**بەرگی یەکەم**

# فەرهەنگی هەژیر

## فارسی - کوردی

**وشە و چەمکە فارسی و ئەو وشە عەرەبی و ئینگلیزییانەی کە بوونەتە زاراوە لە زمانی فارسی لەخۆ دەگرێت**


**وەرگێڕان و ئامادەکردنی:**

**هەژیر عەبدوڵڵا پوور**



هەولێر - 2008



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **فەرهەنگی هەژیر**
- وەرگێڕان و ئامادەکردنی: هەژیر عەبدوڵڵا پوور
- نەخشەسازی ناوەوە: هەردی
- پیتچنین: زانکۆ حەسەن ساڵح
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ( 406 ) ساڵی 2007
- نرخی هەردوو بەرگ: ( 20000 ) دینار
- چاپی یەکەم : 2008
- تیراژ: 1000 دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب** ( 316 )





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

**تقدیم به:**

1) پیــشگامان فــرهنگ نویــسی در کردســتان بویــژه عبــدالرحمن زبیحــی و عبــدالرحمن شرفکندی(هەژار).

2) بانیان و مبتکران پروژه "ڕەهەند".

**مقدمه:**

همه‌ی فرهیختگانی که به کار نوشتن واژه‌نامه‌ها و فرهنگها سروکار داشته‌اند، نیک می‌دانند به انجام رساندن چنین کار سترگی متضمّن چه زحمات کمرشکنی است. سنگینی بار طاقت فرسای تکاپو در این زمینه زمانی بهتر نمایان می‌گردد که وضعیت دشوار حاکم بر زندگی "کاک هژیر" و کمبود امکانات کاملاً ضروری و محروم از منابع کافی در این راستا را درنظرآورده و آنگاه در رابطه با حاصل زحمات وی به داوری بنشینند. ساعتها، روزها و شبها و حتی ماههای متوالی، بدون برخورداری از هرگونه تنوعی و در اطاقکی مهجور نشستن و به کنکاش و پژوهش پرداختن کاریست که از عهده‌ی کمتر کسی برمی‌آید، امّا "هژیر" کوشا و ناشتاب ـ علیرغم همه‌ی کمبودها و نارساییها ـ با تحمّل کلیّه‌ی مشکلات موجود بر سر این راه دشوار و نهمار، توانسته است در این چالش و کشاکش پیروز و سرفراز بیرون آید.

با درنظرگرفتن کلیه‌ی این راستادیهاست که به جرأت می‌توان گفت فرایند کار "کاک هژیر" واقعاً ستودنی و قابل تحسین است بویژه از این نظر که در یافتن چم و آرش واژه‌ها تقریباً از تمامی گویشهای مناطق مختلف کردستان بهره جسته و در این راه زحمات بیمر و بیشماری بر خود هموار کرده‌است. بنابراین از صمیم قلب پیروزی او در این کار سپنتا را تبریك گفته و کامیابی هرچه بیشتری در خدمت به زبان و ادبیّات ملّتمان را برای وی آرزو می‌نمایم.

**فتاح کاویان**

آذرماه 1384 شمسی



## سه‌باره‌ت به‌م فه‌رهه‌نگـــه

"کمال مطلق هرگز در جهان نبوده‌است و نیست، حدا علای کمال این است که کسی بکوشد کار خود را کاملتر از پیشینیان انجام دهد."

سعید نفیسی

کاراترین ئامراز بۆ وه‌رگێڕان له‌ هه‌ر زمانێکه‌وه‌ بۆ سه‌ر زمانێکی تر که‌ڵك وه‌رگرتن له‌ فه‌رهه‌نگی وشه‌ی دوو زمانه‌ یان چه‌ند زمانه‌یه‌ که‌ مانای هه‌ر وشه‌یه‌ك به‌ زمانی زگماکی تێدا شیکرابێته‌وه‌. دانانی فه‌رهه‌نگیش پێویستی به‌ بوونی زانیاری فره‌ و به‌ربڵاو و شرۆڤه‌ و لێکۆڵینه‌وه‌ له‌ په‌رتووك و وشه‌کان و .... هه‌یه‌، ئه‌مه‌ش خۆی له‌ خۆیدا کارێکی زۆر دژوار و ئه‌سته‌مه‌ و پێویستی به‌ تاوتوێکردن و توێژینه‌وه‌ و ته‌رخانکردنی وه‌ختێکی زۆر هه‌یه‌ و ده‌گه‌ڵ سروشتی که‌سانی که‌م جیکه‌ڵدانه‌ و پشووکورتدا نایه‌ته‌وه‌.

له‌ ده‌یان ساڵ له‌مه‌وبه‌ره‌وه‌ و به‌تایبه‌تی له‌م دوو ده‌یه‌ی دواییدا که‌ ئه‌ده‌بیاتی کوردی په‌ره‌سه‌ندنێکی به‌رچاوی به‌ خۆیه‌وه‌ بینیوه‌، کتێبخانه‌ی کوردی پێویستییه‌کی حاشا هه‌ڵنه‌گری به‌ فه‌رهه‌نگی جۆراوجۆر به‌ تایبه‌تی فه‌رهه‌نگی فارسی ـ کوردی شیاو و سه‌رده‌میانه‌ بووه‌ و گه‌رچی له‌م بواره‌دا چه‌ند هه‌وڵێکیش دراوه‌ به‌ڵام نه‌یتوانیوه‌ تینوویه‌تیی نووسه‌ران و وه‌رگێڕانی ئه‌م بواره‌ بشکێنێ و لێکۆڵه‌ران و وه‌رگێڕه‌کانی کورد به‌رده‌وام به‌ دووی مانای چه‌مك و زاراوه‌ نوێ و ته‌نانه‌ت کۆنه‌کانیشه‌وه‌ وێڵبوو. هه‌ڵبه‌ت نابێ ئه‌وه‌شمان له‌ بیر بچێ که‌ وشه‌ و زاراوه‌کانیش بۆ خۆیان ده‌ور گه‌لێکی حکوومه‌تیان هه‌یه‌، هێندێك له‌وان ته‌مه‌نیان ئه‌وه‌نده‌ کورته‌ که‌ وه‌ك هێندێ گوڵ که‌ به‌ هه‌ڵاتنی خۆر ده‌پشکوێن و به‌ ڕۆچوونی خۆریش ده‌ژاکێن، ته‌نانه‌ت سه‌رده‌می وه‌چه‌یه‌کیش نابڕن و زوو له‌ بیر ده‌چنه‌وه‌، هه‌ندێ وشه‌ش ته‌مه‌نێکی درێژ و به‌شێکی زۆریشیان ته‌مه‌نێکی نه‌مریان هه‌یه‌، ئه‌من پێموایه‌ ئه‌گه‌ر مه‌به‌ست له‌ دانانی فه‌رهه‌نگی وشه‌ یارمه‌تیدانی نووسه‌ران و به‌تایبه‌تی وه‌رگێڕه‌کانه‌ ده‌بێ ئه‌وه‌ بزانین که‌ وه‌رگێڕان هه‌موو ده‌قه‌ کۆن و نوییه‌کان له‌خۆده‌گرێ، بۆیه‌ به‌ ڕای من پێویسته‌ وشه‌یه‌ك هه‌رچه‌ند ته‌مه‌نیشی کورتبێ نابێ

هەڵاوێردرێ. پێویستە ئەوەش بڵێین کە دانانی ئەم جۆرە کتێبانە لە وڵاتانی پێشکەوتوودا کاری تەنیا کەسێك نیە و دەیان کەسی پسپۆڕ و شارەزا لە بوار و ڕشتەگەلی جۆراوجۆردا و بە لەبەردەستدا بوونی بوودجەیەکی کەڵان و ژێدەر و پێداویستی پێویست ئەم ئەرکە بەڕێوە دەبەن. هەرچەند منیش کۆمەرجی ئەنجامدانی وەها پرۆژەیەك لە خۆمدا نابینم و دەبوایە کەسانی پسپۆڕ و کارامە و زمانزان هەنگاوییان بۆ ئەم کارە نابا، بەڵام منیش لە قەرای توانایی و لێهاتوویی خۆم شانم دەبەرنا و ئەم بەرهەمەی لێکەوتەوە.

پێموابێ ئەمەش یەکەمین کارە کە وا بەو پان و بەربڵاوییە دەستی پێکراوە و ئەمنیش سەرم نەگرتووە و داواکارم لە هەموو نووسەران و وەرگێڕان بە ڕەخنە و پێشنیار و هەڵسەنگاندنەکانیان ئەم بەرهەمە دەوڵەمەندتر بکەن و هیوادارم لە چاپەکانی دواتردا پڕناوەرۆکتر و دەوڵەمەندتر بێ و بە تایبەتی زۆر وشەی نوێ کە من دەستم پێیان ڕانەگەیشتوە لەم فەرهەنگەدا جێبگرێ. بەو ئاواتەشم کە ئەم بەرهەمە بە زوویی جێی خۆی بکاتەوە و خزمەتێکی بچووك بە دەوڵەمەندبوونی زمان و کولتوور و کتێبخانەی کوردی بکا و بەو هیوایەی کە بەشێك لە ئارەزوو و ئاواتی خوێندکاران و کتێب دۆستان وەدی بێنێ.



## چۆن بوو ئەم کارەم دەست پێکرد

ساڵی 1380ی هەتاوی (2001ن) بە هەگبەیەك وشەی فارسی و کوردی هاوماناوە کە پێشتر کۆم کردبوونەوە هاتمە کۆمیسیۆنی چاپەمەنیی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران، هەر لە یەکەمین ڕۆژەکانەوە بە حوکمی کاری نووسین و وەرگێڕانەوە بەردەوام وشەم کۆدەکردەوە و تا وای لێهات کە زۆر لە سەر یەك کەڵەکە ببوو و هەروا بە پرژوبڵاوی لە تەنیشت یەکدا نووسیبوومن و تەنانەت ئەگەر خۆشم پێویستیم بە وشەیەك ببووایە بە زەحمەت دەمتوانی بیدۆزمەوە، جا بۆیە هەوڵم دا پۆلێن بەندی (طبقـــەبندی)یان بکەم، بەڵام دوای ماوەیەك بیرم لەوە کردەوە کە وێدەچێ ئەو هەڤاڵانەی که پێکەوە کار دەکەین ئەوانیش کۆڵوانەیەك وشەیان هەبێ، ئەمن بۆ نەیەم لە کۆی ئەو وشانە فەرهەنگێکی خنجیلانە ساغ بکەمەوە؟ بۆیە سەرەتا بڕیارم دا تەنیا لە سەر وشە سیاسییەکان کاربکەم و چەند هەزار وشەیەك لەو بابەتە تەتەڵە بکەم و فەرهەنگۆکێکی لێساغ بکەمەوە، بەڵام کە دوایی ڕۆچوومە ناو هێندێ فەرهەنگی فارسی و ئینگلیزییەوە بەتایبەتی فەرهەنگی دوو بەرگی "عمید" و فەرهەنگی دووبەرگی "فرهنگ فشرده سخن" گوتم خۆ ئەمن تازە هەر ملم پێوەناوە، بۆ ئەم فەرهەنگانە نەکەمە بناغەی کارەکەم، کار بۆ دانانی فەرهەنگێکی گشتگیر نەکەم. جا بۆیە سەرەتا بە وردی فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەم خوێندەوە و وشەگەلێکی زۆرم لێ هەڵێنجا و چەندین وردەفەرهەنگی دیکەشم تاوتوێ کرد، ئینجا لە ڕووی ئەو دوو فەرهەنگەوە وشەبەوشە چوومە پێش و سەرەتا بەرگی یەکەمم تەواو کرد. پێویستە ئەوەش بڵێم کە جاری وابووە بۆ دۆزینەوەی مانای وشەیەك بێجگە لە بەراوردکردنی چەندین فەرهەنگی وشە سەردانی زۆر کەسی شارەزا یان سایتی ئینترنێتیم کردووە و بە کورتی بێ خەوی و شەونخوونییەکی زۆرم پێوە چەشتووە، ئەمە جیا لەوەی کە ئەم ئیشە کاری سەرەکی من نەبووە، جا بۆیە وێدەچێ کەموکووڕیشی هەبێ کە هیوادارم بە هەوڵ و پێشنیازی دڵسۆزانەوە کامڵ و پوخت تر ببێ.

## چەند تێبینییەك

1) ئەمن زۆر بە کەمی خۆم لە قەرەی ناوی گژوگیا و جرووجانەوەر و کەلوپەل داوە، چونکە نە لە توانای من دابووە و نە زۆریشم بە پێویست زانیوە و پێشم وایە لەم سەردەمانەدا دەبێ فەرهەنگی ئەو جۆرە وشانە بەپێی تایبەتمەندییەکانیان و بە هۆی پسپۆڕی خۆیانەوە لێك جیابکرێنەوە و پۆلێن بەندی بکرێن.

2) ئەم فەرهەنگە لە بنەڕەتدا فەرهەنگێکی فارسی ــ کوردی ــ کوردییە و ئەمن تا ئەو جێگەی لە توانام دابووە هەولّم داوە بۆ هەر زاراوە و چەمکێکی فارسی چەندین مانای کوردی بۆ بدۆزمەوە و لە راستیدا بەتێکهەڵکێش کردنی دوو فەرهەنگی باسکراو و فەرهەنگی هەنبانە بۆرینەی مام هەژار ئەم بەرهەمەی لێ شین بووە و ئەو سەرچاوانەی دیکەش کە کەڵکم لێوەرگرتوون لە کۆتایی کتێبەکەدا ئاماژەم پێکردوون.

3) شێوازی خوێندنەوە یان چۆنیەتی گۆکردنی (تلفظ) بەشێك لە وشەکانم داناوە، بۆ وێنە بە دوای وشەی "اجل"دا بزوێنەکانی بەم شێوەیە هاتوە: (اَ.جَ).

4) لە بەرامبەر هەندێ وشەدا وشەی بڕوانە هاتووە بۆ وێنە بۆ دۆزینەوەی مانای "افرازیدن" دەبێ بڕوانییە وشەی "افراختن".

5) لە بەرامبەر هەندێ وشەشدا وشەی سووکەڵە هاتووە کە بە مانای "مخفف"ی فارسییە.

6) وشەیەك کە چەند مانای جیاوازی هەیە بە دانانی ژمارە یان دانانی خاڵ (.) لێك جیاکراوەتەوە.

6) وشەی مێینە لە بەرامبەر هێندێ زاراوەدا بە مانای وشەی "مؤنث"ی عەرەبی هاتووە.

7) ئەگەر وشە یان دەستەواژەگەلێك بۆ وێنە بەشێوەی "خندە زدن ــ زیر" نووسراوە، دەبێ بەمشێوەیە بیخوێنییەوە: "زیر خندە زدن".



## سپاس و پێزانین

سپاس و پێزانینی تایبەتی خۆم ئاراستەی ئەم بەڕێزانە دەکەم:

* بەڕێزان کاك فەتاح کاویان و کاك فەرهاد ئەکبەری کە بەوپەڕی دڵاوایی و پشوودرێژییەوە بە بەشی یەکەمی ئەم فەرهەنگەدا چوونەتەوە و بە زیادکردنی وشە و پێشنیاز و تێبینییەکانیان ئەم فەرهەنگەیان دەوڵەمەندتر کرد.

* بەڕێز کاك غەریب پشدەری کە بە پشوو لەسەرخۆیەکی بێوێنەوە ئەرکی بژار و پێداچوونەوەی سەرجەم ئەم فەرهەنگەی وەئەستۆگرت.

* هاوڕێیان کاك رەسووڵ سوڵتانی و ئەمیر شوعاعی وەند و هێمن سەییدی و مەسعوود بابایی و عەلی بوداغی کە هەرکام بە بەشێك لەم فەرهەنگەدا چوونەوە.

* کاك سمایل زارعی کە فەرهەنگ و سەرچاوەیەکی زۆری لە ئیختیار دانام.

لە کۆتاییشدا دوو پێشنیازم بۆ بەرپرسانی دڵسۆزی نەتەوەکەمان بە تایبەت لێپرسراو و بەرپرسانی باشووری کوردستان هەیە، یەکەم هەوڵ بدەن کە بە دانانی ئاکادیمییەك لە شێوەی فەرهەنگستانی تاران جا بە هەر ناوێك بێ و تەرخان کردنی بوودجەی پێویست و دانانی کەسانی زمانزان و پسپۆڕ لە بوارە جیاجیاکاندا پرۆژەیەکی بەربڵاو بە مەبەستی دانانی فەرهەنگ لە زمانە جۆراوجۆرەکانەوە بۆ سەر زمانی کوردی و بە پێچەوانەوە بخەنە گەڕ. دووهەم بە دامەزراندنی ناوەندێك بە مەبەستی پێداچوونەوە و تاوتوێ کردنی ئەو کتێبانەی کە لە زمانەکانی ترەوە وەردەگێڕدرێنە سەر زمانی کوردی چوارچێوە و سنوورێك بە دەر لە هەر دەمارگیرییەك بۆ ئەو هەموو وەرگێڕانە دابنێن.

هەژیر عەبدوڵڵاپوور

بەفرانباری 1384

Hazhir2020@yahoo.com

# آ

**آباء:** باپیران، باب و باپیر، باب و کال، ئەژداد، بنەوبنەچەك، تۆرەوە.

**آباد:** ئاوا، ئاڤا، ئاوەدان، ئاوەیان.

**آبادی:** ئاوایی، ئاواهی، ئاڤاهی، ئاوەدانی، ئاوەیانی، دێ، دژی چۆڵی. بێ کەموکووڕی بوونی بینا و شتی لەو بابەتە.

**آب آشنا:** مەلەوان.

**آب آورده:** ئاومالْك، ئاومالّە، ئەو چیلکە و چالّەی لافاو هاوردویەو داویەتە کەنار.

**آب اندایش:** ئاوخواز، ئەوەی کە دایم لە بیری ئاو دایە.

**آبتاب:** بڕوانە: "درخشان".

**آب تنی:** مەلەکردن یان شۆردنی لەش لە ئاوی ساردا.

**آبخست:** بڕوانە: "آبخوست".

**آبخور:** رادەی توانایی زەوی بۆ مژینی ئاو. 2) ئەو بەشەی لە سمێڵ کە کەوتۆتە سەر لێوی خوارەوە. 3) ئەو بەشەی دەرەوەی پاپۆڕ کە دەچێتە ناو ئاوەکە. 4) بڕوانە: "آبشخور".

**آبخورد:** 1) شوێنی هەلگۆزینی ئاو یان خواردنەوەی ئاو. 2) مەیخانە. 3) بەش، پشك.

**آبخورش:** بەش و نسیب، پشك.

**آبخورکردن:** راوەستان، وێستان.

**آبخوست:** دوڕگە. میوەیەك کە بەشێکی رزابێ.

**آبخیز:** 1) شەپۆل. 2) هەستانی ئاو، بەرزبوونەوەی ئاو. 3) تووفان. 4) زەوی پڕئاو.

**آبخیزداری:** رێکخستنی جەریانی رۆخی ئاو و پێشگیری لە داخورانی خاك.

**آبخیزگاه:** دەریا، ئوقیانووس/ زەریا.

**آبدار:** 1) ئاودار، تەڕوتازەو تێراو، شاد و سەرزیندوو. 2) ناسك و دلّگر. 3) درەوشاوە، بەدرەوشین. 4) ببڕ، بڕا، تیژ. 5) (کیمیا) هیدراتە. 6) ئاوگێڕ، شەربەتگێڕ.

**آبدان:** 1) دەفری ئاو. 2) هەسێلّ، ئەستێر. 3) میزەلّدان.

**آب درمانی:** (پزیشکی) ئاودەرمانی، چارەسەری هەندێ لە نەخۆشییەکان بە خواردنەوەی ئاو یان بە وەرزشی تایبەتی لە ناو ئاودا.





**آب دندان:** 1) جۆرێ هەلّوا. 2) جۆرێ هەرمێ. 3) جۆرێ هەناری بێ ناوك. 4) ساویلکە، نەزان، داماو 5) بە خواستی مەیل.

**آبدهی:** 1) ئاودێریکردن. 2) رادەی ئاودانی شتێك.

**آبدیده:** 1) تەڕ، شێدار. 2) تایبەتمەندی جلێ کە بە هۆی ئاوکێشانەوە رزابێ یان کەم نرخ بووبێ. 3) سەختی دیتوو و زمووده، ساردوگەرم چەشتوو. 4) ئاودراو.

**آبراه:** بڕوانە: "آبراهه".

**آبراهه:** ئاوەڕێ، رائاو، ئاوەڕێژ، ئاڤاڕۆ، ئاوڕۆ، ئابڕۆ، گونجە، رەهەند.

**آبرسانی:** گەیاندنی ئاو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی.

**آبرفت:** تەناس، ئەو بەردو خاك و لمەی کە ئاو ساویویەتی، ئەو مەوادەی کە لە ئاوەڕۆدا نیشتوە.

**آب رفتن:** 1) کورت بوونەوەی قوماش یان جلی نوێ بە هۆی شتنەوە، چوونە ئاو. 2) ئاوهاتنەوە، رەحەت بوون. 3) جەریانی ئاو.

**آبرو:** (رَ) بڕوانە: "آبراهه".

**آبرو:** (رْ) ئابڕوو، ئاوڕوو، هەتك، شەرم، نامووس، شەڕەف، رومەت.

**آبروبردن:** ئابڕووبردن، ئابڕووبڵاوکردن، ئابڕووڕژاندن، ئابڕووتکاندن، حەیابردن، هەتك کردن، هەتکاندن، سووك کردن، بەبووك بردن، ناوزڕاندن، دارشاخ کردن، شەقلێ شکاندن، لە هەڵڵادان و لە قاودانی کار و کردەوەی سووکی کەسێك کە لە لای خەڵك ناحەزە.

**آبروخواه:** ئابروخواز، رومەت خواز، ئەوەی کە هەوڵی پاراستنی ئابڕووی خۆی دەدا.

**آبرودار:** بەئابڕوو، خاوەن شەڕەف و جێ متمانە، بەنامووس.

**آبرو رفتن:** ئابڕووچوون، ئابڕووبران، ئابڕووبڵاوبوون، ئابڕووڕژان، ئابڕووتکان، ئابڕوونەمان، ئابڕوو لە روو هەلگیران، سووك بوون، حەیاچوون، ناوزڕان.

**آبرو رفته:** هەتکی، هەتکیایش، ئابڕوونەماو، ئابڕووڕژاو، ئابڕووبراو.

**آبروریزی:** ئابڕووچوون، ئابڕووبران، ئابڕووتکان، ناوزڕان، بەدناوی.

**آبرومند:** بە ئابڕوو، ئابڕوودار، شەرمدار، شەرم بەخۆ، بەحەیا، حەیابەخۆ، ب رومەت، شەرم بەخۆ.

**آبریز:** 1) ئاوەڕۆ، ئاوڕێژ، شوێنی رشتنی ئاو، شوێنێ کە ئاو لە کێو یان چۆمەوە دەڕژێتە رووبار یان زرێچەوە. 2) چالێ کە بۆگەناو یان ئاوی گەرماو یان چێشتخانە بڕژێتە تێی. 3) مەبال، ئاودەست.

**آبریزان:** جێژنێك بووە کە ئێرانییەکان لە کۆن دا لە رۆژی سێزدەی پووشپەڕدا ئاو و گولاویان پێکدا پڕژاندوە و ئەم نەریتە تا سەردەمی سەفەوی درێژەی هەبووە. "آب پاشان" و "آب تیرگان" یشیان پێگوتوە.

**آب ریـزش:** 1) دڵۆپ دڵۆپ ڕژانی ئاو لە شوێنێکەوە. 2) ڕژانی فرمێسک لە چاوەوە، فرمێسک هاتنەخوار.

**آبریزگان:** بڕوانە: "آبریزان".

**آبریزگـاه:** ئاوەژەنە، ئاوڕێژگە، ئاوڕشتگە. مەبال.

**آبـریـزه:** 1) بڕوانە: "آبـریـز". 2) نەخۆشینێکی چاوە کە بەردەوام چاو ئاوی لێ دەتکێ.

**آبزا:** ئاودەڵێن، ئاوەزێ، ئاوەزا، ئاڤزێ. **"چمن آبزا":** زن، زنە، زۆنج. **"زمین آبزا":** زوهۆڕ، لەرزك، زەوی ئاودەڵێن، زەنەك.

**آب زر:** ئاوی زێڕ.

**آبزی:** ئاوی، سەواڵێ ئاوی، گیانلەبەرێ کە لە ئاودا دەژی.

**آبزی دان:** ئاکواریۆم.

**آب زیرکاه:** ئاو(ر)ی ژێر کا، ئاڤا بن کایێ. بریتی لە مرۆڤی بنەبڕو ئاژاوەگێڕ و گێرەشێوێن.

**آب ساب:** ساوراوە لە ناو ئاو دا.

**آبست:** سووکەڵەی " آبستن ".

**آبستره:** ئەبستراکت، دەرهەست، هەست پێنەکراو.

**آبستن:** دووگیان، سگ پڕ، زگ پڕ، زك پڕ، سکدار، زگدار، ئاوس، هاوس، ئاڤس، ئاڤاس، یاوس، تۆل لەزگ دا. **"آبستن نزدیك به زاییدن":** لەسەردەستان.

**آبستن حوادث:** ئاوسی ڕوداوەکان، ئەوەی کە چاوەڕێی ڕووداوەکانی لێ دەکرێ، ئاڤاسا بویەران.

**آبستن شدن:** ئاوسبوون، ئاڤسین، ئاڤاس بوون، زگ پڕبوون. **"آبستن شدن گاو از گشن":** کەلگرتن.

**آبستن کردن:** ئاوس کردن، ئاڤاس کرن، زك پڕکردن.

**آبستن فریاد:** بریتی لە عود، چەنگ وهتد.

**آبـستنی:** ئاوسی، ئاڤسی، زك پڕی، دووگیانی.

**آبـسته:** (بَ) ئاوەنیا، بەگا، ڕەپستە، زەوی لەبار بۆ چاندن.

**آبسته:** (بِ) بڕوانە: "آبستن".

**آب سـوار:** بڵق، گومەزە، پەقژك، پەقویشك، قەپووچکە، پۆرگی ئاو، تۆقلەی ئاو.

**آبسه:** دومەڵ، قونێر، قولێر.

**آبشار:** تاڤگە، تافگە، تافە، تافیتە، تاف، بافڵ، ئاوهەڵدێر، ڕێژاڤ، ڕێژاو، سوول، سوویل، سوولاڤ، سوویلاڤ، سوولاو، سوولاوك، سوپێل، سواڤ، سۆرك، سیتاڤك، سەرەوەشێن، قەڵۆەز، قەڵبەزە، شەلال، شۆش، (آبشارکوچك)فوورهە.

**آبـشت:** شاراوە، داشاردراو، بە واتای "سیخوڕ"یش دێ.

**آبـشتن:** شاردنەوە، حەشاردنەوە، ڤەشارتن، قایم کردن.

**آبـشتنگاه:** 1) حەشارگە، خەڵوەتگە. 2) ئاودەست، مەبال، کناراو.

**آبشخور:** 1) پەساو، پەزاو، دەراوی مەڕ ئاودان، شوێنی ئاوخواردنەوە، شوێنی ژیان و نیشتەجێبوون. 2) ڕۆزی، بەهرە، بەش و نسیب. 3) سەرچاوە، چاوگە.





**آب شدن:** 1) تاوانەوە، توانەوە، تاویان، حەلبوون، حەلیان، ڤەبووهوژین. 2) بریتی لە تەریق بوونەوە.

**آب شـناس:** کارناسی ئاو، کەسێ کە شوێنی ئاوە ژێرزەوییەکان دەناسێ و دەزانێ کام جێگە بۆ هەڵکەندنی کارێز و چاڵاو باشە.

**آب شـنگرفی:** بریتی لە فرمێسکی خوێناوی، بریتی لە شەڕابی سوور.

**آبشور:** بەئاوشۆردراو.

**آبشویه:** سیفوون.

**آب فـسرده:** ئاوێك کە بەستوویەتی، سەهۆڵ، بەفر، جەمەد.

**آب کافت:** (کیمیا) هیدرۆلیز.

**آب کـردن:** 1) تواندنەوە، تاواننەوە، حەلاندن. 2) ئاوکردن، پاڵ پێوەنان، قاڵ کردن، ساغبوونەوە، بریتی لە فرۆشتنی کەلوپەلی بێ کەلك.

**آب کش:** سووزمە. 2) دەفرایەتی جۆگە یان کاناڵی ئاو. 3) ئاوکێش. **"آب کش کردن کسی":** کون کون کردنی کەسێك.

**آب کشیـدن:** 1) ئاو هەڵێنجان. 2) ڕاگوازتنی ئاو لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی. 3) ڕەخنەکردنی ئاو بۆ ناو برین، ئاوە دزێ.

**آبکند:** 1) ئاودڕکە، ئاودڕگە، ئاودڕ، ئاڤەدڕ، بەرکەندالێ، کەن، کەناو، کەند، کەنداو، کەنەك، کەندالێ ئاو دای دڕیوە، لاندڕ، کەولۆس، بوودڕ، دڕنال، ڕەهۆڵ، ڕەندۆڵ، جۆم، ئەو جێیەی کە ئاو دایدڕیوە. 2) ئاوگیر، تالاو، شوێنی پەسمەندەکردنی ئاو.

**آبکور:** 1) بێ بەهرە لە ئاو، سەقیل، قڕنیس، ڕژد. 2) بڕوانە: "حق ناشناس".

**آبکوهه:** وشترە، وشتراو، شەپۆل، پێل، بەرزبوونەوەی ئاو.

**آبکی:** 1) ئاوەکی، شل، شل و شۆڵە، تراو، ئاودار، پڕئاو، لامۆ، هولنگ. 2) بێ ناوەرۆك، بێمانا، کەم نرخ.

**آبگاه:** 1) شوێنی ئاو، تالاو، هەسێل. 2) کەلەکە. 3) میزەڵدان. 4) شوێنی هەڵگۆزان یان خواردنەوەی ئاو.

**آب گـذار:** بڕوانە: "آبراهه".

**آبگرایی:** (ڕوەکی) هەڵدان و بزووتنی بەشێ لە ڕوەك لە ئاراستەی نزیك بوونەوە بە ئاو.

**آبگرد:** گێژاو، گێژاڤ، گەرداڤ، گەرداو، گێجاو.

**آب گردش:** خۆشبەز، تیژڕۆ.

**آب گرفتن:** شیلەگرتن.

**آب گریز:** ئاوبێز، ماددەگەلی وەك ڕۆن و چەوری کە تێکەڵ ئاو نابن.

**آبگزشدن:** خەساربوونی بەشێ لە میوە. ترنجانی لەش بە هۆی ئاو.

**آبگند:** گەنداو، گەناو، زەلکاو.

**آبگون:** 1) شین، کەوە، ئاودار، بەرەنگی ئاو، ڕوون و ساف وەك ئاو. 2) تیژ.

**آبگـیر:** حەوز، تالاو، بەنداو، گۆل، ئەستێر، ئاوگیر. ئەمباری ئاو.

**آب لرز:** شەپۆلك، شەپیلك.

**آبله:** ئاوله، هاوله، هەوله، هەلۆیّ، خرووکه، خرۆیکه، خوریکه، خوریّلکه، خرۆیّلکه.

**آبلەدار:** بڕوانە: "آبلەگون".

**آبلەکوبی:** ئاولەکوتان، هاولەکوتان، لێدانی واکسەنی دژی ئاوله له لەش، دەرزی لێدان بۆ خوریکە.

**آبلەگون:** ئاولاوی، ئاولەڕوو، گڕوێ، کرناس، رووزە، کرووز.

**آبلەمرغان:** دانکه، ئاولەی مەل، سووك سووکە، خرووکەی مریشك.

**آبمالی:** 1) شتنەوە بە ئاو بەبێ سابوون و ماددەی پاککەرەوە . 2) شۆردنەوەی سەرپێیی.

**آبناك:** ئاودار، شێدار.

**آب نگاری:** زانستێ کە سەبارەت بە ئەنازەگرتن و وەسفی تایبەتمەندی دەریا و گۆل و روبارەکان و چۆنیەتی کۆنترۆڵ و کەلك لێوەرگرتنیان تاوتوێ دەکا.

**آب نورد:** دەریاوان، مەلەوان.

**آب و تاب:** ئاووتاو، داو و ناو، ئاب و تاب، جوان و رێکوپێك. "**با آب و تاب**": بە داو و ناو، بە تێر و تەسەلی.

**آب ورز:** مەلەوان.

**آب و نان دار:** پڕداهات، نان و ئاودار.

**آبونمان:** ئابوونمان، مزی ساڵانە یا شەش یا سێ مانگەی رۆژنامە و گۆڤار لەبڕ.

**آبونه:** ئابوونە، بەشداربوو، پارەی رۆژنامە یا گۆڤارێك لە پێشدا دان و لە سەر یەك وەرگرتنی.

**آبی:** 1) بەراو، ئاوی، دژی دێم. 2) رەنگی شین. 3) خۆبوێر، نافەرمان.

**آبیار:** ئاودێر، ئاوێر، ئاویار.

**آبیاری:** ئاوداشتن، ئاودێران، ئاودێری، ئاویاری، ئاولێنان، ئاودانی زەوی، داشتن، دێران. "**آبیاری شبانه**": شەودێر، شەودێری، شەواو، ئاوێ کە بە شەو لە زرعات دەنرێ. "**اولین آبیاری**": خامۆخ، خامۆغ، یەکەم جار ئاودانی زەرعات.

**آبی خاکی:** 1) وشکاوی. 2) ئاویخاکی، شیاوی ئاو و خاك.

**آبیژ:** بڕوانە: "آییژ".

**آپارتاید:** سیاسەتی جیاکاری نەژادی، ئاپارتاید.

**آپاردی:** زۆر بێ شەرم، زیرەك وفێڵاوی.

**آپاندیس:** ئاپاندیس، ریخۆڵە کوێرە.

**آپوتئوز:** 1) پەرستن، رێزگرتن. 2) دوادیمەنی شانۆ.

**آپولون:** خوای هەتاو.

**آتاك:** هێرش، هروژم، پەلامار، پڕدان.

**آتراکسیون:** کایەی شانۆیی، شانۆ.

**آتربان:** لە ئایینی زەردەشتیدا نگابانی ئاگری پیرۆز.

**آتروفی:** داخوران و چووك بوونەوەی خانە یان پێکهاتە یان ئەندامێکی لەش.





**آتش افروختن:** بڕوانە: "آتش افروزی".

**آتش افروز:** ئاورهەڵایسێن، وێکەر، ئاگر ئایسێن، پێکەر، ئاگرخۆشکەرە. 2) بریتی لە ئاژاوەگێڕو گێرە شێوێن.

**آتش افروزی:** 1) ئاگربەردانەوە، ئاور هەڵایساندن، هەڵکردنی ئاگر، ئاگرکردنەوە، پێخستن. 2) بریتی لە ئاژاوەگێڕی و پشێوی نانەوە، ئاگرخۆش کردن، ئاگرنانەوە.

**آتش انداختن:** وەکارخستنی ئامێرێ بە هەڵکردنی ئاگر.

**آتش انگیز:** 1) پێکەر، ئاگرئایسێن. 2) بریتی لە کەسێك کە بە قسەی توندو ناشیرین رکی کەسانی دی هەڵدەستێنێ.

**آتش باریدن:** زۆر گەرم بوون. تەقەکردن بە چڕی و پەیتاپەیتا.

**آتشبازی:** ئاگربازی، گرگڕان، ئاگرۆکێنە، یاریکردن بە ئاگر.

**آتش بس:** ئاگر بەست، ئاگربڕ، ئاگربەند، تەقەوەستان، راوەستانی شەڕ، خوێن بەس، خوێن بەست، خوێن داکووژاندن، شەڕڕاگرتن.

**آتش بستن ـ به:** لە پەستا تەقە لێکردن.

**آتشپا:** بریتی لە تیژڕەو، بێئوقرە، نائارام.

**آتش پاره:** 1) سکڵ، پەنگر، پەرەنگ، پشکۆ، پۆلوو. 2) بریتی لە هارو هاج، زیرەك، وریا وزیت، زیخ.

**آتش پرست:** ئاگر/ ئاور پەرست، گاور، مەجووسی، پەیڕەوی دینی زەردەشت.

**آتش تر:** شەڕاب.

**آتش خو:** بڕوانە: "آتش مزاج".

**آتشخوار:** 1) ئاورخۆر. 2) بریتی لە زاڵم و ستەمکار، حەرامخۆر.

**آتشدان:** ئاگردان، ئاورگ، ئاوردان، ئاورجا، تەزگا.

**آتش دست:** فرز و چالاك، بەدەست و برد، گورجوگۆڵ.

**آتش رفتن ـ پی:** رۆیشتن بۆ جێیەك و خێرا گەڕانەوە، ئەنجامدانی کارێ بەخێرایی. 2) وەدوای کاری پێویست کەوتن.

**آتش زبان:** قسە رەق، کەسێك کە بەتوندی قسە دەکا.

**آتش زدن:** 1) ئاورتێبەردان، ئاور بەردانەوە، ئاگردان، سووتاندن. 2) لەناوبردن یان وێران کردن. 3) زۆر رەنجاندن و تووڕەکردن.

**آتش سری:** توورەیی، توندخوویی، تیژە مەژگی. پلەپەرتکێ.

**آتش سوزاندن:** ژانەسر خولّقاندن، هاروهاجی و بزۆزیکردن.

**آتش سوزی:** ئاورگرتن و سووتان، هەڵایساندنی ئاور، ئاگرکەوتنەوە، ئاگر بەربوونەوە، شەوات، شەوتین، سووتمان.

**آتش شدن:** 1) گەرم بوون(ئاو). 2) سەرهەڵدانی ئاژاوە.

**آتش فام:** ئارگۆن، بەڕەنگی ئاور، وەك ئاور، سووری تۆخ.

**آتشفشان:** ئاگرین، ئاگری، ئاگرپڕژێن، گڕکان، بورکان.

**آتشکده:** کوانوو، ئاگردان، ئاگرگە، ئاورخانە، ئاتەشگا.

**آتش کردن:** 1) هەڵایساندنی ئاور. 2) تەقاندن، تەقەکردن.

**آتشگاه:** ئارگا، ئاورگ، ئاگردان، تەشگا.

**آتش گرفتن:** 1) کڵپەسەندن و ئاورگرتن، ئاگرتێکەوتن، ئاگرتێبەربوون، ئاگرتێچوون. 2) بریتی لەتووڕەبوون و قەڵس بوون، هەڵچوون. 3) هەست بە ژان و سووتانەوەی زۆر کردن. 4) هەست بەگەرمی زۆر کردن.

**آتش گشودن:** تەقەکردن.

**آتشگون:** 1) بڕوانە: "آتش فام". 2) زۆر گەرم.

**آتش مزاج:** تووڕەو تۆسن، توند خوو، توندە تەبیات، تیزەمەژگ.

**آتشناك:** بڕوانە: "آتشین".

**آتش نشاندن:** کووژاندنەوە و دامرکاندنەوەی ئاور، ڤەمراندن.

**آتش نفس:** بەسۆز، پڕسۆز.

**آتش وار:** وەك ئاگر.

**آتشی:** 1) سەر بە ئاور، ئاگراوی، گەرم و گوڕ وەك ئاور، پڕتین، لە چەشنی ئاگر. 2) بریتی لە مرۆی زۆر تووڕەو ورووژاو.

**آتشین:** ئاگرین، ئایرین، ئاهرین، ئاهیرین، ئاگراوی، گڕاوی. بەڕەنگی ئاور، وەك ئاور. "**نطق آتشین**": ئاخاوتنی گیرا و کارتێکەر. "**آه آتشین**": ئاهی گیان سووتێن، ئاهی کزە لە جەرگەوەهێن.

**آتشین پنجه:** بریتی لە پیشەسازی کارامەو چالاك وچازان.

**آتلانتیك:** ئاتلانتیك، سەر بە ئوقیانووسی ئەتلەس.

**آتو:** 1) بەرگی براوە. 2) بیانوو، بۆنە. "**آتوگرفتن**": بیانوو وەدەستخستن.

**آت و آشغال:** خشت وخاڵ، چیلکەوچاڵ، پڕژاڵ، چڵوچێو، زبڵوزاڵ، هەژك و بڕژاڵ، پووش و پاڵ، رماڵ، گەندوگەمار، گەندوگو، گەندوگەوەڵ، شتی پیس و پۆخڵ، کرس.

**آتو:** بەرگی براوە.

**آتەئیسم:** حاشاکردن لە بوونی خوا، بێ خودایی.

**آتی:** بڕوانە: "آیندە".

**آثار:** 1) شوێنەوار، شوون وار، شۆنەوار، شێنەوار، ئاسەوار، یادگار، یادگاری، نیشانەکان. 2) بەرهەم گەل، نووسراوەکان.

**آثارباستانی:** کەڤنین، شوێنەواری کۆن، کەڤنارە.

**آثار خیالی:** بەرهەمگەلی خەیاڵکرد.

**آثارزدایی:** ئاسەواربڕین، شوێنەوار سڕینەوە/ نەهێشتن، بنەبڕکردن.





**آثارشك برانگیز:** بەرهەمگەلی (گومانـاوی/ گومان خولقێن).

**آثار مبهم:** بەرهەمگەلی نادیار، بەرهەمگەلی گوماناوی.

**آثار معتبر:** بەرهەمگەلی بڕواپێکراو.

**آثم:** تاوانبار، گوناحکار، سووچبار، سووچکار.

**آجل:** (ج) داهاتوو، ماوەدار، دژی بەپەلەیی.

**آجیدن:** ئاژنین، ئاژن کردن، دوروونەوە، تەقەڵ لێدان، بڕگەبڕگەکردنی رووی شتێك.

**آجیل:** چەرەز، چەرەس، سوێرکە، شۆرکە، سوێرەمەنی، چورۆ.

**آجیل خوردن:** بریتی لە بەرتیل وەرگرتن.

**آجین:** بڕوانە: "آجیدن".

**آچاردن:** تێکەڵکردن، لێکدان، تێك وەردان.

**آچمزکردن:** ئاچمەزکردن، خستنە بنبەستەوە، گرفتارکردن.

**آحاد:** یەکەیەکەی، یەکان، تاکان، دانەدانەکان، یەکێك.

**آخش:** 1) ئۆخەی، ئۆخەیچ، ئۆخەیش. 2) بەها، نرخ.

**آخشیج:** 1) دژ، دژبەر. 2) هەرکام لە چوار توخمەکە واتە ئاو و ئاور و با و خاك. 3) بە درۆ خستننەوە.

**آختن:** 1) هەڵکێشان، هەڵکشاندن، دەرکێشان، دەرهێنان، ڤەکێش. 2) کۆك کردن و لێدانی ئامێری مۆسیقا.

**آختە:** 1) هەڵکێشراو، دەرکێشراو، کشاو، دەرهاتوو. 2) یەختەکراو. 3) کۆك کراو.

**آخذ:** وەرگر.

**آخر:** ئەنجام، سەرەنجام، دوایی، دواجار، کۆتا، کۆتایی، داوی، دومایی، دۆنگی، پاشین، پاشان، ئاکام.

**آخربین:** دوورنواڕ، تێبین، ئاکام بین.

**آخرت:** سڵا، رۆژی قیامەت، پەسڵان، ئاخرەت، هەستانەوەی پاش مردن.

**آخرت نگر:** قیامەت بین.

**آخرت نگری:** قیامەت بینی.

**آخردست:** سەرەنجام. لە کۆتاییدا. دوایین دەور و نۆبەی هەر شتێك.

**آخر سر:** دوا جار، سەرەنجام، ئاخریەکەی، ئاخرەکەی.

**آخر شدن:** بە کۆتایی گەیشتن.

**آخر کار:** سەرەنجامی کار، کۆتایی کار.

**آخرین:** دوایین، داوین، داوینە، دمایین، دواگین، پاشین، پاشینە، پاش هەمووشت، هەرەدوایین. "**آخرین قطره**": دواچۆڕ، دوایین دڵۆپ."**تا آخرین نفس**": تا دواهەمین هەناسە.

**آداب:** دابونەریتەکان، رەوشتەجوانەکان، رێوشوێنەکان، دەستوور، تیتال.

**آدا پتە:** هاوڕێك کراو، گونجاو.

**آداش:** هاوناو.

**آداك:** بڕوانە: "جزیرە".

**آدرس:** ناونیشان، نیشانی.

**آدرنگ:** کەسەر، زەحمەت، مەینەت، پەتا. کارەسات، بەڵا.

**آدم:** بنیادەم، مرۆ، ئینسان.

**آدم تودار:** بنەبڕ، دەبنەوەبڕ، مرۆی رك لە دڵی بە رواڵەت فەقیرۆکە.

**آدم ربایی:** رفاندن (فڕاندن)ی مرۆڤ.

**آدم عصبی:** گیزەڵ، بنیادەمی دایم قەڵس و جاڕز.

**آدم فروش:** خاین، خیانەتکار.

**آدمك:** رۆبۆت، مرۆڤیلە، مروڤی بچووك، مرۆڤەکی.

**آدمك چوبی:** پیاوە دارینە، بووکەبارانە، بووکەبارانێ، بووکە بە بەبارانە، بووکەبەبارانێ.

**آدمکش:** پیاوکوژ، پیاوگوژ، مرۆکوژ، مێرکوژ، بکوژ، کوژەر، گوژەر، خوێن رژ، خوێن کەر، قاتڵ. دڵڕەق و بێبەزەیی.

**"آدمکش حرفەای":** کوشتۆخ، زۆربکوژ.

**آدمکشی:** پیاوکوشتن، مرۆکوشتن، خوێنکردن، کێستەنە.

**آدم کوکی:** مرۆی قورمیش کراو.

**آدم نمایان:** مرۆنوێنەکان.

**آدمی:** مرۆ، بەشەر، عیسان، ئایم، بنیادەم.

**آدمیّت:** بڕوانە: "انسانیّت".

**آدمیزاد:** مرۆڤ، ئادەمی، ئادەمیزا، ئادەمیزاد.

**آدمی سیرت:** خۆشخوڵق، خۆش ئاکار.

**آدینە:** هەینی.

**آذرافروز:** بڕوانە: "آتش افروز".

**آذرافزا:** بڕوانە: "آتش افروز".

**آذرپرست:** بڕوانە: "آتش پرست".

**آذرخش:** بروسکە، تروسکە، هەورەتریشقە، چەخماخە.

**آذرخشین:** بروسکەئاسا، برق ئاسا.

**آذرسنج:** گەرماپێو، تین پێو.

**آذرگون:** وەك ئاور، لە رەنگی ئاور، ئامالْ سوور.

**آذرنگ:** 1) بڕوانە: "آدرنگ". 2) روونـاك، رۆشن.

**آذرنگین:** کارەساتاوی، پڕنەهامەت.

**آذری:** بڕوانە: "آذرگون".

**آذوقە:** تفاق، رزق، پێخۆر، بژیو. تێشووی سەفەر و رێگا.

**آذوقەانداختن:** تفاق کۆم کردن، دابین کردنی بژیوی زستانە، زەخیرەخستن.

**آذین:** ئاڕایش، رازاندن. ئایین، باوو رێساو یاسا.

**آذین بندی:** چراخانی، رازاندنەوە، رازاننەوە.

**آراء:** را، دەنگ، بیروڕا. "**آراء عمومی**": رای گشتی.

**آرابیرا کردن:** خالْ و میل رشتن، خۆڕازاندنەوە.

**آراستگی:** ئاراستەیی، رازانەوەیی، رازانەوەبوون.





**آراستن:** 1) رازاندنەوە، رازاندن، رازانن، رازاننەوە، جوان کردن/ جوانکاری، تەوزاندن، خەملاندن، غەملاندن، تەکووزکردن، نەژرنایش.2) ئامادەکردن. 3) دەربڕین. 4) ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی کارێك، نیازکردن.

**آراستە:** 1 ) رازاوە، رازنان، رازاڤ، جوان کراو، تەکووز، خەملیو، خەملاو، خەملی، غەملیو، کۆك .2) ئامادە.

**آراستە سخن:** بڕوانە: "خوش بیان".

**آراستەشدن:** رازیانەوە، رازانەوە، زەینین، زەیینین، خۆ لە گولْ دان(خۆت بۆ کێ لە گولْ داوە؟)، جوان و رێکوپێك بوون.

**آرام:** لەسەرخۆ، ئارام، هێدی، هێور، هێمن، هێون، مەند، مەنگ، ئامۆش، بەپشوو، بێجووڵە، ئوقرەگرتوو، نەتووڕە، دابین، کوپیان، کڕ.

**آرامانیدن:** بڕوانە: "آرام کردن".

**آرام بخش:** هێور کەرەوە، هێمن کەرەوە.

**آرامجو:** هێورخواز، ئارامی خواز، ئاشتیخواز.

**آرام دە:** بڕوانە: "آرام بخش".

**آرام سوز:** تێکدەری ئارامی، ئوقرە هەڵگر، حەجمین بڕ، حەجمین هەڵگر.

**آرامش:** ئاسوودەیی، ئۆقرە، هەدا، هێوری، ئارامی، دابینی، ئۆخژن، وەخژن، ئۆخە، قارا، هێمنی، هێونی، سوکنا، هێمنایی، هێمنایەتی، هێمنەتی، تۆتکە، تەبت، سرەوت، سرەفت، ستار.

**آرامش خاطر:** ئاسوودەیی خەیالْ، نیگەران نەبوون.

**آرامش دادن:** بڕوانە: "آرام کردن".

**آرام شدن:** بڕوانە: "آرام گرفتن".

**آرام کردن:** ئارام کردن، ئارم کردنەوە، لەتاندن، سرەوت کردن، سرەوتاندن، هێورکردنەوە، هێدیکردنەوە، هێدیکرن، هێوراندن، هەدراندن، هەداپێدان، هاڵەوکردن، داسەکناندن، داکاسانن.

**آرامگاە:** 1) گۆڕ، مەزار. 2) مالْ، خانوو، شوێنی ژیان. 3) شوێنی خەوتن و پشوودان.4) پەناگە.

**آرام گرفتن:** تۆقرەگرتن، هەدادان، ئارام بوون، ئارام بوونەوە، حەجمین، سەکنین، داسەکنان، داسەکنین، داکاسان، داکاسیان، داکاسین، داکەسیان، داکەسین، داکەفتن، هەدرین، سرەوان، سرەفتن، سرەوین، سرەوت گرتن، سرەوتن، داسرەوتن، داسرەوین، داسرەفتن، دان بەخۆداگرتن، لەتان، وەرکەوتن، دامرکان (ی ئێش و ژان)، گونجان، هێوربوونەوە، هێدیبوونەوە، هێدیەوەبوون، هێون بوونەوە، بەراییهاتن، هەندران، هەندرین، هەندریان، هەڤیان بوون، ژێربوونەوە، قریان، تۆتکەخواردن، توێتکەخواردن، تۆتکەگرتن، قورمین، ستارکردن، ستارگرتن، هاڵەوبوون، کڕبوون، کوپین، کەوتش، هەدیایش.

**آرامی:** لەسەرخۆیی، ئارامی، پشودرێژی، ئۆقرەیی، هێوری.

**آرایش:** خەمل، خەملٚ، خەملان، رازانەوە، رازیانەوە، زەین، جوان و رێك و پێك بوون، خۆ جوان كردن، خۆتاس و لووس دان، خۆتیل كردن، لاولووسە. "**آرایش دادن**": بەرێزەوەستاندن، رێكوپێك كردن. "**آرایش نظامی/ جنگی**": خۆرێكخستنی سەربازی.

**آرایشگر:** بڕوانە: "آرایندە".

**آرایندە:** رازێنەر، رازێنەوە، رازێنەرەوە، وەڕازێن، جوانكەر، جوانكار، خەملێن، خەملینۆك.

**آرایەگری:** هونەری رازاندنەوەی شوێن. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "آرایش".

**آراییدن:** بڕوانە: "آراستن".

**آرتروسكوپ:** جومگەبین.

**آرترولوژی:** جومگەناسی.

**آرتری:** خوێنبەرەكان.

**آرتریت:** هەوكردنی جومگە.

**آرتیست:** هونەرمەند، ئەكتەر، نیارڤان، شانۆگەر، لیستك ڤان.

**آرزم:** خەبات، تێكۆشان، شەڕ.

**آرزو:** هیوا، هێڤی، ئاوات، ئاڕمان، ئارەزوو، مگێز، واز، ئیشتیا، حەز، هەز، دڵخوازی، كەلكەلە، هۆك، تاسە، قەشقە، تەما، تاو، خیتك، ئالها. "**آرزوی خام**": ئاواتی نەشیاو و ئەستەم، خەیاڵ پڵاوی.

**آرزوانگیز:** ئارەزووهێنەر، ئیشتیاهێنەر.

**آرزو بردن:** بڕوانە: "آرزو كردن".

**آرزوخواە:** بڕوانە: "آرزومند".

**آرزوكردن:** ئارەزوكردن، دڵ لێچوون، دڵ پیاچوون، دڵ چوونەسەر، دڵ پێوەبوون، حەزلێكردن، مەزەبزووتن، ئیشتیاكردن، بەتاسەبوون، ئاوات خوازتن، بەئاوات بوون، خۆزگەخواردن، خۆزگەبردن، وازلێ بوون، واشتەنە، ڤێتن.

**آرزومند:** بەتاسە، تاسا، تاسەبار، تاسەخواز، تاسەمەند، تامەزرۆ، بەئاوات، ئاوات خواز، ئاواتەخواز، ئاواتەواز، بەئارەزوو، ئارەزووكار، بەعەزرەت، كاسۆتی، هێڤیدار، داڤەگر، بەرهێڤی، بەهومێد، هیوادار، بەهەویا، ئاوات خواز، دڵبەستە، ئاواتەخواز، ئاواتەواز، لهێڤی، هەزكەر، ئارەزووكەر، دل بژۆك. "**بسیارآرزومند**": دڵسووتاو، زۆر بە تاسە.

**آرزوناك:** زۆر بە تاسە، زۆر تامەزرۆ.

**آرستن:** (رَ) بڕوانە: "آراستن".

**آرستن:** (رِ) توانین، تاوای، شیان.

**آرش:** (رِ) مانا، واتا.

**آرشیتكت:** بیناساز، تەلارساز.

**آرشیو:** ئەرشیڤ، ئاڕشیو.

**آرغدن:** 1) تووڕەبوون، رق هەستان، هەڵچوون. 2) تەماكاربوون.

**آرغدە:** 1) تووڕە، رق هەستاو، هەڵچوو. 2) چاوچنۆك، تەماكار.

**آركیولوژی:** دێرینەناسی، شوێنەوارناسی، كۆنینەناسی.





**آرم:** نیشانە، ئاڕم، بەرژەنگ، داخ.

**آرمان:** ئامانج، هیوا، دۆز، "ئایدیال"، بە مانای عەزرەت و ئازاریش دێ.

**آرمان پرداز:** ئایدیۆلۆگ، بیرداڕێژ.

**آرمان خوردن:** هەژان وهەڵچوون لە حەیفان، مشقەمشق، هەڵ پنمان، ئارەزووی زۆركردن.

**آرمان سرا:** شوێنی ئاوات، بریتی لە دنیا.

**آرمان شهر:** شاری ئاوات، یۆتوپیا، شاری خەیاڵی.

**آرمان گرا:** ئایدیالیست، ئامانج خواز.

**آرمان گرایی:** ئامانج گەرێتی، ئامانج خوازی، ئایدیالیزم.

**آرمان نهایی:** ئامانجی دواڕۆژ.

**آرمیدن:** مدران، ئۆقرەگرتن، هێوربوونەوە، نوستن، پشوودان. دامركان.

**آرمیدە:** ئۆقرەگرتوو، ئاسوودە، داسەكناو، حەویاوی.

**آرنگ:** 1) پەژارە، ئازار، رەنج. 2) شێواز، شێوە، مێتۆد.

**آروین:** ئەزمون، تاقیكردنەوە.

**آری:** وشەی وەڵام دانەوە، بەڵێ، ئەرێ، ئارێ، دژی نا. "**آری و نە كردن**": چەنەلێدان.

**آریا:** 1) قەومی ئاریا. 2) ئاهەنگ، ئاهەنگ بۆ گۆرانی.

**آریستوكرات:** ئەندامی چینی ئەشراف (پیاوانی پایەبەرن)، لایەنگری ئاریستۆكراسی.

**آریستوكراسی:** چینی دەوڵەمەندان وپایەبەرزان، حكوومەتی ئەشراف.

**آریغ:** دڵساردی، بێزاری، لە دڵ گرتنی رق و دوژمنی بەرامبەر بە كەسێك.

**آز:** رژدی و تەما، ئارەزووی زۆر، تەماحكاری، هەڵپە، زێدەخوازی لەهەر شتێك دا. "**آزورزیدن**": زیاتر ویستن.

**آزاد:** ئازاد، سەرازا، رەها، سەربەس، سەربەست، سەربەخۆ، وەهێر.

**آزادانديش:** ئازادبیر، لیبڕاڵ.

**آزادسازی:** ئازادكردنی شتێ لە بەرتەسكی یان یەخسیری و داگیركاری و هتد.

**آزادشدن:** ئازادبوون، رزگاربوون، بەڕەڵڵابوون، بەربوون لە كۆت و بەند.

**آزادفكر:** بڕوانە: "آزادانديش".

**آزادگی:** ئازادبوون، رزگاری، جوامێری، مێرخاسی، عەگیدی. رزگاربوون لە كۆتوبەند و گرفتارییەكانی دنیا.

**آزادكردن:** ئازاد كردن، بەرەڵڵاكردن، بەردان، ویلٚ كردن، سەربەست كردن.

**آزادمرد:** جوامێر، مێرخاس، رەسەن.

**آزادمنش:** جوامێر، ئازادڕەوشت، بوونی خووخدەی ئازادەیی. لیبڕاڵ.

**آزادە:** جوامێر، مێرخاس. رەسەن. ئازادو رەها، رزگاربوو، سەربەست.

**آزادەخو:** كەسێك كە خووخدەی مێرخاسانی هەیە، رەسەن ونەجیب.

**آزادی:** ئازادی، ئازایی، ئازادبوون، سەربەستی، رەهایی، رزگاری، سەرخوەبوون، دژی بەندەیی.

**آزادی بخش:** رزگاریدەر.

**آزادی بیان:** ئازادی رادەربڕین.

**آزاد یخواه:** ئازادیخواز، ئازادیخوا، رزگاریخواز، خوازیاری سەربەستی، مشازا.

**آزادی ستیز:** دژی ئازادی، دژه ئازادی، ئازادی کوژ.

**آزادی عمل:** ئازادیی کردەوە، دەست ئاوەڵەیی.

**آزادی فردی:** ئازادیی تاکەکەسی.

**آزار:** ئازار، ژان، رەنج، نەخۆشی، ئێش، وەزن، وەزەن، جەزرەبە، جەزرەوە. "آزارشدید": دەماردەر، ژانی چەتوون.

**آزاردن:** قەڵس کردن، ئازراندن، ئازاردان، ئازارگەیاندن/ پێگەیاندن، ئێشاندن، نەرەحەت کرن، وەزەنی.

**آزاردهنده:** بەژان، لەژان، بەئازار، ئازاردەر، دڵتەزێن.

**آزارش:** دڵتەنگی، ئازار، رەنجیان، دڵشکان، عاجزی.

**آزارطلبی:** "مازوخیسم"، کەسێك کە چێژ لە ژان و ئازاردانی خۆی دەبا.

**آزارگر:** ئازاردەر.

**آزارگری جنسی:** سادیسم، ئازاردانی جنسی.

**آزارمند:** نەخۆش، دەردەدار، بەئازار، نەساخ.

**آزارنده:** ئازاردەر، مزێر.

**آزاریدن:** بڕوانە: "آزردن".

**آزپرور:** چاوچنۆك، تەماکار.

**آزپیشه:** بڕوانە: "آزمند".

**آزجو:** بڕوانە: "آزپرور".

**آزدن:** بڕوانە: "آجیدن".

**آزردگی:** رەنجیان، رەنجان، زیزبوون، دڵشکیان، تۆران، دڵتەنگی.

**آزردن:** 1) ئازاندن، ئێشاندن، ئازاردان، ئازراندن، گەهراندن، تۆراندن، تۆران، زیزکردن، وەزەنی، عەزیەتدان. 2) زامدارکردن، برینداركردن.

**آزرده:** ئازار دیتوو، دڵشکاو، رەنجاو، زیز، مەلوول، تۆراو.

**آزردەجان:** دڵشکاو، رەنجاو، دڵتەنگ.

**آزردەخاطر:** دڵشکاو، مەلوول، رەنجیاو.

**آزرم:** شەرم، حەیا، خەجاڵەتی، ئابڕو، ئابوور، چاوری، چاوڕو، چاوەڕو، نامووس، فهێت، فەدی. بەزەیی، بە نەرمی و مێهرەبانی هەڵسوکەوتکردن.

**آزرمجو:** رووگر، بەشەرم، شەرمن، شەرمێون. دادگەر.

**آزرمگین:** بەحەیا، شەرمن. شەرمەزار، سەرشۆڕ.

**آزرمناك:** شەرماوی، شەرمن، شەرموك.

**آزرمی:** بەحەیا، بەشەرم، ب رومەت.





**آزگار:** رەبەق، بە تەواوی، تەواو، بێ زیادوکەم، تەخت.

**آزما:** بڕوانە: "آزمایشگر".

**آزمایش:** ئەزموونکردن، تاقیکردنەوە، جەڕبێن، ب کارئانین.

**آزمایشگاه:** تاقیگە، ئەزموونگە، زمۆنگە، شوێنی ئەزموون، شوێنی تاقیکردنەوە.

**آزمایشگر:** تاقیکار، تاقیکەرەوە، زمە، ئەزموونگەر، جەرباندکار.

**آزمایشی:** ئەزموونی، (بۆ)تاقیکاری. تێستی.

**آزماینده:** بڕوانە: "آزما".

**آزماییدن:** بڕوانە: "آزمودن".

**آزمند:** بەتەماح، بەتەماع، تەماحکار، تەماکار، تەما، تما، چنۆك، چاوچنۆك، چاڤ چنۆك، چاڤ برچی، چاوبرسی، چاونەزێر، چکوس، چەڵماس، بەئێرەیی، دڵبژوك، هەفهەفی، دەڤبەش.

**آزمندی:** چنۆکی، تەماکاری، بەئێرەیی، چکوسی.

**آزمودگی:** چڵۆنایەتی تاقیکراوە، لەکاردەرهاتوویی، کارکری، بە ئەزموون بوون.

**آزمودن:** ئەزموون کردن، تەجروبە کردن، بەتاقی کردنەوە، تاقیکاری، تاقیکردنەوە، جەڕپاندن، هێچاندن، زمین.

**آزموده:** تاقیکراوە، تاقیکراو، تاقیەوەکراو، تەجرەبەکراو، ئەزموو، زموودە، ئەزموونکراو، جەڕبی، بەئەزموون، هەڵسەنگێنراو، ب کار هاتی، کارامە.

**آزمون:** ئەزموون، تاقی، تاقیکردنەوە، تاقیکاری، زمنای، زموون.

**آزمون شناسی:** تاوتوێ و هەڵسەنگاندنی تاقیکارییەکان.

**آزمونگر:** بڕوانە: "آزمایشگر".

**آزمونه:** تێست. تاقیکاری. "آزمونەای": تێستی.

**آزناك:** چاوچنۆك، بەتەماح، تەماکار.

**آزندن:** بڕوانە: "آجیدن".

**آزور:** چاوچنۆك، تێرنەخۆر، رژد.

**آزیدن:** بڕوانە: "آزندن".

**آزیر:** ئازار، زیان.

**آژانس:** 1) نوێنەرایەتی، هەواڵدەری، هەواڵنێری، ئاژانس. 2) تاکسی تەلەفوونی. "آژانس خبری": ئاژانسی دەنگو باس، ئاژانسی هەواڵدەری.

**آژدن:** ئاژن، ئاژنین، تەقەڵ لێدان، دوورین.

**آژده:** ئاژنراو،دوورواو، تەقەڵ لێدراو.

**آژندن:** نێو ئاخنین، پڕکردنەوەی درز و کەلێنی بەرد و خشت بە قوڕ و سیمان.

**آژنگ:** چرچ و لۆچ، گنج.

**آژنگ ناك:** گنج دار، لۆچاوی، لۆچەوەبوو.

**آژوان:** کارگێڕ، نوێنەر، پاسەوان.

**آژویی:** بڕوانە:"شهوانی".

**آژیدن:** بڕوانە: "آجیدن".

**آژیر:** شوتە، وریاکەرەوە. بەئاوەز، وشیار، زیرەك. خۆبوێر، خۆپارێز.

**آژير زدن:** شوتەليّدان.

**آژيرش:** ئامادەباش.

**آژيرندە:** ئاگاكەرەوە.

**آژيريدن:** ورياكردنەوە، ئاگاداركردن، هايداركرن.

**آژيريدە:** ئاگاداركراو، ئامادەكراو.

**آسا:** 1) ئاسا، وەكو، وەكە. 2) باويّشك. 3) خەملّ، رازاننەوە، قورِساغ، سەقامگيرى، ئەسپايى، شيّواز.

**آسان:** ئاسان، هاسان، هەسان، سانا، ساناهى، سەنا، گانگاز، دژى دژوار.

**آسان ساختن:** ريّخۆشكردن، ئاسانكارى، گريّكردنەوە.

**آسانگان:** پيّداويستييەكان، كەلوپەلەكان. "آسان كردها" و "آسان سازها" ش هەر بەم مانايەن.

**آسان گذار:** 1) بروانە: "سمج". 2) كەمتەرخەم، گويّنەدەر.

**آسان گير:** 1) ئەوەى نەرمى و ليّبوردوويى لە خۆى نيشان دەدا، ئەوەى بە ئاسانى دەگەلّ كيّشە و پرسەكان مامەلّە دەكا، ئاسانگر. 2) كەمتەرخەم، خەمسارد.

**آسانى:** 1) ئاسانى، سانايى. 2) ئاسوودەيى، خۆشى، خۆش بژى.

**آسان ياب:** قامخۆش، ئەوەى كە بە سانايى دەست دەكەوێ.

**آسايش:** ئاسوودەيى، بێ خەمى، شيّنى، هيّسايى، رەحەتى، راحەتى، ئارامى، ئارام گرتن، خۆشى، فرەهى.

**آسايش جو:** ئاسوودەيى‌خواز، راحەت خواز.

**آسايندە:** پشووگرتوو، وچان گرتوو، كەسيّك كە لە ئاسوودەيى‌دا دەژى، خواپيّداو، تيّروتەسەل.

**آساييدن:** بروانە: "آسودن".

**آستان:** 1) دەرگا، دەرگە، بەردرگا، بەردەرك، پيّش مالّ، بەرمالّ، كەوش كەن. 2) بارەگا، ئاسانە، پالّاوەژ.

**آستانە:** 1) سەرەتا، دەست پيّك، بەرەبەر. 2) بروانە: "آستان". 3) سەردەرانە، ژيّردەرانە، سەردەرى. "**آستانەدر**": دەريزان، دەرازين، دەرازوون، دەرازوونە، دەرازينك. "**درآستانە**": لەبەرەبەرى، لە سەروبەندى.

**آستر:** ئاسەرِ، ئاستەرِ، ئەستەرِ، زەخەرە، بەر، بەرەكەوا، هەوبەر.

**آسترونومى:** ئەستيّرەناسى، زانستى ئەستيّرەكان.

**آستيگماتيسم:** سەرەنجلارى، لاربينينى، ئاستيگماتيزم.

**آستين افشاندن بركسى(چيزى):** رووليّوەرگيّران، پشت تيّكردن.

**آستين بالازدن:** 1) قۆلّ هەلّكردن. 2) ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانى كاريّك، قۆلّ ليّ هەلّمالّين، بەرليّگرتن.

**آستين برافشاندن:** 1) بە قۆلّ ئاماژەكردن. 2) هەلّپەرِين. 3) كەمتەرخەمى.

**آستين پوش:** بريتى لە گويّرِايەلّ، بێ‌فيز.





**آستين جنباندن:** بريتى لە هەلّپەرِين.

**آسم:** بەرهەنگ، پشووسواربوون، تەنگەنەفەسى.

**آسمان از ريسمان ندانستن:** جياوازى دانەنان لە نيّوان دوو شتى بەتەواوى جياواز، سەر و قوون ليّكجيانەكردنەوە، توانايى نەناسين.

**آسمان جل:** بێ پيّخەف، بێ سەرنناز، شتيار، لانەواز، مالّ لەكۆلّ.

**آسمان را سيركردن:** 1) چوونە بير و خەيالّەوە. 2) فرە دلّخۆش بوون، چيّژى زۆر بردن.

**آسمانخراش:** خانووى چەندين نهۆم و زۆر بلّيند، هەوربرِ.

**آسمانگون:** سەمالّى، كەوە.

**آسمانە:** ميچ.

**آسمند:** درۆزن، خەلّەتيّنەر، خاپيّنەر، گزيكار، سەرليّشيّواو، ورِ.

**آس وپاس:** 1) لات و لوت، رووتو رەجالّ. 2) لەوپەرِى دەست كورتى و هەژارى‌دا بوون.

**آسودگى:** ئاسوودەيى، بێ خەمى، خۆشى، خۆشكايى، ساناهى، سانايى، سەناهى، سەرسووكى، سەرسڤكى، تەناهى، تەنايى، ئارامى، رەحەتى، ئيسراحەت، چۆنيەتى وچان دان.

**آسودگى خاطر:** خاترجەمى، دلّنيايى، خەيالّ تەختى، ئەرخەيانى، هەدارى.

**آسودگى روانى:** ئاسوودەيى دەروونى، ئوقرەيى دەروونى.

**آسودن:** وچاندان، پشووگرتن، حەسانەوە، هەسان، هەسيان، هەسانەوە، هەسانەڤە، هەسيانەڤە، سانەوە، ڤەهەسيان، هەسيانەڤە، هەسانەڤە، ئيسراحەت كردن. "**بەكسى آسودن**": هۆگرى بەو و لە تەنيشت وى راحەت ژيان.

**آسودە:** ئاسودە، رەحەت، تەنا، بيّخەم، بەئيسراحەت، حەساو، حەساوە، وچان گرتوو، سەرسووك، سەرسڤك.

**آسودە خاطر:** دلّتەنا، ئارخەيان، ئەرخەيان، خاترجەم، بيّخەم، دلّنيا، دلّاسوودە، تليا.

**آسودەدل:** بروانە: " آسودە خاطر ".

**آسودەكارى:** بروانە: "بيكارى".

**آسوغ:** ناديار.

**آسى:** خەمبار، خەفەتبار.

**آسياب كردن:** هارِين، هارِينەوە، داهارِين، وردكردن، ليّكردن، گەژمراندن، گەژمرين. "**مراجع آسياب**": ئاشيّرِ.

**آسيب:** زيان، خەسار، خەسارەت، تەوەرە، مزەرِەت، بەلّا، تەگەرە، فەتەرِات، قسپ، بەسەرهاتى ناخۆش، زەرەر، ئازار، ئيّش، دەرد.

**آسيب پذير:** خەسار هەلّگر، زيان وەرگر، تەوەرەبار، لەرزۆك، لاواز، ناسك، شكيّنەر.

**آسیب پذیری:** زیان وەرگری، لەرزۆکی، خەسارهەڵگری.

**آسیب دیدگی:** زیان بینی، خەساربینی. زیان لێکەوتوویی.

**آسیب دیده:** زیان لێکەوتوو، خەسارە لێکەوتوو.

**آسیب رسان:** مزیڕ، زیان دەر، زەرەردەر، بەزەڕ.

**آسیب زا:** زیان هێن، خەسارەتبار، مزیڕ.

**آسیب شناختی:** خەسار ناسانە.

**آسیب شناسی:** خەسارناسی، "پاتۆلۆژی".

**آسیب شناسی روانی:** سایکۆیاتۆلۆژیا، خەسارناسی دەروونی.

**آسیب گر:** بەزیان، زیاندەر.

**آسیمگر:** نیگەرانکەر، بەپەرۆشکەر.

**آسیمه:** ئالۆز، شپرێو، پەشێو، شێواو، ناخاترجەم، نادڵنیا، سەرسام، نیگەران.

**آسیمیلاته:** توانەوە.

**آسیون:** سەرسام، سەرلێشێواو، وڕومات.

**آشام:** شیاوی خواردنەوە، خۆرەوە، خواردەمەنی، شەربەت.

**آشامیدن:** خواردنەوە، قەخواردن، خوارنەوە، وەخوارن، خارن، نۆشین، نۆشان، فڕکردن، ئاشمای.

**آشامیدنی:** شیاوی نۆشین، شیاوی خواردنەوە، بۆخواردنەوە.

**آش پختن برای کسی:** پیلانگێڕان دژی کەسێ، هاندانی کەسێ لە دژی ئەو.

**آشتی:** ئاشتی، ئاشتێنی، سازان، پێکهاتن، تەنایی، تەبایی، تەڤایی، دژی شەڕ، هێمنایەتی، خۆشی، نێوان خۆشی.

**آشتی پذیر:** ئاشتی هەڵگر، کەسێك کە ئامادەی ئاشتبوونەوەیە، شیاوی ئاشتی و سازان.

**آشتی جستن:** ئاشتی خوازتن، ڕەزامەندی خواستن.

**آشتی دادن:** پێکهێنان، پێك ئینان، پێك ئانین ، لێك ئانین، لەڤئانین، ئاشت کردنەوە، ئاشتەوەکردن، سازاندن، ڕێکخستن. "**آشتیدادن دشمنان خونی**": خوێن کووژانەوە، خوێن کووژاندنەوە، خوێن داکووژاندن، مەسلەت کردن.

**آشتی کردن:** پێك هاتن، ئاشتەوبوون، ئاشت بوونەوە، سازان، هورێ ئاردەنە.

**آشتی کنان:** ڕێوڕەسمێ کە لەودا ئاشت دەبنەوە.

**آشتی ناپذیر:** رقدار، رق ئەستوور، کەللە ڕەق، کەللەشەق، ئاشتیهەڵنەگر.

**آشغال گرایی:** زبڵخوازی، زبلگەری.

**آشغالی:** کەنناس، پاکەوان، زبڵ ڕێژ، کۆلان ماڵ، سپوور.

**آشفتگی:** پشێوی، پەشێوی، شێواوی، تەف لهەڤی، پەرێشانی، شپرێوی، ئالۆزی، پەشۆکاوی، شێوان، شلێویان، شەپلین، کەس لە کەس ، تێکەڵی، تێکەڵ پێکەڵی، تێکەولێکە، شپرزەبوون، ئاژاوە، بێسەرەوبەرەیی، ئاخۆران زاخۆران، ژلوق، ژلوقان.





**آشفتن:** زەڵەویان، ژلێوان، ژڵەژان، شڵەژان، شێوان، شێواندن، پەریشان بوون، پەشۆکان، پەشۆکیان، شەمزان، سەرلێشێوان، تێکەڵ پێکەڵ کردن، شڵەژان، تێکچوون، لێتێکچوون، فکرتێکچوون، لە بەریەك بڵاوبوون، هەڵچوون، تووڕەبوون. سەرهەڵدان، شۆڕش کردن. ئاشق بوون.

**آشفته:** پەشێو، پەشۆکاو، پەشۆکیاگ، شەمزاو، شێواو، شێواگ، هەڵشێواو، شپرزە، بیربڵاو، سەرلێشیواو، ئاشق، تێکەڵ پێکەڵ، بێسەرەوبەرە، سەرگەردان، ناکۆك، پەرێشان، تووڕە، رق هەستاو.

**آشفته‌بازار:** پشێوی و هەرکەسە بۆ خۆی، کەس لە کەس، کەس بە کەس، کەس کەس.

**آشفته‌حال:** شپرزیاگ، شپرێو، ژولسە، نیگەران، پەرێشان، پەشێو، خراب حال.

**آشفته خاطر:** نادڵنیا، ناخاترجەم ، دڵ پەرت، دڵ پەرێشان، خەیاڵ بڵاو، پەشێو.

**آشفته‌خو:** تووڕەوتۆسن.

**آشفته‌دل:** بڕوانە: " آشفته خاطر ".

**آشفته دماغ:** بیربڵاو، خەمبار.

**آشفته‌رای:** بەگومان، ب شك بوون، دوودڵ.

**آشفته‌روز:** بەوبەخت، بێشانس، ڕۆژگار پەشێو، پەرێشان حاڵ.

**آشفته‌سامان:** 1) نەدار، هەژار، بێئەنوا. 2) راکێشراو.

**آشفته شدن:** بڕوانە: " آشفتن ".

**آشفته‌عقل:** شێت، بیربڵاو، نەفام.

**آشفته‌کردن:** پەشۆکاندن، شێواندن، ئالۆزاندن، تێکوپێك دان، تێکەڵ و پێکەڵ کردن، ژلوقاندن.

**آشفته‌هوش:** بیربڵاو، گێژ.

**آشکار:** ئاشکرا، ئەشکەرە، خویا، خویان، خوانە، خوانی، دیار، دیاری، روون، بەرچاو، هاینە، کفش، ئاجاخ، دژی نهێنی. بەڵگەنەویست، روون.

**آشکارا :** راشکاوانە، (بە)ئاشکرایی، خویایی، دیاردە، دژی نهێنی.

**آشکارساز:** خویاکەر، ئاشکراکەر. شۆپاژۆ، شوێن هەڵگر.

**آشکار شدن:** خویا بوون، ئاشکرا بوون، دیاریدان، دیارکەوتن، وەدیارکەوتن، ڤەدیارکەتن، ڤێڤرین، زڕانی راز، هاتنە روو، دەرکەوتن، دەرکەڤتن، گوڵ کردن.

**آشکار کردن:** ئاشکراکردن، دانە خویا کردن، دەرخستن، دەرێخستن، نهێنی دەرخستن، لە بنی کوولەکەدان، دەرهێنان، نواندن، دەرهانین، دەرهاوردن، وەدەرنان، پیشاندان، پەنامەکی خستنەڕوو.

**آشکوخ:** ساتمە، سەرسم، خلیسك. هەڵە، خەتا.

**آشکوخیدن:** هەڵـەنگوتن، سەرسم بـردن، خلیسکان، هەڵەکردن.

**آشمال:** زمـان لـووس، زمـان تـەڕ، جـام لووس.

**آشمالی:** زمان لووسی، ریابازی.

**آشموغ:** گومڕاکەر، هەڵخەڵەتێن، قسەبەر.

**آشنا:** ئاشـنا، نـاس، ناسـیاو، ناسـیار، ناسـراو، شـناس، خـزم، دۆسـت ویـار، خۆیانی، کریف، کرێڤ.

**آشنابازی:** کەس کەسانێ، واسیتەکاری.

**آشنارو:** شناس، ناسراو، نـاودار، دۆسـت. دڵگیر، دڵپەسند.

**آشنا شدن:** ئاشـنابوون، راهـاتن، چـاوکردنەوە، چـاوهەڵاتن، وریـابوون لـە کاروبار، فێربوونی ئەرکی سەرشان.

**آشنا کردن:** ناسـاندن، پێکناسـاندن، دوو کەس دە گەڵ یەك ناسیاو کردن.

**آشناگر:** مەلەوان.

**آشنایی:** ئاشـنایەتی، نێـوان خۆشـی، ناسـیاری، ناسـیاوی، شناسـی، ئاشـنایی، ناسـین. "**آشـنایی بـا ارزشـها**": ناسـینی بەهاکان، ئاشنایەتی دەگەڵ بەهاکان.

**آشنایی‌زدایی:** تێکدانی شێوازە باوەکـانی زمـان بەمەبەسـتی پێکهێنـانی سـۆز و هەست لە خوێنەردا.

**آشنایی کردن:** بوونەهـەڤاڵ، گـەرم و گوڕبوون.

**آشو:** پیرۆز.

**آشوب:** ئاژاوە، ئاژاوڵە، ئاژاولە، چوتورمە، کـەتن، خـڕین، پـشێویوکـەس لـە کـەس، پـشێوە، پـشێوێنی، پەشـێوی، پەشـێوە، پەشێوێنی، بشێوە، بشێوی، بشێوێنی، شـۆڕش، شـێواوی، کێـشەوهەرا، کێـشەوهەڵڵا، گۆبـەن، گۆتـاڵ، قـەومان، هێو، فەرتەنە، گۆبەن، گۆبەند.

**آشوب انگیز:** بڕوانە: "آشوبگر".

**آشوبش:** کـەس لـە کـەس، تێکەولێکـە، پشێوی، شپرێوی.

**آشوب طلب:** ئـاژاوەخواز، کـەتن خـواز، شەڕاشۆ، سەربەگۆبەند.

**آشوبگر:** ئاژاوەچی، ئاژاوەگێڕ، پیلانگێـڕ، بـشێونە، پـشێونە، شەڕهەڵایـسێن، کێشەهەڵایسێن، کـەتن گێـڕ، گۆبەنـدگێڕ، سەرەسۆدرە، شەڕهەڵخڕێن، خومەشوێنە، خومەشوێنکە، خومەشێونە، خـم شـێوێن، شوفار، گێرەشێوێن ، شەڕەنگێز، گوڵکـە، جنگن، مایەفیتنە، هێوچی، سەرەسۆدرە، تێکـدەر، کـارخراپ کـەر، کتکەنەفتینـە، مفسیت، مفسید.

**آشوبگری:** ئـاژاوەگێڕی، ئـاژاوەگێڕان، ئاژاوەنانـەوە، ئاژاوەتێخـستن، ئاژاوەخـستنەوە، کـەتن گێـڕان، شەڕهەڵخڕاندن.

**آشوبناك:** پڕئاژاوە، پڕئاژاوڵە.

**آشوبندە:** بڕوانە: "آشوبگر".

**آشوبیدن:** شـێوان، پەریـشان بـوون، پەشـۆکان، پەشـۆکیان، سەرلێـشێویان، هەڵـچوون، تووڕەبـوون. تێکـدانی ئاسوودەیی شتێ یان کەسێك.





**آشوردن:** بڕوانە: "آشوریدن".

**آشورندە:** تێکدەر، وروژێنەر.

**آشوریدن:** ژێروروکردن، تێکدان، لێکدان. تێکەڵکردن. وروژاندن .

**آشوریدە:** وروژاو، لێکدراو، ئاوێتەکراو.

**آشوغ:** نـامۆ، بێگانـە، نادیـار، نەناسـراو، گوم نێو.

**آش ولاش:** لێك بـڵاو، هەڵوەشـاو، شـپرێو. وردوخاش.

**آشیب وتیب:** دڵخـورتیوپەریـشانی، چەمەوڕایی، نیگەرانی، دڵتەنگی.

**آغاردن:** تەڕکردن، خووساندن، فیساندن، ئاوێتەکردن.

**آغارش:** خووسان، شێداری، بارگاویی.

**آغارندە:** خووسێنەر، تەڕکەر.

**آغاریدن:** بڕوانە: " آغاردن ".

**آغاریدە:** شێدار، خووساو، بارگاوی.

**آغاز:** سەرەتا، دەسپێك، هەوەڵ، پیت.

**آغازگر:** دەسپێکەر. سەرەتا.

**آغازیدن:** دەست پێکردن.

**آغالش:** دنە، وروژان. پیلان.

**آغالشگر:** هانـدەر، دنـەدەر، ئاگرخۆشکەر.

**آغالیدن:** هاندان، وروژاندن.

**آغالیدە:** دنەدراو، وروژاو.

**آغردن:** خووساندن، تەڕکردن، وەخوارن، نۆشین.

**آغردە:** شێدار، خووساو، نۆشیاو.

**آغستن:** ئـاخنین، پڕکـردن، تێپەسـتاوتن، داگرتن.

**آغستە:** ئـاخنراو، کۆمکراو، کـۆم کـەی، جڤیایی، پێچەکولوو، کلوی لۆکەی خاو.

**آغشتگی:** بارگـاوی بـوون، شـەڵاڵی، تێوەردراوی، ئاوی، ئاڵو، ئالوودەیی.

**آغشتن:** 1) تـەڕکردن، بارگـاویکـردن، ئاوێتەکردن. 2) ئالوودەبوون، تێوەچوون، تلێن، خەڵتان، تەڕبوون.

**آغشتە:** بارگـاوی، شـەڵاڵ، تێـوەردراو، ئاوی، تەڕبوو.

**آغندن:** بڕوانە: "آغستن".

**آغندە:** بڕوانە: "آغستە".

**آغوش:** باوەش، ئامێز، هـامبێز، هـەمبێز، همبێـز، همێـز، هـامێز، هـەمبز، هـەمبێز، سنگ و بەر.

**آغوشیدن:** لە ئامێزگرتن، لەباوەش گرتن، باوەش پێداکردن، ل هەمبێزگرتن.

**آغیل:** مۆڕبوونەوە، تەماشای بەڕقەوە.

**آفات:** کۆی"آفت"، زیانەکان، پەتای زۆر.

**آفـاق:** کـۆی"افـق"، ئەوسـەرنادیار، ئاسۆکان. لێوارەکان، رەخـەکان. وڵاتـان. گـشت خـەڵکی جیهـان. جیهـانی رواڵـەت، جیهانی ماددە.

**آفاقی:** 1) رواڵەتی. 2) ئەوەی لە زیاتر لە شازدە فەرسەنگی کابە بێ.

**آفت:** 1) بەڵا، پەتا، درم، هال، مێملێ، زیان، دەرد. 2) زۆر جـوان و بەعیـشوە. "**آفـت پالیزی**": بن وشکە، نەخۆشی بێستان.

**آفت زدە:** بەڵالێدراو، پەتالێدراو، نەخۆش.

**آفتاب برآمدن:** هەتاوکەوتن، هەتاوکەفتن، خۆرهەڵاتن، خۆرهاتن، زەردەی بەیان.

**آفتاب به آفتاب:** بەیانی بۆ بەیانی، لە خۆرکەوتن تا خۆرکەوتنێکی تر، لە خۆرهەڵاتن بۆ خۆرهەڵاتنێکیتر.

**آفتاب پریدن:** خۆراوابوونی ئەو.

**آفتاب پهن:** پێش نیوەڕۆ.

**آفتاب پهن بودن(شدن):** بە نیوەگەیشتنی رۆژ، لە نیوەی رۆژدا بوون.

**آفتاب تنگ:** کاتی خۆراوابوون، تەنگی ئێواران.

**آفتاب چریدن:** بریتی لە بێکاربوون.

**آفتاب خوردن:** کەوتنە بەر تیشکی خۆر، هەتاو وێکەوتن. رەش بوونەوە بە هۆی مانەوە لە بەر هەتاو.

**آفتاب دادن:** خستنە بەر تیشکی خۆر.

**آفتاب رو:** جوان، خوشیك.

**آفتابزدگی:** تاوەگازبوون، تاوانگازی، خۆرانگازی، خۆرەنگازی، خۆربردگی، هەتاوبردوویی، تاوبردن، هەتاوبردن، رۆژبرن، رۆژگەستن، گرمژە، گرمژنە، گەرمابردن، گەرمازۆیی، گەرمەژەنە، هۆرگەزتن، هۆرگەستن، تاوەسووت.

**آفتاب زدن:** خۆرهەڵاتن، تاوکەوتن.

**آفتابزده:** تاوەگاز، تاوانگاز، تاوەنگاز، هەتاوگاز، تاوبردە، تاوبردو، هەتاوبردە، هەتاوبردوو، خۆرزەدە، گەرمازۆ، گەرمابردە، رۆژگەز، رۆژگاز، رۆژگەستی، خۆربردگ، خۆرانگاز، خۆرەنگاز، وەربەردە، هۆرگەز.

**آفتاب زرد:** نزیکی خۆراوابوون. مەرگ، کۆتایی ژیان.

**آفتاب شدن:** دەرکەوتنی هەتاو لە پشت هەورەوە.

**آفتاب کسی از مغرب درآمدن:** بێچارە و بەدبەخت بوونی ئەو.

**آفتاب گرفتگی:** خۆر/ رۆژگیران.

**آفتاب گرفتن:** خۆخستنەبەرتاو، تاوگرتن. خۆرگیران، رۆژگیران.

**آفتابگیر:** خۆروەزان، بەربەرۆچکە، بەربەرۆچك، بەرۆچکە، بەر رۆژ، رووبەرۆژ، سواڤ .

**آفتاب لقا:** زۆر جوان.

**آفتابناك:** هەساو، سامالّ، ساو، روژی هەتاوی.

**آفتاب نزده:** بەیانی زوو، بەر لە خۆرکەوتن.

**آفتاب نشین:** خۆش نشین. بێکارە و تەوەزەل.

**آفتاب نگیر:** بەرسێبەر، نسار، نزار، نسرم، نسیّ، شوێنیّ کە تاو نایگرێتەوە.

**آفتابی شدن:** 1) ئاشکرابوون، خویابوون. 2) لە مالّ دەرکەوتن، لە مالّ هاتنەدەر .

**آفتابی کردن:** ئاشکراکردن، خویاکردن.

**آفتومات:** ئوتومات، خودکار.

**آفدم:** کۆتایی، دووایین، سەرەنجام.





**آفرنده:** بڕوانە: "آفریدن".

**آفرنگین:** بەشکۆ، شکۆدار.

**آفریدگار:** ئافرێنەر، خولّقێنەر، بەدیهێنەر، چێکار، داهێنەر، یەزدان.

**آفریدن:** ئافراندن، خولّقاندن، بەدیهێنان، داهێنان، سازکردن، چێکرن.

**آفریدەشدن:** ئافرێنران، خولّقان، بەدیهاتن، داهێنران، دروست بوون. "آفریدەشده": ئافراو، خولّقاو، خولّقێندراو، بەدیهێنراو، چێکری، بەدیهاتوو، دروستکراو، سازکراو.

**آفرین:** 1) بژی، ئافەرەم، بارەقەڵا، باریکەللّا، دەست خۆش، لەمت کەویّ، لەمنت کەویّ، هەلال بۆ، حەڵاڵتە. 2) فرمانی ئەمر بۆخولّقاندن، بخولّقێنە، بئافرێنە.

**آفرینش:** کردەی خولّقاندن/ ئافراندن. سرشت، خۆڕست. چارەنووس. جیهانی هەبوون.

**آفرین گو:** ئافەرەم بێژ، ئافەرەم خوێن، پەسن بێژ، ستایشکەر.

**آفرینندگی:** ئافرێنەری، داهێنەری، خولّقێنەری.

**آفریننده:** بڕوانە: "آفریدگار".

**آفسانه:** رازە، چیرۆکی خەیالّی، بەسەرهات.

**آفل:** رۆچوو، لەبەرچاو ون بوو، خۆرئاوابوو.

**آفند:** شەڕ، جەنگ. دوژمنی. هێرش، پەلامار.

**آفندگر:** شەڕکەر. هێرشبەر.

**آفندیدن:** شەڕکردن، جەنگان، دوژمنایەتی کردن.

**آقاسی:** گەورە، سەروەر.

**آقشام:** ئێوارە، کاتی خۆرئاوا.

**آك:** ئێش، زیان، پەتا، درم.

**آکادمی:** ئاکادێمی، کۆڕوکۆمەڵی زانستی، فەرهەنگستان.

**آکادمیست:** بەڕێوەبەری زانستگا، خوێندکار.

**آکادمیسین:** ئەندامی ئاکادێمی.

**آکادمیك:** 1) زانستگایی. 2) زانستی، زانستییانە. 3) تیورەکی، تیۆریك.

**آکال:** رسق، رۆزی.

**آك پوشانی:** ساختەکاری، فریودان.

**آکتوالیته:** مۆدی رۆژ.

**آکتور:** ئەکتەر، شانۆکار، شانۆگەر، دەورگێڕ.

**آکتیو:** چالاك، هەڵسوور، ئاکتیڤ، چەلەنگ، پڕکار، کاریگەر.

**آکتیویته:** چالاکی، پڕکاری.

**آکرومگالی:** (پزیشکی) زەبەللاحی، زەبەلاحی، نەخۆشییەکە لە ئاکامی زۆربوونی ئاستی هۆرمۆنی گەشە لە خوێندا پەیدا دەبیّ کە ئەو کەسە زەبەلاح و کەتە دەبیّ.

**احتمال دارد:** لەوانەیە، رەنگە، رەنگبێ، وێدەچێ، دوور نیە، هەیەکوو.

**احتمال رفتن:** شیان، لوان، رەخسان، وێچوون.

**احتمال کردن:** 1) بڕوانە: "تحمل کردن". 2) وێچوون، شیان. 3) بردن، راگوازتن.

**احتمال کننده:** خۆڕاگر، بەگیر، بە تاقەت، پشوودرێژ، هەلگر.

**احتمالی:** شیمانەیی، ئەگەرێتی.

**احتوا:** لەخۆگرتن.

**احتیاج:** 1) نیاز، ئاتاجی، ئەوجە، قاپۆ، چاو لە دەستی، حەوج، حەوجە، حەوجەهی، هەوجە، پێداویستی، گەرەك، دەست کورتی، نەبوونی، کەمایەسی، کەماسی. 2) پێویست.

**احتیاجات:** شتە پێویستەکان.

**احتیاج دادن:** نیازمەندکردن، هەژار کردن.

**احتیاجی:** پێویست.

**احتیاز:** کۆکردنەوە. 2) دەست بەسەرداگرتن، زەوت کردن، داگیرکردن.

**احتیاط:** 1) قایمکاری، پتەو کاری، پارێزکردن، هوشیاریو ئاگایی بە کارهێنان لە کارێك دا، بەمشوورەوە کارکردن. 2) دوورنواڕی، دووربینی. 3) یەدەك(گ)، سپێر.

**احتیاطاً:** تێبینانە، دوورنواڕانە.

**احتیاط آمیز:** بەپارێزەوە، لاپارێزانە، هوشیارانە.

**احتیاط داشتن:** بەگومان بوون لە پاکی یان پیسی حەڵاڵ و حەرام بوونی شتێك. 2) تێبینی هەبوون، ترس هەبوون.

**احتیاط کار:** دوورنواڕ، قایمکار.

**احتیاطی:** 1) بڕوانە: "احتیاط آمیز". 2) پاڵپشتە، یەدەگ، سپێر.

**احتیال:** فێڵ وتەڵەکە کردن ، فێڵبازی، کەڵەك لێدان، ریگەچارە دۆزینەوە.

**احجام:** وەستانەوە، خۆبواردن.

**احد:** تاك، تەنیا، یەك، کت.

**احداث:** (اِ) دروست کردن، چێکرن، سازکرن، دیارخستن، وەدیهێنانی شتێ‌نوێ.

**احداث:** (اَ) 1) شتە نوێیەکان. 2) رووداوەکان، پێشهاتەکان. 3) لاوان، تازەلاوان. 4) دابونەریتی نوێ. 5) نگابانی شەو.

**احداث الدهر:** (اَ) بەلا و دژوارییەکانی رۆژگار.

**احدالناس:** کەسێ، تاکێ.

**احدحدود:** سەخت ترین سزاکان.

**احدی:** تاکێك، هیچ کەس.

**احدیّت:** یەکایەتی، تاقانەبوون، تاقایەتی، تاقانەیی، یەکتایی.

**احذر:** ترسێنەرتر، دوورنواڕتر، وریاتر، هشیارتر.





**احراج:** تەنگەتاوکردن، تەنگاوکردن، کەوتنەتاوانەوە.

**احرار:** 1) جوامێران، مێرخاسان، عەگیدان، خوشمیران. 2) ئێرانییەکان.

**احراز:** بەدەست هێنان، بەدەست خستن، بەدەست ئانین، وەرگرتن، گەیشتن بەشتێك، پاراستن، کۆکردنەوە، پتەوکردن.

**احراق:** سووتاندن، سووتانن، ئاگر تێبەردان، ئاگردان، شەوتاندن.

**احرام:** لەخۆ حەرام کردنی هەندێ شت.

**احرام بستن:** ئامادەی ئەنجامدانی کاروباری حەج بوون.

**احری:** شیاوتر،شایان تر.

**احزاب:** کۆی"حزب"، حیزبەکان، پارتەکان. پێڕەوان.

**احزان:** کۆی"حزن"، کەسەرەکان، کوڤانەکان، خەم وخەفەتەکان.

**احساس(کردن):** هەست کردن، هەست پێکردن، سەح پێ‌کرن، پسو، تێگەیشتن، پێزانین، ئاگاکردن، حەسیان، هەسیان."**بی احساس**": بێ‌هەست، وشك، سارد، بێ‌ڕوح، کەمتەرخەم.

**احساسات:** هەستەکان، کولی دەروون، کولۆکۆ، کەفوکوڵ، هەستی هەناو، جۆشی دەروونی، هەستیاری.

**احساسات گرایی:** عاتفەگەرێتی، سۆزگەرێتی.

**احساساتی:** هەست ناسك، دڵناسك، کەسی هەستیار، زوو وروژێن، عاتفی، سانتی‌مێنتاڵ.

**احساساتی شدن:** وروژان، هەڵبزوان، هەڵخڕان، هەڵچوون.

**احساس برانگیز:** هەست بزوێن، وروژێن، وروژێنەر، هەست هەڵخڕێن، "سێنتی مێنتاڵ".

**احساس سردی:** هەستی سەرما، ساردایی.

**احساس سستی:** داهێزان، لەش گران بوون، هەجنین.

**احساس سوختن:** چزەلێهێنان، هەستی داغکردن.

**احساس سوزش:** چووزیانەوە، چووزانەوە، تووزیانەوە، سووتیانەوە، سووتانەوە، زوورانەوە، برژانەوە، هەڵبرژان، هەڵبرژیان، کڕووزان، کڕووزانەوە، کزانەوە، کزیانەوە، کاویانەوە، سۆڵان، برژانەوەی پێست و زام.

**احساس کننده:** هەستیار، هەستکار، هەستۆك.

**احساسی:** لەسەربنەمای هەست و سۆز، عاتفی، هەست ناسك.

**احسان:** 1) چاکەکردن.2) چاکە، خاسە،چاکەکاری، چاکێتی، خاسی، قەنجی، خێر، خەڵات، بەخشین، خێرکردن.

**احسنت:** بڕوانە: "آفرین".

**احشاء :** دڵ و دەروون، جەرگ و ناو، دڵ و گورچیلە، حورگش، ناوزگ، ناڤزگ، پزۆر، هەناو، هەناڤ، هناڤ، هەندرخان، چەشکە، مێلاک.

**احشام:** کۆی"حشم" مالاتی ماڵ، مەڕو مالات، ماڵوپەز، پاتاڵ، زیندەماڵ، زینەماڵ، وڵسات، ئاژەڵ، ئاژاڵ، واقەکەر.

**احصاء:** 1) وەرگرتن، پاراستن، نگاداری، ژمارەکردن، ژماردن، بژاردن، هەڵ ژماردن، هەژمارتن .2) سەرژمێری.

**احصائیه:** بڕوانە: "آمار".

**احصار:** 1) نەهێشتن. 2) ئابلۆقەدان و لە تەڵزگەخستن، گەمارۆدان.

**احصان:** (إ 1) قایم و پتەوکردن، پارێزگاری، نگاداری کردن. 2) ژن هێنان، شووکردن، پێکهێنانی ژیانی هاوبەش.

**احصان:** (آ کۆی"حصن"، قەڵا، حەشارگە، شوێنی بەرزو پتەو.

**احضار:** ئامادەکردن، بەرهەڤ کرن، سازکردن، خواستن ، خوازتن، بانگهێشت کردن، بانگ کردن، وادە، ڤەخۆندن، هێنان. "**احضار ارواح**": بانگهێشتی رۆحی مردوەکان، پێوەندی کردن بە رۆحەکانەوە، ئەو هەوڵانەی کە بۆ پێوەندی کردن بە رۆحی مردووەکانەوە دەدرێ، "ئیسپێرتیسم".

**احضارنامه:** بڕوانە: " احضاریە".

**احضاریه:** ئاگادارکردنەوە، خوازنامە.

**احطب:** داڵگۆشت، مردەڵە، رەقەڵە، لاواز، کزوکەنفت.

**احق:** شیاوتر، راست تر.

**احقاء:** کۆی"حقیق"، شیاو، لێهاتوو، ژێهاتی.

**احقاد:** رقەکان، قینەکان.

**احقاق:** وەدیهاتن، وەدیهێنان، دەستەبەرکردن، داوای مافکردن، راستگوتن.

**احکام:** (آ 1) بڕیارەکان، فەرمانەکان، حوکمەکان. 2) یاساکان، رێساکان.

**احکام:** (إ 1) پتەوکردن، قایم کردن، توکمەکردن. 2) نەهێشتن، بەرگرتن.

**احکام نویس:** (آ) بڕیارنووس.

**احلاء:** شیرین کردن.

**احلاف:** سوێنددان.

**احلال:** گەردن ئازایی، حەڵاڵ کردن، بەڕەوا دیتن، شایست کردن.

**احلام:** 1) وەهمەکان. 2) خەونە ئاڵۆزەکان.

**احلی:** شیرینتر.

**احلیل زدن:** فریودانی منداڵێک و دەستدرێژی کردنە سەری، **هەڵفریواندن، هەڵخەڵەتاندن.**

**احماد:** ستایش کردن.

**احماض:** 1) ترشکردن. 2) شۆخیکردن.

**احمرار:** سووربوونەوە، سوورهەڵگەڕان.

**احمق:** بڕوانە: "ابله".





**احوال:** هەواڵ، باس، نووچە، دەنگ و باس، خەوەر، سەبارەت، حاڵ و دۆخ، حاڵ و حەواڵ، چۆنیەتی باری ژیان، چۆنیەتی باری جسمی و رۆحی. رووداوەکان، پێشهاتەکان.بەسەرهات، کورتەمێژووی ژیان.

**احوالات:** هەواڵەکان، رووداوەکان.

**احوالپرسی:** چاک و چۆنی، چاک و خۆشی، خۆش و چۆنی، خۆش و بێش، خۆشی و بۆشی، **هەواڵ** پرسی.

**احیاء:** (إ 1) ژیانەوە، ژیاندنەوە، بووژان، بووژانەوە، بووژاندنەوە، زیندوو بوونەوە، لەدایك بوونەوە، وەگورد کەوتن، ڤەژین، ڤەژیان، ڤەژیاندن، فەتاندن، ئاوەدانکردنەوە، گیان وەبەرهێنانەوە. 2) برەو و متمانە پێدان. 3) شەونخوونی.4) لە رەنج و دژواری و تەنگانە رزگاربوون. "**احیاء شدن**": 1) (کیمیا) ئاوێتەبوونی جسم دەگەڵ هیدرۆژن. 2) وەدەست کەوتنەوەی جسمێ لە پێکهاتەکانی وەك وەدەستهێنانەوەی ئاسن لە بەردئاسن.

**احیاء:** (آ) زیندەوەر، زیندەوار، گیانەوەر، گیان لەبەر.

**احیاء گرایی:** ڤەژینخوازی، ژیانەوەخوازی.

**احیاء گرفتن:** بەڕێوەبردنی رێورەسمی مناجات بە تایبەتی لە شەوەکانی قەدردا.

**احیان:** کۆی"حین"، کاتەکان، ساتەکان، گەلێ.

**احیاناً:** ئەگەرکو، ئەگەرهاتوو، وارێکەوت، بەشکایەك، دنیابوو، جار جار(ە) ، جارناجارێ، جاروبار، جارێك لە جاران، ناوناوە ، بەهەڵکەوت ، بەدەگمەن، هنگاڤی، چلۆنها، چلۆنەکایەتی.

**احیل:** فێڵبازتر، زیرەك تر.

**اخاء:** برایەتی، برایی.

**اخاذی:** بەزۆر وەرگرتن، باج وەرگرتن، دەمچەوتانە وەرگرتن/ ئەستاندن لەکەسێك.

**اخافه :** ترساندن.

**اخبار:** (آ کۆی "خبر"، دەنگ و باس، هەواڵەکان، باس و خواس، باس و خەبەر، قسەوباس، خەبەرات.

**اخبار:** (إ) ئاگادارکردن، پێڕاگەیاندن، وەڵام دان.

**اخباری:** سەر بە(اخبار)، مێژووزان، مێژوونووس. هەر وەها کەسێك کە هەقایەت و چیرۆك دەگێڕێتەوە.

**اختاپوس:** جلە، هەشت پێ، ئەختەبووت.

**اختباء:** خۆشاردنەوە، خۆحەشاردان، خوەڤەشارتن.

**اختبار:** تاقیکردنەوە، جەرباندن، ئاگاداربوون لە شتێك، ژێهای بوون.

**اختتام:** کۆتایی هاتن ، تەواوبوون، کۆتایی هێنان، کۆتایی پێهێنان، براندنەوە، بڕینەوە، دوایی هێنان ، بەکۆتایی گەیاندن، داوی ئانین.

**اختتامی:** کۆتایی، دوایی.

**اختتان:** خەتەنە کران(بۆ کچان)، سوننەت کران(بۆ کوڕان).

**اختداع:** هەڵخەڵەتاندن، خاپاندن، فریودان، فێڵبازی.

**اختراع:** داهێنان، داهانین، داهاوردن، وەدیهێنان، هێنانە ئارا، داهاوردن، ئافراندن. "**اختراع شده**": بەدیهێنراو، داهاتوو، ژنوهاتی، نوچێ بویی، ئاردەینە.

**اختراعی:** 1) داهێنراو، نوێچێبوو. 2) دەستکرد، دەس هەڵبەست.

**اختراف:** چنینەوە، میوە چنین/ رنین.

**اخترافروز:** بەختەوەرکەر، یارمەتیدەر.

**اختراق:** 1) دڕان، بڕین، شەقکردن. 2) تێپەڕین، پێداچوون، چوون.

**اخترام:** بڕین، رفاندن، لە رەگەوە دەرهێنانن ریشەکێش کردن.

**اختربین:** ئەستێرەناس.

**اخترسوختگی:** بەدبەختی، چارەڕەشی، دۆش داماو.

**اخترشمار:** ئەستێرژمێر، ئەستێرەناس. شەونخوون.

**اخترشناخت:** زانستی ئەستێرەکان، ئەستێرەناسی.

**اخترشناس:** ئەستێرەناس، ئەستێرە ژمێر.

**اخترگویی:** بڕوانە: "طالع بینی".

**اخترمه:** ئەو دەسکەوتانەی لە دوژمنی بەزیو جێماوە.

**اخترنگاری:** وێنەهەڵگرتنەوە لە هەسارەکانی ئاسمان بە تێلسکۆپ یان کامێرای تایبەتی ئەستێرەناسی.

**اختزال:** 1) تەنیابوون، تەنیایی. 2) لێ کرنەوە، کەمکردنەوە، کورت کردنەوە، خەیانەت لە سپاردە، قۆتکرن. 3) سەرکێشی، ملهوڕی.

**اخت شدن:** (اُ) پێکەوەخووگرتن، هاودەم بوون، سازگاربوون.

**اختصار:** کورتکردنەوە، کورتکاری، کورت بێژی، کورت بڕی، ریێ بڕین. "**به اختصار**": بە کورتی.

**اختصارکردن:** رازیبوون، بەس کردن، بەس بوون.

**اختصاری:** کورتکراوە، پوختەکراو.

**اختصاص:** 1) تەرخان کردن، تایبەتکردن. 2) تایبەتبوون، تایبەتی. 3) پسپۆڕی، شارەزایی، لێزانی.

**اختصاص دادن:** تەرخان کردن، لەبەرچاو گرتن، بەرچاڤ گرتن.

**اختصاصی:** تایبەتی، تەرخان کراو، خۆماڵی، پاوان، نادەوڵەتی.

**اختصام:** دوژمنایەتیکردن، دژی یەکتربوون.





**اختطاب:** 1) ئاخافتن، وتار خوێندنەوە. 2) خوازبێنی.

**اختطاف:** رفاندن، فڕاندن، رفێنران، رەواندن.

**اختفاء:** خۆشاردنەوە، خوەڤەشارتن، خۆقایم کردن، پەناگرتن.

**اختفاض:** هاتنەخوار، نیشتنەوە.

**اختلاب:** هەڵخەڵەتاندن، کەڵەك لێدان، فریودان.

**اختلاج:** 1) هەڵکەندن و کێشانی شتێك، هەڵتەکان. 2) بزوتن ولەرزینەوە، پڵدان، دەمار لێدان.

**اختلاس:** رفاندن، دزی، دزین، دزێتی، دەست پیسی، شت بە دزی شاردنەوە.

**اختلاط:** 1) تێکەڵکردن، تێکەڵبوون، تەڤلی هەڤکرن. 2) تێکەڵی، تێکەڵاوی، ئاوێتەیی. 3) هاوجێیی، هاونوێنی.

**اختلاع:** لە بن دەرهێنان، لێ سەندن، داگیرکردنی ماڵی کەسێك.

**اختلاف:** ناکۆکی، دووبەرەکی، دووبەندی، ناتەبایی، نە وەك هەڤی، جیاوازی، ناڕێکی. هاتووچۆ.

**اختلافات:** دووبەرەکییەکان، دووبەندییەکان، ئالوزیا ناڤبەر دو ئاليان.

**اختلاف افتادن:** سەرهەڵدانی ناکۆکی و دووبەرەکی، وەدیهاتنی کێشمەکێش.

**اختلاف برخاستن:** رەوینەوەی ناکۆکی و ناسازگارییەکان.

**اختلاف پتانسیل:** هۆکاری پێکهاتنی جەریانی ئیلکتریکی نێوان دوو خاڵ لە خولگەیەك.

**اختلاف کردن:** 1) دژایەتیکردن دەگەڵ بیروبۆچوونی کەسێکی دی. 2) هاتوچۆکردن.

**اختلاف نظر:** جیاوازی بۆچوون.

**اختلاق:** درۆڕازاندنەوە، درۆهەڵبەستن.

**اختلال:** 1) تێکەڵ پێکەڵبوون، تێکچوون. 2) تێکەڵ پێکەڵی و ئاڵۆزی، شپڕێوی، پشێوی، شپرزەیی، شێواوی، بێ نەزمی. 3) زیان گەیشتن بە کارەکان، بەفیڕۆچوونی کار.

**اختلال روانی:** (دەروون ناسی) دەروون ئاڵۆزی، دەروون پەرێشی، تێکچوونی دەروونی.

**اختناق:** 1) خەفەبوون، گەرووگیران، خنکان.2) خنکاندن. 3) زەبروزەنگ.

**اختناق آور:** خنکێنەر.

**اخته:** خەساو، خەسیاو، خەسیاگ، خەسیو، گون دەر هاتگ، گون دەرهاتوو، یەختەکراو، تۆم رژیاگ، لە پیاوەتی کەفتگ. "**اخته‌خانه**": تەویلە، گەوڕ.

**اخته‌شدن:** خەسان، خەسیان، هێلکە گون دەرهاتن.

**اخته‌کردن:** خەساندن، خەسانن، یەختەکردن، گون دەرهێنان، گونە کردن، (اختەکردن گاومیش)کرتان کرن.

**اختە کنندە:** خەساس، خەسۆك، خەسێن، گونکە، گونکەنە، گونەکار، گون دەرهێنەر.

**اختیار:** توانایی، دەسەڵات، دەسەڵاتداری، ئازادی کردەوە. ویست و خواست. هەڵبژاردن، پەسندکردن. "**اختیار از کف (دست) کسی رفتن**": بێتاقەت بوونی ئەو، لێسەنرانی دەسەڵاتی ئیرادە لە ئەو. "**اختیار کسی را داشتن**": بوونی دەسەڵاتی بڕیاردان سەبارەت بەو. "**بەاختیار**": بەئازادی، بەسەربەستی. "**دراختیارکسی‌بودن**": 1) بەپێی ویست و مەیلی ئەو جووڵانەوە یان هەڵسوکەوت کردن. 2) لە ژێر ئیرادەی وی دابوون.

**اختیارات:** دەسەڵات، ڕێ پێدراو.

**اختیار افتادن:** لەلایەن کەسێکەوە هەڵبژێران.

**اختیارتام:** دەسەڵاتی تەواو.

**اختیار دادن:** دەسەڵات پێدان، تواناییپێدان.

**اختیاردار:** خاوەن دەسەڵات، دەسەڵاتدار.

**اختیارداشتن:** ئازادبوون لە ئەنجامدانی کارێك، هەبوونی ئازادی کردەوە.

**اختیارکردن:** هەڵبژاردن، بژاردن.

**اختیاری:** خۆخوازانە، خوازەکی، ئارەزوومەندانە، دڵخوازانە، خوەخاستی.

**اختیال:** 1) لووت بەرزی، بەخۆفشین، بە شکۆوە لەنجەکردن. 2) خەیاڵ کردن.

3) بڕوانە: "خرامیدن". 4) سەربزێوی، سەرکێشی.

**اخدع:** فریوبازتر، فێڵاویتر.

**اخذ:** 1) وەرگرتن، گرتن، ڤەگرتن، بەدەسهێنان. 2) یەخسیرکردن. 2) بڕیاردان لەکارێك.

**اخراب:** وێرانکردن، کاول کردن.

**اخراج:** دەرکردن، وەدەرنان، جواودان، کردنەدەشت، دەرپەڕاندن، رادان، دەرهێنان، دەرکێشان، دەرهاوردن، دەرهاویشتن. "**اخراج شدن**": دەرکران، دەرهاتن، دەرهێنران.

**اخراجات:** 1) خەرجییەکان. 2) ماڵیات.

**اخراج البلد:** بڕوانە: "تبعید".

**اخراجی:** دەرکراو، وەدەرنراو.

**اخرب:** خراپتر، وێرانتر.

**اخرس:** لاڵ، بێزمان.

**اخروش:** دەنگ و هەرا، هەڵڵا، قەرەباڵغ.

**اخروی:** پەسلانی.

**اخری:** (اُ) دیتر، ئەویدیکە، ئەوی دی، ئیدیکە، ئیدی، ئیتر.

**اخریات:** ئەوانەی لە پلەی ئاخردان.

**اخریان:** کەلوپەل، شمەك، کاڵا، قوماش، کنج.

**اخس:** قڕنیس تر، پیسکەتر، سەقیل تر.

**اخش:** دراو، بەها، نرخ، قیمەت.

**اخشب:** تووڕە، خەست ، زبر، تیر.

**اخشن:** تووڕە، تووڕەتر، زبرتر.





**اخص:** تایبەتی تر، خاسمانی تر، نەمازەیی. هەڵبژێراو، شاز.

**اخصاء:** خەساندن، یەختەکردن.

**اخضع:** خۆشکێن، سەر پێ دانەواندن، سەرپێ شۆڕکردن.سەرشۆڕتر، مل کەچتر، چاوشۆڕتر.

**اخطاء:** هەڵە کردن، سووچ وتاوان کردن.

**اخطار:** 1) خۆخستنە مەترسییەوە. 2) وریاییدان، ئاگادارکردن، ئاگادارکردنەوە، ئاگاداری پێدان، پێ ڕاگەیاندن.

**اخطارنامه:** بڕوانە: "اخطاریه".

**اخطاری:** وریایی پێدراو، ئاگادارکراو.

**اخطاریه:** ئاگانامە، ئاگاداری‌نامە.

**اخفاء:** شاردنەوە، شاردن، وەشاردن، وەشارتن، حەشار، حەشاردان، ڤەشارن، ڤەشارتن ،ڤەشاردن، ڤەسهاندن، بەنهێنی تاقەت کردن .

**اخفار:** پەیمان شکێنی.

**اخفاف:** بارسووك بوون، سەرسووك بوون، سڤك بوون.

**اخفاق:** تێك شکان، شکستی، نسکۆ.

**اخفض:** نزمتر، نەویتر.

**اخفّ:** سووکتر، سڤکتر، کەم کێش تر.

**اخفی:** شاراوەتر، داپۆشراوتر، ڤەشارتی تر. شاردیەوە.

**اخ کردن:** دانی شتێك لەناچاری و بەبێمەیلی.

**اخگر:** سکڵ، سکەڵ، ئەسکڵ، پۆلوو، پۆل، پۆلی، پەرەنگ، پەن، پن، پنگر، پەنگر، پەنگڵ، پشکۆ، ئیژگڵ، کۆز، کۆزر، کۆزرە، خەلاموور، ژیلەمۆ، زیلەمۆ، کلوا، پلۆخ.

**اخلاء:** (اِ) چۆڵکردن، بەتەنیایی دانیشتن، گۆشەگیری، تەریکی.

**اخلاص:** دڵپاکی، نیازپاکی، کارڕاستی، دڵسوزی، یەك روویی، ئەمەگ.

**اخلاصمند:** نیازپاك.

**اخلاف:** (اَ) جێنشینان، میراتگران، بەرماوەگران.

**اخلاف:** (اِ) 1) پەیمان شکێنی، بەڵێن شکێنی. 2) جێگۆڕکێ.

**اخلاق:** ئاکار، رەوشت، گەد، ئەخلاق، سنج، ڤەوینی. 2) (فەلسەفە) ناسین و تاوتوێکردنی بەهاکانی وەك چاکی، خراپی، هەق و ئەرك و هتد.

**اخلاق صوری:** ئاکاری رواڵەتی.

**اخلاق کاری:** هەست بە بەرپرسایەتی کردن لە بەرامبەر ئەرك و دەروەستە کارییەکاندا.

**اخلاقی:** ئاکاری، ئەخلاقی، مۆڕاڵ.

**اخلاقیات:** ئاکارەکان، کۆی مەسەلە و بابەتەکانی پێوەندیدار بە ئاکار.

**اخلال:** تێکدان، شێواندن، ئالوزکرن، زیان گەیاندن و گەندەڵ کردن. کارشکێنی.

**اخلالگر:** تێکدەر، شێوێنەر، ئاژاوەگێڕ.

**اخلالگری:** تێکدەری، ئاژاوەگێڕی.

**اخلص:** دڵپاکتر، خاوێن تر، پاکژتر.

**اخماد:** دامرکاندن، کووژاننەوە.

**اخم کردن:** قۆرتانن، لچ و لێو گرژ کـردن، رووگرژ کردن، روو ترش کردن، گرژبـوون، مڕومۆچ بوون، مۆن بوون، نێوچـاوان تێـك نان، برۆ وێکنان/ تێکنان.

**اخمو:** ڕەزاگران، گرژ، رووگرژ، رووتـرش، رووتـالّ، رووتـەحل، رووڕدژ، خوێنتـالّ، ناوچاوڕەش، ناوچـەوان تـرش، ناوچـەوان دێز، ناوچـەوان گـرژ، ناڤچاڤـ رەش، نـژم شۆڕ، نمرچ، مـۆن، لمـۆڕ، مـڕ، مـڕو مـۆچ، مڕومـووچ، مـچومۆڕ، ملۆمـووچ، مـووچ، مۆچ، مڕومۆن، مرۆزن، مچ، ریچ، دژ.

**اخـم و تخـم:** تـووڕەیی و رووترشـی، رووگرژی.

**اخوانیات:** نامەگەلی دۆستانە بە پـەخشان یان شێعر.

**اخوانیّـت:** هاوڕێیـەتی لـە رێـی گەشـت و عیرفان دا.

**اخـوت:** 1) بوونـەبرا.2) برایـەتی، دۆستایەتی برایانە.

**اخوف:** سامناکتر، ترسێنەرتر.

**اخیر:** دوایین، هەرەدوایین، هێپاشین.

**اخـیراً:** لـە کۆتاییـدا، لەئـەنجام دا، بەتازەیی، لەو/ لەم دواییانەدا.

**اخیرالذکر:** لـە کۆتاییـدا هـاتوو، لـە دوای هەموان باسکراو.

**ادا:** خەمزە، ناز، عیشوە، کریشمە.

**اداء:** بـەجێهێنان، جێهێنـان، جێئـانین، جێبەجێکردن، ئەنجام دان، راپەڕاندن.

**اداءدرآوردن:** دەمەلاسـکە، دمەلاسـکە، دمەلاسکێ، دەم هەلکی، زارزارك، لاسایی، لاساکردنەوە، لائین، کەپوون، ب زارکـرن. (کـسی کـه ادای دیگـران را در مـی‌آورد) کەپوونی.

**اداءدین:** قەرزدانەوە.

**اداءشهادت:** شایەتی دان.

**ادات:** ئامێر، ئـامراز، کەرەسـتە، ئـاموور، ئـالاو. وشـەیەك کـە بەتـەنیا مانـای سەربەخۆی نیـە. "**ادات استفهام**": (ڕێزمـان) ئـامرازی پرسـیار. "**ادات ربـط**": (ڕێزمـان) ئامرازی بەستنەوە.

**ادارات:** کۆی"اداره".

**ادارت:** وەگەڕخستن، گەڕاندن.

**اداره:** 1) بـەڕێوەبردن، هەڵـسووڕاندن، پێـچاران، ڕێڤـەبرن، ئیـدارەکردن، پـێ راگەیـشتن. 2) بەڕێوەبـەری، بەڕێوەبەرایـەتی، کـارگێڕی، فەرمانگـە، مەزرینگـە، دایـرە، ئـۆفیس". "**اداره ثبـت امـلاك**": تـاپۆ، کـارگێڕی قەباڵـەی موڵـك نووسین.

**ادارەجات:** کارگێڕییـەکان، فەرمانگـەکان، رێکخراوەکان.

**ادارەبـازی:** رێـوڕەسمی ئیـداری، فۆرمالیتە.

**اداری:** 1) کـاروبـاری بـەڕێـوەبەرایەتی. 2) تایبەت بە بەڕێوەبـەری. 3) کارمەنـد. 4) وشك و جیددی.

**اداشدن:** جێبـەجێبوون، ئـەنجام دران. 2) دران.

**اداکردن:** بەجێهێنان، ئەنجامدان.





**ادامه(دادن):** 1) درێژە پێدان، درێـژەدان، دانـەدەم، لـە دوادان، دۆمانـدن، دەوام پێـدان، لەسـەر رۆیـشتن، لەسەرچـوون، دەسـت هـەڵنـەگـرتـن، پـێداچـوون. 2) بەردەوامی، پایەداری.

**ادامه پیداکردن:** درێژەکێـشان، خایانـدن، پێچوون، نەبڕان.

**ادب:** 1) وێژە، تـۆر، ئـەدەب. 2) تـەمبێ، سـزا. 3) ئـەدەب کـردن، پـەروەردەکردن. 4) ناسـینی نـەریت و کولتـوور و شـێوازە دروسـتەکانی ژیـان."**ادب آموزنـده**": ئـەدەبی فێرکارانـە/ هونـدەکار. "**ادب اعترافـی**": ئەدەبی دان پیانان. "**ادب تخیلی**": ئـەدەبی خـەیاڵکرد. "**ادب تطبیقـی**": ئـەدەبی بەراوردکار(ی/ انه)، ئـەدەبی جێبـەجێکار. "**ادب تلـویحی**": ئـەدەبی شـاراوە، ئـەدەبی ئاماژەگەرانـە. "**ادب تـودەای**": ئـەدەبی جەماوەری/کۆگەلی. "**ادب چوپانی**": ئەدەبی شـوانی. "**ادب سـرمایەداری**": ئـەدەبی بـورژوازی. "**ادب عامیانـه**": ئـەدەبی رەشۆکییانە. "**ادب غـیر داسـتانی**": ئـەدەبی ناچـیرۆکی. "**ادب کـاربردی**": ئـەدەبی کـاربردی/ دەکـارکردن. "**ادب متعهـد**": ئـەدەبی دەروەسـت(دەرۆسـت). "**ادب مردمی**": ئەدەبی جـەماوەری. "**ادب مـسئول**": ئـەدەبی بەرپرسـیار. "**ادب واقـع گریـز/ ادب گریزگـرا**": ئـەدەبی واقیـع بێـز/ رەتـێن، ئەدەبی دوور واقیع.

**ادباء:** ئەدیبان، هۆزانڤانان، تۆرەڤانان.

**ادبار:** 1) روو وەرگێڕان ، پشت تێکـردن، بەرەودواوەچوون. 2) رۆژرەشی، نـەهاتی، نەهامەتی، بەخت وەرگەڕان.

**ادبارگر:** رۆژڕەش، بەدبەخت.

**ادب آموز:** 1) مامۆسـتا، فێرکـار. 2) شاگرد، قوتابی، فێریار.

**ادب آموزنده:** بڕوانە: " ادب آموز".

**ادب آوازه:** بڕوانە:" بلندآوازە".

**ادب پرور:** هاندەری ئـەدەب، ئـەوەی کـە هۆگری بە ئەدەب و تۆرەوە هەیە.

**ادب خانـه:** 1) قوتابخانـە. 2) مـەبال، ئاودەست.

**ادب دادن:** ئەدەب کردن، تەمێ کردن.

**ادب دارنده:** ئەدیب، وێژەر، بەفەرهـەنگ، هۆگری ئەدەب.

**ادبـستان:** قوتابخانـە، جێگـەی ئـەدەب، پەروەردگە.

**ادب سـنـج:** 1) مـامـۆسـتـا، فـێـرکـار. 2) قوتابی.

**ادب شدن:** 1) پـەروەردەبـوون، بـەئەدەب بوون. 2) تەمێ بوون.

**ادب کده:** پەروەردگە.

**ادب کردن:** 1) پەروەردەکردن، بارهێنـان. 2) تەمێ کردن. 3) رێزگرتن

**ادب گرفتن:** بڕوانە: "تأدب".

**ادبی:** سەربە شێعرو پەخشان، وێژەیی، ئەدەبی. "**فرا ادبی**": سەروو ئەدەبی. "**توافق ادبی**": ڕێککەوتنی ئەدەبی. "**گفتمان ادبی**": ئاخێوی ئەدەبی، گوتەی ئەدەبی. "**مکتب ادبی**": قوتابخانەی ئەدەبی. "**نظریە ادبی**": تیۆری ئەدەبی.

**ادبیات:** وێژە، بێژە، تووره، ئەدەبیات، شێعر و پەخشان. کۆمەڵە نووسراوەیەك سەبارەت بە بابەتێکی تایبەتی.

**ادبیات طلبکارانە:** بریتی لە لێدەو هاواریش بکە.

**ادبیَت:** 1) شارەزایی لە ئەدەبیات و زانستەکانی ئەدەبی. 2) جەوهەرە یان کاکڵی ئەدەبیات.

**ادخار:** پاشەکەوت کردن، هەڵگرتن.

**ادخال:** خستنەناو، تێخستن، تێڕۆکردن، تێنان، بردنە ژوور، دەنێونان، پێداکردن.

**ادخال زدن:** مەزندەکردن، قەبڵاندن.

**ادراج:** 1) تێکەوەپێچان، پێوان، بڕین. 2) خستنەناو. 3) نووسین، تۆمارکردن.

**ادرار خوردن:** مووچە وەرگرتن.

**ادرارداشتن:** 1) پڕبوونی میزەڵدان لە میز، میزهاتن. 2) جیرە و مووچە وەرگرتن.

**ادرارکردن:** 1) میزکردن. 2) دیاریکردنی مووچە.

**ادراری:** میزاوی. تایبەتی میزپێداهاتن.

**ادراك:** 1) تێگەیین، تێگەیشتن، فامین، سەرلێ دەرکردن، ڕێ تێبردن، سەرلێدەرچوون، هەست کردن، پەی پێبردن. 2) (دەروونناسی) پرۆسەیەکی زەینی کە لەودا ئەزموونە هەستپێکراوەکان مانادار دەبێ. 3) وەدەست هێنان. 4) بەروبووم هەڵگرتنەوە.

**ادراك باطنی:** تێگەیینی ناوخۆیی، وەستانی مرۆڤ لە سەر هەست و سۆزە ناوخۆییەکانی.

**ادراك پذیر:** شیاوی تێگەیشتن.

**ادراك حسی:** تێگەیینی هەستێنی، لە رووی سایکۆلۆژییەوە واتە مەعریفەی راستەوخۆ بە شتەکانەوە لە ڕێگەی هەستەکانەوە.

**ادراکی:** سەربە "ادراك".

**ادعا:** ئیدیعاکردن، بانگەشەکردن، لاف لێدان. داواکردن، خوازتن، ئارەزووکردن. دادخوازی، داوەری، داواکردنی شتێ لە کەسێك بە پەنابردنەبەر سەرچاوە یاساییەکان..

**ادعا پذیر:** شیاوی ئیدیعا.

**ادعا کار:** داواکار، داواکەر، داواچی.

**ادعای غبن:** ئاشکراکردنی زیان دیتوویی و فریوخواردوویی لە مامڵەدا.

**ادغام:** لێکدان، تێهەڵکێشان، کردنەیەك.

**ادغم:** مینگن.

**ادفر:** بۆگەن.





**ادق:** وردتر، باریکتر، زراڤتر.

**ادکن:** ڕەنگێ کە ڕەش بنوێنێ، ڕەنگ تاریك.

**ادلاء:** 1) بەڵگەهێنانەوە. 2) شۆڕکردنەوە.

**ادلال:** ناز و کریشمەکردن.

**ادله:** کۆی"دلیل"، بەڵگەکان.

**ادم:** (اُ د) (پزیشکی) ئاوسان.

**ادماج:** پێچانەوە، تێکەوەپێچان.

**ادمان:** 1) کردنی کارێك بە بەردەوامی، لەسەر ڕۆیشتن، پێداگری. 2) شەڕاب خواردنەوە بە بەردەوامی.

**ادناء:** (اَ) کۆی"دنیء" بە مانای کەنەفت و قرنیس. هیچ و پووچ.

**ادناء:** (اِ) نزیك بوونەوە، نزیك کردنەوە.

**ادوات:** 1) ئامێرەکان، ئامرازەکان، کەلوپەل، پێداویستییەکان. 2) (ئەدەبی)ئەو وشانەی بە تەنیایی مانای سەربەخۆیان نییە. 3) فەننەکان، کاروبارەکان.4) هۆکار و ئامرازی کاریگەر لە وەدەستهێنانی شتێك دا."

**ادوار:** قۆناغەکان، چاخەکان، چەرخەکان، خولەکان، گەڕەکان. زەمانەکان، ڕۆژگارەکان.

**ادواری:** دەورەیی، یەکنایەك، بەنۆرە.

**ادوم:** خۆڕاگرتر، بەرگەگرتر، مەندۆخ، هەرمانی.

**ادویه:** هەزوێلە، هەزبێڵە، هەزبێ، ئەزوا، ئەزبۆڵە، ئەزبێ، ئەدوا، چێشتەخۆشکە، چێشتەخۆشە، ئالات و گیای بۆن خۆشی چێشت، بەهارات، ئالات و زەردەچێوە، ئیسیوەت و ئەدوا.

**ادهان:** (اِ) خەیانەت کردن، فێڵ کردن. سابوون لە بەر پێدان، چەورکردن.

**ادیان:** کۆی(دین)، ئایینەکان، ئۆلەکان .

**ادیب:** ئەدیب، وێژەر، وێژەوان، بوێژ، تووره‌وان، نووسەری شێعر و پەخشان. مامۆستا، راهێنەر. رازاوە بە بەها ئەدەبییەکان.

**ادیبانه:** 1) وەك ئەدیبان. 2) ئەدەبی.

**ادیت:** بروانە:"ویرایش".

**ادیتور:** بروانە:"ویراستار".

**اذابه:** تواندنەوە، تاواندنەوە، حەلاندن.

**اذاعه:** ئاشکراکردن، پەخش و بڵاوکردنەوە.

**اذاقه:** پێ چێژتن.

**اذان گو:** بانگبێژ، بانگوێژ، بانگدەر.

**اذعان:** دانپیانان، مل دان، ملکەچکردن، گوێڕایەڵی.

**اذعان کردن:** 1) دانپیانان. 2) بڕواهێنان.

**اذکار:** فێرکردن، هێن کرن، وەبیر هێنانەوە.

**اذلال:** زەلیل کردن، داماوکردن، سووك ونزم کردن، سڤك کرن.

**اذن:** (اِ) ئیزن دان، رێدان، هێشتن، هێڵان.

**اذناب:** 1) ژێردەستەکان، بەندەکان. 2) دەورووبەر.

**اذهاب:** 1) بردنی کەسێك و دوورخستنەوەی. 2) زێرکفت کردن.

**اذهان:** کۆی "ذهن".

**اذی:** ڕەنج وئازار، کول و دەرد، کەد.

**اذیت:** ئازار، جەزرەبە، ئێش، ئەشکەنجە، زیان، چەرمەسەری، کوێرەوەری.

**اژیر:** زیرەك، وریا، وریاکەرەوە.

**ارائە(دادن):** نیشاندان، پیشاندان، هێنانە پێش چاو، نواندن، خستنەروو، پێشکەش کردن. "**ارائەطریق**": ڕێنمایی، ڕێنیشان دان.

**اراجیف:** هەڵیت وپڵیت، قسەگەلی بێهوودە، هەواڵی درۆو هەڵبەستە، درۆو دەلەسە، قسەگەلی ناڕاست و بێبناغە.

**ارادت:** 1) داواکردن، خوازتن. 2) ویست، مەیل.3) قەزا و قەدەر. 4) ئەمەگ و نیاز پاکی لە دۆستایەتیدا. "**ارادت پیداکردن بەکسی**": هۆگری وی بوون و خۆشەویستییەکی گەرموگوڕانە پەیداکردن سەبارەت بەو.

**ارادە:** ئیرادە، ویست، گەرەك، ویستن، خواست، خواستن، خواستە، لێبڕان، دوابڕیار، ئارەزوو، هەمد.

**ارادەآهنین:** ئیرادەی ئاسنین، ئیرادەی پتەو و قایم.

**ارادە الهی:** خواکرد، کاری خوا، ئیرادەی خوا.

**ارادەگرایی:** (فەلسەفە) ئیرادەخوازی، تیۆرییەك کە گۆڕانی ڕەوتی ڕووداوەکان گرێدراو بە ویست و ئیرادەی مرۆڤ دەزانێ و ڕۆڵێکی زۆر گرینگیشی بۆ دادەنێ.

**ارادی:** خۆویست (انە)، خوەخاستی، ئاگایانە. "**غیرارادی**": خۆنەویست(انە).

**اراذل:** لات و لووت، ڕەجاڵەو رووتەوپووتە، دارەدەست.

**اراضی:** 1) زەوییەکان. 2) بەشگەلێك لە وڵات یان گۆی زەوی. "**اراضی آیش**": ئەو زەوییانەی دوای بەروبووم هەڵگرتنەوە بۆ ماوەیەك زرعاتی تێدا ناکەن. "**اراضی انفال**": ئەو زەوییانەی کە تایبەت بە پێشەوا(امام)یە و بۆ کڕین و فرۆشتن نیە. "**اراضی موات**": زەوییە بێخاوەنەکان کە لەودا زرعات و ئاوەدانی نەبێ."**تقسیم اراضی**": دابەشکردنی زەویوزار.

**ارافت:** ڕژتن، ڕشتن، ڕژاندن. میزکردن.

**ارامل:** نەدارەکان، هەژارەکان، سەڵتەکان، ڕەبەنەکان، بێوەژنەکان، بێوە پیاوان.

**ارباب:** 1) سەرۆك، گەورە. 2) خاوەن موڵك، ئاغادێ. 3) یاساداڕێژان، گەورەکان یان پێشەوایانی تایفە یان گروپێك و هتد.4) خاوەن کار و وەستاکاری هێندێ لە کار و پیشەکان. 5) خواکان. 6) سەرقاڵ و خەریك بووان بە کارێك یان بابەتێك.

**ارباب رجوع:** سەردانکەران و داواکارانی کارێ یان بابەتێ.





**ارباب و رعیتی:** 1) سیتمێکی لەسەر بنەمای پێوەندی چەوسێنەرانەی نێوان خان و وەرزێردا، خان و ڕەعییەتی. 2) هەر جۆرە پێوەندییەکی چەوسێنەرانە و زاڵمانە.

**ارباح:** سوودەکان، قازانجەکان.

**اربیتال:** شوێنی لە ئەتۆم یان مولوکول کە لەوانەیە یەك ئیلکترۆنی تێدابێ.

**ارتاج:** بەستن، شەتەك دان.

**ارتباط:** هاتوچۆوتێکەڵی، پێوەندی، کەین ، کەین و بەین، سڕوتڕ. "**در ارتباط با**": سەبارەت بە، لە پێوەندی لەگەڵ، لەمەڕ، لەبەر. "**در این ارتباط**": لەم پێوەندییەدا، لەمبارەوە. "**ارتباط جمعی**": ڕاگەیەن.

**ارتباطات:** 1) ڕاگەیاندن، ئامرازگەلێکی وەك ڕادیۆ و تەلەویزیۆن و ڕۆژنامە کە بە هۆی ئەوانەوە پێوەندی ساز دەبێ. 2) زانستێ کە لە مەڕ تایبەتمەندی یان چۆنیەتی سازبوونی پێوەندیی دەگەڵ کەلوپەلە تایبەتییەکان موتالادەکا.

**ارتباط دادن:** پێوەنددان، گرێدان، بەستنەوە.

**ارتباط داشتن:** 1) هەبوونی پێوەندی. 2) هەبوونی هاتوچۆوتێکەڵی. 3) بوونی خاڵی هاوبەش یان سازگاری لە وتەزا یان بابەتێك دا.

**ارتباط گرفتن:** پێوەندی گرتن.

**ارتباك:** داماوی، تووشی کاری دژوار و سەخت بوون و تێیدا دامان.

**ارتجاء:** هیواداربوون، هیواداری، هێڤیداری، گەشبینی.

**ارتجاج:** 1) لەرزین، جووڵان. 2) شەپۆل لێدانی دەریا. 3) بڕوانە: "اضطراب".

**ارتجاع:** 1) گەڕانەوە، وەگەڕیان، گەڕانەوە سەر دۆخی پێشوو، ڤەزڕان، زڤرین، ڤەزڤڕین، ڤەزڤڕیان. 2) کۆنەپەرستی، کۆنپاریزی، کۆنەپارێزی، دواکەوتوویی، پاشڤەڕۆیی.

**ارتجاعی:** 1) کۆنەپەرست، دواکەوتوو، پاشڤەڕۆ، کەللەکۆن. 2) لاستیك، چیڕ، بەجیڕ.

**ارتجال:** بێ بیرکردنەوە ئاخاوتن، بێ بیرکردنەوە شێعر هۆنینەوە.

**ارتجالی:** سەرپێیی، کاتی، دەمی.

**ارتحال:** 1) کۆچ کردن، بارکردن، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە ڕۆیشتن، جێگۆڕکێ. 2) کۆچی دوایی کردن، کۆچ پووش، وەخەراداڤی کرن، وەخەرکرن، مردن.

**ارتخاء:** خاوبوونەوە، سست بوونەوە، سیس بوونەوە.

**ارتداد:** هەڵگەڕانەوە، لادان لەدین، گەڕانەوە، وەرگەڕان، ڤەگەڕیان.

**ارتداع:** 1) وەستان و خۆبواردن لەکارێك. 2) تێوەچوون.

**ارتزاق:** داوای رۆزی کردن، رسق و رۆزی خواستن، وە دوای رۆزی کەوتن.

**ارتسام:** نەخش بەستن. فەرمان بردن، ملکەچی. نزا کردن. نیشانە.

**ارتشاء:** بەرتیل وەرگرتن، بەرتیل خۆری.

**ارتشاح:** دەلاندن، پالاوتن.

**ارتشاف:** مژین، نۆشین، قوم قوم خواردنەوە. هەلقوراندن.

**ارتشتار:** خەباتکار، جەنگاوەر، شەرکەر.

**ارتصاد:** چاوەرێبوون ، چاوەنواڕبوون، چاڤ نهێربوون.

**ارتضاء:** 1) خۆشحالٚ بوون، شادبوون. 2) پەسندکردن، هەلبژاردن.3) رازیبوون، قایل بوون.

**ارتضاع:** شیر خواردن.

**ارتعاب:** ترسان، نەوێران، ئەترەش چوون، زارەترەك بوون، دلتۆقین.

**ارتعاد:** ئوقرە لێ بڕان، دانەسەکناو، پەشۆکان، راتلەکین، لەرزین.

**ارتعاش:** لەرینەوە، هەلاجن، هەلاجان، هەلاجین، راژانەوە، لەرزین.

**ارتفاع:** 1) هەستان، چوونەسەر، هاتنەسەر. 2) هەلگرتنەوەی خەلە و خەرمان. 3) بەرزی، بەرزایی، بلێندی، بلندایی، چۆڕۆ، سەرەژووره، هەوراز، حەوا.4) مەودای شتێ تا سەر زەوی. 5) داهاتی زەوییە کشتوکالییەکان. 6) مالیات. 7) لابران، لەناوچوون. **"ارتفاع مطلق"**: بەرزایی رەها. **"ارتفاع نسبی"**: بەرزی رێژەیی.

**ارتفاعات:** بەرزاییەکان، کێوەکان، چیاکان.

**ارتفاع سنج:** (فیزیك) بەرزی پێو، ئامرازێ کە بەرزی شوێنێ لە زەوی تا ئاستی دەریای ئازادی پێدەپێون.

**ارتفاع طلبی:** بەرزەفرێ.

**ارتفاع گرفتن:** 1) بە چلەپۆپە گەیشتن، چوونەبان. 2) هەستان، هاتنەبان. 3) ئەندازەگرتنی بەرزایی.

**ارتفاع یاب:** بڕوانە:"ارتفاع سنج".

**ارتفاق:** 1) لە سەر ئانیشك پالدانەوە، ئانیشك دادان. 2) هاوڕێیەتی، سازان. **"ارتفاق بین المللی"**: سنووردارێتییەك کە دەولەتێ لە سنووری خۆیدا بۆ دەولەتێکی تر لەبەرچاوی دەگرێ، وەك دانی هەقی تێپەڕاندنی سپا لە خاکی خۆیەوە بە دەولەتێکی تر.

**ارتقاء:** بەرزبوونەوە، بردنەسەر، چوونە سەر، بەرەوژوورچوون، وەسەرکەوتن، سەرکەوتن. پێشکەوتن.

**ارتقاءآمیز:** چوونەسەری هەنگاوبەهەنگاو، بەرزبوونەوەی پلەبەپلە.

**ارتقاب:** 1) دیدەوانیکردن، زێرەڤانی، خستنە ژێر چاوەدێری، چاوەڕوان بوون. 2) چاوەڕوانی.

**ارتکاب:** 1) دەست پێکردنی کارێك، ئەنجام دانی کارێك. 2) سووچکردن، ئەنجام دانی تاوان لەلایەن کەسێکەوە. 3) سواربوون.





**ارتکاز:** 1) پشت پێبەستن، راگیربوون، جێگیربوون لە زەیندا. 2) سەقامگیری و ئارامی.

**ارتماس:** چوونە ژێرئاو، سەر خستنە ژێر ئاو.

**ارتوا:** تێراوبوون، تێراوی.

**ارتودنسی:** چاککردنی ناتەکووزییەکانی دیان.

**ارتهاب:** تۆقین، زراوچوون، بزدییان.

**ارتهان:** گرێوکردن، بە گرێو وەرگرتن، بە بارمتە وەرگرتن.

**ارتیاب:** شك کردن، گومان کردن، کەوتنەگومانەوە.

**ارتیاح:** 1) شادبوون، پێخوش بوون، ئارام بوون. 2) شادمانی.

**ارتیاض:** چلە کێشان، ئازار کێشان بە مەبەستی فێربوون.

**ارث:** میرات، کەلەپوور، دارایی لە مردگ جێماو، جێماوە، پاشماوەهشتە، مەردەلا، هشتە.

**ارثاً:** لە رێگەی میراتەوە.

**ارث بر:** بڕوانە: "وارث".

**ارثی:** میراتی، مالی میرات.

**ارثیە:** بڕوانە: "ارث".

**ارج:** بەها، رێز، نرخ، وەج. **"ارج نهادن"**: رێزلێگرتن، رێزدانان، حورمەت گرتن، سەنگ لێنان، سەنگ لێنیان، نرخ بۆدانان، نرخ دانان، بەشت زانین، دانپیانان، قەدرگرتن، بە وەج زانین.

**ارجاء:** وەدواخستنی کارێك، هیوادارکردن.

**ارجاع:** 1) گەراندنەوە، گێڕانەوە، ناردنەوە، دانەوە، وێدانەوە.2) سپاردنی کارێ بە کەسێ یان جێیەك. 3) رێنماییکردن بۆ شوێنێ یان سەرچاوەیەك بۆ کۆمەگ یان زانیاری زیاتر.

**ارجاعی:** گەراوە، گەرێندراوە.

**ارجاف:** هەوالی ناڕاست و قسەی درۆ گوتن و وورووژاندن و پەشۆکاندنی خەلك. دەنگۆ.

**ارجح:** چاکتر، باشتر، پەسند تر، خاستر، تەکەستر، جەختتر.

**ارجحیّت:** بڕوانە:"برتری".

**ارجمند:** بەوەج، مرۆی بە نرخ و قەدر، بە پلە و پایە، بەرێز، رێزدار، قەدر گران، زۆر بەرێز و بە قەدر، هێژا، ب بەها، زۆربەنرخ، جێدار.

**ارحال:** ناردن، رەوانەکردن، شاندن، ب رێ کرن.

**ارحم:** بە زەییدارتر، دلسۆزتر.

**ارخاء:** سست وخاوکردنەوە، شل کردنەوە، داهێشتن، داهێلان.

**ارخالق:** سوخمە، جلی ژێر کەوا، ئەخلەخ.

**ارد:** تەکووز، رێسا، دەستوور، بڕیار.

**ارداد:** فریودەر، خلەتێن،خاپێن، فێلباز.

**ارداف:** پێڕەوی کردن، وەدوای کەسێك کەوتن.

**اردام:** مانەوە، پایەدار.

**اردب:** شەڕ.

**اردم:** 1) پیشەو هونەر.2) کەشتییەوانی کارامە.

**اردو:** ئوردوو، کەمپ، چادرگە.

**اردوکشی:** لەشکرکێشی، جووڵاندنی سپا بە مەبەستی شەڕکردن.

**اردوگاه:** 1) ئوردوگا، شوێنێ کە ئوردوی تێدا بەڕێوەدەچێ، کەمپ. 2) (سیاسی) بەرە، کۆمەڵێك لە وڵاتان و حکومەتەکان کە بەپێی بەرژەوەندیی ئابووری یان ئیدئۆلۆژیکی دەکەونە بەرەیەکەوە وەك بەرەی سەرمایەداری و بەرەی سوسیالیستی.

**اردل:** نزمتر، سووکتر.

**ارز:** 1) (ئابووری) دراو، پارەی وڵاتانی دەرەوە. 2) نرخ، بەها. 3) ڕێز. "**ارز تهاتری**": دراوێ کە لە گرێبەستە کاڵابەکاڵاکان دا وەك بناغەی ژمێریاری بە حەساو دێ. "**ارز شناور**": دراوی مەلەوەر، دراوێ کە نرخەکەی دەگۆڕێ بەپێی نرخی ڕۆژ دیاری دەکرێ. "**ارز یوزانس**": دراوێ کە دوای وەرگرتنی کاڵا دەنێردرێ.

**ارزاق:** 1) رسق و ڕۆزییەکان، خواردەمەنی. 2) مووچە، مانگانە، جیرە.

**ارزان:** 1) هەرزان، هەرزان بایی، کەم نرخ، مەلاخۆر، مەلاخۆرە. 2) بێ نرخ، بێ ڕێز.

**ارزانی:** 1) هەرزانی، فرەهی، شت زۆری. 2) شیاو، شایان. "**ارزانی داشتن/ کردن**": بەخشین، پێدان. "**ارزانی کسی بودن**": پێشکەش و بەشی وی بوون.

**ارزش:** 1) بەها، بایەخ، نرخ، هێنەر، هێژایی، هەژین. 2) گرینگی، گرینگیەتی. 3) شیاوی، وەشیانەوە، لێهاتوویی، ژێهاتوویی، هێژایی. 4) پلەوپایە. "**ارزش ارزشها**": بەهای بەهاکان.

**ارزش اسمی(صوری):** نرخی سەر گەڵا نرخدارەکان یان سککەکان.

**ارزش افزوده:** زێدەبایی.

**ارزش دار:** بڕوانە "ارزندە".

**ارزش دارد:** دەژی، ئەژی، دەمێنێ، نامرێ.

**ارزش زدایی:** بەهاسڕینەوە.

**ارزش ذاتی:** (ئابووری) نرخی ڕاستەقینەی کاڵا یان خەدەمات بەبێ ئەوەی کەوتبێتە دۆخێکی تایبەتییەوە.

**ارزش سنجی:** بڕوانە: "ارزیابی".

**ارزش قایل شدن:** بەهابۆدانان، نرخ بۆ دانان.

**ارزشکاهی:** دابەزینی فەرمی نرخی پارە، هاتنەخواری نرخی بەرابەری پووڵ.

**ارزش گذاری:** 1) بەهادانان، نرخ دانان.2) هەڵسەنگاندن، بەراوردکردن.

**ارزشگرایی:** بەهاخوازی.

**ارزش مبادلەای:** نرخی کاڵا یان خەدەمات لەکاتی ئاڵوگۆڕدا.

**ارزشمند:** نرخدار، بەنرخ، بەهادار، باییدار، قیمەت دار، بەقیمەت، کوك. هێژا، هەژی، هاولە، حەلکی، کاو. بەڕێز، ڕێزدار.

**ارزشی:** 1) بەهایی. 2) بەهادار، بەنرخ.





**ارزشیابی:** بڕوانە: "ارزیابی".

**ارزمند:** بڕوانە:"ارزشمند".

**ارزن از دست کسی نریختن:** بریتی لە فرە قرنیس بوون یان دەست قووچاو بوون.

**ارزنده:** 1) بەبەها، بەهادار، بایەخدار، بەنرخ، بەبایەخ، نایەب، نایاب. 2) بەڕێز، ڕێزدار، بەحورمەت.

**ارزیاب:** خەملێنەر، نرخێنەر، قەرسێنەر، هەڵسەنگێنەر.

**ارزیابنده:** بڕوانە: "ارزیاب".

**ارزیابی:** خەملان، قەرسان، قرسان، بەراورد، هەڵسەنگان، سەنگان، تەخمین، قەبڵ، قەبەڵ، خەمڵ.

**ارزیابی کردن:** هەڵسەنگاندن، هەڵسەنگانن، سەنگاندن، سەنگانن، تەخمین کردن، بەراورد کردن، نرخ بۆ دیاری کردن، نرخاندن، نرخ بڕین، قیمەت بۆدانان، قەرساندن، قەبڵاندن، قەبڵانن، قەولانن، قەبەڵنای، هەسباندن، خەملاندن، خەمڵ کردن، هێژاندن، نقراندن، کرێشەیش، گومان بردن، واتێگەیشتن.

**ارزیافت:** ئاکامی هەڵسەنگاندن.

**ارزیدن:** 1) بایەخداربوون، بەهاداربوون. 2) شیاوبوون، شایان بوون، هێنان، هەژیان، هێژان.

**ارسال:** 1) گەیاندن، گەهاندن، ناردن، هەناردن، بەڕێ کردن، شاندن، ڕەوانەکردن. 2) ئازادکردن، داهێڵان، دانان.

**ارسنال:** جبەخانە، کارخانەی چەك سازی.

**ارس و پرس:** پرسیار و وڵام.

**ارش:** 1) بڕوانە:"دیە". 2) جیاوازی نێوان نرخی ڕاست و ناڕاست کە دەبێ فرۆشیار بە کڕیاری بڵێ.

**ارشاء:** بەرتیل دان.

**ارشاد:** 1) ڕێنوێنی کردن، ڕێ نیشاندان، ڕابەری کردن. 2) ڕێنوێنی، ڕابەری.

**ارشد:** لە پێشتر، گەورەتر، ئازاتر، باڵادەس.

**ارصاد:** چاوەدێری، لە بۆسەدا دانیشتن. روانین.

**ارض:** زەوی. سەرزەوی، شار، وڵات.

**ارضاء:** ڕازیکردن، قایلکردن، مل پێدان.

**ارضاشدن:** 1) ئاوهاتنەوە، ڕەحەت بوون، کاژێری. 2) ڕازیبوون، قایل بوون.

**ارضانشدنی:** تێرنەخۆر، چاوبرسی.

**ارضاع:** شیردان، مەمك پێدان.

**ارعاء:** 1) لەوەڕاندن. 2) بەزەیی پێداهاتن، گوێ دان بە قسەی کەسێك، بەخشین.

**ارعاب:** تۆقاندن، ترساندن، ترسانن، ترس وەبەرنان، زراوبردن، زراوچواندن، بزداندن.

**ارعاد:** 1) ترساندن، هەڕەشە لێکردن،لەراندنەوە. 2) لەرینەوە، لەرزەگرتن .3) برووسکەلێدان، هەورەتریشقە.

**ارعن:** نەزان، کەم فام، گێل، خەشۆ.

**ارغــاب:** هانــدان، دنــەدان، ســیخ دان، بزوانــدن، وەئارەزووهێنــان، وەهــەوەس خستن.

**ارغام:** خۆڵاویکردن. چووك كـردن، تێك شكاندن. ناچار كردن.

**ارغد:** دلگرتر، پەسندتر، فرەوانتر.

**ارغشتك:** هەڵبەزدابـەزو هەڵپـەڕكێ، پـل لێدان، چەقەنە.

**ارغنده:** تووڕە، رق هەستاو، بەڕك.

**ارغیدن:** 1) تـووڕەبـوون، هـەڵچوون. 2) ئاژاوەنانەوە، پشێوی نانەوە. "**ارغیده**": بڕوانە: "ارغنده".

**ارفاق:** 1) سـودگەیاندن بـە كەسـێك، بەزیادەوەحـسێب كــردن. 2) نــەرمی نوانـدن، هـەڵكردن، بـە نـەرمی هـەڵس و كەوت كردن. 3) بە زەیی پێداهاتنەوە.

**ارفاه:** 1) ئـۆقرەگرتن، بێخـەم بـوون، ئاسوودەبـوون، لـە نـازو نێعمەتـدابوون. 2) ئاسوودەیی، راحەتی.

**ارفع:** بــەرزتر، بڵێنــدتر، بــەڕێزتر، پایەبەرزتر.

**ارقاب:** دانی ماڵ یان كەلوپەل بە كەسێك بە مەرج.

**ارقام:** 1) كـۆی"رقـم"، ژمارەكـان. 2) كاڵاكـــان، شـــتومەكەكان. 3) فەرمانەكان، بڕیارەكان، نامـەكان. "**ارقام نجومی**": ژمارە فرە گەورەكان.

**ارقش:** بەڵەك، خاڵخاڵی سپیو رەش لـە مرۆڤـ یان لە ماڵات دا.

**ارقط:** رەشـی تێكـەڵاو بەسـپی، كـونچ، جنجیر، چیل.

**اركـان:**1) كــۆی"ركــن"، بناغــەكان، بڕبڕەكان، كۆڵەكەكان. 2) بنەما، بنـچینە. 3) كەسایەتییە هەڵكەوتەكان.

**اركان اربعه:** مەبەست چوار بناغەی (با.خاك.ئاو.ئاور)ە.

**اركان جملـه:** (ئـەدەبی) ئـەو وشانەی بـە لابردنیان رسـتە مانـای تـەواوی خـۆی لـە دەست دەدا.

**اركــان حــرب:** بارەگـا، بنكـە، سـتادی ئەرتەش.

**اركان دولت:** لێپرسـراوان ودەسـەڵاتدارانی دەوڵەت، پیاوانی دەوڵەت.

**اركانی:** جەستەیی، ماددی، توخمی.

**ارگاسم:** ئەوپەڕی چێژی سێكسی.

**ارگان:** كارمەند. ئەنـدام، ئـامراز، هۆكـار، ئـامراز و كەرەسـەیەك بـۆ گەیـشتن بـە ئامانجێكی دیاریكراو. ئەندام یان لایەنگری حیزبێكی سیاسی. بڵاوكراوەی حیزب یـان رێكخراوێكی تایبـەتی، ئۆرگـان. رێكخـراو، بنیات.

**ارگانیزه:** پێك هێنراو، رێكخـراو، تـەكووز كراو، تەیار و رێك.

**ارگانیسم:** ئـەو پـاژ و ئەنـدام گەلـەی كـە جەستەی بوونـەوەرێك پێـك دێـنن، لـەش، جەستە، قاڵب.

**ارگانیك:** ئۆرگانیك، لەشگۆنە.





**ارمان:** بڕوانە: (آرمان).

**ارمد:** 1) تـووشـبـوو بـە چـاوئـێشـە. 2) دەردكێش، ئێشدار.

**ارمگان:** راهێنەر، فێركار، مامۆستا.

**ارمغــان:** سـڵامانە، سـەوقات، سـەوقاتی، دیاری، پێشكەش.

**ارمل:** بێوەپیاو، پیاوی بێ ژن.

**ارمله:** بێوەژن.

**ارمنده:** بڕوانە:"مصون".

**ارمیدن:** بڕوانە: "آرمیدن".

**ارمیده:** بڕوانە: "آرمیده".

**ارندان:** حاشا، نكۆڵی.

**ارواء:** تێراو كردن، پـاراوكردن، ئـاودێری، داشتن.

**ارواح:** روحەكان. "**ارواح سفلی**": بوونەوەرە خـــاكی و زەوینییـــەكان. "**ارواح علــــوی**": بوونەوەرە ئاسمانییەكان.

**اروس:** كاڵا، كەلوپـەل.

**اروش:** جەریمە، تاوان.

**اروغ:** بنەماڵــــە، بنـــەماڵ، خانـــەدان، گەورەماڵ، كەس وكار، ماڵبات.

**اروم:** بن، ئاخری.

**اروند:** 1) ئەزموون، تاقیكاری. 2) رەنـج، ئارەزوو، عەزرەت. 3) جادوو. 4) رووبـاری لە سنووری ئێران و عێراق.

**ارهــــاب:** 1) تۆقانـــدن، ترســـاندن، بزداندن.2) توندوتیژی. 3) تیرۆر.

**ارهــاص:** مـۆرە، چـینەی دیـواری قـوڕ، دانانی دیوار بە قوڕ، بنیات نان، ئاڤاكرن.

**ارهــاق:** 1) پێگەیانـدن، گەیاندنـە ئاسـتی باڵغ بـوون.2) ماندووكردن، كەنـەفتكردن. 3) وەدواخـستنی نوێـژ. 4) ناچـاركردنی كەسێك بەئەنجامدانی كارێك.

**اریــب:** (آ) ژیــر، ئاقــڵ، زانــا، شــارەزا، كارامە، ئاگا، وریا.

**اریــب:** (اُ) تـیلاو تیـل، لاتـڕ قـەوچ، لاتـڕ قەوچـە، لاتــڕ قەوچــەڵفاچ، پێــچەڵپاچ، قیلەوقاچ، قیلەوقاج، قیلـەوقانج، قیرقـاج، قیرقـاچ، قیروقـاچ، فاچـەڵ فـیچ، پـێچ و پلۆچ، خوار و خێچ، خـواربڕاو، چـەفتوور، شەفتوور، شەفتوول، شـەتوور، چـەماوە، دۆلكـان، خوارەكـەو پێـچەكە، ئالوزبـالوز، لاولا.

**اریــج:** بـۆنی خـۆش، هەڵمـژینی بـۆنی خۆش.

**اریحــی:** خــۆش خولّــق، شــادمان، خۆشحاڵ، رووگەش. جوامێر.

**اریحیّت:** 1) خـۆش خـولّقی، شـادمانی، كێف خوەشی. 2) جوامێری.

**اریــس:** 1) زرەنـگ، وشـیار.2) وەرزیـر، جووتێر، جووتكار.

**اریــستوكرات:** ئەریـستۆكرات، لایـەنگری ئەریـستۆكراسی، لایـەنگری ئەشـراف و خاوەن سامانەكان، حكوومەت یان چینێك كە نوێنەرایەتی كەمینەیەكی نـەجیب زادە دەكــــەن، ئەریــــستۆكراتیش دژی دیمۆكراسییەتە.

**اریش:** زیرەك، وشیار، بەئاوەز.

**اریغ:** بڕوانە: "آریغ".

**از:** لە، ل، ژ، جە.

**ازاء:** بەرامبەر، بەرانبەر، حاست، هەمبەر.

**ازاحت:** دوورخستنەوە، لابردن، نەهێڵان، لەناوبردن.

**ازار بستن:** 1) شەرواڵ دەبەرکردن. 2) بڕوانە: راستەشدن".

**ازالت:** بڕوانە: "ازاله".

**ازاله:** لابردن، لەناو بردن، تەفروتووناکردن، نەهێشتن، دوورخستنەوە.

**ازبر:** لەبەر، ئەزبەر، ژبەر، دەرخ، بێکتێب زانین. "**ازبرداشتن**": لەبەربوون، لە بیرگە دابوونی بابەتێك. "**ازبرکردن**": لەبەر کردن، خستنە بیرگەوە، فێربوونی بێ نووسراو، گرتنەدڵ ولەبیرنەکردن.

**ازبین بردن:** لە ناوبردن، لە بەین بردن، تیابردن، نەهێشتن، هیچ بۆ نەهێشتن، قەلهاندن، توونا کردن، تەفرو تووناکردن، قڕتێخستن، ژناقبرن، ناوابردن، بەربادکردن، هەرژاندن، هەڕشاندن، هەڕشتن، هەڕشین.

**ازبین رفتن:** لە بەین چوون، لە ناو چوون، تەفروتوونابوون، تیاچوون، شۆنەوارنەمان، قەلهین.

**از پا افتادن:** 1) ماندووبوون بە هۆی رۆیشتنی زۆرەوە، لەپێکەوتن. 2) لە کار کەوتن، لاوازبوون.

**ازپاداشتن:** بڕوانە: "برپاداشتن".

**از پای درآوردن:** 1) تێك شکاندن. 2) کوشتن، لەناوبردن.

**از پای ننشستن:** دەست لە کار و چالاکی نەکێشان تا گەیشتن بە ئامانج، کۆڵنەدان.

**ازپی درآمدن:** بە دوا داهاتن.

**از ثمر افتادن:** لەبەرچوون، چیتر بەرنەدان، قسربوون.

**از جا در رفتن:** 1) چرتان، لەجێچوون، لەجێدەرچوون، ترازان، لەگەچوون. 2) تووڕەبوون، رق هەستان.

**از جا رفتن:** لەرزۆك بوون، لەرزین، خلیسکان. گوێزرانەوە.

**از جان گذشتگی:** بڕوانە: " از خود گذشتگی".

**ازجنگ برگشته:** 1) فرە کۆن و شڕ. 2) خاوەنی رەوشی نالەبار و ئاڵۆز، لە شەڕ گەڕاوە.

**ازچشم افتادن:** لەبەرچاوکەوتن، قێز لێ هاتنەوە، بۆڕۆلێکردن، لەبەربێزان، لەبەربێزران، بێزران، بێزان، بێزیان، بێزیای، نگریس بوون.

**ازحاف:** گەیشتن بە دواهەمین ئامانج(دڵخوان)، ماندووبوون.

**ازحال رفتن:** لە خۆبوونەوە، بوورانەوە، داریانەوە، دڵ لە خۆچوون، دڵ بوورین، لەسەرەخۆچوون، لەهۆش چوون، بێهۆش بوون.





**ازحدگذشتن:** ئەنگران، هەنگران، پەڕهەڵاویشتن، لە ئەندازە دەرچوون، لە رادەبەدەر.

**ازخودبیگانگی:** لەخۆنامۆبوون، لەخۆنامۆیی.

**از خود راضی:** بڕوانە: "خودخواه".

**از خود رفتن:** بێهۆش بوون، لە هۆش چوون.

**ازخودشدن:** بڕوانە: "از حال رفتن".

**ازخودگذشتگی:** لەخۆبوردوویی، خۆ لەبیر چوونەوە بۆ کارێك.

**ازخودگذشتن:** لەخۆبوردن، دەست لە ژیان بەردان بۆ ئامانجێك. "**ازخودگذشته**": لەخۆبوردوو، دەست لە ژیان هەڵگرتوو.

**ازدحام:** ئاپۆڕە، حەشامات، کۆمای خەڵك، جمە، جمکوت، تێچڕان، تێچڕژان، قەرەپەستان، پڕایی زۆری خەڵك، قەرەباڵغ، قەڵەباڵغ، چڕە، چڕەبەندان، گورمۆڕە، هێرشکردن، گژگژ، خلەپۆرت.

**ازدر:** شیاو، هێژا، ژهەژی، ژێهاتی.

**از دست بردن:** لە هۆش بردن، بێهۆش کردن.

**از دست بر گرفتن:** تەفر و توونا کردن.

**از دست دادن:** لە دەست دان، لە دەست چوون، ون کردن.

**ازدست رفتن:** لەکیس چوون، لەقیس چوون، لە دەست دان، لەدەست دەرچوون، لە دەس چوون، فەوتان، نەمان، فەلتین.

**ازدلاف:** پێشکەوتن، کەوتنەپێش، نزیك بوونەوە.

**از دنیا بی‌خبر:** بێئەزموون و بێ ئاگا، بێ ئاگا لە دنیا.

**ازدواج:** جووت بوون، جووت گرتن، زەوجین، ژن هێنان، ژن هاوردن، شووکردن، ژن ومێردایەتی، ئاوێتەبوون، پێکهێنانی ژیانی هاوبەش، زەهاسە.

**ازدیاد:** 1) زیادبوون، زۆربوون، پەرەسەندن، پتربوون. 2) زۆرکردن، پترکردن.

**ازدهار:** درەوشان، رووناك بوون، شادبوون، گەشانەوە.

**ازدهن دررفتن:** لەدەم ترازان، لەزارترازان.

**از رواج افتادن:** لەبرەوکەوتن، مۆرەبەسەرچوون.

**از رواج انداختن:** لەبرەو خستن، بێڕەمێن کردن، مەراشتن.

**از رو بردن:** رووشکاندن، رووشکێنی، تەریق کردنەوە.

**ازسرگرفتن:** نوێکردنەوە، لەسەرڕا دەسپێکردنەوە.

**از شرم سرخ شدن:** سووورداگەڕان، سووورداگەڕیان، سووورداگیرسان، لە شەرمان سووربوون.

**ازعاج:** 1) وەڕەزکردن، جاڕزکردن، بێزارکردن، بزواندن، ئۆقرەلێ بڕین، هەڵساندن، هەراسان کردن. 2) وەڕەزبوون، سەخڵەت بوون. 3) دەرکردن.

**ازعز) و جز:** پارانەوە و لالآنەوە.

**ازعهده‌برآمدن:** لەعۆدە هاتن، لە گۆڕ هاتن، دەخۆڕاپەرمون، دەخۆڕادیتن، توانای پێکهێنان لە خۆدا دیتن، دەست هاتن، لە ئەستۆهاتن، دەرەقەت هاتن، باشارهاتن، پێوێران، دەرۆست هاتن، هێگن.

**ازکارافتادن:** لەکارکەوتن، لەکارکەفتن، ژکارکەتن، پەك کەوتن، خراوبوون، لەکەڵك بڕان، بێکەڵك بوون، لەبەهرەکەوتن، داکەفتن، داکەوتن، بەکەرەم نەمان.

**ازکارافتاده:** ئارفتە، لەکارتە، لە کار کەوتە، لەکار کەفتگ، کەفتەکار، پەك کەوتە، کەڵك بڕاو، لەکەڵك بڕان، ژمێزکەتی، خەسپان، کەرخەسپال، زورهان، بکێرنەهاتی، خراپ.

**ازکارانداختن:** لەگەڕخستن، لەکارخستن، ژکارخستن، خراوکردن، پەك خستن، هەلساندن، بێ بەهرەکردن.

**ازکاربرکناركردن:** لێخستن، لەسەرکار لابردن/ لادان.

**ازکی:** پاکتر، خاوێنتر.

**ازگات:** دڵ پیس، دل ب گومان، بەدکار.

**ازلّ:** خێرا، بەلەز، بەپەلە.

**ازلاد:** بنەڕەتی، بنچینەیی.

**ازلال:** هەڵخلیسکاندن، خلیسکاندن، خزاندن، خشکاندن، زەلاندن، هەڵداشتن، لە ڕێگەکلاکردن.

**ازلی:** هەربوو، بێ پێشینە، هەر بووگ، هەمیشەیی، بێسەرەتا، کۆنینە، نەمر.

**ازلیات:** بوونەوەرە نەمرەکان.

**ازلیّت:** هەتاهەتایی، هەربوون، نەمری.

**ازمان:** (اِ) کۆنەبوون، لەمێژینەبوون.

**ازمان:** (اَ) کۆی"زمن"، کاتەکان، ڕۆژگارەکان.

**ازمراقبت بی نیازشدن:** لەخەم رستن، لەخەم رەخسین، لە خەم رەخسان، پێگەیشتن، بێمنەت بوون.

**ازمه:** 1) کۆی"زمام"، هەوسارەکان، ئەوسارەکان. 2) تەنگوچەڵەمە، تەنگانە.

**از نطق بازماندن:** دەم چوونە کلێلە، قسەبۆنەهاتن، زار رەق بوون، شاش مان.

**ازهار:** (اِ) 1) چرۆدەرکردن، شکۆفیانەوە.2) هەڵکردنی ئاور.

**ازهاق:** 1) سەرکردن، تێپەڕاندنی تیر لە نیشانە، پەلەکردن لە رەفتاردا. 2) بێسەروشوێن کردن.

**ازهم بازکردن:** هەڵوەشاندن، هەڵوەشانن، هەڵشاندن، هل ڤەشاندن، لێك بڵاوکردن.

**ازهم پاشیدن:** تێکدان و لە کار خستن، پرۆسکان، لە بەریەك هەڵوەشان، لەبەریەك بڵاوبوون، لێك بڵاوبوون، هەراش بوون، دارزان.

**ازهم جدا شدن:** دابڕان، لەت بوون، جیابوونەوە، جودابوونەوە، لێك جیابوونەوە، لێك هەڵبڕان، لەیەك بوون، لێکبوون، لەیەك بەربوون، لێك ڤەبوون، لێك ترازان، هەڵ وەژێران.





**ازهم جداکردن:** لە یەك بەردان، (لێك/ لەیەك) جیاکردنەوە، هەڵاوێران، هەڵاواردن، هەڵ وەژاردن، لەت کردن، دابڕاندن، لەیەك بەردان، ترازاندن.

**ازهم دررفتن:** ترازان، جیا بوونەوە، لێك کلابوون، لەگرێژەنە دەرچوون، لەرێسمە دەرچوون.

**از هم گذشتن:** 1) تێپەڕین لە بەرامبەر یەکترەوە. 2) جیابوونەوە. 3) مردن، کۆچی‌دوایی‌کردن.

**ازهم گسستن:** لێك بوونەوە، پچڕان، چڕان، لێك ترازان، لەبەریەك هەڵوەشان، لەبەریەك بەربوون، لەبەریەك پچڕان، لەبەریەك چوون ، لەبەریەك رەوینەوە، هەڵ تەقان، هەڵتەقیان، هەڵتەقین، هلشیان، هلشین، هەڵوەشانەوە، هەڵوەشینەوە.

**ازهم گسیخته:** لە بەر یەك هەڵوەشاو، ڕێزاڵ بووگ، هەراش هەراش.

**ازهم وارفتن:** لە بەریەك چوون، لە بەریەك هەڵپچکڕان.

**ازیرا:** چونکی، چونکو، چمکی، ژبەرکو.

**اژکهن:** تەمبەڵ، سست.

**اسائت:** بڕوانە: "اسائه".

**اسائه:** خراپەکردن، خراپەکاری.

**"اسائه‌ادب کردن":** بێئەدەبی کردن.

**اساتید:** مامۆستایان.

**اسارت:** ئەسیری، یەخسیری، دیلی، دیلیەتی، هێشیرێنی، بەردەستی.

**اسارت بار:** بوونە هۆی یەخسیری و سووکێتی.

**اسارت گاه:** بەندیخانە، دیلگە، شوێنی راگرتنی یەخسیران.

**اساس:** بناغە، بناخە، بنەڕەت، هیم، شیشك، بنگەه، خیم، بنەما، بنچینە، بنە، سۆکین، بنەڕەخ، کورۆك، بارخانو، بارخانی، رەگ و ریشە، بنێشە، تین.

**اساساً:** 1) لە بناغەڕا، لە بنەڕەتەوە. 2) بەهیچ کلۆنجێك.

**اساس افکندن:** بناخەدانان، بناغەداڕشتن.

**اساسن:** بکوژ، کوژەر، مرۆکوژ.

**اساسنامه:** پێڕەو، ئەو خاڵ و ماددانەی کە بۆ پێکهێنانی کۆمپانیا یان حیزب یان ئەنجومەنێك گەڵاڵە دەکرێن.

**اساس نهادن:** بناخەداڕشتن، بنچینەدانان، هیم دانان، ڤەنانن.

**اساسی:** بنەڕەتی، بنچینەیی،بناغەیی، بنەمایی، بنیاتی، بنگەهی، هیمی، بنێشەیی.

**اساطیر:** ئوستوورەکان، ئەفسانەکان، چیرۆکە خەیاڵییەکان.

**اساطیری:** ئەفسانەیی، ئوستوورەیی.

**اسافل:** چینەکانی خوارەوەی کۆمەڵ. 2) کەسانی پەست و نزم. 3) کۆئەندامی جووت بوون.

**اسامی:** کۆی"اسم".
**اسباب:** (اَ) کـۆی"سـبب"، کەلوپەلـەکان. پێداویـــستییەکان. ئامرازەکــــان. هۆکارەکـان. کۆئەنـدامی جـووت بـوونی پیاو.
**اسباب:** (اَ.بِ) هۆی. "**اسباب دست کـردن**": لـە یەکێکی دی وەك ئامراز کەڵك وەرگـتن بـۆ گەیشتنن بە ئامانجـەکان. "**اسباب صورت**": پاژەکانی دەموچاو.
**اســباب بـــازی:** کایـــەکلێ، لیـــستۆك، لەیستۆك، لەیزتۆك، لەیزۆك، بووکەڵە.
**اسباب چینی:** پیلان گێڕان.
**اسباغ:** کۆتایی هێنان، تەواوکردن.
**اسب افکن:** پاڵەوان، ئازا، بەهێز.
**اسبال:** بـاران بـارین، فرمێـسك رژانـدن، رشتنی ئاو.
**اســب تـــازی:** 1) تـاودانـی ئـەسـپ. 2) فرەوێژی، فیشاڵ، هاشوهووش.
**اسب دوانی:** شەڕانخێوی، شەڕناخێوی.
**اسبق:** پێشتر، پێشووتر، بەرتر.
**اسپرانتو:** زمـانی قـەراردادی، یـەکێك لـە زمانە دەستکردە نێونەتەوەییـەکان کـە ڕێزمانەکـــەی زۆر ئاســـانە و لـــە ســـاڵی 1887ی زایینــــی لەلایــــەن دوکتـــــور (زامنهوف)ەوە داڕێژراوە.
**اسپردن:** بڕوانە: "سپردن".
**اسپرم:** تۆو، شاوەت.
**اسپسیال:** تایبەت، تایبەتی، خاسمانی.
**اسپیراسیون:** (پزیشکی) هەڵمـژین، ڕێگـای دەم.
**اســـپیریت:** کەسـێك کــە خـــەریکی ئیسپیریتیسمە.
**اسپیریتیـــسم:** زانـستی بـانگ کردنـی روحـــەکان، بنـــەماکانی بانگهێـــشتی روحـەکان، ئیـدیعای پێوەنـدی دەگـەڵ روحەکان.
**اســـــتئناف:** دەس پێکردنـــــەوە، تێهەڵچوونەوە.
**استاتیك:** 1) نـەگۆڕ، لە گـۆڕ نـەهاتوو. 2) زانستی ڕاگرتن و قایم کردن.
**استاخ:** دلێر، ئازا، بوێر، زیخ، چەلەنگ.
**اسـتاد:** مامۆسـتا، فێرکـار، ویـڕا، زانـەر، ڕاهێنەر، وەستا، هۆستا، هۆستە.
**استادباشی:** سەروەستا، سەرهۆستا.
**اسـتادی:** مامۆسـتایەتی، مامۆسـایەتی، دەسـت ڕەنگینـی، وەسـتایی، هۆسـتایی، زانەری، زانایی لەکار، هونەرمەندی.
**استادیار:** مامۆستای یاریدەدەر.
**استادیوم:** یاریگا، ستادیۆم، هۆڵ.
**اسـتارت:** 1) دەسـپێك، دەس پێکـردن، بـزوتن، وەجووڵەخـستن، وەڕێخـستن، خستنەگەڕ. 2) ئامێری هەڵکردنی ماشێن.
**استارتر:** دەسپێکەر.
**استاسیون:** وێستگە، شوێنی وەستان.
**استام:** خاترجەمی، پشت گەرمی.





**اســتان:** 1) شـوێن، شـوێنی وەسـتان، شـوێنی نیـشتەجێبوون. 2) پارێزگـە، پارێزگەه، پارێزگا.
**اســـتاندار:** پارێزگـــار، دەســـەڵاتداری پارێزگەیەك.
**اســـتاندارد:** سـتاندار، نموونـە، ڕێـسا، بنەما، پێوانە، پێوەر.
**استانداری:** پارێزگا. شوێنی پارێزگا.
**استاندن:** بڕوانە: "ستاندن".
**استانده:** پێوەر، پێوانە.
**استانیدن:** ڕاوەستاندن، ڕاگرتن.
**استبداد:** سەرەڕۆیی، ملهوڕی، زۆرداری، ستەمکاری، کەڵەگایی.
**استبداع:** بە نوێ و سەرسوڕهێن زانین.
**استبدال:** بـەدەڵ وەرگرتنـەوە، ویـستنی شتێك بە جێی شتێکیدی، گۆڕینـەوە، لـە جیاتیان ویستی.
**استبسال:** خوازیاری مەرگ بـوون، مـەرگ خواسـتن، ڕازیبـوون بـە مـەرگ. ئازایـەتی نواندن.
**استبشار:** 1) شـادبوون، پرسـینی هـەواڵی خۆش. 2) شادمانی، ڕووخۆشی.
**اســتبـــصار:** 1) ســـۆمایی خـــوازتن، بینابوون.2) سۆمایی، بینایی، چاوتیژی.
**اسـتبطاء:** دێرکـردن، درەنـگ کـردن، وەدرەنگی خستن، خۆگنخاندن.
**استبعاد:** 1) بەدوورزانین، دوورکەوتنەوە، دووری خوازتن.2) دووری.
**اسـتبقاء:** هێـشتنەوە، بـاقی هێـشتنەوە، خوازیاری مانەوەی شتێك.
**استتابە:** تۆبەخوازتن، داوای تۆبە کردن.
**اســتتار:** 1) خۆشـاردنەوە، خۆداپۆشـین، خۆ حەشاردان. 2) شـاردنەوە، داپۆشـین. 3) داپۆشراوی.
**اســتتام:** گـشت خواسـتن. تـەواوکردن، کۆتاییهێنان.
**اســـتتباب:** جێگیربـــوون، دامەزرانـــدن، ساوکەبوون، ئاکنجیبوون.
**اســتتباع:** 1) پێـڕەوی خـوازتن، پێـڕەوی کردن. 2) جێنشینی.
**استتیك:** زانستی جوانکاری، جوانیناسی، بەگـشتی لـە جـوانی و هونـەر و ئـەو هەســـتانەش دەکۆڵێتـــەوە کـــە جـــوانی دەخەنە ناو دەروونەوە.
**استثقال:** بە قورس زانین.
**اســــتثمار:** 1) بـــەرخوازتن، میـــوە لێکردنـــــەوە، وەبەرهـــــەم هێنـــــان، وەبـەرهـێنـــان، ڕەنیوهێنـان، ســـوود وەرگـــرتـن. 2) چەوساندنەوە، زێراندن، چمساندن.
**اســـــتثمارآمیز:** چەوســـــێنەرانە، کەڵکاژۆیانە.
**استثمارگر:** چەوسێن، چەوسێنەر.
**اســتثناء:** 1) ئــاوارتن، هـــەڵاواردن، هـــاوێرکردن، نـــاوازەکردن، جیاکـــاری، جیـــاکردنەوە، دەرهاویـشتن، دەرکـردن. 2) ئاوارتـــــە، هـــــەڵاوێردە، هـــــاوێر، دەرهاویشتە، ڕیزپەڕ. 3) جگە، بێجگە.

**استثنایی:** ئاوارتەیی، ریزپەڕی، دەگمەن، ناوازە، تایبەتی، کەم وێنە، هەڵکەوتە، جەبە، جیا.

**استجابت:** 1) وەڵام دانەوە، قبووڵ کردن، بەدەنگەوەهاتن، پەژراندن، رەواکردن. 2) قبوولبوون، گیرابوون. 3) وەڵام خوازتن، لێپرسین، پێدرکاندن.

**استجاره:** ئەمان خواستن، پەنابردنەبەر، ئیجارەکردن.

**استجازه:** ئیزن خوازتن، داوای ئیزن کردن.

**استجداد:** نوێکردنەوە.

**استجلاب:** راکێشان، کشاندن، هێنان.

**استجماع:** خڕەوبوون، خڕبوونەوە، گردەوبوون، کۆم بوون.

**استجهال:** بەنەزان زانین، بە نەفام لەقەڵەم دان، ب شێت زانین.

**استحاضه:** حەیز، عوزر، بەخوێن بوونی ژن، خوێن هاتن لە رەحەمی ژن لە عادەتی مانگانەدا، بێنوێژی ژن.

**استحاله:** 1) گۆڕان، بارەوباربوون، لە بارێکەوە چوونە سەر بارێکی تر، چەند قۆناغ برین، سووڕی پلەیی. 2) دووربوون، نەگونجان، بەنەگونجاو قەبلاندن.

**استحباب:** خۆشویستن، بەباش وچاک زانین.

**استحداث:** نوێ خوازتن، تازەهێنان، نوێکردنەوە، نووژەن.

**استحسان:** پەسندکردن، ستایش کردن، بەچاك زانین، چاك دەرکەوتن.

**استحصال:** وەدەستهێنان، وەدەست خستن، دەست وەئانین، پەیداکردن، دەست کەوتن، دەست گیربوون، ئاکام وەرگرتن.

**استحضار:** ئامادەکردن، داواکردن، ئاگابوون، زانیاریخواستن، ئاگاداربوون، هایداربوون. "**استحضار داشتن**": ئاگاداربوون.

**استحفاظ:** پاراستن، پارێزگاری، ئاگالێبوون، خوەدیکرن، ئاگاداری. فێربوون.

**استحفاظی:** 1) لەپێوەندی لەگەڵ"استحفاظ". 2) پارێزەر.

**استحقار:** بەسووك و نزم زانین، بەگچکەو کەم ژماردن.

**استحقاق:** شیاوبوون، لایق بوون، رەوابوون.2) شیاوی، لەبارابوون، شیان.

**استحکام:** 1) پتەوبوون، قایم بوون، پتەوکردن.2) پتەوی.

**استحکامات:** بیناکان و سەنگەرەکان و هتد کە بە مەبەستی بەرگری دروست دەکرێ، قایمگەکان.

**استحلاء:** بەشیرین ئەژماردنی شتێك، شیرینی خوازتن.

**استحلاف:** سوێنددان، سوێندخواردن.

**استحلال:** بە رەوا زانین، حەڵاڵ کردن.

**استحمار:** بەکەرزانین، کەرکردن، وەهەڵەخستن.





**استحمام:** چوونە گەرماوێ و خۆشووشتن، حەمام کردن، گەرماو کردن.

**استحواذ:** زاڵبوون، باڵادەست بوون، سەرکەوتن. دەست بەسەر دا گرتن.

**استحیاء:** 1) شەرم کردن، لەڕوودامان. 2) زیندووهێشتنەوە.

**استخاره:** فاڵگرتنەوە، چاکەییخواستن، خوازیاری چاکەکردن.

**استخباء:** رەشماڵ هەڵدان، تاوڵ هەڵدان، چوونە چادرەوە.

**استخبار:** هەواڵ ویستن، هەواڵ پرسین لە کەسێك، هەواڵ وەرگرتن.

**استخبارات:** کۆی"استخبار"، هەواڵگری.

**استخدام:** 1) دامەزران، دامەزراندن، کارپێدان، خستنە بەر کار، بەکارخستن، بەکارهێنان، راگرتن. 2) نۆکەرگرتن، خۆلام گرتن، خزمەتکارگرتن.

**استخراج:** دەرهێنان، دەرهانین، دەرهاوردن، دەرکێشان، دەرهاویشتن، هەڵهێنان، هەڵێنجان، دەرخستن.

**استخفاء:** خۆشاردنەوە، خۆشارنەوە، خۆحەشاردان، خۆوەشارتن، خۆوەشاردن، خۆقایم کردن، خۆلەخەڵك ون کردن، خوەوەنداکرن.

**استخفاف:** بەسووك زانین، بەگچکەو نزم زانین.

**استخلاص:** 1) رزگارکردن. 2) رزگاربوون. 3) پوختەکردن، پاڵفتەکردن. 4) تایبەتیکردنی شتێك بۆخۆت، پاوان کردن، مۆنۆپۆل کردن، پوختەکردن.

**استخلاف:** جێنشین دانان، شوونکاردانان.

**استخوان:** ئێسك، ئێسقان، پێشە. "**استخوان پیشانی**": ئێسکی تەوێڵ/ ناوچاوان. "**استخوان آهیانه**": ئێسکی تاتی، لاسەر. "**استخوان پاشنه پا**": پاشپانی، پانیە، ئێسکی پاژنەی پێ. "**استخوان پروانەای**": ئێسکی بێژنگی/ پەپوولەیی. "**استخوان پشت سر**": ئێسکی پشتەسەر. "**استخوان دنبالچه**": ئێسکی کلێنچکە/ کلێژەیی. "**استخوان کامی**": ئێسکی مەڵاشوو. "**استخوان گیجگاهی**": ئێسکی لاجانگ.

**استداره:** خڕی، خڕبوون ، بەشکڵی جەغز بوون، گرۆڤەبوون. خولخواردن بە دەوری شتێك دا، خولانەوە، سووڕانەوە.

**استدامه:** خوازیاری بەردەوام بوون، تم خواستن، هەمیشەیی، بەردەوامی.

**استدانه:** قەرز(خواستن/ کردن/ وەرگرتن).

**استدبار:** روانینە ئەنجامی کار، پێشوازی نەکردن.

**استدراج:** 1) وردەوردە نزیك کردنەوە، کەم کەمە و وردەوردە خواستن. 2) مەکر و فرتوفێڵ کردن.

**استدراك:** 1) هەست کردن، پێگەیشتن، رابینین، پێزانین. 2) بابەت یان بابەت گەلێ کە لە کۆتایی کتێبێك دا بۆ راستکردنەوەی هێندێ لە بابەتەکان دەنووسرێ. 3) قەرەبوو و سازکردنەوە.

**استدعا:** 1) بانگ کردن، بانگ هێشت کردن. 2) داخوازی، خوازتن، ویستن. 3) خوایشت، تکا.

**استدلال:** بەڵگە ویستن، بەڵگەخوازتن، بەڵگەهێنانەوە، بەڵگاندن. بۆچوون.

**استدلالگر:** بەڵگەهێن، بەڵگەهێنەر.

**استدلالگرا:** بەڵگە خواز.

**استدلالی:** بەڵگاندنی، بەڵگەیی، ئەوەی کە لە سەر بنەمای بەڵگە بێ، بیرمەند یان فیلسوفێك کە بۆ سەلماندنەکانی بەڵگە بێنێتەوە.

**استذکار:** کەوتنە بیری کەسێك، وەبیرهێنانەوە، فێربوون.

**استرابت:** گومان کردن.

**استراتژی:** ستراتێژی، رێکار، لەشکرکێشی، زانستی بەرێوەبردنی چالاکی و جموجۆڵەکانی ئەرتەش لە شەڕدا .

**استراحت:** ئاسوودەیی، حەسانەوە، پشوو، سانەوە، وچان.

**استراق:** دزین، بە دزیەوە کارێك کردن. "**استراق سمع**": کوڵ، کوڵە، کەڵە، پسوگرتەی، خۆگرتن، گوێ هەڵخستن، بەدزیەوە گوێ لە قسەی خەڵك گرتن، گوێچکە گرتن، هەست راگرتن، گۆبەل کردن. "**استراق سمع کننده**": خۆگرتوو، خۆگرتی، گوێگر لە قسەی خەڵك بە نهێنی.

**استرجاع:** گەڕاندنەوە، ڤەگەڕاندن، وەرگرتنەوە، خوازتنەوە.

**استرحام:** بەزەیی خوازتن، روحم خوازی، مێهرەوانی خوازتن، دلۆڤانی خواستن.

**استرخاء:** خاوبوونەوە، داهێزان، نەرم بوونەوە، داهێڵران، سستی و شۆڕەوەبوو.

**استرداد:** وەرگرتنەوە، لێوەرگرتنەوە، سەندنەوە، لێسەندنەوە. گەڕاندنەوە، دانەوە، رادەست کردنەوە.

**استردن:** بڕوانە: "ستردن".

**استرزاق:** رۆزیخوازتن.

**استرس:** گرژی، ئالۆزە، ئێسترێس.

**استرسال:** 1) خاوبوونەوەو شۆڕبوونەوەی مووی سەر. 2) درێژدادڕی لە ئاخاوتن دا. 3) پێڕەوی کردن.

**استرشاء:** 1) پێڕەوی لە کەسێك و شادمان کردنی. 2) بەرتیل خوازتن، بەرتیل وەرگرتن.

**استرشاد:** رێ دۆزینەوە، رێوێنی خوازتن، خوازیاری رێنوێنی کردن.

**استرضاء:** رەزامەندی، رەزامەندی خواستن.

**استرعاء:** چاوەدێری و یارمەتی خواستن.

**استروژن:** هۆرمۆنی مێینە.

**استرونومی:** زانستی ئەستێرەکان، ئەستێرەناسی.

**استرهاب:** تۆقاندن، ترساندن، بزداندن.

**استرەلیسیدن:** بریتی لە ئازایەتی و گیانفیدایی کردن.

**استریل:** داری بێمیوە، بێبەر، نەزۆك، نەزا، نەزێ. بەبێ میکرۆبە زیندووەکان.

**استسعاد:** بەختەوەری خوازتن، خوازیاری بەختەوەریبوون، (یارمەتی/ هاریکاری) خوازتن.

**استسفار:** داوای لێکدانەوە کردن، داوای راڤەکردن، لێ پرسین.





**استسقاء:** 1) داوای ئاوکردن، باران خوازتن. 2) تینشکی، حەیزە، زکەماسێ، نەخۆشی ئاوبەند، نەخۆشی زگ ئاوسان، نەخۆشییەکە کە نەخۆش هەرگیز تێراو نابێ. "**نماز استسقاء**": نوێژەبارانە، نقێژاباڕانێ.

**استسلام:** ملکەچ و گوێڕایەڵ بوون، خۆبەدەستەوەدان، خۆڕادەست کردن. ئاشتیخوازتن.

**استشاره:** 1) پرس پێکردن، تەگبیر پێکردن، راوێژکردن. 2) راوێژکاری، راوێژەری، راگۆڕینەوە. "**مجلس استشاره**": رابێژگە.

**استشراق:** خۆرهەڵاتناسی، لێکۆڵینەوەی بیرمەندانی خۆراوایی لە ئەدەبیات و زانست و داب و نەریتی خۆرهەڵاتییەکان.

**استشعار:** لە دڵەوە ترسان، شاردنەوەی ترس لە دڵ دا. زانین، ئاگاداربوون.

**استشفاء:** داوای (چاك بوونەوە/ خۆش بوونەوە) کردن، داوای سەلامەتی کردن.

**استشفاع:** داوای بەخشین کردن، پاڕانەوە.

**استشمام:** 1) بۆن کردن، بۆن پێوەکردن، بێهن کرن، هەڵمژینی بۆنی شتێك. 2) زانین، پەی پێبردن.

**استشهاد:** 1) شایەتی خوازتن، راست بێژی ویستن، بەڵگەهێنانەوە. 2) گیان بەخت کردن، شەهیدبوون.

**استصباح:** داوای چرا کردن، چرا هەڵکردن، رووناکیخوازتن.

**استصحاب:** هاوڕێیەتی خوازتن، هاریکاری خوازتن، داوای یارمەتی کردن لە کەسێك.

**استصعاب:** بە دژوار زانین، دژواربوون، بە ئەستەم زانین.

**استصغار:** بە گچکەدانان، بەپەست و سووك دانان، ب کێم زانین.

**استصفاء:** پالاوتن، پالافتن، پاك کردنەوە.

**استصواب:** چاك دانان، بەباش زانین، پەسندکردن، رند زانین.

**استضائە:** رووناکی خوازتن، رووناك کردن، رووناهی کرن.

**استضعاف:** بەلاواز دانان، بەبێ هێز زانین.

**استطابە:** بە پاکی و خاوێن دانان.

**استطاعت:** توانین، توانایی، دەست رۆیشتن، پێکران، ژدەست هاتن.

**استطالە:** درێژبوونەوە.

**استطراب:** شادی خواستن، شاد بوون.

**استطراد:** 1) هەڵاتن لە پێش دوژمنەوە بە مەبەستی لە خشتە بردنی. 2) دوورکەوتنەوە لە بابەت. 3) وتنی بابەتێ بەپێی هەلومەرج.

**استطراداً:** بەپێی هەلومەرج.

**استطراف:** بە سەیر زانین ، سەرسوڕمان، بە نوێ زانێن.

**استطلاع:** زانیاری خوازتن، زانیاری خوازی.

**استطلاق:** 1) رزگاری خوازتن، رزگارکردن لە بەند، خلاس کرن. 2) زکچوون.

**استظلال:** سێبەر نشینی، پەنا بردنە بەر سێبەر.

**استظهار:** یارمەتی خوازتن، هاریکاری خواستن، پشت پێبەستن.

**استعاده:** داوای گەڕاننەوەی شتێك کردن، گەڕاندنەوە.2) هۆگری گرتن بە شتێك.

**استعاذه:** پەنا گرتن، پەنا بردن، هانابردن.

**استعاره:** خوازتنەوە، خوازە، میتافۆر. "**استعاره گسترده**": خوازەی بەربڵاو. "**استعاره مرکب**": خوازەی تێکەلاو."**استعاره مرده**": خوازەی مردوو. "**استعاره مطلق**": خوازە( میتافۆر)ی رەها. "**استعارەمصور**": خوازەی وێنەیی.

**استعاضه:** بژاردنەوە، پێبژاردنەوە، هەژمارتنەوە، خستنە بری، لە باتی(جیاتی).

**استعانت:** یارمەتی خوازتن، پشت پێبەستن.

**استعباد:** کردنە بەندە، کردنە کۆیلە.

**استعجاب:** سەر سووڕمان، واق وڕمان، شاش مان.

**استعجال:** لەز کردن، پەلە کردن، خێرا کردن، دەست و بردکردن، لەزین.

**استعداد:** ئامادە بوون، ئامادەیی، لەبارا بوون، لە باراندابوون، لێهاتوویی، توانایی، بەهرە، ژێهاتی. کەسانی شەڕکەر، تڕوتفاقی شەڕ."**استعداد فردی**": بەهرەی تاکەکەسی.

**استعذاب:** داوای ئاوی پاك و زوڵاڵ کردن.

**استعراب:** لاسایی عەڕەب کردنەوە، بوونە عەڕەب.

**استعراض:** نواندن، نیشان دان، پیشان دان.

**استعسار:** دژوار بوونی کار.

**استعصاء:** نافەرمانی کردن، سەربزێوی کردن، سەرپێچی کردن، یاخیبوون.

**استعصام:**1) بۆ پاێزگاری لە خۆ دەست بە شتێکەوە گرتن، پەنابردنەبەر. 2) پەنابردنە بەر کەسێك.

**استعطاء:** سواڵ کردن، خوارزۆکی، دەرۆزە کرن، پاس کرن.

**استعطاف:** 1) مێهرەوانی خواستن، مێهرەبان بوون، دلۆڤان بوون. 2) بەدەست هێنانی دڵ.

**استعظام:** 1) بە گەورە زانین. 2) گەورەیی کردن.

**استعفا:** 1) دەس لە کار کێشانەوە، دەست ژکار هلگرتن، وازهێنان، کەنارگرتن. 2) داوای لێبوردن کردن، داوای بەخشین کردن.

**استعفانامه:** وازنامە، نامەی دەست لەکارکێشانەوە.

**استعفاف:** خۆبواردن لە حەرام، پاکی خواستن، خۆپاراستن.

**استعلاء:** بەرزی خواستن، بلندخوازی. زاڵبوون، زاڵێتی، باڵادەستی.





**استعلاج:** دەرمان کردن، داوای چارە کردن، چارەدۆزی.

**استعلاجی:** تایبەتی دەرمان و چارەسەرکردن.

**استعلام:** زانیاری خواستن، پرسیارکردن لە بارەی شتێکەوە، هەواڵ پرسین.

**استعلامات:** پرسگە.

**استعمار:** 1) ئاوەدان کردنەوە. 2) دەست تێوەردانی دەوڵەتە بەهێزەکان لە کاروباری وڵاتانی لاواز بە بیانووی ئاوەدان کردنەوەو بە نیازی کەڵك وەرگرتن لە سامان و سەرچاوە ژێرزەمینییەکانیان، داگیرکردن، دەست بەسەرداگرتن، بێ بەری،"کولۆنیالیزم".

**استعمارزدایی:** دانی سەربەخۆیی، لە کولۆنی دەرهێنان، decolonization.

**استعمارشدن:** بوونە کولۆنی، داگیرکران، دەست بە سەر داگیران.

**استعمارگر:** (سیاسی) داگیرکەر.

**استعمارنو:** زاڵبوونی وڵاتێکی بەهێز بەسەر وڵاتێکی لاوازدا بەبێ کەڵك وەرگرتن لە هێزی نیزامی و بەیارمەتی حکوومەتی دانراو(انتصابی).

**استعماری:** (سیاسی) داگیرکەر.

**استعمال:** بەکار بردن، بەکارهێنان، ب کارئانین.

**استغاثه:** هانا ویستن، هاوار بردنەبەر، بانگ کردن بۆ دەهاناهاتن. دادوەری خوازتن، دادپرسین.

**استغراب:** سەرسووڕمان، حەیرین، واقمان، پەشۆکان، حەپەسان.

**استغراق:** تەواو لە کارەوە چوون، بە هەموان گەیشتن، هەموو لا داگرتن. نغرۆبوون، نقووم بوون، قووم بوون، خنکان.

**استغفار:** تۆبەکردن، پاشگەزبوونەوە، گەڕانەوە، بادانەوە، پەشیمانی لە گوناهان، داوای بەخشین و لێبوردن کردن، داوای لێخۆشبوون کردن.

**استغلاظ:** تیربوون، خەست بوون. ئەستوور بوون.

**استغلاق:** داخران، دژواربوونی ئاخاوتن.

**استغلال:** خەڵەوخرمان هەڵگرتن، هێنانەبەر، بەهرە لێوەرگرتن، چەوساندنەوە.

**استغناء:** بێنیازی، بێنیازبوون، پێنەویستن، دوورنیازی، کاربەکەس نا.

**استفاده:** کەڵك وەرگرتن، سوودوەرگرتن، قازانج کردن. کەڵك، قازانج، سوود، بەهرە. "**استفادەکننده**": کەڵك وەرگر، بەکارهێن.

**استفاضه:** 1) بەخشش و فەیز خوازتن. 2) بەهرەمەندبوون. 3) ئاشکرابوون و بڵاوبوونەوەی قسە یان هەواڵ.

**استفتاْء:** راخوازی، راوەرگرتن، راپرسی، دەنگ وەرگرتن، رێفراندۆم، فتوا پرسین.

**استفتاح:** کردنەوە، دەست پێکردنی کارێك، سفتاح، یەکەم فرۆشتن.

**استفراد:** 1) کردنی کارێك بە تەنیایی، تەنیابالّی لە کارێکدا، ب تەنیّ خەبتین. 2) خوازیاری تەنیایی بوون. 3) هەلّبژاردنی کەسیّ لە نێوان گروپیّ.

**استفراغ:** رشانەوە، هەلّێنانەوە، هێلّنج هاتنەوە، قەی کردنەوە. بەکارهێنانی توانایی خۆت لە کارێك دا.

**استفزاز:** وروژاندن، هەلّخڕاندن.

**استفسار:** 1) لێپرسین، پرسیارکردن، داوای شیکردنەوە کردن. 2) گەڕان، پشکنین.

**استفعال:** داوای کارێك یان شتێك کردن.

**استفهام:** پرسین، پرسیار کردن، داوای تێگەیشتن کردن. پرس، پرسیار.

**استفهامی:** پرسیاری.

**استقاء:** داوای ئاو کردن، ئاو هەلّێنجان.

**استقاله:** 1) دەست لە کار کێشانەوە، دەست لە کار هەلّگرتن، وازهێنان. 2) خوازیاری لێبوردن بوون.

**استقامت:** خۆراگری، خوەڕاگری، بەرخۆدان، پایەداری، راوەستان. راست راوەستان، راستەڕێیی، رێکی. "**بر یك استقامت بودن**": (بیرکاری) لەسەر یە ك هێلّ بوون.

**استقباح:** بەخراپ زانین، بە ناحەز و دزێو زانین، بە کرێت زانین.

**استقبال:** پێشوازی، بەپیرەوەچوون، بەرەو پیر، پیرایی، بەرەندك.

**استقدام:** چوونە پێش، بەرەو پێش چوون، حەرکین. دەست پێشخەری.

**استقراْء:** گەڕان، لێگەڕان، بۆ گەران. خوێندنەوە.تاوتوێی پاژەکانی کاریّ یان بابەتێك و ئاکام لێوەرگرتنی گشتی لێی، لێکۆلّینەوەو کونج پشکنی لە کارێك یان بابەتێك دا، توێژینەوە.

**استقرار:** جێگیر بوون، جێگیری، سەقامگیربوون، هاتنەسەرکار، نیشتەجیّ بوون، بنەجیّبوون، ساوکەبوون، ئارام وئۆقرەگرتن، سرەوتن، حەوانەوە، پشوودان. "**استقرار مطلق**": جێگیری رەها. "**عدم استقرار**": ناجێگیری.

**استقراردادن:** جێگیرکردن، سەقامگیرکردن، بنەجیّکردن.

**استقراض:** قەرزخوازتن، قەرزخوازی، قەرزکردن، قەرکرن.

**استقراع:** تیر و پشك خستن. لێدانی تەپل (دەرگا).

**استقسام:** 1) داوای سوێند خواردن کردن. 2) بەش خوازتن، پارخوازتن، داوای بەش کردن.

**استقصاء:** لێکۆلّینەوە لە کار یان بابەتێك، بە وردی تاوتوێکردنی شتێك، بە کۆتایی گەیاندن، هەولّ و تەقالای زۆر کردن.

**استقصار:** بە تاوانبار زانین، بەسووچبارزانین. بە کەمتەرخەم زانین.





**استقصاص:** داوای تۆلّە کردنەوە، داوای سزا دان.

**استقلال:** سەربەخۆیی، سەر ب خوەیی، سەربەخۆبوون، سەرخۆبوون، خۆی بوون، خۆبوون، خۆییبوون، سەربەستی، سەرازادی، سەرازایی، بەسەربەستی کار کردن.2) بە کەم دانانی شتێك. "**استقلال رأی**": سەربەخۆیی بڕیاردان، توانایی بڕیاردان بەشێوەی سەربەخۆ. "**استقلال طلبی**": سەربەخۆخوازی، سەربەستی خواستن.

**استکانت:** 1) خاکەڕا بوون، گردەنشین بوون، زەبوون بوون. 2) مل دان. 3) گریان.

**استکبار:** 1) زۆری کاری و ستەمکاری بەهۆی زۆرداری و بەهێزی. 2) ولّات یان ولّاتانی زۆردار و دەسەلّاتخواز. 3) بە گەورە زانینی کەسێك، خۆبە گەورە زانین، بەخۆفشین، خۆنوێنی و سەربزێوی کردن.

**استکتاب:** 1) داوای نووسین کردن، پیّنووسین. 2) بڕوانە: "استنساخ".

**استکثار:** زێدەخوازی، فرەخوازی، زۆرخوازی.

**استکراه:** بە ناپەسند زانین، لەبەر چاوخستن، بە کرێت زانین.

**استکشاف:** ئاشکرا کردن، خۆیاکرن، گەڕان. دۆزینەوە. "**استکشاف کردن**": گەڕان، بەدواداگەڕان، لێکۆلّینەوەکردن.

**استکمال:** تەواو کردن، کاملّ کردن، داوای کۆتایی پێهێنان کردن.

**استل:** کێل، لەوحی بەردینە.

**استلاب:** رفاندن، فڕاندن.

**استلال:** هەلّکێشان، شمشێر دەرهێنان.

**استلام:** 1) دەست هێنان(ساوین) بە شتێك دا. 2) ماچ پێدان. 2) ئاشتی کردن. 4) وەرگرتنی شتێك لە یەکێکیدی.

**استلانت:** 1) بەنەرم دانان، نەرم کردن. 2) نەرم بوون.

**استلزام:** بە پێویست زانین، بە گەرەك زانین.

**استلقاء:** بە پشت داکەوتن، لە سەر پشت راکشان، لە سەر پشت نووستن، خۆ لە گەز دان.

**استماع:** گوێگرتن، گویّڕاگرتن، گویّڕادێران، گوێدان، بیستن، ژنەفتن، گوێدێربوون، گوهداریکرن. "**استماع شدن**": بیستران.

**استمالت:** 1) بڕوانە: "مایل شدن". 2) دلّدانەوە، دلّخۆشیدانەوە، بۆ لای خۆ هێنان، بەرەو لای خۆ راکێشان.

**استمتاع:** بەهرە ویستن، بەهرەمەندی، کامڕەوایی. چێژبردن.

**استمداد:** یارمەتی خوازتن، هاناویستن، بەهاناوەهاتن، هاوار لێبەستن.

**استمرار:** بەردەوام بوون، بەردەوامی، لەسەر رۆیشتن، لەدوودان، پێوەچوون، پەیتایی.

**استمراراً:** بەردەوام، هەمیشە، پەیتاپەیتا، پەستاپەستا.

**استمراری:** 1) بەردەوامێتی، هەمیشەیی. 2) بڕوانە: " مستمری".

**استمزاج:** قسە لێ دەرهێنان، ژێر زوان چەشتن، بن زوان تاقی کردنەوە، قسە لێ دەرکێشان، پرسینی ویست و رای کەسێك لە مەڕ بابەتێك یان کارێك.

**استمزاجی:** ئەزموونی، تاقیکاری، تاقیکارانە، "blue sky".

**استمساك:** پەنابردنە بەر شتێك، کردنە بیانووی شتێك، دەستەو داوێن بوون.

**استمطار:** باران خوازتن، داوای باران کردن، باراندن.

**استملاء:** نژوە خوازتن، نژوە لێگرتن، رێنووس پرسین.

**استملاك:** زەوتکردنی ملکێ، بوونە خاوەن زەوی، خاوەنداریێتی، کردنی شوێنێك بە ملکی خۆ.

**استملال:** وەزالەهاتن، جاڕزبوون، خەمباربوون.

**استمناء:** دەسپەڕ، جلق، مشتە، مشتاو، مشتەگان، کابلەمە، دەستمیز، ساك لێدان، ئاوهێنانەوە، شاوەت هێنانەوە بە دەست.

**استمهال:** (ئەختان/ دەرفەت/ مۆڵەت) خواستن، کات خوازتن.

**استنابت:** جێگرخواستن، بە جێگردانانی کەسێك، شوونکاردانان، بریکارخوازتن.

**استناد:** 1) پشت پێبەستن، پشت بەستن. 2) بەڵگەدانان. 3) پەنابردنە بەر کەسێك.

**استناره:** رۆشناییخوازتن، رووناك بوون.

**استنامت:** خۆ لەخەو کردن، نووستن.

**استنان:** پێڕەوی کردن لە داب و نەریتی کەسێك.

**استنباء:** گەران بە دوای هەواڵدا ، هەواڵ خوازی، هەواڵ پرسین.

**استنباط:** هەڵگۆست، تێگەیشتن، تێگەیین، سەرلێدەرکردن، دەرهێنان، هەڵێنجان، هەڵگۆزین.

**استنباطی:** هەڵێنجەرانە. دەرهاتوو، تێگەیو.

**استنبه:** 1) ناحەز، زبر، درشت. 2) بەهێز، ئازا. 3) دێو. 4) شەوە، مۆتەکە.

**استنتاج:** دەرەنجام، دوائەنجام، ئاکام ویستن، ئاکام گیری، بۆ دەرکەوتن، بەرهەم گرتن، وەبەرهێنان، بەرهەم هێنان، لێدەرخستن، لێپەیداکردن.

**استنتاجی:** وەبەر هاتوو، ئاکام لێگیراو.

**استنجاء:** 1) رزگاربوون، قوتاربوون، دەربازبوون، خەلاس بوون. 2) دەس بە ئاو گەیاندن.

**استنجاح:** رەواییخوازتن، دابین بوونی پێداویستی. خوازیاری سەرکەوتن.

**استنجاد:** یارمەتی ویستن، ئازایەتی نواندن دوای ترس، بەهێزبوونەوەی دوای لاوازی و سستی.





**استنزاف:** بەفیڕۆچوون، لە نێوچوون.

**استنزال:** نیشتنەوە، داوای نیشتنەوە کردن.

**استنساخ:** روونووسکردن، لە روونووسینەوە، روونڤیس، لەبەرگرتنەوە، کۆپی هەڵگرتن، گوهاستۆ.

**استنشاق:** 1) هەڵمژینی ئاو یان هەوا. 2) بۆن کردن.

**استنصار:** یارمەتی/ هاریکاری خوازتن.

**استنطاق:** لێپرسینەوە، پرسینەوە، پرسیارلێکردن، وەقسەخستن، ڤەپرسین.

**استنقاذ:** رزگارکردن، قوتارکردن.

**استنکاح:** مارەکردن، ژن هێنان، شووکردن.

**استنکار:** نکۆڵیکردن، حاشا لێکردن، مل نەدان.

**استنکاف:** بێزنەهاتن، بە شوورەیی زانینی ئەنجام دانی کارێك، خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێ لەبەر خۆبەزل زانی، نەکردن، سەرپێچی.

**استنکال:** سزادان، جەزرەبەدان.

**استواء:** 1) بەرابەربوون، وەك یەکبوون، رێك وبەرانبەر، ل هەڤ هاتن. 2) بەرابەری، خۆڕاگری، میانەڕەوی. "**خطّ استوا**": هێڵی رێکی، کەمەرەی زەوی.

**استوائی:** یەکسانی، کەمەرەیی، لە نزیك کەمەرەی زەوی.

**استوار:** 1) پتەو، قایم، توند، تۆکمە، جێگیر، خۆگرتوو، خۆگرتی، خۆڕاگر، چەقیو، موکوم. 2) دەس پاك وڕاست، ئەمین، جهێ باوەڕیێ. 3) پلەیەکی لەشکرییە لە نێوان گروبان یەکەم و ستواندا.

**استوارخرد:** پیاوی ژیر و بەئەزموون.

**استوارداشتن:** 1) بەڕاست و دروست زانین، جێ متمانە، بەقاپێکردن. 2) باوەڕکردن، بڕواهێنان. 3) جێگیرکردن، پتەوکردن.

**استوارساختن:** 1) پتەو کردن، قایم کردن، کیپ کرن. 2) پێداگرتن، شێلگیربوون.

**استوارشدن:** خۆگرتن، پتەوبوون، وێستان و چەقین.

**استوارکردن:** 1) پتەوکردن، قایم کردن. 2) بەستن، داخستن. 3) پشت راست کردنەوە.

**استوارگردیدن:** 1) پتەوبوون، جێگیربوون. 2) خاترجەم بوون.

**استوارنامه:** ناسێن نامە، بڕوانامەیەك کە لەلایەن دەوڵەتەوە بە مەبەستی دانانی باڵوێز لە وڵاتێکی دی پێشکەش دەکرێ.

**استواری:** 1) پتەوی، توندی، قایمی، تۆکمەیی، راوەستاوی.2) متمانە، خاترجەمی، ئەرخەیانی.

**استواری کردن:** 1) متمانەپێکردن، بڕواپێکردن. 2) لێکۆڵینەوە و پشکنین کردن. 3) جەخت کردن. 4) قایمکاری، پارێزکردن.

**استوان:** بڕوانە: "استوار".

**استودن:** بڕوانە: "ستودن".

**استو شدن:** بڕوانە: "اعتراف".

**استوە:** بڕوانە: "ستوە".

**استهانت:** بە سووك و نزم زانین، سووك و چرووك كردن.

**استهجان:** بەدزێوزانین، بەشوورەیی دانان، ناحەزی.

**استهداء:** رابەرخوازتن، رێنوێنی ویستن.2) دیاری خوازتن.

**استهزاء:** گەمە پێ كردن، تیز پێكردن، تیتاڵی پێكردن، گاڵتە، تڕانە.

**استهزاآمیز:** گاڵتەجاڕانە، گەپجاڕانە، پێكەنیناوی.

**استهلاك:** 1) لەناوبردن، لەناوچواندن. 2) دانی بەرەبەرەی وام. 3) **هاتنەخواری** نرخی دارایی یان كەلوپەلەكان بە هۆی كار یان تێپەڕینی كاتەوە، پووان، سوان. 4) بەكاربردن، دەكاركردن.

**استهلال:** 1) بۆدیتنی **هیلال**(**هێڤك**) چوون، لە مانگی نوێ گەڕان، مانگی نوێ دیتن. 2) گریانی منداڵ كاتی لە دایك بوون. 3) سەرەتا، دەس پێكردن.

**استهواء:** 1) سەرلێشێوان، سەرگەردان بوون، وڕبوون. 2) سەرلێشێواندن، سەرگەردان كردن، خلەتاندن.

**استە:** (اَ) ناوك، پێشە.

**استە:** (اِ.تُ) بڕوانە: "استوە".

**استیجاب:** 1) بە پێویست دانانی كارێك یان شتێك.2) شیان، شیاو بوونی شتێك.

**استیجار:** بە مزبەر گرتن، بەكرێگرتن.

**استیجاری:** بەكرێدراو. شیاوی بەكرێگرتن.

**استیجاز:** لابردنی شتە زیادییەكانی ئاخاوتە.

**استیجال:** دەرفەت خوازتن، كات ویستن، دەم خواستن.

**استیحاش:** ترسان، تووشی ترس و خۆف هاتن، دڵتەنگ بوون، سڵەمینەوە، رەوەكیەتی.

**استیدن:** بڕوانە: "ایستادن".

**استیذان:** ئیزن خوازتن.

**استیصال:** 1) لە بێخ دەرهێنان، بن بڕ كردن، ریشەكێش كردن، رووخاندن، تەفروتووناكردن. 2) داماوی، دەستەوەستانی، بێ دەسەڵاتی، بێچارەیی.

**استیضاح:** 1) روونخوازی، ئاشكراخوازی. 2) بڕوانە: "بازخواست". 3) پرسیاری نوێنەری پاڕلمان لە وەزیر، كە دوای وڵام دانەوەی وەزیر دەبێ لە لێژنەی وەزیران دەنگی متمانە وەربگرێ.

**استیعاب:** **هەموولاداگرتن.** تاوتوێكردنی بابەتێ بەتەواوی.

**استیفاء:** داوای بەتەواوەتی كردن، مافی تەواو ویستن، مافی تەواو وەرگرتن.

**استیقاظ:** وریابوونەوە، **هوشیاربوونەوە،** وریایی.

**استیقاع:** چاوەڕوانی رووداني كارێكبوون.

**استیقان:** بە حەتمی دانان، مسۆگەر، بەدەر لە گومان زانین.

**استیل:** پلان، شێوە، شێواز، چۆنیەتی بیناسازی یان كۆتەڵ سازی.





**استیلاء:** دەسەڵات، زاڵبوون، سەركەوتن، دەست بەسەرداگرتن.

**استیلاد:** منداڵخوازتن، ئاوس كردن.

**استیمار:** راوێژ خوازتن.

**استیمان:** 1) ئەمان خوازتن. 2) پەنابردنەبەر.

**استیناس:** 1) **هۆگربوون،** خووگرتن. 2) بڕوانە: "آرام گرفتن". 3) بەرەو مرۆڤایەتی چوون.

**استیناف:** تێهەڵچوونەوە، سەر لە نوێ دەس پێكردنەوە، پێداچوونەوە.

**اسجاد:** چەمانەوەو سەردانەواندن، **داهاتنەوە.**

**اسجال:** زۆربەخشین، جێ**هێشتنی** كار.

**اسحاق:** 1) كۆن بوون، سوان. 2) دوورخستنەوە.

**اسخان:** گەرم كردن.

**اسخی:** دڵئاوالاتر، جوامێرتر، مێرخاستر.

**اسدال:** (اِ) داهێلان، شۆڕكردنەوە، داشۆڕاندن، بەردانەوە، داكێشاندن، رۆهێشتن.

**اسرا:** كۆی"اسیر"، بەندییەكان، دیلەكان.

**اسراح:** بەرەڵاكردن، ئازادكردن، بەردان.

**اسرار:** (اِ) شاردنەوە، نهێنیكردن.

**اسرار:** (اَ) كۆی"سرّ"، رازەكان، نهێنییەكان، نەپەنییەكان.

**اسرارآمیز:** رازاوی، پڕنهێنی، لێڵ و ناڕوون.

**اسراع:** 1) بەلەسەبوون، لەزین، خێرا رۆیشتن، لەزگین. 2) پەلەپێكردن.

**اسراف:** بێ هوودە خەرج كردن، **هەڵەخەرجی،** دەسەت بڵاوی نە لە جێی خۆیدا، دەست پێوەنەگرتن، ماڵ بە فیرۆدان، زێدەڕۆیی كردن، **هەڕش، هەرژاندن،** مەزەختی بە فیڕۆ، دەم تێژەندن. "**اسراف شدن**": بەفیڕۆچوون، خەساربوون، لەناوچوون.

**اسراف آمیز:** **هەڵەخەرجانە،** زێدەڕۆیانە.

**اسرامیشی كردن:** نگاداریكردن، پاراستن.

**اسرشتن:** بڕوانە: "سرشتن".

**اسرع:** خێراتر، گورج تر، بەلەزتر ، چالاكتر،زووتر.

**اسرە:** 1) زرێی پتەو. 2) بنەماڵە، خانەدان، ماڵبات.

**اسطار:** (اَ) كۆی"سطر"، دێڕەكان.

**اسطار:** (اِ) هەڵەكردن لە خوێندنەوەدا.

**اسطقس:** (اَ.طُ.قُ) مادە، بنەما، توخم.

**اسطورە:** ئوستوورە، چیرۆك، **هەقایەت.**

**اسطورەچە:** ئوستوورۆچكە.

**اسطورەزدایی:** ئەفسانەسڕینەوە.

**اسطورە شناختی:** ئوستوورەناسانە. "**انتقاد اسطورە شناختی**": رەخنەی ئوستوورەناسانە.

**اسطورەشناسی:** ئوستوورەناسی، "میتۆلۆژی".

**اسعاد:** 1) یارمەتیدان، **هاریكاریكرن.** 2) بەختەوەركردن.

**اسعار:** كۆی"سعر"، نرخەكان، دراوەكان.

**اسعاف:** فریاکەوتن، بەهاناگەیشتن، بەهاوارەوەچوون، بەفریاکەوتن، چارەسەری، پێڕاگەیشتن، یارمەتیدان.

**اسعد:** بەختەوەرتر، خۆشبەخت تر، پیرۆزتر.

**اسعر:** لەڕ، لاواز، کز.

**اسف:** خەمباربوون، پەرۆش، پەژارە، داخداری، سویَ، داخ وکەسەر، دەرد و داخ، مخابن، دوخان، کوڵ و زوخاو.

**اسفا:** بڕوانە: "دریغا".

**اسفار:** (اِ) رووناك بوونەوە، درەوشانەوەو ئاشکرابوون.

**اسفارکردن:** گوتن، دەربڕین.

**اسفبار:** خەماوی، بە ژان و ئێش، دڵتەزێن.

**اسف خوردن:** بڕوانە: "افسوس خوردن".

**اسفناك:** 1) خەم هێن، پەژارەهێن. 2) خراو، زیان دیتوو.

**اسقاط:** 1) فڕێدان، خستن/ بەرخستن، بەردانەوە، خستنەخوارەوە، داخستن. 2) وازهێنان لە هەقیَ لەلایەن خاوەن هەقەوە.3) هەڵەکردن لە ئاخاوتن دا.

**اسکات:** بیَ دەنگ کردن، مات کردن، وسکوت کردن، ئارام کردن، دامرکاندن، کپ کردن، سووسە بڕین، داسەکناندن.

**اسکار:** (اُ) خەڵاتێکی ساڵانەیە کە بە باشترین ئەکتەرەکانی سینەما لە ئەمریکا دەدریَ، کە پەیکەرێکی برنجییە بە کێشی 7 پۆند.

**اسکار:** (اِ) مەست کردنی کەسێك.

**اسکان:** نیشتەجیَ کردن، دانیشاندن، جێکردنەوە، ب جی کرن، ئاکنجیکرن، دامەزراندن، رۆنیشاندن، ئارام و هێدی کردن، داسەکناندن، هێوراندن، جێگەپێدان.

**اسکایلاب:** تاقیگەی فەزایی.

**اسکدار:** پەیك، نامەبەر.

**اسکلت:** 1) ئێسکەڕووتە، ئێسکەپەیکەر، ئەستوون بەندی سەخت و رەقی بوونەوەران. 2) کۆڵەکەکان، ئەستوونەکان. 3) کەسی رەقەڵە.

**اسکله:** لەنگەرگە، چارۆکە، وێستگەی کەشتی لە لێواری دەریا.

**اسکورت:** ئیسکۆرت، پارێزەر.

**اسکولاستیك:** قوتابخانەیی، وانەیی.

**اسکولاستیسیسم:** فەلسەفەی قوتابخانەیی.

**اسکی‌باز:** کاشیکان، خلیسکێن کەر.

**اسکی‌بازی:** خلیسکێن، خلیسکانیَ، ئیسکی.

**اسکیزوفرنی:** بڕوانە: "جنون جوانی".

**اسکیزیدن:** هەڵبەزدابەزین، لووشکەخستن، جووتەوەشاندن.

**اسلاف:** پێشینیان، پێشوونان، باب و کال.

**اسلام:** خۆبەدەستەوەدان، ملکەچی، چوونە ژێرباری هێمنیو ئاشتییەوە، بوونە موسڵمان، ئایینی موسوڵمانان.

**اسلام آوردن:** بوونە موسوڵمان.





**اسلام‌خواهی:** ئیسلامخوازی، لایەنگری لە ئیسلام.

**اسلام شناسی:** ئیسلام ناسی، لێکۆڵینەوە و تاوتویَ و موتالآی ئایین و فەرهەنگی ئیسلام.

**اسلام گرا:** ئیسلام گەرا، خوازیاری پەیوەست بوون بە ئایینی ئیسلام.

**اسلامی:** 1) سەبارەت بە ئیسلام، ئیسلامی. 2) موسوڵمان.

**اسلامیّت:** خاوەنی تایبەتمەندییەکانی ئیسلامی‌بوون، موسوڵمانەتی.

**اسلاید:** وێنەیەك کە بە پرۆژێکتۆر دەکەوێتە سەر پەردە.

**اسلحه‌برداشتن:** چەك هەڵگرتن.

**اسلحه‌به(بر) زمین گذاشتن:** 1) کۆتایی هێنان بەشەڕ. 2) خۆبەدەستەوەدان، کۆڵدان، چەك دانان.

**اسلوب:** شێواز، شێوە، مێتۆد، رێگە.

**اسلیمی:** نەخش و نگارگەلێکی بازنەیی شکلیَ و پێچاوپێچ.

**اسم:** 1) نێو، ناو، ناڤ. 2) هۆ و بیانوو. "**بەاسم**": بەبیانووی، لە رواڵەت دا بۆ. "**بەاسم کسی بودن**": تۆماربوونی ناوی کەسێك لە بەڵگەیەك دا. "**بەاسم کسی دررفتن/ تمام شدن**": رەپاڵدانی ئەنجامدانی کارێك بە کەسێك کە ئەو ئەنجامی نەداوە، بەناوی ئەوەوە تەواو بوون.

**اسماً:** بەشێوەی رواڵەتی و ناواقیعی.

**اسمار:** کۆی"سمر"، ئەفسانەکان، هەقایەتەکان.

**اسماع:** (اِ) بەگویَ گەیاندن، بەگویَ دادان.

**اسم بامسما:** ناویَ کە ماناکەی دەگەڵ خاوەنەکەی دێتەوە.

**اسم بددرکردن:** بە خراپ ناو رۆیشتن، ناوبە بەدنێوی ناودەرکردن.

**اسم بردن:** ناوهێنان، ناوبردن، باسکردن.

**اسم بی رسم:** ئەوەی لە ناوەرۆکەکەی تەنیا ناوەکەی مابێتەوە.

**اسم خانوادگی:** ناوبانگ، شۆرەت.

**اسم درکردن:** ناوبانگ دەرکردن، ناوبانگ رۆیشتن.

**اسم روی کسی گذاشتن:** 1) بەناحەق تاوانبارکردنی کەسێك. 2) ناو لەسەر دانان.

**اسمز:** (پزیشکی) دەڵاندن.

**اسم شب:** ناوی شەو، وشەی نهێنی لە شەو دا، ناوێکی قەراردادییە کە تەنیا هێندێك کەس دەیزانن بۆ تێپەڕین لە شوێنێکەوە کە رابردن لێوەی یاساغە.

**اسم علم:** دیارناو، ناوی ناسراو.

**اسم کسی بدرفتن:** ناو بە خراپە رۆیشتن، ناودەرکردنی ئەو بە کارگەلی نەشیاو.

**اسم کسی بە چیزی دررفتن:** بەناوبانگ بوونی ئەو.

**اسم گذاردن:** رێورەسمیَ کە لەو دا ناوی تازەزاوی ساوا بەگوێیدا دەخوێنن.

**اسم گذاری:** ناودێری، ناونیان، ب ناڤ کرن.

**اسم مستعار:** نازناو، ناوی خوازراو.

**اسمن:** قەڵەوتر، چاختر.

**اسم نویسی:** ناونووسی.

**اسم و رسم:** ناو و پلە، ناوبانگ و پرستیژ، پلەی بەرزی کۆمەڵایەتی.

**اسمی:** 1) ناودار، بەناوبانگ. 2) رواڵەتی، بەبێڕاستێتی. 3) دیاریکەری رادە یان سنووری دیاریکراو بۆ توانایی کردەوە یان دەفرایەتی شتێك.

**اسناد:** (اَ) کۆی"سند"، بەڵگەکان، بەڵگەنامەکان.

**اسناد:** (اِ) نیسبەت دان، دانەپاڵ. "**اسناد مجازی**": رەپاڵدانی شتێ بە شتێ کە راستێتی نیە و لە خەیاڵی شاعیرانەوە سەرچاوە دەگرێ.

**اسنی:** بلێندتر، بەرزتر.

**اسواء:** خراپتر، دزێوتر.

**اسواق:** کۆی"سوق"، بازاڕەکان.

**اسوه:** پێشەوا، پێشەنگ، پێشڕەو، نموونە، سەرچەشن.

**اسهاب:** زۆربلێی، درێژکردنەوەی قسە، لە رادە دەرچوون، زێدەڕۆیی لە بەخشیندا.

**اسهال:** 1) لەچیاوە هاتنە پێدەشت، گەیشتنە زەوی نەرم.2) سەرپێیی، سەرپایی، بەلەفیڕە، فیڕکە، فیڕان، زگچوون، سکچوون، زك رۆین، زکەشۆرە، زکەشۆرێ، سکەشۆرە، هەڵ تووڕان، شووڵاندن، زەحیری، رەوانی، تەقە فیڕە، هەڵفیڕان، تەڤژین، شوولین، تووڕاندن، داتووڕاندن، ڤڕك، ڤژۆ، ڤێرکە، شاتان، دەڕاوی. "**اسهال خونی**": سکچوونی خوێناوی، زەحیری.

**اسهالی:** تووشبوو بە سکچوون، زەحیر.

**اسهام:** کۆی"سهم".

**اسهل:** ئاسانتر، ساناتر، ساناهی‌تر.

**اسید:** ترش(ی)، تێکەڵییەکە لە کانزایەکی سادە دەگەڵ ئیدرۆژن.

**اسیدیته:** رادەی ترشبوونی هەر ترشێك.

**اسیر:** دیل، یەخسیر، ئێسیر، هێشیر، هێسیر، گیراو، بەندکراو، گرفتار، بەیدەس، مل دەر. "**اسیرخاك**": مردوو، کۆچکردوو. "**اسیروابیر**": گرفتار و لەبەندا.

**اسیرکردن:** یەخسیرکردن، گرتن، لەبەندخستن، لەبەندکردن.

**اسیری:** بڕوانە: "اسارت".

**اشادت:** 1) هەڵدان، هەڵچنین، بردنەسەری رێزو پێگەی کەسێك. 2) خویاکردنی کەسێك.

**اشارت:** 1) ئاماژە، هێما. 2) فەرمان، دەستوور. 3) رادەربڕین.

**اشاره:** ئاماژە، هێما، ئیما، نیشانك، چاوبرکێ، سەرلەقاندن، دەست یان چاو هەڵتەکاندن، پیشاندان، دەست راداشتن، بە درکە ئاخاوتن.

**اشاعه:** ئاشکراکردن، خویاکرن، بڵاوکردنەوە، خەبەر بڵاوبوونەوە، تەقەداکەوتن، قاو داخستن، دەنگۆداخستن، دەنگ دەرچوون، دەنگەشە. برەوسەندن، وەبرەوخستن، پەرەسەندن.

**اشام:** بۆخواردنەوە، خواردەمەنی، خواردنی، خۆراك.

**اشباح:** کۆی"شبح"، تارماییەکان، سوێسەکان.





**اشباع:** تێرکردن، پڕکردن، تەواو تواندنەوە. "**اشباع شدن**": پڕبوون.

**اشباه:** لێکچوون، وێچواندن.

**اشبه:** وێچووتر، لێکچووتر.

**اشپوختن:** بڕوانە: "اشپیختن".

**اشپیختن:** پرژانن، پرژاندن، رژانن و بڵاو کردنەوەی شتێك. دەڵاندن.

**اشپیخته:** پرژاو، رژاو.

**اشتباك:** تێك ئاڵۆزان، تێك ئاڵان، لێك ئاڵان، ئاڵۆزان.

**اشتباه:** 1) وێچوون. 2) هەڵەکردن، هەڵەکاری، سەهوو کردن، خەتاکردن، گومان بردن، سەرچوون، بەسەرچوون، دەسەرچوون، لەسەرچوون، لەبیرچوون، یانش. "**اشتباه کننده**": سەهوکار، هەڵەکار، شاش کار."**از اشتباه درآمدن**": بە هەڵەی خۆ زانین، لە هەڵە رەخسین. "**به‌اشتباه‌انداختن کسی**": تووشی هەڵەکردن، وەسەرهەڵەخستن، سەرلێتێکدان، سەرلێسەندن، سەرلێشێواندن.

**اشتباهاً:** بەهەڵە، لەرووی هەڵەوە.

**اشتباه داشتن:** هەڵە هەبوون. وێکچوون.

**اشتباه‌گرفتن:** بەهەڵەگرتن.

**اشتباه لپی:** شێوەی دەربڕینی لەبزێ لە جیاتی لەبزێکی دی یان هەڵە لە مانای وشەدا.

**اشتباه لفظی:** جوڕیان، زمان بە هەڵەدا چوون، هەڵەی زارەکی.

**اشتباهی:** بەهەڵە، بەخەتا. هەڵەدار.

**اشتجار:** مشتومڕکردنی دوو گرووپ دەگەڵ یەکتری، دەوەوەری، شەڕە قسە.

**اشتداد:** توند بوونەوە، قایم بوون، سەخت بوون، توندی.

**اشتراء:** کڕین، سەندن، کڕین و فرۆشتن.

**اشتراط:** گرێوکردن، مەرج بەستن، مەرجدارکردنی شتێ بە شتێکی‌تر.

**اشتراك:** 1) شەریك بوون، بەشداربوون. 2) بەشداری، هاوبەشی. 3) لە بیرکاری دا: یەکتربڕ.

**اشتراك پیداکردن:** هاوبڕوابوون.

**اشتراك دادن:** بەشداریپێکردن، کردنە هاوبەش.

**اشتراك داشتن:** هاوپشك بوون، هاوکاربوون، بەشداربوون.

**اشتراك لفظی:** (لۆژیك) بەکاربردنی لەبزێك بۆ چەند مانا.

**اشتراك مساعی:** هاوکاری.

**اشتراکی:** 1) هاوبەشایەتی، هاوبەشێتی، بەهاوبەشی یەکتر. 2) لە ئێران دا بەمانای کۆمۆنیست یان لاگری کۆمۆنیزم دێ، بەڵام لە عەرەبی دا بە مانای سوسیالیست بە کاردەبرێو بە جێگەی (کۆمۆنیست)یش زاراوەی شیوعی بە کار دێنن.3) (ئابووری) تایبەتمەندی سیستمی ئابووری لەسەر بنەمای خاوەندارێتی کۆیی.

**اشتراکی کردن:** 1) بەشداری پێکردنی دیتران لەمڵکایەتی کەسێك یان شتێ. 2) گۆڕینی خاوەنداریێتی تاکەکەسی بە خاوەنداریێتی کۆیی.

**اشتعال:** داگیرسان، داگرسان، داگیران، هەڵبوون، پێبوون، گڕگرتن، هەڵگرسان، هەڵکردن، هەڵایسان، کڵپەسەندن. **"اشتعال ناگهانی"**: کڵپە، گوڵپە، پڵتە، گڕی لە پڕی ئاگر.

**اشتعالی:** بڕوانە: "آتشین".

**اشتغال:** خەریك بوون، سەرگەرم بوون بە کاریکەوە، مژوولی، خی، گرفتاری. شوغڵ، کار، پیشە. **"اشتغال اتفاقی"**: کاری بەهەڵکەوت و بەبێ سەعاتی کار و هەقدەستی ڕێکوپێك.

**اشتغال زا:** کار پێکهێن، تایبەتمەندی هەر چەشنە کارێکی ئابووری و پیشەیی و هتد کە شوغڵ پێك دێنێ.

**اشتقاق:** تلێشاندن، شەق بردن، لەت بوون، پارچەبوون، لێوەرگرتن، دەرهێنان. ریشەناسی.

**اشتقاقی:** وەرگیراو، دەرهێنراو.

**اشتکاء:** گلەیی کردن، گازندەکردن.

**اشتلم:** مقۆمقۆ، دم لە دم نان و چەقەوگورە.

**اشتمال:** لەخۆگرتن، دەورەدان، دەورەگرتن، گەمارۆدان.

**اشتهاء:** هەوەس، ئیشتیا، حەز، ئارەزوو، واز، بزۆك، مەیل، گێڤل، دڵ بردن، دڵ بۆچوون، دڵ تێچوون، دڵ پێوەبوون، دڵچوونەسەر، دڵخواز، مجێز، مەگێز، مەگیرانی، بێزوو، واشتش، وەشتی.

**اشتهاانگیز:** حەزهێن، ئیشتیاهێن، حەزوورووژێن.

**اشتهار:** ئاشکرا کردن، خویابوون. ناوبانگ دەرکردن، ناوداربوون، نێوپەیداکردن.

**اشتهارطلب:** خوازیاری نێو و نێوبانگ.

**اشتیاق:** تاسە، ئارەزوو، نگە، شن، سوو، شەیدایی، دڵ لێچوون، تامەزرۆیی، تاسەو ئارەزووی زۆر، نگە، بیهر، مەراق، مەرەق، ئارەزوومەندی، ئارەزووی دیدارکردن.

**اشجع:** ئازاتر، بوێرتر، بەجەرگ تر. ئازاترین.

**اشدّ:** سەخت ترین، قایم ترین، تۆکمەترین.

**اشراب:** تێرکردن.

**اشرار:** خراپەکاران، شەڕفرۆشان.

**اشراف:** (اِ) چوونەسەر، لە بەرزییەوە ڕوانین، چاو تێوەبوون، چاودێری، زاڵبوون بەسەر شتێك دا، ئاگاداربوون لە شتێك، ئاگایی، سەرپەرشتی، سەردەرهێنان لە بیر و ئەندێشەی کەسێك. **"اشراف برضمایر"**: ئاگاداربوون لە ناخی کەسەکان. **"اشراف داشتن برچیزی"**: بەتەواوی ئاگاداربوون لێی، زاڵبوون بەسەری دا.

**اشراف:** (اَ) مەزنان، خانەدانان، پیاوانی پایەبەرز. **"اشراف زاده"**: ئەریستۆکرات، نەجیم زادە. **"اشراف زاده مفلس"**: چەکمەبۆر، چەکمە رەق، کۆنە نەجیم، بەگزادەی نابووت، ئاغاڕووتە. **"گروه اشراف سالار"**: ئەریستۆکراسی.





**اشراف سالاری:** ئەریستۆکراسی.

**اشرافی:** بەشکۆ، بەرزوتەرز. شیاوی پایەبەرزان. ئەریستۆکرات.

**اشراق:** 1) ڕووناك بوونەوە، تیشکدانەوە، درەوشانەوە. 2) ئیلهام وەرگرتن. **"اشراق کردن"**: درەوشین، بریقەدان، شۆقدان.

**اشرس:** بەدخوڵق، توندخوو، تیژەمەژگ، ئازا لە شەڕدا.

**اشرف:** بەرزتر، خانەدانتر، بەڕێزتر، ڕێزدارتر.

**اشرف مخلوقات:** لەسەرترین ئافرێنەکان، مرۆڤ.

**اشرق و مشرق:** سەرانسەر، هەموو جێگەیەك.

**اشعار:** (اِ) ئاگادارکردنەوە، ئاگاداری، پێڕاگەیاندن، هەواڵدان.

**اشعار:** (اَ) کۆی "شعر".

**اشعال:** هەڵ کردن، گیرسانن، پێکردن، داگیرساندن.

**اشعث:** موو ئاڵۆزکاو، مووی تێکەڵاو، گژ، گژن، گژنەسەرە، سەرقژن.

**اشعر:** 1) تووکن، پرچن، قژن. 2) هەستیارتر، بوێژتر، زاناتر. 3) شێعری باشتر.

**اشعه:** تیشك، تیرێژ، تیرۆژ، پرشنگ، لیزگ، ڕووناکایی خۆر. **"اشعه فوق بنفش"**: تیشکی سەروو وەنەوشەیی. **"اشعه زیر قرمز"**: تیشکی خوار سوور. **"اشعه نامرئی"**: تیشکی نەبینراو.

**اشغال:** (اَ) کۆی "شغل".

**اشغال:** (اِ) 1) خەریك کردن، لەکاروەردان. 2) داگیر کردن، جێگاگرتن، دەست بەسەرداگرتن، داپڕکردن، دەس پیاگرتن، بەزۆرگرتن و بردن، دابەزاندنی هێزی نیزامی لە خاکی وڵاتێکی دیکە بە نیازی داگیرکردنی هەمیشەیی یان کاتی.

**اشغالگر:** داگیرکەر، دەست بەسەرداگر.

**اشغالی:** داگیرکراو، بەزۆری زەوتکراو.

**اشفاء:** چاك و خۆش کردنەوە، ساڕێژکردنەوە، ساخ کردنەوە.

**اشفار:** لێوارەی هەرشتێك، شیرازە، قەراخ.

**اشفاق:** 1) ترسان، ترسیان. 2) دلۆڤانی، دڵسۆزی.

**اشقّ:** دژوارتر، سەخت تر، ئەستەمتر.

**اشقی:** بەدبەخت تر، ڕۆژڕەش تر.

**اشقیا:** دڵڕەقان، زاڵمان. بەدبەختەکان، ڕۆژڕەشەکان. تاوانباران. یاخیبووان.

**اشك:** ئەسر، ئەسرین، هەسر، فرمێسك، سرشك، ڕۆندك، هەستار، فریش، هەرس، هەرەس، هێستر، هێسیر، هەرش، هێرش.

**اشك افشاندن:** فرمێسك ڕشتن، ئەسرین هەڵوەراندن.

**اشك آلود:** فرمێسکاوی، ئەسریناوی، هەرسین.

**اشك آور:** فرمێسك ڕێژ، فرمێسك هێن.

**اشكافت:** (اِ) بڕوانە: "شكافتن".

**اشكال:** (اَ) كۆی"شكل".وێنەكان، شكڵەكان. شێوەكان، شێوازەكان.

**اشكال:** (اِ) دژواربوون، سەخت بوون. 2) دژواری، ئاڵۆزی و سەختی كارێك. 3) مەسەلە. 4) كەموكورتی، كەمی."**اشكالی ندارد**": مەسەلەیەك نیە، قەی ناكەقەیدی نیە، باشە، باوابێ، وابۆ.

**اشكالتراش:** بڕوانە: "ایرادگیر".

**اشكالتراشی:** بڕوانە: "ایرادگرفتن".

**اشكال زدایی:** ئیراد و گرفت لابردن، عەیب و كەموكووڕی سڕینەوە.

**اشكبار:** گریان، ئەسرین ڕێژ. لە حاڵی گریان دا.

**اشكباری:** فرمێسك ڕشتن.

**اشك تمساح:** بریتی لە گریانی خەڵك خلەتێنانە یان بە درۆ.

**اشك داودی:** فرمێسكی زۆر، فرمێسكی پەشیمانی.

**اشك شوق:** شەكەرگری، كەنی گری، گریان لە خۆشیان، فرمێسكی شادی لە چاو هاتن.

**اشك فشان:** فرمێسك ڕێژ، فرمێسكبار.

**اشك فشاندن:** ئەسرین ڕشتن، فرمێسك هەڵوەراندن، ڕوندك باراندن.

**اشك گرفتن:** وەگریان خستنی كەسێك بە خوێندنەوەی دولكە و شتی وا.

**اشكل:** (اِ.كِ) فێڵ و تەڵەكە.

**اشكنجه:** بڕوانە: "شكنجه".

**اشكوب/ اشكوبه:** بڕوانە: "طبقه".

**اشكوخیدن:** خلیسكان، ڕەت بردن و كەوتن. "**اشكوخیده**": خلیسكاو، هەلنگفتوو.

**اشكول:** گەوج، بێ ئاوەز.

**اشكوهیدن:** گەورەیی و شان و شكۆ نواندن، سامداربوون.

**اشكەكردن:** تكانی شتی ڕەوان وەك فرمێسك.

**اشكی زدن:** مەینۆشی كردن.

**اشكیل:** بڕوانە: "اشكل".

**اشگرف:** سەیر، خاس و دڵپەسند، بێهاوتا لە چاكیو جوانیدا.

**اشگفیدن:** بڕوانە: "اشكفتن".

اشل: 1) پلە، پایە. 2) پێوانەی پلەبەندی.

**اشمئزاز:** بێزكردنەوە، بێزنەهاتن، قێز لێبوونەوە، بێزراوی، بێزاری.

**اشمام:** بۆن كردن، بە لێو هێماكردن.

**اشمل:** لەخۆگرتووتر.

**اشن:** كاڵ، نەگەیشتوو، نیاوا.

**اشنودن:** گوێدان، بیستن، ژنەفتن، گوهداریكردن.

**اشوع:** بڕوانە: "اشعث".

**اشوق:** بەتاسەتر، تامەزرۆتر.

**اشهاد:** (اِ) شادەهێنان، شایەتیدان.

**اشهاد:** (اَ) كۆی"شاهد"، شایەتەكان.

**اشهار:** دەرخستن، ئاشكراكردن، ناوداركردن.





**اشهر:** ناودارتر، بەناوبانگ تر. ناودارترین.

**اشهی:** بەڕمێن تر، دڵخوازتر، خۆشتر، بەتامتر.

**اشیاء:** كۆی"شیء"، شتومەك، شتمەك، شمەك، تەنەكان، وردەشت.

**اصائل:** كۆی"اصل".

**اصابت:** 1) وێكەوتن، بەركەوتن، هەنگوتن، ئەنگووتن، لێدان، پێكان، هەنگاوتن، ئەنگاوتن. 2) ڕاست و دروستی ڕا و بۆچوون. 3) سوود و بەهرە، هەقدەست. "**اصابت رأی**": دروستی ڕاوبۆچوون. "**اصابت یافتن**": بە ئامانج گەیشتن. "**مورد اصابت واقع شدن**": وەبەرهاتن، پێكران، وێكەوتنی فیشەك وهتد.

**اصارم:** كۆمەڵ، كۆمەڵی خەڵك.

**اصالت:** ڕەسەنایەتی، ڕەسەنێتی، ڕەسەنی، بنەچەیی، ڕیشەداربوون، بەڵگەمەندی. "**اصالت داشتن**": 1) ڕەسەنایەتی هەبوون. 2) پابەندی بە بنەماكانی ئەخلاقی و نەریتەكان.

**اصالتاً:** لەلایەن خۆوە.

**اصباح:** گەیشتنە بەیانی، هەستان لە بەیان دا.

**اصبار:** هێوركردنەوە، بۆ سەبرو لەسەرەخۆیی هاندانی كەسێك.

**اصحّ:** ڕاست تر، سالم تر.

**اصحاب:** 1) خاوەنان. 2) هەواڵانی پێغەمبەر.

**اصحاب رأی:** پێڕەوانی ئەبووحەنیفە.

**اصحاب قلم:** نووسەران.

**اصحاب كهف:** حەفت مێردە.

**اصحاب مطبوعات:** ڕاگەیەنكار.

**اصدار:** هەناردن، ناردن، ناردنەدەرەوە. ئاشكراكردن، دەرخستن.

**اصدق:** ڕاست تر، ڕاست وێژتر.

**اصدقاء:** كۆی"صدیق"، واتە دۆستان و هەڤاڵانی مێهرەبان و دڵسۆز، دۆستانی گیانیبەگیانی.

**اصراركردن:** پێداگرتن، شێلگیربوون، سووربوون لە سەر مەبەست، ئاو نەپاڵاوتن، ڤەپژڵاندن، پژڵاندن، جەخت كردن، لەسەرچوون، لەسەر ڕۆین، لەسەر ڕۆیشتن، لاق چەقاندن، پێچەقاندن، پركێشی.

**اصراروَرز:** پژل، پێداگر، شێلگیر، پێ چەقێن، دەم سوور، سوور لە سەر شتێ.

**اصرار ورزی:** ڤەپژڵان، سووری و پێداگری، شێلگیری، مكوڕی.

**اصراف:** گەڕاننەوە، گەڕاندنەوە، زڤڕاندن.

**اصرام:** كۆمەڵ، كۆمەڵی خەڵك، كۆمەڵگە.

**اصطبار:** سەبركردن، دان بە جەرگی خۆدانان.

**اصطفاء:** هەڵبژاردن، بژاردن، نەقاندن.

**اصطكاك:** لێك خشان، لێكدرانی دووشت. تێك ئەنگوانی بیر و سەلیقە، ناتەبایی، نێوان ناخۆشی.

**اصطلاح:**1) پێکەوەئاشت بوونەوە، سازان. 2) چەمك، زاراوە، دەستەواژە، ئیدیۆم، وشە. 3) زمان، شێوەی ئاخاوتن. "**بەاصطلاح**": بەناو. بەڕواڵەت، بە خەیاڵی خۆی. بەپێی، بەگوێرەی.

**اصطلاحاً:** بەو جۆرەی باوە.

**اصطلاحات انتزاعی:** زاراوەگەلی دەرهەست.

**اصطلاحات عینی:** چەمکگەلی ئۆبژێکتیف، چەمکگەلی بابەتی.

**اصطلاح شدن:** بوونەباو، باوبوون.

**اصطلاح شناسی:** زاراوە ناسی، تێرمینۆلۆژی.

**اصطلام:** لە رەگ و ریشەوە دەرهێنان، بن برکردن.

**اصطناع:** دەستووردان بۆ چێکردنی شتێك، چاکەکردن، پەروەردەکردن، هەڵبژاردنی کەسێك، هەڵبژاردنی شتێك بۆ خۆت. دەسکرد.

**اصطیاد:** راوکردن.

**اصعاب:** دژواربوونەوە، سەخت بوونەوە.

**اصعاد:** رۆیشتنەسەر، سەرکەوتن.

**اصعب:** دژوارتر، سەخت تر، ئەستەم تر.

**اصغاء:** گوێدان، گوێڕاداشتن، گوێڕاگرتن، بیستن، ژنەفتن.

**اصغر:** گچکەتر، چووکەتر.

**اصفاء:** 1) هەڵبژاردن. 2) بەتاڵ بوونەوە.

**اصفی:** روون تر، پاك تر،پاڵاوتەتر.

**اصل:** 1) بنەچە، بنەچەکە، بنیچە، بنچینە، درق، رەچەڵەك، ناوپشتە، رەسەن، عەسڵ، خاسە، سۆلان، بنەما، درق، بێخ، بن، ریشە، رەگ، ماك، سفن، سەرچاوە. 2) پڕەنسیپ، بنەواشە. 3) هەرکام لە ماددەکانی یاسای بنەڕەتی.4) یاسا، رێسا. 5) هەقیقەت، راستیبوون. "**اصل انواع**": بنچینەی جۆرەکان. "**اصل کاری**": بەشی سەرەکی کار."**اصل متعارفی**": هەر بنەمایەکی بەڵگەنەویستی ئەقڵی گشتی وەك چووکەتربوونی پاژ لە گشت. "**اصل مطلب**": مەبەستی سەرەکی. "**اصل موضوع**": بنەمای بەڵگەنەویست، مەسەلەی سەرەکی.

**اصلاً:** لەبنەوە، لەبێخەوە، لە بنەڕەت را، هەرگیز، هیچ کاتێك، لە هیچ دەمێك دا.

**اصلاح:** 1) کەموکورتی لابردن، باشترکردنی دۆخ یان چۆنیەتی شتێ. 2) کورتکردنەوە یان تاشینی مووی سەرو روخسار. 3) راستکردنەوە، دەستکاری، هەڵەچنی، هەڵەگیری پێداچوونەوە. 4) سازاندن، ئاشت کردنەوە. 5) چاك کردن، چاك کردنەوە، چاکسازیکردن، رێفۆرم. 6) چاکەکردن، چاکەخوازی.

**اصلاحات:** کۆی"اصلاح"، چاکسازیگەل، چاکسازییەکان.

**اصلاح پذیر:** شیاوی چاك بوون.

**اصلاح دادن:** ئاشت کردنەوە، سازاندن.





**اصلاح طلب:** رێفۆرمخواز، چاکسازیخواز.

**اصلاح طلبی:** رێفۆڕمخوازی.

**اصلاحگر:** ریفۆرمیست، چاکساز.

**اصلاحگرا:** بڕوانە:"اصلاح طلب ".

**اصلاحی:** چاککراو، هەڵەچن کراو.

**اصلان:** (أ) کۆی"اصیل".

**اصلب:** رەقتر، پتەوتر.

**اصلح:** چاکتر، شیاوتر، باشتر، هەژێتر. شیاوترین.

**اصلحیّت:** بڕوانە:"شایستگی".

**اصله:** بن، ریشە، نەمامێك.

**اصلی:** سەرەکی، بنەمایی، بنچینەیی، بنیاتی، بنەڕەتی.

**اصلیّت:** بڕوانە:"نسبت".

**اصلیه:** سەرەکی، راستەقینە.

**اصم:**1) کەڕ، گوێگران، گوێ کپ، نەژنەوا. 2) رەق و پتەو.

**اصناف:** پیشەوەران، گرووپەکان.

**اصوات:** کۆی"صوت"، ئاوازەکان، دەنگەکان. رستەتاکان.

**اصوب:** باشتر، چاکتر، راست تر.

**اصول:** بنەماکان، بناغەکان، بنیاتەکان، بنەڕەتەکان، بنچینەکان. رێساو یاساکان. پڕەنسیپەکان. هۆگەل، هۆکان.

**اصولاً:** لە بنەڕەتدا، لە بناغەڕا، لە بنچینەڕا.

**اصولگرایی:** بنەماخوازی، بنەڕەتخوازی، بناژۆیی، فەندەمێنتالیزم.

**اصولی:** پێڕەوی بنەماو رێساکان، لەسەربنەمای بنچینەو رێساکان، بنەمایی، بنچینەیی. لۆژیکی، لە رووی یاسا و لۆژیکەوە.

**اصهار:** (اِ) بوونە زاوای کەسێك.

**اصیل:** رەسەن، کەحێل، جسن، ریشەدار، نەجیب، قایم وپتەو، بنەچەدار، نەژادباش.

**اضائت:** بڕوانە: "اضائە".

**اضائە:** رووناك بوونەوە، رووناك کردنەوە، رۆشنکردنەوە.

**اضاعە:** 1) زایەکردن، بەبادان، بە فیڕۆدان، لە دەست دەرچواندن. 2) زۆربوونی ئاو و زەوی کەسێك. 3) تیمارنەکردن، چارەسەرنەکردن.

**اضافت:** 1) رەپاڵ دان. 2) هاوپێچ.

**اضافە:** زیادکردن، خستنەسەر، خستنەگەل، وەردان، سەربارە، سەرەڕا، زێدەبار، قیتەوەبوون و خۆنزیك کردنەوە لە شتێك. لە بیرکاری دا: کۆ. "**بەاضافە**": سەرەڕای ئەوە. (بیرکاری) کۆ، دەگەڵ.

**اضافەبار:** سەربار، سەربارە، سەروار، ناوبار، ناقبار، ناقبارك، نێوبار، ناوتا، مزۆدك، زێدەبار، تەمەڵێت، تەمبەڵێت.

**اضافەبر:** سەرەڕای.

**اضافەتولید:** بەرهەمهێنانی کاڵا زیاتر لە داواکاری بەکاربەران.

**اضافە حقوق:** سەرکرێ، سەرمووچە، سەرمەعاش.

**اضافەکار:** زێدەکاری.

**اضافی:** زیادی، ناپێویست. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "اضافەبار".

**اضاقە:** 1) تەسک کردنەوە، بەرتەنگ کردن.2) لەدەست چوونی ماڵی کەسێك، نیازمەندبوون، دەست کورتی، نەداری.

**اضجاع:** لەسەرتەنیشت خەوتن، هێنانەخواری شتێك، نیشتاندن.

**اضداد:** کۆی"ضد"، دژبەرەکان، نەیارەکان، دوژمنەکان.

**اضراب:** 1) نیشتەجێبوون. 2) سەرشۆڕ کردنەوە و بێدەنگ بوون. 3) هەڵگەڕانەوە، مانگرتن، دەست لەکار هەڵگرتن.

**اضرار:** (اِ) زیان پێگەیاندن، زەرەرمەندکردن.

**اضرار:** (اَ) کۆی"ضرر"، زیانەکان.

**اضطراب:** دڵەخورپە، دڵەتەپێ، دڵەکوتێ، دڵە خورپێ، دڵەڕاوکێ، هەژقین، هەلەبەل، نیگەرانی، شڵەژان، پەشۆکان، پەشۆکاوی، دڵخورتیو پەرێشانی، کەڵکەڵە. "**اضطراب کننده**": پەشۆکێنەر، پەرێشانکەر، نیگەرانکەر.

**اضطرار:** 1) بێچارەو نیازمەندکردنی کەسێك.2) بێچارەبوون، ناچاربوون، ناچاری، مەجبووری، داماوبوون. 3) بێچارەیی، داماوی.

**اضطراری:** نائاسایی.

**اضطرام:** کڵپەسەندن، بڵێسەسەندن.

**اضعاف:** (اِ) لاوازکردن، بێتین کردن،خاوکردنەوە.

**اضعاف:** (اَ) دووقات، دووبەرابەر.

**اضغان:** کۆی"ضغن"، کینەکان، رقەکان.

**اضلال:** گومڕاکردن، بێقام کردن، بەلاڕێدابردن ، چەواشەکردن، لەخشتە بردن، لە رێگای راست لادان، تەفرەدان.

**اضمحلال:** لەنێوچوون، تەفروتوونابوون، زایەبوون، لێك هەڵوەشان، لەبەریەك بڵاوبوون، لێك بڵاوبوون.

**اضیق:** تەنگ تر، تەسك تر.

**اطابە:** 1) خاوێن کردنەوە، حەڵاڵ کردن، بۆنخۆش کردن، خۆش چێژکردنی خواردەمەنی. 2) قسەی خۆش و شیرین گوتن.

**اطاعت کردن:** ملدان، مل راکێشان، ملکەچی، پەیرەوی کردن، گوێڕایەڵی، گوێدێری، بەگوێکردن، گوێشلکردن، گوێدان، پابەندبوون، فەرمان بردن، سەردانەواندن، سەرسپاردن.

**اطالە:** درێژە پێدان، درێژەکێشان، درێژکردنەوە، کێشاندن، خایاندن.

**اطالەکلام:** درێژکردنەوەی ئاخاوتە، درێژەپێدانی قسە.

**اطالە لسان:** درێژدادڕی، زمان درێژی، فرەوێژی، چێردرێژی.

**اطاول:** کۆی"اطول"، بە مانای درێژتر.

**اطایب:** کۆی"اطیب"، پاکتر.





**اطباق:** داپۆشین، خستنە سەریەك، تاکردن، پێکەوەنان، کۆڕایی، هاوڕایی.

**اطراء:** زێدەڕۆیی لە ستایشدا، زۆر پێداهەڵگوتن.

**اطراب:** وەشادیخستن، سروودگوتن.

**اطراح:** خستنەڕوو، هێنانە گۆڕێ. هاویشتن، دوورخستنەوە.

**اطراد:** دەرکردن، رەتاندن، دوور خستنەوە.

**اطراف:** لێوار، کەنارە، دەوروبەر، دەوروپشت، داوێن، قەراغ. "**دراطراف**": سەبارەت بە، لەبارەی. لە دەورووبەری.

**اطراف فراهم گرفتن:** ئامادەی کارێك بوون.

**اطراف و اکناف:** دەوروپشتی شتێ، هەموو جێیەك.

**اطرافیان:** خزم و کەسوکارەکان.

**اطروحە:** تێز، توێژینەوەی زانستی.

**اطعام:** دەرخواردن، خۆراك و خواردەمەنی دان، نان دان.

**اطفاء:** کووژاندنەوە، دامراندن، دامرکاندنەوەی ئاگر، تەمراندنی سوتمان، ئاگربڕ.

**اطلاع:** پێزانین، ئاگاداربوون، ئاگالێبوون، ئاگاداری، های لێبوون.

**اطلاعات:** زانیارییەکان، هەواڵەکان.

**اطلاع دادن:** راگەیاندن، پێڕاگەیاندن، ئاگادارکردن(ەوە).

**اطلاع دهی:** زانیاری دەر. زانیاریدان.

**اطلاع رسانی:** گەیاندنی هەواڵ و زانیارییەکان. "**مرکز اطلاع رسانی**": ناوەندی راگەیاندن.

**اطلاع یافتن:** ئاگاداربوون، زانین، بەخەبەربوون.

**اطلاعیە:** راگەیەنراو، راگەیەندراو.

**اطلاق:** 1) ئازادو سەربەست کردن، بەردان، بەڕەڵاکردن.2) پێگوتران، ناوزەد کردن، گشتاندن. "**براطلاق**": هەرگیز، بەهیچ کلۆنجێك.

**اطلس:** نەخشەی جوغرافیا، نەخشەنامە.

**اطماع:** (اِ) وە تەماح خستن.

**اطمینان:** دڵنیایی، خاترجەمی، ئەرخەیانی، بێخەمی، پشت راستی، دڵئاسوودەیی، پاڵ لێدانەوە.

**اطمینان خاطر:** دڵاوخواردنەوە، خاترجەم بوون، بێ خەمبوون، دڵنیابوون.

**اطمینان دادن:** خاترجەم کردن، ئەرخەیان کردن، پشت راست کردن.

**اطمینان داشتن:** دڵنیا بوون، ئەرخەیان بوون.

**اطمینان کردن:** پەڕمیان، خاترجەم بوون، دڵنیابوون، متمانەپێکردن.

**اطناب:** (اِ) 1) درێژدادڕی، درێژکردنەوە، زۆر بڵێیی، فرەوێژی. 2) زێدەڕۆیی لە پێداهەڵگوتن یان زەم کردن، پێ زیادکردن. 3) (ڕێزمان) درێژبڕی.

**اطوار:** رەوشت و کردەوە، ئەدا، ژێست.

**اطوال:** کۆی"طول" بەواتای درێژی.

**اطول:** درێژتر.

**اطهر:** پاکتر، خاوێن تر، پاقژتر.

**اطیب:** پاکتر، حەلاڵتر، بۆن خۆشتر.

**اظلال:** نسیٚکردن، سێبەرداخستن.

**اظلام:** تاریکایی داهاتنی شەو، لە تاریکیدا ڕۆیشتن.

**اظهار:** 1) لێدوان، دەربڕین، وتن، گوتن. 2) ئاشکراکردن، دەرخستن، نواندن، خستنەڕوو، پیشاندان، عەیان کرن. **"اظهار شده"**: دەربڕاو، درکاو.

**اظهارات:** قسەگەل، وتەگەل.

**اظهار فضل:** زانستی خۆ بە رووی خەڵکی دیکە دادان.

**اظهار لحیه:** قسەکردن لەبارەی شتێکەوە بە نیشانەی هەبوونی زانیاری لەسەری یان خۆنوێنیکردن.

**اظهار ناخشنودی:** دەربڕینی ناڕەزایەتی، لچ هەڵقرچاندن، لچ هەڵقوتاندن.

**اظهارنظر:** رادەربڕین، رابێژی.

**اظهار وجود:** بڕوانە: "ابراز وجود".

**اظهر:** ئاشکراتر، خویاتر، دیارتر.

**اعادت:** زیندووکردنەوەی دوای مەرگ.

**اعاده:** گەڕاندنەوە، گێڕانەوە، ناردنەوە، دانەوە، وێدانەوە، پێدانەوە، هاوردنەوە، هناردنەوە، ڤەگەڕاندن، هەڵگەڕاندنەوە. **"اعاده حیثیت"**: روو سپی کردنەوە، ئابڕوو کڕینەوە.

**اعادی:** کۆی "اعداء"، دوژمنان، ناحەزان.

**اعاذه:** دالدەدان، پەنادان، حەشاردان.

**اعاره:** دەستەوا، بە دەستەوایی‌دان.

**اعاشه:** بەخێوکردن، پەروەردەکردن، حاواندنەوە، ژیاندن، ژیاندنەوە. بژێوی. **"اعاشه‌کردن"**: دابین کردنی کەلوپەلی ژیان، ژیاندن.

**اعانه:** پیتاک، هشکبەر، باربوو بۆ یارمەتی هەژاران، یارمەتی‌کردن، ئاوڕلێدانەوە.

**اعباد:** نۆکەرگرتن، خزمەتکارگرتن، بەردەست گرتن. کۆیلەکردن.

**اعبار:** پەڕاندنەوە، تێپەڕاندن.

**اعتاق:** ئازادکردنی نۆکەر یان کۆیلە.

**اعتبار:** 1) پەندو عیبرەت وەرگرتن. 2) جیٚ باوەڕی، باوەڕی، جیٚ متمانە، جیٚ بڕوایی، باوەڕپێکردن، بەقاپێکردن، ئیحتوبار، پشت پێبەستن، پرستیژ، هورم. 3) (ئابووری) هەقی کەڵك وەرگرتن لە وام یان خەدەمات و کڕینی کالا بەبیٚ دانەوەی خێرای پوولٚ. 4) کات یان مۆڵەتی بەردەوامی شتیٚ. 5) بڕەپارەیەکی پێشبینی‌کراو لە بوودجە بۆ ئەنجامدانی کارگەلێکی دیاریکراو. **"از اعتبار افتادن"**: لە دەست دانی بەها و گرینگی خۆ، متمانەنەمان، بەقانەمان.

**اعتبارات:** بوودجە.

**اعتباردادن:** گرینگی پێدان، بایەخ پێدان.

**اعتبارداشتن:** گرنگی و بایەخداربوون، جێی متمانەبوون.

**اعتبارکردن:** متمانەپێکردن، بەقاپێکردن.

**اعتبارنامه:** ناسێن نامە، بڕوانامە، باوەڕنامە.

**اعتباری:** 1) بەشێوەی (اعتبار). 2) رێژەیی. 3) بڕوانە: "انتزاعی".





**اعتداء:** دەستدرێژی، زوڵم کردن، پەلاماردان.

**اعتداد:** 1) زۆربوون، بەئەژمارهاتن. 2) بایەخ وگرینگی پێدان. 3) سەربەرزی، سەربڵیندی. 4) خاوەنداریێتی کەسێك بەسەر شتێکدا.

**اعتدال:** 1) راست بوونەوە، راست وەستان، بەرابەربوون. 2) میانەڕەوی، مام ناوەندی، مام ناوەندێتی. 3) رێکی بەژن و بالا.

**اعتدالی:** میانەڕۆ، مام ناوەند.

**اعتذار:** لێبوردن خواستن، داوای لێبوردن کردن، پاکانەکردن، بیانووهێنانەوە.

**اعتذارآمیز:** لێبوردن خوازانە.

**اعتراض:** 1) ناڕەزایەتی، نارەزایی، دەنگ هەڵبڕین، پرۆتێستۆ. 2) لەقەم گرتن، رەخنەگرتن، پەڵپ گرتن، وردەگیری. 3) پێداچوونەوەخوازی. **"حق اعتراض"**: مافی ناڕەزایەتی دەربڕین، مافی رەخنەگرتن. مافی پرۆتیستۆ.

**اعتراف:** 1) دانپیانان، وەخۆ گرتن، درکاندن، راستی‌گوتن، راست رۆین، پیٚ لێنان، چوونە ژێر، دەرڤەدان، مکووڕبوون، مکوڕی، دەربڕین. 2) ناسین. **"اعتراف کننده"**: درکێن، درکێنەر، دان پیانەر، پیٚلێنەر، مقیڕ، مکوڕ.

**اعتراف گیری:** (ڕاستی)پیٚدرکاندن، ناچار بە دانپیانان کردن.

**اعتزا:** خۆڕەپاڵ کەسێك دان.

**اعتزاز:** شانازی کردن، بەڕێزبوون.

**اعتزال:** کەنارەگیری، گۆشەگیری، دوورەپەرێزی، تەریك بوونەوە.

**اعتساف:** لە رێگەی راست لادان، بەلاڕێدا رۆیشتن، زوڵم کردن.

**اعتصاب:** گریف، مان، مانە، ماهنە، مەنەر، جەنە، گە، گەی، هۆك، خەزر، غەزر. **"اعتصاب کردن"**: مانگرتن، دەست لە کار کێشانەوە، خوبواردن لە خواردنی غەزا، پێداگرتن، پیٚچەقاندن، پێداگرتن، گەگرتن، جەنەگرتن، هەڕمین، هەڕنین، هۆك کردن، خەزرین. **"اعتصاب کننده"**: مانگر، مانگرتو، گریڤکەر، گەگر، هۆکن، بەسی.

**اعتصابی:** مانگر، ئەوەی کە لایەنگری مانگرتنە.

**اعتصار:** گوشین، دەرهێنان.

**اعتصام:** پەنابردنە بەر، خۆ دوورەپەرێزگرتن لە گوناح، پەناگرتن.

**اعتضاد:** یارمەتی دان، کۆمەگ کردن.

**اعتقاد:** باوەڕ، بڕوا، باوەڕمەندی. **"اعتقاد داشتن"**: بەقاکردن، بڕواهێنان، بڕواپێبوون، باوەڕکردن.

**اعتقال:** گرتن، گیران، خستنە زیندان. بەستنەوە.

**اعتکاف:** گۆشەنشین بوون، لە شوێنێك مانەوە، سەرقاڵ بوون. 2) گۆشەنشینی، دوورەپەرێزی.

**اعتلاء:** بەرزبوونەوە، گەورەبوون.

**اعتلاق:** ئەوینی و هۆگری پەیداکردن بە کەسێك، سەوداسەری.

**اعتلال:** نەخۆش کەوتن. بیانووهێنانەوە، دەستیدەستیپێکردن.

**اعتلام:** پێزانین، ئاگاداربوون.

**اعتماد(کردن):** متمانە، متمانە پێکردن، رکان، پشتبەستن، پشت پێوەبەستن، رابینی، رابینین، رادیتن، تێرادینی، تێرادیتن، پێداپەرموون، بروایی، بروا پێدان، بروپێکردن، باوەڕپێهاتن، باوەڕی، باوەڕکردن، راپەرموون، بەقاپێکردن، خاترجەمی لە کەسێك.

**اعتماد بەنفس:** بڕوابەخۆبوون، لەخۆرادیتن، بەخۆداپەرموون، پشت بە خۆ بەستن.

**اعتمادسازی:** متمانەسازکردن، پێکهێنانی متمانە.

**اعتناء:** گرنگی دان، بایەخ دان، بایەخ پێدان، گوێ پێدان، بەتەنگەوەبوون، بەتەنگەوەهاتن، خەم لێخواردن، خەمخۆری، ئاوڕلێدانەوە، چاوتێوەبوون، چاوەدێری، خۆتێگەیاندن.

**اعتناق:** دەست خستنە گەردنی یەکتری، دەستەملان بوون.

**اعتیاد:** خووگرتن، خووپێگرتن، خووپێوەگرتن، تووشبوون، گیرۆدەیی، راهاتن، هۆگربوون، ئۆگربوون.

**اعتیادآور:** گیرۆدەییهێن، سڕکەر، بێهۆشکەر.

**اعجاب:** 1) وەسەرسوورمان خستنی کەسێك، سەرسامی، سەرسوڕمان. 2) خۆبینی، خۆپەسندی، پەسنی خۆدان، خۆڕانان.

**اعجاب انگیز:** سەرسام هێنەر، سەرسووڕهێنەر.

**اعجاز:** بەجێهێنانی کارێك کە لە توانای کەسێکی تردا نەبێ، پەرجۆ، بێ هاوتایی.

**اعجام:** (اِ) خاڵ و سەر و بۆر و ژێر دانان.

**اعجب:** سەیرتر، سەرسام تر.

**اعجم:** بێدەم و پل، کەسێ کە نەتوانێ بە دروستیو رەوانی بئاخوێ، کەسێ کە نەتوانێ بە زمانی عەرەبی قسان بکا.

**اعجمی:** ناعەرەب، بە هەموو کەسێکی دەڵێن کە عەرەب نەبێ.

**اعجوبە:** سەرسامکەر، واق و ورهێنەر.

**اعداء:** کۆی "عدو"، دوژمنان.

**اعداد:** (اِ) ئامادەکردن، تەیارکردن.

**اعداد:** (اَ) کۆی "عدد"، ژمارەکان.

**اعدام:** لەسێدارەدان، لەداردان، ب دار ڤەکرن، تیرباران، گوللەباران، لەناوبردن، نەهێشتن.

**اعدامی:** مەحکووم بە لەداردان.

**اعدل:** دادپەروەرتر، دادگەرتر.

**اعذار:** داوای لێبوردن، کردنە بیانوو.

**اعراب:** (اِ) 1) ئاشکراکردن و دەرخستن، رەوان بێژی، قسەرەوانی. 2) بزوێنە (سەرو بۆرو ژێر) دانان، پارزنین.

**اعراض:** (اِ) روو وەرگێران، رووڵێوەرگێران، پشت تێکردن، دووریکردن، خۆبواردن، خۆپاراستن.

**اعرف:** ناودارتر، ناسراوتر.

**اعزّ:** خۆشەویست تر.

**اعزاز:** قەدر زانین، رێزگرتن.





**اعزام:** ناردن، چوون، رەوانەکردنی کەسێك بۆ شوێنێ، رێکردن، بەڕێکردن، وەڕێخستن.

**اعسار:** لێکەوتوویی، رەجاڵی، دەست تەنگی، دەسکورتی، تووشی ئاتاجی بوون.

**اعصاب:** کۆی "عصب"، دەمارەکان. "اعصاب داشتن": هەبوونی ئاسوودەیی بیرکردنەوە و دۆخی دەروونی لەبار. "**اعصاب کسی را خرد کردن**": بە توندی نارەحەت و قەڵس کردنی. مێشك تێکدان، تێکدانی دۆخی دەروونی ئەو. "**اعصاب مختلط**": تێکەڵەدەمار. "**اعصاب مغزی**": مێشکەدەمار.

**اعصار:** (اِ) گەردەلوول، باهۆز، گێژەڵووکە، باوبۆران، بابەلیسك.

**اعصار:** (اَ) کۆی "عصر"، بە مانای دەورەو چاخ و رۆژگار.

**اعضاء:** کۆی "عضو"، ئەندامەکان.

**اعطاء:** بەخشین، پێدان،وێدان، داین، دان.

**اعظام:** (اِ) گەورەکردن، بەگەورەزانین.

**اعظم:** گەورەتر، پایەبەرزتر.

**اعقل:** ژیرتر، بەئاوەزتر.

**اعلاء:** 1) بڵندو بەرزکردنەوە، هەڵێنان، هەڵهێنان، بردنەسەر، وەسەرخستن. 2) زۆرباش، فرەخاس، عال. "**اعلای کلمه**": سەرکەوتنی بڕوا.

**اعلال:** نەخۆش خستن.

**اعلام:** راگەیاندن، ئاگاداری، وەئاگاهێنان، دانەزانین، جاڕ. "**اعلام دادن**": ئاگادارکردنەوە.

**اعلامنامه:** بڕوانە: "اعلامیه".

**اعلامیه:** راگەیەنراو، جاڕنامە، ئاگانامە.

**اعلان:** 1) ئاشکرا کردن، وەدیارخستن. 2) پێڕاگەیاندن، جاڕدان، بانگەواز، ریکلام، عام فام.

**اعلم:** زاناتر.

**اعلن:** ئاشکراتر، خویاتر، دیارتر.

**اعلی:** بەرزتر، بڵندتر، قۆزتر، سەروەتر.

**اعم:** گشتیتر، گشتگیرتر.

**اعماء:** (اِ) کوێرکردن.

**اعمار:** (اِ) 1) ئاوەدانکردنەوە. 2) دەوڵەمەندو بێنیاز کردنی کەسێك.

**اعماق:** قووڵایی، ناخ.

**اعمال:** (اَ) کارەکان، کردەکان، کردەوەکان.

**اعمال:** (اِ) بەکاربردن، گونجاندن.

**اعمال نظر:** سەپاندنی بیروبۆچوونی خۆت بە سەر دیتران دا.

**اعمال نفوذ:** (اِ) رەخنەکردن، دزەکردن، پێدزەکردن.

**اعمی:** کوێر، کۆر، کۆرە.

**اعنات:** رەنجاندن، تۆراندن.

**اعوان:** یاران، یاریدەدەران، دەست و پێوەندان.

**اعیاء:** 1) ماندووکردن، کەنەفت کردن، شەکەت کردن. 2) ماندوویەتی، شەکەتی، لەپەل و پۆکەوتن.

**اعیاد:** کۆی "عید"، جێژنەکان.

**اعیان:** دەرەبەگ، دەوڵەمەندان، گەورەپیاوان، پیاوماقووڵان. ئەریستۆکراسی. "**مجلس اعیان**": پارلمانی لۆردەکان.

**اعیانی:** ئاغاواتی، دەرەبەگی.

**اغاثه:** بەهاناوەچوون، فریاکەوتن، بەفریاگەیشتن، یارمەتیدان.

**اغاره:** تالان کردن، تالان و برۆ کردن، بەسەردادان.

**اغبرار:** تەپ وتۆزاوی بوون، خۆڵاوی‌بوون.

**اغتباط:** شادبوون، کەیف خۆش، ئارەزووکردنی ژیانی خۆشی کەسێك.

**اغتراب:** ئاوارەبوون، دوورکەوتنەوە لە زێد، کەوتنە غەریبایەتی.

**اغترار:** فریوخواردن، خەڵەتان، بەفیزو هەوابوون، لەخۆبایی بوون.

**اغتسال:** خۆشوشتن.

**اغتشاش:** پشێوی، شێواوی، تێکەڵ پێکەڵی، ئاڵۆزبلۆزی.

**اغتصاب:** زەوت کردن، لێ‌ئەستاندن، داگیرکردن، دەست بەسەرداگرتن.

**اغتفار:** بەخشین، لێخۆش بوون، لێبوورین.

**اغتماس:** چوونە ژێر ئاو. بناولێدان.

**اغتمام:** خەمناك بوون، خەمباربوون.

**اغتنام:** بە دەرفەت زانین، بە هەل زانین.

**اغتیاظ:** توورەبوون، رك هەستان.

**اغتیال:** لە نکاو کوشتن، رەشەکوژی، لەناو بردن.

**اغراء:** هەڵخڕاندن، هان دان، ناچارکردن، شەڕ هەڵایساندن نێوان دوو کەس، تێکبەردان.

**اغراب:** شتی نوێو سەیرو سەمەرە هێنان.

**اغراس:** دارچاندن، نەمام چاندن.

**اغراض:** کۆی"غرض".

**اغراق:** 1) نغرۆکردن، خنکاندن، نوقوم کردن.2) زێدەڕۆیی، زیاد پێوەنان، پێ‌لێداگرتن.3) شاتوشووت کردن.

**اغراق آمیز:** زێدەڕۆیانە، ناواقیعی.

**اغرب:** نامۆتر، سەیرتر.

**اغشاء:** داپۆشاندن.

**اغضاء:** چاوپۆشی، چاوپۆشین، لێ‌بوردن.

**اغفال:** خڵافاندن، خافڵاندن، تەفرەدان، خاپاندن، فریودان، هەڵخەڵەتاندن، دەسخەڕۆکردن، لە خشتەبردن، دەست بە زاخاکردن، کەڵەك لێدان، قۆڵ بڕین، دەست بڕین، دۆشین.

**اغلاء:** 1) گران کردن، بە گران کڕین. 2) کوڵاندن.

**اغلاط:** (اِ) هەڵە پێکردن، سەهووپێکردن، شاشی‌کرن.

**اغلاق:** (اِ) 1) دەرگابەستن، پێوەدان، داخستن، بەستن. 2) دژوارو ئاڵۆز کردنی کار یان بابەتێك.





**اغلال:** خیانەت کردن، ناپاکی کردن، رك هەڵگرتن.

**اغلب:** زۆربە، گەلێ‌جار، زۆرجار، زۆرجاران، زۆرتر.

**اغلوطه:** ئاخاوتنی هەڵە. دژوازی. "**اغلوطه‌دادن**": خستنە گومانەوە، فریودان.

**اغماء:** لەهۆش چوون، لەخۆچوون، بوورانەوە، لەپڕ، بێهۆشی، دڵ بووردنەوە، بێهۆش بوون، شۆبە.

**اغمار:** کۆی"غمر"، نەزان و بێ‌ئەزموون.

**اغماز:** لەقەم گرتن، بێ‌ڕێزو سووك کردنی کەسێك لای خەڵکی.

**اغماض:** چاوپۆشین، چاوپۆشی، چاوپۆشان، چاولێ‌پۆشین، چەم پۆشی، لێ‌ بووردن، بەخشین، چاولێ قووچاندن، چاونووقاندن، پێ پیاساوین.

**اغن:** منگن، مینگن.

**اغناء:** دەوڵەمەندکردن، بێ نیازکردن.

**اغنی:** دەوڵەمەندتر، بێ نیازتر.

**اغواء:** گومڕاکردن، بەلاڕێ‌دابردن، فریواندن، خڵەتاندن. "**اغواء کننده**": فریودەر، خڵەتێن، خاپێنەر، گومڕاکەر.

**افاده:** 1) کەلك دان، بەهرەدان، قازانج پێگەیاندن.2) فیز، خۆبینی، خۆنوێنی، لووت بەرزی. "**افاده‌مرام**": دەربڕینی مەبەست.

**افاضه:** 1) ئاو بە خۆداکردن، لێوڕێژکردن. 2) بەهرە پێگەیاندن.

**افاقه:** خۆشبوونەوە، چاك بوونەوە، لە نەخۆشی راست بوونەوە. وەخۆهاتنەوە، بەهۆش هاتنەوە.

**افت:** 1) کەوتن. 2) دابەزین ، کەمبوونەوە، دەراویشتن لە کڕدراو، لەحیساب دەراویشتن، ئەفرۆز، بەهیچ نەگرتن، پشت گوێ خستن، فڕێدان لە کۆدا، (لە ئابووریدا) داتەپین، هاتنەخوار. 3) کەم و کورتی، ناتەواوی، کێمی."**افت و خیز**": کەوتن و هەستانەوە، بە ئەسپایی رۆیشتن و پەلەکردن. سەرکەوتن و ناکامی. هاتوچۆ.

**افتادگی:** خاکەڕایی، خاکێتی. لارەوەبوو.

**افتادن:** کەوتن، کەفتن، کەتن، داکەفتن، داکەوتن، کەوتنە خوار، بەربوونەوە، کەوتش، گلیان، گنین. "**افتادن بدون اراده**": بەلادا کەوتن. "**افتاده**": کەوتوو، کەفتوو، بەرەوبووگ، کەفتی، کەفتگ، کەفتە. بێ‌فیز، خاکەڕا. داماو، عاجز. شەیدا، عاشق. رووداو، بەسەرهات.

**افتالش:** بڕوانە:"رسوایی".

**افتالیدن:** پڕژانن، بڵاوکردنەوە، دڕاندن، تلێشاندن، کەلاشتن. ئابڕووچوون.

**افتتاح:** کرانەوە، کردنەوە، ئاوەڵاکردنەوە.

**افتتاحیه:** درگاژەنانە، شیرینی‌دان بە هۆی کردنەوەی دام و دەزگایەك. کرانەوە.

**افتتان:** شەڕەنگێزی، گێرەشێوێنی، ئاژاوەنانەوە.

**افتخار:** شانازی، هەمبازی، سەربڵندی، سەربەرزی، ناز پێوەکردن، پێوەنازین، پێنازین، نازین.

**افتخارآمیز:** جێگەی شانازی، پڕسەروەری.

**افترا:** خۆهەڵبەست، بوختان و هەڵبەستی درۆ، بوختان پێکردن، قسەهەڵبەستن، تۆمەت لێدان، دەس هەڵبەس، چەفتە.

**افتراش:** شەوجێیی، بەربڵاوبوون، خستن، ڕێگەپێوان.

**افتراض:** بەدەرفەت زانین، هەل قوازتنەوە، گریمانکاری.

**افتراق:** جیابوونەوە، لێك جیابوونەوە، لێك بوونەوە، لێبوونەوە، لێك هەڵبڕین، هەڵبڕان، تاك بوونەوە، دابڕان، لێك کردن، ترازان.2) جیایی.3) جیاوازی.

**افتضاح:** ئابڕووچوون، ئابڕووبران، ئابڕووتکان، ناوزڕان، خەنزاری.

**افتضاح آمیز:** ئابڕووبەرانە، سەرشۆڕانە.

**افتعال:** بوختان و درۆ بۆ کەسێکی هەڵبەستن.

**افتقاد:** 1) ون کردن، لەدەست دان، گەڕان بە دوای گوم بوودا. 2) دلۆڤانی و دلدانەوە.

**افتقار:** هەژاربوون، بەلەنگازبوون، ئاتاجی، دەس کورتی و نەداری.

**افتکارکردن:** بیرکردنەوە.

**افتکاك:** لێك جیابوونەوە، جیابوونەوە، لێك هەڵبڕان، هەڵبڕان، لێك بوونەوە، لێك ترازان، هەڵوەشانەوە.

**افتیدن:** بڕوانە: "افتادن".

**افحاش:** جوێن دان.

**افخم:** گەورەتر، پایە بەرزتر.

**افد:** (اَ.فْ) سەیر، دایلان، سەرسووڕێنەر.

**افد:** (اَ.فَ) وەپەلەکەوتن.

**افدم:** ئەنجام، سەرەنجام، دویماهی، کۆتا، کۆتایی.

**افدیدن:** سەرسووڕمان، واق مان.

**افژول:** دنە، داوا، پێداگرتن. 2) وڕووژاوو شێواو، پەرێشان. "**افژولنده**": وڕووژێنەر، پەرێشان کار. "**افژولیدن**": وڕووژاندن، پەرێشان کردن. "**افژولیده**": پەرێشان، وڕووژاو، دنە دراو.

**افر:** پێشنیار، پێشنیاز.

**افراخ:** (اِ) 1) جووچکەهەڵێنان، دەرهاوردن. 2) ترس رەوینەوە. 3) ئاشکرابوونی کار یان راز.

**افراختن:** هەڵدان، هەڵێنان، بەرزکردنەوە، بڵیندکرن، بردنەسەر. "**افراخته**": هەڵدراو، هەڵێنراو، بەرزکراو، بەرزکراوە.

**افراز:** (اَ) هەوراز، بەرەوژوورکە، هەورازی کەم.

**افراز:** (اِ) جوێکردنەوە، جیاکردنەوە، لێك کردنەوە، لێك ترازاندن، دابڕین، دابڕدان، دابەش کردن.





**افرازمند:** وەستایانە. "**نیمە افرازمند**": نیمچە وەستایانە.

**افرازنده:** هەڵێنەر، بڵیندکەر، بەرزەوەکەر.

**افرازیدن:** بڕوانە: "افراختن".

**افرازیده:** بڕوانە: "افراخته".

**افراشتن:** بڕوانە: "افراختن".

**افراض:** جیرەو بەراتیدان بە کەسێك.

**افراط:** 2) زێدەڕۆییکردن، توندڕۆییکردن، لە ئەندازە و سنوور تێپەڕاندن.2) زێدەڕۆیی، پێوەنان. "**به افراط**": زیاد لە ئەندازە، زۆر.

**افراط آمیز:** زێدەڕۆیانە، توندڕۆیانە، پەرگیرانە.

**افراط گرا:** زێدەڕۆ(خوان)، توندڕۆ، پەڕگر، بیرکورت، بیرتەسك.

**افراطی:** بڕوانە: " افراط گرا".

**افراطیگری:** دەمارگرژی، دەمارگیری، بیرکورتی.

**افرزمند:** ئامرازکار، ئامێرکار.

**افرندن:** رازانن، رازاندنەوە، خەملاندن.

**افروختگی:** ئاییسان، هایسان، هەڵگیرسان، هەلگرسان، پێکران، پێ بوون، گیسەنە ، گڕ لێپەیدابوون، سووربوونەوە.

**افروختن:** داگیرسان، داگیرساندن، داگرساندن، داگریساندن، هەڵگیرسان، هەڵگیرساندن، هەلگرساندن، هەلگرسانن، هەڵبوون، گڕ لێپەیداکردن، گڕ تێبەردان، پێکردنی ئاگر، پێکران، وێبوون، گیسنای، هەڵکردن، هەڵگڕان، پێکردن، وێکردن، ئایساندن، رۆشن کردن، فێخستن، هۆرکریان، هۆرگرتن."**افروختن تنور**": داخستنی تەندوور، تەندوور نێڵ دان، وەبڵێسەخستن. "**افروخته**": هەڵکراو، هەڵگیرساو، هەلگرسیاو، داگرساو، ئاگر پێبووگ، پێکراو، رۆشن، هەلکری. "**افروختەشدن**": بڕوانە: "افروختن".

**افروز:** هەڵایسێن، هەڵگیرسێنەر.

**افروزان:** بەدرەوشین، بەدرەوش، درەوشاوە، بریقەدەر، گەش، بڵێسەدار.

**افروزاندن:** بڕوانە: "افروختن".

**افروزش:** 1) رووناکی، رووناکایی، تیشك. 2) بڕوانە: " اشتعال".

**افروزنده:** هەڵایسێن، پێکەر، ئاگرپێکەر، ئاگر هەڵکەر، رووناك کەرەوە، درەوشاوە، دروشین، گەشێنەر.

**افروزنه:** شنکی، دەستەچیلە، دەستەچیلکە، دەساگر، دەساور، ئاگرگیرە، پڕوپووش بۆ ئاگر کردنەوە، چاوك، چاوگ، چاوە، چاوداگیرسێن، چاوڕۆشنکەرە، ئاوردوو.

**افروزه:** بڕوانە:"افروزنه".

**افزار:** ئامراز، ئەسپاب، کەرەستە، ئالات.

**افزارگان:** ئامرازەکان، کەلوپەلەکان، کەرەستەکان.

**افزارکار:** میکانیك، نووژەنکار.

**افزاع:** ترساندن، بزداندن.

**افزانه:** بڕوانە:"مجموعه".

**افزایش:** بەرزبوونەوە، بەرزبوون، زیادبوون، زۆربوون. "**افزایش دادن**": بردنە سەر، لێ زیادکردن، زیادکردن. "**افزایش یافتن**": چوونە سەر، بەرزبوونەوە.

**افزاینده:** زیادکەر، زۆرکەر.

**افزاییده:** بڕوانە: " افزودە ".

**افزاییدن:** بڕوانە: "افزودن".

**افزودن:** 1) زۆرکردن، فرەکردن، زیاترکردن.2) زۆربوون، فرەبوون. "**افزوده**": زۆرکراو، فرەکراو.

**افزون:** زۆر، فرە، زاف، بۆش، زەحف، گەلێك، گەلەك، زێدە، پتر، پڕ.

**افزون خواهی:** زێدەخوازی.

**افزون طلب:** زێدەخواز.

**افزون مایه:** بەهرەمەندبوون لە زانست یان سامان.

**افزونی:** زۆری، فرەیی. کردارێك کە بەجێهێنانی پاداشی هەبێ و وازلێهێنانیشی گوناە و سزای نەبێ.

**افزونیدن:** لەسەرتردانان، بەباشترزانین.

**افزونی جستن:** زێدەخوازبوون.

**افزونی گرفتن:** کەم کەمە زۆر بوون.

**افژولیدن:** هەڵخڕاندن، هاندان.

**افساد:** رزاندن، داڕزاندن، داقناندن، بە فیڕۆدان. ئاژاوە و گەندەڵی نانەوە، شۆفاری.

**افسار:** دزگر، هەوسار، رەشمە، دەسکەڕێشمە، جڵەو، جەڵەو، قامچی لغاو. "**افسار بەدست کسی بودن**": ملکەچی بێئەملاوئەولای ئەو بوون. "**افسار کسی را دردست داشتن**": زاڵبوون بە سەریدا، لە کوردیدا دەڵێن کلکی لەبەر دەستم دایە.

**افسارگسیخته:** هەوسارپچڕاو، هەوسار پساو. سەرکێش، سەربزێو.

**افسانه:** رازە، چیرۆکی خەیاڵی، ئەفسانە، سەربوردە، هەقایەت.

**افسانەای:** ئەفسانەیی، وەك ئەفسانە، ناواقیعی. بەشکۆ.

**افسانه پرداز:** بێژەری ئەفسانە. تایبەتمەندی ئەو کەسەی لە گێڕانەوەی راستییەکان دا خەیاڵیان ئاوێتە دەکا.

**افسانەشدن:** 1) تیاچوون، لەناوچوون یان مردنی کەسێك و بەسەرهاتەکەی بوونە ئەفسانە. 2) ناو/ ناوبانگ دەرکردن.

**افسانەکردن:** ناودارکردن.

**افساینده:** رامکەر، جادووگەر، سێحرباز.

**افساییدن:** فێڵ کردن، جادوو کردن، رام کردن.

**افسد:** گەندەڵتر، خراوتر. گەندەڵترین، خراوترین.

**افسر:** ئەفسەر، پلەمەند.

**افسردگی:** 1) خەمۆکی. 2) کزی و خەمباری، دڵگیران، ژاکاوی، گرژی، ناهومێدی. 3) بڕوانە: "انجماد".

**افسردن:** 1) سیس بوون، ژاکان، گرژبوون. 2) سەهۆڵ کردن، رەق بوون. 3) خەمباربوون، ناڕەحەت بوون. "**افسرده**": ژاکاو، چرچاو، کز و سیس، دوژ، خەمبار، مات و کز، خەمۆك، ناڕەحەت، دڵتەنگ، زۆیر، گرژ، مەرس، بەستوو، رەق هەڵاتوو. "**افسردەکردن**": دەماخ پروانن، وەڕەزکردن، کەیف تێکدان، ناڕەحەت کردن.





**افسوس:** 1) زوڵم، زۆرداری.2) وشەی خەمخۆری، مخابن، مەخابن، بەداخەوە، داخم، حەیف، حەیفێ، پەکو، تەقو، حەیف وخەسار.3) تەوزە، تیز، گەمە.

**افسوس خوردن:** داخ و هەسرەت خواردن، بوونی هەستی داخ و پەشیمانی و ناخۆشحاڵی بە هۆی لەدەست دان یان نەبوونی شتێ، ئارەزووی زۆرکردن.

**افسوس کردن:** گاڵتەپێکردن، تیتاڵی پێکردن.

**افسوسگر:** تیزپێکەر، تەوزەپێکەر.

**افسوسی:** زاڵم.

**افسون:** فرت و فێڵ، گزی، کەڵەك، جادوو، سێحر.

**افسون ساز:** سێحرباز. فێڵباز، تەڵەکباز.

**افسون کردن:** فێڵ کردن، کەڵەك لێدان. سێحرکردن. چارەدۆزیکردن.

**افسونگر:** 1) جادووگەر، سێحرباز. 2) فرە سەرسووڕهێنەر. 3) جوان چاکی دڵگر و دڵڕفێن.

**افسونگری:** جادووگەری، سێحربازی.

**افشاء:** ئاشکرا (کردن/ بوون)، فش کردن، بڵاو (بوونەوە/ کردنەوە)، خستنەڕوو، لەدەم دەرچواندن، پەردەلەسەرلادان، درکاندنی نهێنی، زڕاندن، راستی لێگوتن، لێهلدان.

**افشاردن:** بڕوانە: "افشردن".

**افشاردن:** بڕوانە: "افشردن".

**افشاگری:** ئاشکراکردن، لەقاودان.

**افشان:** پرژۆڵ، پرژ، پرش، وەشان.پەرێشان. بە مانای پرژێنەر دێ لە کاتی پاشگردا وەك (آتش افشان): ئاگر پژێن.

**افشاندن:** بڵاوکردن، بەلاڤ کرن، بڵاوکردنەوە، پرژاندن، پرژانن، وەشاندن، وەشانن، هەڵاویشتن.

**افشانده:** بڵاو، بەلاڤ، پرژ، پەرژ.

**افشانه:** ئیسپرەی.

**افشاننده:** پرژێنەر، بەلاڤکەر.

**افشانیدن:** بڕوانە: "افشاندن".

**افشردن:** هەڵ پشاوتن، هەڵپشافتن، بشافتن، پشافتن، هەڵکوشین، هەڵکوشان، هەلگلۆفان، هەلگلۆفتن، هەلگلۆفین، هەلگولۆفان، هەڵگوشان، هەڵگوشین، گوشین، گوشان، گوشانن، گوشیان، گۆشین، گوشران، کوشران، کوش، کوشین، رێك گوشین، راگوشین، راگڤاشتن، مزدان. "**افشرده**": کووشراو، گووشراو، گوشیاگ، گوشیاو، گڤاشتی.

**افشرنده:** گوش، هەڵگوشەر، هەڵگولۆفەر.

**افشره:** سووکەڵەناوی"افشردە"، خۆشاو، شیلە، شیرە.

**افصاح:** بەڕوونی ئاخاوتن، رەوانی ئاخاوتە.

**افصح:** خۆش راوێژتر، تەڕزمان تر، دەماوەرتر.

**افضاء:** 1) بەرەو فەزاچوون، ئاوەڵاكردنەوەی شوێن.2) باسكردنی راز لای كەسێك.3) تێگەیاندن.4) راشكاوانە.

**افضل:** زاناتر، زیاتر، باشتر.

**افطار:** بەربانگ كردنەوە، رۆژوو شكاندن، رۆژووكردنەوە، دەم واكردە.

**افطاری:** ئەوەی كاتی بەربانگ دەیخۆن یان دەدرێ بە رۆژەوانان.

**افعال:** كۆی "فعل"، كارەكان، كردارەكان.

**افق:** ئاسۆ، ئاسۆگ، هاسۆ، هەسو، سوێگە، ماك. پانتایی، گۆڕەپان. سەرزەوی.

**افغان:** هاوار، هەوار، ناڵە.

**افقر:** نەدارتر، هەژارتر.

**افقه:** زاناتر، بیرمەندتر.

**افقی:** ئاسۆیی، هەسوویی، كێڕی، راست و لەدرێژەوە. (لە جوغرافیادا)ئاسۆیی، (لە هێندسەدا) پۆیی. "**محور افقی**": تەوەرەی ئاسۆیی. "**اختلاف افقی**": ناكۆكی ئاسۆیی.

**افك:** درۆ، تۆمەت.

**افكار:** كۆی "فكر"، بیروڕاكان، بۆچوونەكان. "**افكار عمومی**": بیروڕای گشتی. "**افكار فطری**": بیرە خۆڕسكەكان.

**افكل:** گرووپ، دەستە.

**افكندن:** هاویشتن، هاویژتن، فڕێدان، تووڕدان، تووڕهەڵدان، خستن، داخستن. راخستن، پان كردنەوە. رشتن. خستنەدواوە، سپاردن. لەسەرهەڵگرتن، لابردن. بەتاڵ كردنی ریخۆڵە. "**افكندە**": هاوێژراو، تووڕدراو، فڕێدراو. "**افكنندە**": هاوێژەر، فڕێدەر.

**افگار:** دڵشكاو، ماندوو، رەنجاو، كزو داماو، ئەوگار، سیس هەڵگەڕاو. بریندار، زامدار.

**افگانگی:** بڕوانە: "سقط جنین".

**افگانه:** لەبەرچووگ، بێچووی بە مردوویی زاو. "**آفگانەكردن**": بەرخستن، لەباربردن.

**افلاس:** 1) نەداربوون، نابووت بوون، مایەپووچ بوون.2) نەبوونی، نەداری، چنەیی، نابووتی. "**بە افلاس افتادن**": تووشی دەسكورتی و هەژاری هاتن.

**افلاسنامه:** نابووتنامە.

**افلاق:** قسەی سەیرو سەمەرە هێنانەوەی شاعیر.

**افلاك:** گەردوون.

**افلیج:** سەقەت، گۆج، گێڕ، لەگۆكەوتوو، شەپڵەلێدراو.

**افناء:** قڕكردن، قڕان تێخستن، لەنێوبردن، لەناوبردن، تەفروتووناكردن.

**افندی:** ئاغا، ساحێو، خاوەن.

**افندیدن:** بڕوانە: "آفندیدن".

**افنون:** 1) جۆر، چەشن.2) لقی تێك ئاڵاو. 3) هەڕەتی لاوێتی. 4) ئاخاوتەی كورت و شاراوە.





**افواج:** كۆی "فوج"، گرووپەكان، دەستەكان.

**افول:** ئاوابوونی خۆر، داچوونی خۆر، داكشان، بزربوون، پووكانەوە، پووچانەوە، كەمكردن و چرچ هەڵگەڕان. لەناوچوون، هەرەس هێنان.

**افهام:** (اِ) تێگەیاندن، فاماندن، حاڵیكردن.

**افهام:** (اَ) كۆی "فهم".

**اقاله:** 1) تێكدانی مامەڵە. 2) بەخشین، لێبوردن.

**اقامت:** مانەوە لە شوێنێ، نیشتەجێ بوون، نیشتەجێیی، جێگرتن، جێخۆش كردن، دیماتی.

**اقامه:** دابەستن، قامەت بەستن، دەست پێكردنی نوێژ و نییەت. "**اقامە دعوا**": (مافناسی) خستنەڕووی سكاڵا. "**اقامەدلیل**": بەڵگەهێنانەوە.

**اقباض:** 1) كالان دروست كردن بۆ شمشێروهتد. 2) گرتن، دەست بە سەرداگرتن.

**اقبال:** 1) رووتێ كردن، پێشوازی لێكردن، هاتنە پێش و بەرەوڕووچوون، لالێكردنەوە. 2) بەخت، هات، شانس، ئامەد، ئامەو. 3) خۆشبەختی، بەختەوەری.

**اقبال زمانه:** لەباربوونی رۆژگار.

**اقبالمند:** بەختەوەر، بەختیار.

**اقبح:** دزێوتر، ناشیرین تر.

**اقتباس:** 1) قازانج وەرگرتن و زانست فێربوون لە كەسێك.2) لێوەرگرتن، لێفێربوون، گێڕانەوەو وەرگرتنی بابەتێك لە كتێب یان رۆژنامە.

**اقتحام:** 1) بێ بیر كردنەوە خۆ لە كارێكی هەڵقورتاندن، خۆتێهەڵقورتاندن. 2) خۆ خستنە ئازارو كوێرەوەرییەوە. 3) بەسووك و كەم گرتنی كەسێك.

**اقتداء:** پەیڕەویكردن، وەشوێن كەوتن، رەدووكەوتن، وەدووكەوتن. لاساییكردن، لاساكردنەوە.

**اقتدار:** دەسەڵاتدارەتی، دەسەڵاتدارێتی، باڵادەستی، بەهێزبوون، میرایەتی، گەورەیی، هێز، توانایی.

**اقتدارگر:** خاوەن دەسەڵات، بە هێز و توانا.

**اقتدارگرا:** دەسەڵاتخواز، دەسەڵات ویست، گشتخواز.

**اقتدارگرایی:** توتالیتاریزم، ئۆتۆریتریانیزم، گشتخوازی.

**اقتراب:** لێك نزیك بوونەوە، تخوون یەك كەوتن.

**اقتراح:** بێبیركردنەوە ئاخاوتن، داهێنانی نوێ بە بیر و سەلیقەی خۆ، پێشنیار، پێشنیاز، راپرسی لەمەڕ مەسەلەیەك لە راگەیەنێكی گشتییەوە، هەڵبژاردنی شتێك.

**اقتراض:** قەرز كردن.

**اقتراع:** دەنگ دان، پشك هاویژتن.

**اقتراف:** 1) وەدیهێنان، بەدەست هێنان، کۆشش کردن. 2) گوناه کردن، تووشبوون.

**اقتران:** 1) نزیك بوونەوەو بوونە دۆست و یار، جووت بوون. 2) نزیکی، پێوەندارێتی.

**اقتسام:** 1) دابەش کردن. 2) سوێند خواردن.

**اقتصاد:** 1) میانەڕەوی، میانەڕەوی کردن. 2) ئابووری، economy.
"**اقتصادباز**": ئابووری بە بێ سنووردارێتی بازرگانی یان بەبێ بەرتەسك کردنەوەی هەنارده و هاورده، ئابووری کراوە.
"**اقتصادبسته**": ئابووری بێ هەنارده و هاورده، ئابووری داخراو.

**اقتصاددان:** ئابووریزان، ئابووری ناس، پسپۆڕی زانستی ئابووری، "economist".

**اقتصادی:** ئابووریی، ئابوورییانە، ئابووریکار، بەقازانج، بەبەهرە، economic. ئابووری زان.

**اقتصار:** 1) کورت کردنەوە. 2) بڕوانە: "اکتفا".

**اقتصاص:** 1) تۆڵەسەندنن، تۆڵە لێکردنەوە. 2) چیرۆك گێڕانەوە.

**اقتضاء:** 1) ویستن، خوازتن، داواکردن. 2) شیاوولەباربوون. 3) تکا، داوا.

**اقتطاع :** بڕین، بڕان، جوێکردنەوە.

**اقتطاف:** میوە چنین، میوەڕنین. وەدەست هێنان.

**اقتفاء:** 1) پێڕەوی‌کردن، وەدواکەوتن. 2) شوێن هەلگرتن، شوێن پێ‌هەلگرتن.

**اقتلاع:** هەڵکەندن، هەڵکەنران، لە ریشە دەرهێنان، لە بن دەرهێنان، هەڵکێشان.

**اقتناص:** 1) راوکردن. 2) بڕوانە: "اسارت".

**اقتناع:** دابین کردن و پاشەکەوت کردنی سامان، پەزمەنە کردن.

**اقحاط:** وشکەسالی، قاتوقڕی.

**اقدار:** بەهێزکردن.

**اقدام:** هەوڵدان، تێکۆشین، هەنگاونان، پێشکەوتن لە کارێك دا، داپەڕ، چاونەترسان لە کار، دەست برن، دەست بردن.

**اقدر:** تواناتر، بەهێزتر.

**اقدس:** پیرۆزتر، پاکتر.

**اقدم:** پێشتر، پێشووتر، بەرتر، بەروتر، وەبەرتر،مێژینەتر، کۆنتر.

**اقرار کردن:** درکاندن، راستی گوتن، دانپیانان، پێ‌لێنان، مکووڕبوون، پێ‌هاتن، چوونە ژێر، خستنەڕوو. "**اقرارکننده**": بڕوانە: "اعتراف کننده".

**اقراض:** قەرزدان.

**اقراع:** پشك هاویشتن.

**اقساط:** (اِ) دادگەری کردن.





**اقساط:** (اَ) کۆی"قسط".

**اقسام:** (اِ) سوێندخواردن.

**اقسام:** (اَ) 1) بەشەکان، بەهرەکان. 2) سوێندەکان.

**اقصاء:** دوورتر. دوورترین.

**اقصر:** کورت تر.

**اقصی:** دوورتر، ئەوپەڕ.

**اقطاع:** 1) لۆمەکردن. 2) بڕینی بەشێ لە شتێك و دانی بە کەسێك. 3) بەخشینی پارچەزەوییەك لەلایەن خەلیفەوە.

**اقعاد:** دانیشاندن، رۆنیشاندن.

**اقفال:** 1) کلۆم دان، پێوەدان، گاڵەدان.2) گەڕاندنەوە.

**اقل:** کەم تر.

**اقلاً:** لانیکەم، بەلانیکەم، بەلای کەمەوە، کەمایی، کەمینە، بەشی کەم، کێمیڤە، هیچ نەوێ، هیچ نەبێ، دەس ئاخر.

**اقلاق:** ئۆقرە لێبڕین، شڵەژاندن، بزواندن.

**اقلال:** (اِ) کەم کردنەوە، کەمایەسی، دەسکورتی، ئاتاجی، هەژاری.

**اقلام:** کۆی"قلم". چەشنەکان، جۆرەکان. قەڵەمەکان.

**اقلیّت:** کەمینە، کەمایەتی، کەمایی.

**اقلیم:** هەرێم، وڵات، سەرزەوی، ناوچە، کاڤار.

**اقلیم گرایی:** هەرێم خوازی، هەرێم گەرێتی.

**اقلیمی:** هەرێمی، ناوچەیی.

**اقناع:** رازی‌کردن، قەناعەت پێکردن، قایل کردن، هێنانە باوەڕ.

**اقواء:** نیازمەند بوون، نیشتنەوە لە رووتەڵان، دوایی هاتنی تێشو.

**اقوال:** قسەکان، گوتەکان.

**اقوام:** کۆی"قوم".

**اقوس:** چەماوە، نووشتاوە.

**اقوی:** بەهێزتر، پتەوتر.

**اقهر:** زاڵتر.

**اقیانوس:** زەریا، ئوقیانووس.

**اکاذیب:** درۆیەکان، هەڵبەستەکان.

**اکال:** فرەخۆر، زۆرخۆر.

**اکبر:** گەورەتر، بەتەمەنتر.

**اکبیر:** پیس، ناحەز، کرێت.

**اکتتاب:** 1) نووسین، کتێو نووسین. 2) (ئابووری) دەسیاو.

**اکتراء:** بە کرێ گرتن، بەکرێدان.

**اکتساء:** دەبەرکردن، پۆشین، داپۆشین.

**اکتساب:** وەدەس هێنان، وەدەس خستن، دەس کەوتن، قازانج کردن، کۆوەکردن. فێربوون.

**اکتسابی:** ئەوەی وەدەست بێ.

**اکتساح:** رامالین، راپێچان.

**اکتشاف:** دۆزینەوە، دەرخستن، ئاشکراکردن، پەیداکردن، پێگەیشتن.

**اکتشافی:** 1) سەر بە"اکتشاف". 2) دۆزراوەیەتی. 3) گرۆپێ کە بۆ دۆزینەوەی زانیاری لەمەڕ دوژمنەوە ئیش دەکەن. 4) فرۆکەیەك کە مەئموورییەتی دۆزینەوەی شوێنی دوژمن و وەدەست هێنانی زانیاری لە بارەی ئەوانەوەیە.

**اکتفاء:** رازیبوون، بەس کردن، بەس بوون، تێربوون.

**اکتناز:** پاشەکەوت کردن.

**اکتـنـاف:** 1) خستـنـه ژێـر بـاڵ. 2) حەشارگە سازکردن، دەورەدان.

**اکتناه:** گەیشتنە ئەنجامی شتێ، پەی بردن بەنێوەرۆکی شتێ.

**اکتـودرم:** (پزیشکی) دەرەتوێژ، چینی دەرەوە.

**اکتهال:** پیربوون، تەمەنی نێوان سی تا پەنجا.

**اکتیال:** پێوانەکردن.

**اکتیو:** چالاک، زرک، ئاکتیڤ.

**اکتیواسـیون:** پرۆسەی چالاک کردنی مەوادی کیمیاوی لە ڕێگەی گەرم کردنەوە یان وزەپێدان یان خستنە بەر تیشك.

**اکثـار:** 1) زۆرکـردن، فرەکـردن. 2) زێدەڕۆیی کردن.

**اکثر:** زۆربە، زۆرتر، فرەتر.

**اکثریـت:** زۆرینـە، زۆرم، زۆرمـە، بەشـی زۆر، زۆربـە، بەشـی زۆربـە، بەشـی هـەرەزۆر، تەخـەر، زۆراتـی، زۆرایـەتی، پتری خەڵك، غاڵبە، پێرایی. "**اکثریَت قریب بـه اتفاق**": نزیکـەی تـەواوی کەسـەکان. "**اکثریَت مطلق**": نیـوە+یـەك و زیـاتر لـەو. "**اکثریَت نسبی**": زۆرتـرین بابـەت لـە نێـوان چـەند بابـەت دا یـان زۆرتـرین دەنـگ لـە نێوان کۆی دەنگەکان دا.

**اکـدش:** 1) دورە، دورِە، دووتـۆمـە. 2) خۆشەویست، دڵخواز.

**اکـرام:** ڕێزگـرتن، ڕێزلێنـان، حورمـەت گرتن، بەخشینەوە.

**اکرام خو:** بڕوانە: "بخشنده".

**اکران:** پەردەی سینەما، نمایش کـردن، پیشاندران.

**اکـراه:** زۆرلێکـردن، ناچـاری، بـە زۆر، تـەنگاوکردن، نابـەدڵی، حـەزلێنـەکردن. "**بەاکراه**": بەزۆری، بەنابەدڵی.

**اکرم:** بەڕێزتر، جوامێرتر.

**اکزیما:** بیرۆ.

**اکسپرس:** زەرۆپ، خۆشڕەو، بەپێ.

**اکسپانسیونیست:** لایـەنگری پەرەسـەندنی وڵات لە باری خاکەوە.

**اکسپانسیونیسم:** بڕوا بە پەرەپێدانی وڵات لە ڕێگەی نیزامی یان کاروباری ئابووری‌و یان هەر شێوەیەکی دی.

**اکسپرت:** هەناردن، ناردن، ڕاگواستن.

**اکسپرسیونیـسـت:** لایـەنگری قوتابخانـەی (اکسپرسیونیزم).

**اکسپرسیونیـسم:** قوتابخانـەی دەربـڕین خوازی.

**اکسپوزان:** کەسێك کە کەلوپەلەکەی خۆی بۆ پیشانگا هێنابێ، نوێنەر، نوانەر.

**اکسپوزیسیون:** پیشانگا.

**اکسد:** بێ برەوتر.

**اکسید:** هەر جسمێك کـە لـە تێکـەڵبوونی کانزایەك دەگەڵ ئوکسیژن پێك دێ.

**اکسیداسیون:** دژکردەوەی هەر ماددەیـەك لە گەڵ ئوکسیژن.

**اکسیدان:** ئوکسیدکەر.

**اکسیده:** تێکەڵ بوو دەگەڵ ئوکسیژن.





**اکفـاء:** (اِ) چـەمانن، چـەماندنەوە، لارکردنـەوە، خوارکردنـەوە، لـە مەبەسـت دوور کەوتنەوە.

**اکل:** خواردن، خارن.

**اکمال:** کامڵ کردن، تەواوکردن.

**اکمل:** کامڵ تر، تەواوتر.

**اکنـاف:** کـۆی"کنـف"، دەوروبـەر، دەوروپشت، لێوارەکان.

**اکنـون:** هەنووکـە، ئێـستا، ئێـستاکە، ئێـستاکانێ، ئێـستێکانێ، ئێـستاکی، ئیـستا، ئیـسا، ئیـسە، ئێـسە، ئێـستە، ئیـستە، ئێستەکە، ئیستەکێ، ئێستێ، ئیستێ، ئەمێستە، ئەمێستا، ئەمێستاکە، ئەمێستەکانێ، ئەمێستەکێ، ئەمێستاکێ، ئەوێستا، ویستا، وێستا، وێسە، ئاییسە، نووکە، نۆکا، نۆکە، نها، نوها، نوە، نهۆ، نەهە، لەجێ، هەوکە، ئەلعان، ئەلئان، ئەم دەمە، ئەلحان، هینگا.

**اکوسیستم:** بڕوانە: "بوم سازگان".

**اکولـوژی:** پێوەنـدی گیانلەبـەران دەگـەڵ شوێنکار.

**اکولوژیست:** لایەنگری پاراستنی ژینگە.

**اکونـومی:** ئـابووری. بـەقازانج ، دەس پێوەگرتن.

**اکونومیست:** ئابووری زان.

**اکونومیـک:** ئـابووریی، ئابووریانـە، بەهرەدار ، بەقازانج، قازانج هێن.

**اکیاس:** زانایان.

**اکیپ:** شاند، ئێکیپ.

**اکیـد:** 1) بێـگومـان، سـوور، دڵنیـا. 2) پتەو، قایم.

**اکیس:** وریاتر، زاناتر، ژیرتر، زیرەکتر.

**اکیل:** خۆرا، فرەخۆر.

**اگـالیتر:** لایـەنگری بەرابـەری، یەکسانی خواز.

**اگالیتـه:** بەرابـەری، یەکـسانی، ڕێکـی، هاوئاهەنگی.

**اگر:** وشەی مەرجە، ئەگەر، گەر، هەگەر، ئەر، ئەگەرکو.

**اگرچه:** ئەگەرچی، گەرچی، هەرچـەندە، لەگەڵ ئەوەشا.

**اگرونومی:** بڕوانە: "برزشناسی".

**اگزما:** گزنەك، گەزنـە، گەزەنـەك، بـیرۆی تەڕ.

**اگزیستانسیالیـسم:** قوتابخانەیەکـە کـە جەخت لە گرینگی و ڕەسەنایەتی مرۆڤ دەکاتـەوە و بەوپێیـە هەرکەسـەو لـە کردەوەکانی خۆی بەرپرسە، قوتابخانـەی بوونخوازی، ڕەسەنایەتی بوون.

**اگنوس تی‌سیسم:** فەلسەفەیەك کە حاشا لە بوونی شتە پەتییەکان لە زەینی مرۆڤ دا دەکاو پێی وایە پەیبردن بە خوداو جیهانی نادیار نامومکینەو مرۆڤ هیچ زانیارییەکی لە بارەی یەکەمین حەقیقەتەکانەوە نیە.

**اگنوستیك:** لایەنگری (اگنوس تی سیسم)، سەربە (اگنوس‌تی‌سیسم).

**اگوئیسم:** خۆبینی، خۆپرستی، خۆپەسنی.

**الا:** (اَ) وتەی دەنگدان و ئاگادارکردنەوە، هێی، ها، بزانە، ئاگاداربە.

**الا:** (اِ) وشەی دەراویشتن، مەگەر، مەگین، جگە، بێجگە.

**الاخن:** ئاوارەو پەرتەوازە، لانەواز.

**الاستیک:** جیر، لاستیک، لاسیق. بەجیڕ، جیڕ، جیڕی، چیڕ، خۆگرو نەپس. **"الاستیک کارتیلاژ"**: (پزیشکی) کرکراگەی کشۆک.

**الاش:** بڕوانە: "آلش".

**الاغ چران:** کەرلەوەڕێن، شوانی کەران.

**الاکلنگ:** حینەدرحۆ، حندرحۆ، حێزەرقانە، شلك شلکێن، وشترحۆ، سیسۆ، جێجلقانە، هەقلیمەقۆ، حەقلی مەقۆ، حەلەق مەلەق، حەللەق مەللەق، هەلەقەمەلەقە، حەللادۆشکە، حەللادۆشە، هەللادۆشە، حلاقووچکە، هەللەرومەللەر، زەرانیق، زەرزانیق، زیقوزەر، هیلاهۆپ.

**الاو:** بلێسە، کڵپە.

**الاهة:** (اِ) پەرستن.

**الاهة:** (اُ)بڕوانە: "اُلوهیت".

**الاهیات:** 1) ئەوەی پێوەندی بە خوداوە هەیە، مەسەلەگەلی پێوەندیدار بە خودا. 2) زانستی خواناسی و ناسینی ئایینەکان.

**الاهیون:** شارەزایانی زانستی خواناسی.

**الباب:** کۆی "لب"، ئاوەزەکان، مێشکەکان.

**الباد:** هەلاج، پەڕەکەر.

**البته:** هەڵبەت، هەڵبەتە، بێگومان، بێ سۆ، دیارە.

**البر:** زیرەك، فێڵباز، گزیکار.

**التباس:** 1) کار یان شتێك لە کەسێك شاردنەوە، داپۆشیان. 2) لێك ئالاوی، تێك ئالاوی.

**التجا:** پەنا بردن، هانابردن، دالدەهێنان، چوونە ژێر دالدەی...، پەناهێنان، راخوستن، هالا.

**التجاج:** تێکەڵبوونی ئاوازو دەنگەکان، کەفوکوڵی زەریا، جۆش و خرۆشی دەریا.

**التحاد:** لە ئایین وەرگەڕان، هەڵگەڕانەوە.

**التحاق:** پەیوەست بوون، چوونەپاڵ، پێگەیشتن، پێگەیین.

**التحام:** بە یەکتر پەیوەست بوون، گەیشتنەوە یەکتری، جۆش خواردن، لەحیم بوون.

**التذاذ:** چێژبردن، تام کردن.

**التزام:** پابەند بوون، پابەندی، دەستەبەری، لەسەرخۆ بە پێویست زانین، بەرپرسیاری، وەئەستۆگرتنی کارێك، وەخۆگرتن، پەیمان دان.

**التصاق:** 1) پێوەنووسان، لکان، پێوەلکان.2) پێوەندی.

**التفات:** ئاوڕلێدانەوە، لا لێکردنەوە، رووتێکردن، لاواندنەوە، بەهێندگرتن، ئاوڕلێدانەوە، ئاوڕ وێدان، سەرنج دان.

**التفاف:** تێك ئالان، هەڵ پێچران، لەخۆئالان/ پێچان.





**التقاء:** دیدارکردن، یەکتردیتن، یەکتردینی، پێك گەیشتن، تووشی یەکتربوون.

**التقاط:** 1) هەڵگرتنەوە، چینەکردن. 2) بڕوانە"اقتباس".

**التقاط گرایی:** "ئێلێکتیسیزم".

**التقاطی:** لاساییکردنەوەی نائەدەبی و سەرنەکەوتوو. تێکەڵ کردنی چەند شێوازێك بە ناحەزی. پێکهاتوو لە توخمە ناساز و دەنگ و بیرە لێکدژەکان.

**التماس:** لاڵانەوە، لاڵیانەوە، لاڵان، لاڵیان، لاڵە، لالکە،لاڤ، لاڤە، لاڤاهی، لاڤایی، لافایی، پاڕانەوە، پاڕیانەوە، پاڕیان، وەپاڕان، هەوەر، کرووزانەوە، تکاکردن، خوازتن. **"التماس کنان"**: لە حاڵی لاڵانەوە و پاڕانەوە. **"التماس کننده"**: لالکەر، لالکەهاس، کەسێك کە دەپاڕێتەوە.

**التماع:** بریسکەدانی کارەبا، هەڵ بوون، رەنگ پەڕین، رفاندنی شتێك.

**التواء:** 1) باوخواردن، ئالان، پێچ دران، تێکەوە پێچران. 2) ئالۆزاوی وچەمین. 3) سەرکێشی، سەرپێچی.

**التهاب:** 1) هەڵایسانی ئاور، بڵێسەسەندنی ئاگر، کڵپەکڵپ، گڕگرتن. 2) (پزیشکی) هەوکردن. 3) تووڕەیی، هەڵچوون. 4) بێ ئارامی، بێئۆقرەیی.

**التیام:** 1) سارێژ، سارێژبوونەوە، سارێش، سۆ، چاك بوونەوە، خۆش بوونەوە، گۆشتەزوون، گۆشتەزوونە، وێك هاتنەوەی زاری برینان، کوێربوونەوە، قەمووش. 2) پەیوەندان، ساچاندن. 3) پێکەوەسازانی دووشت.

**الجاء:** 1) ناچارکردن. 2) دالدەدان.

**الجخت:** تەماح، هیوا، چاوەڕوانی.

**الحاح:** شێلگیربوون، پێداگرتن، مقیڕبوون، لەسەر رۆیشتن، بەدواداچوون، داواکردنی شتێك بەکرووزانەوە. **"الحاح کننده"**: شێلگیر، شێتگیر، پێچەقێن، سوور لە سەر مەبەست.

**الحاد:** (اِ) ناخواباوەڕی، بێ باوەڕی، بێبڕوایی، هەڵگەڕانەوە، حاشا لە خوا کردن، خوانەناسین.

**الحاصل:** بەکورتی، بەهەرحاڵ.

**الحاق:** 1) گەیشتن و پەیوەست بوون بە کەسێك، رەگەڵ خستن، خستنە پاڵ، وەدووخستن، پێگەیاندن، پێڕاگەیاندن . 2) پێوەندی. 3) **هاوپێچ** کردن.

**الحاقی:** هاوپێچ کراو، رەگەڵ خراو.

**الحاقیه:** هاوپێچ.

**الحذر:** ترس، پارێز.

**الخ:** سووکەڵە ناوی "الی‌آخر".

**الدنگ:** بێ شەرم، بێکارە، مفت خۆر، گەرپانۆخ.

**الذ:** بەتامتر، بە چێژتر.

**الزام:** ناچارکردن، پێکردن، پێدرکاندن، وەئەستۆخستن، خستنەمل، پێویست کردن.

**الزام آور:** بڕوانە: "الزامی".

**الزاماً:** بەناچار.

**الزام دادن:** رامل خستن، قسه پێ نەهێشتن.

**الزامی:** پێویست، زۆرپێویست، واجب.

**الزم:** پێویست تر، واجب تر.پێویست ترین.

**السن:** وتەپاراو، دەماوەر.

**الش:** بڕوانە: "آلش".

**الصاق:** لکاندن، پێوەنووساندن، چەسپاندن.

**الصاقی:** چەسپێنراو، لکێنراو.

**الطاف:** نەرمی نواندن، مێهرەبانی کردن، سەوقات دان.

**الطف:** نەرمتر، خاوێن تر .

**الغاء:** هەڵوەشاندنەوە، پووچ کردنەوە، پوچەڵکردنەوە، پووچاندنەوە.

**الغاز:** مەتەڵ گوتن.

**الفاختن:** بڕوانە: "الفختن".

**الفاظ:** کۆی"لفظ".

**الفت:** 1) هۆگری، هۆگربوون، هۆگرتن، عادەت کردن، خووگرتن، خووپێگرتن، خوو پێوەگرتن، هووکارەبوون، ئالوودەبوون، دەستەمۆیی، وەلفەت. 2) دۆستی و ئاوەدەنگی. "الفت دادن": باناندن، هۆگرکردن، سازگارکردن. "الفت دهنده": بانۆك، بانین. "الفت گرفته": هۆگر، ئۆگر، گرۆ، خووگرتوو، خووپێگرتوو، خووپێوەگرتوو، خووگرتی، لسکە، دەستەمۆ، هاودەنگ، هەڤاڵ و هاودەم.

**الفختن:** پاشەکەوت کردن، کۆوەکردن، خڕڤەکرن، کۆمکرن.

**الفنجیدن:** بڕوانە: "الفختن".

**القاء:** 1) هاویژتن، فڕێدان، تووڕدان. 2) بابەتێك دەنێو بیرو زەینی کەسێك خستن، خستنە مێشکەوە، وەبەرنان. "القاء بنفس": بە خۆ تەڵقین کردن. "القاء شبهە": وەهەڵەخستنی کەسێك، بەهەڵەدابردن.

**القاح:** ئاوس کردن، زگ پڕکردن، دووگیان کردن.

**القارعە:** قیامەت، بەڵای دژوار، تالووکە.

**القاص:** وتاردەر، چیرۆك بێژ.

**القاط:** کۆی"لقاطە"، شتە پەست و بێنرخەکان.

**القصە:** قسەی کورت، وتەی کورت. چیرۆك. بەهەرحاڵ، هەر چۆنێك بێ.

**ال کردن:** بڕوانە:"لاف زدن".

**الکن:** لاڵەپەتە، لاڵەپەتێ، لاڵەپەترە، لالەك، تور، دەمبەل، زمان پسك، فسەزمان، زمان بە گرێ، زمانگر، زمانگیر، زوانگیر، زمان گران، زوان بەگیر، کون زوان، زاندەگونایش، کەسێ قسەی بە ڕەوانی بۆ نایات.

**الکی:** گۆترە، گۆترمە، لاتەری، دەمبڕ، بێ سەوداکردن. بەدرۆ. بەبێ ئاگایی و زانیاری. بێ هۆ. ناڕاستەکی. بێ یاسا و ڕێسا و چاوەدێری.

**الگو:** سەرمەشق، مودێل، نموونە، پاڕادایم. "الگوی مثالی": نموونەی سەرچەشنانە.





**الگوبرداری:** سازکردنی مودێل بۆ دروست کردنی شتێ. پێڕەویکردن لە کەسێك یان شتێك.

**اللم قللم:** فێڵبازی، ساختەکاری.

**اللە بختی:** بەختەکی، بەهەڵکەوت، خۆوبەختی.

**اللهی:** خوایی. مرۆڤی کامڵ.

**الم:** ئێش، ژان، ئازار، دەرد.

**المراد:** بەکورتی، بەهەرحاڵ. یارمەتی من بدەن.

**الم شنگە:** هەراوهوریا، ئاژاوە، بەزم و هەرا، هەراوکێشە، گێرەوکێشە، قەرەباڵغ.

**المع:** پیاوی زیرەك، بیرتیژ، بەهۆش.

**المناك:** بەئازار، بەژان، لەش بەبار.

**النگ:** مێرگ، سەوزەڵان، سەوزەزار، لەوەڕگە.

**النگ دولنگ:** شڕوشاتاڵ، وردکەوپردکە، شڕەوبڕە، شەنگەشڕە.

**الو:** (اَ.لَ) بڵێسەی ئاگر.

**الواد:** کۆی"الود".

**الوار:** ئاڵودار، داری رایەڵی سەربان، دەستەك، تەژە.

**الوان:** کۆی"لون"، رەنگەکان، ڕەنگاوڕەنگ.

**الود:** سەرەڕۆ، سەربزێو، سەرکێش.

**الوف:** (اَ) هۆگر، ئۆگر.

**الوهت:** بڕوانە: "الوهیّت".

**الوهیّت:** سفەتی خوایەتی، زاتی خوایەتی، پلەوپایەی خوایی، خوایەتی.

**الویە:** کۆی"لواء"، ئاڵاکان.

**الهاء:** خەریك کردن، سەرگەرم کردن.

**الهام:** سەرۆ، پەیام، سرووش، خورپەخستنە دڵەوە، بیرێك کە لە نادیارەوە بە دڵ دەگا.

**الهام بخش:** ئیلهام هێنەر، خورپەبەخش، وەدیهێنەری بیرۆکەیەکی نوێ لە زەینی کەسێك دا بۆ ئەنجامدانی کارێکی خولقێنەر.

**الهام شدن:** بیرێ بە زەینی کەسێك گەیشتن. "بە من الهام شدەبود": لە دڵم چەقیبوو، لە دڵی دابووم، دەمزانی.

**الهام گرایی:** سرووش خوازی.

**الهام گرفتن:** دەدڵ چەقین، کاریگەری وەرگرتن لە شتێ یان لە بیرۆکەیەك یان شێوەی کاری کەسێك و گەیشتن بە بیر یان شێوازێکی نوێ، بیر کردن لە شتێ کە نەتزانیوە. "الهام گرفتە": ئیلهام پێکراو، سرووش گرتوو.

**الهیّات:** زانستێ کە باس لە خوا دەکا، زانیاری لە بارەی خواوە، "تیۆلۆژی".

**الهیون:** کۆمەڵێك زانا (خاوەن حیکمەت) کە باس لە حیکمەتی خوایی دەکەن.

**الی:** تا، تاکوو، بەرەو.

**الیاف:** کۆی"لیف"، پرزە، ریشاڵ، ریزاڵ.

**الیز:** بڕوانە: "آلیز".

**الیزیدن:** بڕوانە: "آلیزیدن".

**الیغ:** لەوچە، بێدەم ودوو، وهەروەها بە مانای کەم فام و سەپۆل.

**الیف:** بڕوانە: "الفت گرفته".

**الیم:** پڕ ژان، زۆر بە ئێش و ئازار، ژان هێنەر.

**الین:** نەرمتر، نەرم خووتر.

**الیناسیون:** لەخۆنامۆیی.

**الیوم:** ئەمڕۆ، ئەمڕۆکە، ئیمڕۆ.

**امّا:** بەڵام، بەڵان، ئەما، ئەمان، لێ.

**امّاآوردن:** 1) گومان کردن لە سەرکەوتنی کارێك. 2) بیانووهێنانەوە بۆ ئەنجام نەدانی کارێك، گنخاندن.

**اماته:** مراندن، کوشتن، لە نێو بردن، تێدابردن.

**امارات:** (اِ) کۆی "امارت"، دەسەڵاتدارەتی، چوارچێوەی دەسەڵاتدارێتیی میر، میرنشین.

**امارات:** (اَ) کۆی "امارة"، نیشانەکان.

**امارت:** 1) بڕوانە: "امارات". 2) بوونە میر، میرێتی، میرایەتی.

**اماره:** (اِ) نیشان، نیشانە.

**امّاره:** (اَ) پاڵ پێوەنەر بەرەو شەڕ و خراپی.

**اماطت:** دوورخستنەوە، بردن.

**اماکن:** کۆی "مکان"، شوێنەکان. **"اماکن عمومی"**: شوێنە گشتییەکان.

**ام العلوم:** 1) هۆکاری سەرەکی سەرهەڵدانی زانست، بناغە و ئەستوونی زانستەکان. 2) وشەسازی و ڕێزمانی عەڕەبی.

**ام الفساد:** 1) مایە و هۆکاری گەندەڵی. 2) گێرەشەوێن، شەڕەنگێز.

**ام القری:** 1) گرنگترین و بەنرخترین سەرزەوی. 2) مەککە. 3) گەورە دێ.

**اماله:** هەڵگەڕاندنەوە، هەڵچەرخاندنەوە، چەماندنەوە، لارکردنەوە. کەف کردنە قوونەوە بۆ ڕەوان بوون.

**امالی:** کۆی "املاء".

**امام:** (اَ) 1) پێش، پێشەوە، بەردەم. 2) بەرامبەر.

**امام:** (اِ) پێشەوا، پێشڕەو، پێش نوێژ.

**امامت:** پێشەوایی، پێش نوێژی.

**امام جمعه:** پێش نوێژ.

**امامزاده:** نزرگە، گۆڕخانەی پیاوی خوا کە خەڵك دەچنە زیارەتی.

**امان:** بێ ترسی، بێ ترسێتی، ئاسوودەیی، ئارامی، پارێزراوی، پەناوپەسیو. **"امان خواستن"**: هاناخواستن، داوای تەسلیم بوون کردن، پەناهێنان، هاتنەبەر داڵدە، پاریزگاری خواستن، پەنا بۆ کەسێك بردن کە بتپارێزێ. **"امان دادن"**: پەنادان، داڵدەدان. **"امان راه را بریدن"**: بڕین/ پێوانی بەشی سەرەکی ڕێگا. **"امان کسی را بریدن"**: بێچارە و داماو کردن. **"امان یافتن"**: پارێزراوی، ئاسوودەیی، چوونەژێر داڵدەی کەسێك. **"به امان آمدن"**: بێ تاقەتبوون. **"در امان بودن"**: پارێزران، ئاسوودە و ئەرخەیان بوون.

**امانت:** 1) دەس پاك و ڕاست بوون، جێی متمانە بوون. 2) دەس پاکی، سەرڕاستی، ڕاستگۆیی، ڕاست بێژی. 3) سپاردە، ئەسپاردە، سپارتی، سپاردی، سپارە، پێ سپێردراوی، ڕاگرتن بۆ دانەوە، ئەمانەت.





**امانت دار:** دەس پاك، سەڕاست، ڕاستگۆ، ئەمانەت دار.

**امانتی:** ئەمانەتی، بەئەمانەت داندراو، ڕاگیراو بۆ دانەوە، بەئەمانەت وەرگیراو، خواستە، خواستەنی، ئەسپاردەیی، ئەسپارەیی، سپاردەیی، سپارەیی، سپارەیی، ئەسپاردن، سپاردن، سپارتن.

**امان نامه:** پارێزراونامە.

**امانی:** (اَ) بڕوانە: "امانتی".

**امانیّ:** (اِ) هیواکان، ئارەزووەکان.

**امانات:** کۆی "امانت".

**امپراطور:** پاشای دەسەڵاتدارو بە توانا، ئیمپرتۆر، میری میران.

**امپرسیون:** هەست ، تێگەیین، پەژارە، ژان.

**امپرسیونیست:** ئەمپێرسیونیزم خواز، شێوەکار یان نووسەرێك کە بە شێوازی ئەمپێرسیونیزم ئیش دەکا.

**امپرسیونیسم:** ئەزموون خوازی، نێوی قوتابخانەیەکە لە شێوەکاریدا کە بریتی لە نواندنی حاڵەتەکان بە ڕەنگی جۆراوجۆر و نێوی قوتابحانەیەکی ئەدەبیشە کە نووسەر هەست و پەژارە بەو شێوەی کە بووە دەگێڕێتەوە.

**امپریال:** ئیمپراتۆری، پاشایەتی، دەسەڵاتدارەتی.

**امپریالیست:** ئیمپراتۆری خواز، لایەنگری ئیمپریالیزم.

**امپریالیسم:** لایەنگری لە حکوومەتی ئیمپراتۆری، سیاسەتی پەرەپێدانی باڵادەستیو دەست درێژی هێزی نیزامی وڵاتیك بۆ سەر وڵاتێکی دی، سیاسەتی دەوڵەتێکی گەورەو بەهێز کە بە زۆرەملێ دەسەڵاتی خۆی بە سەر وڵاتانی دیکەدا بسەپێنێ.

**امت:** گروپێك لەخەڵك، کۆمەڵ، پێڕەوانی پێغەمبەرێك.

**امتناع:** بەهرەمەندبوون، چێژبردن.

**امتثال:** گوێ لە مستی، فەرمان بەری، پێڕەوی کردن.

**امتحان:** ئەزموون، تاقیکردنەوە، تاقیکاری، هێچاندن، جەرباندن. **"امتحان پس دادن"**: ڕوونبوونەوەی کەسێ یان شتێ، خۆتاقیکردنەوە.

**امتداد:** 1) درێژبوون، خۆڕاکێشان، کێشران، کێش هاتن. 2) کشان، کێشان، درێژایی، ڕاستا. **"امتداد دادن"**: درێژەپێدان، کێشان. **"امتداد یافتن"**: درێژەکێشان.

**امتزاج:** 1) تێکەڵبوون، تێکەلاوبوون، ئاوێتە بوون. 2) تێکەلاوی، ئاوێتەیی.

**امتساك:** دەست لە شتدان، ڕاوەستاندن، ڕاگرتن.

**امتصاص:** مژان، مژین، مژتن، هەڵمژین، هەڵمژتن، مریستن.

**امتلاء:** 1) پڕبوون، دارماڵ بوون، لێوڕێژبوون، سەرڕێژبوون، لیپ بوون. 2) پڕی، لێوانلێو، تەژی. 3) سابخۆر، گرفت، سقڵ، ئینتەلا، نەخۆشی خواردن نەتواندنەوە، ورگ پڕی هەزم نەکراو کە نەخۆشی دێنێ.

**امتلاك:** دارایی، هەبوویی.

**امتناع:** راوەستان، نەکردن، دووریکردن، خۆلێ پاراستن، خۆبواردن و لادان و خۆلێنەدان، مان گرتن. (فەلسەفە) پێویستی نەبوونی شتێ.

**امتنان:** سوپاس کردن، سپاسکاری، پێزانین، چاکە لەبەرچاوبوون.

**امتهال:** مۆڵەت پێدان، کات پێدان.

**امتیاز:** 1) جویٚبوونەوە، جیایی، بەسەرداهەبوون، بەلایەك دا هاتن، لەسەری.2) تازیاری، پوان، سەرەتی، هەڤیازی، ئاتۆ، ودم، چوور، قان، سەرپشك، مافی تایبەتی، لە یاسادا:جیاوك.

**امثال:** کۆی "مثل". "**امثال و حکم**": پەندی پێشوونان.

**امجاد:** (اِ) رێزگرتن، زۆربەخشین.

**امجاد:** (اَ) کۆی "ماجدو مجیدو مجد"، پایەبەرزان.

**امجد:** پایەبەرزتر، مێرخاس تر.

**امحاء:** سڕینەوە، رەش کردنەوە، لەنێوبردن، لەناوبردن، قڕکردن، تەفروتووناکردن، دوابڕینەوە، قەڵاچۆکردن.

**امحاض:** دۆستایەتی پاك، راست کردنەوەی ئاخاوتن.

**امحاق:** لە نێوچوون، کوژران.

**امداد:** (اِ) یارمەتیدان، یاریدەدان، کۆمەگ کردن، ئاریکاری، فریاکەتن، بەفریاگەیشتن، بەهاناگەیشتن.

**امداد:** (اَ) کۆی "مدد".

**امداد رسانی:** گەیاندنی یارمەتی، بەهاناوەچوون.

**امر:** 1) دەستوور، فەرمان، بڕیار. 2) شت. 3) بابەت. 4) کار. 5) رووداو. 6) ژیان، بژیوی. 7) سپاردە. "**امر بدیهی**": بابەتی بەڵگەنەویست. "**امر جزئی**": بابەتی هەندەکی. "**امر کلی**": بابەتی گشتی. "**امر مسلط**": بابەتی زاڵ، توخمی زاڵ. "**امر مطلق**": بابەتی رەها. "**امر واقع**": بابەتی واقیع. "**امر وجودی**": بابەتی بوونیانە. "**فعل امر**": فرمانی داخوازی.

**امرّ:** تاڵتر، قایم تر، پابەندتر.

**امراء:** کۆی "امیر".

**امرار:** بژیوی، بەسەربردن، رابواردن، تێپەڕاندن، بەڕێ چوون، گوزەران . "**امرار معاش**": بژیوی ژیان.

**امراض:** کۆی "مرض"، نەخۆشییەکان. "**امراض تناسلی**": نەخۆشییە زایەندییەکان.

**امربر:** خزمەتکار، نۆکەر.

**امرد:** دەمڕووت، لیسکە، لاوی موو لە روو دەرنەهاتگ، کۆسە.

**امردبازی:** نێربازی.

**امروز:** ئەمڕۆ، ئەمڕۆکە، ئیمڕۆ، ئیڕۆ، ئاڕۆ، ئارۆ، هارۆ، ئەوڕۆ، ئەڤروکە، ناڕۆژ، نەسۆزی، رۆژێ کە تیاین.

**امروز و فرداکردن:** حەواڵە بە گواڵە، دەستی دەستی، تەفرەدان، ئەمڕۆ و سبەی پێکردن.





**امروزە:** ئەمڕۆکە، ئەم رۆژە، ئێڕۆهە، ئەم سەردەمە.

**امروزی:** ئەمڕۆیی، سەردەمیانە.

**امریە:** دەستوور، فەرمان، بڕیار.

**امس:** دوێکە، دوێنەکە، دوێنێ.

**امساء:** کردنە شەو.

**امساك:** 1) راگرتن، نەهێشتن. 2) وێستانەوە، وەستانەوە. 3) خۆبواردن، خۆراك نەخواردن، پارێزکردن.4) بەغیلیو چنۆکی، قڕنیسی. 5) بێدەنگ بوون. 6) کەم خۆری.

**امشب:** ئەمشەو، ئەمشۆ، ئیمشەو، ئەڤشەڤە، ئیشەڤ، شەوێ کە تیاین.

**امشی زدن:** 1) ئیمشی پڕژاندن. 2) دەرکردن، لە کۆڵ خۆکردنەوە.

**امضا:** 1) رەوانەکردن، راپەڕاندن، بەجێهێنان، تەواوکردن و ئەنجام دانی کارێك. 2) واژۆ، پەنجەنووس، مۆر، ئیمزا.

**امطار:** (اِ) بارین، هاتنەخواری بەفرو باران، داگرتنی باران، وارین، وارای.

**امعان:** 1) دوور روانین، قووڵ تێڕامان، لێوردبوونەوە. 2) سەرنج و دوورنواڕی.

**امکان:** رەخسان، گونجان، دەستدان، لوان، بووز، هەڵکەوتن، مەیسەربوون، لەکردن هاتن، لە دەست هاتن، توانین، شیان، دەشێت. ئەگەر. دەرفەت."**عالم امکان**": کۆی مرۆڤ و زیندەوەر و گیا و ماددە.

**امکانات:** کۆی کەرەسە و پێداویستی و هەلومەرجی لەبار بۆ وەدەستهێنانی شتێ یان ئەنجامدانی کارێك.

**امکان پذیر:** شیاوی رەخسان، شیاوی بوون، رێتێچوو، مەیسەر.

**امکان پذیری:** رێ تێچوون، شیاوی پێکهاتن، رەنگە، گونجاوی.

**امکان دادن:** ئیزن دان، مۆڵەت دان.

**امکان دارد:** رەنگە، وێدەچێ، دەبێ.

**امکان ندارد:** لە توانادانیلوان، کمە، هەرنابێ، دەست نادا، ناگونجێ، نالوێ، ناشێت.

**امکان یافتن:** دەرفەت و دەسەڵات پەیداکردن.

**ام کردن:** پوکاوڵەلێنان، چەمۆڵەلێنان، شاگەشکەلێنان، کەپلێگرتن، قژانك، قەپو، گڤشك، گشکە، گژکە.

**امکن:** تواناتر.

**امکنە:** کۆی "مکان".

**امل:** (اُ.مُّ) کۆنەپەرست (زۆرتر بە ژنان دەگوترێ).

**امل:** (اَ.مَ) هومێد، ئارەزوو، هیوا.

**املاء:** رێنووس، نژوە، ڤەریس، نووسەوەری، لەبەرگوتە نووسینەوە، پڕکردن، تەژیکردن.

**املاح:** کۆی "ملح"، خوێ، شۆری."**املاح معدنی**": خوێی کانزا.

**املاق:** هەژاری، نەداری، بێ شتی، خزایی.

**املاك:** (اَ) کۆی "ملك".

**املاك:** (اِ) کردنە خاوەن ملك، ژن لێ مارەکردن.

**املال:** جاڕزکردن، وەزاڵەهێنان، درێژبوونەوەی سەفەر بۆ کەسێك.

**املح:** تێرخوێ، سوێرتر، بەتام، جوانتر.

**املس:** نەرم، لووس، تاس و لووس، تەخت، رێك.

**امم:** کۆی"امّت".

**امن:** 1) بێترس بوون. 2) بێترسی، ئارخەیان، ئاسوودەیی، هێمنایی، بێ خەمی.

**امناء:** کۆی"امین".

**امنع:** قایم تر، پایەبەرزتر.

**امنیه:** (اُ.یّ) هیوا، هێڤی، ئارەزوو، ئامانج.

**امنیّت:** پارێزراوی، ئاسایش، ئاسوودەیی، هێمنی، هێمنایەتی، هێوری، ئارامی.

**امنیّت خاطر:** ئاسوودەیی خەیاڵ.

**امنیّت ملی:** ئاسایشی نەتەوەیی، تەنایی نەتەوەیی.

**امنیّتی:** هێمنایەتی، هێمنایی، هێدێتی.

**اموات:** مردوەکان، کۆچکردوان.

**امواج:** کۆی"موج".

**اموال:** کۆی"مال". "**اموال غیرمنقول**": مردە، مردەماڵ، ماڵی بێگیان، شتی ماڵ جگە لە ئاژەڵ و زیندەوەر. "**اموال منقوله**": میری، ماڵ و دارایی کە رادەگوێزرێ. "**اموال وقف**": وەرەستا، ماڵی مەوقووفە.

**امور:** کۆی"امر"، کارەکان، کاروبارەکان، شوول و موول. بابەتەکان، مەسەلەکان. رووداوەکان، پێشهاتەکان. "**امور خارجه**": کاروباری دەرەوە.

**امومت:** دایکێتی، دایکایەتی.

**امهات:** کۆی"ام"، دایکان، دالك گەل. گرنگترین. "**امهات اربعه**": بریتی لە چوار توخمی(ئاو.با.خاك.ئاور).

**امهال:** مۆڵەت دان، ماوەدان، ماوەپێدان، دەرفەت دان، مەیدان دان، بوارپێدان.

**امی:** نەخوێندەوار، بێسەواد.

**امیال:** کۆی"میل".

**امید:** هیوا، هومێد، هومێ، ئومێ، ئومێد، همێ، ئاوات، ئارەزوو، هێڤی، هەویا، تەوا، تەما.

**امید بخش:** هیوابەخش، هومێدبەخش، دڵگەرمکەر، مایەی هیواداری.

**امید بریدن:** ناهومێدبوون، هیوابڕان.

**امیدزندگی:** نێونجی تەمەنی تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەك.

**امیدوار:** هیوادار، بەهومێد، بەهیوا، بهێڤی، هێویدار، هومێدەوار، هێڤیدار، بەئاوات، ئاواتەخواز، تەوادار، تەمادار، دڵگەرم، دڵگەش، گەش بین، دەڤ گەرم، چاوڕوون، چاولەدو، چاولەدوا، چاوەڕێ، چەمەڕا، چاوەنۆڕ.

**امیدواری:** هیواداری، هێڤیداری، بەهیوایی، هێڤیبوون، بەئاوات بوون، بەتەمابوون، تەواداری، تەماداری، خۆشیخۆشی.

**امیرنشین:** میرنشین، جێگەی ژیانی میر.

**امیری:** میری، پاشایەتی، حکوومەت. سەروەری، گەورەیی. فەرمانداری.





**امیل:** لارو چەماوە، پیاوی بێشمشێر، پیاوی دڵ پیس.

**امیم:** پێشەوا، پێش نوێژ.

**امین:** دەس پاك، باوەڕپێکراو، جێیمتمانە، بڕواپێکراو، جێباوەڕی، راست کردار، سەر راست، دڵپاك.

**الان:** بڕوانە: "اکنون".

**انابت:** بڕوانە: "انابه".

**انابه:** 1) گەڕانەوە بۆ لای خودا، تۆبەکردن، دەس هەڵگرتن لە گوناح. 2) پەشیمانی، پشتی دەست گەزتن، پاشگەزبوونەوە، گەڕانەوە، بادانەوە.

**اناره:** 1) رووناك کردن، رووناك بوون، ئاشکرابوون، درەوشینەوە. 2) چرۆکردنی دار.

**انارشی:** بڕوانە: "آنارشی".

**اناس:** کۆی"اِنس"، خەڵك، خەڵکان.

**اناطه:** هەڵاوەسین، پێوەکردن، لێك بەندکردن.

**انام:** بڕوانە: "آنام".

**انان:** نووکن.

**انانیّت:** منەمنە، منێمنە، خۆبینی، خۆنوێنی، خۆپەسندی، خۆپەرستی، خۆبەزیادزانین.

**اناهیتا:** بڕوانە: "آناهیتا".

**انباء:** (اِ) ئاگادارکردنەوە، هوشیارکردنەوە.

**انباء:** (اِ) کۆی"نباء"، هەواڵەکان.

**انبات:** (اِ) 1) رواندن. 2) روان، شین بوون.

**انباذ:** کەم، پیچ.

**انباردن:** ئاخنین، ئەمبارکردن، پڕکردن. "**انبارده**": بڕوانە: "انباشته".

**انبار زغال:** خەڵوزان، خەڵوزدان، رەژیدان.

**انبارش:** پڕکردن، و هەرشتێك کە ناو شتێکی دی پێ پڕ دەکەنەوە.

**انبار غلّه:** کەوری، کواڕ، هەمباری دەغڵ و دانەوێڵە.

**انباز:** هاوبەش، هاوپشك، شەریك، هاوکار، هەڤکار، هەڤتا، هاوتا.

**انبازی:** شەریکایەتی، هاوکاری، هاودەستی.

**انباشتگی:** پڕی، پڕکراوی، کۆگاکراوی، تەپدان.

**انباشتن:** پڕکردن، ئاخنین، تەپاندن، تەپانن، تەپدان، تەژیکردن، کەڵەکە کردن، کۆماکردن، خۆمین، بەسەریەك داکردن، هەڵچنین، پوور، چەپانن، ئەمبارکردن، خەزنکردن. "**انباشته**": کۆما، کۆگاکراو، گومەڵتە، لەسەر یەك کەڵەکە کراو، هەڵچناو، هەڵچنراو، هەڵچنیاگ، چڕکراو، ئەمبارکراو، خومیا، پەچن، حەڵاقووچکە، پڕی سەرڕێژ. "**انباشتەکردن**": بڕوانە: "انباشتن".

**انباغ:** هاوبەش، شەریك، هەوێ، هەڤی، هەڤکار.

**انبریولوژی:** ( ئاولەمە، پز، پێزە)ناسی.

**انبساط:** 1) کرانەوە، بڵاوبوونەوە، دڵخۆش بوون. 2) دڵخۆشی، کەیف خۆشی، شادان. 3) کشان، لێك کشان، درێژبوونەوە. 4) (پزیشکی) خاوبوونەوە.

**انبساط خاطر:** دڵخۆشی، شادی.

**انبست:** (آ.بَ) خەست بوونەوە، توندبوونەوە، رەق بوون، مەیین.

**انبعاث:** 1) هەڵبژێردران، ناردران، رەوانەبوون. 2) مەیل، شەوق.

**انبودن:** 1) چنینەوە، گوڵ چنین، هەڵچنین، کۆماکردن، کۆوەکردن. 2) ئافراندن، چێکرن، خوڵقاندن.

**انبوسیدن:** 1) هاتنەدی، وەدیهاتن. 2) رزان، پوان.

**انبوه:** پڕ، پڕایی خەڵك، جەماوەر، چڕ، قەڵەباڵغ، ئاڵۆزو تێکەڵاو، کەڵەکە، کۆما، زۆر، گەلەك. "**انبوەشدن**": خڕبوونەوە، کۆبوونەوە.

**انبوهی:** زۆری، فرەیی، فرەوانی، پڕایی، چڕی، ئاپۆرە، خرتۆڵ.

**انبوینده:** بۆنکەر، بۆندەر.

**انبوییدن:** بۆن کردن، هەڵمژین، بێهن کرن.

**انبیاء:** کۆی"نبی"، پێغەمبەران.

**انتاج:** گەیشتنی کاتی زانی مەڕو ماڵات. بەئاکام گەیشتن، لێ پەیدابوون، بەرهەمهێنان، دەرهێنان. (لۆژیك) ئاکام وەرگرتن لە پێشەکییە لۆژیکییەکان.

**انتباه:** 1) وشیاربوونەوە، هۆشیاربوونەوە، وەئاگاهاتن، چاوکردنەوە، هاتنەوەسەرخۆ. 2) وشیاری، وریایی. 3) (دەروون ناسی) وردبینی.

**انتحار:** 1) خۆکوژتن، خۆکوشتن، خۆلەناوبردن، خۆکوژیکردن، ورگی خۆدڕاندن. 2) خۆکوژی.

**انتحاری:** خۆکوژی، خۆتەقاندنەوە.

**انتحال:** 1) وەپاڵ خۆدان، وەخۆنیسبەت دان. 2) خۆ وەئایینیَکەوە بەستن.

**انتخاب:** هەڵبژاردن، هەڵبژارتن، هەڵبژین، هەل بژارتن، بژاردن، بژارتن، بژارکردن، بژانن، نەقاندن، ڤەبژارتن، چاك لە خراپ جیاکردنەوە، دەست نیشان کردن، دەست لە سەر دانان، دانەبژێرکردن، هەڵچنین. "**انتخاب شده**": هەڵبژارتو، هەڵبژارتی، هەڵبژاردو، هەڵبژاردە، هەڵبژارتە، هەڵبژنیاگ، هەڵبژیاگ، هەڵبژێراو، هەڵبژراو، هەڵبژێردراو، هەل بژارتی، بژیاگ، بژاردە، بژنیاگ، تەلبژێر، تەلبژێن، دانەبژێرکراو، نەقاندی، سەرگوڵ. "**انتخاب کننده**": هەڵبژێر، هەڵبژێرە، هەڵبژێن، هەل بژێر، کەسێك کە هەڵدەبژێرێ. "**اولین انتخاب**": سەرپشکی، یەکەم هەڵبژێری، خاترخۆیی.

**انتخابی:** هەڵبژێراو، هەڵبژاردە.

**انتداب:** کردن بە نوێنەر، ناردن، چاودێری، سەرپەرشتی.





**انترسان:** جێگەی سرنج، سەرگەرمکەر، بەقازانج.

**انترن:** ناوخۆیی، فێریار، قوتابی شەوانە، قوتابی دوایین ساڵی پزیشکی کە کێشکە.

**انترناسیونال:** نێونەتەوەیی، جیهانی، ئەنجومەنێکی گشتی کە کرێکارانی نەتەوە جیاوازەکان بۆ پاراستنی مافەکانیان پێکیان هێناوە.

**انترناسیونالیست:** لایەنگری بنەماکانی ئەنتێرناسیۆنالیزم.

**انترناسیونالیسم:** 1) بڕواهێنان بەوەی کە هاوکاری نێوان نەتەوە جیاکانی جیهان پێویستی بە هاریکاری تەواوی مرۆڤەکان هەیە. 2) (ئابووری) بەرنامە یان کارێك کە بە هاوکاری نێونەتەوەیی جێبەجێ دەبێ. 3) (سیاسی) بۆچوونێ لەسەر بنەمای بڕوا بە هاوپێوەندی نەتەوەکانی جیهان یان گروپێکی دیاریکراو لەوان لە باری سیاسی و رامیارییەوە.

**انترناسیونالیسم پرولتری (کارگری):** بە بۆچوونی مارکسیستەکان هاوپێوەندی جیهانی نێوان چینە بێبەشەکان بەتایبەت نێوان چینی کرێکاری وڵاتانی جۆراوجۆر.

**انتروپولوژی:** مرۆڤناسی.

**انتریگ:** ئاژاوە، کەتن، فێت، فیتنە، (لە سینەمادا)بابەت یان هۆکارێك کە سەرنجی بینەر بۆ لای خۆی راکێشێو بیورووژێنێ.

**انتراکس:** (پزیشکی) کوانەپیسە.

**انتزاع:** 1) جیابوونەوە لە کەسێ یان لە جێگەیەك، هەڵکەنران، هەڵکەندن، داماڵین، دەرکێشان، داڕنان، لێ کردنەوە، هەڵڕووتان، رووت کردن. 2) "ئەبستراکشن"، دەرهەستکاری. 3) بیربڵاوی، پەرێشان خەیاڵی. 4) هەڵێنجانی پاژێ لە گشتێ، دەرکێشانی واتایەکی گشتی و هاوبەش لە ناو کۆمەڵێ واقیعییەتی دیاریکراو. 5) داگیرکردن، زەوت کردن.

**انتزاع کردن:** 1) جیابوونەوە لە کەسێ یان لە جێگەیەك. 2) گرتن، داگیرکردن، زەوت کردن. 3) جیاکردنەوە.

**انتزاع گرایی:** Abstractionism.

**انتزاعی:** 1) "ئەبستراکت"، دەرهەست، هەست پێنەکراو. 2) دەرکێشراو، دەرهێنراو، داماڵراو. 3) پەتی، رووت. 4) ئەو شتانەی لە زەین دایە و بەڵام واقیعییەتی دەرەکییان نییە. 5) تایبەتمەندی هەر واقیعییەتێکی زەینی کە لە رێگەی گشتاندنەوە وەدەست هاتبێ. 6) تایبەتمەندی هەر بەرهەمێکی هونەری پشت ئەستوور بە حاڵەتە زاتی و ناوەکییەکان نەك هێما رواڵەتییەکان.

**انتساب:** 1) خزم بوون، خۆڕەپاڵدان، رەچەڵەك دانان. 2) پێوەنداریێتی و خزمایەتی.

**انتساخ:** 1) لەبەرنووسینەوە، لە روونووسینەوە. 2) گوهاستۆ. 3) لە نێوبردن.

**انتساق:** 1) رێکبوون، رێکوپێك بوون، رێك خران، تەکووزبوون. 2) رێك خستن.

**انتشار:** بڵاوبوونەوە، پەرەسەندن، پەخش.

**انتشارات:** کۆی"انتشار"، چاپەمەنی.

**انتشاراتی:** 1) دەپێوەندی لەگەڵ چاپەمەنیدا. 2) بڵاوکەرەوە. 3) دامەزراوە یان شوێنی بڵاوکردنەوە و فرۆشی کتێب.

**انتشاردادن:** پەرەپێدان. چاپ و بڵاوکردنەوە.

**انتصاب:** دانان، دانران، وەئەستۆگرتن یان وەئەستۆنان. دامەزراندن، دامەزران، قیت کردنەوە.

**انتصابی:** دانراو، بەشێوەی دانان.

**انتصاح:** ئامۆژگاریو پەند وەرگرتن.

**انتصار:** 1) یارمەتیدان. 2) سەرکەوتن، سەرکەفتن.

**انتصاف:** 1) وەرگرتنی هەقی خۆ لەکەسێك.2) بە نیوە گەیشتن.

**انتطاق:** قسەکردن، ئاخاوتن، دوان.

**انتظار:** چاوەڕوانی، چەمەڕایی، چاوەنواڕی، چاوەنۆڕی، چاوەڕێی، چاڤنێری، چاوەچاوی، چاولەدوویی، نەزاکە، تەرنە، ریپان ، نەزاکە.

**انتظاردادن:** لە چاوەڕوانیدا هێشتنەوە.

**انتظار داشتن:** چاوەنۆری کردن، چاوەڕوانی کردن.

**انتظار رفتن:** 1) پێشبینیکردن. 2) چاوەڕوان مانەوە.

**انتظار کشیدن:** بڕوانە: "انتظار داشتن".

**انتظام:** مروارید گرتنەوە، ڕێکبوون. 2) رازانەوەیی و ڕێکوپێکی، تەکووزی.

**انتعاش:** ژیانەوە، بووژانەوە، وەهێزکەوتنەوە، گەشانەوە، باڵاکردن.

**انتفاء:** لەناوبردن، تەفروتووناکردن. رەد، حاشا.

**انتفاخ:** بڕوانە: "آماسیدن".

**انتفاضه:** راپەڕین، رابوون.

**انتفاع:** قازانج کردن، بەرخواردن. کەلك وەرگرتن.

**انتقاء:** هەڵبژاردن، خاوێن کردنەوە، دەرهێنانی مێشك لە پێشە.

**انتقاب:** پەچە بەستن، دەمامك لێدان.

**انتقاد:** بەنەخت وەرگرتنی پارە. پووڵی چاك لەهی خراپ جیاکردنەوە. لێگرتن، وردەگری، رەخنە، رەخنەکاری، ئیراد. **"انتقادپذیر"**: رەخنە هەڵگر. **"انتقادسازنده"**: رەخنەی داهێنەرانە، رەخنەی بنیاتنەر. **"انتقاد عاطفی"**: رەخنەی سۆزدارانە. **"انتقاد کلاسیکی"**: رەخنەی کلاسیکی. **"انتقاد مثالی"**: رەخنەی سەرچەشنانە. **"انتقاد مطلق گرا"**: رەخنەی رەهاگەر. **"انتقاد فمینیستی"**: رەخنەی فێمینیستی، رەخنەی مێخواز(انە). **"فرا انتقاد"**: بان رەخنە، ئەوپەڕی رەخنە.

**انتقادآمیز:** رەخنەگرانە، تێکەڵ بە رەخنە.

**انتقادی:** رەخنەگرانە.

**انتقاش:** 1) دەرهێنان، دەرهاوردنی دڕوو لە لاق، هەڵبژاردن. 2) نەخشاندن، نەخشین. 3) نەخش وەرگرتن.





**انتقاص:** کەم بوونەوە. 2) کەم کردنەوە. 3) رەخنەگرتن. 4) کەم و کوڕی، ناتەواوی.

**انتقاض:** 1) قەڵشت هەڵگرتن و داتەپینی بینا. 2) پەیمان شکێنی. 2) خۆش بوونەوەی برین. 3) پووچەڵ بوونەوەی تارات. 4) کرانەوەو پسانی پەتی جۆلانێ.

**انتقال:** 1) گواز، راگوێز، جێگۆڕکێ، گۆزتن، گۆزان، گۆزانن، گۆزانەوە، گۆزتنەوە، گوازتن، گوازتنەوە، گوێزانەوە، گوزیان، گۆزیانەوە، گۆزین، گۆستن، گۆستنەوە، گواستن، راگواستن، راگوازتن، راگوێزان، راگوێزتن، گوهاستن، گوهازتن، ڤەگوهاستن، هەڵگۆستن، گواستنەوە، گوازتنەوە، هەڵگێڕ، بردن. 2) مردن، کۆچی دواییکردن. **"انتقال دادن"**: 1) بڕوانە: "انتقال". 2) فێرکردن، راهێنان. 3) تێگەیاندن. 4) تەشەنەپێدان. **"انتقال داده شده"**: گوازراو، راگوازراو، راگوێزراو، گۆزراو. **"انتقال دهنده"**: راگوازەر، راگوێزەر، گوازەر. **"انتقال دهنده صدا"**: دەنگبەر، دەنگبەرە، دەنگەوەرە.

**انتقام:** تۆڵە، تۆڵ، حەق، حەیف، هەیف.

**انتقام گرفتن:** تۆڵەساندن، تۆڵەسەندن، تۆڵەلێ سەندنەوە، تۆڵەکردنەوە، وێکردنەوە، حەق ساندنەوە، هەق لێکردنەوە، هەیف ستاندن، هەیف هەلێنان، وێکردنەوە، ئاڤدین، سزادانەوە.

**انتقامگیر:** تۆڵەستێن، تۆڵەکەرەوە، حەق وەسێن، هەقوەستێن، خوێن ئەستێن، خوێن گر.

**انتکاس:** سەرنگوم بوون، سەرەوژێربوون، نخوون بوون.

**انتلکتوئل:** رووناکبی، رۆشنبیر.

**انتماء:** 1) بە کەسێك نیسبەت دران، خرانە پاڵ. 2) بەستراوەیی، پەیوەندارێتی، لایەنگیری.3) گەشەکردن، هەڵدان.

**انتولوژی:** بوون ناسی.

**انتهاء:** دوایی، کۆتایی، ئاکام، دەرەنجام، بڕانەوە.

**انتهاج:** رێگە دۆزینەوە، گەڕان بە دوی رێگەی روون و ئاشکرادا.

**انتهاز:** دەرفەت دەست خستن، چاوەڕوانی دەرفەت بوون، بە هەل زانین، هەل قۆستنەوە.

**انتهاض:** هەستان، راپەڕین.

**انتهاك:** 1) ئابرووبردن، ریسواکردن. 2) سنوورشکاندن.

**انتیاب:** پەیتاپەیتا هاتن.

**انتیم:** دەروونی، نەفسی، ناخی، خۆمانەیی.

**انجاء:** 1) رزگارکردن. 2) ئاشکرا کردن.

**انجاب:** وەچەخستنەوە، مناڵ بوون.

**انجاح:** 1) بەجێهێنانی نیاز. 2) سەرکەوتن. 3) سەرخستن.

**انجاد:** 1) یارمەتیدان. 2) خوێندنەوە بە دەنگی بەرز.3) هەستان.

**انجاز:** بەجێهێنانی ئاتاجی کەسێك، هێنانەدی، ئەمەگداری.

**انجاس:** (اِ) پیس کردن، گەمارکردن.

**انجام:** ئاکام، دوماهی، دوایی، پاشین، جێبەجێ، یەربەیەر، ئەنجام.

**انجام پـذیر:** بڕوانە: "عملی".

**انجام دادن:** بەجێ هێنان، بەجێ هانین، هێنانەجێ، بە ئاکام گەیاندن، بەڕێوەبردن، جێبەجێ کردن، راپەڕاندن، لەقەم کردن، لەقم کردن، مەشاندن، سازاندن، سازدان، چێکرن، پێك هێنان، پێك هانین، کوداندن، فەسالْ دان، ئەنجام دان، رێك هاوردن، کردن، کرن، کاردش، تێپەڕاندن، سۆغین، قەتاندن، تەواوکردن، دروست کردنی کار/ کار دروست کردن.

**انجام دهنده:** پێك هێنەر، کار چێکەر، ئەنجامدەر، جێبەجێکەر.

**انجامش:** کۆتایی و سەرەنجامی کارێك، تەواوبوون، دەرەنجام. پەسلان، قیامەت.

**انجام شدن:** جێبەجێ بوون، بەجێهاتن، پێکهاتن، کودان، کران، بەڕێوەچوون، سەرگرتن، هاتنە کرن، هاتنە کردن، ئەنجام دران، رەنگ گرتن، یەربەیەر بوون.

**انجام شدنی:** شیاوی جێبەجێبوون.

**انجام گرفتن:** بڕوانە: "انجام شدن".

**انجام نا پـذیر:** بەرەو پێش نەچوو، جێبەجێنەبوو.

**انجامیدن:** جێبەجێبوون، بەکۆتا گەیشتن، کۆتایی هاتن.

**انجخیدن:** بڕوانە: "انجوخیدن".

**انجذاب:** کشران، کێشران.

**انجرار:** کێشران، رەوان بوون.

**انجلاء:** 1) رۆشن بوون، تروسکان، دەرکەوتن، ئاشکرابوون. 2) دوورکەوتنەوە.

**انجلاب:** کێشران.

**انجماد:** جەمەدین، بەستن، بەستران، بوونەسەهۆڵ، سەهۆڵ بەستن، رچان، رچیان، رچین.

**انجم گری:** مەکر و فێڵ.

**انجمن:** کۆمەڵە، کۆڕ، شوێنی کۆبوونەوە، شوێنی دانیشتن، جڤات، جوات، مەکۆ، راوێژگە، ئەنجومەن.

**انجمن آرا:** کۆڕ رازێنەوە، کۆڕخەملێن، مەشرەف خۆش.

**انجمن پیوند:** پێك هێنی کۆڕ، کۆکردنەوەی ئەندامانی کۆڕ.

**انجمن داشتن:** کۆڕ پێکهێنان، کۆبوونەوە بوون.

**انجمن کردن:** کۆوەبوون، راوێژکردن.

**انجوخ:** چرچ و لۆچی پێست.

**انجیدن:** جنین، هەنجاندن، هەنجنین، هنجنین، ئەنجنین، وردکردن بە تیخ یان چەقۆ، ئەنجن ئەنجن کردن، بڕین. "انجیده": هنج، هنجن، هنجی، هنج هنج، هەنجن، جنیاگ، هەنجناو، ئەنجناو، ئەنجن، پلپل، وردکراو بەتیخ.

**انجیردن:** کون کردن، وڵ کردەی.





**انحاء:** کۆی "ناحیە"، شێوەکان، رێگەکان.

**انحدار:** هاتنەخوار، نیشتنەوە. لێژی، هەڵدێر.

**انحراف:** لادان، وەرچەپین، کل بوون، کلابوون. "انحراف تیر": لاکردن، سەروبەرکردنی تیر، نەهەنگاوتن.

**انحراف استاندار:** لادانی پێوەر.

**انحراف جنسی:** کشان بەرەو کرداری سێکسی بەشێوەی ناسروشتی، لادان (بەلاڕێدا چوون)ی سێکسی.

**انحراف داشتن:** لار و چەماوبوون، لاری، خواری.

**انحراف ذهنی:** لادانی زەینی.

**انحراف کردن:** بەلاڕێدا بردن، چەواشەکردن.

**انحرافی:** لاڕێ(یانە)، لادەر(انە)، لاوەکی، ناڕاستەوخۆ. بەلاڕێدابەری زەین.

**انحصار:** 1) کەوتنەتەنگانەوە، بەرتەسک بوون. 2) پاوان کردن، تاپۆکردن، قۆرغ کردن، مۆنۆپۆل کردن، تایبەتی بوونی کار یان بابەتێك یان فرۆشی کالایەك بە کەسێك یان دامەزراوەیەك.

**انحصار تجارت:** چاوەدێری رێژەیی یان رەهای دەوڵەت بەسەر هەناردە و هاوەردەکاندا.

**انحصارگرا:** پاوانخواز.

**انحصارگرایی:** پاوانخوازی.

**انحصار وراثت:** بەڕێوەچوونی رێوڕەسمی یاسایی بۆ بەفەرمی ناسران و دیاریکردنی ژمارەی میراتبەران.

**انحصاری:** پاوانکراو، سەربە کەسێ یان دامەزراوە یان گروپێکی دیار.

**انحطاط:** نزم بوون، پەست بوون، بەخت وەرگەڕان، داکەوتن، داڕووخان. داوەشان، داوەشین.

**انحلال:** 1) توانەوە، تاوانەوە، حەلیان، کرانەوە. 2) هەڵوەشانەوە، هەڵوەشینەوە، هلشیان، هلشین، شیبوونەوە. 3) خاوبوونەوە. 4) ئاوالابوون، کرانەوە.

**انحناء:** کۆم بوونەوە، کووربوونەوە، داهاتنەوە، داچەمان، چەمانەوە، چەمینەوە، دانەوین، خواربوونەوە، لاربوونەوە.

**انخداع:** خەڵەتان، فریو خواردن، خاپیان، هەڵفریوان، لەخشتەچوون.

**انخراط:** 1) بە نەزانی خۆ دە کارێك هەڵقورتاندن. 2) لەڕیبوونی لەش.

**انخزال:** بەرەو سستی و داماوی و لەشگرانی چوون.

**انخساف:** رۆچوون، ون بوون، کوێربوون، مانگ گیران.

**انخفاض:** کەوتنە لێژایی، کەوتنە نشێوی، نزمی، دابەزین.

**انخناق:** قوڕگ گیران، خنکان.

**انداختن:** 1) هاويشتن، هاويژتن، هاويتن، ئاويشتن، ئاڤيتن، ئاويتن، خستن، كەواندن، فڕێدان، تووڕدان، تووڕهەڵدان، برك دان، هل قتاندن. 2) راخستن، پانكردنەوە. 3) لەباربردن، بەرخستن. 4) خستن، وەشاندن. 5) دروستكردن، ئامادەكردن. 6) لەپێ خستن، ماندووكردن. 7) بڵاوكردنەوە، پەخش كردن. 8) پێدادان. 9) لابردن، وەلانان. 10) لەسەكارلابردن.سڕينەوە، لەناوبردن. 11) نەخش كردن. 12) پێكهێنان، سازكردن. 14) رەت كردنەوە.15) رژانی تراوێ لە دەفرێ. 16) دوورخستنەوە، خستنەدەرەوە. 17) ئەنازەگرتن، پێوان. 18) راوێژكردن سەبارەت بە كارێك. 19) پلان دانان بۆ كارێك. 20) خستنەڕوو. 21) بڕينی ئەندامانی لەش. "**انداختن بدون هدف گيرى**": مێشومحانج، ئاويتنی بێئامانج. "**انداختن به كسى**": 1) قسەی بەتێكوڵ پێگوتن، گاڵتەپێكردن. 2) كاڵای ئەياغ و بێرمێن بە فێڵ پێفرۆشتن يان پێدان. "**انداختن درجايى**": نيشتەجێبوون لەوێ. "**انداختن كسى را از چيزى**": لێوەرگرتن(ەوە). "**خود را جايى انداختن**": خۆبەسەرادان، خۆسەپاندن بە سەر خانەخوێ دا.

**انداخته:** تووڕدراو، فڕێدراو، فڕێدرياگ، هاوێژراو، پەرت كرياگ، هل قتايی.

**انداد:** كۆی"ند"، وەك، هاوتا.

**اندار:** كەم كردن، لەكەمی‌دان.

**اندازنده:** بڕوانە: "افكننده".

**اندازه:** رادە، هەندێ، پێوانە، پێودان، پێودانك، شاقەڵ، شۆ، قەدر، قەدەر، قەير، قەرا، گۆرەبا، رەژە، ئەندازە، سايز. "**از اندازه به در بردن**": سنووربەزاندن، لە رادە تێپەڕاندن. "**از اندازه بيرون**": فرە، زۆر. "**تا اندازه‌اى**": تاڕادەيەك.

**اندازه‌گذارى:** دياريكردنی مەودا، درێژی، پانايی، بەرزی و قووڵايی لەسەر نەخشە.

**اندازه گرفتن:** پێوان، پێوتن، پێوانەكردن، ئەندازەگرتن و دياريكردنی رادەی چۆنايەتی و چەندايەتی شتێ.

**اندازه‌گير:** پێوەر، كەسێ كە دەپێوێ، لە گەزدەر، ئەندازەگر.

**اندازه نگه‌داشتن:** ميانەڕۆيی كردن.

**اندام:** لەش، جەستە، بەدەن، ئەندام. بەژن، باڵا. رێساو شێوازی دروست، كاری رێك و پێك. كۆئەندامی سێكسی ژن يان پياو. "**به‌اندام**": هاوڕێژە، هاوكێش.

**اندام دادن:** رازاننەوە، رێكوپێك كردن، فۆرمی لەبار پێدان.

**اندام زايى:** پێكهاتنی جەستە كاتی هەڵدان و گوورانی تۆل.

**اندامك:** هەركام لە پێكهاتەكانی ناوەوەی خانە كە ئيشی تايبەتی خۆی هەيە.

**اندامگان:** بڕوانە: "ارگانيسم".





**اندام گرفتن:** رێكوپێك بوون، تەكووزبوون، دۆخی لەبار پەيداكردن.

**اندامى:** ئۆرگانيك.

**انداوش:** بڕوانە: " اندايش ".

**انداويدن:** بڕوانە: "انداييدن".

**اندايش:** قوڕەكاری، ماڵەسواغ، پياساوين، هەڵسوان، ناوين، سواق، سواغ.

**اندايشگر:** گەچكار، تێساوەر، سواغدەر، بەنناى ماڵەسواغ.

**انداينده:** بڕوانە: "اندايشگر".

**انداييدن:** ماڵە سواغ كردن.

**اندخس:** پشت و پەنا، پشتيوان، پشتەڤان.

**اندخسواره:** قەڵا، حەشارگە.

**اندخسيدن:** 1) پەنادان، پشتيوانی لێ كردن، پاراستن.2) پەناگرتن، خۆحەشاردان.

**اندر:** 1) دەفری دەم و كات، لە، لە ناو. 2)بە دەگمەنتر، كەم وێنەتر. 3) خەرمان.

**اندراج:** هاتنە ناو، چوونەناو.

**اندراس:** 1) لە ناوچوون، كۆنەبوون، كۆن بوون . 2) كۆنی.

**اندرباى:** سووكەڵەی "اندربايست"، پێويست.

**اندربايست:** پێويست، بەگرينگ گر، گوێ دەر بەكارێك.

**اندرخور:** شياو، شايان، لايق، هەژی.

**اندرز:** ئامۆژگاری، ئامۆژياری، ئامۆچياری، مۆچياری، مۆجگاری، مۆجياری، نسحەت، پەند.

**اندرز دادن:** ئامۆژگاری‌دان، ئامۆژگاری كردن، نسحەت كردن.

**اندرزگر:** ئامۆژگار، ئامۆژگاری كار، ئامۆژگاری كەر، ئامۆژيار، مۆژيار، پەندێر، نسحەتكەر، ئامۆچيار، مۆچيار، مۆجيار، مۆچكە، وەعزدادەر.

**اندرزگو:** بڕوانە: "اندرزگر".

**اندرزنيوش:** نسحەتگر، پەندوەرگر، ئامۆچياری وەرگر.

**اندرشدن:** چوونە ژوورەوە، رۆيشتنە ناوەوە.

**اندرشكستن:** ئامادەكردن.

**اندركشنده:** بڕوانە: "جاذب".

**اندركشيدن:** 1) كێشان. 2) راخستن، پان كردنەوە. 3) فڕكردن، هەڵقوڕاندن. 4) بزاوتن، جووڵاندن. 5) رۆيشتن، چوون. 6) تێپەڕين.

**اندركنش:** كارتێكەريی دوولايەنەی دوو شت لەسەر يەكتر، پێكەوە هەڵكردن.

**اندرگذاشتن:** 1) تێپەرشاندن. 2) وازلێهێنان.

**اندرگذشتن:** 1) تێپەڕين، پێداچوون. 2) مردن، كۆچی دوايی كردن. 3) وازهێنان، چاوپۆشی. 4) دەرچوون.

**اندرگرفتن:** دەس پێکردن. بلێسەسەندن.
**اندرماندن:** دامان، عاجزبوون.
**اندر نوشتن:** 1) پێوان، بڕین. 2) کراندن، هەڵکوڵین. 3) لەناوچوون، سڕانەوە. 4) تێپەڕاندن، وەدوادان.
**اندروا:** 1) هەڵواسراو، هەلاویستی. 2) سەرگەردان و پەشۆکاو، داماو.
**اندرون:** بنکڵێشە، دەرون، ناڤ، ژناڤدا، ناولەش، ژوور. زەین.
**اندرون شناسی:** هەناوناسی.
**اندر یابایی:** بڕوانە: "ادراك".
**اندریافت:** بڕوانە:"ادراك".
**اندریافتن:** تێگەین، تێگەیشتن. پەیاکردن، دۆزینەوە.
**اندفاع:** دوورکەوتنەوە، لابران، لادران. هەڵپە.
**اندك:** کەموکە، کەم، کم، کێم، بەحاڵ، ئاستەم، حاستەم، تۆزقاڵ، تۆسقاڵ، تۆسکاڵ، تۆزکاڵ، تۆزڵانە، تۆزڵقان، توزولکە، نەختوکە، پرك، پرتك، پیچ، هندك، پیت، پێزە، نچە، کەمترین ئەندازە.
**اندك اندك:** کەمەکەمە، کەم کەم، کێم کێم، کمکمە، پیچ پیچە، پچرپچر، تۆزە تۆزە، پیتەپیتە، وردەوردە، نەختەنەختە، برەبرە، بەرەبەرە، سەبرەسەبرە، هێدی هێدی، وەرەوەرە.
**اندکی:** کەمێك، کەمێ، کەمەکێ، کەمەك، کەموسکەیەك، کمەك، کەمەی، هەندەك، هێندێك، هێندێ، هەندێك، هندکەك، هنەك، پاژێکی کەم، برۆکە، برێك، تۆزێ، تۆزێك، گونچڕ، نەختێ، نەختێك، میچالەك، چکێ، قلێك، قنجك، حاستەم و دوو بەلا، کرتك، کوچێو، پیچەك، پێتەك، تانێ.
**اندماج:** 1) تێوەچوون، چوونە ژوورەوە.2) پتەوبوون.
**اندمال:** خۆشەوەبوون، ساڕێژبوونەوە.
**اندمه:** باسکردنی رووداو و بەسەرهاتی تاڵ و ناخۆش، وەبیر هێنانەوەی خەم و کەسەرەکانی رابردوو.
**اندوختن:** پاشەکەوت کردن، پاشکەوت کردن، پەزمەندە کردن، پەسمەنەکرن، پاشقل دان، گێڕانەوە، هەڵگرتن، کۆکردن، نۆتەکردن، نیاتەکردن، داخستن، هەلخستن. وەدەست هێنان. "**اندوخته**": 1) پەزمەنە، پەزمەندە، پەزمەندە، پەسمەنە، پەسمەندە، پاشەکەوت، پاشەکەفت، پاشەکەوتی، پەسەناز، پەسەنناز، نیاتە، نۆتە، گردەوەکۆیی، گلدریاوە، گلۆدراو، پاشقول، پاشقل، ڤەبوور، بازمان، لێ بەجێماو. 2) ئەزموون، زانیاری. 3) تێشوو، بژیو.
**اندودن:** تێهەڵساوین، تێهەڵسوون، تێساوینی رەنگ، پیاساوین، پێداساوین، هەڵسوون، هەڵسوان، هەڵساوین، هەلهسوون، پیامالین، هنین، ناوینەوە، سواغ دان، ماڵەسواخ کردن، تەڕەماڵە، گلەبان.





**اندوکرین:** نێوەڕژێن.
**اندوزه:** بڕوانە: "اندوه".
**اندوزنده:** پاشەکەوت کەر، پەزمەنەکەر، (کەر، کان).
**اندوزیدن:** بڕوانە: " اندوختن".
**اندول:** بەرك، رقاوی.
**اندوه:** کەسەر، کول، کولوکەسەر، مەینەت، کۆڤان، خەم، پەژارە، کرێب، خەم و خەفەت، حەژمەت، مەینەت، کوزیرك، خەمباری، گژم، کەدەر، جخار، جەخار، جغار، تەمیان، تانۆت، مورووز، مۆژە، عەزرەت.
**اندوهبار:** خەم هێن.
**اندوهزدا:** تەمیان رەتێن، کەسەرسڕێن، خەم رەوێن، خەفەت بەر.
**اندوهفزا:** کەسەرزا، کول هێنەر، خەم هێنەر.
**اندوهگسار:** خەم خۆر، خەم خوار، دڵسۆز، کەسێ کە خەم لە پیاو دەخوا.
**اندوهگین:** خەمبار، خەمناك، دڵ پڕلەخەم، مەینەتبار، دڵتەنگ، داخدار، تەمین، ناشاد، غەمگین، مروچ، جەرگاوس.
**اندوهمند:** بڕوانە: "اندوهگین".
**اندوهناك:** بڕوانە: "اندوهگین".
**اندوهه:** بڕوانە: "اندمه".
**انده:** سووکەڵەی"اندوه".
**اندی:** هیوا، هیواداری، سەیر.و بە مانای بوو و مەگەر و لەوانەیە.
**اندیدن:** 1) سەرسووڕمان، بە گومانەوە ئاخاوتن، دوودڵ بوون. 2) بڕوانە: "اندودن".
اندیش پایە: بڕوانە:"جزمی".
**اندیشگیر:** گیرا، جێیسەرنج.
**اندیشمند:** هزرڤان، خاوەن هزر، خودان هزر، بیرروناك، بیرمەند، تێ بین، تێراماو لە بیرو ئەندیشە. "**اندیشمند شدن**": چوونە فیکرەوە.
**اندیشمندی:** بیرکردنەوە، تێفکرین.
**اندیشناك:** 1) بیرمەند، هزرڤان. 2) نیگەرانی هێنەر، جێگەی ترس و گومان، ترسناك.
**اندیشنده:** بیرمەند، بیرکەرەوە.
**اندیشه:** هزر، بیر، بیرۆکە، فیکر، بیرکردنەوە، تێرامان. گومان، ترس، نیگەرانی. خەم، کەسەر. لالێکردنەوە، خەمخۆری. "**بهاندیشه**": بێجەرگ.
**اندیشه‌برگماشتن:** وردبوونەوە.
**اندیشه‌خوردن:** 1) خەم خواردن. 2) ترس هەبوون.
**اندیشه داشتن:** 1) ترسان و نیگەران بوون. 2) وردبوونەوە و چاوەدێریکردن.
**اندیشه‌دیسه:** وێنا، خەیاڵ.
**اندیشه‌کار:** بڕوانە: "اندیشەگر".
**اندیشه‌کردن:** 1) بیر کردنەوە، راوێچکە، راوێشکە، تیا رامان، خەیاڵ کردن. 2) هەست بە ترس کردن، ترسیان. 3) خەم خواردن. 4) پەندوەرگرتن.
**اندیشه‌کشیدن:** بڕوانە: "اهتمام و عنایت".
**اندیشه‌کیش:** 1) هۆگری بیرکردنەوە، ئەوەی خووی بە بیرکردنەوە گرتوە. 2) خەیاڵاتی.

**اندیشەگاه:** بیردان، جێگەی خەیاڵ، واق.

**اندیشەگر:** هزرڤان، خاوەن هزر، بیرکەرەوە، دوورنواڕ.

**اندیشەگرایی:** هزرخوازی، بیرۆکەخوازی.

**اندیشندە:** بیرکار، گومانکەر.

**اندیشەورزی:** هزرڤانی، هزرکاری، تێفکرین.

**اندیشیدن:** بڕوانە: "اندیشەکردن". "**اندیشیدن از**": ترسین لە. "**اندیشیدە**": بیرلێکراوە.

**اندیك:** سووکەڵەی "اندی".

**اندیکاتور:** پێناسکار، ناسێنەر، پیشاندەر، دەفتەری نوێنەر.

**اندیویدوآلیست:** بڕوامەند بە پرەنسیپەکانی (اندیویدوآلیسم).

**اندیویدوآلیسم:** ڕێبازێکە کە پێڕەوانەکەی بڕوایان بە رەسەنایەتیی تاك هەیە. پاراستنی بەرژەوەندی تاکەکەس.

**انژار:** ترساندن، گەڤ، ئاگادارکردنەوە، پێڕاگەیاندن.

**انژکسیون:** دەرزی لێدان.

**انز:** نارەسەن، درێو، سامناك، ترسناك.

**انرژی:** وزە، هێز، توانایی، پڕکاری. "**انرژی الکتریکی**": وزەی ئێلێکتریکی، وزەی بەرهەمهاتوو لە جەریانی ئیلێکتریکی. "**انرژی پتانسیل**": وزەی شاراوە و ناچالاك. "**انرژی جنبشی**": وزەی سێنێتیك، ئەو وزەیەی کە لە جسمی لە حالّی رۆیشتن دایە. "**انرژی ماهیچەای**": وزەی شیمیایی پەزمەنەکراو لە ماسوولکەی بوونەوەران دا. "**انرژی هستەای**": وزەی ناوکی.

**انرژی زا:** هۆکاری وەدیهاتن یان زۆربوونی وزە، وزەبەخش.

**انزار:** کەم کردن، لێکشان، کەم کردنەوەی وەخشە.

**انزال:** (اَ) کۆی "نزل".

**انزال:** (اِ) ناردنەخوار، هێنانەخوار، دابەزاندن، داگرتن. "**انزال منی**": ئاوهاتنەوە، رەحەت بوون.

**انزجار:** بێزاری، نارەزایەتی، تووڕەیی، جاڕزی.

**انزجارآور:** بێزاریهێن، جاڕزکەر، قێزەون.

**انزعاج:** وەڕەزی، بێزاری، نائارامی.

**انزواء:** 1) گۆشەگیربوون، تەریك بوون، دووریکردن. 2) دوورەپەرێزی، گۆشەگیری، بەدەری، تەریکایەتی، تەریکێتی، پەناگیری، کەنارەگیری، سلکاندن.

**انزواطلب:** تەریك، گۆشەگیر، دوورەپەرێز.

**انزوای وجودی:** تەریکایەتی بوونیانە.

**انس:** (اُ) 1) خووگرتن، خووپێگرتن، هۆگربوون، هۆگرتن، گرۆبوون، عادەت گرتن. 2) خووگری، هۆگری، هاودەمی، هاودەنگی، پێکەوە رابواردن.





**انس:** (اِ) مرۆ، مرۆڤ.

**انساء:** 1) وەدواخستن، پاوپاکردن. 2) فەرامۆشکاری، لە بیرچوونەوە.

**انسال:** (اَ) کۆی "نسل".

**انسال:** (اِ) وەچەخستنەوە.

**انسان:** مرۆ، مرۆڤ، خەڵك، ئینسان، حیسان، عیسان. کەس، تاکەکەس.

**انسان اقتصادی:** مرۆڤی ئابووریکار.

**انسان انگاری:** هاوشێوەخوازی، قایل بوونی تایبەتمەندییەکانی مرۆیی بۆ خوا یان ئاژەڵ یان تەنەکان، "ئانترۆپۆمۆرفیسم".

**انسان پنداری:** بڕوانە: "انسان انگاری".

**انسان دوستی:** مرۆڤدۆستی. مرۆڤخوازی، هیومانیزم.

**انسان ستیزی:** دژە مرۆیی.

**انسان شناس:** خەڵك ناس، مرۆناس.

**انسان شناسی:** خەڵك ناسی، مرۆناسی، ئانترۆپۆلۆژی.

**انسان گرایانە:** مرۆڤخوازانە.

**انسان گرایی:** مرۆڤگەریەتی، مرۆڤخوازی، هیومانیسم. "**ضدیّت با انسان گرایی**": دژەمرۆخوازی.

**انسان گروی:** بڕوانە: "انسان گرایی".

**انسان محوری:** مرۆڤ تەوەرانە.

**انسان مدار:** مرۆڤ تەوەر، بە پێی ئەم بڕوایە مرۆڤ نێوەندی جیهانە.

**انسان مداری:** نێوەندێتی (چەقگیری) مرۆڤ، مرۆڤ تەوەری . ئومانیزم.

**انسانی:** مرۆیی، ئینسانی، باش و شیاو.

**انسانیّت:** 1) مرۆڤبوون. 2) مرۆڤایەتی، مرۆڤانی، ئینسانەتی، پیاوەتی، جوامێری، بەزەیی. "**انسانیّت ستیزی**": دژە مرۆڤایەتی.

**انسب:** لەبارتر، شیاوتر.

**انسباك:** توانەوە.

**انسترومنتالیزم:** پاساوگەرێتی.

**انستیتو:** دامەزراوە، لێژنەی ئەدەبی یان زانستی، ئەنجومەن.

**انسجام:** یەکگرتوویی، یەکپارچەیی و **هاوئاهەنگی**، یەکدەستی، کۆکی، دەگەڵ یەکتری ڕێککەوتن، گونجان، پێکەوە گونجان، تەکووزبوون. **هاتنەخواری** ئاو یان فرمێسك. "**انسجام مضمون**": یەکگرتوویی واتادار.

**انسحاق:** پلیشانەوە، وردبوون.

**انسداد:** داخران، بەستران، پێوەدران، گیران.

**انسدار:** 1) شۆڕبوونەوە، داهێڵران. 2) وەپەلەکەوتن، بە ئەسپایی رۆیشتن.

**انسدال:** شۆڕبوونەوە، داهێڵران.

**انسراح:** 1) شۆڕکردنەوەی موو. 2) رووتبوونەوە. 3) ئاسانی، سانایی.

**انسکاب:** هەڵڕێژان، رژان، رژیان.

**انسلاخ:** 1) پێست فرێدان، رووت بوونەوە، داماڵران، داماڵیان. 2) لیباس داکەندن، رووت بوونەوە. 2) تێپەڕین.

**انسی:** (اُ) هۆگر، خووگرتوو.

**انشاء:** 1) دەس پێکردن، خولقاندن، وەدیهێنان، چێکرن. 2) ئینشا، پەیداکردنی وشەو رستەی جوان بۆ نووسین، دارشتن. 3) نووسراوەی ئەدەبی یان هەر نووسراوەیەکی تر. "**انشاکردن**": سازکردن، وەدیهێنان. 2) نووسین، هۆنینەوە.

**انشاءاله:** خوابیکا، خوا حەزکا، هوومای بکۆ.

**انشاد:** 1) تاریف و پەسنی ون بوو. 2) رێنوێنیکردن. 3) هەجوگوتن. 4) خوێندنەوەی شێعری کەسێ بۆ کەسێکی دی، خوێندنەوە و هێنانەوەی شێعری کەسێکی دی.

**انشار:** زیندووکردنەوە.

**انشراح:** کرانەوە. شادبوون.

**انشعاب:** لێك بڵاوبوون، کەرت بوون، لێکجیابوونەوە، جیابوونەوە، دوورکەوتنەوە، تیرەتیرەبوون، لك لك بوون، بڕ، تەکینەوە، فایقانە، حاچە.

**انشقاق:** 1) قەڵەشان، قەڵەشین، قڵیشان، تڵیشان، تڵیش بردن، داتڵیشان، هەڵتڵیشان، دادڕان، ترەکیان، درزبردن، کرانەوە، ئاوەڵەبوون. 2) لەت بوون، کەرتبوون، لێك بڵاوبوون، لەت و پەت بوون، پەرت بوون.

**انصات:** 1) بێدەنگ بوون، بێدەنگ کردن. 2) گوێگرتن، گوێهەڵخستن.

**انصار:** کۆی "نصر،ناصر"، پشتیوانان، یاریدەدەران، دەست و پێوەندان، لایەنگران.

**انصاف:** (اَ) کۆی "نصف".

**انصاف:** (اِ) ئینساف، مرۆت، مرۆیەتی، مروەت، ویژدان، هەقانیەت، هەق بێژی، دادپەروەری، میانەڕۆیی. "**انصاف دادن**": دادپەروەری کردن، وەدیهێنانی هەق.

**انصافاً:** لە روی داد و ئینسافەوە.

**انصداع:** قڵیشان، ترەکیان، درزبردن.

**انصراف:** وازهێنان، وازلێهێنان، چاوپۆشیکردن، راگۆڕین، لێگەڕان، دەست کێشانەوە، دەس لێبەردان، پەشیمانی. گەڕانەوە.

**انصرام:** بڕان، پچڕان.

**انضباط:** رێك و پێك بوون، دیسیپلین.

**انضمام:** 1) لە گەڵ کەوتن، خرانەسەر یەکتری، سەریەك خستن، گەیشتنەوە یەکتری دوو چت، لکان، هاوپێچی. 2) پەیوەست بوون، چوونە ریزەوە. "**بەانضمام**": بەهاوپێچ. رەگەڵ، لەگەڵ.

**انطاق:** وەقسەخستن.

**انطباع:** چاپ بوون، نەخش بەستن. هەست، کاریگەری.

**انطباعات:** چاپەمەنی.

**انطباق:** بەرامبەربوون، یەکسانی، پێکەوەگونجان، گونجان، گونجاندن، سازان، لوان، هاوڕێکی، هاوتایی. "**انطباق دادن**": پێك گرتن، بەراوردکردن.

**انطفاء:** کووژانەوە، کووژیانەوە، دامراندن، دامرکانەوەی ئاگر.

**انطلاق:** 1) رزگاربوون، بەرەڵابوون، ئازادبوون، بەردران. 2) بڕوانە: "گشادگی".

**انطماس:** داپۆشران، لە بەرچاو ون بوون.





**انطواء:** هەڵپێچران، نووشتانەوە، پێوان.

**انظار:** 1) گوێدان. 2) کات دان، مۆڵەت دان. 3) چاو، بەرچاو. 4) روانگەکان. "**انظارعمومی**": بەرچاوی خەلکی.

**انعام:** (اَ) کۆی "نعم"، مالات، زیندەماڵ، چوارپێیەکان.

**انعام:** (اِ) رێزانە، خەڵات، بەخشین، وەخشە، بەخشش، چێشتانە، مارکوونە، شاگردانە، دەست خۆشانە، پاداشت. "**انعام لباس تازە**": بەردڕانە، بەردڕکانە، بەردڕەکانە، نوقڵانەی بەرگی نوێ.

**انعدام:** نەبوون، نەمان، بڕیان، قڕتێکەوتن.

**انعزال:** لێکەوتن. گۆشەگیری.

**انعطاف:** نەرمی، خواربوونەوە، چەمانەوە، لاربوون، وەرگەڕانەوە، هەڵچەرخیان، بادانەوە.

**انعطاف پذیر:** نەرم و شلك و شیاوی بادان، چەم هەڵگر، سازگار، لخیز، لاستیکی، وەك لاستیك، elastic. خۆگونجێن، خۆڕێکخەر.

**انعطاف پذیری:** نەرمی نواندن، سازگاری. خۆڕێکخەری.

**انعطاف ناپذیری:** نەرمی نەنواندن، نەچەمین، نەگۆڕی، وشکی، یەك دندەیی.

**انعقاد:** بەستن، بەستران، گرسان، مەیین بۆ شتی شل و تراو. گرێدران، گرێدان، گرێ خواردن، رێکەوتن، پێکهاتن. (سیاسی) گرتن، بەستن، بەرێوەبردن. "**انعقاد خون**": مەیینی خوێن، "ئاگلۆتیناسیۆن".

**انعکاس:** (دەنگ/ رەنگ/ کار) دانەوە، کەوانەکردنەوە، وەدان، بەراوەژووبوون، پێچەوانەبوون. "**انعکاس پرتو**": شەوق دانەوە، شۆقدانەوە، شەبەقدانەوە، ترووسکانەوە، تیشك دانەوە، بریقانەوە. "**انعکاس صدا**": زایەڵە، پێژن، دەنگ ڤەدان، دەنگ دانەوە، گومنی. "**انعکاس کلی**": سەراپادانەوە، دانەوەی گشتی، کاردانەوەی گشتی.

**انعم:** (اَ.عَ) نەرمتر.

**انعم:** (اَ.عُ) کۆی "نعمت".

**انغاص:** ناخۆش کردنی ژیانی کەسێك.

**انغاض:** لەرزین و نیگەران بوون.

**انغمار:** چوونە ژێر ئاو. داپۆشران.

**انغماس:** ژێر ئاوچوون، نقووم بوون، نغرۆبوون.

**انغمام:** 1) خۆداپۆشین، داپۆشین. 2) خەمباربوون.

**انفاد:** 1) لەناو بردن. 2) تەواو کردن، بە کۆتایی گەیاندن. 3) تەواوبوون، بە کۆتایی گەیشتن. 4) ناردن، رەوانەکردن.

**انفاذ:** 1) بەجێهێنان، جێبەجێکردن، پێکهێنان، کار هەڵسووڕاندن. 2) ناردن.

**انفاق:** 1) بەخشین، رۆزی دان، خەرج کردن. 2) نەداربوون.

**انفال:** کۆی "نفل"، تالانەکان، بەهرەکان.

**انفت:** 1) عەیب، ناحەز. 2) زیان، تاوان.

**انفتاح:** کرانەوە، کریانەوە، ڕەوانەوە، ئاوەڵەبوون، ڤاڵاهی.

**انفتاق:** ڕەوانەوە، لێك جیابوونەوە، تلیشان، ئاوەڵابوون.

**انفجار:** تەقینەوە، تەقانەوە، تەقین، تۆقین، ترۆقین، بەقتین، پەقان، پەقین، ترەکین، لەبەریەکچوون، ڤلت.

**انفجارآمیز:** تەقینەوە ئاسا.

**انفجار جمعیت:** چوونەسەری لەنکاو و چڕی حەشیمەت.

**انفجاری:** تەقینەوەیی.

**انفراج:** لاچوونی تەمیان و ڕزگاربوون لە خەم، ڕەوینەوەی خەم، والایی نێوان دوو شت.

**انفراد:** یەکتایی، تەنیایی، تەنیابوون.

**انفرادی:** تاکەکەسی، یەك کەسی.

**انفس:** گرانتر، بەنرختر.

**انفساخ:** ڕووخیان، تێکچوونی گرێبەست.

**انفصال:** 1) جیابوونەوە، جوێبوونەوە، لێك بوونەوە، لێك بڕان. 2) جیایی، دابڕان، پسان، پچڕان. 3) لەسەرکار لابران، لێخران. "**انفصال کردن**": یەکالاکردنەوە.

**انفصام:** شکان، ترەکیان، بڕان، دابڕان، ترازان.

**انفطار:** درزبردن، تلیشان، قەڵشین.

**انفع:** بەقازانجتر، بەسوودتر.

**انفعال:** ناچالاك، بێکردەوە. شەرمەزاری، شەرمەزاربوون، سەرداخستن، کارتێکراو، کاردانەوە، تاوگیری. "**انفعال خوردن**": شەرمەزاربوون، خەجاڵەت کێشان. "**انفعال دادن**": تەریق کردنەوە، خەجاڵەت کردنەوە.

**انفکاك:** لێك جیابوونەوە، لێك جوێبوونەوە، کرانەوە، هەڵوەشان، ڕزگاربوون، ئازادبوون. "**بەانفکاك**": جیاجیا.

**انفکاك قوا:** جیایی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و بەڕێوەبەری و دادوەری لەیەکتر.

**انفکاك ناپذیر:** جیانەکراوە، جیانەبۆوە.

**انفلاسیون:** زۆربوونی ناهاوڕێژەی پارە، بڵاوبوونەوەی لە ڕادەبەدەری دراو و ئاوسانی پارە کە ببێتە هۆی چوونەسەری نرخەکان و دابەزینی بەهای پارە.

**انقاذ:** ڕزگارکردن، دەربازکردن، قوتارکردن، پەڕاندنەوە.

**انقاض:** پاشماوەی شتی ڕووخاو، دارو پەردوو.

**انقباض:** 1) گرفت، دڵ وەتەنگ هاتن، چوونەیەك، چوونەوەیەك، وێك هاتن، فلین، هەڵقرچان، شەبکین. 2) (پزیشکی) گرژبوون، گرژبوونەوە.

**انقراض:** لەناوچوون، قڕتێکەوتن، قڕان، قڕهاتن، بڕانەوە، بنبڕ بوون، نەمان، فەوتان، قەلاچۆ، تەفروتوونابوون، ڤەبڕیان، ڤەبڕین.





**انقسام:** دابەش بوون، دابەش کران، بەش بەش بوون، کەرت بوون.

**انقص:** کەموکوڕی دارتر.

**انقضاء:** بەسەرچوون، بەسەرهاتن، تێپەڕین. دواییهاتن، بەکۆتایی گەیشتن. لەناوچوون، نەمان.

**انقطاع:** پچڕان، پچڕیان، بڕان، بڕیان، دابڕان، پسان، پسیان، لێك بڕان، لێك هەڵبڕان، لێك بوونەوە، جوێبوونەوە، لەت بوون، نابەردەوامی. "**انقطاع یافتن**": دوورکەوتنەوە، لاچوون.

**انقلاب:** شۆڕش، هەڵگەرانەوە، ڕاپەڕین.وەرچەرخان، وەرگەڕان، سەراوژێربوون، ژێر و ژوور بوون. ئاژاوە، پشێوی. "**انقلاب سرخ**": 1) شۆڕشی سووسیالیستی. 2) شۆڕشێ کە خوێنی تێدا بڕژێ. "**انقلاب سوسیالیستی**": ڕاپەڕینی کرێکاران بۆ جێگیرکردنی سوسیالیسم و بە نەتەوەییکردنی سەرمایە و ئامرازی بەرهەمهێنان. "**انقلاب فرهنگی**": شۆڕشی کولتووری، گۆڕانکاری کتوپڕ لە پڕۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردن کە زۆربەی کات دوای شۆڕشی سیاسی دێتە ئاراوە. "**انقلاب مخملی**": شۆڕشی نەرم.

**انقلابی:** شۆڕش گێڕانە، شۆڕشگێر. لایەنگری شۆڕش.

**انقلابیون:** شۆڕشگێڕان.

**انقلاع:** هەڵکەنران، لە ڕیشەوە دەرهێنران، ڕیشەکێش کران، هەڵکێشان.

**انقیاد:** ملدان، مل کەچ بوون، ڕام بوون، گوێڕایەڵی، خاکەڕایی.

**انکاح:** مارەبڕین، بەشوودان.

**انکار:** حاشا، هاشا، نکۆڵی، لاگرتن، مل نەدان، ملەجەڕێ، دان پێدانەهێنان، نەدرکاندنی ڕاستی، ڕاستی وەشارتن، قبووڵ نەکردن، خوەنین، نەچوونەژێر، دانەژێر، باوەڕنەکردن، بێباوەڕی، نەبە، نەناسین. "**انکارکننده**": حاشالێکەر، نکۆڵی لێکەر، لەژێردەرچوو، مل نەدەر، دان پیانەنەر، وەشێر.

**انکارانکار:** نکۆڵیکردنی نکۆڵی لێکراو.

**انکارنا پذیر:** حاشاهەڵنەگر.

**انکر:** نەناستر، ناشیرین تر، ناحەزتر، دزێوتر.

**انکرمنکر:** ناحەز، ناشیرین.

**انکسار:** 1) شکان، شکیان، شکاندن، شکانەوە، ڤەشکان. 2) بێهێزی، بێ تاقەتی. 3) خۆشکێنی، خۆبەکەم گرتن. "**انکسارنور**": شکانی نوور، گۆڕانی ئاراستەی تیشکی ڕۆژ.

**انکساف:** خۆرگیران، گیرانی خۆر.

**انکشاف:** دەرکەوتن، دیاربوون، ئاشکرابوون.

**انکیزیسیون:** ڕاپشکنی، گەڕان و لێپێچینەوە لە بیروڕای خەڵکانی دی.

**انکیس:** ئاوەژوو، نخون.

**انگ:** 1) لەقەم، بڕوبیانوو، تۆمەت. 2) بەدخولق. "**انگ زدن**": تۆمەت لێدان. لەقەم لێدان. دیاریکردنی عەیار و پلەی پوختەیی کانزاکان. مۆرکردنی بەستەی کاڵاکان.

**انگار:** هەروەکی، هەروەکوو، گومان، گریمان، خەیاڵ، هەڵبەت، وێدەچێ، رەنگە، مەرسە.

**انگاراك:** وەهم، خەیاڵ، وێنای پووچ.

**انگاردن:** بڕوانە: "انگاشتن".

**انگارده:** 1) رازە، چیرۆك، بەسەرهات. 2) وازانراو، وێناکراو.

**انگارش:** 1) وێنا، گومان، وەهم. 2) چیرۆك، رازە. 3) گریمانەیی، گۆترەیی، بەمەزندە.

**انگاركردن:** وێناکردن، فەرزکردن.

**انگارگان:** ئیدئۆلۆژی، مەرام.

**انگارنده:** گومانکەر، وێناکەر.

**انگاره:** 1) گومان، وێنا، بیرو خەیاڵ، وێنەی زەینی. 2) رازە، سەربوردە، سەرهاتی. 3) پێوانە، پێودانگ. 4) دەفتەری ژمێریاری، نامەی کردارەکان. 5) تیۆری. 6) ئایدیال. "**انگاره‌كردن**": گێڕانەوەی چیرۆکێ بەبەردەوامی. "**انگاره‌گرفتن**": بەراوردکردن، هەڵسەنگاندن.

**انگاز:** بڕوانە: "افزار".

**انگاشتن:** وادانان، فەرز کردن، وازانین، ئاوابیربردن، گومان کردن، خەیاڵ کردن، وێناکردن. "**انگاشته**": وێناکراو، وازانراو، وادانراو.

**انگپايه:** پێوەر، پێوانە.

**انگختن:** بڕوانە: "انگیختن".

**انگشتال:** نەخۆش، دەردەدار.

**انگشت بە دهان ماندن:** سەرسام مان، حەپەسان.

**انگشترپا:** بریتی لە چتی بێ کەلك.

**انگشت خاييدن:** قامك کرۆشتن، واتە حەسرەت خواردن و پەشیمان بوونەوە.

**انگشت شمار:** کلك نیشان، شتی زۆر سەیر یان زۆر باش، کەم، کەموکە.

**انگشت كسی در خون بودن:** خوێن رێژ و بێ بەزەیی بوونی ئەو.

**انگشت كشيدن:** 1) ناوزڕاندن. 2) دەربڕینی نەداری و پەشیمانی.

**انگشت گذاشتن:** هەڵبژاردن، قامك لە سەردانان. ئیرادگرتن.

**انگشتگر:** رەژی فرۆش.

**انگشت گرفتن:** حیساب کردن، بژاردن، ژمارەکردن.

**انگشت گزيدن:** 1) پەشیمان بوونەوە. 2) سەرسوڕمان، واق وڕمان.

**انگشت نشان:** ناودار، بەناوبانگ.

**انگشت نگاری:** پەنجەمۆر کردن، داکتیلۆسکۆپی.

**انگشت نما:** 1) ناسراو، بەناوبانگ، کلکەنما. 2) ئابڕووتکاو، خەنزار، ریسوا.

**انگل:** مشەخۆر، چەورە، زگ لەوەڕێن. سەربار، خۆرکە.





**انگولك كردن:** دنەدان، وروژاندن، قامك تێوەردان، دەست تێوەردان بۆ تێکدان، سەرخستنەسەر. سووك پێوەکردن، جووك پێوەکردن، (بز/ بووز/ جوون) پێوەکردن، قامك بۆ قنگ بردن، کلك پێوەکردن، کلکەقنگێ، کلکەکنگێ.

**انگيختار:** بڕوانە: "محرك".

**انگيختن:** 1) وەجووڵەخستن، هەڵخراندن، وروژاندن، بزواندن، هاندان، پێکردن. 2) وەدیهێنان، بەرهەمهێنان. 3) وەڕێخستن. 4) سەرلەنوێ زیندووکردنەوە. 5) رەوانەکردن، ناردن. 6) کۆتەڵ سازکردن. "**انگيخته**": وروژاو، دنەدراو، پێکراو، هان دراو.

**انگيزان:** بڕوانە: "محرك".

**انگيزاندن:** بڕوانە: "برانگیختن".

**انگيزش:** 1) دنەدان/ دنەدران، وروژان/ وروژاندن. 2) جووڵە، بزاو، رمبازێن. 3) قیامەت، پەسڵان.

**انگيزنده:** دنەدەر، هانەدەر، وروژێنەر، پاڵنەر.

**انگيزه:** پاڵنەر، سەمەد، هاندەر، واسیتە، هۆ، بیانوو، لام، هیجران، مایەی سەرەکی.

**انگيزه‌ای:** پاڵنەرانە، هاندەرانە.

**انگيزيدن:** بڕوانە: "انگیختن".

**انگيزيسيون:** بڕوانە: "انکیزیسیون".

**انماء:** 1) نەشونماپێدان، گەشاندن، پترکردن. 2) ئاشکراکردنی قسە.

**انوار:** کۆی "نور"، رۆشناییەکان، رووناکییەکان.

**انواع:** کۆی "نوع"، جۆراوجۆر، هەمەچەشن، چەشنەکان.

**انوثت:** بوونەژن، ژنێتی، ژنیەتی، مێیەتی.

**انور:** رووناکتر، درەوشاوەتر، رۆشنتر.

**انوشه:** (اَ.نُ.شَ) نەمر، بێکۆتایی، هەردەمی، جاوید.

**انوشه:** (اَ.نَ.شَ)پاشای نوێ، پاشای لاو، لاوی تازە زاوا.

**انهاء:** وەڵامدان، پێڕاگەیاندن، ئاگاکردن، بەئاگاهێنان، ئاگاداری.

**انهاب:** بەتاڵان و برۆ دان.

**انهاج:** خویابوون، دەرکەوتن و ئاوەڵەبوونی رێگە.

**انهاض:** هەڵستاندن، هەستاندن، راپەڕاندن. هاندان، هەڵخڕاندن.

**انهباط:** نیشتنەوە، هاتنەخوار.

**انهتاك:** ئابڕووچوون، ناوزڕان.

**انهدام:** وێران بوون، کاول بوون، رووخان، رووخیان، داڕووخان، رمان، رمین، رمیان، داتەپین، تێکوپێکدان، لە ناوبردن، هەڵتەکاندن، وێرانی.

**انهزام:** شکان، شکیان، تێك شکان، شکست خواردن، بەزین، ژێرکەوتن.

**انهمار:** شکان، کاول بوون، داڕمان، رژانی ئاو یان باران، هاتنە خواری فرمێسك.

**انهماك:** 1) کۆشش کردن لە کارێك دا، سەرقاڵ بوون بە کارێکەوە. 2) پێداگری.

**انهيار:** هەرەس هێنان، رووخان.

**انيران:** غەیرە ئێرانی، نەئێرانی.

**انيرگرايي:** بێگانەدۆستی، بێگانەخوازی.

**انيس:** بڕوانە: "الفت گرفته".

**انيسان:** رازە، قسەی هەڵبەستە، گوتاری بێهوودە.

**انيق:** دەلال، جوان و پەسندکراو، سەرسووڕهێنەر. پۆشتە، شیك.

**انيميشن:** وێنەجووڵ(ە)، وێنەی جووڵاو یان کارتۆن.

**انين:** ناڵەناڵ، نووزە، ناڵەوهاوار.

**اوائل:** کۆی"اول"، سەرەتاکان.

**اواب:** تۆبەکار.

**اواخر:** کۆی"اخیر"، ئاخرو ئۆخر، دوادوایی، نزیك بەبڕانەوە، کۆتایی."**اواخر بهار**": کەوبەدار، کۆتایی بەهار.

**اواخواهر:** ژنانیلێ، ژنانیلە، ژنانی، سەرژنانە، بلەکناچێ، camp.

**اوار:** (اَ) گەرما، تینی ئاگر یان هەتاو. تینوویەتی.

**اوارون:** ئاوەژوو، لار، ناڕاست.

**اواسط:** کۆی"اوسط"، نێوەڕاستەکان، ناوەندەکان.

**اوام:** (اُ) توونیەتی، گێژی.

**اوامر:** کۆی"امر".

**اوان:** سەردەم، تاف، کات، وەخت، چاخ، رۆژگار، هەرەت، سەروبەند.

**اوب:** گەڕانەوە، هاتنەوە.

**اوباردن:** بڕوانە: "اوباریدن". "**اوبارده**": بڕوانە: "اوباریده". "**اوبارنده**": قووتدەر.

**اوباريدن:** قووت دان، قووت کردن، بەگەروودا بەڕێ کردن. "**اوباريده**": قووت دراو، بەگەروودا بەڕێکراو.

**اوباش:** شەلاتی، سنۆتە، لات و لووت، لاتولەوا، لۆتیوپۆتی، بێسەروپێ، بێسەروپا، خوێڕیو بێکارە، خۆڕی و تۆڕی،ڕووت و رەجاڵە، ، چەورەوبێکارە، هەتیومەتیو، جەلۆ، عەلۆجەلۆ، رووتەوپووتە، هەتیومەتیو، هەرچی پەرچی، هەرچی و پەرچی، سەکەماتی، گەلۆر، شەقاوە." **تجمع اوباش**": هەڵقەتران، هەڵقەترانێ.

**اوباشتن:** بڕوانە: "انباشتن".

**اوباشته:** بڕوانە: "انباشته".

**اوثق:** قایم تر، پتەوتر، موکومتر.

**اوج:** ترۆپك، لووتکە، قووچکە، دوچك، چڵەپۆپە، پۆپە، ئەوپەڕ، دوند، تەشق، قلەپۆپە، ئەوپەڕ، سەرکاو، بڵندایی، بەرزترین شوێن، بەرزترین پلە، کمت، کۆپ. "**اوج آسمان**": تەشق، حەلحەلە، پەرپەرۆچکە. "**اوج سرما**": تەشلەخە، جەنگە/ هەرەتی سەرما."**اوج گرفتن**": بەرەبەرە بە بەرزترین شوێن گەیشتن، بەرەوسەرچوون، هەڵچوون. پەرەسەندن.

**اوجال:** کۆی"وجل"، ترس.

**اوجب:** پێویست تر، واجب تر.





**اوحد:** تاقانە، تەنیا، بێهاوتا.

**اوژندن:** خستن، بە زەوی دادان. دار بڕینەوە.

**اوژوليدن:** بڕوانە: "افژولیدن".

**اوراشتن:** هەڵدان، بەرزکردنەوە.

**اوراق:** کۆی"ورق". 1) کۆنە و رزاو. 2) پەشێو و خەمبار، نەخۆش و بێ هێز. 3) گەڵای دار .4) لێك بڵاو و پارچەپارچە.

**اوراق بهادار:** (ئابووری) گەڵا نرخدارەکان، ئەو بەڵگانەی کە نرخی پووڵییەکەیان لەلایەن سیستمی بانکی هەر وڵاتێکەوە گرەنتی دەکرێ.

**اوراق قرضه:** (ئابووری) ئەو بەڵگە و قەبالانەی کە وامگرێك وەك بانکە دەوڵەتییەکان دەری دەکا و بەو هۆیەوە خۆی دەروەست دەکا لە کاتیخۆیدا بەهرەیکی دیاریکراو بدا بە وامدەرەکان.

**اوراق کردن:** لێك بڵاوکردن و پارچەپارچەکردن، زیان پێگەیاندن بە ئامرازێك و لێك هەڵوەشاندنی. خەمبار و پەرێشانکردن.

**اورت:** کریاوە، ئاواڵە.

**اورند:** (اَ) شان و شکۆ، ئاوەزو زانست، فریو، فێڵ.

**اورنديدن:** فریودان، خڵەتاندن.

**اورنگ:** تەختی پاشایەتی، ئەقڵ و زانست، شان و شکۆ، مەزناتیو جوانی، ئاوڕەنگ، ئاوی. فرت و فێڵ.

**اوروت:** رووت، پەتی.

**اوريباندن:** بڕوانە:"تحریف".

**اوريون:** ملەخرە.

**اوزار:** 1) بڕوانە: (ابزار). 2) کۆی"وزر"، گوناحەکان، تاوانەکان.

**اوزاع:** گرووپەکانی خەڵك، کۆمەڵەکان.

**اوزان:** کۆی"وزن".

**اوژندن:** 1) هاویشتن، هەڵاویشتن، خستنە خوارەوە. 2) کوشتن.

**اوس:** (اَ) بەخشین، بەخشش.

**اوساط:** کۆی"وسط".

**اوسانه:** بڕوانە:"افسانه".

**اوستا:** کتێبی زەردەشت.

**اوستاخ:** بوێر، چاونەترس.

**اوستام:** بڕوانە: "اعتماد".

**اوسخ:** پیس تر، چڵکن تر.

**اوسط:** 1) نێوەڕاست، ناوەند، نێونجی، ناونجی. 2) لەسەرتر. 3) هەڵبژاردە.

**اوسع:** بەرین تر، بەربڵاوتر، واڵاتر.

**اوشال:** (اَ) تاڵاو، زۆنگ، رۆندکی کەم.

**اوشاندن:** بڕوانە: "اوشانیدن".

**اوصال:** کۆی"وصل"، پێوەندییەکان، ئەندامانی لەش.

**اوصياء:** کۆی"وصی".

**اوضاح:** کۆی"وضح".

**اوضاع:** کۆی"وضع".

**اوضح:** روونتر، رووناکتر.

**اوطار:** کۆی"وطر"، نیاز، ئاتاجی.

**اوقات:** کۆی "وقت"، وەختەکان، کاتەکان. "**اوقات تلخی**": تووڕەیی و ناڕەحەتی، رووترشی، مرو مۆچی. "**اوقات داشتن**": پشوودرێژی، حەوسەڵە هەبوون.

**اوقاف:** ئەو سامانەیە کە بۆ هەژاران تەرخان دەکرێ.

**اوگ:** بروانە: (اوج).

**اوکندن:** بروانە: "افکندن".

**اوگار:** بریندار.

**اوگندن:** بروانە: "افکندن".

**اوَل:** هەوەڵ، یەکەم، ئێکەمین.

**اولتراسونیک:** بان دەنگ.

**اولتراویولیت:** بان بنەوش.

**اولتیماتوم:** دوایین مەرج، دوایین قسە، دوایین ئاخاوتە، رامل خستن، دوایین بڕیار، دوایین پێشنیاز، ئولتیماتۆم.

**اولجامیشی:** سەردانەواندن، ملکەچی، پێڕەوی کردن.

**اولو:** خێویان، خاوەندان.

**اولویت:** لەپێشی، پێشێتی، لەسەرتری، یەکەمینی، پێشینە، مەڵایەتی، بەسەردابوون، راسەری، ئەولەوییەت.

**اولی:** شیاوتر، شایان تر، لەسەرتر، قنجتر.

**اولیاء:** دۆستان، یاران، پیاوانی خودا. "**اولیای امور**": کارگێڕان و بەرپرسانی سەرەوەی حکوومەتی. "**اولیای دم**": خوێنگران. "**گور اولیاء**": زیارەتگە، زێوە، گۆڕی پیاوچاکان.

**اولیگارشی:** تاکرەوی، حکوومەتێك کە تەواوی دەسەڵات بە دەست چەند کەسێکەوەیە.

**اوَلین:** یەکەمین، هەوەڵین، یەکا.

**اولیه:** سەرەتایی.

**اومانیسم:** مرۆڤ دۆستی، پرەنسیپەکانی مرۆڤایەتی، مرۆڤگەرێتی.

**اونانیسم:** دەسپەڕ، جووت بوونی نیوەچڵ.

**اونیفرم:** هاوفۆرم، یەك فۆرم، وەك یەك، جل و بەرگی وەك یەك، یونیفۆرم.

**اونیورسال:** گشتی، هەموانی، جیهان داگر، جیهان ڤەگر، بەربڵاو.

**اونیورسیته:** زانکۆ.

**اوورتور:** تێپەڕ، زارك، کرانەوە، دەس پێکردن، سەربەند.

**اوه:** نالان، نالێن.

**اوهام:** کۆی "وهم"، وەهمەکان، گومانەکان، شەڤرەشك، خەیاڵات، لێکدانەوەی بێ بەهرە.

**اویژه:** بروانە: "آویژه".

**اویماق:** تایفە، هۆز، خانەدان.

**اهابت:** 1) ترساندن. 2) بانگ کردن.

**اهاله:** داوەرینی خاك.

**اهانت:** سووکایەتی، سووك کردن، بەسووك و کەم دانان، وتەی سووك پێگوتن، ئەتك، کەتن، بێ حورمەتی، تۆمەتبارکردن.





**اهانت آمیز:** تێکەڵ بە سووکایەتی و بێ حورمەتی، بێ ئەدەبانە، سووکانە.

**اهباط:** نەوی کردن، نزم کردن، دابەزاندن، هێنانەخوار.

**اهتداء:** رێپێبردن، شارەزاکران، رێگەی راست دۆزینەوە، رێنیشان دان.

**اهتزاز:** شەکان، شەکانەوە، هەژان، هەژیان، هەژەك، لەرزە، هەڵدان، راژان، لەرینەوە، لەرانەوە، لەریانەوە. خۆشحاڵی، شادمانی. "**بە اهتزاز درآوردن**": شەکاندنەوە، لەراندنەوە. دڵخۆشکردن، شادکردن.

**اهتزازکردن:** شادی کردن، خۆشحاڵی دەربڕین.

**اهتمام:** بایەخ پێدان، گرنگی پێدان، دەربەستی، بەتەنگەوەبوون، گوێلێگرتن، گوێدان، نەخستنە پشت گوێ، خەم لێخواردن، خەمخۆریکردن، مشوور لێخواردن، پەرۆشی.

**اهداء:** پێشکەش کردن، کردنەدیاری، دیاری دان، بەدیاری پێشکەش کردن.

**اهدار:** بە فیڕۆدان، خەسارکردن، پووچکردنەوە.

**اهداف:** کۆی "هدف"، ئامانجەکانن مەبەستەکان، نیشانەکان.

**اهداف دستوری:** مەبەستە رێزمانییەکان.

**اهرامن:** بروانە: "اهریمن".

**اهرم:** نوێڵ، لۆس، لۆسە، مەڵغە، باری، کەڕانە، لهازە، لەوازە، لێهاز، لێهازە، لایز، مانیلا، قەراسە. ئامراز. "**اهرم فشار**": تەوژمی گوشار، نوێڵی گوشار.

**اهریمن:** ئەهریمەن، دێو، درنج، شەیتان، لە ئاییینی زەردەشتیدا رێنوێنی خراپەکاری و سەرچاوەی شەڕو گەندەڵی و تاریکی و ناخۆشی و ناپاکی. لایەنی بەرامبەری ئەهوورامەزدایە. بەرامبەری شەیتان لە ئایینی ئیسلامدا.

**اهل:** 1) شیاو، شایان. 2) بنەماڵە، خانەدان. 3) نیشتەجێ/ دانیشتووی جێگەیەك، خەڵکی.... 4) هۆگروخەریك. 5) خاوەن.

**اهلاك:** کوشتن، لەناوبردن، تەفروتووناکردن.

**اهل بیت:** ماڵبات، بنەماڵە، خاو، خێزان.

**اهل حال:** 1) ئەوانەی کەیفیان بە پێکەنین و گاڵتە و شۆخی دێ. 2) ژنێ کە ئیشتیای لە دڵداری دەگەڵ کەسانی دیکەیە. 3) ئەوەی زەوقی ئەدەبی و هونەری هەیە.

**اهل حق:** 1) هەقیقەت دۆز، خواناس. 2) تیرەیەك لە شێعە. 3) کاکەیی، گۆران، هەقە، چەند تیرەیەکی کوردن کە ئایینێکی تایبەتیان هەیە.

**اهل دنیا:** خەڵکی جیهان. ئەوانەی گرۆیی زۆریان بە کاروباری دنیاوە هەیە.

**اهل ذمه:** زەردەشتی و جوو و مەسیحی کە لە وڵاتی ئیسلامی دا بژین و ساوەری بدەنە حکوومەت، سەرانە.

**اهل سؤال:** 1) ئەوەی شیاوی ئەوەیە کە وڵامی پرسیارێ بداتەوە. 2) سواڵکەر.

**اهل صورت:** رواڵەت بین.

**اهل طریق:** عارفان.

**اهل عمل:** بەکردەوە، ئەوەی تەنیا قسەناکا و لەکردەوەش دا چالاکە.

**اهل فضل:** زانا، تۆرەڤان.

**اهل فن:** فەن و زانست زان.

**اهل قبور:** مردووەکان.

**اهل قلم:** نووسەر، شاعیر. نووسەران، شاعیران.

**اهل کار:** زەحمەتکێش، نەبەز.

**اهل کتاب:** 1) کتێو خوێن، موتاڵاکەر. 2) جوو و زەردەشتی و مەسیحییەکان.

**اهل معنی:** ئەوانەی خەریکی کاروباری مەعنەوین.

**اهلی:** ئەهلی، دەستەمۆ،ماڵی، خانەکی، کەوی، کەڤی، کەدی، حەمایەت، رام، راهاتوو.

**اهلیّت:** شیان، شیاوی، لێ وەشانەوە، لێهاتن.

**اهم:** گرینگترین، گرنگترین، پێویست ترین.

**اهمال(کردن):** گوێ خەفاندن، گوێ لێ خەفاندن، گوێ نەدان، گوێپێنەدان، گوێ لێئاخنین، خستنە پشت گوێ، خۆتێ نەگەیاندن، تەمەڵی کردن، خۆلێ بواردن، خۆگێل کردن، خۆلێ گێل کردن، گنخاندن، پاوەپاکردن، پاشخستن، هێشتنەوە، وەدرەنگ خستن، خێشاندن، ڤەگوهشین، خەمساردی، خەمشە، کەمتەرخەمی، خۆلەکاردزینەوە، دەستیپێکردن، فەرامۆش کردن، خاویلکەیی، خاوەخاو، قنگەقنگ، قۆنەقۆنە، کلك پێ هەڵپەساردن، سنگەسنگ، سنگەسنگە، سستەسست.

"**اهمال (کننده/ کار)**": خۆبوێر، خۆ وەشێر لە ئەرك، گوێنەدەر بەکار، خۆوەدوادەر، خەنۆك، نەبانۆك، نەدیتبار، ڤزەك.

**اهمام:** خەمبارکردن. ئۆقرە لێبڕین. پیربوون و پەککەوتن.

**اهمیّت:** گرنگی، گرینگی، گرنگایەتی، گرینگایەتی، گرینگێتی، بایەخداری.

**اهمیّت دادن:** گرنگیدان، گرنگی پێدان، بە گرنگ گرتن، بایەخ پێدان، بەتەنگەوەبوون، خەم خواردن بۆ کارێ یان کەسێك.

**اهمیّت داشتن:** گرینگ بوون، پێویست بوون.

**اهمیّت ندادن:** گرنگی پێنەدان، گرنگ نەگرتن، گوێچکەنەلەقیان، لامسەرلایی، گەللایی.

**اهوار:** شەیدا، مات، واماگ.

**اهوال:** کۆی"هول".

**اهورامزدا:** بریتی لە دوو وشەی (اهورا) بەمانای سەروەری گەورە، یەزدان و (مزدا) بە مانای زانای مەزن وهەر دوو وشەکە بەمانای خوای تاقانەیە.

**اهون:** ساناتر، خاوتر، پەست تر.

**اهیب:** ترسناك تر، ترسێنەرتر.

**ای:** وشەی گازی، ئەی، ئۆی، هەی.

**ایاب:** (اِ) گەڕانەوە، وەگەڕان.





**ایاب و ذهاب:** گەڕانەوە و چوون، چوون و گەڕانەوە.

**ایاد:** ئامرازی هێز و وزە، پشتیوان، پەنا، کێو ، قەڵا.

**ایادی:** بەکرێگیراوان. دەستەکان. نیعمەتەکان.

**ایاره:** دەفتەری ژمێریاری.

**ایارەگیر:** ژمێریار.

**ایارده:** لێك دانەوەی کتێوی ئەوێستا، شرۆڤەکردنی کتێوی زەند.

**ایاز:** 1) بای فێنك، شنەبای سارد، بای بسکان، کزە با، سروە. 2) شەونم.

**ایالات:** کۆی"ایالت".

**ایالت:** 1) بەڕێوەبردنی کار، دەسەڵاتدارەتی کردن. 2) بەشێك لە وڵات بریتی لە چەند شارستان، پارێزگا.

**ایّام:** کۆی"یوم"، رۆژگار، دەوران، چاخ. تەمەن. "**ایّام عید**": جەژنان، جێژنان، رۆژانی جێژن.

**ایامی:** ئەو ژن و پیاوانەی کە هاوسەریان نیە.

**ایتام:** کۆی"یتیم".

**ایتکین:** خاوەن ماڵ، خودانێ خانی.

**ایتوك:** مزگێنی، مژدە، هەواڵی خۆش.

**ایثار:** لەخۆبردوویی، خۆنەویستی، بەخشین.

**ایثارگر:** خۆنەویست، لە خۆبوردوو. ئەوەی لە شەڕدا بریندار یان کەم ئەندام بووبێ.

**ایجاب:** بە پێویست زانین، پێویست کردن، واجب کردن، ناچارکردن، گەرەك کردن. قبووڵ کردن.پاراستنی مافەکان. مووچە، بڕانە.

**ایجابی:** پۆزەتیڤ، ئەرێنی.

**ایجاد کردن:** پێکهێنان، داهێنان، هێنانەدی، وەدیهێنان، دروست کردن، بنیاتنان، رۆنان، دروسکردن، دانان، دانیان، یابە کردن، ڤەناندن، ڤەدان. "**ایجاد حریق**": سوتمان نانەوە، ئاگرخستنەوە.

**ایجاز:** کورت بێژی، کورتکردنەوە. (ڕێزمان) کورت بڕی، واتە مانای زۆر بە وشەی کەم دەرببڕدرێ.

**ایجازبیان:** بە کورتی دەربڕین.

**ایجاع:** ئێشاندن، کولاندنەوە.

**ایحاء:** وەحی ناردن، پێڕاگەیاندن، خورپە خستنە دڵەوە، هێماکردن، خستنی بابەتێك دە مێشك یان دڵی کەسێك

**ایدئولوژی** : زانستی بیر و واتاکان، رێبازی سیاسی یان کۆمەڵایەتی، ئایدولوژیا .

**ایدئولوژیك:** سەر بە ئایدۆلۆژی.

**ایدئولوگ:** تیۆریدارێژ، تیۆریسێن، ئەوەی لە ئیدئۆلۆژییەکدا خاوەن را و بۆچوونە.

**ایداع:** سپاردن، سپارتن، دانان.

**ایدر:** لێرە، لێرەکانە، ئێستاکە، نوکە، ل ڤر.

**ایدری:** بڕوانە:"دنیوی".

**ایدون:** ئێستا، ئەم ساتە، وەها، ئێرە.

**ایده:** ئایدیا، ئەندێشە، بیرۆکە، خەیاڵ، وێنا، بروا، باوەڕ، نییەت.

**ایدەآل:** هەرەباش، ئەوپەڕی دڵخوازی، ئارمانی بەرز، ئەوپەڕی ئارمان و ئارەزوو، ئایدیال.

**ایدەآلیسم:** 1) نموونایەتی، سەرچەشنایەتی. 2) ئارمانخوازی، ئارمانگەرێتی، رەسەنایەتی وێنا، خەیاڵ پەرستی، پێڕەوانی ئەم رێبازە لەم بڕوایەدان کە زۆربەی شتەکان دروسکراوی خەیاڵن، ئەوپەڕی دڵخوازی لە سیاسەت و ئابووریدا، لە هونەردا وێناکردنی شتەکان بە پێی ئارەزوو و خەیاڵی هونەرمەند نەك بەو جۆرەی کە هەن. "**ایدەآلیسم شخصی**": ئایدیالیزمی کەسێنی. "**ایدەآلیسم قطعی**": ئایدیالیزمی لێبڕاوانە. "**ایدەآلیسم مطلق**": ئایدیالیزمی رەها. "**ایدەآلیسم موضوعی**": ئایدیالیزمی بابەتی. "**ایدەآلیسم انتقادی**": ئایدیالیزمی رەخنەیی.

**ایذاء:** ئازاردان، ئازارپێگەیاندن، جەزرەبەدان، رەنجاندن، ئێشاندن.

**ایژك:** بڕوانە: "آییژ".

**ایراث:** بەمیراتگرکردنی کەسێك، میرات دانان بۆ کەسێك.

**ایراد گرفتن:** ئیراد گرتن، تانە دینەوە، لەقەم گرتن، رەخنەگرتن، وردەگرتن، بیانووگرتن.

**ایراد گیر:** رەخنەگر، ئیرادگر، لێگر، وردەگر.

**ایران زمین:** نیشتمان/ سەرزەوی ئێران.

**ایران مدار:** بەڕێوەبەری ئێران.

**ایرمان:** 1) میوان، میوانی نەخوازراو، سك لەوەڕێن. 2) پێشەوای ئایینی. 3) دنیا. 4) خوازە.

**ایز:** شوێن پێ، ئاسەوار.

**ایزانش:** بڕوانە: "ترغیب".

**ایزد:** خوا، خوای تاقانە، فریشتە.

**ایزد پناه:** پەنابردنە بەر خودا.

**ایزدگشسب:** خواپەرست.

**ایزدی:** خودایی.

**ایزگم کردن:** شوێن ون کردن، ئاسەواربڕین. بەلاڕێدابردن، وەهەڵەخستن.

**ایزوبار:** (لە فیزیك دا) هاوتەوژم، هاوزەخت.

**ایزوترم:** هاوتین، بوونی گەرمای بەرانبەر.

**ایزولاسیون:** بڕوانە: "عایق کاری".

**ایزوله:** 1) گۆشەگیر، تەریك، لاپەڕ. 2) جیابۆوە لە دیتران بە مەبەستی پێشگیری لە تەشەنە سەندنی نەخۆشی. 3) لەمپەری تین و شێ.

**ایزومر:** هاوفۆرمول، هاوفۆرم.

**ایسار:** 1) دەوڵەمەند بوون، بێنیازبوون. 2) سانابوون، بە ئاسانی لە دایك بوون.

**ایستا:** نەگۆڕ، وەستاو، راوەستاو، چەق.

**ایستادگی:** بەرەنگاری، رووبەڕووبوونەوە، خۆڕاگری، کۆڵنەدان، راوەستاوی، پتەوی، لە سەر پێ بوون.





**ایستادن:** وەستان، وێستان، وێسان، راوەستان، راوەستیان، بەپێوەوەستان، ڤەستان، ڤەڤەستان، سەکنین، بەپێوەبوون، نەبزووتن، راگیران. "**ایستادن بە کاری**": دەسپێکردن بەو کارە. "**ایستادە**": وەستاو، راوەستاو، وێساگ، سەکنی، بەپێوە. "**درکاری ایستادن**": خەریك بوون بەو کارەوە.

**ایستار:** پێگە، شوێن، دۆخ، رەوش. شێوەی بۆچوون و نرخاندن.

**ایستانیدن:** راوەستاندن، وەستاندن، وێستاندن، راگرتن، لەبزووتن خستن. "**ایستاننده**": راگر، راوەستێن. "**ایستانیده**": راگیراو، وەستێنراو، وێستانراو.

**ایستایی:** حاڵەتی وێستان، وەستاوی، نەگۆڕی. 2) (میکانیك) ئیستاتیك.

**ایستگاه:** شوێنی وەستان، وێستگە. ئێزگە. پرسگە.

**ایستش:** بڕوانە: "وقفە".

**ایستیدن:** بڕوانە: "ایستادن".

**ایشان:** راناوی کۆ بۆ مرۆڤ، ئەوان خۆیان، ڤان، ئایشا، ئادی شا.

**ایشك:** مرۆی نەفام و بێ شعوور.

**ایشە:** سیخوڕ، خەوەردز.

**ایصاء:** وەسێت کردن، ئامۆژگاری کردن، راسپاردن.

**ایصال:** پێکەوەبەستن، پێوەندان، وێکهێنان، لێك بەستن، لێك گرێدان، گەیاندن.

**ایضاً:** دیسا، دیسان، دیسانەوە، **هە**میسا، **هە**میسان، **هە**مدیسان، **هە**میسانەوە، جارێکی دیکەش، ئەمجاریش، سەرلەنوێ، هی دی، هی دیکە، ئێدن، دووبارە.

**ایضاح:** روون کردنەوە، رووناك کردنەوە، دیاری دان، دەرکەوتن.

**ایطاء:** پێڕێخستن، دووپات کردنەوەی سەروای شێعر.

**ایعاد:** ترساندن، بزداندن.

**ایغال:** بە خێرایی رۆیشتن، بۆ شوێنی دوور چوون، سەرگەرم بوون بە زانست یان کارێك و زێدەڕۆیی تیایدا.

**ایفاء:** بەڵێنپارێزی، بەڵێن بردنە سەر، دانی **هە**قی کەسێ بە تەواوی.

**ایفاد:** ناردن، رەوانەکردن، کل کردن.

**ایفاگر:** بەجێهێنەر، ئەنجامدەری کارێك. رۆڵگێڕ.

**ایقاد:** ئاورهەڵکردن، ئاگرکردنەوە، هەڵگیرساندن.

**ایقاظ:** وریاکردنەوە، ئاگاکردنەوە، وشیارکردنەوە، **ها**یکەردیوە.

**ایقاع:** خستن، **ها**ویژتن، گرفتارکردنی کەسێك، رێکی دەنگ و ئاواز.

**ایقان:** باوەڕکردن، گومان نەکردن، دڵنیابوون، ئەرخەیان بوون.

**ایگو:** (دەروون ناسی) خود.

**ایل:** خێڵ، تایفە، **هۆ**ز، عەشیرە.

**ایلاء:** نزیك کردنەوە، بەخشین، وەسێت کردن، وەئەستۆ خستن.

**ایلات:** خێڵات، خێڵی زۆر، رەوەندە.

**ایلاج:** خستنەناو، تێخستن. هێنان.

**ایلاد:** بڕوانە: "زایاندن".

**ایلاف:** بەڵێن، وادە، گفت. بوونە هەواڵ و دۆست.

**ایلچی:** باڵوێز، نێردراوی تایبەت.

**ایلخان:** سەرخێڵ، سالاری هۆزی کۆچەر.

**ایل شدن:** ملکەچ بڕیاری کەسێك بوون، تەسلیم بوون.

**ایلغار:** هێرش، هەڵکوتانەسەر، شالاوبردن.

**ایل کردن:** خستنە بەر فەرمان، راژێرکردن.

**ایماء:** 1) ئاماژەکردن. 2) درکە، کۆد.

**ایماژ:** وێنە.

**ایماژیست:** وێنەخواز، ئیماژیست.

**ایماژیسم:** ئیماژیسم، وێنەخوازی(لە ئەدەب دا).

**ایماق:** بڕوانە: "اویماق".

**ایمان:** بڕوابوون، باوەڕبوون.

**ایمانی:** دەپێوەندی دەگەڵ"ایمان". خاوەنی بڕوای هاوبەش.

**ایمپلنت:** (پزیشکی) چاندنی هەر جۆرە ماددەیەکی زیندوو یان نازیندوو لە لەشی مرۆڤێك دا.

**ایمن:**1) راست، لای راست. 2) پیرۆز. 3) رزگار، بێترس، دڵنیا، بێخەم.

**ایمن سازی:** 1) (پزیشکی) پێکهێنانی خۆڕاگری لە بەرامبەر نەخۆشییەکی تایبەتیدا. 2) لە زیان و ترس رەواندنەوە، ئەرخەیان و هێمن کردنەوە.

**ایمنی:** پارێزراوی، پاراستن، هێمنی، تەنایی. **"سیستم ایمنی"**: (پزیشکی) کۆئەندامی بەرگری.

**ایمنی دادن:** خاترجەم کردن، ئاسوودە و ئەرخەیان کردن.

**ایمنی‌زایی:** (پزیشکی) بەرگریی سازی.

**ایمنی‌شناسی:** (پزیشکی) ئیمۆنۆلۆژی.

**ایمونولوژی:** زانستێکە کە تاوتوێی دژکردەوەی خۆپاراستنی بوونەوەران لە بەرامبەر ئانتی ژێنە بێگانەکان و چۆنیەتی پێکهێنانی پارێزراوی یان لە بەرانبەر هۆکارە نەخۆشیهێنەکان دەکا.

**ایمه:** ئێسا، ئەم کاتە، وەها، ئەم هەموە.2) بێهوودە، گەزاف.

**ایمیل:** ئیمەیل، ئایدی، پۆستی ئینتەرنێتی، سیستمێ بۆ ئالۆگۆڕی زانیارییەکان لە ریگەی کامپیوتێرش و مووبایلەوە.

**ایمیل زدن/فرستادن:** ئیمەیل ناردن، پێوەندی سازکردن لە رێگەی ئیمەیلەوە.

**این:** راناوی ئاماژە بۆ نزیك، ئەمە، ئەڤە.

**ایناس:** 1) باناندن.2) خووگرتن.

**ایناغ:** دووزمان، تێچێن.

**اینجا:** ئێرە، ئێرا، ئێرەکانە، ئێرەکانێ، ئێرەکانە، ئێرانە، ئەگرە، ئەم جێگە، هرە، ڤر، ڤرا.

**اینرسی:** تایبەتمەندی مەیلی جسم بۆ مانەوە لە حاڵەتی نەبزووتن یان درێژەدان بە بزاوتن یان خێرایی نەگۆڕی خۆی و خۆڕاگری لە بەرامبەر گۆڕانی خێرایی دا.





**اینك:** ئاماژە بە نزیك، ئێستاکە، ئێستاکانێ.

**اینکوباسیون:** کڕکەوتن.

**اینهمانی:** ئەم وەك ئەوی. یەکسانی.

**ایوار:** ئێوارە، ئێوار، ئێڤار، وێرەگا.

**ایواز:** بڕوانە: "آراستە".

**ایوان:** هەیوان، بەربێڵایی، بەرسڤك. کۆشکی پاشاکان.ئاسمان.

**ایوانچە:** هەیوانۆچکە.

**ایوانگاە:** باڵکۆن.

**ایهام:** 1) دوودڵ کردن، بەهەڵەدابردن، خستنە وەهم و گومانەوە، خستنە گومان و هەڵەوە، کەوتنە وەهم و گومان و هەڵەکردنەوە. 2) (ڕێزمان) توانج پۆشی، ئەوەیە کە وشەیەك دوو مانای هەبێ یەکی دوور و یەکی نزیك.

# ب

**با ابهت:** بە شکۆ، شکۆدار.

**بائده:** دوابڕاو، بمر.

**بائر:** 1) بووره، بوور. 2) وێران، کاول، لەناوچوو. 3) خراپ، بێ کەلك.

**باارزش:** بەهادار، بایەخدار، هێژا، بەنرخ، بەقیمەت.

**بائس:** 1) بەلەنگاز، نەدار، هەژار، پیاوێ کە تووشی سەختی و دەس کورتی بووبێ.2) بێزار.

**بااستعداد:** بە بەهرە، بەهرەمەند، هێژا، جەوهەردار.

**بائع:** فرۆشیار، فرۆشەر.

**بائن:** ئاشکرا، خویا، روون، دیار، بەرچاو.

**باانداm:** هاوڕێك، هاوکێش.

**باالتهاب:** بڕوانە: "ملتهب".

**باب:** 1) شیاو، شایان. 2) باو، بابەت. 3) برەودار، بەڕمێن. 4) پێوەری رووپێو، یەکەی درێژی نزیکەی 60 گەز. 5) دەرکە، دەرگا، دەرگە، دەروازە. 6) پار، بەش. 7) باوك. "**باب چیزی باز شدن**": باو یان جێگیربوونی ئەو. "**باب دندان**": شیاو، دڵخواز. "**بەهیچ باب**": بە هیچ کلۆنجێ.

**باباشمل:** جوامێر، مێرخاس، خۆشمێر، لۆتی.

**بابت:** 1) سەبارەت بە، دەربارەی، لەمەڕ. 2) بابەت، وتەزا. 3) رەوا، شایان، شیاو. 4) هۆ، هۆکار.

**بابرکت:** بەخێر، بەپیت، بەقازانج.

**باب روز:** باوی رۆژ، هەر شتێکی ئیمکرۆیی و و مۆد و پەسندی بەرەی ئێستایی.

**باب شدن:** بوونە باو، بوونە مۆد، برەو سەندن..

**بات:** 1) برشت. 2) بەبرشت، لێبڕاو. 3) یەکجارەکی. 4) کز، لەڕ.

**باتالیون:** دەستە، گرووپ، گوردان، بەتالیۆن.

**باتجربە:** بەئەزموون، راهاتوو لە کار، کاردیتوو، کاردیتی، کاردی، کاردیە، گورگی باران دیدە، گورگی داودیدە.

**باتك:** (ت) بەبرشت، برندە.

**باتلاق:** بڵقاو، زەلکاو، زلقاو، زۆنگاو، زۆنگ، زنە، زەنج، ئاوەزا، گراف، چراف، چەلاو، چەق، باتلاخ، باتلاغ.





**باثبات:** سەقامگیر، ئارام.

**باج:** 1) باج، باژ، باز، خەرج، سەرانە، پیتاك، ماڵیات، کەلەپووڕ. 2) گوتار، ئاخاوتە، یەکێك لە رێوڕەسمەکانی ئایینی زەردەشت.

**باج بار:** بارانە، سەربارانە، ئەو باجەی باجگر بۆ هەر بارێك دەیسێنێ.

**باجبان:** بڕوانە: "باج ستان".

**باج چراگاه:** ئاڵفانە، پووشانە.

**باجخانە:** باجگە، شوێنی گرتنی باج، رادارخانە، ئەو بنکەیەی باجگری تێدان.

**باج خواهی:** باج خوازی، سەرانە.

**باج دولتی:** پیتاك، ماڵیات.

**باجربزە:** شایستەو شیاو و کەسێ کە توانای سەرپەرشتی کەسانی دی هەیە، لێبڕاو، بەزیپك، بەهێز، بەورە.

**باج زمین:** زەویانە، باجی زەوی.

**باج زورکی:** کەڵەپیتاك، باجی بە زۆر و ناهەقی.

**باج سبیل:** خاوە، دمچەوتانە، کەرانە، سەرانە بۆ شەلاتی زۆردار، ئەوەی بە ملهوڕی دەیسێنن، باجی سمێڵ.

**باج ستان:** بڕوانە: "باجگیر".

**باج سر راه:** رادارانە، باجێ کە لە رێگە دەدرێ.

**باج قپان:** قەپانداری.

**باجگاه:** بڕوانە: "باجخانە".

**باج گرفتن:** باج گرتن، باج وەرگرتن، باج لێوەرگرتن، باج سەندن.

**باجگیر:** باج ئەستێن، باج ستێن، باج سێن، باجگر، باجەوان، رادار، پیتاك وەرگر.

**باجگیری:** بارانەسەندن، باجگرتن، راداری.

**باج لشکرکشی:** پادارانە.

**باج مالك:** کێسمە، باجێ کە ئاغا دەیسێنێ.

**باج مستغلات:** ماڵانە، ماڵیاتیخانووبەران، باجی خانوان.

**باجناغ:** ئاوەڵ زاوا، هاواڵ زاوا، هاوزاوا، هام ریش، هاوریش، هاولینگ.

**باجنگ:** رۆچنە، دەربیچەی چووکە.

**باج و خراج:** خووك، خوێك، خووگی، باربوو، میجبێتی، پیتاکی میری، ماڵیات.

**باج ویژەی امیر:** میرانە.

**باجە:** دەلاقە، رۆچنە، پاجە، پەنجەرە، شوێنی تایبەتی فرۆشی بلیت یان وەرگرتن و دانی پارە لە سینەما و بانکەکان دا، گیشە.

**باحال:** 1) دڵگیر، سەرنج راکێش. 2) خاوەنی کەسێتی خۆشەویست و لەبەردڵان.

**باحالت:** گیرا، خاوەنی کارتێکەری رۆحی و سۆزداری.

**باحث:** توێژەر، لێکۆڵەر، لێگەڕ.

**باحرارت:** بەتین. خاوەنی سۆز و شەوقی زۆر، بەجموجۆڵ.

**باخبر شدن:** ئاگاداربوون، هەواڵ پێگەیشتن.

**بدجور:** زۆرخراو، مەترسیدار. مایەی رەنجان و عاجزی.

**بدجوری:** بەتوندی. بە شێوەی ناخۆش و ناحەز.

**بدچشم:** 1) چاوحیز، چاو چەرێن، چاوباشقاڵ. 2) چاوپیس، چاڤینۆك.

**بدحال:** نەخۆش، خەمبار، بەدبەخت، حاڵ شڕ، حاڵ خراو، کۆڵەوار، بێحاڵ.

**بدحساب:** قەرزکوێر، قەرزکۆر، سەرچەوت، ناحەساو، حیساب ناڕاست.

**بدخرد:** بڕوانە: "ابله".

**بدخش مذاب:** بریتی لە شەڕابی سوور، و هەر وەها بە مانای لەعل.

**بدخلق:** بڕوانە: "بدخو".

**بدخو:** بەدخولق، بەدخو، بەدفەڕ، تووڕە و تۆسن، تووش و تووڕە، رووشن، نەگونجاو، بێ ئاکار.

**بدخوان:** بڕوانە:"ناخوانا".

**بدخواه:** نەیار، دژ، ناحەز، بەدخوا، بەدخواز، بەدواز، دڵپیس، نیازپیس، لەچاکەبەدوور، ئەوەی خراپەی خەڵکی دەوێ، کینەکێش، قین لەدڵ.

**بدخوراك:** دژخۆراك، دژخۆر، گەندەخۆر، پیس خۆر، هەڵەخۆر، دوودڵ لە خواردەمەنی، کەسێ کە خۆراکی خراو دەخوا.

**بدخیال:** بەد گومان.

**بدخیم:** بڕوانە: "بدخو".

**بدداشت:** بەهێندنەگرتن و بێڕێزی.

**بددل:** بەدگومان، ترسەنۆك، قین لە دڵ، بوغز لە زگ، دڵ پیس، دڵ چەپەڵ، بەددڵ.

**بد دماغ:** 1) ناڕازی. 2) بڕوانە: "بد دماغ".

**بددهان:** دەم پیس، دەم چەپەڵ، دەڤ گەنی، دەڤ پیس، زمان پیس، زمان رەش، سخێف بێژ، قسەڕەق، جنێوفرۆش، جوێن فرۆش.

**بددین:** بڕوانە: "ملحد".

**بدذات:** بەدڕەسەن، ناجسن، ناعەسڵ، دەروون ناپاك، بەدنیهاد.

**بدذهن:** کەم زەین، گەمژە، گەوج.

**بدرام:** سەربزێو، سەرکێش، سەرشەق.

**بدرفتار:** ئاکارخراپ، بەدخو، بەدڕەوشت، قیچمەز، سەرشەق، گوێ نەبیس و بەدفەڕ، بەدڕەفتار.

**بدرفتاری:** هەڵسوکەوتی خراپ، لاساری، ئینات، بەدڕەوشتی، بەدکرداری.

**بدرقە:** 1) رەوانەکردن، بەڕێکردن، خستنە رێی میوان، وەسەرڕێخستن، ڤەرێخستن، ڤەرێکرن. 2) رێبەر، رێنوێن. 3) پشت و پەنا. 4) نگابان، پارێزەر. "**بدرقه محبت**": نامەی دۆستانە.

**بدرگ:** ناجسن، دەروون پیس، بەدخو، سەربزێو.

**بدرنگ:** رەنگ ناحەز، رەنگ کرێت، ناشیرین.





**بد روزگار:** 1) رۆژ رەش، بەدبەخت. 2) زاڵم، ستەمکار.

**بد روش:** بڕوانە: "بدرفتار".

**بد ریخت:** بعۆك، بەدشکڵ، بەدسەکوت، رەزاگران، دەموچاو ناحەزی پیاو ترسێن، بیچم ناحەز، بەوتەشك، ناشیرین.

**بد زبان:** زمان پیس، بەدبێژ، بەدوێژ، بەدواچ، جنێوفرۆش، جوێن دەر، سخێف بێژ، دوژینفرۆش، دەم پیس، بەدزوان، زمان بەد، ئەزمان رەش.

**بدزهره:** ترسەنۆك، نەوێر، بەددڵ.

**بدسابقه:** پێشینە خراو.

**بدسالی:** وشکەساڵی، ساڵی کەم باران.

**بدست آمدن:** چنگ کەوتن، بەرهەم هاتن، دابین بوون، وەدەست هاتن، گیرهێنان، گیرکەوتن، دەست کەفتن، دەسکەوتن، دەست وەهاتن.

**بدست آوردن:** بەرهەم هێنان، وەچنگ خستن، وەدەست هێنان، دەسهاوردن، پەیاکردن، دابین کردن.زەوت کردن، دەست بەسەرداگرتن. ملکەچ و رام بوون.

**بدست بودن:** 1) ئاگادار بوون، وریا بوون. 2) بڕوانە: "مراقب بودن". 3) دابین بوون، ئامادەبوون.

**بدست دادن:** خستنەڕوو، پێشکەش کردن.

**بدست شدن:** بڕوانە: "بدستآمدن".

**بدست گرفتن:** وەدەست گرتن، وەئەستۆگرتن. دەسپێکردن. هەڵبژاردن. کردنەبیانوو.

**بدسر:** بەدڕەفتار، ناسازگار.

**بدسرشت:** بڕوانە: "بدذات".

**بدسگال:** بیرخراو، دڵپیس، پیاوخراپ، نیازخراپ، ناخۆشەویست.

**بدشانس:** بۆنەهاتگ، دێزگ، دێزەك، بێ تالح، بەوشانس، بارکەوتە، بارکەوتو، کەم بەخت، بێ بەخت، بەخت نووستوو، بەدبەخت، بەوبەخت، نەهاتی، خایەن، چارەڕەش، مروز.

**بدشکل:** رەزاگران، خوێنتاڵ، جێ قێز، ئێتریس، ناشیرین، نەشیرین، ناحەز، نەهەز، نەڕند، قرە، دژی جوان.

**بدشگون:** شووم، بێفەڕ، قەشان، وەیشوومە، سەرەخۆرە.

**بدطینت:** بڕوانە: "بدسرشت".

**بدع:** (بِ.دْ) 1) نوێ، شتی نوێ. 2) جوامێرتر و سەرتر.

**بدع:** (ب.دَ) کۆی" بدعت".

**بدعاقبت:** بڕوانە: "بدفرجام".

**بدعت:** نوێگەری، داهێنەری، داهێنانی شتی نوێ، نوێ هێنان، داب و نەریتی نوێ، نەریتی تازە کە دژی یاسا کۆمەڵایەتییەکان و کۆمەڵگابێ، دیاردە یان بیری نوێ کە دژی نەریت بێ، خووی خراپ.

**بدعت آوردن:** هێنانی رێسا و بیر و شتی نوێ و بێ پێشینە.

**بدعت گذاردن:** داهێنان، داهاوردن، نوێ هێنان(بە واتایەکی ناحەزەوە).

**بدعمل:** رەوشت ناحەز، ئاکارچەوت، بەدکردار، بەدعەمەڵ، کانج.

**بدعنق:** تووشو توورە، توورەوتۆسن، فیزن، بەدەمار، خۆبەزل زان.

**بدعهد:** بڕوانە: "پیمان شکن".

**بدفرجام:** ئاخر شەڕ، ئەو کەسەی ئاخری بە خێر تەواو نەبێ، گووپێخوران، بەدفەڕ و نگریس.

**بدفعل:** 1) بەدعەمەڵ، بەدحەمەل، بەدکردار، ئەتوارلەق، نەقەنج. 2) مزیڕ، ئازاردەر.

**بدقدم:** پاوشك، بەدقەدەم، پێڕەش، بێفەڕ، سەرەخۆرە.

**بدقلب:** بەدخواز. دڵ پیس.

**بد قلق:** بەد ئەدا، بیانووگر، پەڵپ گر.

**بدقواره:** زەبەلاحی ناقۆڵا، بەدچارە، ئێسك قورس، ڕەزاگران، بەدقەوارە.

**بدقول:** بەدقەول، پەیمان شکێن، بێشۆن، بێسۆز.

**بدقیافه:** ناحەز، بیچم ناشیرین، سەگسار.

**بدك:** نەزۆر خراپ.

**بدکار:** بەدعەمەڵ/ عەمەل، بەدحەمەل، ئاکارناپەسند، گوناحکار، پیاوخراپ، بەدکار، بەدکردار، هەڵەکار.

**بدکام:** نییەت خراو، بەدواز، دڵپیس، دڵ چەپەڵ، دەروون ناپاك.

**بدکردار:** بەدکردار، بەدئاکار، بەدخو، بێئاکار، خراپەکار، خراپەکەر، نفز، نڤز.

**بدکله:** کەللەشەق، لاسار.

**بدکنش:** بڕوانە: "بدکردار".

**بدکیش:** بڕوانە: " بدآیین ".

**بدکینه:** زۆر بەکینە، زۆرکینەکێش، ڕقاوی، ڕق کێش.

**بدگل:** کرێت، بێبەش لەجوانی، ناحەز، ناشیرین، نازەریف، نەجوان، کەست، دزێو، شەنی، گەست، خوێنتاڵ، ئێسك گران.

**بدگمان:** گومان ڕەش، دڵ کرمن، دڵ کرمێ، دڵ کرمۆڵ، دوودڵ، دڵ پیس، دڵ چەپەڵ، بیرخراو.

**بدگمانی:** دوودڵی، دڕدۆنگی، دڵپیسی، سڤیشك، خەلێڵە، بێباوەڕبوون.

**بدگو:** بەدزوان، بەدبێژ، بەدوێژ، زمان پیس، بەدگۆ.

**بدگواری:** بڕوانە:"سوءهاضمە".

**بدگوهر:** بڕوانە: "بداصل".

**بدل:** 1) زڕ، زڕە، ناعەسڵ، ناجسن، نەڕاستی، بەدەڵ، ڕەشۆکی، کەم نرخ، تەخلیت، زەغەل، خرش، سهر، سهرك، بەد عەسل، لەبات عەسڵ. 2) جێگر. "**بدل شدن**": گۆڕان.

**بدلگام:** لاجڵەو، بەدلغاو، لغاو قبوول نەکەر، سەرکێش، ئەسپ و ماینی سەرڕەق.

**بد مزاج:** 1) بەدخولق، توورە و تۆسن. 2) بڕوانە: "ترشرو".

**بدمزه:** تامسار، چێژناخۆش، تام ناخۆش، نێوەس، بێ تام.





**بدمذهب:** کاتی توورەبوون بە کەسی ئازاردەر دەوترێ. کافر، بێبڕوا.

**بدمست:** مەستی کەلەلا، زۆرسەرخۆش، بەدمەست.

**بدمستی:** شەڕ و هەرای مەستانە، بەدمەستی.

**بدمعامله:** مامەڵە ناخۆش، قەرزکوێر.

**بدمنش:** بەدڕەوشت، بەدخوو، بەدخولق.

**بدمنظر:** ناحەز، ناشیرین.

**بدن:** لەش، جەستە.

**بدنام:** بەد(ناو/ نێو)، ناوخراپ، حەیاچوو، ئابڕووتکاو، ناوزڕاو، ناوزڕیاگ، نام ڤەت، ناڤنۆ، بۆسۆ، خەنزار.

**بدنام کردن:** بەدناوکرن، ناڤنۆکرن، ناوزڕاندن، سووك کردن، بۆسۆکردن.

**بدنامی:** ناوزڕان، بەدناوی، ناڤنۆبوون، ئابڕووچوون، ناڤنۆبوون.

**بدندان بودن:** بریتی لە لەباربوون، شیاوبوون.

**بدنژاد:** بڕوانە: "بداصل".

**بدنشان:** 1) بەد کردار. 2) زەبوون، نزم.

**بدنصیب:** 1) بێبەش. 2) بەدبەخت.

**بدنفس:** بڕوانە: "بدنهاد".

**بدنما:** ناحەز، ناشیرین.

**بدنمود:** بێنموت، بێنمود، پۆخەکە، پوتەکە، بیچم ناپەسند. "**لاغربی نمود**": مردەڵە، مردوڵە، کزوکەنەفت، ڕیوەڵە، زەردەڵە. "**بدنمود حقیر**": گولە، پووتەکەی پیسەکە.

**بدنهاد:** دڵخوار، دلخار، دڵچەپەڵ، دڵپیس، دڵ گەمار، هەناڤ ڕەش، دەروون پیس، زکڕەش، ڕق لە زگ، دەبنەوەبڕ، بەدخوا، بیروهزرخراپ، بنیات خراو.

**بدنی:** جەستەیی.

**بدنیّت:** نییەت خراپ، دڵپیس، بەدخوا.

**بدو:** (بِ.دَ) خۆشڕۆ، خۆشبەز، خێراڕەو، تاشك، چالاك.

**بدو:** (بَ.دْ) 1) سەرەتا، دەسپێك. 2) سارا، بیابان، چۆڵگە.

**بدوبیراه:** جوێن، چۆڕس.

**بدوسوار:** سوارچاك، سووکەڵەسوار.

**بدوش کشیدن:** وەئەستۆگرتن، خستنەپای خۆ.

**بدون استثناء:** بەبێهەڵاواردە، تێکڕایی، بێ هەڵبژاردن، تێك لهەڤ .

**بدون انقطاع:** بڕوانە: "پیاپی".

**بد و بیراه:** قسەگەلی ناحەز.

**بدون تردید:** بەبێدڕدۆنگی، بێدڵەڕاوکێ، بەبێگومان، بێسێودوو.

**بدون علّت:** بێ هۆ، لە هیچێ، خوتوخۆڕایی.

**بدون نقص:** دروس، بێکەمایەسی، ساز.

**بدوی:** سەرەتایی، بەرایی، سارانشینی، چۆڵ پەرستی، یابانیەی.

**بدەبستان:** دان و ستان، دان و ستاندن. ساتوسەودا.

**بدهکار:** قەرزدار، قەرزار، قەرتدار، دەین دار، ڤادار، وام لەسەر، وامدار، بورجدار، وامار.

**بدهی:** قەرز، قەرز و قۆڵە، قەر، قەرت، وام، واو. "**بدهی بالاآوردن**": قەرزداربوون.

**بدیع:** جوان. جوانکاری. نوێ، سەیر.

**بدیع الجمال:** جوان چاك، قەشەنگ.

**بدیع الزمان:** تاقانە و بێهاوتا لە سەردەمی خۆیدا.

**بدیل:** جێگر، جێگرەوە، جێنشین، ئەلترناتیڤ.

**بدیمن:** شووم، بێ فەڕ، پێوقەدەم خراو، کەفارەتدار.

**بدیمنی:** جووت قۆشەیی، شوومی، کەفارەت.

**بدینسان:** بەمجۆرە، بەم پێیە.

**بدیهه:** لەپڕ، لەنکاو، شێعر و ئاخاوتەیەك کە بە بێ تێفکرین بوترێ.

**بدیهەسازی:** هۆندنەوەی پارچەیەك مووسیقا یان شێعر وهتد بە بێ بیرکردنەوە یان پرۆڤەی پێشوو.

**بدیهی:** بەڵگەنەویست، روون، ئاشکرا، دیار، سەرپێیی، یەکسەری.

**بذال:** زۆربەخشنە/ بەخشندە، فرە دڵاوا، بەدڵ.

**بذرافشان:** تووچێن، تۆوچێن، تووچن، داچێن، تۆم وەشێن.

**بذرافشاندن:** تۆم وەشاندن، توو وەشاندن، تووچانن، چاندن، داچەندن، داچەنن، کارتش، کارتەن.

**بذرافشانی:** بڕوانە: "بذرافشاندن".

**بذرپاش:** بڕوانە: " بذرافشان ".

**بذل:** دان، بەخشین، بەخشش، کەرەم. "**بذل توجه**": رووتێکردن، سەرنجدان. "**بذل جهد**": هەوڵ و تەقالای زۆردان.

**بذله:** حەلك، حەنەك، جەفەنگ، قسەی گاڵتەوگەپ، قسەی خۆش.

**بذلەگو:** قسەقوت، قسەخۆش، قسەسەیر، سیقاف، حەلك، حەنەکچی، چەکە، چوولە، گاڵتەچی، گاڵتەباز و قسەخۆش، جەفەنگ باز، کایکەردۆخ، نەقاڵ، شۆخی کەر."**مجلس بذلەگویان**": هەڵقەتیزان.

**بذی:** بڕوانە: "بدزبان".

**بذیم:** 1) بەهێز، بەتاقەت. 2) کەسێ کە زاری بۆنی لێبێ.

**بر:** بڕوانە: "خشکی".

**برا:** بڕندە، بڕرا، ببڕ.

**برائت:** 1) پاکی، پاکێتی، خاوێنی، بێتاوانی، رزگاربوون، رێدان. 2) بێزاری. 3) تۆبە. "**برائت جستن**": دووریکردن. "**برائت یافتن**": ئازادبوون، رزگاربوون.





**برابر:** بارتەقا، باتەقا، بەرانبەر، بەرامبەر، هەمبەر، هەناڤ، ڤەراڤەر، راستاهەڤ، هاوتەراز، هاوتەرازوو، هەڤسەر، هەڤهەسوو، یەکسان، چووبەچوو، پاك لە پاك، داربەدار، تۆڵەبەتۆڵە، سەربەسەر، وەك یەك، وەکوویەك، وەکەهەو.

**برابر آمدن:** پێشوازی. یەکسان بوون.

**برابر شدن:** رووبەڕووبوونەوە. یەکسان بوون، گونجان.

**برابر کردن:** 1) هاوکێش کردن، کردنە یەك ئەندازە. 2) هاوقەد کردن.

**برابرنگر:** یەکسان روان، بەئینساف، بەبێهەڵاواردن، بێلایەن، بێغەرەز.

**برابرنهاد:** دژسانی، ئانتیتێز.

**برابرنهاده:** 1) ئانتیتێز. 2) هاوکێش، هاومانا.

**برابری:** 1) یەکسانی، بەرابەری. 2) هاوپلەوپایە، هاوشان.

**برات:** حەواڵەی پووڵی. بەڵگەیەك کە بەپێی ئەو بەراتگر ناچارە پارەیەکی دیاریکراو لە رێکەوتێکی دیاریکراودا بداتە بەرات نووس.

**براد:** (بَ) ساردکەرەوە.

**براداندر:** زڕبرا.

**برادر دینی:** برای هاوئایین، برای دینی.

**برادرانه:** برایانە. وەك برا، بەشێوەی خۆشەویستانە.

**برادرکشی:** براکوژی. کوشتنی یەکتر لەلایەن کەسانێکەوە کە لە بنەڕەت دا پێکەوە پێوەندی بنەماڵەییان هەیە.

**برادروار:** 1) وەك برا. 2) خۆشەویستانە و گەرموگوڕانە.

**برادری:** برایەتی. یەکسانی لە ماف دا. گەرموگوڕی و دلۆڤانی لەلایەن پیاوێکەوە.

**براده:** (بُ.دِ) تۆپاڵ، ئارداسن، وردەی ئاسن کاتێك دەیبڕنەوە.

**برادیکاردی:** لەسەرخۆلێدانی دڵ.

**براری:** زەوییە وشکەکان.

**براز:** جوانی، رازاوەیی. چاکێتی.

**برازا:** جوان، پێکەفتگ، شیاو، ژێهات.

**برازش:** بڕوانە: "برازندگی".

**برازندگی:** لێکالانەوە، لێهاتنەوە، لێ ئانین، شیاوی، شایانی، ژێهاتن، شایستەبوون، شایستەیی، وەشانەوە، وەشیانەوە، پێکەفتن.

**برازنده:** شیاو، شایستە، شایان، پێکەفتگ، بەرکەتی، بەرکەفتی.

**برازیدن:** شایستەبوون، شیاوبوون، لێوەشاوەیی، رازیانەوە.

**براستادکردن:** 1) بەئەدەب و رێزەوە هەڵسوکەوت کردن. 2) دروست بوون.

**برآسودن:** ئاسوودەبوون، ئوقرەگرتن، ئارام بوون، هەدادان، داسەکنان.

**براشفتن:** توورەبوون، هەڵچوون، دەرهەڵبوون. "**براشفته**": تووڕە، رق هەستاو، هەڵچوو.

**براعت:** بەسەردابوون، بەسەردابوون لە زانست و چاكە دا یان لە جوانی و تێگەیشتویی‌دا، لێزانی. رەوانبێژی، زمان پاراوی.

**برآغالیدن:** بڕوانە: "آغالیدن".

**برافتادن:** لەبەین چوون، لەناوچوون، لە مۆد كەوتن.

**برافراختن:** بڕوانە: "افراشتن".

**برافراشتن:** بڕوانە: "برافراختن".

**برافروختن:** 1) هەڵكردن، داگیرساندن، ئایساندن، هەڵایساندن، هەڵایسان، هەڵگرسان، داگیرسان ، پێ‌كردن، ئاگرگرتن، گرتێ‌بەربوون، پێبوون. 2) سوورەوەبوون بە هۆی گەرما یان تووڕەیی یان ورووژان، هەڵچوون. "**برافروخته**": داگیرساو، هەڵایساو، هەڵكراو، پێكراو، سوورەوەبوو. "**برافروخته‌شدن**": بڕوانە "برافروختن".

**برافزون:** رووله زیادبوون.

**برافزون كردن:** زۆركردن، زیادكردن.

**برافكندن:** 1) بڕوانە: "برانداختن". 2) داپۆشین، وەشاردن. 3) لابردن، لەلاوەدانان. 4) ناردن، رەوانەكردن. 5) رژاندنی شتێ بە سەر شتێكی دیكەدا، زیادكردن.

**براق:** بریقەدار، بریقەدەر، بەتروسكە، بریسكەدار، برقۆك، بەدرەوشین، درەوشاوە، زۆر ورشەدار.

**برآمد:** بە كۆتایی گەیشتن، تەواوبوون.

**برآمدگی:** زگدان، سنگ دان، هەڵمسان، ئەستوورایی، هەڵتۆقین، گروزین، قەڵپە، گوێچك. بۆمانای زیاتر بڕوانە: "برجستگی".

**برآمدن:** 1) هاتنە(سەر/ بان)، (رۆژ)هەڵاتن، بەدیهاتن، دەركەوتن، ئاشكرابوون. 2) بەكۆتایی گەیشتن، تەواو بوون، بەئەنجام گەیشتن.3) قیتەوەبوون، زگدان، فوویریان، قنج، ڤەپەنگزین، ماسین، هەڵمسان، دەرپۆقین، دەرتۆقین.4) وەدەست هاتن. 5) زانران. 6) تێپەڕینی كات. 7) چوونەدەر، هاتنەدەر. 8) ئەنجام بوون، جێبەجێ‌بوون. 9) گەڕان، سەیران كردن. 10) روان، سەوزبوون. 11) پەروەردەبوون، بارهاتن.12) پێكران، وێكەوتن. 12) گەیشتن."**برآمدن باكسی(چیزی)**": بەرابەری‌كردن دەگەڵیدا. خۆڕاگری لە بەرامبەریدا. "**برآمدن جان**": مردن. "**برآمدن خمیر**": هەڵاتن، هەڵ پفان، هەڵ پفیان، هەڵ پفین، پێگەیشتنی هەویر. "**از چیزی برآمدن**": بێبەش مان لێی، لەدەست دانی."**برآمدن خورشید و ستاره**": هەڵهاتن، هەڵاتن.





**برآمده:** 1) بڕوانە: "برجستگی". 2) ناودار، بەناوبانگ.

**برآمیختن:** بڕوانە: "آمیختن".

**بران:** 1) بڕوانە: "بُرنده". 2) لێبڕاو و دەست رۆیشتوو.

**برانداختن:** 1) رووخاندن، لەبەین بردن، لەناوبردن، بنەبڕكردن، تەفروتووناكردن، هەرفاندن. 2) لەسەركارلابردن، لێخستن. 3) خستن، فڕێدان، هاویشتن. 4) تاودان، پڕتافیان. 5) رشانەوە، هەڵهێنانەوە. 6) تێڕامان لە ئەنجامی كارێك و راوێژكردن لەوبارەوە، هەڵسەنگاندن. "**برانداخته**": رووخاو، لەناوچوو.

**برانداز:** 1) خەمڵ، قرس، قەبڵ. 2) رووخێنەر، سەرەوژێركەر.

**براندازكردن:** سەرنج دان، پیاڕوانین، تێروانین، هەڵسەنگاندن.

**براندازنده:** رووخێنەر، لەناوبەر.

**براندازی:** رووخاندن، لەناوبردن.

**برانگیختن:** 1) دنەدان، هاندان، هانەدان، گاڵدان، بن كێلك، هەڵخڕاندن، ورووژاندن، هێژاندن، هەفتووش، دامۆچانن، هالان، هەڵ كرن. 2) زیندووكردنەوەی مردووەكان لە رۆژی پەسڵانێ. 3) تاودان، بە لەز لێخوڕین. 4) وازپێهێنان.5) بە شێوەی زەق سازكردن.6) وەدیهێنان، هێنانەدی، دروست كردن. 7) هەستاندن، لەخەو هەستاندن.

**برانگیخته‌شدن:** 1) دنەدران، ورووژان، هەڵخڕان. 2) بڕوانە: "انبعاث".

**برانگیزاندن:** بڕوانە:"برانگیختن".

**برانگیزش:** بڕوانە:"تحریك".

**برآور:** بڕوانە: "بارآور".

**برآورد:** قەرس، قرس، خەرس، خەمڵ، نەهان، بەراورد.

**برآوردشدن:** قەبڵان، قەبڵین، خەمڵ كران، نرخ لەسەردانران، بەراوردكران.

**برآوردكردن:** هەڵسەنگاندن، نرخاندن، خەمڵاندن، سەركردن، خەرسانن، خەرس كردن، قەرسان، قرسان، قەرساندن، قرساندن، قەبڵاندن، نەهاندن، بەراوردكردن، ل هەڤدان، لێكدانەوە.

**برآوردكننده:** خەملێن، قەرسێن، نرخێنەر.

**برآوردن:** 1) بەرزكردنەوە، بلێند كردن، بردنەسەر، ب سەر خستن، هێنانە بان، هەڵدان.2) رەواكردن، قبووڵ كردن، رازیبوون و ئەنجامدان، بەجێهێنان. 3) بڕوانە: "پروردن". "**برآوردن جان**": گیان دان، مردن. "**برآوردن خمیر**": هەڵهێنانی هەویر، هەڵ پفاندن. "**برآوردن نام**": ناوبانگ دەركردن."**از چیزی برآوردن**": بێبەش كردن لێی."**بهم برآوردن**": تووشی فیتنە و ئاژاوەكردن.

**برآورده:** پەروەردەكراو. چێكراو. "**برآورده شدن**": وەدیهاتن، هاتنەدی. 2) گیرا بوون، قبووڵ كران. "**برآورده‌كردن**": قبووڵ كردن، بەجێهێنانی نیاز.

**براوردی:** هەڵسەنگێنەرانە.

**براویختن:** بڕوانە: "گلاویزشدن".

**براه:** 1) بەجێ، لەبار، چاك. 2) چاكێتی، ڕەوایی.

**براهختن:** بڕوانە: "آهختن".

**براهمه:** كۆی" برهمن".

**برای:** بەهۆی، لەبەر، لەبۆ/ لۆ/ بۆ كەسێك یان شتێك، چونكە، چونكێ، ژبۆ، ژبەر.

**برآیند:** 1) ئاكام/ بەرەنجام/ بەرهەمی كاریگەری چەند هۆكار. 2) (فیزیك) فلش/ پەیكانێ كە كاریگەرییەكەی بەتەنیا بەرابەری كاریگەری كۆی چەند فلشە. "**برآیند نیروهای سیاسی**": بەرەنجامی كاریگەری هێزە سیاسییەكان.

**برء:** (بُ) خۆش بوونەوە، چاك بوونەوە.

**برء:** (بَ) بڕوانە: "آفریدن".

**برباد:** بێزەلەت، لەكەڵك و كار كەوتوو، هیچ پێوەنەماو، خراو، بەرباد.

**بربادآمدن:** لەناوچوون، تیاچوون، مافنگیبوون.

**بربادددادن:** بەباداكردن، فەوكاندن، فەوتاندن، بەفیڕۆدان و لەناوبردنی بڕێك لە سامان و دارایی خود، كاول كردن.

**بربادرفتن:** لەناوچوون، بەفیڕۆچوون، خەساربوون، لەدەست چوون، ژدەست چوون. "**بربادرفته**": بابردە، بابردوو، بەفیڕۆچوو، لەدەست چوو، لەناو چوو.

**بربادساختن:** خراو كردن.

**بربر:** وەحشی، هۆڤی.

**بربر نگاه كردن:** بڕوانە: " خیره نگریستن".

**بربریّت:** دوور لە شارستانی، هۆڤیتی، هۆڤینی، وەحشیگەری.

**بربست:** دەستوور، یاسا و ڕێسا، شێوە.

**بربستن:** 1) بەستنەوە، كۆت كردن، دەربەست كردن.2) ئامادەكردن، ساز و تەیاركردن.3) سوودهەڵگرتنەوە.

**بربسته:** 1) بەستو، مەبیو، سەهۆڵبەند، نەگۆڕ، ڕەق، وشك. 2) دەسكرد، دەست ساز.

**بربشول:** بڕوانە:"بلبشو".

**برپا بودن:** وێستان، لە سەر پێ بوون.

**برپا خاك كردن:** سووك كردن، بە چووك و سووك دانان.

**برپاخاستن:** هەستان، بەرزبوونەوە، لەسەرپێ وەستان.

**برپاداشتن:** دامەزران(دن)، بەرپاكردن، بەرپابوون، سازكردن، سازدان، سازبوون، هەڵدان، ئەنجام دان.

**برپار:** ڕێژەیی.

**برپاری:** ڕێژە، ڕادە.

**برپاكردن:** بڕوانە: "برپاداشتن".

**برپایی:** بەڕێوەچوون، بەڕێوەبردن، سازدان، وەڕێخستن، دارخستن.

**برپهلوانداختن:** پاڵخستن، خستنەسەرلا، خستنە سەر تەنیشت.





**برپیچیدن:** تێك ئاڵۆزان، لێك ئاڵۆزان، لێك هاڵان، تێك هاڵان، تێكەوەپێچران.

**برتاختگر:** هێرشبەر، پەلاماردەر، شاڵاوبەر.

**برتافتن:** 1) ڕوو وەرگێڕان، هەڵگەڕانەوە. 2) پێچدان، سووڕان. 3) بەرگەگرتن، تاقەتهێنان. 4)بەربەرەكانیكردن. 5) بەنرخ بوون، بایەخداربوون. 6) كون كردن. "**برتافته**": گەڕاوە، هەڵگەڕاوە، پێچدراو، سووڕاو.

**برتاو:** زاڵ.

**برتاویدن:** بڕوانە:"برتافتن".

**برتر:** لەسەرتر، بەرزتر، زاڵ.

**برتری:** 1) لەسەرتری، سەرێتی، بەرزتری، زاڵی، زاڵێتی. 2) سەروەری. 3) بەرزی، بڵیندی.

**برتری جویی:** 1) هەوڵدان بۆ وەدەست خستنی پۆستی بەرزتر. 2) خۆ لە كەسانی دی لەسەرتر دانان.

**برتری گرایانه:** بڕیاردەرانە، سەپێنەرانە.

**برتن:** خۆبین، سەربزێو، لەخۆڕازی، بەدەمار.

**برتنی:** خۆبینی، خۆنوێنی، فیز، بادی هەوایی.

**برج:** تاوەر، برج/ بورج، مزڵگەی ڕۆژ لە عاسمان، قۆنگرەی قوتی قەڵا. مانگی ساڵ. "**برج بابل**": جێیەك كە خەڵكەكەی زمان و نەریتی جیاوازیان هەبێ. "**برج ریق**": بێفەڕی، ناپیرۆزی. "**برج زهرمار**": زۆر تووڕە، مڕومۆچ و بەدئەخلاق.

**برجا/ برجای:** نەگۆڕ، جێگیر.

**برجا(ی)داشتن:** جێگیركردن، دامەزراندن.

**برجاس:** (بُ) ئامانج، نیشانەی تیر، جاسووسی تفەنگ.

**برجاماندن:** مانەوە، جێگیربوون، ئاكنجیبوون.

**برجستگی:** قیتایی، قیتی، قوتكە، زەقایی، زەقی، ڕەپی، زۆپی، زۆپایی، قۆزایی، قۆقزایی، قووپك، دەرپەڕیوی، گتایی، قوتی، میت، بەرزە، بەرزی، بەرزێتی، زی. هەڵكوتوویی. "**برجستگی لب بام**": بەرزەكی بانان، قوتكەی بە سەر لێواری بانەوە.

**برجستن:** (بَ.جَ.تَ) هەڵبەزین، هەڵبەزان، هل بەزین، هەڵ وەزین، هەڵ خستنەوە. "**برجستن ناگهانی**": هەڵبەزینەوە، هەڵوەزینەوە، هەڵ وەزانەوە.

**برجسته:** 1) هەڵكەوتە، كەسێتی مەزن و ناودار، بەرچاو. 2) قیت، قیتەوەبووگ، قیتكە، قوت، قوب، قوبان، قوبك، قۆقز، دەرپەڕیو، زاق، زەق، زۆق، زق، زوك، زەپ، زۆپ، ڕەپ، كت، گت، بەرچاو، ڤیت، زوك، زیك، مۆچ، گورمك، بەرجەستە، قەتیس.3) باش، چاك. 4) بڕوانە: "ممتاز".

**برجستەسازی:** بەرجەستەکردنەوە، قیت کردنـەوە، قـوت کردنـەوە، میـت کـردن، هەڵتۆقاندن، ڕەپ کردن، زەق کردنەوە.
**برجستەشدن:** بەل بوون، دەرپـەڕین، زەق بـــوون، زۆپ بـــوون، قیتــــەوەبوون، هەڵتۆقین.
**برجستەکردن:** بڕوانە: "برجستەسازی".
**برجستە نـشان دادن:** قـوت کردنـەوە، زۆپ کردنەوە، بە زەقی نیشان دان.
**برجوشش:** بڕوانە:"فوران".
**برجوشیدن:** کوڵان، کوڵین، هەڵچوون.
**برچدن:** بڕوانە: "برچیدن".
**برچسب:** لەقـەم، نیتـك، (نـاو و)نیتکـە، ئێتیکێت. نرخی سەر شتومەك.
**برچـــسب زدن:** لەقــــەم لێــدان، نـــاو و نیتکەلێدان، بوختان بۆ هەڵبەستن.
**برچسپانیدن:** بەسەرالکاندن، پیانووساندن.
**برچند:** ڕێژە، ڕادە.
**برچیدگی:** نابووتی، هەڵوەشانەوە.
**برچـــــیدن:** هەڵگرتنــــەوە، چـــنینەوە، ڤەرچیناندن، هەڵبژاردن، بژاردن. بەیەکادان و لەناو بردنی نووسینگەیەك، تێکەوەپێچان و کۆکردنـــەوەی دام و دەزگایــەك. "**برچـــیدە**": کۆکراوە، هەڵوەشاوە.
**برحسب:** بە گوێرەی، پێکا.
**برخ:** بەهرە، بەش، بڕێك لە شتێك.
**برخاستن:** ڕابوون، ڕابین، هەڵست، هەڵستان، هەڵسان، هەستان، خێزیـان، بـەرزەوبوون، ڕاســتەوەبوون، ڕاسـت بوونــەوە، هـۆرزای، هـۆرێزان، هـۆریزای، هۆرێزیـای، هۆرێـستەی، وریستەی، هنگرتن، ڤـڕین. ڕوودان، پێشهاتن. سەرچـــاوەگرتن. پـــەیابوون و ســـەرهەڵدان. هاتنـەبان، قیـت بوونـەوە. شـۆڕش کـردن، ڕاپەڕین. لەناوچوون، لابران. "**برخاستن ازچـیزی**": تـەواوکردنی، لێبوونـەوە لێـی. "**برخاسـتن ازسـر چیزی**": دەست لێهەڵگرتن، وازلێهێنانی.
**برخاستە:** ڕابـوو، هەسـتاو، بـەرزەوەبوو، ڕاستەوەبوو. هەڵقولاو.
**برخج:** ناپاك، چەپەڵ، گەمار، دزێو، ناحەز.
**برخلاف:** بە پێچەوانە، بەرچەپ، بەرڤاژی، دژ. "**بـرخلاف میـل**": نابـەدڵ، پێـچەوانەی دڵخواز، شتێ کە پەسند نـەکرێ و بـەردڵ نەکەوێ.
**برخوان:** بڕوانە:"فراخوان".
**برخور:** بـەش بـەر، قـازانج بـەر، شـەریك، هاوبەش.
**برخورد:** 1) پێکادان، پێکدادان، لێك دان، تێك ئەنگوان، بەرکـەوتن، وێکـەوتن، وێـك کەوتن، یەك کەتن، لێکەتن، لهەڤـ کـەتن، ڤێـك کـەفتن، خۆلێکـدان، گەپـچاندن، ڕووبەڕووبوونەوە، هەفتووش، هەفتوویش، تــووش بــە تووشـــەوەبوون، تووشـــی یەکهاتن، تێك ئەنگوان، هەڵ تەقان، هـەڵ تەقین، دیـدار، چـاوپێکەوتن، نـاییش پـا، "contact". 2) هەڵسوکەوت، مامەڵە.
**برخـــــوردار:** مرادحاســــڵ، کـــامڕەوا، بەهرەمەند، بەشبور، بەرخوردار.
**برخورداری:** بەهرەمەندی، کامڕەوایی.





**برخــوردکردن/ برخــوردن:** 1) یـەکتردیتن، پێـك گەیـشتن لــە ڕێگــەدا، تووشـــی یـەکـتربـــوون، ڕووبـەڕووبـوونـــەوە. 2) هەڵسوکەوت کردن. 3) ناڕەزایەتی یان ڕەخنەی توند سەبارەت بـە هەڵسوکەوتی نەشـیاوی کەسـێك. 4) هاتنەسـەر ڕێ، پێـشهاتن. 5) هەوڵـدان بـۆ چارەسـەری کێشە یـان گرفتێك. "**برخوردن بـە جـایی**": بوونـە هـۆی زەرەر و زیـان یـان هـەبوونی کاریگەری نەخوازراو.
**برخـی:** 1) هێنـدێ، هێنـدێك، هەنـدێ، کـەمێك، کۆمـەڵێك. 2) دەسـەرگەڕان، بەلاگێڕ، فیدایی، پێشمەرگە.
**برخیزانیـــدن:** هەسـتاندن، هەڵـساندن، هەڵسانن، ڕاستەوەکردن، بەرزکردنـەوە، هانـــدان، وروژانـــدن. ســـەرلەنوێ زیندووکردنەوە.
**بـرد:** (بُ) 1) بـردن، کـردەی بـردن. 2) سـوود، قـازانج. 3) کاریگـەری، مـەودا، بڕ. "**بردداشتن**": کاریگەری دانان.
**برد:** (بَ) سەرما، سۆڵە.
**بردابرد:** (بُ.بُ) ئاژاوەو هەلاوهەنگامە.
**بردابرد:** بڕوانە: "بردیدن".
**بـــردادن:** 1) بـــەردان، بەرهــــەم دان، میوەدان. 2) جیَهێشتن، وێڵ کردن.
**بردار:** فلش، پەیکان.
**بردارندە:** هەڵگر، لابەر.
**برداروومال:** بڕوانە:"کلاەبردار".
**برداشت:** 1) تێگەیشتن، هەڵێنجان، دەرك پێکراوی ئەقڵی، دەرەنجامگیری. 2) کۆکردنـــەوەی بەرهـــەم، بـــەرووبووم هەڵگرتنـــەوە. 3) وەرگرتنـی پـارە لــە حەساوی بانکی. 4) بەر، بـەرهـەم. 5) هەڵگرتن، لابردن.
**برداشت سطحی:** دەرەنجامی/ تێگەیشتنی ڕواڵـــەتی، تێگەیـــشتنی ڕووکەشـــی/ ڕووکەشیانە.
**برداشت محصول:** کۆکردنـەوەی بەرهـەم/ بەروبۆ/ بەرووبوم.
**برداشـتن:** 1) هـەڵگرتن، لەسـەرهەڵگرتن، لەسـەرلابردن، لابـردن، بەرزکردنـەوە، هـەڵێنان، هلیـان، هلیانـدن، هـەلانین، لـە زەوی بڵنـد کـردن، هـل گـاڤتن، داگرتن، ڤەڕۆتن، هنگرتن، هـۆرگرتن، هۆرگرتـەی، وادارتەنـە، هـورش گـرتن، وەدارتـش، وەداردش، وەداردایـــش، وەداروتـــش. 2) دروێنەکردن، کۆکردنەوەی بەرهەم. 3) دەست بـەسەراگرتن، بوونـەخاوەن. 4) هەڵگرتنەوە. 4) کڕین. قبوڵ کردن. 6) تاقـەتـهـێـنـان، بـەرگـەگـرتـن. 7) لـەنـاوبـردن، وەلانـان. 8) دزیـن. 9) جیاکردنــەوە. 10) لادان، لابـردن. 11) هەڵبـژاردن. 12) وەدەسـت خـستن، وەدەســت هێنــان. 13) خــستنەڕوو، پێشکەشکردن. 14) دەست پێکردن. 15) درێژەکێـــشان. 16) وەڕێکـــەوتن. "**برداشتن بە چیزی**": وێناکردن، وازانین.

**بردال:** بڕوانە: "پرگار".

**بردالعجوز:** زیپ، زیپك، زیپە، برجی پیرێژن، دووهەمین حەوتەی ڕەشەممە کە زۆر ساردە.

**بردبار:** بەتاقەت، پشوودرێژ، بەپشوو، نەفەس درێژ، بەسەبروحەوسەلە، لەسەرخۆ، نەرموو، نەرم و شل، هێمن، خۆڕاگر، بەگیر، بیهن فرە.

**بردباری:** تەوات، تەوتین، سەبرو حەوسەلە، تاقەتو پشودرێژی، لەسەرخۆیی، دان بە خۆداگرتن.

**بردفسانیدن:** چەسپاندن، لکاندن.

**برد فکری:** (بُ) قوولّی بیرکردنەوە، بڕکردنی هزری.

**بردك:** بڕوانە: "لغز".

**بردگی:** 1) کۆیلایەتی، کۆیلەتی، کۆیلێتی، کۆلەتی، بەندەیی. 2) بڕوانە: "اسارت".

**بردل نشستن:** پەسندکردن، خۆش لێهاتن، نیشتنە دڵ.

**بردماندن:** رواندن، سەوزکردن.

**بردمیدن:** 1) بڕوانە: "دمیدن". 2) هەلاّتنی ئەستێرەکان. 3) بەری بەیان. 4) قسەکردن. 5) روان، سەوزبوون.

**بردن:** 1) بردن، برن، بەردەی، هەلانین، راپێچکردن، بەرانبەری هێنان. 2) بردنەوە، سەرکەوتن، قازانجکردن. 3) سڕین، پاککردنەوە. 4) دزین، رفاندن. 5) لێخوڕین. 6) گەیاندن. 7) هەڵکردن، کێشان، دەربردن. 8) وەدەست هێنان. 9) وەرگرتن.

**بردە:** (بَ) کۆیلە، کۆلە، کۆلی، بەنی، بەندە، قول، (بردەی زر خرید) ئازەپ.

**بردەدار:** کۆلەدار، کۆیلەدار، کۆلیدار، خاوەن بەنی.

**بردەداری:** 1) کۆیلەداری، راگرتنی کۆیلەکان بە مەبەستی کارلێکێشانەوە یان چەوساندنەوە یان کڕین و فرۆشتنیان. 2) (کۆمەڵناسی) سیستمی ئابووری و کۆمەلاّیەتی لەسەر بنەمای کاری کۆیلەکان وەك ئامرازی سەرەکی بەرهەمهێنان.

**بردیدن:** دوورکەوتنەوە لەڕێگا، لەڕێ دەرچوون.

**بررستن:** روان، شین بوون، سەوزبوون.

**بررستە:** رووەك، گیا، دار کە لە گەش و نما دایە، بەرانبەر بە "بربستە".

**بررسی:** تاوتوێ، هەڵسەنگاندن، پێداچوونەوە، چاوپیاخشاندنەوە، پرسینەوە، لێپرسینەوە، لێکۆڵینەوە، پشکنین. "**بررسی اجمالی**": تاوتوێی خێرا، پێداچوونەوەی خێرا، کورتە پێداچوونەوەیەك، روانینی سەرپێیی.

**بررسیدن:** تاوتوێکردن، پێداچوونەوە/ چاوپیاخشاندنەوە بە کارێکدا، پرسینەوە.





**بررفتن:** چوونە سەر/ بان، سەرکەوتن.

**بر روی هم انباشتن:** هەڵچنین، هل چنین، بەسەریەکا کۆما کردن.

**برز:** (بُ) 1) بەژن و بالاّ. 2) تەپۆڵکە، کێو. 3) گەورەیی، شکۆ، جوانی.

**برز:** (بَ) کار، کشت و کاڵ، جووتیاری.

**برزبان آمدن:** بەزمان داهاتن، درکان، قسەلێدەرچوون.

**برزخ:** بەرزەك، بڵندایی نێوان تەختایی، لەمپەری نێوان دوو شت، دونیای نێوان ئەم جیهانە و قیامەت، لەکاتی مەرگ تا رۆژی قیامەت.

**برزدن:** (بَ) 1) پاڵدانەوە، هاوسەرێتی، بەرابەرێتی کردن. 2) هەڵکردن، هەڵدانەوە. 3) هاتنەبان. 4) سووك کردن. 5) هەڵدان. "**بەهم برزدن**": تێکدان، شێواندن.

**برزدن:** (بُ) بڕلێدان، لێکدان، تێکەڵ کردنی وەرەقەی پاسۆر.

**برزش:** 1) کشتوکاڵ، وەرزێری. 2) جێبەجێکردن، بەکردەوە هەنگاونان.

**برزشناسی:** (بَ) "ئەگرۆنۆمی"، زانستی چاندن و وەبەرهێنان لە خاك، زانستی کشتوکاڵ.

**برزکار:** بڕوانە: "برزگر".

**برزگر/ برزەگر/ برزیگر:** وەرزێڕ، وەرزیار، جووت بەندە، جووتیار، جووتێر، هیتەوان، بەزگەر، کشتیار، هیتەوان، هیتیار، فەلا.

**برزگری:** کشت و کاڵ، کشت و کار، چاندن و کێلاّن، وەرزێری.

**برزم:** ناز و خەمزە.

**برزمین افتادن:** تەخت بە عەرزا درێژبوون، تخێڵ، رەهێڵ، گنایش وارۆ.

**برزمین افکندن:** بە زەوی دادان، خستن، ئێخستن.

**برزمین کشیدن:** راکشاندن، بەسەر زەویدا راکێشان، خێش کردن، خشیان، کشکشاندن، رەکێش کردن بە سەر زەویدا، کاش کردن، کڕانتش، کڕونتش، کرێشەیش، ڤەچڕین.

**برزمین کشاندن:** خزاندن، خزانن، خریکاندن، خشاندن، خشانن، راکێشان بە سەر زەوی دا.

**برزنگی:** رەش پێست.

**برزە:** کشتوکاڵ. لکی دار.

**برزیدن:** درێژەپێدان بە کارێ یان بابەتێ، کردن.

**برزین:** بەشکۆ، نێوی ئاتەشگایەك بووە لە خۆراسان.

**برساختن:** ساختەکاری یان دانانی وشە یان گێڕانەوە و شتی وا. "**برساختە**": ناڕاستەقینە، دەسکرد. وشەی دانراو/ داتاشراو.

**برسایش:** بڕوانە: "فرسایش".

**برسبیل:** بەگوێرەی.

**برسختن:** 1) هەڵسەنگاندن، کێشان. 2) تاقیکردنەوە.

**برسرآمدن:** 1) بەسەردابوون. 2) سەرکەوتن، زاڵ بوون.

**برسرآوردن:** بەسەرهێنان، پیاهانین.

**برسکیزیدن:** بڕوانە: "سکیزیدن".

**برش:** (بُ) 1) تیژی، بڕ، بڕشت، بڕان، قەڵت، ڤەقوسان. 2) بڕگە. 3) توانایی، لێبڕاوی. 4) بڕان، کەلەبەر، کەلێن. "**برش داشتن**": هەبوونی لێبڕاوی و توانایی و لێهاتوویی لەبەرەوپێش بردن یان ئەنجامدانی کارێك. "**برش زدن**": بڕین.

**برشت:** برژ، ورژ.

**برشتن:** برژان، برژین، برێژیان، برژاندن، براشتن، ورژان، ورژاندن، ورژانن، وژانن، بریان کردن. بۆدان. "**برشته**": برژاو، برژی، برژیاگ، برژیاو، برژیو، برشته، بریشته، برشتی، بریان. "**برشتەکردن**": بڕوانە: "برشتن".

**برشدن:** چوونەسەر، بەرزبوونەوە، هەستان.

**برشکستن:** 1) بڕوانە: "اعراض". 2) شکست پێدان، بەزاندن. 3) پەرێشان کردن. 4) شکان، شکاندن. "**بە هەم برشکستن**": تێکشکاندن. تێکهەڵچوون دەگەڵ یەکتر.

**برشمردن:** هەژماردن، هەڵ شماردن، حەساوکردن، دووبارە ژماردن، دانەدانە باس کردن، مۆردەنە.

**برطرف کردن:** لابردن، لە سەر ڕێ وەلابردن، چارەسەرکردن. ڕەواندنەوە. دابین کردن.

**برطیل:** بەرتیل، بەردی درێژ، بەردی لاکێشە.

**برعکس:** پێچەوانە، بەپێچەوانە، چۆپەوانە، تەرسە، بەراوەژوو، بەراوەژی، بەرەواژی، سەروقوون.

**برعهده:** لەپا، وەئەستۆ، لەسەر، بەعۆدە. "**برعهدەداشتن**": (لە/ وە)ئەستۆبوون. "**برعهدە گرفتن**": (لە/ وە)ئەستۆگرتن.

**برغست خاییدن:** درێژدادڕی، چەنەبازی بەخۆڕایی.

**برغلانیدن:** بڕوانە: "برانگیختن".

**برفاب دادن:** خەمبار و ناهومێدکردن.

**برفر:** شان و شکۆ، ڕێز و پایە بەرز.

**برفرست:** کاڵای تایبەت بە هەناردنە دەرەوە.

**برفرود:** 1) هەوراز و نشێو. 2) سانایی و دژواری. 3) جیاوازی. 4) جیاواز، بژاردە، شاز.

**برف کوری:** (چاو) بەبەفرکەوتن.

**برفنج:** تووڕە، دژوار، ڕێگەی دژوار و باریك.

**برفنجك:** بڕوانە: "بختك".

**برفند:** بڕوانە: "ترفند".

**برق آسا:** لەناکاو، وەك برق، وەك بروسك/ بروسکە، بەخێرایی زۆرەوە.

**برق بلا:** بڕوانە: "آتشپارە".

**برقرار:** جێگیر، دامەزراو، هەر کەس یان هەر چییەك کە بمێنێتەوە و نەفەوتێ.

**برقراری:** جێگیر(کردن/ بوون)، دامەزراندن، سازدران.





**برقع:** پەچە، ڕووبەندی ژنان، دەمامك. "**برقع از روی کسی انداختن**": ئاشکراکردنی ڕازی ئەو. "**برقع برافکندن**": دەرخستنی ڕوخسار. "**برقع زدن**": دەمامك لێدان، دەماخ هەڵبەستن، پەچەگرتنەوە.

**برکات:** کۆی"برکت".

**برکار:** بەبرەو، بەڕمێن.

**برکارکردن:** وەگەڕخستن، وەکارخستن، خستنەسەرکار. دانان لەسەرکار دانان.

**برکت:** پیت، بەرەکەت، فیت، فەڕ، پیرۆزی، زۆربوون، بەختەوەری.

**برکردن:** 1) بردنەسەر، بەرزەوەکردن، هەڵدان. 2) لەبەرکردن، خستنە مێشکەوە. 3) هەڵکردن، هەڵگیرساندن. 4) دەرهێنان دەرهاوردن. 5) کردنەوە. 6) ناردن، ڕەوانەکردن. "**بەهم برکردن**": تێکدان، شێواندن و پەرێشان کردن.

**برکشیدن:** 1) دەرهێنان، دەرکێشان، هەڵ کشاندن، هەڵ کشانن، هەڵ کێشانە سەر، هەڵمژین، مژین، قووت دانی تەڕایی، هەڵێنجان، هەڵهێنجان، لووش دان. 2) بڕوانە: "پروردن". 3) داکەندن، دەرهاوردن. 4) هەڵسەنگاندن، کێشان. 5) هەڵدان. 6) جووڵان، کەوتنەڕێ. 7) کێشانەوە.

**برکنارکردن:** لێخستن، لەسەرکار دەرکردن، وەلانان، قت کردن.

**برکندن:** هەڵپچڕین، هەڵپچڕاندن، هەڵپچکڕان، هەڵپچکڕاندن، ڤەچڕین، بەزۆر لێکردنەوە، ڕیشەکێش کردن، هەڵ قەندن، هەڵ قاندن، هەڵکەندن، کۆڵین، هەڵ کولۆشان، هەڵ کولۆشین، هەڵ کولۆشیان، ورکەنە.دەرهێنان، داکەندن.

**برگ:** 1) پەژە، گەڵا، پەلك، بەڵگ. 2) سامان، تێشو، ساز و نەوا. 3) فیش. 4) مەیل، هۆگری. 5) تاقەت، وزە و تابشت. 6) نیاز.7) ئاواز، ئاهەنگ. "**بەبرگ**": ڕێکوپێك، سەروسامان گرتوو.

**برگاشتن:** بڕوانە:"برگرداندن".

**برگاشتن(روی):** ڕوو وەرگێڕان.

**برگ برنده:** ئاتۆ، کارتی براوە.

**برگ خرید:** فاکتۆر، سیایی، لیستە.

**برگ دادن:** گەڵادەرکردن، سەوزبوونٍ.

**برگردان:** وەرگێڕدراو.

**برگرداندن:** گەڕاندنەوە، هێنانەوە، ڕەت کردنەوە، دانەوە، هەڵگەڕاندنەوە، نکساندن، ژێر و ژوورکردن، پشت و ڕووکردن، داموچانن، ئاوەژووکردن، هەڵ گێڕانەوە، وەرگەڕاندن، وەرگێڕان، وەرگێڕانەوە، هێرفاندن، ورگێلان، هۆرگێلانن، هۆرگێڵنای.

**برگردان کردن:** ژێروڕووکردن، هەڵگەڕاندنەوە.

**برگرداننده:** وەرگێڕ، وەرگێل، هەڵگێڕ، هەڵگێڕەوە، هەڵەوگەڕ، وەرگەڕێن.

**برگردیدن:** گەڕانەوە، هاتنەوە، ڤەگەڕیان. روو وەرگێڕان، پشت تێکردن.

**برگذارکردن:** تێپەڕاندن، بەکۆتایی گەیاندن، تەواوکردن، داڤیئانین.

**برگذشتن:** تێپەڕین، تەواو بوون. چوونە بانتر. "**برگذشتن از کسی**": وازهێنان لێی. بەهێندنەگرتنی ئەو. چاوپۆشیکردن لە هەڵەکانی ئەو.

**برگذشته:** تایبەتمەندی ئەوەی کە تەمەن و کاتی بەسەرچووە.

**برگراییدن:** 1) کێشکردن. 2) هەڵسەنگاندن، تاقیکردنەوە. 3) بڕوانە: "پیچاندن".

**برگرفتن:** 1) چنینەوە، هەڵگرتنەوە، بەرزکردنەوە. 2) رفاندن. 3) بڕوانە: "بستن". 4) داپۆشین. 5) وەرگیران. 6) راگواستن، بردن. 7) وەدەست هێنان.8) هەڵبژاردن. 9) دەس پێکردن. 10) لەناوبردن، سڕینەوە، پاککردنەوە. "**برگرفتن بەکسی**": وردە و ئیرادلێگرتن.

**برگریزان:** خەزان، خەزام، گەڵاڕێزان، دەمی خەزەڵوەر، گڕەژۆ.

**برگریزی:** خەزەڵوەرین، گەڵاڕێزان، کاتی گەڵاوەرینی داران.

**برگ ریزی:** خەزەڵوەرین، گەڵاوەرین لە داران. "**موسم برگ ریزان**": خەزەڵوەرێن، گەڵاڕێزان، رەوتین.

**برگزارکردن:** بەڕێوەبردن، ئەنجام دان، بەجێهێنان.

**برگزاری:** بەڕێوەچوون، بەستران، گرێدان، ل دار خستن.

**برگ زدن:** کەڵەکبازیکردن، فێڵبازیکردن.

**برگ زرین:** لاپەڕەیەکی زێڕین.

**برگزیدگان:** هەڵبژێراوەکان، هەڵبژێراوان، بژاردەکان، ناوازەکان.

**برگزیدن:** هەڵبژاردن/ تن، هەڵ بژنین، هەڵ بژین، هەڵ مژاردن، هەڵژماردن، هەڵمژاردن، بژاردن، بژارتن، بژارکردن، وژاردن، چاك لە خراپ جیاکردنەوە. بۆ مانای زیاتر بڕوانە "انتخاب". "**برگزیده**": بژاردە، بەربژار، بژێراو، تەلبژێر، تەلبژێن، هەڵبژاردە، هەڵبژارتە، هەڵبژێراو، هەڵبژارتی، هەلبژارتو، هەڵبژاردی، هەڵبژێردراو، هەڵبژاردو، هەڵبژیاگ، هەڵژماردوو، ، هەڵژماردە، هەڵژمێراو، ورچنیا، هەژماردە، سەرتڵ، سەرتەڵ، سەرچن، سەرگوڵ، نەقێنراو، پەسندکراو، خاسە، ناوازە.

**برگزین:** هەڵبژێراو، بژاردە، دانسقە، سەرتۆپ.

**برگزیننده:** هەڵبژێر، هەڵبژێن، هەڵژمێر، تەلچن کەر.

**برگ سبز:** ئاڵەکۆك. "برگ سبز است تحفە درویش/ چەکند بینوا همین دارد": دیاری شوانە وێڵە ئاڵەکۆکە.





**برگشادن:** کردنەوە. ئازادکردن لە بەند.

**برگشت:** گەڕانەوە، هاتنەوە.

**برگشتگی:** سەرەونخونی، ئاوەژوویی، چۆنیەتی" برگشتە".

**برگشتن:** گەڕانەوە، هەڵگەڕانەوە، بادانەوە، هاتنەوە، وەگەڕیان، زڤڕان، زڤڕین، دێور، کشانەوە، وەکشان، بەرەوپاش وەکشان، ڤەکشین، واز هێنان، فتلین، فەتلین، ئاوەژووبوون، وەرگەڕان، ورگێڵان، سەرەونخون بوون."**برگشتن ازکسی**": دووری لێکردن، روولێوەرگێڕان.

**برگشت ناپذیر:** بێ گەڕانەوە، کردەی ئەنجام دراو.

**برگشته:** گەڕاوە، گەڕیاوە، وەرگەڕاو، سەرەونخون.

**برگماردن:** بڕوانە: "گماشتن".

**برگماری:** بڕوانە: "انتصاب".

**برگماشتن:** بڕوانە: "گماشتن".

**برگ و نوا:** تێشوو و کەلوپەلی ژیان، نێعمەت و دارایی. وزەوهێز، گوڕوتین.

**برگە:** فۆڕم. گەڵا، پەڕ.

**برگی:** ملکەچ و بەرفەرمان بوون وەك بەرخ، گوێڕایەڵی بێئەملاوئەولا.

**برلیان:** بەدرەوشین، ورشەدار، بریقەدار، گرشەدار، روون.

**برم:** (بَ.رْ) 1) لەبەر، بیرگە.2) کانی، تالاو.

**برماسیدن:** بڕوانە: "پرماسیدن".

**برمال زدن:** هەڵاتن، راکردن.

**برمالیدن:** 1) لوول دان و تێکەوەپێچانی شتێك، هەڵ ماڵین، هەڵ کردنی قۆڵ و دەلینگ، هەل دان. 2) بڕین، پێوان.

**برماندبر:** بڕوانە:"وارث".

**برمانە:** نەریت.

**برمایون:** بڕوانە: "پرمایە".

**برمچیدن:** ساوین، پیاماڵین، پێداهێنان.

**برمخیدن:** سەرەڕۆیی و سەربزێوی کردن، بەقسەی دایك و باوك نەکردن، سەرکێشی.

**برمر/ برمو/ برموز:** (بَ.مَ) چاوەڕوانی، چاوەنواری، چەمەڕایی.

**برمسند:** لەسەرکورسی/ تەخت.

**برملاشدن:** بڕوانە: "آشکارشدن".

**برملاکردن:** بڕوانە: "آشکارکردن".

**برمغاز:** بڕوانە: "بغیاز".

**برمنش:** خۆپەسن، خۆهەڵکێش، فیزن، بەدەعیە، قۆڕەدەماغ.

**برمنشی:** خۆپەسنی، خۆهەڵکێشان، فیز، دەعیە، بادیهەوایی.

**برنا:** خۆرت، لاو، گەنج، جحێڵ، وشاق."**برنای زیبا**": لاس، لاز، لاج، لاوچاك.

**برناس:** نەزان، بێئاگا، خەواڵوو.

**برنامە:** سەردێڕ، پێڕست، پێشەکی، ریچ، پێڕەو/ پەیڕەو، بەرنامە، پڕۆگرام، رێنامە، دەستووری کار، پلان.

**برنامەچیدن:** دابین کردنی پێشەکییەکانی کارێ بەپێی ئامانجێکی دیاریکراو. پیلانگێڕی.

**برنامەڕیزی:** پلان داڕشتن، پلان دانان، تەرح داڕشتن، بەرنامەڕێژی، بەرنامەدانان، بەرنامەداڕشتن. "**برنامەریزی شدە**": پلان کراوە، بەرنامە بۆ داڕێژراو.

**برنامەسازی:** دروست کردنی بەرنامە بۆ رادیۆ و تەلەویزیۆن یان نووسینی بەرنامە بۆ کامپیوتێر.

**برنامەسنجی:** هەڵسەنگاندنی بەرنامەکان پێش لە نواندنیان بەمەبەستی خاترجەم بوون لێیان.

**برنامەنویسی:** کردەی نووسینی بەرنامە، بەرنامەنووسی.

**برنایشت:** پەرگیر، بیرکورت، کەم چیکەڵدانە.

**برنجزار:** مەرەزە، کێڵگەی برنج، برنجاڕ.

**برندگی:** (بُ) بڕوانە: "برش".

**برندە:** (بَ) براوە، سەرکەوتوو. هەڵگر.

**برندە:** (بُ) بڕ، بڕا، بڕندە، بوڕ، بڕ، ئەوەی دەبڕێ، تیژ، بەبڕشت، دژی کول. کاریگەر، کارتێکەر.

**برنشاندن:** سوارکردن، خستنە سەر تەخت، دانانی کەسێك لە شوێنێ. ئامادە و تەیارکردن.

**برنشستن:** سواربوون، دانیشتن لە سەر تەخت.

**برنگاشت:** بڕوانە: "کتیبە".

**برنهاد:** 1) تێز. 2) بڕوانە: "پس انداز".

**برنهادن:** 1) دانان، دانیان، لەسەردانان. 2) بڕوانە: "نصب کردن". 3) بارکردن. "**برنهادن برچیزی**": دەرووەست بوون پێی.

**بروبازوزدن:** هەوڵدان، تەقالادان.

**بروبچەها:** ژن و منداڵ. دۆستان و هاوکاران. کەسانی هاوپلەوپایە.

**بروبرگرد:** ئەملاوئەولا، شك و گومان.

**بروبوم:** پێکهاتوو لە دوو وشەی "بر" بە مانای چۆلگە و "بوم" بەمانای زەوی، شوێن و شار، سەرزەوی.

**بروبیا:** هاتوچۆی زۆر. دەم و دەزگا، دەسەڵات و دەست رۆیشتوویی.

**بروج:** کۆی"برج".

**برودت:** 1) ساردبوون. 2) ساردی، ساردوسڕی، فێنکی، تەز.

**برور:** بڕوانە: "بارور".

**برورو:** جوانی، قەشەنگی.

**بروزدادن:** درکاندن، ئاشکراکردن، دەرخستن.

**بروزکردن:** دەرکەوتن، سەرهەڵدان، روودان.

**بر و فرود:** بڵیند و نەوی، هەوراز و نشێو.

**بر وفق مراد:** بە پێی ویست و دڵخواز.

**برومند:** 1) بەرهێن ، بەبەرهەم، بەرهەمدار، میوەدار.2) تورت و تێراو، کامڕەوا. 3) ئابڕوودار، بەئابڕوو. 4) بەهێز و ئازا. "**برومندشدن**": بەهرەمەندبوون.





**برون:** دەرەوە. رواڵەت. دوور، جیا. "**برون از**": بێجگە، جیالە. "**برون از اندازە**": بێ‌ژمار و فراوان، لەئەندازەبەدەر.

**برون آمدن:** 1) دەرچوونەدەر، هاتنەدەر. 2) دەرکەوتن. 3) سەرپێچیکردن. 4) روان، شین بوون. "**برون آمدن برکسی**": دژی ئەو شۆڕش کردن.

**برون آوردن:** دەرهێنان، دەرهاوردن، هەڵکێشان، هەڵێنجان.

**برون افکنی:** بڕوانە: "برون فکنی".

**برون بر:** کۆمەڵە خانەیەك کە رووی دەرەوەی میوە دادەپۆشن و بەشی ناوەوەی میوە دەپارێزن.

**برون پالش:** بڕوانە: "دفع".

**برون پوست:** دەرەوەیی‌ترین توێژی تۆل، "اکتودرم".

**برون تاختن:** بەپەلە هاتنەدەر.

**برون جوشش:** بڕوانە: "فوران".

**برون رفت:** دەرچوون، دەربازبوون.

**برون رفتن:** هاتنەدەر، دەرچوونەدەر.

**برون ریز:** بڕوانە: "فوران".

**برون زمینی:** بان زەمینی، فەزایی.

**برون سوی:** بەرەودەرەوە، لەدەرەوە.

**برونش:** بڕوانە: "برون رفت".

**برون شو:** چوونەدەرەوە. لێبوونەوە، رزگاری.

**برونشیت:** هەوکردنی بۆرییەکانی هەناسە.

**برون فکنی:** (دەروونناسی) جۆرە بەرگرییەکی دەروونی کە لەودا تاك بۆ رزگاربوون لە کێشمەکێش و نیگەرانی مەیل و گرۆییەکانی خۆی رەپاڵ دیتران دەدا، رەپاڵدان، دیترهاوێژی.

**برون کردن:** دەرکردن، خستنەدەر. ناردن، رەوانەکردن.

**برون کوچ:** بڕوانە: "مهاجرت".

**برون کوچگر:** بڕوانە: "مهاجر".

**برون گرا:** دەرەوەخواز، بەرەودەرەوە، مرۆڤی کۆمەلایەتی/ جڤاکی.

**برون مرزی:** دەرەوەی سنوور.بێگانە، دەرەکی.

**برون ناوی:** سەربە دەرەوەی سەفینەی فەزایی.

**برونە:** دەرەکی. رواڵەت. نما.

**برونی:** دەرەوەیی.

**برهات:** کۆی"برهە".

**برهان:** بەڵگە، پرتۆ، دەلیل، پاژە، پازە.

**برهان خلف:** بەڵگەی پشتەوە.

**برەبرە:** رووشاو، لەلەدار، شوێندار.

**برهختن:** بڕوانە: "برهیختن".

**برەکشان:** 1) کردەی کوشتنەوەی بەرخ. 2) قازانجی زۆر کردن، بەهرەمەندی.

**برهم انباشتگی:** شخل، شخلین، بەسەریەکا هاتن، لەسەریەك کەڵەکەبوون، قەڵاقۆچکەبوون.

**برهم انباشتن:** لەسەر یەك (هەڵچنین/ دانان)، کەڵەك کردن، کەڵەکەکردن، بەسەریەك داکردن، هاویشتنەسەریەك، کۆگاکردن، کۆکردن، قەڵاکردن، قەڵاپەچن کردن، شەمیتێن، قەڵاچ، قەڵانقووچکە. "**برهم انباشته**": بەسەریەکا هاتوو، بەسەریەکاکۆم بوو/ بووگ، بەسەریەك داکراو، لەسەریەك کەڵەکە کراو، کەڵەکە بووگ، بان یەك، خومیا، بەرهەڤ، شخلی، کۆگا، قەڵاقووچ، قەڵاقووچە، قەڵاقووچکە، قەڵاپەچن، قەفەنگێو، قەڵاتە، خومیا، تۆپڵاخ، تۆپڵاخە، شەمیت.

**برهم آوردن:** لێکنان، بەسەر یەك دا هێنان.

**برهم برآمدن:** دڵتەنگ بوون، خەمباربوون، تووڕەبوون.

**برهم خوردن:** تێك دران، تێك چوون، بڵاوبوون، پرژان، پەشۆکیان، تێکەڵاوبوون.

**برهم زدن:** تێك دان، خراوکردن، ژێر و رووکردن، تێکەڵ کردن، هەڵ شاندن. "**برهم زدن پلکها**": چاوتروکاندن، چاوتروکانن، چاوترەکاندن، چاوترەکانن.

**برهم زنندگان:** تێکدەران، ئاژاوەگێران.

**برهم شدن:** پەشۆکیان، پەشۆکان، پەرێشان بوون، بیربڵاوبوون.

**برهم کنش:** کاریگەری دوولایەنە، کردەوە و دژکردەوە.

**برهمن:** زانا و پێشەوای ئایینی بەرەهمایی.

**برهم نهادن:** بان یەك نان، لەسەریەك دانان، کەڵەکەکردن، خستنەسەریەك، سەر هەڤدانان، جووتکردن، پێکەوە نووساندن، نووقین، قووچان، چووقان.

**برهنجیدن:** دەرهێنان، دەرهاوردن، دەرکێشان، کێشان، هێنانەبان.

**برهنه:** پەتی، رووت، رووت و قووت، رووس، خواس، ڤڕێ. نەدار، هەژار.

**برهوت:** چۆڵوبیابان، چۆڵگەی گەرم و بێئاو و گیا.

**برهود:** سەرەبزووت، بزووت، بزۆت، بسۆت.

**برهودن:** سووتاندن، بەهۆی تینەوە زەرد یان سوورکردنەوە.

**برهه:** قۆناغ، رۆژگار، رۆچیار، بڕگە.

**برهیختن:** بارهێنان، راهێنان، پەروەری، پەروەردەکردن، ئەدەب کردن. دەرکێشان، دەرهێنان.

**بریء:** پاك، بێتاوان. بێزار. دوور. "**بری شدن**": بێزاربوون. دوورکەوتنەوە. "**بری کردن**": بێزارکردن، جاڕزکردن.

**بریان کردن:** برژانن، براشتن، کەباب کردن، قەلاندن.

**بریان کننده:** گۆشت بژێر، گۆشت برژێن.

**برید:** نامەگەێن، پۆستە، پەیك.

**بریدگی:** دابڕان، بڕان، جیایی، بڕگە، کەلێن، قەڵشت. "**بریدگی بسیار**": بڕگەبڕگە، زۆرلەلەکراو.





**بریدن:** 1) بڕین، بڕیەی، بڕاندن، بڕینەوە، هەڵبڕین، دابڕین، دڕاندن، وڕین، لەت کردن، قەڵتاندن، قەڵت کردن، داپاچین، هەڵپاچین، هەڵ قاچین، لێکردنەوە، جیاکردنەوە، کرتاندن. 2) دڕان، تلّیشان، جیابوونەوە، لەت بوون، دابڕان. 3) رێگە پێوان. 4) بڕینەوە، دیاریکردن. 4) نەهێشتن.5) کەندن، هەڵکەندن. "**بریدن از کسی**": پێوەندی پچڕاندن، لێك دابڕان. درێغی کردن. "**از هم بریدن**": لێکتر جیابوونەوە. تەواوبوون.

**بریده:** بڕاو، دابڕاو، دادڕاو، تلّیشاو، قەڵشاو، جیابۆوە.

**بریده دم:** 1) کلك بڕاو. 2) بڕوانە: "حیلەگر".

**بریدەزبان:** بڕوانە: "زبان بریده".

**بریدەشدن:** بڕیان، بڕان، بڕدران، هەڵبڕان، هل پەکاندن، لەت بوون.

**بریز:** داڕژان، بارشت، باران.

**بریق:** درەوشاوەیی، رۆشنی.

**بریگاد:** تیپ، بریگاد(نزیکەی پێنج هەزار سەربان).

**برین:** سەرووتر، بەرزتر.

**برینش:** (بُ) 1) بڕوانە: "برش و بریدگی".2) زگچوون، قۆڵنج. 3) جیایی.

**بزآوردن:** (بُ) لە زاراوەی قوماربازان دا: نەهاتی، بۆنەهاتن، دۆڕان.

**بزبازی:** بریتی لە فێڵ کردن لە کەسێك، گەمەپێکردن بە کەسێك.

**بز بها:** (بُ) 1) قیمەتی بزنێك. 2) کەم نرخ، نزم.

**بزبیاری:** بڕوانە:"بزآوردن".

**بزچراندن:** بریتی لە بێکاربوون، بێکارسووڕانەوە. بزن لەوەڕاندن.

**بزخر:** کەسێك کە کەلوپەلەکان بە کەمتر لە نرخی راستەقینەی خۆی دەسێنێ.

**بزخو:** (بُ) بۆسە، سیپە.

**بزخوکردن:** بۆسەنانەوە و چاوەڕێی دەرفەت بوون.

**بزداییدن:** بڕوانە: "زداییدن".

**بزدل:** ڤەرچالە، ڤرچالە، بێ ورە، ترسنۆك، ترسەنۆك، تەرسۆنەك، ترسونەك، ترسەزاوەر، قزە، قوزە، کەللەزراو، نەوێر، نەوێرك، نەوێرۆك، نەوێرەك، بەزدونەك، بێ هەناو، بێزراو، بێ زات، حیزەڵ، قەڵسەمێر، کەللەزاور، خنز.

**بزدلی:** نەوێران، نەوێرین، ترسنۆکی، ترسەنۆکی، حیزاتی، حیزایەتی، حیزیەتی، حیزێتی.

**بزدودن:** بڕوانە: "زدودن".

**بزرکار:** بڕوانە: "برزگر".

**بزرگ:** گەورە، زل، زەلام، مەزن.

**بزرگان:** پیاوە گەورەکان، مرۆڤێن مەزن، ئاکابر.

**بزرگانه:** بەشێوازی گەورەکان.

**بزرگتر:** گەورەتر، مەزنتر، زلتر، گەپتر، مازتر، ماستر.

**بزرگ خوانده:** ناسراو بە گەورەیی یان لاف لیچدەری گەورەیی.

**بزرگ خویشتنی:** خۆبە زل زانی، بادیهەوایی، فیز.

**بزرگداشت:** بەرز نرخاندن، بەرزڕاگرتن، ڕێزلێنان، یادکردنەوە.

**بزرگ راه:** ئوتووبان، ئازادڕێ.

**بزرگ سازی:** بڕوانە: " آگراندیسمان". .

**بزرگمرد:** کەڵەپیاو، گراگر، گڕگر، گرگرە، پیاوی هەڵکەوتە و بەشەڕەف، پیاوی ئازا و بەڕێز و جوامێر.

**بزرگ منش:** 1) بڕوانە: "بزرگوار". 2) لەخۆڕازی، خۆویست، بەفیز.

**بزرگوار:** پایەبەرز، گەورە، مەزن، گرس.

**بزرگواری:** پایەبەرزی، مەزناهی، گەورەیی

**بزرگی:** مەزنی، مەزناهی، مەزنایەتی، مەزنێتی، گەورەیی، سەروەری، میرایەتی، توانایی، شکۆ. گرینگی و پێگەی کۆمەڵایەتی و ناوبانگ و شتی وا.

**بزرو:** بزنەڕێ.

**بزك (کردن):** رازاننەوە، خەملاندن، خاڵ و میل رشتن، خۆجوان کردن، خۆتاسولووس دان، لاولوسە.

**بز گرفتن:** قازانج کردن لە مامڵەیەك دا کڕینی شتێ بە کەمتر لە نرخی راستەقینەی خۆی. "**بە بز گرفتن کسی**": بەگەمژەزانین و فریودانی. بەکەم نرختین شت خەملاندنی

**بزم آرا:** رازێنەری کۆڕی بەزم و میوانی.

**بزمان:** 1) مەیل و تکا. 2) مەست و خەمبار، دڵتەنگ.

**بزماورد:** بەتام، بەچێژ.

**بزم چیدن:** رێکوپێك کردن و ئامادەکردنی کەلوپەلی بەزم و میوانی.

**بزمگاه:** بەزمگا، بەزمگە، شوێنی شادی و ئاهەنگ گێڕان.

**بزن:** لێدەر. کارزان و توانا.

**بزن بزن:** تێکهەڵچوونی توند، کوتەککاری.

**بزن بهادر:** بلەربەزێن، سمێڵ بابڕ، بەبڕشتو هێزدار، ببڕ، دلێر، ئازا.

**بزنگاه:** شوێنی لێدان، شوێنی دز و رێگر و چەتەکان، ئەو جێگەیەی کە رێگر و چەتەکان موسافیرەکان دەڕووتێننەوە.

**بزن و بکش:** تێکهەڵچوون و کوشتار.

**بزن و بکوب:** مووسیقاژەنین و هەڵپەڕین، بەزم و رەزم. تێکهەڵچوون و کوتەککاری.

**بزوش:** (بُ) وەك بزن، بزن ئاسا.

**بزوغ:** بڕوانە: "تابیدن".

**بزه:** گوناح، وەباڵ، ئۆباڵ، تاوان.

**بزهکار:** تاوانبار، سووچبار، خراپکار، چەقاوەسوو، بێ شەرم و بەچەقە و شڵتاغ، "delinquent".





**بزهکاردهی:** رادەست کردنەوەی تاوانبار، تاوانبارگەڕاندنەوە.

**بزهکارستانی:** بڕوانە: "بزهکاردهی".

**بزهکاری:** هەرزەکاری، تاوانکاری، خراپکاری، "delinquency".

**بزەمند/ بزومند:** بڕوانە: "بزهکار".

**بزیدن:** (بَ) بڕوانە: "وزیدن".

**بژکول:** بڕوانە: "بشکول".

**بژم:** بڕوانە: "بشم".

**بژن:** بڕوانە: "لجن".

**بژهان:** بڕوانە: "پژهان".

**بس:** 1) زۆر، فرە، گەلەك. 2) بەس، تەنیا.

**بسائط:** کۆی"بسیط".

**بساردادن:** بڕوانە: "بساردن".

**بساردن:** خۆش کردنی زەوی کێلدراو.

**بسارده:** بەگا، زەوی دێراو کە بۆ چاندنی رەپستە ئامادەیە.

**بسازوبفروش:** ئەوەی کاری سازکردنی ماڵ و فرۆشتنەوەیەتی.

**بساط:** (بِ) بارگەوبنە، رایەخ، راخەر، سفرە.

**بساط:** (بَ) 1) بەربڵاوی گۆڕەپان، زەویی تەخت و بەربڵاو. 2) فەرش، رایەخ. 3) دەزگا. 4) کاڵا، سەرمایە. "**آه در بساط نداشتن**": زۆر نەدار و هەژار بوون. "**بساط برچیدن**": کۆکردنەوەی سفرە، لەناوبردنی دۆخێکی نالەبار. "**بساط چیدن**": ئامادەکردن و پانکردنەوەی ئامرازی کارێك. "**بساط درآوردن**": ئەنجامدانی کاری نالەبار و نائاسایی، بەزم و هەرانانەوە. "**بساط کسی را برچیدن**": کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتدارەتییەکەی. "**برهم چیدن بساط:**" (رێکخستن/ ئامادەکردن)ی دەم و دەزگا. "**پهن کردن بساط**": راخستنی سفرەی قومار.

**بساط آراستن:** فەرش راخستن، ئامادەکردنی" بساط ".

**بساط بسیط:** زەوی پان و بەرین.

**بساطت:** 1) ساکار و بێ دەعیە، ساکاری. 2) شیرین زوانی. 3) روو خۆشی.

**بساط خاك:** زەوی.

**بساط فلك:** گۆی زەوی.

**بساط گستردن:** فەرش راخستن.

**بساط گشادن:** فەرش پان کردنەوە، فەرش راخستن.

**بساطی:** وردە فرۆش.

**بسالت:** 1) دلێربوون. 2) دلێری، ئازایەتی، بوێری، نەترسان.

**بسام:** زۆر رووخۆش، زۆر دەم بەپێکەنین، رووگەش، رووکەن.

**بسامان:** چاك و باش و رێکوپێك، هێژا.

**بسامد:** هاتن و چوون. لە فیزیك دا: فرێکوێنس/ فرەکانس.

**بسان:** وەك، وەکە، وەکو، لەچەشن، لەوێنە.

**بساوایی:** بڕوانە: "حس لامسە".

**بساوند:** بڕوانە:"متناسب".

**بساویدن:** ساوین، پیامالین، پێدا(هێنان/ هانین)، رێخستن.

**بسایند:** فره، زۆر.
**بسباس:** جلّف و سووك، فشقیات، قسەی شڕ و بێتام.
**بسپار:** پولیمێر.
**بسپارش:** پولیمێریزاسیۆن.
**بستاخ:** بڕوانە: "گستاخ".
**بستار:** كۆتایی. ئاسێبوون، گرفتاربوون. دەربیجە، دەركەی بۆتڵ و هتد. داخران، بەستران. دەركە داخستن. پچڕانی جەریانی ئاو.
**بستانكار:** خاوەن قەرز، قەرزدەر، داواكار.
**بستدن:** بڕوانە: "ستاندن".
**بستر:** 1) جێگە و بان، نوێن. 2) بەستێن. 3) پانتایی.
**بستر افكندن:** جێ و بان داخستن.
**بستر تاریخی:** بەستێنی مێژوویی.
**بستر خواب:** نوێن، پێخەف.
**بستر خلاقیّت:** بەستێنی خوڵقێنەرانە/ خوڵقێنەری، بەستێنی دانەرانە.
**بستردن:** بڕوانە: "ستردن".
**بستر رود:** رووبار.
**بستر سازی:** بەستێن سازی، جێخۆشكردن.
**بستر نهادی:** بەستێنی دانەرانە.
**بستر نشین:** لە جێدا كەوتوو، نەخۆش.
**بستری:** 1) نەخۆش، لە جێدا كەوتوو. 2) بەستێنی، پێوەندیدار بە دەقەوە.
**بستری شدن:** لە جێدا كەوتن، نووستنی نەخۆش.
**بستری كردن:** خەواندن، دەخەو كردن، نوێن گیركردن، خستنی نەخۆش لە شوێنی دەرمان كردن.

**بستگی:** 1) داخران، بەستران. 2) پێوەندی، پێكەوەلكاوی، هەڵواسراوی. 3) خزمایەتی، نزیكی. 4) دڵبەستراوەیی، هۆگری. 5) ئاڵۆزی كار یان كێشەگەلی ژیان. 6) قەبزی، سك وەستان.7) خەم و دڵتەنگی. 8) لێڵ بوونی رەنگ."**بستگی سخن**": بڕوانە: "لكنت زبان". "**بستگی داشتن**": پێوەندی هەبوون. خزم بوون.
**بستن:** بەستن، بەسن، بەسیان، بەستەی، بەندان، بەنان، بەندكردن، داخستن، هەڵپێكان، هەڵپێكانن، پێوەدان، بەسەریەكا جووت كردن، ژەندن، ژنیان، ئاژنین، گرێدان، گاڵەدان، شەتەكدان، قەپات كردن، قوڵفدان، قفڵدان، مسمتاندن، بەرلێگرتن، نووقین، قووچان، چووقان، مسمد، شد، شەد، توندبوون، سەهۆڵ كردن، رەق (بوون/ كردن)، جەمەدین، مەیین، سێحر كردن. "**بستن به كسی**": رەپاڵدان بەو."**بستن پل**": سازكردنی پرد. "**بستن زبان كسی**": وڵامدانەوە و قسەپێنەهێشتنی كەسێ لە باس و گفتوگۆدا. "**بستن مجلس**": داخستنی پارلمان. "**بستن هوا**": ساردبوون و هەوری بوونی هەوا. "**بسوگند بستن**": پابەندكردن بە سوێند. "**خود را بستن**": بێنیاز و ماڵدار بوون."**بهم بستن**": پێكەوە چنین. سازوباز و كەین و بەین كردن. جۆركردن، بەستن.
**بستناك:** بەستوو، رەق هەڵاتوو.
**بست نشستن:** مانگرتن.





**بستنگاه:** شوێنی بەستنەوە/ وەبەستن. لەنگەرگە.
**بستنی:** 1) شیاوی بەستن. 2) دۆندرمە، دۆڵدرمە، بوزە، بەستەنی، چلورە.
**بست وبند:** بڕوانە:"بندوبست".
**بست و گشاد:** داخستن و كردنەوە. بەڕێوەبردن، رێكوپێك كردن.
**بسته:** داخراو، پێوەدراو، هەڵپێكراو، هەڵپێكیاگ، پلۆم، بەستراو، بەسراو، بەندكراو، ژنیای، گرێ خواردوو، رەق بوو، سفت بوو، بەستوو. "**امید بسته**": هیوای محاڵ و ئەستەم."**بسته رحم**": بڕوانە: "عقیم".
**بستەبندی:** قوتووبەندی، كۆكردنەوە، پێچانەوە، بەستەبەستەكردن، بەستەبەندی.
**بستەرحم:** بڕوانە:"نازا".
**بستەشدن:** داخران، بەستران، بەسیان، هەڵپێك، هەڵپێكران، پێوەدران.
**بستەكار:** كەسێك كە بەئەسپایی كارێك ئەنجام دەدا.
**بسته میان:** بە بەهرە و ئامادەی خزمەت.
**بسرآمدن:** 1) تەواوبوون، كۆتایی هاتن، دوایی هاتن. 2) مردن.
**بسرآوردن:** تەواوكردن، كۆتایی/ دوایی پێهێنان.
**بسربردن:** بەكۆتایی گەیاندن، بردن/ راگواستن تا شوێنی مەبەست، بەڵێن بردنە سەر، رابواردن، رۆژ تێپەڕاندن، بەسەربردن.
**بسردرآمدن:** بەسەرەوە بە زەوی دادران، خلیسكان و بە زەویدادران، سەرەونخوون وەئەرزی كەوتن، بە سەر سەردا كەوتن.
**بسردویدن:** بریتی لە راكردن بە خێراییو پەلەیی زۆرەوە، پەلەكردن لە بەجێگەیاندنی بڕیار و فەرمانی كەسێك.
**بسر رسیدن:** بەكۆتایی گەیشتن، بەئەنجام گەیشتن، كۆتایی هاتن.
**بسر رفتن:** 1) جێبەجێبوون. 2) وەكوڵ هاتن و لێوڕێژ بوون. "**بسر رفتن كار**": جێبەجێبوونی كار.
**بسر زدن:** 1) بە دەست لە سەر دان لە كاتی پەرێشانیدا. 2) بە كۆتایی گەیاندنی شتێ. 3) رازیبوون، قایل بوون. 4) لە كەللە دان. 5) دێوانەبوون.
**بسرشدن:** بڕوانە: "بسر رسیدن".
**بسر كردن:** 1) رازیبوون. 2) بە كۆتایی گەیاندنی شتێ.
**بسر كشیدن:** یەكجێ خواردنەوە. 2) بە سەر دادانی عەبا و چارشێو هتد.
**بسزا:** شیاو، شایستە.
**بسط:** 1) پەرەپێدان، بڵاوكردنەوە، ئاوەڵاكردن، پان كردنەوە. 2) ئاوەڵایی، هەراوی، بەربڵاوی، بەرینی. 3) بە تێروتەسەلی گوتن، شیكردنەوە. 4) رووبەر. "**بسط كلام**": روونكردنەوەی قسە، درێژەپێدانی ئاخاوتە. "**بسط ید**": دەس ئاوەڵەیی."**بسط پیداكردن**": برەوسەندن، بەربڵاوبوون."**بسط و قبض**": رێكخستنی كارەكان.

**بیرون دادن:** دەرپەڕاندن، دەرفرتاندن، فرتاندن.

**بیرون رفتن:** دەرکەوتن، دەرکەفتن، دەرکەتن، دەرچوون، چوونەدەرەوە، رۆیشتنە دەر.

**بیرون راندن:** دەرپەڕاندن، دەرچڕانن، دەرکردن بە زۆر و گوشار.

**بیرون راندەشدگی:** وەدەرنراوی، دەرکراوی، هل قەتین.

**بیرون ریختن:** خستنە دەرەوە. وەدەرنان.

**بیرون زدن:** قیتەوەبوون، هەڵتۆقان، هەڵتۆقین، هەڵ زیپان، هەڵ زڕەپان. دەرچوون، چوونەدەر.

**بیرون شدن:** چوون/ رۆیشتنە دەر، دەرکەوتن.

**بیرون شو/ برون شو:** ڕێگەی چوونەدەر.

**بی‌رونق:** بێبرەو، بێکڕیار.

**بیرون کردن:** وەدەرنان، دەرکردن، کردنەدەر، ڤەدیکرن. دەرهێنان، داکەندن.

**بیرون کشیدن:** بڕوانە: " بیرون آوردن".

**بیرون کننده:** دەرپەڕێن.

**بیرون گرفتن:** دەرهێنان، دەرهاوردن.

**بیرون نویسی:** دەرهێنانی بابەتی پێویست لە ناو بابەتە تێر و تەسەلەکان.

**بیرون مرکزی:** سەنتەردەرەوەیی.

**بیرونی:** سەربە (دەرەوە)، دەرەوەیی. رواڵەتی.

**بی روی:** پڕڕوو، بێ شەرم.

**بی‌رویه:** بێسەرەوبەرە، بێبەرنامە، بێ ڕێسا، ناسروشتی.

**بی‌ریا:** بێڕووبینی، بێدووڕوویی، دڵساف، دڵپاك، راستگۆیانە.

**بی‌ریب:** بێ گومان، بێ شك.

**بیریش:** 1) ئەوەی ریشی نیە، بێموو، کۆسە. 2) بڕوانە:"امرد".

**بیزار:** بێزار، وێزار، وەڕەز، جاڕس، جاڕز.

**بیزارشدن:** بێزان، بێزران، وەڕەز بوون، جاڕزبوون، لەبەردڵ لاچوون.

**بیزار کردن:** جاڕزکردن، وەڕەزکردن، حاڵ تێکدان.

**بیزاری:** بێزاری، جاڕزی، وەڕەزی، بێمەیلی، لەبەرچاوکەوتن، کەرخ.

**بیزاری دادن:** تەڵاق دان.

**بیزاری گرفتن از کسی:** جیابوونەوە و دوورکەوتنەوە لێی.

**بیزنده:** دابێژ، دابێژەر.

**بیزیدن:** بڕوانە: "بیختن".

**بیژە:** بڕوانە: "ویژە".

**بی‌سابقە:** بێپیشینە، بێپێشوونە.

**بی‌ساختە:** سادە و ساکار. بێ ئامراز و کەلوپەل.

**بی سار:** وشەیەکە وەك فلان، فیسار، کاورا.

**بی‌سامان:** ناڕێك و پێك، بێماڵ و حاڵ، بێ جل و بەرگ و خواردەمەنی، لانەواز، نەدار، رووت و قووت، رووت و رەجاڵ، رووت و نەدار، رووتە، رووتەڵ.





**بی‌سامانی:** ناڕێکی، ناتەکووزی، نەداری، هەژاری، لانەوازی، عەودالی.

**بیستاخ/ بستاخ:** بڕوانە: "گستاخ".

**بیستار:** بڕوانە: "بستار".

**بیستون:** بێ کۆڵەکە، بێئەستوندەك.

**بی‌سخن:** بێ شك و گومان. بێ ئەملاوئەولا، بێ قسە.

**بی‌سرانجام:** ئەوەی داهاتوویەکی دڵخواز و سەرکەوتوانەی نیە، بێئەنجام.

**بی‌سروپا:** بێسەر و پێ/ پا، شەلاتی، چەورە، خۆڕی و تۆڕی، بێکارە و خوێڕی، داماو، بێهێز. بێسەروبن.

**بی‌سر و تە:** بێسەر و بن، بێ سەروقوون، لەڕادە و ژمارە بەدەر.

**بی‌سر و سامان:** ناڕێك و پێك، تێکەڵ پێکەڵ، بێسەرە و بەرە، لانەواز، بێ ئەنوا و دەربەدەر، رووت و نەدار، بێ بەرگ و تێشو.

**بی‌سکەکردن:** بێمتمانەکردن، لە متمانە و بەها خستن.

**بی‌سلیقە:** بڕوانە: "بی‌ذوق".

**بی‌سنگ:** سووك و بێکێش. بریتی لە کەسێکی بێ نرخ و پلە و پایە.

**بیسواد:** نەخوێندەوار، نەخوێندو، نەخوێندی، ناخوندە، نەخۆندە، نەخۆندی، نەخۆنە، نەخاندی، نێوەندە، نێوەندا.

**بی‌سیرت:** ئابڕووتکاو، سووك و چرووك، بێ رەوشت، بێ ناموس. "**بی سیرت کردن**": دەست درێژی سیکسی کردنە سەر.

**بیش:** زۆر، فرە، گەلەك.

**بی شائبە:** سادقانە، بێشێلەوبێلە، بێ فێڵ و تەڵەکە.

**بی‌شبهە:** بێ شك و دڕدۆنگی.

**بیش ترك:** کەمێك زیاتر.

**بیشترین:** زۆرترین، فرەترین.

**بیشترینە:** زۆربە، زۆرتر.

**بی‌شرف:** بێئابڕوو، ئابڕوونەدار، بێ ناموس.

**بی‌شرم:** بێئاوڕو، ئابڕووتکاو، بێچاوەڕو، بێچاوڕو، بێعار، رووهەڵماڵاو، رووهەڵماڵراو، رووهەڵماڵاو، رووداماڵاو، ئاوەسوو، چەقەسوو، چەتاوەسوو، چەتاوەڕو، بێحەیا، بێشەرم، سلسار، بەڕو، باتیزك، باتیزۆك، قوڵتەش، قوڵتەشە، قرشماڵ، چاڤ هیشکن دوقدۆقە.

**بیشرو:** زێدەڕۆ، توندڕۆ.

**بی‌شعور:** نەزان، نەفام، بێئاوەز.

**بی‌شك:** بێگومان و سۆ، بێدڕدۆنگی.

**بیشکاری:** زێدەڕۆیی.

**بی شکیب:** بێ سەبر و حەوسەلە، بێ پشوو، ناجێگیر، بێئۆقرە.

**بیشمار:** بێژمار، بێشومار، لەژمارەبەدەر، لەژماربەدەر، زێدە لەبژاردن، یەکجارزۆر.

**بیشە:** قامیشەڵان، قامیشەڵێن، بێشەڵان، مێشە(ڵان)، وێشە.

**بیشی:** 1) زۆری، فراوانی. 2) لەسەرتری. 3) زێدەخوازی.

**بیشی جستن:** زیاتر ویستن، زیاتر لە پێویست خواستن.

**بی شیلە پیلە:** بێ شێلوبێلە، بێشێلە و بێلە، بێفێڵ و تەڵەکە، بێ رووبینی، ساف و سادە.

**بیشینە:** زۆرترین رادەی شتێك، ماکزیمۆم.

**بیص:** تەنگانە و دژواری.

**بی‌صبر:** بێ سەبر و حەوسەڵە، کەم چیکەڵدانە/ چیکلڎانە، بیهن کورت، تەنگەنەفەس.

**بی‌صدا:** قڕوقەپ، قەپ و قڕ، بێدەنگ، بێخوست، کپ. "**بی صداکردن**": بێدەنگ کردن، نووکەبڕین، قڕوقەپ پێکردن.

**بی‌صرفە:** بێسوود، بێهوودە. بێ مانا.

**بی‌صفت:** بڕوانە: "بی وفا".

**بی‌صورت:** 1) بێ شەرم، بێ حەیا. 2) بڕوانە: "بی سیرت".

**بی صورت کردن:** بڕوانە:"بی‌سیرت کردن".

**بیضوی:** هێلکەیی.

**بیضە**(**آتشین/ زرین**): بریتی لە خۆر.

**بیضەبرآوردن:** هێلکەکردن.

**بیضە خاکی:** بریتی لە گۆی زەوی.

**بیطار:** بەیتار، پزیشکی مەڕ و ماڵات.

**بیطاقت:** بێهێز، بێتاقەت و تابشت، بێ وزە، بێتاو، بێتاقەت، وەڕەز.

**بیطالع:** بێبەش، بەوبەخت.

**بی‌طرف:** بێلایەن، دەرکەنار، بێ لایەنگیری، لاتەریك، نێتار، دوورەپەرێز لە کێشە، نێکەردونێوەرد، نەکردو نەخوارد، لابوون، گوێ دینج.

**بی طرفی:** بێلایەنی، نێتاری، دوورەپەرێزی.

**بیع:** فرۆشتن. "**بیع و شرا**": کڕین و فرۆشتن.

**بیعار:** بڕوانە: "بی‌شرم".

**بیعانە:** بێعانە، بەیعانە، پێش بەها، پێشەکی سەودا، دراوی پێشەکی.

**بیعت:** (بِ.عَ) پرستگەی جوولەکە.

**بیعت:** (بَ.عَ) گفت و پەیمان، پەیمانی دۆستی و بەئەمەگی، پێڕەوی.

**بیعت شکستن:** پەیمان شکاندن، تێکدانی قەرارداد.

**بیعت کردن:** رازیبوون و قبووڵ بوونی سەرۆکایەتی کەسێك.

**بیعت نامە:** بەڵێن نامە.

**بی‌عدد:** بێژمار، بێحەساو.

**بی‌عدیل:** بڕوانە: "بی‌همتا".

**بی‌عرضە:** بێشیان، خوێڕی، هەپیلۆك، بێکارە، بێئیرادە، تەوەزەل، خیت.

**بیع سلم:** سووت و سەلەم، پێشکڕ، پێشخڕ.

**بی عصمت:** داوێن پیس، داوێن تەڕ، بێ نامووس.

**بی عصمت کردن:** بڕوانە:"بی سیرت کردن".

**بی عقل:** بڕوانە: "بی خرد".

**بی‌علّت:** بێهۆ، لەخۆڕا.

**بی‌عمل:** بێ کردەوە. بێکار.





**بی عیب و نقص:** بێ کەموکووڕی، راست و دروست، تەواو.

**بیغار:** تانە، سەرزەنشت، لۆمە.

**بیغارە:** بڕوانە: "بیغار".

**بی‌غرض:** بێمەبەست و تەماح.

**بی غل و غش:** بێ فرت و فێڵ، بەڕاستگۆیی.

**بیغلە:** بڕوانە: "بیغولە".

**بیغولە:** کونج، گۆشە. کوێرەڕێ. وێرانە.

**بی‌فایدە:** بێکەلك، بێسوود.

**بی‌فرجام:** بێئاکام، بێهوودە.

**بی‌فرمان:** سەربزێو، سەرکێش، سەرەڕۆ، یاغی.

**بی‌فروغ:** بێڕووناکی، بێ(تیشك/ گزینگ)، ئەوەی کە برەو و دیمەنێکی نیە، بێڕەواج.

**بی فکر:** بێبیر، بێفکر، کەسێك کە بیر لە ئاکامی کارێك نەکاتەوە.

**بی‌قاعدە:** بێڕێسا، ناڕێك و پێك، ناتەکووز، بێبناخە.

**بیق بیق بودن:** بە تەواوی مانا گەوج و گەمژە بوون.

**بی‌قدر:** بێنرخ، بێحورمەت، بێحوزم، سووك، سقك.

**بی قرار:** بێئۆقرە، بێئارام، هەدانەدەر، دانەسەکناو، هێدی نەدەر، چرتی، ناجێگیر، ناپایەدار.

**بی قراری:** ناجێگیری، بێئۆقرەیی، بێ ئارامی، گل و گوێز، ناپایەداری.

**بی قیاس:** بڕوانە: "بیشمار".

**بی قید:** بڕوانە: "لاقید".

**بی قیدوشرط:** بێ شەرت و مەرج.

**بیکار:** بێکار، بەتاڵ، دەس بەتاڵ، دەستڤالا، بێشوغڵ.

**بیکارە:** بێکارە، بێ هونەر، تەوەزەل، لەشگران، کەتوەر، بودەڵە، کۆڵانگەڕ، مێشەڕەوی، چەورە، مازوور.

**بیکاری:** بێکاری، بەتاڵی، دەس بەتاڵی، پووچی، مێش خەساندن، مێش قەپاندن.

**بیکران:** بێکۆتا، بێکەنارە، بێلێوار، بێسنوور، بێ داوی.

**بی کم و کاست:** تەواو، بێکەم و زیاد، سەروزیاد، بێکەموکووڕی، سەرومڕ، گزۆری، رێکوپێك.

**بی‌کنش:** ناچالاك، پاسیڤ.

**بی‌کیار:** چوست و چالاك، زیرەك و کارا.

**بیگ:** بەگ، گەورە، ئاغا.

**بیگار:** بێگار، پشتەملە، کاری زۆرەکی و بەخۆڕایی، کاری بەگ بە زۆرداری.

**بیگاری:** بێگاری، کاری بێگار، پشتەملێ، سۆخرە، سۆغرە.

**بیگانگی:** بێگانەیی، نامۆیی، نامۆبوون.

**بیگانە:** غەوارە، غەریبە، گەجە، گەچە، کەس نەناس، بیانی، بەڕانی، بێگانە، نامۆ، هاڤی، لاپرە، کەجە، لاوەکی، دەرەکە، دەرەگە.

**بیگانە پرست:** بێگانە پەرست، خۆخۆر، جاش، نیشتمان فرۆش.

**بیگانەخوار:** خانەیەك كە بتوانێ خانەیەكی دی قووت بدا، زیاتر بە خڕۆكە سپییەكان دەوترێ"فاگۆسیت".

**بی گاه:** بڕوانە: "بێموقع".

**بی گدار بە آب زدن:** بریتی لە مل پێوەنان و خۆنەپاراستن لە ئەنجام دانی كارێ كە قازانج و زیانەكەی روون نیە، هەڕەمەكییانە خۆپیادان، بێ بوار لە ئاو دان.

**بێگزند:** بێزیان، بێئازار، بێوەزەنگ، بێوەی.

**بێگمان:** بڕوانە: "بی شك".

**بیگناه:** بێتاوان، بێگوناح، بێسووچ، ناتاوان.

**بیگە:** بڕوانە: "بیگاه".

**بیلان:** بڕوانە: "ترازنامە".

**بی لگام:** هەوسارپچڕاو، بێجڵەو.

**بیلمز:** بێخەبەر و نەفام.

**بیلە:** دوڕگە، چزیرگە، وشكی نێوان دەریا و رووبار.

**بیم:** ترس، خۆف، مەترسی، هەراسە.

**بیمار:** نەخۆش، ناخۆش، لەش بەبار، ناساخ، نەساخ، ناساغ، ناساق، ناساز، نەساز، نەوەسە، دەرداوی، دەردبار، دەردەدار، نێوەش.

**بیمارسان:** بڕوانە: "بیمارگون".

**بیمارستان:** نەخۆشخانە، خەستەخانە، خەسەخانە.

**بیمارشدن:** نەخۆش بوون، نەخۆش كەوتن، نەخۆش كەفتن، تووش بوون بە لەش بەباری.

**بیمارگون:** وەك نەخۆش، نەخۆش ئاسا، بەئێش، رەنگ زەرد، رەنگ پەڕیو.

**بیماری:** نەخۆشی، ناخۆشی، نەخۆشین، ناخۆشین، نەخوەشی، مەرەزن، لەش بەباری، ناسازی، نێوەسانی، نێوەشانی، نێوەشەن، نێوەشی، نێوەشینە، نێوەشییە، نەساخی، ناساخی، ناساغی، ناساقی، هللە. "**بیماری‌سخت**": بەلوەشین، نەخۆشی گران. "**بیماری صعب العلاج**": دەردیكاری، دەردیگران، ملتاف. "**بیماری واگیر**": نەخۆشی گیرۆ، ئاهۆ، پەتا، گیرۆ، مافەتا، مافەتە، درم، ئازار، شەوب.

**بیمانند:** بڕوانە: "بی همتا".

**بیمایە:** بێنرخ، بێبایەخ. بێبناخە، بێ بنیچە. نەخوێندەوار و بێهونەر. نەدار و دەست تەنگ، بێسەرمایە، بێپووڵ. بێ خەرج.

**بی مبالات:** كەمتەرخەم، بێمبالات، گەللایی، قەرقل، گوێ نەدەر بەكار، روونەدان، رووسارد.

**بیمثال:** بڕوانە: "بی مانند".

**بیمحابا:** بێشەرم داگرتن، رووداماڵیاگ، رووهەڵماڵاو، چەقاوەسوو، نەترس، گوێنەدەر، چاونەترس.

**بیمحتوا:** بێناوەڕۆك، بێكاكڵ.

**بی محل:** 1) بێ متمانە، بێ پاڵپشت. 2) نابەجێ، نارەوا. 3) بێنرخ، بێ بەها.





**بی محلی:** گوێپێنەدان و بەهێند وەرنەگرتن.

**بی‌مخ:** بێمێشك، بێمەژگ، بێمەژی، گەوج، بێ هۆش و گۆش.

**بیم‌خوردە:** ترساو، تووشی خۆف هاتوو.

**بیمر:** بڕوانە: "بی حد".

**بی‌مرز:** بێسنوور، بێكەوشەن.

**بی‌مصرف:** گەندەڵ، چروكوبێكەڵك، بەدەردنەخور، بێنرخ، بێكارە.

**بی‌معارض:** بڕوانە:"بلامنازع".

**بی‌معنی:** بێمانا، بێناوەڕۆك. ناشیرین، نەشیاو. پووچ.

**بی‌مغز:** بێناوك، بێكاكڵ. بێمێشك، بێئاوەز، نەزان. بێمانا. ناوبەتاڵ، پووچ.

**بی‌مقدار:** بێبەها، بێنرخ.

**بیمگاه:** شوێنی ترس و خۆف، خۆفگە.

**بی‌مناسبت:** ناوەخت، نابەجێ.

**بیمناك:** ترسناك، ترسێنەر، پڕمەترسی، مەترسیدار.

**بی‌منظور:** 1) بێمەبەست. 2) پێنەزان، بێ ئەمەگ.

**بیموجب:** بێهۆ.

**بی مورد:** بێجێ، نابەجێ، بێ مانا، بێ واتە.

**بی‌موقع:** بێگاڤ، بێوەخت، ناوەخت.

**بیمە:** بیمە، دابین، سیگۆرتە. "**بیمە اتكایی**": بیمەیەك كە بیمەكەر بەشێك لە دەرۆستەكانی خۆی رادەگوێزێتە شیركەتێكی بیمەی تر. "**بیمە بیكاری**": بیمەیەك كە لەودا بیمەكەر دەرووەست دەبێ كە كاتی بێكاری كەسی بیمەكراو پشتیوانی لێبكا. "**بیمە خویش فرما**": بیمەی خۆویستانە. "**بیمەگذار**": كەسێك كە خۆی یان سەرمایەكەی بیمە دەكا.

**بی‌مهرگان:** بێبڕبڕەكان، بێمۆرەكان، بێ مۆرتخەكان، ئەو زیندەوەرانەی كە مازەپشت و پێشەبەندییان نیە.

**بین:** نێوان، بەین، ناوەڕاست، ناڤین. "**در این بین**": لەم كاتەدا.

**بینا:** چاوتیژ، زۆربین، بینەر، دیتۆخ، چاوساغ، وینا، بینا.

**بیناانسانی:** نێوان مرۆڤی.

**بینابین:** میانەڕۆ. نێونجی، ناونجی.

**بینادل:** هوشیار و زیرەك، دڵئاگا، ویژدان روون.

**بین المجالس:** لە پێوەندی لەگەڵ پارلمانەكانی یاسادانانی ولاتان.

**بین المدارین:** نێوان هەر دوو خولگە.

**بین المللی:** نێونەتەوەیی، ناڤنەتەوەیی، ناڤنەژادی.

**بین النهرین:** میزۆپۆتامیا، دووچۆمان، دوروە، زەوینی نێوان دوو چۆمان.

**بی‌نام:** بێنێو، بێناو، گومناو، كەس نەناس.

**بینامتنی:** نێوان دەقی.

**بینامتنیّت:** نێوان دەقێتی.

**بی ناموس:** داوێن پیس، داوێن تەڕ، بێ ئابڕوو.

**بینـایی:** بینـایی، بینـاهی، وینـایی، سۆ، سۆما، سۆمایی، ڕۆشـنی چـاو، هەتـەر، چاوساغی.
**بێنبین:** بڕوانە:"بینابین".
**بێنتیجە:** بێئاکام، بێئەنجام.
**بێنراهی:** ناوڕێیی.
**بینش:** 1) ڕوانگـە، بۆچـوون، تێڕوانین. 2) بینـایی، بینەربوون، بەرچاوڕوونی. 3) دیتن. 4) چاو.
**بـێنشان:** بـێ نیشانە، بـێ سەروشوێن، شرت و گوم، ون. شاراوە، نهێنی.
**بینش پـذیر:** هەست پێکراو.
**بینشگر:** بڕوانە:"فهیم".
**بێنصیب:** تەریك، دوورەپـەرێز. بـێبـەش، بێپار.
**بێنظر:** بێمەبەست. نەزان.
**بێنظیر:** بێچوون، بێوێنە، کـەموێنـە، بـێ هاوتا، کەلە، تاقانە، یەکە.
**بێنمك:** بێخوێ. و بریتی لە کەسێك کە ڕواڵـەت و کـردار و هەڵـسوکەوتی دڵگـیر نەبێ. سپڵە، سفڵە.
**بێنمود:** پووتەکە، نابووت، ناجەستە.
**بینندگی:** بینەری، بینەربوون، بینایی.
**بیننده:** بینەر، بینا، تماشاکەر، تماشاڤان، نهێڕتۆخ.
**بێننگ:** بڕوانە: "بیعار".
**بینـوا:** ڕووت و نـەدار، ڕووت و ڕەجـاڵ، بێچارەونەدار، هـەژارو بێچارە، بـێپـەنا، بێپەناو بێکـەس، مـاڵ بـەکۆڵ، بـێمـاڵ و حـاڵ، بـێجـێوڕێ، بـێتوتـە، بـێئـەنوا، ڕەجـەن، ڕەواڵ، بەلـەنگاز، بلـەنگاز، بەسـتەزمان، نـەتێر، بێدەر، بابەدەست، بـرەش، زوار، پـەژۆم، زیڤـار، لامیـسك، لیتەك، کاسۆ، ناك، نسك.
**بینونت:** جیاوازی، جیایی.
**بیّنـە:** (بَ.نَ) بەڵگـە، بەڵگـەی ڕوون و ئاشکرا.
**بـێنهایـت:** بێداوی، بـێکۆتـایی، بێنـا، تاسـەر، هـەرماو، لـەبڕان بـەدوور، لەدوانەهاتو، لە بڕان نەهاتوو.
**بێنیـاز:** بـێنیـاز، کاربەکـەس نـا، تێـر و تەسەل، چاڤ تێر، بوودە.
**بێ نیازی:** بڕوانە: "استغنا".
**بینی کردن:** خۆبینیکردن، فیز و دەعیەکردن.
**بێوارە:** غەوارە، بێکـەس، تـەنیا، بێچارە، دامـاو، بێگانـە، نـەناس. دەردەدار، نەخۆش. نائاسایی.
**بێواسطـە:** ڕاستەو خۆ.
**بیوباریدن:** بڕوانە: "اوباریدن".
**بیوپسی:** بڕوانە: "بافت برداری".
**بیوپیـك:** فیلمـی ژیاننامـەیی، فیلمـی زیندەوەرنامەیی.
**بێ وجود:** پەست، نزم، ناکەس، خوێڕی.
**بیوسان:** بڕوانە:"منتظر".
**بیوسـیدن:** هیواداربـوون، چـاوەڕوانی، تەماکردن. بە مانای زمان لووسیش دێ.





**بیوشـیمی:** توێژینـەوەی کیمیـایی تـان و پۆیـە زینـدووەکان، لێکۆڵینـەوە و لێکدانـەوەی ئەنـدامانی گیانلەبـەران لـە باری کیمیاییەوە.
**بێوفـا:** بـێئەمـەگ، پـێنـەزان، سـپڵە، بەڵێن شکێن.
**بێوقفە:** بێوچان، بێپسانەوە، نەپساوە، بـێڕاوەسـتان، پەیتاپـەیتا، لەسـەریەك، بەردەوام، گەنم گردی.
**بیوك:** گەورە، مەزن.
**بیـوگراف:** کەسـێك کـە بەسـەرهات و چـلۆنایەتی ژیـانی کەسـێکی دیکـە دەنووسێ، بەسەرهات نووس.
**بیـوگرافی:** ژیاننامـە نووسـی، بەسـەرهات نووسی.
**بیولوژی:** زیندەوەرناسی، زیندەوەرزانی.
**بیولوژیست:** زیندەوەرناس.
**بیولوژیـك:** لـە پێوەنـدی لـە گـەڵ زیندەوەرناسیدا، زیندەوەرناسانە.
**بیوند:** خیانەت، ناهەقی، فریو.
**بیونیـك:** بـان/ ژوور مرۆڤـ(لـە هێـز و خێرایی و هتددا).
**بـێهـدف گـشتن:** خولانـەوە، گـەڕانی بـە خۆڕایی.
**بیهدە:** بڕوانە: "بیهودە".
**بیهمال:** بڕوانە: "بیهمتا".
**بێهمتـا:** بێوێنـە، بـێهاوتـا، بـێهـەواڵ، بیهـەمپا، تاقانـە، نەهـەم هەڤـ، کـەتۆ، تەها، یەکە.
**بێهنگام:** بڕوانە: "بی موقع".
**بی هوا:** کتوپڕ، لە نکاو، ناخافڵ.
**بیهودگی:** بێهۆدەیی، بێهوودەبوون.
**بیهودە:** خۆڕایی، لەخۆڕا، فیڕۆ، بێفایـدە، هیچ و پووچ، بێهوودە، بێداوی، کـاری بـێ بـەهرە، بـێنـرخ، حـاش، خـت، خـوت، هەوانتە. بێمانا.
**بیهودەکـار:** کـاری بێهـوودە و هیـچەکە و پووچەکە.
**بیهودەگو:** بڕوانە: "یاوەگو".
**بیهوش:** کەم زەین، کەم فام، بێهـۆش، دڵ بووراو.
**بیهوش شدن:** لـەهۆش چـوون، بوورانـەوە، دڵ بوورینـەوە، بووردنـەوە، بێهـۆش کـەوتن، بێهـۆش بـوون، لەسەرخۆچـوون، بێئاگاکەوتن، دڵ لە خۆوەبوون، دڵڕۆین، لەپڕین، بێتار.
**بیهوشـانە:** لـەحاڵی بێهۆشـیدا، بێهـۆش ئاسا، وەك بێهۆشەکان. دەوای بێهۆشی.
**بیهوش دارو:** دەرمانی بێهۆشی.
**بیهوش گر:** پسپۆڕی بێهۆش کردن.
**بیهویت:** لەخۆنامۆ، خۆدۆڕاو. بێناسنامە.
**بیهیچ چـون و چـرا:** بـە بـێ هـیچ پـەلپ و بیانوویەك.
**بییاروجفت:** بێکەس و بێپەنا. بێهاوتـا، بێچوون. تەنیا.
**بی ینال:** دوو ساڵانە.



**پا از جایی کشیدن:** نەچوونە ئەوێ، تەرك کردنی ئەو شوێنە، پێکێشانەوە لەو جێیە.

**پا از سر نشناختن:** بە تامەزرۆییەوە بەرەو مەبەست چوون، سەر پێوە نەبوون.

**پاافتادن:** 1) مەیسەربوون، دەست دانی هەلی باش. 2) پێشهاتنی رووداوێکی خۆش یان ناخۆش.

**پا(ی)افشان:** لە حالّی سەمادا.

**پاانداختن:** 1) لووشکە خستن. 2) پەنابردنە بەر ناوبژیوان.

**پاانداز:** 1) دەویت، قورمساغ. 2) قەوالّە. 3) پادەری. 4) میوانی.

**پا باز(وا) کردن:** پێگرتن، کەوتنەڕێ.

**پا(ی) بازی:** هەلّپەرکێ، سەما. تەردەستی، کەلّەکبازی.

**پاپاکردن:** ئەم دەستەودەست کردن، ساوەساوکردن، نەرمی نواندن، دڕدۆنگ بوون و گنخاندن لە کارێك دا، خۆهێنان و بردن.

**پابدامن کشیدن:** کونج نشینی، دوورەپەرێزی، سەبرکردن، رازی بوون.

**پابرجا:** راوەستاو، پایەدار، پتەو، قایم، جێگیر، نەگۆڕ.

**پابرجابودن:** پتەوو راوەستاوبوون.

**پابرجاشدن:** جێگیربوون، سەقامگیربوون.

**پابرجاکردن:** پتەوکردن، جێگیرکردن، پایەدارکردن.

**پابرچین:** بڕوانە: "پاورچین".

**پابرداشتن برای کسی:** کارکردن بۆ وی.

**پابرکاب:** ئامادەی سواربوون و وەرێکەوتن.

**پابرهنە:** 1) پێخواس، پێخاوس، خواس، پاخراو، پاپەتی، پێپەتی، پاوڕاو، بێپێلاّو، پاخروە.2) بریتی لە نەدارو هەژار.

**پابریدە بودن:** تەرکی هاتوچۆ کردن.

**پا(ی)بست:** 1) دەربەست، گرفتار، پابەستراو، پابەند، پێبەند، هۆگری بە کار یان شتێك.2) دۆغاو.

**پا بسن گذاشتن:** چوونەسەری تەمەن، پیربوون.





**پا بماه:** ژن لە دوایین مانگی دووگیانی دا، مانگی خۆ، پێومانگ.

**پا(ی)بند:** 1) ئەو ئالّقەو زنجیرەی کە دەست و پێی چوارپێ یان زیندانی پێدەبەستنەوە، پاوەن. 2) گرفتار، پابەند، پێبەند، ئیلاقەدار، بەستراوە بە شتێ.

**پاندان:** بڕوانە:"تضمین".

**پابند بریدە:** 1) هەوسار پچڕاو. 2) بڕوانە: "لاابالی".

**پا(ی) بند شدن:** ئەسیر یان گرفتار بوون. مانەوە لە شوێنێك و نیشتەجێبوون.

**پا(ی) بندی:** پێبەندی، پابەندبوون، دەرۆست و بەرپرسێتی. زەحمەت و ژانەسەر و گرفتاری. هۆگری، بەستراوەیی.

**پابوس:** 1) پابۆس، ماچ کردنی لاقی کەسێك.2) بریتی لە چوونە دیداری کەسێکی گەورە.

**پابە پا:** هەنگاوبەهەنگاو.

**پابە پاشدن:** بریتی لە بێئۆقرەبوون، هەدانەدان. درەنگ کردن.

**پابە پای:** پێبەپێی، هاوڕێ دەگەلّ ئەو.

**پا بە جهان گذاشتن:** لەدایکبوون، بەدنیا هاتن.

**پا بە رکاب:** ئامادەی سەفەر و رۆیشتن. تیژتێپەڕ، نابەردەوام.

**پابەزا:** بڕوانە:"پابماە".

**پابەمیان آوردن:** دەست تێوەرنەدان، نێونجیکردن.

**پاپ:** پێشەوای قەشەکانی مەسیحی کاتۆلیك کە ناوەندەکەی لە واتیکانە، پاپا.

**پا پاسی:** بڕوانە: "پشیز".

**پا پتی:** نەدار، رووتە، رووتەلّ، رووت و رەجالّ، پێخاوس، پێپەتی، بێپێلاّو.

**پا پس کشیدن:** هاتنەقەراغ، کشانەوە، خۆکێشانەوە، خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێك.

**پا پوش دوختن:** بریتی لە پیلان و پەروەندە دروس کردن بۆ کەسێك، قسەدەرهێنان، بوختان بۆ کردن.

**پا پی:** (پَ) پێڕەو، بەدوای.

**پا پی بودن:** بەدوای کارێکەوەبوون، پێداگرتن لەمەڕ بابەت یان کارێك دا.

**پا پیچ برای کسی ساختن:** پیلانگێڕان بۆ ئەو.

**پا پیچ کسی شدن:** موزاحیمی وی بوون، لەکۆلّ نەبوونەوە.

**پا پی شدن:** بەدوای کارێك دا چوون، پێداگرتن، شێلگیربوون، لەسەرچوون، دەوس دەچوون. ناڕەحەت کردن، ئازاردان، موزاحیم بوون.

**پا پیش گذاشتن:** هەنگاونان بۆ کارێ، دەسپێشخەری کردن.

**پا پیون کردن:** فرە ترسان.

**پاتابە:** پێڵاو، پێتاو، پێتاوە، پێپۆش، پاتاوە، کاڵەوزەنگاڵ.

**پاترس رفتن:** ترساندن.

**پاتریارکال:** (کۆمەڵناسی) باوک سالاری، باوک سەرداری.

**پاتوبیولوژی:** خەسارناسی.

**پاتوژن:** نەخۆشیزا، ئەو هۆکارەی کە دەبێتە هۆی نەخۆش کەوتن.

**پاتولوژی:** (پزیشکی) نەخۆشی زانی، نەخۆشی ناسی.

**پاتوق:** پاتۆق، پاتۆخ، قەلەمندارە، قۆمرغانە، کۆمرغانە، شوێنی کۆم بوونەوە و یەکتر دیتنی دۆست و ناسیاو.

**پا توی (در) رکاب کردن:** سواری ئەسب بوون.

**پاتی کردن:** شەن کردن.

**پاتیل شدن:** بە خاتری مەستی لەپێکەوتن، زۆر مەست بوون.

**پاتیل کسی دررفتن:** بێهێزبوون و لەکارکەوتن.

**پا جا(ی) پای کسی گذاشتن:** بریتی لە پێڕەوی کردن لێی.

**پاچاندن:** پرژاندن، پرژوبڵاو کردن، بڵاوەپێکردن.

**پاچراغ:** پاچرا، پێچرا، پێچکی لە دار یان لە قوڕ بۆ قوتیلکە چرا.

**پاچنگ:** دەلاقە، رۆژەن، رۆژن، رۆژنە، رۆچن، رۆچنە، قەڵشتی دیوار.

**پاچەگرفتن:** تووڕەبوون و بەگژاچوون، قولاپەگرتن.

**پاچیدن:** بڕوانە: "پاشیدن".

**پاخور:** قایم و پتەو، لە پسان بەدوور.

**پاخوردن:** 1) راخستنی قاڵیو قاڵیچە تا بە سەریدا ئاموشۆ بکەن.2) بریتی لە هەڵخەڵەتان و فریوخواردن. 3) زیان دیتن.

**پاد:** 1) دژ، دژبەر.2) نگابانی.3) نگابان. 4) تەخت.

**پادادن:** رەخسانی هەلی لەبار، هەڵکەوتنی دەرفەتی لەبار بۆ کەسێك بۆ وەی بەهرەی لێ وەرگرێ، بەهێزکردن و پشتیوانی کردن لە کەسێك.

**پادار:** بڕوانە: "پایدار".

**پادارشدن:** جێگیربوون، سەقامگیربوون، ب جێ بوون، قایم بوون.

**پادارکردن:** جێگیرکردن، سەقامگیرکردن.

**پادارکش:** تێلا/ گۆپاڵ بەدەست.

**پاداری:** بڕوانە: "پایداری".

**پاداش:** پاداشت، پاداش، مز، کرێ، دەست خۆشانە، رێزانە، خەلات، تۆڵەی چاکە. سزا.

**پاداشت:** بڕوانە: "پاداش".

**پادافراه:** بڕوانە: "بادافراه".

**پادام:** 1) تەڵە، داو. 2) هەرجۆرە فێڵ و تەڵەکەیەك کە بۆ فریودانی کەسێك ئەنجام دەدرێ.

**پاد اوج:** دژەتەشق، داکەوتن.

**پاد پرتابە:** دژەمووشەك.

**پادتن:** بڕوانە:"آنتی بادی".

**پادرآوردن – از:** کوشتن.

**پادرازی:** دەست درێژی، پڕکێشی، پەلکێشی، تێپەڕاندن.

**پادراهە:** پاسداری رێگە.





**پادرجا:** بڕوانە: "پابرجا".

**پادرختی:** پاداری، باڕن، باوەڕێن، میوەیەك کە با وەراندبێتی.

**پادرگل:** بریتی لە کەسی گرفتار و داماو و شەرمەزار، بەقوڕداچوو، لە قوڕ دا چەقیو.

**پادرم:** رەعیەت، رایەت، مسکێن.

**پادرمیانی:** ناوبژیوانی.

**پادرهوا:** بریتی لە لەرزۆك و بێبناغە، سەرلێشێواو، یان قسەی گەزاف و بێبنەما. "**پا درهوا ماندن**": بڕوانە: "بلاتکلیف".

**پادریم:** دژەگەن.

**پادزهر:** ژاربڕ، ژاربەر، دژەژەهر.

**پادزی/ پادزیست:** ئانتیبیۆتیك.

**پادساعت گرد:** تایبەتمەندی ئەوەی کە بە پێچەوانەی ژمێرەرەکانی کاتژمێر دەسووڕێ.

**پادسوهش:** بێزاری، جاڕزی.

**پادش:** بڕوانە:"تناقض".

**پادشاه:** 1) شا، پاشا. 2) خاوەن دەسەڵات. 3) خوا.

**پادشاهی:** 1) پاشایەتی. 2) دەسەڵاتدارەتی. باشترین دۆخی شیاو بۆ کەسێك. 4) قەڵەمڕەوی پاشایەتی. 5) باڵادەستی، زاڵێتی.

**پادگر:** ناتەبا، دژ.

**پادگری:** دژایەتی، دژێتی.

**پادگن:** بڕوانە:"آنتی ژن".

**پادگویی:** بەدرۆخستنەوە، حاشاکردن.

**پادو:** بەردەست، کەسێ لە بەر دەستایە و خزمەتی کەسێك دەکا.

**پادوان:** راکەر.

**پادهستەای:** دژەناوەکی.

**پادیکردن:** دژایەتیکردن.

**پاراالمپیك:** ئولەمپیکی کەم ئەندامان.

**پا را توی یك کفش کردن:** بریتی لە پێداگرتن، شێلگیر بوون. پێخستنە کەوشێکەوە.

**پارادایم:** سەرچەشن، نموونە، پارادایم.

**پارادوکس:** دژوازی، پارادۆکس.

**پارادوکس طنزآمیز:** دژوازیی تەوساوی.

**پارادوکسیکال:** دژواز، پارادۆکسیکال.

**پارازیت:** 1) مشەخۆر، مفتەخۆر، گیاندارێك کە لە نێو لەشی گیاندارێکی دیکەدا دەژی و خۆراکی خۆی لە لەشی ئەو وەدەست دەخا. 2) شەپۆلی شێوێنەری ئیزگەی رادیۆ. 3) تەوس، توانج.

**پارازیت اندازی:** پارازیت خستنە سەر، شێواندنی شەپۆلی رادیۆیی بە هاویشتنی شەپۆلێکی دیکە وەها کە باش نەبیسترێ و خشەی بێ.

**پارازیتولوژی:** مشەخۆرناسی، پارازیتۆلۆژی.

**پاراف:** فۆڕمی کورتەوەبووی واژۆ.

**پا را کج گذاشتن:** بریتی لەکاری ناحەز و ناپەسند کردن.

**پاراگراف:** بەند، پاژ، پاراگراف.

**پارالاکس:** جیاوازی روانگە.

**پارالل:** هاوتەریب، هێڵی هاوتەریب.

**پارالمپیك:** بڕوانە:"پاراالمپیك".

**پارامتر:** پاڕامێتر، هەر کام لەو هۆکارانەی کە لە سەر چۆنیەتی ئەنجامی کارێك کاریگەرییان هەیە.

**پارانویا:** (پزیشکی) جۆرێك تێکچوونی دەروونی کە تایبەتمەندییەکەی وەهمی لەژێر ئازاردابوون و خۆبە زل زانییە. 2) (دەروونناسی) بێمتمانەیی زۆر و بێ هۆ سەبارەت بە دیتران.

**پارانوئید:** (پزیشکی) تووشبوو بە نەخۆشی پارانویا.

**پارتی:** 1) بەش، پاژ، دەستە، گروپ. 2) کۆمەڵە و تەشکیلاتی تاقمێکی هاوبیر و بڕوا کە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکانیان پێك دێنن، حیزب. 3) لایەنگر، پاڵپشت. 4) میوانی بە مووسیقا و هەڵپەڕکێوە. "**پارتی دادن**": رێکخستن و بەڕێوەبردنی میوانی.

**پارتی بازی:** کەس کەسانێ، واسیتەکاری، تکا و کار پێکهێنان بۆ خزم و ناسیاو.

**پارتیزان:** لایەنگر، هەوادار، پێشمەرگە، پارتیزان، چریك.

**پاردم ساییده:** بریتی لە مرۆی رووهەڵماڵاو، زیرەك و کۆنەکار لە فێڵ و تەڵەکەدا.

**پاردن:** 1) بەخشین، لێبوردن، ژێخۆش بوون.2) ببورە.

**پارسا:** خۆپارێز، پاك داوێن، دژکام، تەرکەدنیا.

**پارسازن:** ژنی پاك داوێن.

**پارسال:** پارەکە، ساڵی پێشوو.

**پارسایی:** خۆپارێزی، پاك داوێنی.

**پارس کردن:** وەڕین، رەوین، حەپین، حەپەحەپ کردن، گەپین، گەفین.

**پارسە:** 1) سواڵ، دەرۆزە، خوازەڵۆکی. 2) کەیخودایی.

**پارفت:** هاتوچۆی بەردەوام کردن بۆ شوێنێ.

**پارگی:** دڕاوی، شڕولەتی، جێگەدڕاو.

**پارگین:** گەنداو، گەناو.

**پارلمان:** پارلمان، کۆڕی نوێنەرانی هەڵبژاردەی نەتەوە یان نەتەوەکان، ئەنجومەنی نیشتمانی.

**پارلمانتاریسم:** بنچینەکانی حکومەتی پارلمانی، سیستمی پارلمانی، سیستمێکی حکوومەتی کە دەسەڵاتی بەڕێوەبەری واتە سەرەك وەزیر و وەزیرەکانی بە زۆربەی دەنگی نوێنەرانی پارلمان هەڵدەبژێردرێن و هەرکاتێك کە پارلمان متمانە لە هەیئەتی دەوڵەت بستێنێتەوە سەرەك وەزیر دەبێ دەس لە کار بکێشێتەوە.

**پارلمانتر:** ئەندامی پارلمان، پارلمانی، دەپێوەندی دەگەڵ پارلمان دا، بە پێی رێوشوێنەکانی پارلمان.

**پارناسیسم:** قوتابخانەیەك لە ئەدەبیات ئوروپایدا کە لە سەدەی نۆزدەهەم دا هاتەئاراوە و لایەنگری تیۆری هونەر بۆ هونەر بوو.

**پارودی:** گاڵتە بەرهەم.





**پارو زدن:** سەوڵ لێدان، سەڵپ لێدان، قەفاندن.

**پاروکردن:** ماڵین، ماڵای، رادان، رامالین.

**پا روی دم کسی گذاشتن:** بریتی لە ئازاردان و هاندانی کەسێ بە مەبەستی تۆڵە لێکردنەوە. پێ لە کلکی کەسێك نان.

**پارە:** 1) پارچە، لەت، لەتە، پاژ، تیکە، پل، قنچك، پرتك، بڕ، قراش، کەرك، فەرژ، شەر.2) پینە.3) دڕاو، دڕیاگ، دادڕاو، چڕیاگ، دەڕسە، شەقار، فەتار. 4) بەرتیل. 5) دیاری.

**پارەبرزدن:** پینەلێدان.

**پارەپارە:** لەت لەت، لەت و پەت، لەت و کوت، لەتار، پاژپاژ، شەقارشەقار، بڕبڕ، پارچەپارچە، رێزەڕێزە، رێزاڵ رێزاڵ، ریزاڵ ریزاڵ، ریشاڵ ریشاڵ، قراش قراش، شەت و پەت، پچڕپچڕ، لەتار، شڕ، کەرکەر.

**پارەجگر:** بەندی جگەر.

**پارەخط:** هێڵێ کە دووسەرەکەی دیار بێ.

**پارەخوار:** بەرتیل خۆر، بەرتیل گر.

**پارە دوختن:** پینەکردن.

**پارەدوز:** پینەچی.

**پارەدهندە:** بەرتیل دەر.

**پارەشدن:** پچڕین، پچڕیان، چڕیان، دڕان، دڕیان، دادڕان، لەت و کوت بوون، فەرژین، تلیشان، هەڵ زڕان، گەزخان.

**پارەکار:** خۆشەویستی شۆخ و شەنگ.

**پارەکردن:** پچڕاندن، چڕاندن، بزڕاندن، دڕانن، دڕاندن، دڕین، دڕون، دادڕان، دادڕین، هەڵدڕین، هەڵ زڕاندن، هەڵ زڕانن، فەرژاندن، فەکاندن، رنای، چڕاندن، قەتاندن، پساندن، لەت کردن، کەرکرن.

**پارەوقت:** نە تەواو وەخت، نیوەوەخت.

**پاریاب:** بەراو، زەوینی ئاوی.

**پاریدن:** هەڵفڕین، بازدان.

**پاریزە:** بڕوانە:"ذرّە".

**پارینە:** سەرەتایی.

**پارینەسال:** ساڵی رابردوو، پارەکە.

**پارینەسنگی:** چاخی کۆنە بەردینە/ کۆنینە بەرد، پالێئۆلیتیك.

**پازدن:** 1) فێڵ و تەڵەکە کردن لە حیساب دا، یان گزی و تەزویر لە حیساب و فاکتۆردا. 2) پێلێدان لە مەلە و بایسیکڵ سواری و هتد.

**پازند:** وەرگێڕاوی کتێبی زەند بە فارسی، لێکدانەوەی کتێبی زەند، خودی زەندیش لێکدانەوەی کتێبی ئەوێستایە.

**پازنگ:** بڕوانە: "پاژنگ".

**پا(ی)زهر:** بڕوانە: "پادزهر".

**پازهری:** کەسکی ئاماڵ رەش.

**پاژخ:** ئازار، ماڵشت، خستنە ژێر پێ.

**پاژنگ:** 1) دەلاقە، رۆچنە. 2) بە واتای پێڵاویش هاتوە.

**پاس:** 1) نگابانی، کێشک، ئێشک. 2) ئاگاڵ بوون، ئاگاداری، پارازتن. 3) حورمەت، رێز.4) لەت، پاژ. 5) بەشێك لە شەو یان رۆژ. 6) تێپەڕین، پێشڕەوی کردن بەرەو لای غەنیم. 7) تەنگەلانی شیاوی پاپۆڕ لێخوڕین. 8) لە تۆپی پێدا رەت کردن و گەیاندنی تۆپ بە یەکێك لە کەسانی هاودەستەی خۆت، پاس دان. 9) پاسپۆرت.

**پاسار:** لەقە، پێخوس.

**پاسارکردن:** پێشێل کردن، خستنە ژێر پێ، بن پێکرن، پێپەست کرن.

**پاسبان:** نگابان، پاسەبان، پاسەوان، ئاژان، ئێشکگر، پاسگر، پارێزەر.

**پاسبانی:** نگابانی، ئێشك گرتن، پارازتن، پاراستن.

**پاسبز:** 1) بریتی لە پاوشك و بێفەڕ. 2) بە مانای دەلاڵ و نێوبژیکەریش دێ.

**پاسبك:** 1) خۆش قەدەم، پێوقەدەم موبارەك. 2) جلف، بلّح، قرت.

**پا سبك کردن:** زایین، بێچووهێنان.

**پاسپار:** پێخوست، ژێر پێ خراو.

**پاسپر:** بڕوانە: "پاسپار".

**پاسپورت:** تەزکەرە، تەسکەرە، مۆڵەت نامەی سەفەر، پسولەی رێگەدان بۆ سەفەر، بەلگەی و پێناسی هاتووچۆ لە ولاتێك بۆ ولاتانی دیکە، پاسپۆرت، پاساپۆرت.

**پاسخ:** وەلام، ولام، وەرام، واوێژ، سڤ، پەرسڤ، بەرپەرچ، جواب، جواو، جوال، پاژوخ، پاگۆ، بەرانبەری پرسیار.

**پاسخانه :** شوێنی ئیشك گر.

**پاسخ خواستن:** بڕوانە: "استجابت".

**پاسخ شفاهی:** لێڤکی، ولامی زارەکی.

**پاسخ عجولانه :** گورگاور.

**پاسخ کتبی:** نڤیسکی، وەرامی بەنووسین.

**پاسخ گزار:** ولامدەر، جواب دەر، بەرسڤدەر، بەرپرسیار.

**پاسخ گو:** بڕوانە: "پاسخ گزار".

**پاسخ گویی:** ولامدانەوە، جواب دانەوە، جواودان، پەرسڤ وەدان، بەرپەرچ دانەوە.

**پاسخنامه :** ولامنامە، جوابنامە.

**پاسدار:** پارێزەر، بازگر، پازگر، پاسگر، پاسدەر، نۆبەچی، نۆبەدار، نۆگەچی، نیگابان، ئیشك گر، کێشکچی، جەزایرچی، جەزایەرچی، نۆترڤان. "**پاسداران ارتجاع**": پارێزەرانی کۆنەپەرستی.

**پاسداری:** ئیشك گرتن، کێشك کێشان، کێشك گرتن، واسەگرتن، پارێزەری، ئاگاداری، چاوەدێری، پاسگری.

**پاس دادن:** 1) کێشکدان، نگابانیدان. 2) (لە تۆپی پێدا) پاس دان. 3) نۆبە دان بە خەنیم لە کایەی وەرەقبازیدا. 4) ناردن یان رەت کردنی کەسێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی.





**پاس داشتن:** 1) چاودێریکردن، کێشك کێشان، پاراستن.2) رێزگرتن، بەرزنرخاندن.

**پاسداشتگر:** پارێزەر.

**پا سست کردن:** شك و گومان کردن.

**پاسك:** بڕوانە: "خمیازە".

**پاس کردن:** پاس کردن، تێپەڕاندن. رەت کردن و پاڵ پێوەنانی شتێ بۆ لای کەسێك یان دانی شتێ بە کەسێك.

**پاسگان:** گارد.

**پاسگاه:** زالگە، پاسگە.

**پاسگزار:** بڕوانە: "شاکر".

**پاسنگین:** بڕوانە:"بدقدم".

**پاسوخته:** 1) تامەزرۆ، تاسەمەند. 2) ئاشق، دلّدار.

**پاسوختەشدن:** ئاشق و شەیدا بوون.

**پاسور:** ولامدەر، بەرپرس.

**پاسوز:** 1) دلّدار، ئەوینندار. 2) تایبەتمەندی کەسێ کە خۆشبەختی خۆی فیدای خۆشبەختی و خۆش بژیوی کەسێکی دی بکا.

**پاسوز کسی شدن:** زیان دیتن بەهۆی خۆشبەختی کەسێکەوە.

**پاسیدن:** پاراستن، چاودێریکردن. دەست پێداهێنان.

**پاسی فیسم:** ئاشتیخوازی، هێمنایخوازی، دژایەتی دەگەڵ شەڕ.

**پاسیفیك:** ئاشتیخواز، هێمنایخواز.

**پاسیو:** بێکەلك، پاسیڤ.

**پاشان:** لە حالّی پژاندندا.

**پاشاندن:** پژاندن، پرژاندن، بلاوکردن.

**پاش پاش شدن:** هەلوەشان، پارچە پارچەبوون.

**پاشدن:** 1) هەستان، بەرزەوەبوون. 2) لەخەو هەستان. 3) خۆشبوونەوە، خاسەوەبوون.

**پاشش:** کردەی پژاندن.

**پاشگونه:** بڕوانە:"واژگونە".

**پاشنده:** پرژێنەر، بەلاڤکەر، وەشێنەر، وەشێن.

**پاشیدگی:** بڕوانە: "پراکندگی".

**پاشیدن:** پرژاندن، پژانن، پژاندن، وەشاندن، وەشانن، رژانن، رژاندن، رشاندن، رەشاندن، رەقشاندن، فیشاندن، فیشانن، داپژاندن، بلاوکردن. "**درهم پاشیدن**": لێك هەلوەشان، لەبەریەك بلاوبوون، لێك ترازان.

**پاشیدنی:** شیاوی پژانن، شایانی وەشاندن.

**پاشیده:** رژاو، پژاو، وەشاو، وەشاندی، وەشیاو، بلاوکراو، شاندی.

**پافشار:** پێداگر، شێلگیر، شێتگیر، شێرگیر، پیچەقێن، مکوڕ، سوور لە سەر مەبەست.

**پافشاری:** پێداگری، شێلگیری، پێ چەقاندن، میچلە، چیڕی و گیڕی، مکوڕی، سووری، خۆڕاگری، راوەستاوی، پایەداری، بەرەنگاری.

**پافشردن:** پێداگرتن، شێلگیربوون، جەخت کردن، لە سەر رۆیشتن، پایەداریکردن، راوەستان.

**پاك:** 1) پاك، خاوێن، پاقژ، پاکژ، بێگەرد، پوار. 2) دوور لە خراپە و گوناە. 3) بێ کەموکورتی. 4) رۆشن، روونـاك. 5) حەڵاڵ زادە. 6) بە گشتی، بە یەکجاری.

**پاکار:** شاگرد وەستا، بەردەست، خولامی هەمیشە ئامادە، گزیر، کزیر، پاکار.

**پاك اصل:** رەسەن، ئەسڵ زادە.

**پاك اندرون:** دەروون پاك، نیاز پاك، نیازخاوێن، دڵ پاك.

**پاك اندیش:** هزرپاك، بیرخاوێن.

**پاك باختن:** بە تەواوی دانان، دۆڕاندنی هەموو شتێك، لە دەس دانی هەموو شتێك.

**پاك باختە:** تەواو دۆڕاو، هەموو شت لە دەس داو. تایبەتمەندیی کەسێك کە هەموو شتێکی لە پێناو گەیشتن بە ئامانجێك بە تەواوی لە دەست دابێ.

**پاکباز:** 1) تەواو دۆڕاو، کەسێك کە تەواوی داراییەکەی لە قومار دا دانابێ. 2) ئەویندارى راستگۆ، کەسێ کە بە پاکی بروانێتە دڵبەرەکەی، کەسی ئازادو سەربەست و تەرکە دنیا.

**پاکبازی:** 1) بە تەواوەتی دۆڕانن لە قوماردا، دانانی هەموو شتێ لە پێناو ئەویندارییدا. 2) رزگاری، ئازادی، لەخۆبوردوویی.

**پاکبوم:** نیشتمانی پاك، خاکی پاقژ، زەویی پیرۆز.

**پاك بین:** پاك بین، گەشبین سەبارەت بە چاکێتی و راست کرداری خەڵك، دوودڵ نەبوون.

**پاك پیوند:** رەسەن، پاك نەژاد.

**پاك تن:** 1) لەش خاوێن.2) خۆپارێز، پارێزکار، داوێن پاك، نەجیب و رەسەن.

**پاك جامە:** بریتی لە خۆپارێز و داوێن پاك.

**پاك جان:** دەروون پاك.

**پا کج گذاشتن:** کلابوون لە رێگەی راست و ئەنجامدانی کاری نارەوا، پێ بە خواری دانان.

**پاك جیب:** داوێن پاك، خۆپارێز.

**پاك چشم:** ئەوەی کە بە هەوەسەوە نەڕوانێتە نامەحرەم، چاودەروێش، کەسێك چاوحیز نەبێ.

**پاك چهر:** جوان، دەلال، قەشەنگ، جوان چاك، خوشیك، روخساری پاقژ و رۆشن، رووگەش، رووپاك، بەدەڤ.

**پاك خو:** خۆش خولق، خدە پەسند، خۆشخوو.

**پاك خواندن:** بە پاکی ستایش کردن.

**پاك داد:** دادپەروەر، دادگەر.

**پاك دامن:** بریتی لە داوێن پاك، دامێن پاك، هێمۆ، هێمێ، خۆپارێز و نەجیب، پاك پێسیر.

**پاك دامنی:** خۆپارێزی، پارێزکاری، داوێن پاکی، پاك پێسیری.

**پاك درون:** دەروون پاك.

**پاك دست:** دەست پاك، سەر راست دروسکار.





**پاك دل:** دڵ پاك، دڵ پاقژ، بێ فروفێڵ، راست و دروست، ساف، دوور لە رق و بوغز و گومان، هزرباش، هشپاك.

**پاك دیده:** بڕوانە: "پاك چشم".

**پاك دین:** ئایین پاك، راست ئایین، ئوول پاقژ.

**پاکرای:** بڕوانە: "پاك اندیش".

**پاکردن:** دەپێکردن، کردنەپا، پێ کرن.

**پاکرو:** (رَ)خۆپارێز، داوێن پاك، نەجیب، خۆش ئاکار، شێواز باش.

**پاکرو:** (رُ) بڕوانە: "پاك چهر".

**پاکروان:** دڵ و دەروون پاك، نەفس پاك، رۆح پاك، نییەت پاکژ.

**پاك روز:** رۆژی روون، رۆژگەش.

**پاکزاد:** پاك نەژاد، حەڵاڵ زایە/ زادە، بنەچەدار، رەسەن، نەجیب، جسن.

**پاك زبان:** زمانپاك، راستگۆ، جنێونەدەر.

**پاك زن:** ژنی داوێن پاك.

**پاکسازی:** 1) پاکتاوکردن، سڕینەوە. 2) پاك کردنەوە، خاوێن کردنەوە. 3) دەرکردن یان خانەنشین کردنی کارمەند یان ئەندامێ کە لە روانگەی ئۆرگانە فەرمییەکانی دەوڵەتەوە سەلاحییەتی نیە.

**پاك سرشت:** سرشت پاك، دەروون پاك، ناخ پاقژ، رەسەن و نەجیب.

**پاك سیرت:** بەرەوشت، شێواز باش، خدەپەسند، خووخدە باش و پەسند.

**پاك شدن:** 1) خاوێن بوونەوە، لە پیسی پاك بوونەوە. 2) سڕینەوە، پابوونەوە، تەفرو توونابوون، فەوتان، لە ناو چوون. 3) لە زۆرەوانی‌دا: قەرەبووکردنەوەی شکستی پێشووی زۆرەوانێك. 4) بێ تاوان بوون، بێگوناە بوون.

**پاك طینت:** سرشت پاك، دەروون پاك، پاك رەوان.

**پاك فطرت:** بڕوانە: "پاك سرشت".

**پاك کردن:** 1) خاوێن کردنەوە، پاك کردنەوە، سڕین، ئەسترین،سپیکردنەوە، پێست لێکردنەوە، پوختەکردن، جیاکردنەوە، بژنین، بژاردن.2) سڕینەوە، تەفروتووناکردن.3) توێکڵ لێوەکردنی میوە و خواردەمەنی بەتێکوڵ.

**پاك گهر:** رەچەڵەك پاك، بنەچە پاك، رەسەن، نەجیب.

**پاك مغز:** هزرپاك، زیرەك، وریا.

**پاك منش:** رەوشت پاك، دەروون پاك، سرشت پاك.

**پاك نام:** خۆش نێو، خوش ناو.

**پاك نژاد:** بڕوانە: "پاکزاد".

**پاك نفس:** بڕوانە: "راستگو".

**پاك نهاد:** بڕوانە: "پاك طینت".

**پاکوب:** 1) ژێرپێخراو، بەر پێدراو، پێخوست کراو.2) سەماکەر.

**پاکوب کردن:** شێلان بە پا، خستنە ژێر پێ، پێخوست کردن، پێشێل کردن، پێلاقە لێدان.

**پاکوبیدن:** بڕوانە: "پاکوفتن".

**پاکوفتن:** سەماکردن، هەڵپەڕین، دیلان کردن، گۆڤەندگرتن.

**پاکوبان:** لە حاڵی سەما کردن دا.

**پاکوبندە:** سەماکەر، سەماکار، دیلان کەر.

**پاكوبى:** سەما، هەڵپەڕكێ، ديلان، گۆڤەند، وڕپڕاى.

**پاك و پوست كنده:** ڕەپ و ڕاست، ڕاست و ڕەوان، بێدەڕوايسى.

**پاكى جستن:** بڕوانە: "تطهر".

**پاكىخواستن:** بڕوانە: "استبراء".

**پاكيدن:** بڕوانە: "پاك كردن".

**پاكيزگى:** خاوێنى، پاكى، پاكژى، پاقژى، داوێن پاكى.

**پاكيزه:** پاقژ، پاكژ، پاك، خاوێن، قازاخ.

**پاكيزه بوم:** بڕوانە: "پاك تن".

**پاكى نژاد:** بڕوانە: "اصالت".

**پاگرد:** پێگۆڕكە، پێگۆڕكێ.

**پاگرفتن:** پتەوبوون، جێگيربوون، دامەزراندن، سەقامگيربوون، هێز و وزە گرتن، پێگرتن، سەرپێكەوتن، هەڵدان.

**پاگرفتن برف:** نيشتن و زۆر مانەوەى بەفر لە سەر زەوى.

**پاگرفتن كارى:** برەوسەندن.

**پاگير:** 1) ئەوەى كە پێ لێى گير دەكا، ئەوەى كە مرۆڤ پێى پابەندە. 2) دەست هەڵنەگر، لە كۆڵ نەبۆوە، مايەى ژانەسەر. 4) پابەند، دەربەست.

**پالا پال:** 1) گەڕان، كۆڵينەوە، پەيدۆزى و كۆڵينەوە لە نێوان شتە بڵاوو لێك ئاڵۆزەكان. 2) بە واتاى تێكەڵ پێكەڵى و شۆڕش و ئاژاوەش هاتوە.

**پالا دادن:** بڕوانە: "پالودن".

**پالاش:** ئالودەيى، پيس بوونى پا بە قوڕ و گڵ.

**پالان دوز:** كورتان دوروو.

**پالان كردن:** كورتان/ كۆپان كردن.

**پالانگر:** بڕوانە:"پالان دوز".

**پالانيدن:** 1) بڕوانە: "افشردن". 2) زۆر كردن، زيادكردن.

**پالاون:** بڕوانە: "پالونه".

**پالايش:** 1) (كيميا) پالاوتن. 2) نەرمكردنەوە ڕاكێشە غەريزييە قبووڵنەكراوەكان لە ڕوانگەى كۆمەڵەوە لە ڕاستايەكدا كە كۆمەڵگا پەسندى بكا. 3) بڕوانە:"تراوش". 4) بڕوانە:"والايش".

**پالايشگاه:** پاڵوێنەخانە، پالاوگە، پاڵێوگە.

**پالايشگر:** پاڵێو، پاڵێوەر، پالاوكەر، پاڵێوكەر، پاڵێنەر، پاڵوێنەر.

**پالاينده:** بڕوانە: "پالايشگر".

**پالايه:** فيلتێر.

**پالاييدن:** پالاوتن، پالافتن، پاڵێوران، بەپاڵوێنەداكردن، بە سافى داكردن، ساف كردنى تراو. "**پالاييده**": پالاوتە، پالاو، پالافتە، پاڵفتە، پاڵێوراو، بەپاڵوێنەداكراو.

**پالئوگرافى:** زانستى هێڵە قەديمييەكان، زانستى خوێندنەوەى هێڵە كۆنينەكان.

**پالئوليتيك:** بڕوانە: "پارينەسنگى".





**پالئونتولوژى:** فوسيل ناسى، دێرينەناسى، زانستى ئاسەوار و جێماوەى گياندارە قەديمييەكان.

**پالش:** پشكنين، گەڕان، كۆڵينەوە. پالاوتن.

**پالنده:** پاڵێو، كۆڵەر، پشكنەر، گەڕێن.

**پالودگى:** پاك و بێ فێڵ و كينە، خاوێنى، پاكژى، پاكيزەيى، دژى ئالوودەيى.

**پالودن:** بڕوانە: "پالاييدن".

**پالودنى:** شياوى پالاوتن.

**پالوده:** 1) پاك كراو، خاوێن كراو، پاقژكراو. 2) پالوودە.

**پالونه:** پاڵوێنە، پاڵوانە، پاڵێوكە، پاڵوێنكە، پالێن، پارزن، پارزنگ، پارزونگ، پارزون، پارگێن، ڕاوك، ڕاوەك، مۆخل، موخل، سافى، نەسل، سافۆ.

**پاليدن:** 1) كۆڵينەوە، گەڕان بە دواى شتێك دا .2) پالاوتن، چكانن، زنچكان، دارمان، دارووخان. 3) تەواوبوون، بە كۆتايى گەيشتن.

**پاليده:** پاڵێوراو، پالاوتە، پالاوتى، لە سافى دراو، سەپى، پشكێنراو، پشكنراو.

**پاليز:** پارێز، كيار، بێستان/ بێسانى تەڕەكاڵ.

**پاليزبان:** پارێزڤان، بێستانەوان، باخەوان.

**پامال:** پێخوس، پێخوست، پێڕێخراو، پاشێل، پێشێل، بەرپێدراو، پەست و زەليل كراو.

**پامال شدن:** بڕوانە: "پايمال شدن".

**پامال كردن:** بڕوانە: "پايمال كردن".

**پامرد:** بڕوانە: "پايمرد".

**پامزد:** بڕوانە: "پايمزد".

**پامس:** پابەند، گرفتار، دەستەوەستان، داماو.

**پان اسلاميسم:** تيۆرييەك لە سەر بنەماى يەكيەتى تەواوى موسوڵمانەكان.

**پا نگه داشتن:** بريتى لە سەبر كردن، وردەوەبوون.

**پانتوميم:** هێما، ئاماژە، شانۆيەك كە لەو دا ئەكتەرەكان تەنيا بە جووڵە مەبەستەكان دەردەبڕن.

**پانتەئيسم:** يەكبوونى بوون، بڕواى يەكبوونى بوون كە تەواوى بوونەوەرەكان بە "جيلوە"ى خودا دەزانێ، حيكمەتى ئيلهام وەرگرتن.

**پانتيزم:** ڕێبازى يەكيەتىبوونە، ئەم ڕێبازە يەزدان و سروشت دە گەڵ يەكدى جووت دەكا.

**پانسمان:** برين پێچى، برين پێچان.

**پانسيون:** ماڵ و شوێنێ بۆ ژيان و خواردن بە پارەيەكى دياريكراوى مانگانە، هاوماناى "شبانەروزى"يە.

**پانوراما:** (كۆ)ديمەن، بەرچەوەن، دوورنما، دوورنوێن، دوورەديمەن، پانۆراما.

**پانوراميك:** بەرچەوەنى، دوورنوێنى.

**پانوشت:** پەڕاوێز. ژێرنووس.

**پانویس:** بڕوانە:"پانوشت".
**پا نهادن:** 1) هەنگاونان، چوون. 2) دەس پێکردن.
**پانهادە:** ئانتیتێز.
**پا واکشیدن:** دووری کردن.
**پاورچـــین:** پاچـرکێ، پێـدزکێ، بـزدم، چوونەجەسـه، خـشکێ، پاپـارێزی، بەهێدی و بێچرپە ڕۆیشتن، بە سەری پەنجەو بێ هەست ڕۆیشتن، ڕۆیشتن بە ماتەماتە، قوونەخشکە، قەلزان، قەلزین.
**پاورچـین پاورچـین:** تەلەتەل، ماتەماتە، سەبرەسەبرەچوون.
**پاورقی:** 1) ژێرنووس. 2) چیرۆك و شتی وا کە لە چەند ژمارەی گۆڤار یان ڕۆژنامەیەکدا چاپ و بڵاودەبێتەوە. 3) هەر جۆر ڕۆمان یان چیرۆکێکی جەماوەر پەسند.
**پاوند:** بڕوانە: "پابند".
**پایآور:** بەهێز، توانا.
**پایـا:** خـۆڕاگر، نـەبڕی، بـەردەوام، درێژخایەن، نەمر، ڕاوەستاو، پاوەجێ، ڕوولەگەشە.
**پایـاب:** 1) بنی ئاو، بنی حەوز، بەشی تەسکایی ڕووبار و تاڵاو، ئەو بەشە لە بەستێنی ڕووبار کە کەمتر قووڵەو پێی دەگاتێ، شوێنی تەسکایی ڕەخی دەریا. 2) توانایی، تاقەت، هێزوتوان، خۆڕاگری. 3) قووڵایی.

**پایاب داشتن:** قووڵ بوون.
**پایا پـای:** سەربەسەر، سەرووەسەر، ئاڵوویری کاڵا بە کاڵا، مامەڵەی یەك بە یەك گۆڕینەوە.
**پـای افـزار:** پاڵا، پێلاو، پێتاو، کاڵەو کەوش و کەڵاش وهتد.
**پایـان:** ئاخر، دوماهی، دوایی، داڤی، کۆتایی، سەرەنجام، بڕانەوە، دوایی هەر شتێك.
**پایان بخش:** کۆتایی هێنەر، کۆتایی هێن.
**پایـان بخـشیدن:** کۆتایی پێ هێنان، تەواوکردن، دوایی هێنان، دوایی پێهێنان، ڤەبڕین، داکووژان، داکووژاندن.
**پایان بندی:** چۆنایەتی کۆتایی هێنان بە شتێ.
**پایان بین:** دوورنواڕ، دوور ڕوان، دوابین.
**پایان دادن:** بڕوانە: "پایان بخشیدن".
**پایانگر:** تەواوکەر، کامڵکەر.
**پایان گرفتن:** بەکۆتایی گەیشتن.
**پایـان ناپـذیـر:** بێکۆتایی، لەبڕان نەهاتوو، لەبن نەهاتوو، بێداڤی.
**پایـان نامـه:** نامیلکەی دوکتورا، تێز، نامیلکەیەك کە خوێندکاران دوای تەواوبوونی خوێندن لە ڕشتەکەی خۆیاندا دەینووسن.
**پایان نگر:** بڕوانە: "پایان بین".
**پایانە:** تێرمینال.





**پایـان یـافتن:** کۆتاییهاتن، کۆتاهاتن، کۆتابوون، تەواوبوون، دواییهاتن، خەلاس بوون، بڕانەوە، ب داڤیبوون.
**پایایی:** هەمیشەیی، دایمی.
**پایباف:** جۆڵا، بووزووتەن، شاڵباف.
**پای برداشتن:** هەڵاتن، دەرچوون.
**پای برنهادن:** بڕوانە: "متابعت کردن".
**پای بست:** بڕوانە: "پابست".
**پای بند:** بڕوانە: "پابند".
**پایتابه:** بڕوانە: "پاتابە".
**پایتخت:** پاتەخت، پایتەخت، پێتەخت، شاری ناوەندی.
**پای خست:** بڕوانە: "پامال".
**پایـدار:** ڕاوەستاو، بەردەوام، خۆڕاگر، سەقامگیر، جێگرتوو، پتەو، قایم، پاوەجێ، هەرماو، پایەدار، بەرخۆدەر.
**پایـداری:** ڕاوەستاوی، بەردەوامی، خۆڕاگری، پتەوی، هەرمان و خۆڕاگری.
**پایدام:** تەڵە، داو.
**پای زهر:** بڕوانە:"پادزهر".
**پایستگی:** بڕوانە:"استمرار".
**پایستن:** چاوەدێری کردن، ئاگالێبوون. بەردەوام بوون، دۆم درێژی، نەمری. "**پایسته**": خۆڕاگر، جێقایم، پایەدار، بێپسانەوە.
**پایش:** بڕوانە:"حفاظت".
**پـایشگـر:** 1) پارێزەر. 2) پابەند. 3) تێبین، دووڕوان.

**پایکار:** بڕوانە: "پاکار".
**پایکوبان:** بڕوانە: "پاکوبان".
**پایکوب کـردن:** شێلان بە پا، پێخوست کردن، خستنە ژێر پێ، خستنە بەر پێ، کوتانەوە.
**پایکوبی:** بڕوانە: "پاکوبی".
**پایگاه:** 1) پێگە، جێگە، شوێن، پلە. 2) درگا، دەرگە.
**پایگیر:** بڕوانە: "پاگیر".
**پایمال:** بڕوانە: "پامال".
**پایمال شدن:** پێشێل بوون، پێشێل کران، چوونەژێرپێ، خرانە ژێر پێ، بەر پێ دران.
**پایمـال کـردن:** پێشێل کردن، خستنەژێرپێ، پێ ڕێخستن، خستنەبەرپێ، پاپیاساوین.
**پایمان:** بڕوانە:"ثابت قدم".
**پـایمرد:** هاریکار، هاریکەر، ئالیکار، یارمەتیدەر. تکاکار. نێوبژیکەر.
**پـایمردی:** یارمەتی، هاریکاری، پێوەڕۆیشتن، دەس بەر نەدان لە مەبەست. نێوبژی، نێوبژە. تکاکردن، تکاکارێتی.
**پـایمزد:** کاڵەدڕانە، پاڵادڕانە، کراپا، مزیهاتن، مزی ماندووبوونی پا، کراپا، کراهەپا، پاڵامز، پامز، قولخ.
**پایندان:** بەرعۆدە، دەستەبەر، کەفیل، قبووڵکەر، نێوبژیکەر.

**پایندگی:** هەربوونی، هەرمانی، نەمری، بێپێشوونە، مانەوە، نەفەوتان. "**پایندگی کردن**": سەرپەرشتی و ئاگاداری لێکردن.

**پاینده:** خۆڕاگر، جێقایم، بەردەوام، نەبڕی، بێلەناوچوون، بەردەوام، نەمر، هەربوو، پایەدار، پاینده، پاینە.

**پایور:** خاوەن پلە، خاوەن پلەو پایە، پایەبەرز.

**پایوران:** بڕوانە: "کادر".

**پایون:** خشڵ، زێڕ و زەنبەر.

**پایوند:** بڕوانە: "پای‌بند".

**پایە:** 1) هیم، بناغە، بناخە، بنەما، بنێشە، بنەڕەت.2) پێچك، پاچکە، پایەکورسی و هتد.3) ڕێز و حورمەت، پلە و پایە.

**پایە پایە:** پلەبەپلە.

**پایەریزی:** ڤەنانەن، بناغەداڕشتن، هیم دانان.

**پایەگذار:** بنیاتنەر، دانەر، ئاڤاکەر.

**پایەوران:** کادر.

**پایەورسازی:** بڕوانە:"ترفیع".

**پاییدن:** چاوەدێریکردن، بەچاو ئاگا لێ بوون، خستنە ژێر چاوەدێری، چاڤ نهێری. درێژەکێشان. چاوەڕوانیکردن. خۆڕاگریکردن، ڕاوەستان.

**پایی شدن:** لەسەرچوون، بەدواداچوون، پەی چوون.

**پایین:** 1) نزم، خوارەوە، خواروو، لای خواروو، ژێرو، ژێری. 2) هێواش، بەئەسپایی.

**پایین‌آمدن:** هاتنەخوارەوە، دابەزین، داوەزین، داخزین، داخوەستن، نزم بوونەوە، نشت، ئەرەوەسای.

**پایین‌آوردن:** هێنانەخوار، هاوردنەخوار، دابەزاندن، داوەزاندن، داخۆزانن، داگرتن، لەسەرلابردن، ڤەرێتن.

**پایین پرست:** قەرەواش، کارەکەر، پاکار، خزمەتکار، پەرستار.

**پایین پرستی:** خزمەتکاری، کارەکەری، پاکاری، کۆیلایەتی.

**پایین رفتن:** چوونە ژێرەوە، نیشتنەوە.

**پایین کشیدن:** کێشانە خوارەوە، هێنانە خوار، دابەزاندن، دانەواندن. رووخاندن، لەناوبردن.

**پپه:** بڕوانە:"پخمە".

**پت آلود:** بڕوانە: "آهارزده".

**پتانسیل:** هۆکاری پەنگراو/ شاراوە، تەوژم، تین، وڵتاژ.

**پتت:** (پ.تَ) تۆبە، تۆبەنامە.

**پتوازگر:** بڕوانە:"پاسور".

**پت و پهن:** پان، والا، بەرین.

**پتی:** بەتاڵ، رووت، پەتی، خاوس.

**پتیار:** بڕوانە: "پتیارە".

**پتیارك:** بڕوانە: "پتیارە".

**پتیارە:** پەتا، بەڵا، زیان. درێو و ترسێنەر، ئەهریمەنی، دێو، درنج. ئاکارخراپ، ژنی بێحەیا و زمان پیس.





**پچ پچ:** پچەپچ، پچە، چپە، چپەچپ، چپ چپ، چرپەچرپ، سرتەسرت، سرتە، سرپەسرپ، سرتوخورت، سرکەسرك، سرکە، فتە، فتەفت، فچە، فسەفس، پسکەپسك، پستەپست، سرت و خورت.

**پچ پچ زیاد:** چپوهۆڕ، سرتەوخورتەی زۆر.

**پچل:** چەپەڵ، پیس، گەمار.

**پچوهگر:** وەرگێڕ (بەشێوەی زارەکی).

**پختگان:** کارزانان، بە ئەزموونان، قاڵبووان، دنیادیتوان، زانایان.

**پختگی:** بە ئەزموون بوون، ئەزموونداریێتی، پێگەیشتن، چۆنیەتی هەر شتێکی لێنراو.

**پختن:** لێنان، پێژان، پێژتن، پێتن، پەهتن، پوختەبوون، پێگەیشتن لەسەر ئاگر، گرینای. "**بسیارپختن**": داڕزان، داڕزیان، داڕزین، هەلاهەلابوون.

**پختنی:** شیاوی لێنان، بۆ لێنان. لێنراو.

**پختە:** 1) لێنراو، پێژراو، گەییو، دژی کاڵ. 2) کەسی بە ئەزموون و کارزان و ژیر و زانا. 3) کوڵاو.

**پختەخوار:** مفت خۆر، مفتەخۆر، سواڵکەر، دەرۆزەکەر.

**پختەرای:** بەئەزموون، کارامە، تاقی کراوە، ژیر.

**پختەکار:** بڕوانە: "کارآمد".

**پختە کردن:** 1) کامڵ کردن، بە کۆتایی گەیاندن. 2) ئامادەکردنی کەسێ بۆ ئەنجامدانی کارێ.

**پخچ شدن:** بڵاو و پان بوونەوە.

**پخچیدن:** کوتران، نەرم بوون، بڵاوبوونەوە، پان بوونەوە.

**پخس:** 1) بڕوانە: "بخس". 2) هاڵەپرووز، پرووزان.

**پخسیدن:** 1) بڕوانە: "بخسیدن". 2) پرووزان، هاڵەپرووزبوون.

**پخش:** پەخش، پرژاو، بڵاو، وەشان.

**پخش شدن:** بڵاوبوون، دابەش بوون، بەش بەش بوون، چۆپرپیان، پەرژان.

**پخش کردن:** بڵاوکردن، بڵاوکردنەوە، بەلاڤ کرن، توژی، بەش کردن، دابەش کردن، بەش بەش کردن، وەشاندن، وەشین، ندن.

**پخش کنندە:** بڵاوکەرەوە، وەشیار.

**پخشیدن:** بڕوانە: "پخچیدن".

**پخشیدە:** کوتراو، پانەوەکراو.

**پخمە:** گێل، گێلۆکە، کەم زان، بێئاوەز، چۆپیك، سەپۆل، سەپۆلە، سەپەل، حەپۆل، تەفك، پەخمە.

**پداگوژی:** زانستی پەروەردەو فێرکردنی منداڵان، هونەری راهێنان، هونەری مامۆستایەتی.

**پدرام:** 1) سەرسەوز و بەگەشە. 2) شاد، دڵخۆش. 3) بێترس، هێمنایی. 4) شادی، دڵخۆشی.

**پدرختە:** خەمبار، خەمناك، دڵ تەنگ.

**پدرسالار:** (کۆمەڵناسی)باوك سالار/ سەردار.

**پدرشاهی:** (کۆمەڵناسی) باوك سالاری.

**پدرکش:** بکوژی باوك، کەسێ کە باوکی خۆی کوشتبێ.

**پدرکشتگی:** بریتی لە رق و دوژمنایەتی زۆر، خوێن لە ئارادابوون.

**پدرکشته:** 1) تایبەتمەندی ئەوەی کە باوکیان کوشتبێ. 2) دوژمنی زۆر قیندار و رکین.

**پدرکشی:** باوك کوژی، باوك کوشتەیی.

**پدرکلان:** باوەگەورە.

**پدرمرکز:** باوك سەنتەر.

**پدرگیر:** زڕباب.

**پدوند:** بڕوانە: "پیوند".

**پدید:** 1) ئاشکرا، خویا، بەرچاو، دیار. 2) جیاواز.

**پدیدآمدن:** بەدیهاتن، وەدیهاتن، پێکهاتن، دەرکەوتن، ئاشکرابوون. "**پدیدآمده**": بەدیهاتوو، پێکهاتوو.

**پدیدآوردن:** بەدیهێنان، وەدیهێنان، داهێنان، ئاشکراکردن، خویاکردن، ڤەدان. "**پدیدآورنده**": وەدیهێنەر، خویاکەر، دەرخەر.

**پدیدار:** 1) دیار، بەرچاو، ئاشکرا، خویا، خوانە، خوانی، وەرەچەم. 2) (فەلسەفە) دیاردە.

**پدیدار شدن:** بەرچاوهاتن، دیاریدان، دەرکەوتن، بەدیهاتن.

**پدیدارشناسی:** دیاردەناسی.

**پدیدکردن:** 1) ئاشکراکردن، دەرخستن. 2) وەدیهێنان. 3) دەربڕین، وتن.

**پدیده:** 1) دیاردە، دیاردی. 2) کەس یان شت یان رووداوی بەرچاو، دیار.

**پدیده‌شناختی:** دیاردەناسانە.

**پدیده‌شناسی:** دیاردەناسی، زانستی دیاردەکان، "فینۆمینۆلۆژی".

**پدیکور:** پاکوخاوێنی قامك و نینۆکەکانی پێ و جوان کردنیان.

**پذرفت:** قبوولکردن و وەئەستۆگرتنی شتێك، دەستەبەری، وەخۆگرتن.

**پذرفتار:** قبووڵکەر، وەرگر، بەرعۆدە، وەئەستۆگر، بەڵێن دەر.ملکەچ، بەرفەرمان.

**پذرفتکار:** بڕوانە: " پذرفتار ".

**پذرفتن:** بڕوانە: "پذیرفتن".

**پذیرا:** 1) وەرگر، قبووڵکەر، پێشوازیکەر. 2) ناچالاك، پاسیڤ.

**پذیراشدن:** بە پیرەوەچوون، بە پێشوازییەوەچوون، پێشوازی لێکردن.

**پذیراندن:** سەلماندن، پێ قبووڵکردن، رازیکردن. داسەپاندن.

**پذیرایی کردن:** خزمەت و پێڕاگەیشتنی میوان، میوانداری. قبووڵ کردن، وەرگرتن.

**پذیرش:** وەرگیران، وەرگرتن، قبووڵ کردن، پەژراندن، رازی بوون، قایل بوون، وەئەستۆگرتن، بەڵێن دان.





**پذیرفتار:** بڕوانە: "پذرفتکار".

**پذیرفتکار:** بڕوانە: " پذرفتکار".

**پذیرفتن:** وەخۆگرتن، وەرگرتن، وەئەستۆگرتن، پەژیران، قبووڵ کردن، پەژراندن، رازیبوون.

**پذیرفتنی:** شیاوی پەژیران، شیاوی قەبووڵ کردن.

**پذیرفته‌شدن:** وەرگیران، قبووڵ کران، پەژری. "**پذیرفته‌شده**": وەرگیراو، قبووڵ کراو.

**پذیرنده:** قبووڵکەر، وەرگر، وەخۆگر. پێشوازیکەر.

**پذیره:** 1) (ئابووری) دەستەبەری کڕینی گەلانرخدارەکان. 2) قبووڵکراو. 3) پێشوازیکەر. 4) بڕوانە:"استقبال".

**پذیره‌شدن:** 1) بەپیرەوەچوون، پێشوازی لێکردن، وەرگرتن، قبووڵ کردن. 2) بەرەبەرەکانی کردن، بەرەنگاربوونەوە.

**پذیره‌نویسی:** قبووڵ کردنی دەروەستی دانی قەباڵەیەکی ماڵی.

**پر:** (پُ) پڕ، لێوڕێژ، لێوالێو، لێوانلێو، کەلاو، سەرڕێژ، تژی، تژە، لپ، لیپاولیپ، دارماڵ.

**پرآب:** ئاودار. گەییو. فرمێسکاوی، گریان. بەدرەوش، روون.

**پرآب و تاب:** بە تێر و تەسەلی و پەسنی زۆر، بە ئیشتیا.

**پرآتش شدن:** 1) بەئازار و خەمگین بوون. 2) تووڕەبوون و هەڵچوون.

**پرآوازه:** بڕوانە:"مشهور".

**پراتیك:** بەڕێوەبردن، کردەوە، ئەزموون، تاقیکاری، راهێنان.

**پراچین گرایی:** بڕوانە:"التقاط گرایی".

**پراسس:** پرۆسە.

**پراشیدگی:** بڕوانە:"اختلال".

**پراشیدن:** پرژانن، پژاندن، بڵاوکردنەوە.

**پراطناب:** درێژ کردنەوە، درێژ دادڕی، فرەوێژی.

**پرافشاندن:** 1) پەڕ و باڵ لێدان. 2) بریتی لە وازهێنان لە کارێك بە هۆی نەتوانین لە ئەنجام دانیدا.

**پرافکندن:** بریتی لە دەربڕینی ترس و نەتوانین و زەبوونی. باڵ وەرین.

**پراکافت:** فەلەجبوونی بەرەبەرەیی.

**پراکتیکال:** بڕوانە: "پراگماتیك".

**پراکسیس:** فەلسەفەی کردەکی.

**پراکندگی:** پەرتەوازەیی، پرژوبڵاوی، بڵاوبوون، لێك بڵاوی، بڵاوی، وەڵاوی، تیچان، ناڕێکوپێك بوون، شەپلین، شپرێوی، شپرزەیی.

**پراکندن:** پرژاندن، پرژان، پەرژبوون، بژکین، بژیان، پژیان، ڤەبژکاندن، بڵاوکردن، بڵاوکردنەوە، بڵاوەپێکردن، بڵاوبوون، پەخشان کردن، وەشاندن.

**پراکنده:** پەرتەوازە، پرژوبڵاو، کەرت و پەرت، پەرژ، پرش، پەخش، پەخشان،

شپرزە، شپرزیاگ، شپڕێو، تەرت، بڵاو، وڵاو، وەڵاو، بەلاڤ، چۆپڕ، لێك جیا، تاك و توك، **هاویر**.

**پراکندەدل:** بڕوانە: "پریشان حال".

**پراکندە شدن:** پەرتەوازەبوون، پڕژوبڵاوبوون، لێك بڵاوبوون، پەڕژان، پڕژان، راورتن، کەرت و پەرت بوون، **هەریەك بە لایەکاچوون**، پەخشان بوون، چۆپڕیان، بڵاوبوون، ڤەبژکان، ڤەبژکین، ڤەبژکیان، ڤەپرژیان.

**پراکنش:** 1) (فیزیك) پڕۆسەی **هەڵوەشانی** شەپۆلێ بە چەند شەپۆلێکی سادەی پێکهێنەری ئەو شەپۆلە. 2) بڕوانە: "انتشار".

**پراکنندە:** پڕژێنەر، پڕژێن، بڵاڤکەر، پەخشکەر، وەشێنەر.

**پراکنیدن:** بڕوانە: "پراکندن".

**پراگماتیسم:** کردەگەرێتی، رێبازی رەسەنایەتی کردەوە، فەلسەفەی کردەیی.

**پراگماتیك:** کردەیی، کردەوەیی.

**پراگندن:** بڕوانە: "پراکندن".

**پران:** 1) باڵندە. 2) لە حاڵی فڕین دا.

**پرانتز:** کەوانە، نیشانەیەك بەم فۆڕمە ().

**پرانداختن:** دامان و خۆبەدەستەوەدان، باڵ شۆڕکردنەوە.

**پراندازکردن:** باڵ کردنەوە. شادی و خۆشحاڵی کردن.

**پراندن:** 1) **هەڵفڕاندن**، فراندن. 2) فڕێدان، **هاویشتن**. 3) لە نکاو **هەستاندنی یەکێك لە خەو**. 4) دوورخستنەوە و رەواندنەوە. 5) **هاونوێن** بوونی جاربەجاری ژن دەگەڵ پیاوگەلی جۆراوجۆر. 6) تاریف کردنی بێجێ. "**متلك پراندن**": قسەی زل و بێجێ کردن، مەتەڵەك خستن.

**پراندیشە بودن:** مەترسیدار بوون، ترسان، خەمناك بوون.

**پرانندە:** فڕێن، فڕێدەر، **هاوێژەر**.

**پرانیدن:** بڕوانە: "پراندن".

**پراور:** باڵندە، تیژ ڕۆ.

**پراهنجار:** ناسروشتی، "پارانۆرماڵ".

**پر باد شدن:** 1) پڕبا بوون، ماسین. 2) بەدەماری، خۆ بە زل زانی.

**پربار:** 1) پڕبار، بەری زۆری **هەیە**، نەخلەش، نەخلیایش. 2) ماندار. 3) بەبەهرە، بەقازانج.

**پرپرزدن:** 1) باڵ و پەڕ لێدانی باڵندە. 2) باڵاتەپە، پەلەقاژە، بریتی لە گیان دان و مردن.

**پرپرشدن:** **هەڵپریوان**، **هەڵپڕووکان**، **هەڵوەرین**، **هەڵوەران**، وەرین.

**پرت:** 1) چەپەك، دوور، قەراخ، لە رێدەرچووگ. 2) بەندەر، تابگە، لەنگەرگا. 3) تووڕ، شەمڕ، ڤەزەلان، 4) بێجێ.

**پرتاب:** 1) پڕتاو، پڕتاف. 2) بەدرەوشین، تابان، پێچاوپێچی زۆر.





**پرتاب شناسی:** (میکانیك) بالێستیك.

**پرتاب کردن:** بڕوانە: "پرت کردن". "**بە بالا پرتاب کردن**": کێلدان، کێل ڤەدان، بەرەوژوور ئاویتن.

**پرتاب گشتن روی:** سووربوونەوەی روخسار.

**پرتابل:** شیاوی راگوازتن. شیاوی پۆشین، پۆشەن.

**پرتاب و توان:** پڕ وزە و **هێز**، پڕ توان و تاقەت.

**پرتابی:** 1) **هاوێژراو**، تیری **هاوێژ** راو، فڕێدراو. 3) تیرێك کە زۆر بڕ بکا. 2) تیرهاوێژ. 4) خێرا و بەپەلە.

**پرتابیان:** تیرهاوێژان، کەماندارەکان.

**پرت اندیشی:** بڕوانە: "پرشیدگی".

**پرتحرك:** بزۆزو سەهندە، پڕجووڵە، زۆر **هەڵسووڕ**، چەپخوون، چوست و چالاك.

**پرتخمە:** بە داوونا و و رێوڕەسمی زۆرەوە، بەشکۆ و بەبرەو.

**پرترە:** پۆرترە، وێنەی روخساری مرۆڤ.

**پرت شدگی:** فڕێدراوی، تووڕدراوی، **هەل قەتین**، **هەل قەتایی**.

**پرت شدن:** **هەڵدێران**، پەڕان، پەرت بوون، فڕێدران، تووڕدران، گلان. "**پرت شدن از بالا**": **هەڵدێران**، **هەڵدێریان**، لە بەرزی‌یەوە فڕێدران.

**پرت کردن:** تووڕهەڵدان، فڕێدان، **هاویشتن**، دوور **هاویشتن**، **هاویژتن**، ئاویشتن، **هاویتن**، **هاڤیتن**، ئاویتن، **هەل قەتاندن**، قەوانچەدان، ڤەوەشاندن، شەمڕاندن، ڤەشەمڕاندن، ڤەزەلاندن، خستن، خستنەدوور، گلاندن، سوڕدان، وەڕنان، وارۆواینە، وەرکرن، وزای، وزین، برنگ. دوورخستنەوە لە رێگە یان مەبەستی سەرەکی. "**پرت کردن از بالا**": **هەڵداشتن**، **هەڵدێران**، بەردانەوە، فڕێدان لە بەرزی‌یەوە. "**بە بالا پرت کردن**": **هەڵدان**، تووڕهەڵدان بەرەو سەر، فڕێدان بەرەو سەرەوە، **هەوادان**، حەوادان.

**پرت کنندە:** فڕێدەر، تووڕدەر، **هاوێژەر**، **هاڤیتەر**، ئاڤێژ.

**پرتکی:** بێ بیر و تێڕامان.

**پرتگاە:** **هەڵدێر**، **هەڵدێرکە**، **هەڵدێرگە**، مشەفل، زنار، **هەلەم**، **هەڵەمووت**، **هەڵەت**، **هەزاربەهەزار**، نشووڤ، یارمە.

**پرت گفتن:** **هاتەران پاتەران** گوتن.

**پرتلاش:** پڕکار، چالاك.

**پرتو:** تیشك، پڕشنگ، گزنگ، تیرێژ، شۆق، رۆشنایی. 2) کاریگەری، کارتێکەری.

**پرتوافکنی:** تیشك خستن، تیشك **هاوێژی**، تیرێژ ئاوێتن، رووناکی‌دان.

**پر توان:** بەهێز، بە تاقەت.

**پرتوبینی:** رادیۆسکۆپی.

**پرت و پلا:** **هاتەران پاتەران**، **هەڵیت و پڵیت**، قسەی بێ مانا و پڕوپووچ، پەشێو، پەرێشان.

**پرت و پلاشدن:** پرژوبلاوبوون، تەفروتوونا بوون.

**پرت و پلا کردن:** پەرژوبلاوکردن، دەراندن، تەفروتووناکردن.

**پرتودرمانی:** رادیۆتراپی، تیشك دەرمانی.

**پرتوزا:** رادیۆئەکتیو، توخمە تیشکدەر.

**پرتوشناس:** رادیۆلۆژیست، تیشك ناس.

**پرتوشناسی:** رادیۆلۆژی، تیشك ناسی.

**پرتونگاری:** رادیۆگرافی، وێنەهەلگرتنەوە بە تیشکی ئیکس.

**پرتوه:** بڕوانە: "پرتابی".

**پر جرأت:** (پُ) بەجەرگ، دلێر.

**پر جفا:** (پُ) ستەمکار.

**پر جمعیّت:** پڕحەشیمەت.

**پرچاره:** زۆر بە فرت وفێڵ، فێڵاوی.

**پرچانگی:** چەڵتەچەڵت، چەنەدرێژی، چەنەوەری، چەنەلێدان، زۆر بێژی، زۆربڵێیی، هەڵەوەڕی، چەناگە لێدان.

**پرچانه:** بریتی لە فرەوێژ، زۆر بڵێ، چەنەوڕ، پڕچەنە، درێژدادڕ، چەقەچەناو، چەناگەدرێژ، هەڵەوەڕ، چەقەکەر، زمان درێژ، دەڤ درێژ.

**پرچ کردن:** پاچین، پەچدان، پەچدانەوە، پەرچاننەوە، پەرچ کردن، پەرچاندن، پەڕاندن.

**پرچم:** ئاڵا، بەیداخ، بەیاخ.

**پرچم افراشتن:** ئاڵاهەڵکردن، ئاڵاهەڵدان، بەیداغ هەڵدان.

**پرچمدار:** ئاڵاهەڵگر، ئاڵادار، ئاڵاچی، بەیداخدار، بەیاخدار، بەیداغدار.

**پرچیدن:** بڕوانە: "پرچ کردن".

**پرچین:** (پَ) پەرژین، پەژان، چیل، چەپەر، تان، تامان، تەیمان، ناقبریك، جاخ، تەجیر، شورەی بە درو، درگای بە شووڵ هەڵچنراو.

**پر چین:** (پُ) پڕ پێچەڵاوپێچ، پڕ چین و توێ، چین دار.

**پرچین کردن:** بڕوانە: "پرچ کردن".

**پرحرارت:** (پُ) 1) بەتین، پڕتین. 2) کەسی پڕکار و هەڵسووڕ.

**پرحرف:** (پُ) دمهار، دەمهار، دەم درێژ، دەم هەڵە، زۆربڵێ، فرەوێژ، چەنەباز.

**پرخاش:** شەڕو مشت ومڕ، بە تووڕەییەوە بەگژ یەکاچوون، بەگژداهاتن، دەگژڕاهاتن، پێك پڕژان، شەڕ، هەڤ بڕین.

**پرخاشجو:** شەڕانگێز، شەڕخواز، شەڕانی، شەڕاشۆ، جینگن، کەللەشەق، جەنگاوەر.

**پرخاش خر:** خوازیاری شەڕ، جەنگاوەر، شەڕخواز، دلێر.

**پرخاش ساز:** سازکەری شەڕو هەڵا، ئامادەی شەڕ، شەڕانگێز.

**پرخاش کیش:** ئەوەی کە بەردەوام لە شەڕ دایە، شەڕخواز، شەڕاشۆ.

**پرخاشگاه:** گۆڕەپانی شەڕ.





**پرخاشگری:** شەڕانگێزی، بەگژیەکاچوون، پیاهەڵپڕژان، هەڵشاخان، هەڵشاخین.

**پرخروش:** پڕ هەراو هوریا، پڕقاڵە، قاڵمەقاڵمی زۆر، بەجۆش و خرۆش.

**پر خشم:** تووڕە. پڕ تانەوتەشەر.

**پرخنید:** رەسا.

**پرخواب:** 1) کەسێك کە زۆر هۆگری خەوە. 2) خەواڵوو، خومار.

**پر خواسته:** خاوەنی ماڵ و سامانی زۆر، ساماندار.

**پرخواه:** تەماکار، چاوچنۆك، تێر نەخۆر، رژد.

**پرخور:** خۆرا، خۆهرا، خوارۆخ، زۆرخۆر، فرەخۆر، خۆش خۆر، بخۆر، تەشپیتڕێن، چڵەك، چڵێس، زك لەوەڕێن، زك تێڕ، هەستی کۆژ، دەوریلێس، واردۆخ، وەردۆخ، پێلۆ، کەلپاچا، کەلپاچە، فارزك. "**بسیارپرخور**": دەلیالووش.

**پر خوردن:** زۆر خواردن.

**پرخون:** 1) پڕخوێن. 2) خوێناوی، خوێنین. 3) سوورەوەبوو، سوور وەك تلی خوێن.

**پرخونی:** (پزیشکی) کۆبوونەوەی لەڕادەبەدەری خوێن لە هەرکام لە ئەندامەکانی لەش دا.

**پرخیدن:** پشکنین، گەڕان، گەڕین.

**پرخیده:** بڕوانە: "اسرارآمیز".

**پرداخت:** 1) دانەوەی قەرز و شتی لەو بابەتە. 2) پارەیەك کە بە کەسێك دەدرێ. 3) هەڵەچنی، هەڵەبڕی. 4) ژەنگ لێکردنەوە، سیقاڵدان، زاخاودان. 5) خەریك بوون بەکارێکەوە. 6) ساف و رێکوپێککردن. 7) رتووش. 8) (لەزاراوەی بانکیدا) دانی پوول، کارسازی. "**پرداخت دادن**": سیقاڵ دان، مشتو ماڵدان، تیف تیفەدان. "**عدم پرداخت**": نەدان، نەدران.

**پرداخت کردن:** 1) سیل کردن، سیقاڵ دان، مشتوماڵ دان، لێك و لووس کردن، تیفتیفەدان، ماڵەفە، ژەنگ سڕینەوە. 2) دان، دران، دانەوە. 3) رێك کردن و هەڵەچنی نووسراوەیەك.

**پرداختگی:** بڕوانە: "فراغت".

**پرداختن:** 1) سیقاڵ دان و تەوزاندن، ژەنگ سڕینەوە، سازکردن، رێکوپێك کردن. 2) بەجێهێنان، جێبەجێکردن. 3) خۆخەریك کردن، خەریك بوون، سەرقاڵبوون. 4) لێبوونەوە، خەلاس بوون. 5) بەتاڵ کردن. 6) پوول دان، کارسازیکردن، وام دانەوە. 7) رازاندنەوە. "**سخن پرداختن**": قسەکردن، ئاخاوتن. "**پرداختن از کاری**": بەکۆتایی گەیاندن و خستنە لاوە یان لێبوونەوە لێی. "**پرداختن بە کسی**": سەرنجدان یان خەریك بوون بەو یان بە کاری ئەوەوە، پێڕاگەیشتن بە ئەو یان کاری ئەو.

**پرداختن جریمە:** بژاردن، بژاردنەوە، تاوان دان.

**پرداختن خانه:** دروست کردن، تەواوکردنی بینا.

**پرداختن دل:** 1) دلّ پێوەنەمان، وازهێنان. 2) خاڵیکردنەوەی گرێی دڵ.

**پرداختن زكات:** دەرکردن، زەکات دان.

**پرداختن عمر:** بە کۆتایی گەیشتنی تەمەن.

**پرداختی:** دراو.

**پردادن:** ئازادکردن و هەڵفڕاندنی باڵندە. ڕەواندنەوە و دوور خستنەوە.

**پردازش:** 1) (کامپیۆتێر) ئەنجامدانی کۆمەڵێك کرداری جۆراوجۆر لەسەر زانیارییەکانی ناو کامپیۆتێر، process. 2) ڕێکوپێك کردن و هەڵەچنی بابەتی نووسراو وەك چیرۆك و وتار. 3) خەریك بوون، سەرگەرم بوون، مژوولی، هەوڵ. "**پردازش کردن**": خستنەڕوو و جێبەجێکردن.

**پردازگر:** 1) سڕێنەر، سیقاڵکار،ماڵشتە، زۆخی. 2) بڕوانە: "طرّاح".

**پردازنده:** 1) سیقاڵکار، ماڵشتە، ماڵشت دەر. 2) ڕازێنەر، خەملێن. 3) بنیاتنەر، ڕێکوپێك کەر. 4) "پرۆسیسۆر".

**پردازه:** بڕوانە: "عملکرد".

**پردازیدن:** بڕوانە: "پرداختن".

**پردان:** (پُ) زۆر زان، زۆر زانا و ژیر و وریا.

**پردختن:** بڕوانە: "پرداختن".

**پردرآمد:** پڕداهات.

**پردرآوردن:** پەڕوباڵ دەرکردن. دڵخۆش بوون.

**پردستان:** ئاوازخوێن.

**پردك:** بڕوانە: "چیستان".

**پردگی:** سەربە پەردە، داپۆشراو، پەردەنشین. کچ و ژن.

**پردگی‌شدن:** داپۆشران.

**پردل:** بوێر، ئازا.

**پرده‌باز:** ژەنیار، شانۆکاری پشت پەردە.

**پرده برافتادن:** ئاشکرا یان خویا بوونی شتی نهێنی.

**پرده‌برافکندن:** ئاشکرابوون، دەرکەوتن.

**پرده‌برداری:** پەردە لادان.

**پرده برداشتن:** پەردە لادان، ئاشکراکردن، دەرخستن.

**پرده برون افتادن:** ئاشکرابوون، خویابوون.

**پرده پوش:** ڕازدار، نهێنی پارێز، پەردەپۆش، ئەمین بۆ سوڕ نەدرکاندن.

**پرده‌دار:** پایوان، پەردەداری پیاوی گەورە، دەرکەوان، خزمەتکاری ژووری تایبەتی حاکمان.

**پرده‌در:** ئابڕووبەرە، بێشەرم، ڕووهەڵماڵاو.

**پرده‌دری:** درکاندنی نهێنی کەسێك و ناوزڕاندنی.

**پرده دریدن:** پەردە دڕانن، پەردەدڕان، ڕووسیابوون، درکاندنی نهێنی کەسێك و بێئابڕووکردنی.





**پرده‌دریدگی:** خەنزاری، ناوزڕان، ئابڕووتکان، بێشەرمی.

**پرده دریده:** ڕاز درکاو، خەنزار، ئابڕووتکاو، حەیاچوو.

**پرده‌سرا:** سەراپەردە، دیوانی میر، خێوەت.

**پرده‌سرای:** ستران بێژ، سروودخوێن.

**پرده‌شناس:** ژەنیار، مووسیقازان، بەزمگێڕ، لۆتی.

**پرده‌کردن:** 1) داپۆشینی دەموچاو. 2) داپۆشاندن.

**پرده‌گر:** پەردەدورووو، پەردەساز.

**پرده‌نشین:** 1) ژنی ڕووداپۆشراو، ژنی بە دەمامك، داپۆشراو. 2) کەسی خەڵوەت نشین و خۆپارێز و ڕازدار. 3) جوان چاك.

**پردیس:** بەهەشت. باغ.

**پررو:** بێ شەرم و ڕووهەڵماڵاو، ڕووداماڵاو، بێ شەرم و شوورەیی، بێچاوەڕوو، ڕووداماڵاو، ڕووداماڵیاو، ڕیلاس، ڕوودار، ڕووقایم، ساواز، قوڵتەش، قوڵتەشە، چاڤ هیشك.

**پررویی:** بێشەرمی، ڕووهەڵماڵاوی.

**پرریختن:** 1) پەڕ و باڵ وەرینی پەلەوەر، تووڵەك کردن. 2) بریتی لە داماں، زەبوون بوون، پەست بوون، ڕووت بوون.

**پر زا:** (پُ) فرەزێ، ئەوەی کە مناڵی زۆری دەبێ.

**پرزدن:** پەڕ و باڵ لێدانی پەلەوەر، پەڕین، فڕین، هەڵفڕین.

**پرزیدنت:** (سیاسی)سەرۆك کۆمار.

**پرس:** (پُ) پرسین، پرسیار.

**پرس:** (پَ) پەردە، ڕووپۆش.

**پرسا:** بڕوانە: "پرسان".

**پرسان:** پرسیارکەر، پرسکەر، پرسا، لە حاڵی پرس کردن دا.

**پرسان پرسان:** زۆر پرس کردن، زۆر پرسیار کردن بۆ دۆزینەوەی شوێنێ.

**پرسانتاژ:** بڕوانە: "پورسانتاژ".

**پرسپکتیو:** 1) هونەری کێشانەوەی دیمەن و شتەکان. 2) دوورنما، دوورنوێن، دیمەن. 3) چاوەڕوانی، چەمەڕایی.

**پرستار:** 1) یاریدەدەری نەخۆش، پەرستار. 2) خزمەتکار. 3) بەندە، بەنی. 4) ژن، هاوسەر. 5) ژێرفەرمان، بەرفەرمان. 6) پەرسیار، پەرەس. 7) نگابان و پارێزەر.

**پرستاروش:** وەك پەرستار.

**پرستاری کردن:** ئاگالێبوون، ئاگاداری کردن، خەمخۆری‌لێکردن، پێڕاگەیشتن، تیمارکردن.

**پرستش:** بەندەیی، نزا، دوعا، پەرستن.

**پرستشگاه:** بڕوانە: "معبد".

**پرستشگر:** پەرسیار، پەرست، پەرستەر. خزمەتکار، نۆکەر، بەنی.

**پرستشگری:** نزا، پەرستن، بەندەیی، خزمەت.

**پرستك:** خزمەت گوزار، خزمەتكار.

**پرستندگی:** بەندەیی، كۆیلەیی، پەرستن، خزمەتكاری.

**پرستنده:** 1) پەرسیار، پەرەس، پەرست. 2) بەندە، كۆیلە، خزمەتكار.

**پرسته:** 1) پەرستێنراو، ستایش كراو، ئەو كەسەی كە دەیپەرستن. 2) پەرستن. 3) خزمەتكار، قەرەواش.

**پرستیدن:** پەرستن، بەپیرۆز زانین، ستایش كردن، بەندەیی كردن، خزمەت كردن، زۆر خۆشویستن. "**پرستیده**": پەرستێنراو، ئەو كەسەی كە دەیپەرستن و ستایشی دەكەن.

**پرستیژ:** پرستیژ، جێ متمانە، جێباوەڕی. بالادەستی، دەست ڕۆیشتوویی. سێحر، جادوو. فریودانی سێحراوی.

**پرسش:** 1) پرسیار، پرس، پرسین، پسیار، پەرسای، وتەیێ كە وەلامی گەرەكە. 2) بروانە:"بازخواست"."**به پرسش رفتن**": سەردانی نەخۆش كردن. "**به پرسش گرفتن**": لێكۆلینەوەكردن، لێپرسین، پرسیاركردن.

**پرسش آفرین:** پرسیار خولقێن، جێگەی پرسیار.

**پرسش تعارفی:** پرسەگورگانە، پرسەگورگانێ، پرس كردنی رواڵەتی و بە قسەنەكردن.

**پرسش كلامی:** پرسیاری ئاخاوتەیی.

**پرسش كننده:** پرسا، پرسكەر، بەپرسیار.

**پرسشگاه:** شوێنی پرسیار.

**پرسشگر:** بروانە:"پرسش كننده".

**پرسشنامه:** پرسنامە.

**پرسمان:** (پُ) مەسەلە، پرس، پرسیار.

**پرسنده:** بروانە: "پرسش كننده".

**پرسنل:** كەسێنی، تایبەتی، كۆی كارمەندانی ئیدارەیەك، پێرسونێل.

**پرس و جو:** پرسین و لێكۆلینەوە بۆ زانینی راستی شتێك.

**پر سوز و گداز:** بروانە: "پر گداز".

**پرسوناژ:** كەس، كەسی جێی سەرنج، كەسی گەورە و ناودار، (لە شانۆدا) هەر كام لە كەسەكانی شانۆنامە، ئەكتەر، كەسایەتی.

**پرسه:** (پُ) پرسیار، پەرستن.هەواڵ پرسی لە نەخۆش، سەرەخۆشی، پرسە، تازیە.

**پرسه:** (پَ) مالانگەڕی، سواڵ، لەتەچنی، پارسەكی.

**پرسه‌زدن:** سووڕانەوە لە كۆلان و بازاڕدا، (بێكار) خولانەوە، ڕۆیشتن و سواڵ كردن.

**پرسه‌كردن:** بەسەركردنەوە، سەرلێدان.

**پرسیدن:** پرسیاركردن، پرس كردن، پرسین، هەواڵ پرسین.

**پرش:** فڕ، باز، بازباز، بازد، واز، شەقاوی بە هەلبەزینەوە، خێز، خۆهەڵدان، قەفاز، قەفێژ، قەلباز، قەلبەز، قەلەمباز،





قەلەمبازد، كەلەمباز، دەقەلوون، لیتك، فنچك."**مسابقه پرش**": بازبازان، بازبازێن، بازدبازدێن، بازدەلبازد، بازبازۆكێ، چرتك، چلاپە."**بازی پرش**": كەوشێن، كەوشەك، سێباز.

**پرش دادن:** بازدان، بازهاویشتن، قەلەمبازبردن، پەڕین، هەلبەزین، خۆهەڵدان، لنگەئەستەنە.

**پرشكن:** بروانە: "پُر چین".

**پرشور:** (پُ) 1) بەهەست، بەسۆز، بە گوڕوتین. 2) شەپۆلاوی، پڕشەپۆل.

**پرشوروشر:** بروانە:"ماجراجو".

**پرشیدگی:** بێربلاوی، هەواس پەرتی.

**پرفسور:** زۆر فێلەزان، بەمەكر و فێلەزان. زۆر زانا و زیرەك.

**پرفیكس:** بروانە: "پیشوند".

**پرقو:** بریتی لە ئاسوودەیی و خۆش بژیوی زۆر.

**پركار:** (پ) 1) پڕكار، چالاك. 2) ناسك.

**پركاوش:** پەرتاوتن، هەلپەرتاوتن، لكەدار پەراندن.

**پركردن:** پڕكردن، تژەكردنی والا، لێوڕێژ كردن، دارماڵ كردن، مش كردن، مشت كردن، گۆزانن، داگرتن، ئاخنین."**پركردن دوباره**": پڕكردنەوە، داگرتنەوە.

**پركشیدن:** 1) بال لێدان، هەلفڕین. 2) تاسە و تامەزرۆیی زۆر كردن.

**پركندگی:** رووتان، رووت بوونەوە، رووت بوونەوە، بێپەڕبوونی مەل.

**پركندن:** رووتاندن، رووتانەوەی مەل، پەڕیتاندن، زەمتاندن.

**پركنده:** 1) رووتاوە، لەپەڕوپۆكراو. 2) پەرژ، تەرت، بلاو. 3) بریتی لە داماو و كلۆل.

**پركنش:** (پُ.كُ نِ) چالاك، فرز، چوست.

**پر كوس:** پڕ پێچەلاوپێچ، چرچ و لۆچاوی.

**پر كین:** بروانە: "كینەور".

**پرگار:** 1) جەغزینگ، جغزینگ، پەلكدار، پەرگار، پەرگال. 2) جەغز، بازنە، چەمەرە. 3) پێوەر، پێوانە. 4) كەلەك، فێل. 5) چارەنووس.

**پرگال:** (پُ) حەشیمەت.

**پر گداز:** (پُ) سۆزدار، بە تین و گوڕ، پڕكەسەر.

**پرگرفتن:** بازەلە بوون. هەلفڕین. فرە خۆشحال و شادمان بوون.

**پرگست:** هەرگیز، حاشا.

**پر گستردن:** 1) بال كردنەوە. 2) بریتی لە خاكەڕایی.

**پرگو:** فرە(بێژ/ وێژ)، زۆربلێ، چەنەباز، چەقەسرۆ، فرەوەڕ، زۆروڕ، بەلەبل، درێژدادڕ، زماندار، دەماوەر.

**پرگونه:** بروانە:"متنوع".

**پرگویی:** فرەوێژی، زۆربلێیی، درێژدادڕی، دەم لێدان، دەم لێكدان، چەنەبازی بەخۆڕایی، ڕیسە.

**پرگیدن:** ئیزن دان، هێشتن.

**پرگیر:** دەوراندەور.

**پر گیرودار:** پڕ شەڕ و شۆڕ، پڕ لە هەرا و هوریا.

**پر لاف:** بروانە: "لافزن".

**پرماس:** ساوانی، ساوایی.

**پرماس ناپذیر:** هەست پێنەکراو.

**پرماسیدن:** سوون، پیا هانین، دەست هێنان بە شتێك دا. لاواندنەوە.

**پرمان برداشتن:** فەرمان بردن، ملکەچی.

**پرمایە:** 1) پڕقازانج، پڕ هێژا و بەنرخ. 2) کەسی زۆر زانا و مەزن، خاوەن زانست و ئاوەزی زۆر. 3) پووڵدار، دەوڵەمەند. 4) ئاوەدان و سەرسەوز. 5) بەشکۆ. 6) گرینگ. 7) گرانبایی، بەنرخ.

**پرمخیدن:** بڕوانە: "برمخیدن".

**پرمغز:** 1) ناوکدار. 2) پڕمانا و واتا.

**پر منش:** خۆ بە زل زان، خۆ پەسن، هێژا و ڕێزدار، بە ئاوەز و پڕقازانج.

**پرناس:** بڕوانە: "برناس".

**پر نخوت:** زۆر بە ناز، بە فیز و لەخۆڕازی، زۆرخۆ بەزل زان، خۆپەسن.

**پرندوش:** دوێشەو.

**پرندە:** پەلەور، پەلەوەر، باڵدار، باڵندە، باڵنە، فڕندە، فڕننە، فڕا، مەل. "**پرندە پر نزدن**": بریتی لە خەڵوەت و چۆڵ و بێدەنگ بوون، لە کوردیدا دەڵێن پەپووی لێدەخوێنێ یان کەری لێبگێی کەس نازانێ.

**پرنس:** شا، شازادە.

**پرنسس:** خاتوو شازادە، کچی شا، ژنی شا، مەلەکە، شاژن.

**پرنسیپ:** بنەواشە، بنەچە، سەرەتا، دەسپێك، مایە، ماددە، ڕێسا، بابەتی سەرەکی، ڕێسای ئاکار و هەڵسوکەوت، بڕوا، سەلیقە، مەرام، پڕەنسیپ. بنەمای ئەخلاقی.

**پرنگ:** سیقاڵ دان.

**پرو:** بەڵگە، دیکۆمێنت، نیشانە.

**پروا:** 1) مەترسی، سام، ترس، سڵ، باك. 2) ئاوڕ، بایەخ.

**پرواداشتن:** سڵ کردن، مەترسی کردن، ئاوڕ لێدانەوە، لالێ کردنەوە، گرنگی پێدان.

**پروار:** بڕوانە: "پرواری".

**پرواری:** دابەستە، دابەسراو، دابەسیاو، ئەرەبەستە، بەختە، ڕەپێتە، بەسلەمە، دانی، دەرماڵە، دەرماڵی، هەملك.

**پرواز:** فڕین، هەڵفڕ، هەڵفڕین، هەڵفڕان، باڵ گرتنەوە.

**پرواز دادن:** هەڵفڕاندن، هەڵفڕانن، بوونە هۆی باڵ گرتنەوە.

**پرواز دهندە:** هەڵفڕێن، شتێ کە باڵدار وە فڕین دەخا.

**پرواز زدن:** بڕوانە: "پرواز کردن".

**پروازکردن:** هەل فڕین، هەڵفڕین، فڕین، ڕفین، فڕەکردن، دەحەواچوون، دەحەواوەچوون، باڵگرتن، باڵگرتنەوە، باڵەوگرتن، باڵۆگرتن، پەڕین.

**پروازە:** خۆراك، تێشوو.

**پروازیبازی:** سەما.





**پرواس:** 1) هەست پێکردن، دەس پیاهێنان. 2) ڕزگار، خەلاس.

**پرواسیدن:** 1) سوون، پیاهێنان. 2) بڕوانە: "یازیدن". 3) ئامادەکردن و لێبوونەوە.

**پروانەکار:** مۆڵەتی کار، جەوازی کار.

**پر و پا قرص:** 1) پێداگر و ڕاوەستاو لەسەر مەبەست. 2) هەمیشەیی، دایمی. 3) پتەو، قایم، تۆکمە. 4) بە شەخسییەت.

**پروپاگاند:** بانگەشە، پڕوپاگەندە، هەوڵدان بۆ برەوپێدانی مەرام و ڕێباز.

**پروتست:** 1) ناڕەزایەتی دەربڕین، پڕۆتێستۆ کردن. 2) بڕوانە: "واخواست".

**پروتستان:** ناوی گشتی بڕوامەندان بە چاکسازیی ئایینی مەسیح، پێڕەوانی ئایینی لۆتێر، یەکێك لە لکە سێیانەکانی ئایینی مەسیح کە بڕوایان بە سەرۆکی ڕوحانی (پاپ) نیە.

**پروتکل:** پڕۆتۆکۆل، ڕەشنووسی گرێبەست یان ئەو شتانەی کە لە وتووێژەکان دا یادداشت دەکرێ و دوایە دەکرێتە پەیمان.دام و دەستوور و ڕێساگەلێ کە لە پێوەندییە نێونەتەوەییەکان دا باوە.

**پروتوپلاسم:** ماددەیەکە وەك سپێنەی هێلکە لە نێو خانەکانی گیانداران و گیایەکان دا کە لە دوو بەشی سیتۆپلاسم و ناوك پێکهاتوە.

**پروتون:** بەشی ناوەندیی ئەتۆم کە پێکەوە دەگەڵ نۆترۆن ناوکی ئەتۆم پێك دێنن.

**پرودین:** بڕوانە: "مغذّی".

**پروراندن:** بڕوانە: "پرورانیدن".

**پرورانندە:** پەروەر، ڕاهێنەر، بەخێوکەر.

**پرورانیدن:** پەروەراندن، پەروەردەکردن، بارهێنان، بارهاوردن، پێگەیاندن، ڕەعەمەل هێنان، بەخێوکردن، بەخۆکردن، بەخویکردن، ئامادە کردن، بەخەم کردن. "**پرورانیدە**": پەروەردەکراو، بار هێنراو، خەملێندراو، بەخێوکراو.

**پروردگار:** پەروەر، پەروەردەکار، ڕاهێنەر، یەکێك لە ناوەکانی خوا.

**پروردگری:** بڕوانە: "تغذیە".

**پروردن:** بڕوانە: "پرورانیدن".

**پروردنی:** شیاوی پەروەردەکردن.

**پروردە:** 1) پەروەردەکراو، بار هێنراو، ڕاهێنراو، پێگەیو، ڕەعەمەل هاتوو. 2) منداڵ. 3) بڕوانە: "سنجیدە".

**پرورش:** 1) پەروەردە، بارهێنان، کردەی "پروردن". 2) بە مانای پەرستاری و بەندەییش هاتوە. 3) دابونەریت، کولتوور. 4) خۆراك و غەزا.

**پرورش دادن:** پەروەردەکردن، ڕاهێنان، بارهێنان، بەخێوکردن، ڕەنێوهێنان، هینکرن.

**پرورش دام:** چاخەوکردن، قەڵەوکردنی حەیوانی گۆشت.

**پرورشـــــگاه:** پەروەردگـــە، شـــوێنی پەروەردەکردن.

**پرورش یافتن:** پەروەردەبوون، گۆشکران، هێن بوون.

**پـــرورشـــی:** 1) پـــــەروەردەیـــــی. 2) پـەروەردەکراو لـە دەرەوەی ژینگـەی سروشتی خۆی.

**پـــروز:** 1) داوێنـی جلوبـەرگ و فـەرش و شتی وا. 2) بنەوبنەچە. 3) جەوهەر.

**پرورنده:** بڕوانە: "پرورانندە".

**پروریدن:** بڕوانە: "پروردن".

**پروز:** 1) رەچەڵـەك، بنـەچەکە، بنـەما. 2) پەراوێز، پینە.

**پـروزی:** 1) بنـەڕەتـی، بنـچـینـەیـی. 2) سەرەتایی.

**پروژکتـور:** نـوور هاوێـژ، تیـشك هاوێـژ. دەزگای نیشاندانی فیلم یان ئیسلاید.

**پروژه:** پـڕۆژە، نەخشە، پـلان، گەڵاڵـەی کار، نییەت، پلان و نەخشەی ئەو کارانەی دەبێ ئەنجام بدرێن.

**پروســـس:** 1) پرۆسـە. 2) (کـامپیوتێر) بڕوانە:"پردازش".

**پروسه:** پرۆسە، رەوت.

**پروفاز:** قۆناغی ئامادەیی.

**پروفرما:** پێشنیاری فرۆش یـان فـاکتۆری کاتی بۆ ناردنە بانك و کردنەوەی ئیحتوبار بە قازانجی فرۆشیار.

**پروفـــسیونل:** پیـشەیی، پیـشەوەر، پیشەگەر، پسپۆڕ لـە کـار و هونـەرێك دا، لێزان.

**پروفیـل:** بـڕ، لاڕوو، نیـوڕوو، نەخـشە و وێنەی بینایەك کە لایەکی نیشان بـدا وەك ئەوەی لە ناوەڕاست را بڕیبێتیان.

**پروفیلاسـکی:** (پزیـشکی) پێـشگیری لـە نەخۆشی.

**پروکاسیون:** هـان دان، دنـەدان، هـۆ، تێك دانـی کارێـك لـە رووی نەخـشە و پـێش بینییەوە.

**پروگرام:** پرۆگرام، بەرنامە.

**پرولتاریـا:** چـینی کرێکـار، چـینی رەنجبـەر، کەسـانێك کـە جگـە لـە هەقدەستی رۆژانە داهاتێکی دیکەیان نیە.

**پـرولتر:** کرێکـار، رەنجبـەر، ئـەرك دەر، زەحمەتکێش، کەسێ کە بێجگـە لـە هـەق دەستی خۆی داهاتێکی تری نیە.

**پرونجا:** فایل، پووشە.

**پرونـده:** پەروەنـدە، پەروەنـە، هەڤـ نڤـیس، فایـل، دۆسـیە (ئـەم وشـەیە فەڕانسییە). پێشینەی کەسێك.

**پرویختن:** بڕوانە: "بیختن".

**پرویش:** بڕوانە: "اهمال".

**پروهان:** گشتی، هەموانی.

**پرهختن:** بڕوانە: "پرهیختن".

**پر هنر:** بڕوانە: "هنرمند".





**پرهودن:** سووتان، سووتیان.

**پر هول:** فرە ترسێنەر، سامناك.

**پرهون:** بڕوانە:"دایرە".

**پرهونی:** بڕوانە:"مدور".

**پر هیـاهو:** پـڕ هـەراوهوریا، بـەگوڕەگوڕ، کەسـێ کـە زۆر قوولـەقوول و قیڕەقـیڕ دەکا.

**پرهیب:** بڕوانە:"شبح".

**پرهیختن:** پارێزکردن، دووریکردن.

**پرهیختار:** 1) بڕوانە:"معلم". 2) بڕوانـە: "محتاط".

**پرهیز:** پارێز، پـەهریز، بـەهریز، دەژ، لـە هێندێ خۆراك دەم گرتنەوە، تەکینەوە لە هەنـدێ خـواردن، خۆپـارێزی، دوورە پەرێزی.

**پرهیزانیدن:** پارێزاندن، ناچار بـە پارێز کردن.

**پرهیز جستن:** بڕوانە: "پرهیز کردن".

**پرهیـز شکـستن:** تـەرکی پـارێز کـردن، وازهێنان لە پارێز کردن.

**پرهیزکار:** بڕوانە: "پرهیزگار".

**پرهیزکـاری:** خۆپـارێزی، داوێـن پـاکی، دشکردن.

**پرهیزکـردن:** پـارێزکردن، پـەرهێزکردن، خۆپاراسـتن، خوەپاراسـتن، خۆپـارازتن، خـۆ دوورخـستن، خـۆلادان، دشـکردن، دوورە پەرێز بوون.

**پرهیزگـــار:** خۆپـــارێز، پارێزگـــار، پەرهێزگار، پارێزکار، تەرکەدنیا، تۆبەدار، تۆبـەکار، خۆپارێزلـە خۆشـی دنیـا، لەخواترس، دینداری راست، داوێن پاك.

**پرهیزناك:** پارێزکەر/ پارێزکار.

**پرهیزنده:** پارێزکەر.

**پرهیزیدن:** 1) پـارێزکردن، دووری کـردن، خۆبـواردن لـە کـارێ یـان شـتێك، خوەپاراسـتن. 2) ترسـیان. 3) راگـرتن، پاراستن.

**پری‌افسا:** بڕوانە: "افسونگر".

**پری‌بند:** بڕوانە:"جن گیر".

**پریچهر:** پەری روو، خوشیك، جوان چاك، فرە قەشەنگ، رندك.

**پری‌خوان:** بڕوانە:"جن گیر".

**پری‌دار:** هاڵە لێدراو، شێت، دێوانە.

**پریدن:** (پَ) پەڕ، پەڕین، فڕین، هـەڵفڕین، فـڕان، ڤەگـەمزین، هەڵبـەزان، بـازدان، بازبردن، قەفازتن، وزاقدان، وزاق بەسـتن، باڵەوگرتن، باڵ گرتنەوە. "**از خواب پریـدن**": لە پڕ لە خەو هەستان، لە خـەو راچـەنین. "**پریـدن انـدام**": لـەرزینی بـێ‌ئـیرادەی ئەنـدامێك، پڵدان. "**پریـدن جـان**": مـردن. "**پریـدن بـا کـسی**": هـەبوونی هاتووچـۆ و پێوەنـدی دەگـەڵ وی. "**بـەهم پریـدن**": دەگەڵ یە ك تێکهەڵچوون و بەشەڕهاتن.

**پریـــدن:** (پُ) پڕبـــوون، کەڵەکـەبوون، لێوڕێژبوون، تژیبوون.

**پریده:** هەڵ فڕیو، فڕیو، دەحەواچوو.

**پری دیدار:** بڕوانە: "پریچهر".

**پریرو:** پەری روخسار، پەریڕوو.

**پریروز:** پێرەکە، دوو ڕۆژ پێشتر.

**پریرین:** تازەپێگەیشتوو.

**پریز:** 1) هەرا، گوڕە، نەڕە. 2) هێڵەك. 3) شاخە، رشتە.4) پرێزی کارەبا.

**پریزاد:** پەریزادە، منالّی فریشتە، پەری نەژاد، بریتی لە جوان چاکی مێوینە.

**پریزدن:** پەڕین، فڕین، هەڵفڕین.

**پریسا:** بڕوانە: "افسونگر".

**پریش:** پەرێشان، پەرژ، پەخشان، بڵاو، پەریشە.

**پریشان:** پەشێو، پەشێواو، پەشۆکاو، پەشۆکیاو، پەژێو، شپرزە، شپڕێو، شڵەژیو، بیربڵاو، مەلوول، زوێن، پەرێشان.

**پریشان افکار:** بیربڵاوی، وەرەگەیرایش.

**پریشان حال:** بێکەیف، نەباش، پڕوپەشێو، پەشێو، شپرزە، شاپرزە، شاپرزا، شەق و شڕ، شەوێق، بێ سەروبەر، حالّ خراپ، حالّ پەرێشان، بێ حال، پەرێشان و سەرلێشێویاگ، ناساز، ناکۆك، دڵتەنگ، بەوبەخت، نیگەران، کەلەلا، کەساس.

**پریشان دل:** دڵ پەرێشان، ناڕەحەت، نیگەران.

**پریشان روزگار:** رۆژ رەش، دەسکورت، دۆش داماو، کەسێ کە ژیانی خۆشی نیە.

**پریشان شدن:** بڵاوبوون، پرژان، پەخشان بوون، پەشۆکان، پەشۆکیان، پەرێشان بوون، نیگەران بوون، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "آشفتن".

**پریشانی:** بڕوانە: "آشفتگی".

**پریشانیدن:** پەرێشان کردن، پەشۆکاندن، نیگەران کردن، پرژاندن، پەخشان کردن، بڵاوکردن.

**پریشب:** پێرێشەو، دووشەوپێش، شەوادیتر.

**پریشن:** بڕوانە: "پریشان".

**پریشیدن:** بڕوانە: "پریشان شدن".

**پریشندگی:** کردەی پەرێشان کردن.

**پریشنده:** پەشێو کەر، پەرێشان کەر.

**پریشیدگی:** چۆنیەتی پەرێشانی و پەشێوی، شێواوی، شپڕێوی، پشێوی، شێوان.

**پری نژاد:** بڕوانە: "پریزاد".

**پریود:** 1) بڕوانە:"قاعدگی". 2) (فیزیك) دەورەی لەدوا یەك.

**پریوش:** پەری ئاسا، وەك پەری، پەری روو.

**پزا:** لێنەر، پێژەر. زووپەز، هەر شتێ کە زوو و بەتینی کەم لێبنرێ.

**پزاختن:** بڕوانە: "گداختن".

**پزان:** 1) لەحاڵی لێنان/ پێژاندا. 2) لێنەر، ئامادەکەر.





**پزاندن:** 1) بڕوانە: "پختن". 2) نەرمکردنی برین تا ئەو جێگەی کە چڵکەکەی بێتەدەر.

**پزاننده:** پێژەر، لێنەر.

**پز دادن/ آمدن:** خۆنوێنی، خۆڕانان.

**پزش:** لێنان، کردەی لێنان.

**پزشکیار:** هاریکاری پزیشك، برین پێچ.

**پزنده:** لێنەر، پێژەر، دوو وشەی پەز و پێژ ئەگەر وەك پاشگر بێن مانای (پزندە) دەدەن وەك خشت پێژ(دارپێژ)، نان پێژ(برژێن)، چاپەز، ئاشپەز.

**پزوا:** کەسی رووت و رەجاڵ و شڕۆڵ.

**پزوایی:** بێلیاقەت و خوێڕی.

**پزیدن:** بڕوانە: "پختن".

**پزیسیون:** شوێن، جێگە، پێگە، دۆخ، بە پلە و پایە گەیشتن، دانان یان گرتن، لەش و قەوارەی کەسێك.

**پژ:** (پُ) بڕوانە: "سرماریزه".

**پژمان:** 1) خەمبار، ژاکاو، شەمزیو، دڵتەنگ. 2) پەشیمان. 3) بێ هیوا.

**پژمراندن:** شەمزاندن، ژاکاندن، چرچاندن، خەمناك کردن.

**پژمراننده:** ژاکێن، شەمزێن.

**پژمردگی:** سیسی، ژاکاوی، ژەڵم، شەمز، شەمس، چرچ (هەڵاتن/ هەڵگەڕان).

**پژمردن:** ژاکان، شەمزان، شەمزین، سیس هەڵگەڕان، سیس بوون، سیسیان، چرچ بوون، هەڵچرچان، کرچیان، ژوڵ، ژوڵیان، گەچڵان، هەڵ چرچان، چرمسین، چلمسین پەڕمووچان، پڵژیان، خەمباربوون، دڵتەنگ بوون. "**پژمرده**": ژاکاو، ژاکیاگ، ژاکیان، سیس، سیس بووگ، سیسیاگ، شەمزی، شەمزیو، شەمزاو، چرچ، چرچاو، چرچ هەڵگەڕاو، چرمسی، چەرمسی، چلمسی، جلوا، ژەلمسە، ژولسە، ژوڵیاگ، پڵژ، پڵژیاگ، گەچڵ، پەڕمووچ، لە گەشە کەوتوو،خەمبار، خەمناك، دڵتەنگ، کز، دوژ.

**پژمردەخاطر:** دڵتەمری، دڵ وشك، مڕو مۆچ، کەم پێکەنین.

**پژمردەشدن:** بڕوانە: "پژمردن".

**پژمریدن:** بڕوانە: "پژمردن".

**پژنگ:** رێگەچارە.

**پژواك:** زایەڵە، پێژن، دەنگدانەوە، "ئێکۆ".

**پژوژناك:** بڕوانە: "مصر".

**پژولاندن:** ژاکاندن، ژاکانن، چرچاندن، سیس کردن، دڵتەنگ کردن، پەرێشان کردن، رەنجاندن.

**پژولاننده:** ژاکێن، رەنجێن، ئازاردەر.

**پژولانیدن:** بڕوانە: "پژولاندن".

**پژولش:** پەرێشانی، ژاکاوی، کزی و خەمباری.

**پژولگر:** مەستی هێن، گیرا.

**پژولیدن:** چرچ بوون، سیس بوون، ژاکان، گرژ(بوون/ هەڵاتن)، کرچیان، گەچڵان. "**پژولیده**": ژاکاو، چرچاو، سیس هەڵگەڕاو، سیس و چرچ، هەڵقرچاو، کرچ، تێت ترنجاو، ژار، گەچڵ، خەمبار، پەرێشان، دڵ بە خەم، گژن.

**پژوم:** دەروێش، هەژار، خزان، سواڵکەر، زەبوون.

**پژوهان:** توێژەر، لە حاڵی توێژینەوەدا.

**پژوهانە:** هەق(دەست)ی لێکۆڵینەوە.

**پژوهش:** 1) توێژینەوە، لێتوێژینەوە، لێ وردبوونەوە، شیکردنەوە، کۆڵینەوە، ڤەکۆلان، کۆڵانەوە، هووراندن، هینکاری، منیٚکرن، منیٚکاری، هێرە، پاسادان، داباش.2) بڕوانە:"کنجکاوی". 3) بڕوانە: "استیناف".

**پژوهش حال:** بڕوانە: "احوالپرسی".

**پژوهش خواندە:** کەسی شکایەت لێکراو.

**پژوهش خواە:** شکایەتکار، سکاڵاکەر.

**پژوهش خواهی:** ئیعتڕاز لە قۆناغی دووهەمی پێڕاگەیشتن بە پەروەندە.

**پژوهشگاە:** توێژینگە.

**پژوهشگر:** توێژەر، تۆژەر، تۆژەرەوە، تۆژێن، پەیجۆر، کۆڵەر، کۆڵەرەوە، سەرنج دەر، منیٚکار، هوورەنێڕ، هێرەکەر، هینکار.

**پژوهندگی:** توێژینەوە، پشکنین، گەڕان، کۆڵینەوە،تاوتویٚ.

**پژوهندە:** بڕوانە: "پژوهشگر".

**پژوهیدن:** توێژینەوە، گەڕان، پشکنین، لێکۆڵینەوە، خوازتن.

**پژوهیدە:** توێژراو، پشکنراو، تاوتویٚکراو.

**پژهان:** ئارەزوو، ئارەزووی شتی باشی خەڵکی بۆ خۆت کردن بیٚئەوەی ئارەزووی نەبوونی ئەو شتانە بۆ خەڵك بکەی، پێچەوانەی"حسد".

**پس:** کەوابوو، کەوایە، جا.

**پس آمد:** بڕوانە:"پیامد".

**پسابە:** پاشاو، نشتاو.

**پسا پیش:** پاش وپێش، پیش و پاش، بەرودوا.

**پساچین:** پاشەڕۆك، پاشارۆ، پاشەبەرە، خاپەڕۆك، خەرتۆك، خرتك، میوەی بەجێماو، دوای باغ رنین.

**پسادست:** پاشەکی، لەدوایی پارەدان، قەرز، بەرانبەر بەیعانە.

**پس افت:** 1) دواخراو، قەرزیٚ کە لە کاتی خۆی دا نەدرابیٚ.2) پاشەکەوت، پەزمەنە.

**پس افتادن:** 1) دواکەوتن، پاش خران. 2) لە هۆشچوون، بێهۆش بوون. 3) مردن. 4) وەدنیاهاتن، هاتنەدی. 5) جێبەجیٚ نەبوونی کاریٚ لە کاتی خۆیدا.

**پس افکند:** 1) پاشەکەوت، پەزمەنە. 2) ئاکام، دەرەنجام.

**پس افکندن:** دواخستن، وەدواخستن، پاشەکەوت کردن، پاش هێلان.

**پس افکندە:** دواخراو، پاشەکەوت، پەسمەنە.

**پساگرا:** پاشینەخواز.

**پسامدرن:** بڕوانە:"پست مدرن".

**پس انداختن:** 1) وەدواخستن. 2) پاشەکەفت کردن. 3) وەدنیاهێنان، وەدیهێنان.

**پس انداز:** بڕوانە: "اندوختە".

**پس اندازکردن:** بڕوانە: "اندوختن".

**پس اندازکنندە:** پەزمەنەکەر، نۆتەکەر، نیاتەکار.





**پسان فردا:** سیٚ رۆژیتر.

**پساوند:** بڕوانە: "پسوند".

**پساویدن:** بڕوانە: "بساویدن".

**پساهنگ:** بڕوانە: "پس قراول".

**پسایند:** ئاکام، دەرەنجام.

**پس برداشتن:** وەرگرتنەوە.

**پس بردن:** گەڕاندنەوە، دانەوە.

**پس پسکی:** لە حاڵی بەرەودواوەچوون دا.

**پس پشت:** پشتەسەر، دواوە.

**پست:** (پَ) نزم، نەوی، نوی، نەمە، نیمر، نقی، نەوەر، وهار، نشێو. خوێڕیو هیچکە، رەزیل، بەدئاکار، تەرەس، هەتمچە. بەخێلٚ، بەخیل. کورت، پێچەوانەی بلێند. سەرەتایی. "**پست و بلند**": بەرز و نزم، بەرز و نەوی، بلێند و نەوی.

**پست:** (پُ) 1) ئیدارەی پۆستە و گەیاندن. 2) پلەوپایە، پۆست. 3) نگابان، پاسەوان. 4) نگابانی، پاسەوانی. 5) شوێنی جێگیربوونی نگابان. "**پست بازرسی**": بازگە، پرسگە، شوێنی جێگیربوونی هێزی ئینتیزامی بۆ کۆنتڕۆلٚ کردنی مسافیرەکان."**پست تصویری**": فاکس. "**پست کردن**": ناردن بە هۆی پۆستەوە. "**بە پست کسی خوردن**": تووشی وی بوون یان دەگەلٚ وی سەروکەللە لێدان.

**پستا:** 1) پەسمەنە، پاشکەوت. 2) نۆبە، کەڕەت، جار.

**پستادست:** بڕوانە: "پسادست".

**پستامند:** بڕوانە:"متناوب".

**پستاندار:** مەمکدار، شیردەر، گواندار، گوهاندار، بەگوان.

**پستایش:** دان و ستان، مامڵە.

**پستایی:** بڕوانە: "پس انداز".

**پست پایە:** سووك، نزم.

**پست تحلیلی:** (پُ) پاش شیکارانە.

**پست ساختارگرایی:** (پُ)پاش پێکهاتەخوازی.

**پست شدن:** پەست و زەلیل بوون، لە ناو چوون، تەفروتوونابوون.

**پست شمردن:** بە پەست و زەلیل دانان، بە سووك و کەم گرتن.

**پست فطرت:** نزە، نز، بیٚئابڕوو، بیٚفەڕ، نیازپیس، ئاکار خراپ، بیٚئاکار، پەست، پەسپندە، پەسندە، ناپەسند، گناس.

**پست فطرتی:** پەستی، بیٚئاکاری.

**پست کردن:** (پَ) هێنانەخوار، نزم کردن، خستنە بەر پیٚ، پیٚ رێخستن، سووك کردن، پەست کردن، زەلیل کردن."**پست کردن آتش**": دامرکاندنی ئاگر.

**پست مدرن:** پاش مودێڕنیتە، پۆست مودێرنیتە، قوتابخانە و شێوازێکە لە نیگارکێشی وئەدەبیات و هتد دا کە دەگەلٚ بنەماکانی کلاسیکی دژایەتی ناکا بەڵکوو بە شێوەیەکی نویٚ دەیخاتەڕوو یان قوتابخانەی مودێڕنیزم بەشێوەیەکی پەڕگرانە بەکاردەبا.

**پستو:** خەڵوەتی، وچخانە، گەزنە، گەنجە، پاشخان، ژووری ئەزراق.

**پستی:** نەویایەتی، نەوێتی، نزمی، سووکی، پەستی.

**پستیش:** دەسکرد، بەرانبەری خۆڕسك.

**پستیگرفتن:** کەم کردن.

**پس خریدن:** کڕینەوەی شتی فرۆشراوی خۆت.

**پس خواندن:** 1) بانگهێشت کردنەوە. 2) تێکدان و پووچەڵکردنەوەی شتی وەك بڕیار و قەرارداد.

**پس خورد:** 1) (برق) فیدبەك. 2) بەرماو، پاشماوە.

**پس خوردە:** بڕوانە: "پس ماندە".

**پسداد:** بڕوانە: "استرداد".

**پس دادن:** 1) دانەوە، وێدانەوە، دانەدواوە، گەڕاندنەوە، گەڕاننەوە، وەگەڕاندن، دواوەدان. 2) تەڕاییدان، لێتکان. 3) خوێندنەوە یان وتنەوەی وانەیەك کە پێشتر فێری بووی یان لەبەری کراوە. 4) دەردانەوەی شتێ کە پێشتر مژراوە. 5) دەرخستنی هەست و کوڵە دەروونییەکان.

**پس دست:** پاشەکەوت، پەزمەنە.

**پسراندر:** زڕکوڕ.

**پس راندن:** بەرەودواوەبردن، پاشەکشە پێکردن.

**پسرحاجی:** پیاگی لاوی دەوڵەمەند.

**پسرزا:** ژنێ کە هەر کوڕی دەبێ.

**پس رفتن:** بەرەو دواوە چوون، پاشەکشەکردن. هاتنەخواری چۆنایەتی شتێك.

**پس روندە:** بەرەودواچوو، پاشەکشێکەر، پاشڤەڕۆ، پێڕەو.

**پس روی:** بەرەودواوەچوون، پاشڤەڕۆیی، پاشەکشەکردن. پێڕەوی.

**پسرینە:** لە رەگەزی کوڕ.

**پس زدن:** لادان، بەرەو دواوە بردن، تەست دانەوە، دوورخستنەوە.

**پس زدە:** بێکەلك، بەدەردنەخور.

**پس زمینە:** 1) بەشێك لە وێنە یان دیمەن کە لە پشت بابەتی سەرەکییەوە جێ دەگرێ، "بەكگراوند". 2) پێشینەی زەینی. 3) شیکردنەوەیەکی کورتی ژیان و رادەی خوێندەواری و ئەزموونی کاری.

**پس ستدن:** بڕوانە: "پس ستاندن".

**پسغدە:** ئامادە، ساز، تەیار.

**پس غذایی:** دێسێر.

**پس فرستادن:** گەڕاندنەوە، گەڕاننەوە، ڤەگەراندن، دانەوە، ناردنەوە.

**پس فکند:** بڕوانە: "پس افکندن".

**پس قراول:** پاشدار، بەرانبەری پێشەنگ، ئەو چەکدارانەی لە دوای لەشکرەوە دەڕۆن.

**پس کرایە:** ئەو بڕە پارەیە لە کرێ کە دوای گەیشتن بە شوێنی مەبەست دەدرێ.





**پس کردن:** 1) لادان. 2) پێوان، بڕین.

**پس کشند:** بڕوانە: "جزر".

**پس کشیدن:** بەرەودواوەچوون، کێشانەوە، کشانەوە، خۆکێشانەوە.

**پس کوچە:** لاکۆڵان.

**پس گشتگاە:** بڕوانە: "مرجع".

**پس گذاشت:** پاشەکەوت، پەسەناز، پەسمەنە.

**پسگرایی:** کۆنەخوازی، پاشینەخوازی، کۆنەپەرستی.

**پس گرفتن:** سەندنەوە، ستاندنەوە، سەننەوە، وەرگرتنەوە، بردنەوە. "**پس گرفتن چیزی**( **حرف، شکایت** و ...)": وازهێنان لێی.

**پس گشت:** بڕوانە: "مراجعە".

**پس گفتن:** وڵامدانەوە.

**پس لرزە:** پاش لەرزە.

**پسلە:** پشتەسەر. "**درپسلە**": نهێنییانە، بەشێوەی نهێنی.

**پسلەخور:** ئەوەی لای خەڵکی کەم دەخوا و بەدزییەوە زۆر دەخوا.

**پس ماندن:** دواکەوتن، پاش کەوتن، پاش مان.

**پس ماندە:** 1) دواکەوتوو، پاش کەوتوو. 2) بەرماوە، بەرماو، پاشماوە، پاشمەنە، پاتە، پاشخوان، پاشخوانە، پاشاخوڕ، پاشەڕۆك، سەمەل، بەرماوەی لەوەڕ.

**پسند:** قبووڵ، بەگەن، پەسن، پەسند، پەسەن، بەردڵ، دڵخواز.سەلیقە. بەڕمێنی.

**پسندر:** زڕکوڕ.

**پسندکردن:** بڕوانە: "پسندیدن".

**پسندندە:** پەسندەر، پەسندار.

**پسندیدن:** پەسندکردن، بەچاك زانین، هەڵبژاردن، نەقاندن، بەدڵ، بەدڵ بوون، بەدڵەوە چەسپان، بەدڵەوەچەسپین، بەردڵ کەوتن، وەبەردڵ کەوتن، دڵ پیاچوون، پەژراندن، قبووڵ کردن.

**پسندیدە:** پەسند و بەڕمێن، پەسند و بەردڵ، هەڵبژێردراو، پەسندکراو، حەز، جوان. ستایشکراو.

**پس نشاندن:** بەرەو دواوە رادان، پاشەکشەپێکردن، دوورخستنەوە، تێك شکاندنی لەشکری دوژمن و دوورخستنەوەی.

**پس نشستن:** خۆ کێشانەوە، نسکۆهێنان لە شەڕ دا و پاشەکشەکردن.

**پس نهادن:** بڕوانە: "پس انداز کردن".

**پسوا:** سەربە، بەستراوە.

**پس و پیش:** بڕوانە: "پساپیش".

**پسودن:** بڕوانە: "بسودن".

**پسوند:** پاشگر. "**پسوند تعریف**": (ڕێزمان) شۆناس. "**پسوند ترتیبی**": (ڕێزمان) پاشگری روتبەیی. "**پسوند نسبت**": (ڕێزمان) پاشگری پاڵشت/ پاڵوێدان.

**پسویی:** چینی وەرزێران.

**پسی:** 1) ناچاری. 2) بڕوانە: "تأخر".

**پسیشیسم:** دەروونگەرێتی.

**پسی‌شیك:** دەروونی، رۆحی.

**پسیکانالیز:** دەروون شیکاری، شیکاریی دەروونی.

**پسیکوتراپی:** دەروون دەرمانی، چارەسەر کردنی پشێوییە دەروونییەکان لە رێگەی دەروون شیکارییەوە.

**پسیکوز:** دەروون پەرێشی/ ئالۆزی.

**پسیکوفیزیولوژی:** زانستی رۆح و ئەرکەکانی ئەندامانی لەش، فیزیۆلۆژی دەروونی.

**پسیکولوژی:** دەروون ناسی، دەروون زانی، زانستی دەروونی، تاوتوێی چۆنیەتی دەروونی، چۆنیەتی هەڵسوکەوتی مرۆ لە ژینگەی خۆیدا.

**پسی‌میست:** رەش بین، لاگری پسیمیزم.

**پسیمیسم:** رەشبینی، تیۆری ئەو کەسانەی کە رەنج و ئێش لە ژیانی مرۆڤ دا بە پوزەتیف دەزانن، بەرانبەری ئۆپتیمیزم.

**پسین:** دوایی، دوایین، دووماهی، دوومایی، ئاخری، پاشن.

**پسینگان:** کۆتایی، دوایی.

**پسینگاه:** کاتی ئێوارە.

**پسینیان:** بڕوانە: "آیندگان".

**پشاسپ:** بڕوانە: "بوشاسب".

**پشتا پشت:** 1) پشت سەرییەك، بەدوای یەکتردا. 2) یارمەتیدەر، یاریدەدەر. 3) دژی‌یەك، لێکدژ.

**پشتارە:** بڕوانە: "پشتوارە".

**پشتبان:** بڕوانە: "پشتیبان".

**پشت بر پشت:** دژی یەکتر.

**پشت برگردانیدن:** هەڵاتن لەبەر دوژمن.

**پشت بە پشت:** نەسڵ دوای نەسڵ، پشتاوپشت، پشت بە پشت، پشت سەری یەك.

**پشت پا زدن:** بریتی لە تەرك کردن، روو وەرگێڕان، پشت تێکردن، وازهێنان.

**پشت پردە:** نهێنی، شاراوە.

**پشت چشم آمدن:** نازکردن، فیزکردن.

**پشت دادن:** 1) پاڵدانەوە. 2) گەڕانەوە، روو وەرگێڕان، پشت کردنە گۆڕەپانی شەڕ و هەڵاتن لە پێش دوژمنەوە، تێ تەقانن.

**پشتدار:** پشت و پەنا، پشتیوان. پاشڵدار، کلکدار.

**پشت دست برکندن:** خوراندنی پشتی دەست.

**پشت دست خاییدن:** بریتی لە پەشیمان بوونەوە، هەسر خواردن.

**پشت دوتاکردن:** کڕنۆش بردن، چەمینەوە.

**پشت راست داشتن بە کسی:** پشت گەرم بوون بەو.

**پشت رو:** پێچەوانە، ئاوەژوو.

**پشت ریز:** بڕوانە:"پیاپی".

**پشت سر گذاشتن:** پێوان، بڕین. تێپەڕاندن، بەکۆتایی‌گەیاندنی دەورە یان قۆناغێ لە ژیان.





**پشت سر هم:** بڕوانە: "پیاپی".

**پشتك:** تەقڵە، مەقولات، سەرمەقولات، خۆ هەڵگێڕانەوە بە پشت و روودا.

**پشتك زدن:** تەقڵەلێدان، سەرمەقولات دان، سەرمەقولانج دان، دەکبووز، خۆ ئاوەژووکردنەوە لە فڕین دا یان لە کاتی بازبردن دا.

**پشتکار:** نەبەزی، لەسەرچوون، بەردەوام بوون، هەوڵ و تێکۆشان لە کار دا، هێزی جێبەجێکردن و بە کۆتایی گەیاندنی کارێك، خۆڕاگریو راوەستاوی لە بەرەوپێش بردنی ئەرکێك دا.

**پشتکاردار:** پێداگر و جیددی، هەوڵدەر و تێکۆشەر.

**پشت کردن:** 1) روو وەرگێڕان، پشت تێکردن، هەڵاتن. 2) پاڵدانەوە.

**پشت کردن بر چیزی:** تەرك کردنی شتێ، وازهێنان لێی.

**پشت کردن کتاب:** بڕوانە: "تجلید".

**پشت کسی ایستادن:** بریتی لە پشتیوانی لێکردنی.

**پشت کسی لرزیدن:** بریتی لە تووشی ترس و خۆف هاتن.

**پشت کوژ:** پشت چەمیو، پشت چەماوە، پشت کووڕ، پشت کۆم، پشت خوویل.

**پشت گرفتن:** وزەگرتن، هێزگرتن.

**پشت گرمی:** پاڵدانەوە، متمانە، پشت پێوە بەستن، خاترجەمی، ئەرخەیانی، دڵنیایی.

**پشت گوش انداختن:** بڕوانە: "اهمال".

**پشتلنگ:** بلح، بێهوودە، کەم وکوڕی دار، سەقەت، عەیب دار، سست، وەدواخراو.

**پشت میزنشین:** کارمەندی ئیدارە.

**پشت ناخن:** بریتی لە رادەیەکی زۆر کەم.

**پشت نمودن:** 1) پشت پێ‌بەستن، پشت بەستن. 2) روو وەرگێڕان، پشتتێکردن. 3) وازهێنان، تەرك کردن.

**پشتوار:** پشتیوان، پشت و پەنا، پاڵپشت.

**پشتوارە:** پشتە، پشتی، پشتەك، پشتیوانە، پشتیوان، کۆڵ و بار، باری کۆڵ.

**پشتوان:** پشتیوان، پشت و پەنا، پاڵپشت.

**پشتوانە:** پاشخان، پاڵپشت، پشتیوان.

**پشت و بازو:** پشتیوان.

**پشت و پسلە:** شوێنی دوور لە چاوان، حەشارگە.

**پشت و پناە:** پشتیوان، پشت و پەنا، پشتگر، هاریکار، نگابان، پارێزەر.

**پشت و رو یکی:** ئەوەی دەروون و رواڵەتی یەکە، بێ‌ڕیا.

**پشتە:** 1) بڕوانە: "پشتوارە". 2) گرد، تەپۆڵکە. 3) مەودای نێوان دوو کارێز.

**پشت هم:** پشت سەری یەك، پەیتاپەیتا و بێ‌پسانەوە.

**پشت هم انداز:** پیلانگێڕ، فێڵباز، کەڵەکباز، گزیکار.

**پشتیبان:** پشتیوان، پشت وپەنا، پشتگر، هاریکار، یاریدەدەر، یارمەتیدەر، لایەنگر، پارێزەر، ئەرخە.

**پشتیبانی:** پشتیوانی، یاریدە، پشتگری، هاریکاری، لاگیری، لایەنگری.

**پشتیبانی کردن:** پشتیوانی لێکردن، پشتیوانیکردن، پشتی کەسێك گرتن و یارمەتی دانی، داژداری کردن، داشداری کردن، لاگیریکردن، لایەنگریکردن، دالدەدان.

**پشتیکردن:** پشتیوانیلێکردن، یارمەتیدان.

**پشتی گر:** پشتیوان، یاریدەدەر، هاریکار.

**پشتیوان:** بڕوانە: "پشتیبان".

**پشتیوانە دیوار:** بەرهەڵیغ، پشتیوانە.

**پشك انداختن:** تیر و پشك خستن.

**پشکلیدن:** بڕوانە: "بشکلیدن".

**پشلنگ:** بڕوانە: "پشتلنگ".

**پشلیدن:** بڕوانە: "بشلیدن".

**پشمالو:** کولکن، کولکنە، بە کولکە، تووکن، تووکنە، تیسکن، بەتیسک، تیسک درێژ، بەخوری، موودار، مووینە، زۆر بە موو.

**پشم ریختن:** بریتی لە بەقانەکردن، جێیمتمانە نەمان.

**پشم ریسی:** خوری رستن/ بادان.

**پشنجیدن:** پرپیشکە خستن، پرژە خستن.

**پشنگ:** 1) پرپیشکەی ئاو یان ئاگر، پرژە، بژنگ، پشکی ئاو. 2) سووکەڵەی (پیش‌آهنگ)، پێشرەو، رچەشکێن. 3) ماڵەوکەن، دیواربڕی دزان.

**پشولیدن:** بڕوانە: "بشولیدن".

**پشەگیر:** حەپەمێش خۆر، زۆر داماو و تەوەزەل.

**پشیز:** بێزە، پوول، پوولێکی کەم، پووڵی رەش، قەرەپووڵ، فلس، وردە، شایی، قۆشە، قرووش، قەمەری.

**پشیمان:** پەشیمان، پەژیوان، پێژەوان، پۆشمان، پاشگەز، ژوڤان، ژیڤان.

**پشیمان دل:** بڕوانە: "متأسف".

**پشیمان شدن:** پەشیمان بوونەوە، پەژیوان/بوونەوە، پێژەوان بوون، بادانەوە، پلەترازیان، پلەتسیان، پەشیمان بوونەوە، پاشگەزبوونەوە، پاشەکشەکردن، سەر لە نوێ هەڵدانەوە، ڤەکشین، لووت بەبەرخۆداهاتنەوە، هەڵگەڕانەوە، هەڵەوگەڕان، هەڵەوگەڕیان، هەڵ گەڕیانەوە.

**پشیمان کردن:** پەشیمان کردنەوە، پەژیوان کردنەوە، پاشگەزکردنەوە، هەڵگێڕانەوە، هەڵ گەڕاندنەوە، هەڵ گەڕاننەوە، هەڵەوگەڕاننەوە، قولاپاندن، قولپاندن.

**پشیمانی:** پەشیمانی، پەشیمان بوون، پەژیوانی، پۆشمانی، ڤەرگەڕ، شەرمەزاری، شەرمەزاربوون.

**پشیمانی خوردن:** بڕوانە: "پشیمان شدن".

**پشیمانی گرفتن:** بڕوانە: "پشیمان شدن".





**پفالود:** پفدراو، پفدریاگ، باکردو، ماسیو، هەڵمساو.

**پفیدگی:** بڕوانە: "آماسیدگی".

**پفیدن:** بڕوانە: "آماسیدن".

**پفیده:** بڕوانە: "آماسیده".

**پفیوز:** پیاوی سست و تەوەزەل و خوێڕی، بێوورە، بیغیرەت.

**پکانیدن:** بڕوانە:"آراستن".

**پکر:** وەڕەز، وەڕز، وەڕس، وەڕست، جاڕز، بێکەیف، بێخوڵك، قەڵس، قاڵس، قارس، کەوەڕی، هۆراسان، هەراسان، عاجز، گیانەسەر، مەرس، پەس، پەست، گێژ، سەرلێشێواو، خەمبار، لەخۆدابوون.

**پکرشدن:** وەڕەزو تووڕەبوون، جاڕزبوون، قەڵس بوون، قارس بوون، پەست بوون.

**پکرکردن:** جاڕزکردن، وەڕەزکردن، دوزاخەدان، قەڵس کردن.

**پکری:** وەڕەزی، جاڕزی، قەڵسی، دوزاخە.

**پکیدن:** 1) باکردن، ماسین، ماسان. ترەکیان. 2) لێك بڵاوبوون. 3) بڕوانە: "منفجرشدن".

**پکیده:** پواو، رزاو. تڵیشاو، قڵیشاو. کەم هێز.

**پگاه:** بەرەبەیان، بەیانی زوو.

**پلاتفرم:** پلاتفۆرم، رێباز، راگەیەنراوی فەرمی راگەیاندنی بنەما و هەڵوێستەکان کە لەو رێگەیەوە تاك یان گرووپێك داخوازییەکانی خۆی بەگشت خەڵك رادەگەیەنێ.

**پلاتونیسم:** بنچینەکانی فەلسەفەی ئەفلاتوون، قوتابخانەی ئەفلاتوون.

**پلاریزاسیون:** جەمسەرگرتن، بەجەمسەربوون، کۆی ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە تیشکی وەرگەڕاو بەرهەم دێ.

**پلاساندن:** ژاکاندن، چرچاندن، سیساندن، چرمساندن.

**پلاس بودن:** کردنی شوێنێ بە پاتۆقی خود، لە شوێنێ بۆ ماوەیەکی زۆر مانەوە، سەرگەردانی.

**پلاستر:** لەزگە، مشەمما. گەچ.

**پلاس شدن:** نیشتەجێبوون.

**پلاسما:** ئاوەکییەك کە شەش لە دەی خوێن پێك دێنێ(لە مرۆڤ دا) و خرۆکەی سوور و سپی تێدا مەلەوەرن، خوێناو.

**پلاسمودیوم:** مالاریا، لەرزوتاو.

**پلاسنتا:** ئاوەڵ منالّ، هاوەڵ منالّ.

**پلاسیدگی:** بڕوانە: "پژمردگی".

**پلاسیدن:** ژاکیان، چرچیان، چرچ هەڵاتن، سیسیان، لە گەشە کەوتن، کوڕیانەوە.

**پلاسیده:** سیسیاگ، چرچ، ژاکیاگ، رزیو.

**پلاکت:** (پزیشکی) پەڕەکانی خوێن.

**پلان:** پێواژۆ، پلان، نەخشە، نما، شاندەر، مەودای رێژەیی شتەکان لە سەر پەردەی نیگارکێشی.

**پلانتاریوم:** ئاسمان نما/ نوێن.

**پل پیروزی:** ڕێگەی گەیشتن بەسەرکەوتن.

**پلتیك:** 1) رامیاری، سیاسەت. 2) لێهاتوویی، بەڕێوەبردنی وڵات، هونەری ڕێخستنی کاروباری ناوخۆیی و دەرەکی وڵات. 3) ڕێباز، شێوەی بیر و کردەوە.

**پلتیك دان:** سیاسەت زان، سیاسەتمەدار.

**پلشت:** بڕوانە: "پلید".

**پلشت بر/ پلشت زدا:** دژگەن، گەن سڕێن.

**پلغیدن:** دەرپەڕین، هەڵتۆقین.

**پلکن:** تانە، سەرزەنشت.

**پلکیدن:** بێکارسووڕانەوە، بە ئەسپایی ڕۆیشتن یان کار کردن و خۆخەریك کردن، بێئامانج ژیان بەسەر بردن، ژیان و رابواردنی نەخوازراو.

**پلماس کردن:** وەك کوێران دەست هاویشتن بە هەموو لایەك دا بۆ دۆزینەوەی شتێ، دەستەکوتە.

**پلنوم:** پلۆنۆم، کۆبوونەوەیەك کە بەبەشداری تەواوی ئەندامانی ڕێبەری یان لێژنەی بەڕێوەبەری حیزبێك یان ڕێکخراوێکی سیاسی پێك دێ.

**پلواس:** بڕوانە:"چاپلوسی".

**پلورال:** کۆ، فرە.

**پلورالیسم:** پلۆرالیزم، فرەیی‌خوازی، زۆرینەخوازی.

**پله:** پلە، پایە، دەرەجە.

**پلیت:** (پَ) بڕوانە: "پلید".

**پلیت ساید:** (پُ) کوشتاری رامیاری.

**پلی تکنیك:** کۆلیژێك کە لەودا چەند رشتەی فەننی تێدا دەوترێتەوە.

**پلید:** ناپاك، چەپەڵ، پیس، گلاو، کۆتی، لەوت، گەمار، قرێژ، پەلۆخ، ترۆڵ، تەرێف، ئالوودە.

**پلیدازار:** زیناکار.

**پلید خو:** بڕوانە: "بدخو".

**پلیدطبع:** بڕوانە: "بدسرشت".

**پلیدکار:** زیناکار، بەدکار، سۆزانی.

**پلیدن:** 1) توێژینەوەکردن، بە دوا داگەڕان. 2) بە ئەسپایی خزانە شوێنێ.

**پمپ زنی:** پۆمپاژکردن.

**پنام:** 1) شاراوە، داپۆشراو.2) دوعای چاوەزار.

**پنامیدن:** نەهێشتن، پێش گرتن.

**پناه:** پەنا، دالدە.

**پناەآوردن:** پەناهێنان، دالدەهێنان، هەوارئانین، پەنا خوازتن، رووتێکردن، هاتنەبەردالدە، پارێزگاری خواستن.

**پناەبردن:** پەنابردن، پەناگرتن، هانابردنەبەر، هاواربردنەبەر، چوونەژێر پەنای کەسێ یان شوێنێ، هاواربۆبردن، هاواربۆهێنان، راخوستن، چوونە بەر دالدەی پارێزەر، وەدەغیل بوون.

**پناهجستن:** بڕوانە: "پناەگرفتن".

**پناهجو:** پەناخواز.





**پناەدادن:** پەنادان، دالدەدان، چەپاڵەدان، پشتیوانی لێکردن، حەواندنەوە، حاواندنەوە، ڤەحەواندن، هێوراندن، هێڤراندن، هەڤاندن، قەفاندن.

**پناه کردن:** 1) پەنابردن، چوونە بەر دالدەی پارێزەر. 2) پەنادان، دالدەدان.

**پناهگاه:** پەنا، پەناگا، حەشارگە، پەناوپەسیو، نوانی، چەپاڵە، دالدە، سامە، لیزگە، لیز، کەلێن، ئەنوا، مالیتە، وار، چراخ، قایە.

**پناەگرفتن:** پەنابردن، پەناهێنان، پەناگرتن.

**پناهندگی:** پەنابەری، پەنابەرێتی، پەنابەربوون.

**پناهنده:** پەنابەر، کۆچبەر، دالدەخواز، لاجە، دەخیل، دەغیل، کەمەربەستە.

**پناهیدن:** پەنا هێنان، پەنابردن، پەناگرتن.

**پناهیده:** 1) پەنابردو، پەناگرتو. 2) پەنادەر، حەوانەر.

**پنبەزن:** حەلاج، هەلاج، پەڕەکەر، کەڤانژەن، کێرنج.

**پنبەزنی:** پەڕە، حەلاجی، هەلاجی، شیکردنەوەی کوڵکە بە کوتك و کەوان، ڤەژاندن، چرکانن، چرکاندن.

**پنبه کردن:** 1) کردنە لۆکە. 2) بریتی لە بڵاوە پێکردن، نەرم کردن، وەڕەز کردن.

**پنبەنهادن:** 1) لۆکە خستنە ناو جلوبەرگەوە. 2) فریودان. 3) رازی‌کردن. 4) ناردنی کەسێ بۆ شوێنێ. 5) لەناوبردن.

**پنبەوز:** بڕوانە: "پنبەزن".

**پنج بر:** پێنج پاڵویی.

**پنجول:** پینگۆل، چنگاڵ، چڕنووك، سمکۆڵی دڕندە.

**پنجەبرتافتن:** کوشتن.

**پنجه بر روی کسی نهادن:** بێ ئابڕووکردنی وی.

**پنجه زدن:** 1) چنگ گرتن، پەنجە لێ قایمکردن، رەنجاندنی کەسێ بە پەنجە. 2) پێك وەربوون دەگەڵ کەسێکا، شەڕکردن، زۆرەزمێکردن.

**پنجەکردن:** زۆرەزمێکردن.

**پند:** بڕوانە: "اندرز".

**پندآموز:** بڕوانە: "اندرزگو".

**پندآمیز:** تێکەڵ بە پەند و ئامۆژگاری.

**پندار:** 1) گومان، خەیاڵ، وێنا، وەهم. 2) فکر، بیر. 3) فیز، دەعیە، لەخۆبایی، خۆبینی.

**پندارش:** خەیاڵ کردنەوە، خەون و خەیاڵ.

**پندارشی:** خەیاڵی، وێنایی، لە دنیای خەون و خەیاڵ دا، وەهمی.

**پندارنده:** گومانکەر، خەیاڵکەر.

**پنداره:** ئایدیال.

**پندارەگرایی:** (فەلسەفە) ئایدیالیزم، ئیدەئالیزم.

**پنداری:** وازانی، پێوایی، دەڵێی، هەروەك، خەیاڵ دەکەی، تەدبێژی، پێت وایە، گوایە، گۆیا، خەیاڵی، وەهمی.

**پنداریدن:** بڕوانە: "پنداشتن".

**پنداشت:** خەیاڵ، گومان، وێنا، گریمان.

**پنداشتن:** پێوابوون، وازانین، ئاوابیرکردن، گومان کردن، خەیاڵ کردن، وێناکردن.

**پنداشته:** وێناکراو، ئەوەی بە خەیاڵ و گومان دا هاتوە.

**پنداشتی:** شەڕ، تۆران.

**پندآگین:** پڕ لە ئامۆژگاری.

**پندام:** بڕوانە: "آماس".

**پند پذیر:** پەند وەرگر، نسحەت هەلگر، گوێڕایەڵ.

**پندتوز:** بڕوانە: "پندآموز".

**پندگرفتن:** پەندوەرگرتن، تەمێبوون.

**پندمند:** پڕ لە پەند، ئاوێتە بە پەند و ئامۆژگاری.

**پند نیوش:** پەند ژنەڤ، نسحەت هەلگر.

**پنوماتیك:** موتالای تایبەتمەندییەکانی هەوا و گازەکانیتر.

**پنومونی:** (پزیشکی) هەوکردنی شانەی سییەکان، گرەسی.

**پنهان:** شاراوە، وەشارتوو، وەشارتی، شاریاگ، بەرپیوار، نادیار، نەدیار، پەنام، پاسا، کیس، ڤاری. "**از پنهان**": بەنهێنی، پەنامەکی.

**پنهان پژوه:** بڕوانە: "جاسوس".

**پنهان خانه:** شوێنی نهێنی.

**پنهان داشتن:** بڕوانە: "پنهان کردن".

**پنهان شدن:** پەناگرتن، خۆوەشارتن، خۆشاردنەوە، خۆحەشاردان، شارانەوە، خۆدزینەوە، خۆ ون کردن، ڤەشەمڕان، ڤاری بوون، ڤەشەمڕان، ڤەشەمڕین، شێرانەوە، وەشێران. "**پنهان شده**": شاردراوە، شاراوە، حەشاردراو، شیش کراو، شێردراوە، شێراوە، ڤەسهان، ڤەشارتو، ڤەشاردو، ڤەشارتی، ڤەشاردی، ڤەشری، پەناگرتو.

**پنهان کردن:** شاردنەوە، شاردن، حەشاردان، وشێردن، وشاردن، وەشاردن، وەشارتن، ڤەشارن، ڤەشارتن، ڤەشاردن، لێوەشارتن، ڤەشەمڕاندن، هەشاردن، هەشاردان، هەلانین، ژێرەوکردن، تاقەت کردن، تەقەت کردن، قایم کردن، شیش کردن، کیساندن، ڤەرا کرن، ڤەسهاندن، داپۆشین، پۆشین، پۆشان، گربەست، نخفتن، نەپەندن، نومتش، وەدایەنە، دزینەوە، لمتش. "**پنهان کننده**": وەشێر، داپۆشەر، گومکەر، پاسا.

**پنهان گردیدن:** بڕوانە: "پنهان شدن".

**پنهانی:** نهێنی، نەپەنی، لەژێرەوە، لەبنەوە، پەنامەکی، بەدزی، دوورلەچاوی خەڵك. شوێنی نهێنی.

**پنهان یابی:** دۆزینەوە، شناسایی.





**پوچ:** پووچەڵ، پووك، بێ(ناوك/ ناوبەتاڵ)، بێکاکڵ، پیفیاگ. بێمانا. بێبناغە، بێبنەما.

**پوچ پنداری:** بڕوانە: "پوچ گرایی".

**پوچ گرا:** پووچگەرا، نهیلیست.

**پوچ گرایی:** پووچگەرێتی، نهیلیزم.

**پوچ گو:** بڕوانە: "یاوەگو".

**پوچ مغز:** نەزان، گەوج، گەمژە، مێشك پووك.

**پود:** پۆ، فرێت، هەڤۆ، تێوەدانی تەون.

**پودرکردن:** هێڕان، هاڕین، هێرفاندن.

**پودگك:** توێژی زۆر ناسك.

**پودن:** رزان، رزین، رزیان، داڕزان، پووکان، پوان، پۆیان، پۆی، پۆرتکان، پۆزنکان. "**پوده**": 1) پویاگ، پواو، پوار، رزیو. 2) بێ ناوك و ناوبەتاڵ، پووك.

**پور:** کوڕ. وەچە.

**پورسانتاژ:** وەرگرتنی سەدی چەن، سەدی چەند. هەقی دەلاڵی.

**پورمند:** خاوەن کوڕ.

**پورنوگرافی:** پەسن و نواندنی کاری سێکسی.

**پوریزم:** بنەڕەت خوازی زمانی.

**پوزخند:** کەنینی گاڵتەجاڕی، پێکەنینی تێکەڵ بە سووکایەتی، پۆزخەن.

**پوزش:** خۆشکێنی، خاکەڕایی، داوای لێبوردن، لێبوردن خوازی، بوردن خوازی، داوای بەخشین کردن. تۆبە.

**پوزش آمیز:** تێکەڵ بە لێبوردن خوازی، لێبوردن خوازانە.

**پوزش پذیر:** بەخشین لە تاوان، قبووڵی لێبوردن خوازی.

**پوزش خواهی:** بڕوانە: " پوزش طلبی".

**پوزش طلبی:** لێبوردن خوازی، بوردن خوازی، داوای لێبوردن کردن.

**پوزش گر:** بڕوانە: "شفیع".

**پوزمالی:** بریتی لە تەمێکردن بە جوێن یان لێدان یان جەریمە.

**پوزه:** قەپۆز، لمبۆز، لمۆز، لمبیز، لمبیس، لمۆز، لموز، لمۆڕ، بێڤل، پۆز. "**پوزەبند**": دمبێن، دەمبێن، دەمبەست، لوقمە. "**پوزەی کسی را بە خاك مالیدن**": بەباشی تەمبێکردنی، شکست دانی ئەو، لمبۆز دەخاك وەردانی ئەو.

**پوزەسا(ی)**: 1) تایبەتمەندی ئەوەی کە لمبۆز بە شتێك دادێنێ. 2) مەراییکەر، رووپاما، زمان لووس، کلکەسووتەکەر، شالووز، کیسەکێش.

**پوزیتیو:** ئیجابی، ئەرێیانە، موسبەت، پۆزێتیڤ.

**پوزیتیویسم:** (فەلسەفە) ئەزموونگەرێتی.

**پوزیدن:** داوای لێبوردن کردن، لێبوردن خوازتن.

**پوزیسیون:** 1) فۆڕم و شکڵی رواڵەتی. 2) لە شەترەنج دا: چۆنیەتی جێگرتنی مۆرەکان.

**پوساندن:** بڕوانە: "پوسانیدن".

**پوسانه:** خۆشکێنی، زمان لووسی، کلکە سووتە.

**پوسانیدن:** گەناندن، رزاندن، پلیخاندن، پرتوکاندن، پەڕتاندن، داڕزاندن، داڕزانن، هەلساندن.

**پوست آوردن:** پێست هێنانەوە.

**پوست اندختن:** 1) پێست خستن، پێست فڕێدان، توکل ئاوێتن، داڕنان، رووتەوەبوون، کاژخستن. 2) سەختی و ئازار کێشان لەبابەت شتێکەوە.

**پوست برآمدن - از:** گەشەکردن، گەشانەوە، بەخۆداهاتن.

**پوست برآوردن:** بڕوانە: "پوست کندن".

**پوست پیرا:** پێست خۆشکەر.

**پوست ترکاندن:** لەپڕایەکی قەڵەو بوون.

**پوست خر کن:** 1) کەسێ کە پێستی کەری تۆپیو دامالێ. 2) بریتی لە تەماکار/ تەماحکار، قڕنیس.

**پوست دادن:** جیابوونەوەی توێیەکی ناسک لە لەش.

**پوست دیگر پوشیدن:** شێوازگۆڕین، هەڵگەڕانەوە لە مەرامی سەرەتایی.

**پوست عوض کردن:** بریتی لە گۆڕینی بڕوا و شێوەی هەڵسوکەوت و ژیان، گۆڕان.

**پوست کردن:** بڕوانە: "پوست کندن".

**پوست کشی(صورت):** کێشانی پێستی دەموچاو بۆ کەمکردنەوە یان لابردنی چرچولۆچی، "لیفتینگ".

**پوست کلفت:** بریتی لە خۆڕاگر و گیان سەخت.

**پوست کن:** کەوڵکەر، گوورێن.

**پوست کندن:** پێست لێکردنەوە، پێست کەنن، پێست لەبەرداماڵین، کەوڵ کردن، کەڤل کرن، گرژاندن، گورژان، توێکڵ لێ کردنەوە، تێکوڵ کردن، وەبیایش.

**پوست کنده:** 1) کەوڵکراو، داماڵیاگ، رووت کراو. 2) بریتی لە گوتەی روون، ئاشکرا، بێ پەردە.

**پوستگر:** بڕوانە: "پوست پیرا".

**پوست گرفتن:** بڕوانە: "پوست کندن".

**پوسته:** توێژاڵ، توێژ، توێك، تۆکڵ، توێکڵ، توێکوڵ، تێکوڵ، تێخوڵ، توێخڵ، تیڤل، تۆفل، تۆشڵ، شکولك، قابلۆخ، قاپێلك، کیلوودە، قاوخ، قاشوول، قاشل، قەپێلك، پەلك. "**پوستەبستن**": هەڵدانەوەی پێستی نوێ لەسەر برین. "**پوستە پوستە**": توێژتوێژ. "**پوستەزمین**": چینی دەرەوەی زەوی کە بریتییە لە قاڕڕەکان و بەستێنی ئۆقیانووسەکان.

**پوستین:** فەروە، کەڤل، کەوڵی تیسکن، کەوڵپۆس. "**پوستین باشگونە کردن**": گۆڕینی شێواز و هەڵسوکەوت."**پوستین بر سر کسی زدن**": ئەشکەنجە و ئازار دان. "**پوستین بگازر دادن**: بەدگۆیی کردن، ئیراد گرتن. "**پوستین بە گازر دادن**": سپاردنی کار یان ئەرکێك بە کەسێکی نەشیاو."**پوستین کردن کسی را/ پوستین کسی دریدن(کندن)**": ناوزڕاندن، بەدگۆیی کردن. ."**از برهنە پوستین کندن**": کاری بێهوودە کردن."**در پوستین خود بودن**": سەبارەت بەخۆ دوان. "**پوستین دوز/ پوستین پیرا**": کەوڵدروو، کەوڵکەر.

**پوسیدگی:** رزاوی، پواوی، پرتوکیاوی، پەپوسی، کۆنەیی، چۆنیەتی هەر شتێکی رزیو.





**پوسیدن:** رزین، رزان، رزیان، داڕزان، داتولان، پۆسیان، پرتوکیان، پەڕتین، داقنان. چلك کردن. "**پوسیدە**": گەندەڵ، رزیو، رزی، رزیای، رزیان، رزاو، رزیاگ، داڕزاو، پواو، پلتیك، پۆرتکاو، پرتوك، پرتوکیاگ، پاسفندە، پۆس، هەلا، هەلار، هیمین، پلیخاو، شیب. سست و بێبناغە ونالۆژیکی.

**پوشالی:** پووشاڵی، فسینە، هەر شتێکی سووك و خۆڕانەگر، سست و بێ بناغە و لاواز.

**پوشاندن:** 1) دەبەرکردن. 2) داپۆشین، وەشارتن، شاردنەوە، حەشاردان. 3) خستنە ژێر دەسەڵات و کاریگەری خۆ. 4) لەناوبردن. 5) لەسەر یەك دانان. "**پوشاننده**": وەشێر، داپۆشەر.

**پوشش:** داپۆشەر، سەرپۆش، پۆشاك، بەرگ، خێوەت، جل و بەرگ، قلێف، کالوخ، کالوخك، میچ. "**تحت پوشش قراردادن**": پشتیوانی ماڵی لێکردن، ئامراز و کولوپەلی شوێنێ خستنە ئیختیار کەسێك بۆ کەڵك لێوەرگرتنی. "**زیر پوشش گرفتن چیزی(جایی)**": خستنە ژێر کاریگەری کرداری خۆ.

**پوش کردن:** 1) وەشاردن، پاشکەوت کردن. 2) تەقالادان، هەوڵدان.

**پوشنده:** پۆشەر، داپۆشەر.

**پوشنی:** بڕوانە: "پوشیدنی".

**پوشیدگی:** داپۆشراوی، چۆنیەتی هەر شتێکی شاراوە.

**پوشیدن:** دەبەرکردن، ل خۆکرن، دەبەرخۆکردن، کردنە بەر، لەبەرکردن، لبەرکرن، لەپێکردن، دەپێکردن، پۆشین، پۆشان، پۆشاندن،، داپۆشین، وەشاردن، شاردنەوە، تەڤزاندن، نخفتن.

**پوشیدن راز:** ستر، پۆشینی نهێنی.

**پوشیدنی:** پۆشەن، پۆشەنی، شیاویپۆشین، پۆشاك، جل و بەرگ.

**پوشیده:** شاراوە، وەشاردو، داپۆشراو، وەشارتی، نادیار، نهێنی، سەرسوور، دەبەرکراو.

**پوشیده چشم:** کوێر، کۆر، کورە.

**پوشیدەحال:** کەسێ کە کەس ئاگای لە حاڵ و باڵی نیە، نادیار.

**پوشیده حرف:** قسەی شاراوە، ئاخاوتەی ناڕوون.

**پوشیدەداشتن:** شاردنەوە، وەشارتن.

**پوشیدەرو:** 1) ئەوەی روخساری داپۆشیبێ. 2) نهێنی. 3) ژن.

**پوشیدەشدن:** داپۆشران، شاردرانەوە.

**پوشیدەدل:** بڕوانە: " کوردل".

**پوشیدەگویی:** بە کینایە و نهێنی ئاخاوتن.

**پوك:** پووچەڵ، بێ ناوك، پووچ، قەڵپووت، بەتاڵ، کلۆر، پواو. پفەڵ، فشەڵۆك. بێهێز، بێتوان، بێتوش.

**پوکیدن:** ترەکین.

**پوگان:** مناڵدان.

**پوگرفتن:** رۆیشتن. راکردن.

**پولابی:** بڕوانە: "حساسیّت".

**پولادبازو:** بریتی لە پیاوی بەهێز و وزە.

**پولادسا:** پۆڵاساوێن.

**پولادخا:** بریتی لە پیاوی بەهێز و تووڕە.

**پولادگر:** ئاسنگەر.
**پولادە:** لە جنسی پۆلا، پۆلایی.
**پولادین:** پۆلایین، لە پۆلا چێکری.
**پول پایە:** (ئابووری) پارەیەك كە لەلایەن دەولەتەوە وەك بنەمای سیستمی پوولی هەلدەبژێردرێ.
**پول پرست:** پوولەکی، خەپوولی، رژدو چروك، دەس قووچاو، پولپەرست، پارەخۆشەویست، مالپەرست، قرنیس، لەچەر، بەتەماح، رەزیل.
**پول خون:** خوێن بایی.
**پولدار:** پارەدار، پوولدار، خاوەن پارە، دەولەمەند.
**پول درجریان:** پوول/ پارەی ناو بازاڕ.
**پول درگردش:** پارەیەك كە خەرجی کاروباری ئابووری و ئالوویڕ دەکرێ.
**پول دوست:** بڕوانە:"پول پرست".
**پول راكد:** پارەی نائەكتیڤ و لەدەرەوەی جەریانی ئابووری ولاتێك.
**پول ساز:** قازانج هێن، خێردەرەوە.
**پول سفید:** پوولێ كە لە زێو چێکرا بێ.
**پول سیاه:** بڕوانە: "پشیز".
**پول شناور:** یەکەی پارەیەك كە نرخەکەی بەنیسبەت یەکەی پارەگەلی دیکە لە هەلبەزدابەز دایە.
**پول قلب:** پوولی سووتاو، پارەی پووچەلکراوە.
**پول قوی:** پارەی شیاوی گۆڕین بە زێڕ یان دراوەکانی تر.

**پول كردن:** فرۆشتنی شتێ لەجیاتی وەرگرتنی پوول.
**پولكی:** 1) پوولەکی، پارەخۆشەویست. 2) ئەوەی لە بەرامبەر وەرگرتنی پارەدا ئامادەی ئەنجامدانی هەر کارێکە، بەرتیل خۆر. 3) رازاوە بە پوولەکە.
**پول محوری:** تیۆرییەك سەبارەت بە کۆنترۆلی ئابووری ولات لەرێگەی رێکخستنی خستنەگەڕی پارەوە.
**پولیش زدن:** ساف و بریقەدارکردنی رووی کانزا یان دار و بەرد.
**پوی:** راکردن، هەلسوکەوتی توند.
**پویا:** تایبەتمەندی ئەوەی دەبزوێ و خاوەنی بەهرە یان توانای گۆڕانکاری بە ئاراستەی بەسەردابوون یان بەرەوپێش چوونە، دینامیك، روو لە گەشە، ئەوەی بۆ وەدەستهێنانی شتێ هەول دەدا، تەڤگەڕ، بزۆز، بزۆك. گەڕێن. "**اقتصاد پویا**": ئابووری روو لە گەشە، ئابووری روو لە هەلدان. "**ذهن پویا**": زەینی چالاك/ ئاكتیڤ.
**پویان:** 1) لە حالی بزووتن دا بەنەرمی و ئارامی. 2) هەلەداوان، بەپرتاو، بەلەسە. 3) بڕوانە:"جوینده".
**پویا نمایی:** بڕوانە: "انیمیشن".
**پویانیدن:** بردنی چوار پێ بۆ چوارنال پێکردن، غار پێکردن، غاردان.





**پویایی:** راکردویی، بزۆزی، جوولان، دینامیزم.
**پویش:** پەیجۆری و چالاکی بەردەوام و جیددی بۆ وەدەستهێنانی شتێك، گەڕان، هەلسووڕان، بزووتن، پشکنین. پرۆسە.
**پویشگر:** 1) سکانێر. 2) لێکۆلەر، تاوتوێکەر.
**پوئن:** خال، نمرە، پوان.
**پویش گرایی:** (لە فەلسەفەدا)ڕەسەنایەتی هێز، دینامیزم.
**پویشمند:** دینامیك، پڕ وزە، چالاك، هەلوەلا.
**پویشمندانە:** چالاكانە، بەشێوەی دینامیكی.
**پویندگی:** چۆنیەتی و کردەی راکردو و گەڕێن.
**پوینده:** راگوزار، رێبوار. ئەوەی بۆ گەیشتن بە شتێ لە هەول و کۆششی بەردەوام و بەپەلەدایە، پەیدۆز، پەیجۆر.
**پوی و تك:** بڕوانە:"تكاپو".
**پویه:** 1) گورگەلۆقە، قۆرتە، دۆمانە. 2) راکردن، هەلاتن. 3) پرۆسە.
**پویەگری:** (بۆ)گەڕان، لێگەڕان، پەیدۆزی، توێژینەوە.
**پوییدن:** راکردن، بە پەلە رۆیشتن، بۆ هەموو لایەك رۆیشتن و گەڕان، جوولان و پێشڕەوی کردن بەرەو مەبەست یان بۆ وەدەستهێنان و گەڕان بە دوای شتێك دا. پێوانی رەوگەیەك یان رۆیشتن لە رەوگەیەکەوە (نە بە پەلە و نە بە ئەسپایی).
**پوییدەی نارستا:** (رێزمان) بەرکاری ناڕاستەوخۆ.
**پهره:** نگابانی، پارێزگاری.
**پهرەدار:** بڕوانە: "پاسدار".
**پهلو:** تەنیشت، تەنشت، پالوو، لا، لارك، ئالی، کست، تەك.
**پهلوان پنبه:** فس فس پالەوان، پالەوان فس فس، پالەوانی درۆیین، دەلی‌دومان، خۆ هەلکێشی هیچ لە دەست نەهاتوو.
**پهلو بر زمین نهادن:** راکشان، خەوتن.
**پهلوبندی:** وەرگرتنی یارمەتی مالی لە کەسێك، دانی یارمەتی بە کەسێك.
**پهلوبه پهلو:** لە تەنیشت یەکتر، لە نزیك یەك، شان بە شان.
**پهلو تهی كردن:** بریتی لە خۆبواردن لە کارێك، نەچوونە ژێربار.
**پهلو دادن(بەکسی):** یارمەتیدان، قازانج گەیاندن بە کەسێك.
**پهلودار:** خاوەن مال و سامان. "**سخن پهلودار**": قسەی بە تێکول.
**پهلو داشتن:** بەقازانج بوون، سوودار بوون.
**پهلوزدن:** بریتی لە بەرانبەری کردن لە رێز و پلەدا، پال (دان/ دانەوە).

**پهلو زن:** کەسێ کە لە ڕێز و پلەدا لافی بەرامبەری دەگەڵ یەکی دی لێدەدا.

**پهلوسا(ی):** ڕکەبەر لە ماڵ و دەسەڵات و شتی وادا.

**پهلوکردن:** پارێزکردن، دووری کردن.

**پهلو گرفتن:** لەنگەر خستن، لەنگەر ئاوێتن، لەنگەر هاویشتن، لەنگەر هاویتن، لەنگەر گرتن، لەنگەر فڕێدان، ڕاوەستانی گەمی لە قەراغ دەریا.

**پهلوگه:** کەلەکە. تەنیشت، لا.

**پهلو منش:** ئەوەی کە ڕەوشتی پاڵەوانانی هەیە.

**پهلو نژاد:** لە نەژادی پاڵەوان.

**پهلو نشین:** هاونشین، هاودەم.لە تەنیشت دەستەوە.

**پهلو نگاه داشتن:** دووری لێکردن.

**پهلو واگرفتن ازکسی:** دوورکەوتنەوە لێی.

**پهلوی کسی را خاریدن:** بریتی لە زیان و خەسارەت پێگەیاندن بەو.

**پهلویی:** پاڵەکی، لاتەنیشتی.

**پهن:** پان، هەراو، بەرین، بڵاو، بەرانبەری تەسك.

**پهنا:** 1) بەرینایی، بەرینی، پانایی، پانی، هەراوی، بەربڵاوی. 2) قووڵایی. 3) گەورەیی، گرینگی. 4) ئەستووری. 5) پانتایی.

**پهنادار:** بەرین، پۆڕ، پانوپۆڕ.

**پهنانگر:** بەرینی ڕوان.

**پهناور:** پان و بەرین، بەرین، بەربڵاو، بەرفرە.

**پهناوری:** بەرینی، بەربڵاوی، بەرفرەهی.

**پهن شدن:** تخێلێ بوون، پان بوونەوە. ڕاخران.

**پهن کردن:** ڕاخستنی فەڕش بە سەر عەرز دا، داخستن، ڤەکشاندن.

**پهنه:** پانایی، هەراوی، بەربڵاوی، ڕاستایی، تەختایی، دەشت، زەوینی ڕێك. گۆڕەپان، مەیدان.

**پی:** بنەما، بناخە، بناغە، بنەڕەت، بنج، بنچینە، ڕیشە، پایە، بنیات."**اندر پی**": بە دوای.

**پی‌آوردن:** تاقەت هێنان، بەرگەگرتن.

**پی‌آیند:** بڕوانە:"برآیند".

**پیا:** 1) پیاو. 2) کەسی بەتوانا و بەهێز بۆ ئەنجامدانی کارێك.

**پیا پی:** پەیتاپەیتا، پەساپەسا، پەستا پەستا، بێ‌پسانەوە، لێکدالێکدا، لەسەریەك، بێ‌وچان و پسانەوە، بەدوای یەکا، یەك بە دوای یەکا، بەبەردەوامی. "**پیا پی‌آمدن حشرات**": ڕێچکەبەستن، ڕێچکەکردن، خێزەرەکردن، کژورەك.

**پیادەشدن:** دابەزین، داوەزین، داوەزان، داخۆزین، داخواستن، هاتنەخوارلە سواری، کەوتش، وارئامەیش، واربیایش، پەیابوون.





**پیادەکردن:** 1) هێنانەخوار، دابەزاندن. 2) کردنەوەی دەزگایەك لەسەر ماشێن بۆ نووژەنکردنەوە یان گۆڕین. 3) جێبەجێکردنی پلان یان پرۆژەیەك بەپێی نەخشە. 4) بە پراکتیك کردن، خستنە خانەی کردەوەوە. 5) ناچارکردنی کەسێك بە خەرج کردنی بڕێکی زۆر پارە. 6) لەسەر کار لابردن.

**پیادەگردی:** پیاسەکردن، قەدەم لێدان.

**پی‌افزود:** پەیوەست، هاوپێچ.

**پی‌افشردن:** بڕوانە: "پافشردن".

**پی‌افکندن:** بناخە داڕشتن، بنیات نان، دامەزراندن، ئاواکرن. هێنانەدی.

**پیاله پیما:** شەڕابخۆر.

**پیالەگردان:** مەیگێڕ.

**پیام:** بروسکە، ڕاسپێری، وڵام، پەیام، هەواڵ، ڕاسپاردە.

**پیام‌آور:** پەیام هێنەر، وڵام هێن، خەبەرهێن.

**پیام بر:** ڕائەسپاردە، کەسێ کە بە وڵامێکەوە ناردراوە.

**پیامد:** ئاکام، ئاسەوار، شوێنەوار، دەرەنجام، دەرهاویشتە.

**پیام دادن:** بروسکەناردن، وڵام ناردن. بانگەشەکردن.

**پیام رسان:** ڕاگەیێن، ڕاسپاردە، ڕائەسپاردە.

**پیام شفاهی:** لێڤکی، پەیامی لەبزی، ڕاسپێری بەبێ‌نووسین.

**پیام گزار:** بڕوانە: "پیام رسان".

**پیام گزاردن:** پەیام گەیاندن، گەیاندنی ڕاسپێری.

**پیام نگار:** ئیمەیل، پۆستی ئێلێکترۆنیك.

**پیام نما:** تێلێتێکس.

**پیانیست:** پیانۆژەن، ژەنیاری پیانۆ.

**پیایند:** جێ‌نشین.

**پی‌برداشتن:** دواکەوتن، وەدوای کەسێك کەوتن، وەشوێن کەوتن، شوێن هەڵگرتن، شوێن گێڕان.

**پی‌بردن:** 1) تێگەیشتن، زانین، پێ‌زانین، پەی‌بردن.2) دانەپەی، شوێن گێڕان.

**پیج کردن:** بانگهێشت کردنی کەسێك بە بڵێندگۆ لە شوێنی وەك نەخۆشخانە یان فڕۆکەخانە.

**پیجو:** شوێنگێڕ، شوێن هەڵگر، شۆپاژۆ.

**پیجویی:** گەڕ، ڕوانین بۆ سۆسەکردن، شوێن گێڕان، شۆپاژۆیی، شوێن هەڵگرتن، شوێن کەوتن، نانەشوێن.

**پیچا:** پێچەر، پێچ دراو، ئاڵۆز، لە حاڵی پێچانەوەدا.

**پیچا پیچ:** بڕوانە: "پیچ پیچ".

**پیچ افتادن در چیزی:** چەمینەوە، پێچ تێکەوتن.

**پیچ افتادن در کار:** گرفت تێکەوتن.

**پیچان:** پێچەر، پێچدەر، پێچراو، لە حاڵی پێچداندا.

**پیچان دل:** نیگەران و بێ‌ئوقرە بە هۆی ژان یان تووڕەیی.

**پیچاندن:** بڕوانە: "پیچانیدن".
**پیچاننده:** پێچەر، کەسێ کە دەپێچێ.
**پیچانده:** بڕوانە: "پیچیدە".
**پیچانیدن:** پێچان، پێچاندن، پێچانن، پێچدان، پێچانەوە، هەڵ پێچان، بادان، باوپێدان، لوولان، لوولدان، خول دان، سووڕدان، ئالاندن، فتلاندن، قەمچاندن. سەرلێشێواندن، سەرگەردان کردن. ڕەنجاندن، ئازاردان. خستنەتەنگانەی کەسێك بە پرسیاری زۆر لێکردن. دەنگۆبڵاوکردنەوە. (پیچاندن بە دور...) تێئالاندن، تێپێچان، وەربادان، نامەتش. "پیچاندن دل کسی": نێگەران و بێ ئوقرەکردنی کەسێك."درهم پیچاندن": بە سەختی ئازاردان.
**پیچانیده:** بڕوانە: "پیچاندە".
**پیچ پیچ:** پێچاوپێچ، پێچەڵاوپێچ، پێچەڵپێچ، پێچەڵ پێچ، پێچ و پلووچ، پێچ و فلووچ، پێچ و پەنا، چیران چەپ، پێچ پێچ، خواری و پێچ، چام، ڕێگەی پڕ لە بادانەوە، باودراوی تێکەڵاو.
**پیچ خوردگی:** پێچران، پێچان، فیچان، باوخواردن.
**پیچ خوردن:** پێچ خواردن، پێچ دران، پێچان، باوخواردن، باخواردن، لوول خواردن، لوولان، خۆلێهالاندن، ئالان، ئالین، فتلین، فەتلین، سووڕخواردن، خول خواردن، لێهالان، وەران، وەرگەڕان.

**پیچ دادن:** بڕوانە: "پیچانیدن".
**پیچش:** پێچان، پچیان، پێچیان، پێچ خواردن، هالان. سەختی و دژواری. "پیچش شکم": بڕوانە:"دل پیچە". "پیچش آواز": چەهچەهەلێدان.
**پیچ کردن:** بەستنەوەی شتێ بە شتێکی دیکەوە بە پێچ.
**پیچندگی:** پێچەربوون، پێچەری، حاڵەت و چۆنیەتی پێچەر.
**پیچنده:** پێچەر، کەسێ کە دەپێچێ.
**پیچ وا پیچ:** بڕوانە: "پیچاپیچ".
**پیچ و تاب:** پێچاو پێچ، پێچەڵاوپێچ، ئاڵۆزی، خولانەوە، سووڕانەوە.
**پیچ و خم:** 1) بڕوانە: "پیچ پیچ". 2) وردەکارییەکان.
**پیچی:** پێچدار، بەپێچ و پلووچ.
**پیچیدگی:** 1) ئاڵۆزی، ئاڵۆز بوون، ئاڵۆزکاوی، گرژی، تەڤل هەڤی. 2) گرێوگۆڵ. 3) پێچراوبوون، پێچ دراوی، بادراوی، لوول دراوی. 4) ناڕوون بوون. 5) بەدرەفتاری کردن. "پیچیدگی زبان": بڕوانە:"لکنت زبان".
**پیچیدن:** لوول (دان/ دران)، لوورکردن، پێچ خواردن، پێچ (دان/ دران)، پێچانن، لێك پێچان، پێچانەوە، وەربادان، وەرپێچان، وەرپێچانەوە، تەواندن، لێك هالاندن، کۆزبەستن، خولانەوە، خولیانەوە، سووڕان. تێکهەڵچوون و





شەڕکردن. دەنگدانەوە، زایەڵە. بەشێوەی بازنەیی دەرهێنان. تووشی کێشە و گرفت بوون. تووشی ڕەنج و ئازاربوون. لاڕێبوون، کلابوون، لەڕێدەرچوون. گۆڕان، تێکچوون. روو وەرگێڕان. گەمارۆدان. "بەخود پیچیدن": تلانەوە لەبەر ژان و ئێش، گەوزدان لەبەر ژان.
**پیچیده:** 1) ئاڵۆز، گرژ، دژوار. 2) بەگرێوگۆڵ، بەپێچ و پەنا. 3) پێچراو، پێچ دراو، پێچیاگ، پێچیاو، باوخواردو، بادراو، لوول دراو، هەڵ کراو، پچ، پێچ.
**پیختگی:** پێچ دراوی، لێك ئالاوی.
**پیختن:** 1) پێچ خواردن، لێك ئالان، ئاڵۆزکان، هەڤ ئالیان. 2) دابەش کردن. 3) سووك کردن، نزم کردن.
**پی‌خجسته:** بڕوانە:"خوش قدم".
**پیخست:** ژێرپێ خراو، پێ رێخراو، پاخۆشە، ماندوو، داماو، بێتوانا.
**پیدا:** پەنی، دیار، ئاشکرا، خویا.
**پیداآمدن:** بەدیهاتن، وەدیهاتن، پێکهاتن، دەرکەوتن، ئاشکرابوون.
**پیداآوردن:** وەدیهێنان، ئاشکراکردن، دەرخستن.
**پیداشدن:** ئاشکرابوون، دەرکەوتن، خویابوون، پەیدابوون، بەدیهاتن، دۆزرانەوە، دۆزینەوە، پەیداکردن.
**پیداکردن:** وەدەست خستن، گیرهێنان، گیر خستن، گیرهاوردن، پەیداکردن، دۆزینەوە، ئاشکراکردن، دەرخستن.

"**برکسی پیدا کردن**": دژکردەوە نیشان دان لە بەرامبەر ئەودا. "**پیداکننده**": دۆزەر، دۆزەرەوە، خویاکەر، ئاشکراکەر.
**پیداگر:** ئاشکراکەر، دەرخەر.
**پیداوار:** دیار، ئاشکرا، بەرچاو، خویا.
**پیداور:** بڕوانە: "پیداوار".
**پیدایش:** 1) ئاشکرابوون، دەرکەوتن، دیاریدان.2) سەرهەڵدان، پەیدابوون، هاتنەکایەوە.3) کردەی خوڵقاندن، هەبوون و بوون.
**پیدایی:** دەرکەوتن، ئاشکرابوون. وەدیهاتن.
**پی درپی:** بڕوانە: "پیاپی".
**پیر:** 1) پیر، بەساڵاچوو. 2) شێخ، ڕێنوێن، ڕێ نیشاندەر. 3) کۆنە، قەدیمی.
**پیرابند:** کادر.
**پیراستگی:** لێك و لەباری، لێك و لەبار بوون، پۆشتە و پەرداخ بوون، ڕێك وپێك بوون، پەڕکاڵ بوون، ڕازاوەیی.
**پیراستن:** بەترمە، بەترومە، پەرتاوتن، هەڵپەرتاوتن، هەڵپەرداوتن، بڕینی لکی زیادی دار، تەکمیش کردن، لێك و لەبارکردن، ڕێك وپێك کردن، سەروگوێکردن، تاشین، بڕین، ڕازاندن، خەملاندن، سیقاڵ دان.پینەکردن، دروونەوە. خاڵیکردن، بەتاڵ کردن. لەناوچوون."**پیراستن از چیزی**": لەناوبردن و پاك کردنەوەی، بەتاڵ کردن لێی. "**پیراستن کسی**": تەمبێکردنی ئەو. "**زلف پیراستن**": ئەگریجەبڕینەوە.

**پیراسته:** لێك ولەباركراو، جوان و لووس كراو، رێك وپێك كراو، پەرداخ، پەرگاڵ، رازیاوە، رازاوە، خەملێو. ئامادە. پاك، خاوێن. "**پیراستەكردن**": ئامادەكردن.

**پیراسنج:** بروانە:"محافظـەكار".

**پیراشهر:** دەوروبەری شار.

**پیرامون:** 1) سەبارەت بە، لەمەڕ. 2) دەوروبەر، دەورو پشت، دەوران پشت، دەورە، دەوراندەور، دۆرمادار، دۆرمەدۆر، دۆراندۆر، نۆردۆر، كەنارەوكەنار، كشتوكنار، پەراپەڕ، ئاقار، گرد. 3) بروانە: "محیط". "**پیرامون چیزی گشتن**": خەریك بوون پێیەوە.

**پیرامونی:** 1) سەر بە (پیرامون). 2) دۆست، هاونشین.

**پیرانگر:** بروانە:"مدبر".

**پیرانەسر:** تەمەنی پیری، رۆژگاری پیری.

**پیراهش:** بروانە: "پیرایش".

**پیراهن از كاغذ پوشیدن:** دادخوازی كردن.

**پیراهن برتن كفن شدن:** مردن.

**پیراهن چاك زدن:** یەخە دادڕین، دڕاندنی كراس بەهۆی ورووژان لە ئەنجامی شادی یان غەم.

**پیراهه:** بروانە: "پیرایه".

**پیرایش:** جوانكاری، رازاندن، بڕین، تەكمیش، هەڵپەرتاوتن، هەڵپێتاندن.

**پیرایشگاه:** بروانە: "آرایشگاه".

**پیرایشگر:** 1) جوانكەر، رازێنەر، خەملێنەر. 2) پێست خۆشكەر. 3) سەرتاش.

**پیرایه:** خشڵ، زێر و زەنبەر. رازاندنەوە، خەملاندن، جوان كردن، رێك و پێك كردن، هەڵ پەرتاوتن. دەفر، پیاڵە.

**پیرایەبستن:** خۆ خەملاندن بە زێڕ و زەنبەر.دەنگۆبلاوكردنەوە.

**پیرایەبند:** جوانكەر، رازێنەر، خۆڕازێنەر بە خشڵ و زێڕ.

**پیرایەسنج:** خەملێنەر، هەڵسەنگێنەر.

**پیراییدن:** بروانە: "پیراستن".

**پیر پاتال:** پیروپاتاڵ، پیر و بەتەمەن، پیر و پەككەوتە، رەندۆڵ، زورهان.

**پیرخانەنشین:** خانگار.

**پیرخر:** 1) پیرەكەر. 2) بەتەمەنی نەزان، پیری بێئاوەز.

**پیرخرابات:** پیری مەیفرۆش. (لە زاراوەی سۆفیگەرێتی دا) مرۆڤی كامڵ و رێبەر، مورشید و رێنوێنی دەری سۆفیگەرێتی.

**پیردیر:** (دَ) شێخ ومورشیدی كامڵ، رێبەر، پێشەوا، كەسێكی زموودە.

**پیرزا:** كەسێك كە لە دایك و بابێكی پیر لە دایك بووبێ.

**پیرزال:** پیر و بەتەمەن، رەندۆڵ، زۆرتر بە ژنان دەوترێ.

**پیر زر:** پیری بەتەمەن، زوران، فەرتووس.





**پیرسر:** 1) كەسێك كە مووی سەری بەهۆی پیری سپی بووە. 2) پیری، بەسالاچوویی.

**پیرفرتوت:** رەندول، رەندۆڵ، زورهان، فەرتووت، فەرتووس، پیری لە كاركەوتە.

**پیرگرگ:** 1) پیرە گورگ.2) بریتی لە پیاوی بە ئەزموون و شەڕكەر.

**پیرمغان:** 1) سەرۆك و گەورەی موغەكان كە پێشەوای ئایینی زەردەشتن. 2) پیری مەیخانە، (لە سۆفیگەرێتیدا) مرۆڤی كامڵ و رێبەری روحانی.

**پیر میكده:** پیری مەیخانە، پیری مەی فرۆش، مورشید.

**پیر نفهم:** كەرەپۆسەر، پیری سەرسپی كەم فام.

**پیرنگ:** گەڵاڵە و چوارچێوە و رێكوپێكی لۆژیكی رووداوەكان لە بەرهەمێكی ئەدەبی یان هونەری وەك چیرۆك یان شانۆنامە و شێعر.

**پیرو:** پێڕەو، دواكەوتە، پێگرتی، دوای كەسێك كەوتوو.

**پیروان:** كۆی"پیرو"، پێڕەوان، شوێنكەوتوان، تابوون، دوكەڤتی.

**پیروز:** سەركەوتوو، زاڵ. بەختەوەر. پیرۆز، موبارەك. دڵخۆش، شاد.

**پیروزآمدن:** سەركەوتن، زاڵبوون. گەیشتن.

**پیروز جنگ:** سەركەوتوو لە شەڕەكان دا.

**پیروزگر:** 1) بەسەركەوتوویی گەێن. 2) سەركەوتوو. 3) خودا.

**پیروزمند:** سەركەوتوو، بەئاوات گەیشتوو، بەختەوەر، كامڕەوا.

**پیروزور:** بروانە: "پیروزمند".

**پیروزی:** سەركەوتن، زاڵی، زاڵبوون. بەختەوەری.

**پیروی:** پێڕەوی كردن، وەشوێن كەوتن، شوێن كەوتن، شوێن كەفتن، ڤەشوون كەتن، دوكەوتن، بە دواداچوون، دانەدوو.

**پیرەزال:** بروانە: "پیرزال".

**پیرەوسباز:** رداڵ، رداڵە، تەرپیر.

**پی‌ریختن:** بناغەدانان، خیم دانان، بنیات نان، ئاواكردن.

**پی‌ریز:** بناخەدارێژ. هەمیشە، بەردەوام.

**پی‌ریزی:** نێژ، بناغەدارژتن، دارشتن. دامەزراندن، بنیاتنان. "**پی ریزیشده**": نێژا، بناغەدارژاو.

**پی‌زدن:** پیاسەكردن.

**پی‌زری:** 1) سست، ناپتەو. 2) بێ هێز و لاواز. 3) بێسەروپێ، شەلاتی، خۆڕی و تۆڕی. 4) بروانە:"فلاكتبار".

**پیزی داشتن:** هەبوونی ورە و توانایی ئەنجامدانی كارێك.

**پیزی گشاد:** تەوەزەلی و سستی.

**پیس:** (پَ) كۆپلە، كۆپلە شێعر یان شانۆ، بابەتی شانۆ، شانۆنامە.

**پی‌سپار:** بروانە: "پاسپار".

**پی‌سپر:** رێبوار، راگوزار. پێشیل، پاشێل.

**پی‌سوده:** پاشێل، پێشێل كراو.

**پێشآمدگی:** بڕوانە: "برجستگی".
**پیش آمدن:** هاتنە پێش، هاتنە ڕێ، ڕوودان. ماسین، ماسان. پێشکەوتن، پێشڤەچوون.
**پیش آوردن:** 1) وەدیهێنان. 2) هێنانەحوزوور. 3) گرتنەپێش. 4) خستنەبەرباس، هێنانە کۆڕ. 5) هێنانە بەر چاو.
**پیشاپیش:** پێشتر، لەپێش دا.
**پیشادست:** پێشەکی، بێع، بەیعانە، عەرەبوون.
**پیش افتاد:** 1) پاشەکەوت، پەسمەندە. 2) بەش، پشك.
**پیش افتادن:** 1) کەوتنەبەرەوە، کەوتنەپێشەوە. 2) ڕوودان.
**پیش انداختن:** خستنەبەرەوە، زووتر ئەنجامدان.
**پیشامد:** پێشهات، بەسەرهات، بەسەرهاتن، هەڵکەفت، ڕووداو، بویەر، هاتنەپێش، هاتنەڕێ، هاتنەڕێگە، بەسەراهاتن، قەومان، قۆمان، ڕوودان، تووشی تەنگانەبوون. "**پیشامد ناگوار**": بەسەرهاتی ناخۆش، هەوتوویش. "**پیشامدکردن**": ڕوودان.
**پیشامدین:** بەهەڵکەوت، بەڕێکەوت.
**پیش امضا:** بڕوانە:"پاراف".
**پیشان:** پێشینە، سەرەتا، پێشخانە، هەیوان.

**پیش انداختن:** بردنە پێش.
**پیش انگاری:** پێش گریمانە.
**پیش اندیش:** دوارۆژبین، دوور نواڕ.
**پیشانی:** 1) تەوێڵ. 2) بەخت، شانس. 3) ڕووداری، بێحەیایی. 3) توانایی، هێز. 4) بڕوانە:"شایستگی".
**پیشانی نوشت:** چارەنووس.
**پیشاوند:** بڕوانە: "پیشوند".
**پیشاهنگ:** پێشەنگ، پێشڕەو، ڕچەشکێن، بەراهی، بەرایی.
**پیشاهنگ کاروان:** سەرقەتار، سەرقافڵەباشی، پێشەنگی کاروان.
**پیشاهنگ رقص:** سەرچۆپی کێش، بەرچەق، سەردیلان، پێشەنگی گۆبەند.
**پیشاهنگ گله:** سەرجەلە، سەرگەلە، ڕەمکێش، هوورەشۆپ.
**پیشباز:** بڕوانە "پێشواز".
**پیشبرد:** بردنەپێش، بەرەوپێش چوون، بەرەوپێش بردن، پێشڤەچوون، بەئەنجام گەیاندن/ جێبەجێ کردنی کارێ بە سەرکەوتنەوە.
**پیش برگ:** بڕوانە:"پروفرم".
**پیش بند:** بەرەڵبێنە، بەرهەڵبێنە، بەربێنکە، بەروان، بەروانکە، بەرڤانك، بەرکۆش، بەرجل، سینەبەندی کارکردن، بەرانپێڵ، بەرانپێچ.
**پیش بها:** پێشەکی، بەیعانە، پێشین.





**پیش بین:** دوابین، دوورنواڕ، پێش بین. غەیب بێژ. ژیر، زانا.
**پیش بینی:** پێشبینی، دوابینی، دوورنوواری، دووربینی، بەربووری، فەگۆتن، کاشکی، خەبەر لە دوارۆژان، خەبەردان لە ڕوونەداو، خەبەر لە ئاکامی کارێك دان، غەیب بێژی. "**پیش بینی خوب**": نوقڵانە، نوخشانەی باش.
**پیش بینی فالبین:** خالانە.
**پیش پرداخت:** پێشەکی، پێشمز، کرێ لە پێش کاردا.
**پیشتاز:** پێشڕەو، پێشەنگ. (ئابووری) بەشی داینەمۆی گەشە و پەرەپێدانی ئابووری.
**پیشتر:** پێشووتر، پێشتر، لەپێش، بەرێ، لەمەوبەرتر، زووتر، لەمێژینەتر، بەرجە.
**پیشترك:** کەمێك پێشتر، نەختێك بەرتر.
**پیش جنگ:** دەستپێشخەر لە شەڕدا.
**پیش خدمت:** پێش خزمەت، خزمەتکار، نۆکەری بەردەستان.
**پیش خرید:** پێش خڕ، سەلەم، پێشکڕ، پوولێ بە سەلەم دەر.
**پیش خواستن:** بڕوانە: "احضار".
**پیش خیز:** زووڕاب، ئەوەی کە پێشتر یان زووتر هەستێ، خزمەتکار یان شاگردی زۆربەکار، زۆرانبازی لاو و تازەکار.
**پیشداد:** 1) بڕوانە: "پیش پرداخت". 2) یەکەمین کەسێ کە یاسای بنیات نا.

**پیش داشتن:** 1) پێشکەش کردن، دیاریدان. 2) خستنە بەرەوە. 3) لە حوزووردابوون.
**پیش دامن:** بڕوانە:"پیش بند".
**پیش دان:** بڕوانە: "پیش بین".
**پیش داوری:** پێشتر و بەبێ ئاگایی تەواو سەبارەت بە شتێ دادوەریکردن.
**پیش دبستانی:** قۆناغی فێرکردنی پێش لە سەرەتایی، قۆناغی ئامادەیی. منداڵێ کە هێشتا نەچووبێتە قوتابخانە.
**پیش درآمد:** سەربەند، پێشەکی."**پیش درآمدکردن**": دەست بە قسە کردن."**از پیش کسی درآمدن**": پشتیوانیلێکردن.
**پیش در کردن:** خستنەپێشەوە، خستنەبەرەوە.
**پیش دست:** 1) هەنگاونەر. 2) هاریکار، یارمەتیدەر. 3) دەست پێشخەر. 4) زاڵ، سەرکەوتوو.
**پیش دستی:** دەس پێشخەری، سەردەق شکێنی، بەر لە خەڵك هەل لێ هێنان، پێش دەستی، دەس پێش خستن.
**پیش دین:** پێشەوای ئایین.
**پیش راندن:** ڕادان بۆ پێشەوە.
**پیش رس:** زووگەیو، نۆبەر، نۆبەرە.
**پیشرفت:** پێشکەوتن، پێشڤەچوون، چوونەپێش، هەڵدان.
**پیش رفتگی:** 1) پێشکەوتوویی. 2) هاتنەپێش.

**پیش رفتن:** 1) چوونەپێش، نزیکبوونەوە، دانە بەر. 2) پێشکەوتن. 3) کاریگەربوون. 4) درێژەکێشان. "**پیش رفتن سخن**": قبوولکرانی قسە. "**پیش رفتن کسی را**": بەرەوپیرەوەچوون، پێشوازی کردن.

**پیشرفتە:** 1) پێشکەوتوو. 2) لە رادەی سروشتی دەرچوو، تێپەڕیو.

**پیشرو:** پێشەوا، رێنوێن، پێشەنگ، پێشڕەو، لپێش. "**پیشرو دروگران**": سەرپالە.

**پیشروی:** پێشڕەویکردن، پێشکەوتن، چوونە پێش، پێش وەچوون، پێشەوایی، رابەری.

**پیشزاد:** ناوەخت، زووڕەس.

**پیش زمینە:** ئەو کۆمەڵە کارەی کە پێشەکی کارێکن، بەربوار.

**پیش ساختە:** لەپێش دا سازکراو.

**پیش شدن:** چوونەپێش، چوونەبەرەوە، پێشکەوتن.

**پیش طرح:** پێش گەڵاڵە.

**پیش فروش:** پێشفرۆش، سەلەم، بەر لە پێگەیشتن فرۆشتن.

**پیش فرض:** بەرگریمانە، گریمانەی پێش وەخت.

**پیش فرا شدن:** پێشوازی.

**پیش فرستادن:** لە پێشەوە ناردن، ناردن لە بەر کاتی خۆیدا.

**پیش فرنود:** سەرەتا، دەسپێك.

**پیش قبض:** ئەوەی کە زووتر وەچنگ دێو وەردەگیرێ.

**پیش قدم:** 1) بڕوانە: "پیش گام". 2) پێش کسوەت.

**پیش قراول:** پێش قەڕەوڵ، سەیارە، دەستەی پێشەنگی لەشکر، پێشایی لەشکر.

**پیشکار:** 1) بڕوانە: "پاکار". 2) بەرپرسی دارایی پارێزگا.

**پیشکرایە:** پێش کرێ.

**پیش کردن:** خستنەپێشەوە، ناردنە پێشەوە، پێشتر رەوانە کردن.

**پیشکردی:** سەرەتایی.

**پیش کسوت:** کەسێ کە لە زۆرخانەدا پێشینەی زیاتری لەوانی دیکە هەیە. لە سۆفیگەرێتیدا: سەرووتر لە موریدو خوارووتر لە شێخ.

**پیشکش:** پێشکەش، پێشکێش، دیاری، خەلات، زنگولنە. جۆرێماڵیات.

**پیشکشی:** خەڵاتی، بەخشراو، پێشکەش کراو.

**پیش کشیدن:** 1) راکێشان بەرەو لای خود. 2) خستنە بەر باس، خستنە روو. 3) پێشکەشکردن.

**پیشگام:** پێشەنگ، پێشڕەو، رچەشکێن.

**پیشگاە:** سەرەوەی کۆڕ، بەرهەیوان، بەردەرگا، بەردەرك. پاشا، میر. بارەگا.

**پیشگاهی:** 1) لە بەر دەرگابوون. 2) پێشەوایی، رابەری.





**پیش گرفتن:** 1) گرتنەپێش. 2) بەرگرتن، رێگەبەستن.

**پیش گفتار:** پێش گوتار، پێش وتار، پێشەکی.

**پیش گفتە:** ناوبراو، باسکراو.

**پیشگو:** 1) بەر بێژ. 2) پێش بین، دوور نوارٍ، غەیب زان، تاڵەبین.

**پیشگویی:** بڕوانە: "پیش بینی".

**پیشگە:** بڕوانە: "پیشگاە".

**پیشگیری:** پێش گرتن، پێشگیری، بەرگیری، بەرپێچ.

**پی‌شمار:** چاوەدێر.

**پی‌شمردن کسی را:** چاوەدێری هەڵسوکەتی کەسێ کردن.

**پیشمرگ:** پێشمەرگە، خۆبەخت کەر، مرۆی ئازا و بوێر. "**پیشمرگ کسی شدن**": پێش لەو مردن.

**پیش مزد:** پێشمز، بەیعانە.

**پیش میر:** بڕوانە: "پیش مرگ".

**پیش نگر:** بڕوانە: "مدبر".

**پیشنماز:** بەرنوێژ، پێش نوێژ، وەرنما.

**پی‌شناسی:** دەمارناسی، نورۆلۆژی.

**پیش‌نرفتنی:** بەرەو پێش نەچوو، جێبەجێ نەبوو.

**پیش نویس:** رەش نووس، بەر نووس، شەما، گەڵاڵە.

**پیشنهاد:** پێشنیار، پێشنیاز، تەگبیر بۆ کارێك لە پێش دا. ئامانج، مەبەست. چارەنووس.

**پیش نیاز:** پێشەکییە پێویستییەکانی کارێك. وانەیەك کە دەرچوون لێی بۆ هەڵبژاردنی وانەیەکیتر ئیجبارییە.

**پیشوا:** پێشەوا، سەرکردە، رێبەر، رێنوێن، سەرۆك، سەرکۆمار.

**پیشواز:** بڕوانە: "استقبال".

**پیشوند:** پێشگر، وشەیەکە کە خۆی بە تەنیا مانا نادا و دێتە پێش وشەوە بۆ یاریدە. "**پیشوند سلب**": پێشگری لابەر.

**پیشە:** کار، سنعات، پیشە.

**پیشەکار:** بڕوانە: "پیشەور".

**پیشەگر:** بڕوانە: "پیشەور".

**پیشەگرفتن:** کردنە کار و پیشەی خۆ.

**پیشەور:** پیشەگەر، پیشەوەر، سنعات کار، کاسبکار.

**پیشیار:** بەردەست، خزمەتکار، بەکرێگیراو، بەروەستا، هاریکار، جێگر.

**پیشیارش:** بەخشش، کەرەم، دیاری.

**پیشیارە:** دیاری، پێشکەشی.

**پیشی‌جستن:** هەوڵدان بۆ کەوتنە پێش، کەوتنەبەرەوە، کەوتنەپێش.

**پیشی دادن:** هەل رەخساندن بۆ کەسێك بە مەبەستی چونەپێش و کەوتنەبەرەوە.

**پیشی کردن:** کەوتنە بەرەوە، کەوتنە پێشەوە، هەوڵدان بۆ کەوتنە بەرەوە.

**پیشی‌گرفتن:** کەوتنە بەرەوە، کەوتنەپێشەوە. سەرکەوتن، زاڵبوون.

**پیشین:** 1) پێشین، پێشوو، بەروو، بەرێ، وەرێ، وەرین، وەرینە، لەمێژ، زۆر لە

بەرێدا، رابردوو.2) یەکەم، یەکەمین. 3) لەپێشتر، لەبەرتر. 4) نیوەڕۆ، نوێژی نیوەڕۆ.

**پیشینگان:** بڕوانە: "پیشینیان".

**پیشین گاە:** کاتی نیوەڕۆ.

**پیشینە:** پێشینە، پێشونە، رابردوو، مێژینە، لە مێژ، بەرگین.

**پیشینیان:** پێشینیان، پێشوونان، وەرینان، لە مێژینەکان، رابردوانی زوو، باب و کال.

**پیغام:** بڕوانە: "پیام".

**پیغام دار:** هەڵگری پەیام.

**پیغام رسان:** بڕوانە: "پیام رسان".

**پیسپردن:** رۆیشتن، پێوان، بڕین.

**پیغام فرستادن:** وڵام ناردن، وەرام ناردن، ئاگادارکردن، قسەڕاسپاردن، وەسێنایس.

**پیغام گزار:** بڕوانە: "پیام گزار".

**پیغلط کردن:** شوێن ون کردن، شوێنەونکەکردن، شوێن پێ سڕینەوە، دەوس نەهێلان.بە لاڕێدا چوون.

**پیفراخ:** توندڕۆ، پەڕگر، دەمار گرژ.

**پیفشردن:** 1) بڕوانە: "پی افشردن". 2) هەنگاونان، بەڕێداڕۆیشتن.

**پیك:** وڵام بەر، نامەبەر، خەبەربەر.

**پیكار:** 1) شەڕ، جەنگ. 2) رکەبەری یان کێبەرکێی وەرزشی. 3) باس و مشتومڕی بێهوودە.

**پیكار افتادن:** شەڕسازبوون.

**پیكارپرست:** شەڕدۆست، شەڕخواز، شەرحەز.

**پیكارجو:** شەڕخواز، جەنگ خواز، شەڕانی، شەڕاشۆ، شەڕانخێو.

**پیكارخواە:** بڕوانە: "پیكارجو".

**پیكارساز:** شەڕ هەڵگیرسێنەر، جەنگ ساز، شەر هەڵایسێن. شەڕکەر، جەنگاوەر.

**پیكارسان/ پیكارستان:** شەڕگە، شوێنی شەڕ و جەنگ، گۆڕەپانی شەڕ.

**پیكاركرد:** شەڕکردن، جەنگ کردن.

**پیكاركش:** پایەدار و راوەستاو لە شەڕدا.

**پیكاركشیدن:** بڕوانە: "مجادلەکردن".

**پیكارگاە:** بڕوانە: "پیكارستان".

**پیكارگر:** شەڕکەر، شەڕانی، شەرڤان.

**پیكاوی:** گەڕان و دۆزینەوە.

**پیكر:** کۆتەڵ، پەیکەر، دەرەگون، موجەسسەمە. لەشی مرۆڤ یان بوونەوەرانیتر. (فەلسەفە) روخسار. نەخش، وێنە.

**پیكرآرا:** رازێنەری پەیکەر، پەیکەرساز، پەیکەرتاش، نیگارکێش.

**پیكر تراش:** پەیکەرەتاش، کۆتەڵ ساز.

**پیكرد:** دوکەوتن، بەدواداچوون.

**پیكردن:** (پَ) 1) پەل کردن، پەڕاندنن، پەی کردن، بەقڵت بڕین، قڵت و بڕکردن. 2) دوکەوتن، شوێن کەوتن، شۆنەونیان، درێژەپێدان.





**پیكردن:** (پِ) 1) بڕینی وردەدەی ماری پێی ئاژەڵ یان مرۆڤ بە خەنجەر و شتی وا. 2) راگرتن، وێستاندن. 3) سەربزێوی کردن، سەرپێچیکردن.

**پیكركننده:** بڕوانە: "پیكرساز".

**پیكرنگار:** نیگارکێش، پەیکەرساز.

**پیكرنما:** پەیکەرنوێن، شاندەری پەیکەر.

**پیكره:** پەیکەر، وێنە، کۆتەڵ، موجەسسەمە.

**پیكسی را شمردن:** بریتی لە خستنەژێر چاوەدێری ئەو.

**پی كسی را گرفتن:** بەدوایداچوون، کەوتنەدوی.

**پیكندن:** قووڵ کردنی شوێنی دیوار یان پایەی بینا بۆ رشتنی شفتە، هەڵکەندنی بناخەی دیوار.

**پیكوب:** پێڕێخراو، پێشێل کراو، پێخوست.

**پیكوب كردن:** پێڕێخستن، پێشێل کردن.

**پیكوركردن:** شوێنپێونکردن، شوێن پێ سڕینەوە.

**پیگرد:** بەدواداچوون، گەڕان بەدوای شتێکدا، گەڕێن، ڤەگەڕ، شوێن گێڕ."**پیگرد گروهی در كوه**": کێومال کردن.

**پیگم كردن:** شوێن پێون کردن، ون کردنی شوێنەواری شتێك، دەوس نەهێلان.

**پیگیر:** شێلگیر، پێداگر، سووربوون، شوێنگێڕ، شۆپاژۆ، پەیجۆر، پەیدۆز.

**پیگیری:** وەدواکەوتن، شوێن کەوتن، شوێن گێڕان، دوای شۆپ کەوتن، بەدواداچوون، دانەدوو، دانەپەی، دەرەدوا، لێپرسینەوە، پەیجۆری، پەیدۆزی، پێبرن.

**پیل افكن:** دلێر، ئازا.

**پیلتن:** زەلام و بەتاقەت، باهۆدار، کەتە، زلحۆرت وەك فیل.

**پیله بستن:** وەك گرێ لێهاتن.

**پیله‌كردن:** 1) هەڵمسانی پووك. 2) بریتی لە پێداگری لەڕدەبەدەر.

**پیله‌ور:** دەستگێڕ، دەست فرۆش، چەرچی، گەڕیدە، وردەواڵەفرۆش، مامەڵەچی سەرپایی، حەتار، دێوەرە، دیڤەرە، کۆڵگێڕ، بەخەڵ فرۆش، چارپێچی، چاریچی، پێڵوەر، مەترەبار.

**پیلی پیلی خوردن:** بڕوانە: "تلوتلوخوردن".

**پیمان:** پەیمان، وادە، بەڵێن، قەول، مەرج، گفت، قەرار، سامە، بەخت( هیوا بێبەختە بەڵێنی خۆی ناباتە سەر). "**به پیمان**": بەم مەرجە. "**از سر پیمان رفتن**": پەیمان شکاندن.

**پیمان بستن:** پەیمان بەستن، وادە و بەڵێن دانان بۆ ئەنجام دانی کارێك.

**پیمان داری:** پابەندی بە پەیمانێ کە بەستراوە.

**پیماندە:** هاوپەیمان.

**پیمانشکستن:** پەیمان شکێنی، پەیمان شکاندن، هلشاندن، غەدداری، کامباخی.

**پیمانشکن:** پەیمانشکێن، بێبەڵێن، بێ قەول، بێشەرت و بەقا، کامباخ، غەددار، بەقەم.

**پیمانکار:** بەڵێندەر، قۆنتەراتچی، قەبەڵچی، پەیمانکار.

**پیمانکردن:** پەیمان بەستن، بەڵێن دان، قەول دان.

**پیمانگان:** بڕوانە:"اتحادیه".

**پیمانگرفتن:** بەڵێن سەندن، وادەساندن، پەیمان بەستن.

**پیمان گسل:** بڕوانە: "پیمان شکن".

**پیمان نامه:** پەیماننامە، بەڵێننامە.

**پیمان نهادن:** مەرج بەستن، پەیمان بەستن، بەڵێن دان، سۆزدان.

**پیمانه:** پێوانە، عەیارە، ئەیارە، کەوچ، میهەنگ، باتمان(کێشانەیەکە هەمبەری شازدە کیلۆ و نیو). "**پیمانه پر شدن**": گەیشتنی کاتی مەرگ. "**پیمانه درکشیدن**": شەڕاب نۆشین. "**پیمانه محصول**": کیلە، خمسە.

**پیمانی:** سەر بە پەیمان، پەیمانی، گرێبەستی.

**پیمایش:** پێوانەکردن، ئەندازەگرتن.

**پیمایشگر:** پێوەر، زەویپێو، کەسێ کە دەپێوێ.

**پیماینده:** پێوەر، کێشەر، پێوانەکار.

**پیماییدن:** بڕوانە: "پیمودن".

**پیمودن:** 1) پێوان، پێوانەکردن، ئەنازەگرتن. 2) بڕین، ڕێگەبڕین، تێپەڕاندن. 3) خواردنەوەی شەڕاب و شتی وا. 4) دەرخواردانی شەڕاب و شتی وەها. 5) پڕکردنی جامی شەڕاب. 6) بەزەویدادان و لەناوبردن. 7) لەخۆگرتن. 8) بڕوانە:"تحمل کردن".

**پیموده:** پێوراو.

**پینکی:** پونژین، پینۆک، پینەك، خەوبردنەوە، خەوەنووچکێ، خەونووچکە، خەوەکوتکێ، وێژنگ، وێژینگ، وەنەوز، چۆرت، سووکەڵەخەو، قنگەخەو، سەرخەو، بیرەخەو، بارینە، نوقورسك، نوقرسك، بۆرژان.

**پی‌نوشت:** ئەوەی بە دوای نامە یان شتێك دا دەنووسرێ، بڕیارێك کە بەرپرسی ئیدارەیەك لە خوارەوەی نامەیەك بینووسێ.

**پی‌نهادن:** پێنان، هەنگاونان، گاڤ هلگرتن. بناخەدانان، بیناکردن.

**پی‌واژ:** تەك واژەیەك کە دەنگی سەربەخۆی نیە و دەنگی شێوەی دەربڕینەکەی بەدوای دەنگی وشەی پێشترەوەیە.

**پی‌وپاچین:** بنیات، بناغە.

**پی‌وپخش:** هێز و تابشت، وزە و تاقەت.

**پی‌ورز:** بڕوانە:"متعصب".





**پیوست:** پێکەوەلکاو، پێوەبەستراو، نووساو. هەمیشە، دایمی. پەیوەس، پەیوەست، هاوپێچ. "**پیوست دادن**": پێوەنددان، گرێدان. "**پیوست کردن**": هاوپێچ کردن. "**به پیوست**": بە شێوەی هاوپێچ.

**پیوستار:** 1) بڕوانە: "پیاپی". 2) کۆمەڵەیەکی پێکەوەلکاو و لێك جیانەکراوە لە هەر شتێك.

**پیوستگی:** 1) پێکەوە لکان و لە تەنیشت یەك دابوون. 2) یەکگرتووبوون، یەکگرتوویی. 3) پێوەندی، پێوەندارێتی، پێکبەستراوی. 4) خزمایەتی، نزیکی. 5) هەمیشەییبوون، بێبڕانەوەبوون. "**پیوستگی دادن**": پێوەنددان، پێوەندیسازکردن. "**پیوستگی‌داشتن**": پێوەندی هەبوون. هەبوونی نیسبەتی بنەماڵەیی. "**پیوستگی کردن**": زەماوەندکردن. بەردەوامی لە کارێك دا.

**پیوستن:** 1) پەیوەست بوون، ڕەگەڵ کەوتن. 2) پێکەوە لکان، چەسپان. 3) هاوپێچکردن، پێ زیادکردن. 4) پێوەنددان، پەیوەستکردن. 5) بەستن، گرێدان. 6) جێگیرکردن، دامەزراندن. 7) بە یەك گەیشتن، پێکەوە بەستران. 8) بەهاوسەری گرتن. 9) وتن، گوتن. 10) هاتن، گەیشتن. 11) هاتنەدی، شکڵ گرتن. 12) هاونوێنی و جووت بوون. 13) بڕوانە:"معاشرت". 14) کردن.

"**پیوستن با(در) کسی**": ڕەگەڵ وی کەوتن. "**درهم پیوستن**": خستنەوەجێی ئێسکی لەجێچوو یان شکاو. پێکەوەبەستران، لێك جۆشدران.

**پیوسته:** 1) هەمیشە، بێپسانەوە، بەردەوام، تم، پەیوەستە.2) بەیەك گەیشتوو، پێکەوەلکاو، لکیاو، چەسپاو، پێوەبەستراو. 3) پێوەند کراو. 4) خزم، خێش. 5) هەڵبەستە، بەشێعر گوتراو. 6) پێوەکراو، دەداوکێشراو، ڕێکوپێك. "**پیوسته‌داشتن**": ئەنجامدانی کارێ بەبەردەوامی. "**پیوسته‌کردن**": پێوەنددان، بەیەك گەیاندن. پەیتاپەیتا و بێپسانەوە ناردن.

**پیوسیدن:** بڕوانە: "بیوسیدن".

**پیوند:** 1) پێوەن، پێوەند، پێوەندی، پێوەندارێتی. 2) پێوەندی دۆستانە، دۆستی، خۆشەویستی. 3) خزمایەتی. 4) بەڵێن و پەیمان. 5) جومگە، خرتکە. 6) پینە. 7) هۆنراوە. 8) بڕوانە: "ازدواج". 9) پێکەوەلکانی دووشت. 10) موتوربەکردنی دار.

**پیوندانیدن:** پەیوەند کردن، پێوەلکاندن، پێوەنووساندن، ل هەڤ نۆساندن.

**پیونداشتن:** هەبوونی پێوەندی، پێوەندیی هەبوون.

**پیوندزدن:** تووزکردن، پەیوەندکردن، لێگرێدان، تاماندن، لێنان، پێوە قایم کردن، متوربەکردنی دار.

**پیوندساختن:** 1) زەماوەندکردن. 2) یەکگرتن.

**پیوندشیمیایی:** وزەی راگری ئەتۆمەکان لە مولوکولێك دا.

**پیوندگاه:** جمگە، بەند.

**پیوندگر:** 1) مونیتۆر. 2) پێوەنددەر.

**پیوندگرفتن:** پێوەندیگرتن. پێکەوەچەسپان. "**پیوندگرفتن خاطر با کسی**": هۆگربوون بەو.

**پیوندگسلیدن:** پچڕانی پێوەندی، بڕانی پێوەندی.

**پیوندگی:** بڕوانە: "ازدواج".

**پیوندی:** پێوەنداریێتی، خزمایەتی، ئاشنایەتی.

**پیوندیدن:** پەیوەست بوون، بەیەك گەیشتن، ب هەڤـ گهیشتن.

**پیونیدن:** پەیوەندکردن، تووزکردن.

**پیەآوردن:** 1) خڕبوونەوەی بەز و چەوری لە دەورووبەری ئەندامیٚ. 2) قەڵەوبوون.

**پی‌هم:** پشت سەری یەك، لێکدالێکدا، پەیتاپەیتا.




**تائب:** تۆبەکار، پاشگەزبۆوە لە گوناح.

**تاب:** 1) لوول، پێچ. 2) تین، گەرمی، هاڵاو.3) توانایی، بەرگە، تاقەت، گریك. 4) جۆلانە، دیلان، هەرازگە، ئێزی، چلەپایە. **"بە تاب"**: بەپەلە.

**تاب آوردن:** بەرگەگرتن، تاقەت هێنان، هاوردن، دەوام هێنان، خۆراگرتن لە بەر مەسەلە و کارێك، کارین، دەربردن، هەڵکردن دەگەڵ دژواریدا، توا.

**تاباك:** دڵەکوتێ، دڵەخورپێ، نیگەرانی، پەژارە.

**تابان:** بەدرەوشین، بەدرەوش، درەوشاوە، بریقەدەر، رووناکیدەر، تابان.

**تاباندن/ تابانیدن:** 1) پێچ دان، بادان، لوول دان. 2) رووناك کردنەوە، رۆشن کردن، هەڵگیرساندن، داگیرساندن، گەرم کردن. 3) سوورکردنەوە.

**تابان کردن:** رۆشن کردن، رووناك کردن، بەدرەوشین کردن.

**تاب برداشتن:** پێچ خواردن، پێچ دران، لوول دران، لارەوەبوون. **"تاب برداشتن چشم"**: لار(خێل)بوونی چاو.

**تاب بردن با کسی:** تاقەت هێنان لە بەرابەر وی دا و بەربەرەکانیکردن لە گەڵیدا.

**تاب تحمّل:** بەرگە، خۆراگری، تاقەت، باشار، وەرگە.

**تاب خوردن:** باخواردن، باوخواردن، بادران، تاودان، پێچ خواردن، لوول دران، گرژبوون. دەورلێدان، سوورخواردن. **"تاب خوردە"**: بادراو، بادریاگ، پێچ خواردو، پێچ دراو، لوول دراو.

**تاب خوری:** بڕوانە:"نوسان".

**تاب دادن:** 1) تاودان، پێچ دان، لێك هاڵاندن، بادان، ڤادان، وادای، خول دان، سووڕدان، لوول دان، لووردان، لوورکردن، نامەتش، موونـاندن، هۆنینەوە. 2) سوورکردنەوەیەکی کەمی شتێ لە رۆن دا. **"تاب دادن کسی"**: تووڕە و ناڕەحەت کردنی ئەو.

**تاب دادە:** پێچ دراو، هۆندراو، تەنراو.

**تابدار:** بادراو، بادریاگ، تاودراو، تاودریاگ، پێچ دراو، لوول دراو، بە پێچ و پلۆوچ.





**تاب داشتن:** 1) لوول داری، پێچ داری. 2) تاقەت هێنان، بەرگەگرتن. 3) لە تووڕەیی و ناڕەحەتیدا بوون.

**تاب درآوردن در کار:** گرێ و کۆسپ تێخستن لە کاردا.

**تابس:** دڵ بوورانەوە، لاوازی، نەخۆشی دیق.

**تابستان:** هاوین.، هامن، تاوسان.

**تابش:** پرشنگ، تیرێژ، تیرۆژ، تیشك، گزینگ، شەوق، تاو، هیتی، تین، گەرمایی.

**تابع:** 1) پەیڕەو، دووکەوتوو، شوێنکەوتوو. 2) ژێردەست، ملکەچ، فەرمانبەر، ژێرفەرمان. 3) سەربە، پاشکۆ، گرێدراو. 4) بڕوانە:"متأثر". 5) هاووڵاتی ولاتێك بوون. **"تابع اولیە"**: (بیرکاری) ئەنتیگراڵ. **"تابع کردن"**: ملکەچ کردن، هێنانەبەرفەرمان.

**تابع سمج:** دوڤەلان، دوڤەلانك، دوڤدوڤك.

**تابعە:** بەرفەرمان، ملکەچ.

**تابعیت:** 1) شوێن کەوتن، دووکەوتن، پێڕەوی کردن. 2) هاووڵاتی بوون.

**تابعیت دادن:** دانی مافی هاووڵاتی، رەگەزاندن.

**تابعین:** 1) کۆی" تابع". 2) ئەوانەی کە یارانی پێغەمبەریان دیبێ.

**تاب گرفتن:** 1) بەلارێدا چوون، دوورکەوتنەوە لە رێگە. 2) لەبەر تیشکی شتێکەوە رووناك بوونەوە.

**تابل:** بەهارات، ئیسوەت و ئەدوا.

**تابلو:** شانۆ، پەردە، دیمەن، وێنە، تابلۆ.تەختەڕەش، وایت بۆرد.

**تابناك:** ورشەدار، رووناك، تریفەدار، بەدرەوشین، گەش. سەرنج راکێش و دیار.

**تابناکی:** ورشەداربوون، رووناکی، گرشەداربوون.

**تاب مقاومت:** دەرووەست، دەرۆست، وەستان، پێوەستان، دەرەقەت، باشار، توانای خۆڕاگرتن، هێزی بەرگری.

**تاب نخوردە:** بانەدراو، لوول نەدراو، خاو، درژ.

**تابندە:** 1) ورشەدار، گرشەدار، بریقەدار. 2) بادەر، لوول دەر، پێچەر، رێسەر.

**تابو:** تابۆ، تابوو، یاساغ، کۆمەڵە یاسا و بیر و باوەڕ و نەریتێك لە کۆمەڵگادا کە پیرۆز کراون و شکاندن و دەست تێوەردانیان قەدەغە کراوە.

**تابوت:** تابووت، تاوت، تاڤێر، سوندرۆك، سوندریك، سندریك، سندروویك، داربەستی مردوو گوێزانەوە، لەزاگ، چاردارە، دارە مەیت، دارەتەرم، دارتەرم، چۆتەرم، داربازە، دارەبازە، دوودارە.

**تاب و تب:** بڕوانە:"تب و تاب".

**تابوت خشکە:** بریتی لە زۆر کز و لاواز.

**تاب و توان:** وزەوهێز، توانوتاقەت، هێز و توان، تین و گوڕ، گوڕ و تین، گوژم، پلوپۆ، پێوەستان، بەرگە، کێش، تاو، تاوشت، تابشت، توان، هێز، وزە، تەڤا.

**تاب و توش:** بڕوانە: "تاب و توان".

**تاب يافتن:** 1) تيشك دۆزينەوە، نوور دۆزينەوە. 2) خوار و پێچى تێكەوتن.
**تابيدن:** 1) تيشك، پرشنگ خستن، درەوشينەوە، درەوشان، ترووسكەدان، بريقەدان.2) بڕوانە: "پيچيدن و تاب دادن".3) گەرم بوون، گەرم كردن.
**تابيده:** 1) پێچ دراو، پێچياگ، پێچياو، باوخواردو، بادراو. 2) لار، خوار. لەحاڵى سووربوونەوە يان توانەوەدا.
**تابين:** ژێردەست، بن دەست، فەرمانبەر، سەربازێك كە پلەى نييە.
**تا پاك:** بڕوانە: "تپاك".
**تاپ تاپ:** تەپتەپ، تەپەتەپ، دەنگى تەپاندنەوە بە دەست يان بە قاچ.
**تاتول:** زارخوار.
**تاتىتاتىكردن:** هەنگاونانى شل و ناپتەو، بە خاوخليچكى ڕۆيشتن.
**تاجدار:** خاوەن تاج، پاشاى خاوەن تاج.
**تاجر:** سەوداگەر، بازرگان، مامەڵەچى، تاجر.
**تاجرانه:** وەك بازرگانەكان.
**تاجر دام:** جەڵەبچى، جەڵەبكڕ.
**تاجرمآب:** بە شێوازى تاجران.
**تاجدار:** خاوەن تاج. پاشا.
**تاج شدن:** 1) بوونە ئەفسەر. 2) بوونە هۆى شانازى پێكردن.
**تاج گذارى:** تاج نانە سەر.
**تاجوار:** وەك تاج، هەرشتێكى وەك تاج. بەنرخ.

**تاجور:** خاوەن تاج و تەخت، پاشا.
**تاحدودى:** كەم تا كورتێك، تاڕادەيەك.
**تاخت:** تاو، غار، ترات، لنگار، چوارناڵە. "بەتاخت": 1) سوار ئەسپ بوون و تاودانى. 2) بەپەلە و خێرا.
**تاخت آوردن:** هێرش كردن، شالاوبردن، پەلاماردان. "بر كسى تاخت آوردن": بە توندى ڕەخنەگرتن لەو.
**تاخت زدن:** 1) گۆڕينەوەى كالابەكالا. 2) بەپەلەو ڕۆيشتن.
**تاخت كردن:** غار پێكردنى ئەسپ. تالان كردن. بەتوندى ڕەخنەگرتن.
**تاختگاه:** ڕمبازگە، شوێنى تاودانى ئەسب.
**تاختگر:** بڕوانە: "تازشگر".
**تاختن:** 1) تراتێن، تاودان، پڕتافيان، پڕتافين، توندغاردان، چوار ناڵ كردن. 2) دەسەڵات نوێنى، هێزمونى نيشان دان. 3) پەلاماردان، هێرش كردنە سەر. 4) بەتوندى ڕەخنە لێگرتن.5) تالان كردن، ڕاووڕووت كردن. 6) ڕادان، وەدەرنان. 7) بەخێرايى ناردن. 8) ڕەوان كردن. "تاختن بردن": شالاوبردن، هێرش كردن."بر كسى تاختن": بەتوندى ڕەخنە لێگرتنى.
**تاخت و تاراج:** تالان، ڕاووڕووت.
**تاختوتاز:** شەڕانخێوى، شەڕناخێوى، ئەسب تاودان، ئەسب غاردان، لينگ دانى ئەسب بە چوارناڵە، ڕمبازێن، هێرش و پەلامار.





**تاخت و تالان:** هێرش و ڕاووڕووت.
**تاخته:** تاودراو، غاردراو.
**تاخيره:** بەخت، تاڵە، چارەنووس، بەش.
**تار:** 1) ڕايەڵ، تا، تاڵ، هەودا، داو، لۆ، لۆنە. 2) يەكێك لە ئامرازەكانى مۆسيقا. 3) تاريك. 4) تەوقى سەر. 5) لێڵ، تاريك، نووتك. 6) تان، بەرامبەر بە پۆ. "تارهاى صوتى": ژێيەكانى دەنگ، دەنگەژێ.
**تاراج:** تالان، تالوو، بڕۆ، كالات، كالەت، پووڕ، پوير، ڕاوڕووت.
**تاراج شدن:** بە تالان چوون.
**تاراج كردن:** ڕووت كران و بەتالان بردن، تالان كردن، تەخت و تاراج كردن، ڕاوڕووت كردن، شەلاندن.
**تاراجگر:** تالانكەر.
**تاران:** بڕوانە: "تاريك".
**تاراندن:** ڕامالين، تاراندن، ڕادان، دوورخستنەوە، دەركردن، پەرتەوازە كردن. "تارانده": ڕامالراو، ڕادراو، پەرتەوازە، پڕژوبلاو.
**تاراننده:** ڕامالێن، تارێن، پڕژێن، دوورخەر.
**تارت:** كات، جار، جارێك.
**تارتار:** بڕوانە: "پارەپارە".
**تارديس:** بڕوانە:"شبح".
**تار زدن:** تار ژەنين.
**تارزن:** تارژەن، تارچى، كەسێ كە تار دەژەنێ.
**تارشدن:** لێڵ بوون، تار بوون، تاريك بوون، شلوێبوون.

**تارك:** 1) كەفاك، تۆقى/ تۆقە سەر، تەپڵە سەر. 2) تەريك، گۆشەگير، تەنيا، تەرك كەر. 3) تەرك كەر، وازهێنەر. "تارك ادب": بێئەدەب، ڕووهەڵماڵاو. "تارك دنيا": 1) تەركە دونيا. 2) گۆشەگير، گۆشەنشين، دوورەپەرێز، تەريك. 3) بڕوانە:"راهب". "تارك صلات": كەمتەرخەم بە نوێژ و ئەركە ئايينييەكان.
**تاركردن:** تاريك كردن، شلوێ كردن.
**تاركش:** ڕايەڵ/ تاڵ كێش.
**تارك شدن:** فەرامۆش كردنى شتى فێربوو.
**تارك نشين:** سەروونشين، ژوورنشين. پايەبەرز.
**تاركه:** مێينەى "تارك".
**تارم:** گومبەز، چێوبەست، ماڵى دارى.
**تارميغ:** مژى خەست.
**تارنما:** سايت.
**تاروپود:** تانوپۆ، ڕاهێڵو تێوەدان. بريتى لە بنە و بنچينەى شتێك. "بى تار و پود كردن": پەرتەوازە و تەرت و توونا كردن.
**تاروتفرقه شدن:** پەرتەوازە و تەفروتوونا بوون.
**تاروتور:** 1) تاريك و تنۆك، تبلچاڤ، زۆر تاريك، شەوەزەنگ، تاريكەسەلات. 2) وردە وردە، گەرديلەگەرديلە.
**تارومارشدن:** تەرتو توونابوون، تەفروتوونابوون، تێكوپێك دران، ژێروژووربوون، لێك بلاوبوون، لەناوچوون، دەماردەرهاتن، هەڵلاداد.
**تارون:** بڕوانە: "تاريك".

**تاره:** تاڵ، هەودا، رایەڵ. تاریك. تەوقی سەر.

**تاری:** 1) روون نەبوون، لێڵبوون. 2) تاریکی. 3) ناڕاستی. 4) چەپەڵ، ناپاك. 5) بەبێ درەوشینەوە و رووناکی، کووژاوە.

**تاریخ:** 1) مێژوو، دیرۆك، دێریك، بەسەرهاتی رووداوان. 2) بەروار، رێکەوت. "**پیشاتاریخ**": بەر لە مێژوو.

**تاریخ اجتماعی:** زانستی تاوتوێی مێژووی گروپەکان یان چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان.

**تاریخ باوری:** بڕوانە:"تاریخ گرایی".

**تاریخچه:** کورتەمێژوو.

**تاریخ دان:** مێژووزان.

**تاریخ ساختن:** 1) رێکخستن و دروست کردنی مێژوو( رۆژژمێر)ی نوێ لەسەر بنەمای رووداوێکی تازە. 2) تۆمارکردنی رووداوێکی گرینگ.

**تاریخ ساز:** مێژووساز، دەوران ساز، زۆر گرینگ.

**تاریخ طبیعی:** مێژووی سروشتی، نێوی زانستێك بریتی لە زیندەوەرناسی و روەك ناسی.

**تاریخ عقاید:** مێژووی بیروبڕوا.

**تاریخ کردن:** تۆمارکردنی رووداوەکانی مێژوو و دروست کردنی کتێوی مێژوو.

**تاریخ گذاری:** 1) دیاریکردنی رێکەوت بۆ دیاردەکان و شتەکان و رووداوەکان و هتد. 2) دیاریکردنی تەمەنی فوسیل و هتد لە رێگەی ئەنازەگرتنی رادەی رادیۆئەکتیوبوونی ئەوانەوە.

**تاریخ گرایی:** 1) تیۆرییەك لەسەر بنەمای یاسامەندبوونی مێژوو. 2) تیۆرییەك کە لە مەڕ کاریگەری مێژوو لەسەر ژیانی مرۆڤەکان وەك پێوانەیەك لە بەها جەخت دەکاتەوە.

**تاریخ گری:** مێژووگەری.

**تاریخ گزار:** مێژووناس، مێژووزان.

**تاریخ گو:** مێژوونووس، دیرۆك نووس.

**تاریخمندی:** مێژوومەندی، رەسەنایەتی مێژوویی.

**تاریخ نامه:** کتێبی مێژوو.

**تاریخ نگار:** مێژوونووس.

**تاریخ نویس:** مێژوونووس، مێژووزان. ئەوەی کە راستی و ناڕاستی رووداوە مێژووییەکان دەکۆڵێتەوە.

**تاریخی:** مێژوویی، دیرۆکی. زۆر کەونارا، قەدیمی. 3) گرنگ، لەبیرنەچۆوە. 4) تۆمارکراو یان شیاوی تۆمارکردن لە مێژوودا. 5) مێژوونووس، مێژووزان.

**تاریخی شدن:** ناودەرکردن و ناو چوونە مێژووەوە.

**تاریخی گری:** مێژووییگەری.

**تاریك:** 1) تاریك، تاری، جێگەی پێوار لە خۆر، رەشایی هەوا. 2) ئاڵۆز، ناڕوون، لێڵ. 3) بەبێهیوا و خۆشبەختی و سەرکەوتن. 4) شێواو، پشێو. 5) خەمبار یان ناڕەحەت یان پەرێشان. 6) پیس و ناپاك، بەدکردار، گومڕا.





**تاریك اندیش:** 1) دژی نوێگەری و رۆشنبیری، تاریك بیر. 2) بیرخراو و گومڕا.

**تاریك بخت:** بەدبەخت، بەخت رەش.

**تاریك داشتن:** تاریك کردن. خەمبارکردن.

**تاریك دل:** 1) دڵڕەش، دڵڕەق. 2) گومڕا، خافڵ. 3) خەبار، ناڕەحەت، دڵتەنگ.

**تاریك دین:** کافر، گومڕا.

**تاریك روشن:** تاریك و روون، تاریك و لێل، بەرەبەیان، بوولێڵە، بوومەلێڵ.

**تاریك شدن:** 1) تاریك بوون، رەش هەلگەڕانی دنیا دوای خۆرئاوابوون. 2) رووناکی بڕان، شۆق نەمان.

**تاریك گردیدن:** تاریك داهاتن، تاریك کردن.

**تاریك کردن:** تاریك کردن، تار کردن.

**تاریك مغز:** کەم ئاوەز، نەزان، بێمێشك.

**تاریك میغ:** هەوری رەش.

**تاریکی:** 1) تاریکی، تاریتی، رەشی، رەشایی شەو. 2) بڕوانە:"آشفتگی". 3) ئاڵۆزی، ناڕوونی.

**تاریکی بسیار:** تاریك و تنۆك، تاریك و نوتەك، تاریك و توناك، تاریکایی خەست، تاریکەسەلات، تبلەچاڤ، تاریکی (ئەنگوستە/ ئەموستە) چاو.

**تارین:** تاریك، تاریکە، رەش و تاری.

**تاز:** 1) پەست، زەبوون. 2) بڕوانە: "امرد".

**تازان:** لە حاڵی تاودان دا. راکەر، تاودەر، بە خێرایی زۆرەوە.

**تازاندن:** تاودان، غاردان، چوار ناڵە پێکردن، لینگدانی ئەسپ.

**تازباز:** مناڵباز.

**تازدن:** تاکردن، دوو قەد کردن.

**تازش:** بڕوانە: "تاخت و تاز".

**تازشگر:** پەلاماردەر، هێرشکەر.

**تازکردن:** هێرش کردن، دەست درێژی کردن.

**تازگی:** تازەیی، نوێیی، نوێبوون، تازەبوون. تێراوبوون، تێراوی. رێکوپێکی و خاوێنی. شادی. رووخۆشی. "**تازگی کردن**": رووی خۆش نیشان دان و بە رووخۆشی و هەڵسوکەوتی جوان دەگەڵ کەسێك رووبەڕووبوون. "**تازگی ها**": بەتازەیی، لەم دواییانەدا. "**بەتازگی**": بەتازەیی، لەم دوایییانەدا. جارێکیتر، سەرلەنوێ.

**تازنده:** راکەر، راکردو، تاودەر. تیژڕەو.

**تازه:** 1) نوێ، نو، تازە. 2) تورت و تێراو. 3) بڕوانە:"مؤثر". 4) دڵگیر، دڵخواز، دڵپەسند. 5) بەتازەیی، لەم دوایییانەدا. "**بەتازه**": نوێ، تازە. بەتازەیی، دیسانەوە.

**تازەایستادن:** شادبوون.

**تازەپا:** 1) پێگرتوو. 2) شوێن یان دامەزراوەیەك کە تازە دامەزرابێ. 3) تازەکار.

**تازەچرخ:** تازەکار.

**تازەچهر:** لاوی رووگەش، رووخۆش.

**تازە داشتن:** زیندووهێشتنەوەی شوێنەواری شتێك. شاد و دڵخۆش کردن.

**تازەدماغ:** خۆشحاڵ، سەرحاڵ. زانا.

**تازەرس:** بڕوانە: "نورس".

**تازەرو:** رووگەش، رووئاوەڵە، رووخۆش. شاد، دڵخۆش. تەڕوتازە.

**تازەزا:** تازەزێ، ژن یان ئاژەڵێ کە تازە منالّی بووبێ.

**تازەسال:** کەم تەمەن، لاو.

**تازە شدن/ گشتن:** 1) سەرسەوز و تێراو بوون. 2) بەرەو پەیداکردنەوە، زیندووبوونەوە. 3) شاد و خۆشحاڵ بوون. 4) روودان، پێشهاتن. 5) برەوسەندن، بەها و گرینگی پەیداکردن. 6) پڕزۆر و بەهێزبوون.

**تازەکار:** تازەکار، نوێکار، باش رانەهاتوو لە کار، ناشی، کەم ئەزموون، چەپلەر، کەم زان.

**تازەکردن:** 1) نوێکردنەوە، تازەکردنەوە. 2) سەرلەنوێ برەوپێدانەوە. 3) بەها و گرینگی پێدان.

**تازەنفس:** کەسێك کە تازە دەستی بە کار کردبێ و هێشتا ماندوو نەبووبێ، بەبێماندوویی.

**تازەنگار:** دڵبەری تازە و جوان.

**تازەنهال:** نەونەمام، نەمامی نوێ، تازەنەمام.

**تازی/ تازیك:** عەڕەب.

**تازیان:** 1) کۆی" تازی". 2) بڕوانە: "تازان".

**تازیانە:** شەللاق، شللاخ، شەلاخ، قامچی، قەمچی، قیرپاچ، تاژان، قوڕباج، قەرپاچ، خەرەزەن، جەلدە.

**تازیدن:** 1) تاودان، پڕتافیان، پڕتافین، غارپێکردن. 2) پەلاماردان، هێرش کردنە سەر. 3) پەیدابوون، دەرکەوتن. 4) گرێوکردن. 5) ئاگرپێکردن، هەڵایساندن. 6) کون کردن.

**تازیهش:** خاوەن بیر و هۆشی عەڕەبی.

**تاژ:** 1) خێوەت، رەشماڵ، سیاماڵ، چادر. 2) ناسك، شەنگ.

**تاسانیدن:** قوڕگ گوشین و خنکاندن.

**تاسە:** تارسە، تاسە، ئارەزوو، خەمباری، نیگەرانی، دڵەخورپێ، دڵەڕاوکێ. مەگیرانی، بێزو. "**تاسەگرفتن**": هەست بە خنکان کردن و ناڕەحەت بوون.

**تاسیدن:** 1) پەشۆکان، تاسین، تاسیان، حەپەسان، نیگەران بوون، دڵتەنگ بوون، خەمباربوون. 2) مەگیرانی، بێزوو. 3) هەستی تامەزرۆیی بۆ شار یان وڵاتێ لە کاتی سەفەردا.4) خنکان، هەناسەبڕان. 5) وەهانکەهانك کەوتنی مرۆڤ یان چوارپێ بەهۆی ماندوویی یان گەرمای زۆرەوە.6) رەش بوون.

**تاشدگی:** قەدکراوی، نووشتاوی.

**تاشدن:** تابوون، قەدبوون، نووشتان، نووشتانەوە.

**تاشك:** چالاك، فرز.

**تافتن:** 1) لوولدان، پێچدان، تاودان. 2) هەڵکردن، داگیرساندن، هەڵایساندن، رووناکایی و تیشك خستن. 3) تاواندنەوە و سوورکردنەوەی/ سووربوونەوەی ئاسن لە ئاگردا، تین پێدان. 3) سەرپێچیکردن، روو وەرگێڕان.





**تاکتیك:** تاکتیك، فەن، هونەری شەڕ، پلانی شەڕ، لێزانی لە هونەری شەڕدا، رێچکەبەستن، ئامادەکردنی سپا، هونەری بزاوتنی سەربازەکان و وەگەڕخستنی هێزەکانی نیزامی لە شەڕدا.

**تاکردن:** قەدکردن، دەقدان، دەق کردن، دوولاکردنەوە، دوولاکردن، بەسەریەکا هێنانەوە، بەسەریەکانووشتاندن، دانووشتاندن، دانووشتانن، دانوراشتن، نوراشتن، ڤەریستن، تەواندن. رەفتارکردن.

**تاکس:** نرخ، نرخی فەرمی، نرخی نەگۆڕ کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ شتەکان دیاری دەکرێ.

**تاکسونومی:** زانستی تاوتوێی تیۆری و شێواز و یاساکانی قاتبەندی بوونەوەرانی زیندوو بەپێی لێکچوون و جیاوازییەکانیان.

**تاکسی درمی:** ئامادە و وشك کردنەوەی پێستی بوونەوەران و دواتر پڕکردنیان بۆ پیشان دانیان لە مووزە یان پیشانگا و هتد.

**تاکیکاردی:** خێرا لێدانی دڵ.

**تالاب:** تالاو، تالاوی، زۆنگ، ئاوپەنگ.

**تالان:** بڕوانە: "تاراج".

**تالواسە:** خەمباری، نیگەرانی، دڵەخورپێ، بێئۆقرەیی، بێئارامی، حەجمین بڕان. مەگیرانی.

**تال و مال:** بڕوانە: "تارومار".

**تالی:** پێڕەو، دووکەوتوو، ئەوەی کە دوایە بێ.

**تامّ:** تەواو، کامڵ، سەرلەبەر، رەبەق، تێر. "**تامّ و تمام**": کامڵ، بێ کەموکووڕی. بەتەواوی.

**تام الاختیار:** بە دەسەڵاتی تەواوە.

**تام گرا:** تەواوخواز، پاوانخواز.

**تان/ تانە:** رایەڵ، تا، تاڵ، هەودا، داو، لۆ.

**تانژانت یك منحنی:** (بیرکاری) هێڵێکی راستە کە تەنیا خاڵێکی هاوبەشی دەگەڵ ئەو کەوانەیە هەیە.

**تانژانت یك زاویە:** (بیرکاری) نیسبەتی سینووس بە کوسینووس.

**تانستن:** بڕوانە: "توانستن".

**تانەخوردن:** بڕوانە: "سرکشیدن".

**تاو:** 1) تاقەت، هێز. 2) تین، گەرمی.

**تاواتاو:** هێز، توانایی، هێز و تابشت.

**تاوان:** بژارە، جەریمە، قەرەبوو، بژاردنەوە. تاوان، باج، بار. گوناح. زیان.

**تاوان دادن:** تاوان دان، بژاردن، بۆ بژاردنەوە، قەرەبوو کردن/ کردنەوە.

**تاوان دار:** زیان دیتوو.

**تاوان کردن:** تەمبێ کردن بە وەرگرتنی پووڵێ یان سەپاندنی کارێك. قەرەبووکردنەوە. رەخنەگرتن، ئیرادگرتن.

**تاوان کشیدن:** ناچاربوون بە دانەوەی خەسارەت.

**تاوان گرفتن:** خەسارەت وەرگرتن.

**تاوستن:** خۆڕاگرتن، بەرگەگرتن، لەئەستۆهاتن.

**تاول:** بلۆق، پۆرگ، تۆقلە، تلۆق.

**تاونده:** خاوەن دەسەلات و توانایی.

**تاویدن:** 1) تاقەت هێنان، بەرگەگرتن، باشارکردن. 2) درەوشینەوە، تروسکانەوە.

**تایم:** وەخت، کات.

**تأبی:** 1) نەویستن و پەسندنەکردنی شتێك. 2) سەربزێوی، ناگوێڕایەڵی. 3) بەباوك قبووڵ کردنی کەسێك.

**تأبید:** بێ برانەوەکردن، نەمرکردن، هەرمان کردن، هەتاهەتاییکردن.

**تأبین:** سەرزەنشت کردن، لۆمەکردن. ستایش کردنی دوای مەرگ.

**تأتر:** شانۆ، تیاتر، drama.

**تأترال:** لە پێوەندیی دەگەڵ شانۆ، شانۆئاسا.

**تأتری:** سەربەشانۆ، دراماتیك.

**تأثر:** خەمباری. کارتێکران، کاریگەری وەرگرتن. سۆز، هەست.

**تأثرآور:** پەژارەهێن، خەم و کەسەرهێن، ناڕەحەتکەر.

**تأثم:** خۆبواردن لە ئەنجام دانی گوناح، تۆبەکردن.

**تأثیر:** باندۆر، کاریگەرێتی، کاریگەری، کارتێکەری، شوێن دانان، شوێنەواردانان، هێزکار.

**تأثیر کردن:** بڕوانە: "تأثیرگذاشتن".

**تأثیر گذار:** کارتێکەر، کاریگەر، شوێندانەر.

**تأثیر گذاشتن:** کارتێکردن، کارلێکردن، کاریگەریدانان، کارکردنەسەر، کاریگەربوون، پێچوون.

**تأثیر نا پذیری:** کاریگەری دانەنان، کاریگەرنەبوون، کارتێ نەکردن.

**تأجیل:** دەرفەت پێدان، کات پێدان، ماوە دیاریکردن، دواخستن.

**تأخر:** وەدواکەوتن، دواکەوتن، لەدواوەمان، درەنگ بوون. دواکەوتوویی.

**تأخیر:** وەدواخستن، دواخستن، درەنگ کردن، پەك خستن. "**بە تأخیر افتادن**": جێبەجێنەبوون لە کاتی خۆیدا، وەدواخران بۆ کاتێکی تر.

**تأخیرکردن:** خۆوەدواخستن، پێچوون، کات بەخت کردن، پاوپا.

**تأدب:** فێربوونی ئەدەب، بەئەدەب بوون.

**تأدیب:** ئەدەب کردن، تەمێ کردن. پەروەردەکردن، راهێنان. فێرکردنی ئەدەب و فەرهەنگ بە کەسێك.

**تأدیه:** بەجێهێنان، دانی پووڵ یان وام، دانەوە.

**تأذی:** ئازار کێشان/ دیتن، رەنجان، دڵشکان.

**تأسف:** داخ/ ئاخ هەڵکێشان، خەمناك بوون، خەمباری، خەم و پەژارە.





**تأسف انگیز:** خەماوی، خەم هێن، جێی کوڵ و کەسەر.

**تأسف بار:** داخاوی، جێی داخ و کەسەر، کەسەربار.

**تأسف خوردن:** هەسر خواردن، خەم و کەسەرخواردن.

**تأسی:** پێڕەوی کردن، وەدووکەوتن، لاساییکردنەوە.

**تأسیسات:** کۆی"تأسیس"، دامەزراوەکان.

**تأسیس کردن:** دامەزراندن، دانان، رۆنان، بنیاتنان، بناخە/ بناغە دانان.

**تأشیر:** ئاماژە بۆکردن، قامك راداشتن، دیاریکردن.

**تأصل:** بنەچەداربوون، ریشەداربوون، ریشەداکوتان، رەسەن بوون، رەسەنایەتی، خاوەن بنەوبنەچە بوون.

**تأکد:** پتەوبوون، قایم بوون، توندبوون. جەخت بوون، تەکەس بوون.

**تأکید:** پێداگرتن، سووربوون، جەخت کردن، تەکەس کردن، تەئکیدکردن، دووپات کردنەوە.

**تألف:** هۆگری، بوونە هەڤاڵ.

**تألم:** دەردمەند بوون، لەش بەباربوون، بەژان بوون، دڵشکان، ئازارگەیشتن. لەش بەباری، دەردمەندی.

**تأله:** ئیدیعای خودایی کردن. خواپەرستی، خۆپارێزی.

**تألیف:** 1) نووسین، دانان، دانین. 2) کۆکردنەوە. 3) هەڤاڵ بوون، باناندن، هۆگرکردن. 4) بڕوانە:"استمالت". "**تألیف قلوب**": وەدیهێنانی خۆشەویستی و دۆستایەتی لە نێوان کەسەکان دا.

**تأمل:** 1) وردبوونەوەی قووڵ و ناوەکی، وەردەوبوون، لێوردبوونەوە، تێرامان، رامان، هەڵوەستە، سەرنجدان، ئەندێشەکردن، بیرکردنەوە. 2) دوورنواڕی.

**تأمیل:** هیوادارکردن، بەتاسەکردن، تامەزرۆکردن.

**تأمین:** 1) دابین کردن، مسۆگەرکردن، بیمە کردن. 2) ئامادە، دابین. 3) بە باوەڕپێکراو و دەس پاك دانان.4) هێمن کردنەوە، ئاسوودەیی بەخشین، دڵنیایی پێدان. 5) پارێزراو. "**تأمین دادن بە کسی**": مسۆگەرکردنی ئاسایشی ئەو. "**تأمین داشتن**": ئاسوودەبوون، لە ئاسایش دابوون.

**تأنس:** خووگرتن، هۆگربوون، عادەت گرتن، راهاتن.

**تأنی:** شێنەیی، ئارامی، لەسەرەخۆ، هێواش.

**تأنیث:** مێینەیی، مێوینەیی، ژنێتی.

**تأنیس:** باناندن، هۆگرکردن.

**تئوری:** تیۆری، بنەما زانستییەکان، زانستی تیۆرەکی (تیۆریك).

**تئوریست:** تیۆریست، بیردۆز، بیرداڕێژ، تیۆرزان.

**تئوریسین:** تیۆریسیێن، شارەزا لە بنەما و پرەنسیپە زانستییەکان دا.

**تئوریوار:** تیۆریئاسا، بەشێوەی تیۆری، ناکردەیی.

**تئوکراسی:** حکوومەتی پیاوە ئایینییەکان، حکوومەتی ئایینی، حکوومەتی تێکەڵ بە دەسەڵاتەکانی ئایینی و ئیسلامی، ئەو سیستمەی کە لە سەر باوەڕی ئایینی دامەزراوە.

**تأویل:** راڤەکاری، راڤەی نوێ، ئازەنتی، لێکدانەوە و ماناکردنەوەی ناوەرۆکی ئاخاوتە، "هێرمۆنۆتیك". پاساودان. **"بە هیچ تأویل"**: هەرگیز، بەهیچ جۆرێك.

**تأویل تمثیلی:** راڤەی (تەمسیلی/ نواندنەوەیی).

**تأویل شناس:** شارەزا لە راڤەکاری و لێکدانەوەی قورئان.

**تأویل گر:** راڤەکار.

**تأویل مخاطب:** راڤەی بەردەنگ.

**تأویلی:** راڤەیی.

**تأهب:** سازوتەیاربوون، ئامادەبوون.

**تأهل:** ژن هێنان، ژن خواستن. ژیانی هاوبەشی ژن و مێردایەتی.

**تأهیل:** بە شیاو دانان، شیاوێتی.

**تأیید:** پشت راست کردنەوە. وزە و هێز پێدان. یارمەتی دان، پشتیوانی کردن.

**تأییدنامە:** نامەی پشت راستکردنەوە.

**تب:** نۆبەتێ، تا، تاو، تاولەرز، یاو. **"تب بریدن"**: لەناوبردنی تاولەرز. **"تب چیزی شکستن"**: پێش بە پەرەگرتنی گیران، لەبرەوی کتوپڕکەوتن. **"تب شبانە"**: شەوتا، شەڤتا، تای شەوانە، نۆبەتێ لە شەودا. **"تب شکستن"**: تاولەرز بڕان. ***"تب روزانە"***: رۆژ تا، نۆبەتێ کە هەر بە رۆژە، بەرانبەری شەوتا.

**تب آلود:** بە تاولەرز، نۆبەتێدار.

**تباب:** تیاچوون، زیان دیتن، لە دەست چوون.

**تبادر:** کەوتنە بەرەوە، دەست پێشخەری، پەلەکردن بۆ پێشکەوتن لە کارێك دا. **"تبادر ذهن"**: بە زەین گەیشتن.

**تبادل:** ئاڵوگۆڕ، گۆڕینەوە.

**تبادل نظر:** راگۆڕکێ، بیروڕاگۆڕینەوە، راگۆڕینەوە.

**تبار:** 1) رەچەڵەك، بنەوبنەچە، نەژاد، خانەدان.2) بنەماڵە و خزمان.

**تبارشناسی:** رەچەڵەکناسی.

**تبارشناختی:** رەچەڵەکناسانە.

**تبارز:** خەبات کردن، دەگەڵ یەکدی شەڕکردن.

**تبارك:** (ڕ) پیرۆز و بەبەرەکەت بوون.

**تبارك اللّە:** 1) پاك و بێگەردە خودا. 2) لە کاتی سەرسوڕمان و ئەقڵ پێنەشکان دا دەردەبڕدرێ.

**تبارنامە:** بڕوانە: "شجرەنامە".

**تباسیدن:** بوورانەوە بە هۆی تینی گەرما، بێهێزبوون لە بەر گەرما، لەش گران بوون لە تا یان گەرما، داهێزان، داهێزران.





**تباشر:** (شُ) مزگێنی/مژدەدان بە یەکتر.

**تباع:** (تَ) پێڕەوی کردن، وەدووکەوتن، وەشوێن کەوتن.

**تبّاع:** (تُ) کۆی"تابع".

**تباعت:** پێڕەوی کردن، وەشوێن کەوتن.

**تباعد:** دوورکەوتنەوە لە یەکتر.

**تباکی:** گریانی درۆیین، خۆ لە گریان دان.

**تبانی:** کەینوبەین، خۆمانەخۆمانە، پێکهاتنی بە نهێنی لەسەر کارێك، سازوباز، سەروساخت، ساختوپاخت، سەینوبەین.

**تباە:** ئاڵۆز و پەرێشان. زایە، خەسار، فیڕۆ، رزان/ رزیو، خەرا، گەنیو، گەندەڵ. زەبوون. هەڵە، خەتا. کەم نرخ.

**تباهانیدن:** بە فیڕۆدان، زایەکردن، رزاندن، گەناندن.

**تباەراە:** لە رێی راست دەرچوو، گومڕا.

**تباە شدن:** بەفیڕۆچوون، زایەبوون، خەساربوون، لەنێوچوون.

**تباهکار:** وێرانکەر، لەناوبەر، تیابەر، خراپەکار، تاوانبار، تاوانکار، گوناهکار، بێئاکار، بەفیڕۆدەر.

**تباهکاری/ تبهکاری:** فناز، فناس، کاری ناڕەوا و مایەی شەرمەساری، خراپەکاری، ئاژاوەوگەندەڵی، سەرپێچی و ئەنجامدانی کاری دزێو و ناڕەوا.

**تباەگفتن:** قسەی پڕوپووچ وتن.

**تباهی:** وێرانی، تیاچوون. گەندەڵی. پەرێشانی، پشێوی.

**تباهیآوردن:** گەندەڵی خستنەوە.

**تباهی پذیر:** گەندەڵی گر، ئەو شتانەی کە تووشی رزیوی و گەنیوی دەبن.

**تباهیجستن:** بڕوانە: "افساد".

**تباهیدن:** بڕوانە: "تباەشدن".

**تباین:** جیاواز بوون، دژی یەك بوون، ناتەبایی، جیاوازی نێوان دوو شت، ناکۆکی، لە یەك نەچوون.

**تبتیل:** دابڕان، لە دنیا دابڕان و بە خوا پەیوەست بوون.

**تبجیل:** رێزدانان، بە گەورەدانان.

**تبحث:** گەڕان، پشکنین، لێکۆڵینەوە، ڤەکۆلین.

**تبحّر:** فرەزانابوون، لێزانی، چازانی، شارەزایی، کارامەیی، باش زانی.

**تب خال:** تێمیسك.

**تبختر:** بە لەنجەولار و خۆنوێنی رۆیشتن، خۆبادان و خۆنوێنی، بەفیز.

**تبخیر:** بە هەڵم کردن، هەڵماندن، بوون بە هەڵم، گۆڕانی تراو بە هەڵم.

**تب دار:** نۆبەتێ دار، یاودار، کەسێ کە تای لێ دێ.

**تبدد:** پڕژوبڵاوبوون. پەرێشان بوون. بەش بەش کردن.

**تبدل:** گۆڕان.

**تبدیل:** گۆڕین.

**تبذل:** دۆڕاندن و تەرك کردنی شتێك، رووگەشی.

**تبذیر:** بڕوانە: "اسراف".

**تبرئه:** بەردان، ئازادکردن، تۆمەت لابردن، بێ تاوان بوون، بێ گوناهی، فحێل، پاکانە. سەلمێنران یان سەلماندنی بێ تاوانی کەسێك لە دادگادا.

**تبرج:** خۆرازاندنەوە، خویاکردنی خشڵ و زێڕوزەنبەر و جوانییەکان لە بەرامبەر بێگانەدا.

**تبرز:** بەرەو فەزا دەرچوون، دەرکەوتن، ئاشکرابوون.

**تبرع:** چاکەکردن و بەخشین لە ڕێگەی خوادا، خێرکردن.

**تبرم:** خەمباربوون، دڵتەنگ بوون، وەزاڵەهاتن.

**تبری:** دوورکەوتنەوە، بێزاری.

**تبرید:** ساردکردنەوە، فێنك کردنەوە.

**تبریك:** پیرۆزبایی، چاوڕوونی.

**تبریك عید:** جێژنەپیرۆزە، جێژنەپیرۆزی، جێژن ممبارەکی.

**تب زده:** 1) بڕوانە:"تب دار". 2) گەرم، بەتین.

**تبست:** بڕوانە: "تباه".

**تبستغ:** ڕەوان بێژ، کەسێك کە بە پەلە قسە بکا.

**تبسط:** پانوبەرین بوونەوە، بەربڵاوی و ئاوەڵایی.

**تبسّم:** وردەبزە، بزە، زەردە، زەردەخەنە، زەردەخۆ، زەردەکەن، زەردەکەنی، بسکە، گەشە، مزچ.

**تبسّم کردن:** مزمزین، زەردەخەنەکردن، بزەکردن، بزەگرتن، بزەهاتنەسەردەم، بزەنیشتنە سەر لێوان، گەشەگرتن، مزچین.

**تبسیدن:** بڕوانە: "تباسیدن".

**تبش:** 1) بڕوانە: "تابش". 2) گەرمی، تین.

**تبشیر:** مژدەدان، مزگێنی دان.

**تبصّر:** (صُ) وردبوونەوە، تێڕوانین، بینایی.

**تبصره:** ڕوونکردنەوە، تێبینی.

**تبطیل:** پووچەڵ کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە.

**تبع:** 1) شوێن کەوتن، دووکەوتن، پێڕەوی کردن. 2) بەپێی، بەگوێرەی، بەدوای.

**تبعات:** کۆی"تبعت"، ئاکام و دەرەنجامە خراپەکان، سزای گوناهەکان.

**تبعت:** ئاکام/ دەرەنجامی خراو.

**تبعه:** 1) کۆی"تابع"، وەشوێن کەوتوان. 2) هاووڵاتی.

**تبعیت:** پێڕەوی، شوێن کەوتەیی، پاشکۆیەتی.

**تبعید:** تاراوگە، مەنفا. دوورخستنەوە.

**تبعیدگاه:** تاراوگە، مەنفا.

**تبعیدی:** دوورخراو(ە).

**تبعیض:** هەڵاواردن، جیاوازیدانان، جیاکردنەوە، پاژپاژکردن، دووچاوەکی. **"عدم تبعیض":** هەڵنەواردن، نەبوونی جیاکاری.





**تبعیض آمیز:** تێکەڵ بە هەڵاواردن، جیکارانە، دووچاوەکییانە، discimionatory.

**تبعیض نژادی:** جیاوازی نەژادی، هەڵاواردنی نەژادی، "ئاپارتاید".

**تبعیضی:** بڕوانە: " تبعیض آمیز ".

**تبغیض:** دوژمنایەتی نانەوە، ڕق و کینە سازکردن.

**تبل:** (تَ.بَ) کەندولەند و ناتەختایی سەر شتێك.

**تبل:** (تَ.بْ) ڕق، دوژمنی.

**تبلّج:** پێکەنین و شادمان بوون، ڕووناك بوونەوە، سپێدە.

**تبلور:** بوونە بلوور، بە شکڵی بلوور دەرهاتن، بە کریستاڵ بوون، بوونە کریستاڵ. دەرکەوتنی بەشی گرینگ و سەرەکی یان پوختە و چۆڕاوەی شتێ، بەرجەستەبوون.

**تبلیغ:** بانگەشە، ڕاگەیاندن، پروپاگەندە کردن.

**تبلیغات:** کۆی"تبلیغ".

**تبند:** فێڵ، تەڵەکە.

**تبنّی:** بە منالی خۆ قبووڵ کردن.

**تب و تاب:** جۆش و خرۆش، گوڕ و تین، کەفوکوڵ. **"در تب و تاب بودن":** هەڵخڕانی سۆز و هەبوونی حاڵەتی ورووژان، لە جۆش و خرۆش دابوون.

**تب ولرز:** تاوتێ، لەرز و تای نۆبەتی، کزگرین.

**تبه:** سووکەڵەی "تباه".

**تبه‌روزگار:** ڕۆژگار پەرێشان، ڕۆژ ڕەش، بەدبەخت، ستەمکار.

**تبهکار:** بڕوانە: "تباهکار".

**تبیان:** ڕوون بوونەوە، دەرکەوتن، ئاشکرابوون. دەربڕین و ئاشکراکردنی مانا.

**تبیره‌زن:** دەهۆڵ ژەن، تەپڵ ژەن.

**تبین:** ئاشکرابوون، دەرخستن، دەرکەوتن، پەیدابوون.

**تبییض:** سپی کردنەوە، ڕۆشن کردنەوە.

**تبیین:** 1) دەربڕین، قسەوتن. 2) ئاشکراکردن، دەرخستن. 3) ڕوونکاری، ڕوون کردنەوە، ڕوونکردنەوە و لێکدانەوە.

**تپاك:** بێ ئۆقرەیی و نیگەرانی.

**تپانچه:** زللە، شەپلاغە. **"تپانچه‌زدن":** زللەلێدان، شەپلاغەلێدان.

**تپاندن:** تەپاندن، تێ‌تەپاندن، چەپاندن، ئاخنین، تێ ئاخنین، تێ خزاندن، تێ پەستاوتن، تێ پەستان، دەناونان بە نهێم، بخۆرتی خستنەناو، تێوەکردن. دانی شتێ بە کەسێك بە نرخێکی زۆر. فرەخواردن، زۆرخۆری.

**تپ تپ:** بڕوانە: "تاپ تاپ".

**تپش:** بێ ئارامی، بێ ئۆقرەیی، دڵەخورپێ، دڵەتەپێ، نیگەرانی، جووڵانەوە، لەرینەوە، کوتە، ترپە، چڵکدانی توند، لێدانی دڵ. گەرمی، تین.

**تپق:** زمان گیرانی کتوپڕ، زمان هەڵەنگوتن، جۆریان.
**تپق زدن:** دەم تێکەڵ بوون، قسە بۆنەهاتن، زمان لێك ئاڵان، تۆپۆق لێدان.
**تپل:** خەپەتۆڵە، ورچەقوڵە، ورچەکوڵە، گردەڵ، وردەڵ، کورتەباڵای خڕکەڵە.
**تپنکوز:** بڕوانە: "ابله".
**تپیدن:** لەرینەوە، بێ ئارام بوون، بێ ئۆقرەیی کردن، لێدانی دڵ و ڕەگ. تێ تەپین، تەپیان، تێ خزین بە نهێم.
**تتابع:** پەیتاپەیتابوونەوە، پەستاپەستا هاتن، یەك بە دوای یەك دا هاتن.
**تتبّع:** 1) وەشوێن کەوتن، دووکەوتن، شوێن پێ هەڵگرتن، بەدواداچوون، بە دواداگەڕان. 2) تاوتوێ و لێکۆڵینەوەکردن. 3) پێڕەویکردن. 4) لاسایکردنەوەی شێعر یان قسەی کەسێك.
**تتربو/ تتره:** شۆخی، تەڵفیز، گەپجاڕی، گەمە و گەپ.
**تتریك:** بەتورك کردن.
**تتق کشیدن:** پەردەکێشان.
**تتق نیلی:** بریتی لە ئاسمان.
**تتمّە:** تەواوکاری، پاشماوە، ماوە، ئەوەی کە شتێکی پێ تەواو دەبێ.
**تتمیم:** تەواوکردن، کامڵ کردن، بە کۆتایی گەیاندن.
**تته پته:** بڕوانە: "الکن".
**تثاؤب:** باوێشك دان.
**تثاقل:** قورس بوون، قورسی.
**تثبت:** تێڕامان لە بابەتێك، پتەو و ڕاوەستاوبوون، سەقامگیری، پایەداری.
**تثبیت:** چەسپاندن، دامەزراندن، جێگیر(کردن/ بوون)، سەلماندن، پایەدارکردن.
**تثبیت قیمت:** نرخ بڕین/ بڕینەوە، نرخ دانان.
**تثریب:** سەرزەنشت کردن، لۆمەکردن.
**تثقیب:** کون کردن، سمین.
**تثقیف:** ڕۆشنبیر کردن، خوێندەوارکردن. بڕوانە:"اصلاح".
**تثقیل:** قورس کردن.
**تثلیث:** 1) سێتایی بوون، سێیانەیی. 2) کردنە سێ بەش/ کەرت، سێ سووچ کردن.
**تثلیم:** کون بوون.
**تثمیر:** بەرهەم هێنان، میوە چنینەوە، بەهرەوەرگرتن.
**تثمین:** نرخ بڕین، نرخاندن، خەملاندن. هەشت سووچ کردن.
**تثنی:** چەمینەوە، چەمانەوە، داهاتنەوە.
**تثنیە:** چەماندنەوە، نووشتانەوە، مووچاندنەوە. دوو تا کردن، کردنە جووت.
**تجادل:** مشتومڕ کردن، بە گژیەکتردا چوون، دەگەڵ یەکدی کێشە و دم بە دمە کردن، دەمەوەری، دەڤە ژەنگ.





**تجاذب:** کێشکردن، یەکترکێشان، هەر کەسەو بۆ لای خۆی کێشان، بەربەرەکانێ کردن.
**تجار:** کۆی"تاجر".
**تجارب:** کۆی" تجربە"، ئەزموونەکان.
**تجارت:** بازرگانی، کڕین و فرۆشتنی گشتی هەر جۆرە شمەکێك، مامەڵەکردن، ئاڵوێرکردن.
**تجاسر:** 1) پڕکێشان، زات کردن، پێوێران. 2) سەرکێشی، کەڵەوەکێشی، نەترسی، بوێری، ئازایەتی.
**تجافی:** ئارام نەگرتن لە شوێنێك، دووری کردن، دوورکەوتنەوە، لالووتی.
**تجالد:** (تَ.لُ) بە خەنجەر لە یەکتر دان.
**تجانب:** دوورکەوتنەوە، دووری کردن.
**تجانس:** هاوچەشن بوون، هاوشێوەبوون. هاوچەشنی.
**تجانس آوایی:** هاوچەشنیی دەنگی.
**تجانس حرفی:** هاوچەشنیی پیتی.
**تجاوب:** وڵامدانەوە بە پرسیاری یەکتر، بە دەنگەوەچوون.
**تجاوز:** دەست درێژی، پێ درێژی، تێ پەڕبوون، تێ پەڕاندن، تێپەڕین لە سنوور، سنووربەزاندن، سنوورشکێنی، لە (ڕادە/ ئەندازە)ی خۆ دەرچوون، زێدەگاڤی، زێدەڕۆیی، وەسەرپەڕین.
**تجاوزات:** کۆی" تجاوز، سنوورشکانەکان، دەستدرێژییەکان.
**تجاوزکار:** دەست درێژ، سنوورشکێن، تێ پەڕێن لە سنوور، لەمپەربەزێن.
**تجاویف:** کۆی"تجویف".
**تجاهر:** کەسێك کە کاروباری خۆی بە قەستی و ئاشکرا بکا، دەرخستن و خویاکردن، ئاشکراکردن.
**تجاهل:** نەزانم کاری، خۆگێل کردن، خۆ لێ گێل کردن، خۆوێڵ کردن، لەقەستی خۆبەنەزان نیشان دان، خۆبەنەزان ناساندنی ئاگەدار. "**تجاهل العارف**": خۆلە نەزانی دانی زانا.
**تجبر:** فیز، دەعیە، خۆبەزل زانین.
**تجبیر:** بڕوانە: "شکستەبندی".
**تجدد:** نوێ بوونەوە، تازەبوونەوە، نوێخوازی.
**تجددطلب:** نوێخواز.
**تجددگرا:** نوێخواز.
**تجدید:** 1) نوێکردنەوە، نوکرنەڤە، تازەکردنەوە، دەست پێکردنەوەی بابەتێك یان کارێك، لە سەرەتاوە دەست پێکردنەوە. 2) ئەو قوتابییەی کە لە چەند وانەیەك دا دەرنەچووبێ و پێویستە سەر لە نوێ تاقی بکرێتەوە. "**بە تجدید**": دووبارە، سەرلەنوێ.
**تجدیدحیات:** بووژانەوە، لەدایك بوونەوە، ڤەژان، ڕێنێسانس.
**تجدیدخاطرە:** وەبیرهێنانەوەی بیرەوەری.
**تجدیدفراش:** ژنی دیکە هێنان.

**تجدیدقوا:** وەدەستهێنانەوەی وزەی لەدەست چوو. سەرلەنوێ خڕکردنەوەی کەسانی نیزامی یان سەروسامان دان بە کەس و کەلوپەل و ئامرازەکانی پێشوو.

**تجدیدکردن:** دووپات کردنەوەی چالاکی یان دەست پێکردنەوەی یان وەدیهێنانەوەی سەرلەنوێی شتێ. نەدانی نەمرەی قبوولّی لە تاقیکاریدا.

**تجدیدنظر:** پێداچوونەوە، چاوپێداخشاندنەوە. "**تجدید نظر خواهی**": داوای سەرلەنوێ پێداچوونەوەکردن. "**تجدیدنظرطلبی**": گۆڕانکاری لە بنەما سەرەتاییەکانی مەرامی حیزبی بەتایبەتی لە بنەمابنەڕەتییەکانی مارکسیسم.

**تجدیدی:** تەژدیدی، کرچە ئەزموون، ئەزموونی نیوەچڵ، دەرنەچوونی قوتابی لە چەند وانەیەکدا.

**تجذیر:** بڕین، ریشەکێش کردن، بنەبڕکردن.

**تجربه:** ئەزموون، تاقی، سەنگان، جەڕب.

**تجربەآموختن:** ئەزموون فێربوون، دەرس وەرگرتن.

**تجربەدیده:** بڕوانە: "آزموده".

**تجربە کردن:** ئەزموون کردن، تاقیکردنەوە، سەنگاندن، سەنگانن، جەڕباندن، قوونەکەوکردن.

**تجربەگرایی:** ئەزموونگەرێتی، رەسەنایەتی ئەزموون، empiricism.

**تجربەگرایی منطقی:** ئەزموونگەرێتی لۆژیکی.

**تجربە مفهومی:** ئەزموونی چەمکی.

**تجربی:** ئەزموونکراو، لەسەر بنەمای ئەزموون، تاقیکاری.

**تجرد:** 1) رووت بوونەوە. 2) پەتی، رووتی.3) سەڵتی، سەڵتێتی، رەبەنی، بێژنی، تەنیایی.4) لە زاراوەی عارفان دا: دووری کردن لە هۆگرییەکانی دنیا. 5) نامادديبوونی بوون.

**تجرّی:** 1) زاتکردن، وێران. 2) سەربزێوی، سەرپێچی، نافەرمانی.

**تجریح:** بریندارکردن.

**تجرید:** 1) داماڵین، داڕووتاندن، رووت کردنەوە، "ئەبستراکت" کردن، بە تەنێ هێشتنەوە. 2) تەنیایی، دوورەپەرێزی. 3) بڕوانە: "پیرایش". 4) لە زاراوەی عارفان دا: تەرك كردنی خۆشییەکانی دنیا و سەرقاڵبوون بە نوێژ و رۆژووەوە. 5) جیابوون لە ماددە و دنیای ماددی.

**تجریدی:** بڕوانە:"انتزاعی".

**تجریع:** قوم قوم خواردنەوەی ئاو و هتد.

**تجزیه:** بەش بەشکردن، کەرت و پارچەکردن، هەڵوەشاندنەوە، جیاکردنەوە، لێك كردنەوە. (ڕێزمان) شیکردنەوە.

**تجزیەطلب:** (سیاسی) جیایی خواز.

**تجزیەگر:** هەڵوەشێنەر، شیکەرەوە.





**تجزیەناپذیر:** لەت نەبوو، لێك جیانەکراوە، دابەش نەبوو.

**تجزیە و تحلیل:** شی کردنەوە، شرۆڤەکردن، تاوتوێ، باس و لێدوان. ئاناتۆمی.

**تجسّد:** 1) بەرجەستەکردن، بەرجەستەبوون، زنتۆڵ و شاقەڵداربوون.2) بەرجەستەیی، زنتۆڵی.

**تجسّس:** گەڕان، بەدوادا گەڕان. سیخوڕیکردن، شۆفاری، زیرەوانی.

**تجسّم:** بەرجەستەکردن/ بوون، گەورەو بەرزکردنەوە، وێناکردن، هێنانەبەرچاو، بوون.

**تجشّم:** رەنج كێشان، لەئازارکەوتن.

**تجصیص:** گەچ/ گێچ کاری.

**تجعّد:** لۆچ و لوول بوون، پێچ پێچ بوونی مووی سەر.

**تجفاف:** (تَ) وشك كردن.

**تجفّف:** وشك بوون، وشك هەڵاتن.

**تجفیف:** وشك كردن.

**تجلی:** دیارکەوتن، دەرکەوتن، ئاشکرابوون، خویابوون.

**تجلیات:** نیشانەکانی دیارکەوتنی شتێك.

**تجلید:** 1) پێست لێ کردنەوە لە شتێ. 2) بەرگ گرتن، بەرگ تێگرتن، بەرگ تێهەڵكێشان.

**تجلیگاه:** دیارگە، شوێنی دیار، دەرکەوتن.

**تجلیل:** بەرز نرخاندن، رێزلێنان، رێزگرتن، گەورەکردن.

**تجمّع:** کۆبوونەوە، گردبوونەوە، خڕبوونەوە.

**تجمّل:** خۆ رازاندنەوە، خۆ جوانکردن، خۆلە گوڵێدان. بوونی ماڵ و کەلوپەلی بەنرخ کە نیشانەی شکۆبێ. گرۆیی بەهەبوونی شکۆ و ماڵ و کەلوپەلی گرانبایی.

**تجمّلات:** زریقەوبریقەی ژیان، زیرۆزێو، خشڵ.

**تجمّلی:** (دێ) لۆکس، بەرزوتەرز، شایانە، دەرەجە یەك، deluxe.

**تجمید:** بەستن، مەیاندن، قەرساندن، جەمداندن. وەستاندن.

**تجمیع:** کۆکردنەوە، جڤاندن، پێکەوەبەستن.

**تجمیل:** رازاندنەوە، خەملاندن، جوانکردن، تاس و لووس دان.

**تجنّب:** دوورکەوتنەوە، دووری کردن، خۆلادان، خۆپارازتن.

**تجنیب:** دوورخستنەوە، دوورکردنەوە.

**تجنید:** سەربازگرتن، سەربازگیری.

**تجنیس:** 1) کردنە هاوڕەگەز و هاوولاتی، تاك رەگەزی. 2) (ڕێزمان) بڕوانە:"جناس".

**تجوّز:** ئاسان گرتن و تاقەت هێنان، چاوپۆشیکردن، بەڕەوازانین.

**تجوّع:** برسێتی کێشان.

**تجوّل:** گەڕان، خولانەوە.

**تجوید:** چاکە/ چاک کردن، کاری باش کردن. دەنگی هەر پیتەی لە شوێنی خۆیدا خوێندنەوە.

**تجویز:** 1) ڕێپێدان، ئیزن دان.2) بە (ڕەوا/ شیاو) زانینی دەوا یان غەزا یان نەشتەرگەری بۆ نەخۆش. 3) پێشنیارکردن.

**تجویع:** برسی کردن.

**تجویف:** ناوبەتاڵ کردن، کلۆر کردن، بۆش کردن. و هەروەها بە مانای ناوەوەی شتێك.

**تجهّز:** (تَ.جَ.هُ) ئامادەبوون، سازبوون.

**تجهّم:** ڕووترش کردن، ڕووتاڵ کردن.

**تجهیز:** 1) تەیارکردن، پڕچەك کردن، ئامادەکردن، سازکردن. 2) تەقەمەنی، کەلوپەلی شەڕ، تڕوتفاق.

**تجهیل:** بەنەزان لە قەڵەم دان.

**تحادث:** لە گەڵ یەکتری دووان، هەڤپەیڤین.

**تحارب:** پێکەوە شەڕکردن، لێکدان.

**تحاسد:** ئێرەیی/ بەغیلی بردن بەیەکتر.

**تحاشی:** دوورکەوتنەوە، خۆپارازتن، خۆلادان، دوورەپەرێزی. حاشاکردن، وەئەستۆنەگرتن. چوونەلاوە.

**تحاکم:** پێکەوە چوونە لای دادوەر/ حاکم.

**تحالف:** دەگەڵ یەکدی سوێند خواردن و پەیمان بەستن، هاوسوێند، بوونە هاوپەیمان.

**تحامق:** خۆ لە گەوجی و گەمژەییدان.

**تحامی:** پارێزکردن، خۆبواردن.

**تحاور:** پێکەوە دووان و گفتوگۆ کردن، دەگەڵ یەکدی ئاخاوتن.

**تحبیب:** کردنە هەواڵ، خۆشەویست کردنی کەسێ لای کەسێکی دی.

**تحبیر:** چاك کردن و ڕازاندنەوەی شتێك، بە باشی و ڕێك و پێکی ئاخاوتن.

**تحبیس:** خستنە زیندان، بەندکردن. کردنە خێری داهاتی ملکێك.

**تحت:** ژێر، بن، خوار.

**تحت الارض:** ژێرزەوی، لە ژێر زەویدا.

**تحت الارضی:** هەڵکەوتوو لە ژێر زەویدا. نهێنی، پەنامەکی.

**تحت الحمایه:** لە ژێر پارێزگاری، ژێر باڵ، بن باڵ. وڵاتێك کە لە ژێر پارێزگاری و چاوەدێریی دەوڵەتێکی دیکەدا بێ سەربەخۆیی تەواوی نەبێ و تەنیا لە کاروباری ناوخۆییدا سەربەخۆ بێ.

**تحت السلاح:** لە ژێر چەك دا، لە ژێر ئاڵادا.

**تحت الشعاع:** ژێر تیشك، ژێرسێبەر، لەژێر کاریگەری. کەسێك یان شتێك کە لە بەرانبەر لە خۆی باشتر و گرنگتر بوەستێ و دیمەن و قەڵافەتی نەبێ.

**تحت اللفظی - ترجمه:** وەرگێڕانی لەبز بە لەبز و وشەبەوشە.





**تحت المراقبه:** (دەس/ دەست) بەسەر، لەژێر چاوەدێریدا.

**تحتانی:** ژێرەوە(یی)، خوارەوە(یی)، بنەوە(یی)، ژێرخان.

**تحت ستم:** بندەست، ژێردەست، ژێر چەپۆکە.

**تحت فشار:** لە ژێر گۆشاردا، تەوژم دراو، هل گوڤاشتی.

**تحت نظر:** خانەشاری، لە ژێر چاوەدێری دا، نەترنایش.

**تحتّم:** (تَ.حَ.تُ) پێویست بوون، گەرەك بوون، حەتمی بوون.

**تحجّر:** 1) بوونە بەرد، بە بەردبوون، ڕەق بوون. 2) کۆنەپەرستی.

**تحدّب:** پشت کووڕی، کووڕبوونەوە، قۆقزێتی، زەقایی، زۆپایی.

**تحدّث:** ئاخاوتن، دووان، لێدوان.

**تحدّی:** ئیرادەکردن، بەرەنگاری، بەگژاچوون.

**تحدید:** 1) سنووربەندی کردن، سنووردانان، سنووردارکردن، کەوشەن دیاریکردن، ڕادەدانان، چوارچێوەبۆدانان، دیاریکردن، دەست نیشان کردن. 2) تیژکردنەوەی کارت و چەقۆ و هتد.

**تحدیق:** چاوتێبڕین، بە زەقی ڕوانین، زەق تواشاکردن.

**تحذّق:** کارامە بوون، خۆ بە لێهاتوو زانین.

**تحذیر:** ئاگادار کردنەوە، هوشیارکردنەوە، ترساندن.

**تحرّج:** دووری کردن لە گوناه. تۆبەکردن.

**تحرّز:** پارێزکردن، خۆبواردن، دووریکردن.

**تحرّس:** خۆپارازتن، پارێزکردن.

**تحرّش:** شەڕ پێفرۆشتن، تەشقەڵەپێکردن.

**تحرّق:** سووتان، سووتیان.

**تحرّك:** بزاوتن، بزووتن، جووڵان، جووڵیان، جووڵە، هەڵسووڕ، هەڵسووڕان. (سیاسی) هەنگاوی سیاسی بۆ وەدەستهێنانی سەرکەوتنێ یان چالاکییەکی نیزامی دژی لایەن یان لایەنە دژبەرەکان. "**تحرك داشتن**": چالاکبوون.

**تحرّی:** تێڕامان، وردبوونەوە، پشکنین، گەڕان.وەدوای حەقیقەت کەوتن.

**تحریر:** 1) ئازادکردن، ڕزگارکردن. 2) نووسین. 3) نووسراوە. 4) کێشانەوە.

**تحریراً:** 1) لەڕێگەی نامە یان نووسراوە. بەنووسراوە(یی). 2) نووسرا.

**تحریرکردن:** نووسین. نیگارکێشانەوە.

**تحریری:** نووسراو.

**تحریریه:** دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامە یان گۆڤار و هتد.

**تحریز:** نگاداریکردن، پاراستن.

**تحریش:** هەڵخڕاندن، هاندان، ئاژاوەگێڕی، شەڕەنگێزی، تێك بەردان، لەیەك بەردان.

**تحریص:** چەشەخۆرەکردن، دانەخۆرەکردن، وەتەماح خستن، چکوس کردن، ناچارکردن.

**تحریض:** ورووژاندن، هەڵخڕاندن، هان دان، دنەدان، خستنە سەر هەوا و هەوەس.

**تحريف:** بەلاڕێدابردن، چەواشەکردن، بەچەپەکدابردن، گۆڕین، دەستکاریکردن، گۆڕینی ڕواڵەت. "**تحريف شده**": چەواشە کراو، بەلاڕێدابراو، گۆڕاو.

**تحريق:** سووتاندن، ئاوردان.

**تحريك:** هان، هانە، هانەهانە، دنە، زیخان، فیت، هەڵخڕان، هەلزرنگان، هەلزرنگیان، هێژان.

**تحريك انگيز:** وروژێنەر، هاندەر، هانەدەر، دنەدەر، بزوێنەر، فیتکار، هەڵخڕێن.

**تحريك پذير:** زووهەلچوو، شیاوی وروژان، کەم جیکەڵدانە، بێ حەوسەلە، فیشقی.

**تحريك شده:** وروژێنراو، هەڵخڕاو، هەلخڕیاگ، دنەدراو، هان دراو، پف دراو.

**تحريك كردن:** بزواندن، بزاوتن، جووڵاندن، وروژاندن، هان دان، هانەدان، هانەهانەدان، دنەدان، هاژۆتاندن، زیخاندن، سیخ دان، سیردان، سیرتێدان، ناقە تێدان، ناڤدان، فیت دان، ختێنە، ختەدان، ناودان، هەڵخراندن، هەلزرنگاندن، هەلزرنگانن، هەژاندن، هێژاندن، شوتیدەبن هەنگڵ نان، ناچارکردن. "**تحريك كننده**": بڕوانە: "تحريك انگيز".

**تحريم:** یاساخ کردن، حەرام کردن، ناڕەواکردن، بێبەش کردن، بێبەریکردن، بایکۆت کردن.

**تحزّب:** (تَ.حَ.زُ) گروپ گروپ بوون، دەستەدەستەبوون، گروپ بەندی سیاسی. پێکهێنانی حیزب.

**تحزّن:** خەمباربوون، خەمناك بوون، دڵتەنگ بوون.

**تحزين:** خەمبارکردن، خەمناك کردن.

**تحسّر:** ئاخ هەڵکێشان، لە خەمان داخ و ئاخ گوتن، هەژان و هەڵچوون لە حەیفان، هەسرخورادن.

**تحسين:** جوانکردن، ڕازاندنەوە، چاك کردن، بەچاك زانین، ئافەرەم گوتن، بارەقەڵاکردن، دەست خۆشانە پێگوتن، تاریف کردن، ستایش کردن.

**تحسين آميز:** شیاوی تاریف و ستایش، شیاوی ئافەرەم، ستایشگەرانە.

**تحسى نحسى:** ژانەسەر و ناڕەحەتی.

**تحشّف:** پۆشینی جلوبەرگی کۆن، کۆنەپۆشی.

**تحشيه:** لەپەراوێز نووسین، پەراوێزنووسی، پڕکردنەوە.

**تحصل:** وەدەست هاتن.

**تحصّن:** مان گرتن. خۆپەنادان، پەناگرتن. خۆ قایم کردن.

**تحصيل:** 1) خوێندن. 2) بڕوانە: "آموختن". 3) وەدەستهێنان، دەست خستن. 4) کۆکردنەوە، خڕکردنەوە. "**تحصيل حاصل**": هەوڵدان بۆ وەدەستهێنانەوەی ئەوەی پێشتر وەدەست هاتوە.





**تحصيلات:** (ڕادەی) خوێندەواری.

**تحصيل كرده:** خاوەنی پلەی خوێندەواری سەروتر لە دیپلۆم.

**تحصين:** قایم کردن، قەڵابەندی و پتەو کردن. پاراستن.

**تحضر:** ئامادەبوون، بەرهەڤ بوون. بەشارستانیبوون.

**تحضير:** ساز و ئامادەکردن، بەرهەڤ کرن.

**تحضيض:** هەڵخڕاندن، وروژاندن.

**تحف:** کۆی "تحفه".

**تحفّظ:** خۆبواردن، خۆپاراستن، خۆپارێزی، خۆڕاگرتن. نگاداری، پاراستن. لەبەرکردن.

**تحفل:** زۆربوون، پڕبوون.

**تحفه:** 1) دیاری، سەوقات، پێشکەشی. 2) ئەنتیکە، قوتحە، دەست نەکەوتوو، شتی بەنرخ و نایاب. تێشوو و دەرەنجام.

**تحفير:** هەڵکۆڵین، هەڵکەندن.

**تحفيل:** کۆکردنەوە، خڕکردنەوە، ڕازاندنەوە.

**تحقق:** دەستەبەر، وەدەستهێنان، هێنانەدی، وەدیهێنان، وەدیهاتن، هاتنەدی.

**تحقق گرايى:** ئەزموونگەرێتی، "پۆزیتیویسم".

**تحقير:** سووك کردن، بە سووکی تەماشاکردن، بە سووك و چرووك دانان، بووچك کردن.

**تحقير آميز:** تێکەڵ بە سووکایەتی، سووکانە.

**تحقيق:** لێکۆڵینەوە، کۆڵینەوە، توێژینەوە. لێپێچانەوە، لێپرسینەوە. پەیسەریکردن، سۆراخ کردن. ڕاستی، دروستی. "**به تحقيق**": بێگومان، بەڕاستی. بەوردی، بەشێوەی حەقیقی.

**تحقيقاً:** بەبێ شك و دڕدۆنگی. بەوردی.

**تحقيق ميدانى:** لێکۆڵینەوەیەك کە لە شوێنکاری سروشتی و واقیعی بابەتی لێکۆڵینەوەکە ئەنجام دەدرێ، لێکۆڵینەوەی مەیدانی.

**تحقيقى:** حەتمی، بێگومان. لێکۆڵینەوەیی.

**تحكّر:** بڕوانە: "احتكار".

**تحكّم:** 1) ڕاخوڕین، تێ خوڕین، حوکم کردن، حکوومەت کردن بە زۆر. 2) دەسەڵاتدارەتی، زاڵێتی. 3) ملکەچی، گوێڕایەڵی، بەرفەرمانی.

**تحكم آميز:** تێکەڵ بە زۆر، ستەمکارانە، بڕیاردەرانە، سەپێنەرانە.

**تحكم بردن:** چوونە بەر فەرمان، ملکەچ کردن، هەڵکردن و لێقەبووڵکردن.

**تحكيم:** پتەوکردن، قایم کردن. نێوبژیکردن، داوەریکردن.

**تحلّب:** دۆشین.

**تحلّق:** کۆز بەستن، خرمانەبەستن.

**تحلل:** 1) شیبوونەوە، شیتەڵ بوون. 2) جلوبەرگ پۆشین. 3) خۆنوێنی و خۆڕازاندنەوە.

**تحلّم:** 1) سەبروحەوسەلە کردن، دان بە جەرگی خۆداگرتن، پشوودرێژی، ئارام گرتن. 2) خەون دیتن.

**تحلّی:** خشلّ و زەنبەر بە خۆداکردن، خۆڕازاندنەوە، رازانەوە.

**تحلیف:** سوێنددان یان سوێندخواردن.

**تحلیل:** 1) شیکار، شیکردنەوە، لێکدانەوە، ئانالیزەکردن. 2) حەلاڵ کردن، بە رەوا زانین. 3) تواندنەوەی خۆراك لە گەدەدا، هەڵتاواندن. 4) بەرەبەرە لەناوچوون و نابوودبوون.

**تحلیل آماری:** شیکاری وردی پێدراوە ئامارییەکان بۆ ئاکامگیری لێیان.

**تحلیل بردن:** بەرەبەرەکەم کردن و هیچ لێنەهێشتنەوە. بەرەولاوازی بردن، بەرەو توانەوە بردن. هەڵتاواندن. تاقەت هێنان و پشوودرێژی لەبەرامبەر کارێکی ناخۆش دا. "**به تحلیل بردن**": بەرەبەرە کەمکردنەوە و هیچ لێنەهێشتنەوە.

**تحلیل دادن:** بەرەبەرە لەناوبردن. هەزم کردن.

**تحلیل رفتن:** داخوران، بەرەولاوازی چوون، وردەوردە کەم بوونەوەی کەنداڵ لە دەم ئاو یان کەم کردنی بنی دیوار. هەڵتاوینی خواردەمەنی لە گەدەدا.

**تحلیل گر:** شیکارگەر، شیکەرەوە، لێکدەرەوە، راقیار، راقەر، راقێن، "ئانالیست".

**تحلیل فرمی:** شیکاری فۆڕمی.

**تحلیل مخرب:** شیکاری وێرانکەرانە.

**تحلیل معنایی:** شیکاری مانایی.

**تحلیل منطقی:** شیکاری لۆژیکی.

**تحلیل نهایی:** دوالێکدانەوە.

**تحلیلی:** شیکارانە، شیکاری، شیکردنەوەیی، "ئانالیتیك"."**انتقاد تحلیلی**": رەخنەی شیکارانە. "**پست تحلیلی**": پاش شیکارانە.

**تحلیه:** رازاندنەوە، خەملاندن، جوان کردن، خشلّ وێخستن. ئاو شیرین کردن.

**تحمّد:** بەخۆداهەلگوتن، ستایش کردنی خود، پەسنی خۆدان.

**تحمّق:** خۆگێل و گەوج کردن، خۆ لە گێلی و گەمژەیی دان.

**تحمّل:** 1) خۆڕاگرتن، خۆگرتن لەبەر ئەرك، راوەستان، لەسەرخۆیی، دان بە جەرگی خۆدانان، دان بە خۆداگرتن، تاقەت گرتن، تاقەت هێنان، بەرگەگرتن، بەرگرتن، وەرگرتن، برکردن، دەربردن، دەربرن، کێشان، هەڵکردن و لێ قەبوولکردن، شان دانەبەر، دەگەڵ رابواردن، ساچان، سازان، دەرۆست هاتن، ئارام بوون، ئۆقرەگرتن، باربردن. 2) پشوودرێژی، بەپشوویی، خۆڕاگری.

**تحمل پذیر:** بەسەبروحەوسەلە، لەسەرخۆ، خۆڕاگر، بەگیر، پشوودرێژ، بەپشوو، نەفەس درێژ، بەرگەگر، دەربر.





**تحمل گداز:** تاقەت پڕوکێن، زیاتر لە توانایی.

**تحمل ناپذیر:** برست بڕ، پشووبڕ، جاڕزکەر، وەڕەزهێنەر. بەرگەنەگر، دەرنەبر، خۆڕانەگر، لە تاقەت بەدەر، لەتاقەت نەهاتو، تاقەت پڕوکێن.

**تحمل نکردن:** دەرنەبردن، بەرگەنەگرتن، هەڵنەکردن، تاقەت نەهێنان، پێنەوەستان، نەحەوانەوە.

**تحمید:** 1) پێداهەلگوتن، ستایش کردن. 2) پەسندکردن.

**تحمیر:** سوور کردن. بە کەر کردن.

**تحمیق:** بە دەبەنگ و گەمژە زانین، گەوج کردن.

**تحمیل آمیز:** داسەپاوانە.

**تحمیل شدن:** داسەپان، بەمل داهاتن.

**تحمیل کردن:** سەپاندن، داسەپاندن، بەملدا هێنان، بەئەستۆدابڕین، بەزۆر تووش کردن، بەسەردابڕین، بارکردن.

**تحمیل گر:** داسەپێن، بەسەردابڕێن.

**تحمیل گرانه:** داسەپێنانە.

**تحمیلی:** داسەپاو، بەسەردابڕاو. "**شکل تحمیلی**": فۆڕمی داسەپاو.

**تحنّی:** چەمینەوە، لاربوونەوە. دلۆڤانیکردن.

**تحوّل:** گۆڕانکاری، گۆڕان، وەرچەرخان، وەرسووڕان، وەرگەڕان.

**تحولات:** کۆی"تحول"، گۆڕانکارییەکان، گۆڕانەکان، وەرچەرخانەکان."**تحولات سرنوشت ساز**": گۆڕانکارییەمەزنەکان، گۆڕانکارییە چارەنووس سازەکان.

**تحول پذیر:** گۆڕان گر، هەر شتێ کە شیاوی گۆڕان بێ.

**تحول گرا:** گۆڕان خواز.

**تحول گرایی:** گۆڕانخوازی.

**تحول گریز:** گۆڕان بێز، ئەوەی کە بە گژ گۆڕان و گۆڕانکاری دا دەچێتەوە.

**تحول یافته:** وەرگەڕاو، گۆڕاو، وەرچەرخاو، وەرسووڕاو.

**تحویل:** 1) رادەست کردن، بەدەستەوەدان، تەسلیم کردن، دانەدەست، سپاردن، سپارتن. 2) گواستنەوە، گوێزانەوە، گوێستنەوە. 3) وێدانەوە، گەڕاندنەوە، گلدانەوە، وەرگەڕاندن. 4) سەرمایە، پارەی نەخت. 5) (بیرکاری) سادەکردنەوە. 6) ماڵیات. 7) ناحەز و جوان.

**تحویل افتادن:** راگوێزرانی شتێ لە جێیەکەوە بۆ جێیەکیتر.

**تحویلدار:** وەرگر.

**تحویل سال:** نوێبوونەوەی ساڵ، تەواوبوونی ساڵی پێشوو و دەست پێکردنی ساڵی نوێ.

**تحویل کردن:** راگواستن و رۆیشتن بۆ شوێنێکی تر.

**تحویل گرفتن:** وەرگرتن، بریتی لەبەهێندگرتن، بایەخ پێدان.

**تحیّات:** کۆی"تحیّة ".

**تحیّت:** سـڵاوكردن، دروود گـوتن، بەخێرهاتن كردن.

**تحیّر:** سەرسوورمان، سەرسام بوون، واق وڕمان، پەشۆكان، واق وڕی، ماتی، سەرلێشێواوی.

**تحیّز:** جێگرتن، جێگیربوون، گەمارۆدران، لایەنگیری، پشت گرتن.

**تخادع:** یەكتر فریودان، خۆ بە فریوخواردو زانین.

**تخاریب:** كاول كردن، خاپووركردن.

**تخاشع:** خۆشكێنی، خۆبەزل نەزانین. مل شۆڕ كردن، ملدان.

**تخاصم:** دوژمنایەتیكردن، دەگەڵ یەكدی جەنگ و شەڕ كردن.

**تخاطب:** پێكەوە ئاخاوتن. قسە لەگەڵ كردن، دواندن.

**تخایل:** خەیاڵ، وەهم و گومان.

**تخبیر:** هەواڵدان، ئاگاداركردنەوە.

**تختاخ:** بڕوانە: "الكن".

**تختگاه:** شـوێنی دانیشتنی پاشـا، پێتەخت. سەككۆ. تەختی پاشایەتی.

**تخت گیر:** بەهێز و توانا.

**تختور:** خـاوەنی تـەخت و دەسـەڵات، پاشا.

**تختەبردوختن:** تەرك كردن، وازهێنان.

**تختەبندشدن:** 1) گرفتـاربوون. 2) وشـك بوون. 3) داخرانی شوێنێك، پلۆم كران.

**تختەخواندن:** بڕوانە:"تعلم".

**تختەزدن:** كایەی تەختەنەرد كردن.

**تختەكوبیكردن:** بە تەختە داپۆشین.

**تختەهدف:** سیبل.

**تخجّم:** نگریس، نـان و دۆبڕ، بـەدودم، چاوچنۆك، ڕژد.

**تخجیل:** شەرمەزار كردن، تەریق كردنەوە، خەجاڵەت كردنەوە.

**تخدّر:** خۆشـاردنەوە، خۆحەشـاردان، خۆڤەشارتن. سست بوون، تەزین.

**تخدیر:** سڕكردن، تەزاندن، سست كـردن، بێهۆش كردن.

**تخدیش:** رووشاندن، رووكانن، رنین.

**تخرّج:** دەرچوون.

**تخرخر:** خۆ بە گەمژە نیشان دان.

**تخریب:** رماندن، رمانن، رووخاندن، وێران كـردن، كـاول كـردن، وێرانكـاری، خـاپووركردن، تێكـدان، تێكوپێـك دان، هەڵوەشاندن. لەكارخستن، لاوازكردن.

**تخریج:** دەركردن، وەدەرنان. دەرهێنـان، دەرهاوردن. پەروەردەكردن، بارهێنان.

**تخریق:** دڕاندن، پچڕاندن، لەت كردن.

**تخس:** (تَ.خْ) گەرمی، تین، لێدانی دڵ.

**تخس:** (تُ.خْ) منـاڵی شەڕاشـۆ و خـەڵك ئازار، تووش، بەدفەڕ، شەیتان، بێعار.

**تخسیر:** زیـان پێگەیانـدن، بەلاڕێدابردن، لەناوبردن.

**تخشا:** كۆشش كار، هەوڵدەر.

**تخشیدن:** هەوڵـدان، كۆشـش كـردن، كۆشان، تەقالادان.





**تخصّص:** پسپۆڕی، شـارەزایی، كارامـەیی. تایبەتیبوون.

**تخصّصی:** پسپۆڕانە.

**تخصیص:** تـەرخان كـردن، دانـان، دیـاریكردن. تایبـەتیكردن. "**بەتخصیص**": بەتایبەتی.

**تخضّع:** خۆ بە كەم زانین.

**تخضیب:** رەنگ كردن. خەنەتێگرتن.

**تخطئه:** تـاوان و هەڵـەكاری گرتنـی كەسێك، بە خـەتابار زانینـی كەسـێك، بـە خەتا و هەڵە زانینی بابەتێك. خەتی سوور بەسەردا هێنان.

**تخطّی:** هەڵـەكردن، تـاوان كـردن، لـە سـنوور تـێ پەڕانـدن، سەرپێـچیكردن، ژێرپێنان، خۆ لێلادان لە هەر شتێك.

**تخطیط:** هێڵ كێشان، هێڵكـاری، نەخـشە كێشان، پلان دانان.

**تخفّر:** پـەناخوازتن، چـوونە ژێـر داڵـدە. شەرمەزاربوون.

**تخفّی:** خۆشاردنەوە، خۆوەشارتن.

**تخفیف:** داشـكان، داشـكاندن، كەمكردنـەوە، سـووك كردنـەوە، كـورت كردنەوە.

**تخلّج:** لەرینەوە، جووڵانەوە.

**تخلخل:** لێـك جیابوونـەوەی پـاژ و ئەتۆمەكانی شتێك. كـون كـون بـوون یـان هـەبوونی فـەزای بـەتاڵ لـە نـاو شـتێكدا. زۆربوونی بارستایی شتێ بەبێ ئـەوەی لـە دەرەوە شتێكی پێ زیادبكرێ.

**تخلّص:** 1) نازنـاو. 2) رزگـاربوون، قوتاربوون، خەلاس بوون.

**تخلّف:** 1) سەرپێـچی، لادان، تـرازان، پێـچەوانەی وادە و بـەڵێن جووڵانـەوە، بەڵێن شكێنی. 2) دواكەوتن، پاش كەوتن، جێمـان. 3) پـشت تێكـردن، رووەرگـێڕان. 4) بـڕوانـە:"تـمایـز". 5) خەتا، هەڵە.

**تخلّق:** خووگرتن، خۆشخوڵق بوون.

**تخلّی:** خـەڵوەت نشینی، گۆشەنـشینی. رەهـابوون، خـەلاس بـوون. بـەتاڵ بـوون، خاڵیبوون.

**تخلید:** هەرمان كردن، نەمركردن.

**تخلیص:** دەربـازكردن، قوتـاركردن، رزگاركردن. پوختەكردن. كورتكردنەوە.

**تخلیط:** تێكەڵ كردن، ئاوێتەكردن. نێوان تێكـدان، دووبـەرەكینانـەوە. درۆ پێكەوەنان.

**تخلیع:** جیاكردنـەوە، لێك جیاكردنـەوە، داماڵین.

**تخلیف:** كردنە جێنشین.

**تخلیق:** 1) بۆنخـۆش كـردن. 2) ئافرانـدن، خولقاندن.

**تخلیل:** ئـاژنین، كۆڵینـەوەی ددان بـۆ خاوێن كردنەوە لە گۆشت و هتد. سركە دروست كردن.

**تخلیه:** بـەتاڵكردن، خـاڵیكـردن، چـۆڵ كردن، دەركردن، رۆكردن، بەجێهێشتن.

**تخليه اطلاعاتى:** وەدەستهێنانى تەواوى زانيارييەكانى كەسێك بە لێپرسينەوە يان فريودانى.

**تخم افشاندن(افكندن/ پاشيدن/ كشتن):** تۆم وەشاندن، زەرعات كردن.

**تخمدان:** سمتەجوولّە، هێلكەدان، هێكدان، هێك كرن، هێگ كرن، خادانيان، گەرادان.

**تخم زا:** بوونەوەرێ كە لە رێگەى هێلكەكردنەوە زاوزێ دەكا.

**تخم كار:** وەرزێر، جووتێر.

**تخم كشى:** لێچاك كردن، چات كردن، لێكێشان، نێر هاويشتنە سەر مێ.

**تخمكى:** هێلكەيى.

**تخمگذار:** هێلكەكەر.

**تخمگذارى:** هێلكەكردن، گەراخستن، گەراداخستن، گەرادانان، گەرانان.

**تخم گيرى:** 1) بڕوانە:"تخم كشى". 2) تۆو هەلّگرتنەوەى روەك بۆ چاندنەكانىتر.

**تخمه:** (تُ.خَ.مَ) ئينتەلا، زۆرخۆرى، ژان كردن بە هۆى خواردنى خراپەوە.

**تخمه:** (تُ.خْ.مَ) 1) رەچەلّەك، بنەچە، رەگەز.2) ناوكە، دندك، جنجێ، تۆم، دەنكى گولّەبەڕۆژە و شووتى و هتد.

**تخمه‌افتادن:** تووشى گرفت/ سقلّ بوون.

**تخمه‌شكستن:** توو تروكاندن.

**تخمى:** دەسكرد و بێبناغە، گۆترەيى. نەهزراو، هەلّنەسەنگێنراو. روەكێكى باش بۆ گرتنەوەى تۆو بۆ چاندنەكانى دوايى.

**تخمير:** كردنە هەوير، ترشاندن. فۆڕم وەرگرتن.

**تخميس:** كردنە پێنج بەش، كردنە پێنج گۆشە، پێنج خشتەكى كردن.

**تخمين:** بەراورد، خەملّ، مەزەنە، مەزەندە، نەهان، خەرس، قرسان، هەزير، بەرجەوەن، بەرجەوەند، (تخمين بدون اندازەگيرى)گۆترە، گۆترمە.

**تخميناً:** لە رووى مەزندە و گومانەوە، بە گۆترە. كەم و زۆر.

**تخمين تقريبى:** مەزندەى لێك نزيك.

**تخمين زدن:** خەملّكردن، خەملاّندن، نرخاندن، بەراورد كردن، قرساندن، خەملاّندن، خەرسانن، خەرس كردن، هەزير كرن، نەهاندن، مەزەندەكردن، گۆترەدانان، بە گومانەوە دووان.

**تخمينى:** خەملّ كراو، خەملاّو، بەراوردكراو لەڕووى گومانەوە. گۆترەيى، بەگۆترە، بەمەزندە.

**تخنيق:** خنكاندن، خەندقاندن. گيرانى قوڕگ.

**تخويف:** ترساندن، تۆقاندن، بزداندن، زراوبردن.

**تخيّر:** هەلّبژاردن، هەلّبژين.

**تخيّل:** (تَ خَ يُ) خەيالّكردنەوە، وێناكردنى شتێ لە زەين دا، وازانين و گومان كردن.





**تخيّلى:** خەيالّكرد، خەيالّئامێز، خەيالّى، زەينى، لەجيهانى خەون و خەيالّ دا، وێنايى، ناواقيعى. "**ابداع تخيلى**": داهێنانى خەيالّكرد، داهێنانى خەيالّئامێز.

**تخييل:** (تَ) 1) (ڕێزمان) توانج پۆشى، ئەوەيە كە وشەيەك دوو ماناى هەبێ يەكى دوور و يەكى نزيك. 2) بيروخەيالّ. 3) خەيالّ، گومان. 4) خستنە گومان و خەيالّى پووچەوە.

**تدابير:** كۆى"تدبير"، رێوشوێنەكان، تەگبيرەكان.

**تداخل:** دەست تێوەردان، دەست تێوەدان لە كاروبارى كەسێكى تر، خۆتێهەلّقورتاندن. چوونە ناو يەك، تێكپەڕين. هاوكات بوون. "**تداخل داروىى**": پووچەلّ يان زۆربوونى كاريگەرى هەندێ دەوا بە دەواى ديكە.

**تدارك:** ساز كردن و پێكهێنان، تەياركردن، ئامادەكردن. قەرەبووكردنەوە. گەيشتنى شتێك بە شتێكى دى.

**تداركات:** كۆى"تدارك"، بەشێك لە دامەزراوە يان ئيدارە يان رێكخراوێك كە كەلوپەلى پێويستى ئەو شوێنە دابين دەكا.

**تدارك انديشيدن:** پێشبينيكردن، پێشگيريكردن.

**تداعى:** دەگەلّ يەكترى شەڕ و كێشە كردن. بيرهێنانەوە، بيرئانين، زنجيرەى يادەوەرييەكان.

**تداعى گرايى:** بيرهێنانەوەخوازى، بيركێشخوازى.

**تداعى معانى:** لە مانايەكەوە بە مانايەكى ديكە گەيشتن، واتا كێشەكى.

**تدافع:** بەرگرى كردن لە خۆ يان پێشگيرى لە مەترسى، پالّەپەستۆدان.

**تدانى:** لێك نزيك بوونەوە، نزيكى.

**تداول:** دەستاودەست پێكردن، دانە دەستى يەكترى، برەو سەندن، وەبرەوكەوتن، بەكارهێنان.

**تداوم:** بەردەوام بوون، بەردەوامى، درێژەكێشان، پايەدارى.

**تداوى:** دەرمان كردن، چارەكردن.

**تدبّر:** بيركردنەوە، تياڕامان، لێوردبوونەوە، بير كردنەوە لە ئەنجامى كارێك، چارەدۆزى.

**تدبير:** تەگبير، تەگبيروڕا، تەڤبير، راوێژ، پرس‌و را، مشوور، رێگەچارە، چارەدۆزى، پلان، رێوشوێن.

**تدخل:** دەست تێوەردان، دەست تێخستن، خۆتێ هەلّقوتاندن.

**تدخين:** كێشانى سيگار و هتد، دووكەلّ كردن.

**تدرّب:** راهێنان، مەشق پێكردن. فێربوون.

**تدرّج:** كەمەكەمە و هێواش هێواش چوونە پێش، پلەپلە نزيك بوونەوە. "**تدرج عمودى**": پلەپلەبوونى ستوونى.

**تدريج:** بەرەبەرە، پلەبەپلە.

**تدريجاً:** بڕوانە: "بتدريج".

**تدريجى:** پلەبەپلەيى، هەنگاو بەهەنگاو، وردە وردە، هێدى هێدى، لەسەرەخۆ.

**تدريس:** وانە گوتنەوە/ وتنەوە، وانە (بێژى/ وێژى). فێركردنى يەكێك لە ڕشتە زانستييەكان.

**تدفّق:** هەڵقولان، هەڵقوڵين، دەرپەڕين.

**تدفيق:** هەڵقولاندن.

**تدفين:** بە خاك سپاردن، ناشتن، نێژتن.

**تدقيق:** وردبوونەوە، لێوردبوونەوە، سەرنجدان، سەرنج لێدان، وردبينى.

**تدلّى:** شۆڕبوونەوە. پێوەلكان. بە لەنجەولار ڕۆيشتن. نزيك بوونەوە.

**تدليس:** 1) شاردنەوە/ داشاردنى كەموكورتى كاڵايەك بۆوەى كڕيار يان خوازيار پێى نەزانێ. 2) ساختەكارى، فريودان، خەڵك خەڵەتاندن. 3) كچى بێ‌بن بە فێڵ و تەڵەكە بە مێرد دان.

**تدمير:** لەناوبردن، تيابردن، كوشتن. كاول كردن، وێران كردن، خاپووركردن، تێك و پێك دان.

**تدنّى:** كەمكەمە نزيك بوونەوە، هاتنەخوارەوە، نزم بوونەوە، ڕەزيل بوون.

**تدنيس:** پيس و چەپەڵ كردن.

**تدوير:** خولاندنەوە. خڕهەڵدان، گرد دروست كردن. گرۆڤەرى.

**تدوين:** نووسين (ەوە)، كۆكردنەوە، كۆنووس كردن، داڕشتن. (سينەما) لابردنى شتە زيادييەكان و لەتەنيشت يەك دانان و ڕێكخستنى ئەو ديمەنانەى فيلمى لێهەڵگيراوەتەوە، مونتاژ.

**تدهين:** 1) چەوركردن، ڕۆن لێدان. 2) مووميايكردن. 3) هەنوين.

**تديّن:** ئايين دارى، دينداربوون.

**تذاكر:** لە مەڕ بابەتێكەوە دەگەڵ يەكترى گفتوگۆ كردن.

**تذبذب:** دوو دڵ بوون، دڕدۆنگ بوون. دوو دڵى و دووڕوويى.

**تذكّر:** خستنەوە ياد، بيرهێنانەوە، وەبيرهێنانەوە، كەوتنەوە ياد. لە يادى خودا دابوون. ئاگاداركردنەوە. پەندوەرگرتن.

**تذكره:** بيرخستنەوە، يادهێنەوە، ياداشت. پاس، پاسپۆرت. ياداشت.

**تذكير:** خستنەوە ياد، وەبير خستنەوە. ئامۆژگارى دان. نێرينە.

**تذكيه:** پێ‌كردن و هەڵايساندنى ئاگر. بڕينى قوڕگى ئاژەڵێ كە گۆشتەكەى حەڵاڵە.

**تذليل:** سووك و چرووك كردن، زەليل كردن.

**تذميم:** زەم كردن، خراپە وتن.

**تذنيب:** كلكداركردن.

**تذهيب:** ئاوەزێڕكردن، زێڕكفت كردن، زێڕكوت كردن، زاخاوكردن.

**ترا ايرگان:** بان نەتەوە.

**ترابش:** بڕوانە: "تراوش".

**ترابيدن:** بڕوانە: "تراويدن".

**ترا پوتيك:** دەرماننانسى، هونەرى دەرمان كردن و چارەسەركردنى نەخۆشييەكان.





**تراجع:** گەڕانەوە، ڤەگەڕان، بادانەوە، كشانەوە. بزووتنى ئەستێرە لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا.

**تراجم:** (تَ.جُ) بەرد تێك گرتن، بەرد پێك دادان، جوێن پێك دان.

**تراجم:** (تَ.جِ) كۆى "ترجمان و ترجمه".

**تراخم:** ئالەكە، ئاويلكە، نەخۆشىيەكى چاوە.

**تراخى:** سستى، خاوى، شل بوونەوە. دێركردن.

**تراداد:** نەريت.

**ترادسيون:** نەريت، سوننەت.

**ترادسيون شفاهى:** نەريتى زارەكى، نەريتى سەرزارەكى.

**ترادف:** هاوواتايى، هاومانايى. كەوتنە يەك ريزەوە، كەوتنە پشت سەرى يەكتر.

**ترادیسی:** بڕوانە:"دگرديسى".

**تراريخت:** بڕوانە:"دگرديسى".

**تراز:** 1) باڵانس. 2) ئامرازێكە بۆ ديارى كردنى بەرزى و نزمى ئاستى شتێك. 3) بەرزى ئاستێكى دياريكراو. 4) هاوڕێك و ئاسۆيى، تەراز. "**ترازاوَل**": پلەيەك. "**ترازبازرگانى**": هاوسەنگى بازرگانى. "**ترازمالى**": جياوازى نێوان دان و وەرگرتنەكان.

**ترازمند:** هاوسەنگ، هاوتەراز.

**ترازنامه:** بيلان، پێڕستێك كە نووسينگەكان لە كۆتايى ساڵ دا ئامادەى دەكەن و دارايى و قەرزەكانى خۆيانى تێدا دەنووسن.

**ترازوى زر:** بريتى لە خۆر.

**تراژدى:** تراژێدى، شانۆ يان قەسيدەى خەم هێنەر، ڕووداوێكى ڕاست و غەمهێنەرى ژيانى مرۆڤ، كارەسات، بەڵا، بەدبەختى. "**تراژدى داستانى**": تراژێديى گێڕانەوەيى. "**تراژدى شخصيتى**": تراژێديى كەسێتى. "**تراژدى‌انتقام**": تراژێديى تۆڵە.

**تراژيك:** بەشێوەى تراژێدى. خەمهێنەر.

**تراس:** تارم، هەيوان، بەربێلايى، چوارتاق.

**تراسهيدن:** دزەكردن، ڕەخنەكردن.

**تراشنده:** داتاش، تاشەر.

**تراشه:** توێڵاش، تەڕاش، تەلاش، تلاش، تۆلاشە، تلێش.

**تراشيدن:** تراشين، تاشين، داتاشين، تراشە، تاشاى، تەراشتن، تەراشين، هەڵتاش، هەڵتاشان، هەڵتاشين، قوسان، ڕەويتن. "**تراشيدن قلم**": (قەڵەم)دادان.

**تراشيده:** تاشراو، تاشياگ، تاشراى، تراشراو، تاشيو، لێ‌هەڵكەندراو، ڕەويتى.

**تراضى:** لە يەكتر رازى و قايل بوون.

**ترافق:** بوونە دۆست و هەواڵ، هاوڕێيەتى يەكتركردن.

**تراك:** كەلێن، درز.

**تراكت:** تراكت، ڕاگەيەنراو.

**تراكم:** جمە، ئاپۆڕە، كەڵەكەبوون، قەرەباڵغ بوون/ قەرەباڵغى، قەرەپەستان، پڕايى، شخڵ، شڵخە. "**تراكم آب**": هەوق، پەنگاوى ئاو.

**تراکیا:** بۆڕی هەناسە.
**ترانزیت:** 1) چوونی کالاّ و شمەك لە ولاّتێکەوە بۆ ولاّتی دیکە بێ دانی هەقی گومرك و مالّیات. 2) تێپەڕین لە ولاّتێك بێ مانەوە لەو ولاّتە.
**ترانزیتی:** تایبەت بە راگوازتنی شتومەك لە ولاّتێکەوە بۆ ولاّتێکی تر.
**ترانسفورمیست:** بڕوامەند بە بنەماکانی ترانسفۆرمیسم، لایەنگری بنەماکانی گۆڕان و پەرەسەندنی چەشنەکان.
**ترانسفورمیسم:** بنەماکانی گۆڕان، تیۆری گۆڕانی چەشنەکان.
**ترانسندنتالیزم:** بەرزتر خوازی.
**ترانەخوان:** گۆرانی بێژ، گۆرانی چڕ، گۆرانیزان، قام بێژ، دنگ بێژ، دەنگ بێژ، لاوك بێژ، لاژەبێژ، شایەر.
**ترانەخوانی:** گۆرانی چڕین، گۆرانی خۆنن، گۆرانی خوێندن، گۆرانی(گوتن/ وتن/ کوتن)، قامبێژی، مقام بێژی، گۆرانی وتن، لاوژەبێژی، لاوك بێژی، لیریك بێژی.
**تراوا:** دەلّێن(ەر)، ئاودادەر.
**تراواندن:** دەلاّندن یان تێپەڕاندنی تراو.
**تراوایی:** دزەکردنی تراو یان گاز لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر. بلاّوبوونەوەی وزە بەهۆی مەیدان ئێلێکتریکی و مێغناتیسییەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر.
**تراوش:** 1) دەلاّن، دەلیان، دەلّیان، دیلان، دەردان، تەڕایی، منتك، نمتك، نمدان، زنە، نز. 2) بەرهەم و ئاکام. **"تراوش کم"**: زنچك، تەڕایی کەم.
**تراوش کردن:** 1) دەلاّن، دەلاّندن، تەڕاییدان. 2) وەدیهێنان، خولّقاندن. 3) پەرتەوازەبوون، بلاّوبوون. 4) گوتران، وتران. **"تراوش کننده"**: نمدەر، دەلّێن، ئاودادەر، شتێ کە تەڕایی دەداتە دەر.
**تراونده:** بڕوانە: "تراوش کننده".
**تراویح:** کۆی "ترویحه".
**تراویدن:** دەلاّندن، دیلاندن، تکەکردن، دەردان، تەڕایی دادان، لێچوون، لێچۆڕین، نمدان.
**ترب:** (تَ.رْ.بْ) فێلّ، تەلّەکە، تەزویر، زمان لووسی.
**ترب:** (تِ.رْ.بْ) هاوتەمەن، هاوزا.
**تربت:** خاك، خۆلّ، گۆڕ.
**تربسه:** (تَ.بَ.سَ) بڕوانە: "قوس قزح".
**تربّص:** بڕوانە: "انتظار".
**تربیت شدن:** پەروەردەبوون، رەنێوهاتن، بارهاتن، گۆشکران، پێگەیشتن.
**تربیت کردن:** پەروەردەکردن، رەنێوهێنان، پێگەیاندن، سەرپەرشتی کردن، راهێنان، بارهێنان، حاواندنەوە، بەخودی کردن، بەخێوکردن.
**تربیع:** کردنە چوار بەش، کردنە چوار گۆشە، دووجا، چارەك.
**ترتّب:** راست و رێکوپێك بوون، کەوتنە پشت سەری یەك.





**ترتیب( دادن ):** رێکخستن‌و جێبەجێکردن، پوختکردن، رێك و پێك کردن، ریزکردن، ریزبەندی، نەزم دان، جۆرکردن، سەروبەرکردن، خستنە پشت سەریەك، پێکهێنان، سازدان، سازکردن، دامەزراندن. **"ترتیب کاری را دادن"**: دابین کردنی پێشەکی و پێداویستییەکانی کارێ، جێبەجێکردن. **"ترتیب کسی را دادن"**: تەمبێکردن یان ئەدەب کردن یان کوشتنی ئەو. **"ترتیب نهادن"**: وەدیهێنان، هینانەدێ. **"ترتیب یافتن"**: بەڕێوەچوون، جێبەجێبوون، سازدران. **"بەترتیب"**: پشت سەری‌یەك. کەم کەم، بەرەبەرە.
**ترتیبات:** ریوشوێن(ەکان).
**ترتیب زمانی:** زەمەنمەندی، کورۆنۆلۆژی.
**ترجمان:** 1) وەرگێڕ، دیلمانج، چێورکار، پاچڤەکار. 2) گێڕەرەوە، راڤیار. 3) ئۆرگان. 4) جەریمە.
**ترجمان دادن:** جەریمەدان، خەسارەت دان.
**ترجمان کشیدن:** بڕوانە:"تاوان دادن".
**ترجمانی( کردن ):** وەرگێڕان. دەربڕین.
**ترجمه:** وەرگێڕان، وەرگێڕانەوە، دیلمانجی، بژارە، پاچڤە، پاچەڤە، پاجڤە، چێور. بیۆگرافی، بەسەرهات.
**ترجمەاحوال:** سەربردە، بەسەرهات، ژیاننامە.
**ترجمەناپذیر:** لەوەرگێڕان نەهاتوو، بابەتێ کە نەکرێ وەرگێڕدرێتەوە سەر زمانێکیتر.
**ترجّی:** هیواداربوون، بە هیوابوون.
**ترجیح:** بەباشتر زانین، پێباشتربوون، پەسندکردن، خستنە پێش، لەسەروتر دانان، بەسەر دا پترکردن.
**ترجیع:** گەڕاندنەوە، گێڕانەوە، دانەدواوە، رەتکردنەوە. وتنی "اناللەوانااليەراجعون".
**ترجیع بند:** سەربەند، بنمایەی چەندپاتکراو.
**ترح:** (تَ.رَ) خەم، کەسەر، پەژارە.
**ترحال:** کۆچ کردن، سەفەرکردن.
**ترحّم:** بەزەیی‌پێداهاتن، زگ پێ سووتان، دلّ پێ سووتان، دلّسووتان، روحم پێکردن، خاوەن بەزەیی، دلۆڤانی.
**ترحیب:** بەخێرهاتن کردن.
**ترحیل:** کۆچ پێکردن، ناردن.
**ترحیم:** دلۆڤانی کردن، بەزەیی پێداهاتن، زگ پێسووتان، داوای لێخۆش بوون کردن. **"مجلس ترحیم"**: مەجلیسی سەرەخۆشی.
**ترخّص:** ئیزن پێدران، ئیزن وەرگرتن. رەوابوون.
**ترخی:** سستی کردن، خاوەخاوکردن.
**ترخیص:** ئیزن دان، رێ‌پێدان.
**ترخیص شدن:** ئیزن دران، ئیزنی چوونەدەر پەیداکردن. تەواوکردنی خزمەتی سەربازی.
**ترخیص کالا:** دەرچوون یان دەرچواندنی کالاّ لە گومرك دوای دانی هەقی گومرك.
**ترخیم:** کلك بڕین.

**ترد:** (تُ) تورت، ترت، شتێ کە زوو دەپەڕێ و زوو دەشکێ، تەڕوتازە، ناسك، نازك.

**تردامن:** بەجوج، دامێن تەر، داوێن تەڕ، داوێن پیس، زیناحکار، فلیتە. بریتی لە مرۆی بەدنێو و بەدکردار و تاوانبار.

**تردّد:** 1) هات و چۆ، ئاموشۆ، هاموشۆ. 2) دوودڵی، دڵەڕاوکێ، دڵێدڵێ، دڕدۆنگی، دووگومانی، ڕاڕایی. 3) لەرە، لەرەلەر.

**تردست:** بریتی لە چوست و چالاك، بەدەست و برد، فرز، گورج، زیرەك، لێزان، چازان، چاوبەست، تاشك، کەڵەکباز.

**تردستی:** فرزی، گورج و گۆڵی، کارامەیی، لێزانی، لێهاتوویی، چاوبەستی، کەڵەکبازی.

**تردماغ:** بریتی لە شاد و سەرحاڵ، کۆك، کەیفساز، کەیفخۆش.

**تردید:** 1) دڕدۆنگی، دڵلەدڵ دان، دڵەراوکێ، دوودڵی، نیگەرانی، گومانکردن، سێ ودووکردن، پاوەپاکردن. 2) ڕەتکردنەوە، گەڕاندنەوە.

**تردیدناپذیر:** گومان هەڵنەگر.

**ترزبان:** زمان تەڕ، تەڕزمان، تەڕزوان، تەڕدەم، قسەزان، دەمەوەر.

**ترزده:** قەواڵە، قەباڵە.

**ترزفان:** 1) بڕوانە: "ترزبان". 2) وەرگێڕ.

**ترس:** ترس، سام، ساب، ساو، تاو، فەرە، باك، خۆف. "**دچار ترس شدن**": ترس داگرتن، ترس ڕێنیشتن، ترس لێنیشتن، ترس لێپەیدابوون، ترسان، ترس لێپەیدابوون.

**ترس آور:** ترس هێن، ترسناك.

**ترسا:** 1) ترسەنۆك، بێوره، نەوێر. 2) گاور، فەلە، فلە، دیان، خاچ پەرست. "**ترسای متعصب**": ڕەشە گاور، گاوری دەمارگرژ.

**ترسان:** ترسنۆك، بێجەرگ.

**ترسان ترسان:** ترسەترس.

**ترساندن/ ترسانیدن:** ترساندن، ترسانن، تووشی ترس و خۆف کردن، تۆقاندن، بزداندن، ترس وەبەرنان، ترس نانە بەر، هەژڤاندن، چاوشکاندن، زات بردن، زراوبردن، فەرهاندن.

**ترسانك:** بڕوانە:"مترسك".

**ترساننده:** ترسێن، ترسێنەر، زات بەر، زەندەق بەر، بزدنۆك، نەتەڵە، مرۆترسێن، چەش چەڕە، بم.

**ترس خورده:** ترساو، تووشی ترس بوو.

**ترس دیده:** ترساو.

**ترسکار:** ترسونەك. لە خواترس، پارێزکار.

**ترسم:** بەڕێوەبردنی ڕێوڕەسم.

**ترسّل:** نامە نووسین، نامیلکە نووسین.

**ترسناك:** سامدار، سامناك، بەسام، ترس هێنەر، ترسێنەر، بەترس، بەمەترسی، پیاوتۆقێن، تۆقێنەر، بەخۆف، گرتۆلە، هۆڤ، ترسناك. لەخواترس، پارێزکار.





**ترسنده:** کەسێ کە لە شتێك بترسێ. ترسەنۆك، نەوێر.

**ترسنده‌جان:** ترسەنۆك، بێجەرگ، ئەوەی کە لە گیانی خۆی بترسێ.

**ترسو:** بێجەرگ، ترسەنۆك، خوێڕی، نەوێر، ڕەڤرەڤۆك، قزە، بزدونەك، مخەننەت، چاڤ سست، خنز، دلچیچك، دلزراڤ. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "بزدل".

**ترسه:** بڕوانە: "قوس قزح".

**ترسیدن:** ترسان، ترسیان، ترسین، سام کردن، چاوشکان، نەترەچوون، نەوێران، بزدان، بزدهان، بزدیان، هەژڤین. "**بسیار ترسیدن**": زراوچوون، ئەترەش چوون، تۆقان، تەرس و گوو تێکەڵ کردن، زۆر ترسان.

**ترسیده:** ترساو، ترسیاو، تووشی ترس هاتگ، بزدیای، وازرە، وازر، بازرە، تەرە.

**ترسیم:** وێنەکێشان، نیگار کێشان، شێوەکێشان، خەت کێشان، نیشانەدانان، نەخشەکێشان.

**ترشح:** دەڵان، دیلان، تەڕایی، شێداری، نمدانەوە، دزاو، ئاوەدز، تز.پەروەردەبوون.

**ترشحات:** دەردراوەکان.

**ترشح کردن:** 1) دەڵاندن، دەڵانن، دەڵیان، لێچۆڕین، لێچوون، لێ ڤەدان. 2) سەرچاوەگرتن.

**ترشرو:** ڕووترش، ڕووترشیاگ، ڕووگرژ، ڕووناخۆش، ناوچاوترش، ناوچاوان ترش، ناوچاوترشاو، ناوچاودێز، ڕووتاڵ، نمرچ، مڕومۆچ، ڕوومۆن، گەمۆر، کۆڤك، خیس. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "اخمو".

**ترشّش:** پڕژانی ئاو، چکان، تکانی دلۆپە.

**ترش و شیرین:** ترش و شیرین، ترش و شیرن، مێخۆش.

**ترشی پالا:** بڕوانە: "پالاون".

**ترشیجات:** ترشی، ترشیات، تورشیات.

**ترشیح:** 1) پاڵاوتن، دەڵاندن. 2) کەم کەمە مەمکدانی دایك بە منداڵەکەی بۆ ڕاهاتن بە مەمك مژین. 3) پەروەردە و ئامادەکردن. 4) خوازیاربوون.

**ترشیدن:** 1) تورشیان، ترشان، ترش هەڵگەڕان. 2) تووڕە و قەڵس بوون. 3) قەیرەبوون. "**ترشیدن خمیر**": هەڵ کفان، ترشانی هەویر.

**ترشیده:** 1) ترشاو، ترش هەڵگەڕاو، تورشیاگ. 2) بریتی لە قەیرەکچ.

**ترصّد:** چاوەڕێی، چاوەڕوانی، چاوەدێری، ڕوانەری، دیدەوانی، نگابانی. بۆسەنانەوە.

**ترصیع:** گەوهەر نیشان کردن، گەوهەربەندکردن، گەوهەرکفت کردن.

**ترضّیه:** ڕازی کردن، خۆشحاڵ کردن. دڵدانەوە، دڵنەوایی. "**ترضیه خواستن**": داوای لێبوردن کردن.

**ترطّب:** شێداربوون، نمداربوون.

**ترطیب:** تەڕکردن، نمدارکردن.

**ترعیب:** ترساندن، بزداندن، تۆقاندن، هەڕەشەوگوڕەشەلێکردن.

**ترغیب:** هاندان، وەئارەزووخستن، خوازیارکردن.

**ترغیبی:** هاندەری. هاندەرانە.

**ترف:** (تَ.رَ) لە ناز و نێعمەت دا ژیان، دەوڵەمەندبوون. خۆش گوزەرانی.

**ترفان:** بڕوانە: "ترزبان".

**ترفت:** (تُ.فَ) ئاسوودەیی، ژیانی پڕ لە ناز و نێعمەت.

**ترفّض:** شکان، پرژ و بڵاو بوون.

**ترفّع:** بەرزخوازی، خۆ لە خەڵکی دی بە سەرووتر گرتن، گەورەبوون. سەربەرزی، فیز و لووت بەرزی. "**ترفع کردن**": سەرپێچیکردن.

**ترفّق:** نەرمی و دلۆڤانی نواندن.

**ترفنج:** دژوار، ڕێگەی باریك و چەتوون.

**ترفند:** کەڵەك، فێڵ، تەزویر، درۆ. قسەی بێهوودە، پووچ.

**ترفّە:** ئاسوودەیی، پۆشتەوپەرداخ بوون، تەڕپۆش و حاڵ خۆش بوون.

**ترفیع:** بردنەسەر، بەرزکردنەوە، سەرخستن، پلەپێدان.

**ترقّب:** چاوەدێری، چاوەڕوانی.

**ترقّص:** هەڵپەڕین، سەماکردن.

**ترقە:** چاشنی، چەشنی، تورەقە، فیشەکەشێتە، فشفشە، کەپسوون.

**ترقّی:** هەڵدان، پێشکەوتن، پێشڤەچوون، سەرکەوتن، پایەبەرز بوون، پەرەسەندن، لەزێدەبوون، وەبرەوکەوتن، بەرەو زیادی چوون.

**ترقیح:** چاك کردنی بژیو.

**ترقیخواه:** پێشکەوتن خواز.

**ترقیدن:** بڕوانە: "ترکیدن".

**ترقیع:** پینەکردن.

**ترقیم:** ژمارەدانان، نووسین، خەت نووسین.

**ترقین:** پووچکردنەوە، لابردن.

**ترك:** (تَ.رَ) 1) ترەك، دەرز، درز، شڕەق، تلێش، شەق، قەڵاش، قەڵشی باریك. 2) چووکەڵەی"تر"، تەڕوتازە، شێدار.

**ترکان/ ترکن:** خاتوو، ژنی ڕێزدار.

**ترك انداختن:** بڕوانە: "ترکاندن".

**ترکاندن/ ترکانیدن:** ترەکاندن، درزپێبردن، دەرزپێدان، قەڵشاندن، قڵێشاندن، قڵێشاندنەوە، قڵێشانن، قڵێشاننەوە، تلێشاندن، داتلێشاندن، هەڵتۆقاندن، هەڵ تۆقانن.

**ترك برداشتن:** ترەکان، ترەکیان، ترەکین، ترەك تێکەوتن، ترەك هەڵگرتن، درزبردن، دەرزبردن، درز تێکەوتن، قەڵشین بێلێك بوونەوە، قەڵش بردن، قەڵشان، قڵێشان، قڵێشانەوە، داقلێشان، شڕەقیان، شەق بردن، تلێش بردن، تلێشان، تلێشیان، داتلێشان، هەڵ تلێشان، وەبیایش.

**ترکتاز/ ترکتازی:** تەراتێنی، پاشاگەردانی، شاگەردانی. شالاوی توند و کتوپڕ و دەگەڵ ڕاوڕووت.

**ترك جان کردن:** لەخۆبردوویی و گیانبازیکردن.





**ترك خوردن:** بڕوانە: "ترك برداشتن".

**ترك سر کردن:** بڕوانە: "ترك جان کردن".

**ترکش:** (تَ.كَ) تیردان، هەگبەی تیران، جێگەی تیرەکەوان.

**ترکش:** (تَ.كِ) پڕیشك.

**ترك کردن:** تەرك کردن، بەجێهێشتن، بەجێ هێڵان، ڤەهێلان، وازهێنان، وازئینان، وازلێهێنان، ڕووڵێ وەرگێڕان، دەست هەڵگرتن، دەست لێ هەڵگرتن، دەست لێ بەردان، تەرخ، ڕۆیشتن، چوون، ڕۆین.

**ترك گفتن:** بڕوانە: "ترك کردن".

**ترکند:** بڕوانە: "ترفند".

**ترکە:** 1) بەجێهێڵراو، وازلێهێنراو، بەجێماو، میرات، پاشماوە. 2) شووڵ، شووڵك، تووڵ.

**ترکەای:** کز، باریك.

**ترکیب:** 1) تێکەڵکاری، لێکدان، ئاوێتەکردن، تێکەڵ کردن، هەڤدودانین. 2) سوارکردن.3) پێکهاتە. 4) پێکهێنان، پێکهاتن.5) پێکەوەنان. 6) لە کیمیادا: گرتنەوە. 7) لە ڕێزمان دا: ڕۆڵی وشە لە ڕستەدا. "**ترکیب شدە**": تێکەڵکراو، لێکدراو، ئاوێتەکراو.

**ترکیدن:** 1) لەبەریەکچوون، تەقین، ڤلت. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "ترك برداشتن". 2) زان، ترەکین. 3) لە ڕادەبەدەر خواردن، دڕان.

**ترم:** 1) کۆرس، تێرم. 2) ئاخر، کۆتایی، سەرەنجام، دەرفەت، ماوە. 3) یەکەی ئەندازەگرتنی تین. 4) بڕوانە: "اصطلاح".

**ترمز بریدن:** لەکارکەوتنی کتوپڕی تورمزی ماشێن، تورمز بڕین.

**ترموتراپی:** تین دەرمانی، چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان بە تین و گەرما.

**ترمومتر:** (فیزیك) گەرماپێو، تین پێو.

**ترمیم:** چاککردنەوە، نووژەنکردنەوە، دەست پێداهێنان، دەمەزەردکردنەوە، سەرنیاکردنەوە، جوانکاری. "**ترمیم صورت**": جوانکاریی روخسار.

**ترمینال:** کۆتایی، دوایی. تێرمیناڵ.

**ترمینولوژی:** زاراوەناسی. فەرهەنگی زاراوەکانی زانست یان هونەرێك.

**ترنجانیدن:** هەڵقرچاندن، گنج و چرچ تێخستن، گنجدارکردن، چرچ و لۆچ کردن، ترنجاندن، ترنجانن، قورمساندن، داقرچاندن، گرنج کردن.

**ترنجیدگی:** ژاکاوی، چرچ و لۆچی، چرچ و لۆچ بوون، چرچی، گنجی، هەڵقرچاوی، هەڵ کرچان، هەڵ کرچین، هەڵ کرچیان.

**ترنجیدن:** گنج و چرچ تێکەوتن، چرچ و لۆچ بوون، چرچ هەڵاتن، چرچیان، چرمقین، چوونە یەك، سیس بوون، ژاکان، هەڵقرچان، داقرچان، داقرچین، ترنجیان، قورمسان، قوڕمسین، قرمچین، مرچقین، قرچ بوون، هەڵ کرچاندن. تووشی خەم و کەسەربوون، ناڕەحەت بوون.

**ترنَج:** بڕوانە: "تلوتلوخوردن".
**ترنگ:** زرینگانەوە، زرنگانەوە، درنگانەوە، دەنگ دانەوەی شتی کانزا.
**ترنَم:** سۆزە، گیزە، لۆرە، لۆرینەوە، لۆرانەوە، لۆرەلۆر، نارەنار، مۆرەمۆر.
**ترنَم کردن:** سۆزەکردن، گۆرانی بەسەبرۆکە گوتن، گۆرانی گوتنی بەسەبر، بەنەرمەگۆرانیگوتن، نێورین، لۆراندن، لۆراندنەوە.
**تروپ:** دەستە، گروپ.
**تروپولوجیکال:** راڤەناسانە، راڤەکارانە.
**تروچسپ:** بەبێ ماتڵی، خێرا، گورجوگۆڵ.
**ترور:** تیرۆر، رەشەکوژی، کوشتن و لە ناو بردنی نەیار و دژبەرەکان و پێکهێنانی ترس و خۆف لە ناو خەڵك دا.
**ترور شخصیّت:** سووکایەتی پێکردن، بردنە ژێر پرسیاری کەسێتی کەسێك، شکاندنەوەی کەسایەتی.
**تروریست:** تیرۆریست، رەشەکوژ، ئەنجامدەری تیرۆر، لایەنگری تیرۆر.
**تروریسم:** تیرۆریزم، شێوەی ئەو کەسانەی کە بە پەنابردنە بەر مرۆڤ کوژی و ترساندن و تۆقاندن دەیانەوێ بگەنە ئامانجە سیاسییەکانیان.
**تروفرز:** بڕوانە: "تروچسپ".
**تروفوتراپی:** (پزیشکی) خۆراك دەرمانی، دەرمانی نەخۆشییەکان لە رێگای بژیو لێگرتنەوە.
**تروفولوژی:** (پزیشکی) خۆراك ناسی، زانستی خۆراکی لەش.
**تروما:** هەر جۆرە زەبر و خەسارێکی جەستەیی یان رۆحی.
**تروند:** 1) تۆبەرە، تۆبەر، میوەی تازە پێگەیشتو. 2) بڕوانە: "ترفند".
**تروَی:** تێفکرین، تێڕامان. بیرکردنەوە لە کارێك.
**ترویج:** برەوپێدان، برەودان، وەڕمێن خستن، باوکردن، رەواکردن.
**ترویح:** ئاسوودەکردن. بۆن خۆشکردن.
**ترویحه:** کۆبوونەوە، خڕبوونەوە، کۆزبەستن.
**ترویه:** تێراوکردن. تێڕامان.
**ترهـّات:** تڕەهات، قسەگەلی بێهوودە و بێبناخە، قسەگەلی زۆربێتام، قسەگەلی پڕوپووچ، گیوەگیو، گێژەگێژ، درۆودەلەسە.
**ترهات گو:** کۆلەویژ، تڕەهات بێژ، چەنەوەری قسەبێتام.
**ترهیب:** ترساندن.
**تریاکی:** تریاك کێش، تلیاك کێش، تلیاك خۆر، تریاك خۆر، تریاکی، تلیاکی.
**تریبون:** تریبوون. شوێنێ بۆ دەربڕینی بیروبۆچوون.
**تریت/ ترید:** تێگوشین، تریتکردن، تلێت کردن، ولێن، تێولێن، چەلاو.
**تریدن:** بڕوانە: "غلتیدن".





**تریش تریش شدن:** لەت لەت بوون، کوت کوت بوون.
**تریلوژی:** سێیانە.
**تز:** تێز، نامیلکەی دوکتورا، کۆتایینامە. تیۆری. بڕوا، باوەڕ، بۆچوون.
**تزاجر:** بڕوانە: "نهی".
**تزاحم:** قەرەباڵغی کردن، خڕبوونەوەی خەڵك لە شوێنێك دا و گوشارهێنان بۆ یەکتری.
**تزاوج:** جووت بوون، پێکهێنانی ژیانی هاوبەش، هاوسەرێتی، ژن و مێردایەتی.
**تزاید:** زیادبوون، پتربوون، زۆربوون. پێشکەوتن.
**تزجیه:** رابواردن.
**تزریق:** دەرزی لێدان، دەرزی وەشاندن.
**تزعزع:** جووڵان، لەقین، تەکان دانە خۆ.
**تزکّی:** 1) پاك بوونەوە. 2) خێرکردن. 3) پتربوون.
**تزکیه:** پاککردنەوە، خاوێن کردنەوە، بێگرێوگۆڵ کردن. زەکات دان.
**تزلزل:** 1) لەرینەوە، لەرزین، جووڵانەوە، تەکان خواردن. 2) بێهێزبوون، سست بوون، سستی. 3) ڕاڕایی، دوودڵی. 4) بێئۆقرەیی، پەریشانی. 5) گۆڕینی بەردەوامی بڕیار و بۆچوون و هەڵسوکەوتەکانی کەسێك.
**تزلزل ناپذیر:** پتەو و خۆڕاگر، قایم و راوەستاو، نەلەریو، لە لەرینەوە نەهاتوو.
**تزوّج:** جووت بوون، ژن هێنان، ژن هاوردن، شووکردن، زەوجین. ژن و مێردایەتی.
**تزویج:** بەشوودان، ژن هێنان.
**تزویر:** فڕوفێڵکردن، فریودان، درۆ رازاندنەوە، ساختەکاری، ساختەکردن، دەسهەڵبەست، قەڵب، دووڕوویی.
**تزیدن:** دەرهێنان، دەرهاوردن، دەرکێشان.
**تزیّن:** رازانەوە، خۆڕازاندنەوە، خۆجوان کردن، خۆتاسدان، خەملان.
**تزیید:** زیادکردن، پترکردن.
**تزییف:** بە ناڕەوا زانین، قەڵب.
**تزئین:** رازاندنەوە، رازاندن، خەملاندن، جوانکردن.
**تزئینات:** رازێنەرەوەکان، کەلوپەلی رازێنەرەوەیی کە بۆ رازاندنەوەی شوێنێ بەکار دێ.
**تزئین کلامی:** رازاندنەوەی ئاخاوتەیی.
**تزئینی:** رازێنەرەوەیی، "دێکۆراتیو".
**تژردن:** چڕۆ دەرکردن.
**تسائل:** لێك پرسین.
**تسابق:** پێش یەکتری کەوتن، کەوتنە بەر یەکترەوە، پێشبڕکێ.
**تساقط:** کەوتن، هەڵوەرین، هەڵوەران، داباڕین.
**تسالم:** ئاشت بوونەوە، پێکەوەسازان، پێکهاتن.

**تسامح:** لێبووردەیی، لێك بووردن، چاوپۆشیکردن، چاوڵێ پۆشین. کەمتەرخەمی و سستی لێکردن.

**تسامع:** لێك بیستن.

**تساوی:** یەکسانی، بەرابەری، وەك هەڤی، بە قەو یەك بوون.

**تساوی طلب:** یەکسانی خواز.

**تساهل:** پێکەوە هەڵکردن، وێك هەڵکردن، بە نەرمی دەگەڵ یەك هەڵسوکەوت کردن، ئاسانی، سانایی. کەمتەرخەمی.

**تسبیب:** هۆ سازکردن، هۆ و بۆنە پەیداکردن.

**تسبیح:** بە پاکی یادی خوا کردن، ستایش کردن. تەزبێح.

**تسبیع:** حەوت تایی کردن، کردنە حەوت بەش.

**تسبیل:** بە خۆرایی دان لە ڕێگای خودا دا.

**تستر:** خۆحەشاردان، خۆشاردنەوە، داپۆشران.

**تستیر:** شاردنەوە، داپۆشاندن.

**تسجیع:** ئاخاوتەی هاوکێش و هاوئاهەنگ گوتن. سەروادار.

**تسجیل:** تۆمارکردن، پشت ڕاست کردنەوە، بەحەتمیکردن، قایم و پتەو کردن. قەواڵە مۆرکردن.

**تسحب:** 1) ناز کردن. 2) زێدەڕۆیی لە خواردن و خواردنەوەدا. 3) پڕروویی کردن.

**تسحیر:** جادووکردن.

**تسخر:** ڕام و کەوی بوون، بەبێ هەقدەست کار کردن. گاڵتە، گەمە پێکردن.

**تسخیر:** دەست بە سەرداگرتن، گرتن، داگیرکردن، رکێف کردن، ڕام کردن، کەوی کردن، هێنانە ژێر بار، خستنە بەر فەرمان.

**تسخیرنا پذیر:** لەگیران نەهاتوو.

**تسخین:** گەرم کردن.

**تسدد:** بەستران، داخران، قایم بوون.

**تسدید:** بەستن، گرتن، قایم کردن. بەڕێگەی ڕاستا ڕێنوێنی کردن. سێرەگرتن. ڕاداشتن.

**تسدیس:** شەش گۆشە کردن، کردنە شەش بەش.

**تسرب:** تەشەنەسەندن، تەنینەوە.

**تسریح:** بەرەڵاکردن، بەردان، ئازادکردن. ڕەوانە کردن. لەوەڕاندن. ژن تەڵاق دان. شۆڕکردنەوە و شانەکردنی موو.

**تسریع:** پەلەکردن، لەزکردن، زووکردن.

**تسطیح:** تەخت کردن، یەکسان کردن، ساف و ڕێك کردن، خشت کردن، هاوئاست کردن.

**تسطیر:** خەت کێشان، دێربەندی کردن، نووسین، دانان.

**تسعیر:** 1) نرخ دانان، نرخ بڕین، نرخاندن. 2) نرخ، بەها. 3) گۆڕینەوەی پارەی خۆماڵی بە پارەی دەرەکی.





**تسفل:** نزم/ نەوی بوون.

**تسفه:** خۆ لە نەزانی و کەم ئاوەزی دان.

**تسفیر:** ڕەوانەکردن، وەڕێخستن، خستنەڕێ، ناردن.

**تسفیه:** بە نەزان و گەمژە زانین.

**تسقط:** بڕوانە: "سخن چینی کردن".

**تسقیه:** تێراوکردن.

**تسکین:** 1) ئارام کردن، دامرکاندن، هێدی و هێمن کردن، داسەکناندن، سوکنایی پێدان. 2) وەستاندن.

**تسکین خاطر:** سەبووری هاتن، سوکنایی هاتن، هەداری.

**تسکین دهنده:** ئازارشکێن، دامرکێن، دامرکێنەر، ئارامیدەر، سوکنایی دەر.

**تسکین یافتن:** دامرکیان، دامرکان، ئارام بوون، داسەکنان، هێوربوونەوە.

**تسلح:** پڕچەکی، چەکداری.

**تسلسل:** زنجیرە، یەك لە دوی یەکتری، یەك لە دوای یەك، بەدوایەکا، لێکدالێکدا.

**تسلسل معانی:** بڕوانە: "تداعی معانی".

**تسلط:** زاڵبوون، زاڵی، باڵادەست بوون، دەست بوون، باڵادەستی، دەست ڕۆیشتوویی، دەسەڵات.

**تسلط جویی:** هەوڵدان بۆ سەپاندنی هێز و ویستی خۆ بەسەر یەکی تردا.

**تسلف:** قەرز (کردن/ وەرگرتن).

**تسلم:** وەرگرتن، بوونە موسڵمان.

**تسلی:** 1) خۆشحاڵ بوون، بێخەم بوون. 2) بێ خەمی. 3) ئارام گرتن، سوکنایی هاتن. "**تسلی دادن**": دڵدانەوە، دڵخۆشی دانەوە. "**تسلی یافتن**": ئارام گرتن، سوکنایی هاتن.

**تسلی بخش:** سوکنایی هێنەر، ئارامدەر، خەمڕەوێن، خەفەت بەر.

**تسلیت:** دڵنەوایی، دڵدانەوە، دڵخۆشیدانەوە، سەرەخۆشی لێکردن، پرسە.

**تسلیت آمیز:** ئارامکەرەوە. دڵنەوایی دەرانە.

**تسلیح:** چەکدارکردن، پڕچەك کردن.

**تسلیحات:** کۆی"تسلیح"، چەکوچۆڵ، کەلوپەلی نیزامی.

**تسلیخ:** کەوڵ کردن، پێست دامالین، پێست داڕنین، گورووین.

**تسلیط:** زاڵکردن، بە دەسەڵات کردن، باڵادەست کردن.

**تسلیم شدن:** خۆبەدەستەوەدان، خۆدان بە دەستەوە، خۆ لە ئیختیار کەسێك نان، تەسلیم بوون، ملدان، ملنیان، کۆڵدان، ملشۆڕکردن، سەرنەویکردن، ڕادەست بوون، ڕام بوون، شان داخستن، فش کردن، بۆدانەواندن، هاتنەسەرچۆك، هاتنەسەرشەك، قێزبوون، پیخ بوون.

**تسلیم کردن:** ڕادەست کردن(ەوە)، بەدەستەوەدان، تەسلیم کردن، سەرپێشۆڕکردن، دانەدەست، دانەوەدەست، پێسپاردن، پێدان، وێدان.

**تسلی نا پذیر:** سوکنایی نەهاتوو.

**تسمم:** ژەهراوی بوون، ژارخواردن.

**تسمن:** قەڵەوبوون.

**تسمیر:** قایم کردن.

**تسميم:** دەرمان خواردکردن، ژاردان، ژەهردەرخوارددان.

**تسمين:** قەڵەوکردن.

**تسميَه:** ناوبردن، ناولێنان، ناونان، ناودێرکردن، ب ناڤ کرن، ناڤبرن.

**تسنن:** قبووڵی سوننەت کردن، پێڕەوی سوننەت/ داب و نەریت بوون، شێوازی سوننییەکان کە دوای پێغەمبەر ئەبوو بەکر بە جێ نشین دەزانن، سوننی گەرێتی.

**تسوق:** بازاڕ گەرمی کردن و خۆنواندن.

**تسويد:** رەش کردن، نووسین. رەشنووسی.

**تسويل:** گومڕاکردن، رازاندنەوە بۆ خافڵاندن و فریودانی کەسێك.

**تسويه:** یەکسان کردن، بەرامبەرکردن، تەخت کردن، رێك و هاوئاست کردن، راست کردنەوە، چوون یەك کردن. "**تسويەحساب**": یەکلاکردنەوە. تۆڵەسەندن، بە سزای کردەوە گەیاندن.

**تسهّل:** ئاسان بوون.

**تسهيل:** ئاسانکاری، ئاسان کردن، ساناکردن.

**تسهيم:** بەش بەش کردن، پاژپاژکردن.

**تسيير:** رادان، رەوانە کردن، وەڕێخستن.

**تشابه:** لێکچوون، وەك یەکچوون، وێکچوون، لە یەك چوون، وەك یەك بوون، لێك کردن، هاوشێوەیی.

**تشاجر:** دمەقاڵەکردن، دم بە دمە کردن، شەڕەقسەکردن، دەگەڵ یەکدی کێشمەکێش کردن، دە گەڵ یەکتر کێشەکردن.

**تشارك:** بوونە شەریك، هاوڕێیەتی.

**تشاعر:** خۆ بە هەڵبەست وان/ شاعیر نیشاندان.

**تشاغل:** خۆ بە کارێکەوە خەریك کردن، خنەخن کردن.

**تشاكل:** هاوفۆڕم بوون، هاوفۆڕمی، هاوشکڵی.

**تشاكى:** گلێی کردن، گازندەکردن.

**تشاور:** دەگەڵ یەکدی راوێژ و تەگبیرکردن.

**تشبث:** داوێنگیری، دەستەو داوێن بوون. چنگەکرێ کردن و گرتنی شتێك.

**تشبّع:** تێر بوون، تێری.

**تشبّه:** وەك دیتران چوون، لێچوون، وێچوون.

**تشبيب:** یادی سەردەمی لاوێتی کردن. پێشەکی و دەسپێکی شتێك.

**تشبيه:** چواندن، لێك چواندن، وێکچواندن، وێچواندن، شوبهاندن، تەژبی، تەشبی، تەشپی. (رێزمان) وەك یەك. "**تشبيه گسترده**": لێکچوونی بەربڵاو.

**تشتّت:** پرژوبڵاوبوون، پرژ/ پرش وبڵاوی، پەرتەوازەیی، پەرەم پەرەم، پەرێشانی. "**تشتت آرا**": جۆراوجۆری و جیاوازی بیروبۆچوونەکان.

**تشتك:** تەشتولکە، تەشتی گچکە.

**تشتيت:** پرش و بڵاو کردن، بڵاوکردنەوە.





**تشجيع:** دنەدانو هەڵخراندن، تیژکردن، هاندان، هێوراندن، دهنددان، سیخ دان، ڤەزیخاندن، ناڤدان، ناڤ تێدان، هالان، ناوتێدان، کوداندن، دەست لە پشت دان، زیخ پێدان بە قسە، ورە پێدان. "**تشجيع سگ**": حەلەلە، کسکس.

**تشحيذ:** توندکردن، بەهێزکردن، تیژ کردنی خەنجێر و چەقۆ و هتد.

**تشخّص:** گەورەبوون، سەرپشکی، بژارە بوون. فیز و دەعیە.

**تشخيص:** 1) ناسینەوە، لێك جیاکردنەوە، هەڵاواردن، دیاریکردن. 2) دۆزینەوەی نەخۆشی، لە نەخۆشی سەردەرکردن. 3) کەسایەتیبەخشی، کەسایەتی ئینسانی بەخشین بە شتەکان و وێناکردنیان وەك مرۆڤ.

**تشدّد:** سەخت بوون، دژوار بوون، دژواری، توندوتیژی نواندن.

**تشديد:** 1) سەخت و دژوارکردن، توندکردن، پتەوکردن، قایم کردن، بەهێزکردن، تۆخکردن، چڕکردنەوە. 2) نیشانەیەکیشە بەم فۆڕمە(ّ) کە لە کوردیدا پێی دەڵێن شەددە. 3) (فیزیك) رێزێنانس. 4) بەتوندوتیژی هەڵسوکەوت کردن. 5) بڕوانە: "پرخاشگری".

**تشذيب:** هەڵپاچین، هەڵپەرتاوتن، لق و پۆ کردن، تەکمیش کردن.

**تشر:** تەشەر، تانە، توانج، قسەی بە تێکوڵ.

**تشريح:** باسکردن و شیکردنەوەی بابەت، شرۆڤەکردن، توێتوێکردن، لەت لەت کردن، پارچەپارچەکردن، پەل پەل کردن. "**علم تشريح**": زانستی توێکاری، ئاناتۆمی، زانستێك کە سەبارەت بە دارشتی لەش و چۆنیەتی ئەندامەکان و پێوەندییان دەگەڵ یەکدی باس دەکا.

**تشريحى:** ( بۆ جەستە) ئاناتۆمی، توێکاری، نەشتەرکاری. بەشیکراوەیی.

**تشريع:** رچەدانان، رێگای ئایین دانان، یاسادانان.

**تشريف:** گەورەکردن، مەزن کردن، بڵیند و بەرزکردن. "**تشريف آوردن**": هاتنی کەسێکی مەزن و بەڕێز. "**تشريف فرماشدن**": هاتن یان چوون.

**تشريفات:** کۆی"تشريف"، رێورەسم، داب و دەستوور.

**تشريفاتى:** بڕوامەند و پابەند بە "تشريفات"، رواڵەتی و بێ ناوەرۆك.

**تشريق:** رووناك کردن، تیشك خستن، جوان چاك بوون، روانینە خۆرهەڵات.

**تشريك:** کردنە هەواڵ، کردنە شەریك، قەیتان لە کەوش کردن. "**تشريك مساعى**": هاوکاریکردن، یارمەتیدان، هاوفکری.

**تشريط:** کەرت کردن، دوولەت کردن.

**تشعّب:** لك لك بوون، شاخەشاخەبوون، کەرت و پەرت بوون، لێکەوتنەوە، لێبوونەوە، بڵاوبوون، بڵاوەلێکردن.

**تشعشع:** تیشك خستن، تیشكدانەوە، تروسكانەوە، رۆشنایی بەخشین، رووناكیدان، ورشەداربوون، بریقەداربوون.

**تشعیب:** جیاكردنەوە، لك لك كردن، شاخەشاخەكردن، بڵاوكردن.

**تشفّع:** تكاكردن، پاڕانەوە.

**تشفی:** چابوونەوە، خۆش بوونەوە. ئاسوودەبوون لە گوشاری رۆحی.

**تشفیع:** بۆ پاڕانەوە.

**تشقیق:** قەڵشاندن، شەق كردن، درزپێبردن.

**تشكّر:** سپاس كردن، بەچاكەزانین، چاكە لەبەرچاوبوون.

**تشكّك:** كەوتنە گومانەوە، گومان بردن.

**تشكّل:** رێكخران، دامەزران، كۆمەڵ بەستن، رێك كەوتن. فۆرم گرتن، شكڵگرتن. رێكخراوە، دامەزراوە، پێكهاتە. "**تشكل یافتە**": ئۆرگانیك، رێكخراو.

**تشكّی:** گلەیی كردن، شكایەت كردن، گازندەكردن.

**تشكیك:** خستنەگومانەوە، دوودڵ كردن، ڕاڕاكردن.

**تشكیل**(**دادن**): پێكهێنان، سازدان/ كردن، رێكخستن، دامەزراندن، دروست كردن، فۆرم و رواڵەت دان بە شتێك.

**تشكیلات:** رێكخستن(ەكان)، رێكخراوەكان. سازمان، دامەزراوە، ئیدارە. دەمودەزگا.

**تشكیل یافتن:** پێكهاتن، دامەزران، رێكخران و بەڕێوەچوونی كۆبوونەوە و شتی وا.

**تشمر:** ئامادەبوون بۆ كارێك، قۆڵ (لێ)هەڵماڵین.

**تشمّس:** لە بەر خۆرەتاو دانیشتن، خۆدانەبەر تاو، خۆهەڵخستن، حەمامی هەتاو گرتن.

**تشمیر:** هەڵكردن/ هەڵدانەوەی قۆڵ و داوێن، بەپەلە و خێرا رۆیشتن، ئیرادەكردن، ئامادەبوون.

**تشمیس:** هەڵخستن، دانان یان پان كردنەوەی شتێك لە بەر تیشكی خۆر. هەتاو پەرستی.

**تشمیم:** بۆن پێوەكردن.

**تشنامار:** 1) توونیەتی. 2) زۆری خواز.

**تشنّج:** گرژبوون، گرژهەڵاتن، (بار)گرژی، كۆڵنج كردن، ترنجان، كێشرانی ئەندامی لەش، قۆڵنج كردن، رەق بوون. پزیشكی: گەشەنگ.

**تشنج آفرین:** گرژی خولقێن، گرژی هێن.

**تشنج زا:** بڕوانە: " تشنجآفرین ".

**تشنج زدایی:** گرژی سڕینەوە، (وەلانان/ لابردن)ی گرژی، "détente".

**تشنگی:** تینگی، تینوێتی، تینوەتی، تینوایەتی، تونیایەتی، تینیەتی، تهنوویی. "**رفع تشنگی**": توونیەتی شكاندن.

**تشنه:** توونی، تینوو، تینگ، تی، تین، تێن، تێنو، تیهن، تیهنی، تەژنە.





**تشنەكام:** فرە تینگ، زۆر توونی.

**تشنەلب:** بڕوانە: "تشنەكام".

**تشنیع:** زۆر خراو گوتن سەبارەت بە كەسێك، بە ناشیرین و ناحەز لە قەڵەم دانی كەسێك، بەدگۆیی، ئاشكراكردنی عەیبی كەسێك، ناوزڕاندن، ئابڕووبردن، ئەتك كردن.

**تشوّر:** شەرمەزاربوون، شەرمەزاری، سەرشۆڕی.

**تشوّش:** شێوان، پەشۆكان، پەرێشان بوون، هەڵچوون، شڵەژان.

**تشویر:** 1) شەرمەزاری. 2) دڵەڕاوكێ، پەرێشانی. "**تشویرخوردن**": شەرمەزاربوون، تەریق بوونەوە. پەشیمان بوونەوە. "**تشویردادن**": شەرمەزاركردن، خەجاڵەت كردنەوە.

**تشویش:** شێواندن، تێكدان، بڵاوەپێكردن، بژاڵ، بڵاوی و پەرێشانی، شێواوی، پەشێوی، شپرێوی، بێ ئارامی. تێكچوونی دۆخ، فیتنە و ئاژاوە. "**تشویش افتادن**": تێكچوونی دۆخ، سەرهەڵدانی فیتنە و ئاژاوە. "**تشویش خاطر**": ئاڵۆزی زەین و نیگەرانی."**تشویش دادن**": شێواندن، نائارام كردن.

**تشویق:** هاندان بۆ ئەنجامدانی كارێك، تامەزرۆكردن، تاسەمەند كردن، وەئارەزووخستن، دڵگەرم كردن. "**تشویق كنندە**": هاندەر، هانەدەر، دنەدەر، ختكینە، تیژەڤان.

**تشویك:** دڕوو دەرهێنان، دڕكداربوونی دار.

**تشهّد:** شایەتیخواستن، ئاگاداربوون، گوتنی "لااله‌الاالله".

**تشهّی:** ئیشتیا، مەگیز، ئارەزوو، تامەزرۆبوون، بەتاسەبوون، دڵ لێچوون.

**تشهیر:** 1) ناوداركردن، بەناوبانگ كردن، ناڤداركرن. 2) ناوزڕاندن، ترۆكردن، شرتوشۆ لێبڕین، ریسواكردن.

**تشیّخ:** بوونەشێخ، بوونە پیر، خۆكردنە پیر(شێخ).

**تشیّع:** شێعەبوون، وەدووكەوتن، پێڕەوی كردن، لە سەر ئایینی شێعە بوون، شێعەگەری.

**تشیید:** قایم كردن، بەرزكردنەوە، دامەزراندن.

**تشییع:** بەڕێكردن، رەوانە كردن، لە گەڵ مردوو رۆیشتن، بەشداریكردن لە رێوڕەسمی ناشتنی مردوو، لە تەكا رۆیشتن.

**تصاحب:** دەست بە سەرداگرتن، بوونە خاوەن.

**تصادف:** 1) لێكدان، خۆلێكدان، پێكادان، وێككەوتن، بە رێكەوت بە یەكگەیشتن، رووبەڕووبوونەوە. 2) رێكەوت، هەڵكەوت، پێشهات، رووداو. 3) هاوكات بوونی دوو یان چەند رووداو.

**تصادفی:** بەختەكی، بەهەڵكەوت، بەڕێكەوت، بەسوتفە. زیان دیتوو بەهۆی پێكادان.

**تصادق:** دۆستایەتی.

**تصادم:** پێك دادران، پێك دادان، بەریەك کەوتن، تێك کوتران، بە توندی لێکدران، تێکەڵەنگووتن.

**تصاریف:** کۆی"تصریف"، پێشهات و ڕووداوەکانی ڕۆژگار، گەڕان و پشێوییەکانی ڕۆژگار.

**تصاعد:** بەرەوژوورچوون، چوونەسەر، سەرکەوتن، بەرزبوونەوە، هەڵگەڕان.

**تصاعدی:** بەرەوژوور، بەرزەڕوو.

**تصاغر:** خۆ بە سووك و کەم دانان.

**تصافح:** دەست لێدانەوە، تەوقەکردن، دەست نانە ناو دەستی یەکتر، دەستی یەکتر گوشین لە کاتی دیدار و یەکتر دیتن دا.

**تصالح:** پێکەوە سازان، سازش کردن، ئاشتی کردن، ڕێککەوتن، ل هەڤ هاتن.

**تصامم:** خۆ لە کەڕی دان.

**تصانیف:** کۆی"تصنیف".

**تصاویر:** کۆی"تصویر". "**تصاویر قیاسی**": وێنەگەلی بەراوردکارانە.

**تصبّر:** سەبرکردن، لەسەرخۆیی، شێنەیی.

**تصحّف:** هەڵەکردن لە خوێندنەوەدا.

**تصحیح:** ڕاست کردنەوە، ساخکردنەوە، چەوتیلابردن، هەڵەلێگرتن، هەڵەگیری. "**تصحیح کننده**": ڕاست کەرەوە، هەڵەگر، هەڵەبڕ، هەڵەچن، هەڵەی نووسراو لابەر.

**تصحیف:** 1) هەڵەکردن لە نووسیندا. 2) بەرگ تێگرتن، شیرازەکردن.

**تصدّر:** لە سەرەوەی کۆڕ جێگرتن. سنگ دانە بەرەوە، سنگ دەرپەڕاندن.

**تصدّق:** 1) خێر کردن. 2) بڕوانە: "بلاگردان". "**تصدق شدن**": لەناوچوون، کوژران.

**تصدی:** وەئەستۆ گرتن. پێ سپێراوی. سەرقاڵی کارێك بوون.

**تصدیر:** لە سەروو دانان، لە سەرووی کۆڕ دانیشاندن. ناردنە دەرەوە.

**تصدیع:** بوونە هۆی زەحمەت و سەرئێشە، تەنگاو کردن. زەحمەت، ژانەسەر.

**تصدیق:** بڕواپێهێنان، باوەڕپێکردن، بەڕاست زانین، ڕاستاندن، پشت ڕاست کردن، تەسێق کردن.

**تصدیق نامە:** تەسێق نامە، ئیزنی لێخوڕینی ماشێن و هتد.

**تصرّف:** داگیرکردن، دابڕکردن، بەزۆر سەندن، زەوت کردن، بە زۆر وەدەست هێنان. دەست تێوەردان، دەستکاری، دەست بە کارێك کردن. گۆڕانکاری تێدا پێکهێنان. مامەڵە، سەودا.سوود، قازانج. "**تصرف استعمالی**": خستنە ئیختیار و زەوت کردنی ماڵێك کە ببێتە هۆی لەناوچوونی وەك بڕینی داری بەبەر بەمەبەستی سازکردنی تەختە و چێو. "**تصرف انتفاعی**": زەوت کردنی قازانج و بەهرەکانی ماڵێ بەهێشتنەوە خودی ماڵەکە. "**تصرف عدوانی**": داگیرکردنی ماڵێك بەبێ ئیزنی خاوەن ماڵ یان بەبێ ئیزنی یاسایی.





**تصریح:** ئاشکراکردن، بە ڕاشکاوی دەربڕین، درکاندن، ڕاگەیاندن. "**تصریح بە چیزی کردن**": بە ڕوونی و ئاشکرا ئاماژەپێدان بەوشتە. "**تصریح داشتن بر چیزی**": بەڕوونی دەربڕینی ئەو شتە. "**بەتصریح**": بە ڕاشکاوی و ڕوونی.

**تصریع:** بە زەوی دادان. دوو تا/ لینگەکردن.

**تصریف:** 1) خەرج کردن، گۆڕین، هەڵێنانەوە. 2) وشەگۆڕی، وشەسازی. 3) گۆڕانکاری، گۆڕین.

**تصعید:** 1) چوونەسەر، بردنە سەر، سەرخستن، هەڵگێڕان، هەڵچواندن. 2) بڕوانە:"والایش".

**تصغیر:** بچوك کردنەوە، چکۆڵەو گچکەکردن، پچووك شاندان.

**تصفّح:** بە وردی تێڕوانین، وردبوونەوە و لێگەڕان، لاپەڕەلاپەڕە و بە وردی خوێندنەوە.

**تصفیق:** باڵ لێدانی باڵندە. چەپڵە لێدان، چەپك کوتان.

**تصفیه:** 1) پالاوتن، پالافتن، بە پالۆێنەداکردن، داپاڵین، داپلاندن، وەرڤاندن، نەسەلنایش، نەسەلیایش، ساف کردنی تراو. 2) پوختەکردن، پاك کردنەوە، پاقژ کردنەوە، خاوێن کردنەوە، ڕوونکردنەوە. 3) پاکتاوکردن. 4) بڕوانە: "حل و فصل". "**تصفیەحساب**": بڕوانە: "تسویەحساب".

**تصفیەخانە:** بڕوانە: "پالایشگاە".

**تصلّب:** ڕەق و پتەوبوون، توندبوونەوە، سفت بوونەوە، سخ بوونەوە. "**تصلّب شرائین**": ڕەقبوونی خوێنبەرەکان.

**تصلّف:** کلکەسووتە، مەرایی، زمان لووسی، خۆهەڵکێشان، فیشاڵ کردن، شات و شوت کردن.

**تصلیح:** ئاشت کردنەوە، ڕێکخستنەوە، چاك کردنەوە.

**تصمیم:** بڕیاردان، بڕیار لە سەر دان، قەراردان، لێ بڕان، لێ بڕیان، ویست و ئیرادە کردن، تەما، بەتەمابوون، تەماگرتن، کەوتنە سەر، خەیاڵ لێدان، نەخشەکێشان، پلان دانان."**تصمیم دارم**": بەنیازم، دەمەوێ.

**تصمیم قطعی:** بڕیاری یەکجارەکی.

**تصمیم نهایی:** دوابڕیار، بەتەواوی ساغ بوونەوە.

**تصنّع:** خۆڕازاندنەوە، ڕواڵەت نوێنی، ساختەکاری. دروست کران.

**تصنّعی:** دەستکرد، ڕواڵەتی.

**تصنیع:** سازکردن، چێکرن، دروست کردن، ئامادەکردن.

**تصنیف:** 1) بەستە، گۆرانی سووکەڵە و بن بزێوکە. 2) پۆلاندن، پۆلێنکردن، پۆل پۆلکردن، دەستەدەستەکردن، هاوپۆل و

هاوبابەتكردن، ریزكردن، ڕێكخستن. 3) نووسین و ڕێكوپێك كردنی پەرتووك، بە بابەت كردن، شێعر گوتن. 4) كتێو، نامیلكە، نووسراوە.
**تصوَر:** وێنا كردن، وێناكێشان. گومان كردن، گومان بردن، وازانین، وادانان، پێوابوون، وابینین، بە خەیاڵ دا هاتن، بەبیرداهاتن، هێنانە پێش چاو، وێنەی كەسێ یان شتێ لە دڵ گرتن، وەزەین خستن.
**تصوَرتام:** وێناكردنی تەواو.
**تصوَردوزخی:** وێناكردنی دۆزەخی.
**تصوَر رمانتیك:** وێناكردنی ڕۆمانتیك، خەیاڵی ڕۆمانتیك.
**تصوَری:** وێناكاری. گومانكاری، خەیاڵی.
**تصوف:** سۆفیگەرێتی، سۆفیگەری، سۆفیایەتی.
**تصوَن:** ئاگاداری خۆ بوون و خۆپاراستن.
**تصویب:** 1) پەسندكردن، پەژراندن. 2) بە راست و دروست زانین، بە رەوا زانین، بە راست بێژ زانین، دەنگدان بە دروستی و چاكی كارێك. 3) بڕوانە:"تأیید".
**تصویب نامە:** پەسندكراو.
**تصویر:** 1) وێنە. 2) وێنەكێشان(ەوە)، وێنەگرتن، رەسم كێشان، روخسار كێشانەوە، فۆرم نەخشاندن. 3) پۆرترە. 4) شیكردنەوە، شرۆڤەكردن. "**بە تصویر كشیدن**": دەربڕین و پیشان دان لە ڕێگەی كێشانەوەی شكڵ یان پیشاندانی فیلم. شیكردنەوە، دەربڕین.
**تصویربردار:** 1) وێنەهەڵگرەوە. 2) فیلم هەڵگرەوە.
**تصویربرداشتن:** وێنەهەڵگرتنەوە.
**تصویر تخیلی:** وێنەی خەیاڵئامێز/ خەیاڵی.
**تصویر پردازی:** وێنەسازی.
**تصویرسازی:** نیگاركێشی، وێنەسازی. بەكارهێنانی وێنە لە شێعر یان نووسراوە.
**تصویرسازی تزئینی:** وێنەسازی رازێنەرەوە(یی).
**تصویركردن:** 1) وێنەكێشانەوە. 2) شیكردنەوە، شرۆڤەكردن. 3) گومان كردن، وێناكردن.
**تصویرگری:** 1) ئامادەكردنی وێنە بۆ كتێب و هتد. 2) بەكارهێنانی وێنە لە شێعر یان نووسراوەدا.
**تصویرمتحرك:** بڕوانە:"انیمیشن".
**تصویره:** بڕوانە: "تمثال".
**تصویر هنری:** وێنەی هونەری.
**تصویری:** وێنەكاری، وێنەیی.
**تضائق:** تەنگاوی، تەنگەتاوی، تەنگانە.
**تضاحك:** بە یەكەوە پێكەنین.
**تضاد:** دژایەتی، لێك دژی، دژبەیەكی، دژكاری، ناسازگاری، ناكۆكی. (ڕێزمان) دژیەك، واتە كۆكردنەوەی دوو مانای دژبەیەكتر لەیەك دێڕدا یان لە نیوەدێڕێك دا وەكوو ڕووناكی و تاریكی.





**تضاد تاریخی:** دژایەتی مێژوویی، ناسازی مێژوویی.
**تضارب:** لێكدان، لە یەكتردان، تێكهەڵچوون. "**تضارب آرا**": هاتنەگۆڕی بڕواگەلی جۆراوجۆر و باسكردن لێیان.
**تضاعف:** دووقات بوون، دوو بەرابەربوون.
**تضاغن:** رك هەڵگرتن لە یەكتر، كینەكێشان، رق لە یەكتری بوونەوە.
**تضامن:** گرەنتیی یەكتر كردن، زەمانەتی یەكتر كردن.
**تضرَر:** زیان كردن، زیان دیتن، تەوەرە دیتن.
**تضرَع:** كڕووزانەوە، لالانەوە، لاڵیان، پاڕانەوە، نووزانەوە، كزاڤ، گریان.
**تضرَم:** 1) كڵپەسەندن، هەڵایسان. 2) هەڵچوون لە تووڕەبیان.
**تضریب:** 1) سەخت لێدان. 2) گێرەشێوێنی، ئاژاوەنانەوە، شۆفاریكردن، دووزمانیكردن، گێچەڵ هەڵایساندن. 3) تێكەڵ كردنی شتێك دەگەڵ شتێكی دی. 4) كەلێن، كەلەبەر.
**تضعَف:** بە لاواز زانین، بە بێهێز دانان، بەكەم گرتن.
**تضعیف:** 1) لاوازكردن، بێهێزكردن. 2) دووقات كردن، دوو بەرابەر كردن.
**تضلیل:** گومڕاكردن، بەلاڕێدا بردن، ڕێ پێ هەڵەكردن، سەرلێشێواندن.
**تضمین:** 1) گرەنتی. 2) وەئەستۆگرتنی تاوان و زیان، تاوان دان، بژاردن. 3) جێكردنەوە، گونجاندن. 4) (ئەدەبی) تێهەڵكێش، ئەوەیە كە شاعیر نیوەهۆنراوە یاخود هۆنراوەیەك یان بەشێك لە هۆنراوەی شاعیرێكیتر وەردەگرێت و دەیخاتە ناو هۆنراوەكەی خۆیەوە هەندێ جار ناوی شاعیرەكەش دەهێنێ، ناواخن كردن.
**تضمین دادن:** گرەنتی دان، دەروەستی دان.
**تضمین كردن:** مسۆگەركردن، دڵنیاكردن، دەستەبەركردن، زەمانەت كردن.
**تضمین گرفتن:** گرەنتی وەرگرتن، زەمانەت وەرگرتن.
**تضییع:** خەساركردن، زایەكردن، بە فیڕۆدان.
**تضییق:** تەنگاوكردن، تەنگەتاوكردن، تەنگاڤ كرن، تەنگپێهەڵچنین، خستنە تەنگانەوە.
**تطابق:** هاوتایی بوون، هاوڕێكی، پێكەوەگونجان، هاوجووت بوون، وەك یەكی، بەرامبەری.
**تطاول:** سەربزێوی كردن، سەركێشی كردن. دەست درێژیكردن.
**تطایر:** پڕش و بڵاوبوون، تەواو داگیرانی ئاسمان بە هەور.
**تطبیق:** وەك یەك كردن، بەرامبەركردن، رێك كردن، هاوتاكردن. گونجان، گونجاندن، پێكەوەگونجاندن، پێك گرتن. بەرابەری. جێبەجێكردن، بەجێهێنان. بەراوردكردنی دوو شت دەگەڵ یەكدی.

**تطبیقی:** بەراوردکاری. بەجێهێناندن.

**تطرق:** (ڕێ/ ڕێگە) دۆزینەوە.

**تطریب:** گۆرانی بەزمی خوێندن، خوێندنی گۆرانی شاد، وە بەزم و ڕەزم خستن.

**تطرید:** ڕادان، دەرکردن، وەدەرنان، دوورخستنەوە، پاڵ پێوەنان.

**تطعیم:** خواردن پێدان. موتوربەکردنی دار، کوتان، واکسێن لێدان.

**تطلب:** گەڕانی بەردەوام.

**تطلیق:** ئازادکردن، بەرەڵاکردن. دەست لێهەڵگرتن، تەڵاق دان.

**تطمیع:** 1) تێر کردن، رازی کردن. 2) وە تەماح/ تەما خستن، تەماح وەبەرنان، تەماح نانەبەر، چکوس کردن.

**تطور:** پەرەسەندن، گۆڕان، پێشکەوتن، گەشەکردن.

**تطوف:** سوورخواردن، سووڕانەوە، خولانەوە، خول خواردن بە دەوری ماڵی کابەدا.

**تطویر:** پەرەگرتن، گۆڕین.

**تطویل:** 1) درێژکردنەوە، درێژەوکردن، درێژبوونەوە. درێژدادڕی لە قسەکردن دا.

**تطهر:** 1) پاک بوونەوە/ کردنەوە، پاقژبوونەوە/ کردنەوە، خاوێن بوونەوە/ کردنەوە. 2) بڕوانە:"غسل". 3) سوننەت کردن.

**تطهیر:** پاکژکردنەوە، پاک کردنەوە، خاوێن کردنەوە.

**تطیر:** نفووسی خراپ لێدان، نوخشەی خراپ لێدان.

**تطییب:** پاک و بۆنخۆش کردن، حەڵاڵ کردن.

**تطییر:** هەڵفڕاندن.

**تطیین:** بڕوانە: "اندودن".

**تظالم:** زوڵم کردن لە یەکتر.

**تظاهر:** 1) خۆنوێنی، خۆنواندن، خۆپیشاندان، وادەرخستن، وانواندن، ڕواڵەتبازی. 2) ئاشکرابوون. 3) پشت بە پشتی یەکترەوەنان، هاریکاریکردن. 4) نیشانە.

**تظاهرات:** خۆپیشاندان، خۆشاندان، خۆنیشاندان، ڕێپێوان، پێکەوە ڕۆیشتن بە کۆمەڵ، مەشیان، گەلەکۆیی.

**تظاهرکنندگان:** خۆپیشاندەران.

**تظلم:** دادخوازی، دادخوایی، شکایەت کردن.

**تظلیل:** سێبەرکردن، سێبەرکاری، نسێکردن، خستنە ژێر سێبەر.

**تظنن:** گومان بردن، گومان کردن.

**تعابیر:** کۆی"تعبیر".

**تعاتب:** سەرزەنشتی یەکتر کردن، گلەیی کردن.

**تعادل:** هاوسەنگی، هاوتایی، هاوکێشی، یەکسانی، بەرابەری.

**تعادل کارساز:** هاوسەنگیی کارامە.

**تعادی:** دوژمنایەتی یەکتر کردن.





**تعارج:** خۆ لە شەلی دان، بە شەلەشەل ڕۆیشتن.

**تعارض:** دژایەتی، دژبوون. جیاوازی، ناکۆکی، ناسازگاری.

**تعارف:** یەکترناسین. خولق کردن. بەخێرهاتن کردن، بەخێرهێنان، فەرمووکردن. دیاری دان بە یەکتری. "**تعارف برنداشتن چیزی**": جیددیبوونی ئەو شتە. "**تعارف دادن**": دیاریدان، پێشکەشیدان یان بەرتیل دان. "**تعارف کردن**": 1) دەست درێژکردن و دانەدەستی شتێک بە کەسێک بە ڕێز و حورمەتەوە. 2) بە ڕاست نەبوون و جیددینەبوونی بابەت و مەسەلەیەک کە لە بەر ڕێز دەردەبڕدرێ.

**تعارفات:** کۆی"تعارف"، کۆمەڵە کردار و قسەیەک کە زۆر جیددی نەبن و لەبەر ڕێز و داب و نەریت دەربڕدرێن.

**تعاریف:** کۆی"تعریف".

**تعاسر:** دەگەڵ یەکتر سەختگیری کردن، لە تەنگانە خستنی یەکتر.

**تعاشق:** سەوداسەری یەکتر بوون، گراوی یەکتر بوون.

**تعاضد:** (هاوکاری/ هاریکاری) یەکتر کردن، پشتگیری کردن.

**تعاطی:** 1) تەگبیر/ ڕاوێژ کردن دەگەڵ یەکتری. 2) خەریک بوون بە کارێکەوە. 3) دان و ستان، مامەڵە کردن. 4) بڕوانە: "اقدام". "**تعاطی افکار**": تەگبیر و ڕاگۆڕینەوە.

**تعاقب:** شوێن کەوتن، بەدواداچوون، بە دوای یەک دا هاتن، بە دوی یەک دا چوون.

**تعاقد:** دەگەڵ یەکتر پەیمان بەستن، سۆزدان بە یەکتر.

**تعاقل:** خۆ بە ژیر زانین، خۆ بە ئاوەزمەند دانان، ئاوەزمەندی نوێنی.

**تعالی:** لەسەرتر، بەرزتر. پێشکەوتن، بەرەوپێش چوون، پێشڤەچوون. پاک بوون یان پاک بوونەوە لە هەر چەشنە ناپاکییەکی ڕەوشتی.

**تعالیم:** کۆی"تعلیم"، ڕێنماییەکان، ڕاهێنانەکان.

**تعالیق:** نامەکان، بحوکمەکان، بەڵگەکان.

**تعامل:** 1) (پێکەوە)هەڵکردن، هەڵسوکەوت کردن. 2) ئاڵوگۆڕ، ئاڵوێڕ، سەوداگەری. 3) کارتێکردنە سەریەک، کاریگەری لەسەر یەک دانان.

**تعامی:** خۆ لە کوێری دان، چاو لێقووچاندن.

**تعاند:** بڕوانە: "عنادورزیدن".

**تعانق:** دەست لە ملی یەکتر کردن، دەستەملانی یەکتر بوون، یەکتر لە باوەش گرتن.

**تعاون:** هەرەوەزی، هاوکاری/ هاریکاری یەکترکردن. "**کار تعاونی**": زبارە، هەرەوەز، گەلەکۆمە، متارە، مەهبەرە، تەوجی.

**تعاون گروهی:** گەلەکۆمە، گەلەکۆمەك، گەلەکۆمەکە، گەلەکۆمەکی، گەلەکۆمەگی، هەرەوەزی.

**تعاویذ:** کۆی "تعویذ".

**تعاهد:** دەگەڵ یەك پەیمان بەستن، هاوپەیمانی. نگاداریکردن، چاوەدێریکردن.

**تعب:** سەختی، دژواری، چەرمەسەری، ماندویەتی، سەخڵەتی، شەکەتی.

**تعبّد:** 1) بەندەییکردن، پەرستن. 2) قبووڵ کردنی شتێ بەبێ مەرج، ملکەچی بێئەملاوئەولا.

**تعبدی:** ئەوەی بە بێئەملاوئەولا قبووڵ دەکرێ.

**تعبّس:** مۆن بوونەوە، ترشڕوویی، رووگرژی، لچ و لێو تێك نان.

**تعبید:** بە بەندەیی گرتن، کردنە بەندەی خۆ.

**تعبیر:** 1) دەربڕین، لێکدانەوە. 2) تێپەڕاندن، پەڕاندنەوە، رەت کردن. 3) گوزارە، گوزارشت. "**تعبیرکننده**": لێکدەرەوە، شرۆڤە/ شرۆکەر، خەوزان.

**تعبیرخواب:** پایژی، لێکدانەوەی خەو، خەولێکدانەوە، وەرزین، بژارە، شرۆ، شرۆڤە.

**تعبیرگرایی:** دەربڕین خوازی.

**تعبیه:** 1) سازکردن و رازاندنەوە، ئامادەکردن. 2) بڕوانە: "نصب کردن".

3) هەنگاو و کرداری سەرسووڕهێن و فریودەرانە، مەکر، فرتوفێڵ.

**تعجب:** سەرسووڕمان، واق وڕمان، سەرسام بوون. "**علامت تعجب**": سەرسامە، نیشانەی سەرسووڕمان لە نووسیندا.

**تعجب برانگیز:** سەرسووڕهێنەر، سەرسامکەر.

**تعجیب:** سەرسام کردن، وە سەرسوڕمان خستن.

**تعجیز:** جاڕز/ وەڕەزکردن. نەهێشتن.

**تعجیل:** پەلەکردن، تاودان، تالووکەکردن، پەلەپڕووزو، پلەپەرتکێ.

**تعداد:** ژمارە. "**تعدادکردن**": ژماردن، بژاردن، هەژمارتن.

**تعدادی:** ژمارەیەك.

**تعدد:** فرە، فرەپاتی، فرەیی، هەمەچەشن، جۆراوجۆر، پتربوونی ژمارە. "**تعدد زوجات**": فرەژنی، چەند هاوسەری، هەبوونی چەند ژنی.

**تعدد ابعاد:** فرەڕەهەند.

**تعددی:** فرەیی، هەمەچەشنی، پلۆرالیزم.

**تعدّی:** دەست درێژی، ناهەقی، نەقی، بێدادی، زوڵم کردن، لەئەندازە تێپەڕاندن، سنوور بەزێنی، غەدر.

**تعدید:** ژماردن، هەژمارتن.

**تعدیل:** 1) راست کردن/ کردنەوە، رێك کردنەوە، بەرابەر کردن، هاوسەنگ کردن، هاوتەرازکردن، هەموارکردن.





2) کەمکردنەوە، خاوکردنەوە. 3) (ئابووری) گونجاندنی ماڵیات دەگەڵ رادەی داهاتی ماڵیات دەرەکان. زیادکردن بە نرخی چالاکییەکانی پێوەندیدار بە قەرارداد‌ەکانی تەندەر دوای تێپەڕینی ماوەیەك بەهۆی گۆڕینی نرخەکانی بازاڕ. "**تعدیل ثروت**": کەمکردنەوەی دارایی دەوڵەمەندان لە رێگەی وەرگرتنی ماڵیات و شتی وا دا. "**تعدیل یافتن**": هاوسەنگی پەیداکردن، هاوتەرازبوون.

**تعذّب:** ئازارکێشان.

**تعذر:** 1) سەختی، دژواری. 2) بیانوو هێنانەوە. "**تعذرداشتن**": دژواربوون.

**تعذیب:** ئازاردان، ئەشکەنجەدان.

**تعذیر:** پەلپ گرتن، بیانووهێنانەوە، بیانوو سازکردن. کەمتەرخەمی کردن.

**تعرّب:** بوونە عەڕەب، خوو و خدەی عەڕەبان گرتن.

**تعرض:** دەستدرێژیکردن، ئەتك کردن، لاقەکرن، دەگژڕاهاتن، بەگژداهاتن. پەلاماردان، هەڵکوتانەسەر. روو وەرگێڕان بەنیشانەی نارەزایەتی. خەریکی کارێك بوون، رووکردنە کارێك.

**تعرضی:** دەست درێژکەرانە، پەلاماردەرانە.

**تعرّف:** ناسران، خۆناساندن، ئاشنابوون. ناسین. تاوتوێ و توێژینەوە. "**تعرف کردن**": ناساندن، پێناساندن. شناسایی و کۆڵینەوە و تاوتوێ کردن.

**تعرفه:** 1) ناساندن. 2) دەستنیشان کردن، پێناسەکردن. 3) بەرگەی پێناسە/ ناسینەوە. 4) تارفە، پێرستی نرخی کالا. 5) رادە یان رێژەی ماڵیاتێ کە بە کالا یان خەدەمات دەبڕێ. "**تعرفه گمرکی**": ماڵیاتێ کە بابەتی (کالا) هاوردەکان وەردەگیرێ، تارفەی گومرکی.

**تعرّق:** رەگئاژۆبوونی دار، ریشەداکوتاندنی دار. ئارەق کردن.

**تعرّی:** رووت و قووت بوونەوە، رووت کران.

**تعریب:** بەعەڕەب کردن، کردنە عەڕەب، نیشتەجێکردنی عەڕەب لە زێدی نەتەوەکانی دیکە. وەرگێڕانە سەر زمانی عەڕەبی. فۆڕمی عەڕەبی دان بە وشەکان.

**تعریض:** 1) پان کردن/ کردنەوە، بەرینترکردن. 2) بە هێما ئاخاوتن، تانە و تەشەر لێدان، پلارتێگرتن، توانج تێگرتن.

**تعریض شدن:** راخران، پەرەسەندن. بەرین بوونەوە.

**تعریف:** 1) پێناسەکردن، پێناسکردن، ناساندن، پێناساندن. 2) پێناسە. 3) تێگەیاندن، زاناندن. 4) باسکردن، تاریف کردن، هەڵکێشان، هەڵ کێشیان، بەشان و پۆداهاتن، پێهەڵگوتن. 5) گێڕانەوە بە قسە.

**تعریف پذیر:** پێناسە هەڵگر، ئەوەی بۆ پێناسەکردن بشێ.

**تعريف دادن:** ناساندن، پێناساندن.

**تعريف نگاری:** پێناسەکردنی وشە و زاراوەکان.

**تعريفی:** باش، چۆنیەتی باشتر. تاریف کراو، ستایش کراو.

**تعريق:** ئارەقە کردن/ پێکردن، تێکەڵ کردنی شەراب دەگەڵ کەمێك ئاو.

**تعزيت:** 1) بڕوانە: "تسلی دادن". 2) ڕێوڕەسمی تازیەباری.

**تعريك:** تەمبێکردن.

**تعزّی:** بڕوانە: "تسلی یافتن".

**تعزير:** لۆمە کردن، سەرزەنشت کردن، ئەدەب کردن، کوتەك لێدان بە دار، سزادان.

**تعزيرات حكومتی:** نرخ دیاری کردن/ نرخ دانانی حکوومەتی.

**تعزيه:** پرسە، سەرەخۆشی، شیوەن، ماتەم، تازیمانە، تازیە، ئازیەتی، خەم داگرتن بۆ تازە مردگ، دڵنەوایی دان، دڵخۆشی دانەوە.

**تعسّر:** دژواری، سەختی.

**تعسير:** سەخت و دژوارکردن.

**تعشّق:** دڵداری، ئەوینداری.

**تعصب:** دەمارگیری، دەمارگرژی، دەمار وشکی. دوژمنی، قین لە دڵی. غیرەت.

**تعصب آميز:** دەمارگیرانە، دەمارگرژانە، دوگماتیك.

**تعصب كردن:** لایەنگری کردن. پێداگری، دەمارگیری کردن.

**تعصبی:** بەغیرەت، دەمارگرژ. لە رووی دەمارگیری و غیرەتەوە.

**تعصّی:** سەرپێچی کردن، مل نەدان، یاخیبوون.

**تعطّر:** عەتر/ بۆن لە خۆ دان.

**تعطّش:** خۆ لە توونیەتی دان، تامەزرۆیی.

**تعطّل:** بێکار مانەوە، لە کارکەوتن، راوەستانی کارێك.

**تعطير:** عەتر/ بۆن لە خۆدان، بۆن خۆشکردن.

**تعطيف:** دلۆڤانی نواندن، سۆز نیشان دان، نەرمی نواندن. چەمانەوە.

**تعطيل:** وچان، پشوو، رۆژی پشودان، رۆژی کار نەکردن، بەتاڵانە، یەفش. بێکارمانەوە. بڕوانەبوون بە بوونی خودا.

**تعطيل بردار:** شیاوی پشوودان.

**تعطيل شدن:** داخران، وەستان، لە کار کەوتن، بێکاربوون/ بێکاری.

**تعطيل كردن:** داخستن، وەستاندن، دەست لە کار کێشانەوە، لەگەڕ خستن، بیکار کردن.

**تعظيم:** 1) کڕنووش، کوڕنووش، کوڕنو، سەرچەماندن بۆ رێزگرتن ، چەمانەوە بۆ رێزو حورمەت، داهاتنەوە بۆ رێزلێنان لە کەسێ، رێزوقەدرگرتن، سەرکۆپ، پانتە. 2) بەگەورە دانان، گەورە و مەزن کردن.





**تعظيم كردن:** کوڕنووش بردن، کوڕنوکردن، چەمانەوە بۆ رێزگرتن.

**تعفّر:** خۆڵاوی بوون، دە خۆڵەوە چوون.

**تعفّف:** داوێن پاکی، خۆپارێزی، خۆبواردن لە حەرام.

**تعفّن:** بۆگەن بوون، بۆگەن کردن، گەنین، رزاوی.

**تعفير:** دە خاك و خۆڵ وەردان.

**تعفين:** رزاندن، گەناندن، بۆگەن کردن.

**تعقّب:** وەدووکەوتن، وەشوێن کەوتن، وەدووی کەموکوڕی ئەم و ئەو کەوتن.

**تعقّد:** بەستران، گرێ لێدران، گرێ تێکەوتن، ئاڵۆزی، دژواری. خەست بوونەوەی تراو.

**تعقّل:** بەکاربردنی ئەقڵ، بیرکردنەوە.

**تعقيب:** راوەدوونان، راونان، راونیان، رەپێنان، بەدواداچوون، شوێن هەڵگرتن، شوێن کەوتن، شوێن کەفتن، ڤەشۆن کەتن، شوێن بە شوێن، دواکەوتن، دووکەوتن، وەدووکەوتن، بەدووی کەسێك دا چوون، بەرودوانان، بەرەودوانان، سەردەدونان، هەڵبڕاندن، هەڵبڕانن، هەڵبڕین، پەیکردن، پەیکەردەی، دانەپەی، دانەدوو، پاسەرنیان، شۆپاندن.

**تعقيد:** گرێ دان/ لێدان. ئاڵۆزکردن، شێواندن. ئاڵۆزی، دژواری.

**تعقيم:** 1) نەزۆك کردن، لە زاوزێ خستن. 2) لە زاراوەی پزیشکی دا: دژەگەن کردن و لە ناوبردنی میکرۆبەکانی شتێك، ئیستریل کردن.

**تعكيس:** هەڵگەڕاندنەوە، دیواودیوکردن.

**تعلّق:** هەڵواسران، گیرسانەوە. پێوەندی، پابەندی، هۆگری، ئینتما، (دڵ) بەستراوەیی.

**تعلّق خاطر:** خۆشەویستی جێگە، پابەندی بەشوێن، بەستراوەیی/ ئینتما بە جێگە، دڵ پێوەبوون.

**تعلّق گرفتن:** پێدران، پێبڕان، تەرخان بوون بە. خرانە ئەستۆ.

**تعلّل:** بیانووهێنانەوە، پەڵپ گرتن، وڕك گرتن، گنخاندن، دەستی‌دەستی، دەسی‌دەسی، ساوەساوکردن، تەفرەدان، خنەخن کردن، دێرکردن.

**تعلّم:** فێربوون، راهاتن، هین بوون، هووین بوون، هەڤۆتن.

**تعليب:** لە قوتوونان، قوتووبەندی.

**تعليف:** ئاڵف دان بە چوارپێ، ئالیك کرن.

**تعليق:** 1) هەڵپەساردن، قۆرت و تەگەرە تێخستن. 2) هەڵواسران، پێوەبەستران. 3) تانە، تەشەر، توانج. 4) (شیمی) سوسپاسیۆن. 5) یاداشت. "**تعليق زدن**": یادداشت کردن. "**تعليق كردن**": یادداشت کردن. هەڵواسین یان هەڵواسران. "**تعليق مجازات**": هەڵپەساردنی سزایەکان، بەڕێوەنەبردنی سزای تاوانبار تا کاتێك تاوانێکی‌تر نەکات.

**تعليقه:** نامە. بەڵگە، مەدرەك.

**تعليل:** بیانووهێنانەوە، پاساودان، بەڵگەهێنانەوە، سەلماندنی بابەتێك بە بەڵگەوە.

**تعليمات:** كۆی "تعليم"، دەستوور/ بەرنامەی كار، ڕێنوێنییەكان، فێركردنەكان، ڕاهێنانەكان.

**تعليم دادن:** بارهێنان، ڕاهێنان، فێركردن، هووین كرن، هین كرن، هیكرن، هۆژاندن، هەڤۆتن، مەشق پێكردن، دەرس دادان، عاملاندن. "**تعليم دهنده**": فێركار، ڕاهێن، ڕاهێنەر، هینكار.

**تعليم ديدن:** بڕوانە: "تعلّم".

**تعليم ديده:** ڕاهاتوو، ڕاهێندراو، فێركراو، فێرەكاركراو، بارهێنراو، هەڤۆتی، عاملاو.

**تعليم گرفتن:** بڕوانە:"تعلم".

**تعليم و تربيت:** پەروەردە و فێركردن.

**تعمّدی:** لەقەس، لەقەست، بەئانقەست.

**تعمّق:** قووڵ بوونەوە، ڕۆچوون، قووڵ پێداچوونەخوارەوە، وردبوونەوە، دوورنواری.

**تعمّل:** بە سەختی كار ئەنجام دان، سەخڵەتی كێشان.

**تعميركردن:** ئاوەدان كردنەوە، ئاواكردنەوە شیاوی نیشتەجێی كردن. چاكردنەوە، چاكرنەوە، چاك كردنەوە، نووژەنكردنەوە، خۆش كردن، تازەكردنەوە، پینەوپەڕۆكردن.

**تعميركار:** نووژەنكار.

**تعميرگاه:** نووژەنگە.

**تعميق:** قووڵ (كردن/ كردنەوە). ڕۆچوونە ناو بنج و بناوانی بابەتێك و دەرخستنی گۆشە نەناسراوەكانی.

**تعميم:** بەگشتی كردن، هەموویی‌كردن، گشتاندن، گشتگیری/ گشتگری، گشتێتی.

**تعميه:** 1) كوێر كردن. 2) دەربڕینی بابەتێ بە شێوەی مەتەڵ. 3) شاردنەوە و داپۆشینی هەقیقەت بەمەبەستی فریودان.

**تعنّت:** ئازارپێگەیاندن، ئیرادگرتن و سەختگیری كردن، تانەلێدان. ورك گرتن.

**تعنيف:** سەرزەنشت كردن، لۆمەكردن، سەركۆنەكردن. توندوتیژی نواندن دەگەڵ كەسێك لە ڕەفتار یان گوتاردا.

**تعوّد:** هۆگربوون، ڕاهتن، خووگرتن، عادەت كردن، ڕام بوون.

**تعوّذ:** پەنابردن/ گرتن.

**تعويذ:** 1) پەنادان، داڵدەدان، پاراستنی كەسێك. 2) جادوبەن/ جادوبەند، نووشتەی جادوو بەتاڵكەر.

**تعويض:** گۆڕین، گۆڕینەوە، لەجیاتی‌دانان، خستنەبری، خستنەجێ، قەرەبووكردنەوە، تۆڵە بۆ كردنەوە، بژاردن، بۆبژاردن، خستنەوەجێ.

**تعويق:** دواخستن، وەدرەنگ خستن. تەگەرەتێخستن، پەك خستن. "**به تعويق افتادن**": وەدواخران.





**تعويل:** بەدەنگی بڵێند گریان و داوای یارمەتی كردن. متمانە پێكردن.

**تعهّد:** وەئەستۆگرتن، وەخۆگرتن، ڤەخۆگرتن، بەڵێن دان، پەیمان دان، پابەندبوون، دەستەبەر بوون، دەستەبەری، لەمل بوون، گرتنەمل، قەرار، بڕیار، دەروەستی.

**تعهدنامه:** بەڵێن نامە.

**تعيّش:** ژیان بە سەر بردن، خۆش ڕابواردن، خۆشگوزەرانی. هەوڵدان بۆ ئامادەكردنی كەلوپەلی ژیان.

**تعيّن:** (تَ.یُ) بەچاو دیتن و بە یەقین گەیشتن، وەدیهاتنی كارێك یان بابەتێك، گەورەیی و دارایی پەیدا كردن. چۆنیەتی و سفەتی تایبەتی بوونەوەرێ كە لە بوونەوەرەكانی دی جیادەكاتەوە. بەرچاوەكی و هەست پێكراو.

**تعييب:** عەیب داركردن، زەدەداركردن، كەل كردن.

**تعيير:** سەرزەنشت كردن، لۆمە كردن.

**تعيين:** دیاری‌كردن، دەست نیشان كردن، دانان، دامەزراندن. "**تعيين تكليف**": دیاریكردن و دەست نیشان كردنی ئەركی كەسێك. "**تعيين كننده**": چارەنووس ساز، دیاریكەر، دابینكەر. گرینگ، بنەڕەتی.

**تغابن:** زیان پێگەیاندن، یەكتر فریودان لە مامەڵەدا، زیانكاری. "**يوم التغابن**": پەسڵان، ڕۆژی قیامەت.

**تغازل:** دەگەڵ یەك بە غەزەڵ ئاخاوتن، دڵداری، ئەوینداری.

**تغافل:** خۆناشارەزاكردن، خۆلەبێخەبەری دان، خۆنابەڵەدكردن، خافڵ بوون. چاوپۆشی‌كردن.

**تغالب:** بەسەریەك دا زاڵ بوون.

**تغامز:** چاو و برۆ لە یەك هەڵتەكاندن، چاوداگرتن.

**تغاير:** 1) ناتەبابوون، جیاوازی. 2) گۆڕان. 3) ئێرەیی بردن بە یەكتر.

**تغذّی:** خۆراك خواردن.

**تغذيه كردن:** خۆراك (پێدان/ دان)، تێركردن. هێز و وزەدان بە كەسێك و دابینكردنی پێویستییەكانی.

**تغرّب:** دووری كردن، چوونەدوور، دووركەوتنەوە.

**تغريب:** دوورخستنەوە، ناردنە غوربەت.

**تغرير:** خستنە مەترسی و لەناوچوون. خەرۆكردن و فریودان.

**تغريق:** خنكاندن.

**تغريم:** پێ بژاردن، تۆڵە لێسەندن.

**تغزّل:** غەزەڵ خوێندنەوە، هۆندنەوەی هەڵبەستی ئەوینداری، دڵداری‌كردن.

**تغسيل:** شۆردن، شوشتن.

**تغشّی:** داپۆشین.

**تغضّن:** چرچ و لۆچ بوون.

**تغفّل:** بڕوانە: "تغافل".

**تغلّب:** زاڵبوون، زاڵێتی، سەركەوتن. دەست درێژی.

**تغليب:** زاڵ کردن، دەسەڵات پێدان، باڵادەست کردن.

**تغليظ:** وەهەڵە خستن، هەڵە پێکردن.

**تغليط:** خەست کردن، ئەستوورکردن، قسەی زبر گوتن بە کەسێك. پڕعەیارکردن.

**تغليق:** بەستن، داخستن، پێوەدان.

**تغنّج:** ناز و لەنجەولارکردن، مەکرکردن.

**تغنّی:** گۆرانی وتن. بێنیازبوون، تێروتەسەل بوون.

**تغيّب:** لەبەرچاو ون بوون، غەیب بوون، نادیاربوون.

**تغيّر:** گۆڕان، گۆڕیان، هەڵگەڕان(بۆ شیر)، تێك چوون، هەڵچوون، بە توندی و تووڕەیی دوان.

**تغيّظ:** رق هەستان/ هەڵسان، تووڕەبوون، هەڵچوون.

**تغييرات:** گۆڕانکارییەکان.

**تغيير پذير:** شیاوی گۆڕان، گۆڕان هەڵگر، گوهێربار.

**تغييردادن:** گۆڕین، گۆڕانکاری، گوهارتن. "**تغييردادن مسير آب**": هەڵبڕین.

**تغيير سيما:** (شێوە/ روخسار)گۆڕین.

**تغيير شكل:** فۆرم گۆڕین.

**تغييركردن:** گۆڕان، گۆڕین، بارەوباربوون، تێکچوون، جوریان، فارای، وارای.

**تغييرنا پذير:** نەگۆڕ، نەگوهێر، گۆڕان هەڵنەگر، دوور لە گۆڕان.

**تفاحش:** جنێو/ جوێن دان، کاری دزێو کردن، سنووری خراپە و ناحەزی تێپەڕاندن.

**تفاخر:** خۆهەڵکێشان، نازین، بەخۆفشین، خۆهەڵنان، بە خۆدا هەڵگوتن. شانازیکردن.

**تفادی:** دوورکەوتنەوە، خۆپاراستن، خۆلێ نەدان.

**تفارق:** جیابوونەوە، جیایی.

**تفاريق:** پاژە لێك بڵاوەکان. "**بە تفاريق**": پاژپاژ، جیاجیا، کەمەکەمە، بەشێوەی پەرتەوازە و نارێکوپێك.

**تفاسخ:** هەڵوەشاندنەوە.

**تفاسير:** کۆی" تفسير".

**تفاصح:** زمان لووسی، تەڕزوانی، چەورزوانی، زمان پاراوی.

**تفاصيل:** کۆی"تفصيل".

**تفاضل:** بەسەردابوون/ لەسەرتربوونی شتێك بە سەر شتێکی دیدا.

**تفاعل:** کارلێك کردن، کارلێك کران.

**تفاله:** تڵفار، تڵفە، تلپە، تڵتە، ملت، ملتە، تۆفاڵ، خڵت، خڵتە، لیتە، لیرد، سلپ. کەسی پەست و بێنرخ.

**تفاوت:** جیاوازی، جودایی، لە یەکتر دوورکەوتنەوە و جیابوونەوە.

**تفاهم:** لێك تێگەیشتن، لە مەبەستی یەك گەیشتن، لێك حاڵی بوون، سازان دەگەڵ بیر و داخوازی و سەلیقەی یەکتر. "**حسن**





**تفاهم**": بە چاکی لە قەستی یەکتر گەیشتن. "**سۆتفاهم**": خراپ لێك گەیشتن.

**تفاهم كردن:** سازان، پێکهاتن، لەڤ هاتن.

**تفاؤل:** گەش بینی، هیواداری. فاڵ گرتنەوە.

**تفتّح:** کرانەوە، واڵابوون.

**تفتگی:** گەرمی، داغی، داغ بوون. پەشۆکان. کوتران.

**تفتن:** سووربوونەوە لە ئاگر دا، داغ بوون. تووشی خەم و تووڕەیی یان وروژان هاتن.

**تفته:** سوورەوەبوو، زۆر داغ. نارەحەت. شەرمەزار، تەریق. فرە توونی.

**تفتەجگر:** ئەویندار، دڵسووتاو/ زۆر بە تاسە.

**تفتەدل:** دڵ تەنگ، دڵشکاو، رەنجێنراو.

**تفتيت:** وردکردن، وەراندن، داوەشاندن.

**تفتيح:** کردنەوە، واڵاکردن.

**تفتيدن:** گەرم بوون/ بوونەوە، سووربوونەوە، توانەوە.

**تفتير:** سست کردن، لاوازکردن، بێهێزکردن.

**تفتيش:** سەچت، ڤەلۆ، پشکنین، گەڕان بە شوێن...، وردبوونەوەو گەڕیان بە شوێن شتێك دا، پیاگەڕان. "**تفتيش بدنی**": گەڕان و پشکنینی جلوبەرگ و گیرفانەکانی کەسێك. "**تفتيش عقايد**": بڕوانە: "انگيزيسيون.".

**تفتيش كردن:** پشکنین، دۆزین، گەڕین، گەڕیان بە شوێن شتێك دا، لێ گەڕان، سەچتین، ڤەلۆکرن، هل کەوشاندن.

**تفتين:** ئاژاوەنانەوە، ئاژاوەگێڕی، گێرەشێوێنی، فەرتەنە نانەوە، پیلانگێڕی.

**تفجير:** تەقاندن، ترەقاندن. بە خوڕکردنی ئاو.

**تفجيع:** کارەسات بارکردن، دڵتەزێن کردن، بەڵالێدراوکردن.

**تفحّص:** پشکنین، گەڕان، لێکۆڵینەوە، کۆڵینەوە، توێژینەوە.

**تفحيش:** بەدبێژی، بەدگۆیی، جوێن دان، خراپ گوتن، ئابڕووبردن، ناوزڕاندن.

**تفخيم:** گەورەکردن، بە گەورە زانین، رێزگرتن.

**تفرّث:** پرژوبڵاوی. دڵ بەیەکاهاتنی ژنی دووگیان.

**تفرّج:** بابیاڵدان، گەڕان لەدەشتو دەر بۆ حەسانەوە و خەم رەواندن، سەیرانکردن. خەم بەبادان، خەم رەواندن. تواشا.

**تفرجگاه:** سەیرانگا، شوێنی سەیران. تواشاگە.

**تفرّد:** تاك بوون، تاقانەبوون، تاق گەڕێتی، تاك گەڕێتی. بێهاوتابوون، بێهاوتایی.

**تفرّس:** بە زیرەکی و هوشیاری تێگەیشتن و حاڵی بوون لە شتێك.

**تفرّع:** لك لك بوون، شاخەشاخەبوون، لك لێبوونەوە، پەلوپۆهاویشتن.

**تفرعن:** (تَ.فَ.عُ) فیز و دەعیە و خۆنوێنی کردن، زوڵم و ستەم کردن. یاخیگەری.

**تفرّغ:** لێ بوونەوە، لە کار بوونەوە. ئامادەبوون بۆ کارێك.

**تفرّق:** جیابوونەوە، بڵاوبوونەوە، لێك هەڵوەشان. "**تفرق کلمە**": پەرتەوازەیی و جیایی تاکەکان یان دەنگەکان. "**تفرق الاتصال**": برین یان شکاوی.

**تفرقە:** 1) جیاکردنەوە، جیاکاری. 2) بڵاوبوون، پەرتەوازەیی. 3) جیایی، دووری. 4) ناکۆکی، دووبەرەکی، ناتەبایی. 5) پەرێشانی، پەشێوی، بیربڵاوی. 6) خافڵ بوون لە هەق و رووکردنە کاروباری دنیایی. 7) جیاوازیدانان. 8) بڵاو، پەرتەوازە، پەرێشان. 9) بەش کردن، دابەش کردن. "**تفرقەخاطر**": پەرێشانی، پەشێوی.

**تفرقەاندازی:** جیاوازی نانەوە، ناکۆکینانەوە، دووبەرەکی نانەوە، لێك کردن، لێككردنی کەسەکان.

**تفریج:** لەناوبردنی خەم و پەژارە، خەم و کەسەر رەواندن.

**تفریح:** شادمانی، خۆشحاڵی. سەیران. سەرگەرمی و کات رابواردن.

**تفریح گاە:** سەیرانگا.

**تفرید:** 1) بوونە فەقێ. 2) تاقانە کردن. 3) گۆشەگیری، دوورەپەرێزی. 4) بەتاك زانینی خودا.

**تفریض:** وردە وردە واجب کردنی شتێك. جیاجیاکردنەوە، ئاشکراکردن.

**تفریط:** درێخی کردن. لەکیس دان، لەکیس چوون، زایەکردن، خەسارکردن، بەفیڕۆدان. کەمیّ، کەمووسکەیەك، کەمەکیّ.

**تفریق:** 1) بڵاوکردنەوە، جیاکردنەوە، دابڕاندن، دابڕکردن. 2) کەمکردن. 3) لێك جیابوونەوە، جیایی. 4) بڕوانە: "پخش کردن".

**تفزیع:** ترساندن، تۆقاندن.

**تفساندن/ تفسانیدن:** سوورکردنەوە، داغ کردن، زۆر گەرم کردن.

**تفسّح:** ئاوالاکردن، پەرەپێدان.

**تفسّخ:** 1) پارچەپارچەبوون، وردوردبوون، لەناوچوون، لێك هەڵوەشان. 2) رزان، داڕزین، داوەشان.

**تفسید:** رزاندن، گەناندن، زایەکردن.

**تفسیدن:** بڕوانە: "تبسیدن".

**تفسیر:** لێکدانەوە، ماناکردنەوە، مانالێدانەوە، واتا شیکردنەوە، شیکردنەوەی پاژبەپاژی بابەتێ بۆ روون بوونەوەی ماناکەی و دوامەبەستی بێژەرەکەی، روونکردنەوە و ئاشکراکردنی مانای گوتەیەك، راڤەکردن، وەرزین، وڵامە، وێرە، راژە، راوە، وەڵامە. "**تفسیر بە رأی**": لێکدانەوەی قورئان بەپێی زەوق و بڕوای کەسێنی. لێکدانەوەی قسە یان بابەتێ بە مەیلی خۆ.

**تفسیری:** لێك دانەوەیی، راڤەیی.

**تفسیق:** بە بەدکار و تاوانبار لە قەڵەم دان.

**تفشەگر:** بڕوانە: "گواژەگر".

**تفصّی:** رزگاربوون لە دژواری و تەنگانەیی، رزگاری. کونج کۆڵی کردن. "**تفصی جستن**": رزگاربوون. "**تفصی کردن**": خۆکێشانەوە لە تەنگوچەڵەمەی کاریّ، رزگاربوون.

**تفصیل:** 1) دەربڕینی بابەتێ بەتێروتەسەلی. 2) پارپارکردنی کتێب و شیکردنەوەی بابەت. 4) درێژەپێدان و لەسەر رۆیشتن، درێژ کردنەوە، لەدوودوان. 5) جیاکردنەوە، دابڕاندن. 6) سیایی، فاکتۆر، لیستە. "**تفصیل دادن**": بەتێروتەسەلی باس کردن، شرۆڤەکردن. "**بەتفصیل**": بەتێروتەسەلی، بە دوور و درێژی، بە وردەکارییەکانییەوە.

**تفصیلی:** تێروتەسەل. راڤەکراو.

**تفضیح:** ناوزڕاندن، ریسواکردن.

**تفضیض:** زێو کفت کردن.

**تفضیل:** بە چاکتر/ باشتر زانین.

**تفطّر:** بڕوانە: "ترك برداشتن".

**تفطّن:** بە زیرەکی و هوشیاری لە بابەتێك گەیشتن، بلیمەتی.

**تفطین:** تێگەیاندن، زاناندن، حاڵی کردن.

**تفقّد:** لێ‌پرسین، لێ‌پرسینەوە، بەسەرکردنەوە، سەرلێدان، مشوور لێخواردن، دڵنەوایی کردن.

**تفقّە:** فێربوونی زانستی ئایینی، بوونە فەقێ.

**تفکّر:** تێفکرین، بیرکردنەوە، متاڵا لەسەرکردن، رامان.

**تفکّرآزاد:** بیرکردنەوەی ئازاد.

**تفکّرانگیز:** هزرورووژێن، بیر وروژێن.

**تفکّرفلسفی:** بیرکردنەوەی فەلسەفی.

**تفکّرمجرد:** بیرکردنەوی رووت.

**تفکّرمنطقی:** بیرکردنەوەی لۆژیکی، هشاندن.

**تفکّك:** لێك جیابوونەوە، لێك بوونەوە، لێك هەڵوەشان، شیبوونەوە.

**تفکە:** سەرگەرم بوون و چێژبردن.

**تفکیك:** جیاکاری، جیاکردنەوە، لێك کردنەوە، هاوێر کردن، لێك هەڵوەشاندن، هەڵاواردن. (شیمی) شکانی مولوکول یان یۆنێك و دابەش بوونی بە مولوکول یان یۆنی تر.

**تفکیك داشتن:** جیابوون.

**تفکیك شدە:** هاوێر کراو، جیاکراوە.

**تفکیك قوا:** جیابوونی سێ دەسەڵاتی یاسادانان و دادپەروەری و بەڕێوەبردن لەیەکتر.

**تفکیك ناپذیر:** هاوێرنەکراو، جیانەکراوە، دانەبڕاو.

**تفکیکی:** شیاوی جیاکردنەوە، ئەوەی بۆ جیاکردنەوە دەبێ.
**تفنگ انداختن:** هاویشتنی گوللە بە تفەنگ، تەقەکردن.
**تفنّن:** هونەر نواندن، هونەرمەندی، بە کارێکەوە خەریك بوون، خۆڕانان، خەریکی، سەرگەرمی، خۆشی.
**تفنید:** درۆ و لاوازی و پیری و کەم ئاوەزی رەپاڵ کەسێك دان. بە درۆ خستنەوە.
**تفوّذ:** هاتنەناوەوە، خۆخزاندنە ژوورەوە، رەخنەکردن.
**تفوّق:** بەسەردابوون، باڵادەستی، سەرکەوتن، زاڵ بوون، زاڵی.
**تفوّق آمیز:** باڵادەستیانە.
**تفوق جویی:** خوازیاری زاڵێتی و لەسەرتربوون.
**تفوّه:** قسەکردن، دوان، ئاخاوتن، پەیڤین. نقاندن، نقەکردن.
**تفویض:** پێ سپاردن، سپاردن، راسپاردن. سەرپشك کردن. حاڵەتی خۆویستانەی مرۆ بۆ ئەنجامدانی کارێك یان وازلێهێنانی.
**تفویضی:** راسپاردەیی.
**تفهّم:** تێگەیشتن، سەرلێدەرکردن، حاڵیبوون، فامین.
**تفهّم انگیزەای:** تێگەیشتنی پاڵنەرانە/ هاندەرانە.
**تفهّم بالفعل:** تێگەیشتنی چالاك/ کردەکیانە.
**تفهّم تبیینی:** تێگەیشتنی روونکەرەوانە.
**تفهّم گرا:** تێگەیشتن/ فامین خواز.
**تفهّم مشاهده‌ای:** تێگەیشتنی بینینانە.
**تفهّم ناقص:** سەقەت تێگەیشتن، تێگەیشتنی ناتەواو، کاڵفامی.
**تفهیم:** تێگەیاندن، حاڵیکردن، ڤەپێچرین، ڤەوەراندن، نیشان دان، روون کردنەوەی مەبەستێك.
**تفیدن:** سووربوونەوە/ کردنەوە، گەرم بوونەوە/ کردنەوە، داغ بوون/ کردنەوە.
**تقاء:** پارێزکردن، خۆپاراستن، خۆپارێزی.
**تقابل:** 1) رووبەڕووبوونەوە، بەرەنگاربوونەوە، لەبەریەك راوەستان، بەرامبەرێتی. 2) بڕوانە: "تضاد". 3) بڕوانە:"طباق".
**تقابلهای دوگانه:** دوانە لێکدژەکان.
**تقاتل:** یەکتر کوشتن، دەگەڵ یەك شەڕ کردن، لە یەك دان.
**تقادم:** لەمێژینە، لەمێژینەیی.
**تقارب:** لێك نزیك بوونەوە. (بیرکاری) تێپەڕینی چەند هێڵ لە خاڵێکەوە. نزیکی، خزمایەتی.
**تقارظ:** پێك داهەڵگوتن ، یەکتر ستایش کردن، پەسنی یەکترکردن.
**تقارن:** 1) هاوکاتبوون، هاوکاتی. 2) لێکنزیکی، هاوخشتی. 3) لە بیرکاریدا: وێنەدانەوە.





**تقاسم:** 1) سوێندخواردن. 2) دابەش کردن.
**تقاصر:** درێخی کردن، تەنەخیکردن، کەمتەرخەمی، خەمساردی.
**تقاص گرفتن:** تۆڵە سەندنەوە، قەرەبوو کردنەوە. "**تقاص پس دادن**": سزادران، خەسارەت دان.
**تقاضا:** داواکاری، داوا، خوازە، سکاڵا، خواستن، خوازتن، تکاکردن. "**عرضە و تقاضا**": دەرخستن و خواستن. "**تقاضا می‌کنم**": تکا دەکەم.
**تقاضای کتبی:** خوازنامە.
**تقاطر:** دڵۆپ دڵۆپ/ تنۆك تنۆك تکان/ بارین، لە دوای یەك هاتن.
**تقاطع:** چوارڕێیان. ئێك بڕین، یەکتر بڕین، یەك بڕین.
**تقاعد:** 1) بڕوانە: "بازنشستگی". 2) دریغیکردن.
**تقاعس:** 1) خۆبواردن لە ئەنجام دانی کارێك، بە قون داخستن. 2) سنگ دەرپەڕین و پشت رۆچوون.
**تقالید:** دابونەریت.
**تقامر:** دەگەڵ یەك گرێو و قومارکردن.
**تقاوی:** 1) پێش مز دان بە کرێکار یان وەرزێر. 2) بنەتۆو.
**تقبّض:** گرژبوون، چوونەوە یەك، هەڵقرچان، گرمۆڵەبوون.
**تقبّل:** 1) قبوڵ کردن، رازی بوون، وەئەستۆگرتن، وەرگرتن. 2) دیاری، پێشکەشی.
**تقبیح:** بە درێو و ناشیرین لەقەڵەم دان، بەتوندی ئیدانە کردن.
**تقبیل:** ماچ کردن، راموسان.
**تقدّس:** پاك بوونەوە، پاقژبوونەوە. پاکی، پیرۆزی.
**تقدّم:** پێشکەوتن، بەرەوپێش چوون، پێشڤەچوون. (فەلسەفە) ئەولەوییەت.
**تقدم جستن:** کەوتنەپێشەوە، کەوتنەبەرەوە.
**تقدم داشتن:** لەپێشتربوون، لەبەرتربوون. لەسەرتری.
**تقدّم گرایی:** پێشکەوتنخوازی.
**تقدمه:** 1) پێشکەوتن، بەرەوپێش چوون. 2) دیاری، خەڵات، پێشکەشی.
**تقدم یافتن:** کەوتنەپێشەوە.
**تقدیر:** 1) خەملاندن، هەڵسەنگاندن، نرخاندن، قەبلاندن، مەزندەکردن، دیاریکردن. 2) پێزانین، رێزگرتن، رێزلێنان. 3) چارەنووس. 4) قەزا و قەدەر، قەڵەملێدان. 5) بڕوانە: "محاسبە". 6) لابردنی شتێ لە ئاخاوتە و هێشتنەوەی لە زەین دا. "**بە هر تقدیر**": بەهەرحاڵ، بەهەر چۆنێك.
**تقدیرآسمانی:** چارەنووس، قەزاوقەدەر.
**تقدیر ازلی:** چارەنووسی لەپێش دا دیاریکراو و بێئەملاوئەولا.
**تقدیر الاهی:** چارەنووسێ کە خوا بۆ بوونەوەرانی دیاری کردوە، چارەنووسی خودایی.
**تقدیرزدایی:** چارەنووس سڕینەوە.

**تقديركردن:** 1) ڕێزگرتن، ڕێزلێنان. 2) لە پێشەوە دیاریکردن. 3) هەژماردن، حەساوکردن، ئەنازەگرتن. 4) وێناکردن، وادانان. 5) گرفتاری قەزاو قەدەربوون، تووشی بەڵابوون.

**تقديرگرايى:** بڕاو بەقەزاوقەدەر، قەدەر گەرێتی.

**تقديس:** پاك/پاقژ کردن. بە پاکی ستایش کردن.

**تقديم:** پێشکەش کردن. خستنەپێش، پێش خستن، بردنەپێش. بەکردەییکردن، خستنە قۆناغی کردەیی‌یەوە. "**تقديم افتادن**": ئەنجام بوون، جێبەجێبوون. "**تقديم رفتن**": ڕەعەمەل هاتن، بەکارهاتن. "**تقديم و تأخير**": پاش و پێش خستن. "**تقديم يافتن**": کەوتنەپێشەوە، کەوتنەبەرەوە. "**بەتقديم رساندن**": بەجێهێنان، ئەنجامدان.

**تقديمى:** 1) پێشکەشکراو. 2) دیاری، پێشکەشی.

**تقذّر:** بە پیس و چەپەڵ دانان.

**تقرّب:** نزیکبوونەوە، نزیکەوەبوون، نزیکی کردن، تخون کەوتن. خزمایەتی.

**تقرّر:** ئارام بوون، داسەکنان، سەقامگیربوون. بڕیار لە سەردان.

**تقريب:** لێك نزیك، نزیك بوون، نزیك کردنەوە. "**تقريب اضافى**": کەمێ زۆرتر لە ڕادەی ڕاستەقینە. "**تقريب نقصانى**": کەمێ کەمتر لە ڕادەی واقیعی. "**بەتقريب**": نزیکەی. نزیك بە. لای.

**تقريباً:** نزیکەی، کەم و زۆر، تارادەیەك.

**تقريبى:** خەملێ کراو، قەبڵاو، خەملێندراو، گۆترەیی، لێكنزیك.

**تقرير:** 1) دەربڕین، درکاندن، دانپیانان، هەڵڕشتن، پێدرکاندن. 2) بڕیاردان، دیاریکردن، دانان. 3) دامەزراندن، جێگیرکردن. 4) خوێندنەوە.

**تقريض:** بڕین، قرتاندن. پێداهەڵگوتن یان زەم کردنی کەسێك.

**تقريظ:** پێداهەڵگوتن، ستایش کردن.

**تقريع:** تانووت لێدان، بە توندی سەرزەنشت کردن.

**تقسّم:** پڕش و بڵاو بوون/ کردن، پڕژوبڵاوی، پەرتەوازەیی. "**تقسم خاطر**": دڵ نیگەرانی.

**تقسيط:** جوێکردنەوە، بەش بەش کردن، دانەوەی قەرز لە چەند بەشی دیاریکراودا.

**تقسيمات:** ئەو شتانەی دابەش بوون، پارچەکان، بەشەکان.

**تقسيم:** دابەشکردن، بەش کردن، بەش بەش کردن، بەهرکردن، پارکردن، پارڤەکرن، لەڤاکرن، گەڕاندن(ئاوی بە سەر خەڵکا دەگەڕاند). "**تقسيم اراضى**": دابەشکردنی زەوییە زەرعاتییەکان لە نێوان جووتێرەکان دا. "**تقسيم تراضى**": دابەش کردنی دارایی نێوان هاوپشکەکان بە مەیلی خۆیان. "**تقسيم سلولى**": زاوزێی خانەکان لە ڕێگەی دابەش بوونەوە. "**تقسيم كار**": سپاردنی کارگەلی جۆراوجۆر بە تاکەکان بەپێی توانایی و پسپۆڕی، دابەش کردنی کار.





**تقسيم بندى:** دابەشکاری، دابەشین، بەش بەش کردن، قات بەندی یان جیاکردنەوە.

**تقسيم پذير:** دابەش بوو، باربەش.

**تقسيم كننده:** بەشکەر، پارکەر.

**تقسيم نشدنى:** دابەش نەبوو، شتێ کە بۆ دابەشکردن نەشێ.

**تقشّر:** پێست و تێکوڵ فڕێدان، توێبوون. گرۆیی بەرەو ڕواڵەتی شتێ.

**تقشير:** پێست و تێکوڵ لێکردنەوە، پاك کردن، پێست داماڵین.

**تقصّى:** دوورکەوتنەوە، بەو پەڕی شتێك یان بابەتێك گەیشتن.

**تقصير:** 1) کورت کردنەوە. 2) درێخ، درێخی، درێغی، قوسوور، کۆتایی، کورتی. 3) هەڵە، گوناح، تاوان، سووچ. "**تقصير افتادن**": درێغی و خاوەخاوی لە کاریێدا، گوێپێنەدان. "**تقصير خدمت**": درێغی و قوونەقوون کردن لە ئەنجامدانی خزمەت دا. "**تقصيررفتن**": درێغی و خاوەخاوکران.

**تقصيركار:** بڕوانە:"مقصر".

**تقصيرى:** دەست بەتاڵی، دەست تەنگی، هەژاری. کەمتەرخەمی.

**تقضّى:** تێپەڕین، تەفروتوونابوون.

**تقضيه:** پێڕاگەیشتن بە پێداویستی و داواکاری کەسێك.

**تقطّر:** دڵۆپ دڵۆپ تکان، لێچوون، لێچۆڕان.

**تقطّع:** بڕان، بڕیان، لەت لەت بوون، پچکڕان، پچڕان، بەش بەش بوون.

**تقطيب:** رووترش کردن، نێوچاوان تێکنان.

**تقطير:** تکاندن، دڵۆپاندن، داچۆڕاندن. (لە کیمیادا) جیاکردنەوە.

**تقطيع:** 1) بڕگەدانان. 2) پارچەپارچە کردن، پەلپەل کردن، لەت و پەت کردن، دابڕین.

**تقطيف:** 1) میوەچنین، بڕینی هێشووی ترێ. 2) رووشان.

**تقعّر:** ناوقووڵ بوون، ناوچاڵ بوون. ئاخاوتن لە ناخی قوڕقوڕۆچکەوە.

**تقعير:** ناوقووڵ کردن، قولۆر کردن. قووپانی ئەندامەکانی لەش.

**تقفّل:** داخران، پێوەدران، کلۆم دران، قفڵ دران، ژەنیان.

**تقلاّكردن:** تەقالادان، هەوڵدان.

**تقلّب:** 1) گۆڕان، وەرچەرخان، وەرگەڕان، تێکچوون، شێوان. 2) فێڵبازی، ناڕاستی، دەغەڵی، قۆپیە، غەش، ساختەکاری، دەستکاری، دەست تێوەردان.

**تقلّبى:** تەزویر، ساختەیی، دەسکرد، جەڵەبی، جەڵەوی. نەهێژا، کەم نرخ.

**تقلّد:** وەئەستۆگرتن. قلاّتە/ قەلاّدە دە مل کردن.

**تقلّص:** وێکهاتن، ڕێکهاتن، گرژبوون، کرژهەلاّتن، کرژبوون، هەڵقرچان، چوونەیەك، چوونەوە یەك، فلین.

**تقلیب:** هەڵگێڕانەوە، هەڵگەڕاندنەوە، ئاوەژووکردن، وەرگێڕان، وەرگەڕاندن، ژێرەوژوورکردن.

**تقلید:** 1) ملوانکە دە مل کردن. 2) کار خستنە ئەستۆی کەسێك. 3) لاسا، لاسایی، گێراڤە، دەمەلاسکە، دەمەلاسکێ، دتەر، ئەنجامدانی کارێك بە شێوازی دیتران. "**اهل تقلید**": بڕوانە: "مقلد".

**تقلید درآوردن:** بڕوانە: "تقلیدکردن".

**تقلیدکردن:** چاولێکردن، چاولێکەری، لاسایی، لاسایی کردنەوە، چاڤ لێکرن، چاولێبڕین، وەدووکەوتن، پێڕەویکردن.

**تقلیدی:** 1) لاساییکەرەوەیی، لاساییکارانە. 2) بڕوانە: "مقلد".

**تقلیع:** لەڕەگ و ریشە دەرهێنان، ریشەکێش کردن. بە مۆدەکردنی سەر.

**تقلیل دادن:** کەم کردنەوە، داشکاندن، دابەزاندن.

**تقلیل گرا:** دابەزین/ داشکان خواز.

**تقلیل گرایی:** دابەزین/ داشکان خوازی.

**تقلیلی:** روولەدابەزین، روولەداشکان.

**تقلیل یافتن:** داشکان، کەم بوونەوە، دابەزین.

**تقنیع:** رازیکردن، قانع کردن.

**تقنین:** یاسادانان، دەستووردانان، یاسانووسین.

**تق و توق:** تەق و پۆق، تەق و تۆق، تەقەتەقی زۆر.

**تقوا:** خۆپارێزی، پارێز لە خراپەکاری بە دڵ و لەش، لە خراپە لادان. لە خواترسان. خواپەرستی.

**تقوّی:** بەهێزبوون، هێزداربوون.

**تقویت:** بەهێزبوون، بەهێزکردن، وزەپێدان، هێزبەخشین، توانایی پێدان، تین پێدان، مزورکردن، شیاندن. "**تقویت کننده**": وزەدەر، وزەبەخش، هێزپێدەر، هێزنك، تین و گوڕ بەخش.

**تقویتی:** بڕوانە: "تقویت کننده".

**تقویم:** 1) راست کردنەوە، لەچەماوەیی رزگار کردن. 2) نرخ دیاری کردن، نرخاندن، هەڵسەنگاندن. 3) رۆژژمێر، رۆژئەژمێر، رۆژبژێر، ساڵ پێو، ساڵنامە.

**تقهقر:** (تَ.قَ.قُ) بەرەودواوە کشان، بەرەودواوە گەڕانەوە، پاشەوپاش گەڕانەوە، بەزین، هەلاّتن لە شەڕدا.

**تقیّ:** خۆپارێز، لە خواترس.

**تقیّد:** پابەندبوون، پابەندی، خۆبەستنەوە. لە بەندیخانە دا بوون، یەخسیربوون.

**تقیّه:** 1) تەقیە، بیر و بڕوا وەشاردن لە کن شێعە، خۆ بە هاوئایین نیشان دان بە مەبەستی گیان پاراستن. 2) خۆپاراستن، خۆبواردن.





**تقیید:** پابەندکردن، دەرۆست کرددن. راگرتن، پاراستن. خستنە زیندانەوە.

**تقییم:** بەهاکاری، نرخ بۆ بڕینەوە، نرخاندن، خەملاّندن، هەڵسەنگاندن.

**تك:** لاپەڕ، تەنیا(باڵ)، تاق، تاقانە، کەم، کەموکە.

**تکابر:** فیز، لووت بەرزی. گەورەیی کردن.

**تکاپو:** گەڕان، راکردن، هاتوچۆی بەپەلە، بە دوای شتێك دا بە هەموو لایەك دا گەڕان، هەوڵدانی چڕ و بەربلاّو، هاتوچۆ و زۆر ماندوو بوون لە شوێن کارێك، جموجۆڵ، هەلوەلا. "**بەتکاپوافتادن**": دەست بە چالاکی کردن، وەجموجۆڵ کەوتن.

**تکاتب:** نامەگۆڕینەوە، نامەکاری، نامە بۆ یەکتری نووسین.

**تکاثر:** زۆربوون، فرەبوون.

**تکاثری:** بڕوانە: "فزاینده".

**تکاثف:** 1) خەست بوونەوە، ، چڕبوون و قەبەبوونەوە. 2) کەم بوونەوەی بارستایی شتێ بەبێ ئەوەی شتێکی لێکەم بێتەوە. 3) بڕوانە: "چگالی".

**تکاذب:** درۆکردن دەگەڵ یەکتر.

**تکاذیب:** بڕوانە: "اکاذیب".

**تکاسل:** سستی، خاوی، تەوەزەلی، تەمبەڵی.

**تك افتادن:** تەك کەوتن، تەنیا کەوتن/ کەوتنەوە، بەتەنێ مانەوە.

**تکافؤ:** بەرامبەرێتی، هاوتایی، هاوشانی.

**تکافل:** بوونە (دەستەبەر/ زامنی) یەکتر، گەرەنتی کردنی یەکتر.

**تکافی:** قەرەبووکردنەوە. هاوتاو بەرابەربوون.

**تکالیف:** کۆی"تکلیف"، ئەرکەکان. چەرمەسەرییەکان، دژوارییەکان. مالّیات. "**تکالیف شرعی**": دەستوور و بڕیارە دیاریکراوەکان لەلایەن شەرعەوە، ئەرکە شەرعییەکان.

**تکامل:** گووران، کاملّبوون، بەرەو کاملّی چوون، گەشەسەندن، پێگەیشتن، تەواوبوون. "**تکامل تدریجی**": کامڵ بوونی پلەبەپلەیی، وردەوردە کامڵ بوون. "**تکامل دادن**": گوورانـدن، کامڵ کردن. "**تکامل گرایی**": گەشەخوازی.

**تکامیشی:** بڕوانە: "تعقیب".

**تکان:** جووڵە، جووڵانەوە، بزووتن، چرکیان، تەکان، تەکوەك، دەکو، تل، نەتر، رەت، ریپ. "**تکان شدید**": راتەکان، راتڵەکان، راوەش، راوەشان، راوەشین، وەشان. "**به شدت تکان دادن**": هەژاندن.

**تکان خوردن:** بزووتن، بزوان، جوولاّن، جوولاّنەوە، وەجووڵەکەوتن، جووڵەتێکەوتن، راژان، هەژان، هەژیان، هەژین، ڤەشەقان، چرکیانەوە، زیویان، گلان، گلیان، نەترەدان، رەت بردن، تەکان خواردن، هەڵخڕان، هەڵخڕیان. "**تکان خورده**": بزووتو، بزاوتوو، جوولاّو، تەکان پێ دراو، گلیاو.

**تکان دادن:** جوولاندن، جوولاندنەوە، بزواندن، بزاوتن، تل پێدان، گۆت دان، دەلەك دان، راژاندن، لەرانەوە، ڤەشەقاندن، شلەژاندن، تەكان پێدان، گۆت دان، دەلەكدان، هەژاندن، راوەشاندن، هەزاندن، لەراندن، وەلەرەلەر خستن، گلاندن، گلدان، راقوتان، راتلەقاندن، راتلەكاندن، هەلخڕاندن، هەلخلاندن، گجگاندن، نەتراندن، ڤژاندن، ڤەهەژاندن. "**تکان دادن شدید**": راتەكاندن، راوەشاندن، هەژاندن.

**تکاندن:** 1) داتەكان، داتەكیان، داتەكین، سەر بەرەو خوار راوەشان.2) راوەشاندن، تەكاندن، هەلتەكاندن، ڤەپەژكاندن، ڤەتەكاندن، زیوانن. بۆ مانای زیاتر بڕوانە "تكان دادن".

**تکان دهنده:** 1) تەكێن، تەكێنەر، راوەشێن. 2) دلتەزێن، هەژێنەر، رووداوی تالّ و ناخۆش، گورچوبڕ.

**تکاننده:** راوەشێن، تەكێنەر.

**تکانه:** ئەنازەی جوولە.

**تکانیدن:** بڕوانە: "تكاندن".

**تکاهل:** كەمتەرخەمی.

**تکبّر:** بەخۆ فشین، خۆ بە (زیاد/ زل) زانین، فیس، فیسە، فیز، تڕوفیز، تڕزلی، دەعیە، قاپانی، لووت بەرزی، لووت بلندی، ملّق، بادی هەوایی، بەدەماری، لەخۆگۆڕاوی، هەرەی، مەنەر، كەپ.

**تك بعدی:** تاك رەهەندی.

**تکبود:** بڕوانە: "فردیّت".

**تکبیر:** گەورەكردن، گەورەكردنەوە، "اللّهاكبر" گوتن.

**تك پا:** كاتێكی كەم و كورت.

**تك تاز:** بڕوانە: "یكەتاز".

**تك تك:** تاك تاك، تاق تاق، یەك یەك، یەك یەكە، كت بكت.

**تکتّل:** كۆبوونەوە، تۆپەلّ بوون، كەلەكەبوون، چڕبوونەوە.

**تك تیرانداز:** نیشانەئەنگێو، تیرهاوێژی زانا و كارامە، سەگوان.

**تکثّر:** زۆر بوون، فرەبوون، پەرەسەندن، زۆرینەیی.

**تکثرصدایی:** فرەدەنگی، پۆلیفۆن.

**تکثرگرایی:** بڕوانە: "پلورالیسم".

**تکثیر:** زۆر كردن/ بوون، فرە كردن/ بوون. لێگرتنەوە، كۆپیكردن. بەرهەم هێنانەوە.

**تك چهره:** پۆرترە.

**تکحّل:** كل لە چاوكردن، چاوڕشتن.

**تکدّر:** دلتەنگ بوون، زویر بوون. لێلّ بوون، لێلّی.

**تکدّی:** سوالّكردن، گەدایی، دەرۆزە.

**تکدیر:** زویر كردن، رەنجاندن. تاریك و لێلّ كردن.

**تکذّب:** خۆ بە درۆزن لە قەلّەم دان.

**تکذیب:** بەدرۆ خستنەوە، حاشا كردن.





**تکرار:** دووپات (كردنەوە/ بوونەوە)، دووپاتەكردن، دووبارە (كردنەوە/ بوونەوە)، دووبارەپات، سەرلەنوێكردنەوە.

**تکرّر:** دووپات بوونەوە/ كرانەوە، دووبارەبوونەوە/ كرانەوە. دوودلّ بوون.

**تك رساله:** نامیلكە تاك.

**تکرّم:** گەورەیی و جوامێری و پیاوەتی نواندن. رێزگرتن.

**تك روی:** تاك رەوی، سەرەڕۆیی.

**تکریم:** رێزگرتن، رێز لێنان.

**تك زدن:** 1) دەندووك لێدان. 2) شێلگیرنەبوون، بە نیوەچلّی جێهێشتن. قامك یان زمان دان لە شتێ.

**تکسّر:** شكان، تێك شكان، وردبوون. لاوازی جەستەیی. هەست بە سەرما و لەرزین كردن. دلّشكاوی، خەمباری.

**تك سلولی:** 1) ژووری تاكەكەسی. 2) تەك خانەیی، یەك خانەیی، بوونەوەرێك كە لەشی تەنیا لە یەك خانە پێك هاتبێ، بەرامییۆم.

**تك سوار:** تاكە سوار.

**تکسیر:** تێك شكاندن، ورد ورد كردن. روو، رووبەر.

**تکشیف:** ئاشكراكردن، خویاكردن، رووت كردن، ناچاركردنی كەسێك بە دۆزینەوەی شتێك.

**تکعیب:** سێ جا دروستكردن، چوارگۆشە دروست كردن. پڕكردنی كاسە. گەیاندنی ژمارەیەك بە توانی سێ.

**تك صدا:** تاك دەنگ.

**تك صدایی:** تاك دەنگی، مۆنۆلۆگ.

**تك فام:** لە یەك رەنگ. تاك رەنگ.

**تکفّل:** دەستەبەری، دەستەبەربوون، بوونە زامن، بەرعۆدەبوون، دەروەست بوون، وەئەستۆ گرتن، وەخۆ گرتن، وە مل گرتن، لە ملە خۆگرتن، خستنە پای خۆ.

**تکفیر:** 1) داپۆشین، كەفارەت دان، تۆلّەی تاوان دان. 2) بە خوانەناس و بێدین لە قەلّەم دان، كافراندن.

**تکفین:** كفن كردن، كۆچ پۆش كردن.

**تك قافیه:** تاك سەروا.

**تك قطبی:** تاك جەمسەری.

**تك گویی:** تاك بێژی، خۆبێژی، مۆنۆلۆگ.

**تکلام/تك كلام:** قسە خۆش، قسەڕەوان، بە دەم و پل، دەماوەر.

**تکلان:** بڕوانە: "اعتماد".

**تکلّس:** بوونە قسلّ.

**تکلّف:** 1) رەنج بردن، رەج و سەختی كێشان، بە خۆ سەپاندن، ناچاری. 2) وەئەستۆگرتن. 3) خۆنوێنی. "**تکلف كردن**": خۆخستنە رەنج و زەحمەتەوە یان زێدەڕۆیی لە كارێك دا. وەئەستۆگرتن. رازاندنەوە. ناچاركردن. "**بەتکلف**": بەزۆر. لە رووی خۆنوێنی یان ریاوە.

**تکلّم:** ئاخاوتن، ئاخافتن، پەیڤین، دووان، وە قسە كەوتن.

**تکلیف:** 1) كاری دژوار خستنە ئەستۆی كەسێك، ناچار كردن، واجب كردن.

2) تەوزیم، کارێ کە پێویستە بکرێ، ئەرکی سەرشان. 3) رووڵێنان. "**تکلیف خود را با کسی روشن کردن**": ئەرک یان پێگە یان رەوشی خۆت سەبارەت بە ئەو دیاری و دەست نیشان کردن. "**تکلیف شدن**": واجب بوون یان وەئەستۆی کەسێك خران. باڵغ بوونی کەسێك و واجب بوونی ئەرکە شەرعییەکان لەسەری. "**تکلیف کردن**": رووڵێنان لە کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێك.

**تکلیم:** ئاخاوتن دەگەڵ کەسێك.

**تك محصولی:** تایبەتمەندی سیستمی ئابووری وڵات گەلێ کە تەنیا کاڵایەك بەزۆری بەرهەم دێنن و دەینێرنە دەرەوە، تاك داهاتی.

**تك معنی:** تاك واتا، تاك مانا.

**تکمّل:** تەواوبوون، کاملّ بوون.

**تکمله:** بەشی کۆتایی وتار یان کتێو یان یاسا یان هەر نووسراوەیەکیتر کە کەموکورییەکانی بابەتێ راست دەکاتەوە.

**تکمیل:** تەکمێلّ کردن/ بوون، کاملّ کردن/ بوون، تەواوکردن/ بوون، بە ئەنجام گەیاندن، بە کۆتایی گەیاندن. کاملّ، بێ کەموکووڕی. تێر.

**تك نرخی:** کاڵایەك کە بە نرخێکی نەگۆڕەوە دەدرێتە خەڵکی.

**تك نگاری:** بڕوانە:"تك نگاشت ".

**تك نگاشت:** تاك نووسین، نامیلکە، مۆنۆگراف.

**تك نوازی:** تاك ژەنی.

**تکنوکرات:** تێکنۆکرات، تێکنیك کار، فەن سالار.

**تکنوکراتیك:** تێکنۆکراتیك، فەن سالارانە.

**تکنوکراسی:** ئەو ئاراستەیەیە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە کاروبارەکانی دەوڵەت بسپێرێت بە تکنۆکراتو تێکنیك کاران، حکوومەتی کارناسانی فەننی، فەن سالاری.

**تکنولوژی:** تێکنۆلۆژی، کۆی زاراوە فەننی و پیشەییەکان.

**تکنیسین:** تێکنیسیێن، تێکنیك کار، خاوەن هونەر، لێزان لە هونەری پیشەسازی، ماکینەچی.

**تکنیك:** تێکنیك، شێواز و فەننی ئەنجامدانی کار، بنەماکانی کارزانی، فەننی، کاری فەننی، رێسا و شێوەی فەننی، هونەر.

**تکنیك داستانی:** تێکنیکی گێڕانەوەیی.

**تکواژ:** تاکواژ، مۆرفیم، چووکترین یەکەی مانادار لە زمان دا.

**تك و پو:** بڕوانە: "تکاپو".

**تك و تاز:** جووڵە و چالاکی، جموجۆڵ.

**تك و تا:** جموجۆڵ.

**تك و تا نینداختن- خود را از:** دان پیانەنان بە شکان و هەڵەی خۆ دا، لە روو نەچوون.

**تكوتوك:** یەکەیەکە، هێندێکی، تاکوواز، تاك و تووك، تاق و لۆق.





**تك و خیز:** بڕوانە:"جست و خیز".

**تك و دو:** جولاّن، جموجۆڵ، هەوڵ.

**تکوّن:** بەدیهاتن، وەدیهاتن، هاتنەدی، پێکهاتن. هەبوون.

**تکوین:** هێنانەدی، داهێنان، خولّقاندن، لە نەبوونەوە چێ کرن، پێکهێنان، رسکاندن.

**تکوینی:** پێکهاتەیی، ژێنێتیك.

**تکوین یافتن:** بەدیهاتن، وەدیهاتن، هاتنەدی، پێکهاتن، رسکان، گووران، گوورین، لێگووران، رۆح هاتنە بەر و دروست بوونی پیزە. "**تکوین یافته**": خولّقاو، رسکاو، گووراو، گرس.

**تکه:** پەنچك، لەت، پارچە، پاژ، لەه.

**تکەبرداری:** نموونە هەڵگرتنەوە.

**تکەتکه:** پارچەپارچە، لەت لەت، پاژپاژ.

**تك یاخته:** تاك خانەیی، بوونەوەرێك کە لەشی تەنیا لە یەك خانە پێك هاتبێ.

**تکیدن:** راکردن، تاودان، جووڵان، بزووتن. کز و لاوازبوون.

**تکیده:** کز، کز و لاواز.

**تکیه :**1) پشت بە شتێکەوە دان، پشت پێوەدان، پاڵ پێوەدان. 2) پشت بەستن.3) شوێنی نگاداری کردنی هەژار و نەدار.

**تکیەگاه:** تەکیەگە، پاڵپشت، پاڵشت.

**تکییف:** گونجاندن. چۆنیەتی.

**تگاور:** تیژڕەو، خۆشبەز. ئەسپ.

**تگاوری:** هەڵاتن، راکردن.

**تگ و تاب:** خێرایی و پەلە.

**تگ و تاز:** بە پەلە رۆیشتن.

**تلاب:** بڕوانە: "تالاب".

**تلابیدن:** بڕوانە: "تراویدن".

**تلاحق:** بە شوێن یەك دا هاتن، پەیتاپەیتایی، بێپسانەوە.

**تلاش:** هەوڵ، حەوڵ، تەقالا، ئەخت. "**تلاش معاش**": هەوڵدان بۆ وەدەست خستنی بژیوی ژیان. "**تلاش مذبوحانه**": پەلاقەژەی بێسوود.

**تلاشگر:** هەوڵدەر، تەقالاکەر، تێکۆشەر.

**تلاشی:** بڕوانە: " اضمحلال ".

**تلاطم:** 1) شەپۆل دان، شەپۆل لێدان، بەیەك دادان. 2) زیان پێك گەیاندن، شەپلاّغە لێك دان. 3) پەرێشانی، پەشێوی. "**پر تلاطم**": شەپۆلاوی، تۆفانی.

**تلاعب:** کایە/ گەمە کردن.

**تلافی:** تۆڵە کردنەوە، قەرەبوودانەوە، قەرەبووکردنەوە، بۆبژاردنەوە، بژاردنەوە، حەقەوەسێن، حەق کردنەوە، لە حەق هاتن، ڤەئانین، ئاڤدین، هۆدانەوە، تێهەڵێنان، تێهەڵێنانەوە، بارە پێگەیاندن، پڕکردنەوە.

**تلافی جویی:** تۆڵەسەندنەوە، تۆڵەکردنەوە.

**تلاقب:** ناو و ناتۆرە لە یەك نان، ناوونیتکە لێکنان.

**تلاقی:** بە یەك گەیشتن، پێك گەیشتن، گەیشتنە یەکتری، یەکتر دیتن، تووشی یەکتر بوون، راستی یەکتر بوونەوە، چاو پێك کەوتن.

**تلان:** قەڵەو و سەرحاڵ.

**تلاوت:** خوێندنەوە.

**تلاوش:** بڕوانە: "تراوش".

**تلاویدن:** بڕوانە: "تراویدن".

**تلاهی:** پێکەوە یاری کردن، یەکتر خەریك کردن.

**تلألؤ:** بڕوانە: "درخشیدن".

**تلبّس:** دەبەر کردن، جل و بەرگ پۆشین.

**تلبیس:** خۆگۆڕین، بە جۆرێکیتر نەك وەك هەیە خۆنیشان دان، داپۆشاندن، شاردنەوەی حەقیقەت، فرت و فێڵ بە کار بردن.

**تلپاتی:** تێلێپاتی، دوورئاگایی.

**تلپ شدن:** موزاحیم بوون، سەرباربوون.

**تلخ:** 1) تاڵ، بەرامبەری شیرین. 2) بەدئەخلاق و زۆر مڕومۆچ. 3) خەم هێن، ژان هێن. 4) شەڕاب یان هەر جۆرە مەشرووبێکی ئەلکولی.

**تلخ احوال:** ناڕەحەت، ناخۆش.

**تلخ سخن:** زمان تاڵ، دەم تاڵ.

**تلخ زبان:** قسەتاڵ، قسەڕەق، قسەناخۆش.

**تلخك:** 1) ناوی گیایەکە. 2) تریاك. 3) بڕوانە: "دلقك".

**تلخ کام:** بریتی لە کەسێك کە ڕۆژگارێکی تاڵ و ناخۆشی هەیە و ژیان بە دژواری تێ دەپەڕێنێ.

**تلخ کامی:** بێهیوایی، ناهومێدی، بەدبەختی.

**تلخناك:** ناخۆش و خەم هێن. ناخۆش و ئازاردەر. تام تاڵ.

**تلخ وش:** تام تاڵ. بریتی لە مەی.

**تلخی:** 1) تاڵی. 2) مۆن بوون، مڕومۆچ بوون. 3) ڕەنج و بەلا. 4) تووڕەیی و قەڵسی. 5) شەڕاب. 5) تریاك. "**تلخی کشیدن**": ڕەنج و سەختی کێشان، تاڵی چەشتن.

**تلخیص:** پوختەکردن، کورت کردنەوە، گەلاڵە کردن.

**تلخی کش:** کەسێ کە تاڵی و ناخۆشی دەکێشێ.

**تلذذ:** چێژ بردن، خۆشی دیتن.

**تلطّف:** 1) نەرمی و دڵسۆزی نواندن. 2) بڕوانە: "چارەاندیشی".

**تلطیف:** جوان و دڵپەسند کردن.

**تلعّب:** کایە/ یاری کردن، خۆ بە گەمە و کایەوە خەریك کردن.

**تلعین:** ئەشکەنجە کردن.

**تلفات:** کۆی"تلف"، زیانەکان، خەسارەتەکان، لەناوچووەکان.

**تلف شدن:** لە نێوچوون، تیاچوون، فەوتان، رزین، خراپ بوون، پەڕتان، لە کیس چوون، بەفیڕۆچوون، خەساربوون، زایەبوون. "**تلف شده**": لەناوچوو، بەفیڕۆچوو، لەکیس چوو، خراوبووگ، خەساربوو.

**تلف کردن:** لەنێوبردن، لەکیس دان، بەفیڕۆدان، خەسارکردن، زایەکردن. کوشتن.





**تلفظ:** چۆنیەتی دەربڕین، شێوەی خوێندنەوە، گۆکردن، گوتن.

**تلفیف:** تێوەپێچان، پێوان، تێپەڕاندن.

**تلفیق:** گەیاندنەوەیەك، وێك هێنان، پێك گەیاندن، پێکەوەبەستن، پێك هێنان، ڕێکخستن، ئاوێتە کردن، تێکەڵ کردن.

**تلقاء:** چاوپێکەوتن، شوێنی چاوپێکەوتن و ڕووبەڕووبوونەوە، ژوانگە. لەخۆوە.

**تلقّن:** فێربوون، تێگەیشتن و فێربوونی بابەت یان ئاخاوتەیەك لە زمانی کەسێکەوە.

**تلقی:** 1) دیدارکردن، چاوپێکەوتن، یەکتردیتن، پێك گەیشتن. 2) وەرگرتن، قبووڵ کردن، رازی بوون.3) تێگەیشتن، تێگەین، زانین. 4) فێر بوونی شتێك لە کەسێکەوە. "**تلقی گردد**": بزانرێ، سەیربکرێ.

**تلقیب:** نازناو پێدان. ناتۆرە لێنان.

**تلقیح:** واکسیناسیۆن، مایەگیراندن، هەڵپیتاوتن، کوتان، موتوربەکردن، (بۆ مرۆڤ)پەیوەندکردن، (لە زیندەوەر زانیدا)چاك کردن، ئاوس کردن، پەڕین. "**تلقیح مصنوعی**": تێکردنی تۆو لە پیزەدان بە بێ ئەنجامدانی کاری سێکسی، ئاوس کردنی دەستکرد، پیتاندنی دەسکرد.

**تلقین:** 1) تێگەیاندن و فێر کردنی ئاخاوتەیەك بە کەسێك، بیروڕایەك دە مێشکی کەسێك نان، تێگەیاندنی سەرزارەکی. 2) بە گوێ دادان، بە گوێدا خوێندن، بە گوێ هەڵێنان، مردوو تەڵقین کردن، تەڵقین دادان.

**تلك و تلك:** کار و شوغڵی کەم داهات.

**تلکە:** پارە یان شتێك کە بە فرتوفێڵ لە کەسێکی بگرن.

**تلکەبندی:** تڕەکەڵەك، بەشێوەی لەرزۆك و ناپایەدار.

**تلکە کردن:** فریودانی کەسێك بە مەبەستی شت لێ ئەستاندن.

**تلم:** (ت.لْ) وەرزێر. زێڕینگەر.

**تلمبار/ تلنبار:** تلۆڤە، بە سەر یەك دا هەڵچنراو، بە سەر یەك دا کراو، قەلاقوچکە.

**تلمبار/ تلنبارکردن:** هەڵچنین، نیانەبان یەك، کەڵەکە کردن.

**تلمبەزنی:** پۆمپاژ.

**تلمّس:** دەست پیاهانین/ پیاهێنان. لێپرسینەوە.

**تلمّع:** درەوشانەوە، ڕووناك بوونەوە، پڕشنگ دانەوە، تروسکان/ تروسکانەوە، بروسکیان.

**تلمیح:** (ڕێزمان) تیل نیشان، ئەوەیە کە شاعیر لە هۆنراوەکەی خۆیدا هێما بە داستان و کارەسات و پەندی پێشینیان بکا. هێما، ئاماژە.

**تلمیذ:** قوتابی، فێر خواز. بەردەست، شاگرد.

**تلمیع:** بریقاندنەوە، تروسکاندنەوە، بروسکاندنەوە، رووناک کردنەوە.

**تلنگر:** پەلەپیتکە، پتە، پتکە، پیتکە، پلّتک، پلّتۆک، ترنگ، ترنگە.

**تلو:** (ت.لْ) پێڕەو، دواڕۆ.

**تلو:** (ت.لَ) لاترە، تل، تللۆر، نەتر، خلۆر، گل، گلۆر، گلار، ڕەت، نسکۆ، ساتمە، سەرسم، نوچ، نوچکە.

**تلواسە:** 1) دلّتەنگی، دلّ گیران، دلّ پڕی. 2) خەم، کەسەر. 3) نیگەرانی.

**تلوتلو:** تلاوتل، تیوتی، تەپاوتل، گلاوگل، لە سەر تەنیشت گەڕان، لاوەلا ڕۆیشتن، ڕەت بردن بە هەر دوو لادا.

**تلوتلوخوردن:** تلیان، شەوسین، لارەولار ڕۆیشتن، تلاوتل ڕۆیشتن، بەم لاو بەولاداکەوتن، بەلاداهاتن، داریانەوە، لارولاروا.

**تلوخوردن:** تل خواردن، تل دان، تل بردن، تل خواردن، تلاوتل کردن، لەتردان، لەتربردن، نەترەبردن، ڕەت بردن، ساتمە بردن، هەلّەنگوتن، نوچ بردن، نوچ دان، نوچکە بردن، نوچکە دان، (لاتراسکە/ لاترووسکە/ لاتریسکە) بەستن، لاترە بردن، خرتەگل، خلێران، خنگلین، بەو لاولادا کەوتن.

**تلوث:** پیس بوون، تێوەچوون دە قوڕ و چلّپاوەوە.

**تلوفاز:** کۆتایی.

**تلوک:** ئامانج، نیشانە.

**تلویح:** هێماژ، هێما کردن لە دوورەوە، بە ئاماژە تێگەیاندن، لە تەنیشت ئاخاوتە یان نووسین دا ئاماژە بە بابەتێک کردن.

**تلویحاً:** بە ئاماژە، بەشێوەی شاراوە.

**تلویحی:** ئاماژەگەرانە، ناڕاشکاو و بەئاماژە.

**تلویم:** بە توندی سەرزەنشت کردن.

**تلوین:** 1) ڕەنگاوڕەنگ کردن، ڕەنگاندن، ڕەنگالّە کردن، ئالّوواڵاکردن. 2) خۆراکی جۆراوجۆر ئامادەکردن.3) گۆڕینی شێوازی ئاخاوتە و داهێنانی ئاخاوتەی ڕەنگالّە.

**تلهّب:** هەلاّیسان و کلّپە سەندنی ئاگر.

**تله پاتی:** تێلێپاتی، دوورئاگایی، پێوەندی بیر و هزرەکان دەگەلّ یەکدی، پێوەندیی مەعنەوی، پێوەندیی هزری نێوان دوو کەس لە ڕێگەی دوورەوە، بابەتێک خستنە مێشکی کەسێکەوە لە ڕێگەی گواستنەوەی هزرەوە.

**تلەتئاتر:** شانۆی تەلەویزیۆنی.

**تلەدینامیک:** ڕاگوێزەری وزە بۆ مەودای دوور.

**تلهّف:** هەسر خواردن، بەپەرۆش و موخابن بوون، خەم خواردن، هەلّپە.

**تلەمتر:** مەوداپێو.

**تلیّن:** 1) نەرم بوون، شلک بوون. 2) زمان لووسی کردن.

**تلیوار:** بڕوانە: "تلمبار".

**تلیین:** نەرم کردن.





**تم:** 1) تەم، ڕەشایی، تاریکایی بەرچاو. 2) مژ.

**تماثل:** لێکچوون، هاوتایی، هاوجۆری، هاوچەشنی، هاوشێوەیی.

**تماثیل:** کۆی"تمثال".

**تماجد:** بە گەورەیی خۆ نازین، شانازی بە یەک کردن.

**تمادح:** بە یەکتر هەلّگوتن، ستایشی یەکتر کردن.

**تمادی:** 1) درێژبوونەوە، درێژە کێشان، کشان، خایاندن. 2) لە سەر ڕۆیشتن.

**تمارزو:** تامەزرۆ، بەتاسە.

**تمارض:** نەخۆشینوێنی، خۆ نەخۆش خستن، بەدرۆ خۆ بە نەخۆش نیشان دان.

**تماس:** پێوەندی. لێک کەوتن، دەست لێدان، بەرکەوتن، لێک سوون.

**تماسک:** خۆبواردن، خۆپاراستن. سەبر و پشوودرێژی.

**تماشا:** تماشا، تواشا، سەیرکردن، ڕوانین، لێڕوانین، لێنوارین، لێنۆڕین، چاولێکردن، نوارین، نۆڕین، تێنوارین، مێزەکرن، مەیزەکرن، لێنهێرین، لێنەڕین، لێنێرین، ونی یایش، هەونیایش.

**تماشاچی:** بینەر، سەیرکەر، تواشاچی، تواشاکەر، تەماشاڤان.

**تماشاخانه:** تواشاخانە، شوێنی هونەر نواندنی ئەکتەرەکان، شوێنی شاندانی شانۆ و شتی دلّخواز.

**تماشادادن:** نیشاندان، پیشاندان. بردنە گەشت و سەیران.

**تماشاگاه/ تماشاگه:** تواشاگە، سەیرانگە، شوێنی سەیران و ڕابواردن.

**تماشاگر:** بڕوانە: "تماشاچی".

**تماشایی:** دیتنی، شیاوی تواشاکردن، دلّڕفێن. تواشاکەر، بینەر.

**تماشی:** پێکەوە ڕۆیشتن، پێکەوە پیاسەکردن.

**تمالک:** بە سەر خۆ دا زالّ بوون، بەر بەخۆگرتن.

**تمام:** تەواو، گشت، تێکڕا، هەموو، سەرلەبەر، سەرجەم. بەئەزموون و کاملّ، بێ کەموکوڕی، چلّ (کاری نیوەچلّ). زۆر، فرە، فراوان. "**تمام عیار**": بە تەواو مانا، بێ خەوش. "**تمام و کمال**": بەتەواوی، بەبێ کەموکورتی. "**با تمام قوا**": بە تەواوی هێز و تواناییەوە. "**هرچه تمام تر**": زۆر، فرە.

**تماماً:** بە تەواوی، بە تێکڕایی، بەگشتی، یەکجاری، یەکجارەکی، ڤکی، دەق، ڕەبەق، بێ زیاد و کەم.

**تمام اتوماتیک:** فوول ئۆتوماتیک، تەواو ئۆتوماتیک.

**تمام اندام:** جوان چاک و ڕێک و پێک، لەبار.

**تمامت:** تەواو، گشت.

**تمام خلقت:** تەواو و بێ کەموکووڕی. خاوەنی ئەندامی لێک و لەبار و بێکەموکوورتی.

**تمام شدن:** تەواوبوون، دوایی هاتن، کۆتایی پێهاتن، بڕانەوە، قەتان، قەتیان، قوتابوون، خەلاس بوون، نەمانی کار یان خواردەمەنی، هەرادیای، تەمامیای، کامڵ بوون. مردن، تیاچوون.

**تمام شدنی:** بڕاوە، ئەوەی کە تەواو دەبێ.

**تمام صورت:** تەواوڕوو. خاوەنی ئەندامی جوان و بێکەموکورتی.

**تمام قد:** تەواونوێن، باڵانوێن. لەسەر لاق، بەحاڵەتی وێستاو.

**تمام کردن:** تەواو کردن، کۆتایی پێهێنان، دوا پێهێنان، دوایی پێهێنان، بنەلێهێنان، بنەلێبڕین، بردنە سەر، هیچ پێنەهێشتن، کامڵ کردن. مردن، کۆچی دواییکردن. کوشتن. بەجێهێنانی نزا و ئاوات و هتد.

**تمام نگاری:** "هولوگرافی".

**تمام نما:** باڵانوێن، باڵا ڕوان.

**تمام وقت:** تەواو وەخت، هەمیشەیی، دایمی.

**تمامی:** 1) تەواوی، گشت، سەرانسەر. 2) کامڵ و بێ کەموکووڕی. 3) تەواوبوون، بەکۆتایی گەیشتن. "**تمامی داشتن**": بە کۆتایی گەیاندن. "**بە تمامی**": بەتەواوی، بەکامڵی.

**تمامیّت:** یەکپارچەیی، تەواوەتی.

**تمامیّت ارضی:** تەواوەتی خاک، یەکپارچەیی خاک.

**تمامیّت خواه:** گشتخواز، تەواوخواز.

**تمامیت خواهی:** توتالیتاریزم، گشتخوازی.

**تماوت:** خۆ لە مردوویی دان، خۆ کردنە مردوو.

**تمایر:** پشێوی و گەندەڵی کەوتنە نێو قەوم.

**تمایز:** لێک جیابوونەوە، جیایی، جیاوازی.

**تمایز داشتن:** جیابوون، جیاوازبوون.

**تمایل:** ویست/ ویستن، ئارەزووکردن، خواست، بەریان. لاربوونەوە.

**تمتراق:** تەمتەراق، دەبدەبە، شکۆ.

**تمتّع:** کەڵک و سوود وەرگرتن، سوود و چێژ وەرگرتن، بەهرەمەند بوون، بەهرە وەرگرتن. "**تمتع کردن**": خەریکی کرداری سێکسی بوون.

**تمتین:** پتەو/ قایم کردن، موکوم کردن.

**تمثال:** (تَ) مەتەڵ هێنانەوە، نموونەهێنانەوە. شوبهاندن.

**تمثال:** (تِ) پەیکەر، کۆتەڵ، هەیتاڵ. وێنە، شێوە. دەستووری پاشا.

**تمثّل:** نموونەهێنانەوە. تۆڵە سەندنەوە.

**تمثیل:** 1) نموونەهێنانەوە، وێنە هێنانەوە. 2) وێکچواندن، وێچواندن، پێچواندن، چواندن، لێک چواندن، شوبهاندن. 3) نواندن، گێڕانەوە. 4) چیرۆک یان هەقایەتێ کە بۆ سەلماندنی مەبەستێ دەگێڕدرێتەوە. 5) شانۆنامە. 6) جۆرێك بەڵگەهێنانەوە بۆ نیشان دانی خاڵی هاوبەشی نێوان دوو شت. 7) بڕوانە: "مَثَل".





**تمثیلی:** ئایدیالی، وێکچواندنی. تایبەتمەندی بەرهەمێکی ئەدەبی کە لەو دا مەتەڵ یان چیرۆك و هتد وەك نموونە یان هێما بۆ دەربڕین یان پشت ڕاست کردنەوەی بابەتێك دەیهێنن.

**تمجید:** ڕێز (لێنان/ گرتن)، بە گەورە و مەزن دانان، پێداهەڵگوتن، پەسندان، تاریف کردن.

**تمحّق:** پاك بوونەوە، کەم بوونەوە.

**تمحّل:** 1) مەکرکردن، خەڵەتاندن. 2) چارەدۆزی.

**تمحیق:** پاك کردنەوە، سڕینەوە، پووچ کردنەوە.

**تمدّح:** بە خۆ هەڵگوتن، خۆهەڵکێشان.

**تمدّد:** کشان، کێش هاتن، ڕاکشان، درێژ بوون.ئاسوودە و ئارام بوون.

**تمدّن:** ژیاری، ژیوەر، شارستانیەتی، شارستانێتی، ژیانی شارستانییانە.

**تمدیح:** ستایش کردن، پێدا هەڵگوتن.

**تمدید شدن:** درێژبوونەوە، کشان.

**تمدیدکردن:** درێژکردنەوە، درێژە وەکردن، درێژەکێشان، درێژە پێدان، کێشان، کشاندن، بە دەمەوە دان، دانەدەم، لەدوادان، خستنە سەر.

**تمرّد:** سەربزێوی، ئەشقی بوون، ئەشقیگەری، یاخیەتی، یاخی بوون، یاخیگەری، یاغێتی، ملەپێچی، سەرپێچی، سەرکێشی، سەرهەڵێنان، مل نەدان.

**تمرّد کردن:** لاری کردن، لەفەرمان دەرچوون، (سەرپێچی/ سەرکێشی) کردن.

**تمرّغ:** لە خاك و خۆڵ دا گەوزین، تلانەوە بە هۆی دەرد و ژانەوە.

**تمرکز:** کۆبوونەوە، خڕبوونەوە، چڕبوونەوە، کۆجێیی، سەنترالیزەبوون. جێگرتن، ئارام بوون. چەقبەستن. "**عدم تمرکز**": ناناوەندێتی، ناکۆجێیی.

**تمرکز زدایی:** ناوەندسڕینەوە، ناوەندڕەتێنی، ناکۆجێییکردن.

**تمرکز حواس:** هەواس لە سەر خۆبوون، لەسەرهەست بوون.

**تمرکز قوا:** کۆکردنەوەی هێزەکان.

**تمرکزگرایی:** ناوەندێتی، ناوەندئاژۆیی، کۆجێیی خوازی.

**تمرگیدن:** دانیشتن، ڕۆنیشتن.

**تمرّن:** ڕاهاتن، خووگرتن، هۆگر بوون.

**تمرین:** پرۆڤە، ڕاهێنان، مەشق (کردن/ پێکردن)، فێر کردن، خۆڕاهێنان.

**تمزیق:** دڕاندن، دڕانن، دڕاندن، دڕین، دادڕان، دادڕین، لەت و پەت کردن.

**تمسخر:** (تیز/ تەوزە/ تەڤز/ تیتاڵی/ گاڵتە)پێکردن، هەڵك، ئەهێو.

**تمسخرآمیز:** گاڵتەئامێز، گاڵتەجاڕانە.

**تمسّك:** دەستەوداوێن بوون، پەنابردنەبەر، پشت پێبەستن. بەڵگە، سەنەد.

**تمسکن:** نەداربوون، دەس تەنگ/ دەس کورت بوون.

**تمسیح:** دەست هێنان بە سەر شتێك دا.

**تمشیت:** ئەنجامدانی کارەکان و سەروبەرکردنیان.

**تمکّن:** جێگرتن، جێگیر بوون. پایە بەرز بوون، بوونە خاوەن پلە و پایە. وزە و هێز پەیدا کردن، پێکران، لە دەست هاتن، توانین.بوونی ماڵ و سامان. ماڵ، سامان، دارایی. "**تمکن داشتن**": خاوەنی سامان و دارایی زۆر بوون. نیشتەجێبوون لە شوێنێك. "**تمکن یافتن**": جێگیربوون، دامەزران. هێز و وزە پەیاکردن.

**تمکین:** 1) ملدان، ملنان، ملکەچ بوون، قبووڵ کردن. 2) جێگیر کردن، پتەو کردن، راوەستاو کردن، وزە و هێز پێدان، توانا پێدان. 3) بڕوانە: "متانت". 4) توانایی ماڵی. "**تمکین دادن**": هێز و دەسەڵات و متمانە پێدان. "**تمکین داشتن**": ملدان، ملنان. "**تمکین کردن**": ملدان، ملکەچ کردن. قبووڵ کردن، رازیبوون. گرنگی و متمانە قایل بوون. "**تمکین یافتن**": وەدەستهێنانی توانایی ئەنجامدانی کارێك. جێگیربوون یان ئۆقرەگرتن لە شوێنێك.

**تملّق:** ماستاوکردن، کلکەسووتە، کلکەسووتەکێ، کلکەلەقێ، خوڵتە، دەڤهلو، ریایی، ریاکاری، رووبینی، رووبازی، راوڕو، دەڵەچەیی، مەرایی، رووپامایی، لامە، سفتە، شەلاف، زمان لووسی، هولیسکی، باریك رێسی، حولیاتی، وشکەیی.

**تملّك:** خاوەنداریێتی، خاوەنێتی، ملّکایەتی، خاوەن بوون، بوونە خاوەن سامان، وەرگرتنی ملّك.

**تملیت:** بڕوانە: "بار اضافی".

**تملید:** بڕوانە: "مالش دادن".

**تملیك:** کردنە خاوەن ماڵ و سامان، خاوەنداریێتی شتێکی بەکەسێکی‌دی سپاردن. "**تملیك خواستن**": خوازیاری خاوەنداریێتی کەسێك یان شتێك بوون. "**تملیك کردن**": داخستن، قوفڵ کردن.

**تمنّا:** تکا کردن، روونان، ئارەزوو کردن، ئاوات خواستن. "**تمنا داشتن**": تکاکردن. ئاوات و ئارەزوو هەبوون. "**تمناشدن**": داواکران.

**تمندە:** بڕوانە:"الکن".

**تمنّع:** بە هێز بوون، پتەو بوون، زاڵ بوون، وەستانەوە.

**تمنّی:** بڕوانە: "تمنّا".

**تمنیت:** تامەزرۆ و هیواداربوون.

**تمنیع:** نەهێشتن، پێش گرتن، راگرتن.

**تموّج:** شەپۆلداربوون، پێلداربوون، شەپۆل لێدان.

**تموّل:** دەوڵەمەند بوون، دەوڵەمەندی، سەروەت و سامان دەست کەوتن. سامان، دارایی.

**تمویل:** کردنە خاوەن ماڵ و سامان، دەوڵەمەند کردن. (بیرکاری) گەیاندنی ژمارەیەك بە توانی دوو.





**تمویە:** ئاوەزێر کردن، زێڕکوت کردن، تەڵاکاری. ساختە کردن، درۆ رازاندنەوە.

**تمهّر:** کارامە بوون، شارەزابوون، دەست رەنگین و چازان بوون.

**تمهّل:** درەنگ کردن، لە سەر خۆیی و بە شێنەیی.

**تمهید:** پێشەکی، سەرەتا. رێخۆش کردن، ئاسانکاری. ئامادە کردن، ئامادەکاری. تەگبیر، چارەدۆزی. "**تمهید یافتن**": ئامادەبوون.

**تمهیدات:** کۆی"تمهید"، پێشەکییەکان، ئاسانکارییەکان.

**تمهیل:** (مۆڵەت/کات/دەرفەت/ ماوە) پێدان.

**تمیدن:** بە لاڵەپەتێ قسەکردن.

**تمیز:** 1) پاك، پاقژ. 2) جیایی و جیاوازی. 3) هۆش، هوشیاری. 4) بەتەواوی و بێ کەموکووڕی.

**تمیز بودن:** پاك بوون.

**تمیز دادن:** ناسینەوە، جیاکردنەوە، لێك جیاکردنەوە، هەڵاواردن.

**تمیز کردن:** پاك/خاوێن/ پاقژ کردنەوە.

**تمیم:** توند و پتەو، تەواو و کامڵ.

**تمیمە:** نووشتە، جادوو.

**تمییز:** جیاکردنەوە، (جیا/ جودا) کاری، هەڵاواردن.

**تن:** لەش، جەستە. کەس. بارستایی.

**تنّاد:** لە یەکتر سڵەمینەوە، رەوینەوە، جیابوونەوە، بڵاوبوونەوە.

**تنادی:** بانگی یەکتر کردن، یەکدی گازی کرن.

**تنازع:** کیشمەکێش، گێرەوکێشە. لە مافدا: ناکۆکی.

**تنازل:** 1) هاتنە خوار، دابەزین، داشکان. 2) وازلێهێنان(لە ماف دا)، دەست بەرداری، دەست کێشانەوە/ خۆکێشانەوە لە پلە و پایە. 3) سازش.

**تن آسا/ تن آسای:** خۆش رابوێر/ گوزەران، خۆ خۆشەویست، ئاسوودە، بێ خەم، راحەت.

**تن آسان:** ساغ و سلامەت، سالم، تەندروست، ئاسوودەیی خواز، تەمبەڵ. بە ئاسانی.

**تن آسانی:** حاڵ خۆشی، خۆخۆشەویستی، خۆشی و تەندروستی.

**تن آسایی/ تناسایی:** ئاسوودەیی، بێ خەمی، راحەتی، ئارامی، خۆخۆشەویستی.

**تنابندە:** هەر بوونەوەرێکی زیندوو بە تایبەتی مرۆڤ.

**تناسب:** تەبایی بابەت و شێواز، هاوڕێژەیی، هاوتایی، گونجاوی، رێکی، بوونی نیسبەت و پێوەندی نێوان دوو شت یان دوو کەس. گونجان، سازان. "**تناسب متسلسل**": هاوڕێژەیی زنجیرەیی. "**بەتناسب**": هاوئاهەنگ دەگەڵ، گونجاو دەگەڵ.

**تناسخ:** 1) پووچ کردنەوە، ڕەت کردنەوە. 2) ڕوونووس کردن، کۆپی کردن. 3) گیان گۆڕکێ، تێژیانەوە، چوونی ڕوحێك پاش مردنی جەستەکەی بۆ ناو ڕۆحی مرۆڤێك یان ئاژەڵێکی تر، چوونە جەستەی یەکێکی ترەوە.

**تناسخ ازمنه:** یەك بە دوای یەك تێپەڕبوونی ڕۆژگار و سەدەکان.

**تناسخ در میراث:** مردنی یەك لە دوای یەکی میراتگران پێش لە دابەش کردنی میرات.

**تناسق:** ڕێکوپێکی و تەکووزی، ڕێکوپێك و ڕازاوەبوون. هاوتەگبیری.

**تناسل:** نەسڵ خستنەوە، منداڵ بوون، زاوزێ کردن. "آلت تناسلی": کۆئەندامی جووت بوون.

**تناسی:** لەبیرکردن، فەرامۆش کردن.

**تناشد:** شێعر خوێندنەوە بۆ یەکتری.

**تناصر:** هاریکاری یەکتر کردن، یارمەتیدان، ئالیکاری.

**تناصف:** 1) دەگەڵ یەك بە ئینساف بوون، وەرگرتنی هەق بە تەواوی. 2) نیوە بە نیوە کردن.

**تناظر:** 1) ڕوانینە یەکتر، تواشای یەکتر کردن. 2) گفتوگۆ و مشتومڕ کردن، کێشە و دم بە دمە کردن لە بابەتێکدا، بەرامبەرکێ. 3) بوونی ڕێسا و یاسا کە بەو پێیە هەر ئەندامی کۆمەڵەیەك پێوەندی دەگەڵ یەك یان چەند ئەندامی کۆمەڵەیەکی ترەوە هەبێ.

**تنافر:** 1) لێك دوورکەوتنەوە، دوورکەوتنەوە. 2) ناتەبایی، ناکۆکی، ناسازگاری. 3) هێنانی چەند وشە بەدوای یەك دا کە دەربڕینەکەی قورس و دژوار بێ.

**تنافرآوایی:** ناتەبایی دەنگەکان.

**تنافرحروف:** ناکۆکی وشەکان.

**تنافس:** ڕقەبەرێتی یەکتر کردن، پێشبڕکێی یەکتر کردن، خۆنوێنی کردن.

**تن افکندن:** هێرش کردن، شاڵاوبردن.

**تنافی:** بە پێچەوانەی یەکتر جووڵانەوە، ڕەت کردنەوەی یەکتر، نەحەوانەوە، ناسازگاری.

**تناقص:** نەختەنەختە کەم بوونەوە، لەکەمی‌دان.

**تناقض:** پارادۆکس، دژواز، دژیەکی، لێکدژی، دژایەتی.

**تناقض گویی:** وتنی قسەگەلی دژبەیەك و ناسازگار.

**تناکح:** پێکهێنانی ژیانی هاوبەش.

**تناوب:** نۆبە دانان، بە نۆبە کار کردن، نۆبەکاری. لەدوایەك، بەدوویەکداهاتن. "**بەتناوب**": بە نۆبە و پشت سەری یەك.

**تناور:** باهۆدار، زەلامو بەتاقەت، زەلامی قەڵەو، تەژەی ئەستوور، زنتۆل، شاقەڵدار، کەتە، زەبەللاح، بەخۆوە.

**تناول:** وەرگرتن، هەڵگرتن، دەست پێگەیاندن. خواردن.

**تناوم:** خۆ لە خەو کردن، خۆکردنە خەو.





**تناهی:** بە کۆتا/ ئەنجام گەیشتن. بەربەخۆگرتن، بەسەرخۆدا زاڵ بوون.

**تنایش:** بڕوانە: "تجسم".

**تن باز پس دادن:** پاشەکشێ کردن.

**تنبان (بە) سر کسی کردن:** ئازاردانی ئەو.

**تنبان کسی دوتا شدن:** باشتربوونی وەزعی ماڵی ئەو.

**تنبان کهنه:** بریتی لە بەئەزموون.

**تنبل:** تەمەڵ، تەمبەڵ، تەوەزەل، تەپلۆس، تەڕاڵ، بارگران، لەشە، لەشگران، لەش قورس، پێگران، سەرگران، قوون گران، کالووم، تەپ، شەختۆ، دێراخێز، سست، کارنەکەر، ماتۆرا، ماتۆرە، مەرشۆ، ژەڵموو، کایەڵ، لۆژ، نەووش، خۆخۆشەویست، گۆن گرۆ، گانگیر، بێکارە.

**تنبل‌ولش:** لەشگرانو تەمەڵ، پفیو.

**تنبلیت:** بڕوانە: "تملیت".

**تنبوشە:** سۆلینە، گونجە، وشتر گەلۆ، ڕێگەئاوی لە سواڵەت.

**تنبّە:** لە خەو هەستان، وریابوونەوە، بەئاگاهاتن. وشیاری، وریایی.

**تن بها:** بڕوانە:"وجەالکفالە".

**تن بە تن:** شەڕی دەستەویەخە.

**تن بە کاردادن:** کارکردن، چوونە ژێر باری کار و بەرپرسایەتییەوە.

**تنبیدن:** لەرینەوە، ڕمان، تێك تەپین، تێك ڕووخان.

**تنبیە:** 1) تەمێ، تاشان، جزیا، ئەدەب. 2) لەخەو هەستاندن، هوشیارکردنەوە، بە ئاگا هێنان.

**تنبیەکردن:** تەمێکردن، لووت شکاندن، لووت شکانن، تاشاندن، جزیادان، ئەدەب کردن.

**تن پرست:** کەسی تەوەزەل و خۆویست کە گرینگی دەداتە لایەنە ڕواڵەتییەکانی ژیان.

**تن پرور:** خۆخۆشەویست، دەست و پێ سپی/ سپیلکە، تەمەڵ، خۆش (ڕابوێر/ گوزەران).

**تن پروری:** خۆش گوزەرانی، خۆخۆشەویستی، ڕاحەتی.

**تن پیمایی:** ئانترۆپۆمێتری، ئەندازە گرتنی بەشەکانی لەشی مرۆڤ.

**تنجاندن:** ڕێك گوشین.

**تنجّس:** گلاو بوون، پیس بوون، گەماربوون.

**تنجّم:** ئەستێرە ژماردن.

**تنجیدن:** تێکەوە پێچران، تێك پەستران، تێك ترنجان، ترنجیان. کەمەربەند بەستن. تووڕەبوون.

**تنجیز:** ڕەواکردن، بەجێهێنان.

**تنجیس:** گڵاوکردن، پیس کردن.

**تنجیم:** ئەستێرە ناسی.

**تنحّی:** متمانە پێکردن، پشت پێ‌بەستن. وازهێنان و دوورکەوتنەوە لە شوێنێك.

**تنخواه:** پارەی نەخت، زێڕوزیو، کاڵا، ماڵ و دار ایی، دەسمایە. بوودجە.

**تنخواەدادن:** سەرمایەدان بە کەسێك بۆوەی خەریکی کەسپ و کار بێ.

**تنخواەدار:** مووچە/ جیرە گر، بەرات گر.

**تند:** 1) چالاك، پێسووك، گورج و گۆڵ. 2) خێرا، پەلە، لەز. 3) بەدخولق، تووڕە، نەترس، شەڕانی.4) چێژە تێژ.5) بڵێندی، بڵێندایی و شوێنێ کە سەراولێژی زۆری هەبێ. 6) تۆخ. 7) ناحەز، نارەحەتکەر. 8) بەتووڕەییەوە. 9) سەرکێش. 10) زەرۆپ، خۆشڕەو. 11) زۆر، فرە. "**تند رفتن**": زێدەڕۆییکردن. دادوەریکردن بەپەلە.

**تندآب:** خوڕێن، خوڕ.

**تن دادن:** مل دان، مل راکێشان، چوونە ژێر بار، رازی بوون، بەقسە کردن.

**تندباد:** باگژ، بای توند.

**تندبار:** زیندەوەری دڕ یان ئازار گەێن.

**تندخو/ تندخوی:** بەدخولق، تووڕەو تۆسن، سەرکێش، نارام، سەرگەرم.

**تندذهن:** خاوەنی هێزی زوو تێگەیشتن و و بەهرەی هۆشی زۆر.

**تندر/ تندور:** دەنگی هەور، گرمە، گورم، زورم.

**تندرأی:** نەترس، چاونەترس، بەجەرگ.

**تن دردادن:** بڕوانە: "تن دادن".

**تندرست:** سالم، ساغ، لەش ساغ/ ساق، سلامەت، تەندروست.

**تندرستی:** لەش ساغی، سلامەتی، تەندروستی، ساخلەمی.

**تندرفتار:** توندڕەو، خۆشبەز.

**تندرفتن:** خێرا و بەپەلە رۆیشتن.

**تندرو:** (تَ.رَ) 1) بەزا، خۆشڕەو، خۆشبەز، چالاك، گورج. 2) توندڕەو، بناژۆ، پەرگیر.

**تندرو:** (تَ.رُ) رووترش، رووتاڵ، رەزاگران. بەغیل.

**تندزبان:** 1) زمان پاراو، زمان تەڕ، قسەزان. 2) کەسێ کە قسەی زل بکا.

**تندس:** بڕوانە: "تندیس".

**تندگذر:** زووتێپەڕ، تیژتێپەڕ، ئەوەی بە پەلە و خێرا تێپەڕێ، ئەوەی کە زوو بە سەر بچێ.

**تندم:** پەشیمانی، پەشیمان بوونەوە، پاشگەزبوونەوە.

**تندمزاج:** تووڕەوتۆسن، تووش و تووڕە، کەسکین.

**تندمزە:** توون، تون، دۆخ، زمان گەز، گەزەك، رووس، تام تیژ، خەڕا.

**تندنویسی:** خێرانووسی، زوونووسی.

**تندوتیز:** گورج و گۆڵ، چالاك، تیژڕەو. تام تیژ. خاوەنی گوتار و هەڵسوکەوتی تێکەڵ بە توندوتیژی. زۆر گەرم و بەتین. زۆر پڕڕەنگ و ناحەز.

**تندوخند/ تندوخوند:** تەرتوتونا، ژێرەوژوور، لێك بلاو.





**تندور:** بڕوانە: "تندر".

**تندە:** بڕوانە: "سراشیب".

**تندی:** 1) توونی، تیژی. 2) خێرایی، پەلە. 3) تووڕەیی، توندوتیژی. 4) بوونی رەنگی بەرچاو. 5) بەخێرایی، زوو. 6) سەرەولێژی زۆر. 7) گورجوگۆڵی لە شەڕدا. "**تندی کردن**": تووڕەبوون، قەڵس بوون. پەلەکردن. سەربزێوی کردن. "**بە تندی**": بەخێرایی، خێرا. بەتووڕەیی و توندوتیژییەوە.

**تندیاز:** پێ سووك، تیژتێپەڕ.

**تندیدن:** (تَ) 1) بڕوانە: "تژردن". 2) تووڕەبوون، قەڵس بوون.

**تندیس:** 1) بڕوانە: "تمثال". 2) بوت. 3) کەلاك، لاشە.

**تندیسگر:** کۆتەڵساز، پەیکەرساز.

**تندیسگری:** بڕوانە:"تجسم".

**تنذیر:** ترساندن.

**تن زدن:** 1) بێدەنگ بوون، بێدەنگی لێکردن. 2) خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێك، نەچوونە ژێر بار. سەبرکردن، دەرەنگ کردن، چاوەڕوانیکردن.

**تنزّل:** 1) نوشوست هێنان، هاتنەخوار، هاتنەخوارەوە(لەباری پلە و پۆستەوە) . 2) (دابەزین/ داشکان)ی نرخەکان. 3) کەم بوونەوە. 4) شکانی قەدروحورمەت. 5) دواکەوتوویی بەتایبەتی لە کاروباری مەدەنی. 6) بڕوانە:"فروتنی". "**تنزل دادن**": کەم کردنەوە. هێنانەخوار. پلە و پۆست کەمکردنەوە.

**تنزە:** 1) پاك/ خاوێن بوونەوە، دووری کردن لە ئاکاری خراپ. 2) داوێن پاکی. 3) گەشت و سەیران، گەڕان.

**تنزیر:** کەم کردن، کەم کردنەوەی بەخشش و کەرەم.

**تنزیل:** 1) هێنانە خوار، دابەزاندن، داگرتن. 2) داشکاندن. 3) رێکوپێك کردن، تەکووزکردن، سازدان. 4) قوڕێان. 5) بەهرەی بانکی. 6) ناردن، رەوانەکردن. 6) بڕوانە:"وحی". "**تنزیل دادن**": دانی پارەیەك بە وەرگرتنی سوود. هێنانەخوار، دابەزاندن. "**تنزیل کردن**": نەخت کردنەوەی بەلگە ماڵییە درێژماوەکان بە کەمکردنەوەی برێك پارە لەو وەك بەهرە. "**تنزیل یافتن**": کەم بوونەوە. "**تنزیل خور**": سووتخۆر.

**تنزیە:** پاك کردنەوە، بە پاك و خاوێن زانین. دووری کردن لە عەیب و خراپە.

**تنسیق:** رێکوپێك کردن، رێکخستن، یەکخستن، هاوئاهەنگی.

**تنش:** ئالۆزی، گرژی. (دەروونناسی) گۆشاری رۆحی.

**تنش آفرین:** گرژی/ ئالۆزی خولقێن.

**تنش آفرینی:** گرژی/ ئالۆزی خولقاندن، ئالۆزی نانەوە.

**تنش زدایی:** لابردنی گرژی و ئالۆزی، گرژی سڕینەوە، رەواندنەوەی گرژی و ئالۆزی، détente.

**تنشیط:** وەکەیف خستن، شادمان کردن، خۆشحاڵ کردن.

**تنشیف:** وشك کردنەوە.

**تنصَر:** بوونە خاچ پەرست/ فەلە. یارمەتی دان.

**تنصیر:** کردنە خاچ پەرست/ مەسیحی.

**تنصیف:** دوونیوە کردن، نیواونیوکردن، لەتکردن، کەرت کردن. بە نیوە گەیشتن.

**تنطَق:** ئاخاوتن، دوان.

**تنظیف:** پاك/ خاوێن کردنەوە.

**تنظیم:** 1) ڕێكوپێك كردن، هەڵ پەرتاوتن، تەكووز كردن، ڕێكخستن، سامان دان، هەڵوەژارتن، هەڵوەژاردن. 2) پێوەكردن، بە داوەوە كردن. 3) هاوتەرازكردن، یەكسان كردن. 4) ڕێكخستن و ئامادەكردن. 5) نووسینی شتێ بە تەكووزییەكی تایبەت و بەپێی ڕێسا. "**تنظیم شده**": ڕێكوپێك كراو، ڕێكخراو، هەڵوەژێراو. "**تنظیم كننده**": ڕێكخەر.

**تنظیمات:** یاسا و كاروباری بەتەكووز.

**تنظیمی:** ڕێكخستنانە. ئەندانی ڕێكخراو.

**تنعیم:** حاڵ خۆش كردن، خستنە ناز و نێعمەت و حاڵ خۆشییەوە.

**تنغیض:** تێكدان و هەڵتەكاندنی ژیانی كەسێك.

**تنفَخ:** باكردن، هەڵمسان، هەڵماسین، پەنەمان، ئەستووربوون.

**تنفّذ:** دەست ڕۆیشتن، دەسەلاتدارەتی.

**تنفّر:** بێزاری، بێزاربوون، جاڕس بوون، رق، قین، نەڤیان، ناخۆش ویستن، ناخۆش گەرەك بوون.

**تنفرانگیز:** بێزاریهێن، قێزەون، جاڕزكەر.

**تن فروش:** سۆزانی.

**تنفّس:** هەناسەدان، هەناسەكێشان، نەفەس كێشان، پشوودان، حەسانەوە. "**تنفس مصنوعی**": هەناسەدانی دەستكرد، ماچی ژیانەوە. "**تنفس هوازی**": هەناسەدانێ كە لە ڕێگەی ئۆكسیژنی هەواوە ئەنجام دەدرێ.

**تنفیذ:** جێبەجێكردن، بەجێهێنان، هەڵسووڕاندن. ڕەخنەكردن و تێپەڕین لە شتێك وەك تێپەڕینی تیر لە نیشانە. واژۆكردن بە نیشانەی تەئییدكردنی بڕیار یان بەڵگەیەك. پشت ڕاستكردنەوە.

**تنفیر:** بڕوانە: "ڕماندن".

**تنفیس:** لەناوبردنی خەم و خەفەت.

**تنقّل:** 1) جێگۆڕین، جێگوازتنەوە، گوێزانەوە.2) مەزە/ سوێرەمەنی خواردن.

**تنقیب:** كۆڵین، كۆڵینەوە، هەڵكۆڵین. گەڕان.

**تنقیح:** خاوێن كردنەوە، بژاركردن، پوختەكردن.

**تنقید:** ڕەخنەگرتن/ لێگرتن.

**تنقیص:** كەم كردنەوە، داشكاندن. بە ناتەواو و نیوەچڵ زانین.

**تنك:** (تُ.نُ) تەنك، تەسك، ناسك. كەم، ئاستەم، تۆسقاڵ. تەنكاو. باریك.





**تنك آب:** (تُ.نُ) تەنكاو، ئاوێ كە قووڵ نەبێ.

**تنكار/ تنكرد:** سروشتی، سروشت. "**تنكردشناس**": فیزیۆلۆژیست.

**تنكارشناسی:** فیزیۆلۆژی، كارئەندام زانی.

**تنكب:** دووری لێكردن.

**تنك دل:** (تُ.نُ) دڵ ناسك، هەستیار.

**تن كردن:** دەبەركردن، پۆشین.

**تنك كردن:** 1) ناسك كردنەوە. 2) لە بارستایی كەم كردن. 3) ڕاخستنی فەرش.

**تنكّر:** خۆنەناس كردن.

**تنك كردن:** (تُ.نُ) 1) پان كردنەوە، ڕاخستنی فەرش لەسەر زەوی. 2) تەنكەكردن، هەڵكێشان و سووك كردنی چاندراوی پڕ.

**تنك مایه:** دەس بەتاڵ. خاوەنی بەهرەی كەم لە ناوەڕۆك یان بەها پێویستەكان دا.

**تنكیس:** سەرەونخوون كردن، سەرەوژێركردن، شۆڕكردنەوە.

**تنكیل:** بەتوندی سزادان یان ئەشكەنجەدان.

**تنگ:** تەنگ، تەنگەبەر، بەرتەنگ، تەسك، ناگوشاد. زۆر كەم.بەرتەسك، داخراو. نەبوونی توانایی ماڵی پێویست. دژوار، سەخت. قایم، بەگوشار، بەتوندی كیپ. دۆڵ، شیو. دەگمەن، كەم وێنە. "**تنگ دل كسی**": زۆر نزیك بەو، لە تەنیشت ئەو.

**تنگ‌آمدن- بە:** وەزاڵە هاتن، تەنگ پێ هەڵچنران، ڕەنجان.

**تنگاتنگ:** بێ مەودا و نزیك بە یەك، زۆر نزیك، زۆرتەنگەبەر، تەك بە تەك.

**تنگ چشم:** 1) كەسێ كە چاوەكانی چووكەیە. 2) بریتی لە ڕژد، چكوس، دەس قووچاو، چاونەزێر، بەرچاوتەنگ.

**تنگ حوصله:** بێسەبر، كەم جیكەڵدان، تەنگەنەفەس.

**تنگ خلق:** بەدخولق، بەدئەخلاق.

**تنگ خو:** بەدخوو، بەدخولق.

**تنگدست:** بریتی لە دەست بەتاڵ، دەستەتەنگ، دەستقالا، دەستكورت، تەنگدەس/ تەنگدەست، كەمدەس، نەدار، بێپارە، بێماڵ، فەقیر.

**تنگدستی:** دەست كورتی، دەست تەنگی، دەست بەتاڵی، نەداری، فەقیری، هەژاری، ناگوزووری، نامانگووری.

**تنگ دل:** دڵ تەنگ، خەمبار.

**تنگ دلی:** دڵ تەنگی، خەمباری.

**تنگ روزی:** نەدار، فەقیر، هەژار.

**تنگسالی:** بڕوانە: "خشك سالی".

**تنگ غروب:** دەمی ئێوارە، دەمەوئێوارە، ئەنگۆرە، تاریكان، كاتی شێوان، وێرەگا.

**تنگ معاش:** دەست بەتاڵ، نەدار.

**تنگنا:** تەنگانە، تەنگاوی، تەنگاڤی، تەنگوچەڵەمە، تەنگەبەر(ی)، تەنگژە، تەڵزگە، بەرتەنگ، لێقەومان، بێدەرەتانی، دژواری، گوشار. دنیا.

**تنگناهراسی:** ترس ڕێ نیشتن لە شوێنە بەرتەنگ و داخراوەكان.

**تنگ نظر:** بەرچاوتەنگ، بەرتەسک ڕوان، کورت بین، بیرتەسك.

**تنگ نظری:** کورت بینی، بەرچاوتەنگی.

**تنگ نفس:** هەناسەسوار، پشووسوار، پشووکورت، بەرهەنگدار، بیهن کورت.

**تنگ و ترش:** زۆر تەنگ.

**تنگه:** تەنگەلان، تەنگە، دەروو، تەسکایی لە زەریا، جێگەی تەسك بوونەوەی دەریا، دەریای نێوان دوو چیا.

**تنگ هم:** زۆر نزیك بەیەك، بەیەکەوە چەسپاو.

**تنگی:** 1) تەنگ بوون. 2) باریکی، کەم بەرینایی. 3) لە تەنگانەدابوون. 4) سەختی، دژواری. 5) وشکەساڵی. 6) کەممی. 7) نزیکی. 8) گوناح، تاوان. "**تنگی معاش**": دەست بەتاڵی، نەداری.

**تنگیاب:** بڕوانە:"نایاب".

**تنگی کردن:** 1) گوشار هێنان بەهۆی بەرتەسك بوون. 2) تووشی هەناسەبڕکێ هاتن. 3) دریغیکردن، خستنە تەنگانەوە.

**تنگی نفس:** بەرهەنگ، نەخۆشی تەنگەنەفەسی، هەناسەبڕکێ، هەناسە بڕکە، هەناسکە بڕێ، هەناسکە بڕکێ، دەف دان، دڵ توند لێدان.

**تن لش/ تنەلش:** تەوەزل، تەمبەڵ و بێکار.

**تنمس:** ڕیابازی و ڕواڵەت نوێنی.

تنمندگری: بڕوانە:"تجسم".

**تنمیق:** نووسین.

**تنمیه:** 1) گەشەپێدان، گەشاندنەوە، پەرەپێدان. 2) دووزمانی، شۆفاری.

**تننده:** بڕوانە: "بافندە".

**تن نمایی:** لەش نوێنی، خۆ ڕووت کردنەوە، exhibitionism.

**تنو:** هێز، توانایی.

**تن و توش:** 1) بڕوانە: "تاب و توان". 2) ئەندام و جەستە.

**تنودن:** بڕوانە: "تنیدن".

**تنوّر:** ڕووناك بوونەوە، کەوتنە بەر ڕۆشنایی ئاگر.

**تنوع:** جۆراوجۆری، هەمەجۆری، ڕەنگاڵەیی، ڕەنگاوڕەنگی، فرەچەشنی، هەمەچەشنی."**تنوع طلب**": فرەچەشن خواز.

**تنورەکشیدن:** لە حاڵی چەرخانەوە چوون بە حەوادا.

**تنومند:** باهۆدار، زەلامو بەتاقەت، زەلامی قەڵەو، مرۆی زەلام و ئەستوور، زنتۆل، شاقەڵدار، کەڵێن، زەبەلاح، گەبەزە، زلە، بەخۆوە، هێقم، زەگوردە، زەگەردوگ، زەگزەگە، لەشگرس. "**تنومند احمق**": گەلحۆ، گەلهۆ، حاپۆل، حەپۆل، تەژە. "**تنومند بیکارە**": زۆپۆ، زەلامی تەوەزەل.

**تنویر:** ڕۆشنگەری، ڕوونکردنەوە، تێ گەیاندن.

**تنویم:** خەواندن، کردنەخەو، خەفاندن، نواندن.





**تنوین:** دووژێر یان دووسەر یان دووبۆر کە لە دوای هێندێك وشەی عەرەبییەوە دێن و بە دەنگی "نون" دەردەبڕدرێن وەك "عامداً. عبدٍ. جندٌ". واتە دوای وشەکە کردنە "نون".

**تنویه:** ڕێز لێنان، ستایش کردن، بەباشی باسی کەسێك کردن.

**تنها:** تەنیا، تەنێ، تاقە کەسە، تاقە شتە.

**تنهایی:** تەنیایی، بێهاودەم و بە تاك کەوتنەوە.

**تنیدن:** 1) تەنین، چنین. 2) بڕوانە: "تلقین". 4) بە دەورووبەری شتێکدا خولانەوە.

**تنیده:** تنراو، تەندراو، تەناو، کر، ڕایەڵی پۆ تێوەردراو.

**تو:** 1) تۆ، ئەنگۆ، ڕاناوی دووهەم کەسی تاك. 2) نێو، ژوور. "**تو آمدن**": هاتنەژوورەوە، هاتنەناوەوە.

**توّاب:** 1) گوناە بەخش، لێبوردو. 2) تۆبەکار و گەڕاوە لە گوناە.

**توابع:** 1) کۆی"تابع" بە مانای پێڕەو و پێڕەوی کار. 2) سەربە. 3) دەرەنجامەکان، ئاکامەکان، شوێنەوارەکان. 4) خزمەتکارەکان، نۆکەرەکان. 5) ئەو شتانەی کە بە جێگا یان شتێ زیاد دەکرێ.

**توابیت:** کۆی"تابوت".

**تواتر:** پەیتا پەیتا، لەپەستا، بە دوی یەکتری، لە دوی یەك هاتن. (فیزیك) فرەکانس.

**تواجه:** ڕووبەڕووبوونەوە دە گەڵ یەکتر.

**توارث:** میرات لێك گرتن، میرات دان بە یەکتر.

**توارثی:** ژێنێتیك.

**توارد:** پەیتاپەیتا گەیشتن، لە یەك کات دا گەیشتن.

**تواری:** خۆشاردنەوە، خۆداپۆشین، لە چاو ونبوون. دەربەدەری، ئاوارەیی.

**تواریخ:** کۆی" تاریخ".

**توازر:** پشتیوانی لەیەکتر.

**توازن:** هاوڕێکی، هاوکێشی، هاوسەنگی، بارتەقایی، هاوتایی، هەمبەری. "**توازن طبیعت**": هاوسەنگی سروشت. "**توازن مستقر**": هاوسەنگی جێگیر. "**توازن هجایی**": هاوسەنگی بڕگەیی.

**توازی:** هاوتەریبی، ڕێکی، هاوڕێکی. هاوئاراستە یان هاوکات بوون.

**تواصل:** پێك گەیشتن، بە یەکتر گەیشتن، بە یەکتر پەیوەست بوون.

**تواضع:** خاکەڕایی، خۆشکێنی، خاکێتی، خۆ بە کەم زانین/ گرتن.

**تواطؤ:** دەگەڵ یەك سازان، ڕێککەوتن، پێکهاتن.

**تواعد:** وادە و بەڵێن پێك دان.

**توافر:** زۆر بوون، فرەبوون، فرەیی، پتربوون.

**توافق:** رێککەوتن، رێکەوتن، پێکهاتن، کۆك بوون، سازان، لێك نزيك بوونەوە، هەڤگهان، قەولوبڕ، قەولوبڕی، لەڤ هاتن، هاودەنگی، هاوڕایی.

**توافقنامه:** رێککەوتننامە.

**توافى:** دە گەڵ يەکتری ئەمەگداری نواندن/ پەيمان بردنە سەر. دە گەڵ يەك تەواوکردن، تەواو و کامڵ بوون.

**توالد:** زاوزێ کردن، زاوزوکردن، زان، منداڵ خستنەوە.

**توالى:** پەيتاپەيتا، بەردەوام، بەدووی يەکاهاتن، يەك لەدوويەك، بەرودوا.

**توان:** بڕ، بڕس، برست، توانست، توانشت، تابشت، تەشە، وزە، ئاوزان، ئاوزيان، ئاوزين، دەگەر، دەسەڵات، هێزوتوانا، تاقەت، کومسە، قام، پێشکان، حێل، دەربداری، زدێ.

**توانا:** بەهێز، هێزدار، هێزان، بەتاقەت و توان، بە وزە، بەقەوەت، شێنا، توانا، دەسەڵاتدار.

**توانایی:** هێز، تابشت، وزەوتاقەت، بارە، شێناهی، توانایی، دەسەڵات، دەڤخۆر.

**توانایی پیدا کردن:** وزە و هێز پەيداکردن، پێکران، لە دەست هاتن.

**توانبخش:** وزەدەر، هێزنك.

**توان بخشیدن:** هێزدان، بەهێزکردن، وزەپێدان.

**توان خواه:** کەسی کەم ئەندام کە سەردانی توانایی بەخشين دەکا يان لەژێر چاوەدێری ئەو ناوەندە دايە.

**توان دهى:** بڕوانە: "تقويت".

**توانستن:** توانين، تانين، لە وزە دابوون، پێکران، بۆکران، بۆلوان، بۆ گونجان، بۆ هەبوون ( بۆم هەيە بێم؟) لەدەست هاتن، قارين، شيان، چەليان، کارين، تاقەت هێنان، توانستن. ئيزن هەبوون.

**توانش:** توانست، توانایی، هێز.

**توانفرسا:** دژوار، سەخت، کەمەرشکێن، تاقەت پڕوکێن.

**توانگر:** دارا، ماڵدار، ساماندار، دەوڵەمەند، زەنگين. توانا، بەهێز.

**توانگرى:** توانایی، هێز، دەسەڵات، سامانداری.

**توانمند:** بەبڕشت و کارامە، بەتوانا، خورت، نيرگ، بەتاقەت، هێزوقەوەت دار.

**توانى:** سست بوون، سستی، خاوێتی، ساوەساو، گنخاندن.

**تواهب:** بە يەکتر بەخشين.

**تواهى:** بڕوانە: "تباهى".

**توأم:** 1) هاوکات، دەگەڵ. 2) جمك، هاوزا، هاوزگ، دووانە.

**توأماً:** دەگەڵ يەك.

**توبه:** (تَ.بَ) تۆبە، پەشيمانی، پەژيوان بوون لە گوناه، پاشگەزبوونەوە، گەڕانەوە. "**به توبه**": تۆبەکار.





**توبه:** (تُ.بَ) بڕوانە: "قوس قزح".

**توبه‌تو:** بڕوانە: "تودرتو".

**توبه‌کار:** پاشگەزبۆوە لە گوناه، تۆبەکار، تۆبەدار.

**توبه‌فرما:** بانگهێشتکەری خەڵکانی دی بۆ گەڕانەوە لە گوناح و کاری دزێو.

**توبه نصوح:** تۆبەی حەتمی و راستەقينە کە هيچ کات نەشکێنرێ.

**توبيخ:** سەرکۆنەکردن، سەرزەنشت کردن، تەمێ کردن، سزا دان.

**توپ آمدن:** تانەلێدان، تەشەر خستن.

**توپ انداختن:** هاويشتنی گوللە تۆپ.

**توپ خالى:** بريتی لە هەڕەشەی بێ‌بناغە.

**توپر:** 1) ناوپڕ، سمڕاو، پێچەوانەی بەتاڵ و پووچ. بريتی لە کەسی بەئەزموون و کارزان.

**توپ و تله:** هات و هاوار، هەراوهوريا.

**توپوگرافى:** نەخشەهەڵگرتنەوە لە شوێنێك يان زەمينێك بە شيکردنەوەی چۆنيەتييەکەيەوە.

**توپى‌آمدن:** خۆهەڵکێشان، بەخۆداهەڵگوتن.

**توپيدن:** بە توندی لۆمەکردن، تەشەرلێدان.

**توتاليتاريسم:** 1) گشت خوازی، شێوازی حکوومەتی تووتاليتێر. 2) حکوومەتی تەك حيزبی.

**توتاليتر:** جۆرێ رێژيمی سياسی لەسەر بنەمای ئيدئۆلۆژيك يان تاك حيزبی و کەمتەرخەم نيسبەت بە ئازادييەکانی تاکەکەسی. حکوومەتی رەها و ديکتاتۆر، قەرەقووشی، حوکمی لاساری.

**توتاليسم:** يەك پارتی، يەك دەسەڵاتی.

**توتك:** خەزێنە، گەنجينە.

**توتميسم:** بڕوا بە هێندێ لە دار و ئاژەڵەکان کە لە کۆن دا لە نێوان هەندێ قەوم و تيرەکان دا برەوی هەبووە.

**توثيق:** قايم کردن، پتەو کردن، متمانە پێکردن.

**توجبه:** بڕوانە: "سيلاب".

**توجّع:** ئێشان، ئێش پێگەيشتن، ژان کردن. هاودەردی کردن.

**توجّه:** ئاوڕدانەوە، لاوەلێکردن، لاکردنەوە، رووتێکردن، سەرنج/ سرنج دان.

**توجهات:** کۆی"توجه"، دلۆڤانييەکان، ئاوڕلێدانەوەکان.

**توجيه:** 1) پاساو، پاکانە.2) رووتێکردن لە شتێك، ئاراستەکردن.

**توجيه پذير:** پاساوهەڵگر، شياوی پاساودان.

**توجيه‌شدن:** قانع و رازی بوون، تێگەيەنران. پاساودران.

**توجيه‌کردن:** پاساودان، پاساوکردن، بەڵگەدارکردن، تێگەياندن، لێ‌گرێدان، تێگرتن، ئاراستەکردن.

**توجيه‌گر:** پاساودەر.

**توجیهنا پذیر:** پاساوهەڵنەگر.

**توجیهی:** پاساوکاری(انە)، پاساودەرانە. ڕێنمایی، ڕێنوێنی.

**توحّد:** تەنیا و تاقانە بوون، تاقانەیی.

**توحّش:** 1) سڵەمینەوە، سڵەمانەوە، ڕەوینەوە، ترس و خۆف هەبوون. 2) کۆڤێتی، دڕندایەتی، دڕندەیی.

**توحید:** تاك خودایی، یەکتاپەرستی، یەك پەرستی، بروا هێنان بە تاك و بێ هاوتایی خودا. یەکاندن.

**توخالی:** ناو بەتاڵ، ناوخاڵی، ناوك پووچ، هەڵۆڵ، هڵۆڵ، قوێرە، کلۆر، کرۆر، کورۆڵ، والا، پیچ، پووچ، پووك.

**توختن:** دورین، تێرۆکردن، دەرهێنان.و هەروەها بە مانای گەڕان، ویستن، وەدەست هێنان و پاشکەوت کردن دێ.

**توخشتی:** تازە لە دایك بوو.

**تودار:** قین لە زگ، بوغز لە زگ، ڕکوونی، دەخەس، ڕق لە سك، نەهێنبڕ، دەبنەوەبڕ، سەرکزۆلکەی بەدفەڕ.

**تودّد:** دەربڕینی خۆشەویستی، خۆشیرین کردن.

**تودرتو:** پێچاوپێچ، پێچەڵاوپێچ.

**تودل برو:** بروانە "دوست داشتنی".

**توده:** جەماوەر، کۆگەل، کۆمەڵ، کۆمەڵتە، کۆ، کۆم، کۆما، کۆگا، تۆپەڵ، ئاپۆرە، تەپ.

**تودەای:** 1) جەماوەری، کۆگەلی. 2) خێڵەکی، ڕەمەکی. 3) ئەندامی حیزبی توودە.

**تودەشناسی:** ناسینی کۆمەڵانی خەڵك، جەماوەر ناسی.

**تودەوار:** جەماوەرئاسا، کۆمەڵ/ کۆگەل ئاسا.

**تودەهای متعصب:** کۆمەڵانی دەمارگرژ.

**تودەهای مردم:** کۆمەڵانی خەڵك.

**تودیع:** ماڵئاواییکردن، خواحافیزیکردن، بەڕێکردن. پێسپاردن.

**تورّط:** کەوتنە قوڕ و چڵپاوەوە، تێوەگلان، تووش بوون، گیرکردن.

**تورّع:** پارێزکردن، پەرهێزکردن، خۆپاراستن، دوورەپەرێزبوون، خۆپارێزی، پاك داوێنی.

**تورفتگی:** داتەپین، تەپین، قووپان، تێك قووپاوی، ڕۆچوویی.

**تور کردن:** خستنە تۆڕەوە.ترساندن و ڕەواندنەوە.

**تورّم:** ئاوسان، هەڵاوسان، ئەستووربوون، هەڵامسان، هەڵمسان، هەڵماسیان، هەڵماسین، ماسین، پەنەمان.

**تورّم اقتصادی:** ئاوسانی ئابووری، چوونەسەری هەمەلایەنە و هەمیشەیی نرخی کاڵاکان.

**تورّم پول:** ئینفلاسیۆن، چاپ و بڵاوبوونەوەی لە ڕادەبەدەری پارە کە ببێتە هۆی چوونە سەری نرخەکان و دابەزینی بەهای پارە.





**تورّم زدایی:** ئاوسان سڕینەوە، هێنانەخواری ئاوسان(لە ڕێگەی بەرگریکردن لە چاپ و بڵاوبوونەوەی لە ڕادەبەدەری پارە)، deflation.

**توریث:** میرات دان، میرات دانان، کردنە میراتگر.

**توریـد:** (تَ) گوڵ کردنی دار، ڕوخسار کرانەوە/ گەشانەوە.

**توریدن:** شەرمەزار بوون، سڵەمینەوە، ڕەمینەوە.

**توریست:** توریست، گەشتیار، گەڕیدە.

**توریسم:** گەشتیاری، جیهان گەڕی، تووریسم.

**توریط:** تێوەردان، تێوەدان، تێوەگلاندن.

**توریه:** 1) داپۆشین و شاردنەوەی حەقیقەت، بە پێچەوانەی حەقیقەت نیشان دان. 2) (ڕێزمان) توانج پۆشی، ئەوەیە کە وشەیەك دوو مانای هەبێ یەکی دوور و یەکی نزیك.

**توزدن:** 1) ڕەخنەکردنە ناوەوە، چوونەژوورەوە. 2) وازهێنان لە بڕیار یان بەڵێنی خۆت.

**توزّع:** بڵاوبوون، لێك بڵاوبوون، لە نێوان خۆ دا دابەش کردن.

**توزنده:** پەزمەندەکەر. گەڕێن، پەیجۆر.

**توزیدن:** بروانە: "توختن".

**توزیع:** دابەشکردن، دابەشین، دابەش دابەش کردن، بەشینەوە، دابەشینەوە، بڵاوکردنەوە، پەخشان کردنەوە، وەشانەوە، وەشاندنەوە، بەخشینەوە، پایکردن. "**توزیع کننده**": دابەشکەر.

**توزین:** 1) خۆ ئامادە کردن بۆ قبووڵ کردنی کارێك، دەربردن لە ژێر قورسایی کارێك دا. 2) کێشان، کشان، سەنگان، هەڵسەنگان، بەراوردکردنی کێش، ڤەکێش، کڕانتش.

**توسّخ:** پیس و چڵکن بوون.

**توسری:** 1) چەپۆك، لاپ، ماپووك، بەپانی دەست لەسەردان. 2) بریتی لە سووك کردنی کەسێك، سەرزەنش و قسەی سووك.

**توسریخور:** پەست و زەبوون، کەسێك کە لە لای هەمووان سووك و چرووك بێ.

**توسّط:** 1) میانەڕۆیی، ناوبژیکاری، بەرەڤانی. 2) لەلایەن، بەهۆی.

**توسّع:** والابوون، بەرفراوان بوون، بەرفرەبوون، هەراو/بەرین بوون.

**توسعه:** پەرەسەندن، پەرەگرتن، برەوسەندن. "**توسعەدادن**": پەرەپێدان، برەوپێدان. "**توسعەطلبی**": زێدەخوازی، فرەخوازی. "**توسعه یافتن**": بروانە:"توسعە". "**توسعە یافتە**": پەرەگرتو، پەرەسەندوو، پێشکەوتوو. "**توسعە نیافتە**": پاشکەوتوو، دواکەوتوو، گەشەنەکردوو. "**درحال توسعە**": پەرەئەستێن، پەرەستێن، لە حاڵی پەرەسەندندا.

**توسڵ(جستن):** پەنابردن، پەنابردنەبەر، دەسەوداوێنی، دەستەوداوێن بوون، بەکارهێنان، لاباسک، پاڕانەوە، لالانەوە، لالهی، لالەیی.
**توسیط:** لە نێوەڕاست دا کردنە دوو بەش. کردنە نێوبژیکار.
**توسیع:** پەرەپێدان، بەرفراوان کردن، والاکردن.
**توسیم:** لە کاتی خۆی دا هاتن. داخ کردن.
**توش:** تاقەت، توانایی، وزە، لەش، جەستە، تێشو.
**توشدان:** تۆشەبەرە، توێشوبەرە، توێشودان، هەگبە، چەنتك.
**توشە:** تێشو، توێشو، تۆشك، تۆشە، توێشە، تیشە، راشەن، سەرشان، بژیوی سەفەر.
**توشەدان:** بڕوانە: "توشدان".
**توشیح:** رازاندنەوە، رازاننەوە، تاراپێداداان. رازانەوەی نووسراوەیەك بە مۆر و واژۆی خۆ. **"توشیح کردن"**: مۆرلێدان یان واژۆکردنی بڕیار و نامەکان لەلایەن پاشا و گەورەکانەوە.
**توشیم:** خاڵ کوتان.
**توصل:** بە شتێك گەیشتن.
**توصیف:** پەسن کردن، پەسندان، پێداهەلگوتن، پێداهەڵدان، وەسف کردن، وەسفین، وسفین، تاریف کردن.
**توصیفی:** وەسفی، پەسنی.
**توصیە:** وەسیەت کردن، راسپێری، راسپاردن، قەوینتی، قەویتی.
**توصیەنامە:** راسپێرنامە.
**توضیح:** روونکردنەوە، رۆشن کردنەوە، شیکردنەوە، ئاشکراکردن، دەرخستن. لێکدانەوە. **"توضیح واضحات"**: شیکردنەوە یان لە سەرڕۆیشتنی بابەتێ کە دیار و روونە.
**توضیحی:** شیکردنەوەیی، شیکردنەوانە، روونکەرەوانە، روونکارانە.
**توطئە:** 1) پیلان، کەین، کەینو بەین، سازوباز، نەخشە، تەگبیر کردن دژی کەسێك. 2) ئامادەکردن، رێك کردن، بوار رەخساندن.
**توطئەچینی:** پیلان گێڕان، پیلان بازی، نەخشەکێشان.
**توطئەکار:** بڕوانە: "توطئەگر".
**توطئەگر:** پیلانگێڕ، پیلان باز.
**توظیف:** دامەزراندن، مووچەخۆر کردن.
**توعد:** پەیمان و بەڵێن دان. ترساندن.
**توغل:** زۆر خەریك بوون بە کارێکەوە و تێوەگلان تێی.
**توغل کردن:** زێدەڕۆییکردن.
**توف:** هەراوهوریا، داد و هاوار، قاڵمەقاڵم.
**توفان:** گوڕ و تین، کەفوکوڵی دەریا، تێکچوونی کەش و هەوا و هەڵکردنی بای توند.
**توفر:** زۆر و زەوەندە بوون. پاراستنی حورمەتی کەسێك. دانی هەقی شتێ بەتەواوی.





**توفیدن:** گوڕاندن، نەڕاندن، هەراوهوریاکردن. جووڵانەوە، بەتوندی لەرینەوە.
**توفیر:** 1) جیاوازی.2) پترکردن، زۆر کردن، تەواو کردن، دانی هەقی کەسێك بە تەواوی. 3) پاشەکەوت. 4) بڕوانە: "صرفەجویی". 5) سوود، بەهرە. **"توفیر داشتن"**: جیاوازی هەبوون. **"توفیرکردن"**: جیاوازبوون. قازانج کردن، سوود کردن. زیادکردن، زۆرکردن.
**توفیق:** سەرکەوتن. یارمەتیدان.
**توقد:** گەشبوونەوە، کڵپەسەندن، بڵێسەکێشان.
**توقع:** چاوەڕوانی، لە چاوەڕوانی روودانی شتێك دا بوون، هیوا و تکا.
**توقع داشتن:** چاوەڕوانی لێکردن، پێداپەڕموون.
**توقف:** وەستان، وەستانەوە، وێستان، وێسان، راوەستان. **"توقف کوتاە"**: وچان گرتن، پشوودان، وێستانی کەم، هەڵوەستە، هەڵوێس. **"توقف سنج"**: پارکۆمیتر. **"توقف گاە"**: وێستگە.
**توقی:** پارێزکردن، خۆپاراستن.
**توقیت:** وەخت دانان، کات دیاری کردن. **"توقیت قیاسی"**: کاتی پێوانەیی.
**توقیر:** رێز گرتن.
**توقیع:** واژۆکردن، مۆر کردن.
**توقیف:** 1) راگرتن، وەساندن، راوەستاندن. 2) گرتن، دەستگیر کردن، بەندکردن. 3) داخران، داخستن.
**توکد:** پتەوبوون، قایم بوون، خاترجەم بوون.
**توکل:** پشت بەستن، پشت پێ بەستن، پاڵ پشتی، پشت گەرمی، متمانە پێکردن.
**توکید:** جەخت کردن. پتەوکردن، قایم کردن.
**توکیل:** کردنە نوێنەر، لە جێدانان، کار پێسپاردن.
**تولا:** بڕوانە: "تولی".
**تولد:** هاتنەدنیا، لەدایك بوون، زان، زایین، منداڵ بوون. هاتنەدی، وەدیهاتن.
**تولع:** تەماکار بوون، چاوچنۆك بوون.
**تولك:** 1) زیرەك و چالاك، چەلەنگ. 2) مەلی پەڕ و باڵ هەڵوەریو.
**تولك رفتن:** پەڕ و باڵ هەڵوەرینی باڵندە تا پەڕ و باڵی تازە بە جێی بڕوێتەوە.
**تولکی:** بڕوانە: "گنداب".
**تولی:** 1) سەرداری کردن. 2) وەئەستۆ گرتنی کارێك و بەڕێوەبردنی. 3) کردنە وەلی. 4) دۆستایەتی کردن.
**تولیت:** 1) کردنە والی/ حاکم. 2) سەرپەرشتی کارێك بە کەسێك سپاردن.
**تولید:** وەدیهێنانی شتێ لە شتێکی دیکەوە، دەسهات، رەنێوهات، بەرهەم، هل بەر، حاسڵ.
**تولیدانبوە:** بەرهەم هێنانی زۆر. بەکاربردنی شێوازە فەننییە پێشکەوتوەکان بۆ بەرهەمهێنانی کاڵا بە رادەیەکی زۆر.

**تولیدکردن:** بەرهەم هێنان، حاسڵ کردن، لێ پەیداکردن، هەڵ بەرێنی. سازکردنی فیلم. "**تولیدکننده**": بەرهەمهێنەر، بەدیهێنەر، هل بەرێن.

**تولیدمثل:** زاووزێ، منداڵ خستنەوە.

**تولید معاش:** رەنیوهێنانی بژیوی ژیان، نان پەیداکردن.

**تولیدن:** رەوینەوە، بەرەو لایەك رۆیشتن، دوورکەوتنەوە.

**تولید ناخالص:** بەرهەمی پوخت نەکراو.

**تولیدی:** کارگەی بەرهەم هێنی کالا. بەرهەم هاتوو، بەرهەم. بەرهەمهێنان.

**تومور:** گرێ، ئالگ، لوو، هەڵتۆقین، هەڵمسان.

**توهّم:** گوتەی وەهماوی، وەهم، گومان بردن، کەوتنە گومانەوە، لێتێکچوون، بەهەڵەداچوون، خەیاڵ پڵاوی، پێوابوون، ساویر.

**توهّم واقعی:** وەهمی (واقیع/ راستەقینە).

**توهیم:** خستنە گومانەوە، خستنە وەهم و خەیاڵەوە، بە هەڵە دابردن.

**توهین:** 1) سووکایەتیپێکردن، بێ حورمەتی پێکردن، ئەتك کردن. 2) سست و لاواز کردن. 3) هێنانەخوار، کەم کردنەوە.

**توهین آمیز:** سووکانە، بێئەدەبانە.

**تویدن:** سووربوونەوە، گەرم بوونەوە، داغ بوون، توانەوە.

**تهاتر:** 1) ماڵ بەماڵ، گۆڕینەوەی کالا بە کالا. 2) بە درۆخستنەوەی شایەتی یەکتر.

**تهاجر:** لێك دابڕان، لێك دوورکەوتنەوە.

**تهاجم:** هێرش کردن، پەلاماردان، هەڵمەت بردن، شالاوبردن.

**تهاجمی:** هێرشکارانە، پەلاماردەرانە.

**تهادی:** 1) دیاری بۆ یەکتر ناردن. 2) رێ نیشان دان.

**تهانی:** پیرۆزبایی لە یەکتر کردن.

**تهاون:** 1) سستی و کەمتەرخەمی، پشت گوێ خستن. 2) بە سووك و چرووك دانان.

**تەئیسم:** 1) بڕوانە: "توحید". 2) گیرۆدەیی زۆر بە چایی.

**تهبّج:** بڕوانە: "تورم".

**تەبندی:** 1) تابەنی، شیرازەچنی، بن چنین. 2) خواردنی کەمێك خواردەمەنی پێش لە خواردنەوەی شەراب.

**تهتّك:** ئابڕوو چوون/ تکان، ناوزڕان، خەنزاری.

**تهجّد:** شەونوێژ، نوێژ لە شەوا پاش هێندێ خەوتن.

**تهجّی:** حینجە/ حونجە کردن.

**تهجیە:** ژماردنی پیتەکان، ژماردنی پیتەکانی وشەیەك و لێك جیاکردنەوەیان.

**تەچهرە:** وردەکارییەکانی روخسار. نیشانەیەکی تایبەتی لە روخساردا.

**تەدلی:** گلەیی، دەردەدڵ.

**تەدوزی:** بن چنین، شیرازەچنی.





**تهدّی:** رێگە دۆزینەوە، رێگە دەر کردن.

**تهدید:** هەڕەشە، گوڕەشە، هەڕەشە و گوڕەشە، نەهیو، گاڵەوگیڤە، گەف، گف، گڤ، گەڤ، گەفوگوڕ، گەڤوگوڕ، گوڕ، هەڕوگیف، هەشەکە، چاوسوورکردنەوە، ترساندن، تاپاڵ.

**تهدیدآمیز:** تێکەڵ بە هەڕەشەوگوڕەشە، هەڕەشاوی، هەڕەشەئامێز.

**تهدید کردن:** هەڕەشە (کردن/ لێکردن)، راخوڕین، گەف کردن، گەف خواردن، هەڕوگیف کردن، هەدیداندن، ترساندن، گەفاندن، چاوسوور کردنەوە، لێ هاندن. "**تهدیدکننده**": گەڤۆك، هەڕەشە کەر.

**تهدیم:** خاپوورکردن، کاول کردن، رووخاندن.

**تهذّب:** پاك بوونەوە لە عەیب و کەم و کووڕی.

**تهذیب:** 1) خاوێن/ پاك کردنەوە، پالاوتن، پوختەکردن. 2) راست کردنەوە، بە شێوازکردن. 3) باش کردنی ئاکار و رەوشت.

**تهذیب نفس:** پاك کردنەوەی دەروون/ پاك بوونەوەی دەروونی.

**تهریب:** 1) رزگار کردن. 2) قاچاخی کردن، رافراندن.

**تهریش:** ئاژاوەنانەوە لە ناو خەڵك، دنەدان دژی یەکتر.

**تهزیل:** کز کردن.

**تهشّم:** 1) شکان، وردبوون. 2) دڵسۆز بوون.

**تهك:** (تَ.هَ) 1) بەتاڵ، خاڵی. 2) رووت، رووت و قووت، پەتی.

**تەکردن:** تاکردن، دوو یان چەند لۆ کردن.

**تەکشیدن:** تەواوبوون، بە کۆتایی گەیشتن.

**تهکّم:** 1) گاڵتەپێکردن، رق و قین هەڵگرتن، فیز و دەعیە کردن. 2) تێك تەپین و وێران بوون.

**تهلکه:** 1) لە ناو چوون، تیاچوون. 2) جێگەی مەترسی، تالوکە.

**تهلیك:** لە ناو بردن، تیابردن.

**تهلیل:** تەلیلە، گوتنی "لا اله الا اللّه" بە کۆمەڵ، ستایش کردن.

**تەمانده:** بەرماوە، پاشماوە.

**تهمت:** بوختان، تۆمەت، تیتاڵ. بەد گومانی.

**تهمتن:** باهۆدار، زەلام و بەتاقەت، زەلامی قەڵەو، زەبەلاح، زنتۆل، بەهێز، خورت، دلێر.

**تەنشین:** تلپ، تلپە، تلتە، ملت، ملتە، خلتە، لیرد، غلفۆش.

**تەنشین شدن:** ڤەنشتن، تانشین، چوونە خواری تلتە، خرتوخاڵ نیشتن.

**تهنیت:** پیرۆزبایی گوتن/ کردن.

**ته و تو:** بنج و بناوانی کار و حەقیقەتی بابەتێك.

**تهوّر:** 1) رووخاندن و کاولکردن. 2) بێ باکی، دلێری، نەترسی، وێرایی، بوێری، سرتی، موکوری. 3) ستەم، زوڵم.

**تهوّع:** فرتك، دڵبەیەکا هاتن، (هەڵنج/ هێڵنج/ هۆڵنج) دان، بڕك، حۆق، هێق، هەراژ، سەرەتای رشانەوە، دەنگی بەر لە رشانەوە.

**تهوّل:** بە سام بوون، ترسناك بوون.

**تهوّم:** وەنەوز بردنەوە.

**تهویل:** ترساندن، بزداندن.

**تهویم:** سووکەخەو، سەرخەو.

**تهویّە:** هەواگۆڕکێ، هەواگۆڕین، هەوا فێنك کردنەوە.

**تهی:** بەتاڵ، خاڵی، فاڵا، ڤالا، والا، پووك، بێ ناوك، نوڕ. بێناوەرۆك، بێنرخ، بێ مانا. بێهوودە، پووچ.

**تهی‌چشم:** 1) بڕوانە:"حریص". 2) کوێر.

**تهی‌دست:** بڕوانە: "تنگ دست".

**تهیّج:** ورووژان، هەڵخڕان، هەڵچوون، هان دران.

**تهیدست:** دەس تەنگ، دەس کورت، دەست بەتاڵ، دەست والا، دەسهاڵی، هەژار، نەدار.

**تهیگاه:** کەلەکە، کێلەکە، کێلەکێ، لاکاول، خاڵیگە، قەبرغە، تەڕیزە، برك، لاپاڵوو، نێڤ تەنگ.

**تهیم:** کەسێك کە تۆمەتی لێدرابێ.

**تهی مغز:** بێ مێشك، دەبەنگ، سەرخلۆل، کەللەبۆش، بێ ئاوەز، حەپۆلی کەم فام، قاف قلۆر.

**تهیّە:** ئامادەکردن، سازکردن، رێکخستن.

**تهییج:** ورووژاندن، هەڵبزواندن، دنەدان، وە جووڵە خستن، گەمەکردن بە هەست و سۆزی کەسێك. "**تهییج شدن**": ورووژان، هەڵخران.

**تیّار:** 1) ئامادە، ساز، تەیار. 2) شەپۆل، پێل. 3) فیزن، خۆبەزلزان، لووت بەرز. 4) تەوژم.

**تیّار کردن:** ئامادە کردن، ساز و تەیار کردن.

**تیب:** مات، وڕ، بێئوقرە، تەنگاو، تەنگەتاو.

**تیپ:** 1) گروپێکی رێکوپێك لە خەڵك، پۆلێك لە خەڵك. 2) بەشێك لە هێزی ئەرتەش. 3) نموونە، سەرمەشق. "**بە تیپ هم زدن**": تێکهەڵچوون، دەرگیربوون.

**تیپازدن:** تێهەڵدان، بە شەق لە یەك دان.

**تیپ شناسی:** تیپۆلۆژی، موتاڵا و پۆلێن کردنی یاسامەندی ئەو نموونە و سەرچەشنانەی کە تایبەتمەندی هاوبەشیان هەیە.

**تیتال:** فێڵ، فریو، کلکە سووتە، مەرایی.

**تیتیش مامانی:** ناسك نارنجی، نازپەروەردە.

**تیر:** تەخش، تیر، بەش.

**تیراژ:** 1) راکێش، راکێشەری. 2) تیراژ، ژمارەی رۆژنامە و گۆڤار و کتێب کە بە جارێك دەردەچێ.

**تیرانداز:** تفەنگاوێژ، تیرهاوێژ، تیرئەناز.





**تیراندازی:** تەقە کردن، تیر (هاویشتن/ هاویژتن)، پێوەنانی گوللە، نایینەپا.

**تیرباران:** تیرباران، تیرەباران، گوللەباران، کوشتنی کەسێك لەلایەن دەوڵەتەوە بە فیشەك.

**تیر خوردن:** پێکران، هەنگاوتران، بریندداربوون. "**تیرخورده**": پێکراو، هەنگاوتە، ئەنگافتە، ئەنگاوتوو، ئەنگواو.

**تیردان:** تیردان، هەگبەی تیران، فیشەك دان، فیشەکبەند، فیشەك لغ، فیشەك لۆخ، خەریتە.

**تیررس:** تفەنگ هاوێژ، هەتەر، مەودای تیر گەیشتنێ.

**تیر کردن:** هاندان و ناچارکردنی کەسێ بە ئەنجامدانی کارێ. دابەش کردن.

**تیرك زدن:** فیچقەکردنی ئاو لە کونی باریکەوە.

**تیرکش:** بڕوانە: "ترکش".

**تیرکشیدن [بدن]:** تەزووی بەژان، بریسك، برووسك، مچوڕك، ڤەکێشك.

**تیرگر:** تیر ساز.

**تیرگی:** تاریکی، لێڵی، رەشی، تەم.

**تیروار:** مەودایەك کە تیر دەیبڕێ.

**تیره:** 1) بەرە، تیرە، تایفە، تایەفە، بڕبڕە، بەشێك لە هۆز. 2) تاریك، ئاماڵ رەش، لێڵ. 3) پڕڕەنگ. 4) کوێر. 5) نادۆستانە.

**تیره بخت:** بڕوانە: "بدبخت".

**تیره پیکر:** بڕوانە:"شبح".

**تیره‌چشم:** کوێر.

**تیره‌دل:** دڵ رەش، گومڕا، دڵ پیس، بەدخواز.

**تیره‌رای:** بیرخراو، بیرچەوت، نادروست.

**تیره روان:** دەروون رەش، دڵ رەش.

**تیره روز:** رۆژ/ رۆژگار رەشی، بەخت رەش، چارەڕەش، نەگبەتی، بەوبەخت، کلۆڵ.

**تیره و تار:** تاریکە، رەش و تاری.

**تیز:** 1) بڕوانە: "برنده". 2) توون، تیژ. 3) درێژ و دەنووکدار. 4) وریا، چاوتیژ. 5) کاریگەر. 6) توند، خێرا. 7) بەهێز، قەوی. 8) بەتوندی، بە توندوتیژی. 9) بەبرەو. 10) بەدخوڵق و تووڕە. 11) خێرایی لە کار کردن دا. "**تیز دادن**": تڕین، تڕ بەردان، تڕ لێبەربوون.

**تیزآب:** خوڕ، خوڕێن، ئاوهەڵدێر.

**تیزبال:** تیژ باڵ، فڕا، فڕۆك، زۆر لە فڕین خێرا.

**تیزبین:** چاوتیژ، چاو روون، چاڤمار. بریتی لە کەسێکی وردبین و زیتەڵ و بەهۆش، وریا.

**تیز بینی:** وردبینی، کونج پشکنی، وریایی.

**تیزپا:** تیژڕەو، خۆشبەز.

**تیزپر:** بڕوانە: "تیز بال".

**تیزپرواز:** بڕوانە: "تیزبال".

**تیز تاو:** بڕوانە: "تندخو".

**تیز چشم:** چاو تیژ، زیت، زیچ، چاولەسەرهەست، دووربین، چاوبەحوکم، کەسێك کە چاوی بە باشی دەبینێ.

**تیز دست:** دەست سووك، چالاك، کارا، کارامە، لە کار دەر هاتو.

**تیز دندان:** بریتی لە چاوچنۆك و تەماکار. دڕننە. خاوەنی دیانی تیژ.

**تیز رفتار:** خۆشڕەو، خۆشبەز، تیژڕەو، توند لە کار و لە ڕۆیشتن.

**تیز زبان:** زمان پاراو، قسەزان، دەماوەر، ڕەوانبێژ، بەدەم و پل.

**تیز شدن:** 1) تیژ بوون، بە بڕشت بوون. 2) ورووژان، هەڵبزوان، تووڕە بوون.

**تیز کردن:** 1) تیژ کردنەوە، دەمەزەرد کردنەوە، بەبڕشت کردن. 2) وروژاندن، هەڵبزواندن، تووڕە و قەڵس کردن.

**تیزگام:** خۆشڕەو، ئەسپی خۆشبەز و بەزا.

**تیز مغز:** بیرتیژ. تووڕە و کەم چیکەڵدانە.

**تیزوبز:** بەخێرایی، گورجێ، دەست بەجێ.

**تیزویر:** بەهۆش، هوشیار، زیرەك.

**تیزهوش:** ویرا، بەبیر، بیر تیژ، بەهۆش، زیرەك، هوشیار.

**تیز هوشی:** هوشیاری، زیرەکی.

**تیزیدن:** ترکەندن، تڕین.

**تیسّر:** ئاسان بوون، سانا بوون، ئامادە بوون.

**تیسیر:** ئاسان کردن.

**تیغ آفتاب:** بەیانی زوو، خۆرکەوتن.

**تیغ خوردن:** برینداربوون.

**تیغ زدن:** 1) تاشینی مووی لەش بە تیغ. 2) بە زۆر یان بە فێڵ پارە وەرگرتن لە کەسێك. 3) بڕین و برینداركردن. 4) تیشك خستن، خۆرکەوتن. 5) شمشێر لێدان. 6) شەڕکردن.

**تیغ زن:** سەرتاش. شمشێروەشێن. شەڕکەر، جەنگاوەر. کەسێك کە بەزۆر یان فێڵ پارە وەردەگرێ.

**تیغ کسی بریدن:** هەبوونی هێز و توانایی و دەسەڵات.

**تیغ گداز:** کوژەر، کوشندە. شمشێر وەشێن.

**تیغ گر:** تیخ/ تێخ ساز.

**تیفوئید:** گرانەتا، گرانەتێ، گرانتا، کەوتوویی.

**تیقّظ:** هەستان. چاوکرانەوە، هوشیاربوونەوە.

**تیقّن:** دڵنیایی، خاترجەمی، خەیاڵ تەختی، بەبێگومان زانین، باوەڕ هێنان.

**تیلەبازی:** چەلەدان، چالان، چالێن، هەڵماتێن، ماتێن، مێشێن، کەللا مێشێن.

**تیم:** 1) کاروانسەرا. 2) کەسەر، کوڵوکۆ، دڵتەنگی، خەم خۆری.دەستە، تیم. 4) بەندەی خوا.





**تیمار:** 1) پەرستاری و لاواندنەوە و چاوەدێری کەسی نەخۆش. 2) خەمخۆری، دڵسۆزی، دەرد و ئێش.

**تیمارخوار:** خەمخۆر، پەرستار، سیستر.

**تیمارخوردن:** خەم لێ خواردن، دڵسۆزی کردن، سەرپەرشتی کردن.

**تیماردار:** خەمخۆر، پەرستار.

**تیمارداری:** خەمخۆری، پەرستاری، سەرپەرشتی.

**تیمار داشتن:** خزمەت و پەرستاری و خەم لێخواردن، ئاگاداری لە کەسێك یان شتێك کردن.

**تیمارستان:** شێتخانە، دینگە.

**تیمارکردن:** ئاگا لێبوون، نگاداری، پەرستاری لێکردن، خزمەت کردن و پێڕاگەیشتن بە نەخۆش و بریندار، دەرمان کردن.

**تیمارکش:** خەمناك، دڵتەنگ، ڕەنجاو، دڵشکاو.

**تیمارگر:** دەرمانکەر، چارەسازی نەخۆش.

**تیمّم:** 1) بە ئانقەست ئەنجامدان. 2) تێموم، دەست نوێژ گرتن بە خۆڵ لە جیاتی ئاو.

**تیموك:** ڕووترش، ڕووتاڵ، ڕووگرژ، مڕومۆن، مڕومۆچ، نمرچ.

**تیموکراسی:** حکوومەتی (ساماندارن/ دەوڵەمەندان)، حکوومەتێك کە لە سەر بنەمای دادپەروەری کۆمەڵایەتی نەبێ.

**تیو:** بڕوانە: "تاب و توان".

**تیوا:** بێباکی، دلێری، نەترسی.

**تیوکراسی:** سیستمێکە لە سیستمەکانی دەسەڵاتدارەتی کە تێیدا دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ پیاوانی ئایینی، ئایین سالاری.

**تیول:** تاپۆ، مووچە و مەزرای خەڵاتی و بێ باج.

**تیولوژی:** ئایین ناسی، خوداناسی.

**تیولوژیست:** ئاییناس، خوداناس.

**تیه:** گومڕایی، سەرلێشێواوی، خۆهەڵکێشان.

**تیهان:** خۆبەزل زان، گومڕا، سەرلێشێواو.

# ث

**ثـــائر:** تۆڵەکـــەرەوە، تۆڵەئەســـتێن، کینەخواز، کەسێك کە هەدا نەدا تا تۆڵە و هەقی خۆی نەستێنێتەوە.

**ثائره:** شۆڕش، راپەڕین.

**ثابت:** 1) سەلمێنراو، بەڵگەنەویست. 2) نەگۆڕ، بێ بزوتن، نەبزوو، راوەستاو، راوەستۆخ، پایەدار، پایا، پاوەجێ، پاوەجێگە، جێقایم، لە لەقین بە دوور، چەق، سنگەپێ، هەمیشەیی، نیشتەجێ، پتەو، قایم، خۆڕاگر، خۆگر.

**ثابت شدن:** 1) جێگیربوون، نیشتنەجێبوون. 2) سەلمێنران. **"ثابت شده"**: سەلماو، سەلمێنراو.

**ثابت قدم:** شێلگیر، بەردەوام، کۆڵنەدەر، پایەدار، پتەو و خۆڕاگر.

**ثاقب:** 1) ژانێ کە تووشبووەکەی وادەزانێ لەشی کون دەکەن. 2) رووناك، رۆشن، بەدرەوشێن، بە تروسکە، بریقەدار. 3) وشیار، مەژودار.

**ثاقل:** قورس، بەرانبەری (سقك/ سووك).

**ثالث:** سێهەم، سێیەم.

**ثالثه:** مێینەی "ثالث". شەست یەکی چرکە.

**ثامر:** بەرهەم دەر، میوەدەر.

**ثامن:** هەشتەم، هەشتەمین.

**ثانوی:** 1) دووەمین. 2) دواناوەندی. 3) دوایی، دواتر.

**ثانویت:** لە پلەی دوو دابوون.

**ثانی:** لە دوان یەك، دووهەم. بریتی لە وەك، وێنە. هاوتا.

**ثانیاً:** دووبارە، جاری دووهەم، دووهەم جار، دیسان، هەمدیسان.

**ثانیه:** چرکە، شەست یەکی خولەك.

**ثانیه‌شمار:** چرکە ژمێر.

**ثانیه شماری:** چرکەژمێری، بەبێ ئۆقرەییەوە چاوەڕوان بوون و بە لەبەرچاوبوونی تێپەڕینی کات.

**ثأر:** کوشتنی بکوژ، تۆڵە سەندنەوە.

**ثبّات:** (ثَ) تۆمارکەر، ئینديکاتۆر نووس.

**ثبات:** (ثُ) ژانی جارزکەر، ژان و ئێشێك کە مرۆڤ لە جووڵە بخا.





**ثبات:** (ثَ) سەقامگیری، جێگیری، پایەداری، ئارامی، پتەوی، قایمی. خۆڕاگری. سووری و بەردەوامی لە کاردا. **"بی ثباتی"**: ناجێگیری، ناسەقامگیری.

**ثبات رأی(عقیده):** راوەستاو و شێلگیر لە بڕوادا.

**ثبات قدم:** راوەستاوی، بەردەوامی، خۆڕاگری، پایەداری، پتەوی.

**ثبات کردن:** خۆڕاگری لە بەرامبەر شتێك دا. درێژەدان بە کارێك بەبێ دڕدۆنگی، سووربوون. جێگیربوون، سەقامگیربوون.

**ثبت:** (ثَ) 1) تۆمارکردن، یاداشت کردن، نووسین. 2) جێگیر و پتەوکردن. 3) زەوتکردن. 4) نووسراو، نووسراوە.

**ثبت:** (ثَ.بَ) 1) بەڵگە، قەواڵە. 2) جێی بەقا، جێی‌متمانە، جێی‌باوەڕ.

**ثبت اسناد:** تۆمارکردنی بەڵگە و پەیمانە فەرمییەکان.

**ثبت کردن:** 1) نووسین، تۆمارکردن. 2) نیگارکێشانەوە، وێنەکێشانەوە.

**ثبت نام:** ناونووسی، تۆمارکردنی ناو.

**ثبت و ضبط:** دەست بە سەرداگرتن، زەوت کردن.

**ثبوت:** 1) پتەو و قایم بوون، پتەوو راوەستاوبوون. 2) سەلمێنران. 3) پایەداری، پتەوی. **"به ثبوت رساندن"**: سەلماندن.

**ثبوتی:** ئەرێنی، پۆزەتیف.

**ثبور:** لە ناو چوون، تیاچوون، هاوار و داد کردن.

**ثبیت:** پیاوی ئازا و دلێر، پیاوی ئاوەز نەگۆڕ، قایم و خۆڕاگر.

**ثخافت:** توند و رەق بوونەوە، ئەستوور بوون.

**ثخانت:** ئەستووری.

**ثخین:** رەق و ئەستوور، خەست و قورس.

**ثراء:** 1) دەوڵەمەندبوون، سامان/ ماڵ دار بوون. 2) پتربوون، زۆربوون. 3) سامان، سامان داری، دارایی، دەوڵەمەندی.

**ثروت:** سامان، دارایی. **"ثروت سالاری"**: **"پلۆتۆکراسی"**. **"ثروت ملّی"**: سامانی نەتەوەیی.

**ثروت اندوزی:** کۆکردنەوە/ کەڵەکەکردنی سامان، خڕکردنەوەی سەروەت و سامان.

**ثروتمند:** دەوڵەمەند، دەوڵەمەن، دەوڵەتمەن، دەوڵەتمەند، دەستمایەدار، دارا، دارندە، بوود، زەنگین، زەنگون، ئەنگراو، کەڕانە.

**ثری:** (ثَ.را) خاکی شێدار، خاك، زەوی. **"از ثری به ثریا رسیدن"**: لە پلەیەکی نزمەوە چوونە پلە و پێگەیەکی بەرزترەوە.

**ثریّ:** (ثَ.رِ) بڕوانە: "ثروتمند".

**ثریّا:** 1) چلچرا، ئاوێزە. 2) پێور، پێرو، ئەستێرەیەکە لە کۆ دا.

**ثرید:** بڕوانە: "ترید".

**ثغر:** 1) دەم، ددانی پێشەوە. 2) کەلێن، قەڵشت، دۆڵ. 3) سنوور.

**ثقاب:** (ثَ) کونکەر.

**ثقابت:** 1) هەلایسانی ئاگر، زۆر سوور بوونەوە وەك گڕی ئاور، درەوشینەوە. 2) بڕوانە:"استواری".

**ثقات:** جێی باوەڕ و بەقا، جێ متمانە.

**ثقاف:** (ثَ) ژنی زیرەك و کارزان.

**ثقافت:** 1) رۆشنبیری/ روناکبیری. 2) زیرەکی، بوونە مامۆستا، مامۆستایی، لێهاتوویی.

**ثقال:** کۆی"ثقیل".

**ثقالت:** قورس بوون، قورسی، سەنگین بوون، سەنگینی.

**ثقب:** (ثَ) کون، درز. "**ثقب کردن**": کون کردن.

**ثقبه:** بڕوانە: "منفذ".

**ثقف:** گورج و گۆڵ بوون، زیرەك بوون، بوونە مامۆستا و کارزان.

**ثقل:** 1) قورسایی، قورسی، سەنگایی، سۆڤ، گرانایی، گران لە هەلگرتن. 2) بارقورس، بارگران، کێش.

**ثقل سامعه:** گوێ گرانی.

**ثقه:** 1) متمانە، دڵنیایی، خاترجەمی، بڕوا. 2) جێباوەڕ، باوەڕپێکراو.

**ثقیل:** قورس، گران، سەنگین.

**ثلاث:** سێیانە.

**ثلاثی:** سێیەکی، سێ پیتی، سێلایەنە، لە سێ پێك هاتوو.

**ثلث:** سێیەك، لە سێ پاژ پاژێك.

**ثمار:** کۆی"ثمر و ثمره".

**ثمر:** بەر، بەرهەم، میوە، بەروبوم. ئاکام، دەرەنجام. "**بە ثمر رساندن**": پڕبارکردن، بەئاکام گەیاندن، وەبەرهێنان.

**ثمراء:** داری بە بەرهەم، زەوی و داری پڕ میوە.

**ثمربخش:** بەرهەم دەر، بەهرەدەر.

**ثمردادن:** بەرهێنان، بەرهەم دان.

**ثمره:** یەکەی"ثمر"، میوە، بەر. ئەنجام، ئاکام.

**ثمن:** ( پَ.مَ) نرخ، بایی.

**ثمین:** پڕ بەها، بە قیمەت، گرانبەها، نایاب.

**ثناء:** پەسن، پێداهەلگوتن، پیاهەڵدان، ستایش کردن.

**ثناخوان:** بڕوانە: " ثناگو ".

**ثناگستر:** بڕوانە: " ثناگو ".

**ثناگو:** پەسن بێژ، ستایش بێژ، ستایشکەر. نزابێژ.

**ثناور:** بڕوانە: " ثناگو ".

**ثنویّت:** بڕوانە: "دوالیسم".

**ثنویه:** بڕوامەندان بە "ثنویت"، دوانەپەرستان.

**ثواب:** چاکە، پاداش، پاداشت، خەلات.

**ثوابکار:** چاکەکار، خێرخواز، خێرخوا، خێرخودا، کەسێك کە کاری خێر ئەنجام دەدا.





**ثوران:** ورووژان، هەژان، **هەڵکردنی** تەپ و تۆز، بەرپابوونی فیتنە و ئاژاوە.

**ثوره:** 1) شۆڕش. 2) مانگا، چێل.

**ثول:** گەمژەبوون، شێت بوون.

# ج

**جا/ جاى:** جى، جیٚ، جا، جێگه، جێگا، جاگه، شوێن، شۆن، ئاقار، ئاست، حاست، حان.

**جاآمدن:** 1) خۆشبوونەوه، چاك بوونەوه. 2) سوكنايى هاتن، خاترجەم بوون. 3) بەهۆش هاتنەوه. 4) هاتنەوه حاڵەتى سروشتى خۆى.

**جائر:** ستەمكار، زاڵم، زۆردار.

**جائز:** رێدراو، رێپێدراو، رەوا، شياو، حلێب، حلێو، هەلێب، دروست.

**جائزه:** خەلات، ديارى، پاداش، پاداشت، دەس خۆشانه.

**جائع:** برسى. تامەزرۆ.

**جاافتادن:** 1) هاتنەوه جیٚ، خۆشەوەبوونى ئەندامى وەرگەڕاو. 2) جێكەوتن، باو بوون. 3) سەقامگيربوون له شوێنێك سازگاربوون لەگەڵ ئەو شوێنه.

**جاافتاده:** 1) جێگرتوو، جێكەوتوو. 2) كەسێكى به ئەزموون و پتەو و قورس و قۆڵ. 3) جێكەوتوو، لەبيرچوو.

**جاانداختن:** 1) خستنەجیٚ، خستنەوەجیٚ، جیٚخستن، گرتنەوه. 2) راخستنى جیٚوبان. 3) تێگەياندنى بابەتیٚ به به كەسێكى. 4) باوكردن. 5) مانەوەى شوێنەوار يان نەخشى شتیٚ لەسەر شتیٚ. **"جاانداختن ناف":** نێوك هێنانەوه.

**جابجا:** 1) جێبەجیٚ، شوێن به شوێن، جێگه به جێگه، خاڵ به خاڵ. 2) بڕوانه: "فوراً".

**جابجا افتادن:** 1) راگوێزران له شوێنێكەوه بۆ شوێنێكیدى، له جێيەكەوه بۆ جێيەكیدى چوون. 2) له حاڵى كەوتن دا، دەسبەجیٚ كەوتن به زەوى دا.

**جابجاشدن:** گوێزرانەوه، گۆزيانەوه، راگوێزران، لەجیٚدەرچوون، له جومگه دەرچوون، ترازان. **"جابجاشده":** لەجیٚدەرچوو، ترازاو، له جێى خۆ بزووتو. راگوێزراو.





**جابجاكردن:** گواستنەوه، گۆزانەوه، گوێزانەوه و دامەزراندن، لابردن له جێگەى خۆى، هلاندن، خستنەوەجیٚ.

**جابجايى:** جێگۆڕكیٚ، گوێزانەوه.

**جابجايى استعاره‌اى:** جێگۆڕكێى خوازەيى.

**جابجايى قدرت:** جێگۆڕكێى دەسەلات، دەستاودەست كردنى دەسەلات.

**جابر:** 1) بڕوانه: "شكستەبند". 2) ستەمكار، ياخى، سەربزێو. 3) قەرەبووكەرەوه.

**جابرانه:** ستەمكارانه، زۆردارانه، ناجوامێرانه.

**جابلسا:** (بُ) بريتى له خۆرئاوا، يان شارێكى خەياڵى له خۆرئاوا.

**جابلقا:** (بُ) بريتى له خۆرهەلات، يان شارێكى خەياڵى له خۆرهەلات.

**جاپا:** جیٚ/ جێگه پیٚ، شوێن پیٚ/ پا، شۆپ.

**جاپيچ:** گەواد، جاكەش.

**جائم:** كەسێك كه سينگى بخاته سەر زەوى، له سەر سينگ خەوتو.

**جائوم:** بڕوانه: "كابوس".

**جاحد:** نكۆڵى لێكەر، مل نەدەر، دان پيانەنەر.

**جا خالى كردن:** جیٚ خاڵى دان، خۆكێشانه لاوه. وازهێنان له بەڵێن يان بڕيارى خۆ. خۆدەربازكردن له گوشار يان بەرپرسيارەتى شتیٚ يان كارێك.

**جاخوردن:** پەشۆكان، شڵەژان، داچڵەكين، راچەنين. بۆ ماناى زياتر بڕوانه: "يكه‌خوردن".

**جاخوش كردن:** جیٚخۆش كردن، مانەوه له شوێنێك به خاترجەمى.

**جاداد:** جیٚبوونەوه، خونجان، گونجان، دەفرايەتى، له بارا بوون.

**جادادن:** جیٚكردنەوه، جیٚبۆكردنەوه، جێگەپێدان، شوێنكردنەوه، گونجاندن، شتێك له شوێنێك دانان، دياريكردنى شوێنێك بۆ كەسێك و دانيشاندنى لەو شوێنه.

**جاداشتن:** جیٚ بوون/ بوونەوه، تێداجیٚ بوونەوه، جێگه بۆ تێخستنى شتێك.

**جادنگو:** بەرەڤان، ناوبژيكەر، نێونجى.

**جادو:** 1) جادوو، سيحر/ سێحر، سيعر، خرس. 2) جادووگەر، سێحرباز.

**جادوآفرين:** جادوو/ سێحر خوڵقێن، جادووگەر.

**جادوان/ جادويان:** كۆى "جادو" به ماناى سێحربازان.

**جادوانه:** سەر به جادوو، سێحربازانه، سێحراوى، وەك جادوو، وەك جادووكار. فره جوان و سەرنج راكێش.

**جادوبند:** جادووبەن/ جادووبەند، نووشتەى جادوو بەتاڵكەر.

**جادوپرست:** پەرسيارى جادوو، كەسێك كه بڕواى به جادوو و سێحر هەيه.

**جادوپيشه:** بڕوانه: "جادوگر".

**جادوجنبل:** سێحر ودۆعاگرتنەوە و پەنابردن بۆ هێزە وەهمییە بان سروشتییەکان.

**جادوخیال:** بڕوانە: "خیال پرداز".

**جادوخیز:** جادووباز/ جادووکار، سێحرباز. کەسێك یان شتێك کە توانای ئەنجامدانی سێحر و جادووی هەبێ.

**جادوزبان:** زمان لووس، بریتی لە شاعیری رەوان بێژ و قسەخۆش.

**جادوزبانی:** زمان شیرینی، قسەخۆشی.

**جادوزن:** ژنی جادووکەر/ سێحرباز.

**جادوستان:** شوێنی جادووکاران، جێگەی کۆبوونەوەی جادووکەران.

**جادوسخن:** 1) قسەخۆش، زمان شیرین، بریتی لە شاعیری وتەپاراو. 2) ئاخاوتنی رەوان و پاراو.

**جادوسخنی:** زمان شیرینی، رەوانبێژی، قسەڕەوانی.

**جادوفریب:** 1) جادووکار خەڵەتێن، فریودەری جادوو. 2) ئەوەی کە کەسێکی دی بە سێحر و جادوو فریو بدا.

**جادوفش:** وەك جادوو، جادوونوێن، سێحراوی.

**جادوك:** جادووکاری گچکە.

**جادوکار:** بڕوانە: "جادوگر".

**جادوکش:** کوژەر/ بکوژی جادووکار، جادووکەر کوژ.

**جادوگر:** جادووباز، جادووکار، جادووکەر، سێحرباز، نێرەنگ.

**جادوگری:** سێحربازی، سێحر، جادووکاری.

**جادومنش:** ئەوەی کە رەوشتی جادووکەرانی هەیە.

**جادونژاد:** ئەوەی کە بنەوبنەچەکی دەگەڕێتەوە سەر جادووکار، رەچەڵەك جادوو.

**جادونگاه:** گراوی، دلبەر.

**جادووش:** بڕوانە: "جادوفش".

**جادوی/ جادویی:** سێحر، سێحربازی، جادووکاری.

**جادوی‌کردن:** سێحر/ جادوو کردن.

**جادویی‌ساز:** بڕوانە: "جادوگر".

**جادەسازی:** رێوبان/ رێگەوبان چێکردن، دروست کردنی جادە.

**جاذب:** کێشەر، راکێش، راکێشەر، راکێش کەر، بەکێش، کێشندە، گیرا، رفێن.

**جاذبە:** مێینەی" جاذب "، راکەش، کێشەر، دڵ راکێش، راکێشە. گیرایی، راکێشەری.

**جاذبەزمین:** وزەیەك کە تەواوی تەنەکان بەرەو چەقی زەوی دەکێشێ.

**جاذبەجنسی:** راکەشی جنسی لە نێوان ژن و پیاو دا، حەز و ئارەزووی سێکسی.

**جاذبیّت:** راکێشەری، سوڕ، دڵ کێشی، ئاکاری دڵبەری، هێزی راکێشان لە تەنەکان وەك هێزی راکێشان لە مێغناتیسدا.

**جار:** 1) بانگەواز، هەڕاڵە، جاڕ. 2) هاوسێ، دراوسێ.





**جارّ:** کێشەر، راکێشەر.

**جارچی:** جاڕچی، راگەیەن، چیرڤان، ئاگاکەر، قاوکەر بۆ دەنگ و باسێك.

**جاررزدن:** بڕوانە: "جارکشیدن".

**جارح:** بریندارکەر، ببڕ، (لۆمە/ سەرزەنشت) کەر. باڵندەی گۆشتخۆر.

**جارحە:** 1) مێینەی"جارح"، بریندارکەر. 2) ئەندامی لەشی مرۆڤ بەتایبەتی دەست. 3) هەر زیندەوەرێك کە راو بکا.

**جارف:** تاعوون، بەڵا، ئەوەی کە دەبێتە هۆی قڕتێخستنی خەڵکی، راواڵنەر.

**جارفتن:** چوونەوە جێی خۆ یان لە جێی خۆ دانیشتن.

**جارکشیدن:** جاڕکێشان، جاڕدان، جاڕڕاهێشتن، بانگەوازکردن، راگەیاندن بە دەنگی بەرز.

**جاروجنجال:** چەق و هەرا و قوولە قوول، هەراوهوریا، هەیتەهەیت، هەراوزەنا، زەنازەنا، کێشە و گێرە، هەراوکێشە، هەلەبەل، لەج، لەزە، حەقلی مەقۆ، شەماتە، بڕێس بڕێس، شەڕهۆمللێ، قیڕەقیڕ، قولاقوول.

**جارود:** پیاوی نەگریس، بەدشانس و چارەڕەش. ساڵی سەخت و قات و قڕ.

**جاروف:** فرەخۆر، چڵێس، تێرنەخۆر، رژد.

**جاروکش:** گسك لێدەر، سبوور.

**جاری:** 1) رەوان، بێگیر، خوڕ، نەوەستاو. 2) ماڵێ کە کڕیاری زۆرە، باو، برەودار، (ئابووری) بەگەر، لە جەریاندا. 3) جێبەجێکردن. 4) دش، هاوگیان. "**حساب جاری**": حسێبی گەڕاو.

**جاری مجرا:** بڕوانە: "جانشین".

**جاریە:** 1) مێینەی"جاری"، بەمانای رەوان، لە جەریان دا. 2) کچە چووکەی ماڵ، کارەکەر.3) هەتاو، خۆرەتاو. 4) مار. 5) باو.

**جازدن:** 1) وازهێنان لە قەول و بەڵێنی خۆ. 2) کۆڵدان، درێژەنەدان بە خەبات و قبووڵ کردنی شکست. 3) دەز/ دەس/ دەست بڕین، ناڵ کردن، کاڵای بێبرەو و قەڵب بە جێی کاڵای باش و بەڕمێن بە کەسێکی دان یان فرۆشتن. 4) ناساندنی کەسێ بە جێی کەسێکی دی.

**جازع:** کەسێك کە دەکڕووزێتەوە و دەناڵێنێ، کەم چیکەڵدانە.

**جازم:** لێبڕاو، بەبڕشت، بڕەرەوە، یەکلاکەرەوە. سوور، پێداگر. "**جازم شدن**": شێلگیربوون، سووربوون.

**جازیست:** ژەنیاری جاز.

**جاسازی:** 1) خستنەجێ. 2) شاردنەوەی شتێ لەناو شتێك دا یان لە شوێنێکی نادیار.

**جاسر:** ئازا، نەترس، دلێر.

**جاسنگین:** قورس و قۆڵ، پتەو و قایم، سەنگین. گرنگ و جێ بەقا. بەنرخ، گرانبایی. تەپلۆس، قوون گران.

**جاسوس:** شوفار، سیخوڕ، زوانگر، خەبەر بەزێن، زیران، زیرەوا، زیرەوان، زیرەڤان، بەزاخ، دەسکیس، زمانگر، زمانگیر، زوانگیر، گوێبیس، گوێبەل، نهێنبەر، جاسووس.

**جاشدن:** جیّگرتن، گونجان.

**جاشو:** کرێکاری پاپۆڕ، کەسێك کە لە پاپۆڕدا ئیش دەکا، گەمیوان، مەلەوان.

**جاعل:** تەزویرکار.

**جافّ:** وشك، برینگ.

**جاف جاف:** سۆزانی، قاحبە.

**جافی:** ستەمکار، زۆردار، تووڕە و تۆسن.

**جاکردن:** جێکردنەوە، گونجاندن، تێکردن، تێخستن.

**جاکش:** گەوواد، قورمساغ، دەویت، سەرگر، کوزکەش، ماسکەش، جاکێش.

**جا کن کردن:** بردنی کەسێ یان شتێ لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی. گلاندن، تلاندن.

**جاگذاشتن/ گذاردن:** بەجێهێنان، بەجێ هانین، جێهێشتن، هێلان، هێلین، دانان، شتێك لە شوێنێك دانان. ئاسەوار یان پەلە هێشتنەوە. بەجێهێشتنی کەسێك و کەوتنەبەرەوەی.

**جاگرفتن:** 1) گونجیان. 2) جێگرتن، جێگەگرتن، جێگرتنەوە، جێبوونەوە، لە جێگەیەك دا حەوانەوە، پەسندکردنی شوێنێ بۆ خود، تەرخان کردنی جێگەیەك بۆ خود.

**جاگرم کردن:** جیّخۆش کردن، لەنگەرخستن، بریتی لە دامەزران لە شوێنێ، ئارام گرتن.

**جاگە:** بڕوانە: "جایگاه".

**جاگیر:** جێگیر، جێگەگر، جێگرتوو.

**جا/ جای گیرشدن:** حاوانەوە، جیّگیربوون، جیّگرتن، جیّبوونەوە لە شوێنێ، نیشتنەجێبوون، بنەجیّبوون، دامەزران، دامەرزان، دامەزریان.

**جاگیری:** بارستایی و ئەندازە. جێگرتن لە دۆخێکی لەباردا. جێگیربوون یان سەقامگیربوون.

**جال:** 1) تەڵە، داو.2) ویست، ئیرادە، دەنگ. 3) لێواری گۆڕ. 4) ملەی کێو.

**جالب:** سەرنج ڕاکێش، ڕاکێشەر، ڕفێن، دڵڕفێن، دڵڕەڤێن، دڵبەر.

**جالس:** دانیشتوو.

**جالشی:** بڕوانە:"شهوانی".

**جالوت:** تاراوگەنشین، ئەوانەی لە وڵاتێکی دی نیشتەجێن.

**جالی:** 1) ژەنگ سڕێن، مشت و ماڵ کەر. 2) ئاوارە، ڕەوگە، کۆچەر.

**جالیز:** بێسان، بێستان، شوێنی کاڵەك و خەیارو شووتی و هتد.

**جالیزبان:** بێسانەوان، بێستانەوان، ئاگاداری بێستان.

**جالیزکاری:** بێستانکاری، چاندنی کاڵەك و ترۆزی و خەیار و هتد.





**جاماندن:** مانەوەی شتێ لە شوێنێ دوای ڕۆیشتنی کەسێك. جێمان، بەجێمان، نەگەیشتن.

**جامانده:** جێماو، بەجێماو، دواکەوتوو، جائاستە. بەرماوە، پاشماوە. میرات.

**جام پرداختن:** شەڕاب خواردن.

**جام جم:** بە پێی چیرۆکە ئێرانییەکان جامەکەی جەمشید پاشای پێشدادی کە نەخشەی ئێرانی تێدابووە یان گشت جیهانی تێدا دیوە و پێیان دەگوت جامی جەمشید و جامی جیهان نوێن و جامی جیهان بین و جامی جیهان شاندەر.

**جامخ:** (م) بڕوانە: "متکبر".

**جامد:** 1) وشك، بەستوو، ڕەق، ڕەق هەڵاتوو، تونـد و سفت. 2) وشەیەك کە وشەی دیکەی لێ نەبێتەوە.

**جامدات:** ڕەقەمەنی.

**جام زر:** بریتی لەخۆر.

**جامس:** ڕەق، ڕەق هەڵاتوو، بەستوو، شەمزاو، ژاکاو، سیسیاگ.

**جامع:** 1) بەربڵاو، گشتگر، کۆگر، تێکڕا، هەمەلاگیر. 2) هەرشتێکی تەواو و کامڵ و بێ کەموکووڕی. 3) کۆکەرەوە، کەڵەکەکار، دابین کەر. 4) مزگەوت.

**جامع الاطراف:** تەواو، کامڵ، هەمەلایەنە. خاوەنی زانیاری بەربڵاو و هەمەلایەنە.

**جامع الشرایط:** کەسێك کە سەفەت و هەلومەرجی پێویستی بۆ ڕاپەڕاندنی کارێك تێدابێ، کۆمەرج.

**جامع تر:** هەمەلایەنە(تر).

**جامعە:** 1) مێینەی"جامع"، کۆکەرەوە. 2) کۆمەڵگا، کۆمەڵێك لە خەڵك کە خاڵی هاوبەشیان هەبێ، کۆی ئەندامانی نەتەوەیەك وەك کۆمەڵگای کوردی. 3) زانستگا، زانکۆ.4) (بیرکاری) حەساوی ئەنتیگراڵ.

**جامعەای شدن:** کۆمەڵگەیی بوون.

**جامعە باز:** کۆمەڵگای کراوە، کۆمەڵگایەك بە سیستمی سیاسی ئازادەوە کە لەودا گشت خەڵکی دەتوانن لە دەسەڵاتداران و حکوومەتەکان ڕەخنە بگرن.

**جامعەبستە:** کۆمەڵگای داخراو. کۆمەڵگای خاوەنی کولتووری سوننەتی.

**جامعە پذیری:** پرۆسەیەك کە لەودا کەسێك دەبێتە ئەندامی گرووپ یان کۆمەڵەیەك و بەها و نۆرم و بڕوا و کولتووری ئەوان قبووڵ دەکا.

**جامعەستیزی:** دژکردەوەی نەرێنی تاك لەبەرامبەر دابونەریت و ڕێسا کۆمەلایەتییەکان.

**جامعەشناختی:** کۆمەڵناسانە.

**جامعەشناسی:** (کۆمەڵ/ کۆمەڵگا) ناسی، سوسیۆلۆژی.

**جامعەمدنی:** کۆمەڵگای (مەدەنی/ شارستانی).

**جامعەمصرفی:** کۆمەڵگای بەکاربەر/ بەرخۆر.

**جامعیّت:** هەمەلایەنی، تێکڕایی، کۆگری. بوونی زانیاری جۆراوجۆر لە بواری زانستی و فەرهەنگی دا.

**جام فرعونی:** بریتی لە جامی گەورەی پڕ لە مەی.

**جامکاری:** بڕوانە: " آیین بندی ".

**جام کشیدن:** مەی نۆشین.

**جامگی:** ئەو بڕە پارەی کە بۆ خۆراك و جلوبەرگ لە ماوەی ساڵێك یان مانگێك دا دەدرێ بە نۆکەر یان خزمەتکار. جلوبەرگ.

**جامگی‌خوار:** مووچەخۆر، نۆکەر یان خزمەتکارێك کە مووچەی مانگانە یان ساڵانە وەربگرێ. شەڕابخۆر.

**جامەباف:** هۆنەر، پارچەچن، جۆڵا، جیلا.

**جامەبەدندان:** لەحاڵی پەلە و هەڵاتن دا، بەپڕتاو، پەلەپڕووزێ.

**جامەچاك:** 1) ئەوەی کە جلوبەرگەکەی دڕاوە. 2) ئاشق، دڵدار.

**جامەخورشید:** بریتی لە تەپ و تۆز یان هەورێك کە بەری خۆر بگرێ.

**جامەدران:** 1) پارچە دڕێن، لە حاڵی پارچە دڕاندن دا. 2) کردەی دڕاندنی جلوبەرگ لە کاتی تازیەباری یان ورووژان و هەژان دا.

**جامەدریدن:** دڕاندنی جلوبەرگ بە هۆی ورووژان یان خەم و کەسەرەوە، کراس دادڕین. بێئۆقرە و خەمباربوون.

**جامەکردن:** فەڕش ڕاخستن لە شوێنێك یان ژێرڕاخەر پانکردنەوە لە سەری.

**جان آدمیزاد:** بریتی لە شتی کەم وێنە و دەگمەن.

**جان آزار:** ئازاردەر/ ڕەنجێنەری گیان، زۆردار، ستەمکار.

**جان آسا:** وەك گیان.

**جان آفرین:** ئافرێنەری گیان/ ڕۆح. لە ناوەکانی خودا.

**جان آهنج:** گیان ستێن، روح دەرکێش.

**جانا:** گیانە، گیانێ، گیانەکەم، مالامن، وشەی دواندنی زۆر خۆشەویست.

**جان افروز:** (ڕووناك کەرەوە/ درەوشێنەوە/ تازەکەرەوەی) گیان، شادیهێنەر.

**جان افزا:** ئەوەی دەبێتە هۆی شادبوون و گەشانەوەی مرۆڤ، شادکەری روح و گیان، ڕووناك کەرەوەی گیان.

**جان افشان:** گیانباز، فیداکار، لە خۆبردوو، گیان لەسەر دەست.

**جان افشاندن:** گیاندان، گیانبازی کردن، فیداکاری کردن.

**جان افشانی:** گیانبازی، فیداکاری، لە خۆبوردوویی، خەبات.

**جانان:** گراوی، دلبەر، خۆشەویست، دلبەرێك کە دڵدارەکەی ئەوی وەك گیانی خۆی خۆش بوێ.

**جانانە:** 1) بڕوانە: "جانان". 2) گیانبازانە و بە شێوەی لە خۆبوردوویی. 3) بەتەواوی و دڵخواز، خەست.

**جان اوبار:** قووت/لووش/ لوور دەری گیان، گیان ستێن.





**جاناور:** بڕوانە: "جانور".

**جانب:** تەنیشت، تەنشت، پاڵ، لێوار، پەراوێز، ڕەخ، ئالی، نکال، لا، لایەن، ڤاج. **"جانب کسی را داشتن"**: لایەنگر و پشتیوانی وی بوون. **"جانب کسی(چیزی) را رعایت کردن"**: گرینگی و بایەخ بەودان یان ڕێزگرتن لێی. **"ازجانب"**: لەلایەن.

**جان باختن:** گیان بەخت کردن، گیان دانان.

**جانباز:** گیانباز، گیانفیدا، گیان بەخش، فیداکار، لەخۆبوردوو، دەست لە ژیان هەڵگرتوو، کەسێك کە ژیانی خۆی خستبێتە مەترسییەوە، دلێر، ئازا، نەترس.

**جانبازی:** گیانبازی، گیان بەخشی، لەخۆبوردوویی.

**جان بخش:** داینەدەی گیان، زیندووکەرەوە، تازەکەرەوەی گیان، گیان بەخش، ژیان بەخش.

**جانبدار:** لایەنگر، لاگر، لایەنگیر، داژدار، پشتیوان، یاریدەدەر، یاریکار، یارمەتیدەر.

**جانبداری:** لایەنگری، لایەنگیری، لاگری، لاگیری، داژداری، پشتیوانی.

**جان برافشاندن:** خۆکردنە قوربانی.

**جان برد:** ڕزگاربوون لە مەرگ.

**جان بردن:** ڕزگاربوون لە مەرگ، ڕزگاربوون لە شوێنی مەترسیدار و تالوکە.

**جان بر کف:** گیان لەسەر دەست.

**جان برمیان:** گیانبازی، فیداکاری، لەخۆبوردوویی.

**جان بسرشدن:** لەکاتی گیان دان دا ورووژان و پەشۆکان.

**جان بسرکردن:** لەکاتی گیان سپاردن دا ورووژاندن و پەشۆکاندن و وەلەرزین خستن.

**جان بوز:** بڕوانە: "جان پناه".

جان بە سلامت بردن: دەربازبوون، ڕزگاربوون.

**جانبەگرایی:** لایەن خوازی.

**جان بە لب رسیدن:** وەزاڵەهاتن، سەبر و تاقەت نەمان.

**جانبی:** پاڵەکی، لایەنی، پەراوێزی، لاوەکی. **"فرآوردە جانبی"**: بەرهەمی لاوەکی.

**جان پاس:** ئیسکۆرت، پارێزەر.

**جان پرداز:** 1) گیان پەروەر. 2) فریودەر، ڕاکێشەر.

**جان پردازی:** مردن، کوژران.

**جان پرور:** ئەوەی کە دەبێتە هۆی شادکردن و بەهێزکردنی گیان و ڕۆح.

**جان پناه:** پارێزەری گیان. پەناگا، سەنگەر.

**جان جان:** زۆر خۆشەویست. بنەما و هەقیقەتی شتێ.

**جان جهان:** دۆست، دڵبەر، خۆشەویست. ئەوەی مانەوەی جیهان بەوەوە بەستراوەتەوە.

**جانخ:** تەنیشت، تەنشت، لارك.

**جانخراش:** (گیان/ڕۆح) رووشێن، ئازاردەری گیان و ڕۆح.

**جان دادن:** 1) گیان دان، گیان (سپاردن/ ئەسپاردن)، گیان کێشان، گیان بە دەستەوەدان، گیان کەندن، گیان دەرچوون، ڕۆح دەرچوون، هەڵ پلۆسکان، هەڵ پلۆسکیان، لە ژیان بێبەش بوون، مردن.2) وزە و هێز پێدان، گیان دەبەرنان، زیندووکردنەوە، ژیان پێبەخشینەوە.

**جاندار:** 1) بوونەوەر، گیاندار، گیان لەبەر، گیانەوەر، ڕۆح دەبەر، ڕۆح لەبەر، زیندەوەر، جاندبەر، جودار، جووقەوار، زیندوو، خاوەن ژی، خاوەن گیان و بەهەست. 2) نگابان و پارێزەری گیان. 3) خاوەنی جەستەی زەلام.

**جاندارو:** دژەژەهر، ژاربڕ.

**جان داشتن:** زیندووبوون. هەبوونی هێز و وزەی جەستەیی.

**جان درازی:** تەمەن درێژی.

**جان دربردن:** بڕوانە: "جان بردن".

**جان دوست:** گیان خۆشەویست.

**جان دە:** گیانبەخش. خودا.

**جان ربا:** دلگیر، دڵخۆشکەر، دڵکێش. کوژەر.

**جان سپار:** گیانباز، لە خۆبوردوو.

**جان سپاری:** بڕوانە: "جانبازی".

**جان سپردن:** بڕوانە: "جان دادن".

**جان سوز:** ئەوەی کە تین و هێزی کەم بدا، تین و تاو وەبەر هێنانەوە.

**جان ستان:** گیان ستێن/ ئەستێن، ئەستێنەری گیان، تیابەر، کوشندە، کوژەك.سفەتی گیانکەنکە/ گیانکێش/ ئیزرایل.

**جان ستانی:** گیان ستاندن، گیان گرتن، کوشتن.

**جان سخت:** 1) گیان سەخت، سەگمەرگ، کەسێك کە بە سەختی گیان بدا، کەسێك کە لە سەختی و کولەمەرگییەکان دا راوەستاو و خۆڕاگر بێ.2) بریتی لە سەقیل، قرنیس و بەرچاوتەنگ.

**جانسوز:** کزە لە جەرگەوە هێن، ئەوەی کار بکاتە سەر دڵ و دەروون و کزە لە جەرگەوە بێنێ، کزە هەستێن، گیان سووتێن.

**جان شکار:** بڕوانە: "جان شکر".

**جان شکر:** 1) راوکەری گیان، گیان ستێن، گیان کێش، ئیزرایل. 2) بریتی لە گراوی و دڵبەر.

**جانشین:** 1) جێگر، جێنشین، جێگەنشین، خەلیفە. 2) بڕوانە:"عوض".

**جانشینی:** جێنشینی، قایم مقامی. "**محور جانشینی**": تەوەرەی جێنشینی.

**جانشینی استعارەای:** جێنشینی خوازەیی.

**جان فدا:** گیان فیدا، جان گۆری.





**جان فرسا:** شەکەتکەر، ماندووکەر، تاقەت پڕوکێن، بەژان، ئێشدار.

**جان فروز:** بڕوانە: "جان افروز".

**جان فزا:** بڕوانە: "جان افزا".

**جان فشان:** بڕوانە: "جان افشان".

**جان فشاندن:** بڕوانە: "جان افشاندن".

**جانفشانی:** بڕوانە: "جان افشانی".

**جانقی:** راوێژ، پرسیار و توێژینەوە، بەچاك و وبەقازانج زانین.

**جانکاە:** کورتکەرەوەی ڕۆح و گیان، کەمکەرەوەی تەمەن، ئازاردەر، ڕەنجێن.

**جان کُردی کندن:** ڕەنج و سەختی زۆر کێشان یان بە سەختی بەرەنگاریکردن.

**جان کسی بالاآمدن:** مردن و گیان سپاردن، یان شەکەت بوون و وەزاڵەهاتن.

**جان کسی راخریدن:** رزگارکردنی لە مەرگ.

**جان کسی راگرفتن:** کوشتنی ئەو، گیان لێسەندن.

**جان کشیدن:** کوشتن. ئازاردان.

**جان کلام:** پوختەی بابەت یان ئاخاوتە.

**جان کندن:** 1) گیان دان، سەرەمەرگ، گیانەڵا، لە حاڵی مەرگ دابوون، ئاویلکەدان. 2) هەوڵ و تەقالا دان، زەجری زۆر کێشان.

**جان گداز:** ئەوەی کە ببێتە هۆی خەمباربوون و ژاکانی ڕۆح و گیان، بەژان، ئێشدار، بێ هێزکەر، بێ تاقەتکەر، تاقەت پڕوکێن.

**جان گرایی:** بڕوانە:"آنیمیسم".

**جان گرفتن:** چاك/ خۆش بوونەوە، وزە و هێز گرتنەوە، وزە هاتنەوە بەر خۆ، وەخۆهاتنەوە.

**جانگزا:** ئازاردەر، زیان گەیێن، ئازاردەری ڕۆح.

**جان گسل:** ڕۆح/گیان پسێن، کوشندە، کوژەر، ئەوەی کە ببێتە هۆی پسانی زنجیرەی ژیان.

**جان مایە:** هۆکاری درێژەی ژیان. ناوەرۆکی سەرەکی و گرینگی هەر بەرهەمێکی هونەری.

**جان نثار:** سەرگەرد، گیانباز، خۆکردنە فیدای کەسێك.

**جان نواز:** لاوێنەری ڕۆح و گیان، ئەوەی کە ببێتە هۆی شادمانیو سوکنایییدەری ڕۆح و گیان.

**جانور:** 1) بڕوانە: "جاندار". 2) کرمی ڕێخۆڵە. "**جانور دوپا**": مرۆڤ، ئینسان.

**جانورخویی:** درندەیی، دڵڕەشی، بێ بەزەیی.

**جانورشناس:** گیانلەبەرناس، بوونەوەر ناس، زێئۆلۆژیست.

**جانورشناسی:** گیانلەبەرناسی، بوونەوەر ناسی، زێئۆلۆژی.

**جانورك:** گیانلەبەری چووکە.

**جانورگویا:** ئاژەڵی قسەکەر، مرۆڤ، ئینسان.

**جانور وحشی:** راور، درِندە.

**جانی:** 1) جینایەتکار، پیاوکوژ، تاوانبار، تاوانکار.2) سەر بە گیان، گیانی، بەڕێز و خۆشەویست. "**یار جانی**": دۆستی گیانی گیانی.

**جانیە:** مێینەی"جانی"، ژنی جەنایەتکار، ژنی تاوانبار.

**جاود:** بڕوانە: "جاوید".

**جاودان:** سووکەڵەی"جاویدان".

**جاودانگی:** نەمری، هەرمان، تاهەتایی، هەگیزنەفەوتان، نیمەردەنی.

**جاودانە:** سووکەڵەی"جاویدانە"، بەردەوام، نەمر، هەرماو، هەتاهەتا(یی)، بێبڕانەوە، هەمیشە، دایم، دایمی.

**جاودانی:** هەمیشەیی، دایمی، هەتا هەتایی، تا سەر، بێبڕانەوە، نەمر(ی)، هەربوون، داویە، هەمیشەژیو، بەردەوامی.

**جاور:** خاوەنی جێگە و شوێن، بە جێگە و رێگە. و بە مانای حاڵەت و چۆنیەتی.

**جاوید:** نەمر، هەرماو، نێمەردەن، هەرهە، پایەدار، نەبڕ، دایم، دایمی.

**جاویدان:** بێبڕانەوە، هەتاهەتا، هەرهە، پایەدار، بەردەوام، هەمیشە، نەمری.

**جاویدن:** بڕوانە: "جویدن".

**جاە:** پایە، مەقام، پلە، شان و شکۆ، شوێن، جێگە، پێگە.

**جاهجو/ جاهجوی:** بڕوانە: "جاەطلب".

**جاهد:** هەوڵدەر، تێکۆشەر، تەقالاکەر، تەقەللاکەر.

**جاەطلب:** مەقام خواز، خوازیاری پلە و پایە، زێدەخواز، بەرزەفڕ.

**جاهل:** نەزان، نەفام، گەوج، تێنەگەیشتوو، دوورەزانست، نەخوێندەوار. کەم ئەزموون و لاو.

**جاهلانە:** نەزانانە، نەفامانە، لە رووی نەزانییەوە.

**جاهلی:** سەر بە"جاهل/ جاهلیّت"، ئەوەی کە لە سەردەمی بت پەرستی دا بووە.

**جاهلیّت:** سەردەمی بت پەرستی، سەردەمی پێش ئیسلام لە عەڕەبستان. نەزانی، تێنەگەیشتوویی.

**جاهمند:** پایەبەرز.

**جاهمندی:** شکۆ.

**جاەوجلال:** گەورەییو پایەبەرزی.

**جای:** بڕوانە: "جا".

**جای‌باش:** شوێنی نیشتەجێبوون/ حاوانەوە، ماڵ، خانوو.

**جایز:** بڕوانە: "جائز".

**جایزوار:** شیاو، گونجاو.

**جایزە:** بڕوانە: "جائزە".

**جایگاە:** پێگە، جێگە، شوێن. پۆست، پلە.ماڵ.لۆژ. رادە و ئەندازە. دەرفەتی لەبار بۆ شتێ یان کارێك. "**برجایگاە(بەجایگە)**": بەجێ، لەکاتی خۆیدا، شیاو، لەبار.

**جایگزین:** ئاڵترناتیڤ، بەدیل، جێگرەوە، جێگرتنەوە، لەجێدانان.





**جایگزینی:** جێگرەوەیی، جێگۆڕکێ، دەستاودەست کردن. "**جایگزینی قدرت**": دەستاودەست کردن/ جێگۆڕکێی دەسەڵات. "**جایگزینی متقابل**": جێگۆڕکێی بەرامبەر.

**جایگشت:** ژمارەی حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی لە لای یەك دانانی چەند شت.

**جایگە:** بڕوانە: "جایگاە".

**جایگیر:** 1) بڕوانە: "جاگیر". 2) جێگیر، سەقامگیر. 3) بڕوانە: "مقبول". 4) کاریگەر و بەکەڵك. 5) جێنشین.

**جای‌مند:** تەمبەڵ، تەوەزەل، بێکارە.

**جاییدن:** بڕوانە: "جویدن".

**جبّ:** (ج َ) 1) بڕین. 2) زاڵ بوون، سەرکەوتن. 3) باردارکردنی داری خورما.

**جباء:** (ج ِ) لاواز بوون. ترسین، ترسیان.

**جبّاء:** (ج ُ) ترسەنۆك، بەدگومان، دڵ پیس.

**جبّار:** زاڵ، بەهێز، بە توانا، زۆر بەدەمار و سەرکێش. یەکێك لە ناوەکانی خودا.

**جبارت:** 1) چاك و باش کردنی حاڵ و وەزعی کەسێك. 2) بڕوانە: "شکستەبندی".

**جبّان:** 1) پیاوی زۆر ترسەنۆك و دڵ پیس.2) پەنیر فرۆش. 3) زەوی تەخت و بێدار، دەشت، گۆڕستان.

**جباوت:** کۆکردنەوەی باج و ماڵیات.

**جبایت:** کۆکردنەوەی باج، باج گرتن.

**جبت:** 1) بت. 2) سێحر، سێحرباز. 3) کەسی بێ خێر و بێر.

**جبر:** 1) هەستی گرتن، ئێسك گرتنەوە، لە گێچ گرتنی ئەندامی شکاو. 2) دارا کردنی مرۆڤی نەدار. 3) زۆر، ناچاری.4) قەدەر. 5) یەکێك لە زانستەکانی بیرکاری. 6) نێوی تەریقەتێك کە بە پێڕەوانەکەی "جبریە/ مجبرە" دەڵێن و بە بڕوای ئەوان تەواوی کردارەکانی مرۆڤ بە ئیرادەی خودا ئەنجام دەبێ و بەندەکانی هیچ دەسەڵاتێکیان نیە.

**جبراً:** بە زەبری هێز، بەزۆری، زۆراتی.

**جبران(کردن):** قەرەبوو، قەرەوی، بارە، تۆڵ، تۆڵەبۆکردنەوە، تێهەڵێنانەوە، بژاردنەوە، ئەستاندنەوە، سزادانەوە، قەزا.

**جبران مافات:** قەرەبووکردنەوەی کرداری خراو یان هەڵە یان کەموکوورییەکانی رابردوو بەئەنجامدانی کردەوەی شیاو.

**جبران ناپذیر:** قەرەبوونەکراوە.

**جبرباوری:** بڕوانە: "جبرگرایی".

**جبرخاطر:** لابردنی خەم و ژانی کەسێك.

**جبرعلمی:** بڕوانە:"دترمینیسم".

**جبرکردن:** چاك یان نۆژەنکردنەوە، چاك کردنەوە، هەڵبەستنەوە.

**جبرگرا:** دیتێرمینیست.

**جبرگرایی:** قەدەرگەرێتی، بڕوامەند بە قەزا و قەدەر، دیتێرمینیزم. "**جبرگرایی زبان شناختی**": قەدەرگەرێتی زمانناسانە. "**جبرگرایی علمی**": قەدەرگەرێتی زانستی.

**جبروت:** دەسەلات و گەورەیی، گەورەیی و مەزنایەتی.

**جبری:** 1) سەر بە "جبر"، کەسێك کە بڕوای بە تەریقەتی "جبر" هەبێ. 2) ناچاری، حەتمی.

**جبریگری:** زۆرکاریی، زۆرداری.

**جبریه:** بڕوانە: "جبر".

**جبس:** ترسەنۆك، دڵتەنگ. ناپاك. گێچ.

**جبن:** 1) ترسیان. 2) ترس، مەترسی، سام، دڵە خورپێ.

**جبهخانه:** بڕوانە: "زرادخانه".

**جبهه:** 1) تەوێڵ، ناوچاوان. 2) کۆمەڵی خەڵك. 3) سەرۆکی قەوم. 4) بەرە، گروپێکی پێکهاتوو لە حیزب و ڕێکخراوە جۆراوجۆرەکان کە بۆ ئامانجێکی سیاسی هاوبەش کار دەکەن. 5) گروپ یان دەستە یان کۆمەڵێکی یەکگرتوو. 6) گۆڕەپانی شەڕ، شەڕگە. 7) تەوێڵ، ناوچاوان. "**از جبهه برگشتن**": بریتی لە زۆر خراو و پواو و کۆنەبوون.

**جبههبندی:** بڕوانە: "جبههگیری".

**جبههسایی:** لەبەرامبەر کەسێکی مەزن دا بە نیشانەی ڕێز تەوێڵ لەسەر زەوی دانان.

**جبههگیری:** لاگیری، چوونە بەرەیەکەوە، بەرەنگاربوونەوەی کەسێك بەمەبەستی دژایەتی و شەڕ یان خەبات کردن دژی وی، "bias".

**جبیل:** بەدخولق، بەدخوو، تووڕەوتۆسن، ناحەز، دڕێو.

**جبین:** 1) تەوێڵ، ناوچاوان. 2) ترسەنۆك، نەوێر، بێجەرگ.

**جثام:** بڕوانە: "کابوس".

**جثه:** لەش، لاش، گش گیان.

**جثهدار:** بڕوانە: "جسیم".

**جحد:** بڕوانە: "انکار".

**جحفل:** سپا، لەشکری زۆر.

**جحم:** ئاورکردنەوە، هەڵایساندنی ئاگر.

**جحیم:** دۆزەخ، جەهەندەم، شوێنی زۆر گەرم، ئاگری بە کڵپە.

**جدّ:** (جِ) 1) تێکۆشان، هەوڵدان. 2) هەوڵ، پەلە، لەز. 3) راستی و حەقیقەت. "بەجد": بڕوانە: "جدی". پێداگر، شێلگیر، سوور.

**جدّ:** (جَ/ جُ) بەش، بەخت. لێوار، قەراغ. باوەگەورە.

**جدا:** (جُ) جوێ، جیا، جگا، جیاواز، دوور لە یەك، تەنیا. "**جدا از**": جیالەوە، بێجگە لە. سەرەڕای.

**جدا:** (جَ) بەخشین، بەخشش، قازانج.

**جداً:** بە راستی، بێگاڵتە. بەشێوەی جیددی. بەپێداگری.

**جداافتادن:** دوورکەوتنەوە یان دواکەوتن لە شتێ یان کەسێك.

**جداجدا:** جیاجیا، جگاجگا، بەش بەش، دانەدانە، تەك بە تەك، عەلاحیدە.





**جداداشتن:** دوورخستنەوە لە خۆ یان کەسیدی. هەڵبژاردنی شتێ یان کەسێ لە ناو دیتران دا.

**جداسازی:** جیاکردنەوە، پاڵاوتن.

**جداشدن:** جیابوونەوە، جیاوەبوون، جوێبوونەوە، لێ جیابوونەوە، ژێ بوون، تاکەوبوون، دوور کەوتنەوە، لێك هەڵبڕان، هەڵبڕیان، لێك پچڕان، لێبوونەوە، ماڵ کردن، هل بڕین، ڤەقەتیان، ڤەقەتان، ڤەقەتین.

**جداکردن:** جیاکردنەوە، جوێکردنەوە، جیاوەکردن، لێکردنەوە، هەڵوەژاردن، هەڵوەژێران، بژارتن، ڤەژارتن، تاك کردن، تاکاننەوە، هەڵاواردن، هلاوارتن، هل بواردن، ئاوارتن، دوورەوەخستن، ڤەدیکرن، ڤەژارتن، لە یەکەوەکردن، بڕدان، ژێکرن، وەکەردەنە. "**جداکردن جزء از کل**": دابڕکردن، دابڕین.

**جداگانه:** جیاکار، جیاواز، بەجیا، جیاجیا، تایبەتی، تەنیا.

**جدّال:** (جَ) زۆر مشتومڕکەر.

**جدال:** (جِ) مشتومڕ، مرومشت، دم بە دمە، کێشە و دم بەدمە، گەلج، بەگژیەکتراچوون، لەهەڤ کەتن، لەهەڤ گززین، دوژمنی/ دوژمنایەتی، کێشمەکێش، شەڕوکێشە.

**جدال برانگیز:** مشتومڕ ورووژێن.

**جدال زنانه:** شەڕەپۆپان، چنگەپرچەی ژنان.

**جدال لفظی:** دەمەقرە، دەمەقاڵە، دمەقاڵە، دەم قاڵی، دەمەقاڵی، شەڕەچەقە، شەڕەدندووك، شەڕەدندووکە، شەڕەدەندووکە، نیوەشەڕ، واتەویرە، شەڕەقسە، کێشەی هەر بە دەم، بۆرەبنار، رابەزاندن، دەڤ ژەنگ، بەتوندی یەکتر دواندن، شەڕوهەرای هەربەدەم، گلتە.

**جدانشدنی:** بڕوانە: "جدایی‌ناپذیر".

**جداول:** کۆی"جدول".

**جدایی:** جیایی، لێك جیایی، جیابوونەوە لە هاوسەر، لێك دوور کەوتن، پچڕانی پێوەندی نێوان دووکەس، دووری، من و تۆیی.

**جدایی انداختن:** مەودا یان دووری یان ناکۆکی سازکردن.

**جدایی‌طلب:** جیایی خواز، سەربەخۆخواز.

**جدایی طلبی:** جیایی‌خوازی، سەربەخۆخوازی، دووهۆیی.

**جدایی نا پذیر:** جیانەکراوە، دانەبڕاو.

**جدب:** 1) وشکە ساڵی، نەهاتی، قات و قڕی. 2) شووڕەیی، وتنی عەیبی کەسێك.

**جدباء:** زەوی وشك و بێ گیا.

**جدّت:** (جِ) نوێبوونەوە.

**جدع:** 1) بڕین. 2) دەستگیرکردن، خستنە بەندیخانەوە.

**جدکردن:** 1) هەوڵدان، تێکۆشان. 2) پێداگری، شێلگیری.

**جدل:** دیالەکتیك، باس و گفتوگۆ، وتوویژ، دەمەقاڵە، شەڕەقسە، کەفتولەفت، جڕەجڕ، مشتومڕ، لەهەقکەتن، کێشمەکێش، شەڕ و کێشمەکێش، شەڕوکێشەکێش، دوژمنایەتی توند و شارەزایی تێیدا.

**جدل برانگیز:** مشتومڕدار، باس ورووژێن/ خولقێن.

**جدلی:** کەسێك کە خوازیاری شەڕ و کێشمەکێش و دوژمنایەتی بێ، شەڕخواز، شەڕانی، کەڵەشێری شەڕانی. ئەوەی لە هەربابەتێك دا بکەوێتە باس و مشتومڕەوە، باس ورووژێن(دەروونناسی). لۆژیکی. دیالەکتیك(ی).

**جدلیون:** دیالەکتیکەکان، مشتومڕخوازەکان.

**جدوجهد:** هەوڵ و تەقالای زۆر.

**جدول:** 1) خشتە، کلێشە. 2) جۆگە، جۆگەلە، دێراو. **"جدول اعمال"**: کارنامە.

**جدول بندی:** خشتەبەندی، خشتەکێشان. جۆگە دانان.

**جدول تناوبی:** خشتەی مەندەلییێف.

**جدول زمانی:** خشتەی زەمەنی.

**جدول ضرب:** خشتەی لێکدان، خشتەی وشە یەکتربڕەکان.

**جدّی:** جیددی، جەردی، یەکبێژ، بەڕاست، سوور لەسەر کاری خۆی، گوێدەر بە کار، تەقالاکەر، پیاوی دوور لە گاڵتە.

**"جدی گرفتن"**: گرینگ زانینی شتێك و بەهێندگرتنی.

**جدیّت:** جیددی بوون، سووربوون، بەدڵگەرمی، هەوڵ، تەقالا. پێداگری و شێلگیری.

**جدید:** نوێ، نو، تازە.

**جدیداً:** بەتازەیی.

**جدیدالاحداث:** تازە بنیات، تازەساز، نوێساز.

**جدیدالاختراع:** تازە داهێنراو، نوێ.

**جدیدالاسلام:** تازە/ نوێ موسڵمان.

**جدیدالتأسیس:** تازە بنیات، تازە دامەزراو.

**جدیدالورود:** تازە هاتوو، تازە گەیشتوو.

**جدیدالولادە:** بڕوانە: "نوزاد".

**جدیدین:** شەو و ڕۆژ.

**جدیر:** گونجاو، شیاو.

**جذ:** بڕین و شکاندنی شتێك، ریشەکێش کردن.

**جذّاب:** دڵگر، دڵڕفێن، راکەش، راکێشەر، کێشەر، سەرنج راکێش، لەبەردڵان، گیرا، جوان، خوشیك.

**جذابیّت:** "جذّاب" بوون، دڵ راکێش، کێشەر، دڵگری، دڵڕفێنی، گیرایی.

**جذام:** (جُ) گولی، کۆتی، کوتی.

**جذام شناسی:** گولیناسی، ناسینی نەخۆشی گولی.





**جذب کردن:** راکێشان، کێشان، کشان، راکێش، بەرەو خۆ هێنان، کەمەندکێش کردن، ملۆسنایش، رفان، فڕان. دامەزراندنی کەسێك بۆ ئەنجامدانی کارێك. مژین، هەڵمژین، هەڵمژان، رەخنەکردنی ماددەیەك بۆ ناو ماددەیەکی تر.

**جذب شدن:** راکێشران، راکێش بوون، کەمەندکێش بوون، هۆگربوون. خەریك بوون بەکارێکەوە یان دامەزران لە رێکخراوێك دا. چوونە ناو گروپێك وەك ئەوان لێهاتن.

**جذبە:** 1) مەودای دوور. 2) جەزمە، جەزم بوون، جەزبە، حاڵ، حاڵ لێهاتنی دەروێش، هەلەکا، سەمای دەروێشان. 3) مەیل و بەریانی زۆر نیسبەت بە کەسێك یان شتێك. 4) بڕوانە:"کشیدن".

**جذر:** رەگ، ریشە، بن، بنج، بێخ، بنەچە.

**جذع:** (جِ) کۆتەرە. بەژن، قەد.

**جذل:** (جِ) بنج، بنەما، بێخ، ریشە.

**جذل:** (جَ.ذَ) شادی، شادمانی، خۆشحاڵی.

**جذم:** 1) بڕین. 2) بنج و بناوانی شتێك، شوێنی روان.

**جذور:** کۆی"جذر".

**جذول:** کۆی"جِذل".

**جذوە:** بڕوانە: "اَخگر".

**جر:** (جِ) درز، کەلێن، قەڵشت، جۆگە.

**جرّ:** کێشان، درێژەپێدان. بەرەولای خۆکێشان. بزوێنی ژێرە دان بە وشە. **"جر نفع"**: وەدەست هێنانی قازانج.

**جرا:** بڕوانە: "مستمری".

**جرائد:** کۆی"جریدە".

**جرائر:** کۆی"جریرە" بە مانای گوناه.

**جرائم:** کۆی" جریمە"، تاوانەکان، جورمەکان.

**جراح:** (جِ) کۆی"جراحت".

**جرّاح:** نەشتەرگەر، نەشتەرکار، برینگەر، نژدار، نشدار، نیشدار، کڕە.

**جراحات:** کۆی"جراحت".

**جراحت:** برین، زام. چڵکی برین. ژان و خەم.

**جراحت برداشتن:** برینداربوون.

**جراحت دیدە:** زامدار، بریندار.

**جراحت کردن:** چڵك کردن.

**جراحتگاە:** شوێنی برین.

**جراحت نهادن:** بریندارکردن.

**جرّاحی:** نەشتەرگەری، نەشتەردان، نەشتەرلێدان، نەشتەردان، نەشتەرکرن، نژداری، برینگەری، هەڵدڕینی بە نەشتەر. **"جراحی پلاستیك"**: نەشتەرگەری پلاستیك. **"جراحی ترمیمی"**: بڕوانە: "جراحی پلاستیك".

**جرّار:** زۆر راکێشەر/ کێشەر، بەرەو لای خۆ هێنەر/ کێشەر. بێژومار، زۆر. **"لشکر جرار"**: لەشکری زۆر و تەیار.

**جراف:** (جُ) 1) سێلاوێك کە هەموو شتێ لە گەڵ خۆی ببا. 2) زۆرخۆر، فرەخۆر، خۆش خۆر.

**جرأت:** زات، وێران، وێرانن، وێرین، وره، هێزی دڵ، غیرەتی دڵ، نەترە، تووروش، غیرەت، نەترسان، نەترسین، بوێری، هەیهێز. "**جرأت دادن**": ورەپێدان، زات وەبەرنان. "**به جرأت**": بەدڵنیایی و خاترجەمی.

**جر انداختن:** تووڕەکردن، دەهری کردن.

**جراید:** ڕۆژنامەکان، چاپکراوەکان.

**جربزه:** توانای ئەنجامدانی کارێك بە شێوەی دڵخواز، لێهاتوویی، شیاوی، ژێهاتن، توانایی، لێبڕاوی.

**جرثومه:** 1) بنەچە، ریشە، بنج و بناوان، بنچینەی هەر شتێك. 2) خۆڵی دەوری رەگی دار. 3) هێلانەی مێرووله. 4) مشەخۆر، میکرۆب. "**جرثومه فساد**": ماکەی گەندەڵی و خراپەکاری.

**جرح:** (جُ) برین، زام.

**جرح:** (جَ) بریندارکردن. رووخاندن.پووچ کردنەوەی شایەتی، رەت کردنەوەی شایەتی شایەتەکان.

**جرح شدن:** پووچەڵ بوونەوە، لە ئێعتوبار کەوتن.

**جرح کردن:** رەت کردنەوەی شایەتی.

**جرح و تعدیل:** سەنگ و سووك کردن.

**جرخوردن:** تلێشیان، دڕیان، هەڵدڕان، قەڵش بردن، هەڵ تەقان، هەڵتەقین.

**جردادن:** تلێشانن، داتلێشاندن، هەڵدڕاندن، دڕاندن، دادڕین، لەت کردن، چڕاندن. "**خود را جر دادن**": بێئۆقرەیی و هەدانەدان لەبەر تووڕەیی و ناڕەحەتی و هتد. هەوڵ و پێداگری لە ئەنجام دانی کارێك بۆ مەبەستێکی تایبەتی.

**جرز:** (جَ) بووره، بوور، زەوی بێڕوەك.

**جرز:** (جَ.رَ) 1) ساڵی سەخت و دژوار، ساڵی قات و قڕی. 2) لەش، سنگ.

**جرزدن:** (جِ) لە زاراوەی قوماربازان دا: حاشالێکردن، دەبەکردن، گێچەڵ کردن، تەشقەڵەکردن، پیلەکردن، پیلەپێگرتن، بەزم پێگرتن، گڕنە بە کەسێك گرتن و لە کۆڵ نەبوونەوە، سەرپێچی کردن لە یاسا و رێسای کایە.

**جرزن:** تەشقەڵەکەر، دەبەکەر. فێڵباز، کەڵەك باز.

**جرس:** (جَ.رَ) 1) زەنگۆڵە. 2) گرتووخانە، شکەنجە و ئازار. "**جرس جنباندن**": ئامادەی جووڵان یان سەفەربوون. "**جرس زدن**": زەنگ لێدان. پاسەوانیکردن.

**جرس:** (جِ) بنەچە، بنچینەی هەر شتێك.

**جرشفت:** (جَ.شَ) بڕوانە: "**هجو**".

**جرعه:** فڕ، ڤڕ، چۆر، قورچ، قوپ، قورم، (قوم/ قم) لە تراو دان، گەپە، گوڵپ، وت، ورم.

**جرعەکشیدن:** شەڕاب خواردنەوە.

**جرعەناك:** بەهرەمەند، فەڕدار.

**جرعەنوش:** شەڕابخۆر، مەی خۆر.





**جرعه نوشیدن:** فڕکردن، فڕکرن، هەڵقوڕاندن، قورچاندن، یەکجێ خواردنەوەی تراو.

**جرقه:** پزوسك، پزیسك، ئاورینگ، مۆزریك، پڕیشکەی ئاگر.

**جرگ:** (جُ) دەشت، چۆڵ، چۆڵگە.

**جر...گرفتن:** زۆر تووڕە و قەڵس بوون.

**جرگ/ جرگه:** (جَ) ناوەند، نێوجەرگە، ناو جەرگە، ئاڵقە. کۆڕ، گروپ، ریز. "**جرگەزدن**": کۆزبەستن، بە دەوری یەکا کۆبوونەوە.

**جرگەسالاری:** بڕوانە: "اولیگارشی".

**جرل:** (جَ.رَ) زەوی رەق و بەردەڵان.

**جرم:** (جُ.رْ یان جَ.رَ) تاوان، سووچ، گوناح، هەڵە.

**جرم:** (جِ.رْ) 1) رەنگ. 2) تەن، لەش. 3) بڕوانە: "رسوب". 4) ئەستێرە. 4) (فیزیك) رادەی ماددەی ناو هەر جسمێ کە دەگەڵ کێشەکەی دا هاوڕێژەیە. "**جرم اتمی**": کۆی پڕۆتۆن و نوترۆنەکانی ناو ناوکی ئەتۆم. "**جرم حجمی**": بڕوانە:"چگالی".

**جرم:** (جَ.رْ) زەوی زۆر گەرم، گەرمێن.

**جرم پوش:** (جُ) هەڵە پۆش، لێبوردە لە گوناە و تاوان.

**جرم دار:** گوناهکار، تاوانبار.

**جرمزه:** 1) رێك هاتن، چوونە یەك، گرژبوون، کۆوەبوون. 2) هەڵاتن، راکردن. 3) سەفەر.

**جرم شناسی:** تاوان ناسی، زانستێك کە دەربارەی تاوان و تاوانبار دەدوێ.

**جرنده:** کرکرۆکە، کڕکڕۆکە، کرۆژە، خرموتە.

**جرنگ:** (جَ.رَ) خرینگە، جرینگە، زرینگە، زڕە، دەنگی وێك کەوتنی خشڵ و ئاسنەوێڵە و بلوور.

**جرنگی:** نەخت، پارەیەك کە نەخت و یەکجێ بە کەسێك بدرێ.

**جرنگیدن:** زڕیانەوە، خرینگە یان جرینگە لێوە هاتنی خەنجێر و هەر شتێکی کانزایی یان چینی کاتێك کە لە شتێکی دی بدرێ.

**جر(و)واجر:** بەتەواوی دڕاو، کۆنە و رزاو.

**جرواجر خوردن:** دادڕان، هەڵقلێشان.

**جرور:** 1) سەرکێش، کەڵەوەکێش. 2) چاڵی قووڵ.

**جروز:** بڕوانە: "پرخور".

**جروبحث:** مشتومڕ، گفتوگۆ، باس و لێدوان.

**جرّه:** (جُ) 1) تەڵەی ئاسکگرتن. 2) جوڕە، بازی نێر. 3) دلێر، ئازا.

**جری:** نەترس، دلێر.

**جریان:** 1) رەوت، پڕۆسە، جەریان. 2) لایەن. 3) رووداو، پێشهات. 4) بڕوانە: "موضوع". 5) دەرچوونی ئیلێکتریسیتە لە ماددەی تێپەڕکەری جەریان، تەزووی کارەبایی. 6) لە زاراوەی بانکی دا: دەستاودەست بوونی پارە. "**به جریان انداختن**": رەوان کردنی شتێکی تراو.

خستنەجەریانەوە. وەگەڕخستن یان بەهرەوەرگرتن لە شتێ وەك پوولٚ و سەرمایە. "**در جریان بودن**": ئاگاداربوون، بەخەبەر بوون. "**درجریان گذاشتن**": ئاگاداركردن. "**عبور جریان الکتریسیته**": تێپەڕینی وزەی كارەبایی.

**جریان داشتن:** ڕەوان بوون. باوبوون. لە گەڕ دابوون. لە ئارادابوون.

**جریح:** زامدار، بریندار.

**جریحه:** زام، برین.

**جریحەدارشدن:** برینداربوون، زامداربوون. كولانەوە.

**جریحەداركردن:** برینداركردن، زامداركردن. كولاندنەوە.

**جریده:** 1) ڕۆژنامە، گۆڤار. 2) كتێب، نامیلكە، پەڕاو. 3) لكی دار خورما، لكی بێ گەڵا. 4) گروپ و كۆمەڵێك بە بێژن. 5) پاشماوەی ماڵ. 6) تەنیا. 7) بە ئامادەییەوە. 8) كارامە و شەڕكەر. "**جریده سیاەكردن**": بریتی لە تووشی گوناح بوون. "**جریده كردن**": تۆماركردن لە دەفتەردا. "**جریدەنگار**": ڕۆژنامەنگار.

**جریره:** گوناە، تاوان، جەنایەت.

**جریش:** كوتراو، هاڕڕاو.

**جریم:** 1) گەورە، ئەستوور. 2) تاوانبار. 3) خورمای وشك.

**جریمه:** تاوان، جەریمە، ماڵێك كە لەخەتابار دەسێنرێ.

**جریمەكردن:** جەریمەكردن، تاوان سەندن، پێبژاردن.

**جریمە گوزیدن:** تەبەقەتڕانە، تەشبیتڕانە، تەشپیتڕانە، تاوان سەندن لە تركەن.

**جرینگەكردن:** نەخت كردنەوە.

**جرینگی:** نەختی، بەشێوەی نەخت.

**جز:** (جُ) بێجگە، جگە، بژ.

**جزّ:** (جَ) بڕین.

**جزاء:** تۆڵە، گۆڕ، پاداشت(بۆ خێر)، سزا(بۆ شەڕ).

**جزائر:** كۆی"جزیره".

**جزاف:** 1) كوێرانە، گۆترە. 2) بێهوودە، بە خۆڕایی.

**جزال:** كۆی"جزل".

**جزالت:** گەورەبوون، گەورەیی. پتەوی پاژەكانی شتێك و پێوەندی دروستیان دەگەڵ یەكدی..

**جزاندن:** كزە لە جەرگەوەهێنان، ئازاردانی كەسێك و خەمباركردنی.

**جزایر:** كۆی"جزیره".

**جزء:** پاژ، هەندەك، لەتك، پارچە، پەرچە، سیپارە، وارە، بەشێكی كەم."**جزء بیست و نهم**": بریتی لە هەر شتێكی كەم نرخ و ناسەرەكی. "**جزء لایتجزا**": پاژی دابەشنەبوو. "**كمترین جزء**": قرتە، بچووكترین پاژ.

**جزءجزء:** كەرت كەرت، بەش بەش."**جزء به جزء**": پاژ بە پاژ، موو بە موو.





**جزئی:** پاژی، پاژەكی، كەرتەكی، هەندەكی، كەم. "**جزئی از كل**": شمۆرتك، كەموسكەیەك، پاژێكی كەم.

**جزئیات:** وردەكارییەكان، پاژەكان.

**جزدر:** بڕوانە: "جزغاله".

**جزر:** 1) نیشتاو، داكشان، داكشە، داچوون، نیشتنەوە، كشانەوەی ئاوی دەریا. 2) سەربڕین، كوشتن.

**جزر و مد:** هەڵكشان و داكشانی ئاوی دەریا، نیشتاو و خێزاو. هەوراز و نشێو. دەرگیری و كێشمەكێش.

**جز زدن:** 1) سووتان و چزەچزی شتێك لە سەر ئاور. 2) گریان و ناڵاندن، پاڕانەوە و لاڵانەوە.

**جزع:** بێئۆقرەیی، بێئارامی، هەدانەدان، خەمباری و دڵتەنگی.

**جزغال/ جزغاله:** چڵەوەزی، چزیلك، چزڵێك، چزیلە، چڵەووەزی، جزیلك، ژزیلك، كسك. "**جزغالەشدن**": بەتەواوی سووتان یان برژان، بوونە چزیلك.

**جزل:** 1) گەورە، مەزن، خەست، زۆر، فرە، بەربڵاو. 2) گوتەی پاراو و بە بەڵگە.

**جزم:** 1) دوگم، دوگما، چەقبەستوو، دەمارگرژ، حەتم. 2) بڕین، بڕانەوە. 3) بڕیاردان، بڕیار لە كارێك دان بەبێ دڕدۆنگی. 4) زەنەدار كردنی پیت. نیشانەیەك بەم فۆڕمە(ْ) كە دەخرێتە سەر پیتی بێدەنگ. "**جزم شدن**": 1) مسۆگەربوون، حەتمیبوون. 2) پتەو و بێ مەودا و كیپ بوون.

**جزم اندیشی:** دەمارگرژی، دەمارگیری، دوگماتیسم.

**جزم گرایی:** دوگم خوازی.

**جزمه:** ڕەوە. پاژێك لە شتێك.

**جزمی/ جزمی اندیش:** دوگماتیك، دەمارگرژ، بیركورت، وشك، نەگۆڕ و حەتمی.

**جزمی بودن:** بڕوانە: "افراطیگری".

**جزمیّت:** چەقبەستوو و نەگۆڕبوونی دیاردەكان.

**جزو:** بڕوانە: "جزء".

**جزوع:** بڕوانە: "جزع".

**جزوه:** نامیلكە، كتێبۆكە، بەشێك لە كتێبێك، تێنووسۆكە. جزم.

**جزویت:** پاژبوون.

**جزەموره:** ناڵە و شیوەنی زۆر.

**جزیره:** دوڕگە، دڕگە، دوڕاجە، چزیرگە، چزیر، گراڤ، گراوە، ناڤرە، ئاد، جێزوك، جزیرە، وشكی لە ناوەڕاستی ئاو.

**جزیل:** 1) گەورە، مەزن، پتەو، قایم، فرە، گەلێك، فراوان. 2) گوتەی ڕەوان و پاراو.

**جزیه:** ساوەری، سەرانە، گەزیت.

**جسّ:** دەست هێنان بە شتێكدا.

**جسّار:** (جُ) كۆی"جاسر".

**جسارت:** بوێری، نەترسی، ئازایەتی، زات كردن، سرتی، دەخۆڕا(دیتن/ دین)، ڕووهاتن.

**جسارتاً:** (عەیب نەبێ، بێئەدەبی نەبێ) لە خزمەتتان دا.

**جسّاس:** بڕوانە: "جاسوس".

**جسامت:** گەورەیی، ئەستووری، زنتۆلی، باهۆداری، شاقەڵداری، زەبەلاحی.

**جست:** پەڕین، بازدان، قەڵەمباز، کردەی"جهیدن".

**جستار:** (جُ) باس، وتەزا، گوتار، جێگەی باس و توێژینەوە. بڕوانە:"جستجو".

**جستان:** (جَ) باز (دەر/ بەر)، خێز بەر، هەڵبەزدابەزکەر، بزۆز، لە حاڵی خۆهەڵدان و هەڵبەزدابەزدا.

**جستجو:** گەڕان، لێگەڕان، لێگەڕین، لێگەڕیان، بۆ گەڕان، بەدواداگەڕان، دانەپەی، لە شوێن چوون، گردی سەر، پەیدۆزی، پەیجۆری، تەقانن، توێژینەوە، کۆڵینەوە، کنەکردن، داباش، گێڕایش. "**جستجوکننده**": گەڕێن، لێگەڕ، پەیدۆز، پەیجۆر، پشکن، پشکێن.

**جستجوگر:** بڕوانە: "جستجوکننده".

**جست زدن:** بڕوانە: "جَستن".

**جستن:** (جُ.تَ) لێگەڕان، بۆگەڕان، پەیداکردن، وەدەست هێنان، دۆزینەوە. وەدوای وەدەست خستنی شتێ یان گەیشتن بە مەبەستێکەوە بوون. پرسین. "**جستن دل کسی**": رازی کردنی وی.

**جستن:** (جَ.تَ) پەڕین، هەڵبەزین، راپسکان، بازدان، قەڵەمباز بردن.هەڵاتن، راکردن. رەهابوون، رزگاربوون، دەرچوون.

**جست و خیز:** بازباز، بازبازان، بزۆزی و هەڵبەزدابەز، هەڵپەڕ، هەڵپەڕداپەڕ، هەڵپەڕوداپەڕ، پەڕین، خۆهەڵدان، هەڵبەزین، هەڵبەزینەوە، هەڵبزۆق، هەڵ بلۆق، بەرەو ژوور باز بردن، تەپ و تل، گل و گوێز، وڕکە، وڕکەوڕك، فڕکەفڕك، فڕك و هۆڕ، لەپتین، هەڵسوکەوت.

**جسته:** (جَ) پەڕیو، هەڵبەزیو، هەڵبەزاو. رزگاربوو، رەهابوو، دەرچوو.

**جسته:** ( جُ) دۆزراو، گەڕاو، لێگەڕاو.

**جسته جسته:** (جَ.جَ) بەرەبەرە، بڕەبڕە، نەختەنەختە، کەم کەم، کەمەکەم، وردەوردە.

**جسته گریخته:** بە پڕژوبڵاوی، پچڕپچڕ، بە کەرت و پەرتی، لێرەولەوێ، لەم و لەو.

**جسد:** 1) جەستە، جەسە، لەش، ئەندام. لە فارسی دا زۆرتر بە مانای تەرم و لاشە دێ. 2) خوێن، خوێنی رەق هەڵاتوو.

**جسك:** (جَ.سْ) ئازار، بەڵا، مەینەتی، پەتا، ناخۆشی.

**جسم:** تەن، لەش، گۆدە، گۆڤدە، گەودە، جەستە، قەوارە، شت، هەرشتێ کە بەشێك لە فەزا داگیر بکا. "**جسم سلولی**": بەشی ناوەوەی خانە.

**جسماً:** لەباری جەستەیییەوە.

**جسمانی:** بڕوانە: "جسمی".

**جسم کوچك:** تەنۆچکە.





**جسمی:** جەستەیی. ئەوەی بەتاڵە لە مانا و هەقیقەت و لە بیری کاروباری پێوەندیدار بە جەستەوەیە.

**جسور:** بوێر، نەترس، بەزات، بەجەرگ، ئازا، دلێر.

**جسورانه:** نەترسانە، بوێرانە، ئازایانە.

**جسوم:** (جُ.سُ) کۆی"جسم".

**جسیم:** 1) گەورە، زل، بەخۆوە، باهۆدار، زنتۆل، زەبەلاح. 2) گرنگ، گرینگ. 3) بەژن و باڵا رێك و جوان.

**جشاو:** (جُ) 1) قرخێنە، قرقێنە، قرپ. 2) شەپۆل، پێل.

**جشن:** (جَ.شْ) جێژن، جێژنە، جەژن، جەژنە، گێژن، گێژنە، شادی، خۆشی. "**جشن پیوستن**": جێژن گرتن. "**جشن تولد**": جێژنی لە دایك بوون. "**جشن کردن**": جێژن گرتن.

**جشن:** (جَ.شَ) یاو، تاو و لەرز.

**جشنگی:** تینوویەتی، توونییەتی.

**جشنواره:** فستیواڵ.

**جشیم:** خەست، تیر، قورس، درشت.

**جعّال:** ساختەکار، درۆهەڵبەست.

**جعاله:** هەقدەست، کرێ، مز.

**جعبه:** 1) بڕوانە: "ترکش". 2) مجری، سندۆقی چکۆڵە.

**جعد:** 1) لوول، بادراو. 2) پیاوی قرنیس و کنس.

**جعل:** (جَ) دانان، سازکردن. گۆڕین، ساختەکاری، ساختەکردن، دەسهەڵبەست. "**جعل اکاذیب**": درۆسازکردن بەمەبەستی تۆمەت لێدان.

**جعل:** (جُ) بڕوانە: "جعاله".

**جعلی:** چرووك، قەڵب، بێ نرخ، تەزویری. "**مصدر جعلی**": چاوگەی سازکراو.

**جغرافی/ جغرافیا:** جوگڕافیا، جوغڕافیا، زانستێکە کە سەبارەت بە گۆی زەوی و بارودۆخی خۆرسك و رامیاری وڵاتان و چۆنیەتی ژیانی قەوم و نەتەوەکان و گیانلەبەرەکانی سەر زەوی دەدوێ و چەند بەشە: جوغڕافیای سروشتی، جوغڕافیای رامیاری، جوغڕافیای ئابووری، جوغڕافیای مرۆیی، جوغڕافیای روەك(نباتی).

**جفاء:** (جُ) بێهوودە، پووچ.

**جفاء:** (جَ) ستەم، زوڵم، دڵڕەقی، بێئەمەگی. چۆڕس، جوێن. "**جفا کشیدن**": کەوتنەبەر ستەم و ئازاری کەسێك. "**جفاگفتن**": سەرزەنش کردن و جوێن دان.

**جفا پیشه:** ستەمکار، زۆردار، هەڤاڵ و گراوی نادلۆڤان و ستەمکار. وشەکانی "جفاجو.جفاکار.جفاگر.جفاکیش" هەر بەم مانایە دێن.

**جفات:** (جُ) کۆی"جافی"، ستەمکاران.

**جفّاخ:** فیزن، بەدەمار، خۆهەڵکێش، فیشاڵچی.

**جفاف:** وشکەوەبوون، وشك بوونەوە. "**جفاف مطلق**": وشکی رەها.

**جفت:** جووت، جفت، ولف، بەرانبەری تاق. هاوسەر، شەریکی ژیان. تەنیشت و نزیك شتێ یان کەسێك. هاوتا، هاوشان. **"جفت بە جفت"**: دووبەدوو. **"جفت متضاد"**: دوانەی لێکدژ. **"جفت راندن"**: جووتکردن.

**جفت شدن:** جفت/ جووت بوون، پاڵ وێکدان، پێکەوە نووسان. هاونشین بوون.

**جفتك:** لەقە، جووتە، جفتە، جوحتك، جووتکە، لووشك، لووشکە، زرچك، زیترك، چەڕ.

**جفتك انداختن:** جووتە وەشاندن، لووشك هاویژتن، لەقە(هاویشتن/ وەشاندن/ خستن)، جفتە(هەڵخستن/ وەشانن)، هەڵ تووران، هەڵخستن، هەڵخستنەوە.

**جفتك انداز:** لوشکە هاوێژ، جووتە وەشێن، چەڕوەشێن.

**جفت کردن:** 1) پەڕاندن، لێچاك کردن، چات کردن، لێکێشان، نێرهاویشتنە سەر مێ. 2) بەرابەرکردنی شتێ دەگەڵ شتێکی دی. 3) زۆر ترسان. 4) خستنە سەر یەك، مۆنتاژ کردن.

**جفتك زدن:** پەڕین/ بازدان بە هەر دوو لاق. لەقەخستن، لووشکەخستن.

**جفتگیری:** جووت گیری، خەرز، جووت بوونی ئاژەڵی نێر و مێ بۆ زاوزێ.

**جفت و طاق:** جۆراوجۆر. تاق و جووت.

**جفته:** (جُ.تَ) جووت و نزیك و شەریك.

**جفته/ جفتا:** (جَ.تَ) چەماوە، لار.

**جفتی:** دوودانەیی. جووت بوون. هاوسەری.

**جفنگ:** بێهوودە، قۆڕیات، قسەی پڕوپووچ و بێ مانا.

**جفیر:** بڕوانە: "تیردان".

**جك:** فشەگاڵتە، نوکتە، کوراتا، پێکەنینۆك، حەنەك، جۆك.

**جك و جانور:** گیاندارە دڕندە یان مزیڕەکان، جڕوجانەوەر.

**جکیدن:** بڕوانە: "ژکیدن".

**جگرآور:** بریتی لە نەترس، ئازا و بوێر.

**جگرپارە:** بڕوانە: "جگرگوشە".

**جگرتشنە:** 1) بریتی لە زۆر توونی. 2) بریتی لە زۆر تامەزرۆ.

**جگرخای:** 1) جەرگ خۆر. 2) جەرگ خۆرە، کەسێك کە زۆر خەم و خەفەت بخوا. ئەوەی کە ببێتە هۆی خەم و پەژارە و کەمکردنی کێشی لەش.

**جگرخراش:** ناڕەحەتکەر، ئازاردەر، خەمهێنەر. ترسناك، ترس هێن.

**جگرخوار(ە):** 1) جەرگ خۆر. 2) زۆر ستەمکار و بێ بەزەیی. 3) خەمبار، ناڕەحەت. 4) غەمخۆر، دڵسۆز. 5) نەترس، ئازا.

**جگر خوردن:** رەنج کێشان، خەم و کەسەر خواردن.

**جگردار:** نەترس، ئازا، دلێر.





**جگرداشتن:** بریتی لە وێران، زات کردن، ئازایەتی.

**جگرزلیخا:** بریتی لە هەر شتێکی لەت لەت.

**جگرسفید:** سی.

**جگرسوز:** کزەلەجەرگەوەهێن، ناخۆش و دڵتەزێن.

**جگرگوشە:** بەندی جگەر، بەنجگەر.بریتی لە رۆڵەی زۆر خۆشەویست.

**جگرگون:** سووری پڕ رەنگ، سووری تۆخ.

**جگری:** بە رەنگی جەرگ.

**جلّ:** (جُ) بەشی گەورەتر و زۆرتری شتێك، بەشی گرنگی شتێك.

**جلّ:** (جَ.لَ) گەورەیە، مەزنە.

**جل الخالق:** خوا گەورەیە، ئافرێنەر مەزنە.

**جلاء:** 1) کۆچ کردن، دوورکەوتنەوە لە زێد و نیشتمان. 2) روون بوونەوە و ئاشکرابوونی بابەتێك، وەدیارکەوتن. 3) سیقاڵ دان و سڕینەوەی ژەنگی خەنجەر و ئاوێنە و هتد. 4) دیمەن، جوانی. 5) بڕوانە: "بینایی".

**جلائل:** کۆی "جلیلە".

**جلّاب:** (جَ) راکێشەر، کێشەر، هێنەر.

**جلّاد:** سەربڕ، خوێن رێژ، مرۆڤ کوژ، شەللاق زەن، ئەشکەنجەدەر، میر غەزەب، میرخەزەب، جەللاد.

**جلادادن:** زاخاودان، پەرداخ کردن، برقاندن. خاوێن کردنەوە لە ماددەگەلی زیادی.

**جلادت:** 1) گورج و گۆڵ بوون، فرزبوون. 2) بەهێزبوون. 3) پتەوی، بەهێزی، فرزی، ئازایی، لەسەرخۆیی، سەمەت.

**جلّاس:** (جُ) کۆی "جالس و جلیس".

**جلافت:** 1) بەدخولقی، تووڕەو تۆسنی. 2) ناوبەتاڵی، کلۆری. 3) بێ مێشکی، گەمژەیی.

**جلال:** شکۆ، پایەبەرزی، گەورەیی، مەزنی.

**جلالت:** گەورەبوون، گەورەیی، مەزنایەتی، پایەبەرزی.

**جلال و شکوە:** تەنتەنە، بزەم بزەم، سەنتەنە، شان و شکۆ، شکۆ و جەلال.

**جلب:** (جَ.لَ) 1) هەڵلا و هەنگامە، فیتنە و ئاژاوە. 2) مرۆی دەروون ناپاك و فێڵباز، ژنی بەدکردار.

**جلب(کردن):** (جَ.لْ) 1) راکێشان، کێشان لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی، هێنان. 2) گرتن، قۆڵبەست کردنی کەسێك لە رێگەی یاساییەوە.

**جلب توجّە:** سەرنج راکێشانی کەسێك بۆلای خۆ یان شتێکیدی.

**جلب کنندە:** راکێش، کێشەر، سەرنج راکێش.

**جلد:** (جَ) 1) فرز، کرژ، ئازا، گورج، چالاك. 2) لێدان، شەللاق لێدان، فەلاقەکردن، دارکاری.

**جلد:** (جِ) 1) پێست، پێستی لەشی مرۆڤ یان ئاژەڵ. 2) بەرگ، پشتە کتێب. **"جلدکردن"**: بەرگ تێگرتن.

**جلدو:** بڕوانە: "انعام".

**جلدی:** دەس بە جێ، گورجێ، خێرا. خێرایی، پەلە. زیرەکی.

**جلزوولزکردن:** 1) بەپێداگری زۆرەوە خوازیاری شتێ یان ئەنجامدانی کارێك بوون. 2) هەست بە ژان و ناڕەحەتی زۆرکردن بەهۆی سووتانی بەشێك لە لەش.

**جلسات:** کۆی "جلسە"، کۆبوونەوەکان، دانیشتنەکان.

**جلسە:** کۆڕ، کۆبوونەوە، دانیشتن. "**جلسەداشتن**": بەشداربوون لە کۆبوونەوەدا. "**جلسەکردن**": پێکهێنانی کۆبوونەوە.

**جلف:** سووك و چرووك، جلّف، جرت، قرت، بلّح، خونك، ئاكارناشیرین، بەدئەدا، نەگونجاو، گەمژە، ناوبەتاڵ.

**جلق:** (جَ) 1) سەر تاشین. 2) بڕوانە: "استمناء".

**جلگە:** دەشت، دەشتایی، دەشتانی. "**جلگە وسیع**": لێلات، دەشتی پان و کاکی بە کاکی.

**جلل:** (جَ.لَ) کار یان بابەتی گەورە و مەزن.

**جلو:** پێش، بەر، بەردەم، بەرەوە، بەرەوڕوو، رووبەڕوو. بە مانای هەوسار و رەشمەی ئەسبیش دێ. "**جلوجلو**": پێشتر، لەپێش دا. "**جلو چیزی را گرفتن**": پێش گرتن یان بەرگرتن. "**جلو خود را گرفتن**": خۆکۆنترۆڵ کردن یان بەسەرخۆدا زاڵبوون. "**جلودادن**": خستنەبەرەوە، قیت کردنەوە، دەرپەڕاندن. "**جلو کسی را گرفتن**": بەرپێگرتن. خۆڕاگریکردن لە بەرامبەر ئەودا یان بەر بە جێبەجێبوونی کردەوەی ئەو گرتن. "**جلو کشیدن**": نزیك کردنەوە لە خۆ، هێنانەپێش. "**جلوگرفتن از چیزی**": بەرگیریکردن لێی، پێشگیریکردن لێی. "**از جلو کسی درآمدن**": بەربەرەکانی کردن لە بەرامبەر ئەودا، دەرەقەت هاتن، خۆلەبەرگرتن.

**جلو آمدن:** هاتنە پێش، هاتنە بەرەوە.

**جلواد:** خوو و خدەی خراپ، سرشتی خراپ.

**جلواز:** پاسەوان، بەردەست.

**جلو افتادن:** بەرکەوتن، پێش کەوتن، کەفتنە بەر. لەپێش خەڵکانی ترەوە رۆیشتن. پێشەنگ بوون لەئەنجامدانی کارێك دا.

**جلوانداختن:** خستنە پێشەوە، خستنە بەرەوە، پێش خستن، بەرەوخستن، وەبەرخۆدان.

**جلوبردن:** بردنەبەرەوە، بردنەپێشەوە.

**جلوت:** ئاشکرا و دیار.

**جل و جهاز:** کەلوپەلی بووك.

**جلوت و خلوت:** ئاشکرا و شاراوە، دیار و نادیار.

**جلود:** کۆی "جلد" بەمانای پێست.





**جلودار:** جڵەودار، جڵەوکێش، پێشڕەو، پێشەنگ. "**جلودارکسی نشدن**": توانای بەربەرەکانی دەگەڵ ئەودا نەبوون، دەرەقەت نەهاتن، پێنەوەستان.

**جلو رفتن:** چوونە/ رۆیشتنە (پێش/ بەرەوە).

**جلو رویبدن:** رادان، وەبەر خۆدان و ماشتن.

**جلوریز:** خێرا، فرز و چالاك. "**جلوریزشدن**": بەخێرایی جوولان.

**جلوزدن:** کەوتنەبەرەوە.

**جلوس:** 1) دانیشتن، رۆنیشتن. 2) کۆی "جالس".

**جلوف:** کۆی "جلف".

**جلوگیر:** بەر(گر/ گیر)، پێش(گر/ گیر) بەربەست، نەهێڵ.

**جلوگیری:** بەرگرتن، بەرگیریکردن، پێش گرتن، پێشگیری کردن، راوەستاندن، نەهێشتن، بەربەست دانان.

**جلوە:** 1) ئاشکراکردن، خویاکردن، دەرخستن، نواندن، خۆنواندن. 2) دیمەن، بەرچاو، نما، هێما، لایەن. 3) جوانی، دڵ راکێشی. "**بەجلوەآمدن**": بەشێوەی باش و دڵخواز دەرکەوتن.

**جلوەدادن:** نواندن، نیشاندان، پیشاندان.

**جلوەداشتن:** سەرنج راکێش بوون، راکێشەربوون.

**جلوەفروختن:** خۆنوێنیکردن، نیشاندانی جوانی خۆ.

**جلوەکردن:** 1) ئاشکرا و خویا بوون. 2) بە فکر گەیشتن. 3) خۆنوێنیکردن. 4) بە باشی و دڵپەسند نیشاندان.

**جلوەکنان:** 1) ئاشکرا و دیار و بەتروسکە. 2) لە حاڵی (خۆدەرخستن/ خۆنواندن) دا.

**جلوەگاە:** شوێنی ئاشکرابوونی شتێك.

**جلوەگر:** دیار و روون و بریقەدار. "**جلوەگرساختن**": نیشاندان، نواندن. "**جلوەگرشدن**": خۆپیشاندان، ئاشکرا و خویابوون. "**جلوەگری**": خۆنوێنی، خۆشاندان بەمەبەستی سەرنج راکێشانی دیتران.

**جلوە نمایی:** خۆنواندن، خۆنوێنی، خۆدەرخستن.

**جلّی:** روون، ئاشکرا. سیقاڵ دراو، مشت و ماڵ دراو. بەرز، بڵیند.

**جلید:** 1) سەهۆڵ، بەستوو. 2) بەهێز، بەتاقەت و لەسەر خۆ، فرز و وریا.

**جلیس:** هاونشین، هەڤ نشین، هاودەم، هۆگر.

**جلیف:** پیاوی بەدخولق و تووڕە، ستەمکار، گێل و نەزان.

**جلیل:** مەزن، گەورە، بەڕێز، بەشکۆ. "**جلیل القدر**": پایەبەرز، مەزن.

**جلیلە:** مێینەی "جلیل"، ژنی بەڕێز و مەزن.

**جلیّە:** مێینەی "جلی"، روون، ئاشکرا. حەقیقەتی بابەت یان کارێك.

**جمّ:** فره، زۆر و زێده له هەرشتێك.

**جماء:** ژنی قەڵەو و گۆشتن. زەوی تەخت.

**جماح:** (ج) سەرکێشی، سەرەڕۆیی.

**جماد:** کرەك، نەجووڵ، بێجووڵە، بێگیان، رەق، هەر شتێ کە نەش و نما نەکا، بەرانبەر بە زیندەوەر و روەك.

**جمادات:** کۆی "جماد"، رەقەمەنی.

**جمادی:** بێگیان و بێجووڵە بوون.

**جمار:** کۆمەڵ، گروپێك لە خەڵك کە لە شوێنێك کۆ ببنەوە.

**جمّاز:** راکەر، توندڕەو، خۆشبەز، تیژڕەو.

**جماع:** (ج) لێك جووت بوونی ژن و پیاو، نێزیکی، گان کردن، ئیلاقەکردن، کوتان، نیان، نیهان.

**جماعت:** (بە)کۆمەڵ، دەستە، گروپ، گروپێك لە خەڵك.

**جماعتی:** بە کۆمەڵی، بەشداربوو لە نوێژی جەماعەت.

**جماعتی‌شدن:** کۆمەڵی‌بوون.

**جمال:** جوانی، دەلالی، قۆزی. "**جمال گرفتن**": بە کەماڵ گەیشتن یان بە باشترین شێوە دەرکەوتن. "**بەجمال**": جوان، قەشەنگ.

**جمّال:** وشترەوان، نگابانی وشتر

**جماهیر:** کۆی "جمهور".

**جمایع:** کۆی "جمیعه".

**جمبوری:** کۆبوونەوەی لاوانی جیهان بەتایبەتی پێشەنگەکان لە شوێنێکی دیار بۆ هاوپێوەندی و ئاشتی و دۆستایەتی.

**جمجاه:** پاشای گەورە و پێگەدار، خاوەن مەقام و پێگە.

**جمجمه:** قاپێلکە سەر، کەللە سەر، ئێسکە سەر، کاسەسەر، قاقلۆك، قاف، قەحف، کاپۆل، کاپۆڵ، کاپۆڵك، کاکۆت، کات، کاتك، کاتات، کاژە، کاژەڕە، کاژەڵە، کاژەلاك، کافا، کولۆخ، کەپوو، کەپوولە، پیت.

**جمره:** 1) بڕوانە: "اخگر". 2) کۆمەڵ و تیرەی یەکگرتوو و هاوئاهەنگ.

**جمع:** 1) گشت، کۆ، کۆم. 2) کۆکردنەوە، خڕکردنەوە، گردەوەکردن، خستنە سەریەك. 3) گروپ، کۆمەڵ. 4) ئاسوودە، بە بێ‌پەرێشانی و ئاڵۆزی. "**بر سر جمع**": لە حوزووری هەموواندا. "**بەجمع**": بەکۆ، بەشێوەی گروپی. "**درجمع**": لەسەریەك، بەگشتی.

**جمعاً:** تێکڕا، هەموو، بەگشتی.

**جمع آوری:** خڕکردنەوە، کۆکردنەوە، کۆوەکردن، کۆم کرن، ڤێك خستن، ڤێك ئێخستن.

**جمع اضداد:** کۆی دژەکان.

**جمع بندی:** پۆلین بەندی، کۆبەندی.

**جمع بودن:** خڕبوونەوە لە شوێنێ. ئەرخەیان، خاترجەم.

**جمع داشتن:** خڕکردنەوە لە شوێنێ یان لە تەنیشت یەك دانان.





**جمع شدن:** کۆبوون، کۆبوونەوە، وەکۆبوون، کۆم بوون، لێك خڕبوونەوە، گردبوون، گردبوونەوە، گردەوبوون، جڤات کرن، ڤەجەمیان، ڤەجەمین، جەم بوون، جەمەوبوون. رێکهاتن، گرژبوون.

**جمع کردن:** 1) کۆکردنەوە، وەکۆکردن، خڕکردنەوە، چڕکردنەوە، جڤات چێکرن، ڤەجەمانن، جەمەوکردن، گردکردن، گردکردنەوە، گردەوکردن. 2) هەڵگرتنەوە. 3) پاشەکەوتکردن، پەزمەندەکردن. 4) وەدەستهێنان. 5) بڕوانە: "انطباق". 6) کۆنترۆڵ کردن. "**جمعش کن**": خڕی‌کەوە، کۆی‌کەوە.

**جمع گرایی:** کۆخوازی.

**جمع نشستن:** بەچڕی و لە نزیك یەك دانیشتن.

**جمع و جور:** جەم و جۆر، خنج و خۆڵ، خنج و منج، رێکوپێك.

**جمعه:** هەینی، هەینو، هەنی، ئین، جومعە.

**جمعی:** کۆیی، بەکۆمەڵ، گشتی. سوننی.

**جمعی بودن:** بە کۆمەڵ بوون.

**جمعیّت:** 1) حەشیمەت، حەشامەت، دانیشتوان، ئاپۆرا، ئاپۆرە، جەماوەر. 2) کۆمەڵە، کۆرگە. 3) کۆبوونەوە، یەکگرتن. 4) هاونشینی.

**جمعیت خاطر:** ئەرخەیانی، خاترجەمی.

**جمعیّت شناسی:** حەشیمەت ناسی، دێمۆگرافی.

**جمعیّت شناختی:** حەشیمەت ناسانە، دێمۆگرافیك.

**جمعیّت کردن:** کۆکردنەوەی لەشکر یان سپا یان گروپێك.

**جمعیّت نگاری:** توێژینەوە لە مەڕ حەشیمەت، حەشیمەت ناسی.

**جمّ غفیر:** گروپێکی زۆر لە خەڵك.

**جمل:** (جُ.مَ) کۆی "جمله".

**جملات:** کۆی "جمله"، رستەکان، وتەکان.

**جملت:** هەموو، گشت. "**بر آن جملت**": هەر بەو جۆرە.

**جملگی:** گشت، هەموو، تێکڕا. بەتەواوی.

**جمله:** 1) رستە، چەند وشە کە مانا تەواو دەکەن، هەڤۆك.قسە، ئاخاوتە. هەموو، گشت. بەتەواوی. کورتە، بەکورتی. وێنە، نموونە. "**جمله امریه**": رستەیێ کە فەرمان بە کارێ دەدا، هەڤۆکافەرمانی. "**جمله اسمیّه**": ناوەڕستە، هەڤۆکاناڤکی. "**جمله ظرفیّه**": دەفرە رستە، رستەیەك کە دەفر دەگەیەنێ، هەڤۆکاهۆکەری. "**جمله شرطیّه**": رستەی مەرج، هەڤۆکاهەکەنی. "**جمله مستقل/ جمله کامل**": رستەوشەی تەواو، هەڤۆکابسەرخۆ. "**شبه جمله**": کلۆز، رستەتا. 2) کۆ، گشت، گشتی. "**برجمله**": بەگشتی، تێکڕا. "**برچه جمله**": چۆن. "**درجمله**": بەکورتی.

**جمله‌بندی:** رستەبەندی.

**جمله‌سازی:** رستەسازی.

**جمله‌شدن:** کۆبوونەوە، خڕبوونەوە.

**جمله فروشی:** کۆبایی، کۆفرۆشی.

**جمله‌کردن:** کۆکردنه‌وه. تێکه‌ڵاوکردن.

**جمله‌وار:** رسته‌ئاسا.

**جمله‌واره:** نیمچه رسته، نیوڕسته.

**جمند:** بڕوانه: "جای‌مند".

**جمنده:** بڕوانه: "جنبنده".

**جموح:** (جُ.مُ) سه‌رکێشی کردن، سه‌ره‌ڕۆیی‌کردن.

**جمود:** (جُ.مُ) به‌ستران، سه‌هۆڵ کردن، چه‌قبه‌ستن، رچان، وشك بوون، ره‌ق هه‌ڵاتن و وشك بوونی خوێن. وشكی و گرژی. بێجووڵه‌یی، ره‌قی.

**جموس:** (جُ.مُ) به‌ستران و سفت بوونه‌وه‌ی رۆن و چه‌وری.

**جموع:** كۆی"جمع"، گروپه‌كان.

**جموم:** (جُ.مُ) زۆر بوونی شتێك، فره‌بوونی ئاو.

**جموم:** (جَ.مُ) پڕئاو، چاڵی پڕئاو.

**جمهور:** جه‌ماوه‌ر، ئاپۆره، پڕایی خه‌ڵك، قه‌ڵه‌باڵغ، گروپ. كۆمار.

**جمهوری:** (سیستمی)كۆماری، شێوه حكوومه‌تێ كه سه‌ره‌ك كۆمار له‌لایه‌ن خه‌ڵكه‌وه بۆ ماوه‌یه‌كی دیاریكراو هه‌ڵده‌بژێردرێ.

**جمهوریّت:** حكوومه‌تی كۆماری.

**جمهوریخواه:** كۆماریخواز، لایه‌نگری حكوومه‌تی كۆماری.

**جميع:** گشت، گشتی، هه‌موو، سه‌رجه‌م، سه‌رتاپا. "**جميع جهات**": گشت لایه‌نه‌كانی بابه‌تێ.

**جميعاً:** گشت، به‌ته‌واوی.

**جميل:** جوان، قه‌شه‌نگ.چاك، باش.

**جميله:** مێینه‌ی"جميل".

**جنّ:** جن، جند، جندۆكه، جنۆكه، ژنۆكه، هاڵه، ئاڵه، ئه‌جنه، ئه‌جنده، عه‌جنه، ژنۆكه، شه‌وه، مۆته، مۆته‌كه، قژبه‌سه‌ره، ساهل، سه‌ركڕنیك. "**جنّ ترسناك**": ملۆزم.

**جنائز:** كۆی"جنازه".

**جناب:** لێوار، چوارچێوه‌ی ده‌رگا. وشه‌ی رێزگرتن به مانای به‌ڕێز، ئاغا.

**جنابت:** 1) پیس بوون، گلاوبوون. 2) له‌ش پیسی.

**جنابت دار:** له‌ش پیس.

**جناح:** (جَ) باڵ، قۆڵ، په‌ل. "**جناح چپ**": حیزب و گروپ گه‌لێك كه خوازیاری پێكهێنانی گۆڕانكاری به‌قازانجی كۆمه‌ڵانی خه‌ڵك و خاوه‌نی به‌ریانی شۆڕشگێڕانه‌ن. "**جناح راست**": حیزب و گروپ گه‌لێكی خۆپارێز یان كۆنه‌پارێز یان خوازیاری پێكهێنانی چاكسازیگه‌لی میانه‌ڕۆ. "**برجناح چیزی بودن**": به‌نیازی ده‌سپێكردنی ئه‌و بوون، له به‌ره‌به‌ری ده‌سپێكردنی دا بوون.

**جناح‌بندی:** باڵبه‌ندی، باڵباڵێن.

**جناح:** (جُ) گوناه، تاوان، ئۆباڵ.

**جنازه:** مه‌یت، تاڤێر، ته‌رم، كه‌له‌ش، جه‌نده‌ك، كه‌لاك(جه‌نده‌كی منداره‌وه‌بووگ)، لاش، لاشه(كه‌لاكی تۆپیو)، مردوو.





**جناس:** (رێزمان) ره‌گه‌زدۆزی، ئه‌وه‌یه كه له رسته‌دا ـــ جا هۆنراوه بێت یان په‌خشان ـ دوو وشه زیاتر هه‌بێت كه له رواڵه‌ت دا وه‌كوو یه‌ك وابن به‌ڵام له مانادا هه‌ریه‌كه مانایه‌كیان هه‌بێت وه‌كوو: گوڵی باخان له باخان جووتی باخانی ئه‌وێ.

**جناغ:** ته‌ڵه‌مه، ئێسكی (چۆڵه‌مه/ چه‌ڵه‌مه/ چۆڵه‌مێ). "**جناغ سینه**": كۆڵه‌كه‌ی سینگ.

**جناغ شكستن:** چه‌ڵه‌مه‌شكێنه، چه‌ڵه‌مه‌شكانێ، چۆڵه‌مه‌شكێنه، ته‌ڵه‌مه‌شكێنه.

**جنان:** (جِ) كۆی"جنّت".

**جنان:** (جَ) 1) دڵ. 2) بابه‌ت یان كاری شاراوه، ناوه‌وه‌ی شتێك. 3) شه‌و و تاریكی شه‌و.

**جنايات:** كۆی"جنايت".

**جنايت:** تاوان ، تاوانكاری، گوناه و تاوانی گه‌وره، جه‌نایه‌ت.

**جنب:** (جَ) ته‌نیشت، لا، ئالی، ره‌خ، لاكه‌له‌كه، لاقه‌برغه.

**جنب:** (جُ.نُ) 1) غه‌واره، نامۆ، بێگانه، دوور. 2) له‌ش پیس.

**جنبا:** (جُ) بڕوانه:"متحرك".

**جنبان:** جووڵێنه‌ر، بزوێن، له‌رێن، راژێن، له‌وێن.

**جنبان جنبان:** بزۆك، جووڵه‌كه‌ر، له حاڵی جووڵانه‌وه‌دا.

**جنباندن/ جنبانیدن:** جووڵاندن، جووڵاندن، جووڵاندنه‌وه، جوولانن، جووڵانن، جوانن، بزواندن، بزاوتن، ته‌كان پێدان، هه‌ژاندن، هێژاندن، ڤه‌هه‌ژاندن، راژاندن، راژه‌نین، زیوانن، شانین، قه‌لاندن، هه‌ڕكاندن، له‌ره‌نه. بۆمانای زیاتر بڕوانه: "تكان دادن". "**جنباننده**": بزوێن، له‌قێن، تلێن، هه‌ژێن، راژێن، راتڵه‌كێن، شه‌كێنه‌وه، هه‌ڵته‌كێن، هه‌ڵته‌كێنه.

**جنب جنبان:** بڕوانه: "جنبان جنبان".

**جنب خوردن:** بزووتن، جووڵان، هه‌ستانه سه‌ر پێ، ئاماده‌ی هه‌نگاونان.

**جنبش:** بزووتنه‌وه، بزاڤ، بزاو، بزوتن، جووڵه، جووڵیان، جووڵان، جم، جمدان، جمین، جمس، جمشت، جنگ، جوین، ته‌كان خواردن، ژووڵه، زیوان، زیڤان، فرته.

**جنبش رمانتیك:** بزاڤ/ بزووتنه‌وه‌ی رۆمانتیك.

**جنبش زيبايى شناختى:** بزاڤی جوانناسانه.

**جنبش فراوانى:** بزاڤی بان ده‌روونی.

**جنبنده:** بزۆك، جووڵه‌كه‌ر، جوولێن، جووڵێنه‌ر، جمه‌كه‌ر.

**جنب و جوش:** جموجۆڵ، جنگوجۆڵ، جومبوجۆش، بزوتنی زۆر، بزووتن و سووڕانه‌وه، جووڵانه‌وه‌ی زیاد، هه‌وڵ و ته‌قالا، جرت و فرت، قت و فت، گلوخول، چه‌رخوخول.

**جنبه:** 1) لایه‌ن، لا، ره‌خ، ئالی. 2) به زه‌رفییه‌ت بوون. "**جنبه مفهومی**": لایه‌نی چه‌مكیانه، لایه‌نی واتایی. "**جنبه مكنون**": لایه‌نی شاراوه.

**جنبی:** تەنشتی، لابەلا. لاوەکی، ناسەرەکی.

**جنبیدن:** جوولآن، جوولان، جوولآنەوە، بزووتن، خۆبزاوتن، تەکان خواردن، وەلەرە کەوتن، خێزیان، لڤین، جمان، جمیان، جنگدان، جووم، جنگلێ، گینگل، لەخش، لەخشان، لەخشین، لەخشە، خشکەکردن، هەژان، هێژان، راژان، کوش بوون، داجوین، هەرکین، لڤین، لەڤین، لەبات، وەرجسە. **"جنبیدن مختصر"**: جینگلێ، بزووتنی کەم.

**جنّت:** بەهشت.

**جنتلمن:** پیاوی قورس و قۆڵ و سەنگین، جوامێر.

**جنجال:** حەلەلا، هەراوزەنا، زەنازەنا، قاڵ، قال، قشقەڕە، گۆڵمەز، سمڕ، سرمە، هەنگامە، ژلێوە. **"هووجنجال"**: چەقەچەق، چەقەوهەرا، هەراوهوریا، گاڵەگاڵ.

**جنجال آفرین:** (گۆڵمەز/ هەنگامە) خولقێن.

**جنجال و همهمه:** دەنگەدەنگ، هەراهەرای حەشامەت، دەنگەشە، قاڵە، قاڵمەقاڵ، قاڵمەقاڵم، چەقە و هەرا، چەقەوگوڕە، قاو و قریشك، قاو و قو، قاو و قیژ، قشقەڕەق، غەڵبەغەڵب، سنگەسنگ، سڕمەسڕم.

**جنجالی:** ئاژاوەچی، دەنگەشە و ئاژاوەخولقێن، شەڕەنگێز، مشتومڕ هەڵگر.

**جند:** (جُ) سپا، لەشکر.

**جندره:** نەتاشراو، ناڕێك، ناساف، پڕ چرچ و لۆچ.

**جنده:** جندە، جنە، جننە، جنێ، سۆزانی، قاحبە، ژنی خۆفرۆش.

**جندەباز:** جندەباز، جننەباز.

**جندی:** (جُ) سەرباز.

**جنس:** (جِ) رەگەز، رەسەن، چەشن، توخم، جۆر، کالآ، شمەك. **"جنس به جنس"**: بڕوانە:"پایاپا". **"جنس خانگی"**: بریتی لە شەڕاب، مەی. **"جنس دوپا"**: بریتی لە مرۆڤ. **"اسم جنس"**: (ڕێزمان) ناوی گشتی.

**جنس:** (جَ.نَ) بوونە سەهۆڵ، سەهۆڵ کردن.

**جنسی:** (جِ) سێکس، سێکسی. بەشێوەی جنس و کالآ.

**جنسیّت:** 1) رەگەزنامە، ناسنامە. 2) هاوڕەگەز و هاوچەشن بوون. 3) ژن یان پیاوبوون، نێر یان مێ بوون.

**جنسیّت گرایی:** سێکسیزم، Sexism.

**جنگ:** (جُ) بەیاز، کەشکۆڵ، کەشکۆل، دەفتەری بیرەوەری و شێعران.

**جنگ:** (جَ) شەڕ، جەنگ، تێکهەڵچوون.

**جنگ آزما:** شارەزا لە شەڕ، لێهاتوویی و زانایی لە شەڕدا.

**جنگآزموده:** شەڕدیتوو، ئازا، شەڕکەر، جەنگاوەر.

**جنگ آوردن:** شەڕکردن.





**جنگ افروز:** شەڕایسێن، شەڕهەڵایسێن، شەڕەنگێز.

**جنگ افزار:** جبە، ئامرازی شەڕ، چەکوچۆڵ، چەك، چەکان، ئەرکان.

**جنگاور:** شەڕکەر، شەڕکار، شەڕڤان، جەنگاوەر.

**جنگاوری:** شەڕکەری، ئازایەتی، جەنگاوەری.

**جنگ تحمیلی:** شەڕی داسەپاو، شەڕی نەخوازراو.

**جنگجو(ی):** شەڕکەر، دلێر، ئازا، شەڕخواز، شەڕانی، جەنگی، جەنگاوەر.

**جنگجویی:** جەنگاوەری، ئازایەتی، جەنگ خوازی، شەڕاشۆیی، جینگنی.

**جنگ حیدری و نعمتی:** بریتی لە شەڕی بێ بنەما و بەهۆی دەمارگرژی تایفییەوە.

**جنگ داخلی:** شەڕی نێوخۆیی.

**جنگ روانی:** شەڕی دەروونی.

**جنگره:** بڕوانە:"پرخاشگر".

**جنگ زده:** شەڕلێکەوتوو، شەڕلێدراو.

**جنگ زرگری:** شەڕی زێڕینگەری، شەڕی درۆیین و ناڕاست بۆ فریودانی دیتران.

**جنگ زرگرانه:** شەڕی زێڕینگەرانە، لە دوورەوە قسە بە یەك گوتن.

**جنگ سرد:** شەڕی سارد، شەڕی پڕوپاگەندەیی– سیاسی، زۆرتر بەو شەڕە سیاسی و پڕوپاگەندەییە دەگوترێ کە لە نێوان ئەمریکا و یەکیەتی سۆڤییەتی پێشوو لە پاش شەڕی دووهەمی جیهانی تا دەیەی نەوەد درێژەی کێشا.

**جنگ شیمیایی:** شەڕی کیمیاوی.

**جنگ طلبی:** شەڕخوازی.

**جنگ فرسایشی:** شەڕی شەکەتکەر.

**جنگ قدرت:** شەڕی دەسەڵات.

**جنگلبان:** مێشەڤان، مێشەوان، ئاگاداری مێشە.

**جنگ مغلوبه:** ئۆغڵمە، شەڕ بە تێك چرژان و پێك هەڵپڕژان، شەڕی زۆر توند.

**جنگ مکانیزه:** شەڕی میکانیزە، شەڕێك کە لەو دا لە ماشێن گەلی جەنگی کەلك وەردەگیرێ.

**جنگ ناخواسته:** شەڕی نەویستراو، شەڕی نەخوازراو، شەڕی یەخەگیر.

**جنگنده:** شەڕکەر، شەڕکار.

**جنگ و گریز:** قنگەشەڕ، وردەشەڕ، پەلامار و راکردن.

**جنگی:** سەر بە جەنگ، ئەوەی پێوەندی بە شەڕەوە بێ، شەڕکەر، شەڕانی.

**جنگیدن:** شەڕکردن. بەربەرەکانیکردن دەگەڵ دژوارییەکانی شتێ یان هەوڵدان بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی تایبەتی.

**جن گیر:** جن(گر/ گیر)، کەسێك کە ئیشی دۆعا نووسین و نووشتەدان بە تووش بووانی نەخۆشییە رۆحییەکانە و بە گوتەی خۆی دەگەڵ جنۆکەکان پێوەندی هەیە و دەتوانێ بیانخاتە ژێر رکێفی خۆی.

**جن گیری:** جنۆکە خوازی، کار و ئیشی "جن گیر".

**جنم:** (جَ.نَ) شکلّ، روخسار، قەلافەت، سرشت.

**جنوب:** (جُ.نُ) کۆی "جَنب".

**جنوب:** (جَ.نُ) باشوور، راژێر، نشیڤ. "**جنوب شرقی**": باشووری خۆرهەلات. "**جنوب غربی**": باشووری خۆراوا. "**باد جنوب**": زریان.

**جنوبی:** باشووری. خەلکی باشوور. دروستکراو یان رەنیوهاتوو لە ناوچەکانی باشووری ولات.

**جنود:** کۆی "جند"، لەشکرەکان.

**جنون:** شێتی، دێوانەیی. شەیدایی. کەم عەقلی، نەزانی.

**جنون ادواری:** شێتی(جاربەجار/ کاتی).

**جنون آسا:** (دێوانە/ شێت) ئاسا، شێتانە، وەك شێتان، کاری شێتان.

**جنون اطباقی:** حالەتی شێتی دایمی.

**جنون اعداد:** جۆرێك لە شێتی نەخۆشی رارا نیسبەت بە ژمارەکان کە دایم دەیەوێ تەنەکان بژمێرێ.

**جنون پیری:** خەرەفان، خەرەفین، نەخۆشی دەروونی کە دوای شەست ساڵەیی سەرهەلّ دەدا و نەخۆش تووشی بێخەوی و بێ ئیشتیایی و لاوازی بیرگە و سەربزێوی دەبێ.

**جنون جوانی:** "شیزۆفێرنی"، "ئیسکیزۆفێرنی"، نەخۆشی دەروونی کە لە نێوان 15 تا 30 ساڵەیی سەرهەلّدەدا و نەخۆش تووشی حالەتی بێ حالّی و حەپەساوی و خەمۆکی و پەرێشانی و راوە و وەهم و و هەلّسوکەوتی گەوجانە دەبێ.

**جنون زده:** شێت، دێوانە، besotted.

**جنون وار:** بڕوانە: "جنونآسا".

**جنیب:** 1) فەرمانبەر، بەردەستە، مل کەچ. 2) ئەسپی یەخترمە.

**جنیس:** رەسەن، جسن، نەژادباش.

**جنین:** کۆرپەلە، پز، پێزە، تۆل، پس، گۆدەك، بەبلە. "**جنین جان نگرفته**": ئاوڵەمە، گۆشت پەرە، گۆشت پارە، پێزەی رۆح تێ نەگەڕاو. "**سقط جنین**": بەرخستن، لەباربردن، بەراویتن.

**جنین شناسی:** تۆل ناسی، embryology.

**جو:** (جَ) تەوشك، زەپۆش، کەش، کەشوهەوا، فەزا، نێوان زەوی و ئاسمان، ئەتۆمسفێر.

**جوائز:** کۆی "جائزە".

**جواب:** بڕوانە: "پاسخ". "**جواب دندان شکن**": هەس دانەوە، ولامی دیان شکێن. "**جواب عجولانە**": گورگاور.

**جواب کردن:** 1) ولامی رەت دانەوە بە تکا یان داواکاری کەسێك. 2) وەرنەگرتنی نەخۆش یان بڕینی داودەرمان لێی بەهۆی ناهومێدی لە چاکبوونەوەی. 3) دەرکردن.





**جوابگو:** بڕوانە: "پاسخگو".

**جواد:** 1) بڕوانە: "بخشندە". 2) خۆشبەز، ئەسپی تیژڕەو، گورج.

**جواذب:** کۆی "جاذب".

**جوار:** دراوسێیەتی، هاوسێیەتی. پەنا، تەنیشت.

**جوارح:** کۆی "جارحە".

**جوارح النهار:** ئەو بەلاّ و کوێرەوەرییانەی کە ئینسان لە رۆژ دا بەرەورووی دەبێتەوە.

**جواز:** 1) رەوایی، رەوابوون، رێدان. 2) ئیزن، ئیجازە، رەوا، پەتە، پسوولە. 3) تێپەڕنامە، رێنامە، پاساپۆرت.

**جوازم:** کۆی "جازم".

**جواسیس:** کۆی "جاسوس".

**جوامد:** کۆی "جامد".

**جوامع:** کۆی "جامع و جامعە".

**جوان:** 1) گەنج، لاو، لاڤ، جوان، تازەپێگەیشتوو، جحێلّ، جەحێلّ، جەهێلّ، خۆرت، وشاق، نەوچە. 2) کەم ئەزموون بە هۆی کەم تەمەنییەوە. 3) بڕوانە: "شاداب". 4) نوێ، تازەدامەزراو. 5) لەبار و هاوڕا.

**جوانب:** کۆی "جانب".

**جوان بخت:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**جوان خواهی:** بڕوانە: "جوان گزینی".

**جوان سالاری:** لاوساوی، لاوسالاری، گەنج سالاری.

**جوان سری:** وەك لاوان هەلّسوکەوت کردن.

**جوانك:** جوانکیلە، جوانکەلە، لاوژۆکە، کوڕی لاو.

**جوان گزینی:** لەسەرتردانانی لاوان بەسەر بەساڵ دا چوان دا، لاوخوازی، گەنج خوازی. "ageism"

**جوانمرد:** جوامێر، جامێر، مێرخاس، مەردەمێر، جۆمەرد، پیاوخاس، شەجو، دلاوا، بەخشندە، مەزن، ئازا.

**جوانمردی:** جوامێری، مێرخاسی، ئازایی، پیاوەتی، پیاگەتی، مۆردەمەنی، لاوچاکی، دلاوایی، بەخشندەیی، رەندی.

**جوانمرگ:** جوانەمەرگ، بە گەنجی مردوو، بێ وەخت مردوو.

**جوانە:** 1) لاو،لاوی، جوانی. 2) چرۆ، چەکەرە، چەقەرە، چووزەرە، خەلّف، غەلّف، لزگ، لکی یەك ساڵە، لکی باریکی دار.

**جوانەزدن:** چرۆدەرکردن، (چەکەرە/ چەقەرە)دان، چووزەدان، پشکووتن، گەلادەرکردن، پەلك لێ روانی روەك، دندوکەدان، ملیان.

**جوانەزن:** ژنی لاو.

**جوانی:** گەنجی، گەنجایەتی، جحێلّی، خۆرتی، لاوی، لاوانی، لاوێتی، لەوەندی، جوانی. کەم ئەزموونی. "**اول جوانی**": دردوك، هەرزەکاری.

**جواهر:** کۆی "جوهر".

**جواهرنشان:** گەوهەر نیشان، گەوهەردار.

**جوایز:** کۆی "جایزە".

**جوبە:** (جُ) گۆڕەپان، مەیدان.

**جوجوشدن:** وردوردبوون، پارچەپارچە بوون.

**جوخە:** 1) دەستە، تاقم، گروپ، دەستەیەك لە خەڵك، دەستەیەك لە ئاژەڵان. 2) قولکە. 3) چۆخە. "**بە جوخە اعدام سپرده شدن**": ئێعدام کران، گوللەباران کران.

**جود:** بەخشش، بەخشندەیی، جوامێری.

**جودت:** چاك بوون، خاس بوون. چاکی، باشی.

**جور:** (جَ) ستەم، زۆر، لەتم، ناهەقی.

**جور:** (جُ) چەشن، جۆر، وەك.

**جوراجور:** هەمەچەشن، جورجور، جۆراوجۆر، جۆربەجۆر، جورەجورە، رەنگاڵە، رەنگاوڕەنگ.

**جوراوجور:** بڕوانە: "جوراوجور".

**جورشدن:** رێکخران، دروست بوون، (جۆر/ جوور) بوون.

**جورکردن:** رێك خستن، دروست کردن، سازاندن، (جوور/ جۆر)کردن.

**جوره:** جمع"جائر".

**جوریدن:** گەڕان بە دوای شتێك دا.

**جوزاك:** 1) خەم، کوڵ، کەسەر. 2) خەمبار، خەمناك.

**جوسازی:** شانتاژ، گەمەکردن بە هەست و سۆزی بەردەنگ.

**جوسان:** گەڕان و خولانەوە لە ناو ماڵاندا بۆ راووڕووت.

**جوَسنج:** "بارۆمیتر"، تەوژم پێو، زەخت پێو.

**جوسنگ:** هاوکێشی جۆ، بە قەرای دەنکە جۆیەك.

**جوسە:** (جَ.سَ) کۆشك، کاخ، باڵەخانە.

**جوش:** 1) کوڵان، کوڵین، وەکوڵ هاتن، هاتنەکوڵ، جۆشان، جۆشیان. 2) شۆڕش، هەنگامە، پشێوی، شپرێوی. 3) دڵەخورپێ، دڵەکوتێ، تێن و گوڕ و ورووژان. 4) زیبکە. 5) بڕوانە:"تلاطم". "**بەجوش آمدن**": 1) کوڵین، هاتنە کوڵ. 2) شەپۆل هەستان. 2) تووڕە و قەڵس بوون، هەڵچوون. 3) وەجووڵە کەوتن.

**جوش آب:** کوڵ، قوڵت، جۆش.

**جوش آمدن:** بڕوانە: "جوش".

**جوش آوردن:** 1) کوڵاندن، وەکوڵ هێنان. 2) تووڕەبوون، قەڵس بوون.

**جوشاجوش:** کوڵینی بەردەوام.

**جوشاك:** کوڵان، کوڵین.

**جوشان:** 1) لە حاڵی (کوڵان/ کوڵین) دا. 2) بڕوانە:"مواج". 3) زۆر تووڕە و ناڕەحەت و بێئۆقرە. 4) لە حاڵی هەڵقوڵین دا.

**جوشاندن/ جوشانیدن:** کوڵاندن، کوڵانن، کوڵانگ، کەلاندن، کەڵاندن، جۆشانن، جۆش پێهاوردن، جۆش پێهێنانی تراو، قلپاندن، قوڵانن، قوڵتاندن، قوڵتانن، قەلاندن."**جوشانیدن مختصر**": کەنگرکوڵین، کوڵاندنی ناتەواو. "**بازجوشانیدن**": کوڵاندنەوە، کوڵاننەوە.

**جوشاننده:** کوڵێن، جۆشێن.





**جوش خوردن:** (پێکەوە نووسان/ پێکەوەلکان) بە هۆی قاڵاییکردن. وێك هاتنەوەی برین و خۆش بوونەوە، جۆش خواردن. دروست بوون، جۆربوون. هەست بە ناڕەحەتی و قەڵسیکردن. "**جوش خوردن با چیزی**": سازگاربوون دەگەڵ ئەو. "**جوش خوردن با کسی**": خووگرتن دەگەڵ وی و گەرموگوڕبوون لە تەکیا.

**جوش دادن:** قاڵایکردن، لەحیمکردن، جۆشدان، ئاویەدان، کەوین. کوڵاندن. لێك نزیك کردنەوە، پێوەنددان. جۆر کردن، مەیسەرکردن.

**جوش زدن:** هاتنە کوڵ. وە گوڕوتین کەوتن، تووڕەبوون، هەڵچوون. تووشی دڵەڕاوکێبوون. هەوڵ و تەقالای زۆر کردن. پێوەنددانی دوو کانزا بەیەکتر. زیپکە دەرکردن.

**جوشش:** کوڵوکۆ، قوڵت، کوڵ، هاتنەکوڵ. گوڕوتین و ورووژان."**جوشش شدید**": کفتوکوڵ، جۆشینی بەتەوژم.

**جوش فلزات:** جۆش، پێکەوە نووساندنی کانزا بە قاڵایی.

**جوش کردن:** هەوڵ و تەقالادان. هاتنەدی، وەدیهاتن.

**جوشناسی:** زانستی تاوتوێ و ناسینی کەشی زەوی، کەشناسی.

**جوشنده:** بە کوڵوکۆ، ئەوەی بکوڵێ و بێتە جۆش. شەپۆلاوی. فیچقەکەر، ئەوەی هەڵدەقوڵێ.

**جوش و جلا:** هەوڵ و هەلوەلا. رژدی و بەئێرەیی.

**جوش و خروش:** کوڵوکۆ، گوڕوتین، تین وگوڕ، کەفوکوڵ.

**جوشی:** زووهەڵچوو، فیشقی.

**جوشیشدن:** تووڕە و قەڵس بوون.

**جوشیدن:** کوڵین، کوڵان، کوڵیان، کوڵاتن، کوڵخواردن، کەلان، کەڵان، کەلین، کەڵین، کەلستن، کەل کەل، هەڵقوڵیان، هەڵقوڵین، هەڵقولان، هەڵ قوڵتان، هەڵ قوڵتیان، قەزکین، قەمزتن، قەمستن، جۆشان، جۆشیان، جۆشین، وەجۆش هاتن، گرەوای، قلتیان، قولان، قوڵتان، قەلین، فووپر، فووپریان. هەرا و قەرەباڵغی کردن. ناڕەحەت و تووڕەبوون. نیگەرانی و بێئۆقرەیی هەبوون. پەیابوونی تۆقلە لەسەر تراو. "**با کسی جوشیدن**": بوونی هاوڕێیەتی و گەرموگوڕی دەگەڵ ئەودا.

**جوشیده:** کوڵاو، کوڵیو، کوڵیاگ، جۆشیو، جۆشیاگ، هەڵقوڵاو، هەڵقوڵیو.

**جوغ:** برسێتی.

**جوف:** ناوەوەی شتێك. سك، زگ.

**جوقه:** بڕوانە: "جوخە". "**جوقەبەجوقە**": گروپ گروپ.

**جوك:** نوکتە، جۆك.

**جول:** گەڕان، خول خواردن، تەواف کردن.

**جولا:** بڕوانە: "جولاە".

**جولان:** گەڕان، دەورلێدان، ئەسپ تاودان بۆ هەر لایەك، لینگ دان، رمبازێن، تەراتێن.دەسەڵات نوێنی. خۆنوێنیکردن. "**جولان داشتن**": جووڵان، گەڕان.

**جولانگاه:** رمبازگه، شوێنی تاودانی ئەسپ. شوێنی هاتوچۆ و بزووتن یان چالاکی.

**جولاه/ جولاهه:** بڕوانه: "بافنده".

**جولاهگی:** بڕوانه: "بافندگی".

**جولهه:** بڕوانه: "جولاه".

**جولیدن:** بڕوانه: "ژولیدن".

**جوندگان:** جووینەرەکان، کرتێنەران، گیانلەبەرانێ کە بە ددان شت دەقرتێنن.

**جونده:** جاوەر، جووینەر، جوونەر، خورۆک، کرتێن.

**جوهر:** 1) گەوهەر، گەوەر، بەردی زۆر بەنرخ. 2) بنەچە و کورتەی شتێك، ناوەرۆك. 3) هەقیقەت. 4) توخم و ماددەی سەرەکی و پێکهێنەری شتێ. 5) توانایی و لێهاتوویی بۆ ئەنجامدانی کارێك. 6) (کیمیا) ترش. 7) (فەلسەفە) ئەوەی بۆ وەدیهاتنی لە دەرەوە پێویستی بەشتی دی نیە. 8) بڕوانە: "درخشندگی". 9) شەپۆل و ناڕێکی لە ئاسن و چێو و هتد.

**جوهردار:** رەسەن، بەکار، ئازا لە کاردا. هەرشتێك کە بریقەی لێوە بێ و بدرەوشێتەوە.

**جوهرداشتن:** هەبوونی توانایی و لێهاتوویی.

**جوهرفرد:** لە زاراوەی پێشینیان دا: پاژی دابەش نەبوو.

**جوهرگین:** ئیستامپ.

**جوهری:** بنەڕەتی، سەرەکی.دەپێوەندی لەگەڵ هەقیقەت و چییەتی شتێ. گەوهەرفرۆش.

**جویا/ جویان:** پەیجۆر، لێگەڕ، پرسان.

**جویاشدن:** لێگەڕان، بەدواداگەڕان، ئەحواڵ پرسین، هەواڵ پرسین، پرسین، پرسیارکردن.

**جویدن:** جاوین، جوون، جووین، جووتن، لۆچکاندن، ژاوین، ژاوای. بەناڕوونی دەربڕینی قسەیەك. لەناوبردن. "**دوبارەجویدن**": جوونەوە، جاوینەوە.

**جویدنی:** شیاوی جاوین، قانیك، شتێ کە ئەیجاون وەك: جاچك.

**جویده:** جاوراو، جاویاو، جاویاگ، جووراو، ژاویا، ژایسە، ژاییە. لێڵ و ناڕوون و بڕگەبڕگە.

**جوینده:** لێگەڕ، پەیجۆر، دۆزەر، توێژەر، خوازیار.

**جوییدن:** بڕوانە: "جُستن".

**جهات:** لایەن، لا، ئالی.

**جهات اربعه:** لە جوگرافیادا: چوار لا واتە باکوور، باشوور، خۆرهەڵات، خۆراوا.

**جهات اصلی/ چهارگانه:** بڕوانە: "جهات اربعه".

**جهات ششگانه:** شەشدەر، شەش ئالی، شەش لا، پێش و پاش و سەر و ژێر و راست و چەپ.





**جهات فرعی:** بریتییە لە باکووری خۆرهەڵات، باکووری خۆراوا، باشووری خۆرهەڵات، باشووری خۆراوا.

**جهاد:** 1) خەزا، شەڕی ئایینی، خەبات، تێکۆشان، جەنگین. 2) زەوی رەق و بێ ڕووەك. "**جهاداصغر**": شەڕ لە گەڵ دوژمنانی ئایینی خودا. "**جهاداکبر**": رەنج و سەختی کێشان بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ هەوا و هەوەسی دەروونی.

**جهادگر:** خەباتکار(لەڕێگەی ئایین دا).

**جهار:** (جِ) ئاشکراکردن، دەرخستن.

**جهارت:** بەرزبوونەوە و بە تروپك گەیشتنی دەنگ.

**جهاز:** 1) جیاز، جیازی، رەهال، رەهێل، باوانی. 2) دەزگا، کەلوپەل، ئامراز، ئامێر. 3) کۆئەندام. "**جهازهاضمه**": دەزگا/ کۆئەندامی هەرس کردن.

**جهّال:** (جُ) کۆی"جاهل".

**جهالت:** نەزانین، نەزانی، بێئاوەزی.

**جهام:** هەوری بێباران.

**جهان:** 1) جیهان، دونیا، دنیا، گەردوون، گۆی زەوی. 2) بڕوانە: "جهنده". 3) رۆژگار. 4) خەڵکی دنیا. 5) ژیان. 6) سروشت. "**به جهان باقی شتافتن**": کۆچی دواییکردن، مردن.

**جهان آرا:** رازێنەرەوەی جیهان، جیهان رازێن، جیهان خەملێن.

**جهان آزاد:** جیهانی ئازاد، وڵاتانی سەرمایەداری پێشکەوتوو یان وڵاتانی سەر بەوان.

**جهان آفرین:** ئافرێنەری جیهان، خودای مەزن.

**جهان افروز:** رووناك کەرەوەی جیهان، رۆشنکەرەوەی جیهان، سفەتی خۆر.

**جهان باقی:** ئەو دنیا.

**جهانبان:** نگاداری گەردوون، نگابانی جیهان، سفەتی پاشای گەورە.خودا.

**جهانبانی:** پاشایەتی.

**جهان بین:** جیهان بین، بینەری جیهان، سفەتی چاو. جیهان نما.

**جهان بینی:** جیهان بینی، کۆی بیروبۆچوونەکانی تاکێك یان قوتابخانەیەکی ئایینی یان فەلسەفی یان سیاسی سەبارەت بە دیاردەکانی جیهان.

**جهان پژوه:** جیهان توێژ، گەشتیار، جیهانگەڕ.

**جهان پناه:** پەنا و پەناگەی خەڵکی، پاشای دادپەروەر.

**جهان پهلوان:** پاڵەوانی گەورە، دلێرترین و بەهێزترین پاڵەوانی دنیا.

**جهان پیما:** جیهان پێو.

**جهانتاب:** رووناك کەرەوەی جیهان، سفەتی خۆر.

**جهانجو:** جیهان خواز، پاشای مەزن و وڵات (سێن/ ستێن).

**جهان خوردن:** بەهرەمەندبوون لە چێژە ماددییەکانی دنیا.

**جهاندار:** نگابانى جیهان، پاشاى دادپەروەر و ژیر کە وڵاتەکەى بە باشى بەڕێوە ببا. خودا.

**جهاندارى:** پاشایەتى.

**جهاندن:** بڕوانە: "جهانیدن".

**جهان دیده:** دنیا دیده، دنیادیە، جیهان گەڕاو، کەسێ کە ئەزموونى زۆرى لە دنیا هەبێ.

**جهانسوز:** سووتێنەرى جیهان، پاشاى زۆردار و ستەمکار.

**جهان سوم:** وڵاتانى دواکەوتوو یان لە حاڵى گەشەسەندن دا. "**جهان اول**": وڵاتانى پێشکەوتووى سەرمایەدارى. "**جهان دوم**": وڵاتانى سووسیالیستى پێش هەڵوەشانى یەکیەتى سۆڤیەتى پێشوو.

**جهانشمول:** جیهانداگر، جیهانگر، "یونیوێرسال".

**جهانگرا:** جیهان خواز، جیهانگەر.

**جهانگرد:** توریست، گەشتیار، گەڕیدە، جیهانگەڕ، دنیاگەڕ.

**جهانگشا:** جیهان کەرەوە، وڵات گیر، وڵات ستێن، پاشاى ئازا و زاڵ، زێدەخواز.

**جهانگشایى:** ستاندن یان داگیرکردنى وڵاتان، وڵات ستێنى، زێدەخوازى.

**جهانگیر:** 1) جیهان داگر، جیهانى، نێونەتەوەیى. 2) جیهانگیر، داگیرکەرى جیهان. 3) کەسێك کە ناوبانگى بە هەمو شوێنێکى جیهان بگا.

**جهانگیرى:** گرتنى وڵاتانى گەورە، زاڵێتى، زاڵ بوون بە سەر جیهاندا.

**جهان نما:** جیهان نوێن/ نما، شاندەرى جیهان.

**جهان نورد:** بڕوانە: "جهانگرد".

**جهانى:** جیهانى، گەردوونى، نێونەتەوەیى. گشتى و تەواوداگر. یەك کەس لە خەڵکى جیهان.

**جهانیان:** خەڵکى جیهان، تەواوى خەڵکى جیهان.

**جهانیدن:** هەڵبەزاندن، هەڵبەزاندنەوە، هەڵبەزاننەوە، هل بەزاندن.

**جهانى شدن:** بە جیهانى بوون، جیهانگیرى. ناوبانگ دەرکردن لە سەرانسەرى جیهاندا.

**جهت:** ڕوو، ئاراستە، ئاقار، لا، ئالى.لایەن. هۆ. "**جهت اصلى**": هەرکام لە چوار لاى باکوور و باشوور و خۆراوا و خۆرهەڵات. "**جهت دادن به چیزى**": مەبەستدارکردنى ئەو. "**جهت داشتن**": بوونى هۆ یان هۆکار. "**جهت فرعى**": هەرکام لە چوار لاى باکوورى خۆراوا و باکوورى خۆرهەڵات و باشوورى خۆراوا و باشوورى خۆرهەڵات. "**جهت مثلثاتى**": ئاراستەى پێچەوانەى جووڵەى ژمێرەرى کاتژمێر لە سەر جەغزێك. "**از جهت**": سەبارەت بە، لەبابەت. لەلایەن. بۆ. "**از هر جهت**": لەهەر بارێکەوە، لەهەر بوارێکەوە. "**به جهت**": بەهۆى. بۆ. "**بەهر جهت**": بەهەر حاڵ.





**جهت بخش:** ڕێنوێنیکەرى کەسێ یان شتێ بەرەو لایەك، ئاراستەکەر.

**جهت دار:** مەبەستدار.

**جهتگیرى:** لاگیرى/ لایەنگرى لە کەس یان بڕوایەکى تایبەتى، هەڵوێست گیرى. جێگیربوون لە شوێنى مەبەست.

**جهت نما:** ڕوونما، ئاراستەنوێن.

**جهت یابى:** دۆزینەوەى ئاراستە/ ئاقارى جێ مەبەست بە شێوازى جۆراوجۆر.

**جهد:** (جَ) دڵ دانە سەر، گوێ پێدان. تێکۆشان، تێکۆشین، ڕەنج دان. "بەجهد": بەدژوارى، بە زۆر.

**جهر:** ئاشکراکردن، دەرخستن، چڕاندن، بەرزکردنەوەى دەنگ کاتى ستران بێژى.

**جهش:** پەڕین، بازدان، قەڵەمباز، خۆهەڵدان، سنگەباز، خێز، گوژم، وزاق، تەکانى بەتەوژم، ڤەگەمزین، هەڵپەڕان، هەڵپڕژان، لیتك. موتاسیۆن. "**جهش حیوان**": گومەتە، گومەزە، گومەڵەك، بازرەقە.

**جهل:** نەزانین، نەزانى، پەى پێنەبردن، نەفامى، دەبەنگى.

**جهل بسیط:** بە کەسێك دەڵێن کە دەزانێ کە نازانێ، یەك سەرە نەزانین.

**جهل مرکب:** بە کەسێك دەڵێن کە نازانێ بەڵام وادەزانێ کە دەزانێ، دووسەرە نەزانین.

**جهم:** گرژ، مۆن، ڕووترش.

**جهمندى:** (فیزیك) ئیلاسیسیتێ.

**جهن:** بڕوانە: "جهان".

**جهنده:** 1) بڕوانە: "جستان". 2) تێپەڕ و نابەردەوام.

**جهود:** 1) تێکۆشەر، تەقالاکار، زەحمەت کێش. 2) مووسایى، جوولەکە. "**جهود خون دیده**": ئەوەى بەهۆى ژان و ئێشێکى کەمەوە هاتوهاوار دەکا.

**جهودانە:** وەك جوولەکەکان لە ڕووى دەمارگیرى یان خۆبەستەم لێکراو نیشاندان.

**جهودبازى:** هاتوهاوارکردن بۆ شتێکى کەم و چووکە. ڕژدى و قرنیسى کردن.

**جهودى:** جوولەکە، مووسایى.

**جهورى:** بڵێند، بەرز، دەنگ بەرز.

**جهول:** نەزان، نەفام، بێئاوەز، خۆپەسند.

**جهوم:** لاواز، بێهێز، بێ وزە.

**جهیدن:** هەڵبەزین، هەڵبەزان، هل بەزین، هەڵپەڕان، پەڕین، ڕاپسکان، چندك، وزاق بەستن، وزاقدان.

**جهیر:** جوان، خۆشخوڵق، بەرز، دەنگ بەرز.

**جهیز/ جهیزیه:** جیاز، جیازى، ناوتێڵانە، شەکێرت، وەردەك.

**جیاع:** کۆى "جائع".

**جیب بر:** گیرفان بڕ، بەرك بڕ، کیسەبڕ، جێوبڕ.

**جیب تمام:** (بیرکارى) کوسینووس.

**جیب خالى:** بریتى لە نەدار و بێپووڵ.

**جیب زدن:** گیرفان بڕین.

**جیبی:** گیرفانی.

**جیَد:** باش، چاك.

**جیران:** کۆی"جار"، بە مانای هاوسێکان، دراوسێکان.

**جـیرە:** جـیرە، مـچە، مووچـە، مووچـانە، بەشە نان و بژیو. "**جیرە ماهیانە**": مانگانـە، هەیڤانە.

**جیرەخشك:** جیرەوشکە، خواردەمەنی کـاڵ و ئامادنەبوو، بێپێخۆر.

**جیرەخـــوار:** جیرەخـــۆر، جـــیرە هـــەر، مووچــــەخۆر. ملکــــەچ، بەرفــــەرمان، ژێرفەرمان، ژێردەست و خزمەتکار.

**جیرەفقرا:** یابڕ، جیرە بۆ فەقیر و هەژاران.

**جیزشدن:** سووتان.

**جیزکردن:** سووتاندن یان زیان پێگەیاندن.

**جیزگر:** بڕوانە: "رباخوار".

**جیستن:** بڕوانە: "جَستن".

**جیش:** 1) سـوپـا، لـەشـکـر، ئەرتـەش. 2) هـــاتـــنـــە کـــوڵ، وەکـــوڵ هـــاتـــن. 3) وە کـەفـــوکـــوڵ کـەوتـــنی دەریـا. 4) بـەرپابوونی شـەڕ. 4) فرمێسك هاتنـە خوار.

**جیشیدن:** میزکردن.

**جیغ:** زیڕە، زیق، زیقە، قیژ، قیژە، قـیڕە، واقـی، زریـك، زریکـان، زریکـە، قریـشکە، سیڕە، شیق، شات، شاتان.

**جیغ پیا پی:** زیڕەزیڕ، زیقـەزیق، قیژەقیـژ، زیق و هۆڕ.

**جیغ زدن:** بڕوانە: "جیغ کشیدن".

**جیغ کش:** زیڕەکەر، هاوارکەر، هاوارکرۆخ.

**جیغ کـشیدن:** زیڕانـدن، زیـڕانن، زیقانـدن، زیقـانن، قیژانـدن، قیـژانن، قیـژەکردن، قیـژین، ڤەقیژانـدن، قیڕانـدن، زریکانـدن، تریکانـدن، شـاتاندن، شـیقین، نـشڤین، واقایش.

**جیـــغ و داد:** زیڕەزیـــڕ، سیڕەســـیڕ، زریکـــەزریك، زیقەوهـــەرا، شیڕەشـــیڕ، قیڕەقـیڕ، قیـژوهۆڕ، قیـژووڕ، گوڕگـوڕ، نەڕە، گوڕە.

**جیفـــە:** تـــەرمی بۆنگرتـــوو و بۆگـــەنیو، مندارەوەبوو، کـەلاك. "**جیفـە دنیـا**": مـاڵی دنیا، پارە و سامان.

**جیـك زدن:** ناڕەزایـەتی دەربـڕین، دەنـگ کردن.

**جیل:** نەوە، وەچە، بەرە. سەدە.

**جیم شدن:** خۆ باریك کردنـەوە/ خـۆ لـوول کردنەوە و دەرچوون، لە پەنایەکەوە بۆی دەرچـــوون، خۆدزینـــەوە، کوورزووبـــوون، باچـاندن، راکـردن بـێ خەبـەر، فیـسماڵك دان، شوولکاندن، قوونەدزەکردن.

**جـین:** دەرزەن.جـۆرێ مەشـروب. جـۆرێ شەرواڵ.

**جیـــوش:** کـۆی"جـیش"، لەشـکرەکان، سپاکان.

**چاپار:** چەپەر، تەتەر، نامەبەر، نامە گەیێن، پۆست، پۆستەچی.

**چاپارخانە:** پۆستە، پۆستخانە، پۆستەخانە، پۆسەخانە، بەڕێوەبەری پۆست، جێگەی نامە گەیاندن.

**چاپاری:** زەرۆپ، تیژڕەو، تەتەر. خێرا، کرژ، تیژ، توند.

**چاپچی:** چاپکەر، چاپچی، کەسێك کە کتێب چاپ دەکا. درۆزن، فێڵباز.

**چاپخانە:** چاپخانە.

**چاپك:** بڕوانە:"چابك".

**چاپگر:** چاپکەر، پرینتێر.

**چاپلوس:** جاملووس، جامە لووس، زوان لووس، ماستاوکەر، مەراییکەر، پیاوی بە کلکە سووتە، دەوتەڕی ریاباز، لاعب کەرە، لاعبی.

**چاپلوسی:** شەلاف، کلکە سووتە، مەرایی، زمان لووسی، ماستاوکردن، ریاکاری، هولیسکی، دووڕوویی، رووبینی، راوڕو، حولیاتی.

**چاپندە:** تالانکەر، ئەوی کە ماڵ و سامانی خەڵك بە تالان ببا.

**چاپی:** سەربە چاپ. چاپکراو. کلیشەیی، چەندپاتکراو.

**چاپیدن:** تالانکردن، راووڕووت کردن، شەلاندن، چرپانن، دزین، رفاندن.

**چاپیدە:** تالانکراو، دزراو.

# چ

**چابك:** 1) فرز، گورج، کرژ، ئازا، چالاك، چوست، لەش سووك، بەپێ، هەرفە، زرنگ، کارامە، تەڕدەس، بەدەس، بەدەست. 2) جوان و ناسك. 3) بەخێرایی. 4) جوان چاك، سوڕپەری.

**چابك دست:** بە دەست و برد، کارامە، کارزان، لێهاتوو.

**چابك سوار:** سووکەڵەسوار، سووکەلە سوار، سوار چاك، شۆڕەسوار.

**چابکی:** فرزی، گورجی، ئازایی، چالاکی، چوستی، کارامەیی.

**چاپ:** چاپ، هونەری نەخشاندنی نووسراوە و وێنەکان لە سەر کاغز بە دەزگای چاپگەر. "**بە چاپ رساندن**": چاپ کردن، بڵاوکردنەوە.





**چاتمەزدن:** پێك هەڵپەساردنی تفەنگان لە کاتی وچان دا، راوەستانی ژمارەیەك کێشکچی لە شوێنێك، جێگیربوونی قەرەوڵ و سەربازەکان لە شوێنێ.

**چاچول:** کەڵەك، فرتوفێڵ، تەشقەڵە، گەڕ گزی.

**چاچول باز:** فێلباز، گزیکار، تەشقەڵەباز، کەڵەکچی، جامباز.

**چاخان:** چاپ باز، درۆزن، بە فرۆفیشاڵ، بەشات و شووت، مەراییکەر، خۆهەڵکێش، فیشاڵکەر، هاشەکەر، چاخان، چاخان پاخان، درۆ، دەلەسە.

**چادر:** چارشێو. چادر، خێوەت. رووپۆش، دەمامك. کفن. "**چادر بە سر انداختن (سرکردن)**": چارشێو بەسەر دادان، ئامادەبوون بۆ رۆیشتنەدەر لە ماڵەوە. "**چادر بە کمر زدن**": ئامادەی ئەنجامدانی کارێك بوون.

**چادر احرام:** بریتی لە بەفرێك کە کەوتبێتە سەر زەوی، سپیەتیی بەفر لە سەر زەوی.

**چادرترسا:** بریتی لە سووربوونی ئاسۆ و رووناکیی هەتاو.

**چادرزدن:** هەڵدانی خێوەت.

**چادرکافوری:** بریتی لە سپێتیی بەیانی و رۆشنایی هەتاو.

**چادرکبود:** بریتی لە شەو، تاریکایی شەو.

**چادرکحلی:** بریتی لە ئاسمان و تاریکەشەو.

**چادرلاجوردی:** 1) بریتی لە ئاسمانی بێ هەور. 2) بریتی لە سەوزەڵان، سەوزەزار.

**چادرنشین:** چۆڵپەرست، چۆڵ نشین، چادرنشین، کۆچەر، گەرمێن کوێستان کەر، خێڵەکی، رەوەند، کەسێك کە لە ئاوەدانی دا ناژی.

**چادرنیلی:** بڕوانە: "چادرکحلی".

**چادری:** چارشێو پۆش. لەبار بۆ خێوەت.

**چار:** 1) سووکەڵەی "چهار". 2) سووکەڵەی "چارە".

**چاربالش زدن:** دانیشتن، نیشتەجێبوون.

**چارپا:** چوارپێ.

**چارپهلو:** 1) بریتی لە زگی گەورە و پڕ. 2) زنتۆل، گۆشتن، قەڵەو. 3) چوارپاڵوو.

**چارپهلوشدن:** بریتی لە تێربوون.

**چارچار:** 1) بەرابەری، رقەبەرایەتی، رووبەڕووبوونەوە، شەڕەچەقە، دەمەقاڵە. 2) چوار رۆژی کۆتایی چلەی گەورە و چوار رۆژی هەوەڵی چلەی چووکەی زستان.

**چارچوب:** چوارچێوە، شیپان، شیپانە. سیستم. پێکهاتە. دار، خاچ. "**بەچارچوب کشیدن**": لەخاچ دان. خستنە چوارچێوەوە. چەسپاندن، جێگیرکردن.

**چارقد:** چوارلۆ، چوارقەد، چوارلا، دوو جار وەنووشتاو.

**چارك:** 1) چارەك، چارەگ، چاری، لە چوار بەش بەشێك. 2) (پێشەنگی/پێشڕەوی) کاروان.

**چارگامە:** ئەسپی خۆشبەز، ئەسپی چەلەك، چوار ناڵ.

**چارگاه:** 1) یەکێك لە ئاهەنگەکانی ئێرانی. 2) شێوێندراوی "چراگاه"، لەوەڕگە، جیٚلەوەڕ، رەپەڵگا، چەرینگەھ.

**چاروادار:** وڵاخدار، وڵاغدار، کەردار، قاترچی، خەربەندە، هەربەنە، داوەسین، چاروادار، چاروەدار، چاروێدار، قەتارچی، مەکارەچی، ئاگاداری بارەبەران.

**چاروناچار:** ناچاری، نەچاری، چاری ناچار، خوایی ناخوایی.

**چارە:** چار، چارە، چارەسەر، گوزوور، دەرمان، تیمار، دەرەتان، تەگبیر، مشوور، فێڵ، کەڵەك، مەکر.

**چارەاندیش:** چارەدۆز، تەگبیرلێکەر، مشوورخۆر، ئەوەی کە بە دوای چارەسەر و دەرمانەوەیە.

**چارەاندیشی:** چارەدۆزی، دەبراندن، رێگەچارەدۆزینەوە، تەگبیرلیٚکردن، مشوور لیٚخواردن، جێبەجیٚکردن، پێك هێنان.

**چارەبردار:** چارەهەڵگر، شیاوی چارە.

**چارەپذیر:** چارەهەڵگر، شیاوی چارەسەر، ژانیٚ کە بتوانریٚ چارەسەر بکریٚ، بابەت یان کارێك کە بکریٚ راست یان چاك بکرێتەوە.

**چارەپرداز:** چارەکەر، تیمارکەر، چاك کەرەوە، راست کەرەوە، بیرازکەر، سازێنەرەوە.

**چارەپژوە:** چارەدۆز، چارەتوێژەر، چارەتۆژێن.

**چارەجستن:** بەدوای چارەسەری کەوتن یان بە تەگبیر چارەسەرکردنی کێشە و گیروگرفتیٚ.

**چارەجو/ چارەجوی:** چارەدۆز، چارەخواز، چارەگەڕ، دۆزەرەوەی رێگەچارە.

**چارەجویی:** چارەدۆزی، چارەخوازی، چارەگەڕی، دۆزینەوەی چارەسەری. تەگبیر، راوێژ.

**چارەداشتن:** رێگەچارەدۆزینەوە بۆ دەربازبوون لە دۆخێکی نالەبار.

**چارەدان:** (چارە/ چارەسەر) ناس، چارەزان، زانەری رێگەچارە.

**چارەساز:** کارساز، چارەناس، چارەکەر، چارەسەرکەر، بەتەگبیر و را. عیلاجکەر.

**چارەسازی:** چارەدۆزی، رێگەچارە دۆزینەوە، چارەسەرکردن.

**چارەسگال:** بڕوانە: "چارەجو".

**چارەسنج:** چارەدۆز، بیرکەرەوە لە رێگەچارە.

**چارەشدن:** لابرانی کێشە یان دژواری.

**چارەشناس:** چارەناس، چارەناسێن، کەسێك کە چارەسەری شتێك بزانیٚ.

**چارەکردن:** چارەسەرکردن، چارەکردن، بەکاربردنی تەگبیر بۆ قوتاربوون لە دۆخی نالەبار و ناخۆش و وەدەستهێنانی دۆخێکی دڵخواز. تیمارکردن، دەرمان کردن. فرتوفێڵکردن.

**چارەگر:** چارەکەر، چارەدۆز، بەبیر و تەگبیر.





**چارەگری:** رێگەچارەدۆزی، تەگبیر و تێڕامان.

**چاشت:** سەرەتای رۆژ، کاتی بەیانی، چێشتا، چێشتان، قاوەڵتوون، چێشتەنگاو. 2) نانی قاوەڵتوون.

**چاشت خوار:** بڕوانە: "چشتەخور".

**چاشتگاه:** چێشتانان، چێشتەنگاو، چاشتێنگا، قاوەڵتوون، نێوان بەیان و نیوەڕۆ، سەرشێو، دانیٚ.

**چاشتەخور:** بڕوانە: "چاشت خوار".

**چاشنی:** 1) چەشنی، چاشنی، تەرەقە. 2) تام، چێژە، چەشکە. 3) ئەوەی بۆ خۆش چێژ کردنی خواردەمەنی زیاد دەکریٚ.

**چاشنی چش:** چێژکەر، چێژەر.

**چاشنی خور:** بڕوانە: "چشتەخور".

**چاشنی کردن:** زیادکردنی شتیٚ بە ئاخاوتە بۆ کاریگەری زیاتر دانان. چەشتنی خواردەمەنی بۆ تاقیکردنەوەی چێژ. بە زمان لووسی پێفرۆشتن، پیٚ قاڵبکردن. تاقیکردنەوە.

**چاشنی گرفتن:** چەژتنی خواردەمەنی بۆ دیاریکردنی چۆنیەتی و سالم بوونی. هەڵگرتنی کەمەکێك لە هەر شتیٚ. تاقیکردنەوە.

**چاشنی گیر:** بڕوانە: "چاشنی چش".

**چاقالو:** خەپلە، خرپن، چکۆڵەی تێرگۆشت، گۆشتن، کورتەباڵای قەڵەو.

**چاق دماغ کردن:** هەواڵپرسیکردن.

**چاق سلامتی:** چاك و خۆشیکردن.

**چاق کردن:** 1) قەڵەوکردن. 2) ئامادەکردنی نێرگەلە و شتی وا. 3) چارە و تیمارکردن. 4) تیژکردنی دەمی سمەك و مشار.

**چاق نفس:** بڕوانە: "تازەنفس".

**چاقوخوردن:** وەبەر چقۆ کەوتن. برینداربوون.

**چاقودستەکردن:** بێکاربون، نەبوونی کاری گرینگ.

**چاق و چلە:** چاخوچل، گردەڵی قەڵەو، سالم و سەرحاڵ.

**چاقوکش:** چەقۆکێش، شەڕانی، شەقاوە، کەسیٚ بە چەقۆلێدان هەڕەشە لە خەڵك دەکا.

**چاك:** درز، تلێش، شەق، قلێش، فەتار، دڕیاو، دادڕاو، پێدزکە، کون. "**چاك پیرهن**": گیرفان، یەخەی کراس. "**چاك جامە**": داوێنی جلوبەرگ. "**چاك روز**": رووناکایی بەیانی، بەرەبەیان. "**بزن بە چاك**": بڕۆ ون بە. "**بەچاك زدن**": بڕوانە: "جیم شدن".

**چاکاچاك:** لەت و پەت، لەت وکوت، فەتارفەتار، شڕودڕ، پڕ درز و کەلێن. دەنگی وێك کەوتنی گورز و شمشێر.

**چاکانیدن:** بڕوانە: "چکاندن".

**چاك چاك:** 1) تیتاڵ تیتاڵ، لەتار، ریشاڵ ریشاڵ، لەت و کوت، پڕ لە درز و کەلێن.

2) دەنگی وێك كەوتنی گورز و خەنجەر و هتد لە شەڕدا ، دەنگی لێدانی شمشێر و شكان و دڕانی شتێك.

**چاك خوردن:** بڕاو و دڕان.

**چاك دادن:** دڕاندن، تلێشاندن.

**چاكر:** نۆكەر، خزمەتكار، خزمەتگوزار، خولام، بەندە، چۆكار، ملكەچ، دانراو.

**چاك ران:** ئەندامی سێكسی ژن.

**چاكروار:** بەندەئاسا، نۆكەرئاسا، چۆكارانە.

**چاك روز:** كاتی خۆركەوتن.

**چاك سینە:** بریتی لە نێوان دوو مەمكان.

**چاك كردن:** بڕین، لەت كردن.

**چاك كون:** قەڵشت و مەودای نێوان دوو سمت.

**چال:** 1) چاڵ، چاڵە، قوڵكە. 2) بڕوانە: "آشیانە".

**چالاك:** 1) چەلەنگ، كەلەش، زرك، بەهۆش، چوست، بەكار، ئازا، فرز، گورج، لەش سووك، مەزبووت، دەست هەل، قۆچاخ. 2) شوێنی بەرز و بڵیند. 3) جوان، دلگر.

**چالش:** 1) خلنگین/لەنجە كردن بە ناز و غرورەوە، ڕۆیشتن بە ناز و لەنجەولار . 2) بڕوانە: "جولان". 3) ململانێ، ململانە، ڕووبەڕووبوونەوە. 4) تاوانباركردن.

5) سەرپێچی كردن. 6) رقەبەرایەتی كردن. 7) ناڕەزایەتی، دەنگ هەڵبڕین.

**"بەچالش طلبیدن":** تووشی ململانێكردن، داوای بەربەرەكانێ كردن، داوای وڵام و هەنگاوی بەكردەوە لێكردن.

**چالش كردن:** 1) ڕۆیشتن، كۆچكردن. 2) شەڕكردن، خەبات كردن.

**چالشگر:** 1) بەناز و عیشوەكەر، لەنجەولاركەر و خلنگێن. 2) خەباتگێڕ، تێكۆشەر، شەڕكەر، جەنگاوەر. 3) تێرنەخۆر لە گان كردن دا، زەنەك، كیر چڵێس.

**چالشگری:** 1) خۆنوێنی لە بەرانبەر خەنیمدا. 2) جەنگاوەری، ئازایەتی، خەبات. 3) بەلەنجەولار و عیشوە ڕۆیشتن. 4) بەئێرەیی لە ئیلاقە كردندا.

**چال كردن:** قووڵ كردن، هەڵكەندن.چاڵ كردن، خستنە ژێر خاك، بە خاك سپاردن.

**چالەچولە:** كەندولەند، چاڵ و چۆڵ، مەرخ.

**چالەمیدانی:** 1) پەروەردەنەكراو، لات. 2) لاتانە. 3) ناحەز و دزێو.

**چام:** ناز و عیشوە، لەنجەولاری. خواری و پێچ.

**چام چام:** پێچەلاوپێچ، پێچاوپێچ، خوار و لار، ڕێگەی بە پێچ و خوارەكە و پێچەكە، ڕێگەی بە كەندو كلۆ، دەر و دۆڵی پێچاوپێچ.





**چامە:** هەڵبەست، غەزەڵ، سروود، ستران، گۆرانی.

**چامەزن:** مووسیقاژەن، ستران بێژ، گۆرانی بێژ.

**چامەسرا:** هەڵبەست وان، شاعیر، غەزەڵبێژ، سترانبێژ، بەستەوێژ.

**چامەگو:** بێژەری "چامە"، شاعیر، غەزەڵ خوێن.

**چامیدن:** 1) لەنجەكردن، بە لەنجە و لار ڕۆیشتن، بەناز ڕۆیشتن، خلنگین، شنیان. 2) میزكردن.

**چانە انداختن:** بریتی لە گیان دان، مردن.

**چانە جنباندن:** قسەكردن.

**چانەزدن:** چەنەلێدان، چەنەچەن، چەنەبازی، چەقەچەق كردن، زۆربێژیی، زۆربڵێیی، حیناوە، گیڕەكردن.

**چاو:** ناڵەوشیوەن، ناڵاندن بە هۆی ئێش و كوڵ و كەسەرەوە. پارەی كاغزی سەردەمی مەغوول.

**چاوان:** لەحاڵی ناڵاندن دا، ناڵان.

**چاولە:** 1) گوڵی پڕگەڵا و ڕەنگاڵە. 2) لار، خوار، چەماوە، ناڕێك.

**چاووش/ چاوش:** پێشەنگی لەشكر، سەرقافڵە، پێشڕەوی كاروان.

**چاویدن:** ناڵاندن، ناڵانن، كڕووزانەوە، نالە و خرۆشینی باڵندە.

**چاهجو:** بیركەن، چاڵكەن.

**چاهخو:** بڕوانە: "چاهجو".

**چاەزدن:** بیرلێدان.

**چاەكن:** بڕوانە: "چاهجو".

**چایش:** سەرمابوون، هەڵامەت، چیامانی.

**چایمان:** بڕوانە: "چایش".

**چاییدن/ چاهیدن:** سەرمابوون، تووشی هەڵامەت بوون، نەخۆش كەوتن لە سەرمان.

**چپ:** 1) چەپ، لای بەرانبەری ڕاست. 2) ناڕاست، بەراوەژوو. 2) چەپ دەست، چەپلەر.4) خێل، چاوچێڵ.

**چپ افتادن:** بەقیناچوون، بەڕق داچوون، دەڕكەوەچوون، بوونە دوژمن.

**چپان:** جلی شڕو كۆن.

**چپ انداز:** 1) چەپ هاوێژ. 2) خلەتێن، فریودەر، كەڵەكباز. 3) شەڕكەری سوارە كە بۆ پشتەوە تیر داوێژێ.

**چپاندن/ چپانیدن:** تێئاخنین، ئاخنین، تێتەپاندن، تێڕۆكردن، چەپاندن، چەپانن، دەوساندن، تێبڕین، ئاخنین، تێپەست، تێپەستان، تێپەستاوتن، بەزۆر پەستاوتن، پەستوان، تێتەپاندن، تێخزاندن، دەناونان بە نهێم، ڕاپۆڕاندن، بخورتی خستن تێدا، بەزۆر دەناونان. بەسەردابڕین، فرۆشتنی شتی بێڕمێن بەزۆر یان بە نرخی گران بەكەسێك.

**چپاننده:** پەستێن، تێپەستێن، چەپێنەر، كەسێك كە كاری پەستاوتنە.

**چپانی:** 1) شڕۆڵ، بەرگ دڕاو. 2) ڕەند و بێ سەروپێ.

**چپاول:** ڕاووڕووت، تاڵان، تاڵوو، تاڵان و بڕۆ، پەلیسە، پووڕ، پوویڕ، چەپۆ، نەژد.

**چپاولچی:** بڕوانە: "چپاولگر".

**چپاولگر:** تالانچی، پوورکەر، نەژدڤان، خوداگیر.

**چپ بودن:** 1) چەپ بوون، ناڕاست بوون. 2) (خێل/ چاوخوار) بوون. 3) چەپلەری.

**چپ چپ نگاه کردن:** چەفتەوشیرە، بە خێسەروانین، چەپ و چیڕ بە خێلێکەوە روانین.

**چپ چشم:** خێل، چاولار.

**چپ دادن:** بەلاڕێدابردن، گومراکردن، فریودان، خلەتاندن. تەرك كردن.

چپ دست: چەپلەر، چەپە.

**چپ رفتن:** 1) بە رێگای چەپ دا رۆیشتن، بە لای چەپ دا چوون. 2) دژایەتیکردن، فرتوفێڵ بەکاربردن.

**چپ رو:** 1) ئەوەی کە لە رێگەی راست لابدا، لادەر. 2) لە زاراوەی سیاسیدا: چەپ رەو، توندڕەو، کەسێك کە بیروبۆچوونی چەپیی هەبێ.

**چپ روی:** چەپ رەوی، دژایەتی دەگەڵ سیاسەتی دەوڵەت.

**چپ زدن:** بەرەو لای چەپ چوون. توندڕۆییکردن و لادان لە بنەماکان. لە ڕێ‌دەرچوون.

**چپسیدن:** بروانە: "چسبیدن".

**چپ شدن:** 1) چەپ بوون، سەرەونخوون بوون، وەرگەڕان، بەراوەژووبوون. 2) لادان، لە رێگە دەرچوون. 3) بەقیناچوون، دەرکەوەچوون. 4) لایەنگری سیاسەتی دەستە چەپی بوون.

**چپ کردن:** 1) چەپ کردن، وەرگەڕاندن. 2) بەرەو لای چەپ چوون، بە لای چەپەوە رۆیشتن.

**چپکی:** ئاوەژوو. چەپ چەپ، چەپ و چیڕ.

**چپ گرا:** چەپ رەو، چەپی، دەستەچەپی، مەیلەو چەپ، کەسێك کە دژی سیاسەت و شێوازی دەوڵەت و هەلومەرجی زاڵ بەسەر وڵاتەکەیەتی.

**چپ گرایی:** چەپ رەوی، چەپگەرێتی، مەیلەو چەپی.

**چپل:** پیس، چەپەڵ، چرکن، چڵکن، چلووك، گەمار.

**چپلك:** 1) بروانە: "چپل". 2) مردارەوەبوو.

**چپلوس:** سووکەڵەی"چاپلوس".

**چپو:** بروانە: "چپاول".

**چپ و چوله:** لارولەوێر، چەپ وچیڕ.

**چپوچی:** بروانە: "چپاولگر".

**چپ و راست:** پشت سەری یەك، چەپ و راست. گشت جێیەك.

**چپّه:** 1) چەپ، وەرگەڕان. 2) بروانە: "چپ دست".

**چپه‌شدن:** وەرگەڕان، بەراوەژووبوون. بەزەویدادران، خەوتن.

**چپه‌کردن:** وەرگەڕاندن، ئاوەژووکردن.





**چپیدن:** تێچەپین، تێك بەزین، تێك ترنجان، بە زۆر چوونە ناو یەکتر، بە نهێم چوونە ناو و جێگرتن، جێبوونەوەی شتێ لە ناو شتێکی تر بە گوشار.

**چپیره:** ئامادە و کۆوەبوون.

**چترآبگون:** بریتی لە ئاسمان.

**چترآبنوس:** بریتی لە شەو.

**چتر باز کردن:** بریتی لە بەسەرادان، خۆسەپاندن وەك میوان.

**چترزر:** بریتی لە هەتاو.

**چترسیمابی:** بریتی لە مانگی شەوی چواردە.

**چترشام:** بریتی لە شەو و تاریکایی شەو.

**چتر عنبرین:** بروانە: "چترشام".

**چتر کحلی:** بریتی لە ئاسمان و هەوری رەش.

**چتر مینا:** بریتی لە ئاسمان.

**چتر نور:** بریتی لە هەتاو.

**چتری:** وەك چەتر، چەترئاسا، بە شکڵی چەتر.

**چته:** چریك، پارتیزان، سەربازی خۆبەخش.

**چخیدن:** 1) تێکۆشین، هەوڵدان. 2) خەباتکردن، شەڕکردن. 3) دوژمنایەتیکردن. 4) دەم لێدان، قسەکردن.

**چخین:** بروانە: "چرکین".

**چدر:** (چَ.دَ) بروانە: "چارە".

**چدن:** (چ. دَ) سووکەڵەی"چیدن".

**چرا:** (چَ) لەوەڕ، ئاڵف، گیای خواردنی ئاژەڵ.

**چرا:** (چ) بۆ، بۆچ، بۆچی، لەبەرچی، ئەڕای چی، رای، لۆ، لۆچی، لۆچە، چەنی، لەبۆ، راچ، ژچ، ژچە، ژچی، ساچی، سیچە، وشەی پرسیار.

**چراخور/ چراخورد:** بروانە: "چراگاە".

**چرا دادن:** بردنە لەوەڕ.

**چرا داشتن:** بروانە:"چریدن".

**چرازار:** بروانە: "چراگاە".

**چرازن:** لەوەڕخۆر، ئاژەڵی ئاڵف خۆر لە حاڵی لەوەڕین دا.

**چراغ‌آخر:** (خُ) بریتی لە خۆش رابواردن و زۆر بوونی نێعمەت.

**چراغ‌آسمان:** بریتی لە مانگ، بریتی لە هەتاو.

**چراغان:** 1) چراخانیکردن. 2) شاد، دڵخۆش. 3) رۆشنکەرەوە.

**چراغ خواستن:** سواڵکەری کردن.

**چراغ روز:** بریتی لە هەتاو. و چرای کەم نوور.

**چراغ سپهر:** بریتی لە هەتاو یان مانگ.

**چراغ کش:** (کُ) کووژێنەرەوەی چرا.

**چراغ کشانی:** کووژاندنەوەی چرا بە مەبەستی ئەنجامدانی کاری ناحەز.

**چراکردن:** (چَ) بروانە: "چریدن".

**چراگاه:** جیّ‌لەوەڕ، لەوەڕگە، لەوەڕگا، باسەرە، گیاجاڕ، چایەر، چێری، کۆز، کیڤەچەر، مەرگە، مێرگ و بژوێن، وارکۆز، وێرت، یورت، گادار (چراگاە گاوها).

**چراگر:** لەوەڕخۆر، ئاڵف خۆر، ئاژەڵێ کە دەلەوەڕێ.

**چرام:** بڕوانە: "چراگاە".

**چران:** لە حاڵی لەوەڕین دا، لەوەڕان، لەوەڕێن.

**چراندن/ چرانیدن:** لەوەڕاندن، لەوەڕانن، چەڕاندن، چەڕانن، ئاژوودان.

**چرانده:** لەوەڕیو، چەڕیو.

**چراننده:** لەوەڕێن، کەسێك کە ئاژەڵ دەباتە لەوەڕ: (گا لەوەڕێن/گاوان، مەڕ لەوەڕێن/شوان).

**چرایی:** 1) بۆچییەتی، هۆ، بەڵگە. 2) لەوەڕخۆر، چەڕننە. 3) باس.

**چربآخر:** (خُ) 1) بریتی لە خۆراك و ناز و نێعمەت. 2) ئەوەی کە لە ناز و نێعمەتدا بژی، حاڵخۆش.

**چرباندن:** زۆر کردن، خستنەسەر.

**چرب بالا:** بەژن و باڵا ڕێکوپێك، جوان چاك.

**چرب خونی:** چوونە سەری چەوریی خوێن، "لیپمی".

**چرب دست:** بەدەست و برد، فرز و چالاك، چازان، لێزان، دەست ڕەنگین، هونەرمەند.

**چرب زبان:** جۆشن، تەڕزوان، دەم تەڕ، تەڕزوانی خۆرێك خەر، زارنەرم، لووس، زمان تەڕ، زمان لووس و هەڵخەڵەتێن، خۆتێهەڵقوتێن، نەرم بڕ، چەوروونەرم، زمان شیرین، مرۆخەڵەتێن بە قسەی خۆش، هولیسك، لیسكە.

**چرب زبانی:** تەڕزوانی، زمان لووسی، شیرین زمانی.

**چرب سخن:** بڕوانە: "چرب زبان".

**چربش:** 1) چەوری، چەورایی، ڕۆن، بەز. 2) زۆری، فرەیی، لەسەرتری، زۆرتری.

**چرب قامت:** باڵابەرز، جوان چاك.

**چربك:** (چَ.بَ یان چُ.بَ) 1) درۆ، بوختان. 2) مەتەڵ، لیچاڕ. 3) چووکەڵەی "چرب". "چربك خوردن": بە ڕاست زانینی درۆیەك و فریوخواردن. "چربك زن": تۆمەت لێدەر.

**چرب کردن:** چەورکردن. بە چۆنیەتی یان چەندایەتی شتێ زیاد کردن.

**چرب گفتار:** زمان لووس، قسە خۆش، شیرین زمان، تەڕزوان، وردبێن.

**چربگو:** بڕوانە: "چرب زبان".

**چربنده:** پتری و لەسەرتری لە کێشدا.

**چربی:** 1) چەوری، چەورایی، ڕۆنداربوون، خەزوبەز. 2) نەرمی، نەرمكێشی، مدارا. "چربی کردن": نەرمكێشی کردن.

**چربیدن:** 1) زیادهاتن، زۆرهێنان. 2) زاڵبوون، سەرکەوتن. 3) قورس بوونی شتێ لە شتێکی دی لە کێشدا، لاسەنگی.

**چرت:** (چِ) قسەی هەڵلەق مەڵلەق، هەڵیت و پڵیت.

**چرت:** (چُ) وەنەوز، وەنەوزە، چۆرت، چۆرتم، سەرخەو، سووکەڵەخەو.





**چرت زدن:** (چُ) وەنەوزدان، وەنەوزبردنەوە، وەنەوزەکوتێ، چۆرت دان، سەرخەوشکاندن، خەوبردنەوە، چاو گەرمکردن، وەژێنگ دان، هەلاژنین، هونژین، هێنژین.

**چرچر:** خۆش خۆری، خۆش خۆراکی.

**چرچرکردن:** خۆش خواردن، خۆش لەوەڕین، چاك خواردن و باش ڕابواردن.

**چرچی:** بڕوانە: "پیلەور".

**چرخ:** 1) هەرشتێکی گرۆڤەر کە بسووڕێتەوە و بە دەوری تەوەرەی خۆیدا بخولێتەوە وەك تگەر. 2) ئاسمان، گەردوون، ڕۆژگار، دەوران، گەڕان، سووڕ، خول، زەمانە.

**چرخ‌آبگون:** بریتی لە ئاسمان.

**چرخ‌آبنوس:** بریتی لە ئاسمان.

**چرخ اخضر:** بریتی لە ئاسمان یان گۆی مانگ.

**چرخان:** لەحاڵی چەرخین دا، دەور پێڵێدەر، (سووڕ/ خول) پێدەر.

**چرخاندن/ چرخانیدن:** سووڕانن، سووڕاندن، سوڕدان، وەرسووڕاندن، زڤڕاندن، خول پێدان، خولدان، خولاندن، خولاندنەوە، چەرخاندن، چەرخ دان، وەرچەرخاندن، گێژدان، هەڵسووڕاندن، وەرگەڕاندن. بەڕێوەبردن، هەڵسووڕاندن.

**چرخاننده:** هەڵسووڕێنەر، هەڵسووڕێن، خول پێدەر.

**چرخ خوردن:** چەرخین، چەرخیان، چەرخان، چەرخ خواردن، سووڕان، خولانەوە، خول خواردن.

**چرخ دادن:** بڕوانە: "چرخاندن".

**چرخ روان:** چەرخێك کە بە دەوری خۆی دا دەسووڕێتەوە، ئاسمان.

**چرخ زدن:** 1) بڕوانە: "چرخ خوردن". 2) سەماکردن.

**چرخش:** وەرچەرخان، وەرسووڕان، سووڕ، سووڕان، سوڕخواردن، وەرسووڕ، هەڵسووڕ، هەڵچەرخ، خول، خولان، زڤڕ، دەور، لرسە، چەرخە.

**چرخ فلك:** ئاسمان، چەرخی سووڕدەر.

**چرخ گردان:** سووڕی گەردوون، ئاسمان.

**چرخنده:** سووڕلێدەر، کەسێك یان شتێك کە بە دەوری خۆی یان بە دەوری شتێکی دیدا بخولێتەوە.

**چرخەزدن:** بڕوانە:"پرسەزدن".

**چرخیدن:** سووڕان، سووڕانەوە، سووڕدان، هەڵسووڕان، هەوڵسووڕین، هەڵسووڕیان، خولان، خولانەوە، خولیانەوە، خول خواردن، چەرخین، چەرخان، چەرخیان، چەرخ خواردن، زڤڕین، زڤڕان، گەڕ، پێچ دان.

**چرده:** تاڵە، ئەسمەر، سەوزە.

**چرس:** (چَ.رَ) بەندن و گرتووخانە، شکەنجە و ئازار و گوشار.

**چرش:** لەوەڕین، لەوەڕان، ئاڵف خواردنی ئاژەڵلانی ئاڵف خۆر لە لەوەڕگە.

**چرك آلود:** بڕوانە: "چرکین".

**چرك شدن:** پیس بوون.

**چرك كردن:** چڵك كردن. پیس كردن. خاوێن كردنەوەی لەش لە چڵك، كیسەكێشان لە گەرماودا.

**چركناك:** بڕوانە: "چركین".

**چركنویس:** چڵكنووس.

**چركین:** چركن، چڵكن، چلووك، چڵێك، چەپەڵ، پیس، پەڵۆخ، قەلێر، گەمار، كەرەھ، پۆخڵ، ناپاك، گڵاو، كۆتی، لەوت، كۆتی، دۆژین، دژۆین، چلووك، گەندلخە، گەڤار، گەرماخڕن، چەقڵە، ڤەزخت، نەخاوێن، لێشكن، لێیشن، لێمن.

**چرمی:** چەرمین، چەرمینە، چێكراو لە چەرم.

**چرند:** جرنا، هەڵیت و پەڵیت، قۆرییات، هەللەق مەللەق، قسەی بێتام و خوێ، قسەی بێسەروبەر.

**چرندگان:** كۆی"چرندە"، لەوەڕخۆران، چەرەننەكان، ئاژەڵەكان.

**چرندو:** 1) بڕوانە: "غضروف". 2) لەوەڕخۆر.

**چرندوپرند:** هاتەران پاتەران، هەڵیت و پڵیت، قسەی بێ مانا و پڕوپووچ.

**چرندە:** لەوەڕخۆر، چەرننە، ئاژەڵێ كە دەلەوەڕێ.

**چروك:** چرچ، لۆچ، لوچ، پووكاو، قرمچ، كوریشك.

**چروكیدن:** چرچ بوون، سیس و چرچ بوون، چرچ هەڵاتن، چرچیان، لۆچان، لۆچ تێكەوتن، گرژهەڵاتن، كرژهەڵاتن، كرژبوون، ژاكیان، هەڵقرچان، قرچ هەڵاتن، چوونەیەك، وێك هاتن، چەرمقین، قەرمچین، قرمچین، كەرمەژین، كومشین، كورژان، كورژین، كورسان. "**چروكیدە**": چرچ هەڵگەڕاو، هەڵقرچاو، قرچاو، چرچ و لۆچ بووگ، چەرمقی، قەرمچی.

**چروكین:** لۆچاوی، لۆچی، چرچ.

**چروندە:** چارە (دۆز/ دۆزە).

**چرویدن:** چارەدۆزیكردن، بە دوای ڕێگەچارەوەبوون.

**چرەكردن:** لەوەڕین.

**چریدن:** 1) لەوەڕین، لەوەڕان، لەوەڕیان، چەڕین، دەم دان، ئالف خواردنی ئاژەڵ. 2) سەركەوتن بە سەر، زاڵ بوون بە سەر.

**چریدە:** لەوەڕیو، لەوەڕاو.

**چزاندن:** ئازاردان، ئازاندن، ڕەنجاندن بە قسە یان بە كردەوە.

**چزادن:** ئازاردان. سووتاندنی پەڕ یان مووی پێستی ئاژەڵان لەسەر ئاور.

**چزیدن:** وزەوهێزبڕان یان كز و لاوازبوون.

**چسان:** چۆن، چلۆن.

**چسبان:** چەسپیو و تەنگ. لكێن، پێوەنووسێن. دڵخواز، دلگیر، دڵپەسند.





**چسباندن/ چسبانیدن:** لكانن، لكاندن، چەسپانن، چەسپاندن، پێوە(چەسپاندن/ لكاندن/ نووساندن) ، نووساندن، نوسكاندن، ڤەنووسكاندن، سكانن، مزاندن، زەلقاندن، زەلیقاندن، نیایش پا، نابیش پا. خۆ بەكارێكەوە خەریك كردن. فرز و خێرا ئەنجامدان. هۆگركردن. "**چیزی بە كسی چسباندن**": رەپاڵدان بەو. "**خود را بە دیگری چسباندن**": خۆ بەستراوە بەو یان بەخزمی ئەو نیشان دان.

**چسباننده:** نووسێن، چەسپێن، لكێن.

**چسبانیدە:** چەسپێنراو، لكێنراو، لكێندریاگ، زامق كەردە، زانق كەردش.

**چسب دار:** بڕوانە: "چسبندە".

**چسبناك:** لكێن، پێوەنووسێن، زامقی، لچ، مچ.

**چسبندە:** لكەمەنی، نوسەمەنی، هەر شتێ كە چەسپی هەبێ. "**بسیارچسبندە**": نووسەك.

**چسبیدن:** چەسپ، چەسپان، چەسپین، چەسپیان، پێوەچەسپان، چەسبسە، لكان، لكیان، لكین، پێوەلكان، سكان، زەلق، نووسان، نووسیان، نووسین، ڤەنووسین، پێوەنووسان، بەندبوون، دالكان، دالكیان، لچان. ڕاگرتنی شتێ لە دەست دا بەقایمی. خۆش و دڵخواز. سووری و پێداگری. سەرگەرم بوون بە شتێكەوە و درێژەدان پێیی. بەردەوام لە تەك كەسێك بوون لێی جیانەبوونەوە. "**چسبیدن بە كار**": ئەنجامدانی كارێ بە جیددی، چەسپان بە كارەوە. "**چسبیدن بە كسی(چیزی)**": پێداگری لە هەڵبژاردنی ئەودا، بەوەوە نووسان. "**باكسی چسبیدن**": رەگەڵ ئەو كەوتن و هاتوچۆكردن لە تەكیدا. "**چیزی بە كسی چسبیدن**": چێژپێدان بەو.

**چسبیدە:** نووساو، نووسیاگ، لكاو، لكیو، لكیاگ، چەسپاو، چەسپیو، چەسپیاگ.

**چست:** 1) چالاك، گورج، فرز. 2) پتەو و قایم. 3) كارامە، كارزان. 4) بە فرزی و زیرەكی. 5) توند و خێرا. 6) جوان و ئەندام رێك. 7) بڕوانە: "برازندە". 8) بەحاڵەتی چەسپیو. 9) شیاو، شایان، ژێهاتی.

**چست و چالاك:** گورجوگۆڵ، گورجوبەكار، زۆربەكار، توندوتۆڵ، چوست و مەزبووت، زركوزینگ، وریا و چالاك، پێسووك، تاشك، مجك، مجن، مجنك، چوختی، لەكاردەرهاتوو.

**چستی:** چالاكی، گورجی، فرزی، چەلەنگی، لەش سووكی.

**چس چس كردن:** خاوەخاوكردن، خنەخن كردن.

**چس خور:** بڕوانە:"خسیس".

**چسكی:** سست و نابەردەوام، تڕەكەڵەك، ئەوەی بە تڕێ بەندە.

**چس گرگی:** فیز و لەخۆبایی بێجێ.

**چس مال کردن:** بریتی له سەرسەری شۆردنەوە.

**چس محلی کردن:** گوێپێنەدان، بەهێند نەگرتن.

**چس نفس:** بڕوانە:"وراج".

**چسو:** تسن، تسکەن، فسۆك. لاواز و بێ هێز.

**چسونە:** پەست و بێ نرخ.

**چسی:** فیز و خۆنوێنی.

**چسیدن:** تس بەردان، تسکەندن، تسین، فس بەردان، فس کردن، فس کەندن.

**چشاندن:** پێ چێژتن، پێ چەشتن. پێخواردنەوە. خستنە بەر تاقیکاریەوە.

**چشاننده:** پێ چێژ.

**چشایی:** هەستی چێژ پێکردن، چێژایی، چێشگە.

**چش بە کسی گفتن:** بەرپێگرتن، نەهێشتن.

**چشتە:** چەشە، چەشتە، چێشتە، چەشکە.

**چشتەخوار:** دانەخۆرە، چەشتەبوون، چەشەخواردوو، چەشەبوون، چەشتە خۆرە، چەشەخۆر، نچیری چەشتە خواردو.

**چشش:** چێژتن، چەشتن، چێژان.

**چشم آب دادن:** بریتی لە تواشاکردن و چێژبردن.

**چشك:** 1) زۆر، فرە، زاڵ. 2) زۆری، فرەیی، زاڵی، زاڵێتی.

**چشمآرو/ چشمارو:** چاوچڵە، نووشتەی چاوەزار، جادووبەن، پووچکەرەوەی سێحر.

**چشمآغیل:** خێسە، خێسەڕوانین، مۆڕە، مۆڕی، بە گۆشەی چاو روانین بە تووڕەیی.

**چشمآلوس:** بڕوانە: " چشمآغیل ".

**چشماچشم:** رووبەڕوو.

**چشم اسفندیار:** بریتی لە شوێنی خەسارهەڵگر، خاڵی لاواز.

**چشم افکن:** دوورنوێن، دوورەدیمەن، دوورنما.

**چشم انتظار:** بڕوانە: "چشم براه".

**چشم انداختن:** سەرسەری روانین.

**چشم انداز:** 1) دیمەن، بەرجەوەن، بەرجەوەند، بەرچاو، چاوگە، خویانەك. 2) دوورەدیمەن، دوورنما، دوورنوێن، تێڕوانین بۆ داهاتوو.

**چشم باختن:** کوێربوون.

**چشم بازکردن:** 1) چاوکردنەوە، لەخەوهەستان. 2) بە وردی روانینە شتێك و چاوەدێری کردنی.

**چشم بد:** بڕوانە: "چشم شور".

**چشم برآمده:** چاوزەق، چاوبز، چاودەرپەڕیو.

**چشم براه:** چاڤنێر، چاونهێر، چاوەڕێگە، چاوەنوار، چاوەنۆڕ، چاونێر، چەمەرا ، چاوەڕێ، چاولەدوو، چاوڕوان، چەشدار، چەشرێ، چەش وەڕێ، بەتاسە بۆدیتن، چەمەودما.

**چشم برجستە:** بڕوانە: " چشم برآمده".





**چشم برداشتن:** چاولێهەڵگرتن، لێگەڕان، لێگەڕیان، دەست لێهەڵگرتن، روو وەرگێڕان، پشت تێکردن، چاولێنەکردن، چاولێپۆشین، تێنەڕوانین.

**چشم بستن:** چاونووسان، چاونووساندن، چاونووقان، چاوقووچان، چاوقووچاندن، چاوقونجاندن، پیلوی چاو بەسەر یەکاهێنان، پەلك داخستن، چاولێك نان، چاوتروکاندن، چاو لەسەریەك دانان، چاوبەستن، چاولێ نەکردن. چاوپۆشیکردن. وازلێهێنان. "**چشم از جهان فروبستن**": بریتی لە کۆچی دوایی کردن، مردن.

**چشم بستە:** چاوبەستە، چاوقووچاو، چاونووقاو، چاوقونجاو، کوێرکوێرانە، چاڤگرێدای. بێ ئاگایانە. بێ خەبەر، نائاگا، ئاگالێنەبوو.

**چشم بندك:** چاوشارکێ، چاوشارەکێ، چاوشلکانێ، چاوشێرکانێ، کایەیەکە چاو دەبستن و دەبێ بەچاوبەستراوی هاوگەمە بدۆزێتەوە.

**چشم بندی:** بەستنی چاوی کەسێك، فێلبازی، کەڵەکبازی، سێحربازی، جادووکاری، تەڕدەستی.

**چشم بە زیر:** بەشەرم و حەیا. چاو لە ژێر.

**چشم بیآب:** بێچاوەڕوو، چەقەسوو، بێ شەرم، بێ حەیا.

**چشم پر:** تێر، تەسەل.

**چشم پنام:** نووشتەی چاوەزار، پووچکەرەوەی سێحر.

**چشم پوشی:** چاوپۆشان، چاوپۆشی، چاوپۆشین، چەمپۆشی، چاولێ پۆشین، چاڤ گرتن، داکروپان، بوردن، لێبوردن، ویەردن، ڤەکڕوپان، چاولێ قووچاندن، چاولێ نووقاندن، گەوارا، پاسا، جەبدان، بەخشین لە خەتا.

**چشم پوشیدن:** چاوپۆشیکردن، چاولێقووچاندن، چاونووقاندن، چاوقوونجاندن، ڤەکڕوپاندن.

**چشم پوشیده:** بڕوانە: "چشم بستە".

**چشم پیش:** 1) چاو بز، چاو دەرپەڕیو. 2) بریتی لە شەرمەزار، تەریق، سەرشۆڕ.

**چشم تنگ:** (بەر)چاو تەنگ، رژد، چکوس، دەس قووچاو، بەئێرەیی، چاونەزێر.

**چشم چران:** چاوچڵێس، چاوحیز، چاوباز، چاوباشقاڵ، چاوچڕێن، چاولەوەڕێن، نەزەرباز، کەسێ کە بێ شەرمانە بۆ ژنان دەڕوانێ، حەز لە ژنان کردن.

**چشم چرانی:** چاولەوەڕێنی، نەزەربازی، چاوچڵێسی، چاوحیزی، تۆلازی، دەڵەیی.

**چشم خروس:** بریتی لە شەڕابی سوور کە لە رەنگی چاوی کەڵەشێر بچێ.

**چشم خواباندن:** خۆ لەبێ خەبەریدان، لەبەرچاونەگرتن، چاوپۆشیکردن.

**چشم خوردن:** بریتی لە بەچاوەوەبوون، لەچاوچوون.

**چشمداشت:** تەما، چاوەڕوانی، گەرەك. بۆمانای زیاتر بڕوانە: "انتظار".

**چشم داشتن:** چاوەڕوانی لێکردن، هیواداربوون، تەماداری، چاوەڕوان بوون.

**چشم دراندن:** بە وردی تواشاکردن. چاودەرپەڕاندن بەنیشانەی ترس یان سەرسووڕمان یان تووڕەیی و شتیوا.

**چشم درد:** چاوێشە، چاوئێشە، گل، کولبوونی چاو، چاڤ کولی، ژانی چاو، نەخۆشیی چاو.

**چشم دریده:** چاوقایم، بێ شەرم، بەڕوو، ڕوقایم، ڕووهەڵماڵراو.

**چشم دزدیدن:** بەخێرایی چاوڵێهەڵگرتن، ئیتر تواشانەکردن.

**چشم دل:** چاوی عەقڵ، چاوی ئاوەز.

**چشم دواندن:** چاوگێڕان.

**چشم دوختن:**چاوتێبڕین، چاو هەڵنەگرتن لە سەر شتێ، بە بەردەوامی ڕوانینە شتێ.

**چشم رس:** مەودایەك کە دەکرێ بەچاو ببینرێ، مەودای دیتن.

**چشم رسیدن:** بریتی لەبەچاوەوەبوون، چاوزار کار لێکردن. "**چشم رسیده**": بەچاوەوەبوو، کەسێك کە چاوەزار کاری لێکردوە.

**چشم روشنی:** چاوڕۆشنی، چاوڕوونی، مزگێنی خۆش.

**چشم زاغ:** 1) چاوشین. 2) بریتی لە چەقاوەسوو، بێ شەرم.

**چشم زال:** بڕوانە: "چشم چران".

**چشم زخ:** بڕوانە: "چشم زخم".

**چشم زخم:** چاوزار، چاوەزار، چاوێنی. "**یك چشم زخم**": ساتێکی کەم، چرکەساتێك.

**چشم زخم خوردن:** بەچاوەوەبوون، بە چاوەبوون، بەچاوی پیسەوەبوون، چاوزارکارلێکردن.

**چشم زخم زدن:** بەچاوەوەکردن، چاوپێ هەڵێنان، چاولێدان، لەچاوبردن، چاوزارکارلێکردن، چاوی پیس لێدان، پێ هەڵکاڵان، ئێرەیی پێبردن.

**چشم زد:** چاوتروکانێك. بریتی لە چرکە ساتێك، کاتێکی زۆر کورت و خێرا، ماوەیەکی یەکجار کەم.

**چشم زدن:** 1) بڕوانە: "چشم زخم زدن". 2) چاولێك نان، چاوتروکاندن، چاو لەسەریەك دانان، چاوقونجاندن. 3) ترسان، ترسین. 4) چاوداگرتن، ئاماژەکردن بەچاو.

**چشم زده:** بڕوانە: "چشم رسیده".

**چشم زهره:** ڕوانینی بەخێسە و تووڕەوە.

**چشم سفید/ چشم سپید:** ڕوودار، بێ چاوەڕوو، بێ شەرم، بێ حەیا، بێ ئەدەب، لاسار، گوێ نەبیس.

**چشم شدن:** دەرکەوتن، ڕوون بوونەوە.

**چشم شکستن:** 1) بێحەیابوون، بێ شەرم بوون. 2) کوێربوون.





**چشم شور:** چاوپیس، چاوچڵە، چاڤینۆك، کەسێ کە بە چاوەوە دەکا.

**چشم طمع دوختن:** چاودانە سەر، چاوتێبڕین، تەماح تێکردن، لێڕوانین بە تەمایەکەوە.

**چشم غرّه:** بڕوانە: " چشمآغیل ".

**چشم غرّه رفتن:** چاو دەرپەڕاندن، چاوڵێ بزکردنەوە، چاو بز کردنەوە، چاوڵێ سوورکردنەوە، ڕوانین بە هەڕەشەوە، زەق تواشاکردن بۆ ترساندن.

**چشم غله:** بڕوانە: "چشم غره".

**چشم فروبستن:** چاوبەستن، چاولێك نان، چاونووقاندن، تواشا نەکردن، چاو لێنەکردن، چاوپۆشین.

**چشم فرودوختن:** بڕوانە: "چشم فروبستن".

**چشم فسا:** سێحرباز، جادووگەر، پووچکەرەوەی چاوەزار، چاوزار ڕەتێن.

**چشمك:** 1) چووکەڵەی"چشم"، چاو گچکە. 2) ئاماژە بە گۆشەی چاو، هێما بە پێلووی چاو. 3) چاویلکە.

**چشم کردن:** بەچاوەوەکردن، بەچاوەکردن.

**چشم کردن- بە:** بریتی لە لەبەرچاوگرتن.

**چشمك زدن:** چاڤ شکاندن، چاوشکاندن، چاوداگرتن، چاوقرتانن، چاوقرتکێ، چاوبرکە، چاوبرکێ، هێما بە گۆشەی چاوکردن، چاوڵێداگرتن، چاو هەڵتەکاندن، سووچی چاو تروکاندن بۆ تێگەیاندنی مەبەستێك.

**چشمك زدن ستاره:** درەوشانی هەسارە، تروسکانەوەی ئەستێرە، کل بوون.

**چشمك زن:** 1) چاوداگر، هێماکەر بەچاو. 2) بەچاوەوەکەر. 3) جادووگەر.

**چشم گاو:** چاوگا، چاو گەورە.

**چشم گرداندن:** بە زەقی ڕوانین، لێمۆڕبوونەوە، تێڕوانین بە تووڕەیی و ڕق هەستاوییەوە.

**چشم گرم کردن:** بڕوانە: "چرت زدن".

**چشم گرمی:** بڕوانە: "چرت".

**چشم گشته:** خێل، چاوخوار.

**چشمگیر:** بەرچاو، سەرنجڕاکێش، جوان.گرینگ و بەنرخ. زۆر، فراوان.

**چشم نشین:** دڵبەر، دڵدار، خۆشەویست.

**چشم نواز:** جوان و دلگر، ئەوەی سەیرکردنی خۆش و بەچێژە.

**چشم نهادن:** تەماکردنە شتێك، چاوەدێری کردن، تێڕوانین و ئاگالێبوون.

**چشم نهاده:** چاوەدێر، ڕوانەر.

**چشم و چار:** هێز و وزەی بینایی.

**چشم و چراغ:** 1) بریتی لە هێزی بینایی و هێز و وزەی سۆما. 2) بریتی لە کەسی هەڵبژێراو و ناودار کە ببێتە هۆی شانازیی بنەماڵەکەی.

**چشم و دل پاك:** داوێن پاك، ڕاست کردار، جێیمتمانە، سەر ڕاست.

**چشم و دل سیر:** تێروتەسەل، چاوتێر، بێ نیاز، بێ تەماح.

**چشم و گوش باز:** چاو و گویٚ کراوە، چاوکراوە، لە دنیا زان، تیٚگەیشتوو، کەسی زانا و ئاگا و بەئەزموون.

**چشم و گوش بستە:** چاو و گویٚ داخراو، کەسی بیٚ خەبەر لە دنیا و بیٚئەزموون. بیٚ ئاگایانە.

**چشم وهام:** بڕوانە: "چشم پنام".

**چشم و همچشمی:** رکەبەری، رقەبەرایەتی، ئیٚرەیی پیٚبردن، خۆزگە بۆ شتی خەڵك خوازتن، چاولیٚکەری، بەخیلی.

**چشمە:** 1) کانی، خانی، چاوەی ئاو، سەرچاوە، سەروچاوە. 2) کون. 3) ژیٚدەر، سەرچاوە، سەرەتا و بنەمای هەر شتیٚك. 4) بریتی لە خۆر، هەتاو. 5) نموونە، بەش. 6) خۆر. 7) رووبان. 8) کان، کانگا.

**چشمەآفتاب:** بریتی لە خۆر. "چشمەآتشفشان و چشمە خاوری و چشمەخور و چشمە روز و چشمە روشن و چشمە سیماب و چشمە سیماب ریز و چشمە گرم و چشمە نور و چشمە نوربخش و چشمە هور" یش هەر بەم مانایە دیٚن.

**چشمەالیاس:** بڕوانە: "چشمەخضر".

**چشمە حکمت:** سەرچاوەی حیکمەت، سەرچاوەی ئاوەزمەندی.

**چشمەحیات:** بڕوانە: " چشمەخضر".

**چشمە حیوان:** بڕوانە: " چشمەخضر".

**چشمەخضر:** ئاوی حەیات، دەڵیٚن کانییەکە لە تاریك و نووتەك دا کە هەر کەس لیٚی بخواتەوە هەر دەمیٚنیٚ و هەرگیز نامریٚ.

**چشمەدار:** هەر شتیٚ کە کون کون بیٚ. ئاڵقەدار.

**چشمەزار:** زەوییەك کە کانیی زۆری تیٚدابیٚ.

**چشمەظلمات:** شویٚنیٚ کە هەمیشە شەو بیٚ.

**چشمەقیر:** بریتی لە شەو، تاریکە شەو.

**چشمەگاە:** کانی، سەرچاوە.

**چشم هم گذاشتن:** چاو بەستن، چاو ویٚکنان.

**چشمە نوش:** بڕوانە: " چشمەخضر".

**چشمیار:** چاویلکە.

**چشندە:** چیٚژەر، تامکەر، خویٚچەژ، خویٚ چیٚژ.

**چشیدن:** چەشتن، چیٚشتن، چەشتەکردن، چاشاندن، تام کردن، تام تاقیکردنەوە، چیٚژەکردن، چیٚژان، چیٚژتن، ڤەچەشاندن، چیٚژە، چیٚشکە، چیٚژکە، (ملاّك/ مەلاّك/ میٚلاّك) کردن.خواردن.هەست پیٚکردن، ئەزموون کردن، تاقیکردنەوە. "**چشیدن غذا**": خویٚ چەژی، خویٚ چەشتن، خویٚ چیٚژتن، خویٚ چیٚژی، خویٚ چیٚشتن، خویٚ چەشتن.

**چشیدنی:** شیاوی چیٚشتن، بۆ چەشتن.

**چشیدە:** چیٚژراو، چەشراو.





**چغاز:** سووزمانی، دەلیقانی، ژنی بیٚ حەیا و زمان دریٚژ.

**چغرشدن:** رەق و سفت بوونەوە، مەیین.

**چغزیدن:** 1) نالاّندن، کڕووزانەوە، شین کردن. 2) ترسیان، وەگومان کەوتن.

**چغل:** 1) هەرشتیٚکی سفت و رەق. 2) بڕوانە:"چین و چروك". 3) زریٚ، زرە. 4) بڕوانە: "سخن چین".

**چغور:** بڕوانە:"سرسخت".

**چغیدن:** بڕوانە: "چخیدن".

**چفتاچفت:** بەبیٚمەودا، لە تەنیشت یەکدا دانراو.

**چفت شدن:** داخران، پلۆم کران، هەڵ پیٚکران، هەڵ پیٚکیان، کیپ بوون.

**چفت کردن:** داخستن، پلۆم کردن، ئاڵقەڕیٚزکردن، هەڵ پیٚکانن، ژەندن، گەیاندنی دوو شت بە یەکتر، قایم کردن.

**چفتگی:** چەمین، چەمانەوە، خواربوونەوە. ناڕاستی، لادان لە هەقیقەت.

**چفتن:** بڕوانە: "چفتیدن".

**چفتە:** 1) چەماو، چەمیو، داهاتوو، لار. 2) درۆ، بوختان، گومانی خراپ.

**چفتە پشت:** بڕوانە: "کوژپشت".

**چفتەگر:** بڕوانە:"فحاش".

**چفتیدن:** چەمانەوە، چەمین، لاربوون، داهاتن.

**چفدە:** چەماو، چەمیو، لارەوەبووگ.

**چفساندن:** بڕوانە: "چسباندن".

**چفسیدن:** بڕوانە: "چسبیدن". "**از چیزی چفسیدن**": لادان لەو، دوورکەوتنەوە لەو.

**چك:** (چِ) 1) بڕوانە: "چکە". 2) چەکی بانکی.

**چك:** (چَ) 1) چەنە، چەناگە، ئەرزینگ. 2) زللە، شەپلاّخە، شەپازللە. "**چك خوردن**": وەبەر شەپلاّغەدران، زللەخواردن. "**چك زدن**": زللەلیٚدان.

**چك:** (چُ) 1) ئەژنۆ، هەژنۆ، وژینگ، وژنگ، زرانی، زەنگۆڵ. 2) بڕوانە: "چمباتمە". 3) سیرەت، کیر.

**چکاچاك:** بڕوانە: "چاکاچاك".

**چکاد:** تروپك، سەری کیٚو. تەپڵەسەر. مەتاڵ، قەڵغان.

**چکامە:** چامە، هەڵبەست، قەسیدە.

**چکامەسرا:** چامە بیٚژ، هەڵبەست وان، قەسیدە ویٚژ.

**چکان:** لە حاڵی تکین دا.

**چکاندن/ چکانیدن:** 1) چرتان، چرتاندن، چورتان، چورتانن، چورتاندن، چرکاندن، چرکانن، قرتەلیٚهیٚنان، دەس بە پەلەپیتکەی تفەنگ داهیٚنان و داخستنی. 2) تکاندن، تکانن، چکاندن، داتکاندن، داتکانن، (دلۆپ دلۆپ/ تنۆك تنۆك) رژان. 3) بڕوانە: "افشاندن".

**چکاندن در...:** تیٚ تکاندن، بە تنۆك تیٚ رژاندن.

**چکانش:** بڕوانە:"تقطیر".

**چکاننده:** تکیٚن، تکیٚنەر، چکیٚن، چکیٚنەر، چەقان، رژیٚن بە دلۆپ.

**چکانە:** دڵۆپ، تك، تنۆك.
**چکچاك:** بڕوانە: "چکاچاك".
**چك زدن:** (چ) بڕوانە:"چمباتمەزدن".
**چکش خوردن:** کوترانی ئاسن یان کانزا بە چەکوش.
**چکش خوار:** کانزایەك کە بتوانرێ چەکوش کاری بکرێ.
**چکمیزك:** میزەچرکە، مێزەچرکێ، مێزەچرکێ، مێزەچوڕکێ، چرتکە میزە.
**چك و چانە زدن:** چەندوچوون، قسە لە شتێ کردن، زۆر لە سەر ڕۆیشتن، باس کردن.
**چکولیدن:** کۆڵین، هەڵکۆڵین.
**چکە:** (چ.كَ 1) چووکە، گچکە، سووك. 2) کەسی قەشمەر و نوکتەباز.
**چکە:** (چِ.كَ) چۆڕە، چۆڕ، تك، تنۆك، دڵۆپ، دڵۆپە، سافان، نقووت، چکە.
**چکەچکە:** چۆڕچۆڕ، دڵۆپ دڵۆپ، تنۆك تنۆك.
**چکە کردن:** چرکاندن، چرکان، دڵۆپەکردن، دڵۆپەدادان، تکیان، تکەکردن، تنۆکەکردن، نقووتاندن، سافاندن، وەرفتن، وەرڤاندن.
**چکی:** کڕین و فرۆشتنی یەکجێ، کڕین و فرۆشتنی لە گۆترە، بێکێشان و پێوان.
**چکیدن:** 1) تکان، تکین، تکیان، داتکان، داچۆڕان، چکان، چکیان، داچکیان، چکەکردن، ڤەچکیان، ڤەچۆڕان، چۆڕچۆڕ هاتنە خوار، دڵۆپەدڵۆپەهاتنەخوار. 2) بڕوانە: "ترکیدن". "**چکیدن آخرین قطرات**": چۆڕان، چۆڕیان، چۆڕانەوە، چۆڕیانەوە، چۆڕایی لێهاتن، ڤەچۆڕان، هەڵچۆڕان.
**چکیدن پیاپی:** چکەچک، تکەتك.
**چکیدن در...:** تێ تکان، دڵۆپ تێڕژان.
**چکیده:** 1) چۆڕاو، تکاو، چەکاو. 2) کورتە، پوختە. 3) لێزان، بەئەزموون، زاڵ.
**چگال:** تۆلا، تێکسمراو، تێك پەستێوراو، شتێك کە گەردیلەکانی تێك پەستێورابێ، پێکەوە نووسان و ڕەق بوونی زۆر شتی ورد.
**چگالش:** پرۆسەی گۆڕانی گاز بە تراو.
**چگالنده:** ساردکەرەوە.
**چگالی:** کێشەچڕە، "دانسیتە".
**چگالی‌سنج:** هیدرۆمیتر.
**چگونگی:** چۆنیەتی، چلۆنایەتی، چلۆنەتی، چۆنەها، حاڵ و هەوا.
**چگونه:** چۆن، چلۆن، چاوا، چاوان، چەوا، چوین، چتۆ، چتۆڤ، کلۆن، کوو؟
**چقدر:** چەنێ، چەنێك، چەند، چقا، چقاس.
**چل:** (چِ 1) سووکەڵەی"چهل". 2) نەزان، کەم ئاوەز، نەفام، گەمژە، گەوج.
**چلاس:** بڕوانە: "شکم پرست".
**چلاق/ چلاغ:** شەل، گۆج، گێڕ.





**چلاندن/ چلانیدن:** پەستاوتن بە نهێم، شێلان، ڤەشێلان، ستراندن، سترهاندن، سترین، ولاوین، چلانن، تەژاندن، ڤەپیان، ڤەپین، ولاوین، داماڵین بە دەست، دەست پیاماڵین، گوشین، ئاوچۆڕکردن، گلۆفین، هەڵگلۆفین، هەڵگوشین، هەڵکوشین، ڕێك گوشین، میرکەردەنە. زۆر ئازاردان.
**چلانده/ چلانیده:** گوشراو، هەڵگلۆفراو، ئاوچۆڕکراو، ڕێك گوشراو، شێلراو.
**چلاننده:** هەڵگلۆفەر، گلۆفەر، گوشەر، هەڵپشێو.
**چلب:** فیتنە و ئاژاوە، چەقەوگوڕە، قاو و قریشك.
**چلبله:** (چُ.بُ لَ 1) پەلە، لەز، دڵەتەپێ، دڵەکوتێ، بێئۆقرەیی. 2) بەلەسە و نیگەران.
**چل پله:** زۆر قووڵ.
**چل زدن:** سووڕانەوە بەبێمەبەست، خولانەوە.
**چلغوز:** ڕیقنە. کەسی کورتەباڵای گردەڵە.
**چلغوزکار:** کرێکاری شپرزە و ناشی.
**چلفتی:** لەناو خەڵکی ڕەشۆك دا"دست و پا چلفتی": مرۆی بێ توانا و خوێڕی و نەشیاو، بێکارە، گێلۆکە، حەپۆل، تەپلۆس.
**چلمن:** (چُ.مَ) نەزان، گەمژە، کەللەبۆش. بەیتەشە، گێلۆکە، خوێڕی و بێ دەست و پێ.
**چل و چو:** هەواڵی درۆ و بێبنەما، دەنگۆ.
**چلوزیدن:** بڕوانە:"پلاسیدن".
**چل و ول:** بەڕەڵڵا، بێسەروبەر، کەسێ کە ڕواڵەتی نارێکوپێکی هەیە.
**چله‌بزرگ:** چلەی گەورە، چل ڕۆژی سەرەتای هاوین یان زستان. "**چله کوچك**": بیست ڕۆژی دوای چل ڕۆژی هەوەڵی زستان.
**چله‌بندی:** کرداری بەکارهێنانی تەلیسم و نزا و هتد و بۆ نەزۆك کردنی کەسێك.
**چله‌خانه:** شوێنی چلەکێشان.
**چله‌رشتن:** لۆکە و خوری کردنە دەزوو.
**چله‌شدن:** ڕشتەڕشتە/ هەوداهەودا بوون.
**چله‌کردن:** ڕشتەڕشتەکردن. لەناوبردن، خراوکردن.
**چله‌کسی افتادن:** نەزۆك بوونی ئەو.
**چله‌گرفتن:** 1) پرسەی مردوو دوای چل ڕۆژ لە مردنی. 1) چلەچوون، چل ڕۆژی پاش منداڵ بوون. 3) چوونە ئەشکەوتی چلەنشینان و سۆفی و دەروێشان بۆ ماوەی چل ڕۆژ.
**چله‌نشستن:** چلەکێشان، بۆ ماوەی چل ڕۆژ لە گۆشەیەکی خەڵوەت مانەوە و سەرقاڵی خواپەرستی و خۆپارێزی بوون. خانەنشین بوون.
**چله‌نشین:** چلەکێش، چلەنشین. گۆشەگیر، تەریك.
**چله‌نشینی:** خەڵوە، چلەکێشی، چلەنشینی.
**چلیپا:** 1) خاچ. 2) ئەگریجەی دلبەر. "**خود (خویشتن) را چلیپا کردن**": کڕنۆش بردن لەبەرامبەر کەسێك دا.

**چلیپا پرست:** خاچ پەرست، فەلە، مەسیحی.

**چلیپا کردن:** چەماندن، چەمتاندنەوە، لارکردنەوە.

**چلیپاوش:** بە شکڵی خاچ.

**چلیدن:** 1) گوشران، کوشران، گلۆفان. 2) ڕۆیشتن. 3) جووڵان، بزووتن. 4) شیاوبوون. 5) هەبوونی کڕیار.

**چلیکە:** 1) بڕوانە: "بڕادە". 2) تەلاش، توێلاش.

**چم:** 1) بڕوانە: "خرام". 2) تەکووزی، ڕێسا، بڕەو. "بچم بودن": رازاوە و ڕێکوپێک بوون. 3) مانا، واتا، گیانی ئاخاوتە. 4) چاو. 5) گوناح، تاوان. "بە چم": ژێر و ملکەچ. سەروبەرکراو.

**چماچم:** تەوێڵ، ناوچاوان.

**چم اندرچم:** پڕپێچەلاوپێچ.

**چماق:** تەیاخ، پەیاخ، تێلا، گالۆک، گالۆم، گۆپاڵ، گورز، توپز، چۆماخ، چۆماغ. "**چماق بەدست**": دارەدەست. "**چماق تکفیر**": تۆمەتی کوفر. "**چماق کشیدن**": هەڕەشەکردن بە تێلا.

**چماقدار:** تێلابەدەست. هەرکام لە گروپەکانی گوشاری سیاسی و کۆمەلایەتی.

**چماله:** بڕوانە: "مچاله".

**چمان:** کەسێک کە بە لار و لەنجە بڕوا، بەلەنجەولار، بەناز و خەمزە، خرامان، خلنگێن.

**چماندن/ چمانیدن:** لەنجەولار و خەمزە پێکردن، خراماندن، خلنگاندن.

**چمانە:** (چَ) پیاڵەی شەراب. "**چمانە کشیدن**": شەراب نۆشین.

**چمانە:** (چُ) بڕوانە: "جانور".

**چمباتمە(زدن):** هەڵتروشکان، هەڵتروشکێن، هەڵتروشەکان، هەڵتوروشکان، هەڵ توروشکێن، تروشکان، هەڵتووتەکان، هەڵتووتان، هەڵتووترین، تووتەکان، تووتان، قنجکان، قنچکان، قونەڵتس، قونەڵتس دان، گەماڵ فس، قەلەفسک، جنچکان، جنچک، جنچکە، جینچک، جینچکە، چیچکە، چیچڵە، چینچک.

**چمبک زدن:** بڕوانە: "چمباتمە زدن".

**چمچاچ:** چەماو، چەمیو، سەرتووتک، کووڕ، داهاتوو، پشت کووڕ.

**چم چم:** (چَ.چَ) نازونووز، لەنجەولار.

**چم دار:** مانادار، پڕمانا.

**چم داشتن:** بەبرەوبوون. ماناداربوون.

**چمش:** (چَ.مِ) لەنجەولار و هەڵسوکەوت بە ناز و غەمزەوە.

**چمك:** (چَ مَ) هێز، توانایی.

**چم گردش:** ڕەو، سڵەمە. "**چم گردش زدن**": راکردن و دەرچوون، ڕەوکردن.

**چم گرفتن:** سەروسامان گرتن.

**چمگویی:** لۆژیک.

**چمن:** چیمەن، مێرگ، سەوزەلان، سەوزەلانی.





**چمن آرا:** چیمەن (ڕازێن/ ڕازێنەوە)، ڕازێنەرەوەی مێرگ و چیمەن.

**چمن افروز:** گەشێنەری مێرگ و چیمەن، گوڵێك كە لە ناو سەوزەلانی دا جوان و بەرچاو بێ. پۆپەی کەڵەشێر.

**چمن پیرا:** جوانکەر/ خەملێنەری سەوزەلانی، باخەوان.

**چمنده:** بەلەنجەولار، بەنازوخەمزە.

**چمنزار:** چیمەن، مێرگ، سەوزەلان.

**چمن زن:** چیمەن بڕ.

**چمن کاری:** چاندنی چەمەن و ڕازاندنەوەی شوێنێ بە چیمەن.

**چمنی:** سەر بە "چمن"، هەرشتێکی کەسك کە بە ڕەنگی چیمەن بێ.

**چم و آرش:** بڕوانە: "مترادف".

**چم و خم:** 1) پێچاوپێچ، پێچەلاوپێچ. 2) وردەکارییەکانی شتێ یان بابەتێك. 3) فووت و فەن. 4) دژواری، ئالۆزی. 5) ناز و عیشوە. 6) زمان لووسی، ڕیاکاری، ڕووبینی.

**چموش:** توخس، بەیدەس، دێز، دێزە، سەرکێش، سڵ، سرك، تووش، قوشقی، ڕەوەك، چالاغ، شمووز، شەمبووز، شەمووز، ولاغی رام نەبووگ، جووتەهاوێژ و گازگر، ئەسپ یان هێستری جووتە وەشێن، هەرووم.

**چمیدن:** (چَ) ڕۆیشتن بە ناز و غەمزەوە، بە لەنجەولار ڕۆیشتن. جووڵان، ڕێڕۆیشتن. هێرش کردن.

**چمیدن:** (چُ) لاف لێدان، بەخۆداهەڵگوتن.

**چنان:** سووکەڵەی "چونآن"، ئاوها، بەجۆرێك، وەك ئەو، چنو.

**چنانچە:** بەوجۆرەیکە، ئەگەر، ئەگەر بێتوو، هەرکاتێك.

**چنبر:** کەمە، دەوری هەر شتێکی وەك جەغز.

**چنبرزدن:** ئاخڵە، پاپۆکەدان، پاپۆکەخواردنەوە، پەپکە بەستن، ئەڵقەپێکان، ئاڵقەبەستن، چەمبەرە.

**چنبرکردن:** 1) بەشێوەی ئاڵقە دەرهێنان. 2) چەماندنەوە، دانەواندن.

**چنبرمینا:** بریتی لە ئاسمان.

**چنبری:** ئاڵقەیی، بازنەیی. چەماوە، چەمیو.

**چنبك زدن:** بڕوانە: "چمباتمەزدن".

**چنتە:** هەگبە، چەنتك، توورەکە. دەفرایەتی زەینی. "**چیزی در (توی) چنتە داشتن**": بوونی ئاگایی و زانیاری، شتێك بۆ گوتن یان پێشکەش کردن هەبوون.

**چند:** 1) چەن، چەند، چەنێ، چقاس، ژمارە یان ڕادەی نادیار. 2) تاکەی، تا چ کاتێك.

**چندآوا/ چندآوایی:** ئیستریۆ.

**چندان:** هێندە، ئەوەندە، تا ئەو کاتەی. زۆر، فرە. "**دوچندان**": دووقات، دووبەرابەر.

**چندانکە:** هێندەی، ئەوەندەی.

**چندبر:** فرەپاڵوو، چەندپاڵوو.

**چندبعدی:** چەندڕەهەندی.

**چندجانبه:** چەند لایەنە.

**چندچهره:** فرەڕوو، دووڕوو، رووبین.

**چندخدایی:** بڕوا بە بوونی خواگەلی جۆراوجۆر.

**چنددستگی:** چەنددەستەیی، باندبازی، دووبەرەکی، ناکۆکی، ناتەبایی.

**چندرغاز:** بڕوانە:"پشیز".

**چندش:** قێز، بێز، دڵ تێکچوون لە دیتنی شتێك، گریزانك، گڤۆردی، گڤردی، لەرزینی لەپڕ، مچووڕك پێداهاتن.

**چندش‌آور:** بێزهێن، قیزەون، قێزەون.

**چند صدایی:** پولی فۆنی. چەند دەنگی.

**چندضلعی:** بڕوانە: "چندبر".

**چندك:** بڕوانە:"چمباتمه".

**چندگانگی:** جۆراوجۆری، هەمەجۆری، فرەچەشنی.

**چندگانه:** چەندلایەنە، چەندفاقە، جۆراوجۆر، خاوەنی زیاتر لە یەك توخم یان فۆڕم یان چۆنیەتی.

**چندگانه‌گرایی:** بڕوانە:"پلورالیسم".

**چندگاه:** چەن وەخت، ماوەیەك، دەمێك.

**چندگزینه‌ای:** تێستی، چەندبژێرەیی.

**چندمرده:** بەقەرای توانایی چەند پیاو.

**چندمنظوره:** چەن مەبەستە، لەبار بۆ بەکاربردنی جۆراوجۆر.

**چندنوایی:** بڕوانە: "چندصدایی".

**چندوچون:** چۆنیەتی، چلۆنایەتی.

**چندهجایی:** چەند بڕگەیی.

**چندی:** رادە، رادەی زۆری و کەمی، چەندێتی، ماوەیەك، زەمانێك، چەندیٚ. ژمارەیەك. "**چندی و چونی**": چۆنیەتی و چۆنایەتی.

**چندین:** گەلیٚ، گەلێك، فرە، چەندین.

**چنگ آوردن ــــ به:** وەدەست هێنان، پەیاکردن.

**چنگ انداختن:** 1) بە پەنجە یان نینۆك هێرش بردنەسەر شتیٚ یان کەسێك. 2) دەست درێژیکردن یان دزینی شتیٚ. 3) دەست درێژکردن و بەتوندی گرتنی شتێك، چنگەکڕێکردن.

**چنگ برزدن:** دەست درێژیکردن.

**چنگ پشت:** پشت کووڕ، چەماوە.

**چنگ چنگ:** بڕوانە:"مچاله".

**چنگ خوردن:** پێچ خواردن بەهۆی ناڕەحەتی و ژانی زۆر.

**چنگ زدن:** 1) پەنجەلیٚقایم کردن، چنگ گرتن.2) نینۆك یان پەنجە بە کەسێکدا هێنان. 3) بەپەلە دەست بردنەبەرەوە بۆ گرتتن یان رفاندنی شتێك. 4) پەنابردنەبەر. 5) ئامێری چەنگ لێدان.

**چنگ سازکردن:** چەنگ لێدان، چەنگ ژەنین.

**چنگ شدن:** وشك بوونی ئەندامەکانی دەست و پیٚ.

**چنگ کسی افتادن- به:** گرفتار یان یەخسیری ئەو بوون. کەوتنەبەر دەستی ئەو.





**چنگول کشیدن:** بەپەنجە رووشاندن، چڕنووك لێدان.

**چنگ یازیدن:** دەست درێژکردن و گرتنی شتیٚ.

**چنگی به دل زدن:** دڵخواز و سەرنج راکێش بوون.

**چنیدن:** بڕوانە: "چیدن".

**چنین:** سووکەڵەی"چون این"، وەها، ئەمجۆرە، بەم شێوەیە.

**چوب زدن:** 1) بە دار لە کەسێکدان، تێلاکوت. 2) هەڕاجکردن.

**چوافتادن:** بڵاوبوونەوە، دەنگۆداکەوتن.

**چوانداختن:** دەنگۆداخستن، قاوداخستن.

**چوب انداز:** بەگۆترە و بەبیٚ سەرنج دانە نرخی باو یان راستی.

**چوب به کسی چرب کردن:** بریتی لە تەمبیٚ کردنی ئەو یان بەدار لێدانی.

**چوبدار:** چۆدار. قەپاندار.

**چوب شدن:** بوونە چێو. وشك و رەق یان بیٚ جووڵە بوون.

**چوبکاری:** 1) دارکاری، بە دار لێدان، کوتەن، کوتان، کوایش، کوتش. 2) بریتی لە لەڕادەبەدەر دلۆڤانیکردن دەگەڵ کەسێك بە جۆرێك کە شەرمەزار بێتەوە.

**چوب کسی را خوردن:** بە جێی ئەو تەمبیٚکران یان ئازاردران.

**چوبکی:** تەپڵ ژەن، دەهۆڵ ژەن. نۆکەر و ژێردەستی پاسەوانەکان.

**چوبی:** چێکراو لە چێو، دارین.

**چوبین:** دارین، دارینە، هەر شتیٚ لە دار چیٚ کرابیٚ.

**چوخیدن:** 1) هەڵخلیسکان و بەسەرەوە کەوتن. 2) تێکۆشان و بەربەرەکانێکردن.

**چوشیدن:** مژین، هەڵمژین، هەڵمژان، هەڵمشتن.

**چوگان بازی:** گۆبازی، شەقێن، شەکێن.

**چوگان شدن:** داهاتنەوە، چەمینەوە.

**چوله:** لار، چەماو، چەمیو.

**چون:** وەك، وەکوو، بەوێنەی.

**چون و چرا:** 1) باس و دەمەتەقیٚ، گفتوگۆ و پرسیار دەربارەی هۆکاری شتێك یان بابەتێك. 2) پەڵپ و بیانوو.

**چونه:** ئەنگوتك.

**چونه‌کردن:** پڕوشەکردن، کەم کەم خواردن.ئەنگوتك کردن.

**چونی:** بڕوانە: "چگونگی".

**چهارآخر:** بریتی لە چوار توخمی ئاو و ئاگر و با و خاك.

**چهارآخشیج:** بڕوانە: "چهارآخر".

**چهارآیین:** 1) چوار ئایینی رێبازی سوننەت: حەنەفی، مالکی، شافعی، حەنبەلی. 2) خێوەتی گەورەی چوار گۆشە.

**چهار ارکان:** چوار کۆڵەکە، چوار توخم.

**چهاربند:** چوار (بەندە/ جومگە)، هەموو بەندی لەش. و بریتی لە دنیا و چوار توخم (چهارعنصر).

**چهارپا:** چوارپیٚ، چوارپا، ئاژەڵ، زیندەوەری ماڵی جگە لە باڵدار.

**چهارپادار:** بڕوانە: "چاروادار".

**چهارپارە:** 1) چوارلەت، چواربەش. 2) دووکۆپلەیی. 3) جۆرێ فیشەك.

**چهار پهلو:** بڕوانە: "چارپهلو".

**چهارتخت:** چوارناڵە، چوارگاڤی.

**چهارتکبیر زدن:** بریتی لە تەرکی دنیا کردن و لە خۆشییەکانی چاوپۆشی کردن.

**چهارجهت:** چوار ئاراستە، چوار لای سەرەکی کە بریتین لە باکوور، باشوور، خۆرهەلات، خۆرئاوا. و چوار لای لاوەکی کە بریتین لە باکووری خۆرئاوا، باکووری خۆرهەلات، باشووری خۆرئاوا، باشووری خۆرهەلات.

**چهارچوب:** بڕوانە: "چارچوب".

**چهارخانە:** چوارخانە، شەترەنجی. چوارپالوویی. چوارینە، چوارخشتەکی.

**چهار دست و پا:** چوار پەل، خڕمچون، دوو دەست و دوو پێ.

**چهاردیواری:** زەوییەك کە هەر چوار لاکەی دیوار بێ، ماڵ، خانوو.

**چهارراە:** چوار ڕێ، چوار ڕێگان، چوار ڕێیان، جەمسەری دوو ڕێگەی تێك پەڕیو.

**چهارروزە:** تیژتێپەڕ و نابەردەوام.

**چهارزانو نشستن:** چوارمەشقان، چوارمەشقە، چوار مەشقی، چوار چمکە، چوارمێردەکی، پانەوپان ڕۆنیشتن، بە پانەوە ڕۆنیشتن.

**چهارسمت:** چوار لا، ڕووبەڕوو و پشتەوە و لای ڕاست و لای چەپ.

**چهار سو:** 1) چوار ڕێیان، ڕاستە بازاڕ. 2) بریتی لە دنیا. 3) بریتی لە زگ تێر. 4) بڕوانە: "چهارسمت".

**چهارشانە:** چوار شانە، مرۆی زەلام و ئەستوور، مل پان.

**چهارشنبەسوری:** کوڵە چوارشەممۆ، قوڵە چوارشەمۆ، دوایین چوارشەممەی ساڵ.

**چهارضربەزدن:** لە چەندجێ یان چەند کەس بەهرەمەندبوون و قازانج وەرگرتن.

**چهارطاق:** هەیوانە بەرزە.

**چهارطبع:** 1) لە زاراوەی پێشینیاندا: گەرمی، ساردی، وشکی، تەڕی. 2) بڕوانە: "چهارعنصر".

**چهارعمل اصلی:** لە زاراوەی زانستی بیرکاریدا بریتییە لە کۆ. کەمکردنەوە. جاران. دابەشکردن.

**چهارعنصر:** بڕوانە: " چهارآخشیج".

**چهار فصل:** چوار وەرزی ساڵ بریتی لە بەهار و هاوین و پاییز و زستان، تەواوی ساڵ.

**چهار قاچ کردن:** چوار قاشکردن.

**چهارگامە:** ئەسپی خۆشبەز، ئەسپی چەلەك.

**چهارگان:** چواردانە یان چواردانەچواردانە.

**چهارگاە:** چوارگا، هەوایەکی گۆرانی‌یە، مەقامێکە.

**چهارگوشە:** چوارسووچ، چوارقولینچك، چوارگۆشە، چوار چمك.

**چهارگوهر:** بڕوانە: "چهارعنصر".





**چهارمادر:** بڕوانە: "چهارعنصر".

**چهارموج:** تۆفانی توندی دەریا، گەرداو، گێژاو، قۆناغی مەترسیدار.

**چهارمیخ:** چوارمێخە، چوارنیخە، هەرچوار پەل هەڵواسراو. "**چهار میخە کردن**": بریتی لە لەڕادەبەدەر کارقایمیکردن.

**چهارنعل:** چوارناڵە، چوارناڵ، چوارگاڤی، ئەسپ لینگ دانی توند، بریتی لە پەلە و خێرایی لە ڕاکردن دا.

**چهار هنگام:** 1) بڕوانە: "چهار فصل".

**چهاریار:** چوار یار، چوار جێنشینی پێغەمبەر.

**چهاریك:** چواریەك، لە چوار پاژ پاژێك.

**چهر/ چهرە:** 1) دەم و چاو، دەم و لووت، چڕوچاو، ڕوو، ڕوچك، ڕووك، ڕوخسار، دەفك، ڕواڵەت. 2) کەسایەتی. "**چهرە برافروختن**": جوانکردنی ڕوخسار.

**چهرەای:** چێرەیی، پەمەیی.

**چهرە پرداز:** نیگارکێش، شێوەکار، وێنەگر. گریمکار. "**چهرەپردازی**": گریم.

**چهرەخوانی:** خوێندنەوەی دەم و چاو.

**چهرەشدن:** بوونە کەسایەتی، ناودەرکردن.

**چهرەشناختی:** ڕوخسارناسانە.

**چهرەشناسی:** ڕوخسارناسی.

**چهرەسازی:** نیگارکێشی، شێوەکاری. جوان کردنی ڕوخسار.

**چهرەکردن:** 1) ئاشکرابوون. 2) بڕوانە: "جلوەکردن".

**چهرەگشایی:** وێنەکێشانەوە، نیگارکێشی.

**چهرە نشان دادن:** خۆدەرخستن، ئاشکرابوون.

**چیدن:** 1) چنین، تەنین. 2) ڕنینی بەری دار، ڕنینەوە، لێکردنەوە، چنینەوە، دروێنەکردن. 3) هەڵبژاردن و جیاکردنەوەی شتێك لە ناو شتەکانی دی دا، بژار کردن. 4) لەسەر یەك دانان، لەتەنیشت یەك دانان. 5) دان هەڵگرتنەوەی پەلەوەر لە سەر زەوی. 6) نینۆك کردن، هەڵپاچین، موو کورت کردنەوە. 7) ئامادەکردن، ڕێکخستن. 8) کۆتایی هێنان بە شتێ. 9) پیت چنی کردن. 10) لەناوبردن. "**برهم چیدن**": کۆکردنەوە، لەسەر یەك کەڵەکەکردن.

**چیرگی:** زاڵی، زاڵبوون، زاڵێتی، سەرکەوتوویی، دلێری. "**چیرگی کردن**": سەرکەوتن، زاڵبوون.

**چیرە:** زاڵ، سەرکەوتوو، دەسەلاتدار، دەست بە سەر دا ڕۆیشتوو.

**چیرەدست:** دەست ڕەنگین و چازان، هونەرمەند، بە هونەر، تەڕدەس، لێهاتوو، کارامە.

**چیرەشدن:** زاڵبوون، دەست بە سەردا ڕۆیشتن، سەرکەوتن.

**چیز:** هەر شتێکی بێگیان، شت، تشت، ششت، چشت.

**چیزخواندە:** خوێندەوار، خۆندەوان.

**چیزخور:** بڕوانە: "مسموم".

**چیزدار:** خاوەن سامان.

**چیزشدن:** متمانە پەیاکردن، گرینگ بوون.

**چیزفهم:** فامیدە، تێگەیشتوو، زانا.

**چیزك:** شتی کەم یان کەم نرخ. بابەتی گچکە، مەسەلەی بەهێندنەگیر.

**چیستان:** پەردەك، پەردەکە، چمام، چمامك، مامك، مەتەڵ، مەتەڵە، مەتەڵۆك، مەتەڵۆکە، لیچار، لەگەز، فیشاردە، قەوسەل، تشتانۆك، شتیکانێ.

**چیستی:** چییەتی، ناوەرۆك.

**چین:** توێ، لا، قەد، لۆچ، چرچ، لۆغ، چین. وڵاتی چین.

**چین افتادن:** چین تێکەوتن، چرچ و لۆچ تێکەوتن.

**چین چینی:** توێدار، چیندار.

**چین خوردگی:** چرچ هەڵگەڕان، هەڵقرچان، قرچان، قرمچ. لە زاراوەی زەوی ناسیدا: ئەو ناڕێکی و بەرز و نزمییانەی کە بە هۆی پاڵەپەستۆ و گۆڕانی سروشتی لە سەر زەوی پێك دێ.

**چین خوردن:** چرچ و لۆچ تێکەوتن، هەڵچرچان، ترنجان، قرمچین. بۆمانای زیاتر بڕوانە: "چروکیدن".

**چین دادن:** تاکردن و شکاندنەوەی پارچە.

**چین و چروك:** چرچ و لۆچ، چرچ، گنج، قرمچی، پۆت، هەڵقرچان، توێ لە سەر توێ، خوز.

**چینه:** لا، توێ، چین، قەد.

**چین و شکن:** لا لە سەر لا، خوز، چین.

**چینەشناسی:** ناسینی چینەکانی زەوی، زانستێك کە سەبارەت بە چۆنیەتی پێکهاتنی چینەکانی زەوی دەدوێ.

**چینی جا:** بووفە.



**خائب:** بێهیوا، ناهومێد، بێبەش.

**خائف:** ترساو، ترس هێنەر، ترسێنەر.

**خائن:** خاین، خەیان، خەیانەتکار، غەیان، بڕیارشکێن، پەیمان شکێن، ناپاك، دوخمان، بە ڕواڵەت دۆستی ناڕاست.

**خائنانە:** خاینانە، خەیانەتکارانە، بە شێوازی خەیانەتکاران.

**خابر:** پیاوی ئاگا، خاوەن زانیاری و ئاگایی.

**خابز:** خاوەن نان.

**خابط:** بە لاڕێداچوو، کەسێك کە بە بێ ئاگایی کارێك بکا یان بە لاڕێدا بڕوا.

**خاتل:** بڕوانە: "حیلەگر".

**خاتم:** 1) تەواوکەر، کۆتاییهێن، دووابیهێن. 2) کۆتا، دوایین. 3) مۆر، ئەنگوستێلە، کلکەوانە.

**خاتم الانبیاء:** پێغەمبەری ئیسلام.

**خاتمە:** دوایی، کۆتایی، ئاکام.

**خاتمەدادن:** کۆتایی پێهێنان، دوایی پێهێنان، داویدان.

**خاتمەیافتن:** دواییهاتن، کۆتایی هاتن، تەواوبوون، بڕانەوە، بن دە ئاو دا نەبوون، پسانەوە.

**خاتمی:** مۆرساز، ئەنگوستیلەساز.

**خاتولە:** مەکر، فریو، فێڵ، کەڵەك، گەڕ، دهۆ.

**خاتون:** خاتوو، کەیبانوو، وشەی ڕێز بۆ ژنان.

**خاتون جهان:** بریتی لە خۆر. "خاتون صبح" و "خاتون فلك" و "خاتون یغما"ش هەر بەم مانایەن.

**خاج:** بڕوانە: "خاچ".

**خاخام/ حاخام:** ناونیشانی زانایان و پێشەوایانی ئایینی یەهوود، ماناکەی دەگەڵ مانای وشەی "حکیم"ی عەرەبی یەك دەگرێتەوە.

**خادر:** سست، لەش گران، سەرسوڕماو، سەرگەردان.

**خادع:** خەڵەتێن، خاپێن، فریبۆك، دووڕوو.

**خادم:** خزمەتکار، خزمەتچی، خزمەتگوزار، نۆکەر. ملکەچ، فەرمانبەر. لاوێ کە بۆ کار لە حەرەمسەرا دا یەختە دەکرا. "**خادم مسجد**": مجێور، مجەور، مچەور.

**خادم کردن:** خەساندن، یەختەکردن.





**خادم باشی:** سەردەستەی خزمەتکاران.

**خادمە:** مێینەی"خادم"، خزمەتکاری ژن، کڵفەت، قەرەواش.

**خادمێت:** خزمەتکاری، خزمەتگوزاری، نۆکەری.

**خاذل:** شکست خواردوو.

**خارا:** 1) خارا، راهاتوو، ئامادەبوو، لەکاردەرهاتوو. 2) جۆرێك بەردی رەقە، گرانیت. 3) جۆرێك پارچەی بەنرخ.

**خاراستیز:** قایم، پتەو، رەق.

**خاراسفتن:** شکاندن یان ساوین یان کون کردنی بەردی گرانیت.

**خاراشکن:** شکێنەری بەردی گرانیت.

**خاراگذار:** تێپەڕ لە بەردی گرانیتەوە.

**خاراندن/ خارانیدن:** خوراندن، خورانن، کلاشتە، کەندش، بە نینۆك کراندنی پێست، هەڵ کران، هەڵ کراندن.

**خارا نما:** وەك گرانیت"گرانی توئید".

**خارایی:** لە چەشنی بەردی گرانیت "گرانیتیك".

**خاربست:** بڕوانە: "پرچین".

**خارپا:** بڕوانە:"مزاحم".

**خار پیراهن بودن:** بریتی لە مایەی ئازار بوون.

**خارج:** 1) دەرەوە، دەرێ، هەندەران. 2) رووکەشی شتێك. 3) بێ ئاگا، ناشی. "**خارج از حد**": لە رادە بەدەر، زیاتر لە رادەی باو و پێویست.

**خارج‌آهنگ:** ریتمی ناساز، ناهاوئاهەنگ، نەشاز.

**خارج شدن:** هاتنە دەر، دەرهاتن، دەرچوون.

**خارج قسمت:** بەرکەوت، ئەنجامی دابەشکردن.

**خارج کردن:** دەرهێنان، دەرهاوردن، دەرانین.

**خارجە:** مێینەی"خارج"، دەرەوە، دەرڤە، هەندەران. لە دەرەوە چێکراو. دەرەکی، بێگانە.

**خارجی:** بیانی، بێگانە، غەوارە، دەرەکی، دەرەکە، لاوەکی، خەڵکی هەندەران. لە دەرەوە سازکراو. بابەتی. "**خارجی کردن**": لە سنوور تێپەڕاندن.

**خارچین:** بڕوانە: "خاربست".

**خارخار:** خورووژن، دروخە، دروخیان، وەخورووهاتنی گش لەش، خوروی لەش، سووتانەوەی پێست، دڵەکوتێ و نیگەرانی کە لە ئینتما یان مەیل و ئیشتیا چوونە سەر شتێك لە مرۆڤ دا پەیدا دەبێ. کەڵکەڵە.

**خارخوردن:** سەختی و نارەحەتی کێشان.

**خاردار:** دڕکین، دڕکینە، دڕکاوی، جێگەی بە درووو، چقڵاوی.

**خارداران:** بوونەوەرە دڕکاوییەکان.

**خار در پهلو نهادن:** رەنج و سەختی کێشان.

**خارزار:** بڕوانە: "خارستان".

**خارستان/ خارسان:** دڕکەجاڕ، جێگەی دروان، شوێنی پڕ چقڵ.

**خارش:** خرو، خورەك، خورين، ئالۆش، كەندش، ووڕ، وڕنايش، خارش، خارشت.

**خارش كردن:** بڕوانە: "خاريدن".

**خارش گلو:** دروخان، خورووى گەروو.

**خارق:** كونكەر،درز تێكەر، دڕێنەر. پەرجۆ. ئەوەى بەپێچەوانەى رەوتى سروشتى و ئاسايى كاروبارەكانە.

**خارق العادە:** پەرجۆ، كەرامات، نائاسايى، سەرئاسايى، لە رادەبەدەر، شتى سەرسوڕهێنەر و پێچەوانەى عادەت.

**خارمند:** دڕواوى، سووك، بێ بايەخ.

**خارناك:** دڕكاوى، پڕ چقڵ و دڕوو.

**خارور:** بڕوانە: "خاردار".

**خاريدن:** خوران، وەخروكەوتنى لەش، وەخرووهاتن، ڤەخوران، ئالۆش لێ پەيدابوون، بە خارشت بوون، وڕايش، وراى.

**خازن:** 1) پاشكەوتكەر، پارێزەرى ماڵى پاشكەوت، خەزێنەدار، گەنجينەوان. 2)ئامرازێكە لە ناو دەزگا كارەباييەكاندا.

**خازە:** پەسا، پێ خوێ، ئەو قوڕەى بۆ سواغ گيراوەتەوە.

**خاستگاە:** ئاخێزگە، لانكە، زێد، سەرچاوە، شوێنى هەستان و جووڵان.

**خاستن:** 1) هەستان، رابوون، هاتنە سەر پێ. 2) وەديهاتن، هاتنەدى، دەركەوتن. 3) روان، شينبوون، سەوزبوون. 4) پەروەردەبوون. 5) بەرهەمهاتن. 6) هەناردران.

**خاستە:** باڵاكردوو، گەورەبوو.هەڵتۆقيو و ماسيو.

**خاسر:** زيان ديتوو، زيان پێگەيشتوو، دۆڕاو.

**خاشاك:** پووش، پووشكە، پەڵاش، وشكەگيا، چيلكە، چڕ.

**خاشع:** ملكەچ و بێفيز.لە خواترس.

**خاصّ:** تايبەت، بژاردە، بێ هاوتا، دانسقە. "**خاص و عام**": گشت خەڵكى لە كەسانى هەڵكەوتە و ئاسايى.

**خاص كردن:** لەسەرتردانان. زەوت كردن، تاپۆكردن.

**خاصگى:** 1) خەزێنەدار. 2) كيژۆڵەى جوان. 3) هەر شتێكى بەنرخ. 4) تايبەتى سوڵتان يان راژۆر.

**خاصّە:** بەتايبەتى، تايبەتى. بەڕمێن، رووبازاڕى. هەڵبژێراو و لەسەرتر. "**خاصە و خرجى**": 1) بڕوانە: "تبعيض". 2) ئەوەى تايبەت بە پاشايە و ئەوەى ئاسايى و گشتىيە. 3) چاك و خراو.

**خاصيّات:** كۆى "خاصيّت".

**خاصيّت:** تايبەتمەندييەتى، رەوشى تايبەت. خسڵەت، خوو، سروشت. قازانج، كاريگەرى. "**خاصيت ارتجاعى**": "ئێلاستيسيتێ". "**خاصيت انجمنى**": بڕوانە: "شركت پذيرى". "**خاصيت دادن**": فايدەدان، كاريگەرى. "**خاصيت داشتن**": كاريگەربوون، شوێنەواردانان. هەبوونى تايبەتمەندى.





**خاضع:** بێ فيز، بێ دەمار، خۆكەمگر، خۆشكێن، خاكەڕا، خۆبەزل نەزان.

**خاطئە:** هەڵەكار، تاوانبار.

**خاطب:** 1) وتار بێژ. 2) خوازبێنى كەر. 3) خوازيار.

**خاطر:** خاتر، بير، ياد، زەين، دڵ، ناخ. لەبەر. ئيرادە، مەيل، ويست. "**خاطر از كسى برداشتن**": لە بيرى ئەو دەرهاتن. "**در خاطر كسى بودن**": لە بيرى ئەو دابوون. "**خاطر كسى جمع بودن**": خاترجەم بوونى ئەو. "**خاطر كسى را خواستن**": ئەو خۆشويستن. "**بە خاطرِ**": لەبەر، بۆ. بەهۆى. "**بە خاطر سپردن**": خستنە مێشكەوە، لە زەين راگرتن. "**بە خاطر كسى رسيدن**": بە زەينى ئەو گەيشتن، كەوتنەوە بيرى. "**بە خاطر ماندن**": لەبيرمان.

**خاطرافروز:** شادى هێن، رووناك كەرەوەى "خاطر".

**خاطر پذير:** دڵگر، دڵ پەسند، راكێشەر.

**خاطر پريش:** 1) مەلوول كەر، ئەوەى كە دەبێتە هۆى شێواندنى بير. 2) پەشێو، شپرزە، بير بڵاو.

**خاطر پسند:** بڕوانە: " خاطر پذير".

**خاطرجمع:** خاترجەم، دڵنيا، ئەرخەيان، دڵ ئاسوودە، بێ نيگەرانى، پشت ئەستوور، دل بجى، دل هێسا.

**خاطرجمعى:** خاترجەمى، دڵنيايى، ئەرخەيانى.

**خاطرخواە:** ئەويندار، گراو، ئاشق، لايەنگر. دڵخواز، لەبەردڵ.

**خاطرداشت:** لايەنگرى، پشتيوانى، داژدارى، ئاگالێبوون.

**خاطرفريب:** دڵڕفێن، دڵبەر.

**خاطرگرفتن:** دڵ راگرتن، تووڕەنەكردن، رێز لێنان.

**خاطرنشان:** دەست نيشان كردن، وەبير هێنانەوە، بە گوێ هەڵێنان.

**خاطرنواز:** دڵكڕ، دڵڕفێن، دڵ لاوێن.

**خاطرە:** بيرەوەرى، يادەوەرى، هاتە.

**خاطرەانگيز:** وەبيرخەرەوەى بيرەوەرييەكانى رابردوو. ئەوەى لە زەين و بير دا دەمێنێتەوە.

**خاطرەزدايى:** يادەوەرى سڕينەوە.

**خاطرە ستيز:** دژەبيرەوەرى، دژە ياد.

**خاطل:** پووچ و بێهوودە، ئاخاوتەى بێ مانا و هيچ و پووچ.

**خاطى:** هەڵەكار، تاوانكار.

**خافق:** بزۆك، جووڵەكەر.

**خاك:** خاك، خۆڵ، ئاخ، گڵ. بەماناى وڵات و سەرزەويش دێ. زەوى كشتوكاڵ. گۆڕ، قەبر. خاكە، تۆز. بێ نرخ، سووك، پەست. "**خاك جايى را بە توبرە كشيدن**": خاك بە توورەكە كێشان: واتە وێران كردن، خاپووركردن. "**خاك جايى را خوردن**": بريتى لە مانەوەى زۆر لە شوێنێك و ئەزموون فێربوون لەو شوێنە. "**با خاك يكسان شدن**": وێران بوون، تەفروتوونابوون. هەڵوەشان وەك خۆڵ لێهاتن. "**بە خاك افتادن**": سوژدەكردن. شكست خواردن، كوژران. "**بە خاك سپردن**": بە خاك سپاردن، ناشتن. "**بە(بر خاك سياە نشاندن (انداختن)**": بێچارە و بەدبەختكردن. "**سر خاك**": تەنيشت گۆڕ. "**سر خاك رفتن**": سەردانى گۆڕ كردن.

**خاك آلود:** خۆڵاوی، خاکاوی، تۆزاوی، هەڕێن، هەڕن.
**خاك انداز:** 1) خاکەناز، پێمەڕە، بێڵاسن. 2) بڕوانە: "خاکریز".
**خاك بازی:** خۆڵەپەتانێ، گاڵتە بە خۆڵ کردن، گەمەکردنی منالان بە خۆڵ.
**خاك بر سر ریختن:** بریتی لە چارەدۆزی کردن، بیری ڕێگەچارە کردن. خۆڵ بەسەردا کردن.
**خاك بر سرشدن:** بەدبەخت بوون، داماوبوون، کلۆڵ بوون، بێچارەبوون، زەلیل بوون، لە ڕێز و متمانە کەوتن.
**خاك روبی:** خاکەڕۆ، خاکەڕۆك، خاك هەڵگرتن.
**خاکریز:** خاکرێز، بە خۆڵ قووڵکە پڕ کردنەوە.
**خاك زاد:** ئەوەی کە لە خاك وەدیهاتبێ، مرۆڤ کە لە خاك ئافرێنراوە.
**خاکزی:** بوونەوەرێ کە لە وشکی دا دەژی، بوونەوەری خاکی.
**خاکسار:** وەك خاك، بۆرەلۆوکە، خاکی. بریتی لە خاکەسەر، بەلەنگاز، هەژار، بێچارە، زەلیل، بێفیز، خۆبەزل نەزان، خۆشکێن. خۆڵاوی، تۆزاوی.
**خاکساری:** خاکەساری، بەلەنگازی، کلۆڵی، بێفیزی، خۆبەزل نەزانین.
**خاکسان:** وەك خاك، بە ڕەنگی خۆڵ، زەلیل.

**خاکستر:** خۆڵەکەوە، خۆڵەمڕ، خۆڵەمڕە، خۆڵەمشکی، خۆڵەمێش، خالەکوان، خاك ری، خاکەری، خاکسەر، خۆلی، بوڵ، بوڕ. **"خاکستر شدن"**: بوونە خۆڵەمێش. **"به خاکستر سیاه نشاندن"**: بێچارە و بەدبەخت کردن.
**خاکسترگون:** بە ڕەنگی خۆڵەمێش، خۆڵەمێشی.
**خاکسترنشین:** نەدار، هەژار، بێ ماڵ و حاڵ، ڕۆژ ڕەش، بەدبەخت.
**خاکستری:** بۆر، ڕەنگی خۆڵەمێشی، بە ڕەنگی خۆڵە کەوە، کەورەك. خۆڵەمێش بوون یان بوونە خۆڵەمێش.
**خاك سیاه نشاندن ـــ به:** بەدبەخت و بێچارەکردن.
**خاك شدن:** 1) بوونە خۆڵ. 2) لە ناوچوون. 3) نێژران، بە خاك سپێردران.
**خاك شناس:** خاکناس، کەسێك کە جۆری خاکەکان بناسێ و تایبەتمەندی زەویە جۆراوجۆرەکان بۆ چاندن و زەرعات دیاری بکا.
**خاکشوری:** شۆردنەوەی خاك، وەرزێری، جووتێری.
**خاکشیر مزاج:** بریتی لە خاوەنی تەبعی سازگار.
**خاك کردن:** 1) ناشتن، خستنە ژێر خاك. 2) (لە زۆرەبانیدا) بە زەوی دادانی غەنیم. 3) لەناوبردن.
**خاکمال:** دە خۆڵ ساوراو، لە خۆڵ دا گەوزاو. و بریتی لە زەلیل و داماو.





**خاك نشین:** 1) کەسێك کە لە سەر خاکوخۆڵ دابنیشێ. 2) بڕوانە: "خاکسار". 3) دانیشتووی گۆی زەوی. 4) نێژراو لە ژێر زەویدا.
**خاك نهاد:** خاکەڕا، خاکی، بێفیز.
**خاکی:** 1) بەڕەنگی خۆڵ، بۆرەلۆوکە، خاکاوی. 2) لە جنسی خاك، چێکراو لە خاك. 3) خاکی، بریتی لە مرۆڤی بێفیز و خۆ بە زل نەزان. 4) دانیشتووی گۆی زەوی. 5) دەپێوەندی لەگەڵ وشکیدا، خاکی. 6) بە ڕەنگی خاکی. 7) پەست، داماو، بێ نرخ.
**خاکین:** سەر بە خاك، خاکی، خاکاوی، خۆڵاوی.
**خال:** خاڵ، نوختەی سەر پێست. **"توی خال زدن"**: لە ناوەڕاستی نیشانەدان. بە راشکاوی ئاماژەکردن بە مەبەستی سەرەکی.
**خال خال:** خاڵ خاڵ، پەڵەپەڵە، زۆر پەڵاوی.
**خال خالی:** بڕوانە:"خالدار".
**خالب:** پیاوی خاپێن، زمان لووس.
**خالد:** نەمر، پایەدار، بەردەوام.
**خالدار:** خاڵدار، خاڵ خاڵ، شڵە، دوپڵ، کەڤەز، چیل چیل، بەڵەك و پنۆك پنۆك، کەسێ یان گیانلەبەرێك کە پەڵەی زۆری بە پێستەوە بێ.
**خال زدن:** بڕوانە: "خالکوبی".
**خالص:** پوخت، پوختەکراو، پاڵاوتە، ناتێکەڵاو، بێخەوش، بێگەرد، بێ زەدە، فەتات، پەتی، رووت، خاوێن، پاك، ساف، روون، ناب. لە ناخی دڵەوە هەڵقوڵیو.
**خالصانه:** سادقانە، سادەدڵانە، بێ گەردانە.
**خالع:** ژنێ کە بە دانی ماڵ جیا بووبێتەوە.
**خالق:** خولقێنەر، داهێنەر، رسکێنەر، بەدیهێنەر، ڤەدان دەر. یەکێك لە ناوەکانی خودا.
**خالکوب:** خاڵکوت، کەسێك کە خاڵی دەستکرد لە سەر پێست نەخش دەکا.
**خالکوبی:** خاڵکوتان، کوتاندن، کوتتین، دەقاق، دەقدان، کاری خاڵکوت.
**خالگر:** چێشت کەر، چێشت لێنەر، شیوکەر، ئاشپەز.
**خال مخالی:** بڕوانە:"خالدار".
**خالناك:** بڕوانە: "خالدار".
**خالی:** بەتاڵ، والا، بێ ناوك، بێ ناوەڕۆك، خاڵی. خەڵوەت. تاق و تەنیا، سەڵت. رووت، پەتی(تعارف خالی). **"برای خالی نبودن عریضه"**: بۆ پاراستنی رواڵەت.
**خالی الذهن:** بێ ئاگا لە هەواڵ یان بابەتێکی تایبەتی.
**خالی السکنه:** چۆڵ و هۆڵ، چۆڵی، چۆڵیەتی، شوێنی کەس لێنا.
**خالی السیر:** تەنیاڕۆ، کەسێك کە بە تاقی تەنیا بەرەو لایەك بچێ.
**خالی بستن:** درۆکردن.
**خالی بندی:** خۆهەڵکێشانی بێمانا، تڕوتۆپ کردن، خۆهەڵتڕاندن.

**خالی شدن:** 1) بەتاڵ بوون، خاڵیبوون. 2) تەنیابوون. 3) دوورکەوتنەوە.

**خالی کردن:** 1) بەتاڵ کردن، خاڵیکردن. 2) چۆڵکردن، خەڵوەت کردن. 3) دزین و بردن. 4) تەقەکردن، تیرهاویشتن.

**خالیە:** مێینەی"خالی"، ژنی بێکار. بە مانای رابردووش دێ.

**خام:** کاڵ، ناکامڵ، نەگەیو، نەگەیشتوو، فەریك، خاو، خاگ، خام. نەڕێسراو. نەکوڵیاو، نەکوڵاو. بێئەزموون، ساویلکە، ساکار.پووچ، بێهوودە(خیال خام). نەشۆردراو، ئاووێنەکەوتوو. خۆشنەکراو، دەهەڵاڵ نەکراو. شەڕاب. جلکی چەرمی.

**خام اندیش:** ئەوەی کە بیرۆکەی کاڵ و ساکاری هەیە، بیر ساویلکە، فەریکە بیر.

**خام جوش:** 1) نەکوڵاو. 2) پیاگی بێ ئەزموون.

**خامد:** بێ دەنگ، بێجووڵە، کپ، دامرکاو.

**خام درایی:** بڕوانە: "یاوەسرایی".

**خام دست:** تازەکار، ناشی، کەم ئەزموون، کەسێك کە لە کارەکەی دا بەدەست و برد و چالاك نەبێ.

**خام رأی:** بیرخاو، بیر و ئاوەز نادروست.

**خام ریش:** بڕوانە: "احمق".

**خامس:** پێنجەم.

**خام سر:** کەسێك کە بیرۆکەی بێهوودە و پڕوپووچی لە سەر دایە.

**خامش:** سووکەڵەی"خاموش".

**خام شدن:** خافڵ بوون، خڵەفان، خڵافان، خەڵەتان، فریوخواردن. "**خام شدن کار**": بەرەو دژواری و قەیراناوی چوون.

**خام طبع:** کەسێك کە بیرۆکەی پووچ و بێهوودەی هەبێ، گەمژە، گەوج، نەفام.کامڵ نەبوو و کەمووکووڕیدار.

**خام طمع:** بە تەماح، تەماحکار.

**خامکار:** بێ ئەزموون، تازەکار، کەسێك کە لە کاری خۆیدا لێهاتوو و شارەزا نەبێ.

**خامکاری:** بێ ئەزموونی، بێ ئاگایی.

**خام کردن:** فریودان، هەڵخەڵەتاندن.

**خام گیاەخوار:** خۆتێرکەر لە گیا فەریکەکان.

**خامل:** گوم ناو، ون، بێ ناو و نیشان. پەست، بێ رێز. شل و پل.

**خامن:** گوم ناو، ون، بێرێز، شاراوە، نادیار.

**خام نوش:** کەسێك کە شەڕابی تازە و نەگەیو بخواتەوە.

**خاموش:** مات، بێ دەنگ، لاڵوپاڵ، ئارام، کپ، بێ هات و هاوار، کڕ، قڕوقەپ. کووژاوە، دامرکاو، تەمری. مردوو.

**خاموش سار:** بێ دەنگ ئاسا، بێ جووڵەو دەنگ، بێ هەست و خوست، بێ گوڕەوهەرا.

**خاموش شدن:** 1) بێ دەنگ بوون، کپ بوون، قسەنەکردن، دەم دادروون، دەمکوت بوون، دەم گرتن، دەم لێکنان، دەم هاتن بەیەکا، متەق لێوەنەهاتن، کڕبوون، مات بوون. 1) کووژانەوە، کووژیانەوە، تەمران، ڤەتەمران، ڤەتەمرین، ڤەتەمریان، ڤەمران، دامران، دامرکانی ئاگر، دامرکانەوە، کۆرەوەبوون.

**خاموشکاری:** بێدەنگی، کپی، ماتی.

**خاموش کردن:** 1) بێ دەنگ کردن، لەدەنگ خستن، کپ کردن، متکرن. 2) کووژاندنەوە، کووژاننەوە، کووژاندنەڤە، داکووژاندن، تەمراندنی ئاگر، دامرکاندنەوە، ڤەتەمراندن، ڤەمراندن. 3) بڕینی جەریانی برق.

**خاموشی:** بێدەنگی، ماتی، نەئاخاوتن، قسەنەکردن، قڕوقەپ بوون، ماتی، سەنتە. بڕینی برقی تەواو یان بەشێك لە شار. کووژاندنەوەی گڵۆپەکان.

**خاموشیدن:** بڕوانە: "خاموش شدن".

**خامە:** 1) هەوریشمی خاو یان نەڕێسراو. 2) قەڵەم قامیش، بنووس، پێنووس. 3) سەرتوێ، سەرشیر. 4) کۆ، کۆگا، کۆما. "**خامەدوزی**": گوڵدۆزی کردن بە هەورێشم.

**خامەزن:** نووسەر.

**خامیاز:** بڕوانە: "خمیازە".

**خان:** 1) ماڵ، خانوو. 2) کواڕ، خەڵێفەمێش. 3) دووکان، مەیخانە، کاروانسەرا. 4) شوێن شوێنی ناو لوولەی تفەنگ. 4) سەرۆك، میر، سەرەك هۆز، نازناوی دەسەڵاتداران."**خان خانان**": میریمیران، پاشای چین.

**خانخانی:** خان خانەکێ، دەرەبەگی، خانخانی، حکوومەت کردنی سەرهۆزان، وڵاتی بێ دەوڵەت و بەر حوکمی خان و ئاغایان.

**خان خردە:** بڕوانە:"خردەمالك".

**خاندان:** گەورەماڵ، ماڵەگەورە، بەرەماڵ، جاماڵ، بنەماڵە، خانەدان.

**خانسالار:** سەردەستە و گەورەی جووتیارانی ئاواییەك.

**خانق:** خنکێن، خنکێنەر، رێگەی تەنگەبەر، کۆڵانی تەسك.

**خانقاە:** خانەقا، سۆفیگە، دەروێش دان، شوێنی کۆبوونەوەی دەروێشان، تەکیە.

**خانگی:** خانەکی، ماڵی، کەدی. ماڵەوە، بنەماڵەیی، ناوخۆیی. ئەندامی بنەماڵە. لە ماڵەوە و دوور لە چاوی نامەحرەم.

**خانم:** خاتوو، خانم، وشەی رێز بۆ ژن. کەیبانوو. ژن، کچ. هاوسەر، ژن. سۆزانی.

**خانمان:** خانوو، شوێنی ژیان، ئەندامانی بنەماڵە، ژن و منداڵ، کەلوپەلی ژیان. "**بی خانمان**": لانەواز، عەڤدال، بەلەنگاز، ئاوارە، کۆکم، بێئەنواو دەربەدەر، لێقەوماو.

**خانمان برانداز:** کاولکەر و لەناوبەری "خانمان"،ماڵوێرانکەر.

**خانمانسوز:** ماڵوێرانکەر، شتێك کە ببێتە هۆی لە ناوچوونی ماڵ و بنەماڵە.

**خانمانە:** بەشێوەی خانمان.

**خانم رئیس:** سەرپەرستی ژنانی سۆزانی لە قاحبەخانە.

**خانم والدە:** دایك.

**خانمی:** خانم بوون، قورس و ماقووڵ بوون. گەورەیی. خانمی خۆشەویست و لەبەردڵان. "**خانمی کردن**": گەورەییکردن.

**خانوادگی:** سەر بە "خـانوادە"، خێزانی، بنەماڵەیی. "**نام خانوادگی**": ناوبانگ.

**خـانوادە:** بنەماڵـە، ماڵبـات، خـاووخێزان، خانەدان، ئەندامانی بنەماڵـە، ژن و منـاڵ، زاروزێچ، زاڤـ و زیچ، زاڤـ و زێـچ، فامیـل. "**خـانوادە غـیر هـستەای**": (کۆمەڵناسـی) بنەماڵەیـەك کـە جیـا لـە دایـك و بـاوك و مناڵـەکانیان ئەنـدامێکی تـری بنەماڵـەش وەك دایەگـەورەیان لـە تـەك دا بـژی. "**خـانوادە هـستەای**": (کۆمەڵناسـی): بنەماڵەیـەك بریتـی لـە دایـك و بـاوك و مناڵـەکانیان کـە پێکـەوە لـە شـوێنێك دا دەژیـن. "**رئـیس خـانوادە**": سـەرگەورە، سەرگەڤار، سەرگەڤاز.

**خـانوار:** کـۆی ئەنـدامانی بنەماڵەیـەك، تاکـەکانی بنەماڵەیـەك بریتـی لـە بـاوك و دایك و مناڵەکانیان.

**خان و مان:** ماڵ و ئەندامانی ماڵـەوە، ژن و منداڵ، ماڵ و کەلوپەلی ناوماڵ، بنەماڵە.

**خانە:** خـانگ، خـانوو، خـانی، مـاڵ، جـێ ژیانی خێزان. ناوەند یان دەزگا. شوێنی جێگرتن. "**خانە بـزرگ**": خانووبـەرە. "**بـە خانە بخت رفتن**": شووکردن.

**خانەبدوش:** لانەواز، ماڵ بەکۆڵ، بێمـاڵ و حـاڵ، ئـاوارە، رەبـەن، عەبـدال، عەبدال، عەڤـدال، عـەودال، قەلەنـدەر، ریتـاڵ، ریتاڵە.

**خانەبر:** دز.

**خانـە بـر آب سـاختن:** بریتـی لـە کـاری بێهوودەکردن. کاری محاڵ کردن.

**خانەبرانداز:** رووخێنەری مـاڵ و بنەماڵـە، لەناوبـەری خانـەدان، وێرانکـەر، خاپوورکەر.

**خانەبریدن:** دزیکردن.

**خانە بیزار:** وەڕەز لـە مـاڵ/ وەڕەزەمـاڵ، ئۆقرەنەگر لە ماڵەوە.

**خانە پرداز:** کەسێك کـە گـشت کەلوپـەلی ماڵەکـەی بـە بـادا بـدا. تـەرك کـەری بەستراوەییەکانی دنیا.

**خانـە پرور:** کەسـێك کـە لـە ماڵـەوە پەروەردەکرابێ و سارد و گەرمی رۆژگاری نەچەشتبێ.

**خانەخانـە:** خـان خـان، خانەخانـە، چاوەچاوەی چکۆلە لە شەترەنج دا.

**خانەخدا:** خاوەنی ماڵ. کابە، ماڵی خوا.

**خانـەخراب:** مـاڵ وێـران، مـاڵ کـاول، دەستەشکاو، کۆڵەوار.

**خانەدار:** کابـان، بنـەوا، بنـەوان، بنـاوان، بنەوانە، هوونەدار، ئاگاداری ناوماڵ.

**خانـەداری:** بنـەوانی، بنـاوانی، کابـانی، کابانەتی، کەوانوویی، ماڵداری، ئاگاداری لەماڵ.

**خانـەزاد:** خانـەزا، خانـەزاو، خانـەزای، منـاڵی نۆکـەر یـان کلفـەت کـە لـە ماڵـە ئاغاکەی دا لە دایك بووبێ. خـۆیی، نزیـك. خۆجێیی. بەرهەم و ئاکام.





**خانەسوز:** بڕوانە: "خانمان سوز".

**خانەشمار:** ماڵیاتی"خانوار".

**خانە فـروش:** فرۆشـیاری مـاڵ. بریتـی لـە تـەریك، تەرکـە دنیـا. "**خانـە فـروش زدن**": تالانکردن.

**خانـەکردن:** جێگـرتن، جێگیربـوون. نیـشتەجێبوون. مـاڵ سـازکردن، مـاڵ کردنەوە.

**خانەکن:** کاولکەری ماڵ، رووخێنەری ماڵ. و کۆچی بە کۆمەڵی بنەماڵەیەك بە تەواوی کەلوپـەلی ژیانـەوە لـە شـوێنێکەوە بـۆ شوێنێکی تر.

**خانە کوچ:** بڕوانە: "خانەکن".

**خانـە گـرفتن:** کـڕین یـان بـەکرێگرتنـی شـوێنێ بـۆ ژیـان یـان کـار، مـاڵ گـرتن. نیشتەجێبوون.

**خانەنـشین:** خانەنـشین، گردەنـشین، مالنیش، هەڵپەسێراو، بێکار، گۆشەنشین.

**خاور:** 1) خۆرهەلات، رۆژهەلات، هۆرامان، هۆراسان. 2) درك، درِوو.

**خاوران:** خۆرهەلات، بە مانـای خۆرئـاواش هاتووە.

**خاورخدا:** پاشای خۆرهەلات.

**خاورخدیو:** بڕوانە: "خاورخدا".

**خـاوردور:** بەشـێك لـە خۆرئـاوای ئاسـیا بریتـی لـە ولاتـانی چـین، ژاپـۆن، کـورە، هێندووچین، ئەندونێزی و فیلیپین. "شرق دور و شرق اقصی" شی پێدەڵێن.

**خـاورزمین:** لـە کـۆن دا بـە مەڵبەنـدی خۆرهـەلاتی ئێرانیـان دەگـوت، ئـەمڕۆ بـە قوڕنەی ئاسیا و ولاتانی ئەم قوڕنەیە ئێژن.

**خاورشناس:** خۆرهەلاتناس، رۆژهەلاتناس.

**خاورمیانـە:** (خۆرهـەلاتی/ رۆژهـەلاتی) ناوەڕاست. "شرق میانه و شرق وسطی" شی پێئێژن.

**خاورنزدیـك:** ناوچـەی خۆرهـەلاتی مەدیتەرانـە بریتـی لـە ولاتـانی ئاسـیای باشووری خۆرئاوا یانی تورکیـە، سـووریە، لوبنـان، ئیـسرابیل، ئـوردۆن. "شـرق نزدیك" یشی پێدەگوترێ.

**خاوند:** سووکەڵەی"خداوند".

**خاویە:** زەوی بەتاڵ.

**خایـان:** لـە حـاڵی جـاوین دا، جـاوەر، جووینەر، کرتێن.

**خایستن:** بڕوانە: "خاییدن".

**خـایش:** کـردەی جـاوین و لـە ژێـر دیـان نەرمکردن، کرماندن، کروشتن.

**خاینده:** بڕوانە: "جونده".

**خایەدار:** بەورە، بەغیرەت، بوێر، دلێر.

**خایە داشتن:** زات هەبوون، وێران.

**خایە دستمال کردن:** بڕوانە: "چاپلوسی".

**خایەکردن:** هێلکەکردن.

**خایەمال:** بڕوانە:"متملق".

**خاییـدن:** جـاوین، جـوون، جـووین، کرتانـدن، کـرۆژتن، کرۆشـتن، کـۆتش، کونجین، کونجاندن، داکرۆژین، داقرتاندن، بە ددان ورد کردن، کۆتش. بەدگۆییکردن، جـوێن دان. "**خاییـده**": جـاوراو، جاویـاگ، جیاویار، جوراو، جوتراو، کرتێنراو، لە ناو زار هاتوچۆ پێکراو.

**خۆون:** زۆر خەیانەتکار.

**خبّ:** خەڵەتێن، خاپێن، فریودەر.

**خبائث:** کۆی "خبیثە".

**خباب:** وە کەفوکوڵ هاتنی دەریا.

**خباثت:** پیسی، چەپەڵی، ناپاکی.

**خباره:** بڕوانە: "چست و چالاك".

**خبال:** گەندەڵی، کەموکووڕی.

**خبث:** (خُ) پیسی، چەپەڵی، ناپاکی. بەدگۆیی.

**خبر:** هەواڵ، دەنگوباس، هاڵوهەواڵ، نووچە، خەبەر، خەوەر، پەیام. زانیاری. ڕووداو، پێشهات. حەدیس.

**خبرآور:** هەواڵ هێن، پەیام هێن.

**خبر افتادن:** دەنگۆداکەوتن، بڵاوبوونەوەی خەبەر.

**خبر پراکنی:** دەنگۆبڵاوکردنەوە، بڵاوکردنەوەی هەواڵ.

**خبرپرسی:** هەواڵ پرسی، خەبەرپرسی.

**خبر پیچیدن:** بڵاوبوونەوەی خەبەر.

**خبرت:** زانایی. تاقیکردنەوە، ئەزموون کردن.

**خبرچین:** زوان گیر، شوفار، قسەبەر، خەفیە، خەبەربەزێن، زیرەوان، سیخوڕ، هەواڵگر.

**خبردادن:** هەواڵ پێگەیاندن، زانیاری گەیاندن، ئاگادارکردنەوە.

**خبردار:** 1) ئاگادار، بەئاگا، های لێ، گوێبیس، خەبەردار، شارەزا. 2) ئاگادار بە، ئامادە بە، وریا بە. 3) ڕاست وێستاو بۆ ڕێزگرتن. 4) سیخوڕ، هەواڵگر.

**خبردارشدن:** ئاگادار بوون، خەوەرداربوون، پێزانین، هەست پێکردن، حەسیان، حەسین.

**خبر داشتن:** ئاگاداربوون، ئاگالێبوون.

**خبررسانی:** هەواڵ گەیەنی. هەواڵ ناردن.

**خبرساز:** دروستکەری هەواڵ، هەواڵ چێکەر. تەزویرکەری هەواڵ.

**خبرسازی:** دەنگۆسازکردن، قاوداخستن. تەزویرکردنی هەواڵ.

**خبر شدن:** زانیاری پەیاکردن، بەخەبەربوون، بەئاگابوون.

**خبرکردن:** ئاگادار(کردنەوە/ کردن)، زانیاری پێدان، هەواڵ پێگەیاندن، خەبەرکردن. داوەت کردن، بانگهێشت کردن.

**خبرکش:** بڕوانە: "خبرچین".

**خبر گرفتن:** هەواڵ وەرگرتن، زانیاری وەدەست هێنان.

**خبرگزار:** هەواڵدەر، پەیامدەر، کەسێك کە هەواڵەکانی ڕۆژ بۆ ڕۆژنامە یان دامەزراوەیەکی هەواڵ گەیێن کۆدەکاتەوە و دەنێرێ.

**خبرگزاری:** هەواڵدەری، پەیامدەری.

**خبرگی:** پسپۆڕی، چازانی، شارەزایی، لێزانی، هۆزان لە کارێك دا.

**خبرنامه:** هەواڵنامە، بولتەن.

**خبرنگار:** هەواڵنێر، پەیامنێر، نووچەگهان.

**خبرنگاری:** هەواڵنێری، پەیامنێری.

**خبرگی:** شارەزایی، لێزانی، پسپۆڕی.





**خبرویّت:** کارناسی، توانایی، لێهاتوویی، لێزانی.

**خبره:** شارەزا، لێزان، زانا، کارناس.

**خبری شدن:** ڕوودانی کارێ یان بابەتێ.

**خبك شدن:** خنکان.

**خبك کردن:** خنکاندن.

**خبل:** (خَ.بَ) شێت بوون، دێوانە بوون.

**خبنیدن:** بڕوانە: "خواباندن".

**خبوك:** پتەو، قایم.

**خبیث:** دەروون پیس، ڕەوشت ناحەز، گڵاو، ناپاك، گەمار، کۆتی.

**خبیدن:** بڕوانە: "خپیدن".

**خبیر:** لێزان، چازان، شارەزا لەکاردا، زانا و ئاگا.

**خپ کردن:** بێدەنگ بوون.

**خپیدن:** خنکان، خنکیان، کپ بوون، بێدەنگ بوون. بە مانای چەمانەوەش دێ.

**ختّال:** فێڵباز، کەڵەکباز.

**ختام:** کۆتایی، ئەنجام.

**ختان:** سوننەت کردن.

**ختلان:** فریودان، خڵەتاندن، خافڵاندن، خاپاندن.

**ختم:** 1) تەواوکردن، کۆتایی پێهێنان، بە کۆتایی گەیاندنی شتێك یان کارێك. 2) پرسە، سەرەخۆشی. 3) مۆرکردن. "**ختم روزگار**": زۆر زرینگ و فێڵەزان. "**ختم قرآن**": قورئان خوێندن لەسەرەتا تا کۆتایی. "**ختم کاری (چیزی) بودن**": بەتەواوی شارەزابوون لەو کارەدا.

**ختم شدن:** تەواوکردن، بە کۆتایی گەیاندن.

**ختم گرفتن:** بەڕێوەبردنی کۆڕی ماتەم و تازیەباری بۆ مردوو. بەڕێوەبردنی کۆڕی خەتم کردنی قورئان.

**ختن:** (خَ) بڕین، سوننەت کردن.

**ختنه:** سوننەت، سونەت، خەتەنە، کیر بڕینی منداڵ.

**ختنەسوران:** خەتەنە سووران، نان خەتەنە، بەزم و بانگ هێشتن لەبەر سوننەت کردنی مناڵ.

**ختنەکننده:** چوکبڕ، کیربڕ، خەتەنەکەر، کەسێك کە مناڵان سوننەت دەکا.

**ختور:** (خَ) فریودەر، خڵەتێن، غەدرکەر.

**خجالت:** شەرم، حەیا، ترێق، تەریق، شەرمەزار. "**از خجالت آب شدن**": زۆر تەریقەوەبوون، لەشەرمان بوونەئاو. "**از خجالت کسی درآمدن**": قەرەبووکردنەوەی چاکە و پیاوەتی کەسێك.

**خجالت دادن:** تەریق کردنەوە، تەریقەوکردن، خەجاڵەت کردنەوە، شەرمەزارکردن، ئارەقەپێکردن.

**خجالت دهندگی:** ڕووشکێنی.

**خجالت دهنده:** تەریق کەر، تەریق کەرەوە، ڕووشکێن.

**خجالت زده:** شەرمەزار. لە ڕووی شەرم و تەریقی‌یەوە.

**خجالت كشيدن:** تەریقەوبوون، تەرێقی، شەرم كردن، شەرمەزاری، ئارەقەكردن، شەرماهی، شەرم و شوورەیی، فەدی كرن، فەدیكاری، خەجاڵەتباری، خەجاڵەت كێشان، خەجاڵەت بوونەوە، سڵ كردن.

**خجالتی:** بەشەرم، شەرمین، شەرمی، شەرمێون، شەرمۆ، شەرمۆك، رووتەنك، روونەرم، كەمڕوو، كەمڕی.

**خجستگی:** پیرۆزی، موارەكی.

**خجسته:** پیرۆز، موارەك، مارەك، ممبارەك. خۆشبەخت، بەختەوەر.

**خجسته پی:** قەدەم خێر، پێبەخێر و خۆشی، خۆش قەدەم، پێ و قەدەم خێر، پێ و قەدەم ممبارەك، سەر و نەسەمە باش.

**خجستەرو:** خۆش روو، رووخۆش، رووگەش، دەم بە پێكەنین.

**خجستەروز:** بەختەوەر، ئەوەی كە رۆژگار بە خۆشی و شادمانی رادەبوێرێ.

**خجسته سرای:** ماڵی بەفەڕ.

**خجستەطالع:** بەختەوەر، خۆشبەخت.

**خجسته فرجام:** ئاخر خێر، ئاكام خێر.

**خجل:** (خَ.جِ) تەریق، تەرێق، شەرمەزار، فهێت كار، شەرمەنە، سەرشۆڕ.

**خجلان:** بڕوانە: "خجل".

**خجلت:** شەرم، شەرمەزاری، تەریقی، فەدیكاری، رووگیری، خەجاڵەت بوون، رووشكان.

**خجلت آور:** شەرم هێن، ئەوەی دەبێتە هۆی شەرمەزاری.

**خجلت بردن(كشيدن):** بڕوانە: "خجالت كشيدن".

**خجلت زده:** رووگیر، تەریق، شەرمەزار، خەجاڵەت.

**خجل رو:** تەرێق، شەرمەزار، سوورەوەبوو لە شەرمان.

**خجل رويی:** تەریقی، شەرمەزاری.

**خجل سار:** شەرمەزار، تەرێق، شەرمێونانە.

**خجل شدن:** شكانەوە، تەرێق بوونەوە، خەجاڵەت بوون.

**خجل كردن:** تەریق كردنەوە، رووشكاندن، رووشكانن، شەرمەنەكردن، لەدەم دان، شكاندنەوە، شكانانەوە.

**خجول:** شەرمن، شەرمێون، شەرمۆ، شەرمۆك.

**خجولانه:** شەرمنانە، شەرمێونانە، شەرمۆكانە.

**خجيدن:** كۆبوونەوە، كۆوەبوون، خڕەوبوون. خزین.

**خجير:** جوان، قەشەنگ، باش و بژاردە.

**خدّ:** روخسار، روومەت، گۆنا، كوڵم.

**خدا:** خودا، خوا، خوای، خولاّ، خودێ، بیناهیاچاڤا.

**خداانگاری:** بە خوداكردن.

**خدّاب:** درۆزن، درۆكەر.

**خدابيامرز:** كۆچكردوو، رەحمەتی، خوالێخۆشبوو.





**خدا(ی)بين:** ئایین دار، بڕوامەند بەخودا.

**خدا پرست:** خوداپەرس، خواپەرس، خواخوا، یەزدۆ، بەدین، دیندار.

**خدا پسند:** قسە یان كارێك كە خودا پەسندی بكا، كاری باش.

**خداترس:** كەسێ كە لە خودا بترسێ، خۆپارێز، پارێزكار، داوێن پاك، خوایی.

**خداجو:** پەیجۆری خوا، كەسێك كە بە دوای خواناسییەوەیە.

**خداحافظ:** ماڵیاوا، خاترێ وە، خاترێ تە، خواحافیز.

**خداحافظی:** ماڵاوایی، مالاڤایی، خاترخازی، خاترخوازی، خواحافیزی، وەدا.

**خداخواهی:** هاتنەپێشی كارێكی دڵخواز بەبێ پێشبینی و چاوەڕوانی پێشتر، ویستی خوا.

**خداداد:** خوادا، خواداد، خواداگ، خوداو، بەشێ كە خوا داویەتی.

**خداشناس:** خواناس، پیاوچاك، بە ئیمان، ئیماندار، خۆپارێز.

**خداشناسی:** خواناسی، خواناسین، بڕوا بە خودا، ئیمانداری.

**خداع:** (خِ) 1) فریودان، خڵەتاندن. 2) فریو، فێڵ، مەكر.

**خدّاع:** (خَ) خاپینۆك، زۆر دەسبڕ و بە فریو، خڵەتێن.

**خداگير:** خواگیر، دەین بە مل، مشكولۆزمە.

**خداگيری:** خواگیری، زوڵم و زۆر، كاری ناڕەوا كردن.

**خدّام:** (خُ) كۆی "خادم".

**خدا نخواسته:** خوانەخواستە، خوانەكا، روونەدات.

**خدانشناس:** خوافرۆش، خوانەناس، ناخودا، دەسبڕ، جامباز.

**خداوارگی:** بڕوانە: "خداانگاری".

**خداوند:** 1) خوا، خولاّ. 2) خاوەن، خودان، خاوەند، خێوەند، ساحێو.

**خداوندی:** سەربە "خداوند"، خوایەتی. گەورەیی، مەزنی، پاشایەتی. خاوەنداریتی. "**خداوندی كردن**": گەورەییكردن، سەروەریكردن.

**خداوندگار:** 1) خوا، خوای تاقانە. 2) بڕوانە: "خداوند". "خاوندگار و خوندگار و خونكار" یش هەر بەم مانایەن.

**خدايا:** خوایە، ئەی خوا.

**خدايگان:** خاوەنی مەزن، خودای تاقانە، پاشای گەورە.

**خدايی:** بەویستی خوا، بەئیرادەی خوا. بەتەواوی راست و بەپێی هەقیقەت. خودابوون. خوایەتی كردن.

**خدايی كردن:** بەسەرەڕۆیی حكوومەت كردن یان بەكاربردنی زۆر و لەدەست دابوونی دەسەڵاتی تەواو. بەڕێوەبردنی كاروباری جیهان، خوایەتی كردن.

**خدر:** (خَ.دَ) 1) سستی و گرژی ئەندامەکانی لەش، تەمەڵی، تەوەزەلی. 2) تاریکی، تاریکایی شەو.

**خدر:** (خَ.د) سست، سڕ، تەزیو.

**خدرت:** (خُ.رَ) تاریك و تنۆك.

**خدش:** رووشاندن، رووکاندن، نیشان و شوێنی برین و رووشان.

**خدشه:** 1) رووکان، رووشان، خەوشدار. 2) گومان، دڕدۆنگی. 3) زیان، ئازار. "**خدشه وارد کردن( آوردن )**": زیان پێگەیاندن.

**خدشەدار:** زیان دیتوو، ئازاردیتوو. عەیبدار و بەکەمووکورتی.

**خدشه ناپذیر:** پتەو، قایم، پارێزراو. گومان هەڵنەگر.

**خدعه:** فێڵ، کەڵەك، دهۆ.

**خدم:** ( خَ.دَ) کۆی"خادم".

**خدمت:** خزمەت، کاربۆکردن، راژە، خەومەت. سەربازی. کار بەتایبەتی کاری ئیداری و دەوڵەتی. هاوڕێیەتی. "**بەخدمت کسی رسیدن**": چوونە لای، چوونە خزمەتی. تەمبێ کردنی ئەو، ئەدەب کردنی ئەو. "**خدمت نظام (وظیفه/ زیر پرچم )**": سەربازی. "**به خدمت کسی( جایی ) درآمدن**": کار پێدران لەلایەن ئەوەوە، دامەزران، بۆ ئەو کار کردن. "**در خدمت کسی بودن**": لە خزمەت کەسێك دابوون، ئامادەی ئەنجامدانی کار بۆ ئەو بوون.

**خدمات:** کۆی"خدمت"، خزمەتگوزارییەکان.

**خدمات عمومی:** خزمەتگوزارییە گشتییەکان.

**خدمتانه:** هەقدەستی خزمەتکردن.

**خدمتکار:** خزمەتچی، خزمەتکار، خزمەتگوزار، ژێرکێرە، خوبزە، نۆکەر، خوڵام. ملکەچ و بەرفەرمان.

**خدمتکار دون پایه:** کورتێلۆ، خزمەتکاری سووك و بێ بایەخ.

**خدمت کردن:** 1) خزمەتکردن. 2) کارکردن، ئەرك بەڕێوەبردن. 3) بە تێپەڕاندنی خزمەتی سەربازییەوە خەریك بوون. 4) بەلاوەبوون و چاوەدێریکردنی کەسێك و دابینکردنی نیازەکانی. 5) کڕنۆشبردن. 6) دان، پێشکەش کردن.

**خدمتگزار:** هژمە، هەشمەت، بچووك (کوڕی من بچووکی تۆیە)، کەسێك کە لە بەڕێوەبەرییەك یان نووسینگەیەك کار بکا، کارمەند.

**خدمتی:** دیاری، پێشکەشی.

**خدم وحشم:** دەستوپێوەند، دەست و پێ، دەسوپەیمان، دەبدەبە، نۆکەر و کارەکەر.

**خدمه:** تاقمی خزمەتگوزاری، خزمەتکاران، خزمەتگوزاران.

**خدنگ:** گەزمە، تیر، تیرێ کە بە کەوان داوێژرێ.

**خدوع:** خاپینۆك، خاپێن.

**خدوك:** پەشێو و پەرێشان، دڵشکاو.





**خدیش:** 1) کەیخودا. 2) کەیبانوو.

**خدیعه:** بڕوانە: "خدعه".

**خر:** 1) کەر، وڵاغ. 2) گەمژە، نەزان، زووباوەڕ. 3) ملکەچ، بەرفەرمان. "**خر خوش راه**": بریتی لە کەسێ کە زوو بڕوا دەکات. "**خر در چمن**": تایبەتمەندی دەنگی بەرز و لە گوێ گران. "**خر زدن**": دەرس خوێندنی لەڕادەبەدەر، کەرخوێنی. "**خر شدن**": فریوخواردن، هەڵخڵەتان. "**خر کریم را نعل کردن**": بەرتیل دان. "**خر کسی از پل گذشتن**": بەمەبەست گەیشتنی ئەو، وەدیهاتنی داخوازی ئەو. "**خر کسی به گل ماندن**": تووشی گیروگرفت بوونی ئەو. کەر لە قوڕ چەقین. "**خر کسی رفتن**": دەست رۆیشتنی ئەو. "**خر کسی لنگیدن**": عەیبداربوونی کاری ئەو. "**خر گیرآوردن**": بە نەزان و گەمژە زانینی ئەو. کەر گیر هێنان. "**از خر شیطان پایین آمدن**": لە نیاز یان کردەوەی لاسارانە و کەللەشەقانە دەست هەڵگرتن. لە کەلی شەیتان هاتنە خوار. "**از خر مرده نعل کندن**": بریتی لە زۆر بەتەماح بوون. "**بر خر مراد سوار شدن**": بە مەبەست و ئاواتی خۆ گەیشتن.

**خرائب:** کاول، وێرانە.

**خراب:** کاول، وێران، رماو، رمیاگ، خاپوور، تێکچوو، لەکارکەوتوو، خراو، خراب، خراپ. رزیو، گەنیو. بێبرەو، لەبرەوکەوتوو. سۆزانی. رەشەمەست. بەدنێو، ریسوا. ئاشق، شەیدا. پەرێشان، ناڕەحەت. بوورە، نەکێڵراو.

**خراب آباد:** بریتی لە دنیا، ئەم جیهانە. وێران، کاول.

**خرابات:** کەلاوە، مەیخانە.

**خراب شدن:** رمان، رمیان، رووخان، رووخیان، تێك تەپین، تێك رووخان، تێك رمان، تێك چوون، هەڵ خووشان، خراوبوون، کاول بوون، فەلشان، فەلشین، وەشایش، زایەبوون، خەساربوون، رزان، لەناوچوون.

**خرابکار:** خراوکەر، کاولکەر، زایەکار، کەسێك کە دەبێتە هۆی کاول بوون و زایەبوون. کەسێك کە بە هۆی دژایەتی دەگەڵ حکوومەت هەوڵ دەدا بەجۆرێك زیان بە کۆمەڵگا یان دامەزراوەکانی بگەیەنێ، تێکدەر.

**خراب کردن:** رماندن، رووخاندن، رووخانن، تێك رووخاندن، تێك رماندن، گەپچاندن، کاول کردن، هێرفاندن، هەڵتەکاندن، فەلشاندن. رزاندن، خەسارکردن، زایەکردن. "**خراب کردن توپ**": لە دەست دانی تۆپ. "**خود را خراب کردن**": بە خۆدا ریان، خۆپیس کردن. زۆر ترسان.

**خرابه:** کەلاوە، وێرانە، خاپوور. شکاو و تێك دراو.

**خرابی:** 1) کاولی، وێرانی. 2) شپرێوی، پەشێوی، بێنەزمی. 3) بەدنێوی، ریسوایی. 4) حاڵ خراپی. 5) لە کار کەوتن، عەیب پەیداکردن. 6) سەرخۆشی، مەستی.

**خراج:** ماڵیاتی زەوی، باجێك كە لە بەروبوومی زەوی و زار یان داهاتێكی تر دەیگرن. "**خراج دادن**": دانی ماڵیات. "**خراج گزاردن**": ماڵیات دان.

**خرّاج:** 1) هەڵەخەرج، دەست بڵاو، قەللاش. 2) پیاوی زۆر زیرەك و فێڵباز.

**خراجگزار:** باج دەر، ماڵیات دەر.

**خرّازی:** وردەفرۆشی.

**خراس بان:** ئاشەوان.

**خراش:** 1) بیٚنرخ، بیٚفایدە. 2) رووش، رووشان، رووشە، داڕووش، داڕووشان، رووك، رووكە، روویس، روویش، خاشە، چیخ، شاخە، كیڕ، مەڕت. 3) بە مانای رووشێن ئەگەر ئاوێتەی وشەیەكی دی بێت وەك:"**جگرخراش**": كزە لە جەرگەوە هێن، ئازاردەر. "**گوشخراش**": دەنگی بە گویٚ ناخۆش، دەنگی زبری ناخۆش. "**خراش سطحی**": قرنج، قرنجان.

**خراشاندن:** 1) رووشاندن، كڕاندن، كڕانن، رووكاندن. 2) رەنجاندن، ناڕەحەت كردن.

**خراش برداشتن(خوردن):** رووشان، رووشیان، رووشین، رووش بردن، هەڵ رووشان، هەڵڕووشیان، داڕووشان، رووكان، رووكیان، رووكەداربوون، بریندابوونی سەرچڵ، مەڕتان.

**خراش دادن:** 1) بریندارکردن، زامدارکردن. رووكاندن یان ئازارگەیاندن بە شتیٚ بەهۆی شتێكی نووك تیژەوە.

**خراشنده:** رووشێن، كەسیٚ یان شتیٚ كە ئەڕووشێنیٚ.

**خراشیدن:** رووشاندن، روویشاندن، رووكاندن، رووكانن، رنین، رنینەوە، رەندش، داڕووشاندن، هەڵڕووشاندن، هەڵڕووشانن، چیخ كرن، سەرچڵ بریندارکردن، شاخ كردن، مەڕتاندن، شەقتین. "**خراشیدن سطحی**": قرنجاندن، بەحاڵ رووشان.

**خراشیده:** رووشاو، رووشیاگ، روویشای، هەڵ رووشاو، هەڵ رووشیاگ، رناو، رنیاگ.سەرچڵ بریندارکراو. دەنگ یان ئاوازی گەورە.

**خراط:** دارتاش، دارلووس كەر، خەڕرات.

**خرافات:** كۆی"خرافە".

**خرافه:** پڕوپووچ، قسەوباسی بیٚ مانا و بیٚ كاكڵ و ناڕاست.

**خرام:** 1) لەنجەولار، لارولەنجە، لارە، لەنجە، لەرین، خلنگ، خنچكە، شەلەنگی، نازونووز، چەموخەم، رۆیشتنی بەناز. 2) مژدە، مزگێنی، شادمانی. "**خرام سبزه**": كەروێشكە، كەورێشكە، كێروشكە.

**خرامان:** بەلەنجەولار، شەلەنگ، رۆیشتنی بەناز و خەمزەوە، شلووملن، خرامان.

**خرامش:** هەڵسوكەوتی بەناز و حوزمەوە.

**خرامنده:** لەنجەكەر، خلنگێن، بەلەنجەولار، شەلەنگ، كەسیٚ كە بە ناز و خەمزەوە بڕوا.





**خرامیدن:** لەنجە كردن، بە ناز رۆیشتن، بەلەنجەولار رۆیشتن، لەرینەوە، خلنگین، قنچكەكردن. "**خرامیدن از نسیم**": شنیان، شنین، شنینەوە، لەرین لەبەر با."خرامیدن کبوتر و کبك": قنە، قونە، گومەتە."**خرامیدن اسب**": نێسكان، سەما و گەمەكردنی ئەسپ.

**خرامین:** بڕوانە: "چراگاە".

**خراید:** كچانی لاو، ژنانی بەشەرم و حەیا.

**خرب:** (خَ) خاپووركردنی ماڵ، كونكردنی گویٚ.

**خرب:** (خَ.رِ) وێران، وێرانە، كاول.

**خربار:** باری گەورە، باری كەرێك، ئەو بارەی كە دەینێنە سەر پشتی كەرێك.

**خربازار:** كەربازاڕ، شوێنی شلووق و پڕحەشیمەت.

**خربان:** كەردار، لێخوڕی كەر، كەرلەوەڕێن.

**خربگیری:** تەنگ پێهەڵچنین و بەكاربردنی زۆر.

**خربنده:** بڕوانە: "چاروادار".

**خربه:** (خُ.بَ) كون، كونی دەرزی.

**خرپول:** پووڵدار، كەسیٚ كە پارەی زۆری هەیە، دەوڵەمەند، كەرپووڵ.

**خرت:** (خُ یان خَ) كون، كونی دەرزی.

**خرت و پرت:** وردكەوپردكە، وردەوپردە، شڕوشاتاڵ، شڕەوبڕە، لاچۆپاچۆ، شنگروشیوال، وردیمردی، وەردی مردی، وردی مرد، ریتك و پیتك، ریت و پیت، قەرقۆت، قاپوقاپۆڕ، قەڵپەڵ، كولومول، كولموول، كەلمەل، كەلووپەل، كەلوپووڕ، وردەواڵە، هوورموور، هەیتوهوت، پەڕكاڵ، رێزەوپێزە، پردە، چەك و پوش، وردەكەرەسە، كرتمرت، خرتەوپرتە، خرتوپرت. "**خرت و پرت بیارزش**": كاچوكولۆز، كاچوكولووسك.

**خرتوخر:** تێكەلێكە، بیٚسەرەوبەرە، كەركەرێن.

**خرج:** خەرج، مەزاخ، باج. "**خرج و برج**": خەرجی پێویست و ناپێویست. "**خرج و دخل كردن**": گونجاندنی خەرج دەگەڵ داهات. پێڕاگەیشتن بە حەساو. "**به خرج چیزی زدن**": خەرجكردن بە مەبەستی كڕینی ئەو شتە. "**به خرج دادن**": بەكاربردن. وادانان. "**به خرج رفتن**": ژمێردران، بە ژمارهاتن. "**به خرج كسی رفتن**": لەلایەن ئەوەوە قبووڵ كران، گرنگیدانی ئەو بەو شتەی خەڵكی دەیلێن.

**خرج اتینا:** خەرج كردنی پارە بۆ شتی پڕوپووچ.

**خرج برداشتن:** تێچوون، خەرج هەڵگرتن.

**خرج دادن:** دانی خواردەمەنی بەخەڵك یان بڵاوكردنەوەی لە رۆژە پیرۆزەكاندا.

**خرج در رفته:** بەبیٚ حەساوكردنی خەرجەكان.

**خرجسته:** قالمەقالم، كێشەوهەرا، هەراوزەنا، زەنازەنا.

**خرج غیرضروری:** بەرج، خەرجی خۆڕایی و ناپێویست.

**خرجی:** خەرجی، مەسرەفی ڕۆژانە.

**خرچران:** خەرگەلە، کەرلەوەڕێن.

**خرخره:** قورگ، قرقراچکە، قرقرۆچکە، سورێنچکە، گەروو. "**خرخره کسی را جویدن**": بە توندی تۆڵەلێکردنەوە. "**خرخره کسی را چسبیدن**": بەپێداگری شتێ لێ ویستن یان ناچارکردنی بە ئەنجامدانی کارێ. "**تا خرخره**": تاگەروو، بەتەواوی.

**خرخشه:** هەلّلا و هەنگامە، ئاژاوە، کێشەوهەرا، قەرقەش، گوڵمەز.

**خرخوان:** کەرخوێن، تایبەتمەندی کەسێك کە بە زۆر خوێندن فێردەبێ نەك بە هێزی بیر و هۆش.

**خرد:** (خ.نَ) ئاوەز، هزر، ژیری، عەقڵ، هۆش.

**خرد:** (خُ) ور، ورد، ورت، هوور، هورد، هۆرد، هوویر، لەتی زۆر بچووك. کەم تەمەن. بێ نرخ، سووك. ژێردەست.

**خردابزاری:** (خ.نَ) ئاوەز ئامێری.

**خردانگار:** (خُ) بڕوانە: "خردانديش".

**خردانگارش:** (خُ) بڕوانە: "خردانديش".

**خردانديش:** (خُ) وردبین، وردەبین، کونج پشکن، کەسێك کە چاوەدێری شتی ورد بکا، چاوتەنگ، بەرچاوتەنگ.

**خردباوری:** (خِ) بڕوانە: "خردگرایی".

**خرد پیشه:** (خ.نَ) بەئاوەز، ژیر، زانا، هوشیار.

**خردسال:** (خُ) منداڵ، زارۆ، کچ یان کوڕێك کە تەمەنی لە پێنج ساڵ کەمتر بێ.

**خرد ستیز:** دژەئاوەز، دژە عەقڵ.

**خردشدن:** هاڕان، هاڕیان، وردبوون، هووربوون، هووربین، بوونە تۆز.

**خرد شکوفا:** گەشەکردنی ئاوەز، کامڵ بوونی ئاوەز.

**خردك:** (خُ.دَ) چووکەڵەی "خُرد". بڕوانە: "اندك".

**خردك خردك:** بڕوانە: "اندك اندك".

**خردکردن:** (خُ) وردکردن، کردنەتۆز، لەت و پەت کردن، هێرفاندن، ئەنجنین، هەنجنین، داهاڕین، ساوین، ساوینەوە، هاڕین، کرۆتن، کرۆشتن.

**خردکردن پول:** (خُ) وردکردن، وردکردنەوە، پوولّی درشتە بە بچووك گۆڕینەوە.

**خردك نگرش:** (خُ) بڕوانە: "خردنگرش".

**خردگرا:** (خِ) ئاوەزخواز.

**خردگرا ستیز:** دژە ئەقڵخوازی.

**خردگرایی:** بڕوا بە ڕەسەنایەتی ئاوەز، ئاوەزخوازی.

**خردل:** (خَ.دِ) بریتی لە ترسەنۆك، بێجەرگ، قزە.

**خردمند:** (خِ) بە ئاوەز، خاوەن ئاوەز، ئاوەزمەند، ژیر، ئاقڵ، زانا، فرەزان، وریا، هوشیار.

**خردمندانه:** (خِ) ژیرانە، ئاقڵانە، ئاوەزمەندانە، لە ڕووی ئەقڵەوە.





**خردنگاری:** (خُ) زانستی چۆنیەتی گەردیلەکان، توێژینەوەی گەردیلەکان، تاوتوێ کردنی شتە زۆر وردەکان بە هۆی گەردیلەبین، میکرۆگرافی.

**خردنگرش:** (خُ) بڕوانە: "خردانگارش".

**خردوخاك کردن:** هاڕین، هاڕاندن، وردکردن وەك ئارد.

**خردوخسته:** ماندووشەکەت.

**خردوخمیر کردن:** وردوخاش کردن، هەرستاندن، هەرستین.

**خردور:** (خِ) بڕوانە: "خردمند".

**خردورزی:** ئاوەزکاری، کایە پێکردنی ئەقڵ، دەکارکردنی ئاوەز.

**خردوکلان:** کەسانی جۆراوجۆر لە هەر کۆمەڵێ، چووکە و گەورە.

**خرد و مرد:** شتە وردکە و پڕدکەکان.

**خردومند:** (خِ) بڕوانە: "خردمند".

**خرده:** (خُ) وردکە، ورتکە، زۆر ورد.

**خرده‌بورژوازی:** وردەبورژوازی، پیشەوەرێك کە خاوەنی کەرەسەی بەرهەمهێنان یان سەرمایەی خۆیەتی بەڵام ناچارە بۆ بژیوی ژیان کار بکا. چینی مامناوەندی شاری.

**خرده‌بین:** وردبین، وردەبین، کونجکۆڵ، نوکتەزان، بیر تیژ، وریا.

**خرده‌بینی:** وردبینی، وردەبینی، نوکتەزانی، بیرتیژی، زیرەکی، وریایی. بەچووکە دانان.

**خرده‌پا:** کاسبکاری گەڕۆك و کەم سەرمایە، وەرزێرێ کە زەوی و زرعاتی کەمی هەیە، کەم داهات، دێوەرە.

**خرده‌حساب:** وردە حەساو، قەرزی کەم. و بریتی لە ئازار و زیانێك کە کەسێك لە کەسێکی دی دیبێ و پێی زویر و دڵتەنگ بووبێ. "**با کسی خرده حساب داشتن**": بریتی لە هەبوونی دوژمنایەتی دەگەڵ ئەو.

**خرده‌دان:** بڕوانە: "نکتەدان".

**خرده‌شناس:** جیاکەرەوەی چاك و خراپ، وردبین، وردەبین.

**خرده‌شیشه‌داشتن:** بریتی لە بەدفەڕبوون، بەدنییەت بوون.

**خرده‌فرمایش:** فەرمایشە پەیتاپەیتا و جاڕزکەرەکان، وردەفەرمایشەکان.

**خرده‌فروش:** وردەفرۆش، هووردەفرۆش، پێچەوانەی کۆفرۆش.

**خرده‌کار:** وردەکار، کەسێ کە کاروباری چووك و پاژی ئەنجام دەدا.

**خرده‌کاری:** کردەی وردەکار، وردەکاری، ناسك کاری، ئیش گەلی گچکە و پاژی، پێچەوانەی کاری گەورە و بنەڕەتی.

**خرده‌گرفتن:** بڕوانە: "خردەگیری".

**خرده‌گیر:** ڕەخنەگر، ئیرادگر، وردەگر. وردبین.

**خرده‌گیری:** ڕەخنەگرتن، ئیرادگرتن، وردەبیانووگرتن.

**خرده‌مالك:** خاوەنی زەوی کشتوکاڵی کەم، وردە مالك.

**خردی:** (خُ) منالّی، گچکی.

**خردین/ خردینه:** چووکە، کەم تەمەن.

**خر رنگ کن:** بریتی لە فریودەر، هەڵخەڵەتێن.

**خرزور:** کەرزۆر، کەسێ کە زۆر و هێزی جەستەیی زۆری هەیە.
**خرس:** (خَ.ن) لاڵی.
**خرسند:** شاد، شادمان، خۆشحاڵ، پێخۆش، رازی.
**خرسندی:** شادی، شادمانی، خۆشحاڵی.
**خرش:** (خُ.ر) بڕوانە: "خروش".
**خرشە:** بڕوانە: "خرخشە".
**خرص:** (خَ) درۆ وتن، بەگومان و دڕدۆنگییەوە ئاخاوتن.
**خرط:** تاشین، تاشینی دار.
**خرطبع:** سەرکێش، سەرەڕۆ، بێئاوەز، کەم فام، کەرەپیاو.
**خرف:** (خَ) میوە لێکردنەوە.
**خرف:** (خَ.رَ) خەرف، خەرەف، خەرفاو، خەرەفاو، خەرفتی، خەرفی، خەرفیو، خێور، لە بەر پیری هۆش نەماو، کەم زەین. لە فارسی دا "خرفت"یش دەڵێن.
**خرفهم:** تێگەیاندنی بابەتێ بە کەسێکی گەوج و نەفام بە چەند پات کردنەوە.
**خرفیدن:** خەرفان، خەرەفان، خەرەفیان، خەرەفین، خەڵەفان، خەڵەفین، لە پیری هۆش نەمان.
**خرفیده:** خەرفاو، خەرفیو، خەرەفاو، خەرەفیو، خەرەفیاگ، لە بەر پیری هۆش نەماو.
**خرق:** (خَ) 1) دڕاندن، لەت کردن، تلیشاندن، شەق پێبردن. 2) کون، درز، کەلێن.
**خرق عادت:** پێچەوانەی رەسمی باو(عادەت)، کەراماتی پیاوانی خودا.
**خرقەانداختن:** سپیاڵ فرێدان، لەبەر داکەندنی جلکی شڕ یان بەخشینی. و بریتی لە دانپیانان بە گوناە و خۆدان بەدەستەوە.
**خرقەبازی:** وە سەما کەوتنی سۆفیان لە کاتی جەزم بوون دا و دڕاندنی جلوبەرگێ کە لەبەریان دایە.
**خرقە پوش:** شڕۆل، بەرگ دڕاو، سۆفی، دەروێش. سواڵکەر.
**خرقەتهی کردن:** بریتی لە گیان سپاردن، کۆچی دواییکردن، مردن.
**خرقەسوز:** دەروێشێ کە لە حاڵی جەزم بوون دا جلوبەرگەکانی داکەنێ و بیانسووتێنێ.
**خرقەشدن:** دڕاندن، لەت کردن.
**خرکچی:** بڕوانە: "خربندە".
**خر کردن:** کەرکردن، فریودان.
**خرکش:** لە حاڵی گرتنی مل یان یەخەی کەسێك.
**خرکی:** کەرانە، وەك کەر، کەرەکی.
**خرکیف:** خۆشحاڵ، سەرحاڵ دڵخۆش.
**خرگاه:** خێوەتی گەورە، دیوانی میر.
**خرگاه اخضر:** بریتی لە ئاسمان.
**خرگاەزدن:** خێوەت هەڵدان.
**خرگاه ماه:** خرمانەی مانگ.
**خرم:** (خَ) بڕین، تلیشاندن، کەلێن تێخستن، کون کردن، سمین.





**خرّم:** (خُ.رَ) شاد، شادمان، بەگەشە و تێراو، سەوزەڵان، پاراو. پیرۆز، موبارەك.
**خرّم باش:** بڕوانە: "پردەدار".
**خرّم دل:** شادمان، خۆشحاڵ، دڵ خۆش.
**خرّم دینان:** پێڕەوانی بابەکی خوڕەمدین کە لە سەردەمی مەئموون و موعتەسەم راپەڕیو دەیویست ئێران لە ژێر رکێفی عەبباسییەکان دەربێنێ.
**خرمن:** خرمان، خەرمان، بێدەر، کۆی سووری گەنم. "**سر خرمن**": کاتی هەڵگرتنەوەی داهاتی کشتوکاڵی.
**خرمن کردن:** کۆکردنەوە سەریەك، لەسەر یەك کەڵەکە کردن.
**خرمن کوبیدن:** گێرەکردن، وردکردنی دەغڵ و گیا.
**خرمنگاه:** خرمان، خەرمان، بێدەر، کۆی سووری گەنم.
**خرمن گدا:** سواڵکەری سەر خرمان.
**خرناس/ خرناسە:** پرخە لە خەو دا، مرخە، خرپە، خڕین، خرپوق، ڤزە."**خرناسە پیاپی**": پرخەپرخە، مرخەمرخ، ڤزەڤز.
**خرنبار/ خرانبار:** هێرش و ئاپۆڕەی خەڵك لە شوێنێك دا، کێشە و ئاژاوە، بەو تاوانبارەش دەڵێن کە بۆ وەی خەڵکی دیش پەند وەرگرن سوار کەری دەکەن و بە ناو شاردا دەیگێڕن.
**خرنش:** (خُ.نِ) بڕوانە: "خرناس".
**خروار:** 1) خەروار، خەڵوار، پێوانەیەکە بەرامبەر بە سەد مەنی تەورێز یان 300 کیلۆ. 2) باری کەر. 3) وەك کەر، کەرئاسا، کەرانە.
**خروپف:** پرخە، پرخەپرخ، کرخە، کوفەنی، لە خەو دا دەنگ لە هەناسەهاتن.
**خروج:** 1) دەرچوون، دەربازبوون، چوونە (دەر/ دەرەوە)، رۆیشتنە (دەر/ دەرەوە). 2) سەرپێچی، سەرکێشی. "**خروجی**": دەرچوو، رێی چوونە دەرەوە.
**خروج کردن:** سەرپێچی کردن، سەرکێشی کردن، سەربزێوی کردن.
**خرور:** (خَ.وَ) بڕوانە: "خربندە".
**خروس بی محل:** بریتی لە کات نەناس، کەسێ کە ناوەخت قسە دەکا یان کارێ ئەنجام دەدا.
**خروسك:** کەڵەبابی چووکە.کۆکە رەشە، خەندخەندوك، "لارنژیت".
**خروش:** هاوار، هەراوهوریا، خورۆش، خرۆش، مرۆش، گوڕە.
**خروشان:** خرۆشان، بە گوڕ و تین، خورۆشکەر، لە حاڵی کەفوکوڵ دا.
**خروشیدن:** هاوارکردن، ناڵەوهاوارکردن، خرۆشان، خرۆشیان، خرۆشین، خورۆشان، خورۆشین، مرۆشیان، گوڕاندن. "**خروشیده**": خرۆشاو، خرۆشای، خورۆشاو.

**خروع:** (خَ) ژنێ کە ئەندامی نەرم و شل بێ و بە ئاسانی بچەمێتەوە.

**خروق:** کۆی "خرق"، بە مانای درز، کەلێن.

**خرویلە:** دەنگ و هەرای بەرز و رەسا، دەنگی گریانی بەرز.

**خریّت:** کەرێتی، گەمژەیی، نەزانی.

**خریدار:** کڕیار، کڕینۆخ، سەنیار، بکڕ، بسێن، شت سێن لە بازاڕ.لایەنگر، هەوادار، خوازیار.

**خریداری شده:** کڕدراو، سەنراو، کڕیاگ.

**خریداری کردن:** کڕین، سەندن.وەرگرتن.

**خریدن:** سەندن، ساندن، سانن، سەنن، سانای، ئەسای، بازاڕکرن، کڕین، کڕیان، گرەوتش، هەرینایش، هێرناییننە. وەرگرتن، نرخ بۆ دانان.

**خریدنی:** شیاوی کڕین، بۆ کڕین، هاتنەکڕین.

**خرید و فروش:** کڕین و فرۆشتن، مامەڵەکردن.

**خریش:** 1) رووش، رووشان، رووشاوی. 2) گاڵتە، قەشمەر، مەچەل.

**خریشیدن:** بڕوانە: "خراشیدن".

**خریطە:** 1) نەخشەی جوگرافیا. 2) توورەکە، هەمبانە، کیف.

**خریع:** لاواز، سست، تەمبەڵ.

**خریق:** 1) بای توند و سارد. 2) بڕوانە: "آبراهە". 3) زەوی نزم.

**خزائن:** کۆی "خزانە و خزینە".

**خزاع:** (خُ) مردن، مەرگ.

**خزان:** کۆی "خازن"، بە مانای خەزێنەدار.

**خزان:** 1) گەڵاڕێزان، خەزان، خەزام، دەمی خەزەڵوەر، پاییز. 2) خزۆك، لە حاڵی خزیندا.

**خزان کننده:** گەڵاوەرێن.

**خزانە:** خەزێنە، خەزنە، گەنجینە، سامانگە.

**خزانەدار:** سەرۆکی خەزێنە، خەزێنەدار، گەنجینەوان، وەرگر.

**خزانەداری:** شوغڵ و کاری خەزێنەدار، خەزێنەداری.

**خزانیە:** شێعرێ کە لە وەسفی پاییزدا دەهۆنرێتەوە.

**خزراء:** چاو گچکە، ژنێ کە بە گۆشەی چاو بڕوانێ.

**خزرك:** (خَ.رَ) ترس، سام، بێئارامی.

**خزعبلات:** (خَ.زَ.بَ یان خُ.زَ.بِ) فشقیات، قۆڕیات، قسەگەلی قۆڕ و پووچ و پێکەنیناوی.

**خزل:** (خَ) بڕین.

**خزن:** 1) پاشەکەوت کردن، پەسمەندەکردن، کۆکردنەوە، پارازتن، راگرتن. 2) شاردنەوەی رازێك.

**خزندگان:** کۆی "خزندە"، خزۆکەکان، خشۆکەکان، لەسەرسك چووەکان.

**خزندە:** خزۆك، خزنە، خشندە، خشننە، خشۆك، خشەك، شەمار، ماوموور، هەر گیانلەبەرێ کە بە سەر عەرز دا بخشێ.





**خزنە:** کۆی "خازن".

**خزە:** قەوزە، قۆزە، کەز، کەزی، کەژاو، کەفز، کەفزە، کەفزەر، جلەشینەی سەر ئاو، وردیلە گیایەکی پێکەوە نووساو لە سەر ئاو یان بەرد دەبینرێ.

**خزی:** (خِ) سووکی، سەرشۆڕی، ناوزڕان، خەنزاری.

**خزیدن:** خزین، خزیان، بەخشکەوە بزووتن، خشکە، خشان، خشیان، شەمارە، خوشیان، خوشین، راخوشین، ململێن، جینگڵ دان.

**خزیە:** خوو یان عادەتێك کە ببێتە هۆی ئابڕووچوون.

**خس:** 1) بڕوانە: "خاشاك". 2) خەڵکی پەست و نزم و زەبوون.

**خسائس:** کۆی "خسیسە".

**خسار:** زیان پێگەیشتن، زەرەر کردن، گومڕابوون، تیاچوون، لەناوچوون.

**خسارت:** 1) زیان کردن، زیان پێگەیشتن، زیان دیتن، زەرەر کردن. 2) زیان، زەرەر، خەسارەت.

**خسارت بار:** زیانبار، خەسارەت هێن، مزیر.

**خسارت خوردن:** زیان دیتن.

**خسارت دادن:** تاواندان، قەرەبووکردنەوەی زیان.

**خساس:** (خِ) کۆی "خسیس".

**خساست:** 1) خۆگوشین، خۆگڤاشتن، رژدبوون، رەزیلی کردن، سەقیلی، قڕنیسی. 2) پەستی، نزمی، ناکەسی.

**خساسە:** سامانی کەم و بێ نرخ.

**خسانیدن:** جاوین، جووین، کرتاندن، داکرۆژین، گازگرتن و رەنجاندن.

**خسبانیدن:** خەواندن، نواندن، دەخەو کردن.

**خسبیدن:** خەوتن، نووستن. ئارام و ئۆقرەگرتن. "**خسبیدە**": خەوتوو، نووستوو.

**خس پرور:** کەسێك کە خەڵکانی نەفس نزم و پەست پەروەردە دەکا.

**خسپیدن:** خەوتن، نووستن.

**خسّت:** رژدی، چکووسی، پیسکەیی، چنۆکی، چرووکی، قڕنیسی، سەقیلی، دەست قووچان.

**خستگی:** شەکەتی، ماندوویی، ماندووەتی، ماندوێتی، مانگی، مانیاگی، مەنگی، پاکەمی، کفتی، کۆستکبرین. "**خستگی بسیار**": لاکەیسەرهاتن، لۆسی، ماندووبوونی زۆر. "**رفع خستگی**": ماندوویی دەرکردن، حەسانەوە.

**خستگی درکردن:** حەسانەوە، ماندوویی دەرکردن، لە ماندوویی رزگاربوون.

**خستگی‌ناپذیر:** ماندوویی نەناس.

**خستن:** (خَ.تَ) 1) رەنجاندن، زیزکردن، تۆراندن، دڵشکاندن، ئێشاندن. 2) بریندار کردن/ بوون. 3) زیزبوون، دڵشکان، رەنجان، زامدار بوون.

**خستو:** 1) درکێن، دانپیانەر، مکوڕ. 2) ناوکی میوە.

**خستوشدن:** دانپیانان، درکاندن.

**خسته:** (خَ.تَ) ناوك، دەنكی میوە.
**خسته:** (خَ.تِ) ماندوو، ماندك، ماندگ، ماندی، مانوو، مانیاگ، مەنە، شەكەت، كەشەنگ، كەلەلا، هەلاك، هیلاك، ئاس و پەلاس، شەقی، فلت، كفت، بەتلّ، بەتلّی. وەڕەز، جاڕز، رەنجاو. زامدار، بریندار.
**خستەجگر:** (خَ.تَ) كەسێ كە جەرگی لەخەم و خەفەتان رەش و زامدار بووە.
**خستەدل:** (خَ.تَ) دڵشكاو، دڵتەنگ، رەنجاو. ئاشق.خەمگین.
**خستەشدن:** ماندووبوون، مانیان، شەكەت بوون، وەڕەزبوون، جاڕزبوون، هیلاك بوون، فلتان، فلبوون، بەتڵین، شل بوون، سست بوون، وەسان، وەستیان، وەستین، بەعجان.
**خستە كردن:** ماندووكردن، مانن، ڤەستاندن، هیلاك كردن، شەكەتی پێدان، شەكەت كردن، وەڕەزكردن، جاڕزكردن، عاجزكردن، وەستاندن، بەعجاندن. "**خستەكنندە**": وەڕەزیهێنەر، جاڕزكەر، ماندووكەر، شەكەتكەر.
**خستیدن:** بڕوانە: "خستن".
**خسر:** (خُ) زیان كردن، زەرەر كردن.
**خسران:** (خُ) زیان، زەرەر.
**خسرو:** (خُ.رَ) پاشا، پاشای گەورە.
**خسرواختران:** بریتی لە خۆر.
**خسروا نجم:** بریتی لە مانگ.
**خسروانە:** پاشایانە، وەك پاشاكان.
**خسروخاور:** بریتی لە خۆر.
**خسروپرویز:** خۆشەویستی شا.
**خسروی:** پاشایەتی، پاشایانە، هەر شتێ كە شیاوی پاشا بێ.
**خسف:** (خَ) 1) تێخستن، تێڕۆكردن. 2) رۆچوون، داتەپین. 3) كەموكووڕی، كەممی.
**خس و خاشاك:** پرووپووش و چیلكەوچاڵ، چكاڵ، پژاڵ، پووش و پەڵاش، پووش و پار، چڵوچێو، درك و داڵ، كاوكۆت، گەرس و گێڵ، گەرش و گێڵ، پەڕوشە، پەڕوش، پڕپیش، چكاڵ، قرش و قاڵ، كرش و گلیش، گزرە، قرشك، خاش، خاشە، خاشاڵ.
**خسودن/ خسوردن:** درووێنە، دروونە، برینەوە بە داس.
**خسوف:** (خُ.سُ) 1) رۆچوون، چوونە ژێر زەوی و ون بوون. 2) مانگ گیران، مانگ گیریان، مان گیران، مان گیریان، رەش داگەڕانی مانگ، هیڤ گرتن، ماگرتە، ماگیرسە. 3) كەم بوونەوە.
**خسیر:** زیان دیتوو، زیان پێگەیشتوو.
**خسیس:** دەست رژد، دەست قووچاو، دەست قووچیاگ، دەس وشك، دەست قرمتی، مست قووژاو، رژد، سەقیل، قرنیس، قرنووس، قارنان، قرتن، قرچۆك، قەمتەر، قەمتەركراو، قیرسیچم، قیرسیچمە، پیسكە، حشكەمرۆ، لەچەر،





شتین، رەزیل، كنۆژ، كنۆس، كونۆش، كۆژۆ، كوێرنان، كۆرنان، نان نەخۆر، نانكوێر، نانكۆر، نان بژێر، نان تاڵ، هەرزان كڕ، كەنسی، گونك ژمێر، هەنگوتك ژمێر، گەوش، گیر، نەنووك هیشك، قنگ قووچیاگ، تۆزڵێهەڵنەستان، گەنووس، دڵچڕ، دل نزم، پارەپیس، پارەپەرست، پنتی، خونك، زوفت، ماڵ نەخۆر، ماڵپارێز، ماڵ دۆست، مووسەنەك، بزگیر، بەخیل، بەرچاوتەنگ، نەكەس، ئاجگی، گووكولێنەوە، چاڤ تاری، چاونەزێر، چكوود، چكووس، چەنچووز، چرووك، چنۆك، چنوویك، مردارخۆر، سمنج، تەماحكار، دەخس، وشك، مچ، مچك.
**خسیسە:** مێینەی "خسیس".
**خسیف:** چاڵی پڕ ئاو لە زەوی بەردەڵان.
**خشان:** (خِ) كۆی "خشن".
**خشت افتادن- بە:** لەدایك بوون، بە دنیا هاتن.
**خشت خشت:** بڕوانە: "خش خش".
**خشت زدن:** خشت بڕین، دەقاڵب كردنی قوڕ بۆ كەرپووچ.
**خشت زن:** خشت بڕ، كەسێ كە كارپووچ دە قالب دەكا.
**خشت زنی:** خشت بڕی، كاری خشت بڕ.
**خشتگر:** بڕوانە: "خشت زن".
**خشتمال:** بڕوانە: "خشت زن".
**خشت نشاندن- سر:** بڕوانە: " زایاندن".
**خشتە:** (خَ.تَ) هەژار، رووت و نەدار، دەس كورت.
**خشتی:** وەك خشت، خشت ئاسا، ماڵێ كە لە خشت چێكرا بێ، هەرشتێكی چوارگۆشە وەك خشت.
**خشخاش كردن:** شكاندن و وردكردن.
**خش خش:** خشە، خشپە، خشتین، شپەشپ، شەپەشەپ، خشەخش.
**خش خش زیاد:** خشپەخشپ، خشەی زۆر.
**خشك:** 1) وشك، ویشك، ئیشك، هشك، هوویشك، هوسك، بێ ئاو، زوا، زوها، قاق، گیای سیس و ژاكاو، هەر شتێ كە ئاو و شێی نەبێ، پێچەوانەی تەڕ. 2) بێ باران. 3) بەستوو، رژیاو، سەهۆڵ كردوو. 4) بێ جووڵە. 5) دەمارگیر و سەختگیر. 6) بێ فەڕش و رایەخ. 7) لەڕ، كز. كەم، كەمۆكە. 8) كەسی قرنیس و دەس قووچاو. 9) پوخت و بێ خەوش. "**بسیارخشك**": وشك و برینگ، ئیشك و برینگ، وشكاوشك، وشك و واعیدە، وشكی لە ئەندازە بەدەر.
**خشك آخور:** 1) ئاخوڕی بەتاڵ، ئاخوڕێك كە كا و جۆی تێدا نەبێ. 2) بریتی لە كەسی نەدار كە هیچی بۆ خواردن نیە. 3) بریتی لە وشكەساڵی.
**خشك آوردن:** بێدەنگیكردن.
**خشكامار:** هەژمار، حەساو، پشكنین، بە وردی تاوتوێ كردن.
**خشكانج:** رەقەڵە، دالگۆشت، لەڕ، كز.
**خشك اندام:** بڕوانە: "خشكانج".

**خشکاندن:** وشک کردنەوە، وشک کردن، وشکەوکردن، وشکەوەکردن، ئیشك کردن، ئەستڕین، داچۆڕاندن، داچۆڕان، (خشکانیدن هیزم تر)قەماندن.

**خشك اندیش:** دەمارگرژ، دەمارگیر.

**خشکاننده:** وشککەرەوە.

**خشکبار:** وشکەبەر، وشکەبار، میوەی وشك کراو وەك مێوژ و لەتکە و قەیسی.

**خشك پهلو:** کز و لاواز، کەسێك کە قازانجی بۆ خەڵکانی دەوروبەری نیە.

**خشك پی:** دۆبڕ، بێ فەڕ، پێ ڕەش.

**خشك جان:** بریتی لە بێسەلیقە، سەرنج نەدەر بە هونەر و جوانی، کەسێ کە ئاشق نەبووبێ و چێژی لە ئەوینداری و خۆشەویستی نەبردبێ.

**خشك دامن:** داوێن پاك، چاکەکار.

**خشك دست:** بریتی لە دەس قووچاو و سەقیل.

**خشك دماغ:** بریتی لە کەسی خەمناك، دڵتەنگ، تەمین، پێچەوانەی"تردماغ".

**خشك ریش:** 1) برین و زامی وشك. 2) بریتی لە دووڕوویی و فروفێڵ و بیانوو. 3) پیاوی گەمژە و پەست.

**خشك ریشی:** بیانووهێنانەوە، پەلپ پێ گرتن.

**خشکزار:** بڕوانە: "خشکسار".

**خشك زدن:** وشك بوون، لە جووڵەو بزووتن کەوتن، حەپەسان.

**خشکسار:** 1) وشکارۆ، وشکەرۆ، هشکارۆ، بێرون، ویرون، چۆڵی قاقڕ و بێ ئاو، زەوی بێ ئالف و ئاو. 2) سەرلێشێواو، سەرگەردان، واق وڕماو، حەپەساو.

**خشکسال:** وشکەساڵ، ئیشکەساڵ، هشکساڵ، ڕەشەساڵ، نەبار، سیاساڵ، ساڵی کەم باران.

**خشکستان:** وشکارۆ، وشکەرۆ، وشکستان.

**خشك سر:** بێئاوەز، بێمێشك، لاسار، سەرسەنگ، گوێنەبیس، تووڕەوتۆسن، چەڵتەباز، کۆڵەوێژ.

**خشك شدن:** وشکەوبوون، وشکەوەبوون، وشك بوون، وشك بوونەوە، ئیشك بوون، ئیشك بوونەوە، کەرسین، ڕەق هەڵاتن، کەم کردن.

**خشك کردن:** بڕوانە: "خشکاندن".

**خشك کن:** مژەك، مژۆك، مژەنە، زوانگ، زوهانگ، نووسراو وشك کەرەوە.

**خشك لب:** تینوو، توونی.

**خشك مغز:** 1) بێمێشك، بێمەژگ، مێشك وشك، گەوج، گەمژە، بێئاوەز، دل ڤەرسیای. 2) بڕوانە:"یاوەگو".

**خشکه:** بەرتیل.

**خشکه پز:** نانەوا، نانکەر.

**خشکی:** وشکی، وشکانی، وشکایی، وشکیایەتی، ئیشکایی، هیشکانی، هیشکایی، هێشکایی، هشکاتی، هشکی، بەژ، ڕەشایی.





**خشکیدن:** وشکەوەبوون، وشك بوونەوە، وشکاوهاتن، وشکاوداهاتن، وشکەڵاتن، وشك هەڵاتن، وشك کردن، هشکیان، بێئاوبوونی کانی و سەرچاوە، هەڵنەدان، لە گەش و نما کەوتن و ژاکان، داچۆڕان، داچۆڕین، داچۆڕیان. "**خشکیدن انگور**": کەوژین.

**خشکیده:** وشکەوەبوو، وشکەوبووگ، ئیشکەوەبوو، وشکەڵاتوو، وشك هەڵاتوو، ڕەقەوەبووگ. کز و لەڕ.

**خشل:** (خَ.شَ) ئەوەی کە بە کار نەیا، هەر شتێکی خراو و بێڕمێن.

**خشم:** تووڕەیی، ڕق، ڕك، قین، قەڵسی، سلی، ئاژر، گژ، خەزر، غەزەب، غەزەو، شیپۆر، جونگ، جەهر، خەید.

**خشم آره:** بڕوانە:"خشمگین".

**خشم آغیل:** بڕوانە: "چشمآغیل".

**خشم آگین:** تێکەڵ بە تووڕەیی.

**خشم آلود:** تووڕە، ڕق هەستاو، هەڵچوو، شەڕاوی.

**خشم انگیز:** ڕق هەستێن، ڕك ورووژێن، قەڵسێنەر، ئەوەی کە دەبێتە هۆی ڕق هەستان.

**خشم برانگیختن:** قین هەستاندن، قین هەڵساندن، ڕك هەستاندن، تووڕەکردن.

**خشم راندن:** تۆڵەسەندنەوە، خاڵیکردنەوەی تووڕەیی بەسەر کەسێکدا.

**خشم فروبردن:** ڕق خواردنەوە، تووڕەیی دەرنەخستن.

**خشمگر:** بڕوانە: "خشمگین".

**خشم گرفتن:** تووڕەبوون.

**خشمگین:** قیندار، بەقین، دڵ پڕڕك، ڕکین، ڕك هەستاو، ڕق هەڵستاو، تووڕە، هەڵچوو، قەڵس، قارس، هێچی، هێرز، هێرس، تەنگەتیلکە، غەزریو، خەیدی، گرگین، درژ، گرژ. "**همیشه خشمگین**": هێرسۆك، هێرسۆکن، هێرسۆکنە.

**خشمگین آشتی ناپذیر:** ڕق ئەستوور، تووڕەی لە ئاشتی نەهاتوو، تووڕەیەك کە دێر ئاشت دەبێتەوە.

**خشمگین شدن:** دەڕقەوەچوون، تووڕەبوون، ڕك چوون، ڕك هەستان، قین هەستان، قەڵس بوون، سڵبوون، سلبین، هەڵچوون، هێرس بوون، هەل پفان، گرژبوون، کرژبوون، کرژهەڵاتن، خەیدین، خەزرین، غەزرین، هەردین. "**خشمگین شدن زیاد**": ڕەش داگەڕان، ڕەش داگیرسان، ئارەق کردن و گرژبوون لە ڕکان.

**خشمگین کردن:** تووڕەکردن، ڕق هەستاندن، قەڵسکردن، سڵکردن، خەیداندن، هەرداندن، هەل پفاندن.

**خشمگینی:** تووڕەیی، گرژی، ڕق هەستاوی.

**خشمناك:** تووڕە، ڕق هەستاو، قەڵس، ئاژری، بەڕك، حێدز، سل. "**بسیار خشمناك شدن**": لە پێست دەرچوون، لەپێست چوونەدەر، تووڕەبوونی زۆر.

**خشن:** 1) تووڕە، بەدخولق، توندوتیژ، دڵ رەق. 1) زبر، سبر، زوور، زرپ، گزم، گەرووز، درشت، کونجڕ، نەپۆڕ، ناڕێك، ئاژ، دژی نەرم و لووس. 3) لەگوێگران، ناخۆش.

**خشنو:** بڕوانە: "خشنود".

**خشنود:** رازی، قایل، قادێ، خۆشحاڵ، شاد، شادمان.

**خشنی:** (خُ.نِ) سۆزانی.

**خشودن:** بڕوانە: "پیراستن".

**خشوع:** کرنۆش بردن، ملکەچ کردن، ملدان.

**خشوك:** (خَ) بڕوانە: "حرامزادە".

**خشونت:** توندوتیژی. گزمی، زبری، سبری، زوڤری. "**خشونت مزاج**": بڕوانە: "یبوست".

**خشونت آمیز:** تێکەڵ بە توندوتیژی، توندوتیژانە.

**خشونت بار:** توندوتیژانە.

**خشونت طبع:** توندخولقی زاتی.

**خشونت طلب:** توندوتیژیخواز.

**خشونت کردن:** توندوتیژی نواندن، بەتوندوتیژی هەڵسوکەوت کردن.

**خشونت ورزی:** توندوتیژی نواندن، توندوتیژیکاری، بەکاربردنی توندوتیژی.

**خشی:** (خَ) ترسان، ترسین.

**خشیت:** (خَ.یَ) 1) ترسین، ترسیان. 2) ترس، خۆف.

**خصاء:** بڕوانە: "اختەکردن".

**خصاصت:** دەست بەتاڵی، دەست تەنگی.

**خصایص:** کۆی"خاصیّت"، تایبەتمەندییەکان، خەسڵەتەکان.

**خصّاف:** زۆر درۆزن. پینەچی.

**خصال:** (خِ) کۆی"خصلت".

**خصّام:** دوژمنایەتی کردن، شەڕکردن، کێشەومشتومڕکردن.

**خصّان:** گەورەکان، مەزنان، بژاردەکان.

**خصب:** (خِ) فرەیی بەرهەمی کشتوکاڵی، خۆش رابواردن، فەڕ.

**خصل:** (خَ) 1) بڕین و جیاکردنەوەی شتێك لە یەکتر. 2) نیشانە پێکان، مەج کردن لە تیرهاوێژیدا.

**خصلت:** خوو و رەوشت، سروشت، خەسڵەت. سفەت، تایبەتمەندی.

**خصم:** دوژمن، نەیار، نەدۆست. دادخواز. خاوەن، مالك.

**خصم افکن:** دوژمن شکێن.

**خصمان:** کۆی"خصیم"، دوژمنان، نەیاران.

**خصمانە:** دوژمنانە، دوژمنکارانە، لە رووی دوژمنایەتییەوە.

**خصمی:** دوژمنی، دوژمنایەتی.

**خصوص:** 1) تایبەتیکردن، لەسەروتر دانانی شتێ یان کەسێك . 2) سەبارەت، بۆنە. "**بەخصوص**": بەتایبەتی. "**درخصوص**": لەبابەت، سەبارەت بە.

**خصوصاً:** بەتایبەتی، گەوشینی، خاسما.

**خصوصە:** بەتایبەتی.





**خصوصی:** تایبەتی، خوخوتی، خوخوویی، خۆیی، هۆمایی، گەوشت، کەسین، خوسووسی. نهێنی و نائاشکرا. "**بخش خصوصی**": کەرتی تایبەت، بەشی خۆماڵی.

**خصوصیّت:** تایبەتی، تایبەتمەندی، گەوشین. دۆستایەتی، گەرموگوڕی.

**خصوصی سازی:** بەتایبەتیکردن، تایبەتاندن، بەکەرتی تایبەتی سپاردن، کەساندن، نادەوڵەتیکردن.

خصوم: دوژمن.

**خصومت:** دژایەتی، دوژمنایەتی، شەڕ.

**خصومت ورزی:** دژایەتیکردن، دوژمن کاری، دوژمنایەتیکردن.

**خصیّ:** بڕوانە: "اختەشدە".

**خصیصە:** تایبەتمەندی.

**خصیب:** زەوی بە پیت و بەرەکەت، زەوی پڕبەرهەم.

**خصیم:** دوژمن.

**خضارم:** (خُ.رِ) پیاوی مەزن و بەپشوو.

**خضر:** (خَ.ضَ) بوونە سەوز، بە رەنگی گەڵای دار دەرهاتن.

**خضر:** (خَ.ضِ) سەوز، سەوزایی، شینایی.

**خضراء:** سەوز رەنگ، گیای سەوز.

**خضوع:** (خُ.ضُ) خاکەڕایی، خاکێتی، خۆشکێنی، خۆکەمگرتن، خۆبەکەم زانین.

**خضوع:** (خَ.ضُ) خۆکەمگر، خۆشکێن، خاکەڕا، بێ دەمار.

**خط:** شوێنی پێنووس لە سەر کاغز یان شتێکی دی، کێڕ، هێڵ، خەت، نووسراوە، رێگەی راست و درێژ، مەودای نێوان دوو خاڵ.

**خطاء:** هەڵە، سووچ، تاوان، خەتا. فۆڵ. "**خطا رفتن**": لە ئامانج نەدران، نەپێکران. دروست جێبەجێنەبوون. "**بە خطا رفتن**": هەڵەکردن، بەهەڵەچوون. "**راە خطا رفتن**": بەلاڕێداچوون، گومڕابوون، هەڵەکردن.

**خطاب:** گوتار، قسەیەك کە رووبەڕوو بە کەسێك بوترێ، پێگوتن، دواندن، لە گەڵ بوون. بڕیار، فەرمان. پەیامی بەنووسراو یان بەلەبزی. نازناو. لێپێچینەوە و سەرزەنش.

**خطابت:** بوونە وتاربێژ، وتاردان، ئاخێوەری.

**خطاب کردن:** بانگ کردن. سەرزەنش کردن. بڕیاردان، فەرمان دان. "**خطاب کردن هالو**": خامۆ، بانگ کردنی پیاوی گێلۆکە بە تەوسەوە.

**خطابە:** پەیڤین، وتاردان.

**خطابەسرا:** وتاربێژ، وتاردەر.

**خطّ استوا:** هێڵی رێکی، هێڵی کەمەرەیی، کەمەرەی زەوی.

**خطّاط:** خۆشنووس، خەت خۆش، نووسیار، جوان نووس.

**خطّاطی:** خۆشنووسی، جوان نووسین.

**خطّاف:** زۆر رفێنەر، دز.

**خط افتادن:** خەت تێکەوتن. چین تێکەوتنی پێست.

**خطّ افقی:** هێڵی ئاسۆیی.

**خطاكار:** هەڵەكار، خەتابار، تاوانبار، گونەهبار، گونەهكار.

**خطاكردن:** هەڵەكردن، تووشی خەتابوون. لە ئامانج نەدرانی تیر.

**خطا گرفتن:** خەتاگرتن.

**خط الرأس:** هێڵێ كە بەرزترین خاڵەكانی رشتەكێوێك پێكەوە دەبەستێتەوە، تیرەگ.

**خط المركزین:** هێڵێ كە چەقی دوو جەغز پێكەوە دەبەستێتەوە.

**خط بسته:** هێڵێ كە دوو سەرەكەی پێك گەیشتبێتەوە.

**خطبه:** (خُ.بَ) دوان، وتە، وتار، وتاروێژی، ئاخێوەری، پێشەكی كتێب. "**خطبه به نام كسی خواندن (شدن،كردن)**": بە فەرمی راگەیەنرانی خەلافەت یان پاشایەتی ئەو.

**خطبه:** (خِ.بَ) خوازبێنی، ژنی خوازبێنی كراو.

**خطر:** جێ یان كاری پڕ لە مەترسی، تەلووكە، تالووكە، تەلەزگە، بزدینۆك، قەستەسەر، خەبار، بڤە، خەتەر.

**خطرجویی:** بڕوانە: "ریسك".

**خطرداشتن:** مەترسیداربوون، ئەگەری زیان دیتن. هەبوونی نرخ و گرینگی، گرنگ بوون.

**خطرزدن:** خۆخستنە مەترسییەوە.

**خطر كردن:** خۆخستنە مەترسییەوە، كاری مەترسیدار كردن.

**خطر گذشتن:** لاچوونی مەترسی، رەوینەوەی خەتەر.

**خطرناك:** مەترسیدار، جێی مەترسی، زەرندە، نائەمین، بڤە، نەتەكن. گرانبایی، بەنرخ، گرینگ.

**خطری:** مەترسیدار، جێی مەترسی. خاوەنی پلە و پایە، رێزدار.

**خطّ شعاعی:** لە زاراوەی هێندسەدا هێڵێكی راستە كە سەرێكی دیار بێ و نیوهێڵێشی پێدەڵێن.

**خطف:** رفاندن، بە خێرایی فڕاندن.

**خطّ طولی:** هێڵی درێژی.

**خطّ عرضی:** هێڵی پانی.

**خطّ عمودی:** هێڵی (ئەستوونی/ ستوونی).

**خطّ فاصل:** جیاكەرەوە هێڵ.

**خطّ كش:** راستە، مەستەڕە، ئامرازی خەت دان.

**خطّ مایل:** هێڵی لار.

**خطّ مستقیم:** راسا، راستا، راستە هێڵ، هێڵی راست.

**خطّ مشی:** رێچكە، رێباز.

**خطّ منحنی:** هێڵی (چەماو/ چەماوە) ، ناڕاستە هێڵ.

**خطّ منكسر:** هێڵی (شكاو/ شكاوە)، هێڵی پێكهاتوو لە چەند هێڵی راست.





**خطّ میخی:** خەتی بزماری، هێڵێ كە نیشانەكانی بە فۆڕمی بزمارە و لە نووسراوە كۆنەكان دا بەكار هاتووە.

**خط نویس:** بڕوانە:"خطاط".

**خطور:** هاتنەوە یاد، وەبیر كەوتنەوە، بە زەین گەیشتن.

**خطوط:** كۆی"خط"، هێڵەكان، نووسراوەكان.

**خطوط متقاطع:** هێڵە یەكتربڕەكان.

**خطوط متلاقی:** هێڵە بە یەك گەیشتوەكان.

**خطوط متوازی:** هێڵەتەریبییەكان، هێڵە تەریبەكان.

**خطوه:** هەنگاو، شەقاو، پێنگاڤ.

**خطّه:** 1) زەوینی سنووردار، زەوییەك كە بۆ ساز كردنی ماڵ هێڵ كێشرابێ، زەوی بەرتەسكی كەسێك یان قەبیلەیەك. 2) مەڵبەند، شاری گەورە، وڵات.

**خطّی:** 1) دەستنووس، بە دەست نووسراو. 2) هێڵدار، بەهێڵ. 3) تاك رەهەندی.

**خطیب:** وتاربێژ، بێژەر، قسەكەر، پەیڤەر، ئاخێوەر.

**خطیر:** 1) گرنگ، بەنرخ. 2) زۆر، فراوان. 3) مەترسیدار. 4) دژوار، سەخت. 5) هێژا، رێزدار، خاوەن رێز و پێگە، پایەبەرز.

**خفا:** نهێنی، پێوار، نادیار، شاراوە، پەنامەكی، نەپەنی. "**درخفا**": بەنهێنی.

**خفت:** (خِ) گرێ، ئاڵقە. "**خفت افتادن**": گرێتێكەوتن، ئاڵقەبوون. تووشی گێرەوكێشەبوون. "**خفت كردن**": گرێلێدان. بستنەوە بە پەت و تەناف و شتیوا. خستنە تەنگانەوە، گێرخستن. "**خفت كسی را گرفتن(چسبیدن)**": خستنەتەنگانەوە، گیرهاوردن.

**خفَت:** (خ.فَ) سووك بوون، سووكی لە لەش یان ئاوەز یان كار دا، سەرشۆڕی. "**خفت دادن**": سووك كردن.

**خفتان:** ژێرزرێ، جلی ئاوریشم كە لە بن زرێوە دەپۆشرا.

**خفتانیدن:** خەواندن، خەولاندن.

**خفتن:** خەوتن، نووستن، هەفتەن، نڤستن، خەفان.

**خفت وخو:** خەوتن.

**خفت و خیز:** خەوتن و هەستان. بریتی لە شێنەیی و مدارا و بێئارامی و بێ ئۆقرەیی. هاونوێنی، هاوجێیی.

**خفته:** خەوتوو، نووستوو، هەفتە. درێژبوو، تخێلێ بوو. خافڵ، بێخەوەر. چەمیو، چەماوە.

**خفتیدن:** بڕوانە: "خفتن".

**خفج:** بڕوانە: "كابوس".

**خفده:** چەماو، چەماوە، لار.

**خفرگ:** بێغیرەت. ناحەز و پیس. گەوج.

**خفسیدن:** خەوتن، نووستن.

**خفش:** (خ.فَ) تووش بوون بە كز بوونی چاو و تەسك بوونەوەی چاو.

**خفض:** نزمكردن، دابەزاندن، داشكاندن. خۆشگوزەرانی.

**خفض جناح:** سەنگینی و ئارامی، خاکەڕایی و خۆبەکەم گرتن. باڵ شۆڕکردن.

**خفقان:** 1) لێدانی دڵ، دڵەخورپێ، دڵەڕاوکێ. 2) زەبروزەنگ، قەرەقۆپ، قڕوقەپ. "**خفقان کردن**": لێدان. وەجووڵەکەوتن. "**خفقان گرفتن**": بێدەنگ بوون، قسەنەکردن. تووشی خەفەبوون هاتن.

**خف کردن:** بەبێ دەنگی لە گۆشەیەك دانیشتن. بۆسەدانان. کەم کردنەوەی ڕووناکایی شوێنێك و تاریك کردنی. کووژانەوەی ئاگر بە هۆی نەگەیشتنی هەوا پێی.

**خفگی:** تاسەنە، نەفەس بڕان، پشوونەمان، وەهەناسەبڕکێکەوتن. تاریك بوونی فەزای شوێنێك.

**خفنج:** ناز و خەمزە، سوود و قازانج.

**خفەخون گرفتن:** بێدەنگ بوون.

**خفەشدن:** مردن بە هۆی هەناسەبڕان. خنکان، خنکیان، خنجکان، خەندقان، خەندقین، پشوولێبڕان، هەناسەنەمان، هەناسەبڕان. بێدەنگ بوون، نووزەبڕان. "**خفەشدە**": خنکاو، خنکیاو، پشوولێبڕاو، هەناسەبڕاو. "**جانور خفەشدە**": خنکێنراو، خنکێندراو، گیانداری کە خنکاندوویانە.

**خفەکردن:** خنکاندن، خنکانن، خنجکاندن، خەندقاندن، جیکەبڕین، بێ دەنگ کردن، پشوولێ بڕین، خپ کردن، نووزەبڕین، خەفەکردن. بێدەنگ کردن. کووژاندنەوە، تەمراندن. کوشتن بە گوشینی گەروو. "**خفەکنندە**": خنکێن، پشوولێ بڕ.

**خفیّ:** داپۆشراو، شاراوە، نادیار، گۆشەگیر، تەریك.

**خفیدن:** 2) هەناسەدان، نەفەس کێشان، پشوودان، پژمین. 2) لەرزین، خنکان. 3) ناودار، بەناوبانگ. 4) ئاشکرابوون، دەرکەوتن.

**خفیر:** پاسەوان، نگابان، پارێزەر، پشتیوان.

**خفیف:** 1) سووك، سڤك، سووك و خێرا لە کار و جووڵەدا. 2) کەم، پاژەکی. 3) نادیار، ناڕوون، هێواش. 4) سووك، پەست، بێ نرخ.

**خفیّە:** (خَ.یَ) شاراوە، نادیار.

**خفیە:** (خُ.یَ) 1) پەناگرتن، خۆوەشارتن، خۆشاردنەوە. 2) نهێنی، پەنامەکی.

**خفیەنویس:** (خُ.یَ) نووسەری نامە نهێنییەکان، مەئموری نهێنی.

**خل:** (خُ) شێتۆکە، وەك شێت، نیوەشێت، شەل و شێت، شێت وێت، شل و پەتیار، سەرشێت، نیوە لێوە، سائەقڵ، ئەبتەر، پەتیارە، دەبەنگ، گێل و نەفام، کەللەیی، نیڤدین، تەرەدین، دەلوکار، دەلی، لولسە، کەم ئاوەز، گێژ و وڕ، هاوی، خول.





**خلاء:** بۆشایی، بەتاڵایی، ڤالاهی، ڤالایی، چۆڵی، شوێنی خەڵوەت.

**خلائف:** کۆی "خلیفە".

**خلائق/ خلایق:** کۆی "خلیقە"، خوڵقاوەکان، بەدیهاتووەکان، خەڵك، جەماوەر.

**خلاب:** (خَ) قوڕولیتە، ئاوی لیخن، زۆنگاو، بڵقاو، زنە.

**خلاب:** (خِ) هەڵخەڵەتاندن، خڵەتاندن بە زمانی لووس.

**خلاّب:** (خَ) پیاوی زمان لووس و خڵەتێن.

**خلاص:** ڕەها، ئازاد، ڕزگار، قوتار.

**خلاص دادن:** ئازادکردن، ڕزگارکردن.

**خلاص شدن:** ڕزگاربوون، ڕزگاری، ئازادبوون، قوتاربوون، بەربوون، بەڕەڵابوون، وێل بوون.

**خلاص کردن:** ڕزگارکردن، ئازادکردن، قوتارکردن، بەڕەڵاکردن. کوشتن، لەسێدارەدان.

**خلاصە:** پوختە، هەڵبژاردە، بژاردەی قسە، کورتە. بەکورتی.

**خلاصەسازی:** کورت کردنەوە.

**خلاصەکلام:** پوختەی ئاخاوتە، کورتەی بێژە، کرەیدی. بە کورتیەکەی.

**خلاصی:** ڕزگاری، قوتاری، دەربازی. "**خلاصی دادن**": ئازادکردن، ڕزگارکردن. "**خلاصی یافتن**": ڕزگاربوون، دەربازبوون.

**خلاف:** 1) کێشە و نێوان ناخۆشی، ناسازگاری، دژایەتی. 2) سووچ، ناڕەوا، ناڕاست، نەباش، خەراو، درۆ، کاری ناحەز و دزێو. 3) پێچەوانە، دژ، ناتەبا. "**خلاف افتادن**": سەرهەڵدانی جیاوازی بیروبۆچوون. "**برخلاف**": دژی، بەپێچەوانەی.

**خلاف آمد:** ناکۆکی، ناتەبایی، دژایەتی.

**خلاف عرف:** دژی ئایینی باو.

**خلافت:** جێنشینی، بوونە خەلیفە، پێشەوایی.

**خلافکار:** کەسێ کە کاری ناحەز و نەشیاو ئەنجام دەدا، تاوانبار، خەلافکار.

**خلاف کردن:** 1) کاری نایاسایی‌کردن، تووشی تاوان بوون. 2) دژایەتیکردن. 3) هەبوونی جیاوازی بۆچوون. 4) قسەی ناڕاست گوتن، درۆگوتن.

**خلاق:** (خَ) بەش، پشك.

**خلاّق:** (خَ) داهێنەر، ئافرێنەر، خوڵقێنەر. خودا.

**خلاقیّت:** خوڵقێنەری، داهێنەری، داهێنەرێتی، ڕسکێنەری.

**خلاقیّت هنری:** دەستڕەنگینی.

**خلال:** مەودای نێوان دوو شت، بەین. "**در خلال**": لەماوەی. لەنێوان. لەناوەڕاستی. "**گیاەخلال**": خەڵتانە، خەلیلە. "**خلال دندان**": داناژن، دان ئاژن، هلال.

**خلانش:** بڕوانە: "تزریق".

**خلاننده:** پیاچەقێن، تێهەڵچەقێن.

**خلانیدن/ خلاندن:** ئاژن، ئاژنین، پیاچەقاندن، تێچەقاندن، تێڕۆکردن، هەڵچەقاندن، بە دەوری یەکا تێوەکردن، کۆڵینەوە و تێوەکردنی نووك تیژ بە شتێکدا.

**خلاوە:** تاساو، وڕ، سەرلێشێواو، پەشۆکاو.

**خلایق:** بنیادەمەکان، خەڵك. بوونەوەرەکان، خوڵقاوەکان.

**خلبان:** فڕۆکەوان، فڕۆکەئاژۆ.

**خلپلە:** ناڕاستی، مەکر، کاری تێکەڵ پێکەڵ.

**خلّت:** دۆستی و برایەتی.

**خلخال:** پاموورە، پاوانە.

**خلد:** هەرمان، نەمری، مانەوە، بەردەوامی.

**خلدبرین:** بەهشتی سەرتر.

**خلدستان:** بەهشت.

**خلسە:** 1) حاڵەتی نێوان خەو و هوشیاری کەسی عارف و سۆفی، جەزمە، جەزم بوون، "Rapture" . 2) هەلی لەبار.

**خلش:** تێچەقینی شتێکی نووك تیژ لە جسمێك. خوران.

**خلص:** (خِ) دۆستی تایبەتی، دۆستی گیانی، زۆر گەرموگوڕ.

**خلّص:** (خُ.لَ) کۆی "خالص".

**خلط:** (خَ) تێکەڵ کردن/ ئاوێتەکردنی دووشت کە ببێتە هۆی هەڵە. "**خلط مبحث**": تێکەڵ کردنی دوو بابەت دەگەڵ یەکتر یان هاوردنی مەسەلەگەلی لاوەکی لە ناو بابەتی سەرەکی بە جۆرێ کە مەسەلەی سەرەکی بخاتە ژێر تیشکی خۆی.

**خلع:** (خَ) داکەندن، داماڵین. لێخستن، لەسەرکار دەرکردن، وەلانان. تەڵاق دانی ژن. ترازانی ئەندامێکی لەش.

**خلع:** (خِ.لَ) کۆی "خلعت".

**خلع سلاح:** (خَ.عِ. سِ) چەك کردن، چەك لێسەندن، چەك داماڵین، لەچەك کردن، ژچەك کرن.

**خلعت:** خەڵات، قەلەقندا، دیاری گەورەپیاوان.

**خلعی:** پێوەبەسراو(ژن).

**خلع ید:** شتێ یان جێگەیەك لەڕێگەی یاساییەوە لە ژێر دەسەڵاتی کەسێك دەرهێنان، کۆتاییهێنان بە دەستێوەردانەکانی کەسێ.

**خلف:** (خُ) پێچەوانە، درۆ، پەیمان شکێن.

**خلف:** (خَ) دوا، پاش، پشتەسەر.

**خلف:** (خَ.لَ) وەجاخ، نەوە، منالی باش و چاك. جێنشین. بەدەڵ، جێگرەوە.

**خلفاء:** (خُ.لَ) کۆی "خلیفە".

**خلفی:** دواوە، پشتەوە.

**خلق:** (خُ) ئاکار، نەریت، عادەت، خوو، مەشرەف، راوێژوڕوو. "**خلق کسی تنگ بودن**": قەڵس و نارەحەت بوونی ئەو. "**سر خلق آمدن**": وەلانانی بەدخوڵقی، خۆش ئەخلاق بوون، هاتنەوە سەر بار.





**خلق:** (خَ) 1) خوڵقاندن، ئافراندن، داهێنان، دروست کردن. 2) گەل، خەڵك، خەڵکان.

**خلقت:** 1) بواندن، کردەی خوڵقاندن، سرشت، سروشت، بوون. 2) بڕوانە: "شمایل".

**خلق شدن:** هاتنەدی، چێبوون، ئافران، دروستبوون.

**خلقیات:** خەسڵەت و سروشت.

**خلل:** (خَ.لَ) 1) درز، کەلێن، کەلەبەر. 2) ئاڵۆزی کارەکان، پشێوی و ئاڵۆزی. 3) تێکچوون، تێکدران. 4) ناتەواوی، کەمی، کەموکووڕی. 5) درێغی، تەنەخی. 6) زیان، زەربە.

**خلل رساندن:** زیان پێگەیاندن، زەربە لێدان، تێکدان.

**خلل ناپذیر:** کەلێن هەڵنەگر، درز تێنەچوو، قایم و پتەو.

**خلنگ:** بەڵەك، دوو رەنگ، بازگ، بازە، وازە، پیسە.

**خلوات:** کۆی "خلوت".

**خلوارەبستن:** بەجێمانی ئاگر و خۆڵەمێش دوای سووتانی چێو و هتد.

**خلوت:** خەڵوەت، تەریك، تەنیایی، جێگەی تەنیایی، چۆڵ. هەلی لەبار. تەنیامانەوە لەگەڵ هاوسەر یان دلبەر بۆ رابواردن.شوێنێ کە بێگانەی لێنەبێ. هاوجێیی.

**خلوت سرا:** خەڵوەت خانە، ماڵێ کە بێگانەی تێدا نەبێ، ژووری تایبەت بە کەسێك.

**خلوت کردن:** خاڵیکردنی شوێنێ لە کەسانی بێگانە بەتایبەتی بەمەبەستی تەگبیرکردن لە تەك کەسێکدا. رێکوپێك کردنی شوێنێ بە کەم کردنەوەی ئەو شتانەی لەوێن. نزیکیکردن، لێك جووت بوون.

**خلوتگاه:** خەڵوەتگە، جێیەك کە بێگانەی تێدا نەبێ، شوێنی تەریکی و گۆشەگیری.

**خلوت گزیدن:** دووریکردن لە دیتران.

**خلوت گزین:** خەڵوەت بژێر، گۆشەنشین، تەنیا.

**خلوت نشین:** تەرکەدنیا، عارف. خەڵوەت نشین.

**خلوتی:** گۆشەنشین، تەنیا، کەسێ کە لە تەنیایی دا دەژی.

**خلود:** نەمری، هەمیشەیی، بەردەوامی.

**خلوص:** پاکی، خاوێنی، پاقژی و سادەیی. "**خلوص نیّت**": بڕوای سادقانە و بەدوور لە ریابازی.

**خلە:** هەرشتێکی نووك تیژ. 2) ئێشی کتوپڕ. 3) دەنگ و هەرا. 4) قسەی قۆڕ. "**خلەکردن**": تەرك کردن، وازهێنان.

**خلیج:** کەنداو، لاوچ، دەڵاو، شوێنێ کە لایەکی ئاوە و سێ لای وشکانییە.

**خلیدن:** پیاهەڵچەقین، داچەقان، پیاچوون، تێراچوون، تێڕۆچوون، تێ هەڵچوون، تێهەڵچەقین، تێچەقینی دەرزی یان بزمار، هەڵچەقان، هەڵچەقین. رەخنەکردن، پێدزکەکردن. برینداربوون، زامداربوون. رەنجاندن، ئێشاندن. تەزووی بەژان، مچوورك.

**خلیط:** شەریك، هاوبەش.هاودەم، هاونشین.

**خلیع:** مناڵێ کە لەلایەن باببییەوە دەرکرابێ، کەسێ کە لە بەرپرسایەتییەکەی وەلا نرابێ. و کەسی حەیاتکاو و پیس و سەرەڕۆ.

**خلیعە:** مێینەی"خلیع"، ژنی سەرەڕۆ و خۆسەر کە هەر کارێکی پێی خۆش بێ بیکا.

**خلیفە:** جێنشین، قایم مقام. "**خلیفە را وارد بغداد کردن**": ئیلاقەکردن، گان کردن.

**خلیق:** شیاو، شایستە، گونجاو، هاوخوڵق و خوو. خۆش خوڵق.

**خلیقە:** خوو، خدە، سرشت، خوڵقاو، خەڵك.

**خلیل:** دۆستی دلۆڤان و یەکدڵ، دۆستی تایبەتی، دۆستی راستگۆ.

**خم:** چەم، چەماو، خەم، لار، پێچ و لوولی ئەگریجە و کەمەند.

**خماخم:** پێچەڵاوپێچ، پڕ پێچ و پڵووچ.

**خمّار:** (خَ) مەی فرۆش، شەڕاب فرۆش.

**خمار:** (خُ) خومار، کەسێ کە دوای سەرخۆشی سەری دێشێ، حاڵەتی دوای سەرخۆشی.

**خمارآلود:** خوماراوی، چاوێ کە حاڵەتی خوماری تێدا بێ.

**خمارخانە:** مەیخانە.

**خمارزدە:** کەسێ کە تووشی حاڵەتی خوماری هاتبێ.

**خمارکش:** کەسێ کە لە حاڵەتی خوماریدا بێ.

**خماش:** هەر شتێکی بێ کەلك کە بۆ فرێدان بێ، بەدەردنەخۆر.

**خماندن:** بڕوانە: "خم کردن".

**خم خوردن:** بڕوانە: "خمیدن".

**خم دادن:** بڕوانە: "خم کردن".

**خمدار:** بڕوانە: "تابدار".

**خم زدن:** چەمینەوە، چەمانەوە. هەڵاتن، راکردن.

**خمس:** پێنج یەك.

**خمش:** ( خَ.مُ) بڕوانە: "خاموش".

**خمش:** (خَ.مْ) بڕوانە: "خراشیدن".

**خمش:** (خَ مِ) بڕوانە:"انحنا".

**خم شدن:** کرنۆش بردن، داهاتن، داهاتنەوە، دانەوان، دانەوین، دانەوینەوە، نەوین، نووشتانەوە، خۆچەماندن، نەویبوونەوە، خواربوونەوە، لارەوبوون، لار بوونەوە، کووزبوون، دوولاوەبوون، قولزاندن، قولزین، چڤان، چەمان،





چەمانەوە، چەمیانەوە، چەمینەوە، چەوتانەوە، نەمینەوە، قەلان کردن، ڤەچەمان، ڤەچەمیان، تابوون.

**خمش نا پذیر:** کەللەڕەق، لەئاشتی نەهاتو، نەسازاو.

**خم کردن:** مووچاندن، مووچاننەوە، تماندن، چفاندن، چەڤاندن، چەماندن، چەمانن، چەماننەوە، چەماندنەوە، ڤەژەماندن، چەوتاندنەوە، دانەواندن، دانواندن، نەواندن، لارەوکردن، لارەوکردن، داهێڵاندن، داهێنان، نووشتاندنەوە، دانووشتاندن، خوارەوکردن، خوارکردنەوە، لارکردنەوە، لەهەڤـ تەواندن، ناییش رۆ.

**خم و چم:** ناز و عیشوە.

**خمود:** 1) کووژانەوەی ئاور، دامرکانەوەی بڵێسەی ئاگر. 2) لەهۆش چوون، بوورانەوە.3)سستی، بێهێزی، بێحاڵی.

**خموش:** (خَ.مُ) بڕوانە: "خاموش".

**خموشانە:** بێدەنگانە، بێدەنگ ئاسا.

**خموشیدن:** قسەنەکردن، بێدەنگ بوون.

**خمول:** (خُ) بێناو و نیشان بوون، گوم ناوی، نەناسراوی.

**خمیاز:** بڕوانە: "خمیازە".

**خمیازە:** باوێشك، باوشك، ئاژاژك، ئاژاشکە، وێژە، گرگەش، دەبەنك، دەبانك، وەلایش. "**خمیازەمتوالی**": زڕەباوێشك.

**خمیدگی:** چەماوەیی، چەمین، چەمانەوە، لاری، پێچ دراوی.

**خمیدن:** چەمانەوە، چەمیانەوە، چەمین، چەمینەوە، چەڤین، ڤەچەمیان، ڤەچەمان، قۆزبوون، قۆپ بوون، قۆخدان، قۆزبوون، قۆزین، قۆقی، داهاتن، داهاتنەوە، لاربوون، لاربوونەوە، لارەوبوون، لارەوەبوون. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "خم شدن". "**خمیدە**": چەم، چەماو، چەمیو، چەمیوە، چەماوە، داهاتوو، خوارەوەبووگ، لارەوەبووگ، لارەوەکراو، چڤی، چڤیای، چەلەك، چەوتاوە، چەمتاوە، دوولا، شەڤی، شەڤین، قلووچ، قۆخ.

**خمیرکردن:** کردنەهەویر. نەرم کردن.

**خمیرگیر:** هەویرشێل.

**خمیرە:** کاکڵ، ناوەرۆك.

**خناق:** بڕوانە:"دیفتری".

**خنبانیدن:** (خُ) لاسایی کردنەوەی هەڵسوکەوتی کەسێك بۆ گاڵتە و تیز پێکردن.

**خنبیدن:** (خُ) چەپڵەلێدان، چەپڵەڕێزان، چەپڵەکوتان. بە مانای سەما کردنیش هاتوە.

**خنثی:** 1) نە نێر نەمێ، نێرومێ، ئێرەمووك، نێرەمووك، نێرمۆ، نێرمۆك، نێرمووك، بێ رەگەز. 2) کەمتەرخەم. 3) ناچالاك، پاسیڤ. 4) بە مانای بێکارە و ناکاریگەریش دێ. 5) لە شیمیدا: هاوبارگە. 6) (پزیشکی) هاوتا.

**خنثی سازی:** بڕوانە: " خنثي کردن ".

**خنثـی شـدن:** لەناوچوونی کارایی و کاریگەری شتێ. هەڵوەشانەوە، پووچەڵبوونەوە.

**خنثـی کـردن:** پووچەڵ کردنەوە، هەڵوەشاندنەوە. لە کاریگەری خستن.

**خنج کشیدن:** بڕوانە: "خراشیدن".

**خند:** سووکەڵەی "خندە".

**خندان:** دەم بە پێکەنین، خەندەران، خەنەران، ڕووخۆش، خۆش ڕوو، ڕووگەش، ڕوولکەن، خەنۆل، لە حاڵی پێکەنیندا. پشکووتو، گەش، گەشاوە. **"گل خندان"**: گوڵی پشکووتوو.

**خنداندن:** وەپێکەنین خستن، ناچار بە پێکەنینکردن، کەناندن.

**خندخند:** تریقانەوە، تریقوهوڕ، تریقەتریق، پێکەنین بە دەنگی بەرز، پێکەنینی بە قەو، خەنینەوە.

**خندریس:** شەڕابی کۆنە. بە گەنمی کۆنەش وتراوە.

**خندستان:** 1) کۆڕی پێکەنین و شۆخی و قەشمەری. 2) بریتی لە دەم و لێوی دڵبەر.

**خندستانی:** گاڵتەپێکردن، قەشمەری پێکردن.

**خندمین:** پێکەنیناوی، کەنیناوی، پێکەنین هێن.

**خندناك:** بڕوانە: "خندەناك".

**خندوتند:** ژێروژوور، پرژوبڵاو و پەرێشان، تەفروتوونا، تەرت و توونا.

**خندە:** پێخەنین، پێکەنین، خەنین، کەنوو، وەیایش، ویەیش، هەوایش، کرانەوەی لێوەکان لە شادی و خۆشحاڵی، پێچەوانەی گریان. **"خندە بر کسی زدن"**: گاڵتە پێکردن بەو.

**خندەآور:** پێکەنین هێن، ئەوەی کە دەبێتە هۆی پێکەنین.

**خندەخریش:** کەسێ کە خەڵك پێی پێبکەنن و گاڵتەی پێ بکەن، گاڵتەجاڕ، گەپجاڕ.

**خندەدار:** پێکەنیناوی، کەنیناوی.

**خندەرو:** کەنۆك، ڕووخۆش، ڕووکەن، دەم بە پێکەنین، خەندەران.

**خندەریش:** بڕوانە: "خندەخریش".

**خندەزدن- زیر:** لە قاقای پێکەنین دان، پێکەنین.

**خندە قباسوختگی:** پێکەنینی ڕواڵەتی.

**خندەناك:** شاد، ڕووخۆش، ڕووکەن، خەنەران.

**خندیدن:** پێکەنین، کەن، کەنن، کەندن، کەنین، کەنیان، پێخەنین، خەنین، خەنەکردن، بزە هاتنە سەر لێو، ووی، ووياتەی، وويايش، هەوایش.کرانەوە، پشکووتن. ڕووناك بوونەوە.

**خنس و فنس:** گرفتاری، ناڕەحەتی، بەدبەختی. **"بە خنس و فنس افتادن"**: گرفتاربوون، تووشی ڕەنج و سەختی بوون.

**خنشان:** پیرۆز، موارەك.





**خنك:** 1) فێنك، فونك، هۆنك، هوونك، هووینك، هێنك، سارد، چای، چایگ. 2) پیرۆز.

**خنكا:** بڕوانە: "خوشا".

**خنكی:** فێنكی، فێنكایی، فێنكاوی، فێنكایەتی، فوونكی، هوونكایی، هێنكایی.

**خنگ:** (خِ) کەم زەین، گەمژە، گەوج، کەم ئاوەز، نەفام.

**خنگ زیور:** ئەسپی بەڵەك، ئەسپی دوو ڕەنگ.

**خنگ شبآهنگ:** ئەسپی بەڵەك. و بریتی لە مانگ و بەیانی ڕوون.

**خنگ گردون:** بریتی لە خۆر.

**خنوس:** (خُ) شاردنەوە، حەشاردان، نادیارکردن.

**خنیا:** سروود، گۆرانی، ستران.

**خنیاگر:** گۆرانی بێژ، سروودخوێن، گۆبەندگێڕ، لۆتی، قامبێژی داوەت و بەزم، مووسیقاژەن، ئامێرژەن.

**خنیدن:** (خَ.نِ.دَ) 1) دەنگ دانەوەی دەنگ لە کێو و حەمام و گومبەز. ناودەرکردن. 2) پەسندکردن و هەڵبژاردن.

**خنیدە:** ناودار، بەناوبانگ، پەسندکراو، هەڵبژێراو، خوێنراو.

**خو:** (خُ) خوو، خدە، خدێ، خەدە، خولق، خوڵك، ڕەوشت، سرشت، عادەت. **"خو بریدن"**: تەرکی عادەت کردن.

**خواب:** خەو، خەف.

**خواب آشفتە:** ئاشۆپاشۆ، خەونی تێکەڵ پێکەڵ و ئاڵۆز.

**خواب آلود:** خاوالی، خەوالوو، خۆوالی، خەواوی، چاو بە خەو، خەو بەر نەداو، وەرماوی.

**خوابآلودگی:** خەواڵوویی، چاو بە خەوی.

**خواب آمدن:** خەوهاتن، ئیشتیا لە خەوتن بوون.

**خواب آور:** خەوهێنەر، نوێنەر.

**خواباندن/ خوابانیدن:** 1) خەواندن، خەفاندن، خەفانن، نواندن، لەخەوکردن، کردنە خەو، دەخەو کردن، نوادن، نوانن، نڤاندن، نڤستاندن.2) ئەنبارکردن، پاشەکەوت کردن. 3) دامرکاندنەوە، ئارام کردنەوە. 4) زللەلێدان، شەپلاغەلێدان. 5) ڕووخاندن، خراوکردن. 6) دانیشاندنی مریشك لە سەر هێلکە. **"خواباندن حیوان"**: ئیخ دان، مەرخاندن.

**خواب بند:** بە جادوو دەخەو کردن.

**خواب پراندن:** خەوزڕاندن، خەوپەڕاندن.

**خواب پریدن:** خەوزڕان، خەوزڕین، خەوتەقین، خەوڕەوین، لە خەو بێبەش بوون، هورمەزڕ.

**خواب پریشان:** خەونی ئاڵۆزبالۆز، خەوی بێ سەروبەر، پەرێشان.

**خواب دیدن:** خەوبینین، خەودیتن، خەون دیتن، دیتنی شتان لە خەو دا، هەون دەییش، هەون ڤیانایش.

**خواب رفتن:** 1) بڕوانە: "خوابیدن". 2) تەزین، سڕبوونی دەست یان پێ بە هۆی گوشارێکەوە.

**خواب زدە:** خەواڵوو. خومار.

**خواب سبك:** سووکەخەو، سووکەڵەخەو، سەرخەو، کەروێشکەخەو، گورگەخەو.

**خوابستان:** بڕوانە: "خوابگاە".

**خواب سنگین:** خەوی قورس، خەویگران. "**خواب بسیار سنگین**": خەواتەمار، خەوی زۆر گران.

**خواب کردن:** کردنەخەو. خەوتن. فریودان.

**خوابگاە:** 1) خەفگە، خەوگا، جێ خەو، ژووری خەو.2) نوێن، جێوبان. 3) گۆڕ، قەبر. 4) کاتی خەو. "**خوابگاە دستجمعی**": قاوش، شۆقە، شوێنی نووستنی بە کۆمەڵ.

**خوابگردی:** بەڕێگەداڕۆیشتن لە خەودا، هەستان و ڕۆیشتن لە خەودا.

**خواب گزار:** خەو لێکدەرەوە، شرۆڤەکەر، شرۆکەر.

**خواب گزاردن:** شرۆڤەکردنی خەون.

**خوابناك:** بڕوانە: "خوابآلود".

**خوابنامە:** خەونامە، کتێبی خەون لێکدانەوە.

**خوابنیدن:** سووکەڵەی"خوابانیدن".

**خوابیدن:** 1) خەوتن، خەفتن، نووستن، هەفتەن، نڤستن، نشتش، هاون، هەونا، رازان، نڤان، وتش، لالاکردن، لالیکردن. 2) درێژبوون. 3) جێگرتنی شتێ لەسەر شتێکیدی. 4) دامرکانەوە، ئارام بوونەوە. 5) پاشەکەوت بوون، کەڵەکەبوون.6) لەکارکەوتن. 7) راگیرانی پرۆسەی بەرهەمهێنان یان خەدەماتی. 8) راوەستانی کڕین و فرۆشتن. 9) رووخان، رمیان، داتەپین. 10) نێژران، ژێرخاك خران. 11) لەجێدابوون، لەجێ داکەوتن. "**خوابیدن حیوان**": مەرخان، ئیخ خواردن. "**خوابیدنکی**": بە حاڵەتی خەوتوو.

**خوابیدە:** خەوتوو، خەوتگ، خەفتگ، نووستوو، نووستگ، نووستی، نڤستی، نڤت.

**خواتم:** کۆی"خاتم".

**خواجە:** 1) خاوەن، مەزن، گەورە، سەروەر، دەوڵەمەند، زەنگین. 2) خەساو، یەختەکراو، نێرەمووك، نەنێرنەمێ، سابوورە. 3) بازرگان، تاجر.

**خوار:** پەست، سووك، زەبوون، زەلیل. بێڕێز و حورمەت. سادە، سانا. بەئاسانی، بەڕەحەتی. بێکەلك.

**خواربار:** خواردەمەنی، بژیو، خاروبار.

**خوارتن:** خۆشکێن، خاکەڕا.

**خوارخوار:** ئارام ئرام، بەئەسپایی.

**خوارداشت:** بڕوانە:"تحقیر".

**خوارشمردن:** بەسووك و بێنرخ دانان.

**خوارکار:** ستەمکار، زۆردار، جنێودەر. کەمتەرخەم، خەمسارد.





**خوارکاری:** بەدخوڵقی، تووڕەوتۆسنی، جوێندان، خەراووێژی. کەمتەرخەمی.

**خوارکردن:** سووك کردن، قسەی سووك پێگوتن.

**خوارمایە:** 1) ئاسان، سانا. 2) سووك، پەست، کەم نرخ. 3) کەم.

**خواری:** بەسووك و پەست دانران. بەدبەختی، چارەڕەشی. گرینگ نەبوون. ئاسانی، سانایی. کەمتەرخەمی.

**خوازە:** ویست، تکا.

**خوازەگر:** خوازیار، خوازەر.

**خواست:** ویست، خواست، داوا، ئارەزوو، مەیل. سواڵ.

**خواستار:** خوازیار، خوازەر، داواکار، ویستار.خوازبێنیکەر.

**خواستارمندانە:** بڕوانە:"داوطلبانە".

**خواستاری:** خوازیاری، داواکاری، خوازبێنی.

**خواستگار:** خوازگار، داواکەر، داواکار، خوازیار، داوان، داوخواز، خوازبێنیکەر، هەیجوو، هیجویکەر، هێجبیکار، خۆهستی.

**خواستگاران:** داسنی، خوازبێنی کەران.

**خواستگاری:** خوازبێنی، خازبێنی، خوازگێنی، خازگێنی، خوازمەنی، داوخوازی، وازبێنی، هەی جووی، هیجوی، هێجبی، ژن خواستن.

**خواستن:** داواکردن، بانگهێشت کردن، بانگ کردن، ویستن، بەنیازبوون، گەرەك بوون، ئیرادەکردن، خوازتن، خواستن، خوازی، وازتن، واستن، واستە، توان، ئەتوان، حەزکردن، بەتەمابوون، خوایی، خۆهستن، وستن، وادە.داوەت کردن، بانگهێشت کردن. چاوەڕوانی هەبوون. پێویست بوون. بە هاوسەری گرتن.

**خواست نامە:** وەسێتنامە.

**خواستنی:** خواستەنی، شیاوی بەئەمانەت دان. لەبەردڵان، خوێن شیرین، شیاوی خۆشویستن.

**خواستە:** 1) داخوازی، داوا، داواکاری، دەرخواست. 2) سامان، دارایی. 3) ئیرادە، ویست، مەیل.

**خواص:** 1) خزم و کەس و کاری کەسێك. 2) گەورە و بژاردەکانی قەوم، هەڵکەوتەکان، پێچەوانەی خەڵکی رەشۆك. 3) تایبەتمەندییەکان. 4) بەهرە و قازانجەکان.

**خواطر:** کۆی"خاطر".

**خواطی:** کۆی"خاطئە".

**خوَان:** (خَ) فرە خەیانەتکار.

**خوانا:** خۆش خەت، خوێنراوە. خوێندەوار.

**خواندار:** ئەوەی دەخوێنرێتەوە. نووسراوە.

**خواندن:** 1) خوێندن، خۆندن، خوێندنەوە، وەخوێندن، موتاڵاکردن، واندن، وانای، وەندایەنە. 2) فێربوون، دەرس خوێندن. 3) ئاوازخوێندن، گۆرانی

وتن، چڕین. 4) داوەت کردن بۆ میوانی، لێگێڕانەوە.5) ناولێنان، ناولەسەردانان. 6) بانگهێشت کردن. 7) تێگەیین، دەست نیشانکردن. 8) پێشبینیکردن. 9) زانین، ژماردن. 10) بانگ کردن، گازیکرن. 11) یەکتر خوێندنەوە، یەکترگرتنەوە، هاوئاهەنگ بوون. 12) گوتن، دەربڕین، گێڕانەوە. 13) شوبهاندن، وێچواندن.

**خواندنی:** خوێندەمەنی، خوێندەنی، شیاوی خوێندنەوە. "**متن خواندنی**": دەقی خوێنەرانە، دەقێ کە بخوێنرێتەوە.

**خوانش:** تێخوێندنەوە، خوێندنەوە، موتالا.

**خوانش پریشی:** خوێندنەوە بە تێکەڵ پێکەڵی.

**خوانندگی:** گۆرانیبێژی، سترانبێژی.

**خواننده:** ئەوەی نووسراوەیەك دەخوێنێتەوە، خوێنەر. گۆرانی بێژ، گۆرانیچڕ، گۆرانیزان، دنگ بێژ، ستران بێژ، قامبێژ، ئاوازەخوێن، خوێنەر. خوێندەوار. داوەت کەر، لێگێڕەرەوە. "**خواننده واقعی**": خوێنەری راستەقینە.

**خواها:** خوازیار، داواکار. خوازراو، دڵخواز.

**خواهان:** خاز، خواز، خوازیار، خوازەر، خوازگار، داواکار، داخوازی کار، کارنیار، بەتەما، ویستوو. بەئاوات، ئاواتەخواز. لە رووی ئیرادەوە، بەشێوەی خۆویستانە. "**خواهان سمج**": خوازلۆك، خوازەلۆك، خوازۆك.

**خواهانسازی:** بڕوانە:"ترغیب".

**خواهش:** تکا، رجا، هەرجو، ئەرجو، هەوین، خوایشت، خواهیش، خواهیشت، مەهدەر، هێڤی، ئارەزوو.

**خواهش کردن:** خاتر لێکردن، تکا لێکردن، خوایشت لێکردن، داوالێکردن، روولێنان، پاڕانەوە.

**خواهشگر:** تکاکار، تکاکەر، رجاکار، داواکار، ویستیار، پاڕێرەوە، خوایشتکەر. نێوبژیکەر.

**خواهشگری:** تکاکاری، تکاکردن، داواکاری، وەپاڕان، ناوبژیوانی.

**خواهشمند:** تکاکار، داواکار.

**خواهناخواه:** بتەوی نەتەوێ، بڵێیت و نەڵێیت، بمانەوێ ونەمانەوێ، بڤێ نەڤێ، خوایی نەخوایی، گەرەك ناگەرەك، چاری ناچار، بەناچاری.

**خواهندگی:** بڕوانە: "خواستاری".

**خواهنده:** ناوبژیوان، تکاکار، داواکار، خوازیار. خوازبێنی کەر. سواڵکەر.

**خواهه:** بڕوانە: "خواهش".

**خواهیدن:** بڕوانە: "خواستن".

**خواهی نخواهی:** بتەوێ یا نەتەوێ، حەتمەن.

**خوب:** 1) باش، خاس، چاك، تازە، سپەهی، پەسند، قانج، قەنج، دژی خراپ. 2) جوان، قەشەنگ، رند، خوشیك، پەسند و بەردڵ. 3) بەکەڵك، بەقازانج، بەسوود. 4) بەتەواوی.5) بەڕمێن، دڵخواز.





**خوبرو/ خوبروی:** جوان، قەشەنگ، چەلەك، خشکۆك، کەسێ کە روخساری جوانی هەیە.

**خوب شدن:** 1) بڕوانە: "بهبودی". 2) جوان و دڵخوازبوون. 3) دامەزراندنی پێوەندیی دۆستانە و گەرموگوڕ.

**خوب کردن:** 1) خۆشەوەکردن، خاس کردنەوە، ساڕێژکردنەوە. 2) بەدروستی ئەنجامدان.

**خوب نهاد:** دەروون باش، سرشت پاك.

**خوبی:** چاکە، چاکی، خاسی، باشی، پیاوچاکی، پیاوەتی، دلۆڤانی، پەسندی. بەڕمێنی.

**خوپذیر:** هۆگر، خووپێوەگر، خوو پێوەگرتوو، کەسێ کە خولق و خووی کەسێکی دی بگرێ.

**خوپله:** گەوج، نەزان، گێل.

**خود:** خۆ، خود. راناوی هاوبەش. "**از خود به دررفتن** (**بەدرشدن**)": لەخۆچوون. "**به خود راه دادن**": وەرگرتن. "**در خود بودن**": وشیاربوون، وریابوون.

**خودآرا:** خۆڕازێنەوە، خۆڕازێنەر.

**خودآرایی:** خۆڕازاندنەوە، خۆ لە گوڵدان، خۆئامادەکردن بۆ کارێك، خۆنوێنی.

**خودآزاری:** (دەروونناسی) جۆرێ نەخۆشی دەروونی کە نەخۆش چێژ لە ئازاردانی خۆی دەبا.

**خودآزمایی:** خۆتاقیکردنەوە.

**خودآگاه:** هوشیار، خودئاگا، وەئاگاهاتوو.

**خودآگاهی:** وشیاری، خودئاگایی، وەئاگاهاتن، رابوون.(دەروونناسی) ئاگابوون سەبارەت بە پێداویستییەکان و بیرۆکەکان و دژکردەوەکانی رەفتاری خۆ.

**خودآگاهی جمعی:** خودئاگایی کۆیی، هۆشیاری کۆیی.

**خودآگاهی کاذب:** خودئاگایی درۆیین.

**خودآموختن:** خۆفێرکردن.

**خودآموز:** ئەوەی بەبێ مامۆستا فێردەکا وەك کتێب و نەوار و فیلم.

**خودآیینی:** ئۆتۆنۆمی. سەربەخۆیی.

**خوداتکایی:** متمانەبەخۆ. نەبەستراوە بە دیتران و پشت بەستن بە توانایی و پێداویستییەکانی خۆ.

**خوداستواری:** متمانەبەخۆ(یی).

**خوداشتغالی:** خەریك بوون بەکارێکەوە بەبێ یارمەتی کەسانی دی. شوێنێ کە لەو دا پێداویستی گەلێ لەلایەن دەوڵەت یان شارەدارییەکانەوە دابین دەکرێ تا کەسەکان بتوانن بەرهەمە خۆماڵی یان خەدەماتییەکانیان پێشکەش بکەن.

**خوداصلاحی:** بەخۆداچوونەوە، بەخۆداهاتنەوە، خۆ راستکردنەوە.

**خوداندیشی:** تێفکرین، بیرکردنەوە لە نەفسی خود.

**خودانگیخته:** بڕوانە: "خودجوش".

**خودایستا:** بڕوانە:"مستقل".

**خودباختن:** خۆدۆڕاندن.
**خودباخته:** 1) خۆدۆڕاو. 2) کەسێ کە لە ژێرکاریگەری کولتووری دیکەدا ناسنامەی کولتووری خۆی لەدەست دابێ. 3) فریوخواردوو. 4) سست، شل، بێهێز.
**خودباوری:** متمانەبەخۆ(یی).
**خودبرتربینی:** (دەروونناسی) خۆبەزل زانی، بادیهەوایی.
**خود بخود:** هەرلەخۆوە، لەخۆیەوە، ژبەرخۆ، بێ هۆ، لەخۆڕا، بە بێ ویست و ئیرادەی کەسێکی دی.
**خودبزرگ بین:** ئاخایۆک، خۆبەزل زان، بەدەمار، فیزن، بادیهەوا، بەدەعیە.
**خودبزرگ بینی:** (دەروونناسی) خۆبەزل زانی، فیز، بەدەماربوون، بادیهەوایی.
**خودبسا:** بڕوانە:"خودکفا".
**خودبسنده:** بڕوانە:"خودکفا".
**خودبنیاد:** خۆداڕێژ، خۆبنیاتنەر.
**خودبین:** خۆنما، خۆبین، خۆپەسند، خۆخوا، خۆپەسند، وێوین، ئەو کەسەی وا نیشان دەدا کە لە خەڵك خۆی بە زل تر دەزانێ. بۆمانای زیاتر بڕوانە: "متکبر".
**خودبینی:** خۆبینی، خۆنمایی، خۆپەسندی، لووت بەرزی، بەدەماری، بادیهەوایی.
**خود پرداخت:** بڕوانە:"فرانشیز".
**خود پرست:** خۆپەرس، خۆپەرست، خۆخواز، لەخۆڕازی، لەخۆبایی، خۆویست، خۆبین.
**خود پرستی:** خۆپەرستی، خۆخوازی، خۆویستی، خۆبینی.
**خود پسند:** خۆپەسن، خۆپەسند، خودپەسن، خۆخۆشەویست، خۆبەزل زان، گەڤەزە، لووت بەرز، فیزن، بەفیز، بەدەمار، لە خۆبایی، کبار، کاو.
**خود پسندی:** خۆپەسنی، خۆپەسندی، خدەی خۆپەسند، فیز، دەعیە، لووت بەرزی.
**خود پناهی:** متمانەبەخۆ.
**خود پیدا:** ئاشکرا، دیار.
**خودتأویل:** خۆڕاڤەکردن.
**خود تحمیلی:** خۆداسەپاو.
**خودجستن:** خۆدۆزین، خۆپشکنین، بژار، بژنین.
**خودجوش:** هەڵقوڵاو، خۆڕسك.
**خودحفاظی:** خۆپارێزی.
**خودخوار:** خۆژیو، هەر بوونەوەرێ کە بە بێ نیازی بوونەوەرانیتر بژی.
**خودخواسته:** بەپێی مەیل و بۆچوونی کەسێنی.
**خودخواه:** خۆخواز، خۆخاز، خۆخوا، لەخۆڕازی، خۆویست، خۆپەرست، بەفیز، بابیهەوا، مەنەری.
**خودخواهی:** خۆخوازی، خۆخازی، خۆویستی، خۆپەرستی، منەمن.
**خودخور:** خۆخۆرەوە، کەسێك کە خەم و خەفەتی زۆر بخوا و لە خەمان کز و لاواز بووبێ.
**خودخوری:** خۆخواردنەوە.





**خوددار:** خۆدار، خوددار، خۆڕاگر، خۆگرتوو، خۆگرتی، خۆپارێز، پشوودرێژ، بەحەوسەڵە.
**خودداری:** 1) خۆداری، خودداری، خۆڕاگری، خۆڕاگرتن، خودگیری، خۆپارێزی، دەس راگرتن. 2) سەرپێچی، خۆبواردن، خۆلێ پاراستن، دووری کردن.
**خودآراستن:** خۆگیڤکردن، خۆڕازاندنەوە، خۆبەجوانی نیشاندان.
**خود را آماده کردن:** خۆگورج کردن، خۆفڕدان، خۆپەیت کردن، خۆئامادەکردن بۆ کار.
**خودرافداکردن:** خۆبەخت کردن، خۆ دەپێناونان، مردن لە ڕێگەی مەبەستێکدا.
**خودرأی:** خۆسەر، لاسار، سەرەڕۆ، گوێ نەبیس، هەڵەشە، سەهندە، سەهنگە.
**خودرسته:** بڕوانە: "خودرو".
**خودرو:** 1) خۆدەر، خۆوەر، خۆڕست، خۆڕسك. 2) بریتی لە کەسێ کە ڕانەهێنرابێ و سەرەڕۆ بارهاتبێ. 3) ماشێن، سەیارە. 4) خۆڕسك، هەڵقوڵاو.
**خودزدایی:** خودسڕینەوە، خۆ پاككردنەوە
**خودزندگی نامه:** خۆژیاننامە، ئۆتۆبیۆگرافی.
**خودزنی:** لەخۆدان، لەسەر و گوێلاکی خۆدان بەتایبەتی کاتی خەم یان شادی.
**خودزیست نامه:** ئۆتۆبیۆگرافی.
**خودساخته:** ئەوەی کە ڕواڵەت یان ڕەوشتی خۆی ڕازاندبێتەوە، کەسێك کە خۆی بۆ کاری گەورە ئامادە کردبێ، ئەوەی بە هەوڵ و تەقالای خۆی و بەبێ پشتیوانی کەسانی دی بە دۆخێکی لەبار لە ژیان گەیشتبێ. دەسکرد، تەزویری.
**خودسازی:** ڕازاندنەوەی ڕواڵەتی خود. هەوڵدان بۆ دابینکردنی پێشکەوتنی خۆ. باش کردنی ئاکار و ڕەوشتی خود. خۆ ئامادەکردن بۆ کارێك. بەهێزکردنی توانایی و سفەتەباشەکانی خۆ و دوورخستنەوەی لاوازی و چەپەڵیەکان لە خۆ.ڕیاکاری، ڕواڵەت نوێنی.
**خودستا:** خۆهەڵکێش، خۆڕانەر، خۆهەڵدان، پەسنی خۆ، ستایشی خۆ، فۆرتەك.
**خودستای دروغین:** فشەکەر، فۆرتان، خۆهەڵکێشی درۆزن.
**خودستایی:** خۆهەڵکێشان، بافیش، فشەفش، فۆرت، فۆرتان، پەسنی خۆدان، هۆشەکاری، چاوڕا، بەخۆداهەڵگوتن، تاریفی خۆکردن، فشەکردن، چیڤ، قاپان.
**خودسر:** سەربەردایی، سەرەڕۆ، سەربزێو، لاسار، گوێنەدەر، سەرسەخت، خۆسەر، کێزر، بێخۆ، بێپرس، سەربەخۆ، هەڵچۆ، کەللەشەق، ملهوڕ، دیکتاتۆر.

**خودسرانه:** سەرەڕۆیانە، خۆسەرانە، کەللەشەقانە، ملهوڕانە.

**خودسرپرست:** ژنێ کە بە تەنیایی بژیوی خۆی یان بنەماڵەکەی لەئەستۆدایە.

**خودسری:** سەرەڕۆیی، خۆسەری، لاساری، کێزری، دیکتاتۆری، کار بە ئارەزووی خۆ کردن، گوێ نەدان بە قسەی کەس، بەرهەڵدایی و کاری سەربەخۆ، سەربزێوی، سەرکێشی، سەرپێچی، کێزری، مل نەدان، یاخیگەری.

**خودسوز:** خۆسووتێن، کەسێ کە ئاگر لە خۆی بەر بدا و خۆی بسووتێنێ.

**خودسوزی:** خۆسووتاندن.

**خودشکن:** بەگژ هەواوهەوەس دا چوو، چلەکێش.

**خودشناختی:** خۆناسین، خۆناسینەوە، دەخۆگەیشتن.

**خودشناسی:** خۆناسی، ئاگاداری کەس لە لاوازی و تواناییەکانی خۆی، کەسێ کە قەدری خۆی دەزانێ.

**خودشیرینی:** خۆ خۆشەویست کردن، کاری واکردن کە خۆشەویست بی، خۆشیرین کردن، خۆشیرن کردن.

**خودشیفتگی:** خۆشەیدایی، هۆگریی نەخۆش ئاسا بەخۆ، "نارسیسیسم".

**خودشیفته:** خۆشەیدا، "نارسیسیست".

**خودفرمان:** بڕوانە:"مستقل".

**خودفرمانی:** بڕوانە:" استقلال".

**خودفروش:** خۆنوێن، خۆهەڵکێش، خۆڕانەر، هوشەکەر، بەشات و شووت. 2) سۆزانی. 3) خۆفرۆش، بەکرێگیراو، جاش، کاسەلێس.

**خودکار:** 1) خۆکار، خۆکەر، خۆگەڕ، خۆمەش، ئوتوماتیک. 2) خۆنووس، پێنووس. 3) کەسی متمانەبەخۆ.

**خودکاری:** جووڵەی خودی، ئوتوماتیکی، خۆکاری، خۆگەڕی.

**خودکام/ خودکامه:** دیکتاتۆر، ملهوڕ، سەرەڕۆ، خۆسەر، ستەمکار.

**خودکامگی:** زۆرداری، ستەمکاری، ملهوڕی، دیکتاتۆری، سەرەڕۆیی، خۆسەری.

**خودکاوی:** خۆپشکنین، خۆدۆزین.

**خودکرده:** خۆکردە، خۆکردوو، کارێك کە کەسێك بەبێ دەست تێوەردان و راوێژکردن بە کەسێکی دی ئەنجامی بدا.

**خودکشان:** بێ ئارامی و لەخۆدان لە کاتی پێشهاتێکی ناخۆشدا. هەوڵ و تەقالای بێسنوور. "**خودکشان کردن**": هەوڵ و تەقالای بێسنووردان.

**خودکشی:** خۆکوژی، خۆکوشتن، خۆ لە ناوبردن بە مردن. هەوڵ دانی زۆر و لە رادەبەدەر لە کارێك یان بابەتێکدا.

**خودکفا:** خۆژی، خۆژیو، بەخۆژیو، بژیو، بژێك، خۆبەڕێوەبەر، نان ماڵ، کەسێك کە چاوی لە یارمەتی کەس نەبێ، سەربەخۆ.





**خودکفایی:** خۆبژیوی، خۆژیوی، خۆتێرکردن.

**خود کم بینی:** (دەروون ناسی) خۆبەکەمتر زانین.

**خودگرا:** خۆخواز، خۆویست.

**خودگرایی:** خۆخوازی، خۆویستی، منێتی.

**خودگردانی:** خۆگێڕی، خۆبەڕێوەبەری، هەمان خودموختارییە بە دەسەڵاتی کەمترەوە و زۆرتر بەڕێوەبردنی کاروباری ئیداری و کولتووری دەگرێتەوە.

**خودگزین:** خۆخواز، خۆپەرست، لە خۆڕازی.

**خودگزینی:** هەڵبژاردنی راستەوخۆ.

**خودمان:** خۆمان، خۆن، ئێمە.

**خودمانی:** خۆمانی، خۆمانە، خۆمانەیی، خۆیی، تایبەت بە خۆمان، بە شێوەی تایبەتی.

**خود محور:** خۆتەوەر، خۆخواز، خۆسەر، سەرەڕۆ، egosentric.

**خود محوری:** خۆتەوەری، خۆویستی، خۆسەری.

**خود مختار:** 1) خودموختار، خۆبەڕێوەبەر، لە زاراوەی سیاسیدا: سەرزەوی یان پارێزگا (چەندپارێزگا) یان وڵاتێك کە لە بەڕێوەبردنی هێندێ لە کاروبارەکانی دا سەربەخۆ بێ و لە راپەڕاندنی کاروبارەکانی دیکەیدا پێڕەوی لە حکوومەتی ناوەندی بکا. 2) بڕوانە: "خودرأی".

**خودمدار:** بڕوانە: " خودگرا ".

**خود مختاری:** خۆڕێبەری، خۆبەڕێوەری، خۆهەڵبژێری، ئۆتۆنۆمی، خودموختاری.

**خودمداری:** بڕوانە: "خودمحوری".

**خودمنش:** بڕوانە: "خودپرست".

**خودنکوهی:** رەخنە لە خۆ، خۆ سەرکۆنەکردن.

**خود نما:** خۆنوێن، خۆنما، خۆدەرخەر، خۆپەسند.

**خود نمایی:** خۆنوێنی، خۆنواندن، خۆنوانن، خۆنمایی، خۆ بە غلووری نیشان دان، خۆهەڵکێشان، پەسنی خۆدان، خۆدەرخستن، دەرکەوتن، خۆڕانان، فیز و دەعیە. سنگ دانەپێش، سنگ دانەپێشەوە، سنگ هەڵکێشان، خۆتێ هەڵقوتاندن.

**خودوندی:** بڕوانە: " خودمختاری ".

**خودویژه:** تایبەت بەخۆ، تایبەتی.

**خودی:** خۆیی، خۆیایەتی، خۆمانە، ناسیاو، ناسیار، ئاشنا. "**غیرخودی**": ناخۆیی. "**خودی به میدان انداختن**": بە مەبەستی خۆنوێنی خۆ لەکاری کەسانی دی هەڵقوتاندن. "**خودی نشان دادن**": خۆنوێنی کردن. "**بەخودی خود**": خۆبەخۆ، بەشێوەی ئوتوماتیك. بەتەنیایی.

**خودیاری:** خۆکۆمەگی، کۆمەگی (ناوخۆیی/ خۆیی).

**خور:** 1) هەتاو، خۆر. 2) خواردن، خۆراك، شیاوی خواردن.

**خور:** (خَ.وَ) لاوازی، سستی، بیٚتوانایی.
**خورا:** 1) شیاو، شیان، لایق. 2) بڕوانە: "خوراك".
**خوراك:** چەرە، خواردنی، خواردەمەنی، خۆبراك، واردە.
**خوراکی:** خۆرەك، خواردەمەنی، خواردنی، شیاوی خواردن.
**خوراندگر:** دەرخواردەر، پیٚخوران.
**خوراندن/ خورانیدن:** خۆراندن، خۆرانن، دەرخواردان، پیٚ خوراندن، وەردایش. (کوتەك)لیٚدان.
**خورانش:** بڕوانە: "تغذیە".
**خورخجیون:** بڕوانە: "بختك".
**خورد:** خۆراك، خواردەمەنی، غەزا. "**خوردوبرد**": خواردن و بردن. تەخشان پەخشان. "**بە خورد چیزی رفتن**": بەتەواوی مژران.
**خوردرفتن:** خوران و لەناوچوون.
**خوردگی:** خورانی بەرەبەرەی شتیٚ.
**خوردن:** 1) خواردن، خارن، هەردەن، واردن، واردەی، وەردەن، وەردایش، وەردش، بە دیان جاوین و قووت دان، فارن. 2) خواردنەوە، نۆشین. 3) لەناوبردن و بەفیڕۆدان. 4) بەناڕەوا زەوتکردنی دارایی کەسیٚك. 5) پیٚخواردن. 6) سوان، خوران. 7) بە هەوەس و چیٚژەوە سەیری کەسیٚك کردن. 8) لە دڵ دا راگرتن، خۆبواردن لە دەربڕینی قسە یان هەست یان حاڵەتیٚ. 9) قازانجبردن، سوودکردن. 10) لیٚدران. 11) شیاو و لەباربوون، هاوڕیٚژەبوون. 12) لیٚکدران، پیٚك دادران. 13) کوتەك خواردن. 14) ئازاردیتن. 15) هاوکاتبوون. تیٚپەڕاندن. 16) بڕوانە: "تحمل کردن". "**خوردن و شکستن**": خۆش رابواردن. "**از کسی خوردن**": بەزین لە بەرامبەر ئەودا، قبووڵ کردنی برانەوەی ئەو. "**بە کسی خوردن**": لە رواڵەت یان هەڵسوکەوت لەوچوون. "**خود را خوردن**": خۆ خواردنەوە.
**خوردنی:** خۆرەن، خواردەمەنی، شیاوی خواردن، شتیٚ کە بۆ خواردن بشیٚ، هەردەنی، وەر، واردش، چڵە. لەبەردڵان و خویٚن شیرین.
**خوردەشدن:** خوران، خوریان، بە خواردن چوون.ساویان و لەناوچوون.
**خوردەشدە:** خوراو، خوریاگ، بە خواردن چووگ.
**خوردی:** بڕوانە: "خورد".
**خورشید پرست:** خۆر پەرست، هەتاو پەرس.
**خورشیدگرفتگی:** بڕوانە: "کسوف".
**خورشیدوش:** وەك خۆر، خۆرئاسا.
**خورند:** 1) شیاو، شایان، شایستە، لەبار. 2) بڕوانە: "ظرفیت".
**خورندە:** خۆر، خۆرە، ئەوی دەخوا.
**خوز:** (خَ) دوژمنایەتی کردن، دوژمن داربوون.
**خوزی:** 1) سەر بە خووزستان، خووزستانی. 2) گۆشتی کوتراو.
**خوسانیدن:** بڕوانە: "خیسانیدن".





**خوسپیدن:** خەوتن، نووستن.
**خوست:** 1) بڕوانە: "جزیرە". 2). کوتراو، ریٚگەی کوتراو، شیٚلدراو.
**خوستن:** وردکردن، کوتان، شیٚلان.
**خوش:** چاك، باش، شاد، شادمان، بەگەشە، خۆش.سەرسەوز. راحەت، ئاسوودە.
**خوش آوا:** بڕوانە: "خوشآواز".
**خوش آواز:** خۆشبیٚژ، خۆشخوان، دەنگ خۆش.
**خوشا:** خۆزگەبە، خۆزیٚ، وەڕەك، وەڕەکنا، وەڕەکینا، خۆشا.
**خوش اخلاق:** ئاکارباش، خۆشخوو، خدەپەسند، خۆش ئەخلاق، دژی بەدخوو. "**خوش اخلاقی**": ماریفەت، رووخۆشی وئاکارپەسندی، خۆش ئەخلاقی.
**خوش اقبال:** بەختەوەر، خۆشبەخت.
**خوش الحان:** دەنگ خۆش، خۆش ئاواز، دلگر.
**خوشامدگفتن:** بەخیٚرهیٚنان، خۆشاتن، خۆش هاتن، خیٚراتن، خیٚرهاتن.
**خوشامدگویی:** 1) بڕوانە: "خوشامدگفتن". 2) زمان لووسی، تەڕزوانی، مەرایی.
**خوش اندام:** بەژن و بالاّ ریٚك، خۆش قەلاّفەت.
**خوشانیدن:** بڕوانە: "خشکانیدن".
**خوشایند:** جیٚگەی دڵخۆشی، دڵخۆشکەر. پەسندکراو، جوان، شایستە، شیاو. رازیبوون. زمان لووسی، رووبینی.
**خوش باطن:** دەروون پاك، دڵپاك.
**خوش باور:** ساویلکە، دڵ ساف، خۆشباوەڕ، خۆش بڕوا، بیٚ فیٚڵ و فەرەج.
**خوشبخت:** بەختەوەر، خۆشبەخت، بەختیار.
**خوشبختانە:** بەختەوەرانە، بەخۆشییەوە.
**خوش بدە:** خۆش حەساو.
**خوش برخورد:** هەڵسووکەوت جوان.
**خوش بر و بالا:** بڕوانە: "خوش ترکیب".
**خوش بنیە:** سالم و بەهیٚز.
**خوشبو:** بۆنخۆش، هەرچییەك کە بۆنی خۆش بیٚ.
**خوش بودن:** خۆشحاڵ بوون، ئاسوودەبوون، بیٚ خەم بوون.
**خوش بیان:** شەکرلیٚو، شەکرلیٚڤ، قسەشیرین، گفت و لفت خۆش.
**خوش بین:** گەشبین، خۆش بین، چاك بین، دڵ روون، هیوادار، دوور لە ناهومیٚدی، هەر بەهومیٚد، وەش وین.
**خوش بینی:** گەش بینی، روون بینی، خۆش بینی، هیواداری.
**خوش پوش:** تەڕپۆش، کۆك، پۆشتە، کەسیٚ کە جلوبەرگی نویٚ و جوان دەبەر دەکا.
**خوش تراش:** ئەوەی کە بە جوانی تاشرابیٚ، قۆلاّ، ریٚك، شیاوی، بەژن و بالاّ جوان و ریٚکوپیٚك.
**خوشترك:** نەختیٚك خۆشتر و چاکتر. ئارامتر، نەرمتر.

**خوش ترکیب:** قولغ، رند، جوان و بەرچاو، خاوەنی ئەندامی جوان و لەبار، بەژن و بالا ڕێك و قۆڵا، خۆش قەڵافەت.

**خوش تیپ:** جوان خاس، جوان چاك، وەشەك، خوشیك، خۆش تیپ، پیاوی زۆر جوان و ڕێکوپێك، قیت و قۆز، لەبار.

**خوشحال:** شاد، شادمان، بە کەیف، کەیف ساز، کەیف وەش، خۆش دەماخ، دڵخۆش، خۆشحاڵ، دڵشاد، رازی.

"**خوشحال کننده**": چاوڕۆشن کەرەوە، دیتنی شتی دڵخۆشکەرە، خۆشحاڵکەر.

**خوش حساب:** حەساو خۆش، کەسێ کە قەرزەکەی خۆی لە وادەی خۆی دەداتەوە.

**خوش خبر:** مژدەدەر، مژدەهێن، بەمزگێنی، خۆش خەوەر، خۆش خەبەر.

**خوش خدمتی:** خۆش خزمەتی، خۆشڕەفتاری.

**خوش خرام:** کەسێ کە بە ناز و حوزمەوە دەڕوا، بە لار و لەنجە.

**خوش خط:** خۆش نووس، خۆش خەت، ئەوەی کە بە خەتی خۆش دەنووسێ.

**خوش خلق:** بڕوانە: "خوشخو".

**خوشخو:** خۆش خولق، خدەپەسند، خۆش ڕەفتار، رووخۆش.

**خوش خواب:** خەوخۆش، خەوخەو، خەوتە.

**خوشخوار/ خوشخور:** خۆش خۆر، خواردە، کەسێ خۆراکی باش دەخوا.

**خوش خوان:** بڕوانە: "خوشآواز".

**خوش خوراك:** بڕوانە: "خوشخوار".

**خوش خوش:** هێدی هێدی و لە رووی خۆشییەوە، نەرم نەرم، خۆش خۆش، وردەوردە.

**خوش خوشك:** 1) قەوچە. 2) بڕوانە: "خوش خوش".

**خوش خیال:** خۆش خەیاڵ.

**خوش خیم:** خۆش خولق، خۆشڕەفتار. لە زاراوەی پزیشکیدا: بێمەترسی.

**خوش داشتن:** خۆش ویستن، هۆگربوون.

**خوشدل:** شاد، شادمان، خۆشحاڵ، دڵخۆش، بەکەیف. هیواردار.

**خوش ذوق:** تەڕفام، بەزەوق، بەمجێز، خاوەن سەلیقە، بەسەلیقە، سەلیقەباش.

**خوش رفتار:** کەسێ کە بە چاکی بە ڕێگا دا بڕوا، بەئاکار، ئاکارچاك، خۆش ڕەفتار.

**خوشرنگ:** ئەوەی کە ڕەنگ و رووی باشی هەبێ، ڕەنگ جوان.

**خوشرو/ خوشروی:** رووخۆش، خۆشڕوو، دەم بە پێکەنین، رووگەش، رووکراوە، لەزگین.

**خوش ریخت:** قەڵافەت ڕێك و لەبار، بەژن و بالا جوان، کەسێك کە ئەندامێکی جوان و ڕێکوپێکی هەبێ و جلوبەرگی باش دەبەر بکا.

**خوش زبان:** زمان شیرین، قسەشیرین، قسە خۆش.





**خوش سخن:** گفت و لفت خۆش، شەکرلێو، شەکرلێڤ، گوتەخۆش، قسەخۆش، قسە شیرین.

**خوش سرای:** بڕوانە: "خوش خوان".

**خوش سلوك:** خۆش ڕەفتار، کەسێ کە دەگەڵ خەڵکی بە هەڵسووکەوتی جوان و خدەپەسند دەجووڵێتەوە.

خوش سلیقە: بڕوانە: "خوش ذوق".

**خوش سودا:** بڕوانە: "خوش معامله".

**خوش سیما:** جوان، قەشەنگ، چەلەك، خوشیك، دەلال، خۆش روو.

**خوش شانس:** خواپێداو، خواپێڕادیو، سەربەڕسق، سەربەڕۆزی، خۆشبەخت، بەختیار.

**خوش شگون:** بڕوانە:"خوش یمن".

**خوش صحبت:** راوێژ خۆش، قسەخۆش، خۆش دەڤ.

**خوش صورت:** قەشەنگ، جوان و دلگر، دەلال، دەم و چاو جوان و سپەهی.

**خوش طالع:** بڕوانە: "خوش اقبال".

**خوش طبع:** خۆش زەوق، قسەخۆش و گاڵتەباز، قسەخۆشی گاڵتەکەر.

**خوش طعم:** خۆش چێژ، بەتام، تامدار.

**خوش طینت:** خۆش خولق، خۆشخوو، سرشت باش.

**خوش عاقبت:** ئاخر خێر، کەسێ کە ئەنجام و ئاخری باشی هەبێ.

**خوش عنان:** رام، دەستەمۆ.

**خوش قامت:** بەژن و بالا بەرز و جوان، خۆش قەڵافەت، جوان چاك.

**خوش قدم:** پێ و قەدەم موبارەك، پێ بەودم، پێ و قەدەم خێر، خۆش قەدەم، پێ بەخێر و خۆشی.

**خوش قریحه:** خاوەنی زەوقی هونەری.

**خوش قلب:** دڵ پاك، دڵ پاقژ، دەروون پاك، خێرخواز، بێ فڕوفێڵ.

**خوش قول:** کەسێ کە وادە و قەولەکەی بەجێ بێنێ، خۆش قەول، خۆش بەڵێن.

**خوشك:** بەخۆشی.

**خوش کلام:** بڕوانە: "خوش سخن".

**خوش گام:** ئەسپی چەلەك و خۆشڕۆ.

**خوش گذران:** خۆش رابوێر، خۆش گوزەران، دڵچەرێن.

**خوشگذرانی:** خۆش رابواردن، خۆش بووران، خۆشگوزەرانی، کەیف کردن، کێف کردن، فرەهی.

**خوش گفتار:** زمان شیرین، قسەخۆش.

**خوشگل:** قەشەنگ، جوان، سپەهی، دلڕفێن.

**خوشگو/ خوشگوی:** دەمەوەر، زمان پاراو، قسەخۆش، ئاخاوتە خۆش.

**خوش گوار:** بەتام، خۆش چێژ، شیرین، ئاسان هەزم بوو، خواردەمەنییەك کە بە زوویی هەزم بێ.

**خوش گواری:** تامداری، خۆش چێژی. ئاسان هەزم کردن.

**خوش لحن:** بڕوانە: "خوش الحان".

**خوش لقا:** جوان، قەشەنگ.

**خوش لهجە:** خۆش زوان، زمان خۆش، زمان شیرین، کەسێ کە شێوەی ئاخاوتنی خۆش بێ.

**خوشمزگی:** 1) خۆشتامی، بەتامی، تامداربوون، بەلەزەتی، خۆشی. 2) شۆخی و گاڵتە.

**خوشمزە:** بەتام، تامدار، خۆش چێژ، خۆش چێژە، خۆشتام، مەزەدار، خۆش لە زمان. خۆشەویست و خوێن شیرین. شۆخ و قسەخۆش.

**خوش مشرب:** مەشرەف خۆش، راوێژوڕووخۆش.

**خوش معاملە:** خۆش مامڵە، سەوداخۆش.

**خوش منش:** ڕەوشت جوان و باش، دەروون باش، خۆش خوڵق.

**خوش منظر:** قەشەنگ، سپەهی، خوشکۆك، جوان نوێن، دیمەن جوان، بەدیمەن، دەشە.

**خوشنام:** خۆشناو، خۆش نێو، ناو بەچاکە دەرچوو.

**خوش نشین:** خۆش نشین، رەشایی، کەسێك کە هەرکات جێگەیەکی باشتر و لەبارتری دەست کەوێ بچێتە ئەوێ، ئەو رەعیەتەی دەتوانێ لە دێ بار بکا. لە بنەڕەت دا بەو کەسانە دەگوترێ"قەرەن/رەشایین" کە هیچ زەوی و زارێکیان نیە بی کێڵن و داهاتیان هەبێ بەڵام بۆ ئەوەی بە چەشنێك فریویان بدەن پێیان دەڵێن خۆش نشین، "یووفەمیزم".

**خوش نقش:** نەخشین، نەخشاو، جوان و رەنگاوی، ئاڵووالا.

**خوش نگرش:** بڕوانە: "خوش بین".

**خوش نما:** کەشخە، جوان نوێن، لەبەرچاو، هەر شتێ کە باش و جوان بنوێنێ، شیك و لەبار، هەر شتێ کە بیچم و رواڵەتێکی جوان و پەسندی هەبێ.

**خوشنوا:** بڕوانە: "خوش الحان".

**خوشنود:** بڕوانە: "خشنود".

**خوش نویس:** خۆش نووس، خۆش خەت.

**خوش نهاد:** دەروون باش، سرشت چاك.

**خوش وبش:** چاك و خۆشی، وەش بەش.

**خوش وقت:** خۆشحاڵ لە ڕوودانی کارێ.

**خوشەچین:** خۆشەچن، خۆشەچین، گوڵ هەڵگرەوە، گوڵ چنەوە لە پەرێز، گوڵچین، گوڵبژێر، هێشووگەر، هۆشەچن، هۆشەچە، وشووکەر، ویشیچن، داشی، قورف، کەسێك کە دەسك و گوڵ دەکا. سواڵکەر.

**خوش هیکل:** بەژن و باڵا رێکوپێك، خۆش قەڵافەت.

**خوشی:** خۆشی، شادی، شادمانی، بەدەماخی، تەڕدەماخی، وەشەی. تەندروستی، لەش ساغی. سەرسەوزی. جوانی، قەشەنگی.





**خوشیدن:** بڕوانە: "خشکیدن".

**خوش یمن:** پیرۆز، بەفەڕ، موارەك، پێچەوانەی"بدیمن".

**خوض:** 1) رۆچوونە ناو ئاو، لە ئاو دان. 2) دەبیرەوەچوون و بیرکردنەوە لە شتێك، تێفکرین. 3) خەریك بوونی هەمەلایەنە بە کارێ یان بابەتێ.

**خوف:** 1) ترس، سام، خۆف. 2) ترسان، ترسیان، تووشی ترس و خۆف هاتن. **"خوف و رجا"**: ترس و هیوا.

**خوف انگیز:** ترس هێن، خۆف هێن.

**خوفناك:** ترسناك، سامناك، سامدار.

**خوکردن:** (خَ) بژار کردن، هەڵکەندنی گیای زیادەکی لە باخچە و بێستان.

**خوك کردن:** خووگرتن، عادەت کردن.

**خوگر:** خووگرتوو، خووپێرتوو، هۆگر، ئۆگر، گرۆ.

**خوگرفتگی:** هووك، هووکارەبوون، هۆگری، خووگرتن. بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "الفت".

**خوگرفتن:** خووپێوەگرتن، خووپێگرتن، هۆگربوون، هۆگری، هۆگرتن، ئۆگربوون، گرۆبوون، هوکارەبوون، پێوەڕاهاتن، عادەت کردن.

**خوگرفتە:** خووپێگرتوو، هۆگر، ئۆگر، رمووده، پێوەڕاهاتوو، فێر، فێربوو، فێربووگ، رام.

**خول:** (خَ) بە باشی ئاگالێبوون، ئاگاداری کردن.

**خول:** (خَ.وَ) بڕوانە: "خدم و حشم".

**خولە:** (خُ.لَ) بڕوانە: "خالی".

**خون آشام:** 1) خوێنمژ، خوێن خۆر، زیندی خۆر، پیاوخۆر. 2) بریتی لە کەسی دڵڕەق و زۆردار و زاڵم کە خەڵکی بێتاوان بکووژێ.

**خونآکند:** پڕ لە خوێن، پڕخوێن، لێوڕێژ لە خوێن.

**خونآلود:** خوێناوی، خڵتانی خوێن، خوێناوڵێن، خینالی، گۆنین، گۆنێن، هوونالۆ.

**خون آمدن:** خوێن هاتن لە ئەندامێکی لەش.

**خونابە:** 1) خوێناو، هووناو، خوێن و خوڕ، خوێنی تێکەڵ بە ئاو، فرمێسکی خوێناوی. 2) ئاوێکە کە خڕۆکە سپی و سوورەکان لەو دا دێن و دەچن، پلاسما.

**خونالودشدن:** دەخوێن هاتن، خوێن لێهاتن، خوێناوی بوون.

**خونبار:** 1) بڕوانە: "خونین". 2) شتێ کە خوێنی زۆری لێ دەڕژێ. 3) پیشاندەری خەم و رەنجی زۆر.

**خون برآوردن:** خوێن هەڵێنان، خوێن هەڵێنانەوە، خوێن هەڵاوردنەوە، خوێن رشانەوە.

**خون بست:** خوێن بایی. **"خون بست کردن"**: کوشتنەوەی بکوژێ بە دانی خوێن بایی رزگارکردن. ئاشتیدان.

**خونبها:** خوێن بایی، قەرەبووی کوژرانی کەسێك، وشر، پارەیەك کە بکوژ دەیداتە بەجێماوەکانی کووژراو تا بیبەخشن.

**خونبهادادن:** خوێن بژاردن، خوێن باییدان.

**خون پالا:** بڕوانه:"خونبار".

**خون جگر:** خەم و ڕەنجی زۆر. فرمێسکی خوێناوی. "**خون جگر خوردن**": ڕەنج و ئازاری زۆر کێشان.

**خون چکان:** خوێن دەڵێن، خوێن دادەر، ئەوەی خوێنی لەبەر بڕوا.

**خونخوار:** خوێنخۆر، خوێنمژ. خوێن ڕێژ، زاڵم، زۆردار، ستەمکار، دڵڕەق. **هۆڤی** و دڕنده.

**خونخوارگی:** خوێنخۆری، خوێنمژی، خوێنڕێژی، ستەمکاری، زۆرداری.

**خونخواه:** خوێنخوا، خوێنەخۆ، خوێنگر، خوێن ئەستێن، ونەوەی، داواکاری تۆڵەی کووژراو، کەسێ کە داوای تۆڵەی کووژراو دەکا.

**خونخواهی:** خوێنخوایی، خوێن ئەستاندنەوە، لە تۆڵەی خوێنی کەسێك کە کووژراوە بکووژەکەی بکووژن یان خوازیاری سزادانی بن.

**خون خوردن:** 1) خوێن خواردنەوە. 2) بریتی لە خەم خواردنی زۆر.

**خوندار:** تێکەڵ بە خوێن، خوێناوی. قاتڵ، بکووژ. میراتبەری کووژراو.

**خوندگار:** بڕوانه: "خداوندگار".

**خون دادن:** خوێن دان. کوژران یان شەهیدبوون.

**خون دل:** بریتی لە خەم و خەفەت و ڕەنج و کوێرەوەری زۆر.

**خون دیده:** فرمێسکی زۆر.

**خون رز/ خون رزان:** بریتی لە شەڕاب، شەڕابێ کە لە ترێ ساز کرابێ.

**خون ریختن:** خوێن ڕشتن، خوێن ڕژاندن، خوێن ڕژتن، کوشتنی خەڵك، پیاو کوشتن.

**خون ریز:** خوێن ڕێژ، خوێن ڕژ، **هوون** ڕێژ، پیاوکوژ، ئەوەی کە کاری خوێن ڕژتنە. خوێن دەڵێن. قوربانیکردن.

**خونریزی:** 1) خوێن ڕێژی، ڕزك، ڕسکیان، ڕسین، خوێن پژان، لووت پژان. 2) پیاوکوژی، کوشتن، کوشت و بڕ.

**خون سرد:** 1) خوێن سارد، گیانلەبەرێ کە تینی لەشی بە قەرای پلەی تینی ئەو ژینگەیەیە کە لێی دەژی وەك ماسییەکان و خزۆکەکان. 2) بریتی لە مرۆی **هێدی**، لەسەرخۆ، بەسەبروحەوسەلە، بەتاقەت. 3) گوێ بە **هیچ** نەدەر، کەمتەرخەم، دەهری.

**خونسردی:** خوێن ساردی، پشوودرێژی، سەبر و حەوسەلە.

**خون(فشان/ افشان):** خوێن پڕژێن، پڕژێنەری خوێن، خوێن دەڵێن. گیانباز، لەخۆبوردوو.

**خونکار:** 1) بڕوانه: "خونریز". 2) بڕوانه: "خوندگار".

**خون کافت:** (پزیشکی) "**هێمۆلیز**".

**خون کردن:** کوشتن. قوربانی کردنی گا یان مەڕ. تووشی گوناح بوون.





**خون کسی را خوردن:** بریتی لە چەوساندنەوەی ئەو.

**خون گرفتن:** خوێن گرتن، خوێن بەردان.

**خونگرم:** 1) خوێن گەرم، **هەر** گیانلەبەرێ کە خوێنی گەرم بێ، گیانلەبەرێ کە پلەی تینی خوێنی زیاتر لە پلەی تینی ئەو شوێنە بێ کە تێیدا دەژی وەك گوانداران و پەلەوەران. 2) بریتی لە کەسی دلۆڤان و خۆشخوڵق. 3) بریتی لە سوور لە سەر مەبەست. 4) کەسێ کە زوو **هەڵدەچێ**، زوو تووڕە دەبێ.

**خون گریستن:** لە خەم و خەفەتی زۆر بەکوڵ گریان.

**خون گشادن:** بڕوانه: "خون گرفتن".

خونگیر: بڕوانه: "حجام".

**خون لخته:** خوێنی مەییو، خوێنی بەسیاگ، جەڵتە.

**خون مردگی:** خوێن تێتزان، **هە**ڵاززان.

**خونی:** 1) خوێناوی، خڵتانی خوێن، خوێنین. 2) بکوژ، پیاوکوژ، قاتڵ، خوێن ڕێژ. 3) سوور بە ڕەنگی خوێن.

**خونین:** خوێنی، خوێناوی، خوێنین. خڵتانی خوێن. "**خونین و مالین**": کوتەك خواردووی خەڵتانی خوێن.

**خوهل:** (خُ) پێچ خواردوو، پێچ دراو، باوخواردوو، لار، لارولەوێر.

**خوی:** بڕوانه: "خو".

**خوید:** کاڵ، فەریك، نەگەیو، گیای تازە.

**خویسه:** گەنگەشە، شەڕو کێشە.

**خویش:** بڕوانه: "خویشاوند".

**خویشاوند:** خزم، کەس و کار، قەوم، کریڤ، کرێڤ، مرێبا، مەرەڤ، خوێش. "**خویشاوند دور**": بۆرەخزم، خزمی دوور.

**خویشاوندی:** خزمایەتی، قۆمایەتی، خۆیایەتی، خۆیەتی، خوێشایەتی. "**واحد خویشاوندی**": یەکەی خزمایەتی.

**خویش بین:** بڕوانه: "خودبین".

**خویشتن:** خۆ، خود، خودێتی، خودیەتی، ڕاناوی **هاوبەش** بۆ یەکەم و دووهەم و سێهەم کەسی تاك و کۆ.

**خویشتن بین:** بڕوانه: "خودبین".

**خویشتن پایی:** خۆپارێزی، چاوەدێریکردنی خود.

**خویشتن خویش:** خودێتی خۆ.

**خویشتن دار:** خۆڕاگر، خوددار، بەربەخۆگر، دان بە خۆداگر، خۆپارێز.

**خویشتن داری:** خۆڕاگرتن، دان بە خۆداگرتن، خۆپارێزی، بەربەخۆگرتن، بەسەرخۆدا زاڵبوون، سەبرکردن، **هە**ڵەنەبوون.

**خویشکار:** 1) خۆکار، خۆگەڕ. 2) ئەرك ناس. بە مانای وەرزێری و جووتیاریش **هاتووە**.

**خویشکام:** بڕوانه: "خودکام".

**خویشی:** بڕوانه: "خویشاوندی".

**خهل:** بڕوانه: "خوهل".

**خیابان:** شەقام. "**خیابانی**": سەرشەقام.

**خیار:** 1) خاوەن دەسەلات، هەڵبژاردە/ پەسندکراو لە هەر شتێ. 2) هەوڵدان بۆ ئەنجامدانی کارێك بە مەیل و ویستی کەسێك. 3) هارۆ، هاروێ، خەیار.

**خیاط:** بەرگدروو، جلدروو.

**خیال:** زیندەخەون. گومان، وەهم، وێنا، خەیاڵ.بیر، هزر، ئەندێشە.وێنە.

**خیالات:** خەیاڵات، شەڤرەشك، لێکدانەوەی بێ بەهرە، وەڕارە. خەم و خەفەت و ترس و نیگەرانی. وەهمەکان.

**خیالات سوء:** خەیاڵاتی پیس و شەیتانی.

**خیالاتی:** خەیاڵاتی، خەیاڵاوی.

**خیال اندیش:** بڕوانە: "خیالباف".

**خیال انگیز:** خەیاڵ وروروژێن(ەر)، پڕنەقش و نیگار.

**خیالباز:** بڕوانە: "خیالباف".

**خیالباف:** خەیاڵاتی، خەیاڵاوی، خەیاڵ پلاو، خەیاڵ پەرست، خەیاڵ پەروەر، کەسێ کە بەردەوام لە جیهانی خەیاڵ دا دەژی، کەسێك کە کارێك لە دنیای خەیاڵ دا ئەنجام دەدا و نایگەیەنێتە قۆناغی کردەوە.

**خیال بستن:** خەیاڵ کردن، وێناکردن.

**خیال پرداز:** خەیاڵ پەروەر.

**خیالپردازی:** سازوسەودا، خەیاڵاتی پڕوپووچ، "daydream".

**خیال داشتن:** بەنیازبوون.

**خیال واهی:** خەیاڵاتی پووچ، فاکوفیك.

**خیالی:** خەیاڵی، شتێ کە نەبووە و بە خەیاڵ دروست کراوە، ناڕاستەقینە.

**خیّام:** خێوەت نشین، کەسێ کە لە خێوەت دا دەژی. خێوەت دوروو، خێوەت فرۆش.

**خیانت:** خیانەت، غەیانەت، غەیانی، غەدر، ناڕاستی لە دۆستیدا، نەڕاستی، فێڵبازی، دەغەلی، پەیمان شکێنی.

**خیانت پیشه:** بڕوانە: " خیانتکار ".

**خیانتکار:** خەیان، غەیان، خەیانەتکار، ناڕاست.

**خیانتگر:** بڕوانە: "خیانتکار".

**خیبت:** زیان کردوو، زیان پێگەیشتوو. بێ هیوابوون، هیوابڕان.

**خیتال:** شۆخی، درۆ.

**خیدن:** بڕوانە: "خمیدن".

**خیّر:** (خَ.یِ) پیاوی خێرخواز، پیاوی چاکەکار، خاسەکار، خاوەن چاکە، خێرۆمەند. بەخشندە، دەسەنەدار.

**خیر:** (خِ) سەرلێشێواو، مات و وڕ. بێهوودە، لە خۆڕا.

**خیر:** (خَ) 1) کاری چاکە، خێر.2) نا، نەخێر، نێ هەرێ.

**خیرات:** کۆی"خیر"، خێرات، خێر و خێرات، سەدیەکە، ئەو شتانەی بە چاکە لە ڕێی خوا دەدرێن.

**خیراندیش:** خێرخواز، خوازیاری خێر و چاکە، کەسێ کە بیر لە خێر و چاکی خەڵك دەکاتەوە.





**خیرخواه:** خێرخواز، خێرخوا، چاکەخواز، چاکەکار.

**خیرخیر:** (خ.خِ) بێهوودە، پووچ. وڕ و سەرگەردان.

**خیر دیدن:** خێر دیتن، قازانج وەرگرتن.

**خیر رساندن:** خێرپێگەیاندن، قازانج پێگەیاندن.

**خیرگی:** لاساری، پێداگری. بێ شەرمی. مۆڵەق بوونی چاو، واق وڕمان.

**خیروبرکت:** خێروبێر، خێروبەرەکەت.

**خیره:** (خَ.رَ) مێینەی"خَیر"، خێرکارتر، چاکەکارتر.

**خیّره:** (خَ.یِ.رَ) مێینەی"خیّر"، ژنی خێرخواز.

**خیره:** (خِ.رَ 1) نەترس، سەرکێش، پێداگر، لاسار، بێ شەرم. 2) سەرلێشێواو و مات و وڕ لە سەر سوڕمان، واق، ماق، چاوزەق، وڕ، مات، سەرسام. 3) بێهوودە، بێ هۆ. "**نگاه خیره**": بزە، زەق تواشاکردن، زرتەزرت.

**خیرەخیره:** زەق تێوەڕامان، بزەبز.

**خیرەچشم:** بێشەرم، ڕووهەڵمالاو، پەلپگر، سەرسەخت، لاسار.

**خیرەدرای:** بڕوانە: "یاوەگو".

**خیرەدست:** سەرکێش، سەربزێو.

**خیرەرأی:** بێئاوەز، پەست و گەمژە.

**خیرەرو:** کەسێ ڕووهەڵمالاوانە بجووڵێتەوە.

**خیرەسار:** بڕوانە: "خیرەسر".

**خیرەسر:** پێداگر، سەرەڕۆ، لاسار، لەسار، لەسەر، گوێنەدەر، نەترس.

**خیرەسری:** سەرەڕۆیی، لاساری، گوێنەدەری، لەجە.

**خیرەشدن:** واق مان، زیتەوبوون، مات بوون، چاوتێبڕین. "**خیرەشدن چشم**": ئەبڵەق، مۆڵەق بوونی چاو.

**خیرەکردن:** وەسەرسوڕمان خستن، سەرسام کردن، سەرگەردان کردن.

**خیرەکش:** ستەمکار، زاڵم، کەسێك کە لە خۆڕا خوێن بڕێژێ و خەڵك بکوژێ. سەرکێش.

**خیرەکننده:** سەرسامکەر، سەرسووڕێن، سەرزڤڕێن.

**خیرەنگریستن:** بەزەقیڕوانین، زەق تێڕوانین، زەق تواشاکردن، زیتەوبوون، چاوتیژکردن و ڕوانین، چاوبزکردنەوە، چاوزەق کردنەوە، مڕبردنەوە، چیڕبوونەوە، مالاکامەندش، چاڤکوسکانێ.

**خیریه- امور:** کارگەلێ کە خێر و قازانجی خەڵکی تێدابێ. خێرخوازانە.

**خیز:** 1) باز، قەڵەمباز. 2) بەرزی، بڵێندی.3) شەپۆل. "افت و خیز": دانیشتن و هەستان.

**خیزاب:** لۆچاو، لیپاو، وشترە، وشتراو، پێل، شەپۆل.

**خیزابچه:** بڕوانە:"آب لرز".

**خیزان:** هەڵبەزدابەزکەر، لە حاڵی هەستان و وەستان دا.

**خیزانـــدن/ خیزانیـــدن:** هەڵبەزانـدن، هەستاندنی کەسێك لە سەر زەوی و لەسەر پێ ڕاگرتنی. بەرهەم هێنان.

**خیزبرداشـتن:** بـازبردن، بـازدان، قەڵەمبازبردن، ئاخێزکردن، هەڵبەزان، خۆ حەوادان بەرەوژوور.

**خیزبردن:** بڕوانە: "خیزبرداشتن".

**خیزش:** سەرهەڵدان، ڕاپەڕین، جووڵانەوە.

**خیزکـردن:** 1) بڕوانە: "خـیزبـرداشتن". 2) دووری لێکردن.

**خیزنـده:** خێـز بـەر، هەڵبەزدابەزکـەر. کەسێك کە هەستێ و لە سەر لاق ڕاوەستێ.

**خیزیـدن:** 1) خـزین، خزیـان، خلیسکان، خەشـکین. 2) بـازبردن، قەڵـەمبازبردن، ڕاپسکان، لـە سـەر زەوی هەستان و بـە پێوە وەستان.

**خـیس:** خووسـاو، فـیس، تـەڕ، نمـدار، شێدار. "**خـیس خـیس/تمـام خـیس**": تلـیس، تلیسان، خووسان.

**خیـساندن:** خـووس (لـە خـووس گـرتن)، خوویس، خووساندن، نماندن، نەماندن، تلیساندن، تەڕکردن بۆ نەرم کردن، لە ئاو دا نەرم کردن، تەواو تەڕ کردن، فیساندن، فیسانن، فیسەنە.

**خیس خالی شدن:** بە تەواوی خووسان.

**خیسیدن:** خووسـان، خویسان، خویسی، فیسان، فیسیان، نەرم بوون بە هۆی ئاو.

**خیش زدن:** کێڵان.

**خیــل:** ڕەوەی ئەسـپەکان. گروپـی سوارکاران. گروپ، دەستە. تایفە. "**خیل خیل**": گروپ، گروپ، دەستەدەستە.

**خیلا:** فیز و لەخۆبایی.

**خیلولت:** خەیاڵ، وێنا، وەهم.

**خیلـی:** وەرگـیراو لـە "خیـل"ی عـەڕەبی بـەمانای گروپێـك لـە ئەسـپەکان یـان سـوارکاران، گروپێـك، ژمارەیـەك. زۆر، فرە، گەلێ، فراوان.

**خـیم:** 1) خـوو، سرووشـت. 2) خـووی خراپ، تووڕە و تۆسن، شێت.

**خـیم شناسـی:** زانـستە سروشـتییەکان، زانستی ماددی.

**خیمـەازرق:** بریتـی لـە ئاسمـان. "خیمـەزرنگاری و خیمـە سـبز و خیمـە کبود" یش بەم مانایە دێن.

**خیمـە زدن:** خێـوەت هەڵـدان. نیشتەجێبوون، ئاکنجێ بوون.

**خیمـەگا:** خێوەتگـە، شـوێنێ کـە چـەند خێوەتیان لێ هەڵدابێ.

**خیمەشب بـازی:** شـانۆبازی، شانۆسـازی، شاسـەلیم، شـانۆیەك کـە لـەودا لەیـستۆکەکان لـە پـشت پـەردە یـان خێوەتێکی گـچکەوە بـە سـیم یـان دەزوو وەجووڵـە دەخـرێن و کەسـێك لـە پـشت پەردە یان خێوەتەکەوە بـە زمـانی ئـەوان قسە دەکا.





**خیمی:** سرشتی، زکماگ.

**خیول:** کۆی"خیـل"، 1) گروپـی ئەسـپان. 2) گروپـی سـوارکاران. 3) لەشـکرەکان، سپاکان.

# د

**داء:** دەرد، ژان، ئێش، نەخۆشی، نەخۆشین.

**دائر:** 1) دەورلێدەر، سووڕخۆر، گەڕخۆر. 2) ئاوا، ئاوەدان.

**دائره:** بڕوانە: "دایره".

**دائرةالمعارف:** ئینسکلۆپیدیا، زانیارستان، فەرهەنگنامە، فەرهەنگی گشتگیر، کتێبێ کە تەواوی وشە و زاراوە زانستی و ئەدەبییەکانی زمانێکی لەخۆگرتبێ.

**دائم/ دایم:** 1) هەمیشە، بەردەوام، دایم، بێپسانەوە. 2) پایەدار، نەبڕ، هەرهە.

**دائماً:** هەمووکات، هەمیشە، هەردەم، بێپسانەوە.

**دائمی:** هەمیشەیی، بەردەوامی.

**دائن:** وامدەر، قەرزدەر، خاوەن قەرز، داواکار.

**داج:** تاریکەسەلات، شەوەزەنگ.

**داخل:** نێوخۆ، ناوخۆ، ناو، ناوەوە، ژوور، دەروون. "**داخل چیزی (کاری) شدن**": خەریك بوون بەو شتە یان کارەوە.

**داخل شدن:** 1) چوونەناوەوە، چوونەژوورەوە. 2) خۆتێهەڵقوتاندن، دەست تێوەردان، لووت تێژەنین. 3) دامەزران.

**داخله:** ناوخۆی وڵات. 2) ناوەوەی شتێ. 3) نێوخۆیی.

**داخلی:** ناوخۆیی، نێوخۆیی، دەروونی.

**داخم:** (خ) بڕوانە: "رزق".

**داخیدن:** 1) لێك جیاکردنەوە، لەیەك بەردان، بڵاوەپێکردن. 2) روانین لە شتێك و چاوەدێریکردنی.

**داد:** 1) هاوار، هەرا، هەلا، فریا، هانا. 2) یاسا، داد، حوکمی رەوا، ئینساف، هەقانییەت. 3) بەخشش، دەسەنە، بەش، پشك، چارەنووس. "**داد چیزی را دادن**": بەجێهێنانی مافی ئەو. بەوجۆرەی شیاوی ئەوە هەڵسوکەوت کردن. "**دادداد کردن**": هاتوهاوارکردن. "**داد دادن**": لابردنی زوڵم و ستەم. قارەمانێتی نواندن لەشەڕدا. "**داد کسی را دادن**": بە دادپەروەری هەڵسوکەوت کردن لە تەکیدا و بە ماف گەیاندنی. "**داد کسی را گرفتن**": هەق یان تۆڵەی ئەو ساندنەوە. "**بە داد کسی رسیدن**": بەهاناوەچوون، یارمەتیدان.





**دادآفرین:** ئافرێنەری داد و هەقانییەت. یەکێ لە ناوەکانی خودا.

**دادآور:** دادهێن، دادپەروەری هێن.

**دادائیسم:** قوتابخانەیەکی ئەدەبییە کە لە ساڵی 1917 لە ئورووپا دامەزرا کە پێڕەوکارەکانی لە نووسراوە و هەڵبەستەکانیان دا وشەکانیان بە پێچەوانەی مانای راستەقینەی خۆی بەکاردەبرد و مەبەستیان رزگارکردنی هونەر و ئەدەبیات لە ئاوەز و لۆژیك بوو.

**دادار:** 1) دادگەر، دادپەروەر. 2) ئافرێنەر، یەکێك لە ناوەکانی خودا.

**دادباختگی:** بڕوانە:"محکومیّت".

**دادباخته:** لە زاراوەی دادخانەدا: کەسێك کە بڕیارەکە بە زیانی ئەو دەرچووە، "محکوم علیه".

**دادبخش:** دادگەر، دادپەروەر، عادڵ.

**دادبخشی:** کردەیدادگەر، داد و ئینساف.

**دادبرده:** لە زاراوەی دادخانەدا: کەسێ کە بڕیارەکە بە قازانجی ئەو دراوە، "محکوم له".

**دادبك:** سەرۆکی دادوەرەکان.

**دادپاك:** دادگەر، عادڵ.

**دادپرداز:** ئەندامی لێژنەی دادوەری دادگا.

**دادپرس:** دادخواز، خوازیاری دادپەروەری، دادپرس، فریاڕەس، گازندەپرس، لێکۆڵەر.

**دادپرسی:** دادخوازی، دادخوایی، دادپرسین.

**دادپرور:** دادپەروەر، خاوەن داد، عادڵ.

**دادجو:** دادخواز، دادپرس، پەیجۆری داد.

**دادجویی:** کردەی"دادجو"، دادخوازی، دادپرسی.

**دادخواست:** سکاڵا، گازندە، نامەیەك کە دادخواز بۆ دادگای بنووسێ.

**دادخواستن:** دادخوازیکردن، شکایەت بردنە دادگا و خوازیاری دادپەروەری بوون.

**دادخواه:** دادخواز، دادخوا، خوازیاری داد، دادبەر، داواکار، گازندەر، شکایەتکەر.

**دادخواهی:** دادخوازی، دادخوایی، خوازیاری جێبەجێبوونی دادپەروەری بوون، شکایەتکردن، گلەیی کردن، گازندەکردن، دادپرسین، دادکردن، هاوار.

**داد دادن:** 1) بە هانا و فریای کەسێك گەیشتن و دانی بڕیاری دادپەروەرانە. 2) هەڵسوکەوت کردنی شیاو و بەجێ.

**دادر:** بڕوانە: "دادور".

**دادر آسمان:** خوای مەزن.

**دادراد:** لە ناوەکانی خودا.

**دادراست:** دادوەر، دادپەروەر.

**دادران:** پەرەپێدەری داد.

**دادرس:** دادپرس، فریاڕەس، هانا، لێکۆڵەر، دانێر، دادوەر.

**دادرسی:** دادوەری کردن، دادپرسین، بە هانای کەسێك گەیشتن، دادگاییکردن. "**دادرسی کردن**": پێڕاگەیشتن بە سکاڵای بەمەبەستی بڕیاردا لەلایەن دادپرس یان لێژنەیەك لە دادوەرەکان.

**دادزدن:** هاوار(کردن/ کرن) ، هات و هاوارکردن، گوڕەوهەراکردن، گوڕاندن، دەنگ بڵیندکردن، نەڕاندن، زڕچایش، زڕچایەنە.

**دادستان:** 1) گازندەوان، فریاڕەس، دادستان. 2) شوێنی داد و ئینساف.

**دادستاندن:** هەقی خۆ یان هەقی کەسی دی وەرگرتن، هەق ساندنەوە، هەق لێکردنەوە.

**داد سخن دادن:** ڕوونکردنەوە سەبارەت بە بابەتێ، شیکردنەوەی بابەتێ بەباشی. بەتێروتەسەلی ئاخاوتن یان زۆرقسەکردن.

**دادسرا:** گازندەخانە، خانەیداد، دادگا.

**دادفرما:** دادگەر، عادڵ، لە ناوەکانی خوا. 2) پاشای دادپەروەر.

**دادك:** 1) خزمەتکاری پیر، لەلە. 2) سەرۆکی خانەی داد.

**دادکار:** دادکار، کەسێ کە کاری جێبەجێکردنی دادپەروەرییە.

**دادکردن:** 1) جێبەجێکردنی دادپەروەری، داد و ئینساف بەکاربردن. 2) بڕوانە: "دادزدن".

**دادکشیدن:** هاوارکردن.

**دادکیش:** ئەوەی کە کارەکەی لە سەر بنەمای داد و هەقانییەتە.

**دادگاه:** دادگە، دادگا، جێگەی شکایەت کردن، شوێنی دادپرسین، شوێنی پێڕاگەیشتن بە تاوانی کەسەکان، مەحکەمە.

**دادگاه استیناف:** دادگەی پێداچوونەوە/ تێهەڵچوونەوە.

**دادگاه بخش:** دادگەیەك کە لە کێشە چووکەکان دەپرسێتەوە.

**دادگاه تجدیدنظر:** بڕوانە:"دادگاه استیناف".

**دادگاه پژوهش:** بڕوانە:"دادگاه استیناف".

**دادگاەجنایی:** دادگەیەك کە لە جەنایەتکاران دەپرسێتەوە.

**دادگاه صحرایی:** دادگایەك کە لە کاتی شەڕدا لە ئەرتەش دا بۆ لێپێچینەوە لە سەرپێچییەکانی کەسانی نیزامی پێك دێ.

**دادگاه کیفری:** دادگای تاوانەکان.

**دادگاەنظامی:** دادگەی نیزامی، دادگەیەك کە لە کاتی شەڕدا پێك دێ.

**دادگاهی کردن:** کێشانە دادگا و دادگاییکردن.

**دادگر:** دادپەروەر، دادگەر، دادگێڕ. یەکێك لە ناوەکانی خوا.

**دادگری:** بڕیاردان بە داد و ئینساف، دادپەروەری، دادگەری.

**دادگستر:** پەرەپێدەری داد، دادگەر، عادڵ. خودا.

**دادگستری:** 1) خانەی دادوەری. 2) کردەی "دادگستر"، پەرەپێدانی هەق و داد لە ناو خەڵك دا.

**دادگه:** بڕوانە: "دادگاه".





**دادگیر:** ئەوەی دادی زۆرلێکراو لە ستەمکار بستێنێ، تۆڵەستێن، حەق وەسێن.

**دادن:** 1) دان، داین، داگ، وێدان، وەدان، پێدان، بەخشین. 2) بەرپرسیارێتی ئاگاداری لە کەسێك یان شتێ بەکەسێك سپاردن. 3) پێشکەش کردن، دیاریدان. 4) ڕاسپاردن، دەستووردان. 5) ڕواندن، دەرکردن. 6) پیشاندان، بڵاوکردنەوە. 7) داسەپاندنی دۆخێکی ئازاردەر. 8) دەرخواردان. 9) ڕاگواستن، ڕاگوێزتن. 10) خستنەڕوو. 11) فرۆشتن. 12) خۆخستنە ئیختیار پیاوێ بۆ ئەنجامدانی کرداری سیکسی. 13) خەرج کردن. 14) پێسپاردن، بەدەستەوەدان.

**دادنامه:** بەرگەی فەرمی، بەرگەیەك کە بڕیاری دادگای تێدانووسراوە.

**دادو:** خزمەتکاری پیر، خوڵام.

**دادوبیداد:** 1) هاوار لە دەست ناحەقی کەر. 2) هەراوهوریا، هەراوزەنا، هەراوکێشە، گێرە وکێشە، گرێچ.

**دادودهش:** کەرەم و بەخشش.

**دادور:** دادوەر، دادگەر، عادڵ.

**دادورز:** بڕوانە: "دادور".

**دادوستان:** دان و وەرگرتن، ئاڵوێر.

**دادوستد:** دان و ستان، ئاڵوێر، ئاڵوگۆڕ، فاروگۆڕ، ئاڵش وێرش، ئاڵشت، سەوداوماملە، کڕین و فرۆشتن، داوسەت، مامڵە، بازرگانی.

**دادوفریاد:** هەراوهوریا، هەراوکێشە، هەراوهاوار، هات و هاوار، چەقەوگوڕە، قیژ و واژ، کازتین، کازین.

**دادوقال:** قیڕەوهەرا، چەقەسرۆیی، کورت کورت.

**دادوگرفت:** بڕوانە:"مبادله".

**دادوند:** بەرابەر، یەکسان.

**داده:** 1) پێدراو. 2) لە کۆمپیوتێردا: زانیاری دروست و ڕێکخراو بە مەبەستی شیکار یان بڕیاردان، زانیاری گەلێ کە بە شێوەی ڕێکوپێك بۆ کۆمپیوتێر ئامادە دەکرێ. 3) ڕادەی کاڵا و خەدەماتێ کە دێتە پرۆسەی بەرهەمهێنانەوە. 4) دراو، پێچەوانەی وەرگیراو. 5) بەخشراو، پێئەسپێردراو. 6) بەش، پشك.

**دادەآمایی:** ئەنجامدانی کردارگەلێ بە هۆی کۆمپیوتێر لەسەر زانیارییەکان بۆ شیکردنەوەی ئەو زانیارییانە یان وڵامدانەوە بە مەسەلەکان و هتد.

**دادەبانك/ بانك دادە:** بانکی زانیاری/ زانیارییەکان.

**دادە پایگاه/ پایگاه دادە:** پێگەی زانیاری، زانیاری پێگە، database.

**دادە پردازی:** بڕوانە: "دادەآمایی ".

**دادەپی:** بڕوانە: "دادەپایگاه".

**دادەورزی:** ئەنفۆرماتیك.

**دادیار:** دادوەری لێکۆڵینەوە، بریکاری دادستان.

**دادیك شناسی:** زانستی مافناسی.

**دادیك گرا(ی):** ملکەچی یاسا.

**دارا:** 1) بڕوانە: "ثروتمند". 2) خاوەن، مالك. 3) بڕوانە:"شامل". 4) خودا.

**دارات:** شان و شکۆ.

**دارادار:** سەقامگیری و پایەداری. هەڵلاوهەنگامە. هەراوهوریا.

**داراشکوه:** خاوەن شکۆ و هێز.

**دارافزین:** پەناگە، پاڵپشت، سەکۆ.

**دارالاخره:** قیامەت، دنیای دوای مەرگ.

**دارالاسلام:** وڵاتێ کە بە پێی یاساکانی ئیسلام بەڕێوەدەچێ.

**دارالاماره:** ماڵی میر، کۆشکی فەرمانڕەوا، پێتەخت، ئیدارەی حکوومەتی.

**دارالامان:** شوێنێ ئاسوودەیی و ئارامی تێدابێ، شوێنی بێترس و خەم.

**دارالانشاء:** شوێنی نووسینی نامە، یازخانە، دەفتەرخانە.

**دارالایتام:** هەتیوخانە. پەروەردگا.

**دارالبقاء:** قیامەت، پەسڵان.

**دارالبوار:** دۆزەخ، جەهەننەم.

**دارالتأدیب:** تەمێخانە، جێگەیەك کە منداڵانی سەرپێچیکەری تێدا نگاداری و پەروەردە دەکەن، borstal.

**دارالتجزیه:** بڕوانە: "آزمایشگاه".

**دارالتربیه:** بڕوانە: "پرورشگاه".

**دارالترجمه:** خانەی وەرگێڕان.

**دارالتعلیم:** قوتابخانە، فێرگە، خوێندنگە.

**دارالحرب:** شاری دوژمن، سەرزەوی دوژمن کە لەوێدا شەڕ بکەن.

**دارالحزن:** شوێنی خەم و کەسەر.

**دارالحکومە:** خانەی راژۆر، شوێنی نیشتەجێبوونی حاکم یان فەرماندار. ناوەندی حکوومەت، پێتەخت.

**دارالخلافه:** شوێنی خەلیفە، ناوەندی پێشەوایی، پێتەخت.

**دارالخلد:** بەهەشت.

**دارالسرور:** شوێنی شادمانی، بەهشت.

**دارالسعاده:** شوێنی بەختەوەری، بەمانای "دارالخلافه"ش هاتوە.

**دارالسلام:** خانەی تەندروستی. خانەی ئاشتی. بەهشت. پێتەخت.

**دارالسلخ:** بڕوانە: "کشتارگاه".

**دارالسلطنه:** پێتەخت، شوێنی نیشتەجێبوونی پاشا.

**دارالسیاسة:** جێگەی تاوتوێکردنی کاروباری حکوومەتی، شوێنی پێڕاگەیشتن بە کاروباری خەڵك. شوێنێ کە خراوکاران و سەرپێچیکارانی تێدا تەمبێ دەکەن.

**دارالشفاء:** بڕوانە: "بیمارستان".

**دارالشوری:** راوێژگا، راوێژگە، جێگەی را و تەگبیر، جێگەی تەگبیر لێکردنەوە.

**دارالصفاء:** شوێنی پاکی و شادمانی. ماڵی کابە.

**دارالصناعه:** کارگە، کارخانە.

**دارالضرب:** بڕوانە: "ضرابخانه".

**دارالضیافه:** شوێنی میوانداریتی، میوانخانە.





**دارالطباعه:** چاپخانە.

**دارالظلم:** جێگەی زۆردار، شوێنی ستەمکار.

**دارالعباده:** جێگەی خواپەرستی.

**دارالعجزه:** بڕوانە: "نوانخانه".

**دارالعلم:** جێگەی زانست، فێرگە. زانستگا.

**دارالعیار:** شوێنی پێوانەکردنی زێڕ و زێو. ئەنجومەنی رەخنەگران، ئەنجومەنی ئەدەبی.

**دارالغرار/ دارالغرور:** ماڵی فریو، شوێنی خۆخوازی و خۆبینی، بریتی لە دنیا.

**دارالفناء:** شوێنی نەمان، بریتی لە دنیا.

**دارالفنون:** قوتابخانەی بەرزی راهێنانی فەن و زانستەکان، زانستگا.

**دارالقرار:** جێگای ئاسوودەیی، ئەو دنیا، بەهشت.

**دارالقضاء:** دادخانە/ خانەی داد.

**دارالقمامه:** 1) جێگەی کۆبوونەوەی خەڵك. 2) ماڵی ژنانی خراپەکار. 3) شوێنی خاکوخۆڵ رشتن.

**دارالکتب:** کتێبخانە.

**دارالمجانین:** شوێنی حاواندنەوەی شێتان، شێتخانە.

**دارالمرز:** شاری سەرسنوور.

**دارالمرض:** شوێنێ کە زۆربەی خەڵکەکەی نەخۆشن.

**دارالمساکین:** نەدارخانە، جێگەی نگاداری سواڵکەران.

**دارالمعلمین:** پەیمانگای مامۆستایان، خانەی مامۆستایان، جێگەی راهێنانی مامۆستای قوتابخانە.

**دارالملك:** پێتەخت، بینای بنکەی حکوومەت.

**دارالندوه:** راوێژگە.

**دارالنعیم:** شوێنی پڕناز و نێعمەت، بەهشت.

**دارالوکاله:** دەفتەر یان ژووری کاری پارێزەری دادخانە.

**دارایی:** دارایی، سەرمایە، سامان، مەلەسەك. دارابوون، دەوڵەمەندبوون.

**داربزین:** بڕوانە: "دارافزین".

**داردار:** 1) بڕوانە: "دارادار". 2) هەراو هوریا، هات و هاوار، هەراوکێشە، زەنازەنا.

**دارداركردن:** هەراو هوریاکردن، هات و هاوارکردن.

**داردنیا:** دنیای ماددی. گشت جیهان.

**دارزدن:** لە سێدارەدان، لەقەنارەدان، داردان.

**دارعقبی:** (ر.ع) ئەو دنیا، پەسڵان.

**دارغرور:** بڕوانە: "دارالغرور".

**دارفانی:** جێگەی ناپایەدار، بریتی لە دنیا. "**دار فانی را وداع گفتن**": کۆچی دواییکردن، مردن.

**دارفزین:** بڕوانە: "دارافزین".

**دارفنا:** بڕوانە: "دارالفناء".

**دارقرار:** بڕوانە: "دارالقرار".

**دارمکافات:** جێگەی تاوانەکان، بریتی لە دنیا.
**دارندگان:** هەڵگران، خاوەنان.
**دارنده:** هەڵگر، خاوەن، هەبوو. خاوەنی ماڵ و دارایی، دەوڵەمەند. خودا. پاسەوان، نگابان.
**داروبرد:** هەڵلاوهەنگامە، هەراوچەقە.
**داروخانـه:** دەرمانگا، دەرمانخانە، دەواخانە.
**دارودسـته:** دەست و پێوەند، دەستەودایرە، دارودەستە، تابوون.
**داروساز:** دەرمانساز، دەرمانگەر، دەرمان دروسکەر، دەواساز.
**داروسای:** دەرمان ساوێن.
**داروشناس:** دەرمانناس، دەرمانساز.
**داروغه:** دارۆغە، دارغە، گزیر، قوڵچی ناو شار، پاسەوانی شار.
**داروفروش:** دەرمان فرۆش، دەوافرۆش.
**داروکده:** بڕوانە: "داروخانە".
**داروکردن:** تیمارکردن، دەواکردن.
**داروگر:** دەواساز، دەوافرۆش.
**داروندار:** تەواوی دارایی کەسێك، بوون و نەبوون، تەواوی ماڵ و سامانی کەسێك.
**داروینیست:** لایەنگری تیۆری داروین.
**داروینیسم:** تیۆری کامڵبوونی پلەبەپلەیی داروین، بەپێی ئەم تیۆرییە گیانلەبەر و روەکەکان لە ساکارترین فۆرم پێك هاتوون و بە پەرەسەندنی هەنگاو بەهەنگاو و لە ماوەی چەند میلیۆن ساڵ دا کامڵ بوون.
**داره:** (ن 1) شوێن، قەبیلە، ماڵ. 2) خرمانەی مانگ.
**داری:** 1) گەمییەوان. 2) مەڕدار. 3) بۆن فرۆش.
**دارین:** دنیا و قیامەت، هەر دوو دنیا.
**داستار:** دەلاڵ، نێونجی کەری کڕیار و فرۆشیار.
**داستارها:** پێوەندییەکان.
**داستان:** چیرۆك، خەبەرۆشك، گێڕانەوە، رازێ، مەرسەلا، داستان، بەسەرهات، هەقایەت. ناودار، بەناوبانگ.
**داستان رانـدن:** چیرۆك وتن، بەسەرهات گێڕانەوە.
**داستان زدن:** 1) نموونە هێنانەوە. 2) گێڕانەوەی چیرۆك و بەسەرهاتێك. 3) قسەکردن، ئاخاوتن. 4) گفتوگۆ و باس و وتووێژکردن.
**داستان سرا:** چیرۆك بێژ، رازێوێژ، گێڕەوە.
**داستان سرایی:** چیرۆك گێڕانەوە. وتن یان نووسینی چیرۆك.
**داستان شدن:** بەناوبانگ بوون، ناوبانگ دەرکردن.
**داستان شناختی:** گێڕانەوەناسانە.
**داستان شـناس:** گێڕانەوەناس، چیرۆك ناس.





**داستان شناسی:** گێڕانەوەناسی، چیرۆك ناسی.
**داستان کوتاه:** نەزیلە، نەزیرە، تمتیل، راز، کورتەچیرۆك، چیرۆکی کورت.
**داستان منظوم:** چیرۆکی بە شێعر، بەیت، چامە.
**داستان نویسی:** چیرۆك نووسی.
**داستانی:** گێڕانەوەیی، داستانی، چیرۆك ئاسا. "اعمال داستانی": کردەگەلی گێڕانەوەیی. "غیر داستانی": ناچیرۆکی، ناگێڕانەوەیی.
**داشا:** بەخشش، بەخشین، پاداشت.
**داشت:** پاراستن و نگاداری.
**داشتن:** 1) بوون، هەبوون، دارابوون، خاوەن بوون. 2) پەروەردەکردن، بەخەم کردن، نگاداریکردن. 3) وەدەست هێنان. 4) شیاوی بابەتیبوون. 5) پاشەکەوت کردن و راگرتن. گرتن، حەپس کردن. 6) دانان. 7) وێناکردن، بەحەساو هێنان. 8) جێبوونەوە. 9) پێسپاردن، خستنە ئیختیار. 10) درێژەپێدان. 11) درێژەکێشان. "به چیزی داشتن": حەساو بۆ کردن. هاندان و ناچارکردن بەو شتە. تووش کردن بەو شتە.
**داشن:** بڕوانە: "داشا".
**داعی:** نزاکەر، دۆعاکەر. خوازەر، بانگ کەر، بانگهێشتکەر کەسێ کە خەڵك بۆ ئایین یان رێبازی خۆی بانگ دەکا. هۆ، سەمەد.
**داعیه:** مێینەی"داعی"، هۆ، پاڵنەر، تکا و ئیرادە. تاسە و ئارەزووی وەدەست هێنانی شتێ. "داعیه چیزی را داشتن": بوونی تامەزرۆی گەیشتن بەو شتە. بوونی ئیدیعا لەو بارەوە و خۆ بە خاوەنڕا زانین تێیدا.
**داغ:** داغ، گەرم. نیشانە. "داغ باطله": نیشانەیەك کە لەسەر لەشی چوارپێیانی لەکارکەوتووی دەدەن. "داغ به(بر) دل کسی گذاشتن": خەمبارکردن یان تازیەبارکردنی ئەو. "داغ به دل یخ گذاشتن": ئەنجامدانی کاری بێهوودە و بێ ئاکام.
**داغان:** تەرت و توونا، تەفروتوونا، بەرباد، تێکوپێك، دارزاو، بەجارێك خراوکراو، شەقوشڕ، لەبەریەك هەڵتەکاو، بێ سەرەوبەرە.
**داغان کردن:** تەرت و تووناکردن، پرژوبڵاوکردن.
**داغدار:** 1) شتێ کە شوێنی داغ و پەڵەی پێوەیە. 2) داخدار، لێقەوماو، داغ دیە، بەلا بەسەرهاتگ، بەحەسرەت.
**داغدل:** (د) داخ لە دڵ، دڵشکاو، کەسێ کە بەهۆی مەرگی خۆشەویستێکی خەمناك بێ.
**داغ دل:** داخێك کە لە سەر دڵ نیشتبێ، خەمی قورس کە بە هۆی مەرگی خۆشەویستێکەوە ئینسانی داگرتبێ، کارەساتی گەورە، جەرگ سووتان، زگ سووتان. "داغ دل کسی تازه شدن": هاتنەوەیادی کۆیرەوەری و گیروگرفتەکانی.
**داغ دیدن:** لە مەرگی منداڵ یان یەکێ لە خزمانی نزیك رەنجان و ناڕەحەت بوون، تووشی رووداوی جەرگبڕ بوون.

**داغ دیده:** داخدار، داغ دیه، بەلابەسەرهاتوو.

**داغستان:** بریتی لە دڵی داخدار و پڕ لە خەم و ئازار.

**داغسر:** کەچەڵ، تاس، تووك لە سەر وەریو.

**داغ شدن:** داغ بوون، زۆر گەرم بوون. زۆر بەبرەو بوون. خەمبار و نیگەران بوون.

**داغ کردن:** چزاندن، چزەڵێ هەستان، چزەڵێ هەڵسان، چزەڵێ هەڵساندن، ئارهاندن، داخ کردن، داغ کردن، داغ پێوەنان. گەرم کردن، تین پێدان. بەبرەوکردن. زۆر زویر و قەڵس بوون.

**داغگاه:** داخگە، جێگەی داغ کردنی مرۆڤ یان ماڵات.

**داغول:** بڕوانە: "حیلەگر".

**دافع:** پاڵنەر، پاڵ پێوەنەر، دوورخەرەوە، بەرگر، لەمپەر، کۆسپ.

**دافعه:** مێینەی"دافع".

**دافق:** ئاوێ کە بە توندی و خێرایی لە شوێنێکەوە برژێ و بخوشێ. فیچقەدەر.

**داکتیلوسکوپی:** بڕوانە: "انگشت نگاری".

**دالاندار:** دالآندار، پاسەوانی کاروانسەرا و ماڵەگەورە.

**دالبر:** داڵبڕ، برشتی کەوانەیی لە جل دا.

**دام اهلی:** سەوال، سەواڵ، پاتاڵ، ئاژاڵ.

**دامپرور:** ئاژەڵدار، ماڵات بەخێوکەر.

**دامپروری:** ئاژەڵداری، ماڵداری، ماڵات بەخێو کردن، ماڵات راگرتن، دەوڵەتداری.

**دامپزشك:** بەیتار، بەیتاڵ، وەیتاڵ، مەیتەر، پزیشکی ئاژەڵ.

**دامدار:** 1) خاوەن ئاژەڵ، کەسێ کە کاری کڕین و فرۆشتنی ئاژەڵی ماڵییە، چۆدار، چێودار. 2) کەسێ کە گیانلەبەران بە داو راو دەکا، داوباز.

**دامداری:** 1) بڕوانە: "دامپروری". 2). گرتن و راوکردنی گیانەوەران بە داو و تەڵە.

**دامغه:** شکانی سەر کە گەیشتبێتە سەر مێشك.

**دامگاه/ دامگه:** جێداو، داوگە، جێ تەپکە، جێ تەڵە، کختان.

**دام گستردن:** داونانەوە. دابین کردنی ئامراز بۆ گرفتار کردن یان لەداوخستنی کەسێك.

**دامن‌آلوده:** بڕوانە: "آلودەدامن".

**دامن افشاندن:** داوێن راوەشاندن، وەجووڵەخستنی داوێن. بریتی لە دووری کردن و چوونەلاوە.

**دامن برچیدن:** چوونە قەراغەوە، رۆیشتنە لاوە، دوورکەوتنەوە، خۆکشاندنەوە. تەژگەڵ هەڵکردن.

**دامن دامن:** زۆر و پەیتاپەیتا.

**دامن درکشیدن:** بریتی لە دووری کردن، خۆبواردن، خۆپاراستن، خۆکۆکردنەوە و چوونە لاوە.





**دامن زدن:** 1) فوولێکردن لە ئاگر بە ئاتەگی یان داوێنی جل. 2) بریتی لە خۆش کردن و داگیرساندنی ئاگری دووبەرەکی و ناکۆکی.

**دامن کسی را گرفتن:** دەستەوداوێن بوون، پەنابردنەبەر. تاوانبارکردنی ئەو. تووش و گرفتارکردن.

**دامن کشان:** رۆیشتن بە نازوخەمزەوە، بەلەنجەولار.

**دامن کشیدن(اندرکشیدن، درکشیدن، فراکشیدن، درچیدن):** 1) رۆیشتن بە ناز و لەنجەوە. 2) هەڵدانی داوێن. و بریتی لە روو وەرگێڕان و دووری‌لێکردن لە کەسێك.

**دامند:** نەگۆڕ.

**دامنگیر:** داوێن گیر، تووش هاتوو، یەخەگیر، گرتنەوە. "**دامنگیر کسی شدن**": بوونەهۆی گرفتاری و نارەحەتی ئەو، تووش کردنی ئەو.

**دامنه:** 1) بنار، قەدپاڵ، لاپاڵ. 2) پەراوێز، لێوارە، داوێن و کەنارەی شتێك. 3) پانتایی. 4) درێژە.

**دام نهادن:** داودانانەوە، داوداخستن، تەڵە دانانەوە.

**دامنەدار:** 1) پەراوێزدار، داوێن دار. 2) بەربڵاو و هەمەلایەنە، بەرین. 3) دوور و درێژ، تێروتەسەل.

**دامی:** 1) بڕوانە: "دامیار". 2) خوێنین، خوێناوی.

**دامیار:** داوباز، راوکەر.

**دامیدن:** 1) چوونە سەر، رۆیشتنە بان. 2) دانە با، بەباداکردن، شەن کردن، خۆیان هەڵاویشتن. 3) تۆم وەشاندن، تۆوچاندن.

**دانا:** زانا، شت زان، زۆرزان، زانیار، ژیر، دوونا، حان، چاوکراوە، تێگەیشتوو. "**بسیاردانا**": مامۆك، فره زانا.

**دانادل:** زانا و ژیر، ئاگا و وریا.

**داناسر:** بڕوانە: "خردمند".

**دانای کل:** هەمووشت زان.

**دانایی:** زانایی، زاناهی، فرەزانی، ژیری، ئاقڵی، زانس، زیرەکی، وشیاری، ئاگاداری.

**دانس:** سەما، هەڵپەڕکێ.

**دانستگی:** زانست و مەعریفە.

**دانستن:** زانین، تێگەیشتن، پێزانین، ئاگەداربوون.ئەرخەیان بوون، خاترجەم بوون. (لێك)جیاکردنەوە.

**دانستنی:** شیاوی زانین. "**دانستنیها**": زانیارییەکان.

**دانسته:** زانراو. لە رووی ئاگایی و زانیارییەوە. زانا، فامیدە، ژیر.

**دانستەکردن:** دانان، دیاریکردن.

**دانسینگ:** کۆڕی سەما، شوێنی سەمای پێکەوەی ژنان و پیاوان.

**دانش:** زانست، زانیاری، تۆرە، زانایش، زانایەنە، لێزانین، ئاگاداری.

**دانش‌آباد:** جێگەیەك کە بەهۆی زانست و تۆرەوە گەشەی کردوە، ناوەندی زانست.

**دانش‌آرا:** رازێنەری تۆرە و زانست.

**دانش آزما:** تاقیکەرەوەی زانست.

**دانش آموخته:** ئەوەی زانستێکی تایبەتی فێربووە. دەرچوو.

**دانش‌آموز:** 1) قوتابی، زانست خواز. 2) بە مانای مامۆستا و وانەبێژ و فێرکاریش دێ.

**دانش آور:** زانست هێن، بیرمەند، تۆرەڤان.

**دانش الفنج:** قوتابی، زانست خواز.

**دانش اندوز:** قوتابی، کەسێ کە زۆر کتێو دەخوێنێتەوە و زانست فێر دەبێ.

**دانش اندیش:** کەسێ کە بیر لە زانست و تۆرە دەکاتەوە.

**دانش بهر:** بەهرەمەند لە زانست، ئەوەی کە لە زانست بەهرە دەبا.

**دانش پذیر:** زانست وەرگر، خوازیاری زانست.

**دانش پرست:** زانست پەرست، کەسێ کە زانست و تۆرەی خۆش بوێ.

**دانش پرور:** پەرەپێدەری زانست.

**دانش پژوه:** خوازیاری زانست، پەیدۆزی زانست، تۆرەڤان، زانا.

**دانش پسند:** لایەنگری تۆرە و زانست، زانست پەسند. ئەوەی کە زانست قبوولی بکا.

**دانش پناه:** پەناگەی زانست، لایەنگری تۆرە و زانیاری.

**دانشجو:** خوێندکار، خۆندکار، خوازیاری زانست، پەیدۆزی زانست.

**دانش دوست:** زانست خۆشەویست، هۆگری زانست.

**دانش سار:** شوێنی زانست، زانستگا.

**دانش سرا:** 1) زانستخانە، جێگەی زانست فێربوون. 2) دامەزراوەی راهێنان بۆ پەروەردەکردنی مامۆستا.

**دانشسرای عالی:** زانستخانەی بەرز.

**دانش سگال:** ئەوەی بیر لە تۆرە و زانست بکاتەوە، بیرمەند، تۆرەڤان.

**دانش سنج:** زانست پێو.

**دانش فروز:** رووناک کەرەوەی تۆرە و زانست، گەشێنەرەوەی زانست.

**دانش فروش:** 1) فرۆشیاری زانست، زانا، فرەزان. 2) کەسێ کە زانست و زانیاری خۆی بە رووی دیتران دا بکێشێ.

**دانشکده:** کۆلێژ، زانستخانە، شوێنی زانست، زانینگە، فێرگەی بەرز، هەرکام لە لقەکانی زانستگا،"فاکولتێ".

**دانشگاه:** زانستگا، زانستگە، زانکۆ، جێگەی خوێندنی بەرز، قوتابخانەی بەرز کە تەواوی زانستەکان لەوێ دەوترێتەوە.

**دانشگر:** خاوەن زانست، تۆرەڤان.

**دانش گزین:** هەڵبژێری زانست، ئەوەی کە تۆرە و زانست هەڵبژێرێ، ئەوەی کە رووبکاتە زانست.

**دانش گستر:** پەرەپێدەری تۆرە و زانست ، کەسێ کە لە تۆرە و زانست قازانج بە هەموان بگەیەنێ.

**دانشمند:** تۆرەڤان، هۆزان، بیرمەند، زانا، زانیار، فرەزان، فرەزانا، خاوەن تۆرە و زانست.





**دانشمندانه:** بیرمەندانە، وەک بیرمەندان، بە شێوازی زانایان.

**دانشنامه:** 1) شەهادەی زانستگایی. 2) بڕوانە: "دایرةالمعارف". 3) تێز.

**دانش نیوش:** ئەوەی گرنگی بە زانست دەدا، زانست وەرگر.

**دانشور:** خاوەن تۆرە و زانست، زانا، تۆرەڤان.

**دانشوری:** بیرمەندبوون. خولی راهێنانی تایبەت بە مامۆستایانی زانستگا بۆ بردنەسەری پلەی خوێندەوارییان.

**دانشومند:** بڕوانە: "دانشمند".

**دانشی:** 1) تۆرەڤان، بیرمەند، خاوەن تۆرە. 2) بڕوانە: "دانشمند". 3) بیرمەندانە، تۆرەڤانانە.

**دانشیار:** 1) کەسێ کە زانست دۆست و هەواڵ یەتی، ئەوەی کە یارمەتی زانست دەدا. 2) مامۆستای یاریدەدەر.

**دانشی مرد:** پیاوی بیرمەند، پیاوی خاوەن زانست و تۆرە.

**دانگ:** بەش، بەهرە، پشک. شەشیەکی شتێک، شەشیەکی مڵک.

**دانندگی:** زانایی، زانست، مەعریفە.

**داننده:** زانا، ئاگا. کارامە، لێزان، شارەزا.

**دانه‌بندی:** پلەکردن.

**دانه‌خوار:** دانەخۆر.

**دانه‌نشان:** بڕوانە: "جواهرنشان".

**دانی:** نزیک. و بە مانای پەست و نزم.

**داودادن:** تۆبە پێدان، لە گەمە یان قوماردا مافی پێشکەوتن بە خەنیم دان.

**داودار:** بڕوانە: "ادعاکننده".

**داور:** دادوەر، دانێر، نێوبژیوان، ناوبژیکەر. خودا. پاشا، دەسەڵاتدار.

**داورستان:** دادگا، دادگە."داوریخانە و داوریگاه" ش هەر بەم مانایە دێن.

**داوری:** دادوەری. ناوبژیوانی. یەکلاکردنەوەی ناکۆکی لە رێگەی نافەرمی لەلایەن کەسێک بێجگە لە دادوەر. ناتەبایی، دژایەتی. ناکۆکی، جیاوازی.

**داوطلب:** خۆبەخش، خواستنی خۆیی، داواکار، داخواز، داوخواز، خوازیار، ژدل، هەمت، بەبێ زۆر لێکردن. "**داوطلب شدن**": پێشەنگ بوون بۆ ئەنجامدانی کارێک، خۆبەخشین.

**داوطلبانه:** دڵخوازانە، خۆبەخشانە، بە ئیرادە و ویستی خود.

**داویافتن:** دەرفەت پەیداکردن، وەدەست خستنی هەل.

**داویدن:** ئیدعاخوازی، ئیدیعاکردن، لاف لێدان.

**داها:** ئەشکەوت، کەلێن، کێو، دۆڵ.

**داهی:** زیرەک، وریا، بیرتیژ، زانا. فێڵباز لە رامیاریدا.

**داهیه:** 1) فرە وریا و زیرەک و زانا و بەتەگبیر. 2) بەڵا، کۆست، رووداو و کاری سەخت و دژوار.

**دایرکردن:** دامەزراندن، کردنەوە، خستنەگەڕ. ئاوەدان کردنەوە.

**دایره:** 1) فەرمانگە، کارگێڕی. 2) جەغز، جوغز، جغز، بازنە، چەمەرە، خاز، خیزك، گاخ، خەتی بە دەورە، کێڕی گرۆڤەر، گۆڤەندەك، شووز، کۆز. **"دایرەای"**: بازنەیی، جەغزی. **"دایره بستن"**: بە فۆڕمی جەغز وەستان، کۆزبەستن، ئاڵقەدان. **"دایره مماس"**: (بیرکاری) دوو بازنەی لەیەك کەوتوو. **"دایره داخلی"**: (بیرکاری) بازنەی ناوەوە. **"دایرەزدن"**: بە شێوەی جەغز وەستان، کۆزبەستن. **"دایره ریختن"**: ئاشکرا و خویاکردن. **"نیمدایره"**: (بیرکاری) نیوە جەغز، نیوجەغز، نیڤ گۆڤەند، هەلەك.

**داینامیسم:** رەسەنایەتی روح و پێکهاتنی جیهان لە گەردیلەکانی.

**داییزم:** رێبازی ربووبیەت.

**دبّ:** خزین بەسەر زەویدا، گاگۆڵکەکردن

**دباغ:** چەرمچی، چەرم خۆشکەر، پێست خۆشکەر، دەباخچی، دەباغچی، کەسێ چەرم دەباخ دەدا.

**دباغت:** هەڵاڵدانی چەرم، خۆش کردنی چەرم بە(دەرمان/ تاڵ و مازوو).

**دباغ خانه:** هەڵاڵخانە، دەباخانە، دەباغ خانە، جێگەی دەباخ دان، گەمارگە، خۆشەخانە.

**دباغی:** هەڵاڵدانی چەرم، خۆش کردنی چەرم، پێست خۆش کردن، دەباخدان، دەباغدان، گەمار. **"کارگاه دباغی"**: خۆشگە، خۆشەخانە، دەباغ خانە. **"مزد دباغی"**: دەباخانە، مزی چەرم دەهەڵاڵ نان.

**دبداب:** تەپڵ، دەهۆڵ. لە فارسیدا بە مانای ناوبانگ و شان و شکۆ هاتوە.

**دبدبه:** سەنتەنە، دەنگی وێکەوتنی سمی چوارپێیان لە زەوی، دەنگی تەپڵ و دەهۆل، شکۆ و زرموکوتی حەشاماتی هاوڕێی گەورەپیاو.

**دبستان:** قوتابخانەی سەرەتایی. قوتابخانە، قوتابخانەی ئەدەبی.

**دبق:** بڕوانە: "مویزك".

**دبنگ:** بێئاوەز، گێل و نەفام، گەمژە، گەوج، هێڕ، هەوایی، گەللایی و گوێنەدەر، حەپۆل، شەواك، بێهۆش.

**دبەدرآوردن:** بریتی لە نکۆڵی کردن، تەشقەڵە پێکردن، تەشقەڵە سازکردن، گێچەڵ پێکردن، دەبەپێکردن، هات و هەرا سازکردنی بەدرۆ، کێشەتێهاڵاندن.

**دبەکردن:** تەشقەڵەکردن، گێچەڵ کردن، گەڕکردن، بەزم پێگرتن/ پێگێڕان.

**دبیب:** خزین، خشیان، بەخشکە رۆیشتن.

**دبیر:** 1) نووسەر، بنووس. 2) سکرتێر، ئەمیندار. 3) مامۆستای دواناوەندی. 4) دووهەمین کەسێتی لە باڵوێزخانە. 5) بڕوانە:"محاسب". 6) وێنەکێش، نیگارکێش. **"دبیرکل"**: سکرتێری گشتی.

**دبیرخانه:** بڕوانە: "دارالانشاء".

**دبیرستان:** قوتابخانەی دواناوەندی.





**دبیره:** بڕوانە:"ماتیکان".

**دبیری:** نووسەری.

**دپارتمان:** پارێزگا. گروپ، بەش.

**دپرسیون:** خەمۆکی، نەخۆشییەکی دەروونییە.

**دترمینیسم:** (فەلسەفە) بۆچوونی فەلسەفی لەسەر بنەمای ئەوەی کە دیاردەکانی جیهان بەپێی دۆخێك دێنەئاراوە کە وەدیهاتنیان پێویست دەکا و ئەم پێویستییە لە گشت سروشت دا هەیە، قەدەرگەرێتی.

**دثار:** داپۆشەر، رووپۆش.

**دثور:** (دُ.ثُ) کۆنەبوون و لەناوچوونی داب و نەریت. پیس بوونی جل. ژەنگاویبوونی شمشێر. ون بوونی ئاسەوار.

**دثور:** (دَ) پیاوی لەش گران و تەوەزەل، خەواڵوو.

**دجّال:** 1) ئاوی زێر کە رووی شتێکی پێدادەپۆشن. 2) زۆر درۆزن و خڵەتێن. 3) ججاڵ، جرجاڵ، کەرسوارێکی خەیاڵییە کە گوایە رۆژێك دنیا دەگرێ.

**دجّاله:** گروپی خەڵك، گروپێك لە خەڵك.

**دچار:** تووش بوو، گیرۆدە، گیرخواردوو، دەرەتان لێ بڕاو، ئەوقە، گرفتار.

**دچارشدن:** 1) تووش بوون، گیرۆدەبوون، گرفتاربوون، پێوەبوون، بەسەرهاتن، هەڵ ئەنگوتن. 2) مانەوە، گیرخواردن، قەتیس مان، بەنگ بوون.

**دخّال:** کەسێ کە خۆی لە هەموو کارێك هەڵدەقوتێنێ.

**دخالت کردن:** دەست تێوەردان، دەست تێخستن، چەت و قۆرت تێخستن، خۆتێ گەیاندن، خۆتێهەڵقوتاندن، دەغڵکردن.

**دخالت نکردن:** خۆتێ نەگەیاندن، رووڵێ وەرگێڕان، رووبادان، دەست تێوەرنەدان.

**دخترآفتاب:** بریتی لە شەڕاب.

**دخترترشیده:** قەیرەکچی شوونەکردوو، مانگۆڕ.

**دخترزر:** 1) بریتی لە شەڕاب، شەڕابی ترێ. 2) ترێ، هێشووی ترێ.

**دخترك:** کچۆڵە، کیژۆڵە، کناچڵێ.

**دخترو:** بڕوانە: "دخترك".

**دخش:** 1) سەرەتا، دەستپێك. 2) تاریك.

**دخل:** داهات، دەسکەوت، قازانج، بەهرە، بەروبووم. **"دخل چیزی را آوردن"**: بەتەواوی بەکاربردن و هیچ لێنەهێشتنەوە. **"دخل داشتن"**: داهات هەبوون. **"دخل کردن"**: وەدەستهێنانی داهات. دەست تێوەردان. **"دخل کسی آمدن( درآمدن )"**: بە توندی ئازاردران یان شکست خواردن و لەناوچوونی ئەو. **"دخل و خرج"**: داهات و خەرج. **"دخلی داشتن"**: پێوەندی هەبوون.

**دخمسه:** 1) فریودان، خڵەتاندن. 2) فێل، دهۆ. 3) ژانەسەر، گرفتاری، دۆخی دژوار.

**دخمه:** بۆدڕ، قوڵکەی ژێرزەوینی. گۆڕ. شوێنی بەرتەسك و تاریك.

**دخو:** (دِ.خَ) 1) کەیخودا. 2) پیاوی گەمژە و ساویلکە.

**دخـول:** چوونە ناو، رۆیشتنە ناوەوە. **"دخـول كـردن":** چـوونەناوەوە، چوونەژوورەوە. ئاوێتەبوونی ژن و پیاو.

**دخیـل:** 1) نامۆیەك كە بچێتە ناو قەومێكەوە و پێوەندی و خزمایەتی‌یان دەگەڵ دامەزرێنێ. 2) وشەیەك كە لە زمانێكەوە بچێتە ناو زمانێكی دی. 3) خۆتێ هەڵقوتێن، دەست تێوەردەر. **"دخیل كسی بودن(شدن)":** پەنابردنەبەر ئەو و بەپاڕانەوە داوای شتێك لێكردنی.

**دخیـل شـدن:** پەنابردن، پەنابردنە بەر كەسێك، چوونە ژێر داڵدە.

**دد:** گیانلەبەری دڕ و بێ بەزەیی.

**ددر:** (دَ.دَ) كـوڵان و بـازاڕ، دەرەوەی ماڵەوە.

**ددمنـشانە:** بێ بەزەیی‌یانە، دڕندانە، دڵڕەشانە.

**ددیگـر:** لە پلەی دووهەم دا. دووهەم، دووهەمین.

**درآستانە:** لە بەرەبەری.

**درآمـد:** 1) بارەچە، داهات، دەرامەت، هۆرتە، قازانج، پێچەوانەی **"هزینە"**. 2) پێشەكی، سەرەتا. **"درآمد ملی":** داهاتی نەتەوەیی. **"درآمد ناخـالص ملـی":** داهاتی پوختەنەكراوی نەتەوەیی. **"پـردرآمـد":** پڕدەرامەت، بەرێژەو، هەزەخ.

**درآمدسـال:** ساڵانە، ساڵاوەر، دەرامەتی ساڵ.

**درآمـد سـرانە:** داهاتی تاك، داهاتی سەرانەی خەڵكانی وڵاتێك.

**درآمدن:** 1) چوونە ناو، رۆیشتنە ناوەوە. 2) هاتنەدەر، دەرهاتن. 3) روان، سەوزبوون. 4) دەركەوتن. 5) هاتنە بازاڕەوە. 6) وەدەست هاتن. 7) بەگوێ گەیشتن، بیستران. 8) هاتن، گەیشتن. 9) رەخنەكردن. 10) پێك وەربوون، بەگژاچوون، تێك هەڵچوون.

**درآمیختن:** 1) تێكەڵكردن، ئاوێتەكردن. 2) تێكەڵ بوون، ئاوێتەبوون.

**درآوردن:** 1) دەرهێنان، دەرهاوردن، دەرهانین، دەرخستن، دەرهاویشتن، وەرانتش. 2) داكەندن، داكەنن. 3) چاپ و بڵاوكردنەوە. 4) وەدەست هێنانی زانیاری لە كەسێك بە پرسین. 5) دروست كردن، چێكرن. 6) دەرخستن، ئاشكراكردن. 7) بەگوێ گەیاندن. 8) هێنانەخواردن.

**درآویختن:** 1) هەڵواسران، ئاوێزان بوون، چنگەگركێ وبەگژیەكاچوون، پێك وەربوون. 2) هەڵواسین، ئاوێزان كردن، سەرەونخوون كردن، داڵەقاندن، هەڵپەساردن.

**درآیش:** بڕوانە:"تأثیر".

**درآیند:** بڕوانە:"پیامد".

**درادوزا:** كەسێ باش ببڕێ و بدروێ. كەسی بەئەزموون و زانا كە هەر كاتێ هەڵە بكا خێرا بەخۆیدا بچێتەوە و هەڵەكەی راست كاتەوە.

**دراز:** 1) درێژ، دژی كورت. 2) تێروتەسەل. 3) دژوار، سەخت.





**درازآهنگ:** زۆر درێژ و بەمەودا. كەسێك كە خنەخن دەكا لە كارێكدا و كارەكە وەدوا دەخا. ئەوەی بە نیازە رێگەی دوورودرێژ بپێوێ، بەپشوو.

**درازا:** درێژایی، لە درێژی. **"بە درازا كشیدن":** درێژە كێشان، پێچوون.

**درازبالا:** بەژن و باڵا بەرز، بە قەڵافەت.

**درازدست:** 1) كەسێ كە دەستی درێژی هەبێ. 2) كەسی باڵادەست و زاڵ، دەست درێژی كەر، تەماكار.

**درازدستی:** دەست درێژی، سنوور بەزێنی.

**درازشدن:** درێژ بوون/ بوونەوە، دژی كورت بوون، وەرانتا. باڵابەرزبوون. دژواربوونەوە.

**درازقـد:** باڵابەرز، بەژن بڵیند، درێژن، درێژە.

**درازكـردن:** 1) درێژكردن، درێژكردنەوە. 2) بەرەوپێش بردنی شتێ.3) تەمبێكردن بە تایبەت بە دار. 4) درێژەپێدان. 5) دژواركردنەوە.

**درازكشانیدن:** وەپاڵ خستن، پاڵ خستن، درێژڕاكێشان.

**درازكشیدن:** درێژ بوون، رازان، راكشان، خۆ درێژكردن، خۆلەگەزدان، دلۆرە، خەوتن، پاڵ كەفتن، ڤەكەتن، وەركەتن، وەركەفتن، وەركەوتن، هەڵاژین، هەڵاژیان، خڕكین، خریك.

**درازمدت:** درێژخایەن، درێژماوە.

**درازنا:** درێژایی، درێژ، كێشراو، درێژی.

**درازناك:** درێژ و رەقەڵە.

**درازی:** درێژی، دژی كورتی. درێژبوونی مەودا.

**دراسـت:** كتێـو خوێندنەوە، زانست فێربوون، لێكۆڵینەوە، توێژینەوە. زانایی.

**دراستادن:** دەست پێكران.

**درافتـادن:** 1) تێهەڵچوون، كێشمەكێش كردن، تێك گیران، تێكەوتن، تێوەگلان. 2) سازبوون یان دەسپێكران. 3) كوژران. 4) گرفتاربوون. 5) بڕوانە: "تابیدن". 6) كەوتنەخوارەوە. 7) بڵاوبوونەوە. 8) هێرش هێنان، شاڵاوبردن. 9) رووداو. 10) لە دایك بوون. **"درافتادن بە چیزی":** كەوتنە بیری ئەو.

**درافشان:** (دُ) بریتی لە كەسی رەوان بێژ، زمان پاراو، زمان شیرین. بەخشندە، دایندە. بارانی ورد.

**درافشانی:** بریتی لە رەوان بێژی، زمان پاراوی، زمان شیرینی.

**درافكنـدن:** 1) خستن یان سەرەونخوون كردن. 2) كوشتن. 3) تووش كردن، گرفتاركردن. 4) دانان یان خستنی شتێ. 5) رشتن. 6) تێكەڵاوكردن. 7) پەخش یان بڵاوكردنەوە. 8) خستنەڕوو، هێنانەگۆڕ.

**درام:** دراما، شانۆ، شانۆ یان چیرۆكێك كە لە سەربوردەوە نزیك بێ، شانۆنامەیەك كەهەڵگری بابەت گەلی خەماوی و پێكەنیناوی بێ یان شانۆنامەیەك كە پێكەنیناوی نەبێ.

**دراماتیک:** شانۆیی، دراماتیک. خەمهێنەر، ناڕەحەتکەر.

**درانداختن:** 1) هاویشتن، تووڕدان، فڕێدان. 2) دەستپێکردن. 3) کێشانەوە.

**دراندن:** 1) دراندن، شڕکردن، پچڕاندن، لەت کردن. 2) بڕوانە:"ترکاندن".

**درانگیزشی:** بڕوانە: "احساساتی".

**درای:** بێژە، بلێ. هەروەها بە مانای "درایندە" لە حاڵەتی پاشگریدا وەک: "یاوەدرای": قۆڕیات وێژی.

**درایان:** بێژەر، وێژەر، لە حاڵی قسەکردندا.

**درایت:** زانین، تێگەیین، پەیپێبردن. ژیری. ئاگایی، زانست.

**درایستادن:** 1) دەسپێکران. 2) دەست بە کاربوون. 3) پێداگریکردن. 4) راوەستاوی و خۆڕاگری کردن.

**دراینده:** بێژەر، وێژەر.

**درایییدن:** گوتن، قسەکردن، ئاخاوتن. گۆرانی وتن.

**دربا:** بڕوانە: "حاجت".

**درباختن:** دۆڕان، دۆڕاندن، دۆڕیان، لە دەست دان، دانان.

**دربار:** دیوەخانی پاشا، کۆشکی پاشایی.

**درباره:** لە پێوەندی، لە مەڕ، لە بابەت، سەبارەت، دەربارەی.

**دربان:** دەرکەوان، قاپچی، قاپیوان، قاپێوان، قاپیەوان.

**دربایست:** 1) پێداویستی، پێویستی، ئاتاجی، نیاز. 2) شیاوی، شایستەیی.

**دربایستن:** 1) پێویست بوون. 2) لەبار و شیاوبوون.

**در بحبوحەی...:** لە گەرمەی، لەجەنگەی، لە گەرماوگەرمی.

**دربدر:** 1) ئاوارە، بێ ماڵ و حاڵ، لانەواز، هەڵوەدا، پەڕەوازە. 2) لەم درگاوە بەو درگا، لەم ماڵەوە بەو ماڵ.

**دربدر گشتن:** ماڵ بە ماڵ بە دووداگەڕان.

**دربدری:** ئاوارەیی، لانەوازی، بێ ماڵ و حاڵی.

**دربردارنده:** بڕوانە:"شامل".

**دربرداشتن:** بەدواوەبوون، لە باوەش دابوون، لەخۆگرتن، هەڵگری، بریتی لە.

**دربردن:** ڕفاندنی شتێ یان کەسێک و دەگەڵ خۆ بردن، فڕاندن.

**دربرکشیدن:** لەئامێزگرتن، لە باوەش کردن.

**دربرگیرنده:** هەڵگر، لەخۆگر.

**دربست:** یەکجێ، بەگشتی، دەربەست.

**دربستن:** 1) بەستن، بەندکردن. 2) دەسپێکردن. 3) چەسپاندن، لکاندن. 4) بڕوانە:"پیچیدن". 5) بڕوانە: "پوشیدن". 6) دانەپاڵ، ڕەپاڵدان.

**دربند:** 1) کۆڵانی بنبەست کە درگای هەبێ. 2) ڕێگەی تەسک و باریک لە کێو، دۆڵ. 3) قەڵا. 4) گرفتار، یەخسیر.





**دربندان کردن:** گەمارۆدان، ئابلۆقەدان.

**دربند بودن:** گرفتاربوون، یەخسیربوون، لە گرتووخانەدابوون.

**دربند چیزی بودن:** لە بیری شتێک دا بوون.

**دربندکردن:** پابەندکردن، بەندکردن، یەخسیرکردن، زیندانی کردن.

**دربه:** (دُ.بَ) 1) ژیربوون، شارەزا و کارامە لە کار و پیشەسازی دا. 2) هۆگری و تێرنەخۆری لە شتێ. 3) نەترسی و بوێری.

**درپذیرفتن:** 1) وەرگرتن، قبوولکردن. 2) داڵدەدان، پەنادان.

**در پرتو..:** لەبەر تیشکی، لەبەر ڕۆشنایی، لە ڕووناکایی ...دا.

**درپرده:** بەنهێنی و لە پشت پەردەوە.

**درپردەبودن:** نادیاربوون، نهێنی بوون، داپۆشران.

**درپردەگفتن:** بەنهێنی گوتن، بە تەوس و ڕەمزەوە گوتن.

**درپی:** بە دوای، لە دوای. "درپی کردن": بەدواداچوون، شوێن کەوتن، شۆنەونیان، شوێن هەڵگرتن، پەیجۆریکردن.

**درپیچیدن:** پێچ دان، لوول دان، لوورکردن. دەگەڵ کەسێک تێک گیران. گەمارۆدان. گرتن و لێپێچینەوە لەگەڵ کردن.

**درپیش کردن:** خستنە پێشەوە، خستنە بەرەوە.

**درپیوستن:** بەیەک گەیشتن، پێکەوەلکان، پەیوەست بوون. دەست پێکردن. دەسپێکران.

**درتنگناقراردادن:** تەنگ پێ هەڵچنین، تەنگ پێ هەڵێنان، تەنگەتاوکردن، تێترنجاندن، قەتیس کردن، قەتیزکردن، دەورلێگرتن، گیردان، خستنە ناچارییەوە، دەرەتان لێبڕین، لالێبڕین، لالێ بڕینەوە، کلک گرتن.

**درج:** (دَ) 1) تێکەوەپێچان، نووسین و گونجاندنی بابەتێک لە کتێبێک یان ڕۆژنامەیەکدا، تیانووسین، تۆمارکردن. 2) نامە، نووسراوە.

**درجات:** کۆی"درجه".

**درجازدن:** لە جێگەدا لێدان، بەرەوپێش نەچوون، مانەوە لە دۆخێک یان پلەیەک دا و پێشنەکەوتن.

**درج شدن:** تۆمارکران، نووسران.

**درجنبیدن:** وروژان، هەڵخڕان.

**درجه:** پلە، نمرە، رادە، پایە، ژمارە، میهەنگ.

**درجەبندی:** نقراندن، پلەبۆدانان، پلەبەندی، دابەش کردنی شتێ بە چەند پلە یان چینەوە.

**درجەدار:** پلەدار، خاوەن پلە.

**درچیدن:** کۆکردنەوە. دوورخستنەوە.

**درحال رشد:** پەرەئەستێن، پەرەستێن، لە حاڵی پەرەساندن دا.

**درحد:** له ئاستی، له رادەی.

**درحقیقت:** راستانه، لەڕاستیدا.

**درخت زدن:** داربڕین.

**درختکاری:** دارچاندن، نەمام چاندن.

**درخش:** (دُ.رُ یان دُ.رَ) رووشنی، ڕۆشنایی، رووناکی.

**درخشان:** بریقەدار، بریقەدەر، بەبریقە، بەتروسکە، تروسکەدار، پرشەدار، ورشەدار، شۆقدار، شەوقدار، شاهیك، خەڕرا، بەدرەوش، بەدرەوشین، دروشن، وریشن، گرشەدار، رۆشن، رووناك. سەرنج راکێش و بەرچاو(پیرۆزی درخشان).

**درخشش:** درەوش، درەوشین، درەوشان، درەوشانەوە، دروشە، بروسك، بریس، بریسکە، بریسکەدانەوە، بریکە، تروسك، تروسکە، تریسکەتریسك، تلێسکە، تەیس، چروس، چروسکە، چروسان، برقە، بریق، بریقە، بروقە، بریقەدانەوە، شەوق دان، ورشە، وریش، وریشە، پرشە، گرشە، تیشك دان، ئاورنگ، مەرێس. چالاکی سەرنج راکێش و بەرچاو. "**درخشش پیاپی**": بریسکەبریسك، بریقەبریق، تروسکەتروسك، تروسکەی بەشوێن یەکا.

**درخشش کم:** چریسکە، تروسکایی، تروسکەی کەم.

**درخشندگی:** درەوشاوەیی، بەبریقەیی، بریقەداری، ورشەداری. چالاکی بەرچاو و سەرنج راکێش.

**درخشنده:** ورشەدار، گرشەدار، بریقەدار، تروسکەدار، دروشێن، وریشن، تیشك هاوێژ.

**درخشیدن:** دروشیان، درەوشیان، درەوشان، درەوشین، درەوشینەوە، تیشك دان، ورشەدان، بریقان، بریقانەوە، بریقەدان، شۆقدان، تروسکان، تروسکانەوە، تروسکیانەوە، تروسکەدان، بروسکان، بروسکیان، بروسکین، بریسکان، بریسکینەوە، تەیسین، ئاورنگ دان.

**درخصوص:** سەبارەت بە، لەمەڕ، لەپێوەندی.

**درخواست:** داوا، داواکاری، داخوازی، تکا، خوایشت.

**درخواستن:** داواکردن، خواستن، تکاکردن، خوایشت کردن.

**درخواست نامه:** داوانامە، داخوازنامە.

**درخواندن:** بانگ کردن.

**درخواه:** داوا، تکا، خوایشت.

**درخور:** شیاو، شایان، گونجاو، لەبار، بەکەڵك. "**درخورتوجه**": بەرچاو، شیاوی سەرنج.

**درخوراندن:** دەرخواردان. گونجاندن، جێکردنەوە.

**درخورد:** بڕوانە:"درخور".

**درد:** ژان، ئێش، ئێشان، ئێشای، ئازار، دەرد.





**دردآشام:** (دُ) شەڕاب خۆرەوە، ئەوەی کە چۆڕایی لە جامی شەڕاب دەبڕێ، ئەو کەسەی خڵتەی شەڕاب دەخواتەوە.

**دردآشنا:** (دَ) لەش بەبار، دەردەدار. ئاگادار لە ژان و سەختییەکانی خەڵکانی‌دی و هاودەردی لەتەکیان دا.

**دردآگین:** (دَ) پڕژان، دەرەدەدار، پڕئازار.

**دردآلود:** (دَ) بەژان، ژاندار، بەئێش، ئێشدار، بەئازار.

**دردآمدن:** وەژان کەوتن، ژان گرتن.

**دردآور:** ئازارهێن، ئێش هێن، خەمهێن.

**دردا:** بڕوانە: "دریغا".

**دردادن:** 1) تەقەکردن. 2) دەرهێنان، دەرهاوردن. 3) دان. 4) دەربڕین.

**درداده:** سەرچاوە و هۆکارەکانی بەرهەمهێنان.

**دردار:** 1) درگادار، هەرشتێ کە درگای هەبێ. 2) درگاوان، پاسەوانی بەر دەرگا. 3) دەنگی دەهۆڵ.

**دردام افتادن:** لەداوکەوفتن، کەوتنە داوەوە، لە داو کەوتن، گیران بە داو.

**دردبرچین:** بڕوانە: "دردچین".

**دردبیس:** سەختی و بەڵا، کاری دژوار. پیرو.

**دردچشیدن:** سزاچەشتن، سزا چێشتن، سزاچەشین، تووشی رەنج و ئازاربوون.

**دردچین:** 1) ژان لابەر، ژان شکێن، چارەکەری دەرد و ئێش. 2) دڵسۆز و خەمخۆر.

**دردخوار:** 1) لەش بەبار، دەردکێش. 2) نەدار و بەلەنگاز.

**دردزا یمان:** ژان ژوور، ژان گرتن، ژوو، زاجلانەی، ئێش و ژانی منداڵ بوون.

**دردزده:** دەردەدار، نەخۆش، لەش بەبار.

**دردستان:** ژان بڕ، ژان شکێن، ئازارشکێن.

**دردسترس:** لە هەوێڵدا، پەردەوژ، پەردەژی، بەردەست، بەردەس، لە بەردەم، دەردەست، داڕەت، لادەست، قامچ، دەست پێڕاگەیین، نزیك بۆ دەست تێگرتن، ئامادە.

**دردسر:** ژانەسەر، سەرێشان. و بریتی لە زەحمەت و ئەرکی زۆر، دەردەسەری.

**دردسرآفرین:** ژانەسەرخوڵقێن.

**دردصعب العلاج:** دەردگرو، نەخۆشی گران.

**دردگرفتن:** ژان کردن، ژانین، ئێشان، ئازار پێگەیشتن.

**دردمند:** دەردکێش، بەئازار، لەش بەبار، نەخۆش، دەردەدار، دەرداوی، دەردبار، ئێشدار.

**دردمیدن:** فوو تێکردن، با تێکردن. هەڵکردنی با.

**دردناك:** بەژان، لەژان، پڕژان، بەئازار، بەئێش و دەرد، ئێشدار، دڵتەزێن، خەمهێن.

**دردو:** زمان پیس و بێ حەیا.

**دردور:** گێژاو، گێڤاف، گەرداو.

**درربار:** بەنرخ و گرانبایی. زۆرقسەڕەوان، فرەڕەوانبێژ.

**درربودن:** 1) رفاندن، فڕاندن.2) بێهۆش کردن. 3) لەبەین بردن. 4) رزگارکردن.

**دررسیدن:** هاتن، لە کاتی خۆیدا گەیشتن، لە ناکاو هاتنەناوەوە.

**دررفت:** دەرکەوت.

**دررفتگی:** لەجێگەچوون، لەجێگە دەرچوون، لەجێچوون، لەچووچوون، دەرچوویی، دەرچووگ.

**دررفتن:** 1) هەلاّتن، راکردن، دەرچوون، دەرپەڕین، چرتیان، تەرەبوون، ڤەترووی‌سکان، فیسمالك، خۆدزینەوە. 2) چوونەناو، رۆیشتنەناوەوە. 3) ترازان، لەبەریەك چوون، لە جێگەچوون، پچڕان. "**از زیر چیزی(کاری)دررفتن**": ئەنجام نەدان و لەژێری دەرچوون.

**درز:** قەڵشتی باریك، کەلێنی باریك، دەرز، درز، دەغەز، شڕەق.

**درزبردن:** بڕوانە: "ترك برداشتن".

**درز پیداکردن:** ئاشکرابوونی بابەتێك و ئاگاداربوونی خەڵك لێی.

**درزکردن:** درکیان، ئاشکرابوونی راز یان بابەتێك.

**درزگرفتن:** درز گرتن، درزدادان، کەلێن گرتن، قەڵشتە دیوار بە قوڕ گرتن، دروونەوەی دڕاوی پارچە. لە ناو خەڵکی رەشۆکدا: کورت کردنەوەی قسە.

**درزیستی:** بڕوانە:"سکونت".

**درس:** 1) وانە، دەرس. 2) رێگەی نهێنی.

**درساختن:** سازان، دەگەڵ یەك سازان، تەبابوون.

**درسپاردن:** بەجێهێشتن و بەتەنیا هێشتنەوەی کەسێك. ئاشکراکردنی رازی کەسێك.

**درسپردن:** 1) بڕوانە: "سپردن". 2) بڕینی رێگەیەك تا کۆتایی.

**درسپوختن:** بڕوانە: "سپوختن".

**درست:** راست، دروست، تەواو، بێکەمایەسی، کامڵ، رەوا. 2) دەست پاك و راست.

**درست آیین:** راست بڕوا.

**درستاران:** بڕوانە: "دستاران".

**درست شدن:** چێکران، ساز کران، ئامادەکران، چاك بوون.

**درستکار:** دەست پاك وڕاست، سەرڕاست، مرۆی راست و دروست، راست کردار، راست کار، کار دروست، کار راست، جێ متمانە، حەقانی، دروسکار، مرۆی بێلاریوخواری، بێ گزی ودزی، شیرپاك.

**درستکاری:** سەرڕاستی، دەست پاکی، بێ گزی ودزی، راست کرداری، شیرپاکی.

**درست کردار:** بڕوانە: "درستکار".

**درست کردن:** 1) چێکرن، سازکردن، سازدان، وەدیهێنان، ئامادەکردن، دروسکردن. 2) لێنان. 3) لابردنی کەموکووڕی. 4) بڕوانە:"آراستن". 5) پتەو قایم کردن. 6) سەلماندن. 7) چاك کردنەوە، خۆشەوەکردن.





**درست (و)حسابی:** بێ کەموکووڕی، تەواو. بەتەواوی.

**درسته:** یەکپارچە و تەواو. بەتەواوی و سالم.

**درستەبلعیدن:** لووشاندن، لووشە، لووشین، لووردان، قووت دانی بەخڕی.

**درستی:** راستی، دروستی، دروستکاری، سەرڕاستی. تەندروستی، لەش ساغی. سەلماندن. "**بە درستی**": بەڕاستی. بەبێگومان.

**درس خوان:** وانەخوێن، قوتابی.

**درس خواندە:** خوێندەوار.

**درس دادن:** 1) وانەوتنەوە. 2) ئامۆژگاریدا دان و فێرۆکردنی شێوازی کارێك. 3) فێرکردن، راهێنان.

**درس کردن:** 1) فێربوون. 2) فێرکردن.

**درس گرفتن:** 1) راهاتن، فێربوون. 2) پەند و ئەزموون وەرگرتن.

**درس گفتن:** وانەوتنەوە، فێرکردن.

**درشت:** درشت، زل، زبر، سبر، گرس، ناڕێك، دژی نەرم. بەدخوو، تووڕە وتۆسن. تیژوبڕ.

**درشتخو:** بڕوانە: "تندخو".

**درشت گو:** چۆڕس وێژ، نەشیاو بێژ، جنێودەر، کەسێ کە قسەی لەسەر دڵان گران ئێژێ، قسەڕەق.

**درشت نمایی:** گەورەکردنەوە.

**درشتی:** زلی لە بارستاییدا، درشتی، زبری. ناڕێکی. تووڕەیی، بەدخوڵقی. "**درشتی کردن**": بەتوندوتیژی هەڵسوکەوت کردن. پڕڕوویی و بێ شەرمیکردن. "**بە درشتی**": توندوتیژانە.

**درشدن:** 1) چوونە ناو، رۆیشتنە ناوەوە. 2) تەقەکران.3) ئاوێتەبوون. 4) رۆیشتن. 5) مردن. 6) خەریك بوون. "**بکاری درشدن**": بەکارێکەوە خەرێك بوون، سەرقاڵ بوون بە کارێکەوە.

**درشکستن:** شکاندن، وردکردن. لەناوبردن. وردبوون. بێهێز و لاواز و تێکشکان.

**درصدانە:** بڕوانە:"پورسانتاژ".

**درصدد:** خەریکی، بەتەمای.

**درصدر:** لە سەرەوە، لەبان.

**در عوض:** لەباتی، لە جیاتی.

**درغلتاندن:** خلۆرکردنەوە.

**درغیش:** زۆر، فرە، فراوان.

**درفش:** ئالاّ، بەیداخ.

**درفشان:** (دُ.رَ) بەدرەوشین، درەوشێن، ورشەدار، گرشەدار، رۆشن. لەرینەوە، شەکانەوە.

**درفشیدن:** 1) بڕوانە: "درخشیدن". 2) لەرزین، جووڵان، وەلەرەکەوتن.

**درفکندن:** بڕوانە:"درافکندن".

**درق:** (دَ) بەشی سەخت و رەقی هەر شتێ.

**درك:** (دَ.نَ 1) بێخ، بن. 2) بەڵگەیەك کە دوای فرۆشتنی مڵك بکەوێتە دەستی کەسێکی دی و بەپێی ئەو بەڵگەیە ئیدديعای خاوەندارێتی بکا. 3) شوێنی زۆر ناخۆش. 4) خوارووترین قاتی جەحەندم. **"بە درك":** بەتوون. **"بە درك فرستادن":** کوشتن. **"بە درك واصل شدن":** کوژران.

**درك:** (دَ 1) گەیشتن بە شتێك، پێگەیشتن. 2) تێگەیشتن، تێگەیین، پێزانین، سەردەرچوون، سەرلێدەرکردن، سەردەرهێنان، سەردەرێنان، سەرەدەر، سەرودەر، فامین، پەیبردن، مسایش، مسایە. **"درك عمومی":** تێگەیشتنی گشتی.

**درکار:** پێویست، پێداویست، بەکارهاتوو.

**درکارداشتن:** بەکاربردن، دەکارکردن، دەکارهێنان، کارپێکردن.

**درکردن:** فیشەك تەقاندن. دەرهێنان، دەرهاوردن. خستنەناوەوە. تێکەڵ کردن.

**درکشیدن:** 1) کێشانەوە، وێنەکێشانەوە. 2) سازکردن، دروست کردن. 3) کێشان و بردن بەرەو لایەك، راکێشان، کێشان، بەرەوخۆهێنان. 4) خواردنەوە. 5) قووت دان. 6) هێنانەخوار، دابەزاندن. 7) بڕوانە: "گستردن". 8) دوورخستنەوە، بردنەلاوە. 9) بزووتن، جووڵان. 10) درێژەکێشان. 11) بێدەنگ بوون. 12) بە زۆر ستاندن.

**درکوب:** بڕوانە: "طلبکار".

**درگردش:** لەگەڕدا، دەساودەس، دەستاودەست.

**درگذاشتن:** وازهێنان. تێپەڕین. لێبوردن و بەخشین.

**درگذراندن:** تێپەڕاندن، لە رادە دەرچواندن، سنوور بەزاندن.

**درگذشت:** مەرگ، مردن، کۆچی دوایی، لەدەستچوون.

**درگذشتن:** 1) کۆچیدوایی کردن، مردن. 2) تێپەڕین، دەرچوون، رۆیشتن، کەوتنەبەرەوە. 3) تێپەڕبوون، بەسەرچوون. 4) لێبوردن، بەخشین، دەست لێهەڵگرتن، چاوپۆشی کردن لە گوناهی کەسێك. 5) لابران، لە کۆڵ بوونەوە. 6) لە ناوچوون، تیاچوون. 7) چوونەدەر.

**درگذشته:** 1) جاریجاران، بەرلەئێستا، لە پێشوودا، لەڕابردوودا. 2) کۆچکردوو، مردوو.

**درگرفتن:** 1) ئاگرگرتن، هەڵایسان، سووتان. 2) کارتێکردن، کاریگەریدانان. 3) هاتنەدی و دەسپێکران. 4) تەشەنەسەندن، تەنینەوە. 5) بەشتێك داپۆشین. 6) گرفتاربوون. 7) بڕوانە: "پیش گرفتن".

**درگسلانیدن:** پچڕاندن، دڕاندن، لەت کردن.

**درگشادانە:** درگاژەنانە، شیرینیدان بە هۆی کردنەوەی دام و دەزگایەك.





**درگیر:** تووشبوو، گرفتار، گیرۆدە.

**درگیرانیدن:** ئاگرتێبەردان، پێکردنی ئاور.

**درگیرشدن:** 1) تێوەگلان، تووش بوون، گرفتاربوون. 2) دەس پێکردنی تێك هەڵچوون، هەڵایسانی ئاگری شەڕ، هەڤروشی، ئاورێش بوون، شەڕتێهاڵاندن، ئامبازی یەکتر بوون، تێك گیران.

**درگیری:** تێکهەڵچوون، بەشەڕهاتن. جیاوازی بۆچوون. گرفتار یان خەریك بوون. **"درگیری لفظی":** دەمەقاڵە، شەڕەچەقە، دم لە دم نان، چەنەبەچەنە، حانەحەپەشێ، بناشت.

**درماندگی:** داماوی، داماگی، تێماوی، ماتی و سەرگەردانی، سەخڵەتی. دەست کورتی، نەداری.

**درمان کردن:** دەواکردن، دەرمان کردن، چارەکردن.

**درماندن:** تیامان، تێمان، رامان، دامان، ماتی و سەرگەردانی، دەستەوەستان بوون، کلۆڵی، بێچارەبوون.

**درماندە:** تێماو، داماو، دامای، داماگ، دێران، بارکەوتوو، لاکەفتە، لاکەوتە، سەخڵەت، سەخڵەت، سەرگەردان، دەسەوەسان، دەستەوەستان، کلۆڵ، گونەك، بێچارە، کۆست کەوتە. دەست تەنگ، دەس بەتاڵ.

**درم خرید:** بە زێر کڕدراو، بەندە، خولام.

**درمندە:** بڕوانە: "درماندە".

**درندگی:** دڕندەیی.

**درندە:** دڕننە، دڕ(ندە)، وەحشی، داعبا. زۆر بێبەزەیی، دڵڕەق و زاڵم. زۆر تیژ و بڕ.

**درنشاختن:** بڕوانە: "درنشاندن".

**درنشاندن:** جێکردنەوە، گونجاندن.

**درنگ:** درەنگ، دێر، بێوەخت. مۆڵەت و دەرفەتی ئەنجامدانی کارێك. راوەستان و مانەوە لە شوێنێ. سەبر و پشوودرێژی یان توانای راوەستان و خۆڕاگری، ماوە.

**درنگاشت:** یادداشت، تۆمار.

**درنگ کردن:** دێرکردن، درەنگ کردن، گنخاندن، خاوەخاوکردن، وێستان. اوەستان و خۆڕاگری. وردبوونەوەو تێرامان. درێژەپێدان.

**درنظرگرفتن:** رەچاوکردن، دەبەر چاوگرتن، هەڵ نان، وابۆچوون، حایشان.

**درنگریستن:** روانین، تماشاکردن، سەرنج دان.

**درنوردیدن:** تێکەوەپێچان، لێك ئالان، پێوان، رێگەبڕین، تێپەڕاندن، گرتنەوە.

**درنوسان:** لەحاڵی هاتوچۆدا، لەحاڵی راژاندا، بەتەکەتەك.

**درنوشتن:** تێکەوەپێچان، تێپەڕاندن، پێوان.

**درنهادن:** دانان. دەسپێکردن. لێدان.

**درنهشت:** نەریت.

**درو:** دروێنە، دروین، درون، دروونەوە.

**دروا:** (دَ 1) بڕوانە: "دربایست". 2) هەڵاوەسراو، سەرەونخوون. 3) سەرگەردان، مات.

**دواخ:** 1) پتەو، قایم. 2) تەندروست، سالم، بێ کەمایەسی. 3) حاڵەتی خۆشبوونەوەی دوای نەخۆشی.

**دروان:** دروێنەکردن.

**درواییست:** بڕوانە: "دربایست".

**درود:** نزا، سڵاو، سڵاڤ، بژی، شابە، شاگا، شاگە، شەگە، خۆش بە.

**درودگر:** دارتاش.

**درودن:** دروونەوە، دروێنەکردن. بڕین و جیاکردنەوە.

**دروس:** کۆی "درس".

**دروغ:** درۆ، ورِ، ڤڕ، ڤرکا، ڤرت، ڤرۆ، ساختە، قسەی ناڕاست، دەس هەڵبەست، هل بەستە، چاپ، لاف، دژی ڕاست. "**دروغ بە(بر) کسی بستن**": تۆمەت لێدان لەو. "**بەدروغ**": بە درۆ، بەپێچەوانەی ڕاستی. درۆیین.

**دروغ باف:** بڕوانە: "دروغ پرداز".

**دروغ بافی:** بڕوانە: "دروغ پردازی".

**دروغ پرداز:** درۆ ڕازێنەرەوە، ساختەچی، ساختەکار، درۆهەڵبەست، درۆزن، قەپانچی.

**دروغ پردازی:** درۆ ڕازاندنەوە، ساختەچێتی، ساختەکاری، درۆ هەڵبەستن، درۆکردن، قسەدەراوردن.

**دروغزن:** درۆزن، درۆکەر.

**دروغسار:** درۆزن، درۆ ڕازێنەوە.

**دروغ شاخدار:** حەشکەدرۆ، درۆی زۆر ئاشکرا.

**دروغ گفتن:** درۆکردن، کەزباندن.

**دروغگو:** درۆزن، درۆکەر، درەوکەر، دروزە، وڕبێژ، دەرەوین، ڕاست دەر، ڕاست نەبێژ، نەڕاست، لافی، ڤرڤرە، ڤرۆ، ڤرۆکەر، ڤرەك، ڤرکەر، ڤڕێ، گونەکار، چاپچی، دەڤ خار، یالانچی، سەبیل تێکەر.

**دروغی:** درۆیین. دەسکرد و ناڕاستەقینە. بەدرۆ.

**دروغین:** درۆیی، درۆیین.

**دروکردن:** بڕوانە: "درویدن".

**دروگر:** (دُ.رُ.گَ) دارتاش.

**دروگر:** (دِ.رَ.گَ) دروێنەوان، درەوان، درەوکەر، ناندرو، پاڵە، فاڵە.

**درون:** ناخ، هەناو، دەروون، ژوورەوە، ناوەوە، هندروون. هەقیقەتی شاراوە.

**درون بینی:** دەروون بینی، سەرنجدانە ناخ و هەناو.

**درون پالایی:** پاڵاوتنی دەروون.

**درون پرور:** 1) کەسێ کە دەروونی خۆی ساف و پاك بکاتەوە. 2) جوامێر و خەڵك لاوێن.

**درونده:** دروێنەوان، درەوکەر.

**درونزاد:** بڕوانە: "غریزی".

**درون سو:** لای ژوورەوەی شتێ، ناوەوەی شتێك یان جێگەیەك.

**درون فکنی:** (دەروون ناسی) جۆری بەرگری دەروونییە کە لەو دا تاك تایبەتمەندیی کەسێتی دیتران دەداتە پاڵ خۆی.





**درون کاوی:** (دەروون ناسی) دەروون دۆزی، دەروون پشکنی، تاوتوێی پرسە دەروونی و سۆزدارییەکانی مرۆڤ.

**درون گرا:** دەروون خواز، کەسێ کە مەیلی بە تەریکبوونەوە و دووری لە پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە.

**درون گرایی:** دەروونگەرێتی، ڕۆچوونە ناخی خودەوە. لە زاراوەی دەروون پزیشکیدا: ئاراستەکردنی بیر و سەرنج بە ناخی خۆ بە جێی بیرکردنەوە و سەرنج دانە جیهانی دەرەوە.

**درون نگرانه:** دەروون بینانە.

**درون نگری:** دەروون پشکنین، دەروونگەرێتی، ڕوانینە ناخی خود. لە زاراوەی دەروون پزیشکیدا: تاوتوێکردنی بۆچوون و حاڵ و دۆخی خود.

**درون مایه:** بیر و ناوەرۆکی سەرەکی بەرهەمێکی هونەری و هتد.

**درون مرزی:** ناوخۆی وڵات.

**درونه:** 1) بەشی ناوەوەی شتێ، ناوەرۆك، ناخ. 2) کەوانە، کۆلکە زێڕینە. 3) چەماوە و کەوانەیی.

**درون همسری:** هاوسەرگیری کەسانی نێو گروپێك تەنیا لە ناو هەمان گروپ دا.

**درونی:** 1) هەناوەکی، ناوەوەیی، ژوورەوەیی. 2) دەروونی و مەعنەوی. 3) دەروون خواز.

**درونیات:** پرسگەلی ناوەکی و دەروونی یان زەینی.

**درونی شدن:** مەیل کردن بەرەو مەسەلەگەلی دەروونی و زەینی یان تەریکبوونەوە.

**درونی ساختن:** ناوەکی کردنەوە.

**درویدن:** دووریان، دوورینەوە، دروێنەکردن، دەسکەنە، وشکەڕن. بڕینەوە و جیاکردنەوە. "**مزد درویدن**": کرێداسی، هەقەپاڵە.

**درویده:** دروێنەکراو، دووروواو.

**درویزه:** بڕوانە: "دریوزە".

**درویش:** 1) عەودال، عەبدال، بەلەنگاز، بێماڵ و حاڵ، بێجێوڕێ، ڕەبەن، دەست کورت، هەژار، نەدار، گۆشەنشین. 2) دەروێش، مریدی تەریقەتی قادری بە پرچ. 3) خۆشکێن، خاکەڕا، خاکی.

**درویشی:** دەست کورتی، هەژاری، نەداری، سۆفیگەرێتی.

**درویشانه:** وەك دەروێشان، بەشێوازی دەروێشان، نەدارانە، هەژارانە.

**درهم:** 1) تێکەڵ، تێکەڵاو، تێکەڵ کراو، ئاوێتە، لێکدراو، تەڤ لهەڤ. 2) تێکەڵ پێکەڵ، بێسەرەوبەرە، شێواو، شڵەژاو. 3) بەردەوام و پەیتاپەیتا. 4) توورە، قەڵس.

**درهم آمیختن:** تێکەڵ کردن، تێکەڵ بوون، لێکدان، گژاندن، لێکدران، بەناویەك داچوون، تێکدان، تەڤدان، تێك چرژان،

رژانەیەك، رژیانەیەك، تێك چرژان، لە یەك بەربوون، تێکەڵاوبوون و مل دەبەر ملی یەکترنان. "**درهم آمیختە**": تێکەڵ پێکەڵ، لێکدراو، تێك هەڵشێلدراو، تێك چرژاو.

**درهم برهم:** بلۆز، تێکەڵ پێکەڵ، ئاڵۆز، ناتەکووز، شەختۆ، بێسەروبن، بێ سەرەوبەرە، شێلوبێلە، پێچ و پلووچ، ، شێواو، شێویاگ، هەڵشێواو، گەرفێری، شەلەم شۆربا، گژۆمژۆ.

**درهم برهمی:** بێسەرەوبەرەیی، تێکەڵ پێکەڵی، ژڵیوە، ژڵیویان، شلەژە، ئاژاوە، پشێوی، پەرێشانی، ڤەخومان، ڤەخومین، شەوش.

**درهم پیچیدن:** تێك هاڵان، لێك ئاڵان، لێك هاڵان، تێك هاڵۆزان، تێك ئاڵۆزان. تێکچوون یان تووشی گرفت بوون.بێئۆقرەیی زۆر بەهۆی ژان و نارەحەتییەوە.

**درهم جوش:** پەرێشان، پەشێو، ئاڵۆز.

**درهم چلانیدن:** تێك هەڵشێلان، بەسەریەك دا هەویر کردن، دوو دەرمان پێکەوە تێکەڵ کردن و شێلان.

**درهم ریختن:** تێك دان، دانەیەکا، رژانەیەك، شلەژاندن.

**درهم زده:** پرپێچەڵاوپێچ. پرلە کێشە و کۆسپ.

**درهم شدن:** بەیەکاچوون، چوونەناویەکتر، تێك بەزین، تێکەڵ بوون، ئاوێتەبوون، شێوان، پەشۆکان، هەڵچوون، گرژ بوون.

**درهم شکستگی:** تێك شکان، لەبەریەك چوون، ڤەپرتکان.

**درهم شکستن:** تێك شکاندن، لەبەریەك بردن، ورد و خاش کردن، ڤەپرتکاندن، هەرستاندن. سووك بوون، وردبوون. "**درهم شکستە**": تێك شکاو، لەبەریەك چووگ، ڤەپرتکیای.

**درهم فرورفتە:** تێك چرژاو، تێك ترنجاو.

**درهم فروشدن:** تێك گیران، دەناویەك ترنجان، تێك ترنجان.

**درهم فشردن:** رێك گوشین.

**درهم کردن:** تێکەڵ کردن، ئاوێتەکردن، لێکدان.

**درهم کشیدن:** گنج کردن، چرچ و لۆچ کردن.

**درهواقا پیدن:** قۆزتنەوە، قۆستنەوە، لە حەوا گرتنەوە.

**دریا:** دەریا، دەلیا.

**دریابار:** قەراغ دەریا، لێواری دەریا و شاری لێواری دەریا، بەندەر. دەریای گەورە.

**دریابش:** بڕوانە:"مکاشفە".

**دریابندە:** تێگەیو، زیرەك، مەژودار، ژیر.

**دریاچە:** گۆل، زرێبار، بەهرك، زرێچە.

**دریادار:** خاوەن پلەوپایە لە هێزی دەریاییدا.

**دریادل:** بریتی لە کەسی زۆر دڵاوا و لێبوردو و دلێر.





**دریاسالار:** پلەیەکە لە هێزی دەریاییدا.

**دریاسان:** زرێبار، وەك دەریا.

**دریاشکوە:** خاوەن شکۆ و گەورەیی وەك دەریا.

**دریافت:** 1) وەرگرتن، سەنن، ساندن، ئەستاندن، پێگەیشتن، گورەتەنە. 2) بڕوانە: "ادراك". 3) قەرەبوو.

**دریافت کنندە:** وەرگر.

**دریافتن:** 1) تێگەیشتن، تێگەیین، حاڵیبوون، رێ تێبردن، پەی پێبردن، فامین، زانین. 2) وەرگرتن، پێگەیشتن، هەلانین. 3) دیتن، سەیرکردن. 4) قەرەبووکردنەوە. 5) بەهرەبردن لە شتێ، بەهەل زانین. 6) وەدەست هێنان. 7) گەیشتن بە کەسێك و بەدیل گرتنی. 8) زاڵبوون و کارتێکردن. "**کسی را دریافتن**": بەهاناگەیشتن. زاڵبوون بەسەریدا یان کاریگەری لەسەر دانانی. گەیشتن بەو. ئەویش گرتنەوە. چاوەدێری ئەو بوون.

**دریافتی:** وەرگیراو، پێگەیشتوو، دراو.

**دریاکش:** بریتی لە کەسێ کە شەڕابی زۆر بخواتەوە و سەرخۆش نەبێ.

**دریاکنار:** لێواری دەریا، قەراغی زەریا.

**دریانوال:** جوامێر، مێرخاس، فرە دڵاوا، لێبوردە.

**دریانورد:** دەریاوان، مەلەوان.

**دریانوردی:** دەریاوانی.

**دریانوش:** بڕوانە: "دریاکش".

**دریاویدن:** تێگەیشتن، تێگەیین، فامین.

**دریچە:** دەربیجە، دەلاقە، رۆچنە، هۆرتمە. (پزیشکی) زمانە. "**دریچەهای قلب**": زمانەکانی دڵ.

**دریچەاطمینان:** دەربیجە/ سوپاپی خاترجەمی.

**دریدگی:** 1) دڕاوی، دڕیاگی، داڕاوی، دادڕیاگی، هەڵدڕاوی، لەت کراوی، درز، تلّیش، قلّیش، کەلێن. 2) بڕوانە: "پررویی".

**دریدن:** دڕین، دڕاندن، دڕانن، دڕیان، دڕەنە، دادڕین، دادڕاندن، شڕکردن، لەت کردن، جڕدان. لەناوبردن و تێکدان(دریدن سکوت). بریندارکردن یان لەتوکوتکردنی بوونەوەری راوکراو لەلایەن گیانلەبەری وەحشییەوە. کەلەبەر و مەودا تێخستن، تێکشکان. "**از هم دریدن**": لەتوکوت کردن، پارچەپارچەکردن. لەناوبردن، تیابردن.

**دریدە:** دڕاو، دڕیا، دڕیاگ، دەڕسە، دادڕاو، دادڕیاگ، هەڵدڕاو، هەڵدڕیاگ، داتلّیشاو. بێ شەرم. زبر، زوور، ئاژ.

**دریدەشدن:** دڕان، دڕیان، دادڕان، لەبەریەك چوون. هەڵدڕان. هەڵچڕان.

**دریغ:** تەنەخی، درێغی. داخ، حەیف، مخابن، بەداخەوە، داخەکەم، خەبینەت، یازوخ.

**دریغ آمدن:** خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێ یان شتێ. مایەی داخ و حەیف بوون.

**دریغا:** داخەکەم، داخم، بەداخەوە، دەردۆ، حەیف و مخابن، هاواربەمالّم، وەیلیٚ، وەیڕۆ، هایلیٚ.

**دریغ خوردن:** 1) هەسر خواردن، ئارەزووی زۆر کردن. 2) تەنگەتاوکردن، خستنەتەنگانەوە، خۆلێبواردن، خۆبواردن.

**دریغ داشتن:** درێخی کردن، درێغیکردن، تەنەخی کردن، خۆبواردن لە یارمەتیدانی کەسێك، سەختگیریکردن لە دانی شتیٚ بە کەسێك.

**دریوری:** قسەی قۆڕ و بیٚ مانا.

**دریوزگی:** سوالّکەری.

**دزد:** دز، دەستکاتی، مالّبڕ، کەسیٚ مالّی خەلّك بە نهێنی دەبا.

**دزدافشار:** دزدەسەك، دایکەدزە، دالّکەدزان، شەریکەدز، دزەکە، دەسکیس، پاش دز.

**دزدانە:** وەك دزان، بە دزییەوە، هێواش و بەبیٚ دەنگی، دوور لە چاوی کەسێك.

**دزدبازار:** شوێنیٚ کە دزی زۆرە. دووکان و فرۆشگە و شتی وا کە کەلوپەلەکانی زۆر گران دەفرۆشیٚ.

**دزددریایی:** دەریاگر، چەتەی ناو دەریا.

**دزد سرگردنە:** رێگر، گۆران، چەتە، ملەزەن.

**دزدشبگرد:** دەوال، دزی شەوانە.

**دزدکی:** دزانە، بەدزییەوە، بە دزییەکەوە، دزەکی، لەبنەوە، خنز، کاری بە نهێنی.

**دزدگاه:** دزکۆشکە، دزگا، مەکۆی دزان، جێگەی دزی کەران.

**دزدگیر:** دزگیر.

**دزدە:** بەنهێنی.

**دزدی:** دزی، دزین، مالّبڕی، مالّبڕین، کاری دز. دزراو.

**دزدیدن:** دزیکردن، دزین، چرپ، رفاندن.

**دزدیدنی:** دزیتەنی، شتیٚ کە بۆ دزین دەست دەدا.

**دزدیدە:** دزاو، دزراو، دزیاگ، بە نهێنی براو. دزانە و بەنهێنی.

**دزغالە:** دیوار. سەنگەر، پەناگە.

**دزندیس:** بەرابەر و یەکسان، وێکچوو، ئاشکرا.

**دژآباد:** (دُ) تووڕە، بەدخوو، سامناك.

**دژآگاە:** رق هەستاو، تووڕە. دلّ پیس، دلّ کرمیٚ. نەزان، بیٚئاگا. ستەمکار و بیٚ بەزەیی. خوێن رێژ، پیاوکوژ.

**دژآلود:** رق هەستاو، رکین، تووڕە، بەدخوو و تۆسن.

**دژالون:** بڕوانە: "دژوان".

**دژبان:** پاسەوانی قەلاّ.

**دژبراز:** (دُ.بَ) ناشیرین، ناحەز، بەد خوو، تووڕە، تەماحکار.

**دژبرو:** رووگرژ، رووترش، بەدخوو، بەدخولّق، تووڕە.

**دژپران:** بڕوانە: "ترکش".





**دژپسند:** بەدپەسند، دژوارپەسند. بەمانای خۆپارێز و پاك داوێنیش هاتوە.

**دژخم:** بڕوانە: "دژخیم".

**دژخیم:** 1) بەدخوو، بەدخولّق، بەدڕەفتار، دلّخوار، دلّ پیس. 2) خوێنڕێژ، مرۆڤکوژ، میرغەزەب. 3) زۆر بیٚ بەزەیی و ستەمکار. 4) ئەشکەنجەدەر.

**دژدیس:** ناحەز، ناشیرین.

**دژکام:** نییەت خراو، ژیان تالّ، خەمبار، تووڕە.

**دژکنش:** بڕوانە:"اختلال".

**دژگوار:** هەزم نەبوو.

**دژم:** خەمبار، خەمناك، دلّ تەنگ.تووڕە، هەلّچوو. خراو، نالەبار.

**دژمان:** 1) خەمبار، دلّ تەنگ. 2) مخابن، داخم، حەیف. 3) تووڕە، قەلّس.

**دژمناك:** دەردەبار، دەردەدار، دلّ تەنگ، خەمبار، خەمناك، داخدار.

**دژمنش:** بەد رەوشت، نییەت خراپ، رەنجاو، بێزار.

**دژن:** توون، تیژ. بەدخولّق و تووڕە.

**دژواخ:** بڕوانە: "دژوان".

**دژوان:** داخ، حەیف، حەیفیٚ، مخابن، بەداخەوە.

**دژە:** تووڕە، رکین، رق هەستاو.

**دسایس:** کۆی"دسیسە".

**دسپوتیسم:** حکوومەتی سەرەڕۆیی.

**دست:** 1) دەست. 2) جار، کەڕەت. 3) لا، بەر. 4) چەشن، جۆر. 5) دەسەلاّت و ئیختیار. 6) دەستێوەردان. 7) خاوندارێتی. 8) یارمەتیدەر، یاریدەدەر. 9) یەکەی ژماردنی بینا. 10) بالاّدەستی و زالّێتی. "**از آن دست**": لەو چەشنە، بەو شێوەیە. "**از هر دست**": لە هەر چەشنە. "**فرا دست آمدن**": وەدەست هاتن و کەوتنە ئیختیار. پێشهاتن.

**دستآختن:** دەست درێژ کردن.

**دست آخر:** سەرەنجام.

**دست آلودن:** کاری ناحەز و ناپەسند ئەنجام دان.

**دست آموز:** دەستەمۆ، دەسەمۆ، کەوی، مالّی، پەروەردەکراو.

**دست ابزار:** ئامراز، کەرەسە.

**دستادست:** ماملّەی نەخت و بیٚ قەرز، پێشەکی.

**دست از کار کشیدن:** دەست کێشانەوە، دەست لە کار کێشانەوە، وازلەکارهێنان، کاربەردان، ئاش بە تالّ، مانگرتن.

**دست افشاندن:** سەماکردن، تەکان دانی دەست کاتی سەما و خۆشی. بەخشین، دان.

**دستان:** 1) کۆی"دست". 2) مەکر، فێل، فڕوفێلّ. 3) سروود، هەقایەت، رازە.

**دست انداختن:** 1) دەست بۆ لای شتێك درێژ کردن، بە فرزی و چالاکی دەستبردن بۆ شتیٚ بە مەبەستی گرتنی. 2) تیتالّی پێکردن، گالّتەپێکردن.

**دست انداز:** 1) دەست درێژکەر. 2) قۆرت، زەقایی، ناڕێکی. 3) سەختی، دژواری.

**دست اندازی:** دەستدرێژی بۆ سەر گیان و ماڵی کەسێك.
**دست اندرکار:** کاربەدەست، پێوەخەریك بوو.
**دستان ساختن:** مەکرکردن، فرتوفێڵ کردن.
**دستان سرا:** هەقایەت بێژ، سروودخوێن.
**دست انگاز:** بیانوو، پەڵپ.
**دستاورد:** دەسکەوت، دەستکەوت، یاب.
**دست اول:** نوێ، تازە. خاوەنی پلەی یەکەمی گرینگی.
**دستاویز:** بیانوو، بیانگ، پەڵپ، هۆ، بۆنە.
**دست باز:** بەخشندە، دڵاوا، دەسەنەدار، دەست واڵا، دەست و دڵ ئاوەڵە.
**دست بافت:** دەستچن. ئاکامی کردەوەی کەسێك.
**دست بالا:** بڕوانە:"حداکثر". "**دست بالا کردن**": پێداگر و ئامادەی کارێك بوون یان هەنگاونان.
**دست برآوردن:** دەست بڵێندکردنەوە، دەس بەرزکردنەوە.
**دستبرد:** دزی. 2) هێرش و شاڵاو. 3) زەوتکردنی ناڕەوا، دەست درێژی. 4) دەسەڵات و باڵادەستی و زاڵێتی. 5) دەسەڵات نوێنی. 6) هونەر و دەست ڕەنگینی. "**بە چیزی دستبرد زدن**": دزین و ڕفاندنی ئەو شتە.
**دست بردار:** دەست هەڵگر، وازهێن، دەس بەردار.
**دست برداری:** دەست لێبەردان، دەست هەڵگرتن، دەست لێ هەڵگرتن، وازهێنان.
**دست برداشتن:** 1) بڕوانە: " دست برآوردن ". 2) دەست هەڵگرتن، دەست لێهەڵگرتن، خۆتێنەگەیاندن، وازهاوردن، وازهانین، وازهێنان، وازلێهێنان، وازلێهاوردن، وازئانین، وازئینان، دەست بەردان، دەست لێبەردان، دەست ژێ هلانین، هلشتن، تەرخ کردن.
**دست بردن:** 1) کەم یان زۆرکردن، گۆڕین، دەستکاریکردن، دەست تێوەردان. 2) دەست بردنە بەرۆ. 3) بردنەوە لە کایەدا. 4) هەنگاونان، دەست بردن. 5) سەرکەوتن، زاڵبوون.
**دست بر قضا:** بەرێکەوت.
**دست بسرکردن:** بریتی لە دوورکردنەوەی کەسێك لە خود بە فێڵ و کەڵەك.
**دست بگیرداشتن:** قڕنیس بوون، سەقیل بوون.
**دست بە جیب بردن:** دەست بۆ گیرفان بردن، پارە خەرج کردن.
**دست بە خون شستن:** تووشی قەتڵ بوون، شەڕو کوشتوبڕکردن. ئامادەی گیانبازی و مەرگ بوون.
**دست بەکارشدن:** دەس بەکاربوون، ملنان، ملنیان، مل پێوەنان.
**دست بە کسی زدن:** دەست لێدان. لێدان یان ئازاردانی ئەو.
**دست بە گریبان شدن:** تێکبەربوون، دەرگیربوون.





**دست بە نقد:** خێرا، زوو. ئامادە. بەشێوەی نەختی.
**دست بە یکی:** یەکگرتوو، هاودەست.
**دستپاچگی:** پلەپەرتکێ، پەلەپڕووزە، سەرلێشێواوی، پەشۆکاوی، حەپەساوی، هەوڵ بوون.
**دستپاچە:** دەس و پێ سپی و کار لە دەس نەهاتوو، سەرگەردان و شێواو، سەرلێشێواو، پەشۆکیاو، وڵنگە، حەپەساو، هەولەکی، هەوڵ، داماو.
**دست پاك:** 1) بریتی لە دەست پاك و جێی متمانە. 2) نەدار، هەژار، دەست بەتاڵ، بێبەش.
**دست پایین:** بڕوانە:"حداقل". "**دست پایین گرفتن**": بە کەم حەساوکردن.
**دست پرور:** دەست پەروەردە، ئەوەی کە لە ژێر دەستی کەسێکی دیدا پەروەردەکرابێ.
**دست پیچ:** ئەو شتەی کە بە دەست پێچرابێتەوە و کۆبەندی کرابێ. بیانوو، پەڵپ.
**دست تنگ:** بڕوانە: "تنگ دست".
**دست جنباندن:** پەلەکردن بۆ ئەنجامدانی کارێکو خاوەخاو نەکردن.
**دست چپی:** بڕوانە: "چپگرا".
**دست چلك:** زاڵی، بەدەست و بردی، فرزی، سەرکەوتن.
**دست چین:** دەستچن، دەسچن، هەڵبژاردە، میوەی بەدەست چنراو.
**دست خالی:** دەست بەتاڵ. بێبەش و ناسەرکەوتوو.
**دست خشك:** قڕنیس، بەغیل.
**دست خط:** دەست نووس، دەستوخەت، دەستخەت، بە دەست نووسراو. نامە. بەڵگە.
**دست خوردن:** دەسکاری کران، گۆڕان.
**دستخوش:** 1) کەسێك کە ببێتە گاڵتەجاڕی کەسێکی دی، زەبوون، ژێردەست، بەردەست. 2) لەخۆگرتن، تووش.
**دست خوش:** 1) دەسخۆش، وشەیە لە جێگەی ئافەرین. 2) دەستخۆشانە، ئەو پارەی کە براوەی قومار دەیبەخشێ.
**دست دادن:** 1) دەست لێدانەوە، تەوقەکردن، گفت و پەیمان دان، وادە و بەڵێن دان. 2) دەست دان، لوان، گونجان، دەست کەوتن، گیرهاتن.
**دست داشتن:** دەست تیابوون، دەست بوون، دەست ڕۆیشتوویی، ئاگاداربوون.
**دست درازی:** دەست درێژی، زوڵم.
**دست دست کردن:** دەستی دەستیکردن، گنخاندن، ساوەساوکردن.
**دست دوز:** دەسدرو، بە دەست دورواو.
**دست راستی:** کۆنەپارێز و دژ بە گۆڕانکاری.
**دسترس:** لە بەردەس دابوو، شتێ کە دەست پێی ڕابگا. توانایی، دەسەڵات. باڵادەستی، زاڵێتی. توانایی ماڵی، سامان. "**در دسترس بودن**": لە هەوێڵ دابوون، لە ئێختیاردا بوون.
**دسترسی:** دەست پێڕاگەیشتن، دەست گەیشتن، هەنا، دەسەڵات، توانایی.
**دسترنج:** هەقدەست، مز، کرێ، خەبس، بەرهەمی ڕەنج و تێکۆشان، شتێ کە لە زەحمەت و ڕەنج کێشانەوە وەدەست بێ.
پیشە، کار، ئیش.

**دست زدن:** چەپڵەلێدان، چەپڵەڕێزان، چەپڵەکوتان. دەست لێدان.

**دست ساز:** دەسکرد، دەستکرد، دەسکوت، دەستکار، دەست نێژ، کاری دەستی.

**دست شستن:** دەست شۆردن. دەست لێشۆردنەوە، بریتی لە بێ هیوابوون و وازهێنان لە شتێ.

**دستفال:** سفتاح، هەوەڵ فرۆش.

**دست فروش:** دەستگێڕ، دەست فرۆش، مامڵەچی سەرپایی، چەرچی ناوبازاڕ.

**دست فشان:** لە حاڵی سەما و شادمانیدا.

**دستکار:** 1) بڕوانە: "دست ساز". 2) هاوکار، هاودەست.

**دستکاری:** دەستکاری کردن، دەست تێوەردان لە شتێك، دەست لێدان، گۆڕینی باری شتێ.

**دست کردن:** دەست بردن بۆ شتێ. هەنگاونان.

**دستك زدن:** بڕوانە: "دست زدن".

**دستك زن:** گۆرانی بێژ، سەماکەر، ژەنیار.

**دست كشيدن:** 1) دەست پیاهێنان، بە دەست ماڵش دان. 2) دەست لێ هەڵگرتن، وازهێنان، دەست لە کارکێشانەوە، لێبوونەوە.

**دست كم:** لانیکەم.

**دست كم گيرى:** بەکەم زانین، بەکەم دانان.

**دستگاه:** دەزگا، سامان و کەلوپەل و سەرمایە، مەکینە، کارگە و کارخانە و تەواوی ئەو ئامرازانەی کە لە یەك جێدا بۆ ئەنجام دانی کارێك ئامادەکراون. ئاهەنگێکی کاملی مووسیقا. کۆئەندامێ کە لە لەش دا کارێکی تایبەتی ئەنجام دەدا، دەسەڵات و توانایی و شان و شکۆ. سیستمی سیاسی، رێژیم. "**دستگاه تناسلى**": کۆئەندامی جووت بوون. "**دستگاه گوارش**": کۆئەندامی هەرس کردن. "**دستگاه تنفس**": کۆئەندامی هەناسەکێشان.

**دستگاه وجود:** جیهانیی هەبوون(هایدن)، هەستە رواڵەتی و ناخییەکان و کۆئەندامی لەش.

**دست گذار:** 1) یارمەتیدەر، یاریدەدەر. 2) ئەوەی دەست بە دەست دەگەڕێ. 3) توانایی، دەسەڵات.

**دست گرا(ى):** ئەزموونکراو/ تاقیکراوە بە دەست، راهاتوو بە دەست. بەزیو و ملکەچ. "**دست گرا كردن**": ئەزموون کردن، تاقیکردنەوە. بەزاندن و هێنانە بەر فەرمان.

**دست گرايى:** ئەزموون، تاقی، سەنگان.

**دستگرد:** دێ، زەوی و ملکی کشتوکاڵی.

**دست گردان:** ئەم دەستەودەست کردن، دەستاودەست کردن.

**دست گزار:** بڕوانە:"دست گذار".

**دست گزين:** هەڵبژاردە، ئەوەی بە دەست جیاکرابێتەوە.





**دست گشادن:** کردنەوەی دەست، ئامادەبوون بۆ ئەنجام دانی کارێك، سەرەتای کەرەم و بەخشین.

**دستگير:** 1) یارمەتیدەر، یاریدەدەر، هاریکار، دەسگیرۆ. 2) گرفتار، یەخسیر.

**دستگيرشدن:** گیران، قۆڵبەست کران. تێگەیەنران، فامێنران. گەمەکردن، کایەکردن.

**دستگيركردن:** گرتن، قۆڵبەست کردن.

**دستگيرى:** 1) یارمەتی، هاریکاری، دەسگیرۆیی. 2) یەخسیر کردن، گرفتارکردن، قۆڵبەست کردن. "**از(به) كسى دست گيرى كردن**": یارمەتیکردنی ئەو.

**دستمال انداختن:** رووپامایی و زمان لووسی کردن.

**دستمايه:** 1) سەرمایەی سەرەتایی و کەم، دەزمایە، دەسمایە. 2) بنەمای کار، بابەت. 3) هۆ، هۆکار.

**دستمرد:** بریتی لە یاریدەدەر، هاریکار.

**دستمردى:** یارمەتی، هاریکاری. ئازایەتی، دلێری. توانایی.

**دستمزد:** مز، هەقدەست، کرێی دەستی.

**دست موزه:** 1) ئامراز، کەرەسە. 2) دیاری، سەوقات. 3) بیانوو، پەڵپ.

**دست نخورده:** سەردەق، سەرمۆر، سەربەمۆر، دەست لێنەدراو.

**دست نشانده:** دانراو، داندراو، کەسێ کە بە ئیرادە و ویستی کەسێکی دی لە سەر کارێك دانرابێ یان بە پلەیەك گەیشتبێ.

**دست نگەداشتن:** دەست راگرتن، لێڕاوەستان، سەبر کردن، بەس کردن لە کار.

**دستنماز:** بڕوانە: "وضو".

**دست نوشته:** بەدەست نووسراو، دەس نووس.

**دست نويس:** دەست نووس.

**دستوار:** هاریکار، یاریدەدەر، هاودەست.

**دست و پا چلفتى:** کار لە دەست نەهاتوو، دەست و پێ سپی/ سپیلکە.

**دست و پا دار:** ئەوەی لە عۆدەی هەر کارێك دێ، زیرەك و شیاو.

**دست و پازدن:** لاقەفرتە، پەلەقاژە، پەلەقاژێ، پەلەفرتکێ، پەلەفرتە، پەلەفرتێ، لینگەفرتە، حەول و تەقەلا، دەست و لاق جووڵاندنەوە بۆ رزگاربوون لە چۆرتم.

**دست و پا كردن:** دابین کردن، بەدەست هاوردن. هەوڵدان.

**دست و دلباز:** دڵاوا، بەخشندە، دەست و دڵ ئاوەڵە.

**دستور:** 1) فەرمان، دەستوور، بڕیار. 2) بەرنامە، پرۆگرام. 3) شێوەی ئەنجامدانی کارێك. 3) ئیزن. 4) ئیزندەر. 5) خاوەن پلەوپایە، وەزیر، راوێژکار. 6) رێساویاسا. 7) پێشەوای ئایینی زەردەشتییەکان. 8) پزیشك.

**دستورالعمل:** شێوەی ئەنجامدانی کارێ یان کەڵك وەرگرتن لە شتێ، ڕێسای کار، بەرنامەی کار، بروشوور.
**دستورزبان:** ڕێزمان.
**دستورکار:** بەرنامە(ی کار)، ڕۆژەڤ.
**دست ورز:** کەسێ کە کارگەلی دەستی ئەنجام دەدا، کرێکارێ کە بە دەست و بەبێ مەکینە ئیش دەکا.
**دستوری:** سەر بە ڕێزمان. تایبەتمەندی ئەوەی لایەنی فەرمان و دەستووری هەیە. ڕواڵەتی، فەرمایشی. ئیزن، ئیجازە. دەستوور، فەرمان. وەزیربوون. "**بە دستوری**": بەپێی ئیجازە.
**دسته:** پۆل، کۆمەڵ، گروپ، پەرەم، تاقم، کلك، دەسك، کەرگ، دەستە.
**دستەبندی:** دەستەبەندی، دەستە سازکردن، هەڤال هەڤالانی، دەستە دەستەبوون، لایەنگری لە یەکترکردن، کۆتلەبازی، کۆتلەخۆبەخۆیی، قۆمیتەقۆمیتە.
**دستەجمعی:** بەکۆمەڵ، تێکڕا، پێکەوە، بەگشتی.
**دستەدار:** دەسك دار، بەدەسك، بە هەنگڵ، قولف دار، کلك دار.
**دستەدستە:** پۆل پۆل، پەرەم پەرەم، گروپ گروپ.
**دستەعزاداری:** تەلمیس، کۆروکۆزی شیوەن.
**دستیابی:** وەدەست هێنان. گەیشتن.
**دستیار:** یارمەتیدەر، هاریکار، هاودەست، جێگر.
**دستیاراستادکار:** یاریدەدەری وەستاکار، خەڵفە.
**دستیاری:** هاریکاری، یارمەتی، جێگری.
**دستیازی:** بڕوانە:"توسل".
**دست یازیدن:** دەست درێژ کردن بەرەو شتێك. هەنگاونان.
**دست یافتن:** 1) دەست بەسەرداڕۆیشتن، زاڵ بوون، سەرکەوتن. 2) چنگ کەوتن، وەدەست هێنان.
**دست یافتنی:** بڕوانە: "دردسترس".
**دستی پیداکردن:** ئاشنایەتی یان شارەزایی پەیاکردن.
**دستینه:** کتێبی (ڕێنوێن/ ڕێبەر). واژۆ.
**دسومت:** (دُ.سُ.مَ) چەوربوون، چەوری.
**دسیس:** 1) سیخوڕ، هەواڵدز. 2) ئەوەی کە لە ژێر خاك دا شاردرابێتەوە. 3) ڕیاباز، دووڕوو.
**دسیسه:** پیلان، فێڵ، داو.
**دسیسەچینی:** بڕوانە "توطئەچینی".
**دسی گرم:** دەیەکی گرەمێك.
**دسی لیتر:** دەیەکی لیترێك.
**دسی متر:** دەیەکی میترێك.
**دش:** (دَ) وێچوو، وەك. خۆنوێنی، خۆڕازاندنەوە.
**دشارژ:** دێشارژ، بەتاڵ بوونەوەی باتری یان پاشکەوتکەری کارەبایی.





**دشت:** 1) دەشت، دەشتایی. 2) سفتاح. 3) بێعانە، پێش بەها.
**دشتان:** ژنێ کە لە حاڵی بێنوێژی دایە.
**دشتانگی:** بڕوانە:"قاعدگی".
**دشتانه:** بڕوانە: "حیض".
**دشخوار:** دژوار.
**دشگواری:** بڕوانە:"بدگواری".
**دشگویی:** بڕوانە:"زبان پریشی".
**دشمن:** نەیار، نەتل، نەتەوی، تاسب، دژ، دوژمن، دژمن، دژمین، مخرك، مەخرك.
**دشمنایگی:** بڕوانە: "خصومت".
**دشمن پرور:** ئەوەی کە دوژمن بۆ خۆی سازدەکا، دوژمن پەروەر.
**دشمن خونی:** خوێنخوار، خوێنەخوار، خیندار، دوژمنی خوێنی.
**دشمن رو:** وەك دوژمن، دوژمنانە، کەسێك کە خەڵك لە دیتنی بێزارن.
**دشمن شکن:** دوژمن تێك شکێن، تێکوپێك دەری دوژمن.
**دشمن کام:** بە خواست و ئارەزووی دوژمن، کەسێ کە دۆخ و ڕەوشتی بە ئارەزوو و خواستی دوژمنە.
**دشمن کش:** بکوژی دوژمن، ئەوەی کە دوژمن بکوژێ.
**دشمنی:** دوژمنایەتی، دوژمنی، دژایەتی، نۆیین.
**دشنام:** چێڕ، خوسن، خۆسن، خراو(وتن)، خەراو(وێژی)، کفر، سخێف، جوێن، جنێو، جڤین، جمێن، جوون، جوین، دژنام، دشمان، دوژمان، دوژێن، دژمان، دژمێن، دژون، دمژین، ڤێس، ملق، ڕەف.(دشنام بە مردە): گۆڕڕزیگاندنەوە، گۆڕهەڵاخنین.
"**دشنام خوردن**": جوێن پێدران.
**دشنگ:** (دَ.شَ) بڕوانە: "دلنگ".
**دشنگی:** ڕۆژگار، دنیا.
**دش نهاد:** بڕوانە: "بدنهاد".
**دشوار:** دژوار، دوخشار، چەتوون، چەتن، ئاریشە، ئەستەم، حەستەم، حاستەم، سەخت، زەحمەت، ئاسێ.
**دشوارآمدن:** پێگران بوون، بە زەحمەت زانین، بەچەتوون و دژوار زانین.
**دشوارپسند:** بڕوانە: " دژپسند ".
**دشواررو:** بڕوانە: "صعب العبور".
**دشواریاب:** ئەوەی بە دژواری و سەختی وەدەست دێ.
**دشواژه:** تابۆ، وشەیەك کە بەکاربردنەکەی بە هۆی ئایینی یان ئەخلاقی یان نەریتی کۆمەڵایەتی‌یەوە جوان نیە.
**دعا:** نزا، دوعا، پاڕانەوە. ستایش. داواکاری.نامە.
**دعابه:** شۆخی‌کردن، گاڵتەکردن.
**دعات:** کۆی"داعی".
**دعاخوان:** نزاخوان، نزاخوێن، دوعاخوێن.
**دعامه:** کۆڵەکە، نیرگە.
**دعامةالقوم:** سەروەر و پێشەوای قەوم.
**دعاوی:** کۆی"دعوی".
**دعای بد:** ئاهونزوولە، نفر، نفرە، تووك، دوعای خراپ.
**دعای ضد گلوله:** گوللەبەن، گوللەبەند.

**دعای مستمند:** نزوولە، نزووڵە، نزای بێچارەی هەناسەسارد.

**دعایە:** پڕوپاگەندە، بانگەشە.

**دعوا:** 1) داواکردن، بانگهێشت کردن، خواستن، داواکردن، ویستن. 2) دادخوازی، ئیدعا. 3) شەڕ و کێشە، جەنگ.

**دعوت:** 1) بانگهێشتن، بانگێشتن، داوەت کردن، لێگێڕانەوە، گێڕانەوە، خولقکردن، خولك کردن، میوانی. 2) نزا. 3) سکاڵا، شکایەت.

**دعوتی:** داوەتکراو، بانگهێشت کراو.

**دغ:** زەوی وشك و رەق. کەچەڵ.

**دغا:** مەکر، فریو، فێڵ. مەکرباز، فێڵەزان.

**دغال:** کۆی "دغل".

**دغدغە:** 1) لۆمەکردن، سەرزەنشت کردن. 2) ختیلکەدان. 3) سستی ئاخاوتە. 4) ترس و نیگەرانی، پەژارە، بیر پەرێشانی. 5) حاڵەتی خەریك بوونی زەین بە شتێکەوە. "**دغدغەخاطر**": نیگەرانی و بیربڵاوی، پەرۆشی. "**پر دغدغە**": سەوداسەر، خەیاڵاوی و گێژووێژ.

**دغل:** خەوش، فێڵ، کەڵەك، داو، دهۆ، فڕوفێڵ، گزی، چۆغل.

**دغلکار:** بڕوانە: "حیلەگر".

**دغول:** بڕوانە: "داغول".

**دفاتر:** کۆی "دفتر".

**دفاع:** بەرگری، بەرگرتن، بەرگیری، داکۆکی، خۆپاراستن، لەسەرکردنەوە، دەستکردنەوە، بەگژاچوونەوە، بەرەنگاری دەگەڵ دەست درێژکەر، پارێزگاری لە وڵات. "**موضع دفاعی**": دۆخی بەرگری، حاڵەتی بەرگری.

**دفاعیە:** گوتە یان نووسراوەیەك بۆ بەرگری لە تۆمەت یان رەتکردنەوەی ئیددیعایەکە، بەرگری‌نامە. کۆبوونەوەیەك کە بۆ بەرگری لە تێزی زانستگایی پێك دێ.

**دفتر:** پەڕاو، تێنووس، کتێبۆکە، نامیلکە، دەفتەر. ژووری کار و شوێنی خڕکردنەوەی نامە. بیرۆ، دەفتەر.

**دفترچە:** پەڕاویلکە.

**دفتر خاطرات:** یادنامە، دەفتەری بیرەوەرییەکان.

**دفترخانە:** نوویسگە، نووسگە، نووسینگە، ژووری بەڵگەگەلی فەرمی، دەفتەرخانە.

**دفترك:** بروشۆر.

**دفتر نمایندگی:** دەفتەری نوێنەرایەتی.

**دفتریار:** جێگری دەفتەرخانە.

**دفرمە:** فۆڕم گۆڕاو بە شکڵی نەخوازراو.

**دفع:** دوورخستنەوە، دەست پێوەنان، بەرەو دواوەبردن، پاڵ نان، پاڵ پێوەنان، دەڵەك.

**دفع آفات:** لەناوبردنی هەر چەشنە پەتایەك.

**دفعات:** جارەکان، کەڕەتەکان.

**دفع الوقت:** کات بەسەربردن، وەخت رابواردن.





**دفعە:** کەڕەت، جار، چەل، را، گەلانکە، هەل، گل، گلانگ، گلۆنگ، گەلانکە، وارە، دال.

**دفق:** (دَ) رژانی ئاو، داڕژانی ئاو بە توندی، هەڵبەزینەوەی ئاو لە شتێك، فیچقە.

**دفناس:** گەمژە، گەوج، بەخیل، پەست، نزم.

**دفن شدن:** نێژران، بن گڵ خران، بەخاك سپێردران.

**دفن کردن:** ناشتن، ناژتن، بە خاك سپاردن، ژێرخاك کردن، چاڵ کردن، وەدارتش، لمتش، شاردنەوە، داپۆشین.

**دفیلە:** 1) بڕوانە: "رژە". 2) شانۆ. 3) جووڵەی شانۆیی مانکێنەکان لە تالارەکانی جلوبەرگ.

**دفین:** نێژراو، ژێر خاك خراو، بە خاك سپێردراو، شاردراوە.

**دقّ:** (دِ) 1) دێق، سوێ، وەرهەم، خەمی زۆر. 2) دەردەباریکە، ژانەزراف.

**دقّ:** (دَ) شکاندن، نەرم کردن، وردوردکردن، هاڕین، کوتان، لێدان.

**دقایق:** کۆی "دقیقە".

**دقت:** 1) وردبوونەوە، تێڕامان، بیرلێکردنەوە، سرنج، سەرنج، سەرنجە، وردبینی، باریك بینی. 2) باریکی، وردی.

**دقت کردن:** وردبوونەوە، وردەوبوون، لێوردبوونەوە، لێوردەوەبوون، بەوردی لێڕوانین، هووربوونەوە، سرنج دان، سەرنج دان.

**دق کش شدن:** مردن بەهۆی خەم و رەنجی زۆرەوە.

**دقمسە:** بڕوانە: "دخمسە".

**دقیق:** 1) ورد، باریك. 2) وردبین، باریك بین. 3) کاری دژوار و نهێنی. "**دقیق شدن**": بە وردی سەرنجدانە شتێ، وردبوونەوە لە شتێ.

**دقیقاً:** بەوردی. تەواو راستە، هەر وایە.

**دقیقە:** 1) خولەك، شەست یەکی کاتژمێر. 2) مێینەی "دقیق". 3) سات. "**دقیقە بە دقیقە**": سات بە سات. "**دقیقەنود**": دوایین سات لە رەوتی کارێك دا. "**دقیقەشمار**": خولەك ژمێر.

**دك:** (دَ) 1) سەر، سەری بێ موو. 2) زەوی وشك و رەقەڵان، زەوی بێ ئاو و گیا، داری بێ گەڵا. 3) بەش، پشك. 4) سواڵکەر، سواڵکەری. 5) ئازار و زیان. 6) پتەو و قایم. 7) بناغەی دیوار.

**دكّ:** (دَ) 1) رماندنی دیوار و دەگەڵ خاك رێك کردنی. 2) رێك کردنی بەرزی و بڵیندی زەوی.

**دکاپاژ:** سڕینەوەی رەنگی شیمیایی یان روەکی لەسەر موو.

**دکان بازکردن:** خستنەڕووی کاڵای خۆ. دابین کردنی ئامراز و کەلوپەلێ بۆ فریودانی دیتران.

**دکترا:** پلەوپایەی دوکتورا.

**دکترعلفی:** ئەوەی بە دەوای گیایی و شێوەی سوننەتی نەخۆش تیمار دەکا.

**دکـــتر مهنـــدس:** ئـــەوەی لـــە رشـــتەی ئەندازیاریدا پلەی دوکتورای هەیە.

**دکتریـــــن:** مـــەرام، رێبـــاز، یاســـا بنەڕەتییەکان. شێواز، مێتۆد.

**دکده:** رەمز دۆزینەوە.

**دك شدن:** وەدەرنران، دەرکران، ڤەچفیان، رتان، لەکۆڵ کەوتن.

**دك کـردن:** لـە کـۆڵ خۆکردنـەوە، لـەکۆڵ خستنەوە، دەست پێوەنـان، دەرکـردن، رتانـدن، هـەڵ فرتانـدن، وەدەرنـان، قەوراندن، ڤەچفاندن. "**دك کردن بـا اهانـت**": هەڵ پرتاندن، دەرکردن بە سووکایەتی.

**دکلاماسیون:** لەبەرخوێندنەوەی بابەتێ بە ئاهەنگ و جوولەگەلی شیاوی ئاخاوتە.

**دکلمـه:** لەبەرخوێندنـەوەی بابـەتێك بـە دەنگی بەرز و داوناوەوە. بە گوڕوتینەوە دژی کەسێك یان شتێك قسەکردن.

**دکوپـاژ:** بـڕ، بڕگـە، بـڕان. لـە سـەنعەتی سینەمادا: رێکوپێك کردنی شوێنی شانۆ و سیناریۆ بۆ فیلم هەڵگرتنەوە.

**دکـــور:** کەلەبـدون، دێکـۆڕ، رازانـدن، رازانـەوە، دیمـەن، نـەقش لـە دیـوار و چوارچێوە بۆ جوانی.

**دکوراتـــور:** دیکۆڕاتـۆر، رازێنـەری دیمـەن، خەملێن، جوانکەر.

**دکوراتیو:** رازێنەرەوەیی.

**دکـــوراژه:** ناهومێـد، بـێهیـوا، دڵـسارد، بێمەیل.

**دك و لك:** وشك و بەتاڵ، زەوی بێئاو و گیا.

**دکومانتر:** بەبەڵگەوە، فیلمی بەڵگەیی.

**دگر:** بڕوانە: "دیگر".

**دگرآزاری:** (دەروون ناسی) سادیسم.

**دگراندیش:** جیابیر.

**دگربار:** جارێکیتر، دیسانەوە، دووبارە.

**دگر پـذیری:** قبووڵ کردنی بیروبۆچوونی دژبەر بەبێ بەرچاوتەنگی.

**دگرخواهی:** دیترخوازی، مرۆڤ دۆستی.

**دگـردیس:** شـێوەگۆڕاو، گیانلەبـەرێ کـە شکڵی گۆڕابێ.

**دگردیـسی:** شـێوەگۆڕین، بیـچم گـۆڕان، فۆرم گۆڕین،"مێتامۆرفوز".

**دگرسان:** بـە شـێوەیەکی دی، بـەجۆرێکی دی.

**دگـرسانـی:** 1) جیـاوازی، ناکـۆکـی. 2) بڕوانە:"دگردیسی". 3) گۆڕان.

**دگرش:** بڕوانە:"تبدیل".

**دگرگون:** 1) بەشێوەیەکی دی، بەچەشنی دی، بەچەشـنێکی تـر. 2) سـەرەونخوون، بەراوەژوو، ئاوەژوو.

**دگرگونگاه:** خاڵی وەرچەرخان.

**دگرگونی:** ئاڵوگۆڕ، گۆڕان، گۆڕانکاری.

**دگش شدن:** گۆڕان.

**دگم:** چەقبەستوو، وشکە بڕوا.





**دگماتیسم:** دۆگماتیزم، کورت و تەسك بینی، چەقبەستوویی، بیرۆکەیەك لەسەر بنەمای پڕەنسیپە یەکجارەکی و نەگۆڕەکان و پێداگری دەمارگیرانە لەسەر ئەوان. حیکمەتی بەڵگەیی، بە پێی بڕوامەندانی ئەم رێبازە دەکرێ مەسەلە بان سروشتییەکان بە شێوەی زانستی روون بکرێتەوە و پەی بە هەقیقەتەکانی ببردرێ.

**دگماتیك:** دەپێوەندی دەگەڵ بنەماکانی شەریعەت، کۆی بنەما ئایینییەکان، لایەنگرانی حیکمەتی بەڵگەیی.

**دگم اندیشی:** بڕوانە:"دگماتیسم".

**دل:** 1) دڵ. 2) سك، زگ. 3) مەیل یان بەریان یان ئامەزرۆیی زۆر بۆ شتێ. 4) ناو، ناخ، دەروونی شتێ. 5) بوێری، ئازایی. 6) زەین، بیر، خەیاڵ. 7) رۆح، گیان. 8) ورە. 9) سەرەکیترین بەشی شتێ. "**از دل**": بە ئیشق و هۆگری زۆرەوە. "**از دل رفتن**": لەبیرچوونەوە. "**تـه دل**": قووڵایی دڵ.

**دل آزردگی:** دڵشکان، دڵ شکیان، دڵ شکستی، رەنجیان.

**دل آزردن:** دڵ رەنجاندن، دڵ ئێشاندن، دڵشکاندن، دڵشێلان، ئازاردان، زیزکردن، عەزیەت دان.

**دل آزرده:** دڵشکاو، دڵشکست، دڵشکستە، دڵ ئێشاو، رەنجاو، ئازاردراو، ناڕەحەت.

**دل آسا:** ئارام کەرەوەی دڵ، هێورکەرەوەی دڵ.

**دل آگاه:** زانا و وریا، ژیر و دوورنواڕ.

**دلارا:** دلارا، بەردڵ، دڵخۆشکەر، خۆشەویست و دڵبەر، گراوی جوان.

**دلارام:** هێورکەرەوەی دڵ، دڵبەر، دڵبەند، دۆست، گراوی.

**دلازار:** دلازار، رەنجێنەری دڵ، هەرچی وەبەر دڵ ناکەوێ.

**دل افـروز:** رووناك کەرەوەی دڵ، گەشێنەرەوەی دڵ، دڵشادکەر، خۆشەویست و لەبەردڵ. دۆست، خۆشەویست.

**دل افسرده:** دڵ تەنگ، خەمبار، خەمناك.

**دل افگار:** دڵشکاو، دڵ ئێشاو، رەنجاو، خەمناك، پەرێشان.

**دلال:** (دَ) 1) نازکردن، نازکردنی ژن بەسەر هاوسەرەکەیدا. 2) ناز، نازونووز، خەمزە، لەنجەولار، کریشمە.

**دلاّل:** (دَ) دەلاڵ، نێونجیکەری کڕیار و فروشیار. رێنما، رێنوێن. "**دلال ستور**": جامباز، جانباز، دەلاڵی ولاغ فرۆشتن. "**دلال محبت**": کۆستەك، راست کەر، راکەر، دەلاڵی نێوان کورو کچ، گەواد، قورمساغ، دەویت.

**دلالـت:** 1) ئاماژە، هێما. 2) شارەزاییکردن، رێنوێنی کردن. 3) بەڵگە، پاژە. 4) (لۆژیك) پێوەندی نێوان دوو دیاردە کە لە رێگەی یەکیانەوە ئەوی

دیش بناسریّ. **"دلالت عقلی"**: بەڵگە ژیرانە. **"دلالت کردن"**: ڕێنوێنیکردن. **"دلالت کردن(داشتن) بر(بە)چیزی"**: ئاماژەکردن یان دەربڕینی ئەو شتە. بەڵگە یان نیشانەی بوونی ئەو بوون.

**دلاله:** مێینەی" دلاّل"، دەلاّلی ژن ڕاست کردن بۆ پیاو، کۆستەك.

**دل اندروا:** دڵەدوا، دڵبەدوا، نێگەران.

**دل انگیز:** دڵ بزوێن، دڵ ڕفێن، گیرا.

**دلاور:** ئازا، بوێر، گەڕناس، بەجەرگ، دلێر.

**دلاوری:** دلێری، بوێری، نەترسی.

**دلاویز:** دڵ پەسند، دلگر، دڵخواز، خۆشەویست.

**دلایل:** کۆی"دلالت"، بەڵگەکان.

**دل باختن:** دڵ دان، ئاشق بوون، حەزلێکردن، دڵداری، شەیدابوون. ترسین، ترسیان.

**دل باخته:** شەیدا، دڵدار، ئەویندار، فرە هۆگر.

**دلباز:** دڵاوا، دەسواز، دڵفرەه، دڵ فرەوان. شوێنی بەرفرە و بەدیمەن.

**دلبخواه:** دڵخواز، دڵخوا، دلخاز، دلها.

**دلبخواهی:** دڵخوازی، دلهایی.

**دلبر:** دڵبەر، دلبەر، دڵ وەر، دڵبەند، گراوی، دڵرفێن، خۆشەویست.

**دلبری:** دڵبەری، دڵدزی، دڵ لێسەندن، دڵ لێ سەنن، دڵ بەرەوخۆهێنان.

**دل برداشتن:** دەست لێهەڵگرتن، وازهێنان.

**دل بردن:** دڵ سەنن، دڵ سەندن، دڵ بەرەخۆ ڕاکێشان، دڵ بردن.

**دل بر کندن:** دڵ هەڵکەفتن، دڵ هەڵکەوتن، دڵ هەڵکەنران، دڵ هەڵکەنیان، دەست لێ هەڵگرتن، وازهێنان.

**دلبستگی:** هۆگری و خۆشەویستی و پێوەندی سۆزداری سەبارەت بە شتیّ، دڵبەستراوەیی، دڵ پێوەبوون، دڵ گرتی، ئەوینداری، هۆگری، خۆشەویستی.

**دل بستن:** دڵ بەستن، هۆگربوون بە کەسیّ یان شتیّ، دڵ پێوەبوون، ئەوینداری.

**دل بسته:** هۆگر، دڵدار، ئەویندار، ئەڤیندار.

**دلبند:** بەندی دڵ، بەندڵ، خۆشەویست و لەبەردڵاّن. گراوی. ڕاکێش و گیرا.

**دل به دل راهداشتن:** دوولایەنەبوونی خۆشەویستی یان هەست.

**دل بهم آمدن:** دڵ بە یەکاهاتن، دڵ تێکچوون، دڵ تێکهاڵاّن، دڵ تێکەڵاّتن، دڵ پێکاهاتن، دڵ هەڵشێوان، دڵ هەڵشێویان، دلزڤرین، دلکازین، بێزهەستان، قێزلەخواردن کردن، قێزبوونەوە، قێزشێوان، قێزشێویانەوە، قێزکردنەوە، قیز و بیز، پیّنەخوران، کەرفتن.

**دل بهم خوردن:** بڕوانە: " دل بهم آمدن".

**دلپذیر:** دڵ گیر، دڵ پەسند، دڵخواز، پەسند و بەڕمێن، پەسند و بەردڵ.





**دل پسند:** دلگر، دڵپەسند، خۆشەویست، دڵ بژاردی، زەریف.

**دل پیچه:** دڵ ئێشە، دڵ پێچە، ژان و برك، گڤێری.

**دلتا:** دووئاوان. چوارەمین پیتی ئەل و بێی یوونانی.

**دلتاسان:** سیّ گۆشە، سیّ کۆچە.

**دلتنگ:** دڵپڕ، دڵتژی، دڵ تەنگ، خەمبار، خەمناك، خەماوی، ناڕەحەت، قدیك. "دلم برات تنگ شده بود": بیرم کردبووی، تاسەم کردبووی.

**دلتنگی:** دلگیران، دلگیری، دڵپڕی، دڵ تەنگی، دڵشکاوی، خەمباری، خەمناکی، قەبزی، وەرەگەیرایش.

**دلجو:** 1) دڵخواز، پەسندکراو، شیاو، شایستە. 2) لاوێن، دڵداری دەر، سوکنایی‌هێنەر، دلۆڤان.

**دلجویی:** دڵدانەوە، لاواندنەوە، دڵخۆشی دانەوە، ئاشت کردنەوە بە قسە، دلۆڤانی، ساز و دڵخۆش کردن، ڤەژاندن.

**دل چرکین:** دڵ ڕەنجاو و ناڕازی.

**دلچسب:** دلگیر، دڵپەسند.

**دلخراش:** دڵتەزێن، دڵآزار، ئازاردەر و خەمهێنەر، ڕووداوی ناخۆش، شتیّ کە ئینسان بڕەنجێنیّ و خەمباری بکا.

**دل خسته:** دڵشکاو، دڵتەنگ، ڕەنجاو، دڵخوێن، خەمناك.

**دلخواسته:** دڵخواز، بە ویست و ئارەزووی دڵ.

**دلخواه:** دڵخواز، دلخاز، وازلێبوون، واستەن، واستەنە، ئەوەی دڵ ئارەزووی دەکا.

**دلخورشدن:** دڵ ئێشان، زویربوون، زیزبوون، عاجزبوون، لالووت بوون، ڕەنجان، تووڕەبوون.

**دلخوش:** خۆشحاڵ، شادمان، شاد، بەکەیف، لەسەرکەیف، دەماخ چاخ، تەڕدەماخ، کەسکوون، تۆنگە، دڵخۆش.

**دلخون:** دڵشکاو، دڵ ئێشاو، ڕەنجاو، خەمناك، خەمبار.

**دلدادگی:** شەیدابوون، دڵداری، ئەوینداری، هەڤینداری، ئەڤینی، خۆشەویستی، عاشقی.

**دل دادن:** 1) عاشق بوون، حەزلێکردن، شەیدابوون، دڵبەستن، هۆگری، دڵداری، خۆشەویستی، دڵ دان، دڵ پێدان. 2) سەرنجدان، وردبوونەوە. 3) ورەپێدان. **"دل دادن و قلوه‌گرفتن"**: زۆر گەرموگوڕانە گفتوگۆکردن.

**دلداده:** دڵدار، ئەویندار، دڵبەستە، شەیدا، عاشق، خاترخوا.

**دلدار:** 1) دڵدار، ئەڤیندار، هەڤیندار، ئەویندار، دڵبەر، گراوی، عاشق، بەندەوار. 2) بوێر، ئازا، دلێر، بە ورە، بەجەرگ. 4) هەق، خودا.

**دلداری:** 1) دڵداری، ئەوین، حەزلێکەری، حەزلێکردوویی. 2) بڕوانە: "دلجویی". 3) بوێری، ئازایەتی، مێرانی، نەترسان، وێران.

**دل داشتن:** خوازیار و تامەزرۆی شتی باش بوون. بوێربوون، ئازابوون. هەست و سۆز هەبوون.

**دل درد:** دڵەدەرد، دڵ ئێشە، دەردی دڵ، نەخۆشینی دڵ، ژانی دڵ، قلوومک.

**دل دل کردن:** بریتی لە بەگومان بوون. دڕدۆنگی لە کاردا، دڵەڕاوکێ، دڵەدڵێ، دوودڵی.

**دل دل کنان:** لە حاڵی دڕدۆنگی و دڵەڕاوکێدا، لە حاڵی دڵخورپێ و نیگەرانیدا.

**دل دوز:** دڵ پێک، دڵ هەنگێو، ئەوەی کار لە دڵ دەکا.

**دلربا:** تەڕلان، دڵڕفێن، دڵ ڕەڤێن، دڵبەر، دڵپەسند.

**دلرباشدن:** خاڵومیل، بەخۆداهاتن، جوانتربوون.

**دلربایی:** جوانی، جوان چاکی، دڵڕفێنی.

**دل ربودن:** ئاشق کردنی کەسێک، دڵفڕاندن.

**دل...رفتن:** ئاشق بوون، دڵ لێچوون. زۆر خوازیار و بێئۆقرەبوون.

**دل ریسه:** دڵەکزێ و سستی بە هۆی برسیەتی و بێحاڵی.

**دل ریش:** داخ لە دڵ، دڵشکاو، دڵتەنگ، ڕەنجاو، خەمۆک.

**دلزدگی:** بێمەیلی، وەڕەزی، جاڕزی، بێزاری، فرۆز.

**دل زنده:** وشیار، وریا، دڵاوەدان، شادمان، دڵخۆش، دڵ زیندوو، دڵ زیندی. زانا و ئاگا.

**دل سپرده:** ئاشق، دڵدار، ئەویندار.

**دل ستان:** دڵبەر، دڵڕفێن، دڵکێش، گراوی، دڵ ئەستێن.

**دل سخت:** دڵڕەق، بێبەزەیی.

**دلسرد:** دڵسارد، دڵسار، ناهومێد، بێمەیل، ژاکاو، خەمبار، خەمۆک.

**دلسردی:** تەواسان، دڵساردی، ناهومێدی، ژاکاوی، خەمۆکی.

**دلِ سنگ:** دڵی ڕەق و بێبەزەیی.

**دلسوخته:** دڵسووتاو، دڵشەوات، دڵشەواتی، دڵشەوتی، داغ دیە، مەلوول، خەمناک.

**دلسوز:** دڵسۆز، دڵسۆژ، خەمخۆر، دڵۆڤان، خاوەن بەزەیی، جگەرسۆز، هەڤسۆژ، هەواڵی خۆشیو ناخۆشی، سەرپەرستی باش. "**دلسوزهمگان**": خاڵەخەمە، مامەخەم، کەسێ کە لە خەمی هەمووکەس دایە.

**دلسوزه:** دڵسۆزی، دڵسووتان لە بەزەییهاتنەوە یان لە ئێرەیی و بەخیلی.

**دلسوزی:** دڵسۆزی، دڵشەوتین، خەمخۆری، دڵۆڤانی، بەزەیی.

**دل سیاه:** دڵ ڕەش، بەدگومان، بیرخراو، دڵ پیس، بەدخواز. تاوانبار، گوناحکار.

**دلشاد:** دڵشاد، دڵشاد، دڵشا، دڵخۆش، بەکەیف، دەماخ چاخ، خۆشحاڵ، شادمان.

**دلشاد کردن:** دڵشادکردن، دڵاودان، دڵاڤدان، دڵخۆش کردن، مژدەی خۆش پێدان.





**دل شب:** بریتی لە نیوەشەو.

**دلشدگی:** بڕوانە: "دلدادگی".

**دلشده:** بڕوانە: "دلداده".

**دل شکستگی:** دڵشکاوی، دڵ ئێشاوی، خەم و کەسەر و ناهومێدی.

**دل شکستن:** دڵشکاندن، ئازاردان، ڕەنجاندن، ناڕەحەتکردن، ناهومێدکردن.

**دلشکسته:** دڵشکاو، دڵ ئێشاو، ئازاردراو، ڕەنجاو، ناهومێد.

**دل شکن:** دڵشکێن، مایەی دڵشکان.

**دلشوره:** دڵەکوتێ، دڵەڕاوکێ، نیگەرانی.

**دلفروز:** بڕوانە: "دل افروز".

**دلفریب:** دڵ ڕفێن، دڵبەر، دڵکێش، جوان نوێن.

**دل فکار:** بڕوانە: "دل افکار".

**دلقک:** قردک، کۆسە، کۆستەبابی، گاڵتەجاڕ، گەپچاڕ، حەنەک چی، مامور، ئیشکەڕن، وشکەڕن، لێپۆک، دەلوێ دومان، کەسێ کە بۆ گاڵتە و شانۆ شکڵی خۆی دەگۆڕێ، دڵخۆشکەرەی ئاپۆرە. "**دلقک مسخره**": گۆسارتمە.

**دلک:** (دَ) ماڵشت دان، دامالین، شێلانی بەدەست، سووینەوە، لێخشاندن.

**دلکش:** دڵڕفێن، دڵبەر، دڵکڕ، دڵگیر، فوودڵ، دڵکێش.

**دل کور:** زۆرنەزان، بێزەوق، دڵ کۆر.

**دلگداز:** کەسەرهێنەر، خەفەت هێنەر، پەژارەهێن.

**دلگران:** دڵشکاو، دڵ تەنگ، دڵگران، ڕەنجاو، عاجز، زیز، مەلوول.

**دلگرانی:** ڕەنجیان، ڕەنجان، زیزبوون، عاجزی.

**دلگرم:** دڵگەرم، چێ، ڕازی، بەهومێد، هیوادار، ئاسوودە و دڵنیا، دژی"دلسرد".

**دلگرمی:** دڵگەرمی، دڵخۆشی لە کارێکا، هیواداری، دڵنیایی، خاترجەمی.

**دل گرفتگی:** دڵگیران، دڵ تەنگی، خەمباری.

**دل گسل:** دڵ پسێن، دڵ ڕەنجێن، لێک جیاکەرەوەی دڵ، ئەوەی دەبێتە هۆی پچڕان و ڕەنجاندنی دڵ.

**دلگشا:** دڵ کراوە، دڵ کەرەوە، دڵارا، بەردڵ، دڵخۆشکەر

**دلگیر:** 1) دڵ تەنگ، ڕەنجاو، خەمناک، خەمبار، مەلوول، زویر، زیز. 2) دڵگر و گیرا. 3) ناڕەحەتکەر، ئازاردەر.

**دلگیری:** دڵ تەنگی، دڵگیری، دڵگیران، ڕەنجیان، زیزبوون، لووت لاگرتن، لالووت بوون.

**دل مردگی:** دڵ مردوویی، ژاکاوی، خەمۆکی، دڵ تەنگی.

**دل مرده:** دڵ مردوو، دڵ مردگ، دڵ مردە، دڵ مری، مرۆی سیسەڵەی ژاکاو، خەمبار، خەمۆک، دڵ تەنگ، بێزەوق.

**دلمشغولی:** پەژارە، نیگەرانی، سەرقاڵی زەین.

**دل نازك:** دڵ ناسك، زووهەڵچوو و هەستیار.

**دلنشین:** دڵگر، دڵپەسند، پەسند و بەڕمێن، خۆش، حەیات.

**دلنگ:** (د.لَ) 1) هەڵواسراو، داهێڵدراو، شۆڕەوەبوو. 2) هێشووی خورما.

**دلنگان:** بڕوانە: "آویزان".

**دل نگران:** پەرێشان و دڵەدوا، کەسێ کە تووشی پەرێشانی و دڵەڕاوکێ هاتبێ و چاوەڕوانی ڕووداوێکی ناخۆش بێ.

**دلنواز:** دڵداری دەر، دڵخۆشیدەرەوە، دڵاوەر، دڵ لاوێن.

**دلنوازی:** دڵدانەوە، دڵنەوایی، دلەدلە، دەلاڵەت، دڵداری، دڵخۆشی دانەوە، لاواندنەوە.

**دل نهادن:** بڕوانە: "دل بستن".

**دلواپس:** چاولەدوو، چەمەودوا، چاوەدوا، دڵەدوا، نیگەران، بە پەرۆش، پەشۆکاو.

**دلواپسی:** نیگەرانی بۆ کەسێك، دڵەڕاوکێ، دڵەخورپێ، پەرۆشی، پەرێشانی، پەرێشان خەیاڵی، پەشێوی.

**دلوار:** بڕوانە: "دلاور".

**دل و دماغ:** بریتی لە حاڵ و حەوسەڵە.

**دل و دیده:** بریتی لە کەسی زۆر بەڕێز.

**دلوك:** (دُ.لُ) لاربوونەوەی خۆر بەرەو خۆراوا.

**دلگی:** هەرزەیی، خوێریەتی.

**دله:** چاوچلێس، چاوچڕێن، خوێڕی و جلف و بێکارە.

**دلەدزد:** شڕەخۆر، لادز، (دەس/ دەست پیس، سیرمەخۆر، کەردز، دزی خوێڕیلە، نائەمین، هووردز.

**دلەدزدی:** شڕەخۆری، سیرمەخۆری، قاچ و قووچ.

**دلهره:** دڵەخورپە، دڵەخورپێ، دڵەتەپێ، دڵەکوتێ، دڵەڕاوکێ، نیگەرانی، ورتەورت.

**دلهره انگیز:** دڵەڕاوکێ‌هێنەر.

**دلیر:** دلێر، ئازا، نەترس، بەغیرەت، بەجەرگ، بوێر، چاوقایم، چاونەترس، چاونەترساو، وێرۆك.

**دلیراندن:** بڕوانە: "تشجیع".

**دلیرانه:** وەك دلێران، دلێرانە، بوێرانە، ئازایانە، چاونەترسانە.

**دلیك:** کەسێ کە بەهۆی تەوژم و زەختی ڕۆژگار بووبێتە کەسێکی بەئەزموون و کارزان.

**دلیل:** 1) ڕێبەر، رابەر، ڕێنوێن. 2) هۆ، گەواە، بەڵگە، شانەك، شانی، شانیك، نیشانە.

**دلیل آوردن:** بەڵگەهێنانەوە.

**دلیل تراشیدن:** بەڵگەی ناڕاستەقینە بۆ پاساودانی کارێك هێنانەوە، بەڵگە داتاشین.

**دلیل عقلی:** بەڵگەژیری، بەڵگەیەك کە لە سەر بناخەی ئاوەز بێ.

**دلیل کردن:** بڕوانە: "دلالت کردن".





**دلیل نقلی:** بەڵگە گوتەنی، بەڵگەیێ کە لەسەر بنەمای بڕیارەکانی شەرع بێ.

**دم:** (دَ) 1) هەناسە، پشوو، پشی. 2) هەوا هەڵمژین. 3) کات، وەخت. 4) لێو، لێوارە. 5) مووشەدەمەی کانزا توێنەوە. 6) دووگ، دوق، پاشەڵی مەڕ. 7) خوێن. "**بازدم**": (**هە**ناسە) دانەوە.

**دم آتشین:** دەربڕینی گیرا و کارتێکەر.

**دم آخر:** سات یان ڕۆژەکانی دوایی ژیان، کاتی مەرگ.

**دما:** هەناسە، پشوو. گەرما، پلەی تین، ئەندازەی گەرمی یان ساردی بە پێی پێوەرە قەراردادی‌یەکان.

**دماء:** کۆی "دم"، خوێنەکان.

**دمابان:** فەلاسك.

**دما پا:** تێرموستات.

**دمادم:** دەم بە دەم، سات بە سات، بەردەوام، پەیتاپەیتا.

**دمار:** زایەبوون، لەناوچوون، لەبەین چوون، تیاچوون. وردەدەمار.

**دماسنج:** گەرماپێو، قیرات.

**دماغ:** مێشك.

**دماغ پختن:** وێنای پڕوپووچ کردن.

**دماغ پرور:** بۆن خۆش.

**دماغه:** کەپك، کەپکە، کەڵپە، لوتکە، لووتە، پیشکۆ.

**دماگوژی:** خەڵك خلەتێنی، خەڵك فریودان.

**دمامت:** ناحەزی، ناشیرینی.

**دماندن:** رواندن، شین کردن. فووتێکردن.

**دمانگار:** گەرماپێو، "تێرمۆگراف".

**دمبدم:** بڕوانە: "دمادم".

**دم برآمدن:** بەکۆتاییگەیشتنی تەمەن.

**دم برآوردن:** قسەکردن، ئاخاوتن. هاونشین بوون. ئاخ هەڵکێشان. هەناسەکێشان.

**دم بریده:** 1) بوونەوەرێ کە کلکیان بڕیبێ، بێکلك، کلك قرتاو، کلك بڕاو. 2) بریتی لە کەسی زیرەك و فێڵباز.

**دم به دم:** کات بە کات، سات دوای سات.

**دم به ساعت:** پەیتاپەیتا، پشت سەری یەك.

**دم تیغ:** لەبەردەم مەترسی و زیان دا.

**دمخور:** هاودەم، هاوڕاز، گونجاو، هاوڕاوێژ.

**دمدار:** (دُ) بڕوانە: "دنبالەدار".

**دم درکشیدن:** بێدەنگ بوون، قسە نەکردن، دەم دادروون. مردن.

**دمدمه:** 1) بە تووڕەیی قسەکردن. 2) مەکر، کەڵەك، فرت و فێل. 3) ناوبانگ، ناوودەنگ. 4) دەنگ، ئاواز. "**دمدمەدادن**": فریودان، هەڵخەڵەتاندن.

**دمدمی:** وازوازی، وازیوازی، واسواس، ڕاڕا، سەرسەری، هەردەمی، تاوتاوی، لێزۆکی، حولحولی، هەردەبیر، هەردەمی، گەللایی، هۆکی، شیتەوێژ، بێبار، هەردەم لە سەر فکرێك، هەردەمەی لەسەر هەوایەك.

**دمده:** (دِ.مُ.دِ) ناباو، لە مۆد کەوتوو.

**دمر:** دوولۆر، دوولۆرە، دەمەوڕوو، لەپەوڕوو، بەڕووداکەفتگ، بەڕووداکەوتوو.

**دمرافتادن:** دەمەوڕووکەوتن، تلوورەوکەفتن، لەسەر زگ راکشان، بەدەمەوە راکشان، لەپەوڕوو، لنگەتللوور، لنگەوتللوور.

**دم ریز:** پشت سەری یەك، پەیتاپەیتا، پەستاپەستا.

**دم زدن:** 1) هەناسەدان، هەناسەکێشان. 2) قسە کردن، دەم لێدان، ئاخاوتن.

**دمساز:** هاودەم، ئاودەنگ، هاوڕاز، هاوسوڕ، هاوڕاوێژ، هاونشین، هاوڕا، گونجاو، تەبا.

**دمسرد:** ژاوەژاو، ژاکەژاك، لاژەلاژ، کەسێ کە ئاخاوتەکەی ناکاریگەر بێ.

**دم سرد:** (دَ.مِ.سَ) هەناسەسارد، ئاهێکی سارد کە لە کاتی ناهومێدیدا لە ناخەوە دێتەدەر. قسەیەك کە کارنەکاتە گوێگر.

**دم سنج:** هەناسە پێو.

**دمش:** باتێکران، هەڵکردنی با، کردەی"دمیدن".

**دمغ:** (دَ) شکاندنی سەر تا سەر مێشك. دان بە سەر کەسێك دا و زاڵبوون بە سەریدا.

**دمغ:** (دَ.مَ) سەرشکاو، سەرشۆڕ، تەرێق.

**دم فروبستن:** بێدەنگ بوون، کپبوون، قسە نەکردن، دەم دادروون، دەمکوت بوون.

**دمك:** (دَ مَ) چرکە.

**دم کردن:** 1) دەم کردن، دێم کردن، سەرداپۆشین و نانەسەر ئاگری چا و برنج. 2) ماسین، هەڵماسین، باکردن.

**دم کشیدن:** دەم کێشان.

**دم کلفت:** (دُ) بریتی لە پووڵدار و دەست رۆیشتوو.

**دم گرفتن:** هەناسەگیران. خوێندنی ئاواز یان بەستەیەك بەکۆمەڵ.

**دم گرگ:** بریتی لە کازیوە، بوولێڵە.

**دم گرم:** هەناسەی گەرم، دەربڕینی گیرا، قسەیەك کە کاربکاتە سەر بیسەر، خۆش راوێژی.

**دم لابه:** (دُ.بَ) کلکەسووتە، کلکەسووتەکێ، لاسمەلاسم.

**دم لابەکنان:** لە حاڵی ریایی و زمان لووسیدا، بەلاسمەلاسم.

**دم مرگ:** لە سەرەمەرگدا، گیانەلا، ئاویلکەدان، هەوزینگ.

**دمندان:** دۆزەخ، جەهەندەم، ئاگر.

**دمنده:** فوودەر، باتێکەر، هەڵکەر.

**دم نگار:** هەناسەپێو، "ئیسپیرۆگراف".

**دم وا پسین:** کاتی مەرگ.

**دم و دستگاه:** دام و دەزگا، دەم و دەزگا، بریتی لە کەلوپەل و پێداویستی ژیان و خانوبەرەی بەرز و تەرز و بەشکۆ و جەلال.

**دمور:** بڕوانە: "دمار".

**دموکرات:** دیمۆکرات، لایەنگری دیمۆکراسی، لایەنگری حکوومەتی خەڵکی، ئازادیخواز. لە ئەمریکا: ئەندامی حیزبی دیمۆکرات، لایەنگری حیزبی دیمۆکرات.





**دموکراتیك:** دیموکراتیك، لەسەر بناغەی دێمۆکراسی، سەر بە حکوومەتی خەڵکی، ئازادڕەوشتانە، ئازادیخوازی.

**دموکراسی:** دیمۆکراسی، حکوومەتی خەڵکی، خەڵك سالاری، وڵاتی دیمۆکراتیك، وڵاتی ئازاد، بەپێی پێناسە نوێیەکان پاراستن و دەستەبەرکردنی مافی کەمینە، دوورکەوتنەوە لە دیکتاتۆری.

**دموگرافی:** حەشیمەت ناسی، توێژینەوە لە مەڕ حەشیمەت.

**دمونستراسیون:** سەلماندن، بەڵگەهێنانەوە، ئاماژە، نواندن، خۆنوێنی، خۆپیشاندان.

**دموی:** خوێناوی، پڕخوێن.

**دمیاء:** خێروبێر، خێروبەرەکەت.

**دمیدگی:** روان، هەڵهاتن، هاتنەدەر.

**دمیدن:** 1) پف دان، فوودان، بە فوو پەنەماندن، باکردنەناو، هەڵدان. 2) هەڵکردنی با، با هەڵکردن. 3) سەردەرهێنان، ڤەهاتن، روان و سەر لە خاك دەرهێنانی گیا. 4) هەڵهاتن، هاتنەدەر، دەرکەوتن، دیاریدان. 5) خرۆشین، هاوارکردن. 6) رواندن، سەوزکردن. 7) هەڵکردن، پێکردن. 8) بڵاوبوونەوە (بۆن). 9) روانی موو. 10) ماسین، پەنەمان.11) رۆح دەبەرنان. "**در کسی دمیدن**": **هاندانی ئەو بۆ ئەنجامدانی کارێك.**

**دمیم:** ناحەز، ناشیرین.

**دنائت:** خوێریایەتی، نانەجیبی، هەتمچەرەکی، پەستی و زەلیلی.

**دنان:** بە لەنجەولار، خلنگێن و شادمان. ورووژاو و تووڕە.

**دناوت:** نزیکی، خزمایەتی.

**دنبال (کردن):** شوێن کەوتن، نانەشوێن، شۆنەونیان، رەپێکەوتن، رەپێنان، سەرنیشتن، رانان، راونان، راونیان، راوەدوونان، دانەدوو، دانەپەی، پەیجۆری کردن. "**دنبال چیزی را گرفتن**": درێژەدان و خەریك بوون بەوەوە. "**دنبال کسی حرف زدن**": بەدگۆیی کردن و لە پشتسەرەوە خوێندن. "**دنبال هم**": پشت سەری یەك. "**به دنبال داشتن**": بەدواوەبوون.

**دنباله:** پاشکۆ، درێژکراوە، بەردەوامی، درێژەی هەر شتێ. "**دنباله پیدا کردن**": درێژبوونەوە، درێژەکێشان. "**دنباله چیزی را گرفتن**": درێژەدان بەو. "**دنباله داشتن**": ناتەواو و درێژە هەبوون.

**دنبالەاندیشی:** بڕوانە: "چارەاندیشی".

**دنبالەدار:** پاشڵ دار، بەکلکە، دواییدار، بەدوایی، کلکدار، کلکن. درێژەوەبوو، کێشراو.

**دنبالەرو:** پاش رۆ، شوێن کەفتە، وەدواکەوتە، تەك کەوتوو، تەك کەوتە، پێڕەو. "**دنبالەرو سمج**": دیڤەلان، دوڤدوڤك، دوڤەلانك، هەمیشە لەدوو. "**دنبالەرو لشکر**": پاشدار، ئەوانەی لە دوای لەشکرەوە دەڕۆن.

**دنبە نهادن:** فریودان، کەڵەك لێدان. جۆرێ سێحرکردن بۆ لاوازکردنی کەسێك.

**دنج:** شوێنی بێهەراوزەنا، نژار، خەڵوەت، کونج، فەنا.

**دند:** بڕوانە: "دبنگ".

**دندان بە خون کسی دربردن:** بریتی لە بەسەختی ئازاردان.

**دندان بە کسی نهادن:** هێرش بردنە سەر ئەو، بەزەیی پێدانەهاتن بەو.

**دندان تیزکردن:** دیان لێ تیژ کردن، بریتی لە تەماح تێکردن.

**دندان درد:** دیان ئێشە، ژانی ددان.

**دندان داشتن:** بریتی لە رق و دوژمنایەتی نیسبەت بە کەسێك.

**دندانساز:** دیانساز، دانساز، وەستای ددان کردن.

**دندان سپیدکردن:** بریتی لە پێکەنین.

**دندان شکن:** دیان شکێن، وڵامی بێپێچ و پەنا و بەبڕشت.

**دندان غرچە:** بڕوانە: "دندان قروچە".

**دندان قروچە/ غروچە:** دان جیڕکردن، دان جیڕکردنەوە، دان چیڕکردن، دان ریچ کردنەوە، ددان چیڕکردنەوە، ددان دەچیڕەوەبردن، دانەچیرە، دیانەریکێ.

**دندان گرد:** بریتی لە تەماحکار و چاوچنۆك. و کەسێ کە لە مامڵەدا سەختگیر بێ.

**دندان گیر:** 1) ئاژەڵێ کە گاز بگرێ. 2) ئەوە وەبەر دیان بکەوێ، ئەوەی کە دیان لێیگیر بکا و بریتی لە شتێ کە لەبەردەست بێ.

**دندان مز:** دێسێر، دیان چێژ.

**دندان نشان دادن:** دەسەڵات نوێنی و ترساندن.

**دندان نمودن:** دیان چیڕکردنەوە و ترساندن.

**دندانە:** دچ، ددانۆك، دیانە، هەرشتێکی وەك دیان.

**دندانەدار:** دیانەدار، دچ دار، مشارە.

**دندش:** ورتە، پرتە، قسەکردن لە ژێر لێوەوە.

**دندیدن:** ورتاندن، پرتاندن، پرتەکردن، پرتەوبۆڵە کردن، بۆڵەی بن لێوان، لە ژێر لێوەوە قسەکردن.

**دنس:** (دَ.نَ) پیس، چەپەڵ.

**دنگ:** بڕوانە: "دبنگ".

**دنگل:** بڕوانە: "دبنگ".

**دنگ و فنگ:** دەم و دەزگا، شان و شکۆ.

**دنن:** (دَ.نَ) پشت چەمانەوە، پشت چەمینەوە.

**دنی:** بێئاکار، بێ فەڕ، نامەرد، پەست، دوونی.

**دنیا پرست:** دنیا پەرست، دنیا خۆشەویست، کەسێ کە دنیا و ماڵی دنیای لەلا زۆر خۆشەویستە.

**دنیات:** شتە پەست و چووکەکان.

**دنیاخوردن:** بریتی لە بەهرە بردن لە ماڵ و سامانی دنیا، خۆش رابواردن.

**دنیادار:** دنیا خۆشەویست، ماڵ خۆشەویست، کەسێ کە دڵی بە ماڵ و سامانی دنیا خۆشە.





**دنیاداری:** سیاسەت زانی، رامیاری، دنیاری.

**دنیادیدە:** دنیادیتوو، زۆر بەئەزموون و کارزان.

**دنیا را سیر کردن:** فرە دڵخۆش بوون.

**دنیا و مافیها:** دنیا و هەرچی لەو دایە، هەموو شتێك و هەموو کەسێك.

**دنیاوی:** بڕوانە: "دنیوی".

**دنیای باقی:** ئەودنیا.

**دنیای سفلی:** جیهانی ماددی.

**دنیدن:** لەنجەکردن، بەناز رۆیشتن، بە شادمانی و کەیف خۆشی رۆیشتن.

**دنیوی:** دنیایی، دونیایی، دونیاییکراو، جیهانی، سکۆلاریزە.

**دنیوی شدن:** دونیاییبوون، سکۆلاریزەبوون.

**دنیی:** بڕوانە: "دنیوی".

**دو:** (دَ) بڕوانە: "دویدن".

**دوآلیسم:** 1) دوانگیری، دوانەیی، دوالیزم، جووتخوازی، دوانەپەرستی، ئەم چەمکە بەرامبەر چەمکی تاکگیری دەوەستێتەوە، پوختەی ئەم چەمکە ئەوەیە کە جیهان لە سەر دوو بنەمای دژیەك دادەڕێژێتەوە وەکوو خێر و شەڕ یان جەستە و رۆح و هتد. 2) هاوبەندی دوو دەوڵەت کە سەربەخۆیی خۆیان پاراستبێ، دوو دەوڵەتی سەربەخۆ کە یەك دەوڵەت پێك بێنن.

**دواب:** چوارپێیان، ئاژەڵی بارەبەر.

**دواخانە:** بڕوانە: "داروخانە".

**دواخورکردن:** دەرمان داوکردن.

**دوادو:** بۆ هەر لایەك راکردن. هەولوەلا و هەوڵدان.

**دوار:** (دُ یان دَ) سەرەگێژە، سەرەسوورە.

**دوّار:** (دَ) هەر شتێ کە بە دەوری خۆی یان بە دەوری شتێکی دیدا بخولێتەوە، گەڕۆك، خولخۆر، دەورلێدەر.

**دوّاری:** بڕوانە: "دوّار".

**دوّاس:** شێر، دلێر، پیاوی ئازا.

**دواعی:** هۆگەل، پاڵنەرەکان، سەمەدەکان.

**دواعی الدهر:** رووداوەکانی رۆژگار.

**دوام:** دەوام، پایەداری و مانەوە، نەفەوتان، بەردەوامی، هەمیشەیی، خۆڕاگری.

**دوام آوردن:** تاقەت هێنان، بەردەوامی هێنان، بەرگەگرتن، خۆڕاگرتن، دەربردن، بڕکردن.

**دوام ناپذیر:** درێژەنەکێش، دەوام نەهێن، کورتخایەن، بەرگەنەگر، ئەمەرکورت، فەوتان.

**دوان:** لە حاڵی راکردن دا.

**دواندن:** رەتاندن، رەتانن، غار پێکردن، وەغارخستن، خاردان، لنگدان. بەپەلە بزاوتن. بڵاوبوونەوە، پەخش بوونەوە. سەرلێشێواندن و ناردنە زۆر شوێنان.

**دواننده:** رەتێن.

**دواهی:** کاری سەخت و دژوار، کار یان بابەتی گەورە.

**دوایر:** کۆی"دائرە".

**دوباره:** سەرلەنوێ، دووبارە، بۆ جاری دووهەم، دیسان، دیسانیش، هەمیسا، هەمیسان، هەمیسانەوە، هاونا، هەینا. دووجار، دووکەڕەت. "**دوبارەکاری**": دووپاتکردنەوەی کارێکی بێهوودە.

**دوبالا:** دووقات، دووبەرابەر.

**دوبختە:** دووجار شووکردە.

**دوبل:** دوولا، دووبارە، دووبەرابەر، دووقات، نوسخەی دووهەم، لە بەر نووسراو.

**دوبلاژ:** 1) دووتوێیی، دوولایی، دوودانەیی، دووقاتی، دوولاکردن. 2) دووبلاژ، وەرگێرانی ئاخاوتنەکانی نێو فیلمێکی سینەمایی لە زمانێکەوە بۆ سەر زمانێکی دی، دووبلەکردن.

**دوبلە:** دوو بەرابەر کراوە، دووبلاژ کراوە.

**دوبهم زن:** بەزاجکەر، شۆفار، شووفار، نێوان تێکدەر، بشێونە، خومەشێوێنە، چوکڵەشکێن، شەیتانی کەر، دووزمان.

**دوبیتی:** دوو کۆپلەیی، جۆرێک شێعر لەسەر کێشی"لاحول ولاقوةالاباللّه".

**دوبین:** کەسێ کە شتێ بە دوان ببینێ، خێل، خوێل.

**دوبینی:** خێلی، خوێلی.

**دوپشتە:** لە دوو ریزدا، پشت سەرییەک.

**دوپوستە:** شتێ کە دوو توێکڵی هەبێ. و بریتی لە قسەی ناڕوون، و قسەیەك کە دوو مانای دژبەیەکی لێ هەڵێنجێنرێ.

**دوپهلوگویی:** دژواربێژی، ئاڵۆزکردنەوە، دووپاڵوووێژی.

**دوتا:** دووتوێ، دوولایی، دووقات. چەمیو، چەماوە، لار. دووڕوو.

**دوتخمە:** مرۆڤ یان ئاژەڵێ کە لە دوو نەژاد بێ، دووتۆمە، دوڕە، دوڕەك.

**دوتو:** بڕوانە: "دوتا".

**دوتە:** بڕوانە: "دوتا".

**دوجانبە:** دوولایەنە.

**دوجزئی:** دووپاژێتی، دووپاژی.

**دوجنس گرا:** نەنێرنەمێو، نێرەمووك، خاوەنی هەڵسوکەوت و تایبەتمەندی هەر دوو رەگەزی نێر و مێ، bisexual.

**دوجنسی:** 1) نەنێرنەمێو، نێرەمووك، "هێرمافرۆدیت". 2) (دەروونناسی) خاوەنی هەڵسوکەوت و تایبەتمەندی هەر دوو رەڤەزی نێر و مێ.

**دوجنسیتی:** بڕوانە:"دوجنسی".

**دوجنیبت:** بریتی لە شەو و رۆژ.

**دوجین:** دەرزەن، دەستەیەکی دوازدە دانەیی.

**دوچند/ دوچندان:** دووقات، دووبەرابەر، دووئەوەندە، دووئەوەننە.

**دوخاتون:** بریتی لە مانگ و رۆژ.

**دوختن:** 1) دروون، دوورین، دووریان، دووراندن، دووران، دادروون، هەڵدروون، هەڵدرواندن، کێلدان، واڕزدن، ورازین، وراستن. 2) بڕوانە: "دوشیدن". 3) چەسپاندن، لکاندن.





**دوخت و دوز:** درومان، دورمان، واڕز، وراز، وراست.

**دودآسا:** وەك دووکەڵ، دووکەڵ ئاسا.

دودافکن: بڕوانە: "جادوگر".

**دودآلود:** دووکەڵاوی، تێکەڵ بە دووکەڵ، رەش هەڵگەڕاو بە دووکەڵ.

**دودآهنگ:** بڕوانە: "دودکش".

**دودخانە:** خانەدان، بنەماڵە.

**دود دادن:** خستنە تەنیشت دووکەڵ یان ناو دووکەڵەوە بە مەبەستی وشك کردنەوە.

**دودرەشدن:** نالەباربوون.

**دودرەکردن:** بردنی شتێ یان دزینی بە زیرەکی و فێڵبازی. فریودان. دەرچوون، هەڵاتن.

**دودزا:** دووکەڵکەر.

**دودزدن:** دووکەڵ کردن، دووکەڵ دانەدەر.

**دودزدە:** شتێ کە دووکەڵی پێگەیشتبێ و رەنگ یان بۆنی دووکەڵی گرتبێ، دووکەڵاوی بوو.

**دودستگی:** دوو دەستەیی، جیاوازی بیروبۆچوون لە نێوان کۆمەڵێك دا، ناکۆکی، دووبەرەکی.

**دودشدن:** لەناوچوون، بوونەدووکەڵ.

**دودغلیظ:** چڕەچەمان، چڕەدووکەڵ، چەڕەدووکەڵ.

**دودکردن:** دووکەڵ کردن. جگەرەکێشان و شتی وا. لەناوبردن، لەبەین بردن.

**دودکش:** دووکەڵدان، دووکەڵکێش، دووکەڵگیر، رۆژینگ، لووژن، لووەجن.

**دودگون:** بە رەنگی دووکەڵ، دووکەڵاوی.

**دودگین:** بڕوانە: "دودآلود".

**دودل:** دوودڵ، دووشك، سەددڵ، راڕایی، دل خراب، دڕدۆنگ، بە گومان، باوەڕگومان، ناخاترجەم، نادڵنیا، نیگەران.

**دودلی:** دڵ لە دڵ دان، دڵەڕاوکێ، دڵێدڵێ، دوودڵی، دڕدۆنگی، ناخاترجەمی، نیگەرانی، ئەرێونەرێ.

**دودم:** دوو لێوارە، دوو دەم.

**دودمان:** خانەدان، بنەماڵە، ئەندامانی بنەماڵە، رەچەڵەك.

**دودە:** 1) بڕوانە: "دودمان". 2) قرم، قورم.

**دودهنج:** بڕوانە: "دودآهنگ".

**دودی:** قەندەکێش، قەنگەکێش، قەننەکێش، لووجن، گیرۆدە بە تووتن کێشان.

**دودیگر:** بڕوانە:"ددیگر".

**دور:** (دَ) 1) گەڕان بە دەوری شتێك دا، سووڕانی شتێ بە دەوری شتێکی دیدا، خولانەوە. 2) دەور، گەڕ، زەمانە، رۆژگار، خول، سووڕانی ساڵ.3) شوێنکار و دەورووبەر. 4) ماوە.

**دور:** (دُ) دوور، دویر، بەرانبەری نزیك. درێژ. جیا، لێك جیا. بێئاگا، بێخەبەر. بەرین، بەرفرە. قووڵ. بێگانە.

**دورافتادن:** دوورکەوتنەوە، دوورەوەکەوتن، دوورکەوتن، دوورکەفتن، هەراڤستش.

**دورافتاده:** دوورەوەکەوتوو، دوورکەفتگ، دوورکەوتە، دوورخراوە.

**دوران:** 1) (دَ) دەوران، سەردەم، زەمانە، رۆژگار، قۆناغ، دنیا. 2) (دَ.وَ) سووڕانەوە، خولخواردن، خولانەوە، گەڕان بە دەوری شتێك دا. "دوران دادن": وەگەڕخستن. خول پێدان، سووڕاندن. "دوران کردن": گەڕان، سووڕان، خول خواردن. تووشی سەرگێژەبوون.

**دورانداختن:** فڕێدان، فڕەدان، تووڕدان، شەمڕاندن، دوورهاویشتن.

**دورانداختنی:** فڕێدراوێتی، بەدەردنەخور، شتێ کە بەکار نەیا و بۆ فڕێدان ببێ.

**دوران دم:** گەڕانی خوێن لە لەشدا.

**دورانديش:** تێبین، دوور نواڕ، بیر لە دواڕۆژ کەرەوە.

**دوران ديده:** دنیادیتوو، بەئەزموون.

**دورانساز:** سازێنەری سەردەمێکی نوێ، سەردەمساز.

**دوراهی:** دووڕیان، دووڕێیان.

**دورباطل:** بازنەداریێتی، گەڕانی پووچ و بێهوودە.

**دوربرد:** دوور هاوێژ، دووربڕ، دوورمەودا.

**دوربرداشتن:** دەورهەڵگرتن، بەخێرایی ڕۆیشتن. توانایی و پێگە و ناوبانگ پەیاکردن.

**دوربين:** 1) چاوتیژ، کەسێ کە دوور لە نزیك باشتر دەبینێ. 2) بڕوانە: "دورانديش". 3) دووربین، کامێرا. "دوربين انداختن": بەکامێرا سەیرکردن.

**دورچرخاندن:** خولاندنەوە بەشکڵی جەغز.

**دوربينی:** جۆرێ نەخۆشی چاو کە تووشبوو ناتوانێ شتە نزیکەکان بە جوانی ببینێ. دوورنواڕی.

**دور داشتن:** دور ڕاگرتن، دوورەوەکردن.

**دوردست:** دووردەس، دوورەدەس، دوورە دەست، شتێ کە دەست پێی ڕاناگا، جێگەی دوور. دوورکەوتوو. ئەوەی بەسەختی وەدەست دێ.

**دورزدن:** 1) دەورلێدان، چەرخیان، خولخواردن، گەڕیان. 2) گەڕانەوە یان دەورلێدانی سەیارە و هتد.

**دورسنج:** دەور پێو.

**دورشدن:** تەکینەوە، دوورکەوتنەوە.

**دورفرمان:** دەزگای کۆنترۆڵ لە ڕێگەی دوورەوە.

**دورکردن:** لابردن، دوورکردنەوە. جیاکردنەوە.

**دورگه:** دوڕە، دووڕەهـ، دوڕەك، دووڕەگ، دووڕەگە، دووتۆمە، دووڕێژە، مەلەز.

**دورماندن:** جیامان.

**دورنگ:** 1) هەرشتێ کە لە دوو ڕەنگ پێکهاتبێ. 2) بریتی لە درۆزن و دووڕوو.

**دورنگار:** فاکس.

**دورنگر:** دوورنواڕ، دووڕوان.

**دورنگی:** 1) بریتی لە درۆ ڕازاندنەوە و دووڕوویی و ریا. 2) دووڕەنگ بوون.





**دورنما:** دوور ڕوان، نمای گشتی، دوور نوێن، دوورنما، دوورەدیمەن، ئاسۆ.

**دورنمايی:** دوور ڕوانی، دوور نواڕی، دوورنوێنی، دوورنمایی.

**دورنويس:** فاکس.

**دورو:** دووڕاز، دووڕوو، دووسەر، کۆستەك، کەسێ گوتار و کرداری یەك نەگرێتەوە. دووبەر، دوولایە. لە دوو ڕیزدا.

**دوروبر:** بڕوانە: "پیرامون".

**دورويه:** لە دوو ڕووەوە، لە دوو لاوە. و شتێ کە دووڕووی هەبێ، دووبەر. دوو لێو. دووڕوو، دووڕاز. دووڕیپز. لە دووڕیزدا.

**دورويی:** دووڕوویی، دوورەنگی، ساختەکاری، ، خۆ بە دۆست نیشان دان و بە نهێنی دوژمنایەتی کردن.

**دوره:** 1) گەڕان، سووڕان بە دەوری شتێك دا، جارێك خولخواردن. 2) قۆناغ، سەردەم، خول. 3) پەراوێز و دەورەی شتێ. 4) نۆبە، جار، کەڕەت. "دوره‌افتادن": سەر لە هەموو جێگەیەك دان. دەورەیی. "دوره تناوب": (فیزیك) "پریۆد"، مەودای نێوان دوو دووپاتەی ڕووداوێکی یەکتایەك.

**دوره‌کردن:** دەورەکردنەوەی وانە. گەمارۆدان.

**دوره‌گرد:** گەڕیدە، دەستگێڕ، دەست فرۆش، وردەواڵەفرۆش، دێوەرە، کاسپ و پیشەوەرێ کە بە کۆڵان و شەقامەکان دا بگەڕێ و کاڵاکەی بفرۆشێ.

**دوره‌گرداندن:** بەهەموو جێگەیەك دا خولاندنەوە و بە هەموان پیشاندان.

**دوره‌گشتن:** لەهەموو جێیەك سووڕانەوە، چوونە جێگای جۆراوجۆر.

**دوری:** دووری، دۆژ، نێوان.

**دوری جستن:** دووری کردن، دووری لێکردن، لێدوورکەوتنەوە، دوورە پەرێزیکردن، خۆپاراستن، گورێزدان، تەکانەوە.

**دوزباز:** بڕوانە: "حقه‌باز".

**دوزبان:** دووڕوو، دووڕاز. وەرگێڕ، شارەزا لە دوو زمان.

**دوزبانه:** دووزمانە. لەسەر بناخەی دووزمان.

**دوزچيدن:** فێڵبازی و پیلانگێڕان.

**دوزخ:** دۆزەخ، دۆزەق، دۆژە، دۆژەهـ، جەحەندم، شوێنی تاوانباران لە قیامەت.

**دوزخی:** دۆزەخی، جەحەندمی.

**دوزنده:** بەرگدروو.

**دوزنه:** دووژنە، مێردی دوو ژنان.

**دوزوکلك:** فرتوفێل، فێڵ و فەرەج، ڕاووڕیو، دزی و فزی.

**دوزيدن:** بڕوانە: "دوختن".

**دوزيستان:** وشکاوی، دووژیانییەکان، لە زاراوەی بوونەوەرناسی دا: بوونەوەرگەلێ کە سەرەتا لە ئاودا دەژین و کاتێ کامڵ بوون لە ئاو دێنەدەر و لە وشکانی دا جووڵە دەکەن.

**دوس:** 1) پێشێلکردن، پێ ڕێخستن. 2) سرینەوە و سیقاڵ دانی شمشێر.

**دوسـانیدن:** لکاندن، چەسپاندن. خۆ ڕەپاڵدان بە کەسێکەوە.

**دوست:** دۆس، دۆست، هەواڵ، هەڤاڵ، ئاواڵ، هالاّ، هاولف، ئاشنا. خۆشەویست، دلبەر. خودا.

**دوستار:** بڕوانە: "دوستدار".

**دوستانە:** دۆستانە، هەوالانە، لە رووی دۆستیەوە.

**دوستدار:** هەڤاڵی دلۆڤان، خۆشەویست، هەزکەر، ئارەزووکەر.

**دوست داشتن:** خۆش لێهاتن، خۆش ویستن، دلّ لێچوون، دلّ چوونەسەر، حەزلێکردن، ژێحەزکرن، بەردلّ کەوتن، لیلیاندن، هەباندن.

**دوست داشتنی:** لەبەردلاّن، خوێن شیرین، خوێن شیرن، ئێسک سووک، رەزاسووک، هەستی سڤك. "**نوزاد دوست داشتنی**": ساڤلۆك.

**دوست دغل:** دادۆش، کەسێ کە بەگزی دۆستە و بەهرە دەبا.

**دوست شدن:** بوونەهەڤاڵ. ئاشت بوونەوە.

**دوستکام:** 1) کارێ یان شتێ کە بە دلّی دۆست بێ. 2) دۆستی دلۆڤان، دۆستی خێرخواز و دلّبەند.

**دوستگان:** خۆشەویست، دلبەر، گراوی.

**دوست نداشتن:** خۆش نەویستن، خۆش لێنەهاتن، رك لێبوونەوە، قین لێبوون.

**دوست نداشتنی:** خوێن تالّ، رەزاقورس، رەزاگران، ئێسك قورس، هەستی گران.

**دوستوار:** وەك دۆست، دۆست ئاسا، دۆستانە.

**دوست واقعی:** یەکماڵ، دۆستی گیانی، هەڤاڵی راستەقینە.

**دوستی:** دۆسی، دۆستی، دۆستایەتی، دۆسایەتی، هەڤالی، هەڤالەتی، هەڤالینی، ئاواڵەتی، گراوی، هاوڕێیەتی.

**دوسنده:** بڕوانە: "چسبندە".

**دوسوگرایی:** دوولایەنەخوازی.

**دوسویگی:** دوولایەنەیی.

**دوسویه:** دوولایەنە.

**دوسیدن:** چەسپین، لکان، چەسپان بۆ مژین. "**در چیزی دوسیدن**": بەقایمی گرتن، پێوەهەڵواسین.

**دوسیده:** بڕوانە: "چسبیدە".

**دوسیه:** بڕوانە: "پروندە".

**دوش:** 1) ناوشان، کۆڵ. 2) بڕوانە: "دیشب".

**دوشا:** دۆشەر، دۆشەنی.

**دوشاب:** دۆشاو، دۆشاڤ، شۆك، ئاوی ترێی کولاو.

**دوشاخ:** هەر شتێ کە دوو شاخی هەبێ، دوولك.

**دوشاخە:** دوولەپان، دووفلیقانە، دووحاچە، دووپەل، دوولك.

**دوشادوش:** شان بەشان، پێکرا، بەیەکەوە، پێکەوەجووت، گوێبەگوێ.

**دوشانیدن:** بڕوانە: "دوشیدن".

**دوش بر دوش:** هاونشین، هاودەم.





**دوش بەدوش:** بڕوانە: "دوشادوش".

**دوش گرفتن:** حەمام کردن.

**دوشنبە:** دووشەم، دووشەمۆ، دووشەممە، دووشەمە، دووشەمی، سێهەم رۆژی حەوتوو.

**دوشندە:** دۆشەر، دادۆش، شیردۆش، بێری، بێریڤان.

**دوشیدن:** دۆشین، دادۆشین، دۆشان، دۆتن، دۆختە، شیر لە گوان دەرێنان.

**دوشیدنی:** دۆشەنی، دۆکردە، دۆشانی.

**دوشیدە:** دۆشراو، دۆشیاگ، دۆتی.

**دوشین:** بڕوانە: "دیشب".

**دوغلو:** بڕوانە: "دوقلو".

**دوقافیە حماسی:** جووت سەروای حەماسی.

**دوقطبی:** دووجەمسەری.

**دوقلو:** دوانە، دوودانە، لفەدوانە، ئاوەڵ دوانە، هاواڵ دوانە، ئاواڵ دوانە، زگەدوانە، جڤی، جمك، جڤك، جێمك، جویك، جێوك، جوملاّنە، جومڕانە، هەمبیزە، هەڤالزا، هەڤال جەو، هەڤال جێو، هەڤزك، هاولف، لف، لفانە، لفەدوانە، لفە.

**دوقولی:** ناهاوچەشن و پێك ناکۆك.

**دوك ریسی:** تەشیرێسی، تەشیرستن، بە تەشی کوڵکە بادان.

**دوگانگی:** پارادۆکس، دووفاقێتی، دووفاقیبوون، دووهۆیی، دوانەیی، جووتێتی.

**دوگانە:** دووفاقە، دوانە، هەرشتێ کە لە دوو پاژ پێك هاتبێ، جیاواز و ناهاوچەشن. "**سیستم دوگانە**": سیستمی دوانە.

**دول:** (دَ.وَ) خاوەخاو و دێری لە کاردا، ساوەساو، دەساودەس.

**دول:** (دُ.وَ کۆی:"دولت".

**دولاشدن:** تابوون، دوولابوونەوە، دانەوین، چەمیانەوە.

**دولاکردن:** تاکردن، دوولاکردن، داموچانن، دانووشتاندن.

**دولایە:** دووقەد، دوولانە، دوولۆنە، دووتوێ.

**دولت:** 1) دارایی، سامان، هەیاتی، هەیەتی. 2) مەڕ و ماڵات. 3) دەوڵەت، کابینەی وەزیران، سەرەك وەزیر و وەزیرەکانی، سەرۆك كۆمار و وەزیرەکانی کابینەکەی، دەسەڵاتی بەڕێوەبەری. 4) وڵات، سەرزەوی.

**دولتخانە:** ماڵی دەوڵەت، بارەگا، کۆشك. پێتەخت.

**دولتخواه:** خوازیاری دەوڵەت، لایەنگری دەوڵەت. خێرخواز.

**دولت سرا:** بارەگای دەوڵەت، کۆشك.

**دولتمردان:** پیاوانی دەوڵەت، هەرکام لە بەرپرسانی دەوڵەتی.

**دولتیار:** بەختەوەر، خۆشبەخت، دەوڵەمەند، ساماندار.

**دولتین:** دوو دەوڵەت.

**دولوکس:** شیك، لۆکس.

**دولە:** بڕوانە: "گردباد".

**دومان:** (دَ.وَ) فڕین و دەورلێدانی باڵندە بە دەوری شتێدا.

**دومینیـــون:** دەســەڵات، هێــز، دەســت ڕۆیشتوویی، قەڵەمڕەو، سەرزەوییەک کە لە ژێر دەسەڵاتی حاکمێك دابێ.

**دون:** 1) پەســت، ڕەزیــل. 2) خــواریێ، خوارەوە، ژێرەوە. 3) جگە، بێجگە.

**دون پایـە:** کارمەندی دەوڵـەت کـە پلـەی ئیداری نەبێ.

**دوندگی:** ڕاکردن.

**دونده:** ڕاکەر. تیژڕەو.

**دوهفتەنامە:** دووحەوتوونامە.

**دوهم اندیشی:** بڕوانە: " تلەپاتی ".

**دوی:** نـەخۆش، دەروون نـەخۆش، گـەوج، دەبەنگ، کەم ئاوەز.

**دویـدن:** ڕاکـردن، هـەڕاکردن، دەرچـوون، هــەڵاتن، بەلەزچـوون، ڕەتـان، غـاردان، غارکردن، خاردان، لنگدان، هـەلینگ دان، وایــن، قاچــان، قاچــاندن، وەزیــن. دەرکەوتن، پەیابوون. ڕەخنەکردن.

**دویی:** دوانەبوون، دووفاقێتی و جیایی.

**دوییت:** دووفاقێتی و جیایی و ناکۆکی.

**دهاء:** زیرەکی و کارزانی، بیرتیژی، ژیری.

**دهات:** (دُ) کۆی"داهی".

**دهـــاتی:** (دِ) دیـاتی، دێکـانی، دێهـاتی، لاگـەیی، خـەڵکی دێ، لـە دێ نیشتەجێ، گوندی، لادێیی، دەشتەکی.

**دهاق:** (دِ) پڕ، لێوانلێو، لیپاولیپ.

**دهاقین:** کۆی"دهقان".

**دهـــالیز:** کـۆی"دهلیـز". "**ابناوالـدهالیز**": منداڵانی سەرڕێ.

**دهـــان بازمانـــدن:** دەم داچـــەقان، زار ئاوەڵەبوون. سەرسووڕمان.

**دهان بستن:** بێدەنگ بوون، زاربەستن.

**دهان بند:** دەم بێن، دم بێن، دەم بەست، زاربەست، زاربێن، زاربێنك.

**دهان بین:** ئەوەی بڕوانێتـە زاری کەسـێکی دی، ئـەوەی کـە بـڕوا بـە قسـەی هـەموو کەسێك بکا و بکەوێتە ژێر کارتێکەری ئەم و ئەو.

**دهان دره:** بڕوانە:"خمیازە".

**دهـــان گـــشودن:** دەم داچـــەقاندن، دەم داچـەقانن، دەمـەکوتێ، دەم هــەڵێنان، زارکردنەوە. وەقسەهاتن.

**دهان لق:** بڕوانە: "دهن لق".

**دهانـــەدوزی:** دەم دادروون، دەم دروون، زارك دروون.

**دهبان:** نگابانی دێ، کەیخودا، کوێخا.

**دەچندان:** دەقات، دەبەرابەر.

**دهخدا:** خـاوەنی دێ، سـەرۆك و گـەورەی دێ، کەیخودا.

**دهـــــدار:** خـــاوەنی دێ، کـــەیخودا، سەرپەرشتکاری خەڵکی ئاوایی.

**ده دله:** بریتی لە کەسـێ کـە هـەر دەمـەی دڵ بە یەکێ دەدا، بێئەمەگ، تۆلاز.

**ده دهـــی:** 1) دەدانـــە دەدانـــە، دە دە. 2) زێڕی بێ خەوش.





**دهر:** ڕۆژگاری بێکۆتـایی، سـەردەمانێکی درێـژ، زەمانـە. (فەلـسەفە) واتـای زەینـی کاتی بێ دەسپێك و بـێ ئـەنجام. جیهـان. مرۆڤ.

**ده رگە:** بریتی لە پیاوی ئازا و بـەغیرەت و دلێر.

**ده روزه:** کورتخایەن.

**دهـری:** دەهـری، پـێچـەقێن، کەسـێ کـە حاشا لە بـوونی خـوا بکـا و بلێ کـە دنیا هەتاهەتاییە و ئافرێنـەرێکی نیـە و بێجگـە لەم جیهانە جیهانێکی دیش نیە.

**دهـــش:** ( د.هِ) بەخــشین، بەخــشش، دەسەنە، بەرات، کەرەم.

**دهـــش:** (دَ.هَ) سەرسـوڕمان، واق وڕمـان، حەپەسان.

**دهش:** (دَ.هِ) سەرسوڕماو، حەپەساو.

**دهشت:** (دَ.شَ) سەرسامی، سەرسوڕماوی، حەپەســـان، واق وڕمـــان، تاســـیان، سەرلێـشێواوی، پەشـۆکاوی. "**دهـشتناك**": ترس و خۆف هێن، ترسێنەر، ترسناك.

**دهشگر:** بڕوانە:"سخی".

**دهشمند:** بڕوانە:"سخی".

**دهقـــان:** خــاوەنی دێ، ســەرۆکی دێ، وەرزێر، جووتێر.

**دەکیا:** بڕوانە: "دهخدا".

**دەگان:** دەدانە دەدانە، دەدانەیی.

**دهگـــان:** خـاوەنی دێ، گـەورەی دێ، وەرزێر. دەدانەدەدانە، دەکەس دەکەس.

**دهگانسرا:** ماڵی وەرزێر، ماڵی دێهاتی.

**دهل دریـده:** دەهـۆڵ دڕاو، بریتـی لـە نـاو زڕاو، حەیاچوو، ئابڕووتکاو.

**دهـل زن:** دەهۆڵـژەن، دەهۆڵکـوت، دۆڵ ئەنگێو.

**دهلیـز:** 1) ڕەهـۆڵ، دالان، دالـو، ڕێگـەی تەسك و درێژ. 2) (پزیشکی) گوێچکەڵە.

**دهم:** دەیەم، ئەوەی کە لە پلەی دە دایە.

**دهناء:** بان، بانو، بوڕگە، بیابان.

**دهناد:** تەکووزی و ڕێکوپێکی.

**دهن بـه دهـن:** دەم بـە دەم، دەماودەم، دەڤ بدەڤ، زاربەزار، لە زار بۆ زار.

**دهن بـین:** هـەردەمی، هـەردەبیر، کەسێك لەژێرکاریگـــەری قـــسەی دیـــتران دا بیروبۆچوونی دەگۆڕێ.

**دهن دره:** بڕوانە: "خمیازە".

**دهـن کجـی:** دەم هـەلکی، دەمەلاسکە، دەمەلاسـکێ، بریتـی لـە دژایـەتی کـردن دەگەڵ کەسێك، پێچەوانەی ویستی کەسێ جووڵانەوە.

**دهن لق:** زمان شڕ، زارشڕ، دەم شڕ، دەم دڕاو، دەم دادڕاو، زاردڕاو، دەم هەڵــــە، دەشۆ، دەڤشۆ، دەڤ بەردا، دم هـەراش، هەرزەچـــەنە، بـــەلۆك، تێدانەوەســـتاو، قسەپەڕێن، قسەگێڕەوە.

**دهنی:** دەمێ، زارێك.

**ده و گیر:** بڕوانە: "گیرودار".

**دهه:** دە یەکە لە شتێ، دەیە، دە ساڵ لە سەد ساڵ.

**دهجایی:** دە بڕگەیی.

**دهیو:** (دِ) مەڵبەند، بەش، بەشێك لە وڵات.

**دهیوپد:** فەرمانـدار، دەسـەڵاتداری مەڵبەندێ یان بەشێ لە وڵات.

**دیابت:** شەکرە، نەخۆشی قەند.

**دیاپازن:** پانتایی دەنگ، فەزایەك کە دەنگی ئامێرێ یان ئاوازێ دەیبڕێ.

**دیات:** کۆی"دیە".

**دیاترمی:** گەرما دەرمانی.

**دیار:** کۆی"دار"، بە مانای شوێن و ماڵ. و بەمانای شار و تیرە. وڵات، سەرزەوی. زێد، نیشتمان.

**دیاستول:** (پزیشکی) تەوژمی خاوە.

**دیافراگم:** ماسوولکەی ناوپەنچك.

**دیاگرام:** پیشاندەر، شێوە، فۆرمی هەندسی، هێڵی هەندسی.

**دیاگنوستیك:** ناسینەوە.

**دیالکتیك:** دیالکتیك، زانستی لۆژیك، مشتومڕیلۆژیکی، ، باس و گفتوگۆ، شێوەی مشتومڕ و دەمەتەقێی لۆژیکی.

**دیالوگ:** دیالۆگ، وتوویێژ، گفتوگۆی دوو کەسی، دەگەڵ یەکدی ئاخاوتن، گفتوگۆگەلی ئەدەبی و دراماتیك.

**دیالیز:** شیکردنەوەی شیمیایی شتەکان بە پێی ئاسان تێپەڕینیان لە مەوادی تۆڕی. "**دیالیز خون**": شیکاری پەردەیی خوێن.

**دیانت:** 1) دینداری کردن. 2) ئایینی خواپەرستی، هەر ئایینێ کە لەسەر بنەمای خواپەرستی بێ.

**دییا:** بڕوانە:"معرفی".

**دیباچه:** 1) پێشەکی کتێب، سەرەتای کتێب. 2) دەم و چاو، روخسار.

**دیپلم:** دیپڵۆم، کەسێ کە قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندی و دواناوەندی بڕیبێ، زانست نامە، شایەتی‌نامە، شەهادە.

**دیپلمات:** دیپلۆمات، سیاسەتوان، رامیار، نوێنەری سیاسی، کەسی زانا و شارەزا لە کاروباری رامیاریدا.

**دیپلماتیك:** دیپلۆماتیك، سیاسەتمەدارانە، رامیارانە، لەپێوەندی دەگەڵ سیاسەت و کاروباری سیاسی، بەسیاسەت، بەتەگبیر. "**هیئت دیپلماتیك**": تەواوی باڵوێزان و ئەندامانی باڵوێزخانەکان لە پێتەختی وڵاتێك"کور دیپلماتیك".

**دیپلماتیکالی:** بەشێوەی دیپلۆماتیك، لە باری دیپلۆماسییەوە.

**دیپلماسی:** رامیاری، زانستی رامیاری، سیاسەتمەداری، کاری رامیاری، هونەری پێوەندی دەگەڵ وڵاتانی دیکە.

**دیپلمه:** دیپلۆمە، خاوەنی پلەی دیپلۆم.

**دیپلوئید:** جووت.

**دیجور:** تاریکی، تاریکی شەو، شەڤتاری، شەفتاری، شەڤرەش. "**شب دیجور**": شەوەزەنگ، شەوی درێژ و تاریك و تنۆك، شەوی زۆر تاریك و ئەنگوستەچاو، تاریکەسەلات.





**دید:** 1) سۆما، بینایی، چاو. 2) تێڕوانین، روانین، تماشا. "**دید محدود**": روانگەی سنووردار. "**زاویەدید**": گۆشەنیگا.

**دیدار:** 1) سەردان، چاوپێکەوتن، بینین، دیتن، پێوەچوون، دیدارکردن، هاسایش. 2) سەر و سیما و روخسار. 3) چاو و هێزی بینایی.4) شکڵی رواڵەتی. 5) چاو.

**دیدارگاه:** بڕوانە:"میعادگاه".

**دیداری:** شیاوی دیتن، دیتنی.

**دیدان:** عادەت، خوو، داب.

**دیدبان:** نێرەڤان، نێرین ڤان، روانکاو، چاودێر، چاویار، دیدەوان، ئێشك گر. "**جای دیدبان**": نێڕەگە، روانگەی نێرەڤان.

**دیدبانی:** دیاردی، کێشك، پاسەوانی شەوانە، چاودێری، دیدەوانی.

**دیدچشم:** هەتەر، سۆمای چاو، بینایی، رۆنکاچاڤ، رۆنیاچاڤ، دی.

**دیدزدن:** بەچاوکردن، هاتنەبەرچاو، دیتن، دین، خەملاندنی بەها و نرخی شتێ بە گۆترە، نرخاندنی بەرهەمی کشتوکاڵی یان شتی دی.

**دیدشی:** بڕوانە:"بصری".

**دیدگاه:** 1) شوێنی دانیشتن یان وەستانی دیدەوان. 2) چاوگە، خویانەك، بەرجەوەن. 3) روانگە، سۆنگە، بۆچوون. "**دیدگاهانتقادی**": بۆچوونی رەخنەگرانە. "**دیدگاه جامع**": روانگەی گشتگیر. "**دیدگاه دوگانه**": روانگەی دوانە. "**دیدگاهعینی**": روانگەی بابەتیانە.

**دیدگری:** بڕوانە:"معاینە".

**دیدمان:** بڕوانە:"نظریە".

**دیدمانگر:** بڕوانە:"نظریەپرداز".

**دیدمانی:** بڕوانە:"نظری".

**دیدن:** بینین، دیتن، دین، دیەی، چاوپێکەوتن، چاولێکردن، بەرچاوکەوتن، سەیرکردن.

**دیدنی:** دیەنی، دیتنی، دیدار، چوونە چاوپێکەوتن، سەرلێدان، چوونەدیەنی، شیاوی دیتن.

**دیدوان:** بڕوانە: "دیدبان".

**دیده‌باز:** 1) کەسێ کە چاوی هەڵاتوە و دەبینێ. 2) بڕوانە: "چشم چران".

**دیده‌بان:** بڕوانە: "دیدبان".

**دیده‌دار:** بڕوانە: "دیدبان".

**دیده‌ور:** بینەر، تواشاکەر، دیدەوان، نگابان.

**دیر:** دێر، درەنگ، لە کات رابراو، هێواش.

**دیرآموز:** بڕوانە: "کودن".

**دیرانه:** دێرینە، لەمێژینە، کۆن، کاتێکی درێژ.

**دیرباز:** لە کۆنەوە، سەردەمێکی دوور و درێژ، ماوەیەکی درێژ، زەمانی پێشوو.

**دیرپا:** درێژخایەن، پایەدار، خۆڕاگر، بەرگەگر، پتەو.

**دیرپسند:** دژوارپەسند، وازوازی، ئێرادگر، دێرپەسند.

**دیرترك:** کەمێ درەنگتر.

**دیررس:** ئاڤزەمکی، درەنگ گەیشتوو، ولامێك درەنگ بگا.

**دیر رنج:** بەسەبر و حەوسەلە، پشوودرێژ، کەسیٚ کە زوو هەڵنەچیٚ.

**دیرزمان:** ماوەیەکی درێژ.

**دیرسال:** پیر. کەونارا، کۆن. سالانێکی زۆر.

**دیرفهم:** بڕوانە: " کندذهن ".

**دیرك:** کۆترە، کۆڵەکە، ئەستوندەك، کاریتەی دارەڕا.

**دیرکتور:** بەڕێوەبەر، بەرپرس، ڕێنوێن، کارگێر.

**دیرکرد:** دێرکردن، درەنگ بوون. لە زاراوەی بانکیدا: وەدواخستن.

**دیر کردن:** درەنگ کردن، خۆوەدواخستن، پێچوون، کات بەخت کردن.

**دیرکسیون:** 1) لە زاراوەی فیزیك دا: راستا، درێژایی. 2) روو، لا، ئاراستە.

**دیرك كشتی:** دەگ، ئەستووندەك.

**دیرگاه:** 1) لە مێژینە، لەمێژ، لەزووڕا. 2) ناوەخت، درەنگانیٚ.

**دیرگوار:** خواردەمەنییەك کە درەنگ هەزم دەبیٚ، دێر هەزم.

**دیرگهان:** بڕوانە: "دیرگاه".

**دیرماندگی:** پیری، پیرێتی، کۆنی و سواوی.

**دیرماندن:** زۆر تەمەن کردن، پیربوون.

**دیرمان گرایی:** بڕوانە: " سنت گرایی".

**دیرمانه:** نەریت.

**دیر مغان:** ئاگرگە، پەرستگەی زەرتوشتییەکان.

**دیرند:** 1) بڕوانە: "دهر". 2) ماوەیەکی دوور و درێژ، ڕۆژگارێکی درێژ.

**دیروز:** دویٚ، دوێنیٚ، دوێنەکە، دوێنێکە، دوێکە، دۆنیٚ، دۆه، دوهی، دینیا، ڕۆژی پێشوو.

**دیروقت:** 1) ناوەخت، بیٚوەخت، درەنگانیٚ. 2) بڕوانە: "دیرگاه".

**دیریاب:** ئەوەی درەنگ و بەدژواری وەدەست بیٚ.

**دیریاز:** درێژ.

**دیریدن:** دێربوون، درێژەکێشان، درێژبوونەوە.

**دیرین/ دیرینه:** لەمێژینە، دێرین، دێرینە، پێشوونە، زووگین، قەدیم، کۆن، قۆجە.

**دیرین شناسی:** دێرینەناسی، شوێنەوارناسی، ناسینی ئاسەوار و پاشماوەکانی دار و بوونەوەران کە لە سەردەمی کۆنەوە لە چینەکانی زەویدا ماوەتەوە، "فسیل شناسی"، "پالئونتولوژی".

**دیرینگی:** لەمێژینەیی، دێرینەبوون، مێژینە.

**دیرینەروز:** ئەوەی تەمەنی زۆری کردوە، تەمەن درێژ، پیر و بەتەمەن، زورهان.

**دیرینەسال:** بڕوانە: "دیرینەروز".

**دیس/ دیسه:** وێکچوو، وەك، هاوتا، هاوچەشن. شکلٚ، سەکوت.





**دیسدارشدن:** شکلٚ گرتن.

**دیسدارکردن:** سازکردن، شکلٚ دان بە.

**دیسك خوان:** دیسك خوێنەوە.

**دیسیپلین:** دیسیپلین، ڕێکوپێکی، تەکووزی.

**دیشب:** دوێشەو، دوێنیٚشەو، دوێنیٚ شەویٚ، شەویٚ دی، شەوادیتر، دوشینا، شەوادی، شەوی رابردوو.

**دیفتری:** قوڕگ گیران، گەروەخڕە، وەناق، ملەخڕە.

**دیفتونگ:** دوو دەنگی، یەکیەتی دوودەنگ، یەکیەتی دوو پیت، کۆبوونەوەی دوو دەنگ کە بە جیا دەبیسترێن بەلام بە یەکجار لە زارەوە دێنە دەر.

**دیکتاتور:** دیکتاتۆر، دەسەلاتداری خۆسەر و سەرەڕۆ، ملهوڕ، زۆردار، ماڕز، ماریس، سەرڕەق، کەسێك وەك لیدێڕی حیزبێك یان لە ڕێگەی کوودەتاوە دەسەلاتی بەدەستەوە گرتبیٚ و خۆسەر و سەرەڕۆیانە حوکم بکا.

**دیکتاتورزده:** دیکتاتۆر لێدراو، شوێنیٚ کە قەرەقووشی و خۆسەری تێدا زاڵە.

**دیکتاتوری:** دیکتاتۆری، خۆسەری و سەرەڕۆیی، لاساری، پیٚ چەقێنی، سەرسەختی. "**حکم دیکتاتوری**": قەرەقووشی، حوکمی خۆسەری و لاساری. "**دیکتاتوری پرولیتاریا**": لە تیۆری مارکسیسم دا: شێوازی حکوومەتی سووسیالیستی لە سەرەتای دەست بەکاربوونیدا بۆ چەسپاندنی حکوومەتی چینی کرێکار دیکتاتۆری دەسەپێنریٚ.

**دیکته:** نژوە، ڕێنووس، ڤەریس.

**دیکتەکردن:** ڕێنووس شان دان، ڤەکێشاندن. وتن و دیاریکردنی شتیٚ بە کەسێك.

**دیگ ابزار:** بڕوانە: " ادویه ".

**دیگر:** دیتر، ئەوی دیکە، ئەویتر، دن، دی، تر، هم ژی. بێگانە، غەوارە.

**دیگربار:** جارێکیدی، جارێکیدیکە، جاریٚتر، جارێکیتر، دووبارە، دیسان، هەمیسان.

**دیگرخواهی:** ئەوی دی خوازی، ئەویترخوازی، دیترخوازی.

**دیگرشدن:** گۆڕان، گۆڕیان.

**دیگرسار:** وەك دیتر، وەك ئەویتر، چەشنیتر، رەنگیتر.

**دیگرگاه:** جاریٚتر، جارێکیتر.

**دیگرگون:** بڕوانە: "دگرگون".

**دیگری:** کەسیدی، کەسێکی دی، کەسێکی تر.

**دیلماج:** پەرچڤ، وەرگێڕ.

**دیم:** (د) روخسار، سەروسیما، دەم و چاو.

**دیمومت:** دەوام هێنان، تاقەت هێنان، بەردەوامی هێنان، هەمیشەیی، بەردەوامی.

**دیمی:** 1) دێمی، چاندراوی دێم. 2) هەرەمەکی، گۆترەیی. 3) بەبێ بیرکردنەوە یان بەرنامەڕێژی. 4) بەبێ بەڵگە یان پێشەکی پێویست. 5) بەبێ پەروەردە و بارهێنانی پێویست.

**دین:** (دِ) 1) ئایین، دین، خواپەرستی. 2) ناوی رۆژی بیست و چوارەمی هەر مانگێکی ساڵی هەتاوی. "**دین بە(بهی)**": ئایینی زەردەشت. "**دین ورزیدن**": بەپێی بنەماکانی ئایینی هەڵسوکەوت کردن. "از **دین برگشتن**": هەڵگەڕانەوە لە ئایین.

**دین:** (دَ) قەرز، وام. "**دین بر گردن کسی بودن**": قەرزداربوونی ئەو. "**زیر دین کسی رفتن**": قەرزداری ئەو بوون.

**دینامو/ دینام:** دینامۆ، دەزگای بەرهەمهێنەری وزەی کارەبا. مرۆی پرجووڵە، مرۆڤی پڕ جموجۆڵ.

**دینامومتر:** لە زاراوەی فیزیادا: وزەپێو، ئامرازێ بۆ ئەنازەگرتنی رادەی وزە.

**دینامیسم:** تیۆرییەکی فەلسەفییە لەسەر ئەم بنەمایە کە دنیا لە وزە و هێز پێك هاتوە و لە ناو توخمە ماددییەکان دا تەنیا بروای بە هێز و وزە هەیە.

**دینامیك:** بزوێنەر، وزەیی، زانستی جووڵەی شتەکان بە هۆی وزەی کارەبا.

**دین پرور:** لایەنگر و پەرەپێدەری ئایین، وزەدەر و بەهێزکەری ئایین.

**دین پژوه:** ئایین ناس، ئایین توێژەر، پەیجۆری ئایین، خواپەرستی راست.

**دین پناه:** پشت و پەنای ئایین، لایەنگری ئایین.

**دین پیرایی:** رێفۆرماسیۆن.

**دیندار:** خاوەن ئایین، بەئایین، بەدین، خواپەرستی راست، کەسێ کە رێساویاساکانی ئایین جێبەجێ بکا.

**دینکرت/ دینکرد:** کاروبارە ئایینییەکان، کۆمەڵێك زانیاری سەبارەت بە رێسا و بنەما و نەریت و رەوایەتەکان و ئەدەبیاتی ئایینی مەزداپەرستی بە زمانی پەهلەوی.

**دین مدار:** ئایین تەوەر.

**دینی:** 1) بەئایین، بەدین، باوەڕدار، لەخواترس. 2) ئایینی، رۆحانی. 3) تەرکەدنیا.

**دیو:** دێو، درنج، بوونەوەرێکی خەیاڵییە کە لە ئینسان دەچێ و جەستەیەکی زەبەلاح و ناحەز و ترسێنەری هەیە.

**دیوارنویسی:** نووسینی دروشم و پەیام لەسەر دیوار.

**دیواره:** وەك دیوار، دیوارئاسا، هەرشتێ کە لە دیوار بچێ.

**دیوان:** 1) دیوانی شێعر. 2) دادگە، خانەیدادپەروەری. 3) دەفتەرخانە، ئیدارەی ژمێریاری دەزگای دەوڵەت. 4) خەزێنەی دەوڵەت. 5) بارەگا. 6) شکایەت. 7) دیوان. "**دیوان سیاه (سیه)کردن**": تووشی گوناحی زۆربوون. "**دیوان عالی کشور**": دیوانی بەرزی وڵات.





**دیوان استیفاء:** بەڕێوەبەری یان شوێنێ کە ماڵیات یان داهاتەکانی تێدا کۆدەکەنەوە.

**دیوان بلخ:** هەر دادگایەك کە بڕیارەکانی بەپێچەوانەی دادپەروەری دەربکا.

**دیوان تمیز:** بڕوانە: "دیوان کشور".

**دیوا نخانه:** خانەی دادپەروەری، خانەی راژۆر، جێگەی دادوەری و بڕیاردان.

**دیوان داوری:** دادگا.

**دیوان سالار:** بوروکرات.

**دیوان سالاری:** بوروکراسی.

**دیوان سیاه:** تاوانبار، گوناحکار.

**دیوان قضاء:** ئیدارەی بەڕێوەبردنی بڕیارە شەرعی‌یەکان.

**دیوان کشور:** دیوانی وڵات، دادگەی بەرز کە بە دوایین بڕیار دا دەچێتەوە.

**دیوانگی:** شێتی، شێتایەتی، دینی، لێوەیی، دەلویی، ئاهۆ. کار یان کردەوەی ناماقووڵ و نابەجێ. ئیشق و هۆگری زۆر. هاری.

**دیوان محاسبات:** بەڕێوەبەرییەك لە وەزارەتی دارایی کە بە حیسابە گشتییەکانی وڵات دا دەچێتەوە.

**دیوانه:** 1) وەك دێو، دێوئاسا. 2) شێت، دین، زرئاپ، لیوە، لێوە، لیڤە، سادار، دێڤونە، دەلو، مانیاق، بێئاوەز. 3) ئاشق، زۆر تامەزرۆ و هۆگر. 4) هار، تووشبوو بە هاری.

**دیوانه‌خانه:** شێتخانە، دینگە. شوێنی شلووق و ئاڵۆز.

**دیوانه‌سار/ دیوانه‌سر:** خۆسەر، لاسار، سەرەڕۆ.

**دیوانه‌شدن:** شێت بوون، لیوەبوون، بێ ئاوەزی.

**دیوانه‌وار:** شێتانە، وەك شێتان، کاری شێتان، دەلوکار.

**دیوانه‌وش:** بڕوانە: "دیوانەوار".

**دیوانی:** دەپێوەندی لەگەڵ رێکخراوە دەوڵەتی و بەڕێوەبەرییەکاندا. 2) کارمەندی دیوان. 3) دەوڵەتی، یاسایی.

**دیوباد:** 1) بڕوانە: "گردباد". 2) بریتی لە ئەسپی تیژڕۆ و خۆشبەز.

**دیوپتریك:** لە زاراوەی فیزیادا: باسی شکانی نوور.

**دیوث:** جاکەش، دەوییت، قورمساغ، گەوواد، پیاوی بێغیرەت.

**دیوجان:** 1) دەروون ناپاك، بەدنیهاد، بەد نەفس، شەیتان سفەت. 2) سەگمەرگ، گیان سەخت، پیر و گەڕاوە.

**دیودل:** دڵ رەش، دڵ رەق، دڵ چەپەڵ، بێبەزەیی. بە مانای ئازا و دلێریش هاتوە.

**دیوزاد:** لە دێو بوو، دێو نەژاد، بەچکەی دێو. و بریتی لە ئەسپی زەلام و بە تاقەت.

**دیوزاده:** بڕوانە: "دیوزاد".

**دیوزد/ دیوزده:** بڕوانە: "دیوانە".

**دیوسار:** دێوانە، وەك دێو، دێوی، کاری وەك کاری دێو، بەدخوو، تووڕە و تۆسن، ناحەز و خوودزێو.

**دیوسالار:** دلێر، نەترس، دلێر و بەدخوو وەك دێو.

**دیوسرشت:** ڕەوشت دێو، دێو نیهاد، دەروون پیس، دڵ پیس، بەدخوو، بەدڕەوشت.

**دیوسیرت:** بڕوانە: "دیوسرشت".

**دیوسیما:** ڕوخسار دێو، سەروسیما دێو، کەسێ کە چڕوچاو و لەشی وەك دێو وابێ.

**دیوکده:** شوێنی دێو.

**دیوکردار:** ئەوەی کردەوەکانی لە کردەی دێو دەچێ، بەدکار، ئاکارناحەز.

**دیوگاه:** بڕوانە: "دیوکده".

**دیولاخ:** جێگەی دێوەکان، دەشتی پان و بەرین و ترسناك و دوور لە ئاوایی.

**دیومردم:** بریتی لە خەڵکانی بەدخوو و بەدکردار و شەیتان سفەت.

**دیومنش:** دێو سرشت، ڕەوشت دێو، بەدخوو، گومڕا، لاڕێ.

**دیون:** کۆی"دین"، قەرزەکان.

**دیونتولوژی:** ڕێبازی پابەندبوونی ئەخلاقی.

**دیویزیون:** دابەش، بەش، پشك، لەشکر.

**دیویسنا:** لە ئایینی زەرتوشتیدا: دێو پەرست، پێڕەوی ئایینی پووچ، بەرامبەری"مزدیسنا".

**دیه:** سەربەها، خوێن بایی.

**دیهیم جو:** کەسێ کە خوازیاری تاج و تەختی پاشایەتییە.

# ذ

**ذائب:** تواوە.

**ذائق:** چێژەر، تامکەر، خوێچەژ.

**ذائقة:** 1) هەستی چێژپێکردن. 2) تامی زار. 3) جۆری بەریان یان تێڕوانین، سەلیقە، پەسند.

**ذابح:** سەربڕ، گەرووبڕ. قەسساب.

**ذابل:** ژاکاو، شەمزاو، چرچ و لۆچ بوو، وشك هەڵاتوو، کزولاوازبوو.

**ذات:** 1) مێینەی "ذو"، بەمانای خاوەن، مالك. 2) جەوهەر و هەقیقەتی شتێك، بوونی رەها، بوون. 3) دەروون، سرشت، سروشت. 4) خود. 5) خوداوەند. "**اسم ذات**": (رێزمان) ناوی سەربەخۆ.

**ذاتاً:** هۆرا، لەخۆیدا، لەخۆیەوە، بەشێوەی سروشتی.

**ذات البين:** نێوان دووکەس یان دوو گروپ، ئەوەی لە نێوان دوو کەس دابێ لە چاکە یان خراپە، ناوبژیوان، دوولایەنە.

**ذات الجنب:** سەتلێ و جەم.

**ذات الريه:** هەوکردنی سییەکان، سینەپاڵوو، نەخۆشی سی، سیەسۆ، نەخۆشی سی، ماسینی سییەکان، "تێنۆمۆنی".

**ذات الشمال:** لای چەپ، دەستی چەپ.

**ذات الصدور:** بیرۆکەکان، رازەکان، نیازەکان.

**ذات اليد:** سامان، دارایی. دەست رۆیی.

**ذات اليمين:** لای راست، دەستی راست.

**ذاتی:** خۆیی، خودی، دەروونی، ناخی، سرشتی، جەوهەری. ئەوەی لە جەوهەری شتەکان جیانییە. "**عصب ذاتی**": خۆییەدەمار.

**ذاجل:** ستەمکار، زاڵم.

**ذاکر:** ستایشکەر، وەبیرهێنەوە، یادکەر.

**ذاکره:** بیر(گە)، یاد، هۆش.

**ذاهل:** فەرامۆشکار، لەبیرکەر.

**ذبح:** (ذَ) سەربڕین، قورگ بڕین.

**ذبح:** (ذِ) کووژراو(ە)، سەربڕاو، قورگ بڕاو.

**ذبذبه:** دوودڵێ و سەرلێشێوان و واق ورمان. جووڵانەوەی شتێ بەحەواوە، لەرینەوە.

**ذبل:** وشك هەڵاتن، ژاکان، سیس بوون و لەگەشەکەوتنی گیا.





**ذبيح:** قورگ بڕاو. ئاژەڵێ کە بۆ کوشتنەوە و قوربانی کردن بشێ. نازناوی سمایل کوڕی حەزرەتی برایم.

**ذخاير:** کۆی "ذخیره".

**ذخيره:** پاشەکەوت، پەسمەندە، ئەوەی بۆ رۆژی مبادا رایدەگرن، ئەوەی کە بۆ کاتی پێویست ئامادەی دەکەن. جێگرەوە(بازیکن ذخیره). "**ذخیرەشده**": پاشەکەوت کراو، پەسمەندەکراو، ئەنبارکراو.

**ذخیرەسازی:** 1) پاشەکەوت کردن، پەسمەندەکردن. 2) (کامپیۆتێر) سەیڤ کردن، پاراستن.

**ذرات:** کۆی "ذره"، گەردیلەکان.

**ذرع:** یەکەیەکی پێوان بەرامبەر بە 104 سانتیمیتر. "**ذرع شاه**": یەکە پێوانی درێژایی بەرامبەر بە 112سانت. "**ذرع کردن**": ئەنازەگرتنی درێژایی شتێ، میترکردن.

**ذروه:** بڵێندایی، تروپك، جێگەی بڵێند وەك لوتکەی کێو، ئەوپەڕی.

**ذره:** 1) گەردیلە، هەر شتێکی زۆر ورد، تۆز. 2) کەمێ، پاژێ. "**ذرەای**": گەردیلەیی. "**ذرَە بنیادی**": گەردیلەی سەرەکی، گەردیلەیەك کە گەردیلەی تری لێنەبێتەوە وەك ئێلێکترۆن و پرۆتۆن. "**ذرەذرَە**": کەمەکەمە، وردەوردە، برەبرە. هەموو گەردیلەکان، گشت شتەکان.

**ذرەبین:** هوورك بین، گەردیلەبین. "**ذرەبینی**": گەردیلەیی، بوونەوەر و شتی زۆر ورد کە تەنیا بە هورك بین ببینرێن. "میکرۆسکۆپی". "**زیر ذرەبین بودن**": لەژێر پشکنین و لێکۆڵینەوەدابوون.

**ذرەپرور:** ئەوەی خەڵکانی لاواز و نزم و ژێردەستانی خۆی پەروەردە بکا و بە پلە و پۆستێکیان بگەیەنێ.

**ذرەسان:** وەك گەردیلە، گەردیلەئاسا، سووك و لاواز.

**ذریع:** 1) خێرا، فرز، تیژڕەو. 2) تکاکار، رەجاکەر.

**ذریعه:** 1) هۆ، بیانوو، ئامراز. 2) نامە، نووسراوە.

**ذریه:** نەوە، وەچە، رۆڵە.

**ذکاء:** زیرەکی، زرینگی.

**ذکات:** سەربڕینی گا و مەڕ و ئەو ئاژەڵانەی دی کە گۆشتەکەیان حەڵاڵە.

**ذکاوت:** بیرتیژی، وشیاری، زیرەکی. مشوور.

**ذکر:** (ذَ 1) پیاو، نێر، نێرینە. 2) کێر.) باشترین جۆری ئاسن و مس.

**ذکر:** (ذِ 1) باسکردن، ناوبردن. 2) دەربڕین، شیکردنەوە 3) یاد، بیرکردنەوە. 3) ناوبانگ. 4) خوێندنەوەی نزا یان ویرد. 5) فاکتۆر، لیست. 7) بڕوانە:"موعظە". "**ذکر جمیل**": باسی باشییەکانی کەسێك لە نەبوونی ویدا، زکری خێر". "**ذکرشده**": باسکراو، ناوبراو. "**ذکرکردن**": 1) دەربڕین، شیکردنەوە.

2) دووپاتكردنەوەی نزا یان ویردێك. **"ذكرگفتن"**: دووپاتكردنەوەی نزا یان ویردێك. **"ذكرمصيبت"**: باسكردنی بەڵا و كوێرەوەرییەكانی ئیمامەكان.
**ذكرى**: وەبیرهاتنەوە، بیرەوەری، یادكردنەوە.
**ذكور**: پیاوان، كوڕان. نێر، نێرینە.
**ذكوراً**: لە رەگەزی پیاو یان كوڕ.
**ذكى**: زیرەك، زرینگ، وشیار.
**ذلاقت**: زمان پاراوی، قسەزانی، دەماوەری.
**ذلالت**: زەبوونی، داماوی، نزمی و پەستی. نەبوونی ڕێز و نرخ لای دیتران.
**ذلت**: داماوی، پەستی و زەبوونی.
**ذله**: داماو، وەزاڵەهاتوو. **"ذلەكردن"**: بڕوانە:"ستوهاندن".
**ذليل**: داماو، زەبوون.
**ذمَ**: بەدگۆیی، خراپەوتن، فڕ، زەم.
**ذماء**: بزووتن، جووڵان. دواهێز، دوایین پەلەقاژە.
**ذمارت**: ئازایەتی، بوێری، دلێری.
**ذمه**: 1) وادە، پەیمان، بەڵێن. 2) وە ئەستۆگرتن. 3)(مافناسی) دەرەنجامێ كە لە دەروەستی دەكەوێتەوە. **"ذمە كسی بری بودن"**: ئەنجامدانی ئەرك و دەروەستییەكانی و لە ئەستۆ نەبوونی قەرز. **"بر ذمە كسی بودن"**: لە ئەستۆی ئەو دابوون. **"بە ذمە (برذمە)گرفتن"**: لەئەستۆگرتن، دەروەست بوون.
**ذمَى**: كەسانی غەیرەموسوڵمان كە لە كۆمەڵگای ئیسلامیدا دەژین.
**ذميم**: ناحەز، دزێو، ناپەسند.
**ذنابت**: خزمایەتی.
**ذنابه**: پێڕەو، پاشكۆ، كۆتایی شتێ.
**ذنب**: گوناح، تاوان.
**ذو**: خاوەن، مالك.
**ذواد**: بەرگریكەر، لایەنگری هەقیقەت.
**ذواق**: چەشتن، تامكردن، تام تاقیكردنەوە.
**ذوب شدن**: تاوان، تاویان، تاوین، تاوینەوە، تاویانەوە، توانەوە، تاونای، هەلین، هەلیان، هلەیایش، قاڵبوون، حەلبوون، خێوران، بوونەئاو. **"ذوب شدن برف"**: بەفرچوونەوە، بەفرتوانەوە.
**ذوب كردن**: تاواندن، تاواندنەوە، تاوانن، تواندنەوە، توانەوە، حەلاندن.
**ذوب كننده**: تاوێن، توێن، توێنەوە، تاوێنەوە.
**ذوجنبتين**: دوولایەنە.
**ذوحق**: خاوەن هەق، هەقدار.
**ذوحيات**: زیندوو، گیاندار.
**ذوحياتين**: وشكاوی، دووژینە.
**ذوذنب**: پاشڵ دار، كلك دار.
**ذورأى**: بەتەگبیر و را.





**ذوفنون**: كەسێك كە لەچەند رشتەی زانستی و هونەری و پیشەییدا پسپۆڕی هەیە.
**ذوق**: 1) توانایی و بەهرەوەرگرتن بۆ فێربوونی شتێ یان تێكنیك یان پیشەیەك و خەریك بوون پێیەوە. 2) هەستی چێژپێكردن. 3) تام، چێژ، چەژ. 4) خۆشی، حەز، زەوق. 5) بڕوانە: "اشتياق". **"ذوق سليم"**: توانایی دەست نیشان كردنی دروستی لەسەرتربوونی بەرهەمی هونەری و ئەدەبی و شتی وا لەسەریەكتر. **"ذوق كردن"**: خۆشحاڵ بوون، شادبوون. چێشتن، چەژتن. **"ذوق وشوق"**: هۆگری و زەوق و تاسەی زۆر. **"توی ذوق زدن"**: لە زەوق دان. **"ذوق زده"**: فرە شاد و خۆشحاڵ.
**ذهاب**: 1) ڕۆیشتن، تێپەڕین، نەمانەوە لە شوێنێ. 2) لەناوچوون، سڕانەوە. 3) ڕێگەیەك كە دەگرێتە پێش.
**ذهن**: زەین، مێشك، بیر، هۆش. ناخ، دەروون.
**ذهن گرايى**: زەین گەرێتی.
**ذهنى**: 1) زەینی، جێگرتوو لە زەین دا، پێكهاتوو بەهۆی زەین، بەبیر، بیرەكی. 2) ناخی، دەروونی. 3) تایبەتمەندی كردەیەك كە بەبێ كەڵك وەرگرتن لە پێنووس و تێنووس لە زین دا ئەنجام دەبێ. **"وجودذهنى"**: بوونی شتێك لە زەیندا.
**ذهنيت**: زەینییەت، زەینیبوون. جۆری تێفكرین یان ڕوانگە یان داوەریكردن.
**ذهول**: بڕوانە:"غفلت".
**ذى حساب**: نوێنەری وەزارەتی دارایی لە دامەزراوەیەكی دەوڵەتیدا.
**ذى**: خاوەن، خودان، مالك.
**ذىحيات**: بڕوانە:"ذوحيات".
**ذى ربط**: پێوەندیدار.
**ذي رفعت**: خاوەنی پلەی بەرز.
**ذيروح**: گیاندار، گیانلەبەر.
**ذى سهم**: بڕوانە:"سهيم".
**ذى صلاح**: خاوەن دەسەڵات، خاوەن سەلاحییەت.
**ذى فن**: خاوەنی فەن، پسپۆڕ لە كارێكدا.
**ذى قيمت**: بەنرخ، گرانبایی.
**ذيل**: ژێر، ژێرەوە، داوێنی هەر شتێ. پایەنزم.
**ذيلاً**: لە درێژەی، دوای ئەم بابەتە، لەژێرەوە.
**ذى نفع**: قازانجبەر، بەهرەبەر، سوودمەند.

# ر

**رائـد:** 1) سـیخوڕ، زوانگـر، خەبـەر بەزێن، زیرەڤـان، زمـانگر. 2) نێـردراو لە لایەن کەسێکەوە. 3) پێشەنگ.

**رابـح:** 1) قـازانج بـەر. 2) بەسـوود، بەکەڵك، خێردەرەوە.

**رابـض:** 1) نـیشتەجێ، ئـاکنجـی. 2) شێری دڕننە.

**رابـط:** پێوەنـدەر، گەیەنـەر، نێونجیکەری نێوان دوو کەس یـان دوو شت، نێوبژیوان.

**رابطـه:** 1) کۆمەڵـە کـردار و پەرچەکردارێکی دوولایەنە. 2) پێوەنـدی، هـۆگری نێوان دوو کـەس یـان دوو شـت. 3) خاڵی هاوبەشـی نێـوان دوو یـان چـەند شت یان بابەت کە دەیانخاتە پاڵیـەك یـان دەیانخاتە وتەزایەکـەوە. 4) لـە ڕیزمانـدا: وشـەیەك کـە "مـسند" و "مـسندالیه" پێکـەوە پێوەنـد دەدا. 5) لـە مافناسـیدا: بەسـتراوەیی حوقـووقی دوو یـان چـەند کەس بە یەکتر. 6) لە بیرکاریدا: هاوکێشە یان ناهاوکێشە یان دەربڕینی بیرکاری هەر تایبەتمەندییـەکی نێـوان چـەندایەتییەکان یان نیـشانەکانی بیرکـاری. 7) پێوەنـدەر. "**رابطـەجنـسی**": پێوەنـدی سێکـسی. "**رابطـەداشتن**": هەبوونی پێوەندی. "**رابطـە محرمانـە**": خلێنەوبلێنـە، کـەین و بـەین، خرتـیوپرتـی، پێوەنـدی نهێنـی. "**رابطـە نامشروع**": پێوەنـدی نایاسـایی، پێوەنـدیی نـاڕەوا، پێوەنـدی پێـچەوانەی شـەرع. "**در این رابطـە**": لەم پێوەندییەدا، لـەمبارەوە. "**در رابطـە بـا**": دەپێوەنـدی لەگـەڵ، سەبارەت بە، لەمەڕ، لەبابەت.

**رابە:** زڕدایك، زڕداك، باوەژن.

**رابیس:** هاری.

**رابیە:** تەپۆڵکە، گرد، زەوی بڵیند.

**را پـرت:** راپـۆڕت، گێڕانـەوە، خەبـەری ڕووداو، قسەبردن، قسەهێنان.

**راتـب:** 1) دایـم، هەمیـشە، نـەبزوو، پـاوەجێ، جـێگیر. 2) مووچـە، مانگانـە، بڕانە.

**راتبەخوار:** مووچەخۆر.

**راتـق و فـاتق:** بەڕێوەبـەر، ئەنجامـدەر. پینەوپەڕۆکەر.

**راتع:** 1) لـەوەڕخۆر، چـەرننە. 2) خـۆش رابوێر.





**راجح:** سەرکەوتوو، بەسەردابوو. لاسەنگ.

**راجز:** بڕوانە: "رجزخوان".

**راجع:** 1) گەڕاوە. 2) ژنـێ کـە شـووەکەی بمـرێ و بگـەڕێتـەوە مـاڵـە بـابـی. 3) سـەبارەت، لـە بـارەی. "**راجـع بـە**": سـەبارەت بـە، لەبابـەت. "**راجـع کـردن**": ڕادەست کردن، پێ سپاردن.

**راجل:** پیادە، بەرانبەری سوارە.

**راجی:** بڕوانە: "امیدوار".

**راحت:** 1) ئاسوودە، ڕەحەت، بێخەم، بە ئیـستراحەت. 2) خۆشـی و شـادی، شادمانی. 3) ئاسوودەیی، بێ خەمی.

**راحـت افـزا:** ئاسـوودەییهێن، زیادکـەری خۆشی و ڕەحەتی.

**راحت شدن:** ئاسـوودەبوون، وچـان گـرتن، حەسانەوە.

**راحت طلب:** ئاسوودەییخواز، ڕەحەتخواز.

**راحت کـردن:** 1) حەسـاندنەوە، حەسـانن، ئاسوودەکردن، بـێخـەم کـردن. 2) گیـان لێسەندن، کوشتن.

**راحـت یـافتن:** چـاك بوونـەوە، خـۆش بوونەوە.

**راحتی:** ئاسوودەیی، تـەناهی، بـێخـەمی، ڕەحـەتی. "**بـە راحتـی**": بەسـانایی، بەراحـەتی، بـەبێ دژواری یـان گیروگرفـت یان ئاڵۆزی.

**راحل:** کۆچکردوو، خوالێخۆشبوو.

**راحم:** لێبوردە، بەخشۆ، دلۆڤـان، خـاوەن بەزەیی.

**راخ:** 1) خەم، خەفەت، مەینـەتی، کـوڵ و کەسەری زۆر. 2) گومان.

**راد:** 1) بەرچـاوتێر، دڵاوا، دەس ڤـەکری، بەخشەندە، جوامێر. 2) زانا، ژیر، خاوەن ئاوەز. "**رادی**": دڵاوایی، ڕەندی، جوامێری، ئازایەتی.

**رادع:** لەمپـەر، بەرهەڵـست، کۆسـپ، تەگەرە، چەت.

**رادکار:** دایـندە، دڵاوا، بـەدڵ، سـەغی، بەرچـاوتێر، نوخـافتۆخ، نـان بـدە، جوامێر، مێرخاس.

**رادکاری:** دڵاوایی، بەخـشەندەیی، نـان بدەیی، جوامێری، پیاوەتی.

**رادمـرد:** جـامێر، جـوامێر، پـیگ خـاس، شەهمێر، مەردوڕەند، دلێر، ئاوەزمەند.

**رادمـنش:** دڵاوا، بەخـشندە، مێرخـاس، جوامێر. ڕاست بێژ، سەرڕاست.

**رادە:** قازانج، سوود.

**رادیکـال:** رادیکـاڵ، ریـشەیی، بنـەڕەتی، سەرەکی. لە بیرکاریـدا: هێمـای ڕەگ. لـە زاراوەی سیاسەت دا: لایەنگری چاکسازی بنـەڕەتی لـە کاروبـاری وڵاتـدا بـۆ ئاسوودەیی خەڵك.

**رادیکالیـسم:** بنـەما رادیکاڵییـەکان، ئـازادیخوازی بنـەڕەتی، لایـەنگری لـە گۆڕانکارییە بنـەڕەتییـەکان و چاکسازی تەواو لە کاروباری سیاسـی و کۆمەڵایـەتی کـە ببێتـە هـۆی ڕەخـسانی بەرابـەریی کۆمەڵایەتی و لابردنی گەندەڵییەکان.

**رادیواکتیو:** توخمی تیشکدەر.

**رادیوتراپی:** تیشك دەرمانی.

**رادیوسکوپی:** سەحکردنی ئەندامانی لەش بە "ریون ئیکس" بۆ دەست نیشان کردنی نەخۆشی.

**رادیوگرافی:** بڕوانە:"پرتونگاری".

**رادیولوژی:** تیشك ناسی، زانستی کەڵك وەرگرتن لە تیشکی نادیار بۆ دەست نیشان کردن و چارەسەری نەخۆشییەکان.

**رادیولوژیست:** تیشك ناس، کەسێ کە لە دیاریکردن و چارەسەری نەخۆشییەکان بە تیشکی نادیار شارەزایە.

**راز:** سوڕ، سڕ، راز، نهێنی، مەلامەت. "**رازکردن**": 1) نهێنی وتن، گوتنی سڕی خۆت بە کەسێك. 2) سەلاکردن. 3) پچە پچ کردن. 4) داشاردن، شاردنەوە. "**رازگشادن**": ئاشکراکردنی نهێنی، خویاکردنی راز. "**رازگفتن**": قسەی نهێنی کردن دەگەڵ کەسێك، دەرخستنی نهێنی، سپاردنی رازێ بە کەسێك، سرتەسرت کردن. "**رازنهانی**": دڵدزی، نهێنی دڵ.

**رازبان:** رازدار، رازپارێز، رازڤان.

**رازدار:** رازگر، رازڤان، رازدار، رازیار، سوڕهەڵگر، پەردەپۆش، ئەمین بۆ سوڕ نەدرکاندن، هاودەم، هەڤاڵی نزیك. "**کسی که رازدار نیست**": زاربەهاوار.

**رازدان:** نهێنی زان، ئاگادار لە نهێنییەکان.

**رازق:** رۆزی دەر، بژیوگەیەن.

**رازقی:** بێهێز، سست. جۆرێ ترێ. گوڵێکی سپی بۆنخۆشە.

**رازنگەدار:** بڕوانە:"رازدار".

**راز و رزی:** عیرفان، سۆفیگەرێتی، دەروێشی، mysticism.

**رازونیاز:** سکاڵا، رازونیاز، وتووێژی خۆشەویستانە. "**رازونیازکردن**": هێنانەگۆڕی راز و نیازی خۆت دەگەڵ کەسێك، دەردەدڵ کردن، نزا و مناجات کردن.

**رازین:** شاراوە، نهێنی.

**راژ:** کۆما، خرمانی دەخلۆدان.

**راسب:** نیشتوو، خلتەوپلتە. دەرنەچووی تاقیکردنەوەکان.

**راست:** راست، بەرانبەری چەپ. راست و دروست، پێچەوانەی درۆ. رێگەی بێ پێچ. یەکسان، تەواو، کامڵ.

**راست آوردن:** سەروبەرکردن، دروست کردن و خستنەڕێ.

**راست آیین:** راست پیشە، کەسێ کە راستی و دروستی دەگرێتەبەر.

**راستا:** راست، پێچەوانەی لار. لای راست. رێگەی تەخت و بێ پێچ. پێناو، دەرحەق، بوار، ئاقار، راستا.

**راستاحسینی:** راست و دروست و بێ فرتوفێڵ، سادە و بێ ڕووبینی.

**راستاد:** 1) جیرە، مووچە، مانگانە. 2) رێکوپێك. 3) بەڕێوەبەر، کارگێڕ، سەرپەرشت.





**راستادی:** راستی، راستێتی.

**راست انداز:** نیشانە ئەنگێو، تیرهاوێژی کارامە.

**راست باز:** کەسێ کە بێفرتوفێڵ کایە بکا.

**راست بالا:** خۆش قەلافەت، بەژن و بالا بەرز.

**راست بر:** 1) بە رێگای راست دابەر، ئەوەی کەسێکی دی بە رێی راست و دروست دا رێنوێنی دەکا. 2) راست پاڵوو، شکلێکی هێندسی کە تەواوی لاکانی بەرابەر و هاوتەریب بێ.

**راست بین:** هەقیەقت بین، لایەنگری هەق و هەقیقەت. کەسێ کە چاوی راست و دروست ببینێ، پێچەوانەی خێل.

**راست پا:** راوەستاو، لەسەرپێ.

**راست پهلو:** راست پاڵوو، یەکسان پاڵوو.

**راست پیوند:** پێوەندی راست و دروست، پێوەندی پتەو.

**راست تك:** راستەوڕێڕۆ، ئەوەی رێك و راستەوخۆ بڕوا.

**راست خانه:** کەسێ کە بناخەی ژیانی لە سەر راستی و دروستی بێ، ئەوەی دەگەڵ هەموو کەس سەرڕاستە، راست بێژ. بریتی لە هەر شتێکی راست و دروست.

**راست داشتن:** بە راست زانین، بڕواهێنان بە قسەی کەسێك. سەروبەرکردن، رێکوپێك کردن، یەکسان کردن.

**راست درآمدن:** سازگاربوون، هاوئاهەنگی پەیاکردن، بە یەك ئەنازە دەرهاتن، جۆر دەرهاتن.

**راست دل:** دڵپاك، دڵساف، دڵ سادە، بێفرتوفێڵ.

**راستر:** راست تر، دروست تر.

**راست راستکی:** راستەقینە، بەڕاستی.

**راست رو:** 1) بڕوانە:"درستکار". 2) راست رەو، ئەوەی کە بە رێگەی راست دا بڕوا، ئەوەی لاڕێ نەچێ، لانەدەر. 3) ئاسان، سانا.

**راست روش:** شێواز راست و دروست، هەڵسوکەوت دروست، ئەوەی بە رێگەی راست دا بڕوا و لاڕێ نەبێ، پێچەوانەی رەفتار چەوت.

**راست روشن:** بڕوانە:"راست روش".

**راست ساختن:** 1) راست کردنەوە، لاری لێبڕین. 2) ئامادەکردن.

**راست ساز:** راست کەرەوە.

**راست شدن:** 1) راست بوونەوە، راستەوبوون، هەستانە سەر پێ، رابوون، خێزیان، وێستان. 2) لە خواری رزگار بوون. 3) راست و دروست دەرهاتن، بە هەقیقەت پەیوەست بوون. 3) سازگاربوون، ساز بوون، رێکخران.

**راست شمردن:** بڕواهێنان، باوەڕکردن، بە راست و دروست زانین.

**راست طبع:** تەڕفام، بەزەوق، خاوەن سەلیقە، بەسەلیقە.

**راست عهد:** لەسەر پەیمان، پەیمان دروست.

**راست عیار:** تەواو عەیار، زێڕی بێخەوش، راست و دروست.

**راستکار:** راستکار، راست کردار، کار دروست، مرۆی بێلاری و خواری، بێگزی و دزی.

**راست کردن:** 1) راست کردنەوە، راستاندن، لە خواری رزگار کردن، تەخت کردن. 2) دامەزران، بەرپاکردن، هەلّدان. 3) سازکردن، ئامادەکردن، رێکوپێك کردن.

**راستکی:** بەڕاست، راستەقینە.

**راست کیش:** راست ئایین، ئەوەی بڕوای ئایینی راست و دروستی هەیە.

**راستگر:** راست کەرەوە.

**راست گرا:** راست رەو، سەربە راست، کەسێك کە بیروبۆچوونی راستی هەبێ، ئەندام یان لایەنگری قۆلّی راست.

**راست گرایی:** راست رەوی، راستگەرێتی.

**راست گردان:** مەیلەوڕاست، وەرسووڕاو بۆ لای راست.

**راست گفتار:** راست بێژ، راست وێژ، راست رۆ، کەسێك کە گوتارەکەی راست و دروست بێ.

**راست گفتن:** راست کردن، راست کوتن/گوتن، درۆنەکردن لە قسەکردن دا.

**راستگو(ی):** راست بێژ، راست وێژ، قسەڕاست، راست دەر، راست رۆ، راست رەو، رێوار، رێڕەو، درۆنەکەر، بەرامبەری درۆزن.

**راست گوشه:** لاکێشە. شکلێ کە گۆشەی نەوەد دەرەجەی هەبێ.

**راستگویی:** راست بێژی، راست وێژی، راستگۆیی، پیشەی راستگۆ.

**راسته:** 1) سەربە راست، "ڕاست"ی بەرامبەر چەپ. و راست" ی بەرامبەر بە خوار. و "ڕاست"ی بەرامبەر بە درۆ. 2) رێگەی راست و بێ کەندوکلۆ، تەخت. 3) ریز، سەف، شەمەندەفەر. 4) چەشن، جۆر. 5) گۆشتی مۆغەرەی پشت، پشتەمازە.

**راستەبازار:** چوارسوو، راستەبازاڕ، قەیسەری.

**راستی:** 1) راستی، دروستی، پێچەوانەی درۆ. 2) راست بوون، بەرامبەر بە لاری و چەماوەیی. 3) لای راست بوون، بەرانبەری چەپ بوون. "**راستی راستی**": لەڕاستیدا، بەڕاستی.

**راستین:** راستەقینە، راستەقانی، بەڕاستی.

**راستین نمایی:** ریالیزم.

**راستینه:** بڕوانە:"واقعیّت".

**راسخ:** شێلگیر، نەگۆڕ، پتەو، قایم، تۆکمە، پایەدار، جێگیر، دامەزراو. زۆرزانا،

**راسم:** نەخشێنەر، نیگارکێش، واژۆکەر، مۆرکەر. ئاوی رەوان.

**راسی:** پتەو و راوەستاو، قایم و خۆڕاگر.

**راسیسم:** (سیاسی) سیاسەت یان تیۆری رەگەزپەرستی لەسەر بنەمای لەسەرتر بوونی نەژادێ بەسەر نەژادێکی‌تردا، دەمارگرژی نەژادی، نەژادپەرستی.





**راسیسم ستیزی:** دژەنەژادپەرستی.

**راسیونالیسم:** ئاوەزخوازی، رێبازی ئەقلّی، رەسەنایەتی ئاوەز.

**راشح:** 1) نمدەر، دەلّێن، ئاودادەر، شتێ کە تەڕایی دەداتە دەر. 2) ئەو چۆڕە ئاوەی کە بە لە لابەلای بەردەکان دا دەڕوا. 3) پالاوتە.

**راشد:** بە رێگەی راست دا چوو، کەسێك کە بە رێگەی راست دا بڕوا. بە رێگە زان، رێناس. بەدین، دیندار، لە خواترس.

**راشی:** بەرتیلدەر.

**راشیتیسم:** نەخۆشی نەرمی ئێسکەکان کە بە هۆی تێکچوونی مێتابولیسمی کەلسیۆم و فوسفۆر و کەمی ویتامینی "D" دەردەکەوێ، ئێسکەنەرمە.

**راشیتیك:** نەخۆشی تووشبوو بە نەرمی ئێسك.

**راصد:** چاودێر، نگابان، ئەستێرەناسێ کە دەڕوانێتە جموجۆلّی ئەستێرەکان.

**راضع:** شیرەخۆرە، شیرمژ، بەرمەمکان. پیاوی پەست و نزم، بەغیل.

**راضی:** رازی، قایل، قادێ، قاتە، پێخۆش، دلّخۆش، شاد، شادمان. "**راضی شدن**": رازیبوون، رەزامەندی لا، قانع بوون، قایل بوون، مل دان، هاتنەڕەدا، بە قسە کردن، دلّ پێخۆش بوون. "**راضی کردن**": قایل کردن، هێنانەڕەدایە، بەلّیاندن، دلّ بەجێهێنان، هاشت کرن.

**راعی:** 1) پارێزەر، راگر. 2) چاوەدێر، نگابان. 3) رێنوێن، رێبەر. 4) لەوەڕێن، شوان، شڤان. 5) بڕوانە:"حاکم".

**راغب:** خوازیار، خوازەر، داواکار، پێخۆش.

**رافد:** 1) یاریدەدەر، یارمەتیدەر، بەخشەر، دایندە، بدەر. 2) جێنشینی پاتشا. 3) رووبارێ کە بچێتە رووبارێکی‌ترەوە یان بچێتە دەریاوە، زێ.

**رافض:** وازهێنەر، دوورکەرەوە، دوورخەرەوە.

**رافع:** 1) هەلّگرەوە، بلّندکەرەوە. 2) پێشکەشکاری شکایەت بۆ دادخوازی، دادخواز، شکایەتکار. 3) بڕوانە: "جاسوس". 4) هێنەر، گەیەنەر. 5) دامرکێن، وەرهەم بەر.

**راقد:** خەوتوو، نووستوو، راکشاو.

**راقص:** سەماکەر.

**راقم:** نووسەر، نڤیسار.

**راقی:** کەسێك کە پلەکانی زانستی بڕیبێ، خوێندەوار. بلّند، شکۆ.

**راکاره:** سۆزانی، سوزمانی، جندە، خراپە.

**راکد:** راوەستاو، وێستاو، وێستاوە، وەستاو، پەنگ، بەن، مانەوە، چەق، بێبزووتن. "**راکدشدن**": راوەستان، پەنگ خواردن، پەنگەوخواردن. "**آب راکد**": مەن، مەنداو، مەنداڤ، ئاوی راوەستاو.

**راکع:** چەماوە، چەمیوەوە، بە ئەژنۆداهاتوو. سەردانەوێن، خۆشکێنی‌کەر.

**رام:** دەستەمۆ، دەسەمۆ، دەسازۆ، کەوی، کەدی، کدی، فێر، خووگرتوو، راهاتوو، حەمایەت، رام، ملکەچ، پێچەوانەی توورە و تۆسن و سەرکێش. "**رام شدن**": ڤەپسکان، ڤەپسکین، ڤەپسکیان، بەردەست بوون، هاتنەژێرفەرمان، هاتنەژێربار، هاتنەبەربار، ملدان، رام بوون، کەویبوون، لە سڵی دەست هەڵگرتن، داهاتن. "**رام شده**": دەسازۆکراو، دەسەمۆکراو، کەوی کراو، لە سڵی داتەکاو، رام بوو، رام بووگ. "**رام کردن**": ڤەپسکاندن، دامۆچانن، دەستەمۆکردن، رام کردن، هێنانەژێربار، راهێنان، داهێنان، ماڵیکردن، کەویکردن، کەدیکردن، حەمایەت کردن.

**رامش:** ئاسوودەیی، هێمنایی، ئۆخژن. بە مانای سروود و گۆرانی و کەیف و چێژ و شادییش دێ. "**رامش کردن**": شادیکردن، خەریکی بەزم و شادی بوون.

**رامشگاه:** شوێنی ئاسوودەیی و ئۆقرەیی، شوێنی سەما و رابواردن.

**رامشگر:** بێلتیڤان، چاوەش، لۆتی، گۆبەندگێڕ، زورناژەن، متریب، گۆرانی بێژی داوەت و زەماوەند.

**رامشی:** 1) ژەنیار و گۆرانی بێژ، گۆبەندگێڕ، بێلتیڤان. 2) شاد، دڵخۆش.

**رامق:** 1) هەژار، نەدار. 2) بە ئێرەیی، ئێرەیی بەر، بەخیل، چاوچنۆك، چاڤچنۆك، چاونەزێر.

**راموز:** دەریا. سەرچەشن، نموونە.

**رامی:** فڕێدەر، تووڕدەر، هاوێژەر، تیرهاوێژ، بەردهاوێژ.

**رامیار:** شوان، شڤان.

**رانت:** رانت، داهاتێ کە لە هەل و دەرفەتەکانی سەرووتر بەتایبەتی بەکەڵك وەرگرتن لە کەرەسە و ئیمکاناتی دەوڵەتی و بە پاڵپشتی بەرپرسە دەست رۆیشتوەکان وەدەست بێ.

**رانت خواری:** سامان کۆکردنەوە بە کەڵك وەرگرتن لە رانت.

**راندمان:** کاردا، بەهرەی کار، ئەنجامی کار، راندمان.

**راندن:** 1) دەرکردن، وەدەرنان، رواندن، رەداندن، کردنەدەر، لە خۆ دوورخستنەوە، لە خۆ دوور کردن، ناچار بە رۆیشتن کردن، پاڵ پێوەنان، چڤاندن، ولکرن، هەسربیایش. 2) هاژۆتن، هاژۆتاندن، ئاژۆتن، لێخوڕین. 3) خستنە خانەی جێبەجێکردنەوە، بەکردەییکردن. 4) گوتن، نووسین. 5) ئەنجام دان، کردن. 6) وەگەڕخستن. "**راندن با اهانت**": هەڵ تراندن، هەڵ تڕانن، دەرکردن بە سووکایەتی.

**راندوو:** وادەی ژوان.

**رانده:** دەرکراو، دەرکریاگ، وەدەرنراو، دوور خراوە، بەرهەڵداکراو، ولکری.

**ران زدن:** ئەسپ تاودان.

**رانش:** 1 ) رۆچوون. 2) بڕوانە:"اسهال". 3) (فیزیك) پاڵ پێوەنان و دوورکەوتنەوەی دوو یان چەند شت لە یەکتر.





**رانشگاه:** بڕوانە:"مخرج".

**رانندگی:** ئاژۆتن، هاژۆتن، لێخوڕین، رانین. کار و شوغڵی لێخوڕ، شۆفیر، لێخوڕ.

**راننده:** هاژۆر، ئاژۆ، لێخوڕ، رانبار، شۆفیر. ئاسانکەرەوە.

**راوق:** 1) بڕوانە:"پالونە". 2) جامی شەراب. 3) ساف، روون.

**راوق کردن:** پاڵاوتن، ساف کردن.

**راوك:** روون، ئاشکرا.

**راوی:** چیرۆك خوان، بگێڕەوە، گێڕەرەوە.

**راه:** رێ، را، رێگا، رێگە، راگە، رێك. "**راه عمومی**": رێوبان، رێگەوبان.

**راهآب:** بڕوانە:"آبراهە".

**راه آمدن:** پێوانی مەودایەك."**راه آمدن با کسی**": راهاتن دەگەڵی، هەڵکردن لەگەڵی، هاوڕێیەتی و هاوکاریکردن دەگەڵ ئەو.

**راهآموز:** رێنما، رێنوێن، شارەزای رێ.

**راهآورد:** بڕوانە:"رەآورد".

**راهافتادن:** 1) پێگرتن (مناڵ). 2) رێکەوتن، وەرێکەوتن، کەوتنەڕێ، رێگەکەفتن، رێداگرتن. 3) وەگەڕکەوتن، کەوتنەگەڕ. 4) دەسپێکردن بە کارێ یان چالاکییەك. 5) دەسپێکران. 6) بەرپابوون، سەرهەڵدان. 7) شارەزایی پەیداکردن لە ئەنجامدامی کارێکا.

**راهانجام:** پێداویستی سەفەر.

**راهانداختن:** رێخستن، وەڕێخستن، راخستن، خستنەگەڕ، خستنەسەر رێ، رێگەخستن، بەڕێگەدا ناردن، بەڕێکردن، رەوانەکردن، بەڕێکردن. سەروبەرکردن، بەڕێوەبردن. گەیشتن. رێنوێنی کردن، رێبەری کردن. رێگەپێوان، رۆیشتن. "**راه بردن چیزی**": لێخۆڕینی ئەو شتە. "**راه بردن کسی**": یارمەتیدان بەو لە رۆیشتندا. ناچارکردنی ئەو بە رێ رۆیشتن.

**راهاندازی:** وەڕێخستن، خستنەگەڕ.

**راهب:** ترساو، ترسنۆك. رەبیان، دژکام و تەرکەدنیای نەساری.

**راهبان/راهوان:** رێوان، رێدار، رەخدار، ئاگاداری رێگە، نگابانی رێ.

**راهبر:** (بَ) رێبەر، رێنوێن، رێنما.

**راهبر:** (بُ) 1) رێپێو، تیژڕەو. 2) بڕوانە: "راهزن".

**راهبرد:** 1) رێکار، ستراتێژی.2) کردەی تەیارکردن و بەکارهێنانی هێزە و تواناییەکان لە راستای گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو.

**راهبردن:** بەرێدابردن، باوەش کردنی مناڵ و گەڕاندنی. رێگە دۆزینەوە و پێزانین بە شوێنێ یان شتێك.

**راه برون رفت:** رێگەی دەربازبوون/ قوتاربوون.

**راهبریدن:** رێگەبڕین، پێوان، گەشت و سەفەرکردن. پێشگیری لە رۆیشتن.

**راهبند:** 1) بەربەس، لەمپەری سەر رێگە، رێبەندان. 2) رێوان و باج ستێن. 3) دز، چەتە، رێگر.

**راه به جایی نبردن:** چارەنەبوون. بەئاکام نەگەیشتن.

**راەبەراە:** 1) پشت سەرییەك، پەیتاپەیتا.2) هەمووجێییەك. 3) لە کاتی گەیشتن دا، دەزبەجێ. 4) بێ هۆ و کتوپڕ. 5) هێواش هێواش.

**راەبین:** 1) زانا، بەئاگا لە راستی کاروبارەکان. 2) ڕێنوێن، ڕێبەر.

**راەپو:** ئەوەی بەپەلە بە ڕێگایەك دا بڕوا.

**راه پیدا کردن:** ڕێگەچارەدۆزینەوە، چارەدۆزیکردن.

**راەپیما:** 1) ڕێپێو، ڕێچوو، ڕێبوار. 2) تیژڕەو، خۆشبەز.

**راهپیمایی:** ڕێپێوان، ڕێچوون، پیادەڕەوی.

**راەتوشە:** تێشوی ڕێ، بژیوی سەفەر.

**راەجو:** 1) پەیدۆزی ڕێ. 2) شارەزای ڕێ. 3) بڕوانە:"تندرو".

**راه حاجیان:** بڕوانە:"کهکشان".

**راەحل:** ڕێگەچارە، چارەسەر، دەرەتان، ڕێی دەربازبوون.

**راه خفتە:** بریتی لە ڕێگەی دوور و درێژ، جاددەی تەخت.

**راه دادن:** ڕێگەدان بۆ ڕۆیشتن، ڕێگاکردن، ڕێپێدان، ئیزن دان، چوونە لاوە و ئیزنی تێپەڕین بە کەسێك دان.

**راهدار:** 1) نگابانی ڕێ، پارێزەری ڕێ، ئاگاری ڕێگە، ڕێوان، رادار. 2) ڕێ ڕێ، خەت خەت. 3) ڕێگر، چەتە، دز. 4) مەئمووری وەرگرتنی مالیات لە ڕێگەکاندا، باجگری ڕێ.

**راهدان:** بەلەدی ڕێ، شارەزای ڕێ، ڕێزان، ڕێبەر، ڕێنوێن.

**راه دیدن:** بەچاك زانین، بەقازانج زانین.

**راەراە:** ڕێڕێ، خەت خەت، خەتدار، میل میل.

**راه رفتن:** 1) ڕێ ڕۆیشتن، پێوان. 2) هەڵسوکەوت کردن.

**راهرو:** 1) ڕێبار، ڕێبوار، رابگار، ڕێڤنگ، ڕێڤنگی، کەسێ لە ڕێ دەڕوا بۆ سەفەر. 2) دالان، کوریدۆر، راڕەو، راڕەڤ، ڕێڕەو. 3) پێشخانە، کەوشکەن، کەرەوەت.

**راەزدن:** تالان کردنی کەلوپەلی ڕێبوارانی ناو ڕێگا. سروود خوێندن و لێدانی ئاهەنگی مووسیقا.

**راهزن:** 1) چەتە، ڕێگر، ڕێگیر، راگر، راگیر، ڕێبڕ، رابڕ، رادار، گۆران، جەردە، کەلگیر، کەلەشەی، تەیرە، تەریدە، خەراوەکەر، خەراوەکار، خراپە، پیاوخراپ، دزگەردەنە، ملەزەن، هایدووت، سەرملەگیر، کەلەشە، کەلەشەی، کەلیشۆ.2) تالانکەر و رفێنەر و لەناوبەر. 3) گومڕاکەر، بەلاڕێدابەر. **"دستە راهزنان"**: نژدە، نژدی، دەستەی ڕێگران. **"رئیس راهزنان"**: سەرتەریە، سەرتەریدە، گەورەی دەستە ڕێگران.





**"مقر راهزنان"**: شوبانێر، گۆرانگە، مەکۆی دزان، بنکەی دزان.

**راهزنی:** چەتەیی، چەتەگەری، کاری چەتە، ڕێگری، ڕێگرتن، سەرملەگرتن، دزی و تالان کردنی کەلوپەلی ڕێبوارنی ناو ڕێ.

**راه سازی:** سازکردنی ڕێوبان، ڕێگاکردن، ڕێ دروست کردن، جاددەسازی.

**راهش:** دەمارە دیارەکانی دەست و پەنجە. سەفەر.

**راەشناس:** ڕێزان، ڕێناس، شارەزای ڕێ، بەڕێگەزان.

**راەشناسی:** شارەزایی، بەلەدی، ڕێناسی، ڕێزانی.

**راەشوسە:** چەوڕێژ، خیزڕێژ، ڕێگەی زیخ تێکراو.

**راهکار:** ڕێگەچارە، شێوەکار، شێوازی ئەنجامدانی کارێك.

**راەکردن:** 1) ڕێگەکردنەوە، ڕێگاکردن، ڕێپێدان. 2) ڕێگە بڕین، ڕێپێوان. 3) دزەکردن. 4) ڕەوانەکردن، ناردن.

**راەکشیدن:** ڕێگەکێشان، ڕێگەوبان سازکردن.

**راهگان:** بڕوانە:"رایگان".

**راهگذار:** بڕوانە:"راهگذر".

**راهگذر:** 1) ڕێبوار، ڕێوار، ڕێبار، راویار، ڕێوبوار، رابگار، ڕێڤینگ، ڕێڤنگ، ڕێوینگ، هاتوچۆکەر. 2) ڕێگەی تێپەڕین، گوزەر، ڕێڕەو.

**راەگرای:** ڕێپێو، ڕێبوار، مسافیر.

**راەگرفتن:** ڕێگەگرتن، ڕێگەبەستن، کۆسپ خستنە سەر ڕێگە. **"راەگرفتن( برگرفتن )"**: ڕۆیشتن، چوون.

**راەگزیدن:** وەڕێکەوتن، ڕەوانەکران.

**راەگستر:** خۆشڕۆ، خۆشڕەو، خۆشبەز، چەلەك.

**راهگشا:** ڕچەشکێن، ڕێکەرەوە. کارساز، گرفت ڕەتێن و چارەسەرکەر.

**راهگیر:** 1) ڕێگر، ڕێگیر، ڕێبڕ، رابڕ، چەتە، تەریدە. 2) بڕوانە:"راەبند(1)".

**راهن:** بارمتەدانەر. و هەر وەها بە مانای جێگیر و پتەو و بەردەوام.

**راهنامە:** سەفەرنامە. نەخشەی ڕێ، پەڕاویلکەی ڕێنوێنی.

**راەنشین:** کەسێك کە لە قەراغ ڕێ دابنیشێ زۆرتر بۆ سواڵکەری، لانەواز، ماڵ لە کۆڵ، غەریب، سواڵکەری سەر ڕێ.

**راهنما:** ڕێنوێن، ڕێنما، رانما، ڕێزان، شارەزا، بەلەد، گەزەك، ڕێشاندەر، رابەر، پێشەوا. نەخشە یان هەر شتێکی دی کە کەسێك ڕێ و مەبەستی خۆی پێ بدۆزێتەوە.

**راهنمایی:** ڕێنوێنی، ڕێنمایی، ڕێنیشاندان، ڕێبەری، رابەری.

**راهنمون:** بڕوانە:"رهنمون".

**راهنورد:** ڕێپێو، ڕێبواری پیادە، نامەبەر، وڵام بەر، ئەسپ یان هێستری خۆشبەز.

**راهوار:** خۆشڕۆ، بەپێ، بەکار لە ڕۆیشتندا، چەلەك، خۆشبەز، ڕەهوال، ڕەهوان.

**راهواره:** بڕوانە: "ڕەآورد".

**راه و رسم:** دابونەریت، شێوە.

**راەیابی:** ڕێدۆزینەوە بۆ شوێنێ یان مەبەستێ.

**راەیافتن:** 1) دزەکردن، ڕەخنەکردن. 2) وەدەست خستنی شتێ، گەیشتن و وەدەست هێنانی شتێ. 3) چوون، ئێزن پێدران. 4) ڕێنوێنی کران، خرانە ڕەوگەی دروستەوە. 5) پێزانین، پەیبردن.

**راهیدن:** سەفەرکردن.

**راهی شدن:** وەڕێکەوتن، ڕەوانەبوون، بەڕێ کران، چوون، سەفەرکردن.

**راهی کردن:** ڕەوانەکردن، ناردن، بەڕێ کردن، بەڕێگەدا ناردن، وەڕێخستن، خستنەڕێ، ڕاخستن.

**رای:** 1) ڕا، بیر، بیرووڕا، بڕوا، ئەندێشە.2) تەگبیر، ڕاوێژ. 3) بەرژەوەندی، قازانج. 4) مەبەست، ئامانج. 5) هۆش یان ئەقڵ، ژیری. 6) خواست، ئیرادە. 7) بڕیار، فەرمان. 8) نیاز، قەست. "**رای زدن**": ڕاوێژکردن، تەگبیرکردن. وتووێژکردن، گفتوگۆکردن. ڕادەربڕین.

**رایات:** کۆی"ڕایت".

**رایانه:** کامپیۆتێر.

**رایت:** ئاڵا، بەیداخ، دروشم.

**رایج:** (لە)باو، برەودار، بەڕەواج، بەڕمێن، ڕووبازاڕی. لەگەڕدا(پول رایج). سککە و پوول و شتی وا.

**رایح:** بۆنکەر، بۆن دەر.

**رایحه:** بۆن، بۆنی خۆش یان ناخۆش.

**راید:** پێشڕەو و ڕێنوێن.

**رایزن:** ڕاوێژکەر، ڕاوێژکار، بەتەگبیر، تەگبیرکەر، ڕاوێژیار، ڕاوێژەر. ژیر، ئاقڵ، بەئاوەز.

**رایزنی:** 1) ڕاوێژکاری، تەگبیرکردن. 2) ڕاهێنەر. 3) چلەکێش.

**رایش:** دەڵاڵی نێوان بەرتیل دەر و بەرتیل خۆر.

**رایض:** ڕامکەری ئەسپ یان ئاژەڵی کێوی.

**رایع:** کەسێ یان شتێ کە بە جوانی و چاکی خۆی خەڵك سەرسام بکا، شۆخ و شەنگ.

**رایق:** 1) پاڵاوتە، خاوێن، ساف. 2) پەسند و بەردڵ، دڵخواز، دڵخۆشکەر، جوان. 3) پتەو، قایم. 4) پێشکەوتو.

**رایکا:** کوڕ، کوڕی جوان چاك، خۆشەویست، دۆست.

**رایگان:** 1) مفت، مفتە، مفتەکی، مفتەگی، مفتی، مفتێ، بەلاش، خۆڕایی، بەخۆڕایی، بێنرخ، هەروا، بێبەرامبەر، ئاوانتە، هەوانتە. 2) بێهۆ، لەخۆڕا، بێهوودە. 3) بەبێ زەحمەت و هەوڵ.

**رایگان خوار:** مفتەخۆر، هاوانتەخۆر، سواڵکەر.





**رآکسیون:** 1) دژکردەوە، پەرچەکردار. 2) لە زاراوەی کیمیادا: گۆڕینی حاڵەتی جسمێ بە هۆی کارتێکردنی جسمێکیتر لەودا. 4) لە سیاسەتدا: ئارەزووکردن و گەڕانەوە بۆ بارودۆخی قەدیم و کۆن، و دژایەتی دەگەڵ نوێبوونەوە.

**رئالیست:** ڕاست بین، واقیع بین/خواز، هەقیقەت دۆز، هەقیقەت بین.

**رئالیسم:** واقیع خوازی، واقیع بینی، هەقیقەت دۆزی، شێوازی نیشاندانی ڕاستییەکان و چۆنیەتی کاروبارەکان بە تایبەتی لە ئەدەبیات دا لە ڕووی جوانی و ناحەزییەوە.

**رأس:** 1) یەکەی ژماردنی مەڕ و ماڵات، سەر. 2) کەللە، سەر. 3) سەروو، لوتکە، پۆپە.4) سەروەر، سەرۆك، گەورە. "**رأساً**": 1) ڕاستەوخۆ، یەکسەر. بەتەنیایی. 2) لەبنەڕەت ڕا.

**رأس المال:** سەرمایە، دەست مایە، بەشی سەرەکی سەرمایە.

**رؤساء:** کۆی"ڕئیس".

**رأفت:** بەزەیی، دلۆڤانی، دڵنەرمی.

**رئوس:** کۆی"ڕأس".

**رئوف:** دلۆڤان، دڵسۆز، بەسۆز، خاوەن بەزەیی.

**رأی:** 1) ڕا، ڕاوێژ، تەکبیر، بیر، بڕوا. 2) ڕادەربڕین. 3) دەنگ. 4) بڕیار (ڕأی دادگاە). "**رأی دادن**": 1) دەنگدان. 2) دەربڕین یان نووسینی بیروبۆچوونی خۆ سەبارەت بە کەسێك یان کارێ. "**رأی کسی برگشتن**": وازهێنان لە بڕیارێ کە گرتبووی. "**رأی کسی را زدن**": وازپێهێنان لە بۆچوون یان مەبەستەکەی.

**رأی اعتماد:** دەنگی متمانە.

**رأی العین:** دیتن بە چاو، چاولێکردن.

**رأیگیری:** دەنگ وەرگرتن. دەنگدان.

**رؤیا:** هۆرم، هاون، هۆون، خەون، خۆو.

**رؤیای بیداری:** زیندەخەون.

**رؤیایی:** خەوناوی، فەنتازیایی خەیاڵاتی، خەیاڵاوی. ئیدەئال، نموونەیی.

**رؤیت:** دیتن، بینین، چاولێکردن، سەیرکردن. چاوپێکەوتن، تواشا، ڕوان، هێف. "**به رؤیت کسی رساندن**": پیشاندان بەو، نیشانی ئەو دان.

**رئیس:** سەرۆك، سەرکردە. بەڕێوەبەر. "**رئیس ده**": کەیخودا، کوێخا.

**رئیس الکتاب:** سەرۆکی نووسەران.

**رئیس الوزرا:** سەرەك وەزیر.

**رئیس جمهور:** سەرکۆمار، سەرۆك کۆمار، سەرۆکی دەزگای بەڕێوەبەری لە وڵاتانی کۆماریدا.

**رئیسه:** مێینەی "ڕئیس". "**اعضاء رئیسه**": ئەندامە گرینگەکانی لەش وەك مێشك و دڵ و جەرگ.

**ربا:** فایز، سەڵەف، سوودی دراو.

**رباخوار:** سوودخۆر، سووتخۆر، سووخۆر، سەڵەفخۆر.

**رباعی:** چارین، چارینە، چوارینە، چوارخشتەکی، چواربەن.

**رب الارباب:** خوای خوایان.

**رب النوع:** خێو، خوای کانی و ئاوان.

**ربّانی:** پیاوی خواناس، پیاوی شێلگیر لە ئایین دا، خوایی.

**ربایت:** پەروەردەکراوان.

**ربایش:** دزی، رفان، فڕان، هەڵ بڕسقان. لە زاراوەی فیزیك دا: راکێشان، کێشان بەرەوخۆهێنان.

**ربایشگری:** گیرایی، magnetism.

**رباینده:** رفێن، رفێنەر، فڕێنەر، رەڤین، رەڤینۆك، راڕفێن، شت رفێن، کەسێ شت دەڕفێنێ، قاچان، قەپۆ.

**ربابیدن:** بڕوانە:"ربودن".

**ربس:** 1) کاری ناحەز و ناڕەوا. 2) زۆر، فرە.

**ربط:** بەستن، گرێدان. گرێدراوی، پێوەندی. زانیاری، ئاگایی. **"ربط دادن"**: پێوەنددان، رەپاڵدان.

**ربع:** چارەك، چارەگ، چواریەك، لە چوار بەش بەشێك.

**ربوبیّت:** خوداوەندی، زاتی خوایەتی.

**ربوخه:** خۆشی، چێژ.

**ربودن:** 1) رفاندن، فڕاندن، رفان، فڕان، ترافانن، رەواندن، رەوانن، رەڤاندن، هەڵبرسقانن، قاپاندن، قاپین، قەپاندن، قەپانن، قاچاندن، وراق، وراقنە. 2) راکێشان، راکێش کردن.3) کێشان، بەرەولای خۆهێنان. **"ربودن ناگهانی"**: راپسکاندن، هەڵ پرچان، هەڵ پرچانن، هەڵ پڕووزقانن، هەڵ پڕووزکاندن، هەڵ پڕووسقاندن، رفاندنی لە نکاو. **"ربوده"**: رفاو، فڕێنراو، رفێنراو، رفیاگ، رەڤاندی، براو.

**ربون:** بێعانە، پێش بەها، دراوی پێشەکی.

**ربیئه:** بڕوانە:"دیدەبان".

**ربیثه:** بەرگێڕەوە، لەمپەر. فرتوفێڵ.

**رپتسیون:** گێڕانەوە، وتنەوە، دووبارە گوتنەوە، سەردانەوە، پێداچوونەوە. لە شانۆ دا: تاقیکاری پەیس.

**رپراتور:** پێڕست، خشتە.

**رپرتاژ:** رێپۆرتاژ، هەواڵنێری، پەیام نێری، کۆکردنەوەی هەواڵ لە لایەن هەواڵنێرەوە.

**رپرتر:** هەواڵنێر، هەواڵگەێن، پەیامنێر، نووچەگهان.

**رتب:** کۆی"رتبە".

**رتبه:** ترنگ، پلە، پایە، پۆست.

**رتج:** (رَ.تَ) دامانی ئاخێوەر/وتاربێژ لە قسەکردندا، دەم بە یەکا هاتن.

**رتق:** بەستن، داخستن، دروونەوە، چنینەوە. **"رتق و فتق"**: داخستن و کردنەوە. ئەنجامدانی کارەکان، جێبەجێکردنی کاروبارەکان، پینەوپەڕۆکردن.

**رتم:** شکاندن، وردکردن.

**رتوش:** میکیاژ، دەستکاری، رازاندنەوە، دەسکاری و رازاندنەوەی شتێ دوای دروست کردنی، رتووش.





**رث:** شڕ، کۆنە، رزیو، پواو. بێنرخ .

**رثاثت:** کۆن بوون، رزین، پواوی، پرتووکیاوی.

**رجاء:** 1) تکا. 2) هیواداری، هێڤیداری، بەهیوایی، هێڤیبوون، بەئاوات بوون، تەواداری. 3) لا، ئالی.

**رجاحت:** قورس بوون، زیادهاتن، لاسەنگی، لەسەرتری.

**رجّاف:** زۆر پەشۆکاو و بێئۆقرە. رۆژی پەسلان.

**رجال:** کۆی"رجل"، پیاوان. پیاوانی دەوڵەت و خاوەن پلە و پۆستە بەرزەکان.

**رجال الغیب:** پیاوانی خوا، پیاوچاکان.

**رجاله:** 1) کۆی "راجل"، پیادەکان. 2) لاپۆتی، رەشووڕووت، راش و رووت، رووتەوپووتە، عەلۆجەلۆ، حەلۆجەلۆ، لاتوولووت، بۆرەپیاگ و نەناس، منداڵ و کاڵ، منداڵ و مەزن.

**رجالەبازی:** هەڵڵاوهەنگامەنانەوە و شەڕاشۆیی.

**رجحان:** هەڤیازی، پێشتری، لەسەرتری، لەسەری. زیاد هاتن. **"رجحان دادن"**: لەسەرتردانان، لەپێشتردانان.

**رجز:** (رَ.جَ) شێعرێ کە لە کاتی شەڕدا بۆ تاریف کردن و خۆهەڵکێشان بیهۆننەوە. هاشوهووش، فڕوفیشاڵ، شاتوشووت، لاف لیدان، خۆهەڵدان. **"رجزخوانی"**: خوێندنەوەی شێعر لە گۆڕەپانی شەڕدا بۆ خۆهەڵنان. لاف لێدان، شاتوشووت. چەقەوگوڕە. **"رجزخوانی در زورخانه"**: گولکوشی، بەخۆهەڵگوتن.

**رجس:** پیسی، چەپەڵی، گوناە، کاری خراو و ناحەز، کەڵکەڵەی شەیتان.

**رجع:** 1) گەڕانەوە، ڤەگەڕیان. 2) وڵامی نامە. 3) قازانج، سوود. 4) شینایی بەهار.

**رجعت:** گەڕانەوە، وەگەڕیان، وەگەڕان، زڤرین، ڤەزڤران، ڤەزڤڕیان، ڤەزڤڕین. **"رجعت دادن"**: گەڕاندنەوە، بردنەوە، دانەوە. **"رجعت کردن"**: گەڕانەوە، هاتنەوە، سەردان کردنەوە.

**رجف:** جووڵاندن، بزواندن. جووڵانەوە، بزووتنەوە، وەلەرین کەوتن، لەرزین.

**رجفه:** لەرە، لەرزە، بوومەلەرزە.

**رجل:** پیاو، زەلام.

**رجم:** 1) بەردباران کردن. 2) جوێن دان، نزای خراپ لێکردن. 3) دەرکردن، لە خۆ دوورخستنەوە. 4) قسەکردن لە رووی خەیاڵ و گومانەوە. **"رجماً بالغیب"**: بە دڕدۆنگی و گومانەوە ئاخاوتن.

**رجوع:** گەڕانەوە، هاتنەوە. چوونی کەسێ بۆ لای کەسێکیتر یان شوێنێ بۆ پرسینی بابەتێ یان داواکردنی شتێ یان ئەنجامدانی کارێ یان چارەسەرکردنی کێشەیەك.

**رجولت:** پیاوەتی، مێرانی، جوامێری.
**رجولیّت:** بڕوانە: "رجولت".
**رجیل:** بۆرەپیاو، مێردەك.
**رجیم:** بەردەباران کراو. دەرکراو. نفرەلێکراو، نەحلەت کراو.
**رحّال:** کۆپان/ کورتان دروو. گەڕۆك، کەسێك کە زۆر سەفەر دەکا.
**رحل:** 1) کۆپانی وشتر. 2) ماڵ و جیٚوڕیٚ. 3) تێشوو و بارگەی سەفەر. "رحل اقامت افکندن": بارخستن لە شوێنێك و نیشتەجێبوون لەو شوێنە.
**رحلت:** 1) کۆچکردن، سەفەرکردن. 2) کۆچیدوایی کردن، مردن.
**رحله:** سەفەرنامە.
**رحم:** (رَحِ) منالّدان، تۆلدان، هەلپەز، یاوەرە، زامار، زامالّ. "صله رحم": یەکیەتی و پێوەندارێتی خزم و کەسوکار، بەزەیی بە خزماندا. "قطع رحم": بڕینی پێوەندی خزمایەتی، تەرکی هاتوچۆ دەگەڵ خزمان.
**رحم:** (رَ) بەزەیی، بزی، بەزە، دلۆڤانی، دڵنەرمی، بەخشۆیی.
**رحمان:** لێبوردوو و دلۆڤان.
**رحمت:** دلۆڤانیکردن، دڵسۆزیکردن و لێبوردن. بەزەیی و دڵسۆزی.
**رحیب:** بەربلاو، پان وبەرین.
**رحیق:** ناتێکەڵاو، بێگەرد، شەڕابی بیٚخەوش.
**رحیل:** کۆچ. کۆچکردن. مەرگ.
**رحیم:** دلۆڤان و لێبوردە، بەخشۆ، خاوەن بەزەیی.
**رخ:** (رُ) 1) بڕوانە: "چهره". 2) گۆنا، کولم. 3) هەوساری ئەسپ. 4) لا، ئالی، رەخ. 5) بەشی دەرەوەی هەر شتیٚ، روو. "رخ دادن": ڕوودان، پێشهاتن، بەسەرهاتن، قۆمیان. "به رخ کسی کشیدن": بە روو دا دادان، بە ناوچاودادانەوە. وەبیرهێنانەوەی خەتا یان عەیبی ئەو کەسە، خستنەوە یادی، لۆمەکردنی وی.
**رخ:** (رَ) 1) درز، کەلێنی باریك.2) رووش، رووشان.3) خەم، کەسەر.4) هێڵی سەر بەردەکان و شکان یان درزبردنیان لە راستای ئەو هێڵانەدا بە هۆی هۆکاری جۆراوجۆر.
**رخا:** (رَ) زۆری نێعمەت، ئاسوودەیی و حاڵخۆشی.
**رخامت:** نەرم و سانا بوونەوە، نەرم و ئاسان بوونەوەی ئاخاوتە یان دەنگ.
**رخاوت:** نەرم و ئاسان بوونەوە، شل و خاوبوونەوە. نەرمی، سستی، سانایی.
**رخت از جهان بردن:** کۆچی دواییکردن، مردن.
**رخت افکندن:** بارگەوبنە خستن و مانەوە لە شوێنیٚ.
**رخت بربستن:** بارگەتێك نان، بارگەوبنەتێکنان، خۆئامادەکردن، سەفەر کردن. بریتی لە کۆچی دواییکردن.





**رخت برچیدن:** بارگەوبنەپێچانەوە، کۆچکردن.
**رختخواب:** پێخەف، نوێن، نڤین، پرتان، جا، جیٚ و بان، یاتاخ، یەتاخ، سەرەخەر، بەخۆدادەر، کەلوپەلی خەوتن.
**رخت شویی:** بالاو، بالاڤ، دراڤ، شوارکردن، شیو، کولّ، کولّ و شیو، جل شتن.
**رخداد:** بڕوانە: "رویداد".
**رخسار/رخساره:** سەروچاو، چرۆچاو، دم و چاو، دەم و چاو، روخسار، روو، دیم، دەکودیم، ڕوومەت، ڕۆما.
**رخش:** 1) ڕووناکی، رۆشنی، تیشك، درەوشاوەیی، تیشك دانەوە. 2) رەنگی سوور و سپی تێکەڵاو. 3) ئەسپی رەسەن. 4) کەلێن، درز.
**رخشا:** بریقەدار، بەتروسکە، ورشەدار، شۆقدار، بەدرەوش، بەدرەوشین، گرشەدار، ڕووناك.
**رخشان:** بەدرەوشین، بەدرەوش، درەوشاوە، بریقەدەر، ڕووناکیدەر، تابان.
**رخشندگی:** درەوشاوەیی، بەبریقەیی، گرشەداری، بەتروسکەیی.
**رخشنده:** تیشکدەر، بریقەدەر، ورشەدار، گرشەدار.
**رخشیدن:** ڕووناکیدان، تیشك خستن، درەوشان، درەوشینەوە، بریقەدان، بروسکین، شۆقدان.
**رخص:** (رُ) هەرزان بوون.
**رخص:** (رَ) نەرم و ناسك.
**رخصت:** ئیزن. ئاسانکاری گەلێك کە لە ئەرکە شەرعییەکان دا بۆ کاتە تایبەتییەکان پێشبینی کراوە. "رخصت خواستن": ئیزن وەرگرتن، ئیزن خواستن. "رخصت دادن": ڕێدان، ڕێپێدان، ئیزن پێدان. "رخصت دهنده": ڕێدەر، ئیزندەر. "رخصت کردن": بەکارهێنانی ئەو ئاسانکارییانەی کە لە ئەرکە شەرعییەکاندا پێشبینی کراوە. "رخصت یافتن": ئیزن پێدران، ئیزن وەرگرتن.
**رخنه:** 1) پێدزکە، قەڵش، درز، کون. 2) کەموکوڕی، ناتەواوی، گەندەڵی. "رخنهکردن": 1) دزەکردن، چوونەناو، پێدزکەکردن. 2) کون کردن، درزتێخستن، درزپێدان. 3) گەندەڵی خستنەوە.
**رخنه جو:** کەسیٚ کە بتوانیٚ بۆ ئەرکێکی دژوار دەرەتانیٚ بدۆزێتەوە، چارەدۆز، چارەگەڕ. بە مانای پێدزکەکەر و "گەندەڵی هێن"یش هاتوە.
**رخو:** نەرم و سست لە هەر شتێك. سست بوون، سستی.
**رخوَت:** نەرم و سست بوون، نەرمی و سستی، خاوبوونەوە.
**رخیدن:** هانکەهانك کردن، نرکەنرك کردن، بە توندی هەناسەکێشان.
**رخیص:** 1) هەرزان، کەم نرخ. 2) نەرم و ناسك، نەرم و نۆڵ.
**رخیم:** دەنگ یان ئاخاوتەی نەرم و بەگوێ خۆش.

**رد:** 1) گەورە، سەروەر. 2) جوامێر، ئازا، بەجەرگ. 3) زانا، ژیر. 4) زانای ئاییینی زەردەشتی.

**ردّ:** 1) گەڕاندنەوە، ڤەگەڕاندن، دانەوە، قبوولّ نەکردن. 2) حاشاکردن. 3) سەروشوێن، شوێنەوار، ئاسەوار، شۆپ، یافت. 4) قسەی ناحەز. 5) ڕەت، نەرێنی. 6) بڕوانە:"مردود". "**ردّ صلاحیّت**": قبوولّ نەکردنی لێهاتوویی کەسێك بۆ وەرگرتنی پۆستێك، وەرنەگیران.

**ردائت:** زایەبوون، خراوبوون، خەساربوون.

**ردّپا:** جێپێ، شوێن پێ، شۆپ، شۆب.

**ردشدن:** ڕەدبوونەوە، ڕەدەوبوون. دەربازبوون، ڕزگاربوون، قوتاربوون، تێپەڕین لە شوێنێکەوە.

**ردع:** (رَ) نەهێشتن، بەرپێگرتن، پێشگرتن.

**ردف:** (رِ) پێڕەو، پێگرتی، دواکەوتە، شوێن کەوتوو. دوابەدوا، یەك لە دوای یەك. ریز.

**ردف:** (رَ) پێڕەوی کردن، شوێن کەوتن، دواکەوتن، سواربوون لە پشت سەری کەسێکەوە.

**ردّفعل:** کاردانەوە، دژەکردار، بەرپەرچ.

**ردکردن:** 1) دەست پێوەنان، ڕەدکردن، لە کۆلّ خۆکردنەوە، دوورخستنەوە. 2) ڕەت کردنەوە، وەرنەگرتن. 3) لادان، خستنە کەنارەوە. 4) فرۆشتن. 5) تێپەڕین لە تەنیشت شتێکەوە. 6) تێپەڕاندن، دەرچواندن. 7) دەستاو دەستکردنی شتێکی و گەیاندنی بەدەست کەسێك.

**ردگم کردن:** شوێن ون کردن، ئاسەواربڕین، یافت بڕین.

**ردگیر:** شۆپ هەلّگر، شوێنگێڕ، شوێن هەلّگر، شۆپاژۆ، پسپۆڕ لە جێپێ ناسیندا.

**ردگیری:** جێپێ‌هەلّگرتن، شوێن گێڕان، شوێن هەلّگرتن، دانەشۆپ، کاشان.

**ردم:** بستن، داخستن، پێوەدان، قەپات کردن، درز/قەلّشت گرتن، پڕکردنەوە.

**رد نخور:** بڕوانە:"قطعی".

**ردوکسیون:** داشکان، دابەزین، کورت کردنەوە، کەم کردن.

**ردّه:** (رِ.دَ) هەلّگەڕانەوە لە دین، لادان لە دین. "**اهل ردە**": خەلّکانی هەلّگەڕیاوە.

**ردە:** (رَ.دَ) 1) ریز، رزن، ڕێزە، چینە، قەتار. 2) گروپێ لە کەسەکان یان شتەکان کە بەهۆی هەبوونی تایبەتمەندیی هاوبەش دەخرێنە گروپێکەوە(گروە سنّی). 3) پلە، پۆست.

**ردەبندی:** پلەبەندی، ریزبەندی، قات بەندی، پۆلێنکاری.

**ردی:** خراو، ناحەز، دزێو و ناپەسند.

**ردیاب:** شوێن هەلّگر، شوێنگێڕ، شۆپگەڕ، شۆپ هەلّگر، شۆپاژۆ، هەرند. ئاشکراکەر، دەرخەر.





**ردیابی:** شوێن گێران، شوێن گێڕی، شوێن هەلّگرتن، بە شوێن داچوون، شۆپاژۆیی، کاشان، کاشێل، دانەپەی، چەخەر.

**ردیافتن:** شوێن هەلّکردن، شوێن دۆزینەوە.

**ردیف:** 1) ریز، رزگ، زنجیرە، سەف. 2) پشت سەری یەك، بە تەنیشت یەکەوە، چەند شت بە پەنایەکەوە، دوابەدوا. 3) بەڕێکوپێکی و لە تەنیشت یەکەوە. 4) گروپ، دەستە. 5) تەکووز، ڕێکوپێك.6) (ئەدەبی) وشەگەلێ کە دوای سەروا دووپات دەبنەوە. 7) بڕوانە: "وابستە". "**ردیف شدن**": ریزبوون، ریزکران، چوونە یەك ریزەوە، قەتاربەستن، قەتارەبەستن. "**ردیف کردن**": قەتارەکردن، قەتارکردن، ریزکردن، بە تەنیشت یەکەوە دانان، چەند شت خستنە ناو دەستە یان گروپێکەوە. ڕێکوپێك و جێبەجێکردن. "**ردیف کردن تارهای بافتنی**": رایەلّ کردن، راهێلّ کردن، ریزکردنی تەون و بووزوو.

**رذال:** کۆی"رذیل".

**رذالت:** پەستی، نزمی، ڕەزیلی.

**رذل:** ڕەزیل، پەست، نزم، نەوی، ناکەس.

**رذلاء:** کۆی"رذیل".

**رذیل:** پەست، نزم، ڕەزیل، بەدکار.

**رذیلت:** بڕوانە:"رذالت".

**رزاق:** ڕۆزی‌دەر، بژیوی گەیەن.

**رزانت:** بەشەرموحەیاو لەسەرخۆیی، پشوودرێژی، سەنگینی، گرانی، قۆرس‌وقۆلّی، گران مێری، پایەداری لە هزر و ئیرادەدا. "**رزانت رأی**": ژیری، بەئاوەزی، ئاقلّی.

**رزء:** بەلّا و نەهامەتی گەورە.

**رزبان:** ڕەزڤان، ڕەزوان، ڕەزەوان، باخەوانی باخی ترێ.

**رزرو:** 1) ڕێزێرڤ، لە پێش دا گرتنەوە. 2) پەسمەنە، پاشەکەوت. 3) یەدەکی.

**رزق:** رسق، ڕۆزی، بژیوی.

**رزم:** شەڕ، جەنگ.

**رزم آرا:** کەسێك کە لە سەف رازاندنەوە و کاروباری شەڕدا لێزان و کارامە بێ، کەسێ کە لە شەڕدا هونەرنوێنی دەکا.

**رزم آزما:** شەڕدیتوو، دلێر، شەڕکەر، جەنگاوەر، ئازا لە شەڕ.

**رزم آزمودە:** شەڕدیتوو، راهاتوو لە شەڕ، شەڕزموودە، کەسێ کە شەڕی دیبێ و لە شەڕکردن دا شارەزا و کارامە بێ، شەڕڤان، جەنگاوەر.

**رزم آور:** جەنگاوەر، سەفدڕ، ئازا لە شەڕ، نەترس، بەجەرگ. گرووبان لە سپای پاسداران دا.

**رزمایش:** مانۆڕ.

**رزم توز:** شەڕکەر، جەنگی، جەنگاوەر.

**رزمجو:** شەڕدۆز، شەڕخواز، شەڕکەر، دلێر، ئازا، جەنگاوەر.

**رزمخواه:** شەڕخواز، شەڕکەر.

**رزمدار:** پلەی "استوار" لە سپای پاسداران دا.

**رزم دیده:** شەڕدیتوو، شەڕزمووده.

**رزم زن:** جەنگاوەر، شەڕکەر، شەڕانی.

**رزمساز:** شەڕخوڵقێن، شەڕسازێن.

**رزمکار:** جەنگاوەر، شەڕکەر.

**رزمگاه:** شەڕگە، گۆڕەپانی شەڕ.

**رزمنامه:** چیرۆکی شەڕ.

**رزمنامەای:** بڕوانە:"حماسی".

**رزمناو:** پاپۆڕی شەڕکەر.

**رزمنده:** شەڕکەر، خەباتکار.

**رزمیدن:** شەڕکردن، جەنگان.

**رزمی‌کار:** وەرزشوانی جودۆ، تێکواندۆ یان کاڕەتە.

**رزم یوز:** بڕوانە:"رزم توز".

**رزم یوش:** بڕوانە:"رزم توز".

**رزمیه:** شێعرێ کە لە پەسنی شەڕدا دەهۆنرێتەوە، شێعری حەماسەیی.

**رزنانس:** پێچ خواردنی دەنگ، دەنگ دانەوە، کەوانەکردنی دەنگ و شەپۆلەکانی.

**رزنده:** رەنگرێژ، رەنگکار، خومگەر.

**رزوناتور:** هێزپێدەر، هێزنەك، کەوانەکەری دەنگ، گێڕەرەوەی دەنگ.

**رزیئه:** کارەساتی گەورە، زیان و بەڵا.

**رزیت:** رووداوی ناخۆش، بەڵا، کارەسات.

**رزیدن:** رەنگ کردن، رەنگرێژی کردن.

**رزیدنت:** پزیشکێ کە خەریکی تێپەڕاندنی دەورەی پسپۆڕییە.

**رزیستانس:** راوەستاوی، بەردەوامی، خۆڕاگری، پشوودرێژی، لەسەرخۆیی. لە دەزگای ئیلکتریك دا: خۆڕاگریی ئێلێکتریکی.

**رزین:** قورس و قۆڵ، سەنگین، گران مێر. پتەو، قایم.

**رزیه:** کارەساتی گەورە، بەڵا و زیان.

**رژنراسیون:** نوێکردنەوە، چاك کردنەوە، بووژاندنەوە، بەرهەمهێنانی دووبارە.

**رژه:** رێز، سەف. تێپەڕینی سەربازەکان لە بەرامبەر گەورە بەرپرسەکان دا.

**رژیسور:** بەڕێوەبەر، کارگێڕ، هەڵسووڕێن، بەڕێوەبەر و سەرپەرشتی ئەکتەرەکان لە شانۆدا.

**رژیم:** 1) شێوە، شێواز، رێسا، سیستم. 2) شێوەی حکوومەت، شێوازی سیاسەت، رێژیم.

**رژیم غذایی:** دەمگرتنەوە، پارێز لە خواردن.

**رس:** (رُ) 1) زۆرخۆر، چڵێس، سك لەوەڕێن. 2) گڵەجان. **"رس چیزی را کشیدن"**: زۆرترین کەڵك و بەرلێخواردن لێی. **"رس کسی را کشیدن"**: ماندوو و لاوازکردنی ئەو، بەرەولاوازبردنی وزە و هێزی ئەو.

**رسّ:** (رَ) 1) چاڵی کۆن. 2) کان، کانگە. سەرەتای هەر شتێ. 4) چاڵ کردن، ژێرخاك کردن، ناشتن.





**رسا:** 1) تایبەتمەندی دەنگێ کە بە روونی دەبیسترێ. 2) کێشدار و بڵیند. 3) ئەوەی بە سانایی سەری لێ‌دەر دەکرێ، پاراو، رەوان. 4) بیرتیژ، تیژفام. 5) بەتوانا لە گەیشتن بە ئامانج یان گەیشتنە جێیەك.

**رسائل:** کۆی"رساله".

**رسالت:** 1) پەیام بردن، پەیام گەیاندن. 2) پەیامبەری، پەیامبەرێتی. 3) ئەرك و بەرپرسایەتییەك کە لە ئەستۆی کەسێ یان شتێکە. 4) ئایین، دین. 5) پەیامی بەنووسراوە، نامە. 6) نامیلکە. **"رسالت کردن"**: پەیام بردن.

**رساله:** 1) تێز، نامیلکەی دوکتورا. 2) سیپارە، نامیلکە، کتێبۆکە. 3) نامە.

**رسام:** نیگارکێش، شێوەکار، وێنەکێش. : (کامپیۆتێر) "پلاتیر".

**رسانا:** ماددەیەك کە بە ئاسانی تین و دەنگ و تەزووی ئیلکتریسیتەی لێوە تێپەڕێ.

**رساندن/رسانیدن:** گەیاندن، گەهاندن، گەشتاندن، پێگەیاندن، یاونای، یاوەنان. پەروەردەکردن و کامڵ کردن. **"بهم رساندن"**: پێك گەیاندن. جێبەجێ کردن، ئامادەکردن.

**رسانش:** 1) دەرچوون/تێپەڕینی باری ئێلێکتریکی لە ماددەوە. 2) راگواستنی وزە لە حاڵێك دا کە ئامرازی راگواستن نەبزوێ.

**رسانگر:** ئامرازی گەیاندن.

**رسانگری:** گەیاندن. ئاڵوگۆڕ.

**رسانه:** 1) راگەێن، راگەیەن، میدیا، هەر ئامرازێ کە بابەت یان هەواڵێك بە خەڵك رابگەیەنێ وەك رادیۆ. تەلەویزیۆن. رۆژنامە. 2) داخ، پەژارە، خەم. **"رسانەارتباط جمعی(گروهی، همگانی)"**: راگەیەنە گشتییەکان. **"رسانه صوتی"**: رادیۆ. **"رسانه صوتی و تصویری"**: تەلەویزیۆن.

**رسایل:** کۆی"رساله".

**رست:** (رُ) پتەو، قایم، خۆڕاگر، دلێر، زاڵ.

**رست:** (رَ) ریز، سەف.

**رستاخیز:** 1) هەستان، جووڵانەوە، راپەڕین، سەرهەڵدانی گشتی بە مەبەستی لەناوبردنی دواکەوتوویی سیاسی و فەرهەنگی و زانستی و هتد. 2) پەسڵان، پەشڵان، سەڵا، زنینەوە، رۆژی زیندووبوونەوە، هەستانەوەی دوای مردن. 3) بڕوانە:"شکوفاشدن".4) هەنگامە، هەراوهوریا.

**رستاد:** بڕوانە:"راستاد".

**رستار:** بڕوانە:"رستگار".

**رستاو:** بڕوانە:"رفاقت".

**رستگار:** رزگار، دەرباز، قوتار، خەلاس، ئازا. **"رستگارشدن"**: رزگاربوون، دەربازبوون، قوتاربوون، ئازادبوون، راوراندن.

**رستگارگر:** بڕوانە:"ناجی".

**رستگاری:** رزگاری، ئازادی. **"راه رستگاری"**: دەربازگە، دەرەتان، رێگەی رزگاربوون.

**رستم:** پیاوی ئازا و بەقەوەت. ناوی پاڵەوانی ناوداری "شاهنامەی فردەوسی".

**رستن:** (رَ.تَ) رزگاربوون، دەربازبوون، قوتاربوون. "**رستن از بلا**": سەردەرچوون، سەردەرکردن، رزگاربوون لە بەڵا. "**رستە**": رزگاربوو، قوتاربوو.

**رستگی:** رزگاری، نەجات.

**رستن:** (رُ.تَ) شین بوون، سەوزبوون، روان، هەشین بوون."**رستنگاە**": شوێنی روان. "**رستە**": رواو، سەوزبوو، شین بوو، خوڵقاو، رسکاو، گرس.

**رستنی:** رووەك، هەرچییەك لە زەوی شین دەبێ.

**رستە:** (رَ.تَ) 1) ریز، سەف، شەمەندەفەڕ. 2) بازاڕ. 3) هاوپیشەکان. 4) راستە دووکان. 5) هەر کام لە یەکە پسپۆڕییەکانی ئەرتەش. 6) راستا، رەوگەی جووڵان.

**رستهم:** باهۆدار، شاقەڵدار، باڵابەرز.

**رستی:** رەحەت، ئاسوودەیی. ئازایی، دلێری. بەش، بەهرە، رۆزی، رسق.

**رسخ:** گیانگۆڕکێ، تیَژیانەوە.

**رسد:** 1) دەستە، تاقم، گروپ. 2) بەهرە، بەش، پشك. 3) رێژە، رادە. "**رسد کردن**": دابەش کردن، بەش کردن.

**رسش:** 1) هەڵدان، باڵاکردن، نەشونماکردن. 2) گەیشتن.

**رسم:** 1) نەریت، داب، باو. 2) نووسین، هێڵ کێشان، کێشانەوەی هێڵ یان شکڵێ لە سەر کاغز، وێنە، نیگار.3) شوێن، شۆن، شۆپ، کەرخ، شوێنەوار.4) مووچە، بەرات. "**بە رسم**": 1) بەنیشانەی. 2) وەك، وێنە.

**رسماً:** بەشێوەی فەڕمی، بەشێوەی یاسایی.

**رسم الخط:** شێوەی نووسینی پیت و وشەکان.

**رسم کردن:** 1) کێشانەوە. 2) باو کردن، برەوپێدان.

**رسمی:** 1) فەرمی، رەسمی، بەپێی داب و نەریت، یاسایی. 2) باو، ئاسایی. 3) بەتەواومانا(دیوانە رسمی).4) وشك و جیددی و دوور لە هەست و سۆز(رفتار رسمی). 5) خۆجێیی، خۆماڵی(تخم مرغ رسمی). 6) وەرگری مووچە و جیرە.

**رسمیّت:** حاڵەتی کەسێك کە بەپێی نەریت و باو یان یاسا دەجووڵێتەوە. فەڕمیبوون، رەسمیبوون. "**رسمیّت دادن بە چیزی**": لایەنی یاسایی دان بەو، بەفەڕمیکردنی ئەو. "**رسمیّت داشتن**": هەبوونی بەها و نرخی یاسایی، بەڕەسمیبوون. "**بە رسمیّت شناختن**": بەفەڕمی ناسین، بەڕەسمی ناسین، بەیاسایی زانینی شتێك.





**رسوا:** ئابڕووتکاو، ئابڕوونەماو، بیَئابڕوو، سووك و چرووك، ناوزڕاو، حەیاچوو، حەیاتکاو، خەنزار، رووسیا، تڕۆ. "**رسواشدن**": ئابڕووچوون، ئابڕووتکان، ئابڕوو رژان، ئابڕووبران، ناوزڕان، زەنگ زڕیان، دەلقین، سووك بوون لەبەر چاوان. "**رسواکردن**": ئابڕووبردن، ناوزڕاندن، تڕۆکردن، سووك کردن، شرت و شۆدەرێنان، شرت و شۆلێبڕین، رووسیاکردن، سەخەربرن، بۆ مانای زیاتر بڕوانە: "آبروبردن". "**رسواکننده**": ئابڕووبەرە، ئاوڕووبەر، ناوزڕێن، تڕۆکەر.

**رسوایی:** ئابڕووتکان، ناوزڕان، خەنزاری، دەلق، سووکی، باقر، عەیب و عار. "**مایەی رسوایی**": کلکلە، هۆی ئابڕووچوون.

**رسوب:** ڤەنشتن، تانشین، چوونە خواری تلّتە، خرتوخاڵ نیشتن. نیشانە و ئاسەواریَ کە لە شتیَ جێدەمێنیَ.

**رسوبات:** خرتوخاڵ، تەناس.

**رسوخ:** 1) چەقیوی، بن بەستەیی، پتەوی و راوەستاوی. 2) رەخنە و دزەکردنە ناو شتێك و جێگیربوون تێیدا.

**رسول:** 1) نێردراو، ناردراو، رەوانەکراو. 2) نێرراو لە لایەن خوداوە، پێغەمبەر.

**رسومات:** 1) نەریتەکان، باوەکان. 2) کارخانەی خواردنەوەسازکردن. 3) ماڵیات.

**رسیتال:** کۆنسێرتیَ کە لە لایەن یەك ژەنیار یان یەك ستران بێژەوە بەڕێوە دەچیَ.

**رسید:** 1) دڤانەك، هێمان، قەبز، قەوز، فاکتۆر، پسووڵە. 2) گەیشت، گەیی.

**رسیدگی:** 1) پێیاگەیین، پێیاگەیشتن، پێڕاگەیشتن، سەرکەشی، سەرکردن، بەدواداچوون، لێکۆڵینەوە، لێپرسینەوە، تاوتویَ کردن. 2) تەکووز و رێکوپێك کردن. 3) کاملبوون، پێگەیشتن.

**رسیدن:** گەیشتن، گیشتن، گەین، گەهیشتن، گەهین، گەهان، گیهان، راگەیشتن، هاتنەبەرەوە، یاو، یاوان، یاوای. پێگەیشتنی(هەواڵ.پەیام. نامە). کامڵ بوون، گەیین، وەختی بەهرەدان. وەخت هەبوون، دەرفەت هەبوون. وەدەست هاتن. تەواوبوون، کۆتاییهاتن. تووشبوون، گیرۆدەبوون."**رسیدن بە کسی**": 1) گەیشتن بەو، چاوپێکەوتن بەو کەسە. 2) بەدواداچوون و نزیك بوونەوە لێی. 3) ئاوڕلێدانەوە و پێڕاگەیشتن بەو. "**بە خود رسیدن**": خۆڕازاندنەوە، خۆ لە گوڵ دان. گرینگیدان بە لەشساغی خۆ و چاوەدێریکردن لە خۆ. "**بە هم رسیدن**": چاوپێککەوتن، یەکتردیتن، بەیەکگەیشتن.

**رسیدە:** پێگەیشتوو، پێڕاگەیشتوو، گەیشتو، گەییو، پڕاوپڕ، رەسا، هاتگ، گەیشتوو، گەیشتی، گەهیشتی، گەیگ.

**رسیس:** 1) پتەو و خۆڕاگر. 2) پیاوی زیرەك و بەئاوەز. 3) هەواڵێ کە راستی‌یەکەی نەسەلمێنرابێ.

**رسیل:** 1) نێردراو، ولاّمهێن. 2) هەراو، فەرەه، بەرین. 3) ئاوی خۆش. 4) هاوئاهەنگ، هاودەنگ.

**رسیله:** نووسراوە، نامە.

**رش:** 1) تەپۆڵکە، گرد. 2) دادپەروەر، دادگێڕ.

**رشّ:** پرژاندنی ئاو، ئاو رشتن. بارانی کەم.

**رشاد:** 1) بە رێگەی راست دا چوون، لە لاڕێی رزگاربوون. 2) راستی و خۆڕاگری و سەرکەوتن. 3) تەڕەتیزە، رەشادۆك.

**رشادت:** بڕوانە: "شجاعت".

**رشاشه:** دلۆپەی ورد.

**رشاقت:** بەژن و بالاّ جوان و رێکوپێك بوون.

**رشتن:** رستن، بادانی بەن و لۆکە بە تەشی.

**رشته:** 1) رس، رست، رسك، رێسراو، پەتی باریکی هۆنراو، رایەڵ، تاڵ، هەودا(رشته افکار). 2) رشتە، هەرکام لە لکە جۆراوجۆرەکانی وانەیی و شوغڵی. 3) بابەت، درغە. "**رشته‌رشته**": هەوداهەودا، تاڵ تاڵ. "**رشته کلام را بریدن**": بڕینی قسە یان ئاخاوتە. "**رشته کلام (سخن) را بە دست گرفتن**": دەست بە ئاخاوتن کردن. "**رشته‌کوه**": زنجیرەکێو، گیسی. "**بە رشته تحریر (نگارش) درآوردن**": نووسین. "**بە رشته کردن**": پێوەکردن بە بەنەوە، دەداو کێشان. "**بە (بر) رشته نظم کشیدن**": هۆنینەوەی شێعر.

**رشته‌سان:** پەیتاپەیتا، پشت سەری‌یەك.

**رشح:** دەلاّندن، دیلاندن، دەردان، تەڕایی دادان، لێچوون، لێچۆڕین.

**رشحه:** بڕوانە: "قطره".

**رشد:** 1) بە رێگەی راست دا چوون، لە لاڕێیی رزگاربوون. 2) خۆڕاگری و راوەستان لە رێگەی راست دا. 3) لە باری زەینییەوە گەیشتنە قۆناغێکی بانتر. 3) پەرەسەندن، پێشکەوتن(رشد صنایع). 4) خیف، هەڵدان، نەشونماکردن، هەراش بوون، بەخۆداهاتن. "**رشد دادن**": گەورەکردن یان پەروەردەکردنی کەسێك یان شتێك. "**رشدکردن**": گەشەکردن، بالاّکردن، هەراش بوون، نەشونماکردن، هەڵدان، بەرزبوون، گەورەبوون، هەڵچوون، پەرەگرتن، لەزیادی‌بوون. "**عدم رشد**": هەڵنەدان، بالاّنەکردن.

**رشف:** (رَ) بڕوانە: "مکیدن".

**رشق:** تیر خستن، بە تیر لێدان. تانەلێدان.

**رشك:** 1) رژدی، چاوچنۆکی، ئێرەیی، بەغیلی، کەرا. 2) غیرەت. "**رشك بردن**": ئێرەیی بردن، کالّیان، کالّین، پێهەلّکالاّن.

**رشك بر:** ئێرەیی بەر، بەخێڵ.

**رشکن:** (رِ.كَ) بڕوانە: "رشکین".





**رشکناك:** (رَ) بەئێرەیی، ئێرەیی بەر، چنۆك، بەخیل، چاونەزێر.

**رشکناك:** (رِ) رشکن، رشکاوی.

**رشکین:** 1) ئێرەیی بەر، بەخێڵ، بەغیل، چاوچنۆك، چاڤینۆك، بەرچاوتەنگ، چاونەبار، گاڤبەر، دەخەس. 2) بەغیرەت.

**رشم:** نووسین، مۆرکردن. شوێنی باران لە سەر زەوی، شوێنەواری هەر شتێ.

**رشن:** (رَ) داگەر، دادپەروەر. بەسەرردادان، زگ لەوەڕاندن.

**رشوه:** بەرتیل، بەرتل، هبوودی، رشفەت. "**رشوه‌خوردن**": بەرتیل خواردن، وەردایش. "**رشوه‌دادن**": بەرتیل دان.

**رشوه‌خوار:** بەرتیل خۆر، بەرتیل گر(وەرگر).

**رشید:** 1) رێنمای رێگەی راست. 2) ئازا، نەترس، بەغیرەت.3) پێگەیشتو، بالّغ.

**رشیق:** قیت و قۆز، بەژن و بالاّ بەرز، جوان و ناسك.

**رصانت:** پتەوی، قایمی.

**رصد:** 1) روانینە شتێك و چاوەدێری کردنی، دانیشتن لە شوێنێك و خستنە ژێر چاوەدێری شتێ، چاوەدێربوون. 2) شێوە، رێگە. 3) چاودێر، چاڤێر، نگابان. گروپی نگابانان، گروپێ کە لە بۆسە دابن. 4) لە زاراوەی ئەستێرەناسان دا: شوێنێ کە ئەستێرەناسەکان بە ئامرازی تایبەتییەوە ئەستێرەکان دەخەنە ژێر چاوەدێرییەوە، روانگە، لە فارسی دا "رصدگاه" و "رصدخانه"شی پێدەڵێن.

**رصدبان:** 1) ئەوەی لە رێگادا مالّیاتی رێگەوبان وەردەگرێ، باجگری رێ. 2) ئەستێرەناس.

**رصدبستن:** تۆمارکردنی جووڵە و پلەی ئەستێرەکان، دیاریکردنی جووڵانی ئەستێرەکان لە روانگەدا.

**رصف:** (رَ) لەسەریەك چنینی بەردەکان لە بینا دا.

**رصید:** 1) چاوەدێر، چاڤێر. 2) سەگ یان هەر ئاژەڵێکی راوکەر کە ئامادەی قەڵەمبازبردن بۆ لای نچیرە.

**رصیف:** 1) هاوتا، هاوشان، هاوڕێ. 2) رێگای بەردەڕێژکراو، شۆستە. 3) پتەو، قایم.

**رصین:** پتەو، قایم، راوەستاو. پیاوی دلۆڤان. بەژان، بەئازار.

**رضاع:** شیرخواردنی منالّ لە مەمکی دایکی. مەمك پێدانی ژنی زگپڕ بە منالّ.

**رضاعت:** 1) شیرخواردنی منالّ لە مەمکی دایکی. 2) ساوایی، بەرمەمکان.

**رضاعی:** هاوشیرە.

**رضامندی:** رازی‌بوون، رەزامەندی.

**رضایت( دادن ):** پێڕازیبوون، رازیبوون، رەزامەندی، پێ‌خۆشی، لێخۆش بوون. چاوپۆشیکردن لە شکایەتی خۆ. ملدان، کۆڵدان، تەسلیم بوون.

**رضایت داشتن:** رازیبوون، ڕەزامەندی لەسەر بوون.
**رضع:** شیرخواردن، مەمك مژین.
**رضوان:** رازیبوون، قایلبوون، خۆشحاڵ بوون. بەهشت.
**رطب:** (ڕَ) تەڕ، تەڕوتازە. "**رطب اللسان**": زمان شیرین، تەڕزوان، تەڕدەم، قسەزان. "**رطب و یابس**": تەڕ و وشك، هەمووشت. بریتی لە قسەگەلی دروست و نادروست.
**رطل:** (ڕَ) پیاوی سست و بێ حاڵ. تازەلاوی باریك ئەندام. پیاوی پیری سست و بێ هێز. پیاوی گەوج.
**رطوبت:** 1) تەڕی، نماوی، شێ، شە، مچەو. 2) نەرمی. "**رطوبت زیاد**": لێزماهی، لیزمایی، تەڕایی زۆر.
**رطوبت ناپذیر:** شێ هەڵنەگر، شێ تێنەچوو.
**رطوبت سنج:** شێپێو.
**رطوبتی:** بێ واز، بێ حاڵ، سست.
**رطیب:** تەڕ، تەڕوتازە.
**رعاع:** خەڵکی پەست و نزم و ناکەس و نەزان.
**رعاف:** لووت پژان.
**رعایا:** کۆی "رعیّت".
**رعایت:** 1) لەوەڕاندن، چەڕانن. 2) پێیاگەیین بە کاروباری رایەت و وڵات. پاراستن و نگاداری کردن لە رایەتەکان. پاراستنی حورمەت و مافی کەسێك. 3) ئاگالێبوون، ئاگاداری کردن، ئاگاداری و پاسەوانی، چاوەدێری کردن، لاواندنەوە و دلۆڤانی و پێڕاگەیشتن بە کاری کەسێك، پاراستن. 4) لاگیری، داژداری.
**رعب:** ترس، سام، خۆف.
**رعد:** گرمە، گورم. بروسکە. "**رعدوبرق**": هەورەبروسکە، هەورەتریشقە، گرمەی هەور.
**رعدآسا:** هەورەتریشقەئاسا، وەك هەورە برووسکە.
**رعدانداز:** خۆمپارەهاوێژ، تۆپچی.
**رعده:** پەشۆکان و لەرزین لە ترسان یان لەبەر حاڵەتێکیتر، لەرزە.
**رعشه:** 1) پەلە، لەز. 2) لەرزە، لەرەلەر، موچڕك.
**رعنا:** 1) ژنی خۆش قەڵافەت و جوان، بەژن ڕێك، نەرم و نیان، شلومل. 2) نەزان و بێ ئەقڵ.
**رعونت:** نەزانی، کەم ئاوەزی. کۆڵەوێژی، درێژدادڕی. جوانی و کێشراوی قەڵافەت. خۆویستی و لووت بەرزی.
**رعی:** 1) لەوەڕین. 2) لەوەڕاندن. 3) پاراستن، ئاگالێبوون. 4) نگابانی، سەرپەرستی.
**رعیب:** ترساو، تووشی ترس بوو.
**رعیّت:** گجە، رایەت، رەعیەت، کاسبکاری بەردەستی ئاغا، گوندی بەردەستی خاوەن موڵك، کۆمەڵێ کە چاوەدێر و سەرپەرستیان هەبێ، خەڵکی ژێردەستە.





**رغائب:** شتە باش و پەسندکراو و بەڕمێنەکان.
**رغادت:** ئاسوودەیی و خۆشی ژیان، زۆری نێعمەت.
**رغبت:** حەز، مەیل، خواست، شەوق. "**رغبت داشتن**": ئارەزووکردن، شەوق لێبوون، مەیل لێبوون.
**رغم:** 1) زاڵبوون، شکست پێدان، تێشکاندن، سووك و چرووك کردن. 2) دەخاك و خۆڵ وەردان. 3) پێچەوانە، دژ. "**به رغم**": بە پێچەوانەی، سەرەڕای. "**به رغم کسی**": بە پێچەوانەی مەیل و ویستی ئەو. "**علیرغم**": بەپێچەوانەی، سەرەڕای.
**رغیب:** سك زل، ورگن.
**رغیبه:** هەرشتێکی باش و بەڕمێن.
**رفات:** وردەوپردەی شتێ، وردورد، ئێسك و پروسکی مردوو.
**رفاقت:** دۆستی، دۆستایەتی، هەڤالی، هەڤالەتی، ئاواڵەتی، هەڤالینی، هەڤگر، ئاواڵەتی، هەواڵەتی، هاوڕێیەتی، هەمبازی.
**رفاه:** حاڵخۆشی، خۆش بژیوی، چاك بژی، ئاسوودەیی، خۆشگوزەرانی.
**رفاه طلب:** ئاسوودەیی خواز، خوازیاری بەهرەمەندی لە ئیمکاناتی ماددی.
**رفتار:** 1 ) هەڵسوکەوت، ئاکار، رەڤشت، شێوە، رەفتار.2) (دەروونناسی) دژکردەوەی ئەندامانی لەش لە بەرامبەر هۆکارەکان دا. 3) رۆیشتن، چوون. 4) ریێ رۆیشتن. 5) بڕوانە:"خرامیدن".
**رفتارشناس:** هەڵسوکەوت ناس.
**رفتارگرایی:** (دەروونناسی) قوتابخانەیەکی دەروونناسانەیە کە سەبارەت بە لایەنە بەرچاو و هەست پێکراوەکانی هەڵسوکەوت جیا لە دیاردە زەینییەکانی وەك هەستەکان یان ورووژێنەرەکان دەدوێ.
**رفتگان:** کۆی"رفته"، چووان، کۆچکردوان، مردووەکان، پێشینیان.
**رفتگر:** پاکەوان، کەنناس، سپوور، سەبرگەچی، کۆڵان ماڵ.
**رفتگی:** سواوی، جێیەك لە شتێ کە سوابێتەوە.
**رفتن:** (رُ.تَ) 1) گسك لێدان، ماڵین. 2) پاك کردنەوە، سڕینەوە. 3) لەناوبردن.
**رفتن:** (رَ.تَ) 1) رۆیشتن، رۆین، رووین، چوون، چوین، لە جێنەمان، رەوانەبوون، تێپەڕین، کۆچکردن، پێچەوانەی هاتن. 2) پێشهاتن، روودان. 3) مردن، کۆچی دوایی کردن. 4) بڕان، لێکرانەوە. 5) بڕانی جەریانی شتێ وەك ئاو یان برق. 6) خواردن یان خواردنەوەی شتێ. 7) ئەنجامدان. 8) چوونەناوەوە، رەخنەکردن. 9) بێحاڵبوون و لەدەس دانی توانایی جەستەیی. 10) ساویان و

چوونی توێخی سەرەوەی شتێ. 11) لە دەست چوون، لەناوچوون(خانەرفت). 12) خەوتن. 13) بڕوانە:"عمل کردن". 14) باسکران، وتران. 15) هەستان. 16) بڕوانە:"وزیدن".17) ژمێرران، بەئەژمارهاتن. 18) ناردران. 19) تەواوبوون، بەکۆتایی گەیشتن. "**رفتن رو(ی) چیزی**": پێ زیادبوون، لێزیادبوون. گەیشتن بەو رادەیە. "**رفتن شکم**": (پزیشکی) زکچوون، زگەشۆرە. "**ازخودرفتن**": لەهۆش چوون، لەسەرخۆچوون، بێهۆش بوون. "**با کسی رفتن**": هەبوونی پێوەندی سێکسی دەگەڵ ئەودا. کارتێکردن، کاریگەری لەسەر دانان. "**بر(به)هم رفتن**": داخران، بەستران. "**به کسی رفتن**": چوونە لای وی، سەردانی ئەو کردن. "**به کسی(چیزی) رفتن**": لەئەوچوون. "**تو(ی) خود رفتن**": چوونە فیکر و خەیاڵەوە. گۆشەگیری کردن، دوورەپەرێزی کردن. "**چیزی بر (با) کسی رفتن**": بەسەرهاتن. "**چیزی را رفتن**": دەبەر مران، بە قوربان بوون. "**در هم رفتن**": تووڕە و ناڕەحەت بوون. تێکچوون و رووگرژکردن. "**روی هم رفتن**": بەسترانی دوو لای شتێك.

**رفتنی:** رەتەنی، لەسەر رۆیشتن، کەسێك کە دەیەوێ لە جێیەك نەمێنێ.

**رفت و آمد:** هاتن و چوون.

**رفت و روب:** گەسك لێدان، رامالین، راماڵدان، خاوێن کردنەوەی شوێنێ لە تەپوتۆز.

**رفته:** 1) رۆیشتوو، چوو، رەوانەبوو. 2) کۆچکردوو، مردوو. 3) بێ ئۆقرە و پەرێشان. 4) ونبوو، لەدەست چوو. 5) ئەنجام بوو، کراو. 6) وتراو.

**رفته‌رفته:** کەم کەم، هێدی هێدی، بەرەبەرە.

**رفد:** بەخشین، یاریدەدان، یارمەتیدان.

**رفراندوم:** گشت پرسی، راپرسی، ریفراندۆم، پشت بەستن بە راپرسی گشتی بۆ بەدەست هێنانی دەنگ و بڕوای زۆربەی خەڵك سەبارەت بە ئەنجامدانی کارێك.

**رفرانس:** سەرچاوە، ژێدەر.

**رفرم:** چاکسازی، راست کردنەوە، رێفۆڕم. "**رفرم کردن**": ئەنجامدانی چاکسازی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

**رفرماسیون:** بزاڤی چاکسازی ئایینی.

**رفرمیست:** رێفۆرمخواز، چاکسازیخواز.

**رفری:** دانێر، ناوبژیکەر، نێوبژیوان.

**رفض:** رەدکردنەوە، دوورخستنەوە، تەرك کردن، وازهێنان. سۆز و هۆگری بە شێعەبوون.

**رفع:** 1) بەرزکردنەوە، سەرخستن، بردنەسەر، هەڵێنان، هەڵکێشان. 2) یەکلاکردنەوە، بڕاندنەوە، لابردن، وەلانان. 3) لەناوبردن.4) هەڵگرتنەوەی بەروبووم. 5) دادخوازی، شکایەت. "**رفع ابهام**": لابردنی تەمومژو لێڵی. "**رفع احتیاج**": بەجێهێنانی نیاز و پێداویستی. "**رفع تکلیف**": لەکۆڵ خۆکردنەوە. "**رفع حاجت**": بڕوانە:"رفع احتیاج". "**رفع شدن**": لابران، وەلانران، لەناوچوون. "**رفع موانع**": لابردنی کۆسپەکان. "**رفع و رجوع**": لابردن و یەکالاکردنی کێشە یان ناکۆکی یان پاساودانی کاری هەڵە یان قسەی ناڕاست بە وریایی و بۆ پێشگیری لە توندتربوونەوەی پرسەکە.

**رفعت:** بەرز و بڵیندبوون، پایەبەرزبوون. لەسەرتری و مەزناهی.

**رفق:** نەرم و نیانی، نەرمکێشی، بە نەرمی و خۆشخولقی هەڵسوکەوت کردن، چاکە.

**رفقاء:** کۆی"رفیق"، هەوالان، دۆستان.

**رفقه:** گروپی هاوسەفەر و هاوڕێ، دۆستان و هاوڕێیان.

**رفل:** (رَ) لەنجەکردن، خلنگین، بەناز رۆیشتن.

**رفلکس:** کاردانەوە، دژکردەوە، پەرچەکردار.

**رفوزه:** رەدبۆوە، دەرنەچوو، سەرنەکەوتوو.

**رفوشه:** کایە، شۆخی، حەنەك، گاڵتەوگەپ. گوناه.

**رفوکاری:** بڕوانە:"رفوکردن".

**رفوکردن:** چناندن، چنینەوە، هیڤاستن، هیڤاشتن، کون گرتن بە تەقەڵ.

**رفیع:** بەرز، بڵیند، هەڵدراو. پایەبەرز. بەنرخ، هێژا.

**رفیق:** دۆست، هەواڵ، هەڤال، هەڤاڵ، هاڤال، ئاواڵ، هاواڵ، هاوەڵ، هاوڕێ، ئاوڕێ، هاوبازوو، هەمباز، هاوسەفەر. هاوڕێباز. "**رفیق سفر**": هاوسەفەر، هاوڕێی سەفەر. "**رفیق گرفتن**": دۆست گرتن، دەگەڵ کەسێك پێوەندی نامەشروع گرتن. "**رفیق گرمابه**": هەواڵی گیانی گیانی.

**رفیق باز:** کەسێ کە هەواڵی زۆری هەیە و زۆربەی کاتەکان دەگەڵ ئەوان رادەبوێرێ.

**رقّ:** (رِ) ا) بەندەیی، کۆیلەیی. 2) هەرشتێکی شل و ناسك. 3) گەڵای دار.

**رقا:** پێشکەوتن.

**رقابت:** 1) کێشك کێشان، چاوەڕێبوون. 2) ململانێ، رکبەڕکێ، بەربەرەکانی، پێشبڕکێ، حەمەڕەمزێ، هەڤدوبرن.

**رقاد:** (رُ) خەوتن، نووستن.

**رقاص:** 1) سەماکەر، کایکەردۆخ، داوەت گێڕ. 2) باندۆڵ. "**رقاص ماهر**": لیزەڤان.

**رقاصه:** سەماکەری ژن.

**رقاع:** (رِ) نامەکان، نووسراوە کورتەکان. پینەکان.

**رقاق:** (رُ) ناسك، تەنك.

**رقباء:** کۆی"رقیب".

**رقبه:** مل، ئەستۆ. مرۆڤ. "**در رقبه کسی**": لە ئەستۆی ئەو.

**رقت:** 1) ناسکی، جوانی. 2) هەستی بەزەیی و دڵسۆزی سەبارەت بە کەسێ یان شتێ. 3) تراوی، شلی. "**رقت قلب**": دڵناسکی. "**به رقت آوردن**": تووشی خەم و پەژارەکردن، کاریگەری تێکردن، کارتێکردن.

**رقت انگیز:** بەزەیییانە، ئەوەی مرۆڤ تووشی حاڵەتی بەزەیی و دڵسۆزی دەکا، کارتێکەر.

**رقت بار:** بڕوانە:"رقت انگیز".

**رقراق:** بەدرەوش، بەبریقە، شەوقدار.

**رقص:** هەڵپەڕکێ، سەما، وڕپڕای، لیز. "**رقص شتری**": سەمای هەرەمەکی، سێجرتە، سێجرتەکی، سێڕمەکی، سێمرەکی. "**جای رقص**": سەماگە، جێداوەت.

**رقصان:** سەماکەر، لە حاڵی سەماکردن دا.

**رقصنده:** سەماپێکەر، هەڵپەڕێن.

**رقصانیدن:** 1) هەڵپەڕاندن، سەماپێکردن. 2) کەسێك خستنە خزمەت خۆ بە شێوەی زیرەکانە، لەدەست دابوونی ئیختیاری کەسێك.

**رقص کنان:** لە حاڵەتی سەما دا، هەڵپەڕداپەڕین لە خۆشییان.

**رقصیدن:** سەماکردن، هەڵپەڕین، هەل پەڕین، هل پەرین، لەیزتن، لیزین، لیزتن.

**رقعه:** نامە، نووسراوە. پینە.پارچەیەك لە زەوی.

**رقم:** 1) ژمارە، رەنووس. 2) نووسین، هێڵ، نووسراوە. 3) نیشان. 4) واژۆ. 5) بڕیار، دەستوور. 6) چەشن، جۆر.

**رقم خوردن:** دیاریکران.

**رقم زدن:** 1) کێشانەوە، نیگارکێشان. 2) دیاریکردن. 3) واژۆکردن.

**رقمزن:** نووسەر، نیگارکێش، وێنەکێش.

رقم کردن: نووسین. نیگارکێشانەوە. واژۆکردن.

**رقود:** خەوتن، نووستن.

**رقیب:** 1) نگابان، پاسەوان، چاوەدێر، چاوەڕێ. 2) خەنیم، هاوچاو، رقەبەر.

**رقیع:** گەمژە، گەوج، بێئاوەز، بێشەرم.

**رقیق:** 1) نەرم و ناسك، باریك. 2) تراو، شل، هولنگ.3) (جوغرافیا) تویێ، تەنکۆڵە. 4) کۆیلە، بەندە. "**رقیق کردن**": کەمکردنەوەی خەستی تراو.

**رقیق القلب:** دل هلو، دڵنەرم، دڵناسك، دلۆڤان.

**رقیم:** نامە، نووسراوە.

**رك:** رەپ و راست، راست و رەوان، قسەی بێپەردەومینگە، بەئاشکرا، بێدەروایسی، سەراڤکی، هەربی، بێڕووبینی. "**رك گو**": قسەلەڕوو، کەسێ رەپ و راست قسە دەکا. "**رك و صریح**": کورت و کرمانجی، رەپاوڕەپ، رەپ و راست، سفت و سادە، بێ رووبینی.





**رکاب:** (ڕِ 2) رکێف، رکێو، ئاوزەنگی، زەنگوو، وزنگی. 2) ئەو وشترانەی سەفەریان پێدەکەن. "**رکاب افشاندن**": بزووتن، جووڵان. "**رکاب به رکاب**": شان بە شان، هاوڕێ. "**رکاب دادن**": رامبوونی ئەسپ بۆ سواری دان. ملدان، خۆبەدەستەوەدان، تەسلیم بوون. رەزامەندی ژن بۆ هاوجێیی. "**به زیر رکاب کسی بودن**": ملکەچی وی بوون.

**رکّاب:** (رَ) وشترسوار، سوارکار، سوارچاك.

**رکابدار:** نۆکەرێ کە رکێفی ئەسپەکە بگرێ تا ئاغاکەی سوار دەبێ.

**رکاك:** کۆی"رکیك".

**رکاکت:** کەم ئاوەزی، سستی، بێهێزی، لاوازی لە دەنگ و ئاوەز دا. ناحەزی، ناپەسندی.

**رکانت:** پتەوبوون، راوەستاو و پایەداربوون، سەنگینی و گرانی، قورس و قۆڵی.

**رکّت:** سست بوون، لاوازبوون، بێهێزبوون، کەم ئاوەزبوون.

رك زده: (رَ) قیت، زەق، رەپ. مات، سەرسام، واق وڕ. بەشێوەی نەگۆڕو بێبزووتن، بە حاڵەتی مات و وڕ.

**رکس:** (رِ) چەپەڵی، پیسی، گەماری. خەڵکی زۆر.

**رکض:** راکردن، هەڕاکردن، غاردان، تاودان، جووڵاندن، بزواندن.

**رکعت:** رکات، لەتێك لە نوێژ.

**رکلام:** ئاگاداری، بانگەشە، ریکلام.

**رکن:** 1) ئەستوون، کۆڵەکە. 2) پاژی گەورەتر و بەهێزتر لە هەر شتێك دا. 3) بەشی گرینگ و سەرەکی هەر شتێ. 4) کەسی گرنگ.

**رکوب:** 1) سواربوون. 2) بەبێ بیرکردنەوە کارێك کردن.

**رکود:** (رُ.کُ) داوێستاو، وەستان وەك وەستانی ئاو یان با، داسەکنین، نەبزووتن، نەجووڵان، مەندی. "**رکود اقتصادی**": وەستانەوەی ئابووری، مەندی ئابووری، دۆخێ کە لەودا داهاتی راستەقینەی سەرانە نەبزوو و یان روو لە دابەزینە.

**رکورد:** رێکۆرد، کەوتنەپێشەوە لە کێبەرکێدا، سەرکەوتنی شایان، بەرزترین دەرەنجام یان ئیمتیاز کە قارەمانێك لە یەکێك لە رشتە وەرزشییەکاندا وەدەستی دێ و بەفەرمی تۆمار دەکرێ. "**رکورددار**": خاوەنی زۆرترین پوان.

**رکوع:** چەمینەوە، چەمانەوە، داهاتنەوە، دانەوینەوە.

**رکون:** (رُ.کُ) چەمانەوە بۆ لای کەسێ یان شتێك و ئارام بوونەوە، هەدادان، سرەوتن، داسەکنین.

**رکیدن:** بڕوانە:"ژکیدن".

**رکیك:** 1) بێ هێز، لاواز. 2) قسەی ناحەز و سووك، کۆتیکۆ. 3) کەم و بێنرخ.

**رکین:** پتەو و قایم، خۆڕاگر، راوەستاو، سەنگین.

**رگ:** 1) دەمار، رەگ، رەه. 2) بنەچە، رەچەڵەك. 3) ریزێکی ئاسۆیی خشت یان بەرد یان بلووك. 4) غیرەت. 5) مەیل بۆ شتێ، بەریان بۆ شتێ. "**رگ خونی**": دەمارێ کە خوێن تێیدا دەگەڕێ. "**رگ گردن**": لەخۆبایی، بەدەماری. "**رگ و ریشە**": بنج و بناوان، بنەچەوڕەچەڵەك. "**سرخ رگ**": سوورەدەمار، خوێن بەر، دەماری خوێن راگوێز لە لەشدا. "**سیاهرگ**": خوێن هێن(ەر)، شینەدەمار. "**مویرگ**": رەهچك، وردە رەگی لەش، موولوولەخوێنەکان.

**رگبار:** 1) (رگبار گلولە)دەستڕێژ، دەسڕێژ. 2) (رگبار باران شدید) رەهێل، رەهێڵە، رێژنە، رەژنە، لێزمە، لاسامە، شپی، شەس، شەست، شەستەڕەهێڵە، گۆپاڵ باران، گوزم، خۆڕرەم، خوڕزم، تاوی باران. "**بە رگبار بستن**": دەستڕێژ لێکردن، وەبەر دەسڕێژدان، دانەبەر دەسڕێژ.

**رگبرگ:** قیتایی باریکی رەگ ئاسا لە گەڵای دارەکان و رووەکەکان.

**رگبرگ شدن:** ژانکردنی ئەندامێکی لەش بە هۆی جووڵەی توند و لەنکاو و پێچران یان لەجێدەرچوون/ترازانی دەمار لە جومگەدا، (رگبرگ شدن دست) دەسخەلیان، دەست وەرگەڕان.

**رگ جان:** شادەمار، شاڕەگ، رەگی حەیات.

**رگ زدن:** خوون بەردان، خوێن بەردان، خوێن گرتن لە دەمار.

**رگ شناس:** دەمارناس، کەسێ کە دەماەکانی لەش دەناسێ.

**رگ شناسی:** دەمارناسی، ناسینی دەمارەکانی لەش.

**رگل:** بڕوانە:"قاعدگی".

**رگلاتور:** تەکووزیدەر، ئامرازی تەکووزکردن، ئامرازی تەکووزی لە ماشێندا.

**رگلاژ:** هێڵ کێشی، تەکووزکردن، رێکخستن، رێکوپێك کردنی جووڵە و کاری بەشە جۆراوجۆرەکانی ماشێن.

**رگلمان:** رێکوپێك. ئایین نامە. بڕیار، دەستوور.

**رگ نهادن:** بریتی لە خۆبەدەستەوەدان، ملدان، مل کەچکردن.

**رگە:** 1) رەگ ئاسا، هەر شتێکی بە شکڵی خەت یان نەواری باریکی راست یان خواروخێچ . 2) رشتەیەکی باریك لە خوێن و شتی لەو بابەتە لە تراوێکی تردا. 3) بنەچە، رەچەڵەك. 4) ئاسەوار یان نیشانەیەکی نەهێندە ئاشکرا. 5) چینی جیاوازی خاك، هەرچینێ لە مەوادی کانزای شیاوی کەڵك وەرگرتن کە بکرێ دەربهێنرێ.

**رگەدار:** ناسافی و ژەنگ لە دەنگی ئینساندا بەهۆی زەبر وێکەوتن لە تارە دەنگیەکاندا.





**رل:** (رُ) 1) ئەرك، کار، نۆرە، کاری ئەکتەر. 2) دەور، رۆڵ، کاریگەری. 3) فەرمانی ماشێن. "**رل بازی کردن**": دەورگێڕان، رۆڵگێڕان. "**رل داشتن**": رۆڵ هەبوون، دەورهەبوون، نەخش هەبوون.

**رلەکردن:** بەهێزکردنی شەپۆلی رادیۆیی و تەلەویزیۆنی. جێبەجێکردن یان چارەسەرکردنی کار یان کێشەیەك.

**رم:** (رَ) ترسان و دەرچوون، راکردن و دەرچوون لە ترسان، رەو، سلم، سڵەمە، قوشقیبوون.

**رمّ:** (رَ) پرتووکیانی ئێسقان. نووژەن کردنەوە و چاك کردنەوەی خراوی بینا یان شتی دی.

**رمادیّ:** خۆڵەمێشی.

**رمّال:** 1) رەڵم فرۆش. 2) فالگرەوە، فالاوێژ، فالچی، خیرە، رەمڵ گرەوە. "**رمالی کردن**": خیرەگرتنەوە، رەملێ لێدان.

**رمان:** (رَ) 1) رەوکەر. 2) ترسەنۆك، لە حاڵی رەوینەوە دا.

**رمان:** (رُ) رۆمان، چیرۆکی درێژ. "**رمان احساسی**": رۆمانی هەست بزوێن. "**رمان شخصیتی**": رۆمانی کەسێتی.

**رمانتیسم:** شێوازی نوێ لە رۆمان نووسیدا، شێوازی نووسینی نووسەرانی رۆمانتیك، رۆمانتیك خوازی، ئەوین خوازی، شەیدایی، قوتابخانەیەکی ئەدەبی کە لە سەدەی نۆزدەهەمی زایینی دا لە فەڕانسە سەری هەڵدا و نووسەرەکانی خۆیان لە کۆتوبەندی رێساکانی ئەدەبیاتی کۆن قوتار کرد و روویان کردە ساکارنووسی و رەوانی دەربڕین.

**رمانتیست:** پێڕەوی قوتابخانەی رۆمانتیك، رۆمانتیك خواز.

**رمانتیك:** گێڕانەوەیی، رازەیی، رازەئاسا، قارەمان ئاسا، شاعیرانە، ئاشقانە، سەرنج راکێش، خەیاڵئامێز، خەوناوی، ناکردەیی، گەش بینانە، ئاڕمان خواز، رۆمانتیك.

**رمانك:** کورتەڕۆمان، نۆڤێلێت.

**رماندن/رمانیدن:** رەواندنەوە، سڵەماندنەوە، رەمانن، تۆڕاندن، دەرپەڕاندن، ڤەتروویسکاندن، ڤەتریسکاندن، وارەمەنە، ترساندنی ئاژەڵ و هەڵاتنی. دوورخستنەوە، لەناوبردن. "**برای همیشە رماندن و گریزاندن**": تارانن، تاراندن، تەرەکردن، رەواندنی یەکجاری.

**رمانی:** بەڕەنگی سوور. یاقووت.

**رمایت:** خستن، هاویشتن، تووڕدان، تیرهاویژتن.

**رمباندن:** تێك رماندن، تێك تەپاندن، رووخاندنی بن میچ و دیوار و شتی لەو بابەتە.

**رمبندە:** لە حاڵی داڕمان و تێك تەپین دا.

**رمبیدن:** تێك رمین، داڕمان، تێك رووخان، تێك تەپین.

**رم دادن:** بڕوانە:" رمانیدن ".

**رمز:** 1) هێما، ئاماژە، سەمبول. 2) رازی نهێنی. 3) (کامپیۆتێر) کۆد.

**رمزگان:** کۆد.

**رمزگـــذاری:** گۆڕینی بەرنامەی کار یان زانیارییەکان بە جۆرێ کە کامپیوتێر بتوانێ ئەوان ڕێکوپێك بکا. کۆد دانان.

**رمزگشایی:** کۆدکردنەوە.

**رمژك:** 1) خلیسکە، جێگەی خلیسکێن. 2) خەتا، هەڵە. 3) کەموکووڕی، ناتەواوی.

**رمژك اندیشی:** بڕوای هەڵە/نادروست.

**رمژكدار:** بڕوانە: "مقصر".

**رمس:** 1) ژێرخاك کردن، چاڵ کردن، شاردنەوە. 2) گۆڕ. 3) دەنگی بەئەسپایی.

**رمش:** سڵی، ڕەوەکیەتی، ترسان و هەڵاتن.

**رمشاء:** ژنی خۆشخولق. زەوی پڕگیا.

**رمضاء:** بەتین بوونی گەرما. زەوی گەرم بوو بە هۆی خۆرەتاوەوە. ڕەڵمی گەرم بوو بە هۆی تینی خۆرەتاوەوە.

**رمق:** هێزی کەم، دواهێز، نزگ، تاو، تین، نیوەهەناسە، هەناسەی کز و سەبرۆکە لە نەخۆشییەوە، ئاه، سەروزمان، سەروزوان، تابشتی زۆر کەم. "**آخرین رمق**": گیانەگوینە، دوایین پشوو، نووزە.

**رم کـــردن:** ڕەوینەوە، سڵکردن، سڵەمانەوە، سڵەمینەوە، پەرموون.

**رمکی:** بڕوانە: "رموك".

**رمگا:** بڕوانە: "مادیان".

**رمنده:** بڕوانە: "رموك".

**رمو:** بڕوانە: "رموك".

**رموز:** کۆی "رمز".

**رمـوك:** (رَ.مُ) تۆڕ، سڵ، سوڵ، سلك، سلمو، سرك، سرگ، قوشقی، ڕەوەك، ڕەوك، ڕەڤۆك، ڕەڤەك، ڕەمکەر، ڕەمکار، ڕەمکەر، جۆنگ، جەبە، چڵەك، بەیدەس، بەیدەست، تۆخس، پۆرخز، واپۆك، کوڕە، گورگە، چەمووش، ئەسپ یان ماینێك کە رام نەبووە و ناگیرێ.

**رموك:** (رُ.مُ) نیشتەجێبوون، لە شوێنێك جێگرتن و هەدادان.

**رمە:** ڕەوە، ڕەڤە، ڕەوك، ڕەوکە، ڕەوگ، کۆمەڵە ماین و ئەسپی شەو بە کێو، ران، مێگەل، ڕێوینگ. "**رمەگاو**": گائەل، گاگەل، گایەل. بە مانی سپا و لەشکر و گرووپی خەڵکیش هاتوە.

**رمەبان:** ڕەوکەوان، ڕەوگەوان، ڕەوەوان، ئاگاداری ڕەوکە، شوان، شڤان.

**رمەدار:** خاوەن ڕەوکە، ڕەوکەدار.

**رمەشـــدن/رمەگـــشتن:** کۆبوونـــەوە، خڕبوونەوە.

**رمەیار:** بڕوانە: "رمەبان".

**رمی:** خستن، فڕێدان، هاویشتن، هەڵدان.

**رمیار:** بڕوانە: "رمەبان".

**رمیدگی:** سلی، سڵی، ڕەوەکیەتی، ترسان و هەڵاتن.

**رمیدن:** سڵەمان، سڵەمینەوە، سڵەمانەوە، سڵەمیانەوە، سڵ کردن، سلکیان، سلکێن، سرِدین، ڕەوین، ڕەوینەوە، ڕەویانەوە،





ڕەڤین، ڕەوکردن، ڕەمین، هەڵاتن لە ترسان، ڕەمنای. "**رمیـــدە**": ڕەویو، سڵەمیو، هەڵوەدا، هەتلە، هەڵاتوو. پەرێشان و پەشۆکاو.

**رمیم:** پرتووکاو، پواو، رزیو.

**رنـج:** خەبس، مەینەتی، ئەرکی گران، کاری سەخت، چەرمەسەری، کوێرەوەری، چەوسانەوە، ئازار، ئێش، ڕەنج. "**رنج طاقت فرسا**": بارگرانی، بارگرانایی، ئەرك و ماندوویی زۆر، چەرمەسەری و کوێرەوەری زۆر، ڕەنج و زەحمەتی تاقەت پڕوکێن. "**رنـج بربـاد رفتـه**": ڕەنج بەبا، ڕەنجەڕۆ، ئەوەی بەهرەی لە ئەرکی خۆی پێنەگەیشتوە.

**رنج آزما:** بارقورس، بارگران، کەسێك کە ئەرکی زۆری لەسەرە.

**رنـج آزمـودە:** ئازار چەشتوو، مەینەتی کێشاو، سەختی دیتوو.

**رنـج آور:** ئازارهێن، ئازاردەر، سەختی و مەینەتی هێن.

**رنجال:** خواردەمەنی، خۆراك.

**رنجانـــدن/رنجانیـــدن:** تۆراندن، تووڕەکردن، قەڵس کردن، دلهشتن، دڵ ئێشاندن، دڵشکاندن، دڵشێلان، دڵڕەنجاندن، ڕەنجاندن.

**رنجاننده:** ئازاردەر، ڕەنجێن، دڵشکێن.

**رنجانیـــدە:** ڕەنجێنراو، دڵشکێنراو، ئازاردراو.

**رنج باریك:** نەخۆشی دیق، دەردەباریکە.

**رنجبر:** بارگران، بارقورس، ئەرك گران، ئەرك دەر، زەحمەت کێش، ڕەنجدەر، ڕەنجبەر. کرێکار.

**رنج بردن/رنج کشیدن:** ڕەنج دان، زەحمەت کێشان، ئەرکی گران کردن، مەینەتیکێشان، بەرگەگرتن لە بەرامبەر سەختی و چەرمەسەری، خەم و خەفەت خواردن.

**رنج بردە:** مەینەتی دیتوو، زیان دیتوو.

**رنج دیدن:** ئازاردیتن، زیان دیتن، تووشی ڕەنج و مەینەتی بوون.

**رنج دیدە:** مەینەتی کێشاو، تووشبوو بە ڕەنج و زەحمەت.

**رنجش:** تۆران، ڕەنجان، زیزبوون، خێز، دڵشکاوی، دڵ ڕەنجان، ڕەنجاوی، ملولەی، عاجزی.

**رنجش خاطر:** دڵشکان، دڵڕەنجان.

**رنج کش:** زەحمەت کێش، ڕەنجدەر.

**رنجگی:** دڵشکستی، دڵشکیان، ڕەنجیان.

**رنجمنـــد:** دەردکێش، دەردەدار، دەردبار، ئێشدار، ڕەنج کێشاو.

**رنجـــور:** ڕەنج کێشاو، ئازاردیتوو/ چەشتوو، دەردکێش، لەش بەبار، نەخۆش، دەردەدار، خەمگین.

**رنجـوردار:** نەخۆش دار، کەسێك کە نەخۆشی لە ماڵ دایە.

**رنجورگونـــە:** وەك نەخۆش، وەك دەردەدار، نەخۆش ئاسا.

**رنجـوری:** نەخۆشی، لەش بەباری، دەردەداری، ناسازی، ڕەنجیان.

**رنجه:** رەنجاو، دڵ ئێشاو، دڵشکاو، دڵتەنگ. "**رنجەشدن**": رەنجان، دڵ ئێشان، دڵشکیان، زیزبوون، تۆران.

**رنجیدگی:** دڵشکان، دڵشکیان، دڵ شکستی، رەنجیان.

**رنجیدن:** دڵمان، دلماین، رەنجان، رەنجین، رەنجیان، دڵشکان، دڵ ئێشان، نارەحەت بوون، دڵپڕبوون، دڵتەنگ بوون. "**رنجیدن از...**": لەبەر دڵ کەوتن، خۆش نەویستن، دل ژێچوون.

**رنجیده:** دڵشکاو، دڵ ئێشاو، دل مای، رەنجاو، تۆراو، زیز، زویر، دڵتەنگ، دڵپڕ، ملوول، خێز، سه، سڵ و قوشقی.

**رنجیدهخاطر:** دڵڕەنج، رەنجاو، دڵشکاو، دڵ ئێشاو، دڵگران، دڵمەن، دڵمەند، بەگلەیی، عاجز.

**رند:** 1) زیرەك، زرنگ، فێڵباز. 2) نەترس، بەجەرگ، چاونەترس، گوێ نەدەر. 3) ئەوەی بە وریایی و تیژبینی پەی بە نهێنییەکانی خەڵك ببا. 4) بێ سەروپێ، بەرهەڵدای بێکارە. 5) رەند، مێرخاس. 6) کەسی دڵپاك و ئازادبیر و هەقیقەت دۆز و رواڵەت بەهێندنەگر.

**رندآسا:** وەك رەند، رەندئاسا.

**رندش:** تاشین، تراشین، رەندەکاری. ئارداسن، تۆپاڵ، ئاردەمشار.

**رندیدن:** رەندەکردن، تاشین، تراشین. رووشاندن، رنین. سڕین و پاك کردنەوە، جیاوەکردن.

**رنسانس:** رینسانس، نوێبوونەوە، تازەبوونەوە، بووژانەوە، ژیانەوە، ڤەژیان، لەدایك بوونەوە، گەڕانەوە. سەردەمانێ لە مێژووی ئورووپا کە سەردەمی بووژانەوەی ئەدەبیات و زانستەکان و پیشەسازی لە نێوان سەدەکانی چاردە تا شازدەیە.

**رنگ:** 1) رەنگ، چۆنیەتی هاتنە بەر چاوی دیمەنێك لە سپیەتی، سووری و هتد. 2) سوود، قازانج، برەو، رمێن. 3) مەکر، فێڵ. 4) جلوبەرگی دەروێشان.5) لایەن، حاڵەت. 6) بەش، پشك.7) توانایی، هێز. 8) نەخش، نیگار. 9) نیشان، ئاسەوار. "**رنگ اصلی**": هەرکام لە سێ رەنگی سەوز و سوور و شین کە لە تێکەڵ کردنی ئەوان رەنگی سپی وەدەست دێ. "**رنگ چیزی را گرفتن**": وەك ئەولێهاتن، رەنگی وی گرتن. "**رنگ عوض کردن**": بڕوا و سەلیقە گۆڕین، هەڵوێست گۆڕین. "**ثابت رنگ**": خۆڕەنگ، رەنگ بەس، رەنگ نەچۆوە.

**رنگ آمیز:** نیگارکێش، وێنەکێش، رەنگێن، کەسێك کە رەنگەکان تێکەڵ دەکا.

**رنگ آمیزی:** 1) رەنگاندن، رەنگانن، رەنگ لێدان، رەنگ تێ هەڵسوون، کفتکاری. 2) فێڵبازی، مەکربازی، ریا.

**رنگارنگ:** ئاڵایی، رەنگاڵە، رەنگامە، پڕلە رەنگ، چەند رەنگ لە شتێك دا، بەلەك بردێن، ئاڵوواڵا، رەنگین، رەنگاوڕەنگ.





**رنگ انداختن:** 1) کەوتنە ژێرکاریگەری، کارتێکران. 2) رەنگ گۆڕین بەتایبەتی لە شەرم یان نارەحەتیان، رەنگ پەڕین.

**رنگ باختن:** 1) رەنگ پەڕین، رەنگ فڕین، رەنگ پێنەمان، رەنگ گۆڕین، رەنگ بزرکان، هەڵ بڕزکین، هەڵبڕزکان، هەڵبزڕکان، هەڵ بزڕکین، هەڵ بڕسکان، هەڵپڕووسقان، هەڵپڕووزقان، هەڵپزگڕان، سپیبوون/ بوونەوە، سپی هەڵگەڕان. 2) لەبرەوکەوتن، بێبرەوبوون. 3) لاواز و ناکاریگەربوون، بەرەو نابوودی چوون. "**رنگ باختن از ترس**": هەڵپڕووزقان، هەڵپڕووسقان، هەڵپڕووسقیان، هەڵپڕووزکان، هەڵپڕووزکین، سپی هەڵگەڕان لە ترسان. "**رنگ باختن پارچە از شستن**": رەنگ دانەوە، کاڵبوونەوەی رەنگی قوماش. "**سبب رنگ باختن کسی شدن**": هەڵ پڕووزقانن، هەڵ پڕووسقانن، هەڵ پڕووزکانن، بوونە هۆی رەنگ پەڕینی کەسێك.

**رنگ باخته:** رەنگ پەڕیو، رەنگ پەڕیگ، رەنگ فڕیو، رەنگ چووگ، هەڵبزڕکاو، هەڵپڕووسقاو، کاڵەوەبوو.

**رنگ باز:** فێڵەزان، بەفرتوفێڵ.

**رنگ برنگ:** رەنگاوڕەنگ، جۆراوجۆر. "**رنگ برنگ شدن**": رەنگ گۆڕین، رەنگ هێنان و بردن. نارەحەت و شەرمەزاربوون.

**رنگ بری:** رەنگ سڕینەوە، لەناوبردنی رەنگی شتێ.

**رنگ پریده:** رەنگ پەڕیو، رەنگ پەڕیگ، رەنگ بزڕکاو، هەڵ بزرکاو، سپی یان زەرد هەڵگەڕاو، رەنگ و روو ناخۆش، بێماد.

**رنگ پس دادن:** 1) رەنگ دانەوە. 2) سوورهەڵگەڕان لە شەرم و حەیا.

**رنگ دادن:** رەنگ دانەوە.

**رنگرز:** رەنگڕێژ، خومچی، خومخانەچی، خومگەر، خمگەر.

**رنگرزی:** رەنگڕێژی، خومگەری، خومخانە، خمخانە.

**رنگ رنگ:** بڕوانە:"رنگ برنگ".

**رنگ رو:** رەنگی دەموچاو، رەنگ و روو، دیمەنی روخسار.

**رنگ ریختن:** 1) دەست نیشانکردنی نەخشەی بینا لەسەر زەوی بە رشتنی گێچ. 2) چارەدۆزی یان فرتوفێڵ بەکاربردن. 3) رەنگ فڕین، رەنگ پێنەمان.

**رنگ ریز:** رەنگڕێژ، خومچی، نیگارکێش، وێنەکێش. فێڵباز، بەمەکروفێڵ.

**رنگ زدایی:** رەنگ سڕینەوە.

**رنگ زردی:** رووزەردی، شەرمەزاری، خەجاڵەتی.

**رنگ زدن:** 1) رەنگ لێدان، رەنگ کردن. 2) نەخشەکێشان، پیلان کێشان.

**رنگ طبیعی:** خۆڕەنگ، رەنگ بەس، رەنگی خواکرد، رەنگی سروشتی.

**رنگ کار:** 1) رەنگ کار، نیگارکێش، شێوەکار، کەسێك کە شوێنێ یان شتێ رەنگ بکا. 2) فریودەر، هەڵخڵەتێن، مەکرباز.

**رنگ کردن:** 1) ڕەنگ لێدان، ڕەنگ کردن، ڕەنگاندن، گۆناندن، بە ڕەنگ داپۆشین. 2) فریودان، هەڵخەڵەتاندن.

**رنگ گرفتن:** 1) ڕەنگ گرتن. 2) کاریگەری وەرگرتن، کارتێکران. 3) برەوسەندن، وەبرەوکەوتن، باوسەندن..

**رنگناك:** بڕوانە: "رنگین".

**رنگ و رو:** ڕەنگوڕوو، دیمەنی چڕوچاو، ڕەنگ و ڕواڵەتی شتێ، جوانی و درەوشاوەیی. "**رنگ و رو رفته**": کۆنە و پرتوکیاگ، ڕەنگ و ڕوو پێوەنەماو.

**رنگ و وارنگ:** بڕوانە: "رنگارنگ".

**رنگی:** ڕەنگی، تێکەڵ بە ڕەنگ، بە ڕەنگی جۆراوجۆر.

**رنگی شدن:** ڕەنگ گرتن، ڕەنگ پێوەنووسان، ڕەنگاویبوون.

**رنگین:** ڕەنگین، ڕەنگاڵەیی، ڕەنگامەیی، ڕەنگاوڕەنگ. بە حاڵەتی دڵخۆشکەر. فریودەر.

**رنگین کره:** بڕوانە: "کروموسفر".

**رنگین کمان:** کۆلکەزێڕینە، کۆلکەڕەنگینە، پەلکەزێڕینە، پەلکەڕەنگینە، کەسکوسوور، کەسکوسۆر، کەسکەسۆر، کەلەستون، کێرستوون، کێلستوون، ئەستوونەزێڕینە، هەسارەزەڕینە، هەسێرەزێڕینە، هۆرەوری، موندای ئاشمە، موندا حەزرەتی فاتمە.

**رنین:** گریان و شیوەن، دەنگ بەرزکردنەوە بە گریان و شیوەن. دەنگی خەمناك.

**رو:** 1) بڕوانە: "چهرە". 2) بان، ڕوو. 3) شەرم، حەیا. 4) شکڵ. "**از این رو**": بەم هۆیە. "**از این رو به آن رو شدن**": گۆڕان. "**ازچه رو**": بۆچی، لەبەرچی. "**از رو بردن کسی**": شەرمەزارکردن یان ناچار بە تەسلیم کردنی ئەو، لە مەیدان دەرکردنی ئەو. "**از رو خواندن**": خوێندنەوە لە ڕووی نووسراوەیەکەوە. "**از رو رفتن**": لە ڕوو چوون، تەریقەوبوون، خەجاڵەت کێشان. "**به رو آوردن**": دژکردەوە نیشاندان. "**به هیچ رو**": هەرگیز، بەهیچ کلۆنجێ.

**روآتی:** ڕواڵەتی، ڕووکەشی.

**روآمدن:** 1) هاتنەبان، دەرکەوتن. 2) کەوتنە دۆخێکی باشترەوە، پێشکەوتن. 3) چاك بوونەوە، خاسەوەبوون.

**روآوردن/ روی آوردن:** ڕووتێکردن، ڕووکردنە کەسێك بەرەو لای چوون.

**روا:** 1) شیاو، شایستە. 2) باو، برەودار، بەرمێن. 3) ڕێپێدراو، رجوا، ڕەوا، حەڵاڵ. 4) بڕوانە: "نافذ". "**روابودن**": حەڵاڵ بوون، شیاوبوون، ڕەوابوون. "**رواداشتن**": بە ڕەوا زانین، بە حەڵاڵ زانین. "**روادیدن**": بەڕەوازانین، ڕەوادیتن، بڕوایی، رجوادیتن/دین، دڵ پێ ڕازیبوون، پێ قایل بوون، قیم پێ ئانین، قیمیش، دڵ بەرایی دان، چاوهەڵاتن، چاوپێهەڵاتن. "**رواشدن**": حەڵاڵبوون، ڕێپێدران، باوسەندن، وەبرەوکەوتن، وەدیهاتنی نیاز. "**روایی**": ڕەوابوون، برەو، ڕمێن.

**روابط:** کۆی "رابطە". "**روابط عمومی**": بەشێ لە ڕێکخراو یان فەرمانگە کە بەرپرسێتی دروستکردنی پێوەندی دەگەڵ ڕێکخراو و بنیاتەکانی تر و کەسانی ناو کۆمەڵگای لە ئەستۆیە. پێوەندی سازکردن دەگەڵ کەسانی جۆراوجۆر.

**رواتب:** کۆی "راتب".

**رواج:** برەو، باو، پەرە، ڕمێن، هەڕمێن، گەڕ، گەردان، فرۆخت، فرۆش. "**رواج دادن**": برەوپێدان، پەرەپێدان، کردنەباو. "**رواج داشتن**": برەو هەبوون، باوبوون. "**رواج یافتن (گرفتن)**": باوسەندن، باوسەنن، وەبرەوکەوتن، برەوپەیداکردن، پەرەگرتن، پەرەسەندن، بەرەو زیادی چوون. "**از رواج انداختن**": لە برەو خستن، بێڕمێن کردن، مەراشتن.

**رواجگر:** برەوپێدەر، وەڕمێن خەر.

**رواح:** 1) هاتن و چوونی شەوانە. 2) هاتوچۆ، ئاموشۆ. 3) کاتی شەو، سەرەتای شەو.

**روادار:** کەسێ کە شتێ بە ڕەوا بزانێ، کەسێك کە شتێك بۆ کەسێك بە حەڵاڵ بزانێ.

**رواداری:** 1) بەڕەوازانین. 2) تەحەمولی شتی ناخۆش و بیروبۆچونی دژبەر بەبێ بیرتەسکی، هەڵکردن دەگەڵ دژبەر، مدارا، "تۆلێرانس".

**رواداشتی:** ڕێپێدراوی.

**روادید:** ویزا، دەربڕین یان واژۆیەك کە متمانە بە نووسراوەیەك دەبەخشێ.

**روارو:** زۆری هاتوچۆ، لێکدالێکدا و بەپەلە ڕۆیشتنی گروپێك لە خەڵك یان سپا. پشت سەرییەك.

**رواکرد:** ئیزن، ئیجازە.

**روال:** ڕەواڵ، شێوە، شێواز، ریتم، تەکووزی و ڕێکوپێکی.

**روان:** 1) دەروون، گیان، ڕۆح، نەفسی مرۆیی. 2) ڕێبوار، ڕێوار، ئەوەی بە ڕێدا دەڕوا. 3) لە حاڵی ڕۆیشتندا. 4) ڕەوان، خوڕ، بێگیر، هەرچیەك لە ڕۆیشتندا گە نەکا. 5) تراو، ئاوەکی. 6) شارەزا، لەبەر (درسش را روان است). 7) بڕوانە: "پویا". 8) نەرمی و ئارامی. 9) بەبێ ئاڵۆزی، ڕەوان. 10) بەخێرایی، زوو. 11) بڕوانە: "رایج". "**آب روان**": ئاوی بەخوڕ، ئاوێ کە بە جۆگەدا بڕوا. "**سرو روان**": بریتی لە دلبەرێك کە قەڵافەتی وەك سەروی هەیە و بە ڕێدا دەڕوا. "**طبع روان**": تەبع و زەوقێ کە بە ئاسانی و بێ خۆنوێنی شێعر بهۆنێتەوە. "**شعر روان ـ سخن روان**": شێعر و پەیڤی نائاڵۆز و ڕەوان. "**روان کردن**": لەبەرکردنی وانە.

**روان آسا:** ئاسوودەکەری رۆح و دەروون، دڵکەرەوە، دڵخۆشکەر.

**روان آشفتگی:** دەروون پەشێوی/شێواوی.

**روان آمرز:** 1) لێبوردە، لێبووردوو. 2) خواڵێخۆش بوو، کۆچکردوو.

**روان بخش:** 1) داینەدەی گیان، گیان بەخش، رۆح بەخش. 2) بڕوانە:"روح القدس".

**روان بد:** (ر.بُ) خاوەن رۆح و گیان، نەفسی گشتی.

**روان بیمار:** دەروون نەخۆش.

**روان پالش:** بەتاڵ کردنەوەی گرێی دەروونی.

**روان پریشی:** دەروون ئاڵۆزی، دەروون پەرێشی، دەروون پرۆکی، "پسیکوز".

**روان پزشکی:** دەروون پزیشکی، زانستێ کە سەبارەت بە لایەنە جۆراوجۆرەکانی رۆحی و چارەسەری نەخۆشییە دەروونییەکان دەدوێ.

**روان تنی:** تایبەتمەندی دەستەیەك لە نەخۆشینە دەروونییەکان کە نیشانەی جەستەییان پێوەدیارە.

**روا نخواه:** سواڵکەر، دەرۆزەکەر.

**روان داختن:** روولێنان، خستنە رووی داخوازییەك، بریتی لە تکا و پاڕانەوە و پێداگری.

**روان داشتن:** ناردن، رەوانەکردن. 2) رەوان کردن، خستنە خانەی جێبەجێ کردنەوە. 3) لەبەربوون.

**روان درمانی:** چارەسەر کردنی پشێوییە دەروونییەکان لە رێگەی دەروون شیکارییەوە.

**رواندن/روانیدن:** 1) خستنە ڕێ، وەڕێخستن، ناردن. 2) بەخوڕکردن، وە جەریان خستن. 3) باوکردن، بەرمێن کردن.

**روان ساختن:** 1) ناردن، رەوانەکردن. 2) وەجەریان خستن، بەردانەوە( بچۆ بەری ئاوەکە بەرەدەوە).

**روان سالار:** بڕوانە:"روان بد".

**روان سنجی:** هەڵسەنگاندنی لایەنگەلێکی دیاریکراو لە تایبەتمەندییە زەینییەکان وەك بەهرە و توانایی و پێشکەوتنی مرۆ لەباری چۆنیەتی و ژمارەیی.

**روان شاد:** خواڵێخۆشبوو، کۆچکردوو.

**روان شدن:** چوون، رۆیشتن، وەڕێکەوتن، رێکەوتن. 2) جەریان پەیداکردن، رەوان بوون. 3) فێربوون و لەبەرکرانی وانە.

**روان شناختی:** دەروون ناسانە.

**روان شناس:** دەروون ناس، پسپۆڕی دەروون ناسی.

**روان شناسی:** دەروونناسی، دەروونزانی، پسیکۆلۆژی، لێکۆڵینەوە لە چلۆنایەتییە دەروونییەکان، تاوتوێ و توێژینەوەی کێشە دەروونییەکان، موتاڵای کردارەکانی زەین وەك تێگەیشتن. بیرگە. هزر. هەست. و چۆنیەتی کردەوە و هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ.





**روان شناسی گری:** دەروون ناسی گەری.

**روانکاو:** دەروون شیکار، دەروون توێژ، پسپۆڕ لە دەروون شیکاری.

**روانکاوانه:** دەروون شیکارانە.

**روانکاوی:** دەروونشیکاری، "پسیکانالیز".

**روانکاه:** رۆح/گیان پڕوکێن، ئازاردەری رۆح، رەنجێن، ئەوەی ببێتە هۆی خەمۆکی و دڵتەنگی رۆح.

**روان کردن:** 1) ناردن، هنارتن، هەناردن، رەوانەکردن، وەڕێخستن. 2) وەجەریان خستن. 3) بەرەودان، پەرەپێدان. 4) لەبەرکردنی وانە یان بابەتێك. 5) نەرم و رەوان کردن.

**روان گردان:** تایبەتمەندی دەوایەك کە دەبێتە هۆی گۆڕینی حاڵەتە دەروونییەکانی کەسێك.

**روانگری:** رەوانی، بێگیری.

**روانگی:** رەوان بوون، جەریان.

**روانگیر:** گیان ستێن، ئەوەی رۆح لە ئینسان بستێنێ.

**روان نژندی:** جۆرێ تێکچوونی دەروونی و سۆزداری کە تەنیا کاردەکاتە سەر بەشێك لە کەسێتی تاك و تێکچوونی جەستەیی و فیزیۆلۆژیکی و دەروونی بەدواوەیە و نیشانەگەلێکی وەك نیگەرانی یان ترسی لەگەڵایە.

**روانه:** ناردراو، نێردراو، رەوانە، رێکەوتوو. "**روانه شدن**": رەوانەبوون، بەڕێکران، رێکەوتن، چوون. "**روانه کردن**": ناردن، هەناردن، بەڕێکردن، رێکرن، رەوانەکردن.

**روانی:** 1) تووش بوو بە نەخۆشی دەروونی.2) رەوان بوون. 3) زوو، خێرا.

**روانیدن:** بڕوانە:"روان کردن".

**روایت:** گێڕانەوە، گێڕاندنەوە. حەدیس، هەواڵ، هەقایەت. "**روایت کردن از کسی**": لێگێڕانەوە.

**روایی:** 1) برەو، باو. 2) نرخ، بایەخ. 3) بەراوردکران، هەڵسەنگێنران. 4) گێڕانەوە ئاسا، لایەنی چیرۆکی.

**روباز:** سەراوەڵە، بێمێژ، بێداپۆشەر.

**روباس:** پاڵاوتنی کانزا و پوختەکردنی.

**روبان:** گەسك لێدەر، لە حاڵی گەسك دان دا. رووبان.

**روبر:** (رُ.بُ) مودێل، نموونە.

**روبراه:** ئامادە، ساز. "**روبراه شدن**": 1) ئامادەی سەفەربوون، ئامادەی کاربوون. 2) رێکخران، سەروبەربوون، جێبەجێ بوون.

**روبرتافتن:** روو وەرگێڕان، روو لێ وەرگێڕان، پشت تێکردن.

**روبرگردان:** روو وەرگێڕ، پشت تێکەر.

**روبرگرداندن:** بڕوانە:"روبرتافتن".

**روبرو:** رووبەڕوو، بەرامبەر بە یەك. "**روبروشدن**": رووبەڕووبوون(ەوە)، تووشی یەك هاتن، گەیشتنە رووبەڕووی یەکتر. "**روبروکردن**": رووبەڕووکردنەوە، بەرەورووکردنەوە، لە بەرامبەر یەك دانان، هەڤڕوکرن.

**روبستن:** داپۆشینی دموچاو.

**روبنا:** سەرخان، ژوورخان، (کۆمەڵناسی) لە مارکسیسم دا واتە بنیاتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگییەکانی کۆمەڵگایەك.

**روبند شدن:** کەوتنە رووده‌ربایستییەوە.

**روبوسی:** ماچوموچ، دەستومشتاق، دەستومچ، یەکتر ماچ کردن.

**روبهانه:** وەك ڕێوی، ڕێویانە، وەك ڕێوی فێڵاوی.

**روبەشانگی:** فرتوفێڵی، فێڵەبازی.

**روبەقبلەشدن:** لە کاتی مەرگ دابوون.

**روبەمزاج:** ڕێوی ئاسا، لاواز و ترسەنۆك.

**روبیدن:** گەسك لێدان، گسك دان، ماڵین، ڕاماڵین، دەردان.

**روبیده:** گەسك لێدراو، ڕاماڵراو، ماڵاو، ماڵدراو.

**روپوشاندن:** خۆحەشاردن، خۆشاردنەوە، خۆدەرنەخستن.

**روتاسیون:** گەڕان، سوڕ، دەور، دەوران.

**روتافتن:** 1) بڕوانە: "روبرتافتن". 2) هەڵاتن، ڕاکردن.

**روح:** (ڕَ) شنەی خۆش، بۆنی خۆش. دلۆڤانی، دڵسۆزی. ئاسوودەیی. سەرکەوتن و دڵخۆشی.

**روح:** (ڕُ) ڕۆح، رح، گیانی گیاندار، لە ڕووی فەلسەفییەوە: بریتییە لە حەقیقەتی بیرکەرەوە و ئەو خودەی کە وێنای شتەکان دەکا لە بەرامبەر بابەتە وێناکراوەکەدا و بەرامبەریشی ماددە دێ هەر وەك چۆن بەرامبەر جەستەش بەکار دێ. "**روح دمیدن در (به) چیزی (کسی)**": ڕۆح دەبەرنان، بەهێزکردنی وی. "**روح کسی تازەشدن**": هاتنەحاڵ، کەیف سازبوون، بووژانەوە. "**روح کسی خبر نداشتن**": بەتەواوی بێئاگابوون لێی.

**روحاً:** لەباری ڕۆحییەوە.

**روح افزا:** (ڕُ) گیان بەخش، شادی بەخش، دڵخۆشکەرە.

**روح الارواح:** گیانی گیانەکان.

**روح القدوس:** 1) گیانی پاك، گیانی پیرۆز. 2) جوبڕەئیل. 3) ئەو ڕۆحەی کە لە حەزرەتی مریەم دا دیارکەوت و حەزرەتی عیسای (د.خ) لێکەوتەوە.

**روح اللّه:** نازناوی حەزرەتی عیسا(د.خ).

**روحانی:** زانای ئایینی، بیرمەند و پێشەوای ئایینی، رووحانی. "**روحانی نما**": زانای ئایینی ساختەیی.

**روحانیّت:** ئایینی بڕوا بە ناشتێتی بوونی ڕۆح(گیانی گیانداران). گیانکی، کارێ کە شێخ و مەلا دەیکەن. پاکی و پیرۆزی و خۆپارێزی. مەعنەوی. "**جامعە روحانیّت**": گروپی پێشەوا ئایینییەکان.

**روح بخش:** بڕوانە: "روح افزا".

**روح پرور:** ڕۆح پەروەر، گیان بەخش.

**روح گرایی:** بڕوامەندی بەوەی کە ڕۆح وەك جەوهەرێکی سەربەخۆ لە جەستە بوونی هەیە. بڕوابوون بەوەی کە مردوەکان لە ڕێگەی ڕۆحی خۆیانەوە دەگەڵ زیندووەکان پێوەندییان هەیە.

**روحیات:** کۆی "روحیه".

**روحیه:** ورە، تین و تاوی دڵ. تایبەتمەندیی دەروونی و ڕەفتاری کەس. "**روحیه خود را باختن**": ورەبەردان، هەست بە لاوازی و بێهومێدی کردن، لەدەست دانی بەرگری خۆ. "**روحیه دادن**": ورەبەرز کردنەوە، ورەپێدان.

**روحی فداه:** ڕۆحم دەبەری مرێ.

**روخوانی:** رووخوێنی، لە ڕووی نووسراوەیەکەوە خوێندنەوە.

**روداد:** بڕوانە: "رویداد".

**رودادن:** 1) بڕوانە: "رخ دادن". 2) ڕووپێدان، ڕوودان، خۆشویستن و لاواندنەوە.

**رودار:** بێ شەرم، پڕڕوو.

**روداشتن:** (لە)ڕووهاتن، پڕڕووبوون.

**رودربایستی:** لەڕوونەهاتن، کەم ڕوویی، شەرمنی لە قسەکردندا، رووده‌ربایستی، شەرم و حەیا.

**رودررو:** بڕوانە: "روبرو". "**رودررو ایستادن**": بەربەرەکانێ، دەگژڕاچوون.

**رودست:** باڵادەست، سەرووتر و باشتر لە کەسێ یان شتێ. "**رودست خوردن**": فریوخواردن، هەڵخڵەتان، هەڵفریوان. "**رودست زدن به کسی**": فریودانی وی، هەڵخەڵەتاندنی ئەو، خستنە داوەوە. "**رودست نداشتن**": بێهاوتا بوون، بێوێنە بوون.

**رودل/ روی دل:** سقڵ، گرفت، سابخۆر، ئینتەلا.

**رودوزی:** سەردروو.

**رودوشی:** چارۆك، چارۆکە، چارەکە، چارەگە.

**روده:** ریخۆڵە، روخڵە، ڕەیخەڵۆك، ڕۆڵەخوای، ڕۆدی، ڕۆڤی، ڕوویڤك. "**رودەبر شدن**": زۆرپێکەنین و لەسەرخۆچوون، شاگەشکەبوون.

**رودەدراز:** بریتی لە نووزەدرێژ، چەنەبازی چەقەکەر، فرەوێژ.

**روراست:** یەکڕو، بێڕیا، ڕاست و ڕەوان، بێدرۆ و ڕووبینی.

**روز:** ڕۆ، ڕۆژ، بەرامبەری شەو. "**روز روزش**": ڕۆژی خۆی، ڕۆژێ کە کاتی لەبارە بۆ ئەنجامدانی کارێك. "**بەروز**": بەپێی سەردەم و پێداویستییەکانی ڕۆژ یان هەڵگری نوێترین زانیارییەکان. "**به روز سیاه نشاندن کسی**": بەدبەخت کردنی وی. "**هر روز خدا**": هەمیشە، دایم.

**روزآمد:** بەپێی سەردەم و پێداویستییەکانی ڕۆژ یان هەڵگری نوێترین زانیاییەکان. "**روزآمد کردن**": سەردەمییانەکردن، بەئەمڕۆیی کردن.

**روزافزون:** روولەزیادبوون، ئەوەی هەر رۆژەی لەزیادبوون و بەرزبوونەوە دایە.

**روزافکن:** تاو و لەرزێ کە هەر رۆژ ناڕۆژێك سەرهەڵدەدا.

**روز امیدوبیم:** رۆژی پەسڵان، قیامەت، رۆژی لێپرسینەوە.

**روزانه:** رۆژانە، رۆژینە، بە رۆژ تا شەو، رۆژ بە رۆژ، هەر رۆژە، رۆژگار، کرێی رۆژ بە رۆژ. بە مانای رسق و رۆزیش هاتوە. "**تب روزانه**": رۆژ تا، نۆبەتێ کە هەر بە رۆژە، بەرانبەری شەوتا.

**روزبان:** درگاوان، پاسەوانی درگا.

**روز بازخواست:** رۆژی پەسڵان، رۆژی قیامەت، رۆژا پاشین، رۆژی لێپرسینەوە.

**روزبه:** خۆشبەخت، بەختەوەر.

**روزبەروز:** رۆژبەڕۆژ، هەر رۆژە، رۆژ لە دوای رۆژ.

**روزبهی:** بەختەوەری، خۆشبەختی.

**روز پسین:** رۆژی قیامەت، رۆژا پەسڵانێ.

**روز جزا:** رۆژی قیامەت، رۆژی سزادان.

**روزحشر:** نیرڤانا، رۆژاپەسڵانێ، رۆژا پاشین.

**روزخسب:** تەمبەڵ، تەوەزەل، کەسێك کە بە رۆژ بخەوێ و نەچێتە کار.

**روزدرنگ:** رۆژی راوەستان، رۆژاسڵاتێ، رۆژا پاسین، قیامەت.

**رو زدن:** روولێنان.

**روز رستاخیز:** بڕوانە: "روز بازخواست".

**روزرو:** شۆفیرێ کە بەڕۆژ ئیش دەکا.

**روز سیاه/روز سیه:** رۆژی ماتەم، رۆژی خەم و خەفەت، رۆژی سەختی و مەینەت، رۆژی رەش.

**روزشدن:** رۆژبوونەوە.

**روز شمار:** (رُ.زِ.شُ) رۆژی لێپرسینەوە، رۆژی قیامەت.

**روزشمار:** (رُ.شُ) رۆژژمێر، رۆژئەژمێر. چاوەڕوان، چاوەڕێ.

**روز قطبی:** رۆژێ کە ماوەکەی زیاتر لە بیست و چوار کاتژمێرە.

**روز قیامت:** پەسڵان، سەڵا، رۆاپاشین، رۆژی قیامەت.

**روزك:** زەمانێکی کورت.

**روزکار:** رۆژی هەوڵ و تەقالا، رۆژی شەڕ.

**روزکور:** رۆژکوێر، کەسێك کە بە رۆژ و لەبەرامبەر هەتاو دا چاوی نەبینێ، پێچەوانەی شەوکوێر.

**روزگار:** رۆژگار، رۆجیار، رۆچیار، سەردەم، سەروبەند، وەخت، کات، دەوران، زەمانە، دنیا. "**روزگاربردن**": 1) تێپەڕاندنی رۆژ، رۆژبەسەربردن، کات بە سەر بردن، ژیان کردن، رابواردنی رۆژەکانی تەمەن. 2) خۆوەدواخستن، پێچوون، کات بەخت کردن، سەبرکردن. "**روزگار یافتن**": مۆڵەت /دەرفەت پەیاکردن، بۆکران.

**روزگانه:** رۆزی، خواردەمەنی هەر رۆژە، هەقدەستی رۆژانە.





**روزگرد:** 1) خۆر، رۆژ. 2) گوڵی گوڵەبەڕۆژە.

**روزگون:** وەك رۆژ، سپی و رۆشن وەك رۆژ.

**روزمبادا:** رۆژی خۆی، رۆژی مبادا.

**روزمرّه:** رۆژانە، هەر رۆژە، هەمیشەیی.

**روزمزد:** رۆژمز، رۆژمزە، رۆژمژ، رۆژبڕ، کرای رۆژانە.

**روزمه:** حەساوی رۆژ و مانگ و ساڵ، بەروار، رێکەوت.

**روزن/ روزنه:** دەلاقە، رۆچن، رۆچنە، رۆچینك، رۆژەن، رۆژنە، کلاوڕۆژنە، کولاوکە، کولانکە، کونا، کوناوچە، کەلەك، تەشە، هوللا.

**روزنامه:** رۆژنامە، غەزەتە. یادداشتی رۆژانە. نامەی کردار.

**روزنامەنگار:** رۆژنامەنووس، رۆژنامەوان، رۆژنامەڤان، غەزەتەچی.

**روزنامەنگاری:** رۆژنامەوانی، رۆژنامەنووسی، رۆژنامەگەری.

**روز واقعه:** رۆژی مەرگ.

**روزه:** رۆژوو، رۆژگ، رۆچە، رۆچێ، بە رۆژ هیچ نەخواردن. "**روزه(را) باز کردن**": بەربانگ کردنەوە، رۆژووکردنەوە. "**روزه داشتن**": بەڕۆژووبوون. "**روزه شکستن**": رۆژووشکاندن. پووچ بوونەوەی رۆژوو. "**روزه گرفتن**": رۆژووگرتن، بە رۆژووبوون، وەڕۆژگ بوون. "**روزه گشودن**": بەربانگ کردنەوە، رۆژووکردنەوە، شت خواردن دوای تەواوبوونی رۆژوو.

**روزەخوار/روزەخور:** رۆژووخۆر، کەسێك کە بەڕۆژوو نابێ.

**روزەخواری:** رۆژووشکاندن، رۆژووخواردن، رۆژوونەگرتن، بەڕۆژوونەبوون.

**روزەدار:** بەڕۆژوو، بەڕۆژی، رۆچەوان، رۆژوەوان، رۆژووگر، رۆژگەوان.

**روزی:** 1) داژیار، بژیو، رسق، رۆزی، رۆژی، ژەمەن، خۆراکی هەر رۆژە. 2) بەش، نسیب. 3) رۆژێکی، رۆژەکی، رۆژێك لە رۆژان. 4) مووچە، جیرە.

**روزی خوار/ روزی خور:** مرۆڤ یان ئاژەڵ کە رسق و رۆزی پێ دەبڕێ، بەشەبژیو پێگەیشتن. خوازیاری خۆراك و خواردەمەنی.

**روزیدن:** رۆشن بوون(ەوە)، رووناك بوونەوە .

**روزی دهنده:** رسق و رۆزیدەر، بژیوی گەیەن.

**روزی رسان:** رۆزی گەێن، بژیوی دەر، یەکێك لە سفەتەکانی خودا.

**روزیمند:** خاوەن رسق و رۆزی.

**روزینه:** رۆژانە، خواردەمەنی رۆژانە، جیرەی رۆژانە.

**روزینەدار:** کەسێك کە جیرەی رۆژانە وەردەگرێ.

**روژ:** سوور، سووری، سووراو.

**روژیدن:** 1) بڕوانە: "روزیدن". 2) دەڵاندن، دەردان.

**روساخت:** سەرخان، ژوورخان. (زمانناسی) ئەوەی لە روالەت و پێکهاتەی ئاخاوتەدا جەریانی هەیە.
**روسازی:** رووسازی، دروست کردنی بەشی سەرەوەی جاددە.
**روسپی:** سۆزانی، سوزمانی، قاحبە، جندە.
**روسپی بارە:** ژنباز، داوێن تەڕ، پیاوێ کە حەز لە زۆر ژنان دەکا، پیاگێ کە زۆرتر دەگەڵ سۆزانییەکان جووت دەبێ.
**روسپی زادە:** بڕوانە:"حرامزادە".
**روسپی گری:** جندەیی، قاحبەیی‌گەری.
**روستا:** ئاوایی، گوند، دێ، لادەگا، لادێ.
**روسفید:** رووسپی، رووسوور، بریتی لە مرۆی سەرڕاست، بێ تاوان، سەربەرز و بەئابڕوو.
**روس فیل:** لایەنگری رووسەکان، هەڤاڵی رووسەکان.
**روسم:** نیشان، مۆر.
**روسیاه:** رووڕەش، بریتی لە گوناحبار، فەدیکار، شەرمەزار.
**روش:** شێوە، شێواز، رێوشوێن، مێتۆد، رەواڵ، رەفتار، ئاکار، چەشن، زێ، رست، داب و عادەت. شێوەی رۆیشتن، شێوەی جوولان. پێوانی رێگە، بە رێدا رۆیشتن.
**روش شناختی:** شێوازناسانە.
**روش شناسی:** مێتۆدۆلۆژی، شێوازناسی.
**روشمند:** شێوازمەند، رێسامەند، رێکوپێک، مێتۆدیک، مێتۆدۆلۆژیکاڵ.
**روشمندانه:** شێوازمەندانە، سیستماتیک.
**روشمندکردن:** شێوازمەندکردن، سیستماتیزەکردن، تەکووز و رێکوپێک کردن.
**روشان:** بڕوانە:"روشن".
**روشن:** 1) رۆشن، رۆشنا، رووناک، رۆهن، بەرانبەری تاریک. 2) روون، دیار، ئاشکرا، زانراو. 3) کەم رەنگ.4) ئاگا، بەرچاوڕوون (آدم روشنی است). 5) بەشێوەی ئاشکرا و روون. 6) بینا، چاوتیژ(چشم روشن). 7) شاد، دڵخۆش، سەرحاڵ. 8) جێی بەقا، باوەڕپێکراو. 9) ناودار، بەناوبانگ.
**روشنا:** 1) روون، رووناک. 2) شوێنی رووناک، رووناکی. 3) رۆچنە، دەربیجە.
**روشناخت:** بڕوانە:"واشناخت".
**روشناس:** (رُ.شِ) ناودار، بەناوبانگ، ناسراو.
**روشنان:** رۆشن، رووناک، بەدرەوش. شتە رووناکەکان. "**روشنان فلک**": ئەستێرەکان، ئەستێرە شۆقدارەکان.
**روشن اندیش:** خاوەنی زەین و هزری روون و لۆژیکی، خۆش فکر، بیناوزانا.
**روشنایی:** رۆشنایی، رۆشناکی، رووناکایی، رۆنکایی، رووناهی، رۆژناهی، رهنک، رۆژنایی، دژی تاریکایی. شوێنی رووناک.
**روشنایی بخش:** رووناکاییدەر، تیشک دەر، رۆنەک، رۆندار.





**روشن بین:** بینا، زانا، وریا، هوشیار.
**روشن دل:** 1) دڵاوەدان، دل زیندوو، ئاگا و زانا.2) دڵپاک، راست کردار. 3) کوێر.
**روشن رای:** خاوەنی هزری دروست، کەسێک کە ئیرادە و تەگبیر و بیرۆکەی روونی هەیە.
**روشن روان:** دل زیندی، وریا، ئاگا و زانا. شاد، دڵخۆش.
**روشن شدن:** 1) رووناک بوونەوە، ئاشکرابوون و دەرکەوتنی راستی رووداو. 2) هاتنەگووڕ، هاتنەحاڵ، کەیف سازبوون.
**روشنفکر:** رۆشنبیر، رووناکبیر، هشڤەکری، تێگەیشتووی پێگەیشتوو.
**روشن قیاس:** زیرەک، تیژفام.
**روشن کردن:** 1) رووناک کردن(ەوە)، رۆنانـدن، رۆشنـاییـدان بە تاریکی. 2) دەرخستنی راستی رووداو یان مەبەست، ئاشکراکردن، روونکردنەوە، تیشک خستنەسەر. 3) وەگەڕخستن. 4) هەڵکردن، هەڵگیرساندن، داگرساندن. 5) ئاگاکردنەوە، وشیارکردنەوە. 6) گەڕاندنەوەی سۆمایی بۆ چاو، چاو چاک کردنەوە، لەکوێری رزگارکردن. 7) ساف و روون کردن.
**روشنگر:** 1) تەمومژو لێڵی لابەر، رونکەرەوە، دەرخەر. 2) رووناککەرەوە، هەلایسێن، پێکەر. 3) سیقاڵدەر.
**روشنگری:** روونکردنەوە، لابردنی لێل و ناڕوونی. رۆشنگەری.
**روشن نهاد:** سرشت پاک و باش، دەروون پاک.
**روشنی:** 1) رووناکی، رۆشنایی، رۆشنی، رۆهنی، دژی تاریکی. 2) بەڕوونی، راشکاوی. 3) بینایی. 4) زوڵاڵی و سافی. 5) رزگاربوون، رزگاری. 6) کاتێ کە هەوا روونە.
**روضه:** 1) باخ و گوڵستان، چیمەن، مێرگ، سەوزەڵان. 2) گلکۆی گەورەکانی ئایین. 3) ئەوەی لە رێوڕەسمی تازیەباری دا دەیخوێننەوە، رێوڕەسمێ کە بەم بۆنەیەوە بەڕێوەدەچێ. "**روضەرضوان**": بەهەشت.
**روع:** ترسین، ترسان. وە سەرسووڕمان خستن.
**روغان:** (رَ.وَ) بەملاولادا هەڵاتن. مەکر و فێڵ کردن.
**روغن کاری:** رۆنکاری، رۆن لێدان.
**روغن کشی:** گرتنی رۆن لە گیا.
**روغنی:** رۆندار، چەور.
**روفتن:** بڕوانە:"رُفتن".
**روکار:** رووکار، لەبەرچاو، دیار، نمای بینا.
**روکردن:** سەرنجدان، رووتێکردن، لالێکردنەوە.
**روکش:** رووکێش، رووکەش، دەفری دوو توێ.
**روکش گرفتن:** رووکێش کردن، تامدان.

**روکم کنی:** رووکەمکردنەوە.

**روگر:** سپی کەرەوە، مزگەر.

**روگران:** مڕومۆچ و ناوچاوترشیاگ.

**روگردان:** هەڵگەڕیاوە، هەڵگەڕیاگەوە، روووەرگێڕ، نافەرمان. وەڕەز، بێزار.

**روگرداندن/ روگردانیدن:** روو وەرگێڕان، روو وەرچەرخاندن، پشت تێکردن.

**روگرفت:** کۆپی، فۆتۆکۆپی.

**رو گرفتن:** دموچاو داپۆشین. خڕکردنەوەی مەوادی سەر شتێك و لابردنی.

**روگشایی:** تۆڕهەڵدانەوە لەسەر بووك.

**روگیر:** ئەوەی دەموچاوی لە نامەحرەم دادەپۆشێ. ئەوەی بکەوێتە رووەدەربایستییەوە، لەڕوونەهاتوو.

**رولوسیون:** گۆڕانی توند و لەنکاو، شۆڕش. دەور، سووڕان.

**روم:** خواستن، داواکردن.

**روماتیسم:** با، باداری، ژانی جومگەکان. "**مبتلا به رماتیسم**": باوی، بادار، نەخۆش بە دەردی باداری.

**روند:** رەوت، رەڤەند، پڕۆسە. شێوە، شێواز.

**رونده:** رێبوار، رێوار، راویار، رابگار، راگوزار. 2) خۆشبەز و چالاك. 3) رەوان، خوڕ.

**رونق:** 1) درەوشانەوە، بریقانەوە، جوانتی. 2) برەو، رمێن، پەرە. 3) ئاوەدانی. "**رونق دادن**": برەوپێدان، برەودان. "**رونق گرفتن**": برەوسەندن، چالاك بوون یان بایەخ پەیاکردن. لایەنگری پەیاکردنی کەسێك، کڕیار پەیاکردن بۆ کالایەك. "**از رونق افتادن**": لەبرەوکەوتن، بێبرەوی، کەساسی. لەدەست دانی گرینگی و بایەخ.

**رونما:** 1) سەرمەشقانە، سەرمەشقانێ، سەرمەشکانە، شەرمەشکانە، دیارییەکە کە زاوا دەیدا بەبووك کە تارا لەسەر رووی لابەرێ. 2) روونوێن، پیشاندەری دەمووچاو. "**رونما شدن**": ئاشکرابوون.

**رونمایی:** رێوڕەسمێ بۆ ناساندنی کتێوی تازەدەرچوو. پێشکەش کردن.

**رونمودن:** بڕوانە: "روی نمودن".

**رونگاره:** بڕوانە: "نمودار".

**رونوشت:** روونووس، لەبەرنووسراو، رایش، کۆپی.

**رونویسی:** لەبەرنووسینەوە، نووسانەوە، روونووسی، شکڵنووس، فەرکان، کۆپی هەڵگرتنەوە.

**رویا:** روەك، گیا، ئەوەی لە زەوی شین دەبێ.

**رویارویی:** رووبەڕووبوونەوە، بەرەنگاربوونەوە.

**رویان:** 1) روەك. 2) بڕوانە: "جنین".

**رویاندن/ رویانیدن:** شین کردن، سەوزکردن، رواندن، رپاندن، چەقاندنی ریشە و شەتڵ. "**باز رویاندن**": شین کردنەوە، دووبارە رواندن.

**رویان شناسی:** بڕوانە: "جنین شناسی".





**رویداد:** رووداو، روودای، بەسەرهات، سەرهات، سەرهاتی، قۆمیاو، پێش هات، پێکهات، رێکەوت، هەڵکەوت. "**رویدادناگوار**": رووداوی دڵتەزێن/ دڵچڕێن، قۆمیان، رووداوی زۆر ناخۆش، مقەدەر.

**رویدادشماری:** کرۆنۆلۆژی.

**روی دادن:** روودان، قەومیان، پێشهاتن، هاتنەپێش.

**روی زرد:** رووزەرد، شەرمەزار، خەجاڵەت.

**رویزیونیسم:** بڕوانە: "تجدیدنظرطلبی".

**رویش:** کردەی سەوزبوون، هەڵدان، هەراش بوون، گەورەبوون. "**رویش دوباره**": هەڵدانەوە، سەوزبوونەوەی دوای بڕین.

**رویکرد:** 1) ئاراستە. 2) روانگە، لێڕوانین.

**روی کسی باز شدن:** رووکرانەوە، رووداربوون.

**روی کسی را زمین انداختن:** رەت کردنەوەی داواکاریەکەی.

**روی کسی سیاه بودن:** شەرمەزاربوونی وی، رووڕەش بوونی ئەو.

**رویگر:** مسگەر، مزگەر، سپیکەرەوە.

**رویگردانی:** بێزاری، نابەدڵی، بێمەیلی.

**روی نمودن:** خۆدەرخستن، دەرکەوتن، لاکردنەوە، رووتێکردن.

**رونهادن:** رووتێکردن، سەرنجدان.

**رویه:** (رُ.یَ) رواڵ، لای بەرچاو، روو، دەموچاو. شکڵ، نما. لای دەرەوە و رواڵەتی شتێ، رووکار، رووکێش، توێخی سەرەوە.

**رویّه:** (رَ.وِ.یَ) 1) شێواز، شێوە، رەواڵ. 2) تێفکرین و رامان لە کارێك، وردبوونەوە و رامان لە کاروبارەکان دا. "**بی رویّه**": بێ سەرەوبەرە، بێ بەرنامە، بێڕێسا، ناسروشتی.

**رویهم:** لەسەریەك، بەگشتی.

**روییدن:** روان، رپان، رەهستن، شین بوون، سەوزبوونی چێنراو. "**باز روییدن**": روانەوە، دووبارە شین بوونەوە.

**روییده:** سەوزبووگ، شین بووگ، رواو.

**رویین:** 1) پتەو، قایم. 2) ئەوەی لە رۆح ساز کرابێ.

**رویین تن:** خورت و بەهێز و لەش پتەو.

**رویین دژ:** قەڵای پتەو و قایم.

**رها:** رزگار، قوتار، سەربەست(انە)، ئازاد(انە)، وێڵ، بەردریاگ. "**رهاشدن**": 1) رزگاربوون، ئازادبوون، خەلستن، قوتاربوون لە کۆتوبەند. 2) دەرچوون (سررشته سخن از دستم رها شد). 3) بڵاوبوونەوە، پەخش بوونەوە(بوی عطر در فضای اتاق رها شد.). 4) بەربوونەوە، جیابوونەوە(سینی چای از دستم رهاشد.). "**رهاکردن**": 1) بەردان، رزگارکردن، ئازادکردن، ڤەرساندن، راییکردن، وەردان، وەردای. 2) دەست لێبەردان، دەست هەڵگرتن، وازهێنان، وازهاوردن، تەرخ کردن، خۆتێنەگەیاندن، بەڕەهەڵداکردن، بەڕەڵداکردن، بەڕەڵاکردن، وێل کردن. 3) خستن، هاویشتن. 4) ئیزن دان. 5) جیابوونەوە، تەڵاق دان.

**رهان:** مەرج کردن، گرێوکردن.

**رەا نجام:** خۆشڕەو، تیژڕەو، ئەسپی خۆشبەز. تێشووی سەفەر.

**رهاندن/رهانیدن:** رزگارکردن، ئازادکردن، قوتارکردن، نەجات دان.

**رهانش:** رزگاری، نەجات.

**رهاننده:** رزگاریدەر، نەجاتدەر.

**رهاورد:** 1) دیاری، توێشە، سەوقات، سڵامانە. 2) دەسکەوت. 3) ئاکام، دەرەنجام.

**رهایش:** رزگاری، ئازادی، نەجات، قوتار.

**رهایی:** رزگاری، ئازادی، خەلاسی، نەجات. "**رهایی دادن/ بخشیدن**": رزگارکردن، ئازادکردن، نەجات دان. "**رهایی یافتن**": رزگاربوون، ئازادبوون.

**رهایی بخش:** رزگاریدەر، رزگاریخواز.

**رهبان:** (رَ) 1) بڕوانە:"راهبان". 2) رێنوێن، رێزان.

**رهبان:** (رُ) دژکام و تەرکەدنیای نەساری، رەببان.

**رهبانیّت:** رەببانی، ترسایی، پەراوێزنشینی و تەرکەدنیایی و چاوپۆشی لە خۆشییەکانی دنیا.

**رهبر:** رێبەر، رابەر، رێنوێن، پێشەوا، شارەزای پێشڕەو. "**رهبری**": رێبەری. رێنوێنی، رێنمایی.

**رهبرد:** تێشووی سەفەر.

**رەبردن:** ڕێدۆزینەوە و پێزانین بە شوێنێك یان شتێك.

**رهبه:** خۆف، ترس.

**رەپیما:** بڕوانە:"راەپیما".

**رەتوشه:** بڕوانە:"راەتوشە".

**رهرو:** 1) رێبوار، رابگار، رێڤنگ، رێونگ. 2) دالان، کوریدۆر، سەرسەرا. 3) تەرکەدنیا، دژکام، مرید. 4) شارەزای رێ، رێزان.

**رهسپارشدن:** چوون، رۆیشتن.

**رهگذر:** بڕوانە:"راهگذر".

**رەگو:** ئاوازخوێن، بێژەر، بەزمگێڕ.

**رهگیر:** 1) بڕوانە:"راهگیر". 2) گەشتیار، رێبوار. "**رهگیر شدن**": سەفەر کردن.

**رهگیری:** سەفەر.

**رهن:** گرەو، گرێو، بارمتە. بە بارمتە دانان.

**رهنامه:** بڕوانە:"راهنامە".

**رەنشین:** بڕوانە:"راەنشین".

**رهنما:** بڕوانە:"راهنما".

**رهنمود:** پێشنیار یان راسپاردەیەك کە بۆ رێنوێنی یان چارەسەرکردنی کێشەی کەسێك یان گەیشتن بە مەبەستێ دەخرێتە بەرباس. "**رهنمود دادن**": رێنوێنی کردن.

**رهنمودگر:** رێنوێنیکەر.

**رهنمون:** رێنما، رێنوێن، رێشاندەر، رێبەر. "**رهنمون شدن**": رێنوێنیکردن.

**رهنمونی:** رێنوێنی، رێنمایی، رێبەری.





**رهنی:** بەبارمتەدانراو.

**رهو:** شێوە، شێواز، رێسا.

**رهوار/رهور:** بڕوانە: "راهوار".

**رهیاب:** رێ دۆزەوە، کەسێك کە رێگەیەکی تازە و شێوەیەك بۆ جێبەجێکردنی کارێ یان بابەتێك بدۆزێتەوە.

**رهیافت:** رێگەی خەریك بوون بە مەسەلەیەك یان "مەوقعییەتێك" یان شێوەی بیرکردنەوە لێیان، لێڕوانین.

**رهیدن:** رزگاربوون، ئازادبوون، دەربازبوون. جیاکردنەوە، بڕین.

**رهین:** بەبارمتەدانراو. "**رهین کسی (چیزی) شدن**": قەرزداری وی بوون.

**رهینه:** بارمتە، گرێو.

**ریا:** دووڕوویی، رووبینی، مەرایی، ماستاو ساردکردنەوە، ریا.

**ریاست:** سەرۆکایەتی، سەرۆکی، سەرداری، مەزناهی. "**ریاست کردن**": سەرۆکایەتیکردن، بەڕێوەبردنی فەرمانگەیەك یان دامەزراوەیەك وەك سەرۆك. حکوومەت و فەرمانڕەواییکردن.

**ریاست طلب:** خوازیاری بەدەستەوەگرتنی سەرۆکایەتی بەخاتری زێدەخوازی.

**ریاضت:** 1) وەرزش. 2) گۆشەنشینی، چلەکێشی، رەنج و سەختی کێشان بۆ پاك کردنەوەی نەفس و وەدەست هێنانی ئاکاری باش. 3) راهێنانی زێندەوەران بە تایبەتی ئەسپ. "**ریاضت کشیدن**": 1) رەنج و سەختی زۆر کێشان. 2) وەرزش کردن.

**ریاضی:** بیرکاری، "ماتماتیك". "**ریاضی دان**": زانا لە زانستی بیرکاریدا، ماتماتیکەوان.

**ریاع:** هەڵدان، زۆربوون، فراوان بوون.

**ریاکار:** ریایی کەر، ریاکار، ریاباز، دووڕوو، هەفت روو، رووبین، رواڵەت باز، رووباز، فێڵباز، دەغەڵکار.

**ریان:** تەڕ و تازە، تورت و تێراو.

**ریب:** 1) خستنە گومانەوە. 2) گومان، دوودڵی. "**ریب المنون**": رووداوەکانی رۆژگار، دژوارییەکانی زەمانە.

**ریتم:** ریتم، ئاهەنگ، رێسا، نۆرم، شێواز. کێش.

**ریتمیك:** کێشدار، ئاهەنگدار. زانستی ریتم.

**ریخت:** سەروسەکوت، سەروقڵخ، سەر و شکڵ، دارشت، پێکهاتەی دەرەوە. "**ریخت و قیافه**": سەروگوێلاك، سەروپۆتراك، سەروپۆتەلاك.

**ریختاره:** فورمول.

**ریخت شناسی:** دارشتەناسی، زانستی تاوتوێی فۆرم و پێکهاتەی دەرەوەی بوونەوەرانی زیندوو، "مۆرفۆلۆژی".

**ریختن:** له سەرەوە بۆ خوارەوە رژان، رژیان، رژاندن، رژانن، رژتن، رشتن، ڤەرێتن، رهتن، ریهتن، ریتن، بەرەوخوار بڵاوکردنەوە. جیابوونەوە و کەوتنی شتێ له جێیەکەوە (پدربزرگ دندانهایش ریختە است) . لەناوچوون (ترسش ریخت). خستن، هاویشتن(دشمن از هر طرف تیر می‌ریخت). داڕژتن، دانان(چە نقشەای برایش ریختەاست). دروسبوونی کتوپڕی هەستێك له کەسێك دا(ترس توی دلم ریخت). راگوازران یان تەشەنەکردن، گرتنەوە(ابتدا گلویش ورم کرد و بعد به سینەاش ریخت). تێکردن(پول را بە حسابش ریختم). "**با کسی روی هم ریختن**": ساتوسەوداکردن لەگەڵ ئەو، دەگەڵ ئەو به نهێنی پێکهاتن. گەرموگوڕبوون دەگەڵ ئەو، بوونە دۆستی ئەو. پێوەندی نامەشروع گرتن دەگەڵ وی. "**توی خود ریختن**": شاردنەوەی خەم و ناڕەحەتی خۆ و دەرنەخستنی، خەم و خەفەت له دڵا راگرتن.

**ریخت و پاش:** شپرزەیی، تەخشان و پەخشان، بڵاوکردن، زێدوڕۆیی له خەرج کردن، هەرژاندن.

**ریختە:** 1) رژاو، رژیاگ. 2) داڕێژراو. 3) جیابۆوە. 4) بڕوانە:"پوسیدە". 5) لەبەریەك هەڵوەشاو، لێك بڵاو، پەرێشان و ناتەکووز.

**ریختەگر:** داڕێژ، پێژەر، کەسێك کە کانزاکان دەتوێنێتەوە و دەقاڵبیان دەکا.

**ریختەگری:** داڕژان، داڕژیان، داڕژین، داڕێژی، داڕشتن، کاری دەقاڵب کردنی تاویاو. "**قالب ریختەگری**": داڕێژگە، رێختمان.

**ریخن:** تووشبوو به سکەشۆرە.

**ریدمان:** ئەنجامدانی کارێ یان وتنی شتێ لەڕووی نەزانییەوە و بەخراپترین شێوە، تێڕیان.

**ریدن:** ریان، ریتن، رین، گووکردن. "**ریدن باعجله**": هەڵ ریان.

**ریز:** ورد، هورد، گەردیلە. "**ریزریز**": پراش پراش، وردورد، لەت لەت، وردوخاش، لەت وکوت، ریزاڵ ریزاڵ. "**ریزودرشت**": ورد و درشت، چووك و گەورە. گشت، هەموو. "**بسیار ریز**": وردوخاش، وردوخاڵ، وردورد، وردێك، وردیلە، رێزڵان، رێزڵانە، رێزڵاینە، زۆر ورد.

**ریزآراستە:** باریك و ناسك، پڕ لە وردەکاری ناسك و لێکاڵاو.

**ریزاکردن:** لێك هەڵوەشاندن، لێك بڵاوکردن.

**ریزان:** له حاڵ رژان دا.

**ریزاندن:** داوەراندن، داڕژاندن. لەناوبردن، تیابردن.

**ریزبافت:** وردەچن/هۆن.

**ریزبرگە:** "میکرۆفیش".

**ریزبین:** هووربین، وردبین، گەردبین، "میکرۆسکۆپ".





**ریزپردازندە:** "میکرۆپرۆسێسۆر".

**ریزچە:** بڕوانە:"ریزك".

**ریزدیس:** بڕوانە:"کوتولە".

**ریزسنج:** میکرۆمیتر.

**ریزش:** کردەی رژان، هەڵڕژان، تەپخ بوون، داڕووخان، داتەپین، تەپین. وەرین، بارین، داوەرین له سەرەوە بۆ ژێرەوە کەوتنی ئاو یان هەر شتێکی تراو یان دەنکی زۆر. تێکردنی پارە له حەساو. خەڵات، بەخشش. "**ریزش کردن**": رووخان، رووخیان، داڕووخان، داڕووخیان، داڕمان، تەپین، تەپان، ورووژە. بەخشین، پێدان.

**ریزك:** گەردیلە، زۆر ورد.

**ریزگی:** وردی، چووکەیی.

**ریزفیلم:** میکرۆفیلم.

**ریزە:** وردکە، ورتکە، پرتك، پراش، لەتی چکۆلە. "**ریزەریزە**": بڕوانە:"اندك اندك". "**یك ریزە**": کەمێ، کەموسکەیەك.

**ریزەخوار:** 1) ئەوەی بەرماوەی خوانی دیتران دەخوا. 2) نەتێر، هەژار، ئاتاج.

**ریزەخوانی:** به ئەسپایی و نەرم نەرم ئاخاوتن، نارەنار، ویرەویر. پرتەوبۆڵەکردن.

**ریزەخور:** بڕوانە:"ریزەخوار".

**ریزەکار:** ناسك کار، هونەرمەندێ کە شتی جوان و ناسك ساز بکا.

**ریزیدن:** 1) لێك هەڵوەشان و پرتوکیان. 2) جیابوونەوە و داکەوتنی شتێ له جێیەکەوە. 3) دانان یان خستنی شتێ له جێیەك. 4) رژاندن، رشتن.

**ریژ:** ئارەزوو، مراد، هەوەس.

**ریژخوی:** بڕوانە: "بلهوس".

**ریس:** به ناز و غورورەوە رۆیشتن، خلەنگین. زاڵبوون.

**ریست کردن:** کووژانەوەی دەزگا بەهۆی گرفتی.

**ریستن:** بڕوانە: "ریدن".

**ریسك:** دووبەختی، دووبەختەکی، مل پێوەنان، مل لێنان، فوولەدۆنەکردن، مل رەچەقۆخستن، مل له چەقۆخستن، مل له چەقۆساوین، مل له چەقۆ هەڵسوون، سواری گای تۆڕ بوون، ریسك کردن، کاری بڤەکردن.

**ریسندگی:** کردەی رستن.

**ریسەرفتن:** دڵ بەیەکاهاتن و بێحاڵ بوون بەهۆی گریان یان پێکەنینی زۆرەوە.

**ریسەکردن:** خستنە پشت سەرییەك، زنجیرە کردن. لێکدالێکدا وتنی شتێك، لێڕێسان.

**ریسیدن:** رستن، هۆندنەوە، مووناندن، بادانی بەن و لۆکە بە تەشی.

**ریسیدە:** رێسراو، هۆنە، هۆندراو، موون.

**ریسیور:** دەزگای ماهوارە، ریسیوێر.

**ریش:** برین. خەم، ناڕەحەتی. خەمبار، خەفەتبار. "**ریش شدن**": بریندار‌بوون. "**ریش کردن**": برینداركردن. رەنجاندن، خەمبارکردن.

**ریش:** ردێن، ریش. "**ریش چیزی درآمدن**": لەکەڵك کەوتنی ئەو شتە، بێ کەڵك بوونی. "**ریش کسی را چسبیدن**": خستنە ژێر پرسیار، ناڕەزایەتیدەربڕین بەو. "**ریش گاو**": بریتی لە نەزان، گەوج، گەمژە. "**ریش گرو گذاشتن**": گرەنتیدان بە وادە و بەڵێنی سەرزارەکی، دەروەستی ئەخلاقیدان. "**به ریش کسی خندیدن**": گاڵتەپێکردن بەو کەسە. "**به ریش گرفتن**": بەجیددی گرتنی تاریف و پیاهەڵگوتن. قبووڵ کردن.

**ریشتر:** ریشتێر، یەکەی پێوانی هێزی بوومەلەرزە.

**ریشخند:** ریش خەن، گاڵتەپێکردن، تەوزەپێکردن، تیزکردن، پێکەنین. "**ریشخند شدن**": گاڵتەپێکران.

**ریشگی:** (بیرکاری) رادیکاڵ.

**ریشو:** بەڕدێن، ردێن دار، ریشدار.

**ریشه:** بنج، پنج، بێخ، بنەڕەت، رپن، ریشە، رەگی دار و گیا. (ڕێزمان) رەگ. "**ریشەدوانیدن**": بێخ داکوتان، بنج داکوتان، ریشەقایم کردن، ریشەداکوتان، رەگ داکوتان، رپن داکوتان/داقوتان، رپن دان، ئاژۆ، رەهگرتن، خۆداکوتان، خۆقایم کردن لە زەویدا، لك لێبوونەوەی ریشە. "**ریشەزدن/گرفتن**": ریشەکردن. وەدیهاتن و جێگیربوون. "**ریشەکردن**": ریشەکردن، ریشەداکوتان. جێگیربوون لە شوێنێك و بوونە خاوەنی ماڵ و مناڵ. بەشکڵی رشتە بڕین. "**ریشه کسی را کندن**": تەفرتووناکردنی وی. "**ریشەگرفتن از جایی**": لە جێیەکەوە سەرچاوەگرتن. "**از ریشه درآوردن**": ریشەکێش کردن، لەڕەگ و ریشەوە دەرهێنان.

**ریشەدار:** هەر گیایەك کە رەگی هەبێ، ریشەدار. کەسی رەسەن و نەجیب. پتەو، قایم.

**ریشەشناسی:** رەگەزناسی وشە(لەڕێزمان دا)، زانستێ کە تاوتوێی فۆڕمی سەرەتایی وشەکان و گۆڕانیان لە رەوتی مێژوویی دا دەکا.

**ریشەکن:** ریشەکێش، بێخ بڕ، بن بڕ، بنەبڕ، بن چن، شپنە. "**ریشەکن شدن**": دوابڕان، ریشەکێش بوون، ریشەبڕبوون، لە رەگەوهاتن، لە بنج و بناوانەوە هاتن، ئاسەواربڕان، شولگەنە، قڕهاتن، لەبەین چوون، لەناوچوون. "**ریشەکن کردن**": خەڕتاندن، ریشەکێش کردن، لە رەگ دەرهێنان، بن بڕکردن، لە بنەوەهێنان، دەرکێشان لە بن و رەگەوە.

**ریشەیابی:** ریشەدۆزی، بێخ دۆزی، دۆزینەوەی سەرچاوە و هۆکاری بنەڕەتی شتێك.

**ریشیدن:** 1) لەت لەت بوون، ریزاڵ ریزاڵبوون. 2) رژاندن، بڵاوکردن. 3) رووشاندن، رووکاندن.





**ریق:** گوو، پیسایی. تف. "**ریق رحمت را سرکشیدن**": بریتی لە مردن. "**ریق کسی درآمدن**": تووشی ئەوپەڕی داماوی و بێحاڵیبوون. "**ریق گرفتن**": زکچوون، تووشی سکەشۆرەبوون.

**ریك زده:** ئاشکرا، دیار.

**ریگ:** رەملْ، رەڵم ، رتام، قووم، زیخی زۆر ورد.

**ریکا:** بڕوانە: "رایکا".

**ریگزار:** رێخەڵان، رێخناخ، رەڵماوی، زیخەڵان، قوومەڵان، کەوڵە، شینکە، سیلاخ، هوسکو، کەڤیشتن، شوێنی رەڵم.

**ریگستان:** بڕوانە: "ریگزار".

**ریلکس:** ئارام و بێ نیگەرانی. راحەت.

**ریم:** کێم، کیم، کێماو، زووخاوی برین، هەوا، چڵکی برین، زڵزڵە، زامت.

**ریمن:** (رِ.مِ) چڵکن، چلووك، چڵێك، چەپەڵ، پیس، پەڵۆخ، پۆخڵ، گەمار، کەرەه.

**ریمن:** (رِ.مَ) بەمەکر و فێڵباز، فێڵەزان، رکوونی، قیناوی.

**ریه:** بڕوانە: "شُش".



**زا:** کردەی زایین. "**زا کردن**": بڕوانە:"**وضع حمل کردن**". "**سر زا رفتن**": 1) مردنی مرۆڤ یان ئاژەڵ کاتی زان. 2) شتێك لەدەست دان.

**زائد:** 1) سەربار، بێکەڵك، ناپێویست، زیادی. 2) زۆربوو، پتربوو.

**زائدالوصف:** زیاتر لە ئەندازە، زیاتر لە ڕادەی باو.

**زائدە:** 1) مێینەی"زائد"، پتر بوو. 2) لە زاراوەی توێکاری دا: قیتاییەکی سروشتی لە یەکێك لە ئێسکەکانی لەش دا، چوکڵە، قیتکە. "**زائدە اعور**": ئاپاندیس، ریخۆڵەکوێرە. شتێکی زیادی بەستراوە بە شتێکی دی و ناپێویست.

**زائر:** 1) زیارەتکەر، سەردانکەر. 2) داواکەر، سواڵکەر.

**زائل:** سڕاو، هەشفی، لەناوچوو، تیاچوو، ون، بزر.

**زائو:** زەیسان، زەیستان، ژنێ کە تازە زاوە.

**زاب کردن:** وەسف کردن.

**زابن:** 1) سەرقافڵە. دێوی سەرکێش. 2) پاسەوان.

**زابەراه:** ئاوارە، دوورکەوتوەوە لە ماڵ و بنەماڵە. ماتڵ، سەرگەردان.

**زا پاس:** زاپاس، ڕێزێرڤ، کەلوپەلی یەدەکی.

**زاج/زاچ:** 1) بڕوانە:"زائو". 2) زاخ، شب.

**زاجر:** 1) بەرگێڕەوە، نەهێڵ، یاساغکەر. 2) هاندەر و هەڵخڕێنەر بۆ کارێك.

**زاخر:** لێوڕێژ، لێوانلێو.

**زاد:** 1) سووکەڵەی "زادە"، زاو، مناڵ. 2) تەمەن. 3) تێشو، توێشو، ڕاشەن. "**زادبرآمدن ـــ بە زاد برآمدن**": پیربوون، بەساڵاچوون. "**زادوبود**": 1) ماڵ و زێد. 2) سەرمایە و سامان. 3) هەبوون و بوون. "**زاد و بوم**": زێد، زاینگە، نیشتمان. ماڵ. بوون و نەبوون، داروندار. "**زاد و راحلە**": تێشوو و شتومەکی سەفەر. 3) تەمەن. "**زاد و رود**": ژن و مناڵ. بنەماڵە. "**زادوولد**": زکوزا، زگوزا، سکوزا، سکوزان، زاوزێ، زەووزوو، مناڵ خستنەوە. مناڵەکان، ژن و مناڵ.

**زادبرزاد:** پشت بە پشت، بەرە لە دوای بەرە.





**زادبوم:** نیشتمان، وڵات، زێد، زاینگە.

**زادخور:** بەساڵاچوو، بەتەمەن، پیر.

**زادخوست:** بڕوانە:"زادخور".

**زادروز:** ڕۆژی لە دایك بوون، ڕۆژی هاتنەدنیا.

**زادغر:** بڕوانە:"حرامزادە".

**زادگان:** بنەوبنەچە.

**زادگان شناسی:** 1) زانستی ژێنێتیك. 2) وەچە (نەسڵ)ناسی.

**زادگانی:** ژێنێتیك.

**زادگاە:** زاگە، زاینگە، زانگە، زێد، شوێنەزا، جاخ، نیشتمان، جێی لە دایك بوون.

**زادمرد:** جوامێر، مێرخاس، بەخشنە.

**زادن:** 1) زان، زایین، مناڵ هێنان، مناڵ خستنەوە، بەرهەم هێنان. 2) لە دایك بوون، بە دنیاهاتن، چاوبەدنیا هەڵێنان، وەدیهاتن.

**زادە:** 1) بەرهەم، ئاکام. 2) زاو، لە دایك بوو، مناڵ.

**زار:** 1) بە کۆتایی هەندێ وشەوە دەچەسپێ و مانای زۆر دەدا وەك (ریگزار: زیخەڵان). 2) داماو، کڵۆڵ، بێ هێز، لەڕ، لاواز، نەخۆش و لاواز، نزار. 3) خراو، شێواو، پەشێو، پەرێشان. 4) ناڵە، کڕووزانەوە لە خەم و دەرد. "**زارو زبون**": لاواز و بێتوانا و داماو. "**کار زار**": (ڕ) کار خراو و ناڕێکوپێك. "**حال زار**": حاڵ خراو.

**زارازار:** لە حاڵی داماوی و لاوازی و بێ دەسەڵاتیدا.

**زاران:** ناڵان، لە حاڵی شین و شەپۆڕدا.

**زارخور/زارخورش:** کەم خۆر، کەسێ کە خواردەمەنی کەم بخوا و بەم هۆیە کز و بێهێز بووبێ.

**زارزار:** گریانی بەکوڵ و لەدڵەوە، کوڵیگریان. "**زارزار گریستن**": لە ناخی دڵەوە گریان و ئەسرین ڕشتن. "**زارزار سوختن**": ئاورگرتن و سووتان بە داماوی و زەبوونی. "**زارزار کشتن**": بە داماوی و زەبوونی کوشتن. "**زارزار نالیدن**": ناڵاندن لە ناخی دڵەوە.

**زارع:** وەرزێر، کشتیار، جووتێر، کێڵەر.

**زاروار:** داماو و زەبوون، کڵۆڵ، بێدەسەڵات.

**زاروزندگی:** ئامراز و کەلوپەلی ژیان، بوون و نەبوون.

**زارونزار:** لە حاڵی زەبوونی و داماوی و بێ هێزیدا.

**زارە:** 1) گریان و ناڵە. 2) زەبوون و داماو.

**زاری:** 1) گریان و ناڵە، لالانەوە، شیوەن. 2) داماوی، لاوازی و بێهێزی.

**زاریدن:** بڕوانە:"شکوەکردن".

**زاری کردن:** شیوەن کردن، شین و شەپۆڕکردن، گریان و ناڵاندن.

**زاستر:** ئەولاتر، دوورتر.

**زاغبا:** بریتی لە تانە، لۆمە، سەرزەنشت.
**زاغ چشم:** چاوکەوگ.
**زاغ چـهر:** دەمووچـاوناحەز، دەموچـاو ڕەش.
**زاغ دل:** بریتـی لـە دلّـڕەق، بـێبـەزەیی، بەدگومان.
**زاغ زبان:** کەسێك کە تووکەکـەی کاریگـەر بێ. بریتی لە پێنووس.
**زاغ سـر:** سـەرڕەش. بریتـی لـە زالّمـی کەللەڕەق، دلّڕەق.
**زاغ و زوغ:** ژن و منـالّ. زاق و زرووق، زاق و زیق.
**زاغـه:** تـەوخ، کـول، کوویـل، سـولتان. تەویلە، گەوڕ. ئەنباری تەقەمەنی.
**زاکون:** ڕێسا، یاسا.
**زامل:** (م) دووکەوتوو، پەیڕەو.
**زانو:** ئەژنۆ، ژنـۆ، وژنگ، وژینـگ، چۆك، زەنگۆلّ، زرانـی. **"زانو خم کـردن":** هـەبوونی خـۆڕاگری و ئـیرادە بـۆ ئەنجامـدانی کارێك.**"زانوزدن":** چۆك دادان، لەسەر چۆك دانیـشتن، ئـەژنۆ لەسـەر ئـەرز دانـان، بـە ئەدەب و خاکەڕایی لای کەسێك دانیشتن. **"به زانـو درآمـدن":** بەچـۆك داهـاتن، بـەزین، شکست خواردن، لەسەر ئـەژنۆ دانیـشتن. **"بەزانودرآوردن":** بەچۆك داهێنـان، بەزانـدن، شکست دان. **"به زانـو نشـستن":** لەسـەر دوو ئـەژنۆ دانیـشتن بـە نیـشانەی ئـەدەب و خاکەڕایی. **"پس زانو نشستن":** هەلّتروشکان بە حالّەتی خەم و خەفەتەوە.
**زانـی:** دامـێن تـەڕ، داوێـن پـیس، داوشکەستی، زیناکەر.
**زاو:** 1) بـەهـێـز، هـێـزدار، بـەقـەوەت. 2)دەست ڕەنگین، وەستا.3) کەلێن، درز.
**زاور:** 1) هـێـز، وزە، قـەوەت، توانـایی. 2) خزمەتکار، پێش خزمەت، پەرستار.
**زاورا:** لانـەواز، ئـاوارە، دەربـەدەر. **"زاوراشـدن":** بـە ناچـاری تـەرکی جـێ و شوێنی خووپێگرتوو کردن.
**زاوی:** ژێنێتیك.
**زاویه:** کونج، گۆشە، قوژبن، سووچ. **"زاویه استقرار":** (جوگرافیای سروشـتی) جـێگیرە گۆشـە. **"زاویـه انکـسار":** شکانەگۆشـە. **"زاویەحاده":** گۆشەیتیژ، گۆشەی کەمتر لە نەوەد پلە. **"زاویه داخلی":** گۆشەی نـاوەوە، ناوینەگۆشـە. **"زاویەقائمـه":** گۆشـەی وەستاو، گۆنیـا. **"زاویـه محیطی":** گۆشـەی چـێوەیی، چێوەگۆشـە. **"زاویـه مرکـزی":** گۆشـەی چـەقی، چەقەگۆشـە. **"زاویـه مستقیم":** گۆشـەی ڕاسـت. **"زاویـه منعکس":** گۆشەی پێچەوانە. **"زاویه منفرجه":** گۆشەی کراوە، گۆشەی زیـاتر لـە نـەوەد پلـە. **"دو زاویـه متقابـل بـه رأس":** دوو گۆشـەی سەربەرامبەر، دوو گۆشەی لایەکی هاوتا.
**زاویەنـشین:** گۆشـەگیر، گۆشەنـشین، پەناگیر، دوورەپەرێز.





**زاهد:** 1) پارێزکار، خۆپـارێز، تەرکـەدنیا، هـەبیس، دنیانەویـست. 2) بـەدخوو، بـەدخولّق. **"زاهـد خـشك و قـشری":** وشکەسـۆفی، تەرکـەدنیای نـەزان و بـێ سەلیقە.
**زاهر:** ڕووناك، شۆقدار، بریقەدار.
**زاهل:** خاترجەم، ئەرخەیان، خافلّ.
**زاهی:** ورشـەدار، درۆشـین، ڕوونـاك و بەدرەوش.
**زایا:** 1) سك و زاکەر، خـاوەنی توانـایی زایـین. 2) پەرەسـتێن، لـەحالّی پـەرەسـتانـدن دا (اقتـصاد زایـا). 3) بەرهەمهێن.
**زایاندن:** 1) کۆمـەگ کردنـی زەیستان لـە کاتی زاندا، مامـانیکردن. 2) وەدیهێنـان، هێنانەدی.
**زایش:** زان، زایـین، منـالّ هێنـان، بێچوو هێنـان، بـەدنیاهاتن، لـە دایـك بـوون. وەدیهاتن یان ڕوودان.
**زایـشگر:** وەدیهێنـەر، بەدیهێنـەر، بەدنیاهێنەر.
**زایمان:** زان، زایین، بێچووهێنان. **"آغاز درد زایمان":** سـەرژان. **"زنی که زیاد زایمـان کنـد":** شفتەزێ. **"دردزایمان":** پڕك، زاجلانەی، ژان ژوور، ژان گرتن، ژانی منالّ بـوون. **"هنگـام زایمان":** زیسانی، وەختی زان.
**زاینده:** سك و زاکەر، ژنێ کە بزێ، ئاژەلّی مێ کە بێچوو بهێنێ.
**زاییدن:** 1) زان، زایین، منالّ بـوون، منـالّ هێنـان، بێـچووهێنان، بێـچووبوون، ژباربوون، لەباربوونەوە.2) لـە دایکبـوون، هاتنە دنیا. 3) وەدیهـێنـان، هێنانـەدی. 4) هـەلّقـولاّنی ئاو لـە کـانی یـان ڕووبـار. 5) هاتنـەدی، بەرهـەم هـاتن. **"زیـر چـیزی زاییـدن":** لەبـەر قورسـی و دژواری ئەنجامـدانی ئـەو تیاچـوون، لـە بەتەواوگەیاندنی دامان.
**زاییـده:** 1) وەدنیـاهـاتـو، لـەدایك بـوو. 2) وەدیهاتو، ئاکام، بەرهەم.
**زئولوژی:** بوونەوەرناسی، ئاژەلّ ناسی.
**زئیر:** نەڕاندنی شێر.
**زب:** مفت، خۆڕایی.
**زبالـەدان:** زبلّـدان، زبلّگـە. شـوێنی زۆر پیس و نزم بۆ ژیان.
**زبـان:** 1) زمـان، زوان. 2) شـێوەی ئاخـاوتن، شـێوازی دەربـڕین. 3) قـسە، پەیڤ، ئاخاوتـە. 4) زمان پـاراوی، زمـان تـەڕی. 5) قسەکردن(جلو زبـان مـردم را نمیتـوان گرفـت. 6) توانـایی قـسەکردن. **"زبان آدم(آدمی زاد) سر کسی شدن":** تێگـەین و قبوولّ کردنی قسەی ژیربێژانە، حالّیبوون. **"زبـان بـازگرفتن (درکشیدن،اندرکـشیدن) از کسی(چیزی)":** قسەنەکردن دەگەلّ ئـەو یـان سەبارەت بەو نەدوان. **"زبان بر (به،فرا) کسی دراز کـردن":** سەرزەنـشت کردنـی وی، ئیرادلێگرتن لە ئەو. **"زبان برنگشتن(نچرخیدن)**

**به چیزی"**: زمان نەگەڕان، زات نەکردن لە وتنىدا. **"زبان بندآمدن"**: زمان گیران. **"زبان به چیزی بازکردن (گشودن)"**: دەربڕینی ئەو شتە، وتنی ئەو شتە. **"زبان به دهان گرفتن"**: دەنگ نەکردن، دەمکوت بوون، دەم دروون، وسکت بوون. **"زبان به کام کشیدن"**: قسەنەکردن. **"زبان ترکردن"**: ئاماژەیەکی کورت پێکردن. دەست بە قسەکردن. **"زبانِ تلخ"**: قسەی تاڵ و بەتەوس. **"زبانِ تند"**: قسەی ئازاردەر و بەچز. **"زبان خارجی"**: زمانی بیانی، زمانی وڵاتانیتر. **"زبان درآوردن"**: دەم هەڵبڕین، بوێربوونەوە و ناڕەزایەتی دەربڕین یان قسە بەدژایەتیکردن. **"زبان در دهان نگشتن"**: زمان نەگەڕان، زات نەکردن لە وتنی شتێك دا. **"زبان را گاز گرفتن"**: بریتی لە قسە وەرگرتنەوە، پەشیمان بوونەوە. **"زبان را نگاه داشتن"**: خۆبواردن لە وتنی شتێ کە پێویست نیە یان بە قازانج نیە، قسەڕاگرتن. **"زبان رسمی"**: زمانی ڕەسمی/فەرمی. **"زبان ریختن"**: بریتی لە زۆر قسەکردن، زۆربڵێیی، فرەوێژی. زمان لووسانە ئاخاوتن بۆ ڕازی کردنی کەسێك یان دڵخۆش کردنی. **"زبان زدن بە چیزی"**: زمان لێدان، چێشتن. لستنەوە. **"زبان زرگری"**: زمانی نائاسایی و دەسکرد، زمانی زێ. **"زبان سرخ"**: قسەکردنی بێ شەرمانە. **"زبان سر کسی نشدن"**: تێنەگەیشتنی ئەو لە قسەی دیتران، بەهێندنەگرتنی قسەی دیتران لە لایەن ئەوەوە. نەفام و نەزان بوونی ئەو. **"زبان شکستە بستە"**: قسەی لێڵ و ناڕوون کە کەمتر لێیتێبگەن. **"زبان کسی باز شدن"**: زمان کرانەوە، توانای قسەکردن پەیاکردن. دوای ماوەیەك بێدەنگی وەقسەهاتن. **"زبان کسی بستە شدن(بندآمدن)"**: زمان بەسترانی ئەو کەسە، زمان لێك هاڵان. دەنگ نەکردن، متەق لێوەنەهاتن. **"زبان کسی گرفتن"**: زمان گیران، زمان لێك ئاڵان. **"زبان گرفتن"**: گریان و ناڵان. قسەدەرهێنان لە دوژمنان بۆ ئاگاداربوون لە کەرەستە و تەقەمەنی و پیلانەکانیان. **"زبان گشادن بر کسی"**: سەرزەنشت کردنی ئەو، سەبارەت بەوی بەدوێژی کردن. **"زبان مردە"**: زمانێ کە لە ڕابردوودا قسەیان پێوتوە و ئێستا قسەی پێناکەن. **"زبان یکی کردن با کسی"**: قسەیەکخستن، دەگەڵ ئەودابوون لە بابەتێك دا. **"از زبان"**: لە لایەن، لە قەول. **"از زبان افتادن"**: لە زمان کەوتن، لە گۆ کەوتن. ماندووبوون بە هۆی دووپات بوونەوەی بابەتێ یان قسەکردنی زۆر. **"از زبان کسی دررفتن"**: لە زمان دەرپەڕین. **"از زیر زبان کسی (حرف) کشیدن"**: قسەلەژێر زمان دەرهێنان، قسە لێکێشانەوە، قسە پێدرکاندن. **"برزبان(بەزبان) آوردن(جاری ساختن، راندن، گذراندن)"**: دەربڕین، وتن. **"بە زبان"**: بە





زمان، لەقسەدا نەك لە کردەوەدا. **"به زبان آمدن"**: دەست بە قسەکردن، وەزمان کەوتن، وەقسەهاتن. **"جلو زبان خود را گرفتن"**: پێش بە زمانی خۆ گرتن، خۆبواردن لە قسەیەك کە بە قازانج نیە. **"(بر) سر زبانها افتادن"**: کەوتنە سەرزاران، وتران لە لایەن ژمارەیەکی زۆری خەڵکەوە.

**زبان آور**: 1) زمان پاراو، زمان تەڕ، زوان دار، قسەزان، گفت و لفت خۆش، دەمەوەر، دەم هەراش، بلبل. 2) زمان درێژ، ئەوەی بێ شەرمانە قسە دەکا. 3) بوێژ، شاعیر.

**زبان اشارە**: زمانی هێما، جووڵاندنی سەر و دەست بۆ تێگەیاندنی کەسێك لەمەڕ بابەتێ.

**زبان اصلی**: (فیلم) وەرنەگێردراو، دوبلاژنەکراو.

**زبان باز**: زوان لووس، تەڕزوانی خۆڕێك خەر، زمان لووس و هەڵخەڵەتێن.

**زبان باز کردن**: 1) زمان گرتن(مناڵ). 2) زمان کرانەوە، دەم هەڵبڕین، وەقسەهاتن.

**زبان بازی**: زمان لووسی، کلکەسووتە، مەرایی.

**زبان بریدە**: ئەوەی زمانیان بڕیابێ. بێزوان، بەسەزمان، بێدەنگ، کپ.

**زبان بستن**: بێدەنگ بوون، قسەنەکردن، دەم لێکنان، متەق لێوەنەهاتن. **"زبان کسی را بستن"**: بێدەنگ کردن، لەدەنگ خستن، کپ کردن.

**زبان بستە**: 1) بێدەنگ، کپ، کڕ، وسکوت. 2) ستەم لێکراو، زۆرلێکراو. 3) تایبەتمەندیی بوونەوەران بە تایبەتی ئاژەڵەماڵییەکان کە ئازار دەدرێن. 4) مناڵێ کە هێشتا زمانی نەگرتوە.

**زبان بکام کشیدن**: بێدەنگ کردن، وسکت کردن، لەدەنگ خستن.

**زبان پریشی**: زمان پەرێشی، زمان ئاڵۆزی.

**زبان ترکردن**: بریتی لە قسەکردن، ئاخاوتن.

**زبان چرب**: زمان شیرین، زمان چەور، زمان تەڕ، دەم تەڕ.

**زبان حال**: (زَ.نِ) دۆخ و حاڵەتی کەسێك کە حاڵ و ڕازی دەروونی ئەو دەربخا.

**زبان دادن**: بریتی لە بەڵێن دان، وادە و پەیمان دان.

**زبان دار**: خاوەن زمان، وتەبێژ، قسەکەر. بەدەم و دوو.

**زبان دان**: 1) زوان زان، زمانزان. 2) بریتی لە زمان پاراو، زمان تەڕ، دەماوەر.

**زبان دراز**: دەمەوەر، دەم هەراش، زمان درێژ، زماندار، چەنەباز، چەقەسرۆ، چەنەوەر، چەنەهەراش، هەڵەوەڕ، زۆربێژ، زۆربڵێ.

**زبان درازی:** چەنەچەن، چەنەلێدان، چەنەدان، زۆربێژی، زمان درێژی، هەڵەوەری.

**زبان درکشیدن:** بێدەنگ بوون، دەنگ نەکردن، وسبوون، متبوون، متەق لێوەنەهاتن.

**زبان دل:** زمانی ناخ، ئاخاوتە یان حاڵەتێ کە باس لە ڕازی دەروونی کەسێك بکا.

**زبانران:** زمان پاراو، دەم پاراو، بێژەر، فرەوێژ.

**زبان زد:** کەوتنەسەرزار، ئەو شتەی بابەتی گفتوگۆی زۆرێك لە خەڵکە، بابەت یان قسەیەك کە خەڵکێکی زۆر لێی ئاگادارین و بە یەکتری بڵێن. "**زبانزد شدن**": وترانەوە بە هۆی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی، بوونە وێردی سەرزاران. ناودەرکردن، ناوبانگ ڕۆیشتن.

**زبان زدن:** بریتی لە قسەکردن، پەیڤین، ئاخاوتن.

**زبان ستدن:** 1) بریتی لە وادە و بەڵێن لێوەرگرتن. 2) بریتی لە بێدەنگ کردن، دەنگ لێبڕین.

**زبان شناختی:** زماننناسانە.

**زبان شناس:** زمان ناس.

**زبان شناسی:** زمان ناسی، زانستێ کە تاوتوێی چییەتی، پێکهاتە و گۆڕانکارییەکانی زمان و پێوەندیی ئەوان دەگەڵ چالاکییە مرۆییەکانیتر دەکا.

**زبان عامیانە:** زمانی هەموانی، زمانی ڕەشۆکی.

**زبانك انداختن:** زمان دەرهێنان بە نیشانەی گاڵتەپێکردن یان شیرینکاری.

**زبان کلك:** (زَ.نِ.كِ) زمانی پێنووس، نووکی پێنووس.

**زبان گرفتە:** 1) بێدەنگ، وسکت، کپ، کڕ. 2) بڕوانە:"الكن".

**زبان گشادن:** زمان کردنەوە، دەس بە قسەکردن، دەست بە ئاخاوتن کردن.

**زبانگیر:** 1) شوفار، سیخوڕ، زیرەوان. 2) کەسێکی سەربە دوژمن کە گیرابێ و قسەی لێدەربکێشن. 3) کەسێك کە زاری کەسێکی دی بگرێ و نەیەڵێ قسە بکا.

**زبانگیری:** 1) وەرگرتنی هەواڵ یان قسە لە زمانی کەسێکەوە، ژێر زمان چەشتن. 2) لێکۆڵینەوە و پێدرکاندن لە کەسانی گیراو.

**زبان مادری:** زمانی زکماکی/سکماکی، زوانی ماری، زوانی مایێ.

**زبان مبدأ:** زمانی سەرچاوە.

**زبان مصور:** زمانی وێنەیی.

**زبان مقصد:** زمانی سەرەنجام.

**زبان نفهم:** ئەوەی لە زمان یان مەبەستی بەردەنگ یان هەواڵەکەی ناگا. گەمژە، نەفام، نەزان.

**زبان نگارە:** ئەوەی زمانێکی پێ دەنووسن، خەت.





**زبانور:** زوان دار. قسەزان، دەم پاراو.

**زبانە:** زمانە، قیتکەی باریك لە ناو شتی درێژدا. "**زبانەآتش**": بڵێسە، کڵپە، گڕپە، گوڵۆپە، گوڵ، گڕی ئاگر. "**زبانەدار**": بڵێسەدار، کڵپەسەندوو. "**زبانە زدن**": بڵێسەسەندن، کڵپەسەندن. "**زبانەزن**": بڵێسەسێن، کڵپەسێن. "**زبانەزنان**": لە حاڵی کڵپەسەندن دا. "**زبانەکشیدن**": بڵێسەسەندن، کڵپەسەندن."**زبانەهای خورشیدی**": پزیسکەخۆرییەکان.

**زبانی:** 1) زارەکی، بەدەم، دەڤکی، لەبزی، زمانی. 2) کەسی سەرکێش و شەقی. 3) کەسێ کە قسان بکا و بڕوای بەو قسانەش نەبێ. 4) بەڕواڵەت.

**زبدە:** 1) کارامە. 2) هەڵبژاردە و پەسندکراو لە شتێ، کورتە، پوختە.

**زبر:** (زِ) 1) خڕێخ، درشت، زبر، زوور، گرس، گەرووز، نالووس، نەپۆڕ، ناڕێك. 2) زیل، زیڵ، دەنگی تیژی باریك.

**زبر:** (زَ.بَ) بان، سەر، سەرۆ.

**زبرجد:** بەرزەڕینە، بەردێکی بەنرخە دەیکەنە نقێم قاش.

**زبرجدفام:** زەردی ئاماڵ سەوز.

**زبرجدگون:** بەڕەنگی بەرزەڕینە.

**زبردست:** (زَ.بَ.دَ) 1) دەست ڕەنگین و چازان، تەڕدەست، بەدەست و برد. 2) بەهێز، توانا، خاوەنی توانایی و دەسەڵات. 3) سەرەوەی کۆڕ یان مەجلیس. 4) فەرمانڕەوا، حاکم.

**زبرزیر:** سەر و خوار، سەر و ژێر، سەراوژێر.

**زبرسو:** لای سەرۆ، بەشی سەرەوەی شتێ.

**زبرمرد:** پیاوی بەتوانا و ناودار و هەڵبژاردە.

**زبرنگر:** بەرفرەڕوان، بیرئاوەڵە، هیممەت بەرز.

**زبروزرنگ:** زیرەك و وریا، زرکوزینگ، گورجوبەکار.

**زبرین:** سەروترین، بەرزترین.

**زبودە:** دەس بەجێ، بێڕامان، کوتوپڕ.

**زبون:** 1) داماو، بێچارە، بێدەسەڵات، ژێردەست. 2) تێکشکاو، بەزیو، گرفتار. 3) کزولاواز، لەڕ. 4) شتی بێڕمێن لەهەر شتێك. قامخۆش. "**زبون گیر**": ئازاردەری کەسانی لاواز و ستەم لێکراو.

**زپرتی:** 1) بێ نرخ. 2) سست، خۆڕانەگر، ڕانەوەستاو. 3) لاواز، بێهێز. 4) بەرگەنەگر، کەم تاقەت.

**زجر:** 1) ئازار، ئەشکەنجە، سزا، جەزرەبە. 2) نەهێشتن، پێشگرتن. "**زجر دادن**": ئازار و ئەشکەنجەدان، جەزرەبەدان. "**زجرکردن**": ئازار و ئەشکەنجەدان. تەمبێکردن، سزادان. "**زجرکشیدن (بردن، دیدن)**": ئازارکێشان، جەزرەبەکێشان.

**زجرآور:** زەجر و ناڕەحەتیهێن.

**زجرکش:** کووژراو بە هۆی ئازار و ئەشکەنجەوە.

**زحمت:** 1) قەڵەبالغی، پڕایی، چڕی، ئاپۆڕە. 2) زەحمەت، زامەت، مەینەت، ئەرکی گران، گوپچڕ. 3) هەوڵ و تەقالا. 4) بڕوانە:"مزاحمت". "**زحمت را کم کردن**": 1) ڕۆیشتن لە لای کەسێك، زەحمەت کەم کردنەوە. 2) مردن، کۆچیدوایی کردن. "**زحمت رسیدن بە کسی**": تووشی نەخۆش بوونی ئەو. ئازار و زەربە وێکەوتن بەو. "**زحمت کسی را کشیدن**": چاوەدێری و ئاگاداری لێکردن لەو. "**بە زحمت**": بە هەوڵی زۆر، بە دژواری، بەزەحمەت.

**زحمت افزا:** مایەی ڕەنج و زەحمەت، زۆرکەری زەحمەت.

**زحمت بردن:** زەحمەت کێشان، ڕەنج بردن.

**زحمتکش:** زەحمەتکێش، ڕەنجبەر، ڕەنجدەر، ئەرك گران، کرێکار.

**زحمت دادن:** 1) ڕەنج پێدان، زەحمەت دان، چەوساندن. 2) قەرەپەستان کردن، قەرەبالغیکردن.

**زحمت کردن:** 1) بوونە هۆی ئازارو جەزرەبە. 2) قەرەبالغی کردن. 3) جێ پێ تەنگ کردنەوە.

**زحمت کشیدن:** ڕەنجدان، ئەرکی گران کردن، کردوکۆش کردن، زەحمەت کێشان، چەوسان، چەوسانەوە. "**زحمت کشیدن بی بهره**": ڕەنجەڕۆیی، زەحمەت کێشانی بەخۆڕایی. "**زحمت چیزی را کشیدن**": وەئەستۆگرتنی ئەنجامدانی کارێك. "**زحمت کسی را کشیدن**": چاوەدێری و ئاگاداری لێکردنی.

**زحیر:** 1) نقاندن. 2) بڕوانە:"اسهال". 3) ئازاردەر. 4) خەم، ڕەنج. "**زحیرخوردن**": خەم خواردن.

**زخرف:** زێڕ، خشڵ، نەخش و نیگار.

**زخم:** 1) برین، زام، چوێ.2) ئازار و ئێشی سۆزداری و دەروونی(زخم زبان). 3) زەبر، لێدانێك. "**زخم و زیل**": برینی زۆر. "**زخم و زیلی**": بریندار، زامدار. "**بە زخم گرفتن**": لێدان، کوتان.

**زخم آوردن:** بوونە هۆی زیان و ئازار وێکەوتن.

**زخم برداشتن:** برینداربوون.

**زخم بندی:** برین پێچی.

**زخم خوردن:** برینداربوون، زامداربوون.

**زخمدار:** بریندار، زامدار.

**زخم رسیدن:** ئازاردیتن، زیان لێکەوتن. زەبر وێکەوتن.

**زخم روحی:** داخداری، داغ دیەیی.

**زخم زبان:** بریتی لە قسەی ناخۆش و ناحەز کە دڵی کەسێك بێشێنێ، تانە، تەشەر. "**زخم زبان زدن**": ڕەنجاندنی کەسێك بە تانە و تەشەر.





**زخم زدن:** 1) برینداركردنی كەسێك. زیان پێگەیاندن. 2) زەبر لێدان. 3) گەستن، پێوەدان.

**زخم شدن:** زیان دیتن، ڕووشان، چڵك كردن.

**زخم كاری:** زامی قورس و گران، برینی كوشندە، برینی كاری.

**زخم كردن:** بریندارکردن. لێدان، زەبرلێدان.

**زخم كش:** بریندار، زامدار.

**زخمگاه:** شوێنی بریندار كراو. شوێنی زیان هەڵگر.

**زخم معده:** دڵەكزە، دڵەكزێ.

**زخمناك:** زامدار، چوێدار.

**زخم نظر:** چاوزار، چاوەزار.

**زخمەزدن:** سازلێدان بە "مضراب".

**زخمەزن:** ژەنیار.

**زخمی:** بریندار، زامدار، زامار، چوێدار. "**زخمی شدن**": برینداربوون. ڕووشان، ڕووكان.

**زخیدن:** ناڵاندن. نقاندن.

**زدایش:** سڕینەوە، لابردن، ڕەواندنەوە.

**زداییدن:** بڕوانە:"زدودن".

**زداینده:** سڕێن، سڕێنەر، لابەر، پاككەرەوە، پەڕێن، هەشفێن.

**زداییده:** سڕاو، لابراو، پاكەوەكراو.

**زدگی:** زەدەیی، حاڵەتی زەدەبوو، حاڵەتی ناڕازی و بێهیوایی و ماندویەتی. زەدەدار، عەیبدار. لۆسی.

**زدن:** 1) لێدان، زەرپانن، كوتان، كوتەك لێدان، گەمشاندن، سرەواندن، تێ سرەواندن، قوتان، دۆق، ئازاردان. 2) لێدان، ژەندن، دەنگ دەرهێنان لە ئامرازی مۆسیقا. 3) چەسپاندن (زدن پوسترها بە دیوار). 4) پێوەدان، گەستن(مار زدش). 5) دزین، ڕفاندن و بردن(كیفم را زدند). 6) بڕین، پەڕاندن (درختهای پیادەرو را زدەاند). 7) تاشین (ریشش را دوتیغە زدەاست). 8) بەكارهێنان ( دو بستە تریاك زد). 9) خواردن، خواردنەوە(یك ساندویچ زدم). 10) تەنینەوە، داگرتن، تەشەنەكردن( سرطان بە زیرسینەاش هم زدەاست). 11) سازكردن، دروستكردن (روی رودخانە پل زدەاند). 12) كایەكردن، گەمەكردن(بیا فوتبال بازی كنیم). 13) دامەزراندن، دانان (احمد شركت زدە است). 14) ڕاوكردن. 15) نزیك بوونی شتێ لە شتێكیتر بەتایبەتی لەباری چۆنیەتییەوە(رنگش بە سیاهی می زد). 16) لێكدان( اوّل باید تخم مرغها را در یك كاسە بهم بزنیم). 17) هەللاجیكردن. 18) كەم كردنەوە، لابردن (از خرج خانە می زند و پس انداز می كند). 19) بارین( باران تندی زد). 20) هاتن (باد سردی می زد). 21) هەڵاتن، هاتنەدەر، دەركەوتن (آفتاب زدەبود كە راە افتادیم). 22) ڕۆشن كردن، هەڵكردن (كبریت می زنم).

23) تایپ کردن ( نویسنده متن را میخواند و منشی با ماشین تحریر می‌زد). 24) بەدگۆیی کردن، دووزمانی کردن، قسەهێنان و بردن (در اداره برای همکارها می زند). 25) ناڕەحەت کردن ( رفتار ناپسندشان مرا زد). 26) پارك کردن، ڕاگرتن (بزن کنار). 27) هەوڵدان، تەقالاکردن ( هرچە زد نتوانست کاری بکند). 28) دندە گۆڕین (بزن دو). 29) کۆپیکردن، هەڵگرتنەوە(از روی این نوار برایم بزن). 30) بەرهەمهێنان، دروستکردن. 31) چاپ کردن ( عکس قاتل را توی روزنامە زدەاند). 32) دیاریکردن( برای تو چقدر حقوق زدەاند؟). 33) شکست پێدان، بردنەوە( تیم ما دو بر یك حریف را زد). 34) هێرش کردن، هەڵمەت بردن( زدیم بە نیروهای دشمن). 35) هەڵدان(چادر زدن).هەڵقەندن، هەڵکەندن ( باید پشت کوە چاه بزنیم). 36) دەرکردن، ڕوان (درختها جوانە زدەاند). 37) بەرابەریکردن، هاوتاییکردن. 38) کردن، ئەنجامدان. 39) بەرەولای شتێك چوون. 40) وتن، گوتن(حرف زدن). **"زدن چیزی (تو) سر کسی"**: پۆزدان و بە ڕووی ئەو دا هێنانەوە، بەچاودادانەوە. **"زدن زیر چیزی"**: حاشاکردن لێی. **"بزن قدش"**: لێی دەوە.

**زدوبند:** ساتوسەودا، خلێنەوبلێنە، کەین و بەین، تەون و بەست، پیلان.

**زدوخورد:** تێکهەڵچوون، پێکداهەڵپژان، لێکدان، پێکدادان، کوتەککاری، پەڤچوون.

**زدودگی:** سڕین، ماڵینەوە، هەشف.

**زدودن:** ڤەسڕین، سڕین، سڕینەوە، ئەسترین، پاکەوکردن، هەشڤاندن، هەشفاندن، هەشفین، هەلهسوون. ڕنین، کڕان، کڕاندن.

**زدودە:** سڕاو، هەشفی، پاککراو.

**زدەشدن:** کوتراوی، لێدراوی، زەرپیان. وەڕەزبوون، بێزاربوون، زەدەبوون.

**زرآب:** ئاوی زێڕ. شەڕاب بە ڕەنگی زەرد.

**زرّاد:** زریێ ساز.

**زرادخانە:** جبەخانە، باڕووتخانە، ئەمباری چەکوچۆڵ، کارخانەی چەك سازی.

**زراعت:** کشتوکاڵ، وەرزێری، جووتیاری. **"زراعت آبی"**: ئاویژە، بەراو، بەراوەکێڵ. **"زراعت دیمی"**: دێمەکار، دێمەکێڵ، کشتوکاڵی دێمی.

**زراعت کار:** وەرزێر، جووتێر. **"زراعت کاری"**: 1) وەرزێری، جووتیاری. 2) زەوی چێنراو.

**زرافشان:** 1) زێڕەوشێن، کەسێك کە زێڕ و زیو دەبەخشێتەوە. 2) زەڕی، زێڕباف. 3) بە ئاوی زێڕ یان شتی لەو بابەتە نووسراو.





**زرافشانی:** زێڕوەشان، زێڕەوشان. بەخشینەوەی زێڕ و سککەی تەڵا. پارەخەرج کردن و دڵاوایی.

**زراق:** 1) فریودەر، خاپێن، فێڵباز، فریوباز. 2) جوان و فریودەر.

**زرآگین:** پڕلەزێڕ. تەواو ڕەنگ زەرد بە ڕەنگی زێڕ.

**زراندود:** 1) ئاڵدوز، ئاوەزێڕ، زێڕکفت، زێرکوت، زێڕچن، متەلا، متەڵلا، تەڵاکاری، زێڕەوشان، ڕووکێشی زێڕ و زیو. 2) زێڕباف. 3) فریودەر، خاپێنەر. 4) بە ڕەنگی زەرد.

**زراندوز:** ماڵ و سامان کۆکەرەوە.

**زراه:** زەریا. دەریا.

**زراهی:** زەریایی، ئۆقیانووسی.

**زربازی:** خەرج کردنی ماڵ.

**زربفت:** زێڕباف، زەڕی، پارچەی ڕایەڵ زێڕ.

**زرت:** (ز) بەشێوەی کتوپڕ، لەناخافڵ. **"زرت و پرت"**: قسەی قۆڕ و پووچ. **"زرت و زرت"**: پشت سەری‌یەك، لێکدالێکدا.

**زرتشتی:** گەور، گاڤر، گاور، فەلا، ئاگرپەرست، پێڕەوی ئایینی زەردەشت. **"کیش زرتشتی"**: ئایینی زەردەشت.

**زرخرید:** 1) بە زێڕکڕاو، زێڕکڕ، زەڕخڕی، ئەوەی بە پارە کڕاوە.2) تەواو ملکەچ.

**زرخیز:** کان/کانگای زێڕ. زەوی‌یەك کە بەروبوومی زۆر بدا و قازانجی زۆر ی لێ هەڵگرنەوە، خاکی بەپیت و بەرەکەت.

**زرد:** زەرد، زەر، بەڕەنگی ئاڵتوون. **"زردقناری"**: زەردی تۆخ/پڕڕەنگ.

**زرداب:** زەرداو، زەرتاڵ.

**زرد پوست:** زەرپێست، لە نەژادی زەرد.

**زرد پی:** وردەدەمار، دەماری زۆر باریك لە لەش دا.

**زردچهرە:** کەسێ کە ڕوخساری بەڕەنگی زەرد بێ، ژاکاو، شەمزیو، سیس بووگ.

**زردرخ:** 1) کەسێك کە ڕەنگی ڕوخساری زەرد بێ. 2) بریتی لە شەرمەزار.

**زردرو:** 1) ڕوخسار زەرد.2) بریتی لە خەجاڵەت و شەرمەزار. 3) نەخۆش و بێحاڵ. 4) بێبەش، ناهومێد.

**زردرویی:** 1) زەردی ڕەنگی ڕوخسار. 2) شەرمەزاری، خەجاڵەتی، تەریقی.

**زردشتی:** بڕوانە:"زرتشتی".

**زردشدن:** 1) زەردهەڵگەڕان. 2) سیس بوونی گیا، ژاکان. 3) بەڕەنگی زەرد دەرهاتن. **"زردشدن آفتاب"**: تیشکی نزیك بە خۆراوابوون، کاتی زەردەپەڕ.

**زردفام:** ئاماڵ زەرد، هەرشتێکی بە ڕەنگی زەرد.

**زردك:** چووکەڵەی زەرد، ئاماڵ زەرد. گێزەر.

**زردکردن:** 1) زۆرترسان. 2) میزکردن بەخۆدا بە تایبەتی بەهۆی ترس. 3) بە ڕەنگی زەرد دەرهێنان.

**زردگوش:** بریتی لە دووڕوو، ڕووبین.
**زردگون:** بەڕەنگی زەرد، ئامالْ زەرد.
**زرده:** زەردینە، زەردێنە.
**زر دهدهی:** زێڕی بیٚخەوش.
**زردی:** 1) زەردی، زەردایی، زەراهی، زەرایی، ڕەنگ ئالْتوونی.2) زەردوویی، زەردەیی. 3) زەردێنە.
**زر زدن:** (زِ.زَدَ) گریان. لەخۆڕا قسەکردن.
**زرشناس:** زێڕناس. زێڕکار، ئالْتوونچی.
**زر صامت:** دارایی و کەلوپەلی نەختینە.
**زرع:** چاندن، کێلاّن.
**زرفشان:** بڕوانە:"زرافشان".
**زرق:** فێلْبازی، فریوبازی. تەڕدەستی. "**زرق فروش**": دووڕوو، ڕیاباز.
**زرق و برق:** زریقەوبریقە، بریتی لە زێڕ و زێو و جوانی ڕوالّەتی.
**زركش:** بڕوانە:"زربفت".
**زركوبی:** تەلاّکاری، شوغلْ و کاری تەلاّکار.
**زرگر:** زێڕینگەر، زێڕگەر، زێڕکار، ئالْتوونچی.
**زرگون:** بەڕەنگی زێڕ، تەلاّیی.
**زرنشان:** 1) ئەوەی ڕەنگی زەردیان لێدابیٚ. 2) تەلاّیی.
**زرنگ:** زیرەك، زرینگ، زرنگ، زیت، زیتەلْ، زیخ، زیکل، وریا، بەچنگ، هش ڤەکری، یەمان.
**زرنگار:** بڕوانە:" زراندود ".
**زره:** زریٚ، زرخ، کراسی ئاسنی شەڕکەران، سەرکەوای لە ئاسن هۆنراو کە بۆ شەڕ دەبەر دەکرا.
**زره پوش:** 1) زریٚپۆش، کەسیٚ کە زریٚی دەبەردایە. 2) هەرچی گوللە نایبڕیٚ.
**زرهگر:** زریٚساز، کەسیٚ کە زریٚ دروست دەکا.
**زریر:** پیاوی بیرتیژ و ڕۆح سووك. زەردەچێوە. "**زریری**": بەڕەنگی زەرد.
**زرّین:** لە جنسی زێڕ. بەڕەنگی زێڕ، تەلاّیی. جوان و ڕازاوە.
**زرّین بهره:** براوەی قازانج و بەشی باش.
**زرین فام:** ئامالْ زەرد، بەڕەنگی زەرد، تەلاّیی.
**زرین كاسه:** 1) قاپیٚ کە لە زێڕ سازکرابیٚ. 2) بریتی لە خۆر.
**زریون:** 1) بەڕەنگی زەرد، تەلاّیی. 2) سەوز و بەگەشە.
**زستن:** بڕوانە:"زیستن".
**زشت:** درزێو، ناحەز، ناشیرین، گەست، ناپەسند، دشتە، دشت، خاپ، دژی جوان.
**زشتار:** بەدگۆ، زمان پیس، بیٚ ئەدەب.
**زشت خو:** بەدخوو، بەدخولْق، تووڕەوتۆسن.
**زشت رو:** بیچم ناحەز، ناشیرین.
**زشت كار:** ئاکارناپەسند، بەدکار، بەدکردار.
**زشت گو:** بەدگۆ، زمان پیس، جنێوفرۆش.





**زشت نام:** بەدناو، ڕیسوا، بیٚ ئابڕوو.
**زشت یادی:** قسەهەلْچنین، دووزمانی، بەدگۆیی.
**زشتی:** دشی، دشتی، ناحەزی، ناشیرینی.
**زعاف:** کوشندە، کوژەر.
**زعامت:** پێشەوایی و فەرمانڕەوایی کردن. پێشەوایی، سەرۆکایەتی.
**زعم:** وتنی قسەیەکی ڕاست یان درۆ لە ڕووی گومانەوە. "**بەزعم خود**": بەگومانی خۆی، بەقسەی خۆی.
**زعما:** کۆی"زعیم".
**زعیم:** پێشەوا، ڕێبەر، سەرۆك، سەرکردە، گەورەی قەوم.
**زغار:** سەختی و مەینەتی. هاتوهاوار، هەرای بەسام.
**زغاو:** سۆزانی، قاحبە.
**زغنگ:** نزگەرە.
**زفاف:** شەوی پەردە، هاونوێنی بووك و زاوا بۆ یەکەم جار.
**زفت:** (زَ 1) ئەستوور، قەبە، قەلْەو. 2) دژوار، گیروگرفت. 3) زۆر، فراوان.
**زفت:** (زُ) بەخیل، قڕنیس، سەقیل.
**زكاره:** لاسار، گویٚ نەدەر، قیڕسیچمە، خیلەسەر.
**زكاسه:** بڕوانە:"سیخول".
**زكام:** هەلاّمەت، هەلمەوت، ئارسم، پەسیو، ساڤ، فڕفینگ، مڕك، بابینی. "**زكامی**": هەلاّمەت دار، پەسیودار، ئارسمی.
**زكیّ:** پاك، خاوێن، داوێن پاك.
**زكیدن:** بڕوانە:"ژكیدن".
**زگیل:** بالووك، بالووکە، بالۆکە.
**زلال:** خاوێن، ڕوون، ئاوی ڕوون و ساف.
**زلت:** 1) خەتا، هەلّە. 2) گوناح.
**زلزال:** لەراندنەوە، جوولاّندنەوە، لەراندنەوەی زەوی.
**زل زدن:** ڕوانینی زەق و کونجکۆلاّنە یان ڕووهەلْمالاّوانە.
**زلزله:** 1) بوومەلەرزە، بوولەرە، لەرزەك، لەرزان. منالّی زۆر هاروهاج و بزۆز. "**زلزلەزده**": خەسارەت دیتوو بەهۆی بوومەلەرزە، بوومەلەرزەلێدراو.
**زلزلهشناسی:** بوومەلەروزەناسی، زانستیٚ کە بوومەلەرزە و هۆکاری سەرهەلْدانی تاوتویٚ دەکا.
**زلف:** ئەگریجە، بسك.
**زلفك:** ئەگریجەی جوان و لەبەردلاّن.
**زلق:** (زَ.لَ) 1) خلیسکان، هەلْخلیسکان. 2) هەلّە، خەتا. 3) دەستپەڕ، مشتاو.
**زلل:** ( زَ.لَ) 1) خلیسکان و کەوتن. 2) خەتا، گوناح. 3) ناتەواوی، کەموکووڕی.
**زلیفن:** ترس، خۆف. "**زلیفن بستن**": تۆلّەساندنەوە، تۆلّەکردنەوە. "**زلیفن كردن(دادن)**": ترساندن.
**زلیل:** ئاوی ساف و ڕوون.
**زمّار:** نەی ژەن.
**زمازم:** کۆی"زمزمه".

**زمام:** 1) هەوسار، جڵەو. 2) ئیختیار، دەسەڵات.

**زامدار:** هەوساربەدەست، جڵەوبەدەست. کەسانی سەرەوەی حکوومەت، پیاوی دەوڵەت. "**زامداری**": حکوومەت، ڕێبەری.

**زمان:** وەخت، کات، سات، ڕۆژگار، سەردەم. "**زمان خواستن**": وەخت ویستن، مۆڵەت ویستن. "**زمان دادن**": کات پێدان(دان)، دەرفەت پێدان. "**زمان و مکان**": شوێنکات، شوێن و کات.

**زمان بندی:** کات دیاریکردن، دیاریکردنی ماوەیەکی کەم و دیاریکراو بۆ دەسپێك و کۆتایی کارێك.

**زمانت:** نەخۆشی درێژخایەن و لەپێکەوتن.

**زمان سنج:** 1) تامێر. 2) کوڕنۆمیتر.

**زمانه:** 1) سەردەم، دەوران، ڕۆژگار، زەمانە. 2) پەتا، عەیب، کەموکورتی، پەککەوتوویی. 3) ماوەی ژیان.

**زمانەساز:** سازگار دەگەڵ ڕۆژگار، کەسێك کە دەگەڵ هەلومەرجی ڕۆژگار بسازێ و نەکرووزێتەوە.

**زمانی:** 1) یەکزەمان، ڕۆژگارێك، زەمانێك. 2) هاوچەرخ.

**زمترا:** بڕوانە:"ریشخند".

**زمخت:** (زُ.مُ) 1) ناقۆڵا، ناڕێك، قولۆر. 2) ئەستوور، قەبە. 3) بەخیل، قڕنیس. "**زمختی**": توندوتیژی.

**زمردفام:** ئاماڵ سەوز، بەڕەنگی سەوز.

**زمره:** ڕیز، دەستە، گروپ.

**زمزمه:** 1) لۆرە، لۆرەلۆر، نارەنار، ویر، ویرە، ویرەویر، نێورین، هۆرە، هۆرەهۆر، هوربانەدن، ڕیچار، گۆرانی لەسەرخۆ و لەبەرخۆوە، گۆرانی بەسۆزە، گۆرانی لەبن لێوانەوە. 2) دەنگۆ. 3) ڕاز، قسەی نهێنی. "**زمزمه زیرلبی**": ورنگ، ورنگە، ورنگەورنگ، ورینگ، ورینگە، ورە، ورەورلۆرانەوە، لۆریانەوە، لۆرینەوە. "**زمزمەکنان**": لەبەرخۆوە.

**زمستان:** زستان، زسان. "**زمستانه**": زستانی، شیاو بۆ زستان.

**زمن:** (زَ.مَ) کات، سات، ڕۆژگار. "**در زمن**": دەزبەجێ، دەمودەست، خێرا.

**زمودن:** نەخش و نیگارکردن.

**زمهریر:** جێگەی زۆر سارد، سەرماوسۆڵ.

**زمیل:** (زُ.مَ) لاواز، ترسەنۆك.

**زمین:** 1) زەوی، زەڤی، زەی، هەرد، خاك. 2) قوونەنشین و لەجێ داکەوتوو، کەموکووڕی دار و لەکارکەوتوو. "**زمین آبزا**": لەرزك، زوهۆڕ، زەوینی زۆنگ، زەوینی ئاودەڵێن. "**زمین باتلاقی**": زەوینی زۆنگ، چارچیق. "**زمین به دندان گرفتن**": ئۆقرەلێبڕان بەهۆی ژان و تووڕەیی زۆرەوە. "**زمین بی گیاه**": ڕووتەن، ڕووتەنی، ڕووتاڵ، قاقڕ. "**زمین پر گیاه**": زەمەن، زەمەند، زەوینی پڕگیا. "**زمین را به آسمان دوختن**": هارت و هورت و درۆی زل کردن. هەوڵ و تەقالای زۆر دان. "**زمین سنگلاخی**": چەقەن، تمتم، تمتمان، ڕەقەن. "**زمین غیرقابل کشت**": نەکێڵ، سخار. "**زمین گذاشتن بار**": زان، زایین. "**زمین گذاشتن کاری**": بەناتەواوی جێهێشتنی ئەو کارە. "**زمین و آسمان را به هم زدن( ریختن )**": ئاژاوەنانەوە. "**زمین و زمان**": هەموو جێیەك، هەموو کەس. "**زمین و زمان را به هم بافتن**": پەنابردنەبەر درۆی جۆراوجۆر یان هاشوهوش. "**زمین هموار**": تەختان، دەشتانی. "**بر( به ) زمین زدن**": بە زەوی دادان. شکست پێدان، بەزاندن. "**به زمین گرم خوردن**": مردن یان بەدبەخت بوون."**روی زمین سفت نشاشیدن**": ئاگادارنەبوون لە دەرەنجامی خراپی کارێك. نەبوونی پێشینەی دۆڕان یان شکست. "**کره زمین**": گۆی زەوی، تۆپی زەوی.

**زمین باز:** کەسێ کە کاری کڕین و فرۆشتنی زەوییە.

**زمین بر:** وەرزێرێ کە بەخاتری بوونی زەوی بەشی زۆرتر لە داهات بەرێ.

**زمین پیما:** 1) ئەوەی کە بە سەر زەوی دا دەڕوا و لە جێیەکەوە بۆ جێیەکی دی دەچێ، گەشتیار، تووریست. 2) ڕووپێو، زەوی پێو.

**زمین خوردن:** 1) بە زەویداکەوتن، بە زەویدادران. 2) شکست خواردن لە ژیان یان لە کارێك دا. 3) دابەزین و هاتنەخواری چۆنیەتی کار. 4) دابەزینی نرخ.

**زمین دار:** 1) خاوەن زەوی. 2) سنوور پارێز.

**زمین زدن:** 1) بەزەوی دادانی کەسێك یان شتێك. 2) شکست دان یان بەزاندنی کەسێك. 3) دابەزاندنی نرخی کاڵا.

**زمین سالاری:** فیێئۆدالیتە، خانخانەکێ.

**زمین شناسی:** زەویناسی، "ژێئۆلۆژی"، زانستێ کە سەبارەت بە خولقێنرانی زەوی و چۆنیەتی چینەکانی و بەشە جۆراوجۆرەکانی دەدوێ.

**زمین شو:** زەوی شۆرەوە. شتێ کە زەوی پێ پاك دەکەنەوە، تەی.

**زمین شیمی:** "ژێئۆشیمی".

**زمین فیزیك:** "ژێئۆفیزیك".

**زمین گرایی:** "ژێئۆترۆپیسم".

**زمین گیر:** لەجێدا کەوتوو، پەککەوتوو، زەوینگیر، زەمین گیر، کەسێ کە قوونەنشینە و ناتوانێ بەڕێوەبڕوا، لەپێکەوتوو.

**زمین لرزه:** بڕوانە:" زلزله ".

**زمینه:** 1) بەستێن، بوار. 2) بارە، وارە، دەربارە. 2) ڕووی شتێك کە لەو دا نەخشە یان ڕەنگێکی لێدەکێشنەوە، بووم. 3) پانتایی. 4) بابەت. "**زمینه چیدن**": ئامادەکردنی پێشەکی و پێداویستییەکانی کارێ یان شتێ. "**در زمینه**": سەبارەت بە، لەبابەت.

**زمینەچینی:** ئامادەکردنی پێشەکی و پێداویستییەکانی کارێ یان شتێ، ڕێگاخۆشکردن.

**زمینەساز:** ڕێخۆشکەر، دەراوخۆشکەر.

**زمینەسازی:** ڕێگا خۆشکردن، دەراو خۆشکردن.

**زمینی:** 1) زەویینی، بەرامبەر ئاسمانی. 2) دانیشتوی گۆی زەوی. 3) زەوینگیر.

**زن:** ژن، زە، زینە، پیرەك، ئافرەت، مرۆڤی مێچکە. "**زنانگی**": ژنایەتی، ژنەتی، کەیوانوویی، کاری تایبەت بە ژنان. "**زنانه**": ژنانە، تایبەتی ژنان، وەك ژنان. "**زن بابا**": زڕدایك، باوەژن. "**زن بارگی**": ژنبازی، فین، داوێن تەڕی. "**زنباره**": مێباز، تۆلاز، فینۆك، فچۆزك، پیاوی داوێن تەڕ. "**زنباز**": ژنباز، دڵچەرێن، پیاوێ کە حەز لە زۆر ژنان دەکا، داوێن تەڕ. "**زن بدکاره**": بەستۆك، ژنی داوێن تەڕی بەدەست هەرکەسەوە. "**زن بردن**": ژن هێنان، پێکهێنانی ژیانی هاوبەش. "**زن بودن**": ئافرەتێتی، ژنێتی، ژن بوون. "**زن پدر**": زڕدایك، باوەژن، باواژن، دیدی. "**زن خجالتی**": نارین، ژنی شەرمن. "**زن خواستن**": خوازبێنی کردن. ژن هاوردن. "**زن دادن**": دابین کردنی پێشەکییەکانی ژن هێنانی پیاو. "**زن خودفروش**": سۆزانی، شەلف، ژنی لەش فرۆش. "**زن دوست**": ژن خۆشەویست، مێباز، تۆلاز. "**زن ذلیل**": شەکلە، ئاڵی. "**زن سالاری**": ژن سالاری، مێوەجاخی. "**زن سلیطه**": جانانە، تلۆخ، هەیشۆ، ژنی بێ شەرم و زمان درێژ. "**زن شکم گنده**": مەشکوێ، ژنی ورگ زل. "**زن شهوانی**": گانەکی، سیت بلۆق، حەشەری. "**زن صفت**": لاواز و ترسەنۆك و نەوێر. "**زن طنّاز**": لووتە، ژنی بەناز و شەرمێون. "**زن کردن**": پێکهێنانی ژیانی هاوبەش. "**زن گرفتن**": ژن هێنان، ژن هاوردن، ژنانین، ژن خواستن. "**زن غیرمسلمان**": کێلوك، کێلێك. "**زن گمنام**": ژنکۆك، ژنی بێ ناوونیشان وەك بۆرەپیاگ (مردگمنام). "**زن لاغرمردنی**": قرچەڵۆك، ژنی لاواز و ڕەقەڵە. "**زن مسیحی**": خارسك، ژنەگاور، ژنەفەلە. "**زن ناشزه**": ناچیزە، ژنێ کە لە فەرمانی شوو سەرپێچی بکا. "**زن ولگرد**": لەککاتە، لەیلەدۆنێ، ماڵانگەڕ. "**زن هوودار**": سەربەهەوێ، ژنی پیاوی دوو ژنە. "**زن یائسه**": ئاوەسوو، ژنی لەزگ وەستاو، عوزر نەشۆر. "**زنی که ادای مردان را درمی آورد**": نێربلۆکێ. "**زنی که زیاد می‌زاید(ولود)**": زایا، زایێ، زاڤۆك، زەوك، زەڤۆك. "**مرد زن نما**": ژنانیلە، ژنانی، کچانی، بلەکناچی، سەرژنانە، سەرژنانیلە.

**زناء:** زینا، زیناح، گانی ناڕەوا. "**زناء محصنه**": زیناح دەگەڵ ژنی بەمێرد.

**زنازاده:** زۆڵ، بێژوو، شەلووف.

**زناشویی:** ژن و مێردی، ژن و مێردایەتی، شووکردنی ژن، ژن هێنانی پیاو.





**زناکار:** زیناحکار، پیاو یان ژنی زیناکەر.

**زن بمزد:** پیاوی جاکەش و بێغیرەت، گەواد، پیاوێ کە ژنەکەی خۆی بخاتە ئیختیار کەسانی دیکەوە و پارە وەرگرێ.

**زن پوش:** پیاوێ کە لە شانۆدا بەرگی ژنان دەبەر دەکا و ڕۆڵی ژن دەگێڕێ.

**زن جلب:** تایبەتمەندی پیاوێ کە ژنەکەی خراپەکارە.

**زنجموره:** سکاڵای تێکەڵ بە گریان و ناڵە.

**زنجه:** ژانی سك.

**زنجیدن:** شیوەن کردن، شین و شەپۆڕکردن.

**زنجیر:** زنجیر، چەند ئاڵقە زنجیری تێکخراو. "**زنجیر پاره کردن**": بریتی لە دێوانەبوون. زنجیر پساندن. "**زنجیر خاییدن**": بریتی لە هەوڵدان بۆ ئازادی و ڕزگاربوون. "**زنجیر کردن**": بستنەوەی کەسێ یان شتێ بە زنجیر، زنجیرکردن.

**زنجیرگر:** زنجیرساز، کەسێ کە زنجیر دروست دەکا.

**زنجیره:** 1) شریتە، زنجیرە. 2) سرپاڵ. 3) سیایی ناوی باب و باپیران. "**زنجیره‌ای**": زنجیرەیی. یەك لە دوای یەك، پشت سەری یەك. "**زنجیره متناوب**": زنجیرەی یەکنایەك.

**زنجیری:** 1) شێتێ کە بە زنجیر بەستبێتیانەوە تا ئازار بە کەس نەگەیەنێ، مەترسیدار. 2) دیل، یەخسیر.

**زنچك:** سۆزانی، قاحبە.

**زنخ زدن:** چەنەلێدان، قسەی پووچ کردن.

**زنخ برخون زدن:** شەرمەزاربوون، سەرشۆڕبوون.

**زندان:** گرتووخانە، بەندیخانە، زیندان، هوڵفدو، دوساخ، دوساخ خانە، قولیك، دوساق. "**زندان ابد**": حەپسی هەتاهەتایی. "**زندان انفرادی**": زیندانی تاکەکەسی. "**زندان تأدیبی**": بڕوانە: "حبس تأدیبی".

**زندانبان:** وەردیان، زیندانەوان، زینانوان، زینانەوان، دوساخوان، دوساخچی.

**زندانی:** بەندی، زیندانی، حەپس(ی)، حەفسی، گراو، گیراو، ماپووس، کەسێك کە لە زیندان دایە. "**زندانی کردن**": خستنە زیندانەوە.

**زنداور:** حەڵاڵ، ڕەوا.

**زندبار:** ئاژەڵی بێئازار وەك مەڕ و گا.

**زندباف:** خوێنەری سروود یان ئاواز.

**زندخوان:** خوێنەری کتێبی زەند، پێشەوای زەردەشتی. بریتی لە بولبول و هەر پەلەوەرێکی دەنگ خۆش.

**زندگانی/ زندگی:** ژین، ژیان، نزگ، زیوار، ڕابواردنی تەمەن. "**زندگی دادن**": ژیاندن، ژیانن، بژیوپێدان، بەخێوکردن. "**مایه‌زندگی**": بژیو، پێ بژیو، ژیوار.

**زندگی نامه:** ژیاننامەنووسی، "بیۆگرافی". "**زندگی نامه خودنوشت**": خۆژیاننامە، "ئۆتۆبیۆگرافی".

**زنده:** 1) زیندوو، زینوو، زیندك، زیندگ، زینگ، زیندی، زننو، زننه، زنه، گیاندار، گیان لەبەر، بەرامبەری مردگ. 2) ڕاستەوخۆ. "**زندەباد**": بژی. "**زندەبودن**": بوون، مان، زیندوویەتی، زیندووبوون، هەیین. "**زندە داشتن**": زیندووڕاگرتن، ژیان و تەمەن پێدان. پایەدارکردن، جێگیرکردن. "**زندەشدن**": ڤەژینك، ژیانەوە، زیندووبوونەوە. "**زندەکردن**": زیندووکردنەوە، ژیان پێدان. بەکەیف و زەوق کردن. وەبیرخستنەوە، وەیادخستنەوە.

**زندەبەگور:** زیندەبەچاڵ، زینگەچاڵ، زیندەبەگۆڕ، گیانداریێ کە بە زیندوویی لە خاك دا بنێژرێ.

**زندەدل:** دڵاوەدان، دل زیندی، دل زیندوو، وشیار، وریا، دڵخۆش، شاد.

**زندەزا:** 1) بوونەوەریێ کە لە ڕێگەی گەشەکردنی تەواوی تۆل لە لەشدا و دواتر هاتنەدنیا بە شێوەی زیندوو زاوزێ دەکەن. 2) منالّداربوون، زان.

**زندەنگاری:** بڕوانە: "آنیمیسم".

**زندەیاد:** نەمر، کەسێ کە ناوی بە باشی دەمێنێ.

**زندیق:** بێدین، بێبڕوا بە خودا، کافر. پێڕەوی ئایینی مانی.

**زنش:** بڕوانە: "ضربان".

**زنگ:** ژەنگ، لێش، چڵکی سەر کانزا. گوناح. "**زنگ بستن**": ژەنگ هێنان. "**زنگ خاطر(دل)**": خەم، کەسەر. "**زنگ زدگی**": ژەنگ لێدان، ژەنگ هێنان، ژەنگ هەلێنان، ژەنگ لێنیشتن. "**زنگ زدن**": ژەنگ هێنان. پیس بوون، تێوەچوون. "**زنگ زدە**": ژەنگاوی، ژەنگن، ژەنگی، ژەنگ لێدراو.

**زنگ:** زەنگ. "**زنگ خوردن**": زەنگ خواردن، دەنگ لێوەهاتنی زەنگ. "**زنگ زدن**": 1) زەنگ لێدان. 2) تەلەفوون کردن. 3) زەنگ خواردن.

**زنگار:** 1) ژەنگ، ژەنگار، چڵکی سەر کانزا. 2) پیسی، ناپاکی. 3) خەم، خەفەت. "**زنگار خوردن**": ژەنگ هێنان.

**زنگارزدە:** ژەنگاوی، ژەنگ لێدراو.

**زنگارفام:** هەرشتێکی بە ڕەنگی کەسکی تاریك، بەڕەنگی ژەنگ.

**زنگارگون:** بڕوانە: "زنگارفام".

**زنگاری:** بەڕەنگی ژەنگ، بەڕەنگی سەوز. ژەنگ لێدراو.

**زننده:** 1) لێدەر، قوتێن. 2) ئەوەی گۆڵ دەکا. 3) ناحەز، دزێو. 4) ئازاردەر، ناخۆش (بوی زننده). 5) ژەنیار.

**زنودن:** بڕوانە: "زنوییدن".

**زنویە:** ناڵە، شیوەن. لوورە، قرووسکە.

**زنوییدن:** ناڵاندن، شیوەن کردن. لووراندن، قروسکاندن.





**زنهار:** 1) ئامان، ئەمان، دەغیلە، دەخیلە، نەکەی، نەچی وابکەی، دوچ. 2) مۆڵەت، وادە و بەڵێن، پەیمان. 3) بڕوانە: "امانت". "**بە زنهار داشتن**": پەنادان بە کەسێك. "**بە زنهار کسی درآمدن**": پەنابردنە بەر کەسێك.

**زنهارخوار:** پەیمان شکێن. ئەوەی خەیانەت لە ڕاسپاردە دەکا.

**زنهارخواستن(گرفتن):** مۆڵەت خواستن.

**زنهارخوردن:** 1) بەڵێن شکاندن، پەیمان شکاندن. 2) خیانەت کردن.

**زنهاردادن:** پەنادان.

**زنهاردار:** پابەند بە وادە و پەیمان، وەفادار، بەئەمەگ.

**زنهارکردن:** 1) پاڕانەوە، لاڵانەوە. 2) گلەییکردن، گازندەکردن.

**زنهارنامە:** بڕوانە: "امان نامە".

**زنهارە:** بڕوانە: "اولتیماتوم".

**زنهاری:** ئەوەی وادە و پەیمان ببەستێ. کەسێك کە ئەمان و پەنا بخوازێ، پەناخواز. "**زنهاریان**": پەنابەرەکان، داڵدەخوازەکان.

**زنی:** 1) ژن بوون، ژنێتی. 2) هاوسەری، هاوسەربوون. "**زنی کردن**": وەك ژن هەڵسوکەوت کردن، هەبوونی حاڵەتی ژنانە. "**بە زنی بردن(گرفتن)کسی**": ژیانی هاوبەشی پێکهێنان دەگەڵ ئەو. "**بە زنی خواستن کسی**": خوازبێنی لێکردن لەو. "**بە زنی دادن بە کسی**": بەشوودان بەو.

**زنیّت:** ژن بوون، ژنێتی.

**زنینە:** ژنانە، ئەوەی بۆ ژنان شیاو و لەبارە.

**زوائد:** کۆی"زائدە".

**زواجر:** کۆی"زاجر"، کۆسپەکان، تەگەرەکان، بەرگێڕەوەکان.

**زوار:** (زَ) خزمەتکار، پەرستار.

**زوّار:** (زَ) زیارەتکەران.

**زوال:** نەمان، لەناوچوون، سڕانەوە. "**وقت زوال**": رۆژداگەڕان، ڕۆژداگەڕیان. "**زوال پذیر**": ناپایەدار، خۆڕانەگر، ناپتەو. "**زوال یافتن**": لەناوچوون، تیاچوون. بە کۆتایی گەیشتن.

**زوایا:** کۆی"زاویە".

**زوج:** جیت، جووت، دوان، بەرانبەری تاك. ژن بۆ شوو، شوو بۆ ژن.

**زوجات:** ژنان، هاوسەران.

**زوجە:** ژن، هاوسەری پیاو.

**زوجیّت:** جووت و هاوتا هەبوون، دوانە بوون. هاوسەری کەسێك بوون.

**زوجین:** ژن و مێرد.

**زود:** زوو، توند، خێرا. "**زودا**": زوو، بە زوویی.

**زودازود:** زووبەزوو. زۆرخێرا، بەپەلە.

**زود افزول/زود افگار:** (دەروون ناسی) بڕوانە: "تحریك پذیر".

**زودا نجامی:** ئاسانی، سانایی.

**زودانداز:** بڕوانە: "بدیهە".

**زودانگیز:** هەستیار، لەسەرهەست، سڵ.

**زودباور:** ساویلکە، خۆش باوەڕ، کەسێك کە زوو و بەبێ بیرلێکردنەوە بڕوا دێنێ.

**زودترك:** کەمێ زووتر. هەرچی زووتر.

**زودخشم:** کەم چیکەڵدانە و بەدخولق، کەسێ کە زوو تووڕە دەبێ، زووهەڵچوو.

**زودخیز:** زووڕاب، کەسێك کە زوو هەڵدەستێ.

**زودرس:** ڕەبیت، زووڕەس، زووپێگەیو، هەر شتێ زووتر لە شتیتر پێدەگا.

**زودرنج:** فیشقی، کەم جیکەڵدانە، بهن تەنگ، عەڕنۆك، دڵناسك و دایم تووڕە، خوێن گەرم، گونرو، زوتۆر، کەسێ کە زوو هەڵدەچێ.

**زودسیر:** کەسێ کە لە هاونشینی یان تێکەڵی دەگەڵ کەسی دیکەدا زوو ماندوو و وەڕەز دەبێ.

**زودگذر:** تیژتێپەڕ، نابەردەوام، ناجێگیر.

**زودهنگام:** ناوەخت، ناوادە.

**زودی:** زوویی، زووبوون. "**بە زودی**": بەزوویی، لە داهاتوویەکی نزیك دا. زۆر زوو، دەس بەجێ.

**زودیاب:** 1) بیرتیژ، وشیار، وریا، تیژفام.2) قامخۆش.

**زور:** 1) زۆر، توانایی، تابشت، تاقەت، وزە، هێز، گوشار. 2) ناهەقی، ستەم. 3) پووچ، نالۆژیکی. "**بە زور**": بەزۆری، بەناچاری. بەدژواری. بەهێز، توانا.

**زورآزما:** وەرزشوان، پاڵەوان، زۆرانباز، ئەوەی زۆر و وزەی خۆی تاقیبکاتەوە.

**زورآزمایی:** زۆرەزمێ، زۆرەوانی، زۆرانبازی، پاڵەوانبازی، بەربەرەکانی، هێزو توانا تاقیکردنەوە، خۆتاقیکردنەوە.

**زورآوردن:** 1) زۆرهێنان، گوشارهاوردن. 2) پێداگرتن یان هەوڵی زۆر دان بۆ ئەنجامدانی کارێك.

**زورافزایی:** دووپینگ، ماددەی وزەبەخش.

**زورچپان کردن:** 1) شتێ بەنهێم خستنە شوێنێکی تەنگەوە. 2) بەزۆر پێ قبووڵ کردنی هزر و قسەی خۆ بەکەسێکی تر. 3) بە پێداگری شتێ بە کەسێك دان یان فرۆشتن.

**زورزدن:** نقانن، زۆرلێدان، تەواوی هێز و وزەی خۆ بەکارهێنان.

**زورستانی:** زەوت کردن، بەزۆرستاندن.

**زور شنیدن:** لە بەرامبەر ستەم یان کارێکی ناڕەوا دا خۆڕاگرتن.

**زورکردن:** 1) زۆر و هێز بەکاربردن. 2) زوڵم و ستەم کردن. 3) هێرش بردن، پەلاماردان. 4) زاڵبوون.

**زورکی:** 1) بەزۆر(ی)، بخورتی، بەناهەقی، جەبری، دەگەنەکی، کەرەزەڕی، بەزەبری هێز. 2) پێداگرانە. 3) بەزەحمەت، بە دژواری.

**زورگر:** پاڵەوان.

**زورگویی:** زۆری، ناهەقی، کەڵەگایی، کەرەگایی.





**زورگیر:** ئەوەی بە ملهوڕی و هەڕەشە شتێ لە کەسێك زەوت دەکا.

**زورمند:** بەتاقەت، بەقەوەت، لەهێرت، زۆربەهێز، دەگەنەك. "**زورمند کردن**": بەهێزکردن.

**زوری:** 1) بەزۆر. 2) بەپێداگری، پێداگرانە.

**زوزه:** لوورە، قووزە، کازکاز، دەنگی لوورانـدن. "**زوزەپیاپی**": لوورەلوور. "**زوزەکشیدن**": لووراندن، زوورین.

**زوش:** بەدخوو، بەدخولق، ڕووترش، ڕووگرژ.

**زوم کردن:** 1) زووم کردن. 2) چاوتێبڕین، چاوبڕینە شتێ بە وردی بەبێ چاولێهەڵگرتن لێی.

**زون:** پیاوی کورتەباڵا.

**زووآزرم:** شەرمێون، ڕووتەنك، کەم ڕوو.

**زه:** 1) وشەی ئافەرەم بە مانای بژی، ئافەرەم. 2) دەلانی ئاو لە درزی شتێکەوە. 3) منالدان. 4) گەرا، منال. "**زه زدن**": لەئەستۆی کارێك نەهاتن یان بەشێوەی دروست ئەنجام نەدانی. "**زەکردن**": زان، منالْ خستنەوە. "**بە زه آوردن**": وەچە زیادکردن، ناچار بە زاوزێ کردن."**درد زه**": پڕك. "**زهی**": دووگیان، ئاوس. خۆشا، ئافەرەم.

**زهاب:** زن، زنە، زەهاو. ئەسرین، فرمێسك.

**زهادت:** دنیانەویستی، تەرکەدنیایی، خۆپارێزی، ڕەوان کردن.

**زهانیدن:** کردنەوە و هەڵێنجانی ئاو لە درزی شتێکەوە.

**زهد:** لە خۆگرتنەوە، خودادۆزی، خۆپارێزی، نەویستنی شتێك و وازلێهێنانی، بەهێندنەگرتنی دنیا و خۆشییەکانی، گۆشەگیری.

**زهدان:** پیزەدان، منالدان، منداردان، زاگە، هاوباز، هەماز، زێدان، ڤاگینا، جێگەی بێچوو لە زگ دا.

**زهر:** ژەهر، ژار. "**زهر کسی را چشیدن**": لە ئازاردان و دوژمنایەتی کردنی زیان وێکەوتن.

**زهرآسا:** ژەهری، وەك ژەهر.

**زهرآگین:** 1) ژاراوی، ژەهراوی. 2) ناخۆش.

**زهرآلود:** ژاراوی، ژەهراوی، تێکەڵ بەژەهر. 2) ناخۆش. 3) توند و تێکەڵ بە تووڕەیی.

**زهراب:** ئاوی ژاراوی. میز.

**زهرابه:** ئاوی تێکەڵ بە ژەهر، ئاوی ژاراوی، زاراو، دەرمانی تراوی جانەوەر کوژ. ماددەیەکی سەممی کە هێندێ لە باتریاکان دروستی دەکەن، "توکسین".

**زهرپاشی:** 1) ژەهرڕژاندن. 2) دەنگۆ بڵاوکردنەوە بۆ ناوزڕاندنی کەسێك.

**زهرچشم:** ڕوانین بە تووڕەیی و غەزەبەوە.

**زهرخورده:** دەرمانخوار، دەرمانخواردوو، دەرمانداو.

**زهردارو:** بڕوانە:"پادزهر".
**زهرریختن:** بریتی لە قسەی بەچزکردن.
**زهر زدەکردن:** دەرمان داو کردن.
**زهرکردن:** تاڵ و ناخۆش کردن، ژاردان.
**زهرکش:** (زَ.كُ) ژاربەر، ئەوەی ئاسەواری ژەهر لەناو دەبا.
**زهرگیا:** گیای ژاراوی، گیای سەممی.
**زهرمارکردن:** خواردن(ەوە).
**زهرماری:** 1) زۆر تاڵ و ئازاردەر. 2) خواردنەوەی ئاڵكۆڵی. 3) ماددەی سڕكەر.
**زهرناك:** ژاراوی، تێكەڵ بەژەهر، سەممی.
**زهره:** زارە، زراڤك، زەراڤ، زامار، زالۆ، زاڵە، زەلە، زەلك، زەڵگ، زەندەق، زەندەك، زەهلك، زراو(كیسەی زەرداو). ورە، ورار، هێزی دڵ، هەناو، ئەترەش، هەترەش."**زهره كسی تركیدن** ( **رفتن،آب شدن** )": زراوتۆقین، زراوچوون، زۆر ترسان.
**زهرەتركاندن:** لەبەر زۆرترسان مردن.
**زهرەترك شدن:** زراوچوون، زراوتۆقین، زراونەمان، زارەچوون، ئەترەش چوون، زەندەق چوون، ڕۆح چوون، ورەچوون، ورەبەردان، تۆقین، تۆقان، تۆقیان، ترۆقان، زۆرترسان، تەواوترسان.
**زهرەترك كردن:** زراوبردن، تۆقاندن، ترساندن، نەترەبردن.
**زهرەخود را باختن:** تۆقین، زۆرترسان، زەندەق چوون.

**زهرەداشتن:** ورە و زات هەبوون.
**زهزاد:** ژن و منداڵ، نەسڵ.
**زەزدن:** لەپێكەوتن بەخاتری بێ هێزی و ماندوویی، دەرچوون لەژێر بار.
**زهش:** 1) زان، زایین. 2) سەرهەڵدان، پەیدابوون. 3) دەڵان، دەڵیان، دەردان.
**زهشت:** هەناسە، پشوو.
**زهکشی:** زێڕاوكێشی، وشك كردنی ئاوی زۆنگاو.
**زهواردررفته:** پواو و لەكاركەوتو. بێچارە و لاواز.
**زەوزاد:** ژن و منداڵ.
**زهومت:** بۆگەنی، چڵك كردن.
**زهیدن:** 1) زان، زایین، منداڵ خستنەوە. 2) هاتنەدی، سەرچاوەگرتن. 3) دەڵاندن، دەردان.
**زیاترسی:** ترسان لە ئاژەڵان.
**زیاد:** زۆر، فرە، گەلێك، فت و فراوان، فت و فرەوان. "**زیادشدن**": زاف بوون، زاف بیایش، زۆربوون. "**بسیار زیاد**": فرەفرە، زافزاف، زاڤزاڤ، زۆرزیاد.
**زیادت:** 1) زۆری، زیادی. 2) زۆرتر."**زیادت آوردن بر كسی**": لە سەروی ئەو دانان. "**زیادت شدن**": زۆرتربوون.
**زیادتی:** زۆرتربوون. دەست درێژی. "**زیادتی كردن**": 1) دەست درێژ یكردن، تێپەڕاندن، زوڵم كردن. 2) زۆرتر لە ڕادەی ئاسایی بوون. 3) زیادیبوون.





**زیادە:** 1) زۆربوون، فرەبوون. 2) زۆری، فرەیی، زیادی، زافەی. 3) زیاتر لە ڕادەی ئاسایی.
**زیادەخواهی:** زێدەخوازی، فرەخوازی، زۆرخوازی.
**زیادەروی:** تەلاس، سەرچڵی، زێدەڕۆیی، تێپەڕین لە سنووری دیاریكراو.
**زیادەسر:** خیلەسەر، سەركێش، بەفیز و هەوا.
**زیادەگو:** فرەوێژ، زۆربڵێ، چەنەباز.
**زیادی:** ناپێویست، زیادی. زیادبوون.
**زیارت:** زیارەت كردن، سەردانی پیاوچاك یان شتی پیرۆز كردن.
**زیارتگاه:** قسن، خزن، زێوە، زیارەتگە، گۆڕی پیاوچاكان، جێگەی زیارەت.
**زیان:** زیان، زەرەر، زەرەد، خوسار، خەسارەت، سەرەچەرم.
**زیان آمدن:** خەسارەت و زەرەر پێگەیشتن. زیان وێكەوتن.
**زیان آور:** زیاندەر، بەزیان.
**زیانبار:** بڕوانە:"زیان آور".
**زیاندن:** ژیان پێدانەوە، ڕۆح دەبەرنانەوە.
**زیان دیدن:** زیان كردن، زەرەركردن، وەبن كەوتن.
**زیان رسان:** زیانكار، زیاندار، زیانەخورۆ، پیاوی بەدفەڕ و دەس بەزەرەر.
**زیانكار:** 1) زیان كردوو، زەرەركردوو. 2) زیاندەر، زیان پێگەێن.

**زیانكاری:** زیان كردن، زیان وێكەوتن، زەرەدكردن، سەرەچەرم دان.
**زیانگر:** بڕوانە:"زیانكار".
**زیان مند:** زیاندەر، بەزەڕ، مزیڕ.
**زیاهراسی:** بڕوانە:"زیاترسی".
**زیب:** 1) خشڵ، زەنبەر، شتێ كە مایەی جوانییە. 2) جوانی، قەشەنگی. 3) لێكاڵانەوە، لێهاتنەوە، شیاوی."**زیب دادن**": ڕازاندنەوە، جوانكردن، خەملاندن.
**زیبا:** 1) جان، جوان، جندی، لەبەردڵان، چەلەك، بەرچاو، خرنگ، ڕند، ڕووپەری، خشكۆك، خوشكۆك، خوشۆك، خوشیك، خوەشك، سپەهی، شەنگ، ڕەنین، ڕەنگین. 2) خۆش، دڵگر (آهنگ زیبا). 3) شایستە، شیاو."**بسیار زیبا**": سوور گوڵ، سەرتۆپ.
**زیبارو/ زیباروی:** جوان چاك، جوان چاڵ، سوڕپەری.
**زیباسازی:** جوانكردن یان ڕازاندنەوە.
**زیبایی:** جوانی، قەشەنگی، جوان خاسی، جوان چاكی. شیاوی، شایستەیی، لێكاڵانەوە.
**زیبایی شناختی:** جوانی ناسانە.
**زیبایی شناسی:** جوانیناسی، جوانی زانی، "ستەتیك".
**زیبندگی:** بڕوانە:"برازندگی".
**زیبندە:** ڕازاوە، خەملاو، جوان. شیاو، شایستە.

**زیبیدن:** شیاوبوون، شایستەبوون، لێهاتنەوە، لێکالآنەوە.
**زیج بستن (کردن):** دیاریکردنی وەزع و دۆخی ئەستێرە و شتە ئاسمانییەکانیتر.
**زیج نشستن:** 1) تێڕوانین لە ئەستێرە و شتە ئاسمانییەکانی تر و لێکۆڵینەوە و موتالاکردن سەبارەت بەوان. 2) گۆشەگیریکردن، تەریك بوونەوە.
**زیخ:** زوڵم کردن، ستەم کردن.
**زیر:** ژێر، بن. "**زیر (در) آمدن**": 1) هاتنەخوار. 2) بەزین، شکست خواردن. "**زیرزیر**": بەنهێنی، پەنامەکی. "**زیروبالاکردن**": تاوتوێکردن، سەروژێرکردن. پەرێشانکردن، ئاڵۆزکردن. "**زیر و بالای کسی را یکی کردن**": دەست درێژی سیکسی کردنە سەر کەسێك بە جۆرێك ئێش و زیان ببینێ، سەر و بنی کردنە یەك، "قوز و قوون کردنە یەك". "**از زیر چشم**": لەژێر چاوەوە. "**بە زیر آمدن**": هاتنەخوار، دابەزین. "**بەزیرآوردن**": هێنانەخوار. "**بە زیر افکندن (انداختن)**": سەرپێداخستن. خستنە ژێرەوە. هەڵداشتن، هەڵدێران. "**بە زیر رفتن**": چوونەخوارێ لە جێیەك یان ڕۆچوونە ناو شتێك. "**بە زیر کشیدن**": ڕووخاندن و لەسەرکار لابردن.
**زیرآب:** ژێراو، سولێن. "**زیرآب کسی را زدن**": دژی وی پیلان گێڕان، لەژێرەوە کارکردن دژی ئەو.
**زیرآبی:** 1) ژێرئاوی، مەلەی بینە، ژێراڤك. 2) تایبەتمەندی ئەوەی لەژێر ئاو یان لەحاڵی مەلەکردن یان نقووم بوون دایە. "**زیرآبی رفتن**": پێوانی مەودایەك لە ژێر ئاوەوە. کاری نهێنی کردن بە قازانجی خۆ. تەفرەچوون و خۆبواردن لە ئەنجامدانی کارێك.
**زیرا:** چکۆ، چونکە، چنکی، چونکو، ژونکی.
**زیراب:** بڕوانە: "زیرآب".
**زیراتمی:** دەپێوەندی لەگەڵ ئەو گەردیلانەی لە ئەتۆم وردترن یان ئەو دیاردانەی لە ئەتۆم دا ڕوودەدەن.
**زیرافتادن:** ژێرکەوتن، وەبن کەوتن، وەبەرکەوتن.
**زیراکس کردن:** وێنەهەڵگرتنەوە بە دەزگای زیراکس.
**زیرانداز:** ڕایەخ، ژێڕاخەر، دۆشەك، فەرش.
**زیربار رفتن:** چوونەژێربار، ملدان، وەئەستۆگرتن.
**زیربالاشدن:** تێکچوون و شێوانی کارێك یان شتێ.
**زیربالاکردن:** 1) گەڕان، تاوتوێکردن. 2) ژێروڕووکردن، لێکدان.
**زیربنا:** 1) ژێرخان، بنەمای ژێرینە. 2) بناخە و بنەڕەتی دیاردەکان.
**زیربنایی:** بنەڕەتی، بنەمایی.





**زیرپاکشیدن:** بریتی لە پێدرکاندن، زانیاری لێوەگیرخستن.
**زیرپاگذاشتن:** ژێرپێنان، بەرپێدان، پێشێل کردن.
**زیرجلدی:** ژێرپێستی.
**زیرجلکی:** شاراوە، بەنهێنی، ژێرجلەکی.
**زیرچاق:** ئامادە. فەرمانبەر، ملکەچ.
**زیردریایی:** نقۆك، نۆقار، ژێردەریایی.
**زیردست:** 1) خواردەس، خواردەست، ژێردەست، بەرفەرمان. 2) پەست، بێنرخ. 3) بڕوانە: "پنهانی".
**زیرزبانی:** 1) حەبێ کە دەیخەنە ژێر زمان و دەیمژن. 2) پارەیەك کە کاتی مارەکردن لە لایەن بنەماڵەی زاواوە دەدرێتە بووك تا ڕازی بوونی خۆی نیشان بدا. 3) بەدەنگی هێواش.
**زیرزمین:** ژێرزەوی. "**زیرزمینی**": هەڵکەوتوو لە ژێرزەویدا، ژێرزەوینی. بەنهێنی، پەنامەکی.
**زیرزیرکی:** بەنهێنی، لەژێرەوە.
**زیرساخت:** ژێربنەما، بناخەو بنەڕەتی دیاردەکان.
**زیرسازی:** ژێرسازی، ئامادەکردنی ئاستی ژێرەوەی جادە لە ڕێگەی پڕکردنەوە و ئاوپێداکردن و باگردێن لێدان و تێکپەستاوتن لە چەند لایەدا.
**زیرسبیلی:** 1) بەرتیل. 2) لە حاڵی لەبەرچاونەگیران دا.
**زیرك:** زیرەك، زرینگ، هوشیار، ژیر و زانا.
**زیرکسار:** زیرەك، بیرتیژ، ژیر و زانا.
**زیرگذر:** پرد، تونێل.
**زیرگرفتن:** خستنەژێرپێ، وەبەردان، وەبن دان.
**زیرلب:** بریتی لە قسەی بەئەسپایی.
**زیرمجموعە:** بەشەکۆمەڵە، ژێرکۆما، هەرکام لە ئەندامانی کۆمەڵەیەکی گەورەتر.
**زیرمیزی:** بەنهێنی، لەبنەوە. بەشێوەی نهێنی.
**زیرنظر:** لە ژێرچاوەدێری. "**زیرنظرگرفتن**": لەبەرچاوگرتن، چاوەدێری لێکردن.
**زیرنویسی:** ژێرنووسی، پەراوێزی.
**زیروبالا:** سەر و ژێر. بریتی لە قسەی قۆڕ و بێمانا.
**زیروبمی:** بەرزونزمی.
**زیروح:** گیاندار، گیان لەبەر، تراوری، ژی.
**زیرورو شدن:** ژێرەوژووربوون، سەرنخوون بوون، ئاوەژووبوونەوە، هەڵگەڕانەوە، هەڵ گەڕان، هەڵگێڕوەرگێڕ، قوڵب بوون.
**زیروروکردن:** وەرگەڕاندن، ژێروڕووکردن، سەرەونخوون کردن. "**زیروروکننده**": هەڵگێڕ، هەڵگێڕەوە، هەڵەوگەڕ.
**زیر و زبر:** سەر و خوار. پەرێشان، نیگەران. "**زیروزبرشدن**": 1) تێکچوون، لەناوچوونی تەکووز و ڕێکوپێکی. 2) وێران بوون، کاول بوون. 3) ئاڵۆز و پەرێشان بوون.

**زیرەآب دادن:** فریودان، خەڵەتاندن.

**زیست:** ژیوار، ژیان، بایۆلۆژی. "**محیط زیست**": ژینگە.

**زیست بوم:** 1) ژینگە. 2) زێد، نیشتمان.

**زیست بوم خواە:** لایەنگری پاراستنی ژینگە.

**زیست بوم دوست:** لایەنگری ژینگە.

**زیست بوم شناس:** ژینگەناس.

**زیست پذیر:** شیاوی ژیان لێکردن، شیاوی نیشتەجێبوون.

**زیست تکنولوژی:** بیۆتێکنۆلۆژی.

**زیست چرخە:** دەورەی زیندەوەرناسی.

**زیست زمان:** تەمەن.

**زیست شناختی:** زیندەوەرناسانە، بایۆلۆژیکاڵ.

**زیست شناس:** زیندەوەرناس، زیندەوەرزان، بایۆلۆژیست.

**زیست شناسی:** زیندەوەرناسی، زیندەوەرزانی، بایۆلۆژی.

**زیست شیمی:** "بیۆشیمی".

**زیست فیزیک:** بیۆفیزیك.

**زیست کرە:** فەزای بایۆلۆژی، بیۆسفێر.

**زیستگاە:** نشیمەن، جێگەی لێ ژیان، هێڤر.

**زیست محیطی:** دەپێوەندی لەگەڵ ژینگەدا.

**زیست مکانیک:** بیۆمێکانیك.

**زیستمند:** تایبەتمەندی بوونەوەرێ کە توانای ژیانی هەیە، زیندوو.

**زیستمندی:** ژیان.

**زیستن:** ژین، ژیان.

**زیست نامە:** بیۆگرافی، بەسەرهات نووسی.

**زیش:** ژیان، ژین.

**زیشگاە:** جێگەی لێژیان، هێڤر.

**زی فن شناسی:** بڕوانە:"زیست تکنولوژی".

**زی کافتنی:** شیاوی شیکردنەوەی بایۆلۆژیك.

**زین افزار:** 1) زین و ئامرازە بەستراوەکانی بەو وەك هەوسار و ڕکێف. 2) ئامرازی، شەڕ، چەك، چەکوچۆڵ.

**زینت:** خشڵ، خەمڵ، خەملان، ڕازانەوە، ئەوەی خۆی پێبڕازێننەوە ئەوەی مایەی جوانییە. "**زینت کردن**": ڕازاندنەوەی شتێ بە کەرەسەی جوانکەر. "**زینت یافتن**": ڕازانەوە، زەینین.

**زینتی:** لەبار بۆ ڕازاندنەوە و جوانکردنی شتێ.

**زینهار:** بڕوانە:"زنهار".

**زینەبندی:** بڕوانە:"طبقەبندی".

**زیور:** خشڵ و زەنبەر، خشر، خشروخاڵ، خێز، زێڕوزەنبەر، ڕەوش. "**زیور بستن**": زێڕ و زەنبەر بە خۆوە هەڵواسین. "**زیور زدن**": بڕوانە:"زیوربستن". ڕازاندنەوە، خەملاندن. "**بە زیور طبع آراستن**": چاپ کردن، لەچاپ دان.

# ژ

**ژاژ:** قسەی قۆڕو بێهوودە، هەڵیت و پڵیت، جڕنا.

**ژاژخا:** چیڕدڕێژ، زۆربڵێی لاسار، قسەدرێژ، چەقەسرۆ، چەنەوەر، هەڵەوەڕ، مزەمزکەر، بەجووج، کەسێك کە قسەی زوو بۆنایا و دەیڵێتەوە.

**ژاژخایی:** دەم بەیەکاهاتن، قسەجوونەوە، قسەباش بۆنەهاتن، ڕنگانەوە، ڕینگانەوە، ڕیوەڕیو، هەرزەگۆیی، چەنەبازی زۆر و دووپات کردنەوەی قسەی بێ تام، زۆرگوتنی بێ تام.

**ژاژخاییدن:** منجەمنج کردن، مزەمزکردن، جوونەوەی قسە و درەنگ دەربڕینی، قسەی بێ تام گوتن، قسەی قۆڕ و بێ مانا گوتن.

**ژاژدرایی:** بڕوانە: "ژاژخایی".

**ژاژە:** قسەی قۆڕ و بێ مانا.

**ژاژیدن:** هەرزەگۆیی کردن، لاژگەلاژگ کردن، قسەجوونەوە.

**ژالە:** 1) (زانستی زەوی) شەونم، خوناو. 2) تەرزە. 3) دڵۆپەی باران، باران. 4) تنۆکەی عارەق. "**ژالە پوش کردن**": خووساندن، تەڕکردن.

**ژاندارم:** ژاندارم، جاندارم، مەئمووری پاراستنی ئاسایش لە جادەدە و ڕێگاکانی دەرەوەی شار.

**ژاندارمری:** ژاندارمێری.

**ژانر:** جۆر، چەشن، شێواز، فۆڕم. لە زاراوەی نیگارکێشیدا: وێنەیەك کە نە پەیکەری کەسێك بێ نە دوورنماکەی بەڵکوو بریتی بێ لە دیمەنە ئاساییەکانی ژیانی ڕۆژانە.

**ژاو/ژاوش:** پوختە، کورتە.

**ژئوپولیتیك:** ژێئۆپۆلێتیك، جوگرافیای سیاسی، زانستی سیاسەت دەپێوەندی لەگەڵ زەویدا.

**ژئوتروپیسم:** بەریان (مەیل)ی ڕەگی گیا بەرەو زەوی.

**ژئوشیمی:** زانستی موتاڵای پاژە شیمیاییە پێکهێنەرەکانی چینی دەرەوەی زەوی (قاڕەکان و بەستێنی ئۆقیانووسەکان) و ئەو گۆڕانکاریانەی کە لەو دا ڕوودەدەن.

**ژئوفیزیك:** ژێئۆفیزیك، زانستێ کە سەبارەت بە وزەگەلی فیزیکی و سروشتی زەوی و ئەو جەریانانەی کە لە چینەکانی ناوەوەی زەوی دا ڕوودەدا، دەدوێ.





**ژئولوژی:** زەویناسی.

**ژخار:** هاوار، قوولە، نەڕە.

**ژرف:** قووڵ، قویل، کوور، کووڕ، کوویڕ، قوور، گاود، بەرانبەری تەنك. دوور و درێژ. "**ژرف نگریستن(نگاەکردن)**": بە وردی و قووڵی ڕوانینە شتێك، تێڕامان.

**ژرفا:** قووڵی، قووڵایی، کوران، نق، بەرانبەری پەلی و تەنکایی.

**ژرفایش کردن:** دووڕڕوانی، بەقووڵی لێوردبوونەوە.

**ژرف اندیش:** بیرکەرەوە لە ئەنجامی کارێك، وردبین، دوورنواڕ.

**ژرف بین:** باریك بین، وردبین، چاوتیژ.

**ژرف بینی:** باریك بینی، وردبوونەوە، قووڵبوونەوە، ڕۆچوونەناو بابەتێ.

**ژرفنا:** قووڵایی، جێگەی قووڵ.

**ژرف نگر:** بڕوانە: "ژرف بین".

**ژرفی:** 1) قووڵ بوون، قووڵی. 2) جێگەی قووڵ. "**بە ژرفی**": بەوردی، بەتێڕامان، بەقووڵی.

**ژرف یاب:** 1)ئەوەی قووڵایی شتێکی پێبپێوێ. 2) باریك بین، وردبین.

**ژرمن:** نەژادی خەڵکی ئاڵمان.

**ژست:** ژێست، وەزعی سەرو ڕیخت و جووڵەی ئەندامانی لەش بەتایبەتی دەست و باهۆ.

**ژغار:** 1) بڕوانە: "ژخار". 2) دژواری و مەینەتی.

**ژغند:** دەنگی بەرز، هەرای ترسناك، نەڕەی گیانلەبەرانی دڕندە.

**ژف:** تەڕ، شێدار.

**ژفت:** بەربڵاو، هەمەلایەنە.

**ژفك:** ڕیفۆقی چاو.

**ژفگن:** ڕیفۆقاوی.

**ژفیدن:** تەڕبوون، خووسان.

**ژك:** بۆڵەی بن لێوان، پرتەپرت.

**ژکارە:** لاسار، شەڕانی، قین لە سك.

**ژکان:** لە حاڵی پرتەپرت دا، کەسێ کە بە هۆی تووڕەیی و دڵتەنگی لەبەر خۆیەوە دەبۆڵێنێ.

**ژکفر:** (ژَ.فَ) بەسەبر و پشوو، لەسەرخۆ.

**ژکور:** سەقیل، بەرچاوتەنگ، چاونەزێر.

**ژکیدن:** پرتەوبۆڵەکردن، بۆڵەبۆڵ کردن.

**ژگور:** قرنیس، دەست ڕژد. پەست، ناکەس، نزم.

**ژن:** ژێن، پاژێکی گچکە لە کرۆمۆزۆم کە ئامرازی ڕاگواستنی سفەتە میراتییەکانە.

**ژنتیك:** (پزیشکی) ژێنێتیك، بۆماوەزانی، کنێتی زانی، زانستی چۆنیەتی ڕاگواستنی سفەتە میراتی (ارثی)یەکان لە نەسڵێکەوە بۆ نەسڵێکی تر.

**ژن درمانی:** (پزیشکی) کەڵك وەرگرتن لە شێوازەکانی موهەندیسی ژێنێتیك بۆ دانانی ژێنی سالم بەجێگەی ژێنی ناسالم لە خانەکانی لەشدا.

**ژندە شدن:** پیس، دڕان یان نارێکوپێك بوون.

**ژندگی:** کۆنی، دڕاوی، شڕی.

**ژنده:** (ژَ یا ژِ.دَ) شڕوبەتیتۆڵ، شڕە، شڕەوپڕە، شڕەوشیتاڵ، کۆنە، دڕاو.

**ژنده:** (ژَ.دَ) گەورە، زل، قەبە.

**ژنده پوش:** شڕپۆش، کۆنەپۆش، شڕۆڵ، شڕەبار، کەرپال، قەرپال، جل شڕ، بەرگ دڕاو، ڕینگاڵ.

**ژنرالیسیم:** فەرماندەری گشتی لە ئەرتەشدا، سپاسالار.

**ژنگ:** چرچ و لۆچی.

**ژنوتیپ:** سفەتی هاوبەشی نێوان بوونەوەرانی هاوچەشن.

**ژنه:** چزوو، درێشووکە.

**ژنی:** بلیمەتی، لێهاتوویی، ژێهاتی، هۆش و بەهرەی سەراسایی. بلیمەت، هەڵکەوتە.

**ژو:** دەریا.

**ژور:** ڕۆژ، ڕۆشنایی، ڕۆچنە.

**ژوراسیك:** دووهەمین دەورە لە دەورانی دووهەمی زەویناسی.

**ژورنال:** ڕۆژنامە، گۆڤار.

**ژورنالیست:** ڕۆژنامەنووس.

**ژورنالیسم:** 1) شێوازی زانستی و تێکنیکی ڕۆژنامەنووسی. 2) هەڵاوهەنگامە و هاتوهاوار وەڕێخستن لە ڕێگەی نووسینی وتاری مشتومڕهەڵگر لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا.

**ژنوساید:** قڕکردن، لەناوبردن، ژینۆساید.

**ژول:** 1) ئاڵۆز و تێکەڵ پێکەڵ، پەرێشان، شپرزە. 2) یەکەی پێوانی کار و وزە.

**ژولی:** جوان، خوشیك.

**ژولیدن:** پەرێشان بوون، شپرزەبوون، ئاڵۆزبوون، پەشۆکان.

**ژولیده:** تێکەڵاو، ئاڵۆزوتێکەڵ، شپرزە، گژن، لوول. "**ژولیدەمو**": پرچن، سەرقژن، گژنەسەرە، سەرتەپڵەگوێنی، چنگڵەسەرە، گڤن، مووی تێکەڵاوی پڕی شانەنەکراو.

**ژوهیدن:** دلۆپەکردن، تکان، تکەکردن. "**ژوهیده**": تەڕکراو، ئاوپڕژێنکراو.

**ژیان:** توورە، تۆسن.

**ژیر:** تاڵاو، بەنداو، ئەستێر.

**ژیراسیون:** جووڵەی بازنەیی، جووڵەی دەورانی.

**ژیژ:** مردارەوەبوو، پیس، گڵاو.

**ژیك:** تنۆك، دلۆپ، دلۆپە.

**ژیگانتیسم:** (پزیشکی) هەڵدانی لەڕادەبەدەری لەش بە هۆی چوونەسەری دەڵاندنی هورمونی گەشەکردن.

**ژیگول:** ئەوەی لەڕادەبەدەر پێڕەوی لە مۆد دەکا بە جۆرێ کە سەرنجی دیتران بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ، سووسوول.

**ژیگولو:** 1) لاوێ کە ژنێکی پیر ئەوی لای خۆی ڕاگرتبێ. لاوی ناسك و خۆشگوزەران. 2) پیاوێ کە بۆ سەرنج ڕاکێشانی دیتران بە لای خۆیدا زۆر بە خۆی ڕادەگا.